# تەفسیری قورئانی بەرزو بەڕێز

بەرگی سێیەم

سوورەتی (النّساء)

عەلی باپیر

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نووســـەر: عەلـی باپـیر.

نەخشەسازیی ناوەوە: عزالدين محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٤ ك– ٢٠١٣ز.

تـــیراژ : ٢٠٠٠ دانە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

الحَمْدُ للّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرینو ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەرێزی فێردەکرد پێش هەر قسەیەکی گرنگ بیلێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی‌و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم‌و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم‌و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی‌یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم‌و، سەرقاڵیی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان‌و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی‌و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب‌و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم‌و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان‌و چۆنیەتی جێبەجێکردن‌و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك‌و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم‌و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم‌و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوە، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون‌و دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ فەرموویەتی: ﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بە تایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزنو تەفسیرەکانیو کتێبەکانی سوننەتدا خەریکمو دەیان کتێبو بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا تبارك و تعالی، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لە بارەی زۆرێك لە ئایەتەکانی یەوە، ئەم ڕاستییەش لە کتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا زۆر درەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە نالێمو هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشم ویستووە کە زۆر بەملاولادا بچمو بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو شارەزا نیم، یان خوێنەر پێویستی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیەوێ لە قورئان تێبگاتو بزانێ خوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فەرمووە؟!

ئنجا هەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سووكو گورجو گۆڵو دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هەڵسا بە نووسینەوەو هێنانە سەر کاغەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی، سەرجەم ئەم زنجیرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هەروەها هەڵسا بە (تخريج)ی سەرجەم دەقەکانی

---

١) ئەو کتێبە کە ئێستا بەرگی یەکەمی چاپ کراوەو ئەوانی دیکەشی لە ئامادەکران دان بۆ چاپ، سەرجەم هەشت بەرگو زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵم داوە بە گشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بەم بەرگی یەکەمەوە - کە سەرجەم سوورەتی (البقرة) دەگرێتە خۆی — کێشاوە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوەو، هەر صاڵحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕان‌و کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئان‌و دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن‌و، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەین‌و بە گوێرەی سوورەتەکان بەرگەکانی دیاری دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس‌و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چووومەوەو بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢
٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (آل عمران) و (النِّساء)، سەرگەرمی سوورەتی (المائدة)یەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحَمـد للّه رَبّ العَالـمين وَصَلاته و سلامه و بركاته على عبده مُحَمَّد وآلِهِ السائرين على دربه .

خوێنەرانی بەڕێز !

سوپاس و ستایش بۆ خوای بەرزی مەزن، کە دوای هەرسێك سوورەتی بەپێزی فاتیحەو بەقەرەو ئالی عیمران، یارمەتیی داین سوورەتی پڕ فەڕو بەرەکەتی نیسائیش تەفسیر بکەین.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە تەفسیرکردنی سوورەتی (النساء)یش دا هەر لەسەر هەمان نەخشەو بەرنامەی کە لە سەرەتای ئەم تەفسیرەوە ڕامان گەیاندوە، بەردەوام بووین و هەوڵیشمان داوە لەم بەرگەدا لەو تێبینی و پێشنیارانەی خوێنەرانی سەنگین و شیرین کە لەسەر بەرگی یەکەم و دووەمی ئەم تەفسیرە، خستبوویاننە ڕوو، بەهرەمەند بین و هیواداریشین خوێنەرە خۆشەویستەکان بەردەوام لە تێبینی و سەرنجەکانی خۆیان لە هەر ڕوویێکەوە بن، بێبەشمان نەکەن، چونکە فەرمایشتی بەرزو بەپێزی خوای بێوێنەو تاك، هەتا خزمەتی بکرێ هەر کەمەو، هەموو شتێکی باشی شایستەیە، ئەوەندەی لەتوانادا هەبێ و بلوێ.

هیواداریشم سەرجەم خوشك و برایانی مسوڵمانی بەهرەمەند لەم تەفسیرە، دوعامان بۆ بکەن بۆ هیدایەت و بەرچاو ڕوونیی زیاترو، بەردەوام بوونیش هەتا تەواوکردنی تەفسیرکردنی تێکڕای سوورەتە موبارەکەکانی قورئانی بەرزو بەپێز.

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك

١٠ ی ڕەجەبی ١٤٣٤ ك
٢٠ ی مایسی ٢٠١٣ ز
هەولێر

# چۆنیەتی و نەخشەی تەفسیرکردنی سوورەت و ئایەتەکان

ئەو نەخشەیەی کە من دامناوە بۆ تەفسیرکردنی قورئان، بۆ حەوت قۆناغ دابەش بووە، بەمجۆرە:

١- پێناسەکردنی سوورەتەکە یان ئەو کۆمەڵە ئایەتە، کە دەرسەکە پێکدێنن، بە کورتیی ڕوونی دەکەینەوە، کە لە چ بابەتێك دەدوێن و تەوەرەکانیان چین؟!

٢- نووسین و خستنەڕووی ئەو کۆمەڵە ئایەتە کە دەویسترێ لەو دەرسەدا بتوێژرێنەوە.

٣- مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان بەکورتیی و پوختیی.

٤- شیکردنەوەی ئەو وشانەی حەوجێی شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی زیاترن و، ساغکردنەوەی مانا بنەڕەتییەکەیان.

٥- باسکردنی هۆی هاتنە خوارەوە (سبب النزول)، ئەگەر هەبێ.

٦- مانای گشتی ئایەتەکان، واتە تەفسیرکردن و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکان بەسەریەکەوەو بەگشتی.

٧- خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکان، واتە هەر مەسەلەیەك کە نەگونجابێ وەك پێویست تیشکی بخرێتە سەر، لەم قۆناغی حەوتەمەدا دەیتوێژینەوەو بۆی قەرەبوو دەکەینەوە، جا چ پەیوەندیی بە لایەنی فیکرو عەقیدەوە هەبێ، چ بە لایەنی حوکم و سیاسەتەوە، چ بەلایەنی سیرەو مێژووەوە، ... هتد.

# دەرسی یەكەم

## تەفسیری سوورەتی (النساء)

## پێناسەی سوورەتی (النساء)و بابەتەكانی

بەڕێزان !

خوا پشتیوان بێ لەسەر زنجیرە دەرسی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، بەردەوام دەبین، وە لەم دەرسەدا دەچینە خزمەت سوورەتێكی دیكەی قورئان كە سوورەتی (النساء)ە، ئنجا ئێمە لەم دەرسەماندا پێناسەی سوورەتی (النساء) دەكەین، وە ئاماژە دەكەین بە بابەتەكانی سوورەتی (النساء)و نێوەڕۆكەكەی، بەرلەوەی بچینە سەر درێژەی توێژینەوەی ئایەتەكان، بۆئەوەی بە شێوەیەكی گشتی بابەت و نێوەڕۆكەكەیمان لەبەرچاو بێ‌و سەرەتاش سەرنجی هەموو لایەك بۆ چوار خاڵان ڕادەكێشم وەك پێناسەی ئەم سوورەتە:

١/ سوورەتی (النساء) كە لە ڕیزبەندیی سوورەتەكانی قورئاندا، سوورەتی ژمارە چوارەمینە، سوورەتەكانی: (الفاتحة، البقرة، آل عمران، النساء)، بەڵام لە ڕووی قەبارەوە لە دوای سوورەتی (البقرة) گەورەترین سوورەتی قورئانە، هەرچەندە ژمارەی ئایەتەكانی (١٧٦) ئایەتە بە هەندێك ژماردن، وە بە ژماردنێكی دیكەیان (١٧٥)ە، وە بە یەكی دیكەیان (١٧٧)ە، بەڵام لە ڕووی قەبارەوە، لە دوای سوورەتی (البقرة) دێ، كە بەش (جُـزء)و نیوێكی قورئان دەگرێتە خۆی.

٢/ سوورەتی (النساء) لە مەدینە هاتۆتە خوار، واتە سوورەتێكی مەدینەیی یە، چونكە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: ﴿وَمَا نَزَلَتْ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَالنِّسَاءِ، إِلاَّ وَأَنَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ﴾، (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم:

(٤٩٩٣)، واتە: سوورەتی (البقرة)و (النساء) دانەبەزین مەگەر لە حاڵەتێكدا كە من لە لای پێغەمبەر ﷺ بووم، واتە: ئەو كاتە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرگیریی لەگەڵ عائیشەدا كرد بوو، كە ئاشكراشە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە هاوسەرگیریی لەگەڵ دایكمان عائیشەدا كردوە خوا لێی ڕازی بێ.

بەڵام ئەم سوورەتە ئەگەر سەرنجی نێوەڕۆكەكەی بدەین، وەك دوایی تەماشای دەكەین، بۆمان دەردەكەوێ كە لە هەموو قۆناغەكانی مەدینەدا هاتۆتە خوار، واتە: هەندێك لە ئایەتەكانی لە قۆناغی سەرەتای مەدینەو، هەندێكیان لە قۆناغی نێوەڕاستی، واتە: لە دەوروبەری پێش صوڵحی حودەیبییەو دوای صوڵحی حودەیبیە، وە هەندێكیان لە كاتی فەتحی مەككەو، ڕەنگە دوای فەتحی مەككەش هاتبنە خوار.

٣/ ئەم سوورەتە چوار (٤) جار ڕستەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، واتە: (ئەی خەڵكینە!)ی تێدا دووبارە بۆتەوە، وە یەكەمین ئایەتی بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، دەست پێدەكات، وە نۆ (٩) جار ڕستەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوە، وە بۆ زانیارییتان ڕستەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، تەنیا لە سوورەتە مەدەنیەكاندا هاتوەو لە سوورەتە مەككەیەكاندا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، یان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ﴾، یاخود ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ﴾، ناوونیشانی دواندن (خطاب) بووە.

٤/ دیارە ئەم سوورەتە زۆربەی ئایەتەكانی لە چوار چێوەی خێزانو پەیوەندییەكانی نێوان ژنو مێردو باری كەسێتیدا دەخولێنەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش سوورەتێكی گشتگیرەو سەرجەم بوارەكانی: عەقیدەیی، فیكریی، كۆمەڵایەتیی، حوكمو سیاسەتو دەوڵەتدارییو، جەنگو ئاشتییو، پەیمان بەستنو ... هتد، دەگرێتە نێوخۆی.

ئێستاش وەك لە سەرەتاوەش گوتمان، سەرەنجێكی گشتی لە بابەتەكانی ئەم سوورەتە دەدەین، لەگەڵ ئاماژەكردن بە ئایەتەكان:

**بابــەتی یەكــەم**: كـە لـە ئایـەتی ژمـارە (١) لـەم سـوورەتەدا خراوەتـەڕوو، خـوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾، ئـەم ئایەتـە دەسـتپێكی سـوورەتی (النسـاء)ە، وە ئاماژەشـە بە نێوەڕۆكی ئەم سوورەتە هەمووی، وەك چۆن هـەر نووسـەرێك كـە كتێبێـك دادەنـێ، لـە پێشـەكییەكەیدا ئامـاژە دەكـات بـە نێـوەڕۆكی كتێبەكـەی، خـوای كاربـەجێش لـەم ئایەتـە موبارەكـەدا، ئامـاژە دەكـات بـە كـۆی ئـەو بـاس‌و بابەتانەی كە سوورەتی (النساء) دەیانگرێتە خۆی، دەفـەرموێ: ئـەی خەڵـكینە! پـارێز لـەو پـەروەردگارەتان بكـەن كـە لـە یـەك نـەفس ئێـوەی دروسـت كـردووە، هـەر لەو نەفسـەش هاوسـەرەكەی هێناوەتە دی، (واتە: هەر لەو جـۆرە نەفسـە)، وە پیاوان‌و ئافرەتانێكی زۆری لـێ بڵاوكردوونەتەوە، وە پارێز لەو خوایە بكــەن، كـە داوای پــێ لــە یەكـدی دەكـەن، وە پــارێز لــە خزمایــەتیی بكـەن، (واتــە: پەیوەندییــەكانی خزمایــەتیی بپــارێزن‌و مەیپــچڕێنن)، بێگومـــان خـــوا بەسـەرتانەوە چاودێرە.

كەواتە: یەكەمین بابەت بریتیە لە بانگــكردنی مرۆڤایـەتیی بـۆ پارێزكـاریی، لـە پــەروەردگاریان، وە بیـرخـستنەوەیان كـە هـەموویان لـە یـەك خێزانــەوە هــاتوون، لــە یــەك دایــك‌و بابــەوە، وە هــەموو وەچــەی خێــزانێكن، وە ئامۆژگارییكردنیــان بــەوە كــە پەیوەندییــەكانی خزمایــەتیان بپــارێزن، كــە پەیوەندیی خزمایەتیی بە پێی چەمكی ئەم ئایەتـە، وێـڕای خزمایـەتیی نیزیـك وەك: دایك‌و باب‌و ئەوانەی سەرووی وان، واتە: نەنك‌و باپیـر، وە ئەوانەی خـوار وان، واتە: خوشـك‌و برا، وە ئەوانەی دیكە وەك: پوورو مام‌و خاڵ‌و ئەوانە، بـەڵام وێــڕای ئەوانــە هــەموو مرۆڤایــەتییش دەگرێتــەوەو وشــەی (أرحـام) هــەمووی دەگرێتەوە، چونكە بەشەر هەموو دەبنەوە بە خوشـك‌و براو، سەرجەم ئـافرەت‌و پیاوان لە (ئادەم)و (حــەووا)دا دەگەنـەوە بـە یـەك‌و، پیـاوان هـەموویان پێكــەوە بران‌و، ئافرەتـانیش دەبنەوە بە خوشـك‌و، نێرو مێش دەبنەوە بە براو خوشـك.

**بابــەتی دووەم**: كە لە ئایەتی (٢) دایـە خـوا ﷻ فـەرمان دەكـات بـە مامەڵـەی بـاش لەگـەڵ هەتیوانـدا، وە خـۆ دوورگـرتن لـە سـتەم لێكـردنیان، وە مـاڵو سـامان خواردنی ئەوان بە نـاهەق، یاخـود تێكـەڵ كردنی مـاڵو سـامانی ئـەوان لەگـەڵ هی خـۆی.

**بابــەتی سـێیەم**: كـە لـە ئایــەتی (٣) دایە، خـوای پەروەردگــار باسـی ڕەوا بـوونی زیاتر لە هاوسـەرێك دەكـات، واتـە: باسـی چـەند ژنیــی دەكـات، وەك دەفـەرموێ: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، دیـــارە بــــە مـــــەرجی دادگـەریی‌و ئەگـەر كەسـێك مەترسـیی هـەبێ كـە ناتوانــێ دادگـەریی بكـات، پێویستە بە یەكێك وازبێنـێ.

**بابــەتی چــوارەم**: كـە لـە ئایـەتی (٤)دا خراوەتـەڕوو، خـوای پەروەردگــار باســی مارەیی دان بە هاوسـەران دەكات، وەك: خەڵاتو دیارییەكی بێ بەرانبــەر.

**بابــەتی پێنجـــەم**: كـە لـە ئایەتەكـانی (٥و ٦)دا خراوەتـەڕوو، بریتیـە لـەوە كـە كۆمەڵگای مسـوڵمان، دەبـێ ئەو ماڵو ســامانە كە لەبەر دەستی دایـە، تەسلیم بە كەسانی نەفـامو ناشـیو نەشــارەزای نـەكات، بـا هـی خۆشــیان بـێ، هەتاكـو فێریان دەكاتو ڕایان دێنێو سـەریان لـە قازانجو زەرەر دەردەچـێ، وە دەتـوانن ماڵو سـامانی خۆیان سـەرپەرشتیی بكەنو صـەرافەتی بكەن.

**بابەتی شـەشـەم**: كە لە حەوتـەمین ئایەتـدا خـوای زانـا باسـی دەكـات، ئەوەیـە كـە پیـاوانو ئافرەتـان یەكسـانن لـە میـرات گرتنـدا، دیـارە ئەمـە هەڵوەشـاندنەوەی عادەتێكی نەفامانـەی سـەردەمی نـەفامیی عەڕەبـەكانو غـەیری عەڕەبەكانیـشی تێدایـە، كـە تـەنیا میــراتیان دەدا بـە پیـاوان، بـەڵام خـوای پـەروەردگار پیـاوانو ئافرەتــان، نێــرو مێــی بــە درشــتو وردەوە بەشــداركردن لــە میــراتدا، وەك دەفـــــەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنۡهُ أَوۡ كَثُرَۚ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا﴾، كەواتـــــــە:

میـرات بەشـێكی دیاری كـراوەو كـەس بـۆی نیـە دەسـتكاریی بكـات، هەرچـەندە ئێـستاش لەگەڵـدابێ لـە نێـو كـوردەواریی خۆمانـدا، وە ڕەنگـە لەگەڵـێ شـوێنی دیكەشـدا هـەبێ، زۆر جاران ئافرەتـان بـە گـشتی لـە میـرات بـێبـەش دەكـەن، یاخود لە هەندێ جۆرە میـرات بە تایبەتی، وەك میـراتی زەویو خانوو وبەرە.

**بابەتی حەوتـەم**: كە ئەم سوورەتە موبـارەكە دەیگرێتـە خـۆیو لـە ئایەتەكـانی (٨ - ٩)دا هـاتوە، ئەوەیـە كـە لـە كـاتی ئامـادەبوونی خزمـانو منـداڵانی بـێ بـاب، واتە: هەتیوانو نەدارانـدا بۆ دابەشـكردنی میـرات، پێویـستە هاوكـاریی بكـرێن، وە قسەی باشیان لەگەڵدا بكرێ، وە هەركەسێك لـەو كاتـەدا ئامادەبـێ پێویـستە قسەی ڕێـكو پێـك بكـات، قـسەی وا بكـات كـە بـۆ میــراتگرەكان، ئەوانـەی كـە میـرات دەگرن لە مردووەكە، بەرژەوەندییو قازانج بـێ.

**بابـــەتی هەشـــتەم**: كـە لـە ئایـەتی ژمـارە دە (١٠)دا خراوەتـەڕوو، بریتیـە لـە: هەڕەشـەكردن لەو كەسانەی كە ماڵو سامانی هـەتیوان بـە ناهـەق دەخـۆن، وەك دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾، واتـە: بێگومـان ئەوانـەی مـاڵی هـەتیوان بـە ناهەقو بە سـتەم دەخـۆن، ئـاگر لـە ورگـی خۆیـان دەئـاخنن، وە دەشـخرێنە نێـو كڵپەی ئاگری دۆزەخەوە.

**بابــەتی نۆیـــەم**: لـە ئایەتـەكانی: (١١ - ١٢)دا خـوای پـەروەردگار دەیخاتـەڕوو، كـە بریتیە لە بنچینەكانی دابەشكردنی میـراتو هەموو ئەوەی كە دوایی شەرعزانان لـە كتێبـی گـەورە گـەورەو قەبـەدا باسـیان كـردوە، واتـە: چـۆنیەتی میــرات دابەشكردن، لەبەر ڕۆشنایی ئەم دوو ئایەتەو ئایەتی (١٧٦)، واتە: ئایەتی كۆتـایی سـوورەتی (النـساء)دا باسـیان كـردوە، وێـڕای فەرموودەكـانی پێغەمبـەر ﷺ، وە ئیجتیهـادو كۆشـشی زانایـان بـەهۆی قیـاسو بەكارهێنـانی عـەقڵو بـەراوردكاریی یـەوە، وە خـوای كاربـەجێ ئـاوا دەسـت پێدەكـاتو دەفـەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾، واتـــە: خـــوا

دەربارەی منداڵەکانتان وەصیەتتان بۆ دەکات، ڕێنماییتان دەکات، بۆ نێرینە، هێندەی بەشی دوو مێینە، واتە: بۆ برا دوو ئەوەندەی خوشك، کە وەك دوایی باسی دەکەین مەرج نیە هەمیشە پیاو لە ژن زیاتر بەرێ، بەڵام خوشكو برا وەختێك پێکەوە میرات دەگرن، برا دوو ئەوەندەی خوشك میرات دەگرێ، کە ئەویش حیکمەتی گەورەی تێدایەو پاشان باسی دەکەین.

**بابەتی دەیەم**: کە لە ئایەتەکانی: (١٣ - ١٤)دا خراوەتە ڕوو، بریتیە لە هۆشداریدان بە پابەندبوونی هەموو لایەك بە شەریعەتەوە، وە نەبەزاندنی سنوورەکانی خواو دیاریکردنی سزا بۆ کەسانێك کە سنوور دەبەزێنن، وە پاداشت بۆ کەسانێك کە پابەند دەبن.

**بابەتی یازدەیەم**: لە ئایەتی ژمارە (١٥ - ١٦)دا خراوەتەڕوو، کە بریتیە لە باسی سزادانی ئافرەتانی فاحیشەکەر لەگەڵ پیاوانی فاحیشەکەر، کە وەك دوایی باسی دەکەین، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ ﴾، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان پێیان وایە کە مەبەست پێی زینایە، بەڵام وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە کە مەبەست پێی زینا نیە، بەڵکو مەبەست پێی (سُحاق)ە، واتە: خۆ لێکخشاندنی ئافرەتان، هەروەکو ئایەتەکەی دواییش کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَا ﴾، وە ئەو دووانەی لە پیاوەکان کە دەیکەین ئازاریان بدەن، ئەویش مەبەست پێی نێربازیی یە، سزای زیناش لە سوورەتی (النور)دا خراوەتە ڕوو.

**بابەتی دوازدەیەم**: کە لە ئایەتەکانی: (١٧ - ١٨)دا خراوەتەڕوو، بریتیە لە باسی تۆبەکردن، تۆبە لە کێ قبووڵ دەکرێ؟ وە بە چ مەرجێك؟ وە لە کێ قبووڵ ناکرێ؟ وە بۆچی؟ لەو دوو ئایەتە بەپێزەدا باسی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، کراوە.

**بابەتی سێزدەیەم**: كە لە ئایەتەكانی: (١٩ ، ٢٠ ، ٢١)دا خراوەتەڕوو، بریتیە لە خۆپاراستنی پیاوان لە ستەم كردن لە ژنان، وە مامەڵەكردنی باش لەگەڵیاندا، وە چاوپۆشیكردن لێیان، وە لێ وەرنەگرتنەوەی مارەییەك كە پێیان دەدەن لە كاتی دەست لێبەردانیاندا، هەرچەندە مارەییەكی زۆریشیان پێدابن.

**بابەتی چواردەیەم**: لە ئایەتەكانی: (٢٢ ، ٢٣ ، ٢٤)دا خراوەتەڕوو، كە باسی ئافرەتانی قەدەغەو حەرام دەكات لە پیاوان، كێن ئەو ئافرەتانەی كە لە پیاو قەدەغەنو بۆی بە مەحرەم لە قەڵەم دەدرێن، وە دروست نیە هاوسەرگیرییان لەگەڵ بكات؟ كە پازدە جۆرە ئافرەتن خوای زانا لەم سێ ئایەتەدا خستوونیەڕوو.

**بابەتی پازدەیەم**: لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا خراوەتەڕوو، كە بریتیە لەوەی كەسێك توانای نەبوو ئافرەتانی ئازاد بێنێ، بۆی هەیە لە كەنیزەكان بێنێو كەنیزەكان مارە بكات مادام ئیمانداربن، ئەوەش دوایی باسی دەكەین كە كاتی خۆی كەنیزەك هەبوونو خوای پەروەردگار باسی ئەو واقیعەی ئەو كاتەی كردوە، بەڵام ئێستا ئافرەتان بە شێوەی كەنیزەك نین، هەرچەندە زۆر لە ئافرەتان مامەڵەی لە كەنیزەكیش خراپتریان لەگەڵ دەكرێ، ئەوەندەیە ناوی كەنیزەكو (جارية)یان لەسەر نیە، ئەگەرنا لە واقیعی ئێستادا مامەڵەی خراپتر لە كەنیزەكەكانی كاتی خۆیان لەگەڵدا دەكرێ.

**بابەتی شازدەیەم**: كە لە ئایەتەكانی: (٢٦و ٢٧و ٢٨)دا خراوەتەڕوو، بریتیە لە باسی حیكمەتی ئەو یاساو سنوورە شەرعییانەی كە لە پێشەوە باسی كردوون.

**بابەتی حەڤدەیەم**: خوای پەروەردگار لە ئایەتەكانی: (٢٩و ٣٠)دا، باسی نەخواردنیماڵو سامانی یەكدی دەكات، مەگەر بە شێوەی بازرگانییو بە شێوەیەك كە هەردوولا پێی ڕازی بن، وە باسی خۆكوشتن یان خەڵك كوشتن دەكات، وە باسی سزای ماڵی یەكدی خواردن بە ناهەقو خۆكوشتن، یان یەكدی كوشتن دەكات.

**بابــەتی هــــەژدەیەم**: کـە لـە ئایـەتی (٣١)دا باسـی کـردوە، بریتیـە لـە گوناهـە گـەورەکـان، وە باسی ئەوە کە هەر کەسێك خـۆ لـە گوناهـە گەورەکـان بپـارێزێ، لـە گوناهـە گـچکەکان دەبـوردرێ، وەك دەفـەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەگـەر خۆتـان لـەو گونـاهە گەورانـە بپـارێزن کـە لێتـان قەدەغەکـراون، بچووکەکانتـان لـێ دەسڕینەوە، وە دەتانخەینە شوێنێکی پڕ ڕێزو حورمەتەوە.

ئنجا ئەو گوناهانـە چین، وە چـەندن؟ ئـەوە خـوا پـشتیوان بـێ دوایـی باسـی دەکەین.

**بابەتی نۆزدەیـەم**: بریتیە لە ڕاگەیاندنی حەقیقەتێکـی زۆر گـەورە بـۆ پیـاوانو بۆ ئافرەتان، کە لە ئایەتی (٣٢)دا خراوەتەڕوو، کە هەر کام لە ئافرەتـانو پیـاوان قەناعەت بکەن بەوەی کە خوا پێی داون، چ لـەڕووی جەسـتەیی، چ لـەڕووی ئـەو ئەرکـە شــەرعییانەوە کـە خـوای دادگـەرو کاربـەجێ بـۆی دیـاریکردوون، وە ئـەو مافـە شــەرعییانەی کـە خـوا بـۆی دابـین کـردوون، وەك فەرموویـەتی: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾، واتـە: بـە خۆزگـە مـەخوازن ئـەوەی کـە خـوا داویـەتی بەهەنـدێکتانو نەیـداوە بەهەنـدێکتان، کـە ئـەم ئایەتـە وەك دوایـی باسـی دەکـەین حیکمـەتێکی گەورەی تێدایـە، ئێـستا کـە دەبیـنین زۆر لـە ئافرەتـان دەیکەنـە ملبەملـە لەگـەڵ پیـاوانو دەیانـەوێ هەنـدێك مەیـدان کـە پیـاوان دەتـوانن ئەسـپی خۆیـانی تێـدا بێننـە مەیـدانو تێـدا تـاودەن، ئافرەتـان وەك حەسـوودییو ئێرەیـی پـێ بـردن دەیانەوێ مەیدانەکانی ئەوان داگیـر بکـەن، هـەروەها پیـاوان هەنـدێکیان لاسایی ئافرەتان دەکەنەوە، کە ئەوە هەمووی لادانـە لـەو فیطـرەتـەی کـە خـوا بەشــەری لەسـەر خولّقاندوە، خوای پەروەردگار کۆمـەڵێك تایبەتمەنـدیی بـە پیـاوان داونو

كۆمەڵێك تایبەتمەندییشی بە ئافرەتان داون، كە ئەو تایبەتمەندییانەی پیاوان لە پیاوان جوانن، وە ئەو تایبەتمەندییانەی ئافرەتان لە ئافرەتان جوانن، بۆیە هەر پیاوێك لاسایی ئافرەتان بكاتەوە، پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی، وە هەر ئافرەتێك لاسایی پیاوان بكاتەوە، پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی، وە لە ئەركی فیطرییو سروشتیی خۆی لادەدات، خوای كاربەجێ باسی ئەو حەقیقەتە دەكات كە دوایی بە درێژیی باسی دەكەین.

**بابەتی بیستەم**: لە ئایەتی (٣٣)دا خوای زاناو شارەزا باسی ئەوە دەكات كە میرات گرانی بابو دایكو خزمان دیاریكراون، وە ئەوانەش كە پەیمانیان پێدراوە لە میرات، یان لەماڵو سامان، پێویستە بەشیان بدرێ، وەك دوایی باسی دەكەینو لەوبارەوە ڕاجیایی توێژەرەوانی قورئانیش دەخەینەڕوو.

**بابەتی بیستو یەكەم**: لە ئایەتەكانی: (٣٤و ٣٥)دا، خوا باسی ئەركەكانی ژنو مێردو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی خێزان دەكات، وە لە كاتێكدا كێشەو گرفت لەنێوان ژنو مێرددا ڕوودەدا، مادام خەتای ئافرەت بێ، پیاو پێویستە چۆن چارەسەری ئەو كێشەیە بكات؟ وە ئەگەر پێكەوە بۆیان چارەسەر نەبوو، چۆن خزمانو نیزیكانی هەردوولایان كێشەكە چارەسەر بكەن؟

**بابەتی بیستو دووەم**: لە ئایەتی (٣٦)دا، خوای بێ هاوتا فەرمان دەكات بە بەندایەتیی كردن بۆ خۆی، وەك دەفەرمویێ: ﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴾، پاشان فەرمان دەكات بەوەی كە هاوكارییو چاكەكاریی لەگەڵ دە جۆرە كەسان بكرێ: ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

**بابەتی بیستو سێیەم**: لە ئایەتەكانی: (٣٧و ٣٨و ٣٩)دا خراوەتەڕوو، كە بریتیە لە هەڕەشەكردن لەوانەی كە ڕژدییو چرووكیی دەنوێننو، لەوەی كە

خوا پێی داون نابەخشن لە شوێنی خۆیدا، یاخود كە دەبەخشن ڕیابازیی دەكەنو ڕووپامایی بۆ خەڵك دەكەن.

**بابەتی بیستو چوارەم**: لە ئایەتی ژمارە (٤٠)دا خراوەتەڕوو، كە بریتیە لەو ڕاستییەی كە خوای دادگەر بەقەدەر تۆزقاڵێكو گەردیلەیەك، ستەم لە هیچ كەس ناكاتو كاتێك كە خراپە دەكات، تەنیا بەقەدەر خراپەكەی سزای دەدا، ئەگەر سزای بدات، وە بە پێچەوانەوە بۆ چاكە، یانی: ئەگەر كەسێك چاكە بكات، پاداشتی زۆر گەورەتر لە چاكەكەی خۆی دەداتەوە، وەك لە سوورەتی (الأنعام)یشدا دەفەرموێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا ﴾، واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات دە بەرانبەر پاداشتی دەدرێتەوە، وە هەر كەسێك خراپەیەك بكات، تەنیا بە قەد خراپەكەی سزای دەدرێ، بەڵكو لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە كە خوای پەروەردگار بە حەوت سەد بەرانبەر پاداشت دەداتەوە، بەڵكو زیاتریش بە تایبەتی بۆ بەخشین.

**بابەتی بیستو پێنجەم**: خوای پەروەردگار لە ئایەتەكانی: (٤١و ٤٢)دا دەیخاتەڕوو، كە بریتیە لە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەی كە هەر ئۆممەتێك لە ڕۆژی دواییدا پێغەمبەرەكەی لەسەری دەبێتە چاودێرو شایەد، وە ئۆممەتی ئێمەش، ئۆممەتی (محمد المصطفى) پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەسەریەوە دەبێتە چاودێرو بەڵگەو شایەد، چاكەی كردبێ، یان خراپەی كردبێ، پێغەمبەر ﷺ شایەدیی لەسەر ئۆممەتەكەی دەدا، واش پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ كە شایەدیی لەسەر تاك تاكی ئەو ئۆممەتە بدات.

**بابەتی بیستو شەشەم**: لە ئایەتی (٤٣)دا خراوەتەڕوو، كە بریتیە لە باسی نوێژنەكردن بەسەرخۆشیی، بابای سەرخۆش بۆی نیە نوێژ بكات تا سەرخۆشییەكە بەری نەدا، وە باسی خۆشۆردن دەكات، وە كەسێك كە توانای خۆشۆردنی نەبوو، باسی تەیەمموم دەكات، كە دیارە لەكاتی خۆیدا بە وردیی باسی دەكەین.

**بابەتی بیستو حەوتەم**: لە ئایەتەکانی: (٤٤) تاکو (٥٥) خوای پەروەردگار باسی ژمارەیەك لە هەڵەو کەموکوڕیی‌و تاوانی خاوەن کتێبەکان دەکات، واتە: جوولەکەکان‌و نەصرانیی یەکان، هەردووکیان پێکەوە هەرچەندە واپێدەچێ زیاتر مەبەست پێی جوولەکەکان بێ، بەڵام بەگشتی خوای پەروەردگار باسی کتێبدارەکان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنج نادەیە ئەوانەی بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، کە هەم جوولەکەو هەم نەصرانیی‌و بەڵکو غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە، وە من پێموایە (خاوەن کتێبەکان) کە خوای پەنهانزان ئەم وشەیەی لە قورئاندا بەکارهێناوە، تەنیا مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانی یەکان نیە، بەڵکو هەر کەسێکی دی، هەر ئۆممەتێکی دی، هەر کۆمەڵێکی دی، کە خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانی بزانن، وشەی (أهلُ الكتاب) و (الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَاب) هەموویان دەگرێتەوە، وە خوا ﷻ باسی کۆمەڵێك لە هەڵوێستی دزێوو زەق‌و ناشیرینیان دەکات، لە بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ و لە بەرانبەر ئیمانداران‌و لە بەرانبەر ئیسلامدا، وە پاشان باسی ئەو سزاو جەزرەبەیەش دەکات، کە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیان دەکات.

**بابەتی بیستو هەشتەم**: لە ئایەتەکانی: (٥٦و ٥٧)دا خوا ﷻ باسی سزاو پاداشت‌و سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان لەلایەك، وە سەرەنجامی خێری بڕواداران لەلایەکی دیکەدا دەکات لە دوارۆژدا.

**بابەتی بیستو نۆیەم**: کە لە ئایەتەکانی: (٥٨و ٥٩)دا خراوەتەڕوو، خوای پەروەردگار ڕوو لە ئیمانداران دەکات‌و لەسەریان پێویست دەکات کە ئەمانەتی بەرپرسیارێتیی‌و حوکمڕانیی بەکەسانی شایستە بسپێرن، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾، وە پاشان فەرمانیان پێ دەکات، - واتە: بە بەرپرسان‌و حوکمڕانان - کە دادگەریی بکەن، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا

حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴾، واتە: ئەم ئایەتە لە یەك كاتدا هەم ئۆممەت دەدوێنێ، هەم حوكمڕانانیش دەدوێنێ، ئۆممەت دەدوێنێو دەفەرموێ: حوكمڕانیی و ئەركی بەرپرسیارێتیی بە كەسانێكی شایستە بسپێرن، كەسانێك كە ئەهل بن، شایستە بن حوكمڕان و بەرپرستان بن، دوایی حوكمڕان و بەرپرسەكانیش دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئەگەر حوكمتان كردو دادوەرییتان كرد لە نێوان خەڵكدا بە دادگەریی حوكمڕانیی و دادوەریی بكەن، وە پاشان خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات كە پێویستە لە سنووری شەرع دا فەرمانبەریی حوكمڕانان و بەرپرسان بكرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ... ﴾، كە دیارە ئەم دوو ئایەتە موبارەكە بە بناغەی حوكمڕانیی دادەنرێن، وەك من لە كتێبی (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا كە كتێبەو بەڕێوەیە، وە بە زنجیرە وتار لە (كەناڵی ئاسمانی پەیام)دا پێشكەش كراون باسم كردوە، زۆر لە بنچینەكانی حوكمڕانیی، لەم دوو ئایەتەی ژمارە (٥٨)و (٥٩)ی سوورەتی (النساء) هەڵدەهێنجرێن.

**بابەتی سێیەم:** كە لە ئایەتەكانی: (٦٠) هەتا (٦٨)دا خراوەتەڕوو، كە خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ: قەدەغەیە ئیمانداران بۆ یەكلاییكردنەوەی كێشەكانیان پەنابەرنە بەر غەیری حوكمی شەرعیی، یان پەنابەرنە بەر كەسێك كە حوكم بە ئیسلام ناكات و حوكم بە شەریعەت ناكات، كە خوای دادگەر ناوی لێ ناون طاغووت، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی پێیان وایە ئیمانیان بە خوا هێناوەو بەوە كە بۆ تۆ نێردراوەو بەوە كە لە پێش تۆ ڕەوانە كراوە (كە كتێبەكانی خوان) كەچی دەیانەوێ دادوەریی خۆیان (واتە: چارەسەری كێشەی خۆیان) بەرن بۆ لای

طاغووت (طاغووت: واته كەسێك كه حوكم به شـەریعەت ناكات)، كەواتـە: هـەر لەبەرئـەوەی كـه ئیـرادەی ئـەوەیان هـەبووەو ویـستوویانه ئـەوە بكـەن، خـوای كاربەجـێ دەفەرموێ: ئەوانه پێیان وایه ئیمانیان هێناوە، واتـە: بـه ئیمانـدار لـه قەڵـەم نـادرێنو هـەر بـۆ خۆیـان پێیـان وایـە ئیمانـدارن! واتـە: هـەر كەسـێك بـۆ یـەكلایی كردنـەوەی گرفـتو كێـشەكانی خـۆی پـەنا بەرێتـە بـەر غـەیری شـەریعەت، خوای پەروەردگار نـاوی ئیمانی لـێ دەسـڕێتەوە.

**بابـەتی سـێو یەكـەم**: كه سـوورەتی (النساء) خستوویەتیه ڕوو، لـه ئایەتەكـانی: (٦٩)و (٧٠)دا خراوەتـە ڕوو، كـە بریتیـە لـە ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە كـە فەرمانبـەریی خـواو فەرمانبـەریی پێغەمبـەری ﷺ، واتـە: (إطاعةُ اللّهِ وإطاعة الرَّسول) وا له خاوەنەكەی دەكات واته: هـەر كەسـێك فەرمانبـەریی خـوا بكاتو فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكات، به واتایـەكی دی: پابـەند بـێ بـه قورئانـەوە، وه پابەنـد بـێ بـه سـوننەتی پێغەمبـەرەوە ﷺ ئـا ئـەوە هاوەڵایـەتیی پێغەمبـەرانو صـیددیقانو شـەهیدانو صـاڵحانی بـۆ مـسۆگەر دەكـات، وەك دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾﴾، كـە لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە هـەم لـە دنیـادا هـاوەڵی ئەوانـەو لـە خزمـەت پێغەمبـەران دایـەو لەسـەر ڕێبـازی ئەوانـەو لـە نێـو كۆمـەڵی ئـەوان دایـە، وە لەگـەڵ صـیددیقانو شـەهیدانو صـاڵحان دایـە، وە لـە دواڕۆژیـشدا لـە نێـو ئاپـۆرای ئەواندایـە، كـە بەڕاسـتی ئـەوە موژدەیـەكی زۆر خۆشـە! چونكە خـوای بـەرز كـە دەفـەرموێ: ﴿...فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم...﴿٦٩﴾﴾، ئەوانـە لەگەڵ خـوا پێداوان دان، نەیفـەرمووە لـە دنیـا یـاخود لـە قیامـەت! كەواتـە: لـە دنیادا لەگەڵ ئەواندان، بە لەگەڵدا بـوونی مەعنـەویی‌و لەسـەر ڕێبـازی ئـەوانن، لەگەڵ ئەواندان، وە لەدواڕۆژیـشدا لـە بەهەشـتە ڕازاوەو نەبڕاوەكـانی خـوادان لـە خزمـەت ئەوانـدان، خـوای پـەروەردگار لـەو كەسـانەمان بگـێڕێ كـە ئـاوا دەكەنو خوای بەبەزەییش ئەوەیان بۆ دەكات !

**بابـەتی سـیو دووەم**: کە پانتاییەکی زۆری گرتۆتە خۆی لە سـوورەتی (النسـاء) کـە لـە ئایـەتی (٧١) تاکـو (٨٣)، واتـە: (١٣) ئایـەتن، ئـەو بابەتـەش بریتیـە لـە فـەرمان کـردن بـە جـەنگو بـەرەنگاریی‌و بـەرگریی کـردن لـە ئـاینی خـوای پـەروەردگارو لـە چەوسـاوان، وە پاشـان خـوای تاك‌وپـاك هـانی بـڕواداران دەدا لەسـەر جەنگ‌و جیهادو خەبات کردن، وە سـەرزەنشـتی ئەو کەسـانە دەکات کە سـستیی‌و تەنبـەڵیی دەکـەن، ئەوانـەی کـە دڵنـەخۆش‌و بـێ هێـزن، وە ڕەخنـە دەگـرێ لـە کۆمەڵـێ قـسـەو هەڵـسوکەوت‌و هەڵوێـستی ترسـنۆکانەو دڵنەخۆشـانەو تەنبەڵانـەیان، چـونکە وەك دوایـی باسـی دەکـەین توێـژەرەوانی قوڕئان هەندێکیـان دەڵـێن: ئەم ئایەتانـەی قورئـان مەبەست پێیـان کەسانێکن کە مونافیقن، هەندێکیش دەڵێن: نا، مەبەست پێیـان کەسانێکن کـە ئیمانـدارن، بـەڵام ئیمانەکـەیان بـێ هێـزە، یـان سـستیی‌و تەنبـەڵیی دەکـەن‌و وەك پێویـست ئامـادەنین خـەبات‌و جـەنگ‌و جیهـاد بکـەن لـە پێنـاوی خـوادا، لـە کاتێکـدا کـە لەسـەریان پێویسـت دەبێ.

**بابەتی سـیو سـێیەم**: لە ئایـەتی ژمارە (٨٤)دا خراوەتـەڕوو، کە خوا ﷻ فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکـات‌و دەفـەرموێ: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ٨٤﴾، واتـە: لـە پێنـاوی خـوادا بجەنگـە تـەنیا خۆتـت لەسـەرە، وە ئیمانـدارانیش هانبـدە لەسـەر جـەنگ کـردن، واتـە: ئەگـەر هـەر خۆشـت بـێ ئامادەیی دەربڕە، دیارە جەنگ بـە تـەنیا نـاکرێ، بـەڵام ئیمانـداران هانبـدەو بـۆ خـۆت پێـشێ بـڕۆ مەیـدان، ئنجا ئەگـەر دوایـی خـەڵك بـە گـوێی نـەکردی، تـۆ گوناهبار نیو ئەوان گوناهبـارن، ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ...﴾، واتـە: هانیـان بـدە، کـە دیارە پێغەمبـەری خوا ﷺ بە باشـترین شـێوە هەم هـاوەڵانی بەڕێـزی‌و هـەم ئیمـاندارانی تا دنیا ماوە هانداوە، لەسـەر جـەنگ‌و جیهـاد، جگە لـەوەی کە ئـەو ئایەتانەی خوای باڵادەستی بۆ خوێندوونەتەوە، کە باسی جەنگ‌و جیهاد دەکەن.

**بابەتی سی‌و چوارەم**: لە ئایەتی ژمارە (٨٥)دا خوای بەرزو مەزن ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو، كە چ تكا كردنی چاك، چ تكا كردنی خراپ، واتە: چ شەفاعەت بكەی بۆ شتێكی باش، لە شوێنی خۆیدا، چ بۆ شتی خراپ، ئەوە ئینسان بەش‌و پشكی تێیدا هەیە، كە كەسێك تكایەك بكات بەهۆی ئەو تكا كردنەی ئەووەوە شتێكی باش بێتە دەست كەسێك، تێیدا بەشدارە، وە كەسێك تكاو ڕجایەكی خراپ بكات‌و مەبەستێكی خراپ بێنێتە دی، بە هەمان شێوە لە گوناهەكەیدا بەشدارە: ﴿ مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٌ مِّنۡهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ ﴾.

**بابەتی سی‌و پێنجەم**: كە لە سوورەتی (النساء)دا لە ئایەتی (٨٦)دا خراوەتە ڕوو، بریتیە لەوە كە خوا فەرمان دەكات بە وەڵامدانەوەی سڵاو بە چاكتر لە خۆی، یان لانیكەم وەك خۆی، وەك دەفەرمویّ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ ﴿٨٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر سڵاوتان لێكرا، بە سڵاوكردنێكی چاكتر لە خۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، هەندێك لە توێژەرەوان لەوبارەوە مشتومڕیان بووە - وەك دوایی باسی دەكەین - كە ئایا وەڵامدانەوەی سڵاوی نامسوڵمانانیش وەك هی مسوڵمانان فەرزە، یان نا؟! بەڵام لە ڕاستیدا ئایەتەكە زۆر ڕوون‌و ڕاشكاوە، چونكە بە (البناءُ للمجهول) فەرموویەتی: هەر كەسێك سڵاوی لێكردن، نەیفەرمووە مسوڵمانە، یان غەیرە مسوڵمانە، كەواتە: ئەوەی كە هەندێك لە شەرعزانان دەڵێن: دروست نیە سڵاو بكەی لە خەڵكی نامسوڵمان، یان ئەگەر سڵاویان كرد دروست نیە وەڵامیان بدەیەوە، ئەوە وانیە، وە دواییش باسی دەكەین كە هیچ فەرموودەیەكی ڕاست (صحیح) لەوبارەوە نیە كە پێغەمبەر ﷺ بفەرمویّ: وەڵامی سڵاوی نامسوڵمان مەدەنەوە، یان تەنانەت دروست نیە سڵاویشیان لێبكەی!

**بابەتی سی‌و شەشەم**: لە ئایەتی (٨٧)دا خراوەتە ڕوو، كە بریتیە لە ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، واتە: هیچ پەرستراوی بە

هەق نین، ئەگەرنا دنیا پڕە لە پەرستراوی بە ناهەق، ئەوەتان لەبیرنەچێ كە دەفەرمویٌ: (لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ) یان (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهَ)، واتە: پەرستراوی بەهەق، پەرستراوێك كە شایستەبێ بپەرسترێ، تەنیا خوا (اللَّهَ)یە، بەڵام پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، پەرستراوی بە ناهەق: بتو صەنەمەكان، چ لە دارو بەرد داتاشرابن، چ لە هەواو ئارەزووەكان، چ ئینسانو طاغوتەكان، چ مانگو خۆر، هەموو ئەو شتانەی كە دەپەرسترێن كە زۆرزۆرن، بەڵام پەرستراوی بە هەق تەنیا یەكەو غەیری خوای بێ هاوتا، شایستەی پەرستران نیە، ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾، خوا ﷻ دەیخاتە ڕوو تەنیا ئەو پەرستراوە، دەشیخاتە ڕوو كە لە ڕۆژی دواییدا هەموومان كۆدەكاتەوە، وە دەفەرموێ: فەرمایشتی كێ لە هی خوا باشترە؟! واتە: خوا كە شتێكی فەرموو ڕێكو ڕاستەو خیلافی تێدانیە.

**بابەتی سیو حەوتەم**: لە ئایەتەكانی: (٨٨)و (٨٩)دا خوا ﷻ دەیخاتە ڕوو، ئەویش بریتیە لەوە كە خوای دادگەر سەرزەنشتی مسوڵمانان دەكات كە بۆچی لە مامەڵەكردن لەگەڵ مونافیقو دەغەڵەكاندا ڕاجیایی یان هەیە؟! پێویستە یەك قسەبن، یەك هەڵوێست بن لە مامەڵەكردن لەگەڵ مونافیقەكانو دڵنەخۆشەكاندا، ﴿فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ﴾، بۆچی لە بەرانبەر مونافیقەكاندا بوونەتە دوو دەستەو ڕاجیایی تان هەیە، جا ئەوە كە خوا دەیفەرموێ، ئێستاش هەر وایە، ئەوانەی دووربینو واقیع بین بن، مونافیقەكان دەناسن، بەڵام خەڵكی فەقیرو سادەو سەركێڵ نایانناسنو پێیان هەڵدەخەڵەتێنو، سەرەنجام ئەوانەی كە وردبینو دووربینن وەك خۆیان دەیانناسنو مامەڵەی وەك خۆیان لەگەڵدا دەكەن، خەڵكی دیكەش هەڵدەخەڵەتێو بە مسوڵمانو مرۆڤی باشیان لێ حاڵی دەبێ، وە سەرەنجام دەبنە دوو دەستە، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا سەرزەنشتی ئیمانداران دەكات، كە پێویستە چاوی خۆیان ورد بكەنەوەو وەك پێویست خەڵك بناسن، مسوڵمانو كافرو دۆستو دوژمن بناسن، وە چاكو خراپ وەك خۆیان بناسن.

**بابەتی سیو هەشتەم**: كە لە ئایەتەكانی: (٩٠و ٩١)دا خراوەتەڕوو، بریتیە لە چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ هاوپەیمانانو بێ لایەنان، وە كەسانی فێڵبازو بێ بەڵێندا، ئیمانداران لە مامەڵەو هەڵسوكەوتیاندا لەگەڵ نامسوڵمانانندا، جا نامسوڵمانان یان دەبنە كەسانێكی خاوەن پەیمانو پابەندن بە پەیمانیانەوە، یاخود كەسانێكی بێ لایەن (موحاید)ن، نە دۆستن نە دوژمن، نە پشتگیریی دەكەن نە دژایەتیی دەكەنو بێ لایەنن، یاخود خاوەن پەیمانن، بەڵام پابەند نینو لە هەر دەرفەتێك دەگەڕێن كە بیقۆزنەوەو زەربە لە مسوڵمانان بدەن، خوای شارەزا باسی چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ هەر كام لەو سێ جۆرە خەڵكە لە نا مسوڵمانان دەكات.

**بابەتی سیو نۆیەم**: لە ئایەتەكانی: (٩٢و ٩٣)دا خراوەتە ڕوو، كە بریتیە لە سزای قەتلی هەڵە، سزایەكەی چییە؟ واتە: كەسێك كەسێكی بە هەڵە لەدەست دەكوژرێ، پێویستە چی بكات؟ دەبێ خوێن بدا، وە دەبێ كەفارەت بدا، خوای بەخشەر باسی دەكات، وە هەروەها باسی سزای قەتلی بەئەنقەست (قتل العمد) دەكات، ئەویش تەنیا باسی سزا قیامەتییەكەی دەكاتو سزا دنیاییەكەی خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة)دا، وە لە چەند شوێنێكی دیكەشدا باسی كردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾البقرة، یان: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ... ﴾ المائدة.

**بابەتی چلەم**: لە ئایەتی ژمارە (٩٤)دا خراوەتە ڕوو، كە بریتیە لە قەدەغەكردنی بڕواداران لە بیانووگرتن بە خەڵك، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا .... ﴾، واتە: ئەی ئیماندارینە! ئەگەر بە ڕێ دا ڕۆیشتن، چاوی خۆتان وردبكەنەوەو كەسێك سڵاوی لێكردن هەر لەخۆوە بیانووی پێ

مەگـرنو بڵـێن: بڕواداراندیو بەڕاسـتی سـڵاو ناكەی، یاخود ئەگەر كەسێك ئێوەی هێمن كردەوەو ئاشـتی لەگـەڵ ئێوە پێشاندا، مەڵێن: ڕاست ناكەی تۆ هەر دوژمنیو ناحەزیو بیانووی پێ بگـرن! ئەوەش وەك دوایی باسی دەكەین بنچینەیەكی زۆر گەورەو گرنگی تێدایە بۆ ئیمانداران، كە لە ئاسـتی بەرزی ئیسلامی خۆیاندا بن، وە بە بیانوو نەبن لە خەڵك، وە تا یەقینیان پەیدا نەبێ، كە كەسێك دوژمنە، بە چاوی دوژمن تەماشای نەكەن، بەڵێ با وریایی خۆیان وەربگرن، بەڵام سەنگەر لە كەس نەگرن، لەسەر بناغەی بەرچاو ڕوونیی یەكی تەواونەبێ.

**<u>بابـەتی چـلو یەكـەم</u>:** لە ئایەتەكانی: (٩٥و ٩٦) خراوەتە ڕوو، كە بریتیە لە هاندانی بڕواداران بۆ جەنگو جیهاد، وە فیداكاریی لە پێناوی خواو دینی خوادا، وە پاشان باسی پاداشتی موجاهیدان، وە پلەو پایەی بەرزیان لە دوارۆژدا، دەكات،

**<u>بابـەتی چـلو دووەم</u>:** كە لە ئایەتەكانی: (٩٧و ٩٨ و٩٩)دا خراوەتە ڕوو، ئەوەیە كە خوا سەرزەنشتی ئەوانە دەكات كە ئامادەی كۆچكردنو جیهادكردن نین لە پێناوی خوادا، لە حاڵێكدا كە بۆشیان دەكرێ، بەڵام كەسانێك هەڵداوێرێو جیایان دەكاتەوە كە دەستەڵاتیان نیەو بێ چارەو بێ دەرەتانو ناتوانن كۆچ بكەنو جیهاد بكەن، خوای بەخشندە ئەوانە جیادەكاتەوەو دەفەرموێ: ئومێد وایە ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندابێو لێیان خۆشبێ، هەرچەندە كۆچیان نەكردوەو جەنگو جیهادیشیان نەكردوەو، لەژێر دەستی ئەهلی كوفردا ماونەتەوە، بە ناچاریی.

**<u>بابـەتی چـلو سـێیەم</u>:** لە ئایەتی (١٠٠)دا خراوەتە ڕوو، كە بریتیە لە بەڵێنو موژدەی باشی دنیاو قیامەت دان، بە كۆچكەرانی ڕێگای خوا، كەسانێك كە لە ڕێگای خوادا كۆچ دەكەن، خوا هەم موژدەی دنیایان پێ دەدات، وە هەم موژدەی قیامەتیشیان پێ دەدات، موژدەی دنیا، واتە: وا مەزانن بە كۆچ كردن لە پێناوی خواداو بەجێهێشتنی ماڵو حاڵو نیشتیمان، لە برسان

دەمرن، وە موژدەی دوارۆژیشیان پێ دەدات، کە پاداشتی گەورەیان هەیە، هەر کەسێك لە ماڵی خۆی بە نیەتی کۆچکردن هەنگاو بنێو بێتەدەر، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایەو خوای بە بەزەیی لێی دەبوورێ.

**بابەتی چلو چوارەم**: کە لە ئایەتەکانی: (١٠١و ١٠٢و ١٠٣و ١٠٤)دا، لەو چوار ئایەتەدا خراوەتەڕوو، بریتیە لە باسی نوێژ کورتکردنەوە، وە باسی نوێژی ترس، وە پاشان باسی پاراستنی نوێژەکان دەکات لەکاتی ئاسایی‌و هێمنیی دا، کە پێویستە لەکاتی ئاسایی‌و هێمنییدا، نوێژەکان وەك خۆیان جێبەجێ بکرێن، بەڵام لەکاتی سەفەرو ترس‌و لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا، ئەوە نوێژی ترس هەیەو، کورتکردنەوەی نوێژ هەیەو، کۆکردنەوە هەیە.

**بابەتی چلو پێنجەم**: کە لەم سوورەتەدا خراوەتەڕوو، بابەتێکی زۆر گرنگەو لەسەر ڕووداوێك هاتوە کە لە ئایەتی: (١٠٥ تاکو ١١٣) واتە: (٩) ئایەتی بۆ تەرخان کراون، ڕووداوەکەش ئەوەیە کە مونافیقێك دزیی دەکات‌و دوایی دزییەکەش بەسەر جوولەکەیەکی بێ خەتا دا دێنێ، وە کەس‌و کاری مونافیقەکە دەچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ‌و ئەو شتەش کە دزراوە لە ماڵی جوولەکەکەدا دەدۆزرێتەوە، کە دیارە مونافیقەکە بە ماڵە جووەکە دەڵێ: ئەو ئەمانەتەم بۆ هەڵگبرن، پێغەمبەریش ﷺ دیارە پەنهان (غیب) نازانێ‌و خەریك دەبێ کە جوولەکە بێ خەتایەکە حوکم بدات، بەڵام خوای دادگەرو بێ وێنە، لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە لەو کێشەیەدا تەدەخول دەکات‌و نۆ ئایەت بۆ دیفاع کردن لە جوولەکەیەکی بێ خەتا دەنێرێتە خوار، کە ئەوە وەك دوایی باسی دەکەین، شتێکی زۆر زۆر گەورەیەو عەدالەتی ئیسلام بە جوانترین شێوە تێیدا بەرجەستەیە، جا خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بە دادگەریی دادوەریی لە نێوانی خەڵکدا بکات، وە لە کاتی بە هەڵەداچووندا داوای لێ بوردن بکات، وە بگەڕێتەوە بۆ هەق، وە وریاشبێ خەڵکی فێڵبازو زمان لووس، هەڵینەخەڵەتێنن لەکاتی دادوەرییدا.

**بابەتی چل‌و شەشەم**: کە لە ئایەتەکانی: (١١٤و ١١٥) خراوەتەڕوو، خوا ﷻ باسی قەدەغەکردنی چپەچپ پێکەوە کردن، سرکە سرك دەکات، مەگەر بۆ کاری چاکە، بۆ وێنە: دوو نەفەر لەنێو کۆمەڵێکدا بە تەنیا جیابنەوە، ئەگەر بۆ کاری خێر بوو وەك: صوڵح‌و ئاشتەوایی، ئەوە قەیناکات، چپە چپیش بکەن، بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە نەبێ، چپەچپ پێکەوە کردن‌و سەر پێکەوەنان خراپە، جا چ لەنێو خەڵکێکدا بن، چ بە جیا جیا، وە ئەو ڕاستییەش ڕادەگەیەنێ، کە لادان لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، وە لە ڕێبازی ئیمانداران، سەرەنجامێکی یەکجار شوومی هەیە، لە دنیاو دوارۆژدا.

**بابەتی چل‌و حەوتەم**: خوا عزّ وجلّ لە ئایەتەکانی: (١١٦) تاکو (١٢١) دا خستوویەتە ڕوو، ئەویش باسی ئەوەیە کە خوا لە شیرك نابوورێ، دەگونجێ خوا هەموو گوناهێك ببوورێ، بێ ئەوەی کە خاوەنەکەشی تۆبەی لێ بکات، وە بە تۆبەکردنەوە، ئەوە مسۆگەر خوا لە هەموو گوناهێك دەبوورێ، بەڵام بە بێ تۆبەو گەڕانەوە، دەگونجێ خوا هەندێ کەس لە هەندێ گوناه ببەخشێ، بەڵام شیرك نا، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾، واتە: خوا لەوە نابوورێ شیرکی بۆ پەیدا بکرێ، بەڵام غەیری ئەوە هەر کەسێك بیەوێ لێی دەبوورێ، بەبێ ئەوەی کە تۆبە بکات، بەڵام کە تۆبەی کرد، هەر کەسێك تۆبەی ڕاست بکات، هەموو گوناهێکی دەبووردرێ، بە کوفرو شیرکیشەوە، وە پاشان خوا ﷻ باسی هەندێك لە هەڵوێست‌و بیروبۆچوونی هەڵەو ئەفسانەیی موشریکەکان دەکات.

**بابەتی چل‌و هەشتەم**: لە ئایەتەکانی: (١٢٣و ١٢٤و ١٢٥)دا خراوەتە ڕوو، خوای پەروەردگار باسی ئیمانداران دەکات، وە ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو کە سەنگی مەحەك چ بۆ ئیمانداران‌و مسوڵمانان، چ بۆ خاوەن کتێبەکان، چ بۆ هەر کەسێك، بریتییە لە کردەوەی باش، ئەمما لاف لێدان‌و دروشم‌و شیعار بەرزکردنەوەی بۆش‌و، قسەی بۆش‌وخۆش هیچ نیە!! بەڵکو کردەوەو پابەندیی‌و لەخۆدا بەرجەستەکردنی ئیمان‌و عەقیدە، ئا ئەوانە سەنگی مەحەکن.

**بابەتی چل و نۆیەم**: كە لە ئایەتی (١٢٦)دا خراوەتە ڕوو، خوا ﷻ ئەوە دەخاتە ڕوو كە خاوەنی هەموو شتێكە، وە دەوری هەموو شتێكی داوە، وە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیەو، هەرچی كەونو كائیناتە لە ژێر ڕكێفو قەڵەمڕەوی وی ﷻ دایە.

**بابەتی پەنجایەم**: لە ئایەتی (١٢٧)دا خراوەتەڕوو، كە باسی ئافرەتان دەكات بە گشتی، وە باسی كچانو كوڕانی هەتیو دەكات بە تایبەتی، كە پێویستە مسوڵمانان، واتە: كۆمەڵگاو دەوڵەتی مسوڵمانان، ئاگایان لێیان بێ، وە مافەكانیان پێشێل نەكەن، بەڵكو پشتگیریان بكەنو، سەرپەرشتییان بكەن.

**بابەتی پەنجاو یەكەم**: كە ئایەتەكانی: (١٢٨و ١٢٩و ١٣٠) باسیان كردوە، لەو سێ ئایەتەدا خوا ﷻ باسی چارەسەركردنی كێشەی نێوان ژنو مێرد دەكات لە كاتێكدا كێشەكە، لەلایەن مێردەوەیە، ئەوەی پێشێ كاتێك كێشە لەلایەنی ئافرەتەوە بوو باسی كرد، كە پیاو چۆن چارەسەری بكات؟ بەڵام ئەدی ئەگەر كێشەكە لەلایەن پیاوەكەوە بوو، ژن چۆن چارەسەری بكات؟ خوای دادگەر باسی ئەوە دەكات، وە باسی ئەوەش دەكات كە پێویستە پیاو، واتە: مێرد ئەگەر زیاتر لە هاوسەرێكی هەبوو لە نێوانیاندا دادگەریی ڕەچاو بكات، وە بە دادگەرانە ڕەفتار بكات، دیارە دادگەرییەك كە بۆ ئینسان دەگونجێو گونجاوە، بەڵام دادگەریی ڕەها (مُطْلَق)، دیارە كە تەنیا لای خوای پەروەردگارە، كە دوایی ئێمە باسی دەكەین، چونكە هەندێك لەوانەی كە دەیانەوێ چەند ژنیی كە خوای پەروەردگار ڕەوای كردوە، قەدەغە بكەن، هەوڵ دەدەن ئەم ئایەتەی سوورەتی (النساء)، واتە: ئایەتی ژمارە (١٢٦) لەگەڵ ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (النساء) تێك بگیرێنن، كە لەوێ خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ئەگەر ترستان هەبوو دادگەریی نەكەن، با یەك هاوسەرتان هەبێ، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾، واتە: ناتوانن دادگەریی لە نێوان ژناندا بكەن، هەرچەندە سووریش بن، جا دەڵێن: كەواتە: مادام ناتوانی دادگەریی بكەی، هەر

یەك ژن بێنە! بەڵام لەڕاستیدا ئەو دادگەرییەی كە لەوێ بە مەرج گیراوە، غەیری ئەوەیە كە لێرە نەفی كراوە، ئەوەی لەوێ بە مەرج گیراوە، ئەوەیە كە بۆ ئینسان دەگونجێ، كە بریتییە لە: دادگەریی لە شەو لەلا مانەوەداو، لە جێگاو ڕێگاو، لە بەرگو پۆشاكو لە نانو نەفەقەدا، بەڵام ئەوەی كە لێرە نەفی كراوە، بریتییە لە مەیلی دڵ، یانی كامەیانت خۆشتر دەوێ؟ كە ئەوەش لە توانای ئینساندا نیە، بۆیە ئینسان پێی پابەند (مُكَلَّف) نییە، وەك دوایی باسی دەكەین، هەروەها خوا ﷻ باسی ئەوەش دەكات، كە ئەگەر ئەو ژنو مێردە هەر پێكەوە نەسازان، دەتوانن لێك جیاببنەوە، وە خوای بەخشەر دەرووی خێر لە هەر كامێكیان دەكاتەوە.

**بابەتی پەنجاو دووەم**: لە ئایەتی ژمارە (١٣١) تاكو (١٣٤)دا خوا ﷻ چەند ڕاستییەك دەخاتەڕوو، لەوبارەوە كە خۆی خاوەنی هەموو شتێكە، وە بۆخۆی تواناداره بەسەر هەموو شتێكدا، وە ئاماژەش بەوە دەكات كە ئەی ئینسانەكان ! ئەگەر ڕاست بڕۆن، خوا پاداشتی هەیە بۆتانو، ئەگەر لاش بدەن، خوا سزاو جەزرەبەی هەیە.

**بابەتی پەنجاو سێیەم**: لە ئایەتی ژمارە (١٣٥)دا خراوەتە ڕوو، كە خوای كاربەجێ فەرمان دەكات بە ئیمانداران كە پابەندی دادگەریی بنو شایەدیی هەق بدەن، وە خۆیان لە لادانو شوێن هەواو ئارەزوو كەوتن، بپارێزن.

**بابەتی پەنجاو چوارەم**: لە ئایەتەكانی: (١٣٦و ١٣٧)دا خراوەتە ڕوو، كە خوا ﷻ فەرمان دەكات بە ئیمانداران، كە ئیمان بێنن، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ... ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن بە خواو پێغەمبەری خوا... هتد، یانی، چی؟ یانی: ئیمانتان هێناوە بە پلەیەك، بەڵام هەوڵبدەن پلەی ئیمانەكەتان بەرزتر بكەنەوە، ئیمانێكتان هێناوە، بەڵام هەوڵبدەن ئیمانەكە قووڵتر بكەنەوە، ئیمان پلە پلەیە، وەك چۆن كوفریش پلە پلەیە، بەرەو خوار، بەهەمان شێوە

ئیمانیش پلە پلـەیە بـەرەو سـەر، تۆ بـە ئیمـانێكی كـەم ڕازی مەبـەو هەوڵبـدە ئیمانەكەت قووڵتـر بكەی‌و كامڵتـری بكـەی، وە خـوا ﷻ هـەر لـەو دوو ئایـەتـە موبارەكەدا باسی سزای بێ بڕوایانیش دەكـات.

**بابــەتی پەنجــاو پێنجــەم**: لـە ئایـەتی (١٣٨) تـاكو (١٤٣) دەگرێتـە خـۆی، كـە پانتاییـەكی زۆرەو باسـی مونـافیق‌و دەغەڵـەكان دەكـات، وە چـۆنیەتی مامەڵـە لەگـەڵ كردنیـان، وە وریـابوون لـە فێـڵ‌و پیلانـەكانیان، وە باسـی هەنـدێك لـە سـیفەتەكانیان دەكـات، ئەگـەر سـەرنجتان دابـێ خـوا ﷻ لـە زۆر شـوێندا لـە قورئانـدا باسـی ئـەوە دەكـات كـە چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ مونافیقەكانـدا بكـرێ، مامەڵـەكردن لەگـەڵ مونـافیق‌و دوو ڕووو دەغەڵـەكان، زۆر وریـایی‌و وردەكـاریی دەوێ، بـۆ كـافران ئـەوە كـافر ئاشـكرایە یـان جەنگـت لەگــەڵ دەكـات، یـان ئاشـتییت لەگـەڵ دەكات، بەڵام مونافیـق ئەوەیـە لـە مـاڵی خـۆت دایــەو خـۆی بە دۆست پێشاندەدا، بـەڵام گورگـەو لـە پێـستی مـەڕێ دا، مـارەو هـەر بـەخۆت نـازانی پێتـەوە دەدات، جـا لـەم ئایەتانـەدا خـوای پـەنهانزان بـە درێـژیی باسـی مونافیقـەكان دەكات، وە هـەندێك لە سـیفەتەكانیان باس دەكـات.

**بابــەتی پەنجــاو شـەشــەم**: لـە ئایـەتی (١٤٤)دا خراوەتـە ڕوو، كـە بریتیـە لـە ئاگاداركردنــەوەی بـڕواداران لـەوەی كـە ئەگــەر دۆســتایەتیی كـافران بكـەن، بەڵگەی خـوا لەسـەر خۆیـان پەیدادەكەن، هـەر مـسوڵمانێكە كافران بـە دۆست بگرێ‌و خۆشی بـوێن‌و پـشتیان بگـرێ‌و، پـشتیان پـێ ببەسـتێ، ئـەوە بەڵگـەی خـوای لەسـەر خـۆی پەیـداكردوە، واتـە: خـوا بەڵـگەی لەسـەری هەیـە كـە ئیماندارنیـەو لایداوە، جا ئەگەر دۆسـتایەتییەكـەی بـە موتڵـەقیی بێ، ئـەوە بـە موتڵەقـیی لایـداوەو، ئەگـەر دۆستایەتییەكەی بەشێوەیەكی جـوزئیی بێ، ئـەوە بـە شـێوەیەكی جـوزئیی لایـداوەو گوناهبــارە، وەك دوایـی بـە درێژیــی باسـی دەكەین.

**بابــەتی پەنجــاو حەوتــەم**: لـەم سوورەتەدا لـە ئایەتـەكانی ژمـارە (١٤٥و ١٤٦)دا خراوەتـە ڕوو، كـە خـوا باسـی سـزای سـەختی مونافیــق‌و دەغەڵـەكان دەكـات،

مەگەر ئەوانەی کە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بۆ باوەشی ئیسلام، وە مەرجی وەرگیرانی تۆبەکەشیان دەخاتە ڕوو، کە چوار مەرجی سەرەکیین.

**بابەتی پەنجاو هەشتەم**: لە ئایەتی (١٤٧)دا خراوەتە ڕوو، کە بریتیە لە خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە خوا نایەوێ بەندەکانی سزا بدات، ئەگەر سوپاسگوزارو ئیماندار بن، خوا لە بەهانە نیە لە خەڵك، بەڵكو خوا لە بەهانەیە بۆ ئەوەی لێیان خۆشبێ، نەك لە بەهانەبێ بۆئەوەی سزایان بدات، کە بەڕاستی ئەم ئایەتە زۆر عاطیفەو هەستی ئینسان دەبزوێنێ خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمٗا ١٤٧ ﴾، واتە: خوا چی داوە لە ئازاردانی ئێوە، ئەگەر ئێوە سوپاسگوزارو ئیماندار بن، واتە: خوا چ ئیشێکی بە ئێوە هەیە کە سزاتان بدات، بەڵام ئەگەر سپڵەو ناسوپاس‌و بێبڕوابن، ئەوە کردەوەکەی خۆتانە دێتەوە ڕێتان، ئەگەرنا خوا پێی خۆش نیە کەس سزا بدات.

**بابەتی پەنجاو نۆیەم**: کە لە ئایەتەکانی (١٤٨و ١٤٩)دا، خوا خستوویەتە ڕوو، باسی ئەوە دەکات کە حەز ناکات قسەی خراپ لە کەس ببیستێ، بەڵام کەسێك کە ستەمی لێکرابێ‌و مەزڵووم بێ، دروستە کە مەزڵوومیەتییەکەی خۆی بەیان بکات، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلۡجَهۡرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ١٤٨ ﴾، واتە: خوا حەز ناکات کەس قسەی خراپ بکات‌و دەنگی پێ هەڵبڕێ، بەڵام کەسێك کە ستەمی لێ کرابێ قەیناکات، مەزڵووم وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً}، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٣٧٩)، والبُخَارِيُّ برقم: (٢٢٧١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣١٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: بێگومان خاوەنی هەق مەجالی قسەی هەیە، باسی هەقی خۆی دەکات لە لای دادوەر یان هاوار دەکات، مەجالی هەیە.

**بابـــەتی شـەســـتەم**: لـە ئایەتـەكانی: (١٥٠و ١٥١و ١٥٢)دا خراوەتـە ڕوو، كـە خـوا بەراوردی نێوان خـاوەن كـتێبەكانو مـسـوڵمانان دەكــات، لـە بــواری ئیمانیــان بە خـواو بە پێغەمبەرانـدا (علیهم الصلاة والسلام)، كە مـسوڵمانان ئیمـان بـە هـەموویان دێنن، بە پێچـەوانەی خاوەن كتێبەكـانەوە.

**بابـەتی شـەســـتو یەكـــەم**: كـە لـە ئایـــەتی (١٥٣) تـاكو (١٦٢) واتـە: دە ئایــەت دەگرێتــە خـۆی، باسـی جوولەكـەكان دەكـات، وە باسـی هەنـدێك لـە هەڵوێـستە خراپەكانیــان دەكـات بەگـشـتی، وە بـە تایبـەتی لـە بەرانبـەر عیـسا ﵇، وە دایكی (مەریەم)دا خوا لێی ڕازی بێ، وە باسی ئەوانەشیان دەكات كە چاكەكارن، باسی لاڕێو خراپەكانیان دەكات، بـەڵام باســی ڕاســتو چاكەكانیـشیان دەكـاتو هەڵـیان داوێرێ.

**بابـەتی شـــەســـتو دووەم**: لە ئایەتــەكانی (١٦٣) تاكو (١٦٦)دا، خوا باســی نـاردنی وەحـی خـۆی دەكــات بـۆ موحەممـەد ﷺ كۆتـا پێغــەمبەر، وە بـۆ ســەرجەم پێغــەمبەرانی دیكــە، هــەر لــە نووحــەوە هــەتا دوایــی، وە باســی حیكمــەتی نێـررانی پێغـەمبـەرانیش دەكات.

**بابـــەتی شـەســـتو ســـێیەم**: لـە ئایـــەتی ژمـــارە (١٦٧) تـا (١٦٩)دا، خـوا باسـی سـەرەنجامی شـوومیی كـافران دەكـات، لە دنیاو لە قیـامەتدا.

**بابـــەتی شـەسـتو چـوارەم**: لە ئایـەتی ژمارە (١٧٠)دا، خـوا ﷻ باسـی ئـەوە دەكات كـە بـانگی مرۆڤـایــەتیی دەكـات كـە ئیمـان بێـنن بـە موحەممـەد ﷺ، كـە پێغەمبـەری كۆتـایی خوایــە، بۆ هــەموو لایــەك.

**بابـــەتی شـەســـتو پێنجـەم**: لـە ئایـەتی ژمـارە (١٧١ تـاكو ١٧٣)دا، خـوا بانگــی نـەصـرانی یەكـان دەكاتو دەیاندوێنـێ، ئەوانەی كە خۆیـان بـە شـوێنكـەوتووی عیسـا ﵇ دەزانـن، وە سـەرزەنـشـتیان دەكــات لەسـەر ئـەوەی كە خـوا ﷻ بـە سـێ پەرسـتـراو دەزانو بڕوایان بە سـێكوچكــە (ثـالوث)ی: بـاب، ڕۆڵـە، گیـانی پیـرۆز (الآب، الأبن، الـرُّوحُ القُـدس) هەیــەو، ئامۆژگارییـان دەكــات كە ئیمـان

بە تەنیایی خوا، بێنن، وە ئیمان بەوە بێنن كە عیسا بەندەی خوایە، نەك كوڕی خوا، وە ئەوەشیان بۆ دەخاتە ڕوو، كە نەك عیسا عليه السلام بگرە فریشتە زۆر لە خوا نزیكەكانیش، كەس خۆی لەوە بە گەورەتر نازانێ كە بەندایەتیی بۆ خوا بكاتو، لە بەرانبەر خوادا سەر نەوی بكات، وە پاشان خوا ئەوە دەخاتە ڕوو كە ئەوانەی لە بەرانبەر خوادا خۆ بە زل دەگرن، سزای سەختیان هەیە، وە ئیماندارانیش پاداشتی مەزنیان هەیە.

**بابەتی شەستو شەشەم**: كە لە ئایەتەكانی: (١٧٤و ١٧٥)دا خراوەتەڕوو، جارێكی دیكە بانگی مرۆڤایەتیی دەكات، كە ئیمان بێنن بە قورئان، دەفەرمویْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤ ﴾، ئەی خەڵكینە! بەڵگەیەكتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتوە، ئیمانی پێ بێنن كە قورئانە، وە پاشان موژدەی دنیاو دواڕۆژیشیان پێدەدا.

**بابەتی شەستو حەوتەمو كۆتایی**: لە ئایەتی (١٧٦)ی كۆتاییدا، خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی میرات گرتنی بێ وەجاغ (كَلاَلَة) دەكات، (كَلاَلَة)، واتە: كەسێك كە نە ئەصڵی هەبێ، نە فەرعی هەبێ، نە بابو دایكو داپیرو باپیری هەبن، نە كوڕو ڕۆڵەو نەوەی هەبن، ئایا چۆن میراتی لێ دەگیرێ؟ خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەكات.

ئەمە نەخشەی بابەتەكانو نێوەڕۆكی سوورەتی (النساء)ە، كە خوا پشتیوان بێ لە دەرسەكانی داهاتوودا بە وردییو بە ڕوونی دێینە سەر تەفسیركردنی سەرجەم ئەو ئایەتە موبارەكانە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناســەی ئەم دەرســە

لەم دەرسەماندا ئایەتەكانی ژمارە (١) تاكو (١٠) لە سوورەتی (النساء)دا، تەفسیر دەكەین، واتە: دە (١٠) ئایەت، كە لەم دە ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن سەرەتا بانگی مرۆڤایەتیی دەكاتو فەرمانیان پێدەكات كە پارێزكاریی لە پەروەردگاریان بكەن، چونكە خوا ئەو پەروەردگارەیانە كە لە یەك نەفس هەموویانی دروست كردوە، وە هاوسەرەكەیشی هەر لە خۆی دروست كردوە، كە دیارە مەبەست پێیان (ئادەم)و (حەووا)ن، كەواتە: مرۆڤایەتیی هەموویان وەچەی بابو دایكێكن، هەموویان لە خێزانێكەوە وەپاش كەوتوون، ئنجا فەرمانیان پێ دەكات كە پەیوەندیی خزمایەتییان بپارێزن، وە ئاگاداریان دەكاتەوە كە خوا بەسەریانەوە چاودێرە، پاشان فەرمانیان پێ دەكات، كە ئاگاداری ماڵو سامانی هەتیوان بن بەگشتی، وە بەتایبەتی كچانی هەتیوو بێ باب، وە پێیان ڕادەگەیەنێ كە ئەگەر ترسیان هەبوو ئەگەر لەگەڵ كچانی هەتیودا هاوسەرگیرییان كرد، دادگەر نەبن، با لە ئافرەتانی دیكە بێنن، دووان بێنن، سێیان بێنن، چواران بێنن، بۆیان هەیە بەمەرجێك كە لە خۆیان ڕا ببینن كە دادگەر دەبن لەگەڵ هاوسەرەكانیاندا، وە ئەگەر مەترسییان هەبوو كە ناتوانن دادگەریی بكەن، با بە یەكێك قەناعەت بكەن، هەروەها لە ئافرەتانی كەنیزەك بۆیان هەیە بێنن، ئنجا باسی مارەیی دان بە ژنان دەكات، كە وەك خەڵاتێك پێویستە مارەیی یان پێ بدرێ، دوایی باسی دەست پێوەگرتنی ماڵو سامانێك دەكات كە هی كەسانێكی نەفامە، كەسانێك كە ناشێن، نابێ سامانەكەیانیان تەسلیمیان بكرێ، وە فەرمانیان پێ دەكات كە ئەو كەسانەی نەفامو ناشێنو نەزانن، جا چ لەبەر كەمیی تەمەن، چ لەبەر هەر هۆیەك بێ، پێویستە ڕایانبێننو فێریان بكەن، ئنجا دوایی ئەگەر هەستیان كرد كە

شارەزاو چاوکراوەن، ئەوکاتە ماڵەکانیان تەسلیم بکەن، دوای ئەوەی کە شایەدیان لێدەگرن، ئنجا باسی یەکسانیی پیاوانو ئافرەتان دەکات، چ ورد بن، چ درشت بن، لە میرات گرتندا، ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە هەر کاتێك هەتیوانو خزمانو خەڵکی نەدار ئامادەی دابەشکردنی میرات بوون، پێویستە بەشیان لێی بدرێ، وە قسەی باشیان لەگەڵدا بکرێو دڵیان خۆش بکرێ، وە پاشان لە کۆتاییدا ئەوە دەخاتە بەرچاوی وەصیەتکەر، یاخود ئامادەبووانی دابەشکردنی میرات، کە چییان بۆ منداڵی بەجێماوی خۆیان پێ باشە، ئەوەش بۆ منداڵی خەڵکی دیکە لەبەر چاوبگرن، وە هەڕەشەیەکی گەورە لەو کەسانە دەکات کە ماڵی هەتیوان بە ناهەق دەخۆن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ وَءَاتُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰٓ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلۡخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبٗا كَبِيرٗا ٢ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تُقۡسِطُواْ فِي ٱلۡيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ٣ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ فَإِن طِبۡنَ لَكُمۡ عَن شَيۡءٖ مِّنۡهُ نَفۡسٗا فَكُلُوهُ هَنِيٓـٔٗا مَّرِيٓـٔٗا ٤ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ٥ وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡۖ وَلَا تَأۡكُلُوهَآ إِسۡرَافٗا وَبِدَارًا أَن يَكۡبَرُواْۚ وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ

فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ
وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا
مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم
مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً
ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ
أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ ﴾

## مانای وشــە بە وشــەی ئایەتەکــان

((بــە نــاوی خــوای بەبــەزەیی بەخــشــندە، ئــەی خەڵــکینە! پــارێز لــەو پەروەردگارەتان بکەن کە لە یەك نەفس دروستی کردوونو هاوسەرەکەیشی هەر لە خـۆی دروسـتکردوە، وە پیـاوانو ئافرەتـانێکی زۆری لـەو دووانـە (پەیـداکردوەو) بڵاوکردۆتەوە، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە داوای (شتی) پێ لە یەکدی دەکەن، وە لـە پـچڕاندنی پەیوەندییـەکانی خزمایـەتیی (خۆتـان بپـارێزن) ، بێگومـان خـوا بەسەرتانەوە چاودێرە ﴿١﴾ وە ماڵو سامانەکانی هەتیوان بدەن بـە خۆیـانو، پـیس بە پاك مەگۆڕن (خراپی خۆتان بـە چاکی ئـەوان مـەگۆڕن)، وە مـاڵی ئـەوان لەگـەڵ هـی خۆتـان مـەخۆن، بـە ڕاسـتیی ئـەوە گونـاهێکی زلـە ﴿٢﴾ وە ئەگـەر مەترسـیی ئـەوەتان هـەبوو کـە ئەگـەر ئافرەتـانی هـەتیو بـە هاوسـەر بگـرن لەگـەڵیان دادگـەر نەبن، (واز لەوان بێنـن)و لـە ئافرەتـانی حـەڵاڵ وشیاو بۆتـان دوو دووو سـێ سـێو چوار چوار مارە بکەن، جا ئەگەر ترسان کە دادگەر نـەبن (لـەنێوانیان دا) ئـەوە بـا هـەر یـەکێك (هاوسـەر)تـان بـێ، یـان ئـەو (کـەنیزەك)انـەی کـە خاوەنیـانن، ئـەوە

نیزیکتــرە لــەوە کــە لانــەدەن (و تووشــی ســتەم نــەبن)﴿٣﴾ وە مــارەیی یــەکان، وەك دیارییــەك بــە ژنــان بــدەن، جــا ئەگــەر خۆیــان بــە پێخۆشــبوونەوە شــتێکیان لــەو (مارەیی)ە پێدان، ئەوە بە حــەڵاڵو زەڵاڵــیی بیخۆن ﴿٤﴾ وە ئــەو ماڵو سامانەتان کــە خــوا گێڕاویــەتی بــە مایــەی ڕاوەســتانتانو بەڕێوەچوونتان تەســلیمی نــەفامو ناشـێیەکانی مەکەن، بەڵام لەو ماڵو سامانەیاندا بژیوو پۆشـاکیان بۆ دابین بکـەنو، قسەی پەسندو باشیان لەگەڵ بکەن (تـاکو وانـەزانن لێتـان زەوت کـردوون) ﴿٥﴾ وە منـداڵانی هـەتیو تاقیبکەنــەوە (و ڕایانــبهــێنن)، جـا هـەرکات باڵـغ بـوون، ئەگـەر سـەرڕاستییو شارەزاییتان تێیاندا هەست پێکرد، سامانەکانیان بدەنـەوە، وە نەچـن زێـدەڕۆیی کەرانــەو بــە پەلەپــەل پــێش گــەورەبوونیان بیخـۆن! وە هــەر کەســێك دەوڵەمەنـد بـوو، بـا خـۆی لـێ بپـارێزێو، ئـەوەی هـەژاریش بـوو بـا بەشـێوەیەکی پەسندو باش بخوات، وە هـەرکات ماڵـەکانتان وێدانـەوە، شایەدیان لێبگـرنو خـواش بەسـە بـۆ لێپرسـینەوە ﴿٦﴾ پیـاوان بەشـی خۆیـان هەیـە لـەوەی کـە بـابو دایـكو خزمان (بەمیـرات) بەجێی دەهێڵـنو، ئافرەتـانیش بەشـی خۆیانیـان هەیـە، چ کـەم بـێ چ زۆر، ئــەوە بەشــێکی پێویســت کــراوە ﴿٧﴾ وە هــەرکات خزمــانو هــەتیوانو نــەداران، ئامـادەی دابەشـکردن (ی میــرات)ەکـە بـوون، ئــەوە شــتێکیان لــەو میــراتە بــەش بــدەنو قــسەیەکی باشیــشیان لەگــەڵ بکــەن ﴿٨﴾ وە بــا کەســانێك کــە ئەگــەر منــداڵی (گــچکەو) بێهێزیــان لــە پــاش خۆیــان بەجێهێــشتبایە (خــەمیان لــێ دەخواردنو) مەترسییان لێیان دەبوو با (لە خوا) بتـرسنو قسەی ڕێکو ڕاست بکـەن (کە زیـانی منـداڵانی هەتیوکەوتـەی نـەبێ) ﴿٩﴾ بێگومـان ئەوانـەی بـە سـتەم مـاڵی هـەتیوان دەخـۆن، تـەنیا ئاگــر لـە ورگــی خۆیـان دەئـاخنن، وە لەمــەودوا (لـە دوا ڕۆژدا) لە کڵپەی ئاگردا دەبرژێنرێن ﴿١٠﴾)).

## شـیكردنــەوەی هــەندێـك لە وشـــەكان

( بَثَّ ): واتـه: بـڵاوی كـردەوە، (أَصْلُ البَـثِّ: التَفـرِيـقُ وَإِثَـارَةُ الـشَيءِ كَبَـثِّ الـرِيحِ التُّـرَابُ)، وشــەی (بَــثّ) لــە بنەڕەتــدا، واتــە: بڵاوكردنــەوە، وە شــتێك كــە بپرژێنی، وەك ئەوە كە با گـڵ‌و خـۆڵ دەپرژێنی‌و بڵاوی دەكاتەوە.

(تَسَآءَلُونَ): لە بنــەڕەتدا (تَتَسَاءَلُونَ)یە، واتە: داوای شـتی پێ لە یەكدی دەكەن لـە نێـو خۆتانـداو (تَـسَـاءَلْتُمْ) داوا لەیەكـدی دەكـەن، (تَـساءَلُوا: سَـأَلَ بَعْـضُهُمْ بَعْضَـاً)، واتە: هەندێكیان پرسیار یاخود داوایان لە هەندێكیان كرد.

(وَٱلْأَرْحَامَ): (جَمْـعُ رَحِـمٍ، رَحِـمُ الـمَرأَةِ، وَمِنْـهُ اسـتُعِيرَ الـرَّحِمُ لِلْقَرَابـةِ، لِكَـوْنِهِمْ خَارِجِيـنَ مِـنْ رَحِـمٍ وَاحِـدَةٍ)، (أَرْحَـام) كـۆی (رَحِـم)ە، (رَحِـم) واتــە: منداڵـدان، منداڵـدانی ئـافرەت، وە ئــەم وشــەیە خوازراوەتــەوە بــۆ خزمایــەتیی، چــونكە خزمەكان هەموویان لە منداڵدانی ئافرەتێكەوە دێن، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە.

وە وشـــــەی (أرْحَــام)، واتـــە: خزمـــان، وشـــــەیەكە بـــەكاردەهێنرێ بـــۆ خزمایەتیـی، وە بۆ كـۆی خزمان.

(رَقِيبًا) واتـە: چـاودێر، (الرَّقِيـبُ: الحَـافِظُ) واتـە: پـارێزەر، چـاودێر، كەسـێك كـە چاودێریی شتێك بكات دیارە دەیپارێزێ، ئـەویش لەچـی یـەوە هاتوە؟ (وَذلِكَ إِمَّا لِمُرَاعَـاتِهِ رَقَبَـةِ الـمَحفوظِ، وَإِمَّا لِرَفْعِهِ رَقَبَتَهُ) بۆچی بـە پـارێزەر گـوتراوە (رَقِيـب)؟ دەڵـێ: لەبــەر ئــەوە كــە چـاودێریی گــەردنی ئــەو كەســە دەكـات كــە دەیپارێزێ، یاخود بۆ خۆی ئەستۆ هەڵدێنی‌و مل هەڵـدێنێ كە تەماشای بكات.

(وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ): واتـە: هـی خـراپ بـە هـی چــاك مـەگـۆڕن، دەڵـێ: (الإِبْـدَالُ وَالـتَّبْـدِيلُ والتَّبَـدُّلُ والإِستبدَالُ: جعلُ شَـيءٍ مَكَانَ آخَـر)، ئـەو چـوار وشەیە هـەموویان بە مانای ئەوەن كە شـتێك لە شـوێنی شتێك دابنێـی، (وَهُوَ

أَعَمٌّ مِنَ العِوَضِ الَّذِي هُوَ أنْ يَصِيرَ لَكَ الثاني بإِعطَاءِ الأوَّل)، (عِوَض) واتە: قەرەبووكردنەوە، ئەوەیە كە تۆ شتێك بدەیو شتێكی دیكە بێنیە جێی، بەڵام گۆڕین گشتی ترە لەوە.

(**حُوبًا** ): (الحُوبُ: الإثْمُ، وَالْحَوْبُ المَصْدَرُ مِنْهُ)، (حُوبْ): واتە: گوناح، (حَوْب) چاوگی ئەوەیە، دەگوترێ: (حَابَ يَحُوبُ حُوبَاً وَحَوْباً)، واتە: (حُوب) ناوە، (حَوْب)یش چاوگە.

(**مَا طَابَ لَكُم** ) واتە: ئەوەی كە پێتان خۆشەو حەزی لێ دەكەن، (الطَّيِّبِ: مَا تَسْتَلِذُّهُ الْحَوَاسُ ومَا تَسْتَلِذهُ النَّفْسُ، وَطَعَامُ طَيِّبُ فِي الشَّرْعِ مَا كَانَ مُتَنَاوَلاً مِن حَيْثُ مايَجوزُ وَمِنَ الْمَكَان الذِي لايَجوز)، وشەی (طَيِّب) لە زمانی عەرەبیدا، وە لە بەكارهێنانی قورئاندا، واتە: شتێك كە هەستەوەرەكان چێژی لێ وەردەگرن، وە نەفس چێژی لێ وەردەگرێ، دەگوترێ: خواردنێكی (طَيِّب) واتە: ئەو خواردنەی كە ڕەوایە بەكاربهێنرێ، وە لەو شوێنەوە كە دروستە بەكاربهێنرێ، بەكاردەهێنرێ.

وشەی (طَيِّب) هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن، یانی: حەڵاڵ، بەڵام لەڕاستیدا وشەی (طَيِّب) ئەوەیە كە باسم كرد، واتە: ئەوە كە ئینسان چێژی لێ وەردەگرێو بەسوودەو بە كەڵكەو خۆشەو بەتامە، جا ئەگەر دەنگ بێ، واتە: دەنگێكی خۆش، ئەگەر ڕەنگ بێ، واتە: ڕەنگێكی جوان، ئەگەر خواردن بێ خواردنێكی خۆش، ئەگەر ئافرەت بێ، واتە: ئافرەتێك كە دڵت پێی دادەچێ، ئەگەر پیاو بێ، واتە: پیاوێك كە ئافرەتەكە دڵی پێی دادەچێ، ئەگەر زەوی بێ واتە: زەوییەكی بەپێز.. هتد، كەواتە: وشەی (طَيِّب) بەمانای حەڵاڵ نیە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ... ﴿١٥٧﴾ ﴾الأعراف، واتە: خوا (طَيِّبَات)یان بۆ حەڵاڵ دەكات، جا ئەگەر (طَيِّبَات) بەمانای حەڵاڵ بێ، واتە: حەڵاڵیان بۆ حەڵاڵ دەكات! ئەوەش (تَحصيل)ی (حاصل)ە، كەواتە: نا، بەڵكو (طَيِّب) یانی: شتی چاكو بەتامو بەسوود بەكەڵك.

جـا لـێرەدا (مَـا طَـابَ لَكُـم) واتـە: ئـەو ئافرەتانـەی کـە حـەزتان لێیانـەو کەیفتان پێیان دێ، وە دیارە کە هیچ کەس هاوسەرگیـریی لەگەڵ کـەس ناکات، ئەگەر کەیفی پێی نەیەتو حەزی لـێی نەبێ.

(مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ) لە زمانی عەرەبیدا (مَثْنَى)، واتە: (اثـنَـتَينِ اثـنَـتَينِ)، یـان (اثـنَـينِ اثـنـينِ) دوو دوو، (ثَـلاَث)، واتـە: (ثَلاَثـةً ثَلاَثـةً) سـێ سـێ، (رُبَـاع)، واتـە: (أَرْبَعَـةً أَرْبَعَـةً) چوار چوار، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، واتە: دوو دوو بێـنن، سـێ سـێ بێـنن، چوار چوار بێـنن، واتـە: ئـەوەی کـە دەتوانـێ دووان بێنـی، یـەکی دیکـە دەتوانـێ سـێ یـان بێنـێ، هەیـە دەتوانـێ چـواران بێنـێ، نـەك کـۆی ئـەو دووو سـێو چـوارە، ئەوەنـا، واتـە: هـەمووتان دەتـوانن بەمـەرجی دادگـەریی، وە بەمـەرجی توانـا هـەبوون کـە هـاوسـەرگیـریی لەگـەڵ دوو ئافـرەتـدا بکـەن، وە هـاوسـەرگیـریی لەگـەڵ سـێ ئافـرەتـدا بکـەن، یاخـود لەگەڵ چـواردا بکـەن، دیـارە دوایـی زیـاتر شی دەکەینـەوە.

(أَلَّا تَعُولُواْ): (العَـوْلُ: تَرْكُ النَّصَـفَةِ بِأَخْـذِ الزِيَادَةِ)، (عَـوْل): بریتیە لـەوە، کـە واز لە نێوەڕاسـت بێنـیو بـەرەو زیادە بچی، کـە دەفەرموێ: (أَلاّ تَعُولُـوا)، واتـە: بۆئـەوەی کە لانەدەنو زێدەڕۆیی نەکـەن.

(صَدُقَٰتِهِنَّ): (جَمْعُ صَدُقَة، وَهِيَ الصِّدَاقُ والمَهْر)، (صَدُقَات) کـۆی (صَـدُقَة)یـە، کـە بـە مانـای مـارەیی دێ، کـە (صِـداق)یـشی پـێ دەگـوترێ، (مَهْـر)یـشی پـێدەگوترێ، ئـەو مـاڵو پارەیـەی مێـرد دەیـدات بـە ئافرەتێـك کـە نیکـاحی دەکاتو هاوسـەرگیـریی لەگەڵ دەکـات.

(نِحۡلَةً): (النُّحْـلَـةُ والنِّحْلَـةُ: وَهُوَ عَطِيَّةٌ عَلَى سَبِيلِ التَّبَرُّعِ، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الـهِبَةِ)، (نُحْلَة) و (نِحْلَـة): بریتیە لە بەخشـینێك کە ئینسان بێ بەرانبەر بیبەخشـێ، وە تایبەتـترە لە بەخشین، واتـە: ئـەو مارەییـەی کـە پیـاو دەیـدات بـە ئـافرەت، پێویسـتە بێ هیچ بەرانبـەرێك بیداتـێ، وەك خـەڵاتو دیارییەك.

(هَنِيٓـًٔا): (الـهَنِيءُ: كُـلُّ مَـالاَ يَلْحَـقُ فيـهِ مَـشَـقَّـةٌ، وَلاَ يَعْـقُـبُ وَخَـامَـةً...)، (هَنِيء) هـەر شـتێکە کـە ئینـسـان بـە خواردنیـەوە، یـاخود بەوەدەسـت هێنانیـەوە، زەحمەتی نەبێ، وە سـەرەنجامی خراپ نەبـێ.

(مَّرِيٓـًٔا): (مَـرَؤَ الطَّعَـامُ وَأَمْـرأَ: إِذَا طَـابَ وَسَـاغَ و نـزل فـي الـحَلْق بـسهُولَة)، (مَـرُؤَ الطَعامُ) واته: خواردنەکەی بەئاسانی لە گـەروو چووە خوار، مـن بـەوە لـێکم داوەتەوە (هَنِيئَاً مَرِيئَاً) واتـە: حـەڵاڵو زەڵاڵ.

(ٱلسُّفَهَآءَ): (سُفَهَاء) کۆی (سَفِيه)ە، (سَـفِيه) لە کوردیدا پێی دەڵێن: گـێل، نەفام، نەشـارەزا، نەکامـڵ، لە زمانی عەرەبیش: (السَّـفَهُ: خِفَّـةٌ فِي البَـدَنِ، وَاسْـتُعْمِلَ فـي خِفَّـةِ الـنَّفْسِ لِنُقْـصَانِ العَقْـلِ)، وشـەی: (سَـفَه) لـە ئەسـڵدا کەسـێك کـە بـەدەنی سـووك بـێ، بـەڵام دوایـی بەکـارهێنراوە بـۆ سـووکیی ڕووح، لـە حاڵێکدا کە مرۆڤ عەقڵەکەی کرچو کـاڵ بێو نەفـام بێ.

(قِيَٰمًا): (أي جَعَلَهَـا مِمَّـا يُمسِـككُم، وَالقِيَـامُ وَالقِـوَامُ: اسْـمٌ لِمَـا يَقُـومُ بِـهِ الـشَـيءُ: أي يَثْبُـتُ كَالعِمَـادِ وَالـسِّنَادِ لِمَـا يُعْمَـدُ ويُـسْـنَدُ بِـهِ)، (قِيَامَـاً) واتـە: وای لـە مـاڵو سـامان کـردوە کـە بتـانگرێ، ڕاتـان بووەسـتێنێو پێـی بـچەسـپـن، وەك وشەی: (عِمَـادُ وسِـنَاد) شـتێك کە پـاڵی وێـدەدرێو پشـتی وێـدەدرێ.

(رُشْدًا): (الرَّشَـدُ وَالـرُّشْـدُ خِـلاَفُ الغَـيِّ، ويُـسـتَعَمَلُ اسـتِعْمَالان: يُقَـالُ: رَشَـدَ يَرْشُـدُ، ورَشِـدَ يَرْشَـدُ)، (رَشَـد و رُشْـدْ)، پێـچـەوانەی (غَـيِّ)ە، وشـەی (غَـيِّ)، واتـە: سـەرلـێـشـێوانو ڕێ لـێتێکـچوون، کەواتـە: (رَشَـدْ و رُشْـد)، واتـە: سەرڕاسـتیو شـارەزاییو بەرچاوڕوونیـی.

(وَبِدَارًا): (أي: مُسَـارَعَةً، يُقَالُ: بَدَرْتُ إِلَيْهِ بـادَرْتُ، ويُقَـالُ: عَنِ الـخَطَأَ الَّذِي يَقَـعُ عَن حِـدَّةٍ: بَـادِرَة)، وشـەی (بِـدارا)، واتـە: خێـرایی کـردن، دەگـوترێ: (بَـدَرْتُ إِلَـيْهِ بَـادَرْتُ)، واتـە: دەسـتپێـشـخەرییم بـۆ کـرد، وە قـسەیەك بـە هەڵـە لـە

ئینسان ڕوودەدا، یاخود ڕەفتارێك، پێی دەگوترێ: (بادرة) کە لە ئەنجامی تووڕەییدا ئینسان قسەیەکی لە دەم دەردەچێ، پێی دەگوترێ: (بادرة) چونکە بەپەلە قسەکەی کردوە بۆی نەگەڕاوەتەوە.

(فَلْيَسْتَعْفِفْ ): واتە: با خۆی پاك ڕابگرێ، کە لێرەدا مەبەست پێی، واتە: خۆی دووربگرێ لە خواردنی ماڵی حەرام، (العِفَّةُ: حُصولُ حَالَةٍ لِلنَّفْسِ تَمْتَنِعُ بِهَا عَنْ غَلَبَةِ الشَّهْوَةِ)، (عِفَّة) ئاوا پێناسەکراوە: بریتیە لە حاڵەتێك کە بۆ نەفس دروست دەبێ‌و ئینسان بە هۆیەوە بەسەر ئارەزووی خۆی زاڵ دەبێ‌و، لێناگەڕێ لە سنووری عەقڵ‌و شەرع بیباتە دەرێ.

(نَصِيبٌ ): (الحَظُّ المَنْصُوبُ، أَي المُعَيَّنُ)، (نَصِيب) بریتیە لە بەشێکی دیاریکراو.

(مَّفْرُوضًا ): واتە: بە پێویست دانراو، (الفَرْضُ: قَطْعُ الشَيءِ الصَّلْب والتأثير فِيهِ، وَمَفْروضاً أي: مَعْلُوماً)، (مَفْروض)، واتە: شتێك کە دیاریکراوە، چونکە وشەی (فَرَضَ) یانی (قَطَعَ) لە زمانی عەرەبی دا، شتێکی ڕەق کە بیبڕی‌و کاری تێ بکەی، وە (مَفروض) واتە: زانراو، دیاریکراو.

(سَدِيدًا ): (السَّدادُ وَالسَّدَدُ: الإِستِقَامَةُ، وَالسِّدَادُ مايُسَدُّ بِهِ الثُّلْمَةُ والثّغْرُ) هەردوو وشەی (سَدَادُ)و (سَدَد) لە زمانی عەرەبی دا، واتە: ڕاست ڕاوەستان، وە (سِدَاد) شتێکە کە کونێکی پێ دەگیرێ، کەلێنێکی پێ دەگیرێ، یاخود دەکرێتە سەر بۆ شتێك.

(وَسَيَصْلَوْنَ ): واتە: دەخرێنە نێو ئاگر، بەڵام بە شێوەیەك کە بەهەر چوار دەوریدا ئاگرەکە بیانگرێتەوە، کە لە کوردیدا پێی دەگوترێ: برژان، (أَصْلُ الصَّلْي: الإِيقادُ بالنَّارِ، وَصَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُهَا)، ئەسڵی وشەی (صَلِي)، واتە: ئاگری بدەیە بەری‌و بیسووتێنی، (وَصَلَيْتُ الشَاة) واتە: مەڕەکەم برژاند، پێی دەگوترێ (صَلِي).

(سَعِيرًا): (السَّعْرُ: إلتِهَابُ النَّار) كە ئاگر بڵێسەكەی بەرزدەبێتەوە، وە پێی دەگوترێ: (سَعير)، وە (سَعير)یش، واتە: بڵێسەی ئاگر (وقَدْ سَعَّرْتُهَا وَسَعَرْتُها، وأَسْعَرْتها) لە زمانی عەرەبی دا هەرسێكیان بە مانای ئاگرەكەم بڵێسە پێدا، دێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ ﴾: {عَن عُروَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ ﴾، فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي! هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا تَشْرَكُهُ فِي مَالِهِ وَيُعْجِبُهُ مَالُهَا، وَجمَالُهَا فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا عَنْ أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ، إلاّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا لَهُنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ فِي الصَّدَاقِ فَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنْ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ، قَالَ: عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ: وَإِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُول اللَّهِ ﷺ بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ﴾، قَالَتْ: عَائِشَةُ: وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى فِي آيَةٍ أُخْرَى: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾ ﴾، رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، قَالَتْ: فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا عَنْ مَنْ رَغِبُوا فِي مَالِهِ وَجَمَالِهِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ إلاّ بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ إذَا كُنَّ قَلِيلاَتِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ} (أخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٢٩٨) وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٧٤٤٤)، أَبُو داوُد بِرقم: (٢٠٦٨)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٣٤٦) وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٠٧٣)، غَيْرُهُم)، واتە: عوروەی كوڕی زوبێر كە (خوشكە زای عائیشەیە، دایكی عوروە ئەسمایە) لە پووری دەپرسێ (واتە: عائیشە) دەربارەی ئەم فەرموودەیەی خوا كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ ﴾، ئەویش دەڵێ: ئەی

خوشکەزام! ئەم ئایەتە دەربارەی کچێکی هەتیو کە لەژێر سایەی سەرپەرشتیارێکدا دەبێ، وە لە ماڵو سامانی خۆیدا بەشداری دەکات، وە ئەو پیاوەش سەرسام دەبێ بە سەروەتو ماڵەکەی، وە بە جوانیەکەیو دەیەوێ بیهێنێو مارەی بکات، بێئەوەی بە شێوەیەکی دادگەرانە مارەییەکی وەك مارەیی ئافرەتانی دیکەی بداتێ، خوا نەهی لێکردن کە ئەو جۆرە ئافرەتانە بێنن، مەگەر مارەیی تەواویان بدەنێ، وە بەشێوەیەکی دادگەرانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وە فەرمانیان پێکرا کە لە ئافرەتانی دیکە بێنن، ئەوانەی کە بەدڵیانن، وە هەروەها خەڵك پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، دوای ئەم ئایەتە ئەوەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾، دەربارەی ئافرەتان پرسیارت لێ دەکەن، عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: خوا ئەم ئایەتەی دیکەی نارده خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴿١٢٧﴾﴾ النساء، واتە: ڕەغبەتتان لێ نیە کە بیانهێنن، ئەو سەرپەرشتەی کە بەخێوی کردووە پێی دەشێ، ڕەغبەتی لێ نیە کە بیهێنێ، لەبەرئەوەی کە ماڵو سامانی نیەو جوان نیە، جا لێیان قەدەغەکرا ئەوەش کە ماڵو سامانی هەیەو جوانییەکەیان بە دڵە، قەدەغەکرا کە ئەوانیش بێنن، مەگەر مارەیی تەواویان بدەنێ، وە لەگەڵیاندا دادگەربن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە کاتێکدا ماڵیان نیەو جوان نین، دڵیان بۆیان ناچێو نایانهێنن.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾﴾: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَةَ لاَ يُوَرِّثُونَ البَنَاتِ وَلاَ الصِّغَارَ حَتَّى يُدرِكُوا، فَمَاتَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُ: (أوس بن ثابت) وَتَرَكَ ابْنَتَيْنِ وَابنَاً صَغِيراً، فَجَاءَ ابنا عَمِّهِ وَهُمَا عَصَبَتُهُ إلى رَسُول اللَّهِ ﷺ فَأَخَذوا مِيْرَاثه كُلّه فجاءت امْرَأَتُهُ إلى رَسُولِ اللّه ﷺ فَنَزَلَتِ الآية فَأَرْسَلَ إِلَيْهما رَسُولُ اللَّه ﷺ فَقَال: «لاَ تُحَرِّكَا مِن المِيرَاثِ شَيْئَاً فإِنَّهُ

قَدَ أَنْزَلَ عَلَيَّ شَيء، احترتُ فيه، إن لِلْذَكرِ وَالآنثى نَصِيباً﴾ ثُمَّ نَزَلَ بَعْدَ ذَلِكَ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾، ثُمَّ نَزَلَ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ﴾، فَدَعى بِالمِيرَاث فَأعطى المَرأةَ الثُّمُنَ، وقَسَم مَابَقِيَ لِلْذَكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأنثَيَينِ} [1] ، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لەسەردەمی نەفامییدا خەڵك عادەتیان وابوو میراتیان نەدەدا بە کچان و بە منداڵان (واتە: کوڕبان، یان کچ بان) هەتاکو باڵغ دەبوون، ئنجا پیاوێك لە ئەنصاڕیی یەکان وەفاتی کرد، ناوی ئەوسی کوڕی سابیت بوو، وە دوو کچ و کوڕێکی لەدوا بوون، دوو کوڕە مامی هەبوون (واتە: دوو ئامۆزای هەبوون) کە عەصەبەی بوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ میراتەکەیان هەموو برد، خێزانی پیاوە مردووەکە (واتە: خێزانی ئەوسی کوڕی سابیت) هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد، کە من دوو کچ و کوڕێکم لەو پیاوە هەن، هیچیش نەماوە هەموو میراتەکەی دوو ئامۆزایەکەی بردوویانە؟! خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوار بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: میراتەکە دەستکاریی مەکەن، چونکە خوا شتێکی بۆ ناردوومە خوار دەربارەی شتێك، کە من نەمدەزانی حوکمەکەی چییە؟! خوا بەشی نێرو مێی داناوە (واتە: بەشی کوڕو کچی داناوە) گەورەبن یان گچکەبن، ئنجا دوای ئەوەش ئەم ئایەتەش هاتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾، دوایی ئەم ئایەتەی دیکە، کە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ﴾، خوا دەربارەی منداڵەکان ئامۆژگارییتان دەکات، کە بۆ کوڕ دوو ئەوەندەی کچ هەیە، ئیدی پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد میراتەکەیان هێناو دابەشی کرد، هەشت یەکی دا بە ئافرەتەکە، وە ئەوەی دیکەشی لەنێوانی کوڕەکەو دوو کچەکەدا دابەش کرد، وە دوو ئامۆزایەکەی کابرا، هیچ میراتیان نەبرد.

---

١) لُباب النقول فِي أسباب النزول للسيوطي: ٢٥٧، ص: (٦٥)، و(فتح القدير) للشوكاني، ج: (١)، ص: (٥٥١).

## مانـای گـشــتی ئایەتەکـــان

خوای بە بەزەیی‌و بەخـشـندە، سـەرەتا دەفـەرموێ: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی‌و بەخشـندە، کە دیارە ئەم ڕستە موبارەکە لـە پـێش (١١٣) ســـوورەت لــە ســـوورەتەکانی قورئانــدا هــاتوە، تــەنیا لــە پــێش ســوورەتی (التوبـة)دا نـەهاتوە، بـەڵام وەك قەرەبووکردنـەوەی ئـەوە، لـە سوورەتی (النمـل)دا دوو ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ی تێدایـــە، ئــەو نامەیــەی کــە ســـولەیمان بــۆ مەلیکــەی (ســبأ)ی دەنێــرێ ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠ ﴾، کەواتە: (١١٤) ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، جا ئایـا: بە ناوی خوای بەبەزەیی‌و بەخشـندە، یانی چی؟ ئەم ڕستە موبـارەك‌و بەبرِسـتە، سێ ڕاستیی گەورەو گرنگ دەگرێتە خۆی:

یــەك: یانی ئەم کارەم دەســت پێ دەکەم بە ناوی خــوا.

دوو: ئەم کارە دەست پـێ دەکـەم بـۆ ڕازیکردنـی خـواو، بـۆ ئـەوەی کە پێـی لـە خـوا نزیـك ببمـەوە.

سێ: ئەم کارە دەسـت پـێ دەکـەم بـە پـشـتیوانیی خـوای باڵادەسـت، نـەك بـە شان‌و شــەوکەتی خــۆم.

ئنجا خــوا ﷻ دەسـت پـێ دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ ﴾، خـوا بـانگی مرۆڤــایەتیی دەکات، دەفـەرموێ: ئـەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کە لە یەك نەفس ئێـوەی هێنــاوەتە دی، وە هـەر لـە خۆیـشی هاوســەرەکەی هێنـاوەتــە دی، کـە دیـارە مەبەسـت لـەو یـەك

نەفسە، ئادەمە عليه السلام، وە مەبەست لە هاوسەرەکەیشی (حەووا)یە، کە لێرەدا ناویان نەهاتوە، بەڵام لە شوێنی دیکەدا خوای پەروەردگار ناوی ئادەمی هێناوە، بەڵام ناوی حەووا لە قورئاندا نەهاتوە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً﴾، وە لەو دووانە، لەو دوو نەفسە کە لە یەك جۆرن، پیاوانو ئافرەتانێکی زۆری بڵاوکردۆتەوە، دیارە ئێمە دوایی باسی ئەوە دەکەین کە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: حەووا لە پەراسووی کەلەکەی چەپی ئادەم دروست بووە، بەڵام ئێمە ڕوونی دەکەینەوە لە مەسەلە گرنگەکاندا کە ئەوە شتێکی ڕاست نیە، وە ئەم ئایەتەش ئەوە ناگەیەنێ، ئەم ئایەتە هەر ئەوە دەگەیەنێ کە هاوسەری ئادەم لە هەمان نەفسی ئادەم، واتە: لە هەمان جۆرە نەفس دروستکراوە، چونکە (وخَلقَ منها) ڕاناوی (مؤنث) دەگەڕێتەوە بۆ (نَفْس)ەکەو ئەویش دابەش (تَجْزِئة) ناکرێ، واتە: ئەوان کە دەڵێن: لە بەدەنی ئادەم جیابۆتەوە، ئەگەر وابا دەبوو فەرموویای: (وَخَلَقَ مِنْهُ)، چونکە بەدەنی ئادەم نێر (مذكّر)ە، بەڵام نەفس مێ (مؤنث)ە[1]، بە هەر حاڵ دوایی باسی دەکەین.

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ﴾، وە پارێز لە خوا بکەن، خوایەك کە داوای شتی پێ لە یەکدی دەکەن، (والأرْحَام) یانی: (وَاتَّقُوا الأَرْحَام) ئەوە (عَطْف)ە بۆ سەر (تَقْوَى)، واتە: پارێز بکەن لە خزمایەتییەکان، پارێز بکەن لەو پەیوەندییانەی کە بە هۆی خزمایەتییەوە پێکتان دەگەیەنن، واتە: ئەو پەیوەندییانەی خزمایەتیی بپارێزنو مەیانپچڕێنن، چونکە پەیوەندیی خزمایەتیی پاراستن، شتێکی زۆر گەورەیە، وە پچڕاندنیشی گوناهێکی زۆر زلە، ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾، بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە، کەواتە: بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ خوا دەکەن، وە چۆن مامەڵەش لەنێو خۆتاندا دەکەن، لە نێوان خۆتاندا وەك پەیوەندیی خزمایەتیی، هەموو ئەوانەی کە پێیان دەگوترێ:

---

١) دیارە مەبەست (مذكّر)و (مؤنث)ی (مجازي)یە، نەك (حقيقي).

خزم، کە بە شێوەیەکی باو هەموو ئەوانەن کە ئەسڵو فەرعی ئینسانن، چ لە ڕێی پشتێوە ئینسان پێیان بگاتەوە، چ لە ڕێی بەرێوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿... فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ...﴾ الفرقان، بەڵێ، خزمایەتیی دوو جۆرە، خزمایەتیی نەسەبیی هەیە، کە لە ڕێی پشتێ وە پێکدەگەنەوە، وە خزمایەتی بەرێ هەیە، کە لە ڕێی زاوزێو ژن هێنانو شووکردن (مُصَاهَرَة)ەوە پێك دەگەنەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم وشەی: (الأَرْحَام)ە، لێرەدا خوا مەبەستێکی فراوانتری پێی هەیەو، باسی ئەوە دەکات کە هەموو مرۆڤایەتیی دەگەڕێتەوە بۆ خێزانێك، کەواتە: بەڵێ ئەوەی کە خزمی نزیکتە، خزمی نزیکتە، بەڵام هەموو ئینسانەکانی دیکەش دیسان لە (ئادەم)و (حەووا)دا لەگەڵ تۆ دەگەنەوە بە یەكو تێکەڵ دەبنەوە، کەواتە: دەبێ ڕەچاوی ئەو پەیوەندییە بکرێ، وە ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە ئێمە هەموومان ڕۆڵەی بابو دایکێکین!

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ﴾، وە ماڵو سامانی هەتیوەکان بدەن بە خۆیان، وە خراپ بە چاك مەگۆڕن، واتە: ماڵێکی خراپی خۆتان مەچن دایبنێن لە شوێنی ماڵی چاکی هەتیوەکەو، هی ئەو بۆ خۆتان بێنن، ئەگەر مەڕو بزنە، ئەگەر ئاژەڵە، ئەگەر پارەو سامانە، هەر شتێکی هەیە، مەچن چاکەکەی ئەوان بۆ خۆتان بێننو خراپەکەی خۆتان لە شوێنی هی ئەوان دابنێن، ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ﴾، وە ماڵی ئەوان لەگەڵ هی خۆتان مەخۆن، واتە: مادام بۆ خۆتان هەتانە مەچن ماڵی وانیش بێنن بیخۆنو هەمووی بپێچنەوە لرفی لێ بدەن! ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾، بێگومان ئەوە گوناهێکی گەورەیە، ئەدی ئەگەر لەگەڵ ماڵی خۆیان نەیخۆنو بە تایبەت ماڵی ئەوان بخۆن، ئایا حەڵاڵە؟! نا، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە مادام بۆخۆتان ماڵو سامانتان هەیە، هی وان لەگەڵ هی خۆتان مەخۆن، ئەگەرنا وەنەبێ کە خۆیان ماڵو سامانیان نەبێ، بۆیان دروست بێ ماڵی هەتیوەکان بخۆن، ئەوەش هەر دروست نیە، بەڵام ئەگەر ماڵی خۆیان هەبێو هی وانیش بخۆن، زۆر زەقترو

خراپتـرە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴾، دیارە ئایەتەکانی قورئان وەك زۆر جار گوتوومانە: وەك ئاڵقەکانی زنجیر یەکدی دەبەستنەوە، لێرەدا بە موناسەبەتی ڕەچاوکردنی ماڵی هەتیوان‌و زیان نەگەیاندن بە ماڵەکەیان‌و سەرپەرشتی کردنیان، دێتە سەر باسی هاوسەرگیریی لەگەڵ کردنیان، دیارە، (یتامی) هەم کۆی (یتیمة)یەو هەم کۆی (یتیم)ە، (یتیمة) کچی بێ باوکەو (یتیم) واتە: کوڕی بێ باب، وە لە عەرەبی دا بۆ کچانی بێ باب (یتیمات)یش دەگوترێ، بەڵام (یتامی) بۆ هەردووکیانە.

جاری وایە کابرایەك چەند منداڵێکی هەتیو سەرپەرشتی دەکات، کوڕن، کچن، دیارە دروستە ئەگەر باڵغ بن، یەکێك لە کچەکان بێنێ، مادام مەحرەم نەبێ، جا دەفەرموێ: ئەگەر ترستان هەبوو کە دادگەر نەبن لەگەڵ کچانی هەتیودا، ئەگەر بە هاوسەر بیانگرن، ئەوە واز لەوان بێنن، ﴿ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ ﴾، وە ئافرەتانێك کە بە دڵتانن‌و پێتان باشن‌و دڵتان پێیان دادەچێ، ئەوان بێنن، ﴿ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ﴾، دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار بێنن، واتە: ئەوەی کە پێی خۆشە دوو ژنان بێنێ، دووان بێنێ، ئەوەی پێی خۆشە سێیان بێنێ، ئەوە پێی خۆشە چواران بێنێ بۆی هەیە، بەڵام ئەوەش ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً ﴾، بەمەرجێك کە لە خۆتاندا ڕا ببینن کە لە نێوانیاندا دادگەر دەبن، ئەو دادگەرییەی کە لە توانای ئینسان دا هەیە، کە بریتیە لە دادگەریی لە چیدا؟ شەرعزانان دەڵێن: (فی السُّكْنى والكِسوَة، والنَّفَقَة، والْمَبِيت) ئەو چوارەن لە جێگەو ڕێگەیاندا، لە بەرگو پۆشاکیاندا، لە نان‌و نەفەقەیانداو، لە شەو لەلا مانەوەیاندا، لەو چوار شتانەدا ئینسان دەتوانێ دادگەریی بکات، بەڵام لە چیدا ئینسان ناتوانێ دادگەریی بکات؟ لەوەدا کە کامیانی لە کامیان خۆشتر دەوێ،

ئەوە پێغەمبەریش ﷺ بۆخۆی فەرموویەتی کە ئەوەی لە توانادا نیە، وەك دوایی باسی دەکەین، کەواتە: ئەگەر ترستان هەبوو لەوە کە نەتوانن ئەو دادگەرییە بکەن کە دەگونجێ بکرێ، ئەوە با هەر یەك هاوسەرتان هەبێ، نەك دووان بێنن‌و دواییش تووشی ستەم بن، ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، یاخود ئەوانەی کە بەدەستی ڕاستتانەوەن، واتە: ئەو کەنیزەکانەی کە خاوەنیانن‌و بە دەستتانەوەن، دەتوانن لەوانیش بێنن، ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟﴾، ئەوە نزیکترە بۆ ئێوە لەوە کە لانەدەن‌و، تووشی ستەم‌و گوناح نەبن.

ئنجا بەو موناسەبەتەوە باسی مارەیی پێدانی ئافرەتان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً﴾، وە وەك خەڵات‌و دیارییەك مارەییەکان بدەن بە ژنەکان، واتە: وەك خەڵات‌و دیارییەکی بێ بەرانبەر، ئنجا جاری وا هەیە پیاوەکە ئاتاج دەبێ‌و ئافرەتەکەش مارەییەکی زۆری دراوەتێ، زێڕی بۆ کڕاوە، زەوی دراوەتێ، ماڵ‌و سامانێکی دراوەتێ، وەك مارەیی، پیاوەکەشی پێویستی پێیەتی، ئایا حەڵاڵە بۆی لێی وەربگرێ‌و بەکاری بهێنێ؟ دەفەرموێ: ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾، ئەگەر بە دڵخواستی خۆیان، بە دڵ پێ خۆشبوونی خۆیان، شتێکیان لەو مارەیی یە پێدان، جا کەمێکی بوو، یان هەمووی بوو، ئەوە بیخۆن وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ: بیخۆن نۆشی گیانتان بێ، واتە: حەڵاڵ‌و زەلاڵە بۆتان، بەلام بە مەرجێك بە ڕوو دەربایسی‌و بە لە ڕوودامان نەبێت، واتە: بە دڵ پێخۆشبوونەوە بێت‌و، بۆ ئەوەش دەبێ ئەو پیاوە، ئەو مێردە زۆر بە سەلیقەو وردبین بێ، جاری وایە ئافرەتەکە شەرم دەکات بڵێ نەخێر، بەلام پێشی ناخۆشە، ئەوە بێگومان بۆی حەڵاڵ نیەو دەبێ بزانێ‌و دڵنیابێ کە بە پێخۆشحاڵیی‌و بە پێخۆشبوونەوەیە.

ئنجا دیارە کە بە زۆری وایە هەتیوان کە سەرپەرشتی دەکرێن، منداڵن، گچکەن، نەفامن، ئەگەرنا وشەی (سُفَهَاء) هەر ئەوان ناگرێتەوەو خەڵکی

دیکەش دەگرێتەوە، جا بەو موناسەبەتەوە باسی ئەوە دەکاتو، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا ﴾، وە ئەو ماڵەتان کە خوا گێڕاویەتی بە هۆی ڕاوەستانتانو بەڕێوەچوونی ژیانو گوزەرانتان، تەسلیمی نەفامەکانی مەکەن، (سُفَهاء) کۆی (سَفیه)ە، (سَفیه)، واتە: گێل، یان بە مانای نە کامڵ، واتە: جارێ عەقڵەکەی نەگەیشتووە کرچو کاڵە، یان بە مانای ناشێ، یان بە مانای نەزان، بەو مانایانە هەمووی دێت، واتە: جاری وایە پیاوێك گەورەو بە تەمەنیشەو گچکە نیە، بەڵام ناشێو نەزانە ماڵەکەی خۆی بەملاولادا دەدا، ئەوە دەسەڵاتی شەرعیی (حَجْر)ی دەخاتە سەر، وە تەصەڕڕوفی لە ماڵی خۆیدا لێ قەدەغە دەکات، جا جاری وایە ئەو ناشێیە پیاوە، ئافرەتە، گەورەیە، گچکەیە، بەڵام بەزۆری وایە کە بۆ منداڵانە، ئەگەرنا جاری وا هەیە کابرا باڵغیشەو دەبێ تەصەڕڕوفو دەست وەردانە ماڵی خۆی لێ قەدەغە بکرێ، لەبەرئەوەی کە زیانی پێ دەگەیەنێ، واتە: لەبەر بەرژەوەندیی خۆی دەستی دەگیرێ، جا دەفەرموێ: ﴿ وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ ﴾، دیارە لێرەدا ڕووی دواندن (خِطاب) لەگەڵ کۆمەڵگای موسوڵمانو دەوڵەتی موسوڵمانە، کە ئەوەش وردەکاریی هەیەو دەگونجێ دەستەیەك (هیئة)ی دیاریکراو و، دەزگایەکی دیاریکراو هەبێ، بۆ سەرپەرشتییکردنی ئەو هەتیوانەو سەروەتو ماڵەکەیان بپارێزێ، جا دەفەرموێ: لەو ماڵو سامانەی خۆیاندا بژێویان پێ بدەنو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن، نافەرموێ: ماڵەکەیان بۆ بکەنە بژێوو پۆشاك، بەڵکو دەفەرموێ: لە ماڵەکەیاندا واتە: بازرگانییان بۆ پێ بکەنو لە قازانجەکەی بژێوو پێداویستەکانیان بۆ دابین بکەن، ﴿ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾، وە قسەیەکی پەسندو باشیان لەگەڵ دا بکەن، واتە: کە ماڵەکەیان لەلای ئێوەیە، با وانەزانن کە دەستتان بەسەرداگرتووەو لێتان داگیر کردوون، پێیان بڵێن: ڕۆڵە گیان ! ئەوە پارەکەت، ماڵەکەت، لەلای منە بۆت دەپارێزمو بۆت زۆر دەکەم، ئنجا (إن شاء الله ) کە دوایی بۆخۆت گەورە دەبی، ماڵەکەت دەدەمەوە، ئەوە مەبەستێك،

یاخود مەبەست ئەوەیە کە قسەی باشیان لەگەڵ بکەن‌و وردە وردە ڕایانبێنن‌و شارەزایان بکەن، ئنجا جگە لە قسەی باش لەگەڵ کردن دێتە سەر لایەنی پراکتیکیی‌و کردەیی‌و دەفەرموێ: ﴿وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾، وە هەتیوەکان، منداڵانی بێ باب جا کوڕن یان کچن، ڕابێنن‌و پڕاوەیان پێ بکەن‌و مەشقیان پێ بکەن لەسەر ئەوە کە چۆن تەصەڕروف لە ماڵی خۆیاندا بکەن، بۆ وێنە: ئەو منداڵە ملیۆنێك یاخود چەند ملیۆنێکی هەیە، بچوو جارێ کەمێك پارەی پێ بدەو پێشی بڵێ: وای لێ بکە، بزانە چی پێ دەکا؟ منداڵە هەتیوەکان ڕابێنن، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ﴾، هەتا کاتێك کە باڵغ بوون ﴿فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا﴾، ئەگەر لەوان دا هەستتان پێ کرد، کامڵ بوون‌و سەرڕاست بوون‌و شارەزا بوون هەیە، ﴿فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾، ماڵەکانیان تەسلیم بکەن، ﴿وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ﴾، نەچن ماڵەکەیان بخۆن، پەلە بکەن پێش ئەوەی باڵغ بن‌و، بە حوکمی شەرع ماڵەکەتان لێ وەربگرنەوە، تەخشان‌و پەخشانی بکەن، وە پەلە پەل بکەن پێش گەورە بوونیان ماڵەکانیان لێ بخۆن، ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾، هەر کەسێکیش هەبووو دەوڵەمەند بوو، با هەر توخنی ماڵی وان نەکەوێ‌و هیچی لێ بەکارنەهێنێ‌و خۆی پاك ڕابگرێ، ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾، هەر کەسێکیش هەژار بوو، با بەشێوەیەکی پەسندو بە چاك زانراو، لێی بەکاربێنێ، توێژەرەوانی قورئان لێرەدا دوو ڕایان هەن:

١ – هەندێکیان دەڵێن: لێی بەکاربێنێ، واتە: بە قەرز حیسابی بکات‌و، دوایی بیداتەوە.

٢– وە هەندێکیان دەڵێن: با لێی بەکاربێنێ بایی ئەوەندەی کە زەحمەت بە پەروەردەکردنیان و بەخێوکردن و سەرپەرشتییکردنیانەوە دەکێشێ، بایی ئەوەندە بۆی هەیە لە ماڵەکەیان بەهرەمەند ببێ، چونکە دەبینی بەهۆی سەرپەرشتیکردنی ئەو هەتیوانەوە کارو کەسابەتی بۆ ناکرێ، ئەوەش کاتی دەوێ، ڕەنجی دەوێ، زەحمەتی دەوێ، بۆیە بۆی هەیە کە لە بەرانبەر ئەوەدا، بە ئەندازەی ئەوە سوود لە ماڵو سامانیان وەربگرێ، کە ئەم ڕایەش بەهێزترە.

پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾، وە هەر کاتێك ماڵو سامانەکانتان وێدانەوە، شایەدیان لێ بگرن، با دوو شایەد هەبن کە فلانکەس ئەوەندە ماڵەی هەبووەو بەو شێوەیە تەسلیمتان کردوونەوە، تاکو دوایی کێشەو بێشەی لێ پەیدانەبێو تەشقەڵەتان پێ نەکەن، ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴾، وە خواش بەسە بۆ لێپرسینەوە، واتە:بێئەوەی شایەدیش هەبن، خوا ئاگای لێیە ماڵەکەی چەندەو چەند نیەو، چۆنتان تەصەرڕوف تێداکردووە، چیتان کردوە؟ دڵسۆز بوون، نادڵسۆز بوون؟ خوای پەروەردگار ئاگای لە هەمووی هەیە.

ئنجا دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ، کە بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی عادەتێکی نەفامانە، ئەویش ئەوەبوو کە عەرەبەکان لە سەردەمی نەفامیی دا، بەڵکو ئێستاش زۆر لە کۆمەڵگا مسوڵمانەکان لە سەردەمی ئیسلامیش دا ئەو عادەتە نەفامانەیان هەر هەیە، کە بریتیە لە بێبەشکردنی ئافرەتان، یان منداڵ، جا چ کچ، چ کوڕ، لە میرات، بەڵکو جاری وایە کابرا گەورەشە بێ بەشی دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنۡهُ أَوۡ كَثُرَۚ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا ﴾، بۆ پیاوان بەشێك هەیە لەوەی کە بابو دایكو خزمان بەجێی دێڵن، وەك میرات، وە بۆ ئافرەتانیش بەشێك هەیە لەوەی کە بابو دایكو

خزمـان بـەجێی دێڵـن، کـەم بـێ، یـاخود زۆر بـێ، ﴿ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴾، ئـەوە ئەندازەیەكو بەشێكی پێویسـت كراوە، واتـە: كـەس بـۆی نیـە دەستكاریی بكات، لێرەدا بە كورتیی فەرموویەتیو تەفصیلەكەی لـە هـەردووك ئایـەتی ژمارە (١١و ١٢) دایە، وە لە ئایەتی كۆتـایی ئەم سـوورەتە دایـە، ئایـەتی ژمارە (١٧٦) كە خوای پـەروەردگار لـەم سـێ ئایەتـەدا هـەموو بنـچینەكانی میـراتی بـاس كـردوون، بـەڵام لێرەدا بە كورتی دەیفەرمویو لەوێدا تەفصـیلو درێژەی دەداتـێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتێكی دیكەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ ﴾، كاتێك میـرات دابەش دەكرێ، ئەوانەی كە شەرع بۆی دیاریكردوون، یەكیان نیوە دەبـا، یـەكی دیكـە چواریەك دەبا، وە یـەكی دی شـەش یـەك دەبـا، ئـەوی دی هەشـت یـەك دەبـا، وەك شـەرع دیـاریكردوە، میـراتەكە بەسـەر خاوەنـە شـەرعییەكانی دا دەبەخـشـرێتەوە، بـەڵام هـەندێ خـەڵكو خزمـی دیكـە هـەن، كە بـەپێی شـەرع میـراتیان ناكـەوێ ئـەوە یـەك، وە منداڵی هـەتیو هەیـە دێ چاوی لـەو ماڵـەیەو دەبینـێ میـرات دابـەش دەكـرێ، وە خـەڵكی هـەژارو نـەدار هەیـە دێو ئاگـای لـێ دەبـێ، بـۆ ئەوانـە چـی بكـرێ باشـە؟ دەفـــەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ ﴾، ئەگەر خزمانو هـەتیوانو نەداران ئامادەی دابەشكردنی میـرات بوون لـەو میـراتە بەشیان بدەن، ئەمە وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: یەكێكە لەو یاسـایانە كە كەم وایە لە نێو مسـوڵمانانـدا ئیشـی پێ كرابێو ئیشـی پێ بكرێ، بـەس ئـەوەی كە میـرات دەگرێ، میـراتی دەدرێتـێو خەڵـكی دیكە بـێ بـەش دەكـرێ، هەڵبەتـە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لێـرەدا مەبەسـت پێـی ماڵو سـامانێكی زۆرە، كـە زۆر بێ، هەم بەشـی خاوەن پشـكو بەشەكانی ببێ كە بۆیان دیاریكراوە، وە دەشـگونجێ كە كەمێكیش بدرێ بەوانی دیكە، لێرەش دەفـەرموێ: ﴿ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ ﴾ كـەمێك، ئەندازەیـــەك، یـــانی: كـــەمێكیان دەدرێتـــێ، ﴿ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾، وە

قسەیەکی باشیشیان لەگەڵ دا بکەن، دڵیان بدرێتەوە دڵیان خۆش بکرێ، وە سەرو دیارییەکیان بدرێتێ.

ئنجا خوای بەخشندە دێتە سەر باسی مەسەلەیەکی دی، کە هەر پەیوەندیی بە میرات بەش کردنو بە هەتیوو منداڵانەوە هەیەو دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَـٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾، با لە خوا بترسێن کەسانێك کە ئەگەر منداڵو وەچەیەکی بێهێزیان لەدوای خۆیان بەجێ هێشتبایە مەترسییان لێیان هەبوو کە زایەببن، با ئەوانە لە خوا بترسێن سەبارەت بە منداڵی خەڵك، واتە: با کەسانێك بیهێننە بەرچاوی خۆیان، کە وەك چۆن ئەگەر خۆیان زانیبایان وا خەریکن دەمرنو چەند منداڵێکی سەلکەو پێچکەو ورد لەدوای خۆیان بەجێ دێڵن، چەند بەتەنگیانەوەنو پەرۆشی منداڵەکانی خۆیانیانە، کاتێك کە ئامادەی میرات دابەشکردن دەبن، یاخود ئامادەی مردنی کەسێك دەبن کەوا خەریکە دەمرێو وەصیەت دەکات، با بەهەمان شێوە بە تەنگ منداڵانی ئەو کەسەشەوە بن کە خەریکە بمرێ، یاخود با بە تەنگ ئەو منداڵە هەتیوانەوەشەوە بن کە ئامادەی میرات دابەشکردن دەبن، وەك چۆن بە تەنگ منداڵانی خۆیانەوەن، ﴿ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾، با پارێز لە خوا بکەنو قسەی باش بکەن، قسەیەك بکەن کە نیشانە بپێکێ، قسەی ڕێكو پێكو ڕاستو بەجێ بکەن کە لە بەرژەوەندیی ئەو منداڵە هەتیوانە دا بێ، وە لە بەرژەوەندیی هەموو لایەکدابێ، ئنجا خوای کاربەجێ لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ﴾، بێگومان ئەوانەی کە ماڵی هەتیوان بە زوڵم دەخۆن، ئەوە ئاگرن لە سکی خۆیاندا دەخۆن، واتە: ئاگر لە سکی خۆیان دەئاخنن، ﴿ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾، وە لەمەودواش واتە: لە دوارۆژیشدا لەنێو کڵپەی ئاگری دۆزەخ دا دەبرژێنرێن !

دیارە لە زۆر شوێنی دیکەش خوای باڵادەست باسی خواردنی ماڵی هەتیوانی کردوە، کە خوای لێ دووربگرن و گوناهێکی گەورەیە، وە کاتێک ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار، ئەو مسوڵمانانەی کە هەتیویان لەژێر سەرپەرشتیی دا هەبوون و خواردنیان لەگەڵ خواردنی خۆیان بۆ ساز دەکردن و، نان و نەفەقەیان لەگەڵ هی خۆیان بۆ دەکردن، خواردن و خواردنەوەکەیان بۆ جیاکردنەوە، بۆئەوەی تووشی گوناح نەبن، دوایی تەماشایان کرد خواردنەکەیان جاری وابوو خەسار دەبوو، یان خواردنەوەکەیان خەسار دەبوو، ئنجا خوای بە بەزەیی ئەم ئایەتەی دیکەی سوورەتی (البقرة)ی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾﴾، واتە: دەربارەی هەتیوان پرسیارت لێ دەکەن (چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەن؟) بڵێ: چاکەکردن بۆ وان باشەو چی بۆ وان چاکە وا بکەن، وە ئەگەر ماڵ و شتی خۆشتان لەگەڵ هی وان تێکەڵ بکەن براتانن، واتە: چۆن لەگەڵ برای خۆتان مامەڵە دەکەن، ئاوا لەگەڵ وان مامەڵە بکەن، ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ﴾، خواش دەزانێ کێ خراپەکارە، کێ چاکەکارە، خوا لێی ون نابێ، نەک بچن ماڵەکەیان جیابکەنەوەو سەرەنجام ئەوان تووشی زەرەربن.

ئەمە مانای گشتی ئەم دە ئایەتە موبارەکە بوو.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** ئیمان سەرچاوەو بناغەی كردەوەی باشە، مسوڵمانەتیی لە دووبەشی سەرەكی پێكدێ: ئیمانو كردەوە، كردەوەی چاك، واتە: پابەندیی بەشەریعەتەوەو هەتا ئیمان نەبێ، كردەوەی باش نابێ، ئیمان وەك درەخت وایەو كردەوەی باش وەك میوەكەی وایە، وە ئیمان ئەگەر بناغە بێ، كردەوەی باش دیوارە، وە ئەگەر ئیمان سەرچاوە بێ، كردەوەی باش ئەو ئاوەیە كە لێیەوە هەڵدەقوڵێ[1]، بۆیە خوا ﷻ لەم سوورەتە وە لە هەموو سوورەتەكانی دیكەشدا، مەگەر چۆن دەنا كاتێك بیەوێ كردەوەی باش، یاساكانی شەریعەت بە مسوڵمانان ڕابگەیەنێ، چۆنیان بانگ دەكات؟ بە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، كە پێشتریش باسمان كرد، لەم سوورەتەدا (٩) جاران خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، واتە: ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان هێناوە! چونكە كەسێك ئیمانی نەهێنابێو ئیمانی بە خواو بە فریشتەكانیو بە كتێبەكانیو بە پێغەمبەرەكانیو بە ڕۆژی دوایی نەبێ، لێی چاوەڕوان ناكرێ ئەو سنوورانەی خوای پەروەردگارو ئەو شەریعەتەی خوای كاربەجێ بپارێزێو جێبەجێی بكات، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا ﴾، ئەی خەڵكینە! پارێز لە پەروەردگارتان بكەن، ئەو پەروەردگارەی كە ئێوەی لە نەفسێك دروست كردوە، وە لە خۆیشی هاوسەرەكەی دروست كردوە، پارێزی لێ بكەن، واتە: پابەندبن بە شەریعەتەكەیەوە، ئەو شەریعەتەی كە لەو یاساو سنوورانە پێكدێ كە لەم سوورەتەدا بەشێكیان خراونە ڕوو.

**مەسەلەی دووەم:** بەپێی ئەم ئایەتە، ئادەم ؑ بابی هەموو مرۆڤایەتیی یە، كە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ﴾، كە ئێوەی لە یەك نەفس دروست

١) لە بەرگی یەكەمی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا بە درێژیی باسی پەیوەندیی نێوان ئیمانو كردەوەی باشمان كردوە، لەسەر ئاستی تاكو خێزانو كۆمەڵگا.

کردوە، ئەو نەفسە مەبەست پێی کێیە؟ بێگومان ئادەم ، بۆیە ئەوەی (شیخ محمد عبده)و (شیخ محمد رشید رضا) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، لەژێر کاریگەریی هەندێ قسەو باسی بەناو زانستییدا گوتوویانە، ڕاست نیەو لەگەڵ ڕواڵەتی قورئانیشدا تێك دەگیرێ ! ئەوان دەڵێن چی ؟ دەڵێن: هەندێك لە زانایان ئەوانەی کە لە بواری (ئەنثرۆپۆلۆجیا)دا پسپۆڕن، (واتە: لە زانیاری ڕەگەزەکانی بەشەر)دا، گوتوویانە: ئەوانەی ئەفریقیین ئادەمێکیان بووەو ئەوان لە بابێکەوە وەپاشکەوتوون، وە ئەوانەی هیند لە بابێکی دیکەوە، وە ئەوانەی لە ئاسیان بابی وان جیابووە، ئەوانی دی لە بابێکی دیکەوە وەپاشکەوتوون، جا شێخ (محمد عبده)و (محمد رشید رضا) گوتوویانە: هیچ دەقێك نیە لەسەر ئەوە کە بڵێ: بابی هەموو مرۆڤایەتیی ئادەمە، تاکو لەگەڵ ئەو بەرهەمەی زانستیدا نەگونجێ ! بەڵام لەڕاستیدا ئەو قسەیە حەقیقەتێکی زانستیی نیەو تەنیا قسەیەك بووەو، بەڕاستیش ئایەتەکانی قورئان ئەوە دەگەیەنن، هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺیش، کە ئادەم بابی هەموو مرۆڤایەتییە، ئنجا بۆ زانیارییتان هەندێك لە شیعەکانو هەندێك لە صۆفییەکانیش دەڵێن: تەنیا یەك ئادەم نەبووە، بەڵکو سێ ئادەم هەبوون، بەڵکو هەندێك گوتوویانە: هەزار ئادەم زیاتر پێش ئادەمی ئێمە هەبوون، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان لەدەستدا نیە، بەڵکو ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾، واتە: هەمووومان دەچینەوە سەر یەك نەفس، ئەویش ئادەمە، هەر ئەوە قسەی ڕاستو بەڵگەدارە، وە لە سوورەتی (الحجرات) ئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ... ﴾، لە نێرو مێیەك، کە ئادەمو حەووان، وە پاشان خوا لە چەندان شوێن دا هەر دەفەرموێ: (يا بَني آدَم) ئەی وەچەی ئادەم ! کەواتە: هەرچی هەیە لە بەشەر هەمووی هەر وەچەی ئادەمە، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٠٧٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٥١١٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم:

(٣٩٥٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَحَسَّنَهُ الألباني، واتە: هەمووتان وەچەی ئادەمن، وە ئادەمیش لە گڵ دروست کراوە.

کەواتە: ئەو قسانە پێچەوانەی ڕواڵەتی قورئانن، وە پێچەوانەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن ﷺ، وە ئێمە ناچاریش نین ئایەتەکانی قورئانو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ تەئویل بکەین، مەگەر لەگەڵ حەقیقەتێکی سەلمێنراوی عیلمییدا تێك بگیرێن، ئەو مەسەلەیەش نەبۆتە حەقیقەتێکی عیلمییو، قسەیەك بووە کەسێك کردوویەتی، کە گوایە: ڕەش پێستەکان بابیان جیایەو، سپی پێستەکان بابیان جیایەو، زەرد پێستەکانو چیو چیو... هتد، هەر یەکەی دەچنەوە سەر بابو دایکێکی جیاواز، بەڵام لە ڕاستییدا بەپێی ئەوە کە دوایی زانایان لێیان کۆڵیوەتەوە، بەشەریەت هەمووی دەچێتەوە سەر یەك بابو دایك، وە لە یەك خێزانەوە هاتوون، وە هەر ئەوەش زیاتر لەگەڵ ڕووحی شەریعەتو ڕووحی دادگەرییو یەکسانی نێوان بەشەرەکاندا دەگونجێ.

**مەسەلەی سێیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾، واتە: هەر لەو نەفسە هاوسەرەکەیشی دروست کرد، کە دیارە مەبەست لە نەفسەکە ئادەمە وەك پێشتر باسمان کرد، وە مەبەست لە هاوسەرەکەیشی (حەووا)یە صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، جا هەندێك زانایان بەڵکو زۆربەیان ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوە کە حەووا لە ئادەم دروست بووە، وە هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺیان لەوبارەوە بە بەڵگە هێناونەوە، کە باسی ئەوە دەکەن ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە، یان لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە، بەڵام من پێم وایە کە ئەم ڕایە هەڵەیەو، ئەم ئایەتە ئەوەی لێ نافامرێتەوە کە حەووا لە ئادەم دروست بووە، بە چەند بەڵگەیەك:

**یەکەم:** ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾، کە ڕاناوی ﴿مِنۡهَا﴾، دەچێتەوە بۆ نەفس، دیارە نەفسیش (مُؤَنَّث)ە، (مُؤَنَّث المجازي)یە، لە زمانی عەرەبیدا، کەواتە: ئەگەر بڵێین: حەووا لە نەفسی ئادەم دروست

بـووە، دەبـێ بەشــێك لـە نەفسـی ئـادەم جیـابووبێتەوەو (حـەووا)ی لـێ دروسـت بووبـێ، بـەڵام ئـەوە ناگونجـێ، چـونکە ڕووحو نـەفس بـەش بـەش نـاکرێو ڕووح وەك جەسـتە نیـە تـاکو بـەش بـەش بکـرێ، کەواتـە: ئەگـەر حـەووا لـە ئـادەم دروسـت ببووایـە، ئـەم ئایــەتە کاتێـك ئـەوەی دەگەیــاند، ئەگەر فەرمووبای (خَلَقَ مِنْهُ زَوْجُـهُ)، واتە: لە جەستەی ئـادەم هاوسـەرەکەی دروست کرد، بەڵام خوا فەرموویـەتی: ﴿ وَخَلَقَ مِنْهَا ﴾، وە ناشـگونجێ نـەفسو ڕووح پارچـەی لـێ ببێتـەوە، کەواتـە: مەبەسـت لـەو ﴿ مِنْهَا ﴾یـە چـییە؟ دەڵـێین: مەبەست لێرەدا لەو (مِنَ)ە، (مِن)ی بەشـکردن (تَبْعِیـضـیة)ی نیـە، بەڵکو (مِن)ی ڕوونکردنـەوە (بَیَانیـة)یـە، واتـە هـەر لـەو جۆرە نەفسـە کە خوا ئادەمی لـێ خوڵقاندوە، لەو جۆرە نەفسـەش (حەووا)ی دروست کردو.

<u>**دووەم**</u>: پاشـان ئەگـەر ئـەم ئایەتـە ئـەوە بگـەیەنێ کـە حــەووا لـە ئــادەم جیابۆتەوە، دەبێ بە پێی ئایـەتی ژمارە (٢١)ی سـوورەتی (الـروم)، هــەموو ژنەکانیش لە مێردەکانیـان جیابووبنـەوە، واتـە: لـە نەفسـی ئـەوان دروست بـووبن، وەك خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، واتـە: وە لـە نیـشانەکانو لـە بەڵـگەکانی پـەروەردگارێتی خـوا ئەوەیـە کـە لـە خۆتـان هاوسـەرەکانتانی دروسـت کـردوە، بـۆ ئـەوەی بـە هۆیانــەوە ئـارامبگرن، وە خۆشــەویـستییو ســۆزو بـەزەیی لـە نێوانتانـدا داناوە، بێگومان لەوەدا نیشـانە هەن بۆ کەسـانێك کە بیـر بکەنەوە.

کـە دیـارە هـیچ کەسـیش ناتوانـێ بڵـێ: هەرچـی ژنـە لـە مێردەکـەی جیابۆتەوە، بەو مانایەی کە لە نەفسی مێردەکەی جیاکراوەتـەوە! کەواتـە: مەبەست چییـە؟ واتە: هەموو ژنەکـان لـەو جـۆرە نەفسانە دروست بـوون، کە مێردەکانیان لێیان دروست بوون، کە بریتین لە نەفسی بەشـەریی، واتـە:

ئافرەتانیش وەك پیاوان خاوەنی نەفسێكن، كە نەفسی ئینسانیی پێ دەگوترێ، خاوەنی ئەو جۆرە نەفسەن بەبێ جیاوازییو لە خاوەنی نەفسی بەشەریی بووندا یەكسانن لەگەڵ پیاوان.

**سێیەم**: ئنجا ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ كە لەوبارەوە بە بەڵگە هێنراونەوە بە بەڵگە ناشێن، وە ناگونجێ بە بەڵگەی ئەوە دابنرێن: بابزانین چۆنن ؟

**فەرمایشتی یەكەم**: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا﴾ (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥١٨٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦٣٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ)، واتە: ئامۆژگارییتان دەكەم، یان ئامۆژگاریی یەكدی بكەن دەربارەی ئافرەتان بە چاكە (واتە: بە چاكە مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن) چونكە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە، وە خوارترین بەشی پەراسوو بەشی سەرەوەیەتی، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیتەوە دەشكێ (پەراسوو ئەگەر ئینسان بیەوێ ڕاستی بكاتەوە دەشكێ) وە ئەگەر وازی لێ بێنی، هەر بە خواریی سوودی لێ دەبینرێ، بۆیە ئاگاتان لە ئافرەتان بێ، وە ئامۆژگارییتان دەكەم دەربارەی ئافرەتان چاكبن لەگەڵیان.

جا ئایا مەبەست لەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە كە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە؟ نا، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە ئافرەت لە شێوەی پەراسوودا دروست بووە، بەڵگەشمان ئەم فەرمایشتەی دیكەیە، كە ئەویش هەر بوخارییو موسلیم هێناویانەو ئەمە دەقەكەیەتی:

**فەرمایشتی دووەم**: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا، اسْتَمْتَعْتَ بِهَا

وَفِيهَا عِوَجٌ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٥١٨٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٣٦٢٩)، واتـە: ئـەبو هـوڕەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ئـافرەت وەك پەراسـوویە، ئەگـەر بتـەوێ ڕاسـتی بکەیتـەوە دەیـشکێنی، {واتـە: پیـاو ئەگـەر بیـەوێ ئـافرەت بێنێتـە سـەر سروشـتی خۆی، دەبێ تـەڵاقی بـدات، چونکە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دەفەرموێ: ﴿وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا﴾ (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٣٦٣٠)، وابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٧٩)، واتـە: شکاندنی ئـافرەت مەبەسـتی پـێ تەڵاقدانیـەتی} ، ئەگـەر لێیـشی بگـەڕێی بـە لاریـی لێـی بەهرەمەنـد دەبـی، واتـە: خـوا ئـافرەتی لەسـەر جـۆرە سروشـتێك سروشـتاندوەو خوڵقـاندوە، دەبـێ پیـاو لێیگەڕێو نەیەوێ ئەو ئافرەتـە وەك خـۆی لـێ بکـات، ئـافرەت ئافرەتـەو پیـاویش پیـاوە، ئەگـەر پیاوەکە بیـەوێ ئافرەتەکە بێنـێتە سەر سروشـتی خـۆی، بۆی ناکرێو دەبێ دەستبەرداری ببێ، وەك چۆن پەراسـوو ئەگـەر بتـەوێ ڕاسـتی بکەیتـەوە دەیـشکێنی، ئنجا ئایا لێـرەدا حیکمـەتی ئـەوە چییە کە پێغـەمبەر ﷺ ئافرەتی بە بە پەراسـوو چوواندوە؟

حیکمەتەکـەی ئەوەیـە کـە پەراسـوو، ئەگـەر لار نـەبێ، ئـەرکی خـۆی نابینـێ، ئـەو پەراسـووانەی کـە قەفـەزەی سـینگ پێکـدەهێنن، چـۆن قەفەزەی سینگیان بۆ پێکهێنراوە، کە دیارە قەفەزەی سینگ پارێزگاریی دەکات لە جەرگو دڵو سییەکان واتە: لە هەناوی ئینسان، دیارە بـە هـۆی لارییانەوە توانیویـانە ئـەو قەفـەزە پێکبهێـنن، ئـافرەتیش بەهـۆی ئـەوەوە کە هەستو عاتیفـەو ڕەحمی بەسـەر بیـرکردنەوەیدا زاڵـە لـە چاو پیـاو، بەهۆی ئەو هـەڵکەوتە سروشتییەی خۆیـەوە، دەتوانـێ ئـەرکی دایکایـەتیی ببینـێ، ئـەرکی ماڵـدارێتیی ببینـێ، واتـە: ئـافرەت بـەهۆی ئـەو هەڵکەوتـە سروشتییەی خۆیـەوە، دەتوانـێ ئەرکە سروشـتییەکانی خـۆی ئـەنجام بـدا، کەواتە: دەبێ پیـاو لـە ئـافرەت بگـەڕێ، ئـافرەت ئـافرەت بـێ، بـە پێـی ئـەو سروشـتەی خـۆی کـە خـوا لەسـەری خوڵقانـدوە، وە ئەگـەر بیـەوێ ڕاسـتی

بكات، وەك خۆی لێ بكات، ئەوە بۆی ناكرێ، وەك چۆن پەراسوو ئەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیتەوە دەشكێ.

كەواتە: مەبەست لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە كە ئافرەت لە شێوەی پەراسوودا دروست كراوە، واتە: لە چاو پیاو لارە، چونكە پیاو زیاتر بە عەقڵ بیر دەكاتەوە، وە ئافرەت نالێین عەقڵی نیە! عەقڵی هەیە، بەلام عاتیفەو سۆز بەسەر عەقڵیدا زاڵە، وەك چۆن پیاو عەقڵ بەسەر هەستو سۆزی دا زاڵە، زۆربەی پیاوان وان.

ئەدی مەسەلەی دروستبوونی (حەووا) لە پەراسووی چەپی ئادەم لە كوێوە هاتوە؟

ئەوە لەڕاستی دا لە تەوڕات وەرگیراوە، وەك لە (إصحاح)ی (٢) لە (سفر التكوین)دا[١] ئەم دەقە هاتوە، دەڵێ: (فَأَوْقَعَ الرَّبُّ الإِلَهُ آدَمَ فِي نَوْمٍ عَمِيقٍ ثُمَّ تَنَاولَ ضِلْعاً مِنْ أَضْلاَعِهِ وَسَدَّ مَكَانَهَا بِاللَّحْمِ، وَعَمِلَ مِنْ هَذِهِ الضِّلْعِ إِمْرَأَةً أَحْضَرَهَا إِلَى آدَمَ..)[٢]، واتە: خوا پەروەردگاری پەرستراو ئادەمی خەواند بە نوستنێكی قووڵ، دوایی یەكێك لە پەراسووەكانی دەرهێناو، شوێنەكەی بە گۆشت پڕ كردەوە، وە لەو پەراسووە ئافرەتێكی لێ دروست كرد، وە بۆ ئادەمی ئامادە كرد.

كەواتە: مەبەستی ئایەتەكە ئەوەیە كە حەووای هاوسەری ئادەم سەلامی خوایان لێ بێ لە هەمان جۆرە نەفس كە ئادەمی لێ دروست بووە، ئەویش لە هەمان جۆرە نەفس دروست بووە، وەك لە فەرمایشتێكی

---

١) (إصحاح) وەك سوورەت وایە، لە تەوڕاتو ئینجیل دا، (سفر)یش بە مانای كتێب دێو (العهد القدیم)، واتە: پەیمانی كۆن، كە بۆ مووساو كۆمەڵێك لە پێغەمبەرانی دیكە هاتوە، كە كۆمەڵێك كتێبە، وە (العهد الجدید)، واتە: (پەیمانی تازە) كە چوار ئینجیلەكانن لەگەڵ كۆمەڵێك كتێبی دیكەدا، كە بە حیساب بۆ عیساو ﷺ دوای عیسا ﷺ هاتوون، كە لە ڕاستییدا خوا ﷻ یەك ئینجیلی بۆ عیسا ﷺ ناردوە، بە هەرحاڵ ئێمە باسی واقیعەكەیان دەكەین.

٢) التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التكوین، الإصحاح (٢)، آیة: (٢١و٢٢و٢٣)، ص:(١١).

پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٦٢٣٨)، وَأَبُودَاوُدَ بـرقم: (٢٣٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١١٣)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، وَصَحَّحَهُ الآلباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٨٦٣))، واتە: بێگومان ئافرەتان لەتکی پیاوانن، وەك چۆن سێوێك دەکەیتە دوو بەشەوە، دوو لەتەوە، ئافرەتو پیاویش هەردووکیان خاوەنی یەك جۆرە نەفسن، وەك سێوێك کە لەتت کردبێ ئاوان.

**مەسەلەی چوارەم:** گرنگیی و گەورەیی صیلەی ڕەحم لەم ڕستە قورئانییە موبارەکە وەردەگیرێ، کە دەفەرمویّ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ﴾، پارێز لەو خوایەتان بکەن کە شتی پێ لە یەکدی داوا دەکەن، وە پارێزیش لە پەیوەندییەکانی خزمایەتیی بکەن، یانی بیپارێزنو ئاگاتان لێی بێو مەیپچڕێنن، دیارە وشەی: (الأرحَام) کۆی (رَحِم)، (رَحِم)یش بە مانای منداڵدانی ئافرەت دێ، وە وشەی (الأرحَام) بۆ هەردوو جۆری خزمایەتیی بەکاردەهێنرێ، چ خزمی بەرێ بن، چ خزمی پشتێ، وە ئیسلام زۆر گرنگیی بە پەیوەندییەکانی خزمایەتیی داوەو لەوبارەوە هەم ئایەتی قورئان زۆرن، وە هەم فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بۆ وێنە:

خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارەی (٢٢ - ٢٣)ی سوورەتی (محمد)دا دەفەرموێ: ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴿٢٣﴾ ﴾، (بەرانبەر بە کەسانێکی دڵنەخۆش، یاخود نامسوڵمان) دەفەرموێ: ئایا نیزیك نیە کە ئەگەر ئێوە پشتتان هەڵکرد، یاخود ئەگەر ئێوە دەستەڵاتتان کەوتە دەست، خراپە لە زەوییدا بکەنو پەیوەندییەکانی خزمایەتییتان بپچڕێنن؟! ئا ئەوانە کەسانێکن خوا نەفرەتی لێ کردوون، وە خوا کەڕی کردوونو چاوەکانی کوێر کردوون، کەواتە: کەسێك پەیوەندیی خزمایەتیی دەپچڕێنێ، خوا نەفرەتی لێ دەکات.

ئنجا هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: إنَّ اللَّهَ تَعَالَى خَلَقَ الخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُم، قَامَتِ الرَّحِمُ، قَالَتْ: هَذَا مَقَامُ العَائِذِ بِكَ مِنَ القَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَما تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ! قَالَ: فَذَلكِ لَكِ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣٤٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٨٣٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) برقم: (١١٤٩٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٠٠٥) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوای ئەوەی خوای بەرز دروستکراوەکانی دروستکرد، هەتا تەواوی کردن (رَحِم) هەڵسا (واتە: خزمایەتیی هەڵسا) گوتی: ئێرە کاتێکە کە پەنات پێ دەبردرێت لە پچڕاندن، پەنا دێنمە بەر تۆ لەوەی کە بپچڕێنرێم، خواش فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازی نابی کە هەر کەسێك تۆ بگەیەنێ، منیش بیگەیەنم؟! (واتە: بیگەیەنم بەڕەحمەتی خۆم)، وە هەر کەسێك تۆ بپچڕێنێ، منیش بیپچڕێنم (واتە: بەزەیی خۆمی لێ دوور بخەمەوە)؟! خزمایەتیی گوتی: با، خواش فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ بێ، واتە: هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتیی بگەیەنێ، خوا ڕەحمەتی خۆی پێ دەگەیەنێ، هەر کەسێك پەیوەندیی خزمایەتیی بپچڕێنێ، خوای بەرز بەزەیی لێ دادەبڕێنێ.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٧٧٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٦٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٦٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٩٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٠٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٥٤)، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ ﷺ)، واتە: هەر کەسێك پەیوەندیی خزمایەتیی بپچڕێنی، ناچێتە بەهەشت، جا بۆ ئاگادارییتان، نزیکترین پەیوەندیی خزمایەتیی پەیوەندیی منداڵانە لەگەڵ دایكو بابیان، کچو کوڕان لەگەڵ بابو دایکیان، وە هی دایكو بابە لەگەڵ منداڵەکانیان، ئنجا برا لەگەڵ

بـرا، خوشــكو بـرا، خوشــكو خوشــك، ئنجــا دوایـی پـێ بـە پـێ، كەواتــە: خزمایەتیی تـەنیا ئـەوە نیـە كـە لـە دەرەوەی خێـزان، بـەڵكو نزیكتــرین كـەسو خزم لە تـۆ كـێ یـە؟ بـابو دایكە، وە بـە نـسبەت بـابو دایكـەوە منداڵەكانیانـە، ئنجا دوایی خوشـكو برا، ئنجا دوایی مـامو خـاڵو ئامۆزاو خاڵـۆزاو ... هتد.

هەروەهــا لـەوبارەوە ئـەم فەرموودەیـەش هـەیە: ﴿عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَـتْ: قَـدِمَتْ عَلَـيَّ أُمِّـي، وَهِـيَ مُـشْرِكَةٌ فِـي عَهْـدِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، فَاسْتَفْتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: قَدِمَتْ عَلَـيَّ أُمِّي وَهِيَ رَاغِبَـةٌ: أَفَأَصِلُ أُمِّـي؟ قَـالَ: (نَعَـمْ صِـلِي أُمَّـكِ)﴾ أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٦٩٦٠)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٦٩٦٠)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٢٣٢٢)، واتـە: ئەسـمائی كـچی ئەبووبـەكری صـیددیق خـوا لێیـان ڕازی بـێ [كـە خێزانـی زوبێـری كـوڕی عەووامـە، خوشـكی دایكمـان عائیشــەیە]، دەڵــێ: دایكم كە ئەو كـاتە هاوبەش بـۆ خـوا دانـەر بـوو، هــات بـۆ لام (واتــە: چــووە بــۆ مەدینــە لــە ســەردەمی پێغەمبــەری خــوادا ﷺ) منــیش پرسـیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، گوتم: دایكم هـاتوە بـۆ لامو پێـی خۆشـە لێــم نزیـك بێتــەوە، ئایــا منـیش پەیوەنـدیی لەگــەڵ دایكـم بـەردەوام بكـەم، (واتـە: ئەگـەر ئـەو دیاریی بـۆ هێنـام دیـاریی بـدەمێ، ئەگـەر هات بـۆ لام ڕێـزی بگـرم؟) پێغــەمبەر ﷺ فـەرمووی: بەڵــێ پەیوەنـدیی كـچو دایكایـەتیی لەگـەڵ دایكت بەجێبێنـە، (با كـافریـش بێ).

<u>**مەســەلەی پێنجەم:**</u> كە لـەم ئایەتـە موبارەكانـە وەردەگیــرێن، پێناسـەی (یـتیم)ە، (یتیم) كە پێشتر باسمان كرد (یتامی) كۆی (یتیم)، وە كۆی (یتیمـة)یە، (یتـیم) واتە: كوڕی بێ باب؟ وە (یتیمة) واتە: كـچی بـێ بـاب، جـا ئایـا پێناسـەی (یتـیم) چییە؟ دیارە بە كوردی ئێمە دەڵێین: هـەتیو واتـە: بـێ بـاب، منـداڵێك كـە بـابی مردبـێ، ئنجا ئایـا ئـەم وشـەیە لـە زمـانی عەرەبیـدا لـە چـییەوە هـاتوە؟ دەڵـێ (الیُتْمُ: الإنفـراد) (یُـتْم)، واتـە: تاكبوونـەوە، هـەتا شـتێك كـە زۆر دەگمـەن بـێ، دەگوترێ: (یتیمةُ الدَّهـرِ)، واتە: ئەوە شتێكی تاكە لە ڕۆژگـاردا، وێنەی نـەبووە، لەبـەر ئـەوەی كـە منـداڵ بـابی دەمـرێ جـا كـچ بـێ، یـان كـوڕ بـێ، وەك بڵــێی

جیادەبێتەوە، تاق دەبێتەوە، بێ باب دەمێنێتەوە، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، ئنجا ئایا (یتیم) بە کێ دەگوترێ؟ بە منداڵی نە باڵغ دەگوترێ کچ بێ، یان کوڕ کە بابی مردبێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَآيُتْمَ بَعْدَ احْتِلَامٍ} {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٣) عن عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣١٨٠)}، واتە: لە دوای باڵغ بوون هەتیوی نامێنێ، کوڕ بێ یان کچ، ئەگەر باڵغ بوو بە هەتیو لە قەڵەم نادرێ، بەڵام پێش ئەوە بە هەتیو لە قەڵەم دەدرێ، وە ئەو یاسایانەی کە خوای پەروەردگار باسی کردوون، دەربارەی چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ هەتیودا دەیگرنەوە، بەڵام کە باڵغ بوو، ئەو کاتە بۆ خۆی خاوەنی ئیشی خۆیەتی، وە بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی خۆیو بە هەتیو لە قەڵەم نادرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** ئایا حیکمەتی ئەو تەعبیرەی ئەو ڕستە قورئانییە چییە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ﴾، خوا دەفەرموێ: ماڵی هەتیوەکان لەگەڵ ماڵی خۆتاندا مەخۆن، بۆچی خوا نەیفەرمووە ماڵەکەیان مەخۆن؟ لە شوێنی دیکە فەرموویەتی هەر مەیخۆن، بەڵام لێرە دەفەرموێ: لەگەڵ ماڵی خۆتاندا ماڵی ئەوان مەخۆن، حیکمەتەکەی ئەوەیە: کە کەسێك ماڵی هەتیو بخوا لە حاڵێکدا کە هەبوویەو دەوڵەمەندە، زۆر لێی ناشیرنترەو لێی ناجوانترە، لەوەی کە ناچاربێو موحتاج بێ، هەڵبەتە: کەسێك ناچارو موحتاجیش بێ، ماڵی هەتیوی هەر پێ حەڕامە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوەی کە دەوڵەمەندەو هەبوویە، زۆر لێی ناشیرنترە، چونکە ئەویدیکە ڕەنگە بڵێ: وەڵڵاهی ناچار بوومو نیەتم هێناوە لێی قەرز بکەم، یان دوایی دەیدەمەوە، بەڵام بابای دەوڵەمەند هەبوویەو پێویستی پێی نیە، بۆیە خوای پەروەردگار، کام حاڵەتەی کە زەقترەو ناشیرنترە لە خواردنی ماڵی هەتیودا، ئەو حاڵەتەی بەرجەستە کردوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾، ئەگەر مەترسییتان هەبوو لەوەی کە دادگەریی لەگەڵ

کچانی هەتیودا بکەن، ئەگەر بە هاوسەریان بگرن، مەترسییتان هەبوو کە لەگەڵیان دادگەر نەبن، چ لە ڕووی مارەیی پێدانیانەوە، چ لە ڕووی هەڵسوکەوتی دیکەوە، ئەوە ئافرەتانی دیکە بێنن لەوانەی کە بە دڵتانن، (ربیعة) کە یەکێکە لە زانایان لەوبارەوە گوتوویەتی: {يقولُ تركُوهُنَّ إِنْ خِفْتُمْ فَقَدْ أَحْلَلْتُ لَكُمْ أَرْبَعَاً}[1] واتە: ڕەبیعە گوتوویەتی: (خوا) دەفەرموێ: ئەگەر مەترسییتان هەبوو لەوەی کە لەگەڵیان دادگەربن، وازیان لێ بێنن‌و هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەواندا مەکەن، ئەوە هەتا چواران لە ئافرەتی دیکەم بۆ حەڵاڵ کردوون‌و لەگەڵ ئەواندا هاوسەرگیریی بکەن.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئافرەتانێك کە دڵتان دەیانگرێ، یاخود خۆشتان دەوێن‌و پێتان چاکن، مارەیان بکەن‌و بیانهێنن، زانایانی مەزهەبی ظاهریی گوتوویانە: بەپێی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئافرەتانێك مارە بکەن کە بە دڵتانن، دەڵێن، کەواتە: ژن هێنان لەسەر پیاو فەرزە، چونکە دەڵێن: (الأَمْرُ لِلْوجُوبِ) صیغەی فەرمان لە قورئاندا کە هاتوە بۆ فەرز بوونە، مەگەر نیشانەیەك هەبێ لایبدا لەو فەرز بوونە، وە دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە وشەی: (فَانْكِحُوا)، فەرمانە واتە: فەرزە لەسەر پیاوان هاوسەرگیریی بکەن.

بەڵام شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: ئەوە ڕاست نیە، بە بەڵگەی ئەوە خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم .... ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ ... ﴾، واتە: وە ئەگەر کەسێك لە ئێوە نەیتوانی لەگەڵ ئافرەتانی ئازاددا هاوسەرگیریی بکات، با لە ئافرەتانی ئیمانداری کە کەنیزەکن، وە داوێن

---

١) محاسن التأويل للقاسمي: ج: (٥)، ص: (١٨).

پاكـن، بهێنـێو لەگـەڵ ئەوانـەدا هـاوسـەرگیـریی بكـات، .... دوایـی دەفـەرموێ: ئەوەش بۆ كەسێكە لە ئێوە كە بترسێ لەوەی تووشی گوناح ببێ، وە ئەگەر ئارام بگرن باشترە بۆ ئێوە.

جا شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: كەواتە كە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾، واتە: وە ئەگەر خۆ ڕابگرنو لە كەنیزەكان نەهێننو مادام توانای هاوسەرگیرییتان نیە لەگەڵ ئافرەتانی ئازاددا، خۆ ڕاگرتنەكەتان باشترە، واتە: ژن نەهێنن باشترە لە كەنیزەكان، دەڵێ: نەك فەرز بەڵكو ژن هێنان سوننەتیش نیە[1].

منیش ڕام وایە كە مەسەلەی هاوسەرگیریی بەپێی حاڵو شەخصو مەقام دەگۆڕێ ! هەیە ڕەنگە لە هەقی ئەودا پێویست بێ ژن بهێنێ، هەشە نەخێر، بۆی سوننەتە، وە هەیە ڕەنگە بۆی ڕەوابێ، لەوانەیە هەشبێ بۆی ناپەسند بێ، وە ڕەنگە هەشبێ لێی قەدەغەبێ، واتە: پێنج حوكمەكان (الأَحْكَامُ الخَمْسَة) بەسەر هاوسەرگیریدا جێبەجێ دەبن، بەم شێوەیە:

١/ كەسێك كە ئەگەر هاوسەرگیریی نەكات، بزانێ تووشی گوناح دەبێ، وە لە تواناشی دا هەبێ هاوسەرگیریی بكات، ئەوە لەسەری پێویستە هاوسەرگیریی بكات.

٢/ وە كەسێك كە بزانێ تووشی گوناح نابێ، لەوانەیە بۆی سوننەت بێ.

٣/ وە كەسێك كە ئەگەر هاوسەرگیریی نەكات، ڕەنگە كاری دیكەی باشتر بكات، لەوانەیە بۆی ڕەوابێ (مُبَاح)، بۆیە هەندێ لە گەورە پیاوان وەك: (ابن تیمیة) و(نَوَوي) (سَیْد قُطْب) و (نۆرسیی)و زۆری دیكەش ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ژنیان هەر نەهێناوە، كە دیارە پێیان وا بووە، ئەو كارانەی دیكەی كە پێوەیان خەریكن، پاداشتیان زیاترە لەوەی كە هاوسەرگیریی بكەنو، ماڵو وەچەی صاڵحیان لێ بكەوێتەوە.

---

١) التفسير الكبير، ج: (٩)، ص: (١٤٨).

٤/ وە كەسێك كە پێی وابێ باش ناتوانێ هەقی هاوسەرگیریی خێزانەكەی بدات، ڕەنگە بۆی ناپەسند بێ.

٥/ وە كەسێك كە بزانێ كە توانای ماڵو منداڵ بەڕێوەبردنی نیە، یاخود تووشی زوڵمو ستەم دەبێت، یاخود لەبەر هەر نوقصانییەك كە لە بەدەنیدا هەیە، ناتوانێ هەقی خێزانەكەی بدات، ئەوە بۆی حەرامە، كەواتە: لەڕاستییدا مەسەلەی هاوسەرگیریی یەك حوكمی نیە، بەڵكو حوكمی جیاوازی هەن، بەپێی جیاوازیی حاڵەتەكان.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾، زانایان هەندێكیان بە (ما حلَّ لَكُمْ) لێكیان داوەتەوە، ﴿مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾، گوتوویانە: (مَا حلَّ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ) واتە: ئەو ئافرەتانەی كە بۆتان حەڵاڵن، بەڵام ئێمە پێشتریش باسمان كرد كە وشەی (طيِّب) لە قورئاندا بە مانای حەڵاڵ نیە، بەڵكو بە مانای پاكو چاكو بە سوودو بە تامو خۆشو پەسندە،، یان بە مانای شتێكە كە ئینسان دڵی بۆی دەچێت، بۆچی؟ چونكە ئەگەر وشەی: (طيِّبَات) لێرەدا بە مانای حەڵاڵ لێك بدەینەوە، لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٥٧)دا، كە خوا دەفەرموێ: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ...﴾، واتە: خوا طەییباتیان بۆ حەڵاڵ دەكات، ئەگەر طەییبات بە مانای حەڵاڵ بێ، واتە: حەڵاڵیان بۆ حەڵاڵ دەكات!! دیارە خوای پەروەردگاریش شتی وا نافەرموێ، چونكە حەڵاڵ هەر حەڵاڵە، حەڵاڵ پێویستی بە حەڵاڵ كردن نیە، كەواتە: ﴿... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف، واتە: شتە بە تامو خۆشەكان، یان شتە بە سوودو چاكەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات، هەروەك پیسو زیانبەخشەكانیان لێ قەدەغە دەكات، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف ، (خَبَائِث)یش بە

مانای حەرام نیە، (خَبَائِث) كۆی (خَبِیثَة)یە، واتە: ئەو شتانەی كە پیس‌و زیانبەخشن، وە ناگونجێ (خبیث)، بە مانای قەدەغە بێت، چونكە شتی قەدەغە قەدەغە ناكرێ، وە حەلاڵ حەلاڵ ناكرێ، بەڵكو شتی پاك‌و چاك حەلاڵ دەكرێ‌و، شتی پیس‌و زیانبەخش قەدەغە دەكرێ.

**مەسەلەی دەیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ...مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ... ﴾، ماناكەی واتە: دوو دووو سێ سێ‌و چوار چوار، هەندێك لەوانەی كە خۆیان لە گێلیی دەدەن، یان دەیانەوێ ئەوەی كە خوا قەدەغەی كردوە بۆ خۆیانی حەلاڵ بكەن، گوتوویانە: ﴿ ...مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ... ﴾، واتە: (ثِنْتَین وَثَلاَثاً وَأَرْبَعَاً) كە دیارە ئەو كاتە: دووو سێ‌و چوار دەكاتە نۆ، واتە: پیاو بۆی هەیە تا نۆ هاوسەر بێنێ‌و ئەوەی بۆ حەلاڵە، بەلاّم بێگومان ئەم جۆرە تێگەیشتنە هەڵەیە، بە چەند بەڵگەیەك:

١/ لە زمانی عەرەبیدا وەختێك بگوترێ: (جَاءَ القَوْمُ مَثْنَى)، واتە: ئەو كۆمەڵە خەڵكە دوو دوو هاتن، ئەگەر بگوترێ: (جَاءوا ثُلاَثَ)، واتە: سێ سێ، ئەگەر بگوترێ: (جَاءوا رُباع)، واتە: چوار چوار هاتن، وە ئەگەر بگوترێ: (جَاءَ القَوْمُ مَثْنَى وَثُلاَثاً وَرُبَاعَاً)، واتە: ئەو خەڵكە هاتن، هەندێكیان دوو دوو پێكەوە، هەندێك سێ سێ، هەندێك چوار چوار، بۆیە خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴾، واتە: لە ئافرەتانێك كە بە دڵتانن بهێنن‌و بخوازن دوو دوو، ئەوەی كە پێی خۆشەو توانای هەیە تەنها دوو هاوسەر بگرێ، سێ سێ بۆ هەندێكتان، چوار چوار بۆ هەندێكتان، نەك یەكێكتان دووو سێ‌و چواران پێكەوە كۆبكاتەوە ! ئەم تەعبیرە ئەوە ناگەیەنێ.

٢/ وە لەوبارەشەوە هەم یەكدەنگیی زانایان هەیە، وێڕای ئەوە كە لە ئایەتەكەوە دەفامرێتەوە.

٣/ وە هـەم دەقی سـوننەتی پێغـەمبەر ﷺیش، کـە دەقـی ڕوونو بـێ پێـچو پەنـا هـەن: جارێ دەربـارەی ئایەتەکـە (ابـن کـثیر) ڕەحمـەتی خـوای لـێبێ دەڵێ: (لأن المقام مقام امتنان وإباحة، فلو كان يَجُوزُ الجَمْع بَيْنَ أَكثَر مِن أَرْبَعٍ لِذِكره)[1]، واتـە: لەبەرئـەوەی لێـرەدا مـەقام مـەقامی منـەت لەسەرکردنو بۆ ڕەوا کردنە، ئەگەر دروست بووایە ئینسان لـە چوار هاوسـەر زیاتری هـەبن، خـوای پەروەردگار باسی دەکردن.

کەواتـە: لای زۆرییەکـەی چـواری باسـکردوون، لـە مەقامێکـدا کـە مـەقامی ئەوەیە کە خـوا نیعمـەتی خـۆی دەخاتـە ڕوو، بۆیـە لـە چـوار زیـاتر ڕەوا نیـە، ئنجا لەوبارەشـەوە فەرمایشت زۆرن:

**فەرمایـشـتی یەکـەم:** ﴿عَنِ الْحَارِثِ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَمِيرَةَ الأسدي رضي الله عنه قَالَ: أَسْلَمْتُ وَعِنْدِي ثَمَانُ نِسْوَةٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: {اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا}﴾، أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٤١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥٢)، وَقَالَ الشَيخ الألباني: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، واتـە: ئـەو هاوەڵـە بـەڕێزە خـوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: کـە مـسـوڵمان بـووم هەشـت هاوسـەرم هـەبوون، بـۆ پێغەمبـەری خـوام ﷺ باسـکرد، ئـەویش ﷺ فـەرمووی: چواریان لـێ هـەڵبژێرە، واتە: چوارەکـەیدی واز لـێبێنـەو بۆت حەڵاڵ نیـن.

**فەرمایـشـتی دووەم:** ﴿عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ غَيْلَانَ بْنَ سَلَمَةَ الثَّقَفِيَّ أَسْلَمَ وَتَحْتَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: اخْتَرْ مِنْهُنَّ، وفي لفظ {أَمْسِكْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا، وَفَارِقْ سَائِرَهُنَّ}﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٤٦٠٩) تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح بطرقه وشواهده، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (١١٢٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٥٦)، وَالْحَاكِمُ برقم: (٢٧٨٣)، وَالدَّارَقُطْنِيُّ، والشَّافعي، وَصَحَّحَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (١٨٨٣)، واتـە: عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەڕی کـوڕی خـەتتاب خـوا لێیـان ڕازی بـێ دەڵـێ:

---

[1] المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٢٧٢).

غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفیی مسوڵمان بوو: دە (١٠) هاوسەری لەژێر نیکاح دابوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: چواریان لێ هەڵبژێرە، وە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: چواریان لێ بگرەوە، وە ئەوانیدیکەش واز لێ بهێنە. کەواتە: شتەکە زۆر ڕوونە و یەکدەنگیی زانایانیش لەسەر ئەوەیە کە لە چوار ژن زیاتر بۆ پیاو ڕەوا نیە، لە یەك کاتدا.

**<u>مەسەلەی یازدەیەم</u>:** دەربارەی چەند ژنیی (تعدد الزوجات) دیارە من هەم لە کتێبی: (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا) وە هەم لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بەناوی (سروشتو پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەند ژنیی لە تەرازووی شەرعو عەقڵ دا) باسمکردوە، وە لێرەدا خولاسەیەکی ئەوەی کە لەو نامیلکەیەدا باسم کردوە، دەربارەی چەند ژنیی، لە چەند خاڵێکدا دەهێنمەوە:

## مەسەلەی چەند ژنیی

<u>خاڵی یەکەم</u>: **چەند ژنیی یاسایەکی شەرعیی ڕوونو بێ چەندو چوونە:**

هەندیك کەس دەیانەوێ بۆ مەسەلەی چەند ژنیی، ئایەتەکان وا تەفسیر بکەن، وە حاڵەتەکە وا وێنا بکەن، کە شتێکی قەدەغەیەو ڕێ پێنەدراوە لە شەریعەتدا، بەلاّم لە ڕاستییدا مەسەلەی چەند ژنیی یاسایەکی ڕوونو بێ چەندو چوونە، جارێ ئەوان هەندێکیان دێنن، وەك بۆختان گوێتان لێبووەو لە پەرلەمانیشدا باسکراوە، ئایەتی ژمارەی (٣)ی سوورەتی (النساء) لەگەڵ ئایەتی ژمارە (١٢٩)دا تێك دەگیرێنن، ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (النساء) دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ﴾، واتە: بێنن لەو ئافرەتانەی کە بەدڵتانن دوو دوو و سێ سێو چوار چوار، وە ئەگەر ترستان بوو کە دادگەریی نەکەن، با یەکێك بێ، وە

ئایەتی ژمارە (١٢٩)ی سوورەتی (النساء)یش دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ... ﴾، واتە: وە ناتوانن لە نێوان ژنەکانتان دادگەریی بکەن، هەرچەندە بشتانەوێ و زۆریش سووربن، جا دەڵێن: کەواتە خوا دەفەرموێ: ناتوانن دادگەریی بکەن! لە ئایەتی ژمارە (٣)شدا دەفەرموێ: ئەگەر دادگەرییتان نەکرد، با یەك بێ، کەواتە: هەر دەبێ یەك بێ!!

ئێمەش دەڵێین: لە ڕاستیدا ئەوە سەفسەطە کردنە، چونکە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: دەبێ دادگەریی بکەن، واتە: دادگەرییەك کە لە توانای ئینساندا هەیە، ئنجا ئایا ئەو دادگەرییەی کە لە توانای ئینساندا هەیە، لە چی دایە؟ لە جێگەو ڕێگە بۆ دابینکردنیان دایە (بۆ ژنەکان)، وە لە بەرگو پۆشاکیان، وە لە شەو لە لێ مانەوەیان، وە لە نەفەقەو بژێو دابینکردنیاندا، ئەوانە لە توانای ئینسادا هەن، بەڵام ئەوەی کە لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)دا دەفەرموێ: لە تواناتاندا نیە هەرچەند بشتانەوێ، واتە: دادگەریی موتڵەق کە بریتیە لە مەیلی دڵ، کە پیاو ئەو ژنانەی خۆی هەموو وەك یەك خۆشبووێن، ئەوە لە توانای ئینساندا نیە، چونکە مەیلی دڵ لە ژێر کۆنترۆڵی ئینساندا نیە، بەڵام ئەوە کە هەردووکیان وەك یەك نیشتەجێ بکەی و، بەرگو پۆشاکیان وەك یەك بۆ بکەی و، وەك یەك، شەو لەلایان بمێنیەوە، ئەوە لە توانای ئینساندا هەیەو دەگونجێ، کەواتە: ئەو دادگەرییەی کە پێویستە، ئەوەیە کە دەگونجێ و، ئەوەی کە لە توانادا نیە، خوای بەرز فەرزی نەکردوە، چونکە هەر دوایی لە تەواوکەری (تکملة) ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِ ﴾، وا ڕەفتار لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا مەکەن وەك هەڵواسراو بێ واتە: نە خاوەن هاوسەر بێ و نەبێ هاوسەریش بێ! واتە: ئەگەر یەکیانتان زیاتر خۆشویست لەوانی دیکە، ئەوانی دیکەش مافەکانیان بۆ دابین بکەن، با بە دڵیش بەقەد ئەویدیکەتان خۆشنەوێن.

توێــژەرەوانی قورئــان وایــان لێکــداوەتەوە، وەك (طَبَـرِي)[1] دەڵـێ: (لَـنْ تُطِيقُـوا، أَيُّهَـا الرِّجَـال، أَنْ تُسوُّوا بَـيْنَ نِسَائِكُمْ وَأَزوَاجِكُمْ فِـي حُـبِّهِنَّ بِقلُـوبِكُمْ حَتَّـى تَعْدِلُوا بَيْنَهُنَّ فِي ذَلِكَ)، واتـە: ئـەی پیـاوینە! ئێوە نـاتوانن یەکسانیی بکەن لە نێوان ژنەکانتانو هاوسـەرەکانتاندا، کـە هـەموویانتان وەك یـەك بـە دڵ خۆشــبوێ، تــاکو لــەو ڕووەوە لــە نێوانیانــدا دادگــەربن، واتــە: لــە ڕووی خۆشویستنەوە ناتوانن دادگەربن.

وە (قُرطُبِـي)یش لـە (الجـامع لإحكام القُرآن)دا دەڵێ: (أَخْبَـرَ تَعَالـى بِنَفيِ الإِسـتطَاعَةِ فِي العَدْلِ بَيْنَ النِّسَـاءِ، وَذَلِكَ فِي مَيْلِ الطَّبْعِ بالْمُحبَّةِ وَالجِمَاعِ وَالحَظِّ مِنَ القَلْبِ)[2]، واتە: خـوای بـەرز هـەواڵی داوە کـە ئینـسان ناتوانـێ لـە نێوانی ژنەکـانیدا دادگەریی بکات (ئـەوەش لـە چـی دا؟) لـە دڵ بـەلادا چوونو خۆشـویستنو جووتبوونو لەو بەشـەدا کـە هەیانـە لـە دڵیـدا، واتـە: لەو ڕووەوە ناتوانن دادگەربن.

ئنجـا ئێمـە لـەوبارەوە فەرمایـشتی پێغەمبـەرمان ﷺ هەیـە، کـە دایکمـان عائیـشە دەیگێڕێتـەوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَاءِ فَيَعْدِلُ، ثُمَّ يَقُولُ: اَللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ، وَلاَ أَمْلِكُ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢١٣٤)، وَالتِّرمِذِيُّ (١١٤٠)، والنَّسَائيُّ برقم: (٣٩٤٣)، وَابْنُ مَاجَهْ (١٩٧١)، وَالدَّارَميُّ بـرقم: (٢١٢٧)، وَالْحَاكِمُ بـرقم: (٢٧٦١) تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: هَذَا إسـناد رجالـه ثقـات رجـال الـشيخين، و ضَعَّفَهُ الألبـاني، ولكـن الطـرف الأول منـهُ حَسَن)، واتـە: دایکمـان عائیـشە خـوای لـێ ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ قەسـمی لـە نێـوانی هاوسـەرەکانیدا دەکـرد، (واتـە: دادگـەریی لـە نێوانیانـدا دەکـردو هـەر کامێکـیانی بەشـی خـۆی پێـدەدا)، وە دادگەرییـشی دەکـرد، دوایـی دەیفـەرموو:

١) جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٤٢٢)

٢) ج: (٣)، ص: (١٥٩١).

ئەی خوایە! ئەوە دابەشکردنی منە بەو شێوەیەی کە لە توانامدا هەیە، تۆ لۆمەم مەکە لەسەر شتێك کە تۆ دەتوانیو من ناتوانم!

خوا چی دەتوانێ؟ دڵی ئینسان بەولادا بەرێ، بەولادا بەرێ، بەڵام ئینسان ئەوە ناتوانێ، کە نەك لە نێوان هاوسەرەکانیدا، بگرە جاری وایە لە نێوان منداڵەکانیشیدا ناتوانێ یەکێکیانی لەوانی دیکە زیاتر خۆشتر نەوێ!

ئنجا بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوەی کە چەند ژنیی مەسەلەیەکی شەرعیی بێ چەندو چونە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (١١٠٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥١٠٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٤٢٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٢٨٨)، واتە: ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە ئافرەتو خوشکی بابی، یان ئافرەتو خوشکی دایکی بە یەکەوە لە ماڵێکدا کۆبکرێنەوە، (واتە: کەسێك کە ئافرەتێکی کردوە بە هاوسەری خۆی، دروست نیە پوورەکەیشی یانی خوشکی بابی، یان پلکەکەی، واتە: خوشکی دایکی لەگەڵدا کۆبکاتەوە)، دیارە ئەگەر ئەو ئافرەتەی واز لێ هێنا، دەتوانێ پووری مارە بکات، یان پلکی مارە بکات، کە لە عەرەبیدا (عَمَّة)، واتە: خوشکی باب، (خَالَة)، واتە: خوشکی دایك، بەڵام ئێمە لە کوردیدا دەڵێین: پوورو پلك، بەڵام ئەگەر بڵێین پوور بۆ خوشکی باب و، پلك بۆ خوشکی دایك، ئەوە باشترە.

کەواتە: ئەگەر چەند ژنیی (تعدد الزوجات) دروست نەبووایە، پێغەمبەر ﷺ نەیدەفەرموو: دروست نیە ئینسان ئافرەتێكو پووری، یان پلکی پێکەوە کۆبکاتەوە.

خاڵی دووەم:

**بێجگە لە بەمەرج گرتنی دادگەریی، چەند ژنیی هیچ مەرجێکی دیکەی نیە:**

هەندیك دەیانەوێ ڕەزامەندیی ئافرەتی یەكەم، بكەنە مەرج، یان دەڵێن دەبێ نەخۆش بێو، دەبێ چی بێو ... هتد، كە لە ڕاستییدا ئەوە هیچی ئایەتەكە دەلالەتی لەسەر ناكاتو، ئەوەی كە ئایەتەكە دەیگەیەنێ تەنیا ئەوەیە كە دادگەریی هەبێ: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ...﴾، ئەگەر ترستان هەبوو كە دادگەریی نەكەن با یەك ژن بێ، كەواتە: تەنیا مەسەلەی دادگەریی بە مەرج گیراوە، دیارە دادگەرییش وەك گوتم: لە هەموو ئەو ڕووانەوە كە لە ژێر كۆنترۆڵی ئینسان دان، كەواتە: ئەو شتانەی دیكە كە بە مەرج دەهێنرێنەوە، بۆ ئەوەیە تەنگ هەڵبچنرێ بە مەسەلەی یاسای چەند ژنییو، ئەوە لەڕاستییدا لە ژێر زەختی واقیع دایە، ئەگەرنا نە ئایەتەكە دەیگەیەنێو نە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ، پاشان نە ژیاننامە (سیرة)و سوننەتی پێغەمبەرﷺو خەلیفە ڕاشیدەكانو سەلەفی صاڵحو پێشەوایانیش، كە هەتا ئەم ڕۆژگارو سەردەمەی ئێمە، پیاوان زیاتر لە هاوسەرێكیان هێناوە، بە مەرجێك كە توانیبێتیان دادگەرییان لە نێواندا بەرقەرار بكەن، ئەوەی نەشیتوانیبێ ئەگەر هێنابیشیەتی بێگومان لەسەری گوناهبار بووە، وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (١٠٠٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢١٣٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٩٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٦٩)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٢١٢٦) وَصَحَّحَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (٢٠١٧)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوو هاوسەری هەبن، بەلای یەكێكیاندا مەیل

بكات، (واتە: لەو شتانەدا كە نابێ مەیل بكات، نەك مەیلی دڵ) ئەوە لە ڕۆژی قیامەتی، بە لاریی‌و بە خواریی دێ، بەڵام دیارە ئەمیش هەڵاوارد (إِستثناء)ی تێدایە، وەك لە تەفسیری ئایەتی (١٢٩)ی ئەم سووڕەتەدا بە درێژیی باسی دەكەین.

## خاڵی سێیەم: پاساوو حیكمەتەكانی چەند ژنیی چین؟

یانی بۆچی شەریعەت ڕێگای داوە بە چەند ژنیی؟! ئەگەر لە بیرتان بێ من كاتی خۆشی گوتوومە: وشەی (فرە ژنیی) كە عەلمانییەكان بەكاری دێنن، غەڵەتە، جا بۆ زانیارییتان زۆر وشە هەن، خەڵكی ئیسلامیی ئێمە بەكاریان دێنن، بێئەوەی كە بزانێ غەڵەتن: خەڵكێكی ئێمەش هەر دەڵێن: فرە ژنیی، بەڵام فرە ژنیی لە ئیسلامدا نیە، چەند ژنیی هەیە، فرە یانی زۆر، جا ئایا لە ئیسلامدا زۆر ژن بۆ پیاو حەڵاڵن بیانهێنێ. نەء، دوو، سێ، چوار، وە شتی كەم دەژمێردرێ‌و دەگوترێ چەند، بەڵام شتێك كە زۆربێ دەگوترێ: زۆرە، فرەیە، فرە ژنیی لە غەیری ئیسلام دایە، بابای ناموسڵمان هەرچی ملی بگرێ بە حەڵاڵی خۆی دەزانێ، چونكە پابەند نیە بە شەریعەتەوە، بەڵام لە ئیسلامدا چەند ژنیی هەیە، لەنێو مسوڵمانانداا چەند ژنیی هەیە، فرە ژنیی لە نێو ناموسڵمانانداا هەیە، لەو ئەورووپاو ڕۆژئاواو وڵاتانی كافرستان، ئەوە بۆ خۆتان دەزانن، پیاوی وا هەیە دەیان ژن تەجرەبە دەكات، وە ژنی وا هەیە دەیان پیاو تەجرەبە دەكات، ئەوە فرە ژنیی‌و فرە مێردییە، ئەمما لە ئیسلامدا چەند ژنیی هەیە.

وشەیەكی دیكەش هەیە بە هەڵە بەكاری دێنن لە جیاتی (زینا)و (داوێن پیسیی) دەڵێن: لەشفرۆشیی، كە دیارە غەڵەتە، جارێ ئەوە زوڵمە لە ئافرەتەكە، چونكە ئەو وشەیە تەنیا ئافرەتەكە دەگرێتەوە، كە پارە وەردەگرێ لە بەرانبەر ئەوەدا كە زینای لەگەڵدا دەكرێ، ئەدی ئەو كابرایەی كە زینای لەگەڵ دەكات؟ هەروەها وشەی لەشكڕو لەشفرۆش، قسەی قەڵپ!! یان وشە

عەرەبییەکە بەکاربێنن بڵێن: زینا، یان وشە کوردییەکەو بڵێن: داوێن پیسیی، ئیدی پیاوەکەش داوێن پیسەو ئافرەتەکەش داوێن پیسە، بۆچی بازرگانیی یە لەشکرو لەشفرۆش، بازارمان داناوە؟! پیاوان لەشی ئافرەتان بکڕن! تەعبیرێکی زۆر نارێکە، بەداخەوە ئیعلامی ئیسلامیی ئێمەش زۆر جار دەکەوێتە ئەو هەڵەوەو، ئەو زاراوەو وشانە بەکاردێنن کە مەدلول و مەفهوومی غەڵەتیان هەیە، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە تەنیا ئافرەتێك کە پارە وەردەگرێ لە بەرانبەر ئەوەدا کە داوێن پیسیی لەگەڵدا دەکرێ، خراپە، بەڵام ئەگەر پارە وەرنەگرێ، مانای وایە لەشی خۆی نەفرۆشتوەو قەیناکات!!

هەروەها پیاوێك کە پارە دەدا خراپەو لەشکرە، ئەدی ئەگەر پارەی نەدابێ، قەیناکا، بەڵام نا، داوێن پیسیی بە پارە بێ یان بێ پارە بێ، بە بەرامبەر یان بێ بەرامبەر بێ، هەر خراپە، ئیدی ئێمە دەبێ زاراوە شەرعییەکە بەکار بێنین.

جا ئایا پاساوەکانی چەند ژنیی چین و بۆچی شەریعەت ڕێی پێداوە؟ لەبەر چەند هۆکارێك:

١/ ئافرەت زوو پێدەگات وە زووش لەبەر دەچێتەوە، ئافرەت لە پێش پیاودا بالغ دەبێ ،وە زووتریش لە ڕووی زاوزێ وە، وە لە ڕووی لایەنی (سێکسیی)یەوە پەکی دەکەوێ، یانی ئافرەت لە چل ساڵی بەرەو سەر، چل و پێنج، کە دەگاتە پەنجا منداڵی نابێ، بەڵام پیاو هەیە تا حەفتا بەڵکو تا نەوەد زیاتریش دەتوانێ منداڵی ببێ، کەواتە: فاصیلەیەکی سی چل ساڵەیان لە بەیندا هەیە.

٢/ پاشان ژمارەی ئافرەتان لە هی پیاوان زیاترە، بە هۆی جەنگو شەڕو شۆڕەوە، وە بە هۆی ئەوەوە کە پیاوان کارو کەسابەت دەکەن دەچنە دەر، زیاتر (مُعَرَّض)ن بۆ ئەوەی لە بەین بچن، ژمارەی پیاوان هەمیشە لە کۆمەڵگاکانی بەشەرییدا کەمتر دەبێتەوە لەچاو ئافرەتان، کەواتە: ئەگەر هەر پیاوێك ئافرەتێك بێنێ، ژمارەیەك ئافرەت بێ هاوسەر دەمێننەوە.

٣/ ئـافرەت دەکەوێتــە حــەیزەوە، وە دەکەوێتــە زەیــستانییەوە، هــەموو مانگــێ جارێك دەکەوێتە حـەیزەوە، وە دەکەوێتە زەیستانییەوەو چەند ڕۆژێك لـەو حاڵـەتەدا دەبێ، بەڵکو زەیستانیی مانگ زیاتر دەخایەنێ.

٤/ کـچانی قـەیرەو بـە تەمـەن لـە کۆمەڵـگادا هـەردەبن، وە ئافرەتـانی بێـوە ژن هـەردەبن لـە کۆمەڵـگادا، باشـە ئـەدی ئـەوان چارەنووسـیان چییە؟ جا جێـی سـەرسوڕمان ئەوەیە خــەڵك هـەر باسـی مـافی ئـافرەت دەکــات، باسـی مــافی ئەو ئافرەتانە دەکات کە نایانەوێ ژنیان بەسـەربێ، بەڵام باسی ئەو ئافرەتانە ناکات کـە شــوویان دەسـت ناکـەوێو، گـەنجێکیان دەسـت ناکـەوێ بیـانهــێنێ، بــەڵام بێگومــان ئــەوانیش مافیــان هەیــە، قــەیرە کــچەکانو بێوەژنــەکانیش مافیـان هــەیە، ئــەوانیش دەبــێ هاوســەریان دەسـتبکەوێ، جـا ئەگـەر چـەند ژنیـی نەبێ چۆن گرفتیان چارەسـەر دەبێ؟

٥/ جاری وایـە ئـافرەت نـەزۆك دەبـێ، پیـاویش پێـی خۆشـە منـداڵی هـەبێ، یـان دەبێ تەڵاقی بدات، یان دەبێ ژنێکـی دیکـە بێنـێ، ڕەنگـە یەکـێك بڵـێ: ئـەدی ئەگـەر خـەتای پیاوەکـە بـوو؟ لـەو حاڵەتەشـدا شـەریعەت ڕێگـای داوە بــەو ئافرەتــە کــە خــۆی لــەو پیــاوە جیابکاتــەوەو داوای هەڵوەشــاندنەوەی هاوسـەرگیریی (فسـخ) بکاتو بڵـێ: ئەو پیاوە منداڵی نابێ، بۆ خۆی مێرد بـە پیاوێکی دیکە بکات کە منداڵی دەبێ، ئەو مافە کە پیاو بۆی هەیە ژنی دووەم بێنـێ، ژنیـش بۆی هـەیە لەو هاوسـەرە جیاببێتـەوە، هاوسەرێکی دیکە بگرێ.

٦/ ئافرەت هـەیە تووشی نەخۆشـیی دەبێو ئەو پیاوەش پێویستی بە تێرکردنی ئـەو لایەنـەی خـۆی هەیـە، جا یـان دەبـێ لـە دەرەوەی مـاڵ ئـەو غەریزەیـەی خۆی تێر بکـات، یان دەبێ هاوسـەرێکی دیکە بگـرێ!

٧/ پاشـان ئافرەت هەیە حەز دەکات ژنیی دووەم، سـێیەم، چوارەمی پیاوێك بێ، نەك هاوسەری یەکەمی یەکێکی دیکە بـێ، یـانی (١/٢) یـان (١/٣) یـان (١/٤)ی پیاوێـك تـەرجیح دەدا بەســەر کـۆی پیـاوێکی دیکـەدا، ئـەوەی پـێ چاکــترە، ئەوەش مافی ئەو ئافرەتانەیە، نابێ ڕێگرییان لێ بکرێ مادام شــەرعییە.

خـاڵی چـوارەم: **هـەوێداریی گرفتی هـەن، بەڵام بەدیلەكانی كارەسـاتی هـەن:**

ئایا ئەگەر ڕێگە نەدەین پیاوان زیاتر لە یەك هاوسەر بێنن، بەدیلەكەی چییە؟ بەدیلەكەی ئەوەیە ئەو ئافرەتانە یان خۆیان كپ بكەنەوە، یان دەبێ لە ڕێی ناشەرعییەوە ئەو غەریزەیەی خۆیان تێر بكەن، هەروەها بۆ پیاوانیش ئەگەر هەوێداریی گرفتی هەن، بەڵام بەدیلی هەوێداریی كە زیناكردنە، كارەساتی لێ دەكەونەوە بۆ دنیاو دوارۆژیی تاكو خێزانو كۆمەڵگا.

خـاڵی پێنـجەم: **بە هەڵـە بەكارهـێنانی هـەق، نابـێ هەقمان لەبەرچاو بخات!**

بۆ وێنە: هەیە لە هاوسەرێك زیاتری هەبووە دوایی بە شێوەیەك مامەڵەی كردوە كە لە شەرعدا نیە، وە زوڵمو ستەمی كردوە لەویدیكەیان، ئەو بەكارهێنانی هەقە بەو شێوە نارێكە نابێ، هەقمان لەبەرچاو بخات.

خـاڵی شـەشـەم: **ئایـا ڕاسـتە چـەند ژنیـیو زینـا وەك یەكـن؟!**

زۆرجار عەلمانییەكان ئەوە دەڵێن! كە من خۆم جارێك گوێم لێ بوو، یان لە بڵاوكراوەیەك خوێندمەوە ئافرەتێك گوتبووی: من هیچ جیاوازییەك نابینم لە نێوان ئەوەدا كە پیاوێك چوار ژنی هەبن بە حەڵاڵیی، یاخود زینا لەگەڵ چوار ئافرەتاندا بكات! بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە درۆیەكی زۆر گەورەیە، بۆچی؟ چونكە ئەگەر مسوڵمان بێ ئەو قسەیە ناكات، خوا دەفەرموێ: چەند ژنیی حەڵاڵەو زینا حەرامە، كەواتە: حەڵاڵو حەرام وەك یەك نین، ئەوەی كە خوای كاربەجێ حەڵاڵی كردوە، لەگەڵ ئەوەی كە حەرامی كردوە، وەك یەكیان دابنێی، مانای وایە كافر دەبێ.

بەڵام ئێمە لێرەدا وەڵامی ئەو كەسە دەدەینەوە بێ ئەوەی ئەوە لەبەرچاو بگرین كە مسوڵمانە، یانی بە عەقڵی خۆی دەیدوێنینو دەڵێین: پێنج جیاوازیی سەرەكی هەن لە نێوان چەند ژنییو ئەوەدا، كە پیاو یان ئافرەت بە حەرامی غەریزەی جینسیی خۆی تێر بكات:

١/ پیاوێك كە زیاتر لە هاوسەرێكی هەیە، مەسرەفی ئەو هاوسەرانەی لەسەر فەرزە، مەسرەف كێشانیانی لەسەر فەرزە، بەڵام كەسێك كە لەگەڵ ئافرەتێكدا زینا دەكات، ئافرەتێك داوێن پیسیی لەگەڵدا دەكرێ، بۆی نیە داوای مەسرەفەكەی بكات.

٢/ ژنی دووەم، یان سێیەم، یان چوارەم، سەربەرزە لەنێو خەڵكدا، كە ئەوە خاوەنی ماڵو مێردی خۆیەتی، بەڵام ئەو ئافرەتەی كە زینا دەكات ئایا سەری شۆڕ نیە؟ دەتوانێ بە خەڵكی بڵێ زینام كردوە؟ نەخێر، بەڵام ئەوەی كە هاوسەری دووەم، یان سێیەم، یان چوارەمی پیاوێكە، بەڵێ ماڵو مێردی خۆی هەیەو شانازیشی پێوە دەكاو پێی سەربەرزە، بەڵام ئایا ئافرەتی داوێن پیس سەربەرزە، بەو داوێن پیسییەی؟! بێگومان نەخێر.

٣/ ژنی دووەمو سێیەم، یان چوارەم، بابی منداڵەكانی دیارە، كوڕەكەی دەزانێ بابی كێیە، كچەكەی دەزانی بابی كێیە، بەڵام ئەوەی كە زینا دەكات، یان دەبێ منداڵەكەی لەبەر خۆی بچوێنێ، یان نەیڵێ منداڵی ببێ، یان ئەگەر منداڵیشی بوو ئەوە بیژوو (زۆڵە)و بێ بابەو دەبێ فرێیبداتو كەس خۆی لێ ناكاتە خاوەن.

٤/ خزمانی هاوسەری دووەمو سێیەمی، یان چوارەمی ئەو كەسە كە زیاتر لە ژنێكی هەیە لەگەڵ مێردەكەیدا تەبان، خزمایەتییان هەیە، برایەكانی، خزمەكانیی، برایەكانی دەبنە خاڵی منداڵەكانی، بەڵام ئایا كەسێك كە بزانن زینای لەگەڵ خوشكیان لەگەڵ كچیان دا كردوە، شانازیی دەكەن بەو كەسەوە كە زینای لەگەڵ خوشكیان، یان لەگەڵ كچیاندا كردوە؟! نەخێر، بەڵكو لەوێ خزمایەتییان هەیەو لێرە دوژمنایەتییان هەیە.

٥/ زینا نەخۆشییو دەردی زۆری لێ دەكەونەوە، سیلانو زوهریو ئیدزو ... هتد، بەڵام ئێستا زانست سەلماندوویەتی پیاوێك كە لەگەڵ زیاتر لە هاوسەرێكدا جووت دەبێ، هیچ گرفتێكی تەندروستی لێ پەیدانابێ.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە مارەیی دانی پیاو بە ژنەکەی، نیشانەی ڕێزو خۆشەویستییە، وە نیشانەی پێویستیی پێ بوونیەتیو، وە نیشانەی ڕاستگۆ بوونیەتی لەگەڵیدا، بۆچی؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةً ﴾، (صدقات) کۆی (صَدُقَة)یە (صَدُقَة)ش، واتە: مارەیی، کە بە (صداق)یش هاتووەو بە (مَهر)یش هاتوە، ئنجا گوتراوە: (وسُمِّي الصِّدَاقُ صِدَاقاً، لأنهُ دليل صِدقهِ معها وَحُبِّهِ لَهَا)، واتە: بۆیە مارەیی پێی دەگوترێ (صِداق) چونکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو پیاوە ڕاست دەکات لەگەڵ ئەو ژنەداو خۆشی دەوێو پێی خۆشە هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، کەواتە: مارەیی پێدانی پیاو بە ژن نیشانەی ڕێزو خۆشەویستییو، نیشانەی ڕاستکردنیەتی لەگەڵیدا، جا بۆ زانیارییتان لە ئەورووپاو ڕۆژئاوادا، وە لە زۆر لە وڵاتانی دیکەدا ئافرەتان پێویستییان بە پیاوان هەیەو پارەیان دەدەنێ بۆ ئەوەی بیانکەن بە هاوسەری خۆیان، واتە: ئافرەت پیاو دەکڕێ!! کەچی کۆلکە عەلمانیی وامان هەیە ڕەخنە دەگرێ، لەوەی کە لە ئیسلامدا پیاو مارەیی دەدا بە ژن، دەڵێن: ئەوە مانای وایە ئەو ژنە دەکڕێو، ئەوە ژنە لە شکۆی (شأن)ی کەم دەبێتەوە!! بەڵام ئەوە نەفامیی یە، ئایا پیاوێك کە دیارییو خەڵات دەدات بە ئافرەتێك بۆ ئەوەی قبووڵی بکات بە هاوسەری خۆی، مانای وایە ڕێزی لێ گرتوە، یان بە سووك تەماشای کردوە؟ بە تەئکید ئەوە مانای وایە ڕێزی لێ گرتووەو خۆشەویستیی بۆ دەردەبڕێ، کە من مەمنوونی تۆمو من ڕەغبەتم بۆ تۆ هەیە، من داوات لێ دەکەمو ... هتد، وە ئەو مارەیی یە بریتی نیە لە کڕینو نرخێك نیە ئافرەتەکەی پێ بکڕێ، بەڵام بەداخەوە ئەوانەی کە مارەیی زۆر دەکەن کە لە ئەنجامی لادان لە شەریعەتدا، وایان لێ هاتووەو ئەوانە (واتە: ڕەخنەگران لە شەریعەت) ڕەنگە وایان تەصەووڕ کردبێ کە ئەگەر (٣٠٠ یان ٤٠٠) لیرە بێ، ئەوە دیارە قیمەتی ئافرەتەکەیە، بەڵام نەخێر لە شەریعەتدا وانیە، لە شەریعەتدا وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە،

فەرموویەتی: ﴿خَيْرُهُنَّ أَيْسَرُهُنَّ صَدَاقًا﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي برقم: (١١١٠٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٠٣٤)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ ضَعِيفٌ)، واتە: باشترین ئافرەتان ئەوانەن کە مارەییان کەمبێ، جاری وا هەبووە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی مارە کردوە لە پیاوێك لەسەر ئەوەی چەند سوورەتێك قورئانی فێر بکات، یاخود ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی کردوە بە مارەیی، کەواتە: مارەیی دیارییەکی ڕەمزییە، وە نیشانەی ئەوەیە ئەو پیاوە پێی خۆشە هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بکات، نەك نرخو قیمەتێك بۆ ئافرەتەکەی پێ بکڕێ[1]!!

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا ﴾، وە ماڵەکانتان تەسلیمی ئەو نەفامانە مەکەن، کە خوا ئەو ماڵو سامانەی گێڕاوە بەهۆی ڕاوەستانتان، ئایا مەبەست لەو (سُفَهَاء)ە کێیە؟ لەڕاستییدا مەبەست هەموو ئەوانەیە کە نازانن، وە ناشێن، وە ناتوانن وەك پێویست تەصەڕروف لە ماڵی خۆیاندا بکەن، وە ئەگەر ماڵەکەیان تەسلیم بکرێ، زیانی پێ دەگەیەنن و بەولا ولای دادەدەن، (طَبَري) لەوبارەوە دەڵێ: (وَالصَّوَابُ مِنَ القَوْلِ فِي تأويلِ ذَلِكَ عِنْدَنَا، أَنَّ اللَّه جَلَّ ثَنَاؤُهُ عَمَّ بِقَوْلِهِ: ﴿ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ﴾، فَلَمْ يُخَصِّص سَفِيهاً دُونَ سَفِيه، فَغَيْرُ جَائِزٍ لأَحَدٍ أَن يؤتَي سَفِيهاً مَالَهُ، صَبِيّاً صَغِيْراً كَانَ أَوْ رَجُلاً كَبِيْراً، ذَكَراً كَانَ أَوْ أُنثى، و"السَّفْيه" الَّذِي لا يَجُوزُ لِوَلِيِّهِ أَنْ يُؤْتِيهُ مَالَهُ، هُوَ المُسْتَحِقُّ الحَجْرَ بِتَضْيِيعِهِ مَالَهُ وَفَسَادِهِ وَإِفْسَادِهِ وَسُوءِ تَدْبِيْرِهِ ذَلِكَ)[2]، واتە: قسەی ڕاست لای من لە تەفسیری ئەوەدا کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ

---

١) لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا) بەدرێژی باسی ئەم مەسەلەیەمان کردوە، بڕوانە چاپی (٢٠١٢)ز.

٢) جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٢٥٧).

أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا ﴾، ئەوەیــە کــە خــوا بەگــشتی فەرموویــەتیو نەفامێکی جیانەکردۆتەوە لە نەفامێك، بۆیە دروست نیـە کەسێك کە ماڵـێکی لەژێر دەست دایە، (هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی کۆمەڵگایە، یان دەوڵەتـە، یـان خزمانی ئەو کەسەن، کە ناتوانێ چـاك تەصەڕڕوف لە ماڵی خۆیدا بکـات)، جا ئەوە منداڵێکی گچکە بێ، یان پیاوێکی گەورە بـێ، نێرینـە بـێ، یـان مێینـە بـێ، دروست نیـە ئـەو ماڵەی تەسلیم بکرێ، هەرکەس شایـستەی ئـەوەبێ قەدەغـە (حجر)ی بخرێتە سەر، واتە: دەستی بگیرێ لە تەصـەڕڕوف لـە مـاڵی خۆیـدا، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە مـاڵو ســامانی خـۆی بـە زایـە دەداتو خراپـەکاریی تێـدا دەکاتو بە نەزانیی مامەڵەی تێدا دەکـات.

**مەسـەلەی چواردەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا ﴾، ئـەو ماڵو سامانەتان کـە خـوا گێڕاویـەتی بـەهۆی ڕاوەستانتان، تەماشا بکـەن خـوای زانـا چـەند تەعبیـرێکی سەرسـووڕهێنەر (عجیـب) بـەکاردێنێ: ئـەو مـاڵو سـامانەی هـۆی ڕاوەسـتانی ژیـانو گوزەرانتانـە، کەواتـە: ئـەوە ڕاسـت نیـە کـە هەندێك کەس وا دەزانێ ئیسلام بـە چاوی سـووك تەماشای دنیاو کەسابەتو سەروەتو سامان دەکات، چونکە خـوای پـەروەردگار نـاوی لـە سـەروەتو سـامان نـاوە: بەخـشش (فَضْـل) وەك فەرموویـەتی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ...﴿١٠﴾ ﴾الجمعـــة، نـــاوی لێنـــاوە (خیـــر) وەك دەفەرموێ: ﴿ إِن تَرَكَ خَيْرًا ... ﴿١٨٠﴾ ﴾البقـــرة، وە لێـرەدا خـوای بـەرزو پـاك بـە مایەی ڕاوەستانی داناوە، ژیان بە چی ڕادەوەستێ؟ دیـارە بـە مـاڵو سامانەوە ڕادەوەستێ، کەواتە: ماڵو سامان لـە ڕوانگەی شـەریعەتەوە ئیعتیبـارو نرخێکی تایبەتی هەیە، بۆیە سـەلەفی صالح گوتوویانـە: (الـمَالُ سِـلاَحُ الْمُؤْمِنِ)، واتـە: مـاڵو سامان چەکی ئینسـانی ئیمانداره.

**مەسەلەی پازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴾، واتە: بژێویان دابین بكەنو پۆشاكیان دابین بكەن، لەو ماڵەدا كە لەبەردەستی ئێوە دایەو تەسلیمتان نەكردوە بەو ناشیو نەزانو نەفامانە، جا لەوبارەوە (القاسمي) دەڵێ: (أَي: اجعَلُوهَا مَكَانَاً لِرزقِهِم وَكِسوَتِهِم بِأَن تَتَّجِرُوا وَتَربَّحُوا حَتَّى تَكُونُ نَفقَاتُهُم مِنَ الأَربَاحِ لا مِن صُلْبِ الْمَالِ)[1]، واتە: ئەو ماڵو سامانەی لەبن دەستی ئێوەدایەو سەرپەرشتیی دەكەن، بیكەن بە شوێنی ئەوە كە بژێویانی تێدا دابین بكەن، وە پۆشاكیانیان بۆ دابین بكەن، بەوە كە بازرگانیی پێ بكەنو سەوداو مامەڵەی پێ بكەن، كە ئەو نەفەقەیەی بۆ ئەوانی دەكەن لە قازانجەكەی بێ نەك لە عەینی ماڵەكەو، سەرەنجام ماڵەكەیان تەواوبێو هەمووی سەرف بێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴾، هەر دەربارەی منداڵانی بێ بابە، منداڵانی هەتیو، چ كوڕ بن، چ كچ، دەفەرموێ: وە ئەوانەی كە توانای عەقڵییو هۆشیی تەواویان نیە، كە وەك پێویست تەصەڕڕوف لە ماڵی خۆیاندا بكەن، قسەی باشو پەسندیان لەگەڵ بكەن، جا هەرچەندە ئەم ڕستەیە لە سیاقی باسی هەتیواندا هاتوە، بەڵام مەبەست لە وشەی (سفهاء): ﴿ وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ ٱلَّتِي جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ قِيَٰمٗا ﴾، وەك لە دەرسەكانی دیكەدا گوتمان، دەگونجێ ئەوانە منداڵ بن، وە دەشگونجێ هی گەورەبن، بەڵام توانای تەصەڕڕوفیان نەبێ لە ماڵی خۆیاندا، كەواتە: هەر كەسێك كە ناشیو نەشارەزا بێت، لەسەر كۆمەڵگای ئیسلامیی پێویستە دەستی بگرێ لە دەستوەردانە نێو ماڵو سامانی خۆیو تەصەڕڕوف پێكردنیو، پێویستە قەدەغە (مَنْع)ی بخاتە سەرێ، تاكو ڕادێو بەرچاوی ڕووناك دەبێتەوەو توانای ئەوەی دەبێ، كە بە شێوەیەكی ڕاستو دروست

---

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٣٧).

تەصەڕڕوف بکات، جا دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾، ئەوانەی کە ناشارەزاو ناشێن ماڵەکەیان دەخەنە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆتانەوە، قسەی باشیان لەگەڵ بکەن، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێت، دڵیان بدەنەوە، دڵیان خۆش بکەن، بەوە کە پێیان بڵێن: ئەو ماڵەتان لای ئێمە پارێزراوە، خەمتان نەبێ لێتان داگیر ناکەین، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە بە شێوەیەکی تیۆریی ڕایان بێنن و فێریان بکەن، کە ئەگەر دوایی ماڵەکەیان تەسلیم کرا چۆن بازرگانیی پێ بکەن و مامەڵەی پێ بکەن و بەفیڕۆی نەدەن.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ﴾، واتە: وە منداڵانی هەتیو تاقی بکەنەوە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە بە کردەوە ڕایان بێنن و مەشقیان پێ بکەن، لەسەر چۆنیەتی کارو کەسابەت، چۆنیەتی تەصەڕڕوف کردن ماڵ و سامانی خۆیاندا، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ﴾، هەتا کاتێك گەیشتنە حەددی پێگەیشتن و باڵغ بوون، ﴿فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ﴾، ئەگەر تێتاندا هەست پێکردن، کە سەرڕاست و چاوکراوەن و شارەزان، دوای باڵغ بوون، چونکە هی وا هەیە دوای باڵغ بوونیش دیسان هەر بەکەڵکی ئەوە نایەت کە ماڵ و سامانەکەی بکەوێتەوە ژێردەستی، بەڵام ئەگەر دوای باڵغ بوون تێتاندا هەست پێکردن هی ئەوەن کە ماڵ و سامانەکەیان تەسلیم بکرێتەوە، ماڵ و سامانەکەیان تەسلیم بکەنەوە.

لێرەدا پێویستە پرسیار بکرێ: ئایا بۆچی وشەی: هەتیوان (یتامى)ی بەکارهێناوە، خۆ ئێمە گوتمان: حەدیسی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە کە فەرموویەتی: ﴿لاَيُتْمَ بَعْدَ احْتِلاَمٍ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُودَاوُدَ برقم: (٢٨٧٣) عن عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣١٨٠)، واتە: لە دوای باڵغ بوون هەتیوی نامێنێ، ئەدی وشەی: (یتامى) بۆچی

بەکارهاتوە؟! دیارە بە ئیعتیباری ئەوەی کە کاتی خۆی بە هەتیو لە قەڵەم دراوە، ئەگەرنا دوای باڵغ بوون لە زاراوەی شەرعدا پێی ناگوترێ: هەتیو (یتیم)، بەڵێ بابی نیە، بەڵام پێی ناگوترێ: هەتیو (یتیم)، واتە: مامەڵەی هەتیوی لەگەڵ ناکرێ، بەڵام بە ئیعتیباری پێشێ کە بابی نەبووەو گچکە بووە، پێی گوتراوە (یتیم)و بەو ئیعتیبارە ئەو وشەیەی بۆ بەکاردێ.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنۡ ءَانَسۡتُم مِّنۡهُمۡ رُشۡدٗا فَٱدۡفَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ﴾، لەگەڵ ئەوەی پێشێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾، تەواوکەری یەکدین، هی پێشێ، واتە: بە شێوەیەکی تیۆریی‌و فێریان بکەن چۆن ماڵ‌و سامانی خۆیان بەکاربهێنن، ئەمەشیان واتە: بەشێوەیەکی کردەیی مەشقیان پێ بکەن، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەو منداڵە هەتیوە کە لەلای سەرپەرشتیارەکەیەتی، با پێشێ تۆزێك ماڵ‌و سامانی وێبدا لە ماڵەکەی، بزانێ داخۆ چی پێ دەکات؟ بڵێ: ها رۆڵە بچۆ شتی پێ بکڕەو شتی پێ بفرۆشە، رایبێنێ‌و مەشقی پێ بکات، بەرلەوەی کە ماڵەکەی هەموو تەسلیم بکاتەوە، دوای باڵغ بوون.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ غَنِيّٗا فَلۡيَسۡتَعۡفِفۡۖ وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، واتە: هەر کەسێك دەوڵەمەند بوو با خۆی پاك رابگرێ، بەو واتایە کە ئەو هەتیوانە، یان ئەو نەفام‌و نەشارەزایانە، کە ماڵەکەیان لە لایەتی، با هیچی لێ نەخوا، وە هەر کەسێك هەژار بوو بۆخۆی ئاتاج بوو، با بەشێوەیەکی پەسند لە ماڵەکەیان بخوا، لە بەرانبەر ئەو زەحمەت‌و ماندووبوونەدا، کە بە پاراستنی ماڵەکەیان‌و سەرپەرشتیکردنی ئەوانەوە دەیکێشێ.

توێژەرەوانی قورئان لێرەدا کێشەو مشتومڕی زۆریان بووە، کە ئایا مەبەست لە: ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرٗا فَلۡيَأۡكُلۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾، چییە؟ ئایا مەبەست ئەوەیە کە

ئێمە تەفسیرمان کرد کە کابرای هەژار بۆی هەیە ماڵی هەتیوێك، یان ماڵی سەفیهێك، واتە: بابایەکی نەشارەزاو ناکامڵ، ئایا بۆی هەیە ماڵەکەی بخوا؟ ئایا مەبەست ئەوەیە؟ یاخود مەبەست ئەوەیە کە وەك هەندێك تەفسیریان کردوە: با لە ماڵی خۆی بەشێوەیەکی پەسند بخوا بۆ ئەوەی پێویستی بە ماڵی ئەو کەسە نەبێ کە لەژێر سەرپەرشتیی دایە، (فَلیأَکُل بِالْمَعْرُوفِ مِنْ مَالِهِ نَفْسِهِ، وَلَيْسَ مِنْ مَالِ اليَتِيمِ أَوْ السَفِيه)، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، واتە: با لەسەر خۆی بە قەرز حیساب بکات، واتە: لە ماڵی هەتیوەکە بخوا، لە ماڵی ئەوەی لەژێر چاودێریی دایە لێی بەکاربێنێ، ئەگەر پێویستی پێیە، بەڵام با بەقەرز لەسەر خۆی حیساب بکات، ئەو مانایانەی هەموو هەیە، بەڵام ئەوەی بۆ من دەردەکەوێ، ماناکەی ئاوایە وەك لە ڕواڵەتی ئایەتەکەش دەردەکەوێ: بابای بێ نیازو دەوڵەمەند، پێویستە خۆی بپارێزێو بە هیچ شێوەیەك توخنی نەکەوێ، بەڵام ئەوەی کە هەژارەو ئاتاجەو هیچی دیکەی نیە، بە ئەندازەی زەحمەتو ماندووبوونی سەرپەرشتیکردنی ئەو منداڵەو ئەو ماڵە، کە دیارە دەبێ بەکاری بێنێو مامەڵەو بازرگانیی پێ بکات، بە پێی زەحمەتو ماندووبوونی خۆی، بۆی هەیە لێی بەهرەمەند بێ، هەڵبەتە ئەگەر بە قەرزیش لەسەر خۆی حیساب بکات ئەوە دووربینیی زیاتری تێدایە، ئەگەرنا بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە بۆی هەیە لێی بەکاربێنێو لێی بەهرەمەندبێ، ئنجا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو ڕستەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، بە ڕستەی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ... ﴿١٠﴾ ﴾، ئەو ڕستەی دوایی، ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە وا نیە بۆچی؟ چونکە ئەوەی دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا ﴾، ئەوانەی کە ماڵی هەتیوان بە زوڵم دەخۆن، ئەوەش دیارە قەدەغەیە، بەڵام ئەوەی دوایی

خـــوای پـــەروەردگار دەفـــەرموێ: ﴿ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، هـــەر کەسێك کە هەژارە با بە شێوەیەکی پەسند لێی بەکاربێنێ، ئاشکراشە ئەوەی کە بە شێوەیەکی پەسندو باوو سوود لە ماڵی ناوبراو دەبینێ، لە بەرانبەر زەحمەتێکدا کە پێیەوە دەکێشێ، زۆر جیاوازە لەوەی کە بە زوڵم و بەبێ بەرانبەر ماڵی هەتیوەکە دەخوا، کەواتە: ئەوەی کە بێ بەرانبەر ئەو ماڵە دەخوا، ئەوە زوڵمەو قەدەغەیە، بەڵام ئەوەی کە بە شێوەیەکی پەسندو لە بەرانبەر ماندووبوون و زەحمەتێکدا کە پێوەی دەکێشێ، بەکاری دێنێ، ئەوە شتێکی حەڵاڵە، بۆیە تێکناگیرێن تا بڵێین: ئەوەی دواییان ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە، دیارە جاری دیکەش باسمان کردوە، کە من پێموایە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە نەسخ بووبێتەوەو، ئێمە لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسمان کردوە، ئەمەش یەکێکە لەو شوێنانەی کە هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: ڕستەی دوایی ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە، بەڵام نەسخ کاتێك دەبێ کە ئەو دوو ئایەتە قورئانییە، یاخود دوو ڕستە قورئانییە، تێك بگیرێن و بە هیچ شێوەیەك بەیەکەوە کۆنەبنەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك هەژاربێ و بەشێوەیەکی پەسند لە ماڵی هەتیوێك بەهرەمەندبێ، لە بەرانبەر زەحمەت و ماندووبوونێکدا کە دەیکێشێ، جیایە لەوەی کە بە زوڵم ماڵی هەتیو دەخوا، بۆیە تێکناگیرێن، وە لەوبارەشەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، قَالَتْ: إِنَّهَا نَزَلَتْ فِي وَالِي مَالِ الْيَتِيمِ، إِذَا كَانَ فَقِيرًا أَنَّهُ يَأْكُلُ مِنْهُ مَكَانَ قِيَامِهِ عَلَيْهِ بِالْمَعْرُوفِ﴾ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٥٧٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٤٥١)، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێ ڕازی بێ، دەربارەی ئەم ئایەتە قورئانییە کە خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: ئەوەی دەوڵەمەندە با خۆی پاك ڕابگرێ و توخنی ماڵی ئەو هەتیوە نەکەوێ کە سەرپەرشتیی دەکات، ئەوەش کە هەژارە بە شێوەیەکی پەسندو بەرانبەر بە زەحمەتەکەی خۆی

سـوودی لـێ ببینێ، دەڵێ: دەربارەی سەرپەرشـتیکاری هەتیو هاتۆتە خوارێ، کـە ئەگەر هـەژار بـوو بـۆی هەیـە لێـی بخـوا، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە سـەرپەرشـتی دەکـاتو ماڵەکـەی بۆ بەڕێـوە دەبات.

**مەسـەلەی نۆزدەیـەم:** ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾، وەك پێـشـتریش باسمـان کـرد عـادەتێکی سـەردەمی نـەفامیی هەڵوەشاندۆتەوە، کە بریتـی بـووە لـەوەی میـراتیان نـەداوە بـە منـداڵان، جا چ کوڕ بووبن، چ کچ بووبن، عەرەبەکان عـادەتیان وابـووە، وە ئێـستاش لـەنێو زۆر لە میللەتانی مـسوڵماندا ئـەو عادەتـە نەفامییـە هـەر هەیـە، کـە قورئـان هـەزارو چوارسـەدو سـیو چوار ساڵ لەمـەو پێـش هەڵیوەشـاندۆتەوە کەچـی ئێـستاش هەنـدێ لـە مـسوڵمانان میـرات نـادەن بـە منـداڵ، خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾، بـۆ پیـاوان بەشـێك هەیـە لـەوەی کە بابو دایـكو خزمان لە ماڵو سامان پـاش خۆیـان بـەجێ دەهێڵـن، ﴿وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾، هـەروەهـا بـۆ ئافرەتـانیش بەشـێك هـەیە لەوەی کە بـابو دایـكو خزمـان بـەجێی دێڵن، ﴿مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ﴾، چ کـەم بـێ، چ زۆر بـێ، ﴿نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾، ئـەوەش بەشـێکی دیـاریکراوە، دیـارە ئـەوەی لێـرەدا بـە کـورتیی باسـکراوە، لـە ئایەتـەکانی: (١١و ١٢)دا خـوای زانـاو شـارەزا درێژەی داوەتـێ، وەك دوایی باسـی دەکەین

**مەسـەلەی بیـسـتەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾، ئەگـەر خزمـانو هەتیـوانو نـەداران ئامادەی میـرات دابەشـکردن بـوون بەشـیان لـێی بـدەن، وە

لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فِي الآيَةِ قَالَ: هِيَ مُحْكَمَةٌ وَلَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ﴾، وَفِي لَفْظ {هِيَ قَائِمَةٌ يُعْمَلُ بِهَا}، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٧٦)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: ئەم ئایەتە موبارەکە موحکەمەو مەنسووخ نیە، لە بێژەیەکی دیکەدا: گوتوویەتی: ئەم ئایەتە لە شوێنی خۆیەتیو کاری پێ دەکرێ، بەڵام زۆربەی مسوڵمانان کار بەو ئایەتە ناکەنو کە میرات بەش دەکرێ، هەر کەسە بەشی خۆی دەباتو، خەڵکێك کە ئامادەی میرات دابەشکردنەکە دەبن، بەشیان نادەن، بەڵام بەپێی ئەم ئایەتە دەبێ سەرو دیارییو بەشێکی کەمیش بێ بیاندرێتێ، وە قسەی خۆشیان لەگەڵ بکرێ، لەوبارەوە (القاسمي) لە (محاسن التأويل)دا گوتوویەتی: (وَرُوِيَ عَنْ جَمَاعَةٍ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ فِي هَذِهِ الآيَةِ: أَنَّهَا وَاجِبَةٌ عَلَى أَهْلِ الميرَاثِ مَا طابَت بِهِ أَنْفُسُهُمْ) [1]، واتە: لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانو شوێنکەوتووانی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە: کە ئەم ئایەتە پێویستە کاری پێ بکرێو خاوەن میراتەکان ئەوەندەی کە دڵیان لەبەر ببێتەوەو ئەوەندەی کە دڵیان بێ، نەك دروستە بەڵکو پێویستە بەشی ئەوانەی لێ بدەن کە ئامادەی میرات دابەشکردنەکە دەبن لە خزمانو هەتیوانو نەداران، دیارە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەمە یەکێکە لەو ئایەتانەی کە مسوڵمانان ئیهمالیان کردوونو کاریان پێ ناکەن، یانی زۆربەی مسوڵمانان، هەڵبەتە کەسانێك هەر هەن کە کار بە ئایەتەکان دەکەن، بەڵام ئەوە شتێکی باو نیەو، ڕەنگە هەندێ جاران هەر نامۆش بێ، باشە میرات ئەوە ئەهلی میرات دەیبەن، ئەدی ئەوانی دیکە، خزمو هەتیوو نەدار کە لە شەرعدا بەشیان بۆ دیاری نەکراوە بۆچی بیاندرێتێ؟ قورئان دەفەرموێ: دەبێ ئەوانیش بیاندرێتێ، بەڵام جاری وایە میراتەکە بەش ناکات، ئەوە ئەگەر قسەیەکی خۆشیشیان لەگەڵ بکەن هەر چاکە.

---

١) ج: (٥)، ص: (٤٤).

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴾، ئایا مەبەست لە فەرمان پێکراوان لێرەدا کێیە؟!

هەندێك گوتوویانە: ئەوانەن کە سەرپەرشتیی دابەشکردنی میراتەکە دەکەن.

وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست ئەو کەسانەیە کە سەردانی ئەو کەسە دەکەن کە لە گیانەڵا دایەو خەریکی مردنە.

وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی میراتگرەکانن.

وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی ئەو کەسەیە کە وەصیەتەکە دەکاتو خەریکە بمرێ.

بەڵام من دەڵێم: دەگونجێ هەر چوار جۆرە کەسەکان مەبەست بن: هەم ئەوانەی کە سەرپەرشتیی دابەشکردنی میرات دەکەنو، هەم ئەوانەی سەردانی ئەو نەخۆشە دەکەن کە خەریکە بمرێو لە دەوروبەرینیو، هەم میراتگرەکان، وە هەم ئەو کەسەش کە وەصیەت دەکات، لەسەر هەر چواریان پێویستە کە بترسێن، وەك چۆن کە ئەگەر خۆیان منداڵی بچووکیان لێ بەجێبمێنێ ترسیان لێیان هەیە کە زایەبنو، وەك چۆن بە تەنگ منداڵانی خۆیانەوەن، با بەهەمان شێوەش بە تەنگی منداڵانی خەڵکیشەوەبن، واتە: لە کاتی میرات دابەشکردنەکەدا با ڕەچاوی هەقو مافی ئەوانە بکەن کە میرات دەگرن، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەی کە میراتی لێ دەگیرێ منداڵی وردی هەبن، منداڵی سەلکەو پێچکەی هەبن، یاخود مەبەست ئەوەیە کە لە کاتی دابەشکردنی میراتەکەدا ئەگەر لەوێ بوون؛ خزم بن، یان هەتیو بن، یاخود کەسانی نەدار بن، با وەك چۆن ئەوانە بە تەنگ منداڵانی خۆیانەوەن، وە مەترسییان لێیان هەیە کە بە وردییو بەبێ سەرپەرشتیار بەجێیان بێڵن، با بەتەنگ منداڵی خەڵکیشەوە بن، ئنجا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە

ئینسان دەبێ وەك چۆن لە خەم ماڵو منداڵی خۆیەتی، لە خەم ماڵو منداڵی خەڵکیش بێ، وەك لەو فەرمایشتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥١٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠١٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٦)، واتە: یەکێك لە ئێوە ئیمان ناهێنێ (واتە: ئیمانی کامڵو تەواو) تاکو چی بۆ خۆی حەزی لێیەتی، بۆ برای مسوڵمانی، (یان خوشکی مسوڵمانیشی) حەزی لێ نەبێ، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: چی بۆخۆی پێناخۆشە، پێویستە بۆ براو خوشکی مسوڵمانیشی پێی ناخۆشبێ.

**مەسەلەی بیستو دووەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی ماڵی هەتیوان بە ستەمو بە ناهەق دەخۆن، ئەوە ئاگر لە ورگی خۆیان دەئاخنن، وە لەمەودوا لەنێو کڵپەی ئاگردا دەبرژێنرێن، کاتی خۆی ئێمە لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٢٢٠)ی سووڕەتی (البقرة)دا باسمان کردو، لەبارەی هۆی هاتنە خوارەوەکەیەوە ئەم دەقەمان هێنا: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾ النساء، انْطَلَقَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ يَتِيمٌ فَعَزَلَ طَعَامَهُ مِنْ طَعَامِهِ، وشَرَابَهُ مِنْ شَرَابِهِ، فَجَعَلَ يَفْضُلُ الشَّيْءُ مِنْ طَعَامِهِ وشَرَابِهِ فَيَحْبِسُ لَهُ، حَتَّى يأكُلَهُ أو يَفْسُدَ، واشتدّ ذَلِكَ عَلَيهِم، فذكروا ذَلِكَ لِرَسُولَ اللّه فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ ...﴾، فَتَخْلِطُوا طَعَامُهَم بِطَعَامِكُم وشَرَابُهُم بِشَرَابِكُمْ﴾، أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٤٩٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (سنن

أبي داود)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: کاتێك خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا ...﴾، واتە: وە ئەوانەی ماڵی هەتیوان بە ستەم دەخۆن، ئەوە ئاگر لە زگی خۆیان دەئاخنن‌و دەخرێنە کڵپەی دۆزەخەوە، دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هاتە خوار، کۆمەڵێك لەوانەی کە ماڵی هەتیوانیان لەلابوو، لە هاوەڵانی بەڕێز، خواردن‌و خواردنەوەکانیان جیاکردنەوە، (ئەگەر دۆشاو بوو، ئەگەر سرکە بوو، ئەگەر هەرچی بوو جیایان کردەوە) کابرا هەتیوێك، یان دوو هەتیو، یان سێ هەتیوی لە ماڵێدا بوون، خواردنێکی بۆ ساز دەکردن، دوایی کە خواردنەکەیان لێ زیاد دەبوو، بۆیان هەڵدەگرتن، وە جاری وابوو خواردنەکە خەسار دەبوو، دیارە ئەوەش زۆر بۆیان زەحمەت بوو، (مرۆڤ ئەگەر لە ماڵێکدا یەك خواردن ساز بکات بۆی ئاسانترە، نەك دوو ئاگران بکاتەوەو دوو چێشتان ساز بکات، ئەوە بەزەحمەت بوو بەلایەنەوە) بۆیە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکردو (گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە دوای ئەوەی ئەم ئایەتانە هاتوونەتە خوارێ تووشی سەغڵەتیی‌و زەحمەت بووین، ئایا چی بکەین‌و چۆن مامەڵە لەگەڵ هەتیواندا بکەین؟) خوای زاڵی پایەداریش ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ.

ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، بە تایبەتی ئایەتەکانی ئەحکام، هەمووی چارەسەری گرفت‌و کێشەو وەڵامی پرسیارانە، دەفەرموێ: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ ...﴾، پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی هەتیوان، بڵێ: چی بۆ وان چاکسازییە ئەوە پەسەندە، واتە: چی بۆ وان بەرژەوەندییە، وایان بۆ بکەن لە ماڵ‌و سامانیاندا، چ شتێك لە ماڵەکانیان بۆ دەخەنە بازرگانییەوە، چییان بۆ دەکرن، چۆن بۆ ئەوان چاکە، وابکەن ﴿وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ﴾، وە ئەگەر ماڵەکەی خۆتان تێکەڵی هی وانکرد، وە خواردنتان لەگەڵ هی خۆتان بۆ سازکردن، یان لەگەڵ ماڵەکەی خۆتاندا

کەسابەتتان بۆ کردن، ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾، ئەوە براتانن، وەك چۆن زوڵم لە برای خۆت ناکەی، زوڵم لەویش مەکە ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ﴾، وە خواش دەزانێ کێ چاکخوازەو، کێش خراپەکارە، فێڵ لە خوا ﷻ ناکرێ ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ﴾، وە خوا ئەگەر ویستبای سەغڵەتیی دەکردن، بەوە کە لەسەرتان پێویست بکات، بە جیا خواردنو خواردنەوەیان بۆ ساز بکەن.

ئنجا ئێمە لە مەسەلەی هەژدەیەمدا باسمانکرد، کە ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ... ﴿١٠﴾﴾، لەگەڵ ئەو ڕستەی پێشوودا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾، هیچ تێکگیرانێکیان لە نێواندا نیە، چونکە بێگومان (الأكْلُ ظُلْماً)و (الأكل بالمَعْروف) لێك جیان، بە زوڵم ماڵی هەتیو بخۆی، لەگەڵ ئەوەی بە شێوەیەکی پەسند بیخۆی، لێك جیانو تێکناگیرێن، بۆیە مەسەلەی لابەر (ناسخ)و لابراو (منسوخ) لێرەدا لە ئارادا نیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەدا ئایەتەکانی (١١، ١٢، ١٣، ١٤) لە سوورەتی (النساء) تەفسیر دەکەین، کە ئەم چوار ئایەتە بابەتو نێوەرۆکەکەیان بەم شێوەیە:

لە هەردوو ئایەتی (١١، ١٢)دا خوای کاربەجێ باسی چەند بنەمایەکی گەورەو گرنگی میرات گرتن دەکات، کە لەگەڵ ئایەتی کۆتایی سوورەتی (النساء)دا، واتە: ئایەتی ژمارە (١٧٦)، وە لەگەڵ هەندێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، بناغەی زانستی میراتیان لێ پێکدێتو بنەماکانی میراتیان تێدایە، وە زانایان هەرچی هەڵیان هێنجاوە دوایی لە لق و پۆپەکانی زانستی میرات، لەو سێ ئایەتو چەند فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هەڵیان هێنجاوە.

وە لە ئایەتەکانی (١٣، ١٤)شدا خوای بەرزو مەزن باسی پاداشتی پابەندیی بە شەریعەتو پاراستنی سنوورەکانی خوا لە لایەك، وە سزای لادان لە شەریعەتو سنوورەکانی خوای پەروەردگار لەلایەکی دیکەوە، دەکات.

﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ

عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ
فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ
بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ
لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ
وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا
ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ
وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾
تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن
تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ
ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ
مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾

## مانای وشــه به وشــەی ئایەتەكــان

((خـوا لـەبارەی (میــراتگرتنی) منداڵەكانتانـەوە ڕاتـان دەسـپێرێ: نێرینـە وەك بەشــی دوو مێینــەی هەیــە، ئنجـا ئەگــەر دوو ئـافرەت زیـاتر بــوون، ئــەوە دوو ســێیەكیان هــەیە لــەوەی (مردووەكـە) بەجێیهێشـتوە، وە ئەگــەر یـەك (كـچ) بــوو ئــەوە نیـوەی هــەیە، وە بــابو دایكــی (مردووەكـە) هەركامێكـیان شــەش یەكــیان هەیە لەوەی (مردووەكە بـە میــرات) بەجێیهێـشتوە، ئەگـەر منـداڵی هـەبێ، بـەڵام ئەگـەر منـداڵ (كـوڕو كـچ، یـان یـەكێكیان)ی نـەبوونو بــابو دایكــی (بــە تــەنیا) میــراتیان لێگـرت، ئـەوە دایكـی سێیەكی هەیـە (بابیـشی ئـەوەی دەمێنێتـەوە)، وە

ئەگەر (مردووەکە) برای هەبوو (هی بابیی یان باب‌و دایکیی) ئەوە دایکی شەشیەکی هەیە، (ئەم میرات دابەشکردنە) دوای جێبەجێکردنی وەصیەتێك کە دەیکات، یان دانەوەی قەرزە، (میراتگرەکانتان) باب‌و دایکتان‌و ڕۆڵەکانتانن، نازانن کامیان سوودیان لێتان نیزیکترە، (ئەم میرات دابەشکردنە) لەلایەن خواوە پێویست کراوە، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە ﴿١١﴾ وە بۆ ئێوە نیوەی ئەو (میرات)ە هەیە کە ژنەکانتان بەجێی دەهێڵن، ئەگەر منداڵیان (لە ئێوە یان مێردی دیکە) نەبێ، بەڵام ئەگەر منداڵیان هەبوو، چواریەکتان لەوەی بەجێیان هێشتوە، پێ دەبڕێ، پاش جێبەجێکردنی وەصیەتێك کە دەیکەن، یان دانەوەی قەرزەکەیان، وە بۆ ئەوان (ژنەکانتان) چواریەکی ئەو (میرات)ە هەیە، کە (لە دوای خۆتان) بەجێی دەهێڵن، مادام منداڵتان نەبێ (لەو ژنانە یان لە ژنی دیکە)، جا ئەگەر منداڵتان هەبوو، ئەوە هەشتیەکی ئەو (میرات)ەی بەجێی دەهێڵن، دەگرن، پاش جێبەجێکردنی وەصیەتێك کە کردووتانە، یان دانەوەی قەرزێك (کە لەسەرتانە)، وە ئەگەر پیاوێك یان ژنێك بێ‌ئەوەی باب‌و دایك‌و منداڵی هەبن، میراتی لێگیرا، وە برایەك یان خوشکێکی (دایکیی) هەبوو، ئەوە هەرکامێکیان شەشیەکی هەیە، بەڵام ئەگەر (براو خوشکەکان) لەوە زیاتر بوون، ئەوە لە سێیەکدا بەشدارن (بە یەکسانیی)، (ئەو میرات دابەشکردنەش) پاش جێبەجێکردنی وەصیەتێك کە (میرات لێگیراو) دەیکات، یان دانەوەی قەرزێکە (کە لەسەریەتی) بەڵام نابێ (وەصیەت یان قەرزەکە) زیانگەیەنەرانە بێ، ئەوە فەرمان‌و ڕاسپاردنە لەلایەن خواوە، وە خوا زانای هێدییە ﴿١٢﴾ ئەوانە سنوورەکانی خوان، جا هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، دەیخاتە چەند باغێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، تێیاندا هەمیشەیین، وە ئەوەش بردنەوەی مەزنە ﴿١٣﴾ وە هەر کەسێك سەرپێچیی خواو پێغەمبەرەکەی بکات‌و سنوورەکانی ببەزێنێ، دەیخاتە ئاگرێکەوە تێیدا هەمیشەیی دەبێ، وە سزاو ئازارێکی ڕیسواکەری هەیە ﴿١٤﴾))

## شـــیکـردنــەوەی هــەندێـك لە وشـــەکان

(**يُوصِيكُمُ**): واتــە: ڕاتــانـدەسـپێرێ، (الوَصِيَّةُ: التَّقَـدُّمُ إِلـى الغَيْـرِ بِمَـا يَعْمَـلُ بِـهِ مُقْتَرِنـاً بِـوَعْظٍ: أَوْصَــاهُ وَوَصَّــاهُ)، (وَصِيَّةُ) بریتیـە لـەوە کـە تـۆ شـتێك بـە کەسـێك ڕابگەیـەنی کـە کـاری پێبکـات، بـەڵام هـاوکات لەگـەڵ ئامۆژگـاریی کردنـدا، قـسەیەکی لەگەڵـدا بکـەی کـە هەسـتی بجووڵـێ، دەگـوترێ: (أَوْصَـاهُ وَوَصَّـاهُ)، واتە: ڕایسـپارد، لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: وەصـیەتی بۆ کرد.

(**حَظِّ**): (الْحَــظُّ: النَّـصِيْبُ الْمُقَـدَّرُ)، وشـــەی (حَـظّ) بریتیــە لــە بەشـــێکی دیـاریکراو، (حَظِظْتُ وَحُظِظْتُ فَأَنَا مَحْظُوظٌ)، واتـە: مـن بەشـێکم پێبــڕا، خاوەن بەشـم.

(**كَلَالَةً**): (الكَـلالَةُ: هِـيَ إِسْـمٌ لِمَـا عَـدا الولَـدِ وَالوَالِـدِ. مِنَ الوَرَثَـةِ، أَوْ الـمَيْت لَـيْسَ لَهُ وَلَـدٌ وَلاَ وَالِد، فَهُوَ إِسْمٌ للميّت، وكِلا القَوْلَيْن صَحِيحٌ، إِنَّ الكَلاَلَـةَ مَـصْدَرٌ يَجْمَـعُ الـوَارِثَ وَالْمَـوروثَ)، وشـــەی: (كَـلاَلَة) نــاوە بـۆ جیـا لـە منـداڵو بـابو دایك، واتە: ئەوانەی کە میـرات دەگـرن، ئەگـەر بـابو دایـك نەبنو منداڵ نەبـن، واتـە: کـوڕو کـچ نـەبن، بــرابن، خوشــك بـن، مـام بـن، خــاڵ بــن ... هتــد، پێیــان دەگــوترێ: (كَلاَلَـة)، یـاخود (كَلاَلَـة) ئـەو مردووەیـە کـە میـراتی لـێ وەردەگیـرێو نـە ڕۆڵـەی هەیـەو نـە بـابو دایکـی هــەیە، واتـــە: نــە فــەرعی هـــەیە، نــە ئەســڵی هەیــە، ئــەدی کـێ میــراتی لـێدەگـــرێ؟ خوشــكو بـــراو مـــامو خـــاڵو ئەوانـــە، وە لـــە ڕاســـتییدا هەردووکیــشیان ڕاســـتن، وشـــەی: (كَلاَلَـة) هــەم ئـەو میـراتگرانـەن کـە غــەیری ڕۆڵــەو دایــكو بــابن، هــەم ئـەو مـیرات لێگیـراوەن، کـە غـەیری بــابو دایــكو ڕۆڵــە میـراتی لـێ دەگـرن.

(**مُضَآرٍّ**): (الـذِي يَضُـرُّ)، واتە: ئەو کەسـەی کە زیان دەگەیەنێو زیانبەخشـە.

(**حُدُودُ ٱللَّهِ**): (حُدُود) کۆی (حَدّ)ە، (الحَدّ: هُوَ الحَاجِزُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ الَّذِي يَمْنَعُ إخْتلاَطَ أَحَدِهِمَا بِالآخَر)، واتە: (حَدّ) بریتییە لە هەر پەردەو سنوورێك لە نێوان دوو شتدابێ کە ناهێڵێ ئەو دوو شتە تێکەڵ بن، (حُدُودُ اللَّهِ)، واتە: سنوورەکانی خوا، بۆچی ناو لە قەدەغەکراوەکان نراوە (حُدُودُ اللَّهِ)؟ چونکە خوای پەروەردگار دەربارەی ڕیباو کڕینو فرۆشتن، فەرموویەتی: ﴿... وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ... ﴿٢٧٥﴾﴾البقرة، واتە: خوا کڕینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردوە، وە ڕیبای حەڕام کردوە، واتە: خەتێکی بە نێواندا کێشاون، وە هەروەها زینا حەڕامە، بەڵام هاوسەرگیریی بە شێوەی شەرعیی، حەڵاڵە، وە جاری واش هەیە کە زانایانی ئیسلام بە سزا شەرعییەکانیان گوتوە: (حُدُود) ئەو سزا شەرعییانەی کە دیاریکراون بۆ کەسێك کە گوناهێك دەکات، کە خوای دادگەر سزای بۆ داناوە، وەك: قەتڵو زیناو دزییو بوختان ... هتد، زانایانی شەرعزان بەوانەیان گوتوە: (حُدُود) چونکە ئەوانەش سنوورێکن ئینسان دەگێڕنەوە، لەوە کە تووشی ئەو قەدەغەیە ببێ.

(**ٱلْفَوْزُ**): (الفَوْزُ: الظَّفَرُ بِالْخَيْرِ مَعَ حُصُول السَّلاَمَةِ)، واتە: (فَوْز) بریتییە لەوە کە ئینسان بە ئاوات بگات لەگەڵ سەلامەتییدا، ئامانج بێنێتە دی، وە سەلامەتیش بێ.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایەتەكـان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە كە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ... ﴿١١﴾ ﴾، لەوبارەوە دوو بەسەرهات گێڕدراونەوە:

أ) ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةُ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِابْنَتَيْهَا مِنْ سَعْدٍ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَاتَانِ ابْنَتَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ قُتِلَ أَبُوهُمَا مَعَكَ فِي أُحُدٍ شَهِيداً، وَإِنَّ عَمَّهُمَا أَخَذَ مَالَهُمَا فَلَمْ يَدَعْ لَهُمَا مَالاً، وَلا يُنْكَحَانِ إِلاَّ وَلَهُمَا مَالٌ، قَالَ: فَقَالَ: (يَقْضِي اللَّهُ فِي ذَلِكَ)، قَالَ: فَنَزَلَتْ آيةُ الْمِيرَاثِ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى عَمِّهِمَا، فَقَالَ: (أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ الثُّلُثَيْنِ، وَأُمَّهُمَا الثُّمُنَ، وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَكَ)﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٤٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٩١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٩٢) قَالَ: حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٢٠)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (١٦٩١)، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: خێزانی سەعدی كوڕی ڕەبیع هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەم دوو كچە كچی سەعدی كوڕی ڕەبیعن، كە لەگەڵ تۆدا لە جەنگی ئوحود دا بە شەهیدیی كوژراو، مامی ئەو دوو كچانە هاتوە میراتەكەی هەموو بردوە، (لە سەردەمی نەفامییدا وابووە، منداڵو ئافرەت میراتی نەدەبرد)، هیچی بۆ جێنەهێشتوون، وە كەسیش نایانخوازێ ئەگەر ماڵیان نەبێ (یانی: ئەوكاتە عادەت وا بووە، كچێك كە هیچی نەبووبێ ڕووتو ڕەجاڵ بووبێ، خەڵك زۆر مەیلیان بەلایدا نەبووە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لەوبارەوە دادوەریی دەكات! خوا بڕیار دەدات بزانین داخۆ چی دەفەرموێ؟ ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوار كە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ... ﴾، خـوا ڕاتـان دەسـپێرێو

ئامۆژگارییتان دەكات دەربارەی منداڵەكانتـــان كـه چۆن میـرات بگـرن، ئنجا پێغەمبــەر ﷺ نــاردی بــە دوای مامیانــداو فــەرمووی: دوو لەســـەر ســێی میــراتەكه بـدە بـە هـەردوو كـچەكەی سـەعد، هەشــت یەكـیش بـدە بـە دایكـیان، ئەوەی مایەوەش بۆخـۆت، (نەك هـەموو میـراتەكه بەری)!

ب) ﴿عَـنْ جَـابِرٍ رضي الله عنه قَـالَ: عَـادَنِي النَّبِـيُّ ﷺ وَأَبُـو بَكْـرٍ فِـي بَنِـي سَـلَمَةَ مَاشِيَيْنِ، فَوَجَدَنِي النَّبِيُّ ﷺ لاَ أَعْقِلُ شَيْئًا، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ، ثُمَّ رَشَّ عَلَـيَّ فَأَفَقْـتُ، فَقُلْـتُ: مَـا تَـأْمُرُنِي أَنْ أَصْـنَعَ فِـي مَـالِي يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ؟ فَنَزَلَــتْ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ...﴾﴾، أَخْرَجَــهُ البُخَــارِيُّ بــرقم: (٤٥٧٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤١٢٢)، وغَيرهُم)، واتـە: جابیــری كـوڕی عەبدوڵــڵا خـوا لێیــان ڕازی بـێ دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ و ئەبوبــەكر بــە پێیــان سەردانی منیـان كـرد، نـەخۆش بـووم لـە بـەنی سـەلەمە، (واتـە: تیــرەی بـەنی سەلەمە لەنێو ئەواندا بووە)، لە هۆش خۆم چوو بووم، پێغەمبـەر ﷺ بانگـی كـرد، ئاویـان بۆ هێنـا دەستنوێژێكی گرت لە ئـاوی دەســتنوێژ لێی پرژانـدمو هـاتمەوە هـۆش خـۆم، پێمگــوت: ئــەی پێغەمبــەری خـوا ﷺ! فەرمــانم بــە چی پێدەكەی؟ ماڵەكەم چی لـێ بكـەم؟ (دیارە مـاڵی هـەبووە) ئیـدی خـوا ئـەم ئایەتــەی نــاردە خــوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ...﴾، واتـە: خـوا ڕاتـان دەسـپێرێو ئامۆژگارییتـان دەكـات دەربـارەی منداڵەكانتـــان، ئــاوا بەو شێوەیە بەسـەردا دابـەش بكرێ.

هەڵبـەتە دەشـگونجێ هەردوو بەسـەرهاتەكان هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتـە موبارەكە بوونو تێكگیـرانیشـیان لە نێواندا نیە.

٢/ هۆی هاتنــە خــوارەوەی ئـەم ڕســتە قوڕئانییـە كـە دەفـەرموێ: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ... ﴿١١﴾﴾، وە ئەو ڕســتەیەی دیكـە كـە دەربـارەی ئافرەتــان دەفــەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن

كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم...﴿١٢﴾ ﴾، ئـەم بەسـەرهاتە هەیـە کە هۆی هاتنـە خوارەوەیان ڕوون دەکاتەوە:

{عَنِ السُّدّي: كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَةِ لاَ يُوَرِّثُونَ الجَوَارِيَ وَلاَ الضُعَفَاءَ مِنَ الغِلْمَانِ، وَلاَ يَرِثُ الرَّجُلُ مِنْ وَلَدِهِ إلاَّ من أَطاق القِتَالَ، فَمَاتَ عَبْدُالرَّحْمَن أَخو حَسَّان الشاعِر، وَتَركَ امرأَةً يُقَالُ لَهَا أُمّ كَجَّة، وَتَرَكَ خَمْسَ جَوَارٍ، فَأَخَذَ الوَرَثَةُ مَالَهُ فَشَكَتْ ذَلِكَ أُمّ كَجَّة إلى النَّبِيّ ﷺ فَأَنْزَلَ اللَّهُ هَذِهِ الآية: ﴿ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ ﴾، ثُمَّ قَالَ فِي أُمّ كَجَّة: ﴿ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ ﴾}، أَخْرَجَهُ ابْنُ جَرِير، وابْنُ أَبي حاتم، والشوكاني في فتح القدير[1]، واتە: سوددیی (کە یەکێکە لە زانایانی تابعین) دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامیی عادەتیان وابووە میراتیان نەدەدا بە کچان (الجَوَارِيَ: کۆی (جارية)یە، واتە: کچ)، وە میراتیشیان نەدەدا بە منداڵی گچکە (جا کچ بن، یان کوڕ) وە هیچ کام لە منداڵەکانی پیاو میراتیان لە بابیان نەدەگرت، مەگەر ئەوەی شەڕکەرو، جەنگاوەر بووایە، عەبدوڕڕەحمانی برای حەسسانی کوڕی سابیتی شاعیر مرد، خێزانێکی لە دوا بەجێما کە ناوی (أُمّ كَجَّة)ش بوو لەگەڵ پێنج کچ (پێنج کچیشی لە دوا بەجێمان)، میراتگرەکانی هاتن هەموو ماڵەکەیان بردو ژنو کچەکانیان بێبەش کرد، (أُمّ كَجَّة) چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو شەکوای حاڵی خۆی بۆ کرد، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوار ﴿ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ ﴾، واتە: ئەگەر ئەوانەی کە میرات لە بابیان دەگرن، ئافرەت بوونو دوو زیاتر بوون، ئەوە دوو لەسەر سێیان بۆ هەیە، وە دەربارەی (أُمّ كَجَّة)ی خێزانی عەبدوڕڕەحمان ئەم ئایەتەی ناردە خوار ﴿ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ ﴾، واتە: ژنەکانتان چوار یەکیان

---

١) فتح القدير، ج: (١)، ص: (٥٥٩).

هەیە لەوەی کە ئێوە بە میرات بە جێی دێڵن، دیارە کە کچەکان دوو لەسەر سێی میراتەکەیان بردووە، دایکیشیان چوار یەکی میراتەکەی بردوە.

بەڕێزان!

کاتێك باسی ئەو بەسەرهاتانە دەکەین، ئنجا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم قورئانە چۆن هاتۆتە خوار، بە تایبەتی ئایەتە مەدەنییەکان، هەر یەکەی کە هاتۆتە خوار، چارەسەری کێشەیەکی کردووەو بەرگریی لە ستەملێکراوێك کردوە، دەستی ستەمکارێکی گرتوە کە زوڵم نەکاتو هەقەکەی لێ وەربگرنەوە، ئەم ئایەتانە ئاوا کۆمەڵگای یەکەمی ئیسلامیی یان بنیاتناوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای پەروەردگار ڕوو لە کۆمەڵگای مسوڵمانان دەکات، بە گشتی ڕوو لە مسوڵمانان دەکات، وە ڕوو لە کاربەدەستانی مسوڵمانان دەکات، ئەگەر حکوومەت بن، ئەگەر سەرپەرشتیار بن، وە ڕوو لە دایكو بابەکان دەکات بە تایبەتتر، دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ ﴾، خوا دەربارەی منداڵەکانتان ڕاتاندەسپێرێو ئامۆژگارییتان دەکات، کە بەو شێوەیە میراتتان لێ بگرن، ﴿لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾، بۆ نێرینە وەك بەشی دوو مێینە هەیە، واتە: نێرینە دوو هێندەی بەشی مێینە، میرات دەگرێ، ئەوە دیارە وەك بنچینەیەکە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی کچو کوڕن، واتە: بابێك کە دەمرێ کوڕی هەن و کچی هەن، کوڕەکان دوو هێندەی کچەکان میرات دەبەن، بۆچی وایە؟ ئێمە دوایی باسی دەکەین کە حیکمەتی چییە؟ بەڵام هەر بە کورتیی دەڵێین: لەبەر ئەوەی کوڕەکە دوایی کە دەیەوێ هاوسەرگیریی بکات، دەبێ مارەیی بداو مەسرەف بکاتو ماڵو خێزان بەڕێوەبەرێ، بەڵام کچەکە هەتا لە ماڵی بابیەتی، مەسرەفی دەکێشرێ، بابی نەبوو، برای، مامی، پاشان کە شوو دەکات، بۆخۆی ئەوە هیچ کە مەسرەف ناکات، بەڵکو سەرەڕاش مارەیی دەدرێتێو مەسرەفیشی

دەكێشرێو، هیچ ئەركێكی ناكەوێتە سەر، لەبەرئەوە كوڕەكە زیاتر پێویستی بە ماڵو سامان هەیە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ﴾، ئەگەر دوو ئافرەت زیاتر بوون، واتە: ئەگەر ئەوانەی كە میرات لە بابیان دەگرن دوو كچ زیاتر بوون، بۆچی نەیفەرمووە: (فَإِنْ كُنَّ بَنَاتٍ)؟ تاوەكو وا تەصەووڕ نەكرێ كە دەبێت حەتمەن كچ بنو لە ماڵی بابیان بن، بەڵكو با كچ بێو شووشی كردبێو لە ماڵی مێردی خۆیشی بێ، بەڵام كە بابی دەمرێ، یان دایكی دەمرێ، میراتی هەر لێ دەگرێ، ﴿ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ ﴾، ئەگەر ئافرەت بوونو لە دوو زیاتر بوون، توێژەرەوانی قورئان هەموو دەڵێن: ئەگەر دووانو زیاتریش بوون ﴿ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ﴾، ئەوە دوو لەسەر سێی ئەو میراتەی كە بابیان یان دایكیان بەجێی دەهێڵێ، بۆ وان دەبێ، بەمەرجێك برایان لەگەڵدا نەبن، واتە: ئەگەر كچ بوونو هەر خوشك بوون، دووان یان زیاتر بوون، ئەوە دوو لەسەر سێی میراتی باب یان دایكیان دەبەن، ئەدی ئەگەر كەسێك مردو یەك كچی لێ بە جێما؟ ﴿ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصۡفُ ﴾، وە ئەگەر یەك كچ بوو، ئەوە ئەو كچە لەوكاتەدا نیوەی میراتەكە دەبا، مادام برای لەگەڵدا نەبن.

ئنجا دوای ئەوەی باسی میرات گرتنی منداڵانی كرد، دێتە سەر میراتگرتنی بابو دایكیان، بۆچی؟ چونكە ئەوەی كە گرنگترە خوای پەروەردگار پێشی دەخاتو منداڵ زیاتریان پێویست بە ماڵو سامان هەیە، بۆیە پێشی هی وان باس دەكات، منداڵ تازە دێتە نێو ژیانەوە، كچە دەیەوێ شوو بكات، كوڕە دەیەوێ ژن بێنێ، بەڵام بابو دایك تازە بەشی خۆیان ژیانیان كردوە، بۆیە هی وان دوا دەخات، دەفەرموێ: ﴿ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ ﴾، وە بابو دایكی كەسێك كە خەریكە بمرێ یاخود مردوەو میرات بەجێ دێڵێ، بۆ هەركامێكیان یەك لەسەر شەشی میراتی كوڕەكەیان یاخود كچەكەیان

دەگـرن لـەوەی کـە بـەجێی دێڵـێ ﴿إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾، ئەگـەر ئـەوە کـە دەمـرێ منداڵـی هـەبوو، بـابو دایکـی شـەش یـەك دەگـرن، مـادام منداڵـی لەپـاش بەجێمابوو، جـا کورِ بێ، یـان کـچ بێ، یـەك بێ، یان زیـاتر بێ.

ئەدی کەسێك کە دەمرێو کەسی لە دوا بەجێ نامێنـێ، نـە کـورِ نـە کـچ، چۆن بـابو دایکـی میـراتی لـێ دەگرن؟ دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾، ئەگـەر منداڵـی لەپاش بەجێنەمابوون، ئەوە لـەو حـاڵەتەدا دایکـی سـێ یـەك دەگـرێ، ئـەدی بـابی؟ بابیـشی دوو سـێیەك (٣/٢) دەگـرێ، بۆچـی؟ چـونکە ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾، نێرینـە دوو بەرانبـەری مێینـە دەگـرێ، ئەگەر دایکـی یـەك لەسـەر سـێی میـراتی کورِەکـەی بگـرێ، کە منـداڵی نیـەو تەنیـا دایـكو بـاب میـراتی لـێ دەگـرن، مانـای وایـە بابەکـە دوو هێنـدەی دایکـەکـە دەگرێ کـە دوو لەسـەر سـێیە، ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ﴾، وە ئەگـەر ئـەو کەسـەی کـە دەمـرێ، بـرای هـەبوون، واتـە: سـەرەرِای هـەبوونی دایـكو باب، براشی هـەبوون، ئـەو کاتـە بـابو دایکـی هەرکامێکیـان شـەش یـەك دەگـرنو برایەکـان هـیچ نـاگرن ئـەوەش پێـی دەگوتـرێ: (حَجْبُ النُّقْصـان)، واتـە: برایـەکان میـراتی لـێ ناگـرنو، هـەر بـابو دایکـی میـراتی لـێ دەگرن، بـەڵام برایەکـان دەبنـە هـۆی ئـەوەی کـە میـراتی دایکیـان کەمبێتـەوە، جـا ئـەوە دوایـی باسـی دەکـەین، حیکمـەتەکـەی چـییە؟ بـەڵام ئێـستا هـەر دەڵـێین: حیکمەتەکـەی ئەوەیـە کـە مـادام بـرای هـەبن دیـارە ئـەو برایانـە ئـەرکی بەخێوکردنیـان لەسـەر بابیانـە، لەبەرئـەوە میـراتی دایکیـان لـە سـێیەکەوە دەگوازرێتـەوە بـۆ شـەش یـەك، بۆئـەوەی زیادەکـەی بـچێتەوە بـۆ لای بابیـان، تـاکو مەصرِەفی ئـەو برایانـەی دیکـەی پـێ بکـات ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾، ئـەوەش دوای جێبـەجـێ کردنـی وەصـیەتێکـە کـە ئـەوەی خەریکـە بمـرێ، یـان ئـەوەی وەفـاتی کـردوە، کردوویـەتی، ﴿أَوْ دَيْنٍ﴾، یـاخود دانـەوەی قـەرزێك کـە

لەسەریەتی، پێشێ دەبێ قەرزەکەی بدرێتەوە، ئنجا وەصیەتەکەی جێبەجێ بکرێ، دوایی میراتەکە دابەش بکرێ لە چوار شوێنان ئەمە هاتوە، کە ئەمانەن: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ... ﴿١١﴾﴾، ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ... ﴿١٢﴾﴾، ﴿مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ ... ﴿١٢﴾﴾، ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ ... ﴿١٢﴾﴾، دەبێ قەرزەکە بدرێتەوەو وەصیەتەکە جێبەجێ بکرێ، ئنجا دوایی میراتەکە دابەش دەکرێ، پاشان دەفەرموێ: ﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾، ئەوانەی میراتتان لێ دەگرن، باب‌و دایکی خۆتان‌و ڕۆڵەکانی خۆتانن، واتە: قەڵس مەبن کە خوای بەرز وای داناوە، چونکە جاری وایە کاسێك ڕقی لە باببەتی، یان کەیفی بە دایکی نایەت، یان کوڕێکی خۆی خۆشناوێ، یان کچێکی خۆی خۆشناوێ، خوای کاربەجێ هەست‌و سۆزیان دەجووڵێنێ‌و دەفەرموێ: باب‌و دایك‌و کچ‌و کوڕو ڕۆڵەی خۆتانن‌و خوا چۆنی دابەش کردوە، با بەو شێوەیە بێ ﴿لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾، ئێوە نازانن کامیان قازانجی زیاترتان پێدەگەیەنێ، چ لە دنیا چ لە دوارۆژدا، ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾، ئەوەش پێویستی یەکە لەلایەن خواوە، واتە: پێوەی پابەندبن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾، خواش بێگومان زاڵی کاربەجێیە، خوا دەزانێ چۆنی دابەش دەکات، کاربەجێشە کێ چەندی دەداتێ‌و کێش چەندی ناداتێ.

ئنجا دوای باسکردنی میراتگرتنی منداڵان‌و، پاشان هی باب‌و دایکان، واتە: هی منداڵان لە باب‌و دایکیان، ئنجا هی دایك‌و بابیان لە منداڵان، دێتە سەر میراتگرتنی مێرد لە ژن‌و، ژن لە مێرد، ﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ﴾، وە ئێوە نیوەی ئەوەتان بۆ هەیە کە ژنەکانتان بەجێی دێڵن، مادام منداڵیان نەبێ، واتە: منداڵیان نەبێ لە خۆتان

یان له مێــردی دیکه، یانی نیوەی میـراتی ژن بۆ مێردەکەیـەتی بـه مەرجێـك ئـەو ژنه منداڵی نەبێ، چ له مێردەکەی که میـراتی لـێ دەگرێ، چ له مێردێکی دیکــەی، بەڵام ئەگەر منداڵی هەبوون، کـوڕ بن یان کـچ، کەم بـن یــان زۆر، ﴿ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ﴾، وه ئەگــەر ئـەو ژنانـەی کـه میــراتیان لــێ دەگـرن منداڵـیان هــەبوون، ئـەوه ئێـوه چواریەکــی ئـەو ماڵەی کـه بەجـێی دێڵــن، بـه میــراتی دەگرن ﴿ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ﴾، ئـەو میـرات دابەشـکردنەش دوای جێبەجـێ کردنی وەصـیەتێك کـه ڕایــان سـپاردوه، وه دوای قـەرزێك کـه کەوتۆتـه سـەریانو دەبـێ بدرێتـەوه، جێبـەجێ دەکـرێ، ئـەوه میـراتگــرتنی مێــرد لــه ژن، ئــەدی میـــراتگرتنی ژن لــه مێـــرد؟ دەفــەرموێ: ﴿ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ ﴾، وه هاوسـەرەکانتان چواریەکیان بـۆ هەیـه لـەوەی که ئێوه بەجێی دێڵـن به میـرات، واته: یەك لەسەر چواری ماڵەکـەتان بـه میـرات دەگرن ﴿ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ﴾، ئەگەر منداڵتان نەبوو، واته: ئەو پیاوه ئەگەر منداڵی نەبوو، کوڕی نـەبوو، کچی نـەبوو، نـه لـەو ژنـەی کـه میـراتی لـێ دەگـرێ، یــاخود لــه ژنــانی دیکــه، یـــەك بــێ، دوو بــن، چـــەند بــن، ئــەوه چــواریەکی میـــراتەکەیان دەگــرن، ﴿ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ﴾، وه ئەگـەر منـداڵتان هـەبوون، ئـەوه ژنـەکانتان هەشـت یـەك لـەوەی کـه بـەجێتان هێـشتوه، بـه میــرات دەگـرن ﴿ مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ﴾، دوای جێبــەجێکردنی وەصــیەتێك کــه کردووتانــەو دەیکــەن، وه دوای قــەرزێك کــه لەسـەرتانەو دەبـێ بدرێتـەوه، ئنجا میـراتەکه بـەو شـێوەیه ئـەو هەشـت یەکــەی لـێ بـدرێ بـه ژنــەکه ئەگــەر پیـاوەکه منـداڵی هــەبوو، ئەگـەرنا چــواریەك، وه دوایـی ئەوانـی دیکـەش که میـراتی لـێ دەگـرن هەر کەسـه بەپێی خۆی.

ئنجا دێتــه سـەر جۆری چوارەمی میــرات گـران، پێـشـێ باسـی منـداڵانی کـرد، ئنجــا باســی بـابو دایکـانی کـرد، دوایـی باسـی ژنو مێــردانی کـرد، ئنجـا باسـی

خوشـك‌و برایـان دەكات، بەپێی ڕیزبەندییـەك كـە دیـارە ئـەوەی لـە پێشـترە گرنگـی زیـاتری پێـدراوە، ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾، وە ئەگـەر پیـاوێك یـان ئافرەتێـك بـە شـێوەی بـێ وەچاغ (كَلاَلَة) میـراتی لێدەگیـرا، جا ئایـا (كَلاَلَة)[1] كـێیە؟ (كَلاَلَة) بریتیە لە كەسـێك كە: بـاب‌و دایكی نـەبن منداڵیـشی نـەبن‌و، باب‌و دایكی نەبـێ واتـە: ئەسـڵی نەبـێ، منداڵیـشـی نـەبێ، واتـە: فـەرعی نەبـێ، ئنجا ئایـا ئەگـەر ئەسـڵ‌و فـەرعی نـەبوو، كـێ میـراتی لـێ دەگـرێ؟ خوشـك‌و بـرا، ﴿وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٌ﴾، ئەگـەر برایـەكی هـەبوو، یـان خوشـكێكی هـەبوو ﴿فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ﴾، هەركامێكـیان شـەش یـەك دەگـرێ، كە لێـرەدا مەبەسـت خوشـك‌و بـرای دایكـیین، بـەڵام لـە ئایـەتی كۆتـایی سـوورەتی (النـساء)دا بـاس دەكـات كـە ئەگـەر یـەك خوشـكی هـەبوو، نیـوەی میـراتەكە دەبـاو ئەگـەر بـرا بـوو، ئـەوە هـەموو میـراتی خوشـكەكەی دەبـا، لەوێـشـدا مەبەسـت خوشـك‌و بـرای بـاب‌و دایكیین، ئەدی ئەگـەر كۆمـەڵێك خوشـك و بـرا بـوون؟ دەفـەرموێ: ﴿فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِ﴾، كەسـێك دەمـرێ كۆمـەڵێك خوشـك‌و برای دایكیی هـەن‌و، بـاب‌و دایكـی نیـن میـراتی لـێ بگـرن‌و منداڵیـشی نـین، ئەوە یەك لەسـەر سـێی ماڵەكەی بەسەر خوشك‌و براكانیـدا دابـەش دەكرێ ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾، دوای جێبـەجێكردنی وەصـیەتێك كـە ڕاسـپێردراوە، وە درانـەوەی قـەرزێك كـە كەوتۆتـە سـەری، بـەڵام دەبـێ هـەم وەصـیەتەكە بـە شـێوەیەكی زیـانگەیەنەرانە نەبـێ‌و، هـەم قـەرزەكەش بـە شـێوەیەكی زیـانگەیەنەرانە نەبـێ، جـا ئـەوە دوایـی باسـی دەكـەین كـە چۆن چۆنی مرۆڤ وەصـیەت بكـات، زیـان دەگەیـەنێ بـە میـراتگرەكانی؟ یاخـود چۆن دەبـێ كە قـەرزێكی لەسـەر بـێ‌و ببێتـە هـۆی ئـەوە كە زیانیـان پـێ بگـەیەنێ؟!

١) پێموایە وشـەی؛ (بێوەچاغ) بۆ (كَلاَلَة) مانایەكی پڕ بە پێستە.

چونکــە ئەگــەر وابــێ ئــەو وەصــیەتەو ئــەو قــەرزە، نیـشـانەی پرســیاریان دەکـەوێتە سـەر، کە دوایی بە وردیـی باسـیان دەکەین.

پاشــان دەفـەرموێ: ﴿وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ئــا ئـەوە ڕاســپاردنێکە لـە خـواوە، پێـشـێ فـەرمووی: ﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ئـەوە فـەرزێکــە لەلایــەن خــواوە، لێرەش دەفەرموێ: ﴿وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾، دوایـی ڕوونـی دەکەینـەوە لەبەرچییە؟ ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾، وە خـوا زانــای هێــدیی‌و مەنـدە، ئنجـا خـوا سـبحانه و تعالى لە کۆتـایی باسی میـراتدا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾، ئا ئەوانـە سـنوورەکانی خـوان، ئــەو میــرات دابەشـکردنە، فــلان ئەوەنـدە بــەرێ‌و فــلان ئەوەنـدەو فــلان ئەوەنـدە، ئـەوە سـنوورەکانی خـوان، یاسـاکانی خـوان، ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، وە هەر کەسێك فەرمانبـەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، خـوا دەیخاتـە چەند باغێکەوە ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن، بـە هەمیـشـەیی تێیانـدا دەمێننـەوە، ئـەوە بـۆ هـەر کەسـێك کـە پابەنـدبێ بـە شـەریعەتی خـواوە، واتـە: پابەندبـێ بـە سـنوورەکانی خـواوەو بیانپـارێزێ‌و نەیانبەزێنـێ ﴿وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، وە ئـەوەش بردنـەوەی مەزنـە، بردنـەوەی مـەزن‌و سـەرکەوتنی مـەزن‌و بـە ئامـانج گەیشتنی مەزن، ئەوەیە کە خوا لە بەندەی خۆی خۆشـبێ‌و بیخاتە بەهەشـتەوە، لـە بەرانبـەر چیـشـدا ئـەوەی بـۆ دەکـات؟ لـە بەرانبـەری ئـەوەدا کـە گوێڕایەڵـەو فەرمانبەرە بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پابەندە بە شەریعەتی خواوە.

ئــەدی بــە پێــچەوانەوە ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾﴾، بــەڵام کەســێك سـەرپێـچیی بکـات لــە خــواو پێغەمبــەری خــوا ﷺ ﴿وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ﴾، وە

سنوورەکانی ببەزێنی، سنوورەکانی کێ؟ هی خوا، چونکە پێغەمبەریش ﷺ مولزەم کراوە بە سنوورەکانی خواوە، سنوورەکان لە خواوە دیاری دەکرێن، وە ئەوەی کە پێغەمبەریش ﷺ لە سوننەتی خۆیدا فەرموویەتی، هەر بە وەحی خوایە، کەواتە: ئەوەی کە سەرپێچیی بکات لە خواو لە پێغەمبەری خوا ﷺو سنوورەکانی خوا ببەزێنێو لێیان تێپەڕێنێ، ﴿يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا﴾، بە تەئکید ئەوە دەیخاتە نێو ئاگرێکەوە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، ﴿وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾، وە ئازارێکی ڕیسواکەری بۆ هەیە، ئازارەکە بۆ جەستەیەتیو ڕیسواکردنەکە بۆ ڕووحیەتی، چونکە ئینسان لە ڕووح و جەستە پێکدێ، جەستەکەی ئەوە دیارە بە ئازار ئەشکەنجە دەدرێ، ئەدی ڕووحەکەی؟ ڕووحەکە بەو ئیهانەو سووکایەتیی پێکردنە کە لە دۆزەخدا هەیە، چونکە وشەی: ﴿مُّهِينٞ﴾، واتە: ڕیسواکەر، زەبوونکەر، وە شەرمەزارکەر.

خوا ﷻ وەك دەبینین زۆر بە گەورەییو بە گرنگیی لە دوای ئەوەی کە باسی میراتی کرد، باسی ئەوە دەکات کە ئەوانە سنوورەکانی خوان، ئەوەی پابەندبێ بە سنوورەکانی خواوە، دەیخاتە بەهەشتو ئەوەی لە سنوورەکانی خوا لابداتو بیانبەزێنێ، دەیخاتە دۆزەخ، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەم مەسەلەی میرات دابەشکردنە، بەو شێوەیەی کە شەریعەت فەرموویەتی، شتێکی زۆر گەورەو گرنگە، بۆیە هەموو ئەو پەرلەمان و ڕژێمانەی کە دەستکاریی دابەشکردنی میرات دەکەنو، پێیانوایە ئەوان لە خوای زانا باشتر دەزانن، لە ڕاستییدا سەهوویان کرد، سەهووی زۆر گەورەشیان کرد، جا دیارە هەر کەسێك مسوڵمان بێ، پابەندە بە یاساکانی خواوەو پابەندە بە سنوورەکانی خواوە، جا چ لە بواری باری کەسێتییو میرات دابەشکردن دابێ، چ لە هەر بوارێکی دیکە دابێ، هەر کەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، دەوڵەت بێ، پەرلەمان بێ، شەخص بێ، حیزب بێ، ناتوانێ قسە بکات دەربارەی یەکێك لەو یاسایانەی خوای پەروەردگار کە بە ڕوونی فەرموونی، بە تایبەتی مەسەلەی میرات دابەشکردن، وە هەر شتێکی دیکەی کە دەقی قورئانو سوننەتی ڕوونی

بێ چەندو چوونی لەسەرە، ناتوانێ خۆی بە مسوڵمان بزانێو قسە لەوبارەوە بکات، خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان لەو کەسانە بگێڕێ کە پابەندن بە شەریعەتی خواو بە سنوورەکانی خواوەو، بە دڵو قەناعەتەوە بۆ خوا ملکەچن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئایەتەکانی (١١، ١٢) وەك پێشتر باسمان کرد هەروەها ئایەتی کۆتایی سوورەتی (النساء)، ئایەتی (١٧٦)، زانایانی ئیسلام هەموو بنەما گرنگەکانی میراتیان لێ هەڵێنجاون، لەگەڵ هەندێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا بۆ ئاگاداریی هەموو لایەك زانیاریی میرات دابەشکردن (علم تقسيم الميراث)، یەکێکە لە زانیارییە گرنگەکانی شەریعەتو هەر لە دێر زەمانەوە هەم هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەم زانایانی دوای ئەوان، گرنگییەکی زۆریان بە زانیاریی میرات داوە، کە وەك گوتمان لەو سێ ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (النساء)دا، بنەماکانی ئەم زانیارییە باسکراون لەگەڵ هەندێك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ بە تایبەتی ئەم فەرمایشتە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ فَمَا أَبْقَتِ الْفَرَائِضُ: فَلأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٦٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦١٥)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٨٩٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٤٠)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵ لە نێوان خاوەن بەشەکاندا دابەش بکەن، بە پێی کتێبی خوا (واتە: میرات دابەش بکەن لە نێوان ئەوانەدا کە خوا بەشی بۆ دیاری کردوون، جا دوو لەسەر سێیە، نیوەیە، شەش یەکە، هەشت یەکە)، وە ئەوەی مایەوە بۆ یەکەمین پیاوێکی نێرینە لە خزمانی مردووە، واتە: کێ لە هەموو کەس لێی نزیکتربێ کە پێیان دەگوترێ: (عَصَبَة) چ میراتی گرتبێ، چ میراتی

نەگرتبێ، گرنگ ئەوەیە ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە خاوەن بەشەکان (ذووا الفروض) بۆ خزمانی پشتی ئەو مردووە دەچێ، کێ نزیکتربێ.

هەڵبەتە زانیاریی دابەشکردنی میرات وەك گوتم: بە شێوەیەکی گشتی بنەماکانی لەم سێ ئایەتە موبارەکەو لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دایە، بەڵام وردەکاریی‌و لقو پۆپی زۆری تێدا هەیە، وە هەندێکیش لە زانایان، لە هەندێك لە مەسەلەکانی میراتدا ڕاجیایی یان هەیەو، ئێمە دەرفەتمان نیە بچینە نێو ئەو وردەکارییەوە، بەڵام هەر ویستمان ئاماژەیەکی پێ بدەین، وە لە هەندێك لە شوێنەواراندا هاتوە یەکەمین زانیاریی کە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ فەرامۆشی دەکاتو لە بیری دەچێتەوە، بریتیە لە زانیاریی میرات، بەڵام تەماشای سەنەدی شوێنەوارو فەرموودەکانم کرد، زۆر بەهێزم نەبینین بۆیە نەمهێنان.

<u>**مەسەلەی دووەم:**</u> ئەگەر تەماشای ئەو سێ ئایەتە بکەین، وەك گوتم بنەماکانی زانیاریی میراتیان گرتۆتە خۆیان، واتە: ئایەتەکانی (١١، ١٢) وە ئایەتی (١٧٦) لە سوورەتی (النساء)دا، ئەم ڕیزبەندیی یە دەبینین، واتە: ڕیزبەندییەکی مەنتیقیی دەبینین: لە ئایەتی ژمارە (١١)دا باسی میراتگرتنی منداڵان (چ کچ، چ کوڕ)و بابو دایك کراوە، کە بێگومان منداڵەکانی هەر کەسێك، وە پاشان دایكو بابی، نزیکترین کەسی مردوون، وە لە ئایەتی ژمارە (١٢) خوای پەروەردگار باسی میراتگرتنی مێرد لە ژن، وە ژن لە مێرد، وە پاشان میراتگرتنی خوشكو برای دایکیی کە دوایی باسی دەکەین، باسی ئەوانە کراوە، وە لە ئایەتی ژمارە (١٧٦)دا خوا ﷻ باسی میراتگرتنی خوشكو برای بابیی، یاخود بابییو دایکیی کردوە، کەواتە: بە ڕیزبەندییەکی مەنتیقیی، کێ نزیکترە خوای کاربەجێ پێشێ باسی میراتگرتنی ئەوی کردوە، بەمجۆرە: منداڵەکان، پاشان بابو دایك، ئنجا دوایی مێرد لە ژنو ژن لە مێرد، دوایی خوشكو برای دایکیی، پاشان خوشكو برای بابییو بابو دایکیی.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾، خوا ڕاتان دەسپێرێ دەربارەی منداڵەکانتانو ئامۆژگارییتان دەکات، ئایا دوێندراو لەم ئایەتەدا کێیە؟ خوای پەروەردگار کێی دواندوە؟ توێژەرەوانی قورئان وەك عادەتی خۆیان هەر یەکەی لایەکیان گرتوە:

یەکێك دەڵێ: دوێندراو لێرەدا دایكو بابن.

یەکێکی دیکە دەڵێ: نەخێر، دوێندراو مسوڵمانانن بە گشتی.

یەکێکی دیکە دەڵێ: دوێندراو دەوڵەتی ئیسلامیی یەو بەرپرسانن ... هتد.

بەڵام ئێمە دەڵێین: دوێندراو (مخاطب) ئەوەی کە خوا دواندنەکەی ئاراستە کردوە کە دەفەرموێ: خوا دەربارەی منداڵەکانتان ئامۆژگارییتان دەکاتو ڕاتاندەسپێرێ، کە بەو شێوەیە میراتیان پێ بدەن، دوێندراو (مخاطب) لە یەك کاتدا هەم بابو دایکن، بە نسبەت منداڵەکانەوە، هەروەها منداڵو ڕۆڵەن، بە نسبەت دایكو بابیانەوە، وە پاشان کۆمەڵگایە، وە دوایی بەرپرسانو حوکمڕانانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیین، واتە: هەموو ئەوانە مولزەمن بەوەی بەو شێوەیە کە خوا فەرموویەتی، میرات دابەش بکرێ، دابەشی بکەن، واتە: کاتێك کە دەوڵەت کەمتەرخەم دەبێو کۆمەڵگا کەمتەرخەم دەبێ، مانای وانیە کە بەرپرسیارێتی لەسەر بابو دایکەکان لاچووە، یان لەسەر خێزانەکان لاچووە، کە بەو شێوەیەی شەرع گوتوویەتی میرات دابەش بکەن، بەڵکو هەموویان هەر مولزەمن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾، ئەم ڕستەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە خوا ﷻ سەبارەت بە مرۆڤەکان لە بابو دایکیان لەگەڵیان بە بەزەیی ترە، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ

دەفەرموێ: ئەی بـابو دایکەکـان! خـوا دەربـارەی منداڵەکانتان ئامۆژگـارییتان دەکات ئـاوا بکەن لەگەڵـیان، واتـە: خـوا ﷻ سـەبارەت بـە مرۆڤـەکان لـە بــابو دایکـیان زیـاتر لەگـەڵیان بـە ڕەحـمو بەزەیــی یـە، نـەوەك بــابو دایکــیان عەقڵــیان پــێ نەشـکـێو نـەزانن چۆن وەصــیەت بکـەن، یاخــود نـەزانن کـە چـۆن میــراتێك کـە لێیـان بـەجێ دەمێنـێ، بەسـەریانـدا دابـەش بکـرێ، خـوای کاربەجـێ لـە جیـاتی ئـەوان ئـەو میــراتەی دابـەش کـردوە، کەواتـە: لـە بـابو دایکەکـان بە بەزەیی تـرە سـەبارەت بـە کـوڕو کچـەکانی ئـەوان، لەوبارەشـەوە ئـەم فەرموودەیـە هەیـە: ﴿عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قُدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِسَبْيٍ، فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَبْتَغِي، إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَتَرَوْنَ هَذِهِ الْمَرْأَةَ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟ قُلْنَا: لاَ وَاللَّهِ وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لاَ تَطْرَحَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اللَّهُ أَرْحَمُ بِعَبْدِهِ مِنْ هَذِهِ الْمَرْأَةِ بِوَلَدِهَا﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٥٩٩٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩١٢)، واتـە: عومـەری کـوڕی خەتتــاب خـوا لــێی ڕازی بــێ دەگــێڕێتەوە کـە ڕۆژێـك دیلــی جـەنگی هێنـران بۆ لای پێغـەمبەری خوا ﷺ (سَبْيٌ: بـە ئــافرەتو منــداڵ دەگوترێ کـە لـە جەنگـدا بـە دیـل دەگیــرێن) ئافرەتێـك لـەنێو دیلەکانـدا دەگـەڕا لـە منداڵەکـەی خـۆی کـە لــێی دابـڕا بـوو، کاتێك کـە منداڵێـکی دۆزیـەوە لـەنێو دیلــەکاندا (دیـارە منـداڵی خـۆی بـووە) یەکسـەر بـە زگـی خۆیـەوە نووسـاندو باوەشی لێـداو یەکسەر مـەمکی بۆ دەرهێنـاو شـیـری دایـە (دەبـێ شیــرە خۆرە بووبـێ) دەڵـێ: لەوکاتـەدا پێغـەمبەری خـوا ﷺ پێــی فـەرموون: پێتـان وایـە ئـەم ئافرەتـە ئـەم منداڵــەی خـۆی فـڕێ دەداتـە نێـو ئـاگر؟ ئێمـەش گوتمــان: نەوەڵــلا، مـادام بتوانــێ فڕێــی نـەدا، فڕێــی نـادا، (واتـە: مەگـەر زۆری لــێ بکـرێ)، پێغـەمبەر ﷺ فەرمووی: بە تەئکید خوا بەرانبـەر بە بەندەکەی لەو ئـافرەتە بەرانبــەر بە ڕۆڵەکـەی بە بەزەیی تـرە. کەواتـە: بەنـدە هـەرچ بـڕ ڕوو لە خــوابێو بۆ خوا صـوڵحاوبێ، خوا هێندەی خۆشدەوێ نایخاتە نێو ئاگر.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئایا بەکارهێنانی وشەی: (ذَکَر) و (أُنْثَی) کە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾، حیکمەتی چییە کە خوا نەیفەرمووە: (لِلرّجُلِ مِثْلُ حَظِّ المرأَتَيْنِ) یان (للرّجال مثلي حَظِّ النِّسَاءِ)؟

لێرەدا کە هەردووك وشەی: (ذَکَر) و (أُنْثَی)ی بەکارهێناوە، حیکمەتەکەی ئەوەیە ئەگەر فەرمووبای پیاوو ئافرەت، یاخود پیاوان‌و ئافرەتان، ئەو کاتە وای لێ وەردەگیرا کە تەنیا ئینسانانی باڵغ میرات دەگرن، جا چ نێربن، چ مێ بن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾، بۆ نێرینە هێندەی بەشی دوو مێینە هەیە، واتە: ئەو نێرینەیە چ پیاوبێ چ منداڵ بێ، وە مێینەکەش بە هەمان شێوە، چ ئافرەت بێ، وە چ کچێکی منداڵ بێ، تاکو وەك پێشتر باسمان کرد، ئەو عادەتەی سەردەمی نەفامیی عەرەبەکان‌و غەیری عەرەبەکانیش هەڵبوەشێتەوە، کە میراتیان نەدەدا بە منداڵ، چ کوڕ بووایە، چ کچ بووایە، بەڵکو زۆرجار میراتیان نەدەدا بە ئافرەتانیش.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ ﴾، بۆ نێرینە ئەندازەی بەشی دوو مێینە هەیە، کە پێشتر باسمان کرد، لێرەدا مەبەست لە (ذَکَر) واتە: کوڕ، وە مەبەست لە (الأُنثَيَيْن)، واتە: دوو کچ، جا ئایا بۆچی خوای پەروەردگار بۆ کوڕ دوو بەرانبەری کچ میراتی داناوە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە زۆر ئاشکرایە کە لە شەریعەتی ئیسلامیی دا، وە لە کۆمەڵگای ئیسلامیی دا، بگرە لە هەر کۆمەڵگایەکدا کە فیطرەتیان تێکنەچووبێ‌و بەپێی فیطرەت‌و سروشتی ساغیی ئینسان بەڕێوەبچن، پیاو دەستپێشخەرە بۆ ئافرەت، کە هاوسەرگیریی لەگەڵدا دەکات، وە مارەیی پێدەدا، وە پاشان مەسرەف‌و نەفەقەو پۆشاك‌و شوێن دابینکردن لەسەر پیاوە، کە هی خۆیشی‌و هی خێزانەکەیشی‌و منداڵەکانیشی دابین بکات، لەبەر ئەوە کوڕ زیاتر پێویستی بەو پارەیە هەیە، لەو میراتەی بابی یاخود

دایکـی، بۆیـە خـوای دادگـەر دوو هێنـدەی خوشـکەکانی دانـاوە بـۆ برایـەکـان، چونکە ئـافرەت وەختێك شوو دەكات، مـارەیی پـێ دەدرێو پـارە سـەرف ناكـات، وە وەختێك كە دەچێتە ماڵو مێردی مەسرەفی دەكێـشـرێو مەسـرەف ناكـات، وە كـاتێك لە ماڵی بابیـەتی یان لە ماڵی برایـەتی، یـان لە ماڵی مامیـەتی، هـەر چــۆن بـێ، ئــافرەت هـیچ كاتێـك شــەریعەت مەسـرەف كێـشـانی خۆیـشی نەخستـۆتە ئەستۆی، چ جای هی غەیری خۆی! بەڵام پیاو مەسـرەفی خۆیـشـی، وە هی ماڵو عائیلـەشـی بە ئەسـتۆوەیە، لەبەر ئەوە شـتێكی زۆر دادگـەرانەیە كە خوای كـاربەجـێ دوو هێنـدەی داوە بە برایەكـان لە بەرانبـەر خوشـكەكاندا، ئنجـا هەر ئەو حیكمەتەشـە كە بـابو دایـك وەختێـك كـە هـەر خۆیان میـرات بگرن لە كوڕەكەیان، یان لە كچەكەیانو منداڵیان لەگەڵـدا نـەبن، هەركـامێكـیان شەش یەك دەگرن، وەك یەك: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ﴾، وە بابو دایكی كەسێك كە مردوە، بۆ هـەر كامێكیان یەك لەسەر شەشی میـراتی كوڕەكەیان یاخود كچەكەیان میـرات دەگرن لەوەی كە بەجـێی دێڵـێ ﴿إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾، ئەگەر ئەوە كە دەمرێ منداڵـی هـەبوو، بـابو دایكـی شـەش یـەك دەگرن، جا منداڵەكـە كـوڕ بێ، یان كـچ بێ، یـەك بـێ، یـان زیـاتر بـێ، بـەڵام ئەگەر منـداڵی نەبـن، ئـەو كـاتە دایكی كەمتـر دەگـرێ، دەفـەرموێ: ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ﴾، ئەگـەر منـداڵی نـەبن، دایكـی سـێیەك دەگرێ، ئەدی بـابی چەندی لـێ دەگرێ؟ ئـەوەی كە دەمێنێتـەوە بـۆ بابیـەتی، واتـە: بـابی دوو لەسـەر سـێی دەگـرێ، چونكـە برایـەكان بـۆ خۆیـان میـرات ناگرن، بەڵام میـراتی دایكـیان كەم دەكـەنەوە، وە هی بابیـان زیاد دەكەن، دیارە ئەویـش لەبـەر ئەوەیـە كـە ئەگــەر وابـێ، ئەوكاتـە بابیـان مەسـرەفی زیـاتری دەچـێو پێویسـتی بە ئیمكـانیەتی زیاتر دەبـێ بۆ ئـەوەی مەسـرەفی برایـەكانی بكێـشـێ، واتـە: برایـەكانی بابـای مـردوو، كـە بابیـانو بـابی كـوڕە مردووەكـە، مەسرەفیان دەكێشـێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** لە چوار شوێنان لە ئایەتەکانی (١١، ١٢)دا خوای پەروەردگار باسی ئەوەی کردوە پێش ئەوەی میرات دابەش بکرێ، دەبێ وەصیەت جێبەجێ بکرێو ئەو قەرزەش کە ئەو مردووە لەسەریەتی بدرێتەوە، دیارە لە هەر چوار شوێنەکە وەصیەت پێش قەرز خراوە، کە پێشتر ڕیزمان کردوونو دواییش دەیانهێنین، وەك دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾، دوای وەصیەتێك کە ڕاسپێردراوە، جێبەجێ دەکرێ، وە پاشان قەرزێك کە کەوتۆتە سەری، دەدرێتەوە، بەڵام زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگنو ڕێککەوتوون کە لە کاتێکدا بویسترێ وەصیەتەکە جێبەجێ بکرێو قەرزەکە بدرێتەوە، دەبێ قەرز پێش بخرێ، واتە: دەبێ کەسێك کە دەمرێ پێشێ قەرزەکانی بدەنەوە لە میراتەکەی، ئنجا ئەگەر وەصیەتی کردبێ، وەصیەتەکەش جێبەجێ بکرێ، پاشان میراتەکەی دابەش بکرێ، ئەوە زانایان هەموو لەسەری یەك دەنگن، وەك: شەوکانی لە (فتح القدير) هێناویەتی[1]، ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە کە قەرزدانەوەکە پێش جێبەجێکردنی وەصیەت دەخرێ؟ ئەدی بۆچی خوای کاربەجێ وەصیەتی پێش قەرز خستوەو دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾، یان دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖ...﴿١٢﴾﴾، یان ﴿مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖ ...﴿١٢﴾﴾، یان دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ﴾؟! زانایان چەند شتێکیان باسکردوە:

**یەکەم:** دەڵێن: لەبەر ئەوەی حالەتی وەصیەت کردن زیاترە لە قەرزدانەوە، واتە: بە زۆریی وایە خەڵك وەصیەت دەکات، بەڵام مەرج نیە هەموویان قەرزداربن، بەڵام مەگەر چۆن دەنا هەر کەسێك کە دەمرێ وەصیەت دەکات.

---

١) ج: (١)، ص: (٥٥٦).

دووەم: دەڵـێن: وەصـیەت بەشـی هـەژارو نـەدارو ئەوانەیـە، بـەڵام قـەرز هـی خـاوەن قـەرزە، بۆیـە خـوای پـەروەردگار هـەقی هـەژارو نـەدارەكانی پێشخستوە.

سـێیەم: دەڵـێن: لەبەر ئـەوەی كە وەصـیەت لـە قـەرز زیاتر شێوەی میـرات دەكـات، چونكە وەصـیەت هیچ شـتێكی لـە بەرانبـەردا نیـە، بـەڵام قـەرز دیارە شـتێكی لە بەرانبـەردایەو كاتی خۆی ئەو كەسـە قـەرزدار بووە.

چـوارەم: دەڵـێن: لەبـەر ئـەوەی كـە ئـەو كەسـەی میراتـی لـێ دەگیـرێ، بۆخـۆی هۆكـاری وەصـیەتەكەیە، بـەڵام قەرزەكـە خـۆی هۆكـاری نیـە، بۆیـە وەصـیەتەكە خـوای زانـا پێـشی خـستوە، نـەوەكو ئیهمـال بكـرێ، واتـە: قەرزەكـە هـەر دەبـێ بدرێتـەوە، بـەڵام بـۆ ئـەوەی كەمتەرخـەمیی نـەكرێ لـە جێبـەجێكردنی وەصیەتەكەدا، خـوای پـەنهانزان لـە باسـكردندا پێشـی خسـتوە، ئەگەرنا لە جێبـەجێكردندا قەرزەكـە لە پێشـەوە دەبێ.

پێنجـەم: هەندێكیش گوتوویانە: لەبەر ئەوەی كە قـەرزدانەوە كە گرنگتـرە، وە بـۆ ئـەوەش كـە وەصـیەتیش گرنگـیی پـێ بـدرێو كەمتەرخـەمیی تێـدانەكـرێ.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** كـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، دیـارە پێـشـێ باسـی میـراتگرتنـی منداڵەكـان دەكـات، دوایـی باسـی بـابو دایكـیان دەكـات، جـا دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗا ﴾، نـازانن كامیان سوودی نزیكتـرە بۆ ئێوە، ئەم ڕسـتە قورئانییە مەبەسـتی ئەوەیـە كە ئێمە متمانـەمان هـەبێ بـە شـەریعەتی خـوای پـەروەردگار، وە عـاطیفـەو سـۆزی خۆمـان بەكـارنەهێنین، كەسـێك ڕقـی لـە برایەكەیـەتی، یـان ڕقـی لـە منداڵەكـەیەتی، یـاخود حەسـاسـیەتی بـە خزمێكـی هـەیە، ئەوانـە نەهێنـێتە پێـشو خـوای كـاربەجێ میـراتی چـۆن دانـاوە، بـەو شـێوەیە جێبـەجـێ

بكـرێ، وە خـواش دەزانـێ كـێ بـۆ كـێ چاكتـرە، دەبینـی تـۆ هەسـتیـاریـیت لەگـەڵ كەسـێك، لەگـەڵ منـداڵێكت، لەگـەڵ خزمێكـی نیزیكـت هەیـە، بـەڵام لەوانەیـە لـە دوای خـۆت ئـەو زیـاتر بـە كەڵكـت بـێو سـوودی بـۆت هــەبێ، یاخـود مرۆڤـ كوڕێـك یـان كـچێكی هـەبێ، دووعـای خێـری بـۆ بكـات، خێـرو صـەدەقەی بـۆ بكـات، بـە هەرحـاڵ خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: خــوا دەزانـێ كامیان سوودیان نزیكتـرە بۆ ئێوە، واتە: ئێوە لەبـەر عـاطیفـەی خۆتـانو لەبـەر میزاجی خۆتان دەسـتكاریی ئەو بەشـانەی میـرات مەكـەنو خـوا چۆنی دانـاوە ئـاوا جێبـەجێی بكـەن.

<u>**مەسـەلەی نۆیـەم:**</u> خـوای پەروەردگـار لـە كۆتـایی ئایـەتی دوازدەیەمـدا باسـی كەلالـە دەكـات، ئایـا مەبەسـت لـە كەلالـە كێیـە؟ كـە بـە كـوردی دەتوانیـن بڵێین: بـێ وەجـاغ، وەجـاغ كوێر، بـێ كـەس، یـاخود بـێ ئەسـڵو بـێ فـەرع واتـە: بـابو دایكـی نەبـێو ڕۆڵـەی نەبـێ، زانـایان لـەوبارەوە كەوتوونـە ڕاجیـایی یـەوە: زۆربەیـان دەڵـێن: كەلالـە ئـەو كەسـەیە كـە لەلایـەن خوشـكو بـراو خزمانیـەوە میـراتی لـێ دەگیـرێ، بـەڵام نـە بـابو دایكـی هەیـە مـیراتی لـێ بگـرن، نـە كوڕو نـە كچیشـی هەیـە، واتـە: نـە ئەسڵی هەیـەو نـە فـەرعی هـەیە.

وە (ابـن كثیـر) دەڵـێ: ئەمـە ڕای هـەر حـەوت فەقیهەكانـەو ڕای چـوار پێشـەوایەكانەو ڕای زۆربـەی زانایـانی پێشـینو پاشـینە، بەڵـكو زۆرێـك لـە زانـایان گوتوویـانە: یـەك دەنگـیی زانایـانی لەسـەرە، ئنجـا ئایـا بۆچـی ئـەو كەسـەی ڕۆڵـەو دایـكو بـابی نیـن، میـراتی لـێ بگـرن، نـاوی لێنـراوە كەلالـە؟! دوو ڕا هـەن:

<u>**ڕای یەكـەم:**</u> هەندێكـیان دەڵـێن: لەبـەر ئـەوە كـە: (الكَلاَلَة: مَصْدَر من تكلَّله النَّسَبُ أي أحاط به، وَسُمِّيَ الإكليلُ لإحاطته بالرأسِ مِنْ جَوَانِبِهِ)، (إكليل) واتـە: تـاج، ئـەوەی كـە لەسـەر سـەر دادەنـرێ، چـونكە دەوری سـەر دەدا، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی خزمـان دەوری ئـەو كەسـە دەدەن كـە لەسـەرەوە

ئەسڵی نیە، بـابو دایكـی نیەو ڕۆڵەشی لـە خوارەوە نیـە، بەڵـكو خزمـەكان لە دەوریـنـیو میـراتی لـێ دەگـرن، بۆیــە ئـەو نــاوەی لێنـراوە، یـان دەڵێن: (إنَّ الكَلاَلَةَ مَأْخُوذَةٌ مِنَ الكَلال وَهُوَ الإِعْيَاءُ فَكَأَنَّهُ يصيرُ المِيرَاث إلى الوَارِث عَن بُعْدٍ وإعياءٍ)، واتـە: (كَلاَلَـة) لـە (كـلال)ەوە هـاتوە، واتـە: ماندوویێتـی، واتە: وەك بڵێی میـراتەكە لە دوورەوە گەیشـتۆتە دەسـتی ئـەو خزمـانەو دوای ماندوو بوون، چونكە ئەگەر هـاتبـاو بـابو دایكو ڕۆڵەو منـداڵی هـەبووایە، ئەوان میـراتیـان نەدەگـرت.

**ڕای دووەم**: هەنـدێكی دیكـە دەڵـێن: مەبەسـت لـە كەلالـە بریتیـە لـە خـودی میـراتگرەكــە، مـادام دایــكو بــابو ڕۆڵــەی مردووەكــە نەبــنو بــراو خوشــكی بــن، یــان خــزمی دیكـەی بـن، پێیــان دەگوتــرێ: (الكَلاَلَـة)، لەوبارەشــەوە ئـەم دەقـە (طَبَري) هێناویـەتی بـە ژمـارە: (٨٦٦٨) لـە (جـامع البیـان)ی خۆیـدا دەڵــێ: {مَرِضَ سَعْد رضي الله عنه بِمَكَّة مَرَضًا شَدِيدًا، قَالَ: فَأَتَاهُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَعُودُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لِي مَالٌ كَثِيْر، وَلَيْسَ لِي وَارِثٌ إلاَّ كَلاَلَة، فَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: «لاَ»}، واتـە: سـەعدی كـوڕی ئـەبی وەققـاص خـوا لــێی ڕازی بـێ لـە مەكـكە نەخۆشـییەكی زۆر تونـدی گـرت، (دیـارە لـە خـۆی ترساوە كـە بمـرێ) پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەردانی كرد، گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ! ماڵـێكـی زۆرم هـەیە، وە هـیچ میـراتگرێكیـشـم نیـــە، جگـە لـە كەلالــە (واتـە: بـراو خوشــك) ئایـا ماڵەكــەم هــەمووی بكــەم بـە وەصــیەت؟ فـەرمووی: نەخێــر، (هــەمووی مەكــە بـە وەصــیەت، چـونكە وەصــیەت دەبــێ لـە یـەك لەســەر ســێی مــاڵدابێ ئەوەی دیكـە بۆ میـراتگرانە).

هەروەها لەوبــارەوە ئەو فەرمایشــتەش هـەیـە: ﴿عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ وَأَنَا مَرِيضٌ، فَتَوَضَّأَ، فَصَبَّ عَلَيَّ فَعَقَلْتُ، فَقُلْتُ: لا يَرِثُنِي إلاَّ كَلاَلَةٌ فَكَيْفَ المِيرَاثُ؟ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِضِ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (١٩٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤١٢٤)، واتــە: جابیـــری كـــوڕی

عەبدوڵـڵا خوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبەر ﷺ هـات بۆ لام مـن نەخۆش بووم (دیـارە لـە هـۆش خۆی چـووە)، دەسـتنوێژی گـرت، وە لـە ئاوی دەسـتنوێژەكەی لـێ پرژانـدم، منـیش هـاتمەوە هـۆش خـۆم، گوتـم: ئەی پێغـەمبەری خـوا ﷺ! تەنیـا كەلالـە میـراتم لـێ دەگـرێ، ئایـا چـی لە میـراتەكە بكەم (كەلالـە: واتە براو خوشك، یـاخود خزمـانی دیكـە، كـە نـە بـابو دایـكو نـە منـداڵو ڕۆڵـەن)، ئیـدی خـوا عـزّ وجـل (آيَـةُ الْفَرَائِضِ)ی نـاردە خوار، بۆ چۆنیـەتی میـرات لـێ گیـران.

ئنجا (طَبَـري) لـە (جـامع البيـان) دا هێناویـەتی دەڵـێ: (وَالـصَّوَابُ مِـنَ القَـوْلِ فِـي ذَلِـكَ عِنْـدِي مَـا قَـالَه هَـؤُلاَء، وَهُـوَ أَن "الكَـلاَلَـة" الَّـذِينَ يرِثُـونَ الْمَيْتَ، من عَدا وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ، وَذَلِكَ لِصِحَّة الخَبَـر الَّذِي ذَكَرْنَـاهُ عَنْ جَابِرِ بْـنِ عَبْدِاللَّـهِ)[1]، (طَبَـري) ئـەم ڕایـە بـەهێز دەكـاو هـەڵیدەبژێـرێ، واتـە: قسـەی ڕاسـت لەوبـارەوە لە لای مـن ئەوەیـە كە ئەوانـە گوتوویـانە: كەلالـە بریتیـە لـەو كەسـانەی كـە میـرات لـە مـردوو دەگـرن، وە نـە بـابو دایكنـیو نە ڕۆڵەشینی، واتـە: برانـی، خوشكـنی، خزمـانی دیكـەنی، چونكـە ئەو هەواڵەی لە جابیـری كوڕی عەبدوڵـڵا گێـڕدراوەتەوە، هـەواڵێكی ڕاسـتە (واتە: فەرموودەیەكی ڕاسـتە).

**ڕای سێیەم**: كە من ڕای سێیەمم پێ ڕاستە، ئەویش ئەوەیـە كـە (كـەلالـە) هـەر كـام لە میـرات لـێگیـراوانو میـراتگرەكانە، میـرات لێگیـراوان مـادام بـابو دایـك میـراتیـان لـێ نەگـرن، وە ڕۆڵـە واتـە: كـوڕو كـچ میـراتیان لـێ نەگـرن، پێیـان دەگـوترێ كەلالـە، میـراتگرەكانیش مـادام بـابو دایـك نەبـنو كـوڕو كـچ نـەبن هـی مردووەكـە، واتـە: بـراو خوشـك بـن یـان خزمـانی دیكـەبن، ئـەوانیش پێیـان دەگـوترێ كـەلاله، وە لەڕاسـتیدا ئـەم ڕایـە هـەموو ڕایـەكانی دیكـەش كۆدەكـاتەوە، ئـەوەش كـە (طَبَـري)

---

١) ج: (٣)، ص: (٢٩٩).

گوتوویەتی: لەبەرئەوەی فەرموودەکەی جابیر ڕاستە، بەڵێ فەرموودەکەی جابیر ڕاستە، بەڵام ئەوە ڕێ لەوە ناگرێ کە وەك چۆن میراتگرەکان کەلالەیان پێ دەگوترێ، میرات لێگیراوەکانیش ئەوەیان پێبگوترێ.

وە (ابن زید) کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین لەوبارەوە دەڵێ: (الكَلاَلَةُ: كُلُّ مَنْ لاَ يرِثهُ وَالِدٌ وَلاَ وَلَد، وَكُلُّ مَنْ لاَ وَلَدَ لَهُ وَلاَ وَالِدَ، فَهُوَ يُورَثُ كَلاَلَة) [١]، واتە: ئەو مردووەی کە نە کوڕو نە کچی هەیە، وە نە باب و نە دایکی هەیە، وە ئەو کەسەش کە میرات دەگرێ، هەموویان کەلالەن، ئەویان میرات دەگرێ و پێشی دەگوترێ: کەلالە، ئەویدیکەش میراتی لێدەگرێ پێشی دەگوترێ: کەلالە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوای پەروەردگار لە کۆتایی ئایەتی ژمارە: (١٢)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ﴾، ئەگەر کەسێك بە شێوەی کەلالە میراتی لێ دەگیرا، وە برای هەبوو یان خوشکی هەبوو، بۆ هەر کامێکیان شەش یەك هەیە، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لێرەدا مەبەست لەو براو خوشکە، براو خوشکی دایکیین (الأخ وَالأخت لأُم)، واتە: براو خوشکێکن کە لە دایکدا لەگەڵ مردووەکە پێکدەگەنەوە، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێ: زۆرجار کە قورئانی دەخوێند دەیگوت: (ولَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتُ مِنَ الأُمِّ) بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە، نەوەك ویستبێتی وشەیەك لە قورئان زیاد بکات، ئنجا ئەدی باشە براو خوشکانێك کە میرات دەگرن لە مردوو، بەڵام هی باببین، یانی هی دایك و باببین، ئایا لە کوێ باسکراون؟! ئەوە لە ئایەتی کۆتایی سوورەتی (النساء)، واتە: لە ئایەتی ژمارە (١٧٦)دا خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی میراتگرتنی ئەوانی کردوە، کە میراتگرتنی ئەوان جیایە لە میراتگرتنی براو خوشکی دایکیی، کە تەنیا یەك لەسەر شەش (٦/١) دەگرن،

---

١) جامع البيان، ج: (٣)، ص: (٢٩٨).

وە ئەگەر زۆر بوون لە یەك لەسەر سێ (٣/١)دا بەشدار دەبن بە یەکسانیی، بەڵام ئەگەر براو خوشکی بابیی، یان باب‌و دایکیی (الأخ والأخت لأب أو لأبٍ وأمٍ) بن، ئەوە ڕێژەی میراتگرتنەکەیان جیایە کە دەفەرموێ: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾﴾النساء، تەماشا دەکەین لەوێ خوشك نیوەی میراتی برایەکەی دەبا، وە برا هەموو میراتی خوشکەکەی دەبا، مادام کەسی دیکەیان لەگەڵدا نەبێ، وە ئەگەر دوو ئافرەت یان زیاتر بوون، ئەوە دوو لەسەر سێی میرات دەبەن، وە ئەگەر براو خوشك بوون، ئەوە هەموویان بە یەکسانیی دووبەش بۆ نێرینەو بەشێك بۆ مێینە میرات دەگرن[١].

<u>مەسەلەی یازدەیەم</u>: کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ﴾، دوای جێبەجێکردنی وەصیەتێك ئەو میراتە دابەش دەکرێ کە وەصیەتی پێکراوە، وە دوای دانەوەی قەرزێك، بەڵام ﴿غَيْرَ مُضَآرٍّ﴾، بەبێ زیانگەیاندن، ئایا مەبەست لەوەدا چییە؟ لەڕاستیدا ئەم وشەیە کە دەفەرموێ: ﴿غَيْرَ مُضَآرٍّ﴾، کە تەنیا لێرەدا هاتووەو لە سێ شوێنەکەی دیکەدا نەهاتوە، وە هەر شتێك لە قورئاندا لە شوێنێکدا هات، بۆ شوێنەکانی دیکەش دەچێتەوە، مادام وەکو یەك بن، جا لە سێ شوێنەکانی دیکەدا هەر دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ﴾، بەڵام لێرەدا

---

١) الجامع لاحكام القرآن، ج:(٥)، ص:(٦٧)، هەروەها جامع البيان، ج:(٤)، ص:(٣٠٠)، وە تەفسیری (الرازي، ج:(٩)، ص:(١٩٣).

دەفەرموێ: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾، لێرەدا کە جاری چوارەمین‌و کۆتایی یە خوای کاربەجێ باسی وەصیەت‌و قەرز دەکات‌و وشەی: ﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾یان دەخاتە سەرو دەیکاتە (قید)یان، واتە: ئەو وەصیەتە کە دەکرێ‌و دەبێ جێبەجێ بکرێ‌و قەرزەکە، کە دەبێ بدرێتەوە، پێش دابەشکردنی میراتەکە، دەبێ هەم وەصیەتەکەو هەم قەرزەکە بە شێوەیەکی زیانگەیەنەرانە، نەبن بە میراتگرەکان، (الشوكاني) لە (فتح القدير)دا دەڵێ: (﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾: رَاجِعٌ إِلى الوَصِيَّة وَالدّين المَذْكُورَين، فَهُوَ قَيْدٌ لَهُمَا فَمَا صَدَرَ مِن الإِقْرَارَاتِ بِالدّيُون، أَو الوَصَايَا المنهي عَنْهَا لَهُ، أَو الَّتِي لاَ مَقْصِدَ لِصَاحِبها إلاَّ المضارَة لِوَرَثَتِهِ فَهُوَ بَاطِلٌ مَرْدُودٌ لاَ يُنَفَّذُ مِنْهُ شَيءُ لاَ الثُّلُث وَلاَ دُونَه)[1]، واتە: وشەی ﴿غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾، هەم دەچێتەوە بۆ وەصیەتەکە، وە هەم بۆ قەرزەکەش، کەسێك خەریکی مردنێیە وەصیەت دەکا، نابێ وەصیەتێکی وا بکات کە زیان بگەیەنێ بە میراتگرانی، (بۆ ئەوەی میراتەکە بۆ میراتگرەکان نەچێ، بێنێ بیکاتە وەصیەت، وە ئەگەر وەصیەتێکی وای کرد ئەوە بۆی جێبەجێ ناکرێ)، هەروەها قەرزەکەشی نابێ بە شێوەیەکی وابێ کە زیان بگەیەنێ بە میراتگرەکانی، بۆ وێنە: مرۆڤ لە خۆڕا قەرزی کەسێك بخاتە سەر خۆی، جوابی بۆ بنێرێ بڵێ: وا من دەڵێم دە ملیۆنی فلان کەسم لەسەرە، بۆ ئەوەی میراتەکە بۆ میراتگرەکان نەچێ، هەموو ئەو حاڵەتانە کە دەرکەوت قەرزەکە ڕاست نیە، بەڵکو مەبەستی پێ زیانگەیاندن بووە بە میراتگرەکانی، وە وەصیەتەکەش بە هەمان شێوە، هیچیان جێبەجێ ناکرێن.

ئیمام (فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التفسير الكبير) بەرگی (٩) لاپەڕە (١٩٤) چەند حاڵەتێکی چۆنیەتی ئەو وەصیەت‌و قەرزە

---

١) ج: (١)، ص: (٥٥٨).

زیانگەیەنەرانە ڕوون دەکاتەوە[(١)]:

١/ (أَنْ يُوصِيَ بِأَكْثَرِ مِنَ الثُّلُث)، واتە: ئەگەر وەصیەتەکە لە یەك لەسەر سێی ماڵەکەی زیاتر بێ، بۆ زانیارییتان کەسێك کە وەصیەت دەکات، دروست نیە لە یەك لەسەر سێی ماڵەکەی زیاتر وەصیەت بکات، واتە: تەنیا لە یەك لەسەر سێی میراتەکەیدا بۆ هەیە وەصیەت بکاتو زیاتری بۆ جێبەجێ ناکرێ.

٢/ (أَنْ يُقِرّ بِكُلِّ مَالِهِ أَوْ بِبَعْضِهِ لأَجْنَبِي)، واتە: بڵێ هەموو ماڵەکەم، یان هەندێکی هی بێگانەیەکە لەلای منە، یان بڵێ: ئەوە من زیندووم ماڵەکەم بەخشیوە بە فلان کەس، جا هەمووی بێ یان هەندێکی، ئەویش دیسان لەم حاڵەتەدا ئەو وەصیەتە جێبەجێ نابێ.

٣/ (أَنْ يُقِرّ عَلَى نَفْسِهِ بِدَيْنٍ لاَ حَقِيْقَةَ لَهُ دَفْعَاً لِلْمِيرَاث عَنِ الوَرَثَة)، واتە: دان بە قەرزێك دابنێ کە حەقیقەتی نەبێ، وەکو باسکرد بڵێ: دە ملیۆنی فلان کەسم لەسەرە، ڕاستیش نەبێ بەس بۆ ئەوەی ماڵەکە بۆ میراتگرەکانی نەچێ.

٤/ (أَنْ يُقِرّ بِأَنَّ الدَّيْنَ الَّذِي كَانَ لَهُ عَلَى غَيْرِهِ قَدِ اسْتَوفَاهُ وَوَصَلَ إِلَيْهِ)، واتە: قەرزێکی لەسەر کەسێك بێ، دانی پێدابنێ، کە وەریگرتۆتەوە، ڕاستیش نەکاتو قەرزەکەی لێ وەرنەگرتبێتەوە، چونکە ئەگەر بڵێ: قەرزەکەم لێ وەرنەگرتۆتەوە، قەرزەکە دێنن تێکەڵ بە میراتەکە دەکرێ، ئەوکاتە میراتگرەکان قازانج دەکەن.

٥/ (أَنْ يَبِيعَ شَيْئَاً بِثَمَنٍ بَخْسٍ، أَوْ يَشْتَرِي شَيْئَاً بِثَمَنٍ غَالٍ، كُلُّ ذَلِكَ لِغَرَضِ أَنْ لا يَصِلِ المَالُ إِلى الوَرَثَة)، واتە: شتێك بفرۆشێ بە نرخێکی هەرزان، بۆ وێنە: زەوییەکی هەیەو لە سەرەمەرگدایە یان دەزانێ دەمرێ، بیفرۆشێ یان بە نیوە قیمەتی بدات، یان بە سێیەکی قیمەتەکەی خۆی بدا، یاخود بە

١) ج: (٩)، ص: (١٩٤).

پێچەوانەوە، شتێك بكرێ بە نرخێكی زۆر، بە چەند قات بیكرێ، هەر بۆ ئەوەی ئەو پارەیەی كە دەبێتە میرات، كەم ببێتەوە، ئەوەش دەكەوێتە ئەو قاڵبەوە.

٦/ (أَنْ يُوصِي بِالثُّلُثِ لاَ لِوَجْهِ اللّه لَكِن لِغَرَض تَنْقِيص حقُوقِ الوَرَثَةَ)، واتە: وەصیەتەكە هەر لە سێیەكی ماڵدا بكات، بەڵام مەبەستی ئەوە نەبێ كە ڕەزامەندیی خوای پێ بەدەست بهێنێ، بەڵكو بەس مەبەستی ئەوە بێ كە زیان لە میراتگرەكان بدات، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا نە قەرزەكە بەو شێوەیە جێی خۆی دەگرێو نە وەصیەتەكەش جێی خۆی دەگرێ، بۆچی؟ چونكە خوا فەرموویەتی: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ﴾، كەواتە: ئەگەر وەصیەتەكە زیانگەیەنەرانە بوو، وە قەرزەكە زیانگەیەنەرانە بوو، جێبەجێ ناكرێن، بۆ ئەوەی كە میراتگرەكان زەرەر نەكەن.

<u>**مەسەلەی دوازدەیەم:**</u> خوای زاناو شارەزا كە لە كۆتایی ئایەتی (١١)دا دەفەرموێ: ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾، وە لە كۆتایی ئایەتی (١٢)شدا دەفەرموێ: ﴿وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾، بۆچی ئاوایە؟ لە كۆتایی میراتگرتنی منداڵو دایكو باباندا دەفەرموێ: ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، بەڵام لە كۆتایی میراتگرتنی ژنو مێرد لە یەكدی، یاخود براو خوشكی دایكی لە مردوودا دەفەرموێ: ﴿وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، كە ﴿فَرِيضَةٗ﴾، واتە: پێویست، ﴿وَصِيَّةٗ﴾، واتە: ڕاسپاردن، من پێم وایە كە یەكێك لە حیكمەتەكانی ئەوەیە كە ئێمە بزانین ئەو میرات دابەشكردنە، هەم شتێكە خوا فەرزی كردوە، وە هەم شتێكە كە خوا ئامۆژگاریی ئێمەی پێكردوەو ئێمەی پێ ڕاسپاردوە، واتە: هەم

(فريضة)يەو هەم (وصية)، ئنجا لە هی پێشیدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، بێگومان خوا زانایەو کاربەجێیە، واتە: زانایەو دەزانێ چۆنی دابەش کردووەو کاربەجێیە، دەزانێ هەر کەس چەندی دەداتێ، بۆیە ئێوە تێیدا لە گوماندا مەبن، وە لەویدیکەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾، خوا زانایەو هێدیی و ئارامە، ئەگەر کەسێك هەڵەیەك بکات زوو نایگرێ، بەڵام مانای وانیە کە سزای نادات لە دنیادا، بەڵکو ڕەنگە دوای بخات، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا سزای دەدات، کەواتە: ئەگەر لاتاندا لە مەسەلەی میرات دابەشکردنداو خوا یەکسەر سزای نەدان، پێتان وانەبێ کە بەخشراون، بەڵکو خوا هێدیی (حليم)ەو پەلە ناکات لە دوارۆژدا تۆڵەتان لێ دەکاتەوە.

ئیمام (فخر الدين الرازي) لە {التفسير الكبير}[1]، دەڵێ: حیکمەتەکەی ئەوەیە: کە ئایەتی یازدە باسی میراتی منداڵو بابو دایك دەکات، وە ئایەتی دوازدەش باسی میراتی ژنو مێردو کەلالە دەکات، وە ئەوەی بابو دایكو منداڵیش گرنگترە، بۆیە خوای پەروەردگار وایفەرمووە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا﴾، ئەمە - وەك پێشتریش باسمان کرد - ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە پابەندیی بە یاساکانی شەریعەتەوە بە گشتیو بە تایبەت یاساکانی ئەم سوورەتە، پابەندیی پێیانەوە، مایەی چوونە بەهەشتە، وە لادان لێیان، مایەی تووڕەبوونی خوای دادگەرو سزاو جەزرەبەو چوونە

١) ج: (٩)، ص: (١٩٦).

دۆزەخە، وە لەڕاستیدا هەرچی کە خوا ﷻ فەرموویەتی، بۆ مرۆڤی ئیماندار مایەی خێرو خۆشیی دنیاو قیامەتیەتی ئەگەر بیکات، وە ئەوەی کە فەرموویەتی نەیکەن، لێی دووربن، خۆ لێ دوورگرتنی خێری دنیاو قیامەتی تێدایە، وە بە پێچەوانەشەوە، کەسێك شتێك کە خوا فەرزی کردوە بیچووێنێ، یاخود شتێك کە قەدەغەی کردوە، لێی نزیك بکەوێ، ئەوە بە تەئکید زەرەر دەکات، چونکە خوای کاربەجێ هیچ شتێکی پێویست نەکردوە کە خێرو بەرژەوەندیی دنیاو دوارۆژی تاكو خێزانو کۆمەڵی تێدانەبێو، هیچ شتێکی قەدەغە نەکردوە کە زەرو زیانی دنیاو دوارۆژی هەموو لایەکی تێدانەبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا ئایەتەكانی ژمارە: (١٥، ١٦، ١٧، ١٨) لە سوورەتی (النساء) تەفسیر دەكەین، لەم چوار ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا باسی چۆنیەتی سزادانی ئافرەتانی فاحیشەكار دەكات، كە دوایی باسی دەكەین مەبەست لە ئافرەتانی فاحیشەكار چییە؟ وە سزا دانەكەیان بریتیە لە حەپس كردنیان لە ماڵەكاندا، مادام بە چوار شایەدی پیاو لەسەریان ئیسپات بووبێ كە ئەو فاحیشەیان ئەنجامداوە، ئنجا لە ئایەتی شازدەدا باسی سزای ئەو دوو پیاوانە دەكات كە فاحیشە دەكەن، كە بریتیە لەوەی ئازار بدرێن تاكو تۆبە دەكەنو چاكەكاریی دەكەنە پیشە، دوایی لە ئایەتی حەڤدەیەمو هەژدەیەمدا خوای لێبوردە باسی تۆبەكردنمان بۆ دەكات كە ئایا خوا تۆبە لە كێ وەردەگرێ؟ وە چ تۆبەیەك قبووڵە؟ وە تۆبە لە كێ وەرناگیرێ؟ وە كەسێك كە تۆبەی لێ وەرنەگیرێ، سزاكەی چۆنە؟

﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن
شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾
وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن
قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ
يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ
يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾﴾.

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەکــان

((وە ئەو ئافرەتانەتان کە فاحیشە دەکەن، چوار شایەدانیان لە خۆتان لەسەر بگرن، جا ئەگەر شایەدییاندا، ئەوە ئەو ئافرەتانە لە ماڵاندا حەپس بکەن، هەتا مەرگ کۆتاییان پێ دێنێ، یان خوا ڕێیەکیان بۆ پەیدادەکات ﴿١٥﴾ وە ئەو دوو پیاوەتان کە ئەو کار (نێربازیی)ە دەکەن، ئازاریان بدەن، جا ئەگەر گەڕانەوەو چاکەیان کرد وازیان لێ بێنن، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەیی یە ﴿١٦﴾ مسۆگەر تۆبە لێوەرگیرانی ئەوانە لەسەر خوایە، کە بە نەفامیی خراپە دەکەن و پاشان زوو دەگەڕێنەوە، ئا ئەوانە خوا گەڕانەوەیان لێوەردەگرێ، وە خوا زانای کاربەجێیە ﴿١٧﴾ بەڵام تۆبە (وەرگیران) بۆ ئەوانە نیە کە لەسەر کردنی خراپە بەردەوام دەبن، هەتا کاتێك کە یەکیان مەرگی دەگاتە سەر دەڵێ: من ئێستا دەگەڕێمەوە، هەروەها بۆ ئەوانەش (تۆبە وەرناگیرێ) کە بە کافریی دەمرن، ئەوانە سزایەکی بە ئێشمان بۆ داناون ﴿١٨﴾)).

## شـیکردنەوەی هەندێك لە وشـەکان

(ٱلْفَٰحِشَةَ ): ﴿وَٱلَّٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ﴾، واتە: ئەو ئافرەتانەتان کە فاحیشە ئەنجام دەدەن، وشەی (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ) واتە: هەر سێ وشەی: (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِشَةُ) هەر قسەو کردەوەیەکە کە زۆر دزێوو ناقۆڵاو ناشیرین بێ، کە دیارە وشەی: (فَاحِشَة) لە قورئاندا هەم بە مانای زیناش هاتوە، هەم بە مانای نێربازییش هاتوە، وە بە مانای چرووکیی و ڕژدییش هاتوە، بە مانای بڵاوکردنەوەی قسەی خراپیش هاتوە.

(فَأَمْسِكُوهُنَّ ): (إِمْسَاكُ الشَّيءِ إلتَعَلُّقُ بِهِ وَحِفْظُهُ: إِحْبِسوهُنَّ، مَسَكَ الشَّيء عَلَى نَفْسِهِ حَبَسَهُ)، (إِمْسَاكُ الشَّيءِ) ئەوەیە كە شتێك بگریو بیپارێزی، كەواتە: مەبەست ئەوەیە كە ئەو ئافرەتانە لە ماڵدا بەند بكەنو مەهێڵن بچنە دەر.

(ٱلتَّوْبَةُ ): (التَّوْبُ: الرّجوعُ)، واتە: گەڕانەوە، (تَابَ يَتوبُ تَوْباً)، واتە: (رَجَعَ يَرْجِعُ رجُوعَاً)، كەواتە: (التَّائِبُ) یانی: (الرّاجِعُ إلى اللّه) واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا، (التوبة والتوب: تَرْكُ الذنْبِ عَلَى أَجْمَلِ الوُجُوهِ، والتَّائِبُ يُقَالُ لِبَاذِلِ التَّوْبَةِ وَلِقَابِلِ التَّوْبَةِ، فَالعَبْدُ تَائِبٌ إلى اللَّهِ، وَاللَّهُ تَائِبٌ عَلَى عَبْدِهِ)، وشەی: (توبة) یان (توب) بریتیە لەوە كە واز لە گوناح بهێنرێ بە جوانترین شێوە، وە (تائب) هەم بەو كەسە دەگوترێ كە دەگەڕێتەوە لە گوناح كردن، وە هەم بەو كەسەش دەگوترێ كە گەڕانەوەكە قبووڵ دەكات، بەندە تۆبە دەكاو خواش كە (تائب)ە، یان (توّاب)ە، تۆبە قبووڵ دەكات، كە (توّاب) دەگونجێ بۆ كەسێك بێ كە زۆر تۆبە دەكات، وە دەگونجێ بۆ كەسێك بێ كە زۆر تۆبە قبووڵ دەكا.

(بِجَهَٰلَةٍ): واتە: نەزانیی، نەفامیی، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الجَهْلُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَضْرُبٍ:

الأول: وَهُوَ خُلُوّ النَّفْسِ مِنَ العِلْمِ، هَذَا هُوَ الأَصْلُ.

الثاني: إعتِقَادُ الشَّيءِ بِخِلاَفِ مَا هُوَ عَلَيْهِ.

الثالث: فِعْلُ الشَّيءِ بِخَلاَفِ مَا حَقُّهُ أَنْ يُفْعَلَ، سَوَاءٌ اعْتَقَدَ فِيهِ إعتِقَاداً صَحِيْحَاً أَوْ فَاسِداً، كَمَنْ يَتْرُكُ الصَّلاَةَ مُتَعَمِّدَاً).

واتە: وشەی: (جَهْل) نەزانیی یان نەفامیی، سێ شێوەو جۆری هەیە:

<u>یەكەم</u>: بریتیە لەوە كە ئینسان شتێك نەزانێ، مێشكو دڵی خاڵی بێ لە زانیاریی دەربارەی ئەو شتە، كە ئەوە ئەسڵی جەهلو نەفامیی بەو مانایە دێ.

دووەم: بریتیە لەوە كە ئینسان پێی وابێ شتێك بە جۆرێكە، بەڵام وانەبێت، واتە: لە ناسین‌و زانیاریی لەبارەی شتەكەوە بەهەڵەدا بچێ.

سێیەم: بریتیە لەوە كە ئینسان شتێك بكات كە هەقی وانەبێ بكرێ، جا یەكسانە بیروباوەڕی دەربارەی ئەو شتە ڕاستبێ یان هەڵەبێ، وەك: كەسێك كە نوێژ ناكات، كە دیارە ئەوەی كە نوێژ ناكا پێی دەگوترێ (جاهل) بۆچی؟ چونكە شتێكی چواندوە كە نەدەبوو بچووێندرێ، یان بۆ وێنە: كەسێك كە قەتڵ دەكات، پێی دەگوترێ (جاهل)، چونكە شتێكی كردوە، كە نەدەبوو بكرێ.

## مانای گشتی ئایەتەكان

دیارە ئایەتەكانی قورئان وەك ئاڵقەكانی زنجیر یەكدی دەبەستنەوە، بەڵام جاری وایە بۆنەو چۆنیەتی پێكەوە پەیوەستبوونی ئایەتەكان بۆ ئێمە زۆر ڕوون نیەو، پێویستی بە لێوەردبوونەوەی زیاتر دەكات، بەهەر حاڵ خوا ﷻ لەم سووڕەتەدا بە زۆری باسی خێزان‌و كۆمەڵگا دەكات‌و باسی پەیوەندییەكانی ژن‌و مێردو خزمان‌و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان دەكات.

دوای ئەوەی باسی میراتی كرد، ئنجا دێتە سەر باسی ئەوە كە ئافرەتانێك كە تووشی هەڵەو تاوان دەبن‌و، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡ ﴾، دیارە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا زۆر بە تێرو تەسەلی باسی ئەم بابەتە دەكەین‌و ئەو مەسەلەیە كێشەو مشتومڕێكی زۆری لە نێوان زانایان‌و توێژەرەوانی قورئاندا لەسەرە، بەڵام لێرەدا هەر بە كورتی دەڵێین: خوا دەفەرموێ: ئەو ئافرەتانەتان كە فاحیشە ئەنجام دەدەن، چوار شایەدانیان لە خۆتان لێ بگرن، جا ئەگەر شایەدییان لەسەردان، لە ماڵەكاندا بەندیان بكەن هەتاكو مردن كۆتاییان پێدێنێ، یاخود خوا ڕێیەكیان بۆ دەبینێتەوە، جا ئایا ئەو ئافرەتانە كێین؟ ئەوەی من بۆم دەركەوتوەو دیارە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئانیش ڕایان وایە:

مەبەست لەو ئافرەتانە ئەوانەن کە خۆلێکخشاندن ئەنجام دەدەن، بە عەرەبی پێی دەڵێن: (سُحاق)، واتە: خۆ لێکخشاندن، وەك چۆن دوو پیاو کە بەیەکەوە جووت بن، نێربازیی پێ دەگوترێ، هی ئافرەتانیش (سُحاق) یاخود (مساحقة)ی پێ دەگوترێ، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵ یەکدی جووت دەبن و خۆیان لە یەکدی تێر دەکەن، لێرەدا مەبەست لەو جۆرە ئافرەتانەیە، هەڵبەتە دوایی بە تێرو تەسەلی باسی ئەوە دەکەین کە ئێمە بۆچی وا دەڵێین؟ بەلام لێرەدا دەڵێین: خوا ﷻ هەر باسی ئەو ئافرەتانە دەکات، وە تەنیا باسی سزای وانیش دەکات، ئنجا ئەگەر مەبەست پێی زینا بووایە، وەك زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن، دەبووایە باسی سزای پیاوەکانیش بکات، بەلام ئەو جۆرە فاحیشەیە کە ئافرەتان لەنێوان خۆیاندا دەیکەن، هەر بە ئافرەتان ئەنجام دەدرێ، بۆیە هەر باسی سزای ئافرەتان دەکات و باسی سزای پیاوەکان ناکات، کە لە بەرانبەریان دابن، هەر باسی ئافرەتەکانەو هەر باسی سزای ئەوانیشە، چونکە زینا بە پیاوو ئافرەت دەکرێ، بەلام ئەو جۆرە تاوانە کە تەنیا لە نێوان ئافرەتاندا ئەنجام دەدرێ، تەنیا لە نێوان خۆیاندا دەکرێ، هەروەك چۆن نێربازیی (لواطة) لەنێوان پیاواندا ئەنجام دەدرێ و، پێویستی بە تەرەفێکی دیکەی بەرانبەر نیە، وەکو مێینە، ئنجا ئایەتی دوایی باسی گوناهێکی دیکە دەکات کە لە نێوان پیاواندا دەکرێ، ئەوەی پێشێ لە نێوان ئافرەتاندا دەکرا، وە ئەمەیان لە نێوان پیاواندا دەکرێ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ﴾، وە ئەو دوو پیاوەتان کە ئەو کردەوە خراپە ئەنجام دەدەن، جا ئایا ئەو کردەوە خراپە چییە؟ دیارە فاحیشەیە، چونکە ڕاناوی (ها) لە وشەی: ﴿ يَأۡتِيَـٰنِهَا ﴾دا بۆ وشەی (فاحشة) دەگەڕێتەوە، کە لە ئایەتەکەی پێشوودا هاتوە: ﴿ وَٱلَّـٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ ... ﴾، (فاحشة) لە قورئاندا خوای پەروەردگار بۆ نێربازییشی بەکارهێناوە، وەك لەسەر زمانی پێغەمبەر لووط ﷺ دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلۡفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ٢٨ ﴾ العنكبوت،

واتە: (لووط ﷺ بە قەومەكەی دەڵێ:) ئایا فاحیشەیەك ئەنجام دەدەن كە لە پێش ئێوەدا هیچ كەس لە جیهانییان نەیكردوە، كە نێرینە سواری نێرینە ببێ !

كەواتە: وشەی (فاحشة) كە لێرەدا ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا ﴾، ئەو ڕاناوە دەچێتەوە بۆ وشەی (فاحشة) كە لە ئایەتی پێشێدا هاتوە، كە ئەوەی پێشێ بریتیە لەوەی كە لە نێوان ئافرەتاندا ئەنجام دەدرێ، بەڵام ئەمەی دوایی ئەوەیە كە لە نێوان پیاواندا ئەنجام دەدرێ، هەردووكیشیان فاحیشەن، دیارە پێشتر پێناسەی (فاحشة)مان كردو گوتمان بریتیە لە: هەر قسەیەكو هەر كردەوەیەك كە زۆر ناشیرینو ناقۆڵابێ، جا لەوە ناشیرینو ناقووڵاتر نیە كە ئافرەتان پێكەوە ڕابوێرن، وە پیاوان پێكەوە ڕابوێرن، هەروەك چۆن زیناش هەر فاحیشەیە، كە نێرو مێیەك بەبێ حاڵەتی هاوسەرگیریی‌و بەبێ حاڵەتی شەرعیی بگەنە یەكدی، ئەویش هەر فاحیشەیە، جا خوا دەفەرموێ: ئەو دوو پیاوەتان كە ئەو كردەوەیە خراپە دەكەن ﴿ فَـَٔاذُوهُمَا ﴾، واتە: ئازاریان بدەن، سزایان بدەن، جا ئایا چۆنیان ئازارو سزا بدەین؟ خوای دادگەر بە گشتی فەرموویەتی‌و دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ ﴾، جا ئەگەر گەڕانەوەو چاكەیان كرد، واتە: ئەگەر تا ئێستا موبتەلاو گیرۆدە بوون بەو كردەوە خراپەوە، بەڵام دوای ئەوەی كە ئازارتان دانو سزاتان دان، بەو شێوەیە كە حوكمڕانو دەستەڵاتداری شەرعیی بە چاكی دەزانێ سزای دانو گەیشتنە ئەو قەناعەتەی كە ئەوانە گەڕاونەوەو، وازیان لەوە هێناوەو لەمەودوا چاكە دەكەن لە جیاتی خراپە، ﴿ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ ﴾، وازیان لێبێنن، لێیانگەڕێن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴾، بێگومان خوا زۆر تۆبە قبووڵكەرە، وە زۆریش بە بەزەیی یە ؟

ئنجا بەو موناسەبەیەوە کە باسی تۆبەی ئەوانەی کرد لەو کردەوە خراپە، وە پێشتریش باسی ئەوەی کرد کە ئافرەتەکان لە ماڵدا بەند بکەن، مادام گیرۆدەبن بەو نەخۆشییەوە تاکو دەمرن، یاخود خوا ڕێیەکیان بۆ دەبینێتەوە، جا ئایا ڕێیەکە چییە؟ ڕێیەکە ئەوەیە کە واز لەو کردەوە خراپە بێنن، وە بێنە سەر ئەو قەناعەتەی کە بۆخۆیان شوو بکەن، واتە: نەك ئافرەت لەگەڵ ئافرەت بەڵکو لەمەو دوا شوو بکەن بە شێوەیەکی شەرعیی، مەبەست پێی ئەوەیە، یاخود چاك بن و ئەو فیکرەو ئەو عادەتە خراپەیان نەمێنێ و، خوای بە بەزەیی ڕێیەکی باشیان بخاتە بەردەم، یاخود دەروویەکی خێریان لێ بکاتەوە، وە لەو کردەوە خراپانە دەربازبن، جا بەو بۆنەوە خوا ﷻ باسی تۆبە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ﴾، بێگومان وەرگرتنی تۆبە لەسەر خوایە، بەڵام تەنیا بۆ کەسانێك کە خراپە دەکەن بە نەزانیی و نەفامیی ﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ ﴾، دوایی بە زوویی تۆبە دەکەن و دەگەڕێنەوە، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، ئا ئەوانە خوا دەگەڕێتەوە سەریان، یاخود تۆبەیان لێ وەردەگرێ، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە، توێژەرەوان زۆریان باسکردوە، کە ئایا یانی چی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، تۆبە لەسەر خوایە، وەرگرتنی تۆبە لەسەر خوا پێویستە بۆ کەسانێك کە بە نەزانیی و بە نەفامیی گوناح دەکەن، دوایی زوو دەگەڕێنەوە، ئایا خوا شتی لەسەر پێویست دەبێ؟! دواتر ئێمە بە درێژیی باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا هەر بە کورتی دەڵێم: خوای بە بەزەیی ئەگەر خۆی شتێك لەسەر خۆی پێویست بکات، مانای وانیە کە ئێمە لەسەرمان پێویست کردوە، وەك لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧ ﴾الروم، واتە: هەقە لەسەرمان ئێمە ئیمانداران سەردەخەین، یان دەفەرموێ: ﴿ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠٣ ﴾یونس، واتە: هەقە لەسەرمان ئێمە ئیمانداران دەرباز دەکەین، واتە: خوا بۆخۆی شتێکی لەسەر خۆی پێویست کردوە، لە ڕووی کەرەم و

بەخششی خۆیەوە، خۆی پێوە مولزەم کردوە، نەك ئێمە مولزەمی بکەین! هەتاکو ئەوە بگەیەنێ کە خوای بەرزو مەزن پلەیەکی خوارتری دەبێ و ئەو کەسەی کە شتەکەی لەسەر پێویست دەکات، پلەیەکی بەرزتری هەبێ، خوا ئەگەر بۆخۆی شت لەسەر خۆی پێویست بکات، ئەو واتایە بەدەستەوە نادات، چونکە کاتێك کەسێك شتێك لەسەر کەسێکی دیکە پێویست دەکات، مانای وایە کە پێویستکەرەکە بەرزترە لە پێویست لەسەر کراوەکە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ﴾، زانایان دەڵێن: مەرج نیە هەر گوناهێك بە نەزانییو نەفامیی بکرێ، ئەوجار پێی بگوترێ: ﴿بِجَهَٰلَةٍ﴾، بەڵکو (كُلُّ مَنْ عَصَى اللَّه فَهُوَ جَاهِلٌ)، واتە: هەر کەسێك سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکات، ئەوە جاهیلە، کەواتە: تۆبە تەنیا بۆ ئەو کەسە نیە کە بە نەزانیی گوناحێك بکات، ئنجا تۆبەی لێ بکاو خواش لێی قبووڵ بکا بەڵکو هەر کەسێك گوناهێك بکات مانای وایە بە جاهیلانەو نەفامانە کردوویەتی، چونکە هەقی خوای وەك پێویست دەرك نەکردوە، ئەگەرنا نەدەبوو لە فەرمانی خوا دەرچووبایە، وە کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾، ئایا ئەوە مەبەست پێی چییە؟ واتە: مرۆڤ دەستبەجێ کە گوناهی کرد، پەشیمان ببێتەوە، هەڵبەتە وا باشترە، بەڵام مەرج نیە خوا تۆبە لەو کەسانە وەربگرێ کە گوناهیان کرد، یەکسەر بەدوایدا پەشیمان ببنەوە، بەڵکو جاری وایە ساڵێك دوو ساڵی پێدەچێ، کەواتە: ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، واتە: پێش مردن، یاخود پێش ئەوەی دڵنیابێ کە دەمرێ، یەکێك دەکەوێتە حاڵەتی مردنێ و دەزانێ تازە دەمرێ و دەستی لە هەموو پچکان بڕاوە، ئنجا دێ دەگەڕێتەوە، ئەوە هیچ نیە، بەڵام هەتا بەتەمای ژیان بێ و لەنێو ژیاندابێ، جارێ چاوەڕێی مردنێکی زوو نەبێ، بگەڕێتەوە، خوا تۆبەی لێوەردەگرێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە، نەیفەرمووە: ﴿... وَكَانَ ٱللَّهُ

غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ﴾الأحـــزاب، بۆچـی؟ چـونکە لێـــرەدا باســـی تۆبـە وەرگرتنـــە، یـەکێك بـۆی هـــەیە پرســـیار بکـاو بڵـــێ: باشــە خـوا بـۆ تۆبـە لـەو کەسـانە وەردەگـــرێ؟ بـۆ لەســەر خـۆی پێویســت کـردوە، تۆبەیـــان لـــێ وەربگـــرێ؟ وەڵامەکـــەی: خـوا زانـــایەو دەزانـــێ ئـەو کەســانە شـایـستەی ئـەوەن کـە خـوا تۆبەیـان لێوەربگـرێ، ئـەدی چۆنە خـوای بـەرز ئـاوا مامەڵەیان لەگەڵـدا دەکـات؟ ئـاخر خـوای پـەروەردگار کاربەجێیـە لەبـەر ئـەوە کـە خـوا عـیلمو حیکمـەتی بێســنووری هەیـە، بۆیـە ئـەو یاسایەی بـەم شـێوە دارشـتووەو بـەو شـێوەیە مامەڵـە لەگەڵ گوناهبـارانێکدا دەکات کە بەراسـتییو سـاغیی دەگـەڕێنەوە بۆ لای خوا.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی جـۆری دووەمـی گوناهبـارانو دەفـەرموێ: ﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، وە تۆبـــە وەرگـــرتن لەســـەر خـــوا بـــۆ کەســـانێك نیـە، واتـە: لەسـەر خـۆی پێویسـت نـەکردوە کـە تۆبـە لـە کەسـانێك وەربگـرێ کـە ﴿ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، کـە خراپـەکان دەکـەنو بـەردەوام دەبـن لەســـەری بەبـــێ پـــساندنەوە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾، هەتـــا کـــەی لەسەر گوناهـان بەردەوام دەبن؟ وشـەی: (حَتَّىٰٓ) لە زمـانی عەرەبیـدا بـۆ گەیشـتن بـە ئامـانج (بلـوغ الغايـة) بەکـاردێ، واتـە: بـەردەوام دەبـن، بـەردەوام دەبـن، هـەتا یەکێکـیان مردنـی دەگـاتە سـەرێو دەکەوێتـە حـالی خـۆی، واتـە: دەزانـێ تـازە دەمرێ، لـەو حاڵەتـەدا دەڵـێ چـی؟ ﴿ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ ﴾، گـوتی: ئێسـتا پەشـێمان دەبمـەوەو دەگەڕێمـەوە، ئەوانـە تۆبـە وەرگرتنیـان بـۆ نیـە ئـەوە یـەك، جۆرێـکی دیکـەشمان هەیـــە کـــە تۆبـــەیان لـــێ وەرناگیـــرێ ﴿ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ﴾، وە ئەوانەش کە بـە کافریی دەمـرن، تۆبـەیان لـێ وەرناگیـرێ، کەواتـە: دوو جۆرە کەس تۆبەیـان لـێ وەرناگیـرێ: ئەوانـەی کـە لەسـەر گوناهـان بـەردەوام دەبن، تا دەگەنـە حاڵـەتی سـەرەمەرگ، کـە تـازە ئومێـدیان بـە ژیـان نامێنـێ، بـۆ وێنـە: تووشـی نەخۆشـییەك دەبـێ پزیشـك پێـی دەڵێ: تـازە تـۆ مانگێـکی دیکە

دەمری، یان تۆ نەخۆشیی شێرپەنجە (سرطان)تە، یان بریندار دەبیّ‌و دەزانیّ دەکەوێتە حاڵەتی خۆی، یان حوکمی ئیعدامی بۆ دەرچووە، یان دەزانیّ تازە دەرباز نابیّ، یان بە هەرحاڵ بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان دڵنیابیّ هەر دەمریّ لەو کاتەدا دەگەڕێتەوە، ئەوە بیّسوودە، بۆچی؟ چونکە تازە تەمای ژیانی نەماوە، بە چ مەعلوومە ئەگەر تەمای ژیانی مابووایە، هەر گوناهی نەدەکردن؟! بۆیە لێی وەرناگیریّ، هەروەها کەسێکیش کە بە کافریی دەمریّ ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، ئا ئەوانە ئازارێك‌و سزایەکی بە ئێشمان بۆ داناون، لە جیاتی تۆبە وەرگرتن خوا سزای بە ئێشی بۆ داناون، دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا ئەم ئایەتانە زیاتر شی دەکەینەوە بە تێرو تەسەلی قسەیان لەبارەوە دەکەین.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە توێژەرەوانی قورئان مشتومڕێکی زۆریان بووە دەربارەی تەفسیری ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، کە خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: ﴿وَٱلَّـٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ ۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِى ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾، واتە: وە ئەو ئافرەتانەتان کە فاحیشە دەکەن چوار شایەدانیان لە خۆتان لەسەر بگرن، جا ئەگەر شایەدییاندا، ئەوە ئەو ئافرەتانە لە ماڵاندا حەپس بکەن، هەتا مەرگ کۆتاییان پیّ دێنیّ، یان خوا ڕێیەکیان بۆ پەیدادەکات.

ئەوی دیکە کە دەفەرمویّ: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾، واتە: وە ئەو دوو پیاوەتان کە فاحیشە ئەنجام دەدەن، ئازاریان بدەن، جا ئەگەر گەڕانەوەو

چاكەیان كرد، وازیان لـێ بێنن، بێگومان خوا زۆر تۆبـە وەرگری بە بەزەیی یە.

تویژەرەوانی قورئان مشـتومڕییان لەوبـارەوە بەم شـێوەیەیە:

**یــــــەك**/ زۆربــەیان دەڵـێن: ئایــەتی یەكــەم كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ ﴾، یـانی: ئـەو ئافرەتانـەتان كـە فاحیـشە دەكـەن، داوێنپیـسیی دەكـەن، چـوار شـایەدییان لـە پیاوەكانتـان لـێ بگـرن، جـا ئەگـەر شایەدییان لەسەریاندا، حەپسیان بكەن لە ماڵەكانیانـدا هـەتاكو دەمـرن، یـاخود تـا خـوا ڕێیـەكی دیكەیان بـۆ دەدۆزێتـەوە، واتـە: ڕێیـەكی دیكـە بـۆ سـزادانیان، دەڵـێن: ئـەم ئایەتـە كاتێـك هاتۆتـە خـوار كـە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (النور) كە باسـی سـزای زیناكـەر دەكـاتو دەفـەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ ... ﴿٢﴾ ﴾، واتـە: ئـافرەتی زیناكـەرو پیـاوی زیناكـەر هـەر یەكی سـەد قامچیان لـێ بدەن، دەڵێن: ئەوكاتە ئـەم ئایەتـەی سوورەتی (النـور) نەهاتبووە خوار، بۆیە خوا سبحانەو تعالى بەوە ئافرەتانی زیناكەری سزا داون.

وە دەڵـێن: ئایـەتی دووەمـیش كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴾، واتە: وە ئەو دووانەشتان كە فاحیشە ئەنجام دەدەن، دەڵێن: مەبەست پێی كچو كـوڕی زیناكـەرن، كـە ئـەوان سـزاكەیان ئـەوە بـوو ئـازار بـدرێنو سەرزەنـشت بكـرێنو قـسەیان پـێ بگـوترێو لێیـان بـدرێ، جـا ئەگـەر تۆبـەیان كـردو چاكسازییان كرد، وازیان لێ بهێنرێو لێیان بگەڕێن.

ئنجـا ئێمـە پـێش ئـەوەی بێینـە سـەر ڕایەكـەی دیكە، كـە مـن ڕایەكـەی دیكـەم پـێ ڕاسـتە، دەپرسـین: ئایـا لابەر (ناسخ)ی ئـەو ئایەتـە چییە؟ واتـە: چ شـتێك ئـەو ئایەتـەی (النـساء)ی نەسـخ كردۆتـەوە، یـانی: حوكمەكـەی نەهێشـۆتەوە، ئەگـەرنا ئایـەتەكە هـەر هەیە؟!

دیـارە پێشتـر باسمكردوە كە قەنـاعەتم وایە، هـیچ ئایـەتێك لـە قورئانـدا

نیە نەسخ كرابێتەوە، بەو واتایەی كە حوكمەكەی لابرابێ، بەڵێ ئایەتێك بەگشتیی (عام) هاتووە خوای پەروەردگار بە ئایەتێكی دیكە ماناكەی تایبەت (تخصیص) كردوە، وە ئایەتێك بە ڕەهایی (مُطلق)ی هاتووە ئایەتێكی دیكە ماناكەی بەنددار (مقیَّد) كردووە بەستۆتەوە بە هەندێ موفرەدەیەوە، وە ئایەت هەیە بە كورتی (مجمل)ی هاتووە ئایەتی دیكە درێژەو تەفصیلی داوەتێ، وە پلەپلەیی (تدرّج) هەیە وەك پێشتر باسمان كردوە.

بەلاّم من پێم وایە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نەسخ نەكراوەتەوە، ئنجا بە هەرحاڵ لەسەر ڕای ئەوانەی كە دەڵێن: ئەم حوكمە كە لە ئایەتی ژمارە (١٥)ی سووڕەتی (النساء)دا هاتوە، نەسخ كراوەتەوە، دەپرسین ئایا لابەر (ناسخ)ەكەی چییە؟

لەوبارەوە، دوو ڕا هەن:

ڕای یەكەم: دەڵێن: (ناسخ)ەكەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ: ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷛ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِائَةٍ ثُمَّ رَجْمٌ بِالْحِجَارَةِ وَالْبِكْرُ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٧١٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٤١٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٣٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيْح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٥٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٢٥))، واتە: عوبادەی كوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، {ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾، واتە: ڕێی سزادانی بۆ دۆزینەوە}، كوڕو كچ وەك یەك سزا بدرێن، وە پیاوی هاوسەردارو ئافرەتی هاوسەرداریش وەك یەك سزا بدرێن، كچو كوڕ یەكی سەد قامچییان لێ بدرێ‌و نەفی بكرێن، وە پیاوو ئافرەتی هاوسەرداریش یەكی سەد قامچییان لێ بدرێ‌و بەردبارانیش بكرێن.

دەڵـێن: ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەر ﷺ ئـەو حوکمـەی کـە لـە ئایـەتی پێشـوودا هـاتوە کە دەفەرموێ: ئەو ئافرەتانەی کە زینـا دەکـەن حەپسـیان بکەن لە ماڵێدا، نەسخی کردۆتەوە.

ئنجا دوایی دەڵـێن: پاشـان ئەم فەرموودەیەش بە ئایـەتی: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ ... ﴿٢﴾ ﴾النـور، نەسخ کراوەتەوە، بۆچـی؟

چونکە وەك دوایی کە باسـی دەکەین، سـزای ئافرەتێك کە هاوسـەرداربێ‌و پیـاوێك کـە هاوسـەرداربێ‌و داوێـن پیـسـیی بکـات، بریتیـە لـە بەردبـاران کـردن (رجـم) لەسـەر ڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان، نـەك وێـڕای ئـەوە سـەد قامچیـشـیی لـێ بـدرێ، چونکە کـە بـەردبارانی بکـەی، سـەد قامـچیـی نـاوێ، هەرچـەندە لـە فەرمایـشـتـەکەدا باسـی سـەد قامـچیی دەکـا، بـەڵام دەڵێـن: ئایەتەکە ئەو سـەد قامچییـەی لەو حەدیسـەدا نەسخ کردۆتەوە!

ئنجا دیارە ئیمام شـافیعیی ڕەحمەتی خوای لـێ بێ ڕای وایە کە هیچ کاتێك سـوننەت قورئـان نەسـخ ناکـاتەوە، وە دەڵـێ: قورئـانیش سـوننەت نەسـخ ناکاتـەوە، بـەڵام زانایـانی دیکـە دەڵێن: بەڵـێ، قورئـان سـوننەت نەسـخ دەکاتـەوە، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری زانـایان دەڵـێن: سـوننەت قورئـان نەسـخ ناکاتـەوە، کەواتـە: ئـەم ئیـشکالە لێـرەدا هەیـەو، ئـەو فەرمایـشتەی پێغەمبەر ﷺ ناگونجێ حوکمـی ئایەتێکی قورئـان لابەرێ‌و نەسخی بکاتەوە.

ڕای دووەم: دەڵێن: ئـەم ئایەتـە بـە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (النـور) کـە ئایـەتی (جلـد)یـشـی پـێ دەڵـێن، نەسـخ کراوەتـەوە، ئایەتەکـە دەفـەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ...﴿٢﴾ ﴾النـــور، بـــەڵام (أبـو سلیمان الخطـابي) کـە زانـایەکی گـەورەی بـواری فەرموودەناسـیی یـە لـە (معـالم الـسنن)دا وەك (التفـسير الكـبير) ، لـێی وەرگـرتوە[1]، دەڵـێ:

---

١) ج: (٩)، ص: (٢٠٣).

لەڕاستیدا نە ئایەتەکە نەسخ کراوەتەوەو، نە فەرموودەکەش، دەڵێ، (لَمْ يحصل النسخ في هذهِ الآية ولا في هذا الحَديث البتة، وَذَلِكَ لأَن قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴾، يَدل عَلَى أن امساكهُنَّ في البُيوتِ ممدود إلى غاية أن يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبيلاً وَذَلِكَ السَبيل كَانَ مُجْمَلاً، فلما قَالَ ﷺ: (خُذُوا عَنِّي: الثَّيْب تُرْجَم والبِكْرُ تُجْلَدُ وَتُنْفَى) صار هذا الحَدِيث بياناً لتلك الآية لا ناسِخاً لَهَا وَصَارَ أَيضاً مُخَصِّصاً لِعمُومِ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ... ﴿٢﴾ ﴾النور، وَمن المَعْلُومِ أن جَعَلَ هَذَا الحَدِيث بياناً لاحدَى الآيتَين وَمُخَصِّصاً للآية الأخرى، أولى من الحكم بوقُوع النَّسخ مِرَاراً)، واتە: نەسخ نە لە ئایەتەکەداو نە لە فەرموودەکە ڕووی نەداوە، چونکە خوا کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴾، ئەم ئایەتە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات کە بەندکردنی ئافرەتان لە ماڵەکاندا، درێژ دەکرێتەوە تا ئەو کاتەی کە خوا ڕێیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە، واتە: ڕێیەکی دیکە بۆ سزادانیان، غەیری حەپسکردن، ئەو ڕێیەش کە بە کورتی باسکراوە، ئنجا کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿خُذُوا عَنِّي الثَّيْب تُرْجَم والبِكْر تُجْلَدُ وَتُنْفَى﴾، واتە: لێموەربگرن پیاوو ئافرەتی هاوسەردار بەردباران دەکرێن، وە کوڕو کچی بێ هاوسەریش قامچییان لێدەدرێ‌و نەفی دەکرێن، کەواتە: ئەم فەرموودەیە بۆتە ڕوونکەرەوەی ئەو ئایەتە نەك ببێتە نەسخکەرەوەی، وە هەروەها ئەم فەرموودەیە بۆتە تایبەت (تخصيص)کەری مانا گشتییەکەی فەرمایشتی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ... ﴿٢﴾ ﴾النور، واتە: هەموو ئافرەت‌و پیاوێکی زیناکەر یەکی سەد قامچییان لێبدەن، ئەو حەدیسە ماناکەی تایبەت

کـردوە، بـە کـوڕو کـچـەکەوە، ئـــەدی پیـاوو ژن، واتـە: پیـاوانو ئافرەتـانی هاوسـەردار؟! ئەوە سزاکەیان بریتیـە لـە بـەردبارانکردن، ئنجـا دەڵـێ: دیـارە ئەگـــەر بڵـــێین: فەرمایـــشـتەکەش مانـــای ئایەتەکـــەی پێـــشـێی ڕوون کردۆتەوەو ئایـەتی پێشـێی لە گشتییەوە تایبەت کردوە، باشـتـرە لـەوەی کە بڵێین: چەنـد جارێك نەسخ ڕوویداوە، ئـەوە بـە نـسـبەت ڕای هـەرە زۆری زانایان، کە ئەگەر تەماشـا هەموو تەفسیـرەکان بکەی ئاوا ئـەو دوو ئایەتـە تەفسیـر دەکەن، دەڵێن: ئایـەتی یەکەمیان کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ ﴾، مەبەسـت پێـی ئافرەتانێکـە کە داوێنپیـسـییان کـردوە، وە ئایـەتی دووەمیـان کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ ﴾، مەبەسـت پێـی کوڕو کچێکـن کە زینـایان کـردوە، بـەڵام وەك باسـمان کـرد زانـایان کەوتونەتـە ڕاجیـایی یـەوە لـەوەدا کـە ئەگـەر نەسـخ بوونـە، ئایـا (ناسخ)ەکەیان چییە؟ لەوبـارەوە ڕای (أبو سليماني الخطابي)شـمان هێنـا.

**دوو/** ڕایـەکی دیکـە هەیـە کـە دیـارە مـن ئـەو ڕایـەم پـێ ڕاستتـرە، وە چـوار بەڵگەشم لەسـەر هێنـاونەوە، ئـەویش ڕای بەشـێك لـە زانایـانە کە یەکیـان (أبـو مـسلم الأصـفهاني)یـە، کـە یەکێکـە لـە زانایـانی بەرجەسـتەی تەفـسیـر، ئـەویش ڕایەکـەی لـە (مجاهـد)ەوە، هێنـاوە کـە دیـارە (مجاهـد)یـش شـاگردو قوتـابی عەبدوڵـڵای کـوڕی عـەبباس بـووە، وە (مجاهـد) کـە لـە نێـو زانایـانی شـوێنکەوتووان (تـابعين)دا لـە هـەمووان شـارەزاتر بـووە بـە قورئـان، یـاخود بـەلای کەمـەوە زۆر شـارەزا بـووە لـە قورئـان، (أبـو مـسلم الأصـفهاني) دەڵـێ: مەبەسـت لـە ئایـەتی یەکـەم کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِى يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ ﴾، ئافرەتانێکن کە عـادەتێکی خراپ ئەنجـام دەدەن کە بریتیـە لـە خۆلێکخـشـاندنو بـە عەرەبـی (سُـحاق)ی پـێ دەڵـێن، وە ئـەو جـۆرە ئافرەتانـە (مـساحِقات)یـان پـێ دەڵـێن، واتـە: ئەنـدامی زاوزێـی خۆیـان لێکدەخشێنن، بۆ ئەوەی کە ئـارەزووی خۆیان تێر بکـەن، ئـەوە یـەك.

وە مەبەستیش لە ئایەتی دووەم کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ﴾، ئەو دوو پیاوانەن کە نێربازیی (لِوَاطَة) پێکەوە دەکەن، دیارە (إمام فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆی (التفسیر الکبیر)[1] ئەم ڕایە دێنێ و لە قسەکانیەوە دیارە تەئکیدو پەسندی دەکات، هەروەها (محمد رشید رضا) بەهەمان شێوە لە تەفسیرەکەی خۆی (تفسیر القُرآن الحکیم)دا[2] ئەویش ئەو ڕایەی (أبو مسلم الأصفهاني) دێنێ، منیش ئەو ڕایەم پێ پەسندە، لەبەر چوار بەڵگان:

<u>بەڵگەی یەکەم</u>: بە پێی ئەم جۆرە تەفسیرە، ئەگەر بڵێین: مەبەست لە ئایەتی یەکەم ئافرەتانێکە کە خۆلێکخشاندن (مُساحقة) ئەنجام دەدەن، وە ئایەتی دووەمیش مەبەست پێی پیاوانێکە کە نێربازیی (لواطة) دەکەن، ئەوە ئێمە سێ ئایەتمان لە قورئاندا دەبن، کە هەرکامێکیان باسی یەکێ لە گوناهە جینسییەکان دەکات، دیارە گوناهو تاوانی جینسییش بەگشتی سێ جۆرن:

١/ یان پیاوو ئافرەت پێکەوە جووت دەبن بە حەرامیی، کە ئەوە زینایە.

٢/ یان پیاو لەگەڵ پیاو جووت دەبێ، کە ئەوە نێربازیی (لِوَاطَة)یە.

٣/ یان ئافرەت لەگەڵ ئافرەت، کە خۆلێکخشاندن (مُساحقة) ئەنجام دەدەن.

ئنجا بە پێی ئەوەبێ، ئایەتی ژمارە (١٥)ی سوورەتی (النساء) تەنیا باسی ئافرەتان دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّـٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَـٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ ﴾، دیارە ڕواڵەتی ئایەتەکەش ئاشکرایە کە هەر باسی ئافرەتەکان دەکات، ئەوە یەك.

---

١) ج: (٩)، ص: (١٩٩).

٢) ج: (٤)، ص: (٤٣٦- ٤٣٩).

وە ئایـەتی ژمـارە (١٦)ی سـوورەتی (النـساء) کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ ﴾، دیـارە ئـەویش هـەر بـە صـیغەی نێرینـە (مـذکر) دەیهـێنـێ‌و، بەس باسـی پیاوان دەکـات، ئەوە دوو.

وە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (النـور)یش کە باسـی داوێـن پیـسـیی دەکـات، کـە لـە نێـوان پیـاوو ئـافرەتدا دەبـێ‌و بـە شـێوەیەکی ناشـەرعیی لەگەڵ یەکدی جـووت دەبن، واتە: ئەگـەر بـەو تەفسـیرەبێ، هـەرکامێك لـەو سێ گوناهـە جینسـییە، سـزای خۆی بۆ دیـاری کـراوە:

١) ئافرەتـانێك کـە ئـەو کـارە خراپـە پێکـەوە دەکـەن لـە ماڵەکانیـاندا حەپـس دەکرێن.

٢) وە پیاوانێـك کـە ئـەو کـارە خراپـە پێکـەوە دەکـەن، سـزا دەدرێـن‌و ئـازار دەدرێـن‌و، چۆنیەتی سـزادان‌و ئازاردانەکـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ دەسـتەڵاتی شـەرعیی، کە وەك دوایی باسـی دەکـەین، هـەندێك لـە زانایان ڕایان وایـە، کـە دەسـتەڵاتی شـەرعیی بـۆی هەیـە سـزای تەمبـێ کـردن (تعزیـر)ی بگەیەنێتـە ڕادەی کوشـتن.

٣) وە سـزای داوێـن پیـسیی‌و زینـاش لـە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـوورەتی (النـور)دا دیاریکراوە، کە بریتیە لە سەد قامـچیی‌و، وە لەسـەر ڕای زۆربـەی زانایـانیش پیـاوو ئـافرەتی زیناکـەر، واتـە: پیـاوی هاوسـەردارو ئـافرەتی هاوسـەرداریش سـزای داوێـن پیـسییەکەیان بریتیـە لـە بـەردبارانکردن، کـە ئـەوە لـە کـاتی خۆیـدا باسـی دەکـەین، چـونکە لەوبـارەوە جۆرێـك لـە ڕاجیـایی لـەنێو زانایانـدا هەیـە، کـە ئایـا ئـەو حوکمـە (حوکمـی بەردبـارانکردن) نەسخ کراوەتەوە، یان هـەر هـەیە؟

<u>بەڵـگـەی دووەم</u>: بەپێـی ئـەم تەفسـیرەبێ کە بڵێین: ئایـەتی یەکەم بـۆ ئـەو جـۆرە ئافرەتـانەیە، وە ئایـەتی دووەم بـۆ ئـەو جـۆرە نێرینـانەیـە، وە ئایـەتی ژمارە (٢)ی سـوورەتی (النـور) بۆ ئەوانی دیکەیە، ئەوە باسـی نەسـخ نایەتـە گـۆڕێ، یـاخود هـیچ پێویـست ناکـات بڵـێین: ئایـەتی ژمـارە (١٥)ی

سـووڕەتی (النـساء) بـە فەرمایـشـتەکە، یـاخود بـە ئایـەتی ژمـارە (٢)ی سـووڕەتی (النور) نەسـخ بۆتەوە.

وە بـە تەئکیـدیش ئایەتـەکانی خـوای پـەروەردگار بـەپێی توانـا (حـدّ الإمكان) دەبـێ نەسـخیان لـێ دووربخەینـەوە، یـانی: لابردنـی حوکمەکـەیان، چونکـە مەعقـوولّ نیـە خـوای کاربەجـێ ئایەتـەکەی هێـشتبێتەوەو حوکمەکـەی لابردبـێ! بیخوێنینـەوە، بـەلاّم کـاری پێنەکـەین! نـەخێر مـادام بگونجـێ کاریان پێ بکەینو تێکنەگیرێن، ئـەبو جەعفـەری تەبـەریی‌و هـەموو زانایـانی دیکـەش دەڵێن: ئەگـەر زۆر ناچـار نـەبین‌و دوو ئایـەت لـە هـەموو ڕووێکـەوە زۆر تێکنـەگیرێن، نـابێ بڵـێین: ئـەوەیان ناسـیخەو ئـەوەیان مەنسووخە.

<u>بەڵگـەی سـێیەم</u>: ئەگـەر بـەو جۆرەی کـە هەڵمانبـژارد، هەردوو ئایـەتی ژمـارە (١٥)و (١٦) تەفـسیر نەکـەین، چـەند ئیـشکالێکمان بـۆ دروسـت دەبـن، کـە وەلاّمیـان زۆر زەحمەتـە؟!

١- وشـەی (اللاَّتي) کە کـۆی (الَّـتي)یە، کە دیـارە (الَّـتي)یش بـۆ ئافرەتێـك بـەکاردێ، بـەلاّم (اللاَّتـي) بـۆ کۆمـەڵێك ئـافرەت بـەکاردێ، بۆیـە خـوای پەروەردگـار کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾، مانـای وایـە هـەر باسـی ئافرەتـانە، چونکـە ڕاناوێکـی بەکارهێنـاوە کـە تـەنیا بـۆ ئافرەتـان بەکـاردێ، کەواتـە مەبەسـت لـە (فاحـشـة) خۆلـێکخشاندنی ئافرەتانـە، چـونکە ئەگـەر بڵێیـن: مەبەسـت پێی زینـا کردنە، زینا تەنیـا لە نێـوان نێرو مـێدا دەبـێ، بـەلاّم نێربـازیی تـەنیا لـە نێـوان نێـراندا دەبـێ، وە خۆلێکخشـاندن (سُحاق) تەنیـا لـە نێوان مێیـاندا دەبـێ، بـەلاّم بـۆ زینـاکردن دەبـێ نێرو مـێ هـەر هـەبن، کەواتـە: ئەگـەر بڵـێین: مەبەسـت لـە ﴿وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن

﴿نِسَآئِكُمْ﴾، زیناکردنی کۆمەڵە ژنێکە، ئەدی ئەو پیاوانەی زینایان لەگەڵدا کردوون کێن؟ پاشان ئەگەر ئافرەتەکان بەند بکرێن لەسەر ئەو زینایە، ئەدی بۆچی پیاوەکان باسی سزاکەیان نەکراوە؟! لە کاتێکدا کە لە شەریعەتدا هەرگیز شتی وانیەو خوای دادگەر لە کاتێکدا کە نێرو مێیەك پێکەوە گوناهێك بکەن، باسی سزای مێینەکە بکاو باسی سزای نێرینەکە نەکات، شتی وا لە شەریعەتدا نیە، ئەوە ئیشکالێك!

٢- ئیشکالێکی دیکە ئەوەیە کە وشەی: (اللَّذان)ی لە زمانی عەرەبیدا واتە: دوو نێرینە، بەلاَم بەپێی ئەوەی کە زۆربەی زانایان هەڵیانبژاردوە دەبێ بڵێین: ئەوە مەبەست پێی کوڕو کچی زیناکەرن، کە ئەو کاتە دەگوترێ: (تَغْلیبُ الَّذَکر علی الأُنثی) لە زمانی عەرەبیدا وەختێك پیاوێك و ئافرەتێك، نێرو مێیەك شتێك بکەن دروستە ڕاناوی نێرینەیان بۆ بەکاربهێنین، وەك زاڵکردنی نێرەکە بەسەر مێیەکەدا، بەلاَم دیارە ئەگەر ناچار نەبین نابێ پەنا ببرڕێتە بەر ئەو بنچینەیەو لێرەشدا (اللذان)ی واتە: ئەو دوو نێرینەیە کە ئەو کردەوە خراپەیە دەکەن، کە ئەویش بەپێی ئەو تەفسیرە بێ کە ئێمە هەڵمانبژارد، کە (أبو مسلم الأصفهاني)و (مجاهد) گوتوویانە، هیچ پێویستییمان بەو تەئویلە نابێت، کەواتە: ئەویش هەر مەبەست پێی ئەوەیە، کە لە نێوان دوو نێرینەدا ڕوودەدات. ئنجا ئەوەش کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە ئایەتی: ﴿وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ﴾، ژنانی هاوسەردارە، وە مەبەست لە ئایەتی: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ﴾، کچو کوڕی بێ هاوسەرن، لەڕاستییدا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، بەڵکو دەڵێین: ئەوە هەر قسەیەکە بۆ خۆ دەربازکردن لەو ئیشکالانە، کە بەو جۆرە خۆدەربازکردنە لە جیاتی چارەسەری ئیشکالەکەو لاچوونی، ئیشکالی دیکەش پەیدا دەبێ،

كــەواتە: مەبەســـت لــە: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ ﴾، دوو نێرینــەی نێربازییكەرە، بكـەرو پێكــراو (فاعل)و (مفعول)!

٣- ئنجــا ئەگــەر لــەو دوو ســزایە وردبینـــەوە كــە دەفــەرمــوێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةً مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ ﴾، ئەویدیكـــەش كـــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَا ﴾، ئەگـەر لێیـان وردبینـەوە وە بـە پێـی ڕای زۆربـەی زانـایان لێـكیان بدەینـەوە كـە ئـەوەی یەكەمیـان بـۆ پیـاوانو ئافرەتـانی هاوسـەردارە، وە ئـەوەی دیكــە بـۆ هـی بـێ هاوسـەرە، ئــەوە دیــسان تووشــی چــەند ئیــشكالێك دەبــین كــە لــێ دەربازبوونیــان مەحـاڵە:

أ/ دەڵێین: ئەگەر لـە ئایـەتی ژمـارە (١٥)دا مەبەسـت لـە وشـەی: (فاحِشة) زینـا بێ، باشـە ئەو چوار پیـاوە كە زیناكردنی ئـەو ژنانـە دەبینن، خۆ زینـاكردنی پیاوەكانیش لەگەڵیاندا دەبینن، كەواتـە: وەك چۆن شـایەدیی دەدەن كە ئەو ئافرەتانە زینایان كردوە، شایەدییش دەدەن كە پیاوەكانیش زینایان كردوە، كەواتـە: چۆن شایەدییان لەسـەر ئافرەتـەكان داوەو سـزاش دەدرێن، كەچی شایەدییان لەسەر پیاوەكانیش داوە، بەڵام سـزا نـادرێن ؟!

ب/ پاشـــان دەپرســـین: ئایـــا دەگونجـــێو عەقڵیـــی ســـەلیم ڕێ دەدات، شـــەریعەت فـەرمان بكـات: پیاوێـك ژنـە داوێنپیـسەكەی خـۆی لـە ماڵێـدا بهێڵێتـــەوەو، خزمـــەتی بكـــاو نـــانو نەفەقـــەی بداتـــێ، هەرچـــەندە بەنـدیش بـێ؟! بـە تەئكیـد ئـەوە زۆر دوورە لـە ڕووحـی شـەریعەتو لـە غیـرەتێكـەوە كە شـەریعـەت لە مسـوڵمانـانی دەوێ، كـابرا بزانـێ خێزانـی زینـا دەكـاو بێ لە ماڵی حەپسـی بكـات!! شـتی وا نیـە، وە خـوای پـاكو تاك سـزای وای نەنـاردۆتە خـوار.

ج/ پاشان دەڵێین: ئەگەر مەبەست لە وشەی ﴿ وَٱلَّذَانِ ﴾، كوڕو كچی زیناكەربن، وە سزای كوڕەكە ئازاردان بێ، كە جاری وا هەیە ئەو ئازاردانە دەگاتە ڕاددەی كوشتن، دەڵێین: لێرەدا مانای وایە سزای كچێك كە زینای كردوە، یان كوڕێك كە زینای كردوە، گەورەتر دەبێ لە ژنێكی هاوسەردار، یان پیاوێكی هاوسەردار، كە زینا دەكەن، بۆچی؟

چونكە ژنەكە هەر حەپس دەكرێ، بەڵام كچەكە ڕەنگە بكوژرێ بە سزای تەمبێ كردن (تعزیر)، كە ڕەنگە ئەو سزایە بگەیەنرێتە ئەوپەڕی و پێی بكوژرێ، دیارە ئەوەش شتێكی پێچەوانەیە، چونكە دەبێ ئەوەی كە هاوسەردارە، ئەگەر داوێن پیسیی بكات، سزایەكەی تووندتر بێ لەوەی كە بێ هاوسەرە.

<u>بەڵگەی چوارەم</u>: بەڵگەیەكی دیكەش لەوبارەوە ئەوەیە كە ئەگەر لە هەردوو سزایەكان وردبینەوە لە ڕووی عەقڵیی و لە ڕووی ڕووحیی و لە ڕووی شەریعەت و واقیعیشەوە، زۆرباش لەگەڵ تاوانی خۆلێكخشاندنی ژنان (سُحاق)، وە نێربازیی (اللِواطة) پیاواندا گونجاون، وە هیچ كام لەو ئیشكالانەیان نایانە سەر، كە پێشتر دەهاتە سەریان:

**یەكەم: سزای بەندكردن لە ماڵەكانیاندا (الإمساك في البيوت):**

ئەو سزایە بۆ ئافرەتانێك كە دووچاری ئەو عادەتە خراپە بوونە، سزایەكی پڕ بە پێست و گونجاوە، چونكە ئافرەتێك كە ئەو كارە خراپە دەكات، دیارە حەز بە چارەی پیاو ناكات و نایەوێ وەچەی ببێ، بۆیە جێی خۆیەتی لە ماڵەكەیدا تەنیا بێ و تێكەڵی ئافرەتانی دیكە نەبێ، هەتا واز لەو عادەتە خراپە دێنێ و، دەگەڕێتەوە سەر فیطرەتی ساغیی خۆی، یان بەو حاڵەوە دەمرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴾، كە دیارە ڕستەی: ﴿ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴾، لەگەڵ گەڕانەوەو وازهێنانیان لەو عادەتە خراپەدا دەگونجێ، چونكە كەسێك واز

لە گوناحو خراپە بێنێ، خوا دەرووی خێری لێ كردۆتەوە، بەلاّم سزای قامچیی لێدان (جلد) یان بەردباران كردن (الرّجم) بۆ ئەو ژنانە دەروو لێكرانەوە نیە، بگرە بەردبارانكردن خراپترین جۆری كوشتنە!

دووەم: سزای ئازاردان (فـأَذُوهُمَا):

ئەمیش بۆ ئەو نێرینانە (ذكور) كە دووچاریی نەخۆشیی نێربازیی دەبن، سزایەكی گونجاوو پڕ بە پێستە، چونكە خوا دەفەرمویّ: ئازاریان بدەن، سزایان بدەن، ئیدی ئەو سزادانە بەگشتی فەرموویەتیو، بەپێی حاڵەتە جیاجیاكانی كەسەكان، جۆراو جۆر دەبێو دەگۆڕێ، چونكە جاری وایە دوو كوڕەكە تازە دەگەنێو هەرزەكارن، بە سەرزەنشتكردنێكو دوو زللە وازدێنن، وە جاری وایە تەمەنیان زیاترەو دەبێ سزاكەیان توندتربێ، یاخود جاری وایە وا لێیان بۆتە عادەتێكی خراپ كە بەكەڵكی نێو كۆمەڵگا نەماونو، پێویستە وا سزا بدرێن كە سزاكەیان مەرگ بێ، ئاشكراشە كە وشەی: ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾، هەموویان دەگرێتەوە.

شایانی باسیشە زانایان دوو ڕەخنەیان ئاڕاستەی ئەو ڕایە كردوون كە ئێمە هەڵمانبژاردوە، بە پێویستی دەزانم بیانخەمەڕووو وەلاّمیان بدەینەوە:

ڕەخنەی یەكەم: دەڵێن: هیچ كام لە زانایانی لەوە پێش وشەی (فاحِشة)یان بە خۆلێكخشاندنی ئافرەتان تەفسیر نەكردوە، بەڵكو هەر بە زینایان تەفسیر كردوە!

ڕەخنەی دووەم: دەڵێن: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لەسەر سزادانی تاوانی نێربازیی ڕاجیایی یان بووەو ئەگەر ئەو ئایەتە دەربارەی ئەوە بووایە ڕاجیاییان نەدەبوو!

كە دەگونجێ ئاوا وەلاّم بدرێنەوە:

یەكەم: ڕاست نیە وشەی (فاحِشة) كە لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا هاتوە، بە خۆلێكخشاندن (مُساحقة) مانا نەكرابێ، بە بەڵگەی ئەوە كە (مجاهد) كە

یەكێكە لە كەڵە زانایان، ئاوا مانای كردوە، وە پاشان هەموو زانایەك بۆی هەیە قورئان تەفسیر بكات، لە چوارچێوەی ڕێزمانو واتاكانی زمانی عەرەبیدا، مادام ئەو وشەیە ئەو واتایە بگەیەنێ، وشەی: (فاحِشة)ش وەك پێشتریش گوتمان: لە زمانی عەرەبیدا واتە: هەر كردەوەیەكو هەر قسەیەك كە زۆر ناقۆڵاو ناشیرینو خراپو دزێوبێ، كەواتە (فاحِشة) زیناش دەگەیەنێو، شتی دیكەش دەگەیەنێ، وەك خۆلێكخشاندنی مێینانو نێربازی نێرینان.

**دووەم:** وە بە نسبەت ڕاجیایی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺیشەوە، بەڵێ ڕاجیاییان هەبووە دەربارەی سزای نێربازیی (لِواطة)، بەلآم ڕاجیاییەكەیان لەوبارەوە بووە كە سزایەكی دیاریكراویان بۆ دانەناوە، نەك لەسەر ئەوە كە سزا نەدرێ، هەموویان گوتوویانە: دەبێ سزا بدرێ، بەلآم ئایا سزایەكەی چی بێ؟ لەوەدا ڕاجیاییان هەبووە، دیارە ئەوەش لەگەڵ ئەوە تێكناگیرێ كە ئایەتەكە بەو شێوەیە تەفسیر بكرێ، چونكە ئایەتەكە بواری ڕاجیایی تێدا هەیەو كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَا ﴾:

یەكێك گوتوویەتی: واتە: توند سزا بدرێن.

وە یەكێك گوتوویەتی: واتە: كەم سزا بدرێن.

... هتد، واتە: چەمكی ئایەتەكە چەند مانایەك هەڵدەگرێ، بۆیە هاوەڵانی بەڕێزیش خوا لێیان ڕازی بێ لەبارەیەوە كەوتوونەتە ڕاجیاییەوە.

ئێستاش پاش ئەوەی ئێمە باسی چۆنیەتی ڕاجیایی توێژەرەوانی قورئانمان كرد دەربارەی ئایەتەكانی ژمارە (١٥و ١٦)ی سوورەتی (النساء)، وە بەگشتی دوو ڕامان هێنان، كە زۆربەی توێژەرەوانی قورئان بە جۆرێك تەفسیریان كردوون، هەندێكیشیان بە جۆرێكی دیكە تەفسیریان كردوون، كە دیارە من جۆری دووەمم پێ پەسندە.

## کۆتـا قسـەم لەبارەی تەفسـیری ئەو دوو ئایەتە موبارەکەوە

لە چەند خاڵێکدا قسـەو بیـروڕای خۆم دەخەمـە ڕوو:

خـاڵــی یەکـەم: وشـەی فاحیـشە لـە زمـانی عەرەبـیدا، وە لـە بەکارهێنـانی قورئانیشـدا واتە: هەر قسەو کردارێکی ناشـیرینو ناقـۆڵاو دزێوو خـراپ، کـە ئـەوە زینـاش دەگرێتـەوەو، نێربـازییش دەگرێتـەوەو، خۆلێکخـشاندنی ئافرەتـــانیش دەگرێتـــەوەو، چرووکـــیی (بخـــل)یـــش دەگرێتـــەوەو، جنێـــودانیش دەگرێتـــەوە، بەڵـــێ، وشـــەی: (فُحْش، فَحْشَاء، فَاحِشَة) بریتیـە لە هەر قسـەو کردەوەیـەك کە زۆر دزێـوو ناقـۆڵاو ناشـیـرین بـێ، ئنجا ئەگـەر تەماشـای ئایەتـەکانی قورئـان بکـەین، کـە بێـگومان قورئـان هەندێکـی هەنـدێکی تەفـسیـر دەکـات، دەبینـــین وشـــەی: (فَاحِشَة) بـە چەنـد واتایـەك هـاتووە بـەس یـەك واتـای نیـە، ئنجـا ئایا بۆچی مـن لێـرەدا ئـەوە ڕوون دەکەمـەوە؟ لەبـەر ئـەوەی ڕەخنەیـەك کـە زۆربـەی توێـژەرەوانی قورئـان دەیگـرن لـە ڕای دووەم، کـە دەڵـێ مەبەسـت لـەو ئافرەتانــە ئافرەتــانی زیناکــەر نــەبووەو ئافرەتــانی خۆلێکخــشێنەرە، بەهێزترین ڕەخنەیان ئەوەیـە کە دەڵـێن: وشــەی: فاحیشـە لـە قورئانـدا بەس بە مانای زینـا هـاتووە، بە مانای خۆ لێکخشـاندنی ئافرەتان نـەهاتوە، وە بـە مانـای نێربـازیی (لِواطـة) نەهـاتوە، بـەڵام ئەگـەر ئێمـە تەماشـای قورئان بکـەین، دەبینـین وانیـە، بۆ وێنـە:

أ- لە ئایـەتی ژمارە (١٩)ی سـوورەتی (النـور)دا، خوا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتـە: بێگومـان ئەوانـەی کـە حـەز دەکـەن فاحیـشە لـەنێو ئەوانـەدا بـڵاوبێتەوە کـە ئیمانیـان هێنـاوە، ئـازارێکی بـە ئێشیان هـەیە لە دنیـاو دواڕۆژدا، وە خـوا دەزانـێو ئێـوە نازانـن.

ئنجا ئایا مەبەست لە وشەی فاحیشە لێرەدا چییە؟ ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەكان بكەین، دەزانین كە فاحیشە لێرەدا واتە: بوختانكردن، بۆچی؟ چونكە لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا هاتوە كە دەربارەی بوختانكردن بە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ هاتوونە خوار، كەواتە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ ﴾، واتە: ئەوانەی حەز دەكەن فاحیشە بلاوبێتەوە، یانی قسەی خراپ، بوختانكردن، غەیبەتكردن، تۆمەت هەڵبەستن بۆ خەڵك، كەواتە: وشەی: فاحیشە بە مانای تۆمەتو بوختانو قسەو قاڵی خراپ دێ.

ب- وە لە ئایەتەكانی ژمارە (٢٨و ٢٩)ی سوورەتی (العنكبوت)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ ...﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: وە لووط كاتێك بە گەلەكەی خۆی گوت: ئێوە فاحیشەیەك ئەنجام دەدەن، كە لە پێش ئێوەدا هیچ كەس لە جیهانییان ئەو فاحیشەیەی نەكردوە، ئێوە دەچنە لای پیاوان...

كەواتە: ئەگەر نێرینە سواری نێرینەبێ، پێی دەگوترێ: فاحیشە، یانی كە لە ئایەتی ژمارە: (١٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَا ﴾، (یأتیانها) ڕاناوەكەی دەچێتەوە بۆ وشەی: (فاحشة)، لە ئایەتی ژمارە (١٥)ش وەك چۆن فاحیشەی نێوان ئافرەتان خۆلێكخشاندنە، فاحیشەی نێوان پیاوانیش بریتییە لە لەگەڵ یەكدی جووت بوونیان، هەروەك چۆن فاحیشەی نێوان پیاوانو ئافرەتانیش بریتییە لە زیناو داوێن پیسیی یان.

ج- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٢٨)ی سوورەتی (البقرة)دا وشەی: (فحشاء) بە واتای ڕژدییو چرووكیی هاتوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾، واتە: شەیتان دەتانترسێنێ لە هەژاریی، وە فەرمانتان پێدەکات بە فەحشاء، (واتە: چرووکیی‌و دەستگرتنەوە)، وە خوا بەڵێنی لێبوردنتان پێدەدات، بەڵێنی بەخشینتان پێدەدات، وە خوا فراوانی زانایە، کە دیارە لێرەدا وشەی (فحشاء) واتە: چرووکیی‌و ڕژدیی.

د- ئنجا لە ئایەتی ژمارە (١٩)ی سوورەتی (النساء)دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ... ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! بۆتان حەڵاڵ نییە بە تۆبزیی ئافرەتان بە میرات بگرن، (نەك میراتیان لێ بگرن، کە دوایی باسی دەکەین بە میراتگرتنی ئافرەتان چۆن بووە؟)، وە بۆتان نیە تەنگیان پێ هەڵبچنن ڕێگای هاوسەرگیرییان لێ بگرن، (دوای ئەوەی وازیان لێ دێنن، یاخود هەر لە سەرەتاوە کە هاوسەرگیریی بکەن)، بۆ ئەوەی بەشێك لەو ماڵەی کە پێتان داون (لە مارەیی) لێیان وەربگرنەوە، مەگەر ئەو ئافرەتانەتان فاحیشەیەکی ئاشکرا بکەن، کە لێرەدا مەبەست لە فاحیشەی ئاشکرا لەسەر ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان یانی: یاخییبوون (نشوز)ی ژن لە مێردەکەی، وە سەرپێچیی‌و شەڕەجنێو دەمبەدەمەی لەگەڵ مێردەکەیدا، ئەو کاتە مێرد بۆی هەیە بڵێ: با دارنیین (خُلْع) بکەین، واتە: مارەیی یەکەم بدەوەو دەستت لێهەڵدەگرم.

وەك دیتمان: وشەی (فاحشة، فحشاء) لە قورئاندا بە چەند واتایەکی جۆراوجۆر هاتوە.

خاڵی دووەم: لەڕاستییدا هۆی ڕاجیایی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، وە زانایانی دوای ئەوانیش، لە بارەی حوكمو سزای نێربازیی یەوە، خودی چەمكو واتای فراوانی ڕستەی: ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾یە، كە لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا هاتوە، نەك پێچەوانەكەی، واتە: بۆیە كەوتوونە ڕاجیایی یەوە، چونكە ئەو ڕستەیە چەمكو واتایەكەی فراوانەو زۆر مانایان هەڵدەگرێ نەك لەبەرئەوەی كە ئەو ئایەتە لەوبارەوە نەهاتوە، بەڵكو لەبەرئەوەی ئەو ئایەتە لەوبارەوە هاتووەو مانایەكەشی فراوانە، بۆیە كەوتوونە ڕاجیایی یەوە، چونكە باسی سزایەكەی كردوە، بەڵام بۆ وێنە: دەربارەی سزای دزیی دەفەرموێ: دەستیان ببڕن،و، بۆ زیناكردن دەفەرموێ: سەد قامچییان لێبدەن،و، بۆ بوختانكردن دەفەرموێ: هەشتا قامچییان لێبدەن، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ئازاریان بدەن، چۆن ئازاریان بدەین؟ چەمكو واتاكەی فراوانە:

یەكێك دەڵێ واتە: سەرو زللەیان لێبدەن، یەكێكی دیكە دەڵێ واتە: داركارییان بكەن، ئەویدیكە دەڵێ: واتە: قامچیی یان لێبدەن، ئەویدیكە دەڵێ: واتە: لەسەر شاخێكرا هەڵیاندەنە خوارێ، ئەو ڕایانەو هی دیكەش هەموویان هەن، كە دیارە دیاریكردنی چۆنیەتی ئەو ئازاردانە دەگەڕێتەوە بۆ دەستەڵاتی شەرعیی،و بۆ حومكڕانی شەرعیی، بۆچی؟ چونكە وەك گوتم: ئەوانیش (یانی بكەرو پێكراوەكان دیسان جیاجیان: یەكێك هەرزەكارێكەو یەكەم جارە دەیكات، یەكێك گێل،و نەفامە، یەكێك هەڵخەڵەتێنراوە، یەكێك لێی بۆتە عادەت ... هتد، بۆیە دیاریكردنی سزادانەكە دەگەڕێتەوە بۆ تەقدیری دەستەڵاتی شەرعیی.

خاڵی سێیەم: من زۆر گەڕام لە هەموو تەفسیرەكاندا، هیچ كام لەم دوو ئایەتە هۆی هاتنە خوارەوەكانیان باس نەكراوە، جا ئایا ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە لە كۆمەڵگای پێغەمبەردا ﷺ ئەو كۆمەڵگایەی كە یەكەمجار ئەم ئایەتانەی تێدا هاتوونە خوارێ، بە ئیسپات

نە ئەو عادەتە خراپانەی ئافرەتان (خۆ لێكخشاندن) هەبووە كە بچەسپێ بێ بە بەڵگەی شەرعیی، وە نە ئەو عادەتە خراپەی دیكەش هەبووە، كە لەنێو پیاواندا دەكرێ (نێربازیی)، واتە: ئایەتەكان هۆی هاتنە خوارەوەیان نیەو بە بۆنەیەكەوە نەهاتوونە خوار ڕووداوێك ڕووی نەداوە، تاكو هاوەڵان باسی بكەن، چونكە هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: ئەدی بۆچی هاوەڵانی بەڕێز باسیان نەكردوەو ئەو دوو ئایەتەیان ئاوا تەفسیر نەكردوون؟ هۆیەكەی ئەوەیە كە ئەم دوو ئایەتە بە هۆی دوو ڕووداوەوە نەهاتوونە خوار، واتە: هۆی هاتنە خواریان نیە، بەڵكو دوو حوكمی شەرعیین، خوا ناردوونیە خوارێ بۆ هەموو بەشەریەت، خۆ ئەم قورئانە تەنیا بۆ هاوەڵانی بەڕێز نەهاتۆتە خوارێ، هەتاكو هەمووی پەیوەندیی بەوانەوە هەبێ، بەڵێ ئەم دوو ئایەتە لەسەردەمی ئەواندا جێبەجێ نەكراون، چونكە ئافرەتانی وانەبوون ئەو كردەوەیە بكەن، وە پیاوانی وا نەبوون كە لەوكاتەدا ئەو كارە بكەن‌و لەسەریان ئیسپات بێ بە بەڵگەی شەرعیی، هەتاكو حوكمی ئایەتەكانیان بەسەردا بچەسپێنن، كەواتە: هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ كە باسی تەفسیركردنی ئەو دوو ئایەتەیان نەكردوە بەو شێوەیەی كە ئێمە تەفسیریان دەكەین، مانای وانیە كە ئەم دوو ئایەتە ئەم مەبەستە ناگەیەنن، بەڵكو مەسەلەكە ئەوەیە كە لەو كاتەدا ڕووداوی ئاوا ڕووی نەداوە، تاكو هاوەڵان بەپێی ئەو ڕووداوانە ئایەتەكان تەفسیر بكەن، وە بەسەر ئەو كەسانەشیاندا بچەسپێنن كە ئەو ڕووداوانەیان لێ ڕوویداون.

ئنجا ئەوەی كە ناچارمان دەكات بڵێین: مەبەست لە وشەی: (فاحِشة) لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا، بریتیە لە خۆلێكخشاندنی ئافرەتان، ئەوەیە كە خوا ﷻ تەنیا باسی ئافرەتان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِي ﴾، شتێكیش تەنیا لەنێو ئافرەتان دابێ، لە ڕووی ئینحیرافی جینسییەوە، هەر ئەو ڕەفتارەیە، وە ئەوەی كە وامان لێ دەكات بڵێین: ڕاناوی (ها)ی سەر

(يأتيانها) مەبەست پێی نێربازیی یە، ئەوەیە کە ئەوەی لە نێوان دوو پیاواندا، دوو نێریناندا ڕوودەدات لە ڕووی ئینحیرافی جینسیی یەوە، بریتیە لە نێربازیی، بۆیە ناچارین ئاوا تەفسیریان بکەین.

ئنجا ئێمە لە کۆتایی ئەو لێکۆڵینەوەماندا دەربارەی تەفسیری ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، پێویستە وەڵامی دوو پرسیاران بدەینەوە:

پرسیاری یەکەم:

ئایا چی لەو فەرموودەیەی عوبادەی کوڕی صامیت بکەین کە پێشتر هێنامان: ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِائَةٍ ثُمَّ رَجْمٌ بِالْحِجَارَةِ، وَالْبِكْرُ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٢٧١٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٣٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٤١٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٤٣٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيْح، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٥٥٠)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٤٢٥)، واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، (ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾، واتە: ڕێی سزادانی بۆ دۆزینەوە)، کوڕو کچ وەك یەك سزا بدرێن، وە پیاوی هاوسەردارو ئافرەتی هاوسەرداریش وەك یەك سزا بدرێن، کچو کوڕ یەکی سەد قامچییان لێ بدرێ‌و نەفی بکرێن، وە پیاوو ئافرەتی هاوسەرداریش سەد قامچییان لێ بدرێ‌و بەردبارانیش بکرێن؟! دەڵێین: ئەم فەرموودەیە ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە کێشەی نەبێ، لە ڕووی (متن)ەوە دوو سێ ئیشکالی تێدا هەن، بۆ کەسێك کە وردبێتەوە، چونکە هەرچی کە گوترا: ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، هیچ کام لە زانایان نەهاتوون یەکسەر حوکمی لێ هەڵهێنجن، بەڵکو تەماشایان کردوە: ئایا ئەو حەدیسە لەگەڵ

حەدیسێکی دی، یان لەگەڵ ئایەتێکی قورئاندا، یان ئەو حەدیسە لەگەڵ واقیعدا تێکناگیرێ؟! بۆیە دەبێ لە ڕووی سەنەدو مەتنەوە لێی وردبینەوە:

**یەکەم**: لە ڕووی سەنەدەوە، هەرچەندە ئەم حەدیسە لە ڕووی سەنەدەوە لە جۆری (آحاد)ە و ئەویش واتە: (حدیث الآحاد) لەسەر ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان قورئانی پێ نەسخ نابێتەوە، (حدیث الآحاد)یش ئەوەیە کە یەك هاوەڵ لە پێغەمبەری ﷺ بیستبێ، کە لێرەدا عوبادەی کوڕی صامیت بیستوویەتی، بەڵام بێگومان ژمارەیەکی نەژمێردراو لە هاوەڵان قورئانیان لە پێغەمبەر ﷺ بیستوەو (متواتر)ە و حوکمەکەی یەقینییە، بەڵام (حدیث)ی (آحاد) حوکمەکەی (ظنّي)یەو گومانت هەیە کە وابێ، ئاشکراشە کە گومان (ظنّ) دڵنیایی (یقین)ی پێ هەڵناوەشێتەوە.

**دووەم**: لە ڕووی مەتنەوە: فەرموودەی ناوبراو لە ڕووی نێوەڕۆك (متن)یشیەوە چەند گرفتو ئیشکالێکی هەن:

١/ ڕستەی: ﴿ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴾، خوا دەفەرموێ: ئافرەتانێك کە ئاوا دەکەن، حەپسیان بکەن تاکو دەمرن، یاخود تاکو خوا ڕێگایەکیان بۆ دەبینێتەوە، ئەم مانایە لەگەڵ حەدیسەکەدا ناگونجێ، بۆچی؟ چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: خوا ڕێیەکیان بۆ دەبینێتەوە، بەڵام حەدیسەکە سزایان بۆ دیاریی دەکات ! دیارە سزا دیاریکردنیش کە ئافرەتەکان بەردباران بکرێن، ئەوە ڕێ بۆ دۆزینەوەیان نیە، ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە خوای پەروەردگار چارەسەرێکیان بۆ دەدۆزێتەوە، کە ئەوە لەگەڵ تەفسیرەکەی ئێمەدا دەگونجێ، کە بریتیە لەچی؟ بریتیە لەوە ئەو ئافرەتانە حەپس بکرێن تاکو قەناعەتیان دێو واز لەو کردەوە خراپە دێنن‌و، دەگەڕێنەوە بۆ سەر سروشتی ساغیی خۆیان کە بە شێوەیەکی شەرعیی هاوسەرگیریی بکەن‌و غەریزەی خۆیان تێر بکەن.

٢/ سزای پیاوو ژنی هاوسەرداری زیناكەر وەك: لە سوننەتی كردەیی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، تەنیا بەردباران كردن (رجم)ە، بەڵام لێرەدا باسی (جلد)یش دەكات، واتە: باسی ئەوە دەكا دەبێ سەد قامچیشی لێ بدرێ، ئەوەش ئیشكالێكە، پێغەمبەر ﷺ بە نسبەت (مَاعِزُ بْنُ مَالِك)و بە نسبەت (الْغَامِدِيَّةِ) كە پیاوو ئافرەتێك بوون زینایان كردبوو، بەردبارانی كردن، ئەوە چەسپاوە لە سوننەتی پێغەمبەردا[1] ﷺ، بەڵام ئەم حەدیسە دەفەرموێ: وێڕای بەردبارانكردن دەبێ پێشێ یەكێ سەد قامچیشیان لێ بدەی، دیارە ئەوەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، كەواتە: هەقی خۆمانە لەو حەدیسە بكەوینە گومانەوە كە ناگونجێ ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێ، چونكە لەگەڵ كردەوەی پێغەمبەردا ﷺ تێكدەگیرێ، ئنجا تۆ مادام هەر بەردبارانی بكەی، سەد قامچی بۆ لێ دەدەی؟! خوای دادگەر دوو سزای بۆ تاوانێك دانەناون.

٣/ مادام پێغەمبەر ﷺ بە ناوی خواوە فەرموویەتی: ﴿خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾، لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، باشە ئەوە خوای پەروەردگار ڕێی دۆزییەوە بۆ كوڕو كچی زیناكەر، كە یەكی سەد قامچییان لێ بدەن، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ... ۝٢﴾ النور، واتە: هەموو ئافرەتو پیاوێكی زیناكەر یەكی سەد قامچییان لێ بدەن، كە زۆر لە توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست پێی كوڕو كچن، واتە: پیاوو ئافرەتێك كە هاوسەردار نەبووبن، هەر چەندە من ڕایەكی دیكەم هەیە لەوبارەوە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، باشە ئەوە دامانا،

---

١) بڕوانە: صحيح مسلم: (٤٤٠٣/ ١٦٩٤ و (١٦٩٥/٤٤٠٦).

خـوا ڕێـی بـۆ کـوڕو کـچان دۆزیـەوە، ئـەدی کـوا ڕێـی پیـاوو ئـافرەتی هاوسـەردار؟ ئەوان حوکمیـان لە قوڕئـاندا نیـە !

ئنجـا ئەگـەر وێـڕای ئـەو ئیـشـکالانەش فەرموودەکـە هـەر بـە هـی پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین، دەڵـێین: پێغـەمبەری خوا ﷺ تـەنیا هـەواڵی بە دیاریکردنی سزای زیناکەرانی کـوڕو کـچو ژنو پیـاو داوە، هـیچ باسـی نەسخ کردنـەوەو تێکگیـرانی نێـوان ئـەو دوو ئایەتـەو ئایـەتی ژمارە (٢)ی سـووڕەتی (النـور)ی نـەکردوە، کەواتـە: ئـەو دوو ئایەتـە هـەر لـەجێی خۆیانن‌و، مەسـەلەی نەسخ لـە گۆڕێ دانیـە، وە ئێمـەش پێویـست ناکات هـیچ بـاس نەسـخ‌و تێکگیـران بکـەین، هـەر دەڵێـین: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ئـەوە خـوای پەروەردگـار سـزای بـۆ دیـاری کـردوون، ئەگـەر پێـشـێ فەرمووبێتـی: حەپـسـیان بکـەن، ئێـسـتا سـزای دیکـەی بـۆ دیـاری کردوون، ئەوەیان بۆ قۆناغێك بوو، ئەوەیدیکەش بۆ قۆنـاغێکی دیکەو هـیچ باسی تێکگیـرانی نەکردوە، تاکو ناچـاربین باسی نەسـخ بکـەین.

پرسـیاری دووەم:

ئەگـەر سـزای نێربـازیی (لواطة) بریتی بـێ لـە ئـازاردان، کـە دەفـەرموێ: ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾، ئـەدی چی لـەو فەرموودانـە دەکـەین کـە باسـی کوشـتنی بکـەرو پێکـراو (فاعـل)و (مفعـول) دەکـەن، واتـە: هـەرکاتێك دوو نێرینـە نێربازییـان لەگەڵ یەکدا کرد، دەبـێ هەردووکیـان بکـوژرێن؟

بۆ وێنــە: یـەکێك لـەو فەرموودانـە ئەوەیـە: ﴿عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ اَلنَّبِيَّ ﷺ قَالَ: وَمَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا اَلْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٧٣٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٤٤٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٤٥٦)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٢٥٦١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٠٤٧) وَقَالَ: صَحِيحُ الإسناد، وَالدَّارَقُطني برقم: (٧٦٥) قال الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ) واته: عەبدوڵڵای کوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی

بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێکتان بینی کردەوەی گەلی لووطیان ئەنجام دەدا، ئەوە بکەرو پێکراو (ئەوە سواری ئەوەی دیکە دەبێ، وە ئەوەی دیکەش کە یەکێك سواری بووە) بکوژن، وە حەدیسی دیکەش هەن لەوبارەوە، جا ئایا چۆن وەڵامی ئەم فەرموودانە بدەینەوە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بێگومان کەوتنە ڕاجیایی زانایان لەبارەی چۆنیەتی سزادانی ئەنجامدەرانی ئەو تاوانەوە (واتە: نێربازیی)، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو فەرموودانەی لەوبارەوە هاتوون، لە ڕووی نێوەڕۆك (مەتن)ەوە ڕۆشنن، بەڵام لە ڕووی سەنەدیانەوە هی ئەوە نین کە پشتیان پێ ببەسترێو مەسەلەکە یەکلایی بکەنەوە، ئەگەرنا زانایان بۆچی دەکەوتنە ڕاجیایی؟! زانایان بەمجۆرە ڕاجیاییان هەیە لەوبارەوە:

١) شیعەی زەیدییو شیعەی ئیمامیی: دەڵێن: ئەوانەی نێربازیی دەکەن بکەرو پێکراو (فاعل)و (مفعول) هاوسەرداربن یاخود هاوسەردارنەبن، هەردووکیان دەبێ بکوژرێن، وەك لە (المنتزع المختار، ج: (٤)، ص: (٣٣٦)، وە (الخلاف)، للطوسي، ج: (٢)، ص: (٤٤٤)دا هاتوە.

٢) بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن: ئەوانەی نێربازیی دەکەن (فاعل)و (مفعول) پێویستە ئازار بدرێن، بەڵام نەگاتە ڕاددەی کوشتن، چ هاوسەرداربن، چ بێ هاوسەربن، وەك لە {حاشیة ابن عابدین، ج: (٣)، ص: (١٥٣) وە (تبیین الحقائق: ج: (٣)، ص: (١٦٤)}دا هاتوە.

٣) وە شافیعیی لە یەکێك لە دوو ڕایەکانیداو هەندێك لە مالیکییەکانیش: دەڵێن: ئەنجامدەرانی ئەو کارە حوکمی زیناکەریان هەیە، ئەگەر پیاوی بە ژنوماڵ بن دەبێ بکوژرێن، ئەگەر کوڕ بن ئەوە پێویستە سەد قامچییان لێبدرێ، وەك زیناکەر، وەك لە (المهذب) (للشیرازي، ج: (٢)، ص: (٢٨٦)، وە (المُغني) لابن قدامة، ج: (٨)، ص: (١٨٧)دا هاتوە.

وەك دەبینین: شەرعزانان کەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، هەڵبەتە هۆی ڕاجیاییەکەیان ئەوەیە کە فەرمایشتەکان نەگەیونە پلەی یەکلایی کردنەوە، لە ڕووی سەنەدەوە، وە وشە قورئانییەکەش کە دەفەرموێ: ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾، ئەوانەی ئەو کارە دەکەن ئازاریان بدەن، ماناکەی گشتییە، بۆیە هەندێکیان ئەوپەڕیان گرتوە، هەندێکیشیان ئەملایان گرتوە، هەندێکیان لای زۆریان گرتوە، هەندێکیان لای کەمیان گرتوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَـَٔاذُوهُمَا﴾، بە زاراوەی زانایان سزای پرینگاندنەوە (عقوبة التعزیر) دەگەیەنێ، ئنجا ئایا (تعزیر)و (حدّ) جیاوازییان چییە؟

(حدّ) ئەوەیە: دیاری کراوبێ، بۆ وێنە: سەد قامچیی، هەشتا قامچیی، دەست بڕین، بەردباران، کوشتنەوە، ددانی دەرهێناوە، ددانی دەردێنێ، چاوی کوێر کردوە، چاوی کوێر دەکرێ ... هتد، (حدّ) دیاری کراوە.

بەڵام (تعزیر) دیاری نەکراوە، لێرە کە دەفەرموێ: ئازاریان بدەن، دەگونجێ سەرزەنشت کردن بێ، کە لای کەمی تەمبێکردن (تعزیر) بریتیە لە سەرزەنشت کردن، وە لای زۆرییەکەشی بریتیە لە کوشتن لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، ئەویش کاتێك دەسەڵاتی شەرعیی زانی ئەو کەسە ناپرینگێتەوە، هیچ سزایەکی شەرعیی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە، بۆ وێنە: نێربازیی، دەسەڵاتی شەرعیی بۆی هەیە بیگەیەنێتە ڕاددەی کوشتن، بۆیە هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ ڕاجیاییان هەبووە:

یەکێکیان گوتوویەتی: با بابای نێربازییکەرو نێربازیی لەگەڵ کراو لەسەر شاخێك بەربدرێتەوە.

یەکێکی دیکە گوتوویەتی: با بسووتێندرێن.

یەکێکی دیکەش گوتوویەتی: با بە شمشێر بکوژرێن.

وە هی وا هەبووە گوتوویەتی: با حەپس بکرێن.

وە هەبووە گوتوویەتی: با لێیان بدرێ.

وە هەبووە گوتوویەتی: بایەکی سەد قامچییان لێ بدرێ، ... هتد. ئەوە مەسەلەی یەکەم کە لەو دوو ئایەتەی ژمارە (١٥و ١٦)ی سووڕەتی (النساء)، وەرمانگرت.

**مەسەلەی دووەم:** لەم ڕستە قوڕئانییە وەردەگیرێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ ﴾، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە حەپس کردنی ئافرەتان لە مالێ دا سزای خراپەکاریی یە، لەبەر ئەوەی فاحیشەیەکیان کردوە، یان لەبەر ئەوەی کردەوەیەکی خراپ دەکەن، دەبێ لە ماڵێدا حەپس بکرێن، کەواتە: هیچ کەسێك بۆی نیە خێزانی، خوشکی، دایکی، کچی، لە ماڵێدا حەپس بکات، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار حەپسکردنی ئافرەتانی لە ماڵێدا بە سزای کردەوەی خراپیان داناوە، بەلاّم هەر لە خۆوە حەپسی بکاتو نەهێڵێ بچێ بۆ وەرگرتنی زانیاریی شەرعیی، یان نەهێڵێ بچێ بۆ جومعەو جەماعەت، نەهێڵێ بچێ بۆ بازاڕ بۆ ئیشوکاری خۆی، هەڵبەتە بە ئەخلاقی شەرعییەوە، بە ئەدەبو بە پۆشاکی شەرعییەوە، ئەوە لەڕاستییدا پێچەوانەی بڕیاری شەریعەتە، وە حەپسکردنی ئافرەتان لە ماڵێدا لەسەر فاحیشەو خراپەیەکە کە دەیکەن، نەك بەبێ خراپە، هیچ کەسێك بۆی نیە ئافرەتێك کە لەژێر چاودێریی دایەو، حوکمی بەسەریدا دەڕوا: کچیەتی، یان خوشکیەتی، یان دایکیەتی، یان خێزانیەتی، بۆی نیە بەو جۆرە ئەو ئافرەتە سزا بدات، چونکە ئەو سزایە هی ئەوانەیە کە خراپەکیان لێ واقیع بووبێ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە لە ئایەتی ژمارە (١٧) وەرمانگرتوە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾، بێگومان تۆبە قبوولٚ کردن لەسەر خوا، خوا لەسەر خۆی پێویست کردوە تۆبە قبوولٚ بکات لەو کەسانەی کە بە نەزانیی، بە نەفامیی خراپە دەکەن، دوایی لە نیزیکەوە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئا ئەوانە خوا گەڕانەوەیان لێ قبوولٚ دەکات، وە خوا زانای کاربەجێیە.

لێرەدا پێویست دەکات ئێمە کورتە باسێك دەربارەی گەڕانەوە بۆ لای خوا بکەین، چونکە گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە قورئاندا زۆر هاتوە، لە زۆر لە ئایەتەکاندا خوای لێبوردە باسی گەڕانەوە بۆ لای خوای کردوە، ئنجا ئێمە لێرەدا بۆیە ئەم باسە دەنووسین، تاکو هەرجارێك باسی گەڕانەوە بۆ لای خوا هاتەوە پێش، لەم تەفسیرەدا بگەڕێیەوە ئێرە:

## کورتە باسێك لە بارەی گەڕانەوە (توبة)وە[1]:

**یەکەم: پێناسەی (توبة):**

تۆبە یانی چی؟ کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ﴾، واتە: بێگومان وەرگرتنی تۆبە لەسەر خوایە، وشەی: (توبة) وشەیەکی عەرەبییە، دەڵێ: (تَابَ، يَتُوبُ تَوباً) واتە: (رَجَعَ، يَرْجِعُ، رجُوعَاً)، (عَادَ، يَعُودُ، عَوْدَةً)، (توبة) واتە: گەڕانەوە، جا گەڕانەوە بۆ لای کێ؟ گەڕانەوە بۆ لای خوا، گەڕانەوە لە (کوفر)ەوە بۆ (ئیمان)، لە (شیرك)ەوە بۆ (توحید)، لە (معصیة)وە بۆ (طاعة)، لە دوورکەوتنەوە لە خواوە، بۆ نزیك کەوتنەوە لە خوا، تا ئێستا سەرەڕۆیی کردوە، لەمەو دوا بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ، جا خوای بە بەزەیی تەعبیرێکی چەند خۆشو جوانی

---

١) سوپاس بۆ خوا کتێبێکی تایبەتمان لەبارەی (گەڕانەوە بۆ لای خوا) وە نووسیوە، بە ناوونیشانی (گەڕانەوە بۆ لای خوا) کە هەتا ئێستا پێنج جار چاپ کراوەتەوەو لەو کتێبەدا بە درێژیی باسی بابەتی تۆبە کراوە.

بەکارهێناوە، کاتێك مرۆڤ واز لە گوناهان دێنیو دەچێتەوە بۆ خزمەت خوا، تا ئێستا لێی دوورکەوتۆتەوە، سەرەڕۆو یاخی بووە، ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ باوەشی پڕ سۆزو میهرەبانی خوا بە بەزەیی، لە (لسان العرب)[1]دا، وە فەرهەنگەکانی زمان هەموویان دەڵێن: (أَصْلُ تَابَ: عَادَ إِلى اللَّهِ وَرَجَعَ وَأَنَابَ، وَتَابَ اللَّهُ عَلَى فُلاَنٍ أَي: عَادَ إِلَيْهِ بِالْمَغْفِرَةِ)، لە بنچینەدا (تاب)، واتە: گەڕایەوە بۆ لای خوا، ئەدی جاری وایە خوای بە بەزەیی وشەی: (تاب)ی بۆ بەکاردێ، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾ البقـرة، واتە: بێگومان ئەو (خوا) تۆبە وەرگری بە بەزەیی یە، ئەگەر ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای خوا، خواش (تواب)ەو (تائب الذنب)ە، جا ئایا ئەوە یانی چی؟ تۆبە ئەگەر بەندە بیکات دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بەلاَم (توبة) ئەگەر خوای بێوێنەی پێ وەسف بکرێ، واتە: تۆبەو گەڕانەوەکە قبوولْ دەکاتو وەریدەگرێ، کەواتە: (تائب) یان (توّاب) بە نسبەت خوا، واتە: وەرگری تۆبەو وەرگری گەڕانەوە.

پوختەی پێناسەی گەڕانەوە (توبة): (بریتیە لە دڵتەنگ بوونو پەشێمان بوونەوە لە هەڵەو گوناهەکان لەبەر خوا، وە دەست لێ هەڵگرتنیانو بڕیاردانو عەزم جەزمکردن لەسەر نەگەڕانەوە سەریانو، هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەو قەرەبووکردنەوەی کەلێنی ڕابردوو، هەموو ئەمانەش بە هاندەری لە خوا ترسانو شەرم لێکردنیو لە خۆڕازی کردنیو دڵنیابوون لە زەرەرو زیانی گوناهو سەرپێچییەکانو، سوودو قازانجی طاعەتو چاکەکان)[2].

**دووەم: حوکمی (توبة):**

ئایا تۆبە چ حوکمێکی هەیە، سوننەتە، واجبە، موباحە؟! وەلاَم: گەڕانەوە بۆ لای خوا پێویستیەکی تایبەتییە واتە: (فرض العین)، وە پێویستە

١) ج: (١)، ص: (٢٣٣).

٢) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٢٠٣).

گەڕانەوە بۆ لای خوا گشتگیر بێت، یانی: نابێت لە گوناهێك تۆبە بکەی‌و لە یەکی دیکە تۆبە نەکەی، هەڵبەتە زانایان ڕاجیاییان هەیە لەسەر ئەوە کە کەسێك موبتەلا بووبێ بە چوار پێنج گوناهەوەو تۆبە لە یەکیان بکات‌و لەوانی دیکە جارێ تۆبە نەکا، ئایا لێی وەردەگیرێ، یان نا، تاکو تۆبە لەوانی دیکەش دەکات ؟

هەندێکیان دەڵێن: مرۆڤ دەبێ تۆبە لە هەموو گوناهەکان بکات، یانی بە پیاوانەو بە ساغیی بگەڕێتەوە بۆ لای خواو تەواو.

هەندێکیش دەڵێن: نا، دەگونجێ بە پلە پلەیی تۆبە بکات، یانی: جارێ واز لە بەشێکیان بێنێ‌و ئەوانی دیکە بشکات، ئەوەی تۆبەی لێکردوە لێی وەردەگیرێ، بەڵام دەبێ دڵی وابێ دوایی تۆبە لە هەموویان بکات، منیش ڕای دووەمیانم پێ لە ڕەحمەتی خوای پەروەردگار نزیکترە.

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە کە تۆبە پێویستییەکی تایبەت (فرض العين)ە، لەسەر هەرکەسێك کە گوناهی هەبووەو پێویستە بۆ هەموو گوناهانیش بێ، وە پێویستە بەردەوام‌و نەپساوەش بێ، وە پێویستە زوو بە زوو و دەستبەجێش بێت ؟! واتە:

١- گشتگیر بێ بۆ هەموو گوناهان.

٢- وە زوو بە زوو و دەستبەجێ بێ.

ئەگەر تەماشای ئەم دەقانە بکەین ئەو شتانەمان بۆ دەردەکەون:

١/ خوای لێبوردە دەفەرمووێ: ﴿ ... وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١ ﴾النور، واتە: (ئەی ئیماندارینە!) تێکڕا بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی سەرفراز بن، کەواتە: فەرزە مسوڵمان بگەڕێتەوە لای خوا، هەڵبەتە زۆر کەس وا دەزانێ تۆبە هەر ئەوەیە کە دەبێ گوناهەت کردبن، وەك قەتڵ‌و زیناو دزیی‌و ... هتد، ئەوجار بگەڕێیەوە، بەڵام وەك من لە کتێبی (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا باسم کردوە، وانیە،

چونكە دەگونجێ ئینسان لە طاعەتێكی نزمەوە بۆ طاعەتێكی بەرزتر بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەوەتا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هێندە گەڕاونەوە بۆ لای خوا، لە كاتێكدا كە هیچ گوناهیان نەكردوون، بەڵام ئەو ئەندازە طاعەتو چاكەیە كە كردوویانە، پێیان نزم بووە لە قەدەر خوا بەرزتریان كردۆتەوە، كەواتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا مەرج نیە بەس لە گوناهانەوە بێ بۆ چاكە، جاری وایە لە چاكەیەكەوە بۆ چاكەیەكی زیاتر، یان لە طاعەتێكەوە بۆ طاعەتێكی باشترە.

٢/ ئنجا لە سووڕەتی (المائدة) خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: جا هەركەسێك لە دوای ستەمو خراپەیەك كە دەیكات بگەڕێتەوەو چاكە بكات، ئەوە بێگومان خوا دەگەڕێتەوە سەری، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٣/ پێغەمبەری خواش ﷺ لە فەرمایشتێكدا فەرموویەتی: ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ، خَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٠٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٩٩) وَقَالَ: حديثٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥١)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٢٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦١٧) وَقَالَ: صحيح الإسناد، وَحَسَّنَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٢٣٤١)، واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئادەمیزادەكان هەڵەكارن، باشترین هەڵەكارانیش ئەوانەن كە زۆر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، كەواتە: هەموو ئینسانێك پێویستی بە گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار هەیە.

٤/ وە دەربارەی دەستو بركردن زوو بەزوویی كردن لە گەڕانەوە بۆ لای خوا لە ئایەتی ژمارە (١٣٣)ی سووڕەتی (آل عمران)دا خوای لێبوردە دەفەرموێ: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ ...﴿١٣٣﴾ ﴾، واتە: خێرایی بكەن بەرەو

لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، كەواتە: ئینسان دەبێ دەستو برد بكاتو دەست بجوولێنێ لە تۆبەكردنو گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگاردا.

**سێیەم: چۆنیەتی تۆبەكردن:**

كەسێك بیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، دەبێ چۆن تۆبە بكات؟ پێشتریش ئاماژەم پێدا من كتێبێكم هەیە بە ناوی (گەڕانەوە بۆ لای خوا)، كە تێیدا بە درێژیی باسی چۆنیەتی تۆبەكردنم كردوە، هەروەها لە كتێبی: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو چوون)یشدا[1]، دیسان لە باسێكی تایبەتدا، باسی چۆنیەتی گەڕانەوە بۆ لای خوام كردوە، بەڵام لێرەدا لەوبارەوە هەر بە كورتی دەڵێم:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتێكی هەیە لەوبارەوە كە دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبَاً، ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاّ غَفَرَ لَهُ﴾ رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (٤٠٦)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيح، وَابْنُ ماجَه بِرقم: (١٣٩٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٦٢٣)، وَحسَّنَهُ الأَلبانِي فِي (المشكاة) بِرقم: (١٣٢٤)، عَن أَبِي بَكْرٍ ﷺ، وفِي رِوَايَةِ أَبِي دَاوُد: ﴿فَيتطهَّرُ فَيُحسِنُ الطُّهورَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكعَتَين فيَستَغفرُ الله ...﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا وشەی: (رَجُل) دێنێ، دیارە كوڕەكە كوڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا دیارە كە تۆبەكردن بۆ پیاوانو ئافرەتانە، دەفەرموێ: هیچ پیاوێك نیە كە گوناهێك بكات (دیارە زیاتر لە گوناهێكیش بە هەمان شێوەیە) هەڵسێ خۆی بشوات {(فَيَتَطَهَّرُ): بە خۆ شۆردن لێكدەدرێتەوە، بەڵام دەشگونجێ بە دەستنوێژیش لێكبدرێتەوە}، دوایی دوو ڕكات نوێژ بكات، پاشان داوای لێبوردن لە خوا بكات لەو گوناهەی مسۆگەر خوا لێی خۆش دەبێ.

[1]) ئەو كتێبەش هەتا ئێستا پێنج جاران چاپ كراوەتەوەو بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕدراوەو چاپ كراوە لەلایەن (دار الحكمة)وە.

کەواتە: چۆنیەتی تۆبەکردن ئەوەیە، کە ئینسان هەرکاتێك ویستی تۆبە بکات، خۆی بشوات کە باشتر وایەو ئەگەر بۆی نەگونجا دەسنوێژێك بگرێ، وە دوو ڕکات نوێژ بکات، وەك لە هەندێك فەرموودەی دیکەدا هاتوە، کە لە ڕکاتی یەکەم پاش سوورەتی (فاتحة) سوورەتی (کافرون) بخوێنێ، وە لە ڕکاتی دووەمیشدا پاش سوورەتی (فاتحة) سوورەتی (الإخلاص) بخوێنێ، خۆ ئەگەر ئایەتی دیکەش بخوێنێ هەر دەبێ، وە پاشان بە دڵ لە خوا بپاڕێتەوە، ئەوە بکات بە دەستپێکی گەڕانەوەو تۆبەکەی بۆ لای خوای پەروەردگار، ئەوە چۆنیەتی تۆبەکردنو گەڕانەوە بۆ لای خوا ئاوایە، هەڵبەتە دەشگونجێ ئینسان بەبێ خۆ شۆردنو دەستنوێژگرتنو نوێژکردنیش، هەر یەکسەر لەبەر خوای بە بەزەیی بپاڕێتەوەو تۆبە بکات، بەڵام ئەو جۆرە تۆبەکردنە، بناغەیی ترە بۆ کەسێك کە دەرفەتو مەجالی هەبێ.

**چوارەم: تۆبەی ڕاستو ساغ (التوبة النصوح) چییە؟**

خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٨)ی سوورەتی (التحریم)دا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ...﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە گەڕانەوەیەکی ساغ، (نصوح) واتە: ڕاست، ساغ، بێ خڵتە، چونکە لە زمانی عەرەبی دا دەگوترێ: (نَصَحَ الثَّوبُ) واتە: پۆشاکەکەی چڵکی پێوە نەما، (ناصح) یانی بێ خڵتە، ساغ[1]، وە پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسَّلام) کە بە گەلەکانی خۆیانیان گوتوە: ﴿ ... وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ ﴾الأعراف، واتە: وە من بۆ ئێوە دڵسۆزو بێغەشم، بەبێ خڵتەو بە ساغیی لەگەڵتاندا مامەڵە دەکەمو، قسەتان بۆ دەکەمو ئامۆژگارییتان دەکەم.

ئنجا تۆبەی ڕاستو ساغیش ئەوەیە کە مرۆڤ لە قووڵایی دڵو دەروونیەوە بەرەو خوا پەشیمان بێتەوەو، لەگەڵی ئاشت بێتەوە، بە عەزمو

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٨٠٨).

ئیرادەیەکی پۆڵایینەوە، دەستبەجێ دەست لە گوناهو سەرپێچیی هەڵگرێو قۆڵی چاکەکارییو طاعەتی لێ هەڵبکات، هەموو ئەوانەش بە هاندەری شەرمو شکۆو ترسو سام لە خواو، بە مەبەستی بەخشرانیو خۆشویسترانیو خوا لێ ڕازی بوونیو بە دیدار شادبوونی بن.

**پێنجەم: مەرجەکانی تۆبە؟**

دیارە تۆبە چەند مەرجێکی هەن کە دەبێ مەرجەکانی تێدا بێنەجێ ئەوجار تۆبەیەکی ڕاستو ساغەو، ئەوجار تۆبەکە وەردەگیرێ، کە من لێرەدا یازدە مەرجم هێناون:

١) پەشێمانبوونەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: ﴿النَّدَمُ تَوْبَةٌ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٢٥٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦١٢)، وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان) برقم: (٧٠٢٩) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٦٨٠٢)، واتە: پەشێمانبوونەوە تۆبەیە، تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا بریتیە لە پەشێمان بوونەوە، بەڵام لەچی؟ لەو گوناحو تاوانانەی کە ئینسان کردوونی، ئەگەر لە دڵەوە پەشێمان نەبێتەوە، هەزار جار بە زمانو قسە بڵێ: داوای لێبوردن لە خوا دەکەم (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ)! بایی پوولێکە، دەبێ لە دڵەوە پەشێمان بێتەوە.

٢) ئەو گەڕانەوەیە بۆ لای خوا تەنیا مەبەستت پێی ڕازیکردنی خوا بێ: واتە: تێیدا (مُخْلِص)بیو خۆت ساغو یەکلاکردبێتەوە، نەك هەر بۆ تۆبەکردن، بەڵکو بۆ هەموو خواپەرستییو بەندایەتییەك، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴿١١٠﴾﴾ الكهف، واتە: هەر کەسێك بە تەمای دیداری پەروەردگاری بێ لە دوارۆژدا، با کردەوەی باش بکات، وە هیچ هاوبەشێك پەیدا نەکات بۆ

بەندایەتیی پەروەردگاری، واتە: ئەو عیبادەتەی کە دەیکات، غەیری خوای تێدا بەشدار نەکات، تۆبەش عیبادەتە، گەڕانەوە بۆ لای خوا عیبادەتە، بەڵکو گەورەترین عیبادەتەو بەبێ ئەو عیبادەتە، ئینسان عیبادەتی دیکەی بۆ ناکرێ، ئینسان تا نەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ناتوانێ خوا بپەرستێ، دەبێ پێشێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەوە سەرەتایەتیو بناغەی عیبادەت بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای خوا، کەواتە: مەرجی دووەمی تۆبە بریتیە لە ئیخلاصو ساغیی، نەك بۆ ئەوەی بێ پێی بڵێن: فلان کەس گەڕاوەتەوەو تۆبەی کردوەو مرۆڤی چاکە! ئەوە هیچ نیە.

٣) دەست هەڵگرتن لە گوناحو سەرپێچیی‌و هەڵە: ئەوەش دیارە ئەگەر خراپەو گوناهـ دەستی لێ هەڵنەگری، مانای وایە لێشی پەشێمان نەبوویەوە، ئەوەش شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە، کە هەر بۆخۆی تۆبە پێشتر باسمانکرد (التوبة: الرُّجُوعُ والعَودَة) تۆبە، واتە: گەڕانەوە، تا ئێستا شوێن گوناهـ کەوتووی، ئنجا دەگەڕێیتەوە بۆ طاعەت، مانای وایە ئەگەر بە کردەوە دەستیان لێ هەڵنەگری، نەگەڕاویەوە، بۆیە من زۆرجار گوتوومە کەسێك کە بە کردەوە واز لە گوناهان ناهێنێ‌و بە زمان دەڵێ: داوای لێبوردن لە خوا دەکەم‌و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا، وەك: ئەوە وایە کە گاڵتە بە تۆبە بکات، دەبێ تۆبە لەو تۆبەیە بکات، چونکە بە کردەوە دەستت هەر لە گوناهان دابێ‌و بە قسەش بڵێی: گەڕاومەوە، مانای وایە ئەوە هیچ گوناهەکانت هەر هەن، بەڵکو گوناهێکی دیکەشت خستنە پاڵ، کە ئەویش بریتیە لە درۆکردن، کە دەڵێی: گەڕامەوەو نەشگەڕاویەوە! دەڵێی: خوایە ! داوای لێبوردنم هەیە، ڕاستیش ناکەی‌و هەر لەسەر گوناهەکەت بەردەوامی !

٤) دان بە گوناح داهێنان: مەرجی چوارەمی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، ئەوەیە دان بە گوناهەکەتدا بێنی، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ، ثُمَّ تَابَ، تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾

أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٤٦٩٠)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٩٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٣١٨٠)، وَالنَّسَائِيُّ فـي (الكُبرى) بـرقم: (٨٩٣١)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٤٢١٢) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا، واتـە: بێگومـان بەنـدە ئەگەر دانـی بـە گونـاح داهێنا، وە پاشان گەڕایەوەو تۆبـەی کـرد، خـوا دەگەڕێتـەوە سـەری، گوتمـان: گەڕانەوەی بەندە ئەوەیە واز لە گوناهان بێنـێ، گەڕانـەوەی خـواش بـۆ لای بەنـدە، ئەوەیـە کـە ئـەو گەڕانەوەیـەی لـێ وەربگـرێ، بەنـدە تۆبـە دەکاتو خواش تۆبـەی لـێ وەردەگـرێو بـەزەیی پێدادێتـەوەو، قبـوولّی دەفـەرموێو باوەشی بەزەییو سـۆزی خۆی بۆ دەکـاتەوە.

٥) ئیـرادەی پتـەوو دڵ دامـەزران لەسـەر نەگەڕانـەوە بـۆ گونـاح: دەبـێ بابـای تۆبـەکار ئیـرادەیەکی مەحکـەمی هـەبێ، وە دڵیـشی دامەزراوبـێ، کـە جارێکی دیکە نەگەڕێتـەوە سەر گوناهان، نـەك بڵـێ: با جارێ تۆبەیـەکی بکـەم، دوایـی لـە دەرفـەتێکی دیکـەدا گونـاهێکی دیکـە دەکـەم، ئنجـا دەگەڕێمـەوە، ئـەوە هـیچ نیـە، هـەر لـە ڕێیـەوە ئـەو تۆبـە قبـووڵ نابـێ، بۆچـی؟ چـونکە نەیویـستوە بـە ئیـرادەیەکی پتـەوەوە بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـوا، بەڵـکو گوتوویـەتی: دەگەڕێمـەوەو لەوانەیـە مەبەسـتێکی هـەبێ، دوایـی دەست بە گوناهان دەکاتو دیسان دەگەڕێتـەوە، خـوا ﷻ لەوبـارەوە دەربـارەی بابمـان ئـادەم ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ ﴾طـــه، واتـە: ئێمـە پێـشتـر بـە ئادەممـان ڕاگەیانـد، (ڕامانـسپارد لـە درەختـە قەدەغەکراوەکـە نەخـوا) لـە بیـری چـوو، وە عـەزممان پێـوە نـەبینی، هـەر کەسـێك عـەزمی نـەبێ، تووشـی گوناهـان دەبـێ، وە ئەگـەر ئینـسان تۆبـەش بکـات، بـەلام عـەزمی لەگـەڵ نەبـێ، تۆبەکـە دەشکێنـێ، لێـرەدا خـوا باسـی ئـادەم ﷺ دەکـاتو دەفەرموێ: عەزممان پێوە نـەبینی، بۆیـە تووشـی ئـەو هەڵەیـە بـوو، بـەلام دیـارە دوایـی خوای پەروەردگار گەڕانەوەکەی لـێ قبـووڵ کـردوەو ئەوەشـی قـەرەبوو کردۆتـەوە.

٦) چاكەكاریی‌و قەرەبووكردنەوەی ڕابردوو: ئینسان كە واز لە هەڵەو سەرپێچییەكان دێنێ نابێ، هەر بەوە ئیكتفا بكات، بەڵكو دەبێ هەوڵبدا ئەو خراپانەی لە ڕابردوودا كردوونی قەرەبوویان بكاتەوەو لە جیاتی هەر خراپەیەك چاكەیەك بكات، خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٥٤)ی سوورەتی (الأنعام)دا باسی ئیمانداران دەكات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾، لێرەدا مەبەستم ئەم ڕستەیە: ﴿مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ ﴾، واتە: هەر كەسێك لە ئێوە گوناهێك بە نەزانیی‌و نەفامیی بكات (كە دوایی باسی دەكەین نەزانیی‌و نەفامیی یانی چی؟) دوایی بگەڕێتەوەو چاكە بكات، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە، بۆ كێ؟ بۆ كەسێك كە وازدێنێ لە گوناهان، وە چاكەش دەكات، ئەگەر هەر واز لە گوناهان بێنێ، بەلام چاكە نەكات، مانای وایە تۆبەكە تۆبەیەكی تەواونیە.

٧) گێڕانەوەی مافی خاوەن مافان‌و قەرەبووكردنەوەیان: ئەگەر هەقی خوا ﷻ بێ، ئەوە هەر شتێك شایستەی گێڕانەوەبێ، دەیگێڕیەوە، بەلام ئەگەر قابیلی گێڕانەوە نەبوو، داوای لێبوردن دەكەی‌و دەگەڕێیەوە بۆ لای خوا، بەلام ئەگەر هەقی دروستكراوەكان بوو، هەقی خەڵكی بوو دەبێ هەقەكانیان بۆ بگێڕیەوە، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ بەڵگەمان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە ﷺ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهَا، فَإِنَّهُ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ، وَلاَ دِرْهَمٌ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُؤْخَذَ لأَخِيهِ مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَتْ مِنْ سَيِّئَاتِ أَخِيهِ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ﴾، رَوَاهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٦٥٣٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٤١٩)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی

بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: هەركەسـێك سـتەمی برایـەكی لـە لایـەتی، (هەڵبەتـە پێـشـتریش گـوتم دیارە كۆڕەكە كـۆڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا ئەگەر سـتەمی خوشـكێكی مسوڵمانیـشی لـەلابێ، بە هەمان شـێوە خوشـكێك سـتەمی ئافرەتێكـی لەلابێ، واتـە: قسـەیەكی پـێگوتوە، ماڵێكی لەلایـە، لێیداوە، هەقێكی ماددیی یان مەعنەویی) ئەوە با گەردنی خۆی پـێ ئـازاد بكات، با هەقەكـەی بۆ بگێڕێتـەوە، چونكە لـەوێ (واتە: لە قیامەتێ) نە دینار (واتـە: زێـڕ كە دراوی ڕۆمەكـان بـووە)و نـە درەم (واتـە: زیـو، كـە ئەوكاتـە دراوی فارسـەكان بـووە)ی لـێ نیـە، تـا پـارەیان بدەیـەوە، بەڵـكو برایەكـەی كـە هـەقێكی لەلایـەتی (لـە دنیایـەدا هەقەكـەی نەداوەتـەوە) لـە چاكەكانی وی دەدرێ بـە برایەكەی كـە خـاوەن هەقە، وە ئەگـەر چاكەشـی نـەبوون لـە گوناهـەكانی وەردەگیـرێ، (واتـە: لـە گونـاهی ئـەو كەسـەی كـە هەقەكـەی كەوتۆتـە سـەرو ئـەویش گونـاهی هـەن)، لـە گوناهـەكانی وی فـڕێ دەدرێتـەوە سـەر كـابرای كـە هەقەكـە قەرزارە، وە بە گوناهـەوە دەخرێتـە دۆزەخـەوە (خوا پەنـامان بـدات).

٨) ڕاست ڕاوەسـتاویی وە بەمـلاولادا لانـەدان: دوای تۆبـەو گەڕانـەوە، ئینـسان دەبـێ ڕێـك ڕابوەسـتێو لانـەدات بەمـلاولادا، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١٢﴾ ﴾ هـود، واتـە: (ئـەی پێغەمبـەر ﷺ) خـۆتو ئەوانـەی لەگەڵ تـۆدا تۆبـەیان كـردوە، ڕێـك ڕاوەسـتە (ئینـسـان دوای تۆبەكـردن دەبـێ ئیستیقامەتی هەبێ، ڕاسـت ڕاوەسـتاوبێو دامـەزراوبێ، نـەك دوای تۆبـەو پـێش تۆبـە وەك یـەك بـێ، ئەگـەر وابـێ هیـچی نـەكردوە)، وە لامـەدەنو سەركێشیی مەكەن، بێگومان خوا بینـەری كردەوەكانتـانە !

٩) دەرخـستنو ئاشـكراكردنی تۆبـە لـەو گوناهانـەی كـە بـە ئاشـكرا كردوونـی: ئینـسان هەنـدێك گونـاح هەیـە لـە نێـوان خـۆیو خـوای پـەروەردگاردا كـردوونی، دەبێ تۆبەی پەنهـانیان لـێ بكـات، بەڵام هـەندێك گونـاح هـەن،

كە بە ئاشكرا كردووتن، پێویستە تۆبەیەكی ئاشكراشیان لێ بكەی، بۆئەوەی هەم خەڵكیش بزانن كە تۆ لاپەڕەیەكی سپیو تازەت هەڵداوەتەوە، وە هەم جاری وایە بەهۆی ئەم گوناهەی تۆوە كە بەئاشكرا كردووتە خەڵكێك لە خشتە چووەو ئەویش تووشی گوناح بووە، بۆیە پێویستە تۆبەو گەڕانەوەكە بەئاشكرا بێ، بۆئەوەی ئەو كەسانەش كە بە هۆی گوناهەكەی تۆوە تووشی هەڵەبوون، ئەوانیش بگەڕێنەوە، بەڵگەمان چییە؟ بەلگەمان ئایەتەكانی ژمارە: (١٥٩و ١٦٠)ی سووڕەتی (البقرة)یە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی كە ئەو بەڵگە ڕوونانەو ڕێنمایی یە دەشارنەوە، دوای ئەوەی لە كتێبدا بۆ خەڵكیمان خستۆتەڕوو، ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەكاتو سەرجەم نەفرینكەرانیش نەفرینیان لێدەكەن. جگە لەوانەی دەگەڕێنەوەو چاكسازیی دەكەنو ئەوەی شاردوویانەتەوە ڕایدەگەیەنن، ئا ئەوانە لێیان خۆش دەبم، وە من زۆر تۆبە وەرگرێكی بەخشندەم.

كەواتە: كەسێك بەئاشكرا فیكرەیەكی تەبەننیی كردوە، بۆ وێنە: تا ئێستا عەلمانیی بووە، ماركسیی بووە، لیبراڵیی بووە، كۆمۆنیست بووە... هتد، هەر فیكرەیەك لەو فیكرانەی كە پێچەوانەی ئیسلامنو لەگەڵ ئیسلام تێكدەگیرێن، تەبەننیی كردوەو بانگەشەو پڕوپاگەندەی بۆ كردوە، لەمەودوا كە دیەوێ بگەڕێتەوە، نابێ هەروابچێ لە ماڵێ سەری خۆی كزبكاو دوو ڕكات نوێژ بكاتو بڵێ: وەڵڵا گەڕاومەوە ! پێی عەیب بێ باسی كوفری پێشێی بكات، پێی عەیب بێ باسی گومڕایی پێشێی بكات، بەڵكو دەبێ (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) باسی بكات

بڵێ: بەڕاستی من تا دوێنێ هەڵە بووم، كە بێگومان زانایانی ئیسلام ئاوا بوون، هەم زانایانی هاوچەرخ بۆ وێنە: پیاوێكی وەك: (د. مصطفى محمود) كە كاتی خۆی كابرایەكی ماددیی بووە، پاشان مسوڵمان بووە، هەروەها (خالد محمد خالد) كە كەسێك بووە بڕوای بە ئیسلام نەبووە، وەك بەرنامەی ژیان، بەڵام دوایی گەڕاوەتەوەو باسی حوكمو دەوڵەتی ئیسلامیی كردوە، كەچی پێشێ گوتوویەتی: ئیسلام دەوڵەتو سیاسەتو حوكمڕانیی تێدانیە ! دوایی كە گەڕاوەتەوە، كتێبی داناوە بە پێچەوانەی ئەوەوە، هەروەها زانایانی پێشووش ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ هەر ئاوا بوون، بەڵێ ئینسان دەبێ غیرەتو جورئەتی ئەوەی هەبێ، چۆن پێشێ جورئەتی گوناحكردنی هەبووە، دەبێ ئێستا جورئەتی تۆبەكردنێكی مەردانەشی هەبێ، وە ئەو باطڵو هەڵەیەی كە لەسەری بووە، بۆ خەڵكی ڕوون بكاتەوە، تاكو كەسانێك كە بە هۆی ئەوەوە هەڵخەڵەتاون لە ڕابردوودا، لەمەودوا بە هۆی ئەوەوە هیدایەت وەربگرن.

١٠) دەبێ تۆبەكردن پێش حاڵەتی كەوتنە مەرگەوە بێ، واتە: پێش سەرەمەرگ: بەڵام مرۆڤ بگاتە گیانەلا، ئنجا بگەڕێتەوە، ئەوە هیچ نیە، وەك هەر لەو ئایەتانەدا كە ئێستا خەریكی توێژینەوەیانین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ ﴾، وەك دوایی باسی دەكەین ﴿ مِن قَرِيبٖ ﴾، پێش گیانەلا، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئا ئەوانە خوا تۆبەیان لێ وەردەگرێ، بەڵام كەسێك كە نیشانەی مردنێ لە خۆیدا دەبینێ، تازە دەستی لە هەموو پچكان بڕاوەو نائومێد بووە لە ژیان، ئەوە ئەو گەڕانەوەیە هیچ هونەر نیە ! بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ

إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ ﴾، تۆبە بۆ ئەو كەسانە نیە كە لەسەر كردەوەی خراپ بەردەوام دەبن، هەتا یەكیان مردنی دەگاتە سەرێ دەڵێ: من ئێستا دەگەڕێمەوە، ئەو كاتە بایی پولێكە ! وەك خوای زاناو شارەزا دەربارەی فیرعەونیش دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٔـٰنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾، واتە: وە وەچەی ئیسرائیلمان دەرباز كردن لە دەریا، فیرعەون و سەربازەكانیشی بە دەستدرێژیی و بە ڕاكردن شوێنیان كەوتن، هەتا كاتێك كە فیرعەون ژێر ئاوكەوت و خەریكی خنكانێ بوو، گوتی: ئیمانم هێنا كە تەنیا ئەو پەرستراوە هەیە كە وەچەی ئیسرائیل ئیمانیان پێهێناوە، وە من لە مسوڵمانانم یاخود لە گەردن بۆ خوا كەچانم، (خوا دەفەرموێ:) ئێستا دەگەڕێیەوە ؟! پێشتریش سەرپێچییت دەكرد (هەتا تین و توانات هەبوو، هەتا دەرفەتی ژیانت لەبەردەم دابوو، هەر خەریكی گوناهان بووی، ئێستا كە ڕووحت گەیشتۆتە گەروێ دەگەڕێیەوە ؟! بایی پوولێكە) ئەمڕۆ بەس بەدەنت دەرباز دەكەین، (ئەویش بۆچی؟) بۆئەوەی بۆ ئەوانەی دوای خۆت ببیە پەند، وە بێگومان زۆربەی خەڵكی بەرانبەر بە بەڵگە ڕوون و ئاشكرایەكانی ئێمە بێئاگان.

ئێستا (خۆفۆ) فیرعەونی مووسا ﷺ لە مۆزەخانەی میصر درێژكراوەو بەڵێنی خوای پەروەردگار هاتۆتە دی، كە ئەوە یەكێكە لە موعجیزەكانی قورئان، ئەوەی خوا فەرموویەتی هاتۆتەدی بەدەنەكەی دەرباز بووە، بەڵام ڕووحەكەی لە دۆزەخ دایە.

١١) دەبـێ تۆبـە پێـش هەڵهـاتنی خـۆر لـە ڕۆژئـاوە بـێ: لـەوبارەوە ئـەم فەرمایـشتەی پێغـەمبەر ﷺ هەیـە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٧٠٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٩)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكُبرى)، برقم: (١١١٧٩)، واتـە: ئـەبو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: هـەر کەسـێك پـێش ئـەوەی خـۆر لـە ڕۆژئـاواوە هەڵبێتـەوە بگـەڕێتەوە بـۆ لای خـوا، خـوا تۆبـەی قبـووڵ دەکات.

ئەو کاتە بۆچی تۆبەی قبووڵ نابـێ؟ چونکە ئـەو کاتـە هـەموو کـەس دەزانـێ خـوا هەرچی فـەرمووە هەمـووی ڕاسـت بـووە، کەواتـە: ئیمـان هێنـان ئازایەتیـی نامێنـێ، ئیمـان هێنـان ئـەو کاتـە دەبێتـە ناچـاریی و ئیختیـاری تێـدا نامێنـێ، ئنجا ئایا بۆچی تۆبـە لـە سـەرەمەرگدا قبـووڵ نابـێ؟ چونکە لە سەرەمەرگدا ئەوەی ئەهلـی عـەزاب بـێ، دۆزەخ دەبینـێ و پێشـانی دەدەن، تـازە ئیمان هێنـانی چی ! هەموو شتێك بـە چـاوی خـۆی دەبینـێ، ئیمـان هێنان ئەوەیە کە تۆ شـتێك نـەبینی ئیمانی پـێ بێنـی، بەڵام کە بینی، ئیدی تەواو، بۆ وێنـە: ئێـستا نابـێ من بڵێم: ئیمـانم بـە ئێـوە هەیـە کـە ئێـوە دانیـشتوون، بۆچـی ؟ چـونکە بـە چـاوی سـەر دەتانـبینم، ئیمـان دەبـێ بـە شـتێك بـێ کـە غەیـب و نادیـاربێ، بـەڵام وەختێـك کـە دۆزەخـت دەخـەنە پێـش چاوو فریـشتەکان دەبینـی، یـان مرۆڤـ قیـامەت دەبینـێ و خـۆر لـە ڕۆژئـاواوە هەڵدێتـەوە، تـازە ئـەوە قیامەتی بینـی، تـازە ئـەو ئیمـان هێنانـە، هـیچ هونـەرو ئازایـەتیی تێدانیـە، بۆیـە ئەو تۆبەیـە قبـووڵ نـابێ.

**شـەشـەم: هـۆکـارەکـانی سـەرو بەرگـرتنـی تـۆبـە:**

تۆبـە چۆن سـەردەگرێ و بـەردەگرێ و خاوەنەکەی لـێی بەهەرەمەنـد دەبـێ؟ بێگومـان چـەند هۆکارێکـی هـەن، دیـارە کـە مـن هەشـت هۆکـارم هێنـاون و بـە

کورتیی باسیان دەکەم:

١- هەوڵدان بۆ هەرچی زیاتر نیزیکبوونەوەو دامەزرانی ئیمان: ئینسان دوای ئەوەی تۆبە دەکات نابێ بەو شلو پلیەی پێشێ لە خۆی بگەڕێ، بەڵکو دەبێ هەوڵبدات لەمەودوا ئیمانێکی کاملو قووڵو دامەزراوی هەبێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥٠ ﴾الذاریات، واتە: بەرەو خوا ڕابکەن، من لەوەوە بۆ ئێوە وریاکەرەوەیەکی ئاشکرام، بۆیە دەبێ لەمەودوا چاکە بکاتو، ئەوەی ڕابردووش قەرەبوو بکاتەوە.

٢- دووره پەرێزیی لە هاوەڵی خراپو دوورکەوتنەوە لە شوێنی تێدا گوناهبار بوون: ئەوەش بەڕاستیی هۆکارێکی زۆر گرنگە، وەك خوا ﷻ باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ ﴾الفرقان، واتە: وە ئەو ڕۆژە کە ستەمکار هەردوو دەستی خۆی دەگەزێ (لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: پەنجەی خۆی گەزی، بەڵام لێرە دەفەرموێ: هەردوو دەستی خۆی دەگەزێ، هێندە پەشێمانە) دەڵێ: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم دابایەبەر، وە خۆزگەو بریا فلان کەسم نەگرتبا بەدەستی خۆم (فلان کەس کێیە؟ ئەو کەسەیە کە گومڕای کردوە) چونکە لە یادی خوا، (یاخود لە بەرنامەی خوا، یاخود لە کتێبی خوا)، لایدام دوای ئەوەی کە (لە لای پەروەردگارمەوە) بۆم هاتبوو، وە شەیتان زۆر فریودەری مرۆڤەو لە تەنگانەدا پشتی بەردەدا.

پەشێمان دەبێتەوە، بەڵام دیارە پەشێمانیی هیچ نیە، بۆیە دوای گەڕانەوە بۆ لای خوا، دەبێ ئینسان وریابێ ئەو شوێنەی کە گوناهی تێدا دەکرێ، وە ئەو کەسانەی کە هۆکار بوون بۆ سەرلێتێکدانی، دەبێ دووره پەرێزییان لێ بکرێ، لەمەودوا ڕەفیقو هاوەڵو دۆستی صالح پەیدا بکات.

٣- لە شەیتان وریا بوون: دەبێ کەسی تۆبەکار زۆر وریابێ لە شەیتان، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ فاطر، واتە: بێگومان شەیتان دوژمنە بۆ ئێوە، ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بگرن، ئەو حیزبەکەی خۆی (کۆمەڵی خۆی) بانگ دەکات بیانکاتە هاوەڵ (یان خاوەن)ی کڵپەی (ئاگری) دۆزەخ، کەواتە: ئینسان دەبێ لە فێڵی شەیتان وریابێ.

٤- لە خۆ پرسینەوە: بێگومان بەردەوام لە خۆ پرسینەوە زۆر گرنگە بۆ سەروبەرگرتنی تۆبە، با تەماشای پێغەمبەر یوسف ﷺ بکەین کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِىٓ ۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾﴾ یوسف ، واتە: من نەفسی خۆم تەبریە ناکەم، بێگومان نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، مەگەر ئەوەی پەروەردگارم بەزەیی پێیدا بێتەوە، بێگومان پەروەردگار لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٥- بەردەوامبوون لەسەر پەشێمانییو داوای لێبوردن لە خوا کردن: دەبێ ئینسان بەردەوام بێ لە پەشێمانبوونەوەو داوای لێبوردن لە خوا کردن، (الندم والإستغفار) بەردەوام بێ، چونکە خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە: (٣٣)ی سوورەتی (الأنفال)دا دەفەرموێ: ﴿... وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾﴾، واتە: ئەوان ئەگەر داوای لێبوردن لە خوا بکەن، خوا سزایان نادات، واتە: مرۆڤ بەردەوام دوای تۆبەکردن، دەبێ لەسەر پەشێمانبوونەوەو داوای لێبوردن لە خواکردن بەردەوام بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا بووە لە مەجلیسێکدا حەفتا جار، یاخود سەد جار فەرموویەتی: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ) داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی: «وَاللَّهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً»، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٧٤)، وَالبُخَارِيُّ

برقم: (٥٩٤٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٩٢٥) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، واتە: بە خوا من لە ڕۆژێكدا حەفتا جار پتر داوای لێبووردن لە خوا دەكەم، هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ، تُوبُوا إِلى اللّٰهِ واسْتَغْفِرُوهُ، فَإِنِّي أَتُوبُ فِي اليَومِ مئةَ مَرَّةٍ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٦٧٩٩) عَنِ الأَغَرِّ بنِ يسار المزنِيِّ)، واتە: ئەی خەڵكینە ! بگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبووردنی لێ بكەن، چونكە من لە ڕۆژێكدا سەد جار تۆبە دەكەم.

٦- سەرگەرمبوون بە كردەوەی باشو زیكرو پاڕانەوە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾طه، واتە: من لێبوردەم بۆ كەسێك كە دەگەڕێتەوەو ئیمان دێنێو كردەوەی باش دەكات، دوایی ڕێی ڕاستیش دەگرێ، كەواتە: دەبێ ئینسان بەردەوام لە كردەوەی چاكو زیكرو لێپاڕانەوەی خوای پەروەردگاردا بێ.

٧- گەشبینیی‌و، ئومێدو هیوای پتەو بە ڕەحمەتو بەخشندەیی خوا بوون: ئینسان دەبێ هەرگیز نائومێد نەبێ، ئەگەر تووشی هەڵەیەكیش بۆوەو جارێك تۆبەی شكاند، نەچێ نائومێد بێو بڵێ: تازە تەواو ! تازە فەوتام ! نەء، بەڵكو هەمیشە ئومێدی بە ڕەحمەتو بەزەیی خوای پەروەردگاربێو هەوڵبدات تۆبە نەشكێنێ، هەوڵبدات تووشی هەڵە نەبێ، بەڵام ئەگەر تووشی بۆوەو خلیسكا، یەكسەر هەڵسێتەوە سەر پێ، دەڵێ: (ئەگەر نەكەوتن ئازایەتیی بێ، هەڵسانەوەی دوای كەوتن ئازایەتیی ترە)، خوای بەخشەریش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم كە بەرانبەر بە خۆتان زێدەڕۆییتان كردوە، (چونكە گوناهەكانی ئێمە زیانیان بۆ خۆمان هەیەو بۆ خوا زیانیان نیە)، نائومێد مەبن لە بەزەیی خوا، بێگومان خوا لە هەموو گوناهەكان دەبووریٚ.

٨- نەبەزین و كول نەبوون كۆڵنەدان بەهۆی دووبارە لادان و خلیسكانەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم فەرمایشتەی لەوبارەوە فەرمووە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا، لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ، يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ، فَيَغْفِرُ لَهُمْ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٠٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٤٩)، وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان) برقم: (٧١٠٢)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەوەی كە گیانی منی بەدەستە، ئەگەر گوناهتان نەكردبانایە، خوا ئێوەی لادەبردو كەسانێكی دێنا گوناهیان دەكرد، داوای لێبوردنیان لە خوا دەكرد، خواش لێیان خۆش دەبوو، كەواتە: خوا پێی خۆشە لە بەندەكانی ببووری، وە با ئینسان بە هۆی هەڵەو گوناهەوە نائومێد نەبێ و كول نەبێ و دەست لە كراسی دەرنەهێنێ، ئەوانە گرنگترین هۆكارەكانی سەروبەرگرتنی تۆبە بوون.

**حەوتەم: تۆبە لە چی و چی دەكرێ؟!**

لەڕاستییدا ئینسان دەبێ هەرچی گوناهە بە وردو درشتەوە تۆبەیان لێ بكات، وە دەستیان لێ هەڵبگرێ، بەڵام ئەوەندە هەیە خوای بەرزو مەزن موژدەی پێداوین، كە ئەگەر خۆمان لە گوناهە گەورەكان بپارێزین، یان تۆبە لە گوناهە گەورەكان بكەین، بە تەئكید گوناهە گچكەكان خوا بۆ خۆی دەیانبووری، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾النساء، واتە: ئەگەر خۆ لە گوناهە گەورەكان بپارێزن، خراپەكانتان (واتە: بچووكەكانتان) لێ دەسڕینەوە، وە دەتانخەینە شوێنێكی پڕ ڕێزو حورمەتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمایشتەیدا موژدەیەكی زۆر خۆشی پێداوین: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ، إِذَا

اجْتُنِبَـتِ الْكَبَـائِرُ﴾، أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٩١٨٦)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٢٣٣)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢١٤)، واتـە: ئـەبو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج نوێژە فەرزەکان، جومعە تاکو جومعە، ڕەمـەزان تـاکو ڕەمـەزان، نێوانی خۆیـان دەسـڕنەوە، ئەگـەر ئینـسان خـۆی لـە گونـاهە گـەورەکان دووربگـرێ.

کەواتـە: دەبـێ لـە هـەموو گوناهێـك تۆبـە بکـەین، بـەڵام ئەگـەر لـە گوناهـە گـەورەکان خۆمـان دوور بگـرینو تۆبـەیان لـێ بکـەین، گـچکەکان ڕاستەوخـۆ خـوای بـەرز لێمـان دەسـڕێتەوە، گونـاهە گـەورەکانیش باشـترین پێناسـە لـە لایـەن زانـایانەوە کـە بۆیـان کـراوە ئـەم پێناسـەیە: گوناهـە زلـەکان ئـەو گوناهانەن کە لە دەقێکی قورئان یان سوننەتدا باسکرابێ کە گونـاهی گـەورەن، یاخود سزای دنیـایی یان لەسـەربێ، یـاخود هەڕەشـەو سـزای قیامـەتیی، ئەوانـە گونـاهی گـەورەن ئـەوەی کـە وانەبـێ وەك: ڕوانینـی حـەڕام (النظـر) ئـەوە بـە گوناهێـکی گچکە لە قەڵەم دەدرێ، شایانی باسیشە ئەم پێناسەیە زۆربەی هـەرە زۆری زانایان لەسـەری یـەك دەنگـن.

**مەسـەلەی چـوارەم:** ئایـا مەبەسـت لـە ڕسـتەی: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ﴾، چییـە؟ چونکـە ڕواڵەتی ئەم ڕسـتەیە کە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، بێگومـان تۆبـە لەسـەر خـوا پێویـستە، (واتـە: وەرگرتنی تۆبە لەسەر خوا پێویستە) بۆ کەسـانێك کە بـە نـەزانییو نـەفامیی خراپە دەکەن، دوایی لە نزیکـەوە دەگەڕێنـەوە، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ کە خـوا شـتێکی لەسـەر پێویـست بـێ !! جـا دیـارە توێـژەرەوانی قورئـان لێـرەدا مشتومڕێـکی زۆریان کـردوە دەربارەی ئەم ڕسـتە قورئانییـە، لەبەرچـی؟ لەبـەر ئـەوەی ناگونجـێ شـتێك لەسـەر خـوا پێویـست بکـرێ، چـونکە پێویـستبوونی شتێك لەسەر کەسێك مانای وایـە کـە ئـەو لایەنـەی شـتەکەی لەسـەر پێویـست کـردوە، بەرزتـرە لـەو لایەنـەی کـە شـتەکەی لەسـەر پێویـست کـراوە، خـوای

پەروەردگــاریش ئــەوە دیــارە کــە خوایــە، هەرچــی هەیــە هــەمووی دروســتکراوی خۆیــەتی، هەڵبەتــە (معتزلــة) ڕایــان وایــە کــە بەڵــێ خــوا ﷻ شــتی لەســەر پێویســتە بــە حــوکمی دادگــەریی‌و پەروەردگــارێتی خۆی، بــەڵام زانایــانی دیکــە ئــەم وشــەیان بەکارنەهێنــاوە، ئــەدی ئەوەیــان چــۆن لێــکداوەتەوە ؟ دەڵــێــن: لێــرەدا بەڵــێ خــوای تــاك‌و پــاك وایفــەرمووە، بــەڵام مەبەســت پێــی ئەوەنیــە، بــەڵام لەڕاســتییدا ئــەوەی کــە مــن بــۆم دەرکــەوتوە، دوای ئــەوەی ســەرنجی ئایەتــەکانی قورئــانم داوە، کــە دیــارە قورئــان هەندێکــی هەنــدێکی تەفــسیر دەکات، پێموایە ڕای ڕاست ئەوەیە کە خـوای دادگـەر ڕایگەیانـدوە کـە هەنـدێك شتی لەسـەر خۆی بەرانبەر بە بەندەکانی پێویست کردوە، بەڵـێ هیچ کەسـێك نیـە کـە هـیچ هەقێـك لەسـەر خـوا پێویـسـت بکـات، خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنبيـــــاء، واتـــە: خـــوا لێـــی ناپرســـرێتەوە، لەوەی کـە دەیکـات، بـەڵام ئـەوان لێیـان دەپرسـرێتەوە، بۆچـی؟ چونکە خـوا ﷻ خاوەن‌و بەدیهێنەری هـەموو شـتێکە، پاشـان خـوا هیـچ شـتێکی بێجـێ ناکـات، چونکـە خـوا کاربەجێیە‌و شـتی بێجـێ ناکات، هەتاکو مەجالـی کەسـێك هەبـێ ڕەخنەی لـێ بگـرێ، ئەدی لێرەدا یانی چی کە خـوای پەروەردگـار دەفەرمـوێ: خوا تۆبەی لەســەر پێویـسـتە ؟ کە تەماشای قورئـان دەکـەین دەبیـنین خـوا ﷻ بۆخـۆی - نـەك ئێمـە لەســەری پێویـسـت بکـەین - چـەند شـتێکی لەسـەر خۆی پێویست کردوە، بەرانبـەر بە بەندەکانی، با تەماشـا بکـەین:

١/ لـە ئایـەتی ژمـارە (٤٧)ی سووڕەتی (الـروم)دا خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ:

﴿ ... وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتـــە: هەقـــە لەســـەرمان سـەرخستنی ئیمانداران، کەواتە: خوا ﷻ لەسەر خۆی کردوە بە هـەق.

٢/ وە لە ئایەتی ژمارە (١٠٣)ی سووڕەتی (یونس)دا دەفـەرموێ: ﴿ ... كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتــە: ئــاوا بــەو شــێوەیە لەســەرمان پێویــستە ئیمانداران دەربـاز بکەین.

٣/ وە لە ئایەتی ژمارە (٤و ٥و ٦)ی سووڕەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە ئیمانداران بە هاوکاریی‌و یارمەتی‌و سەرخستنی خوا، دڵخۆش دەبن، خوا هەرکەسێکی بیەوێ سەری دەخات، خوا زاڵی بە بەزەیی یە، ئەوە بەڵێنی خوایە، خوا وا ناکات بەڵێنی جێبەجێ نەبێ‌و بە زایەی نادات، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

جا ئایا چۆنیەتی دەرچوون لەو ئیشکالە چۆنە ؟ ئەوەیە کە خوا ﷻ هیچ کەسێك هیچ شتێکی لەسەر پێویست ناکات، بەڵام خوای بە بەزەیی بۆخۆی بۆی هەیە شت لەسەر خۆی پێویست بکات، ئنجا کە لەسەر خۆیشی پێویست دەکات، بەو واتایەیە کە خوا ئەوەندە بە بەزەیی‌و بەخشندەو گەورەو بە لوتفە لەگەڵ بەندەکانیدا، بۆیە بە بەندەکانی دەفەرموێ: ئەوە بکەن منیش لەسەر خۆم پێویست کردوە ئەوەتان بۆ بکەم، ئنجا لە حەدیسی پێغەمبەریش ﷺدا هاتوە کە لە کاتێکدا لەگەڵ (مُعَاذُ)دا سواری گوێدرێژێك دەبێ دەفەرموێ: ﴿يَا مُعَاذُ أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ؟ قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: أَنْ يُعْبَدَ اللَّهُ وَلاَ يُشْرَكَ بِهِ شَيءٌ، قَالَ: أَتَدْرِي مَا حَقُّهُمْ عَلَيْهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟ فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٨٠٦٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٧٤٩)، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه، واتە: ئەی موعاذ ! ئایا دەزانی هەقی خوا لەسەر بەندەکەی چییە؟ گوتی: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە کە خوا بپەرستێ هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێ، فەرمووی: ئایا دەزانی هەقی بەندەکان لەسەر خوا چییە ئەگەر ئەوەیان کرد (واتە خوایان پەرستو هیچ هاوەڵێکیان بۆ دانەنا)؟ گوتی: خواو پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە کە سزایان نەدات.

کەواتە: دروستە ئەم وشەیە بەکاربهێنرێ، بەڵام بەو واتایە کە خوا بۆخۆی ئەوەی لەسەر خۆی کردوە بە هەق، نەك ئێمە لەسەرمان پێویست کردبێ، ئەو کاتە ئەو ئیشکالە کە باسکرا نامێنێ، وە ئەوەش دادگەریی‌و فەزڵ‌و چاکەو لوتفو گەورەیی‌و بەزەیی‌و بەخشندەیی‌و کەرەمی بێسنووری خوای پەروەردگار زیاتر دەردەخات.

**مەسەلەی پێنجەم:** ئایا مەبەست لە: ﴿لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ﴾، چییە؟

ئەوانەی کە خراپە دەکەن بە نەزانیی یان بە نەفامیی، لەوبارەوە زانایان سێ ڕایان هەن:

١) هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە بابای گوناهکار نازانێ گوناهەو دەیکات.

٢) وە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە بابای گوناهکار دەزانێ گوناهە، بەڵام نازانێ سزایەکەی لەلای خوا چەندە؟.

٣) وە هەندێکیان گوتوویانە: بابای گوناهکار دەزانێ گوناهەو دەشزانێ سزایەکەی لەلای خوا چەندە، بەڵام هەواو ئارەزوو بەسەریدا زاڵ دەبێ‌و، زانایانە گوناهەکە دەکات، بەڵام خۆی دەباتە سەر حاڵەتی بابایەکی نەزان‌و نەفام.

ئنجا ئایا کامە ڕایە ڕاستە لەم سێ ڕایەی زانایان؟ لەڕاستییدا ڕای سێیەم ڕاستە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر وا نەبووایە دەبوو گوتبامان: خوا تەنیا تۆبە لەوانە قبووڵ دەکات کە گوناهێك دەکەن‌و نازانن کە گوناهە، ئەوە ئەگەر بەپێی ڕایەی یەکەم بێ، یاخود دەزانن کە گوناهە، بەڵام نازانن سزایەکەی چەندە لەلای خوا، دەبوو ئەویش تۆبەی لێ قبووڵ نەکرێ، بەڵام نەخێر، بەپێی ڕای سێیەم، کە ئەوە زیاتر لە ڕەحمەتی خواوە نزیکە، ئەوەیە کە بابای گوناهکار دەزانێ گوناهەو دەشزانێ سزایەکەی چەندە، بەڵام تاقەتی بە نەفسی خۆی ناشکێ‌و ئارەزووو نەفس‌و شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبن‌و هەڵەکە دەکات، ئەو جۆرە کەسانەش خوای

بە بەزەیی تۆبەیان لێ قبووڵ دەکات، ئنجا ئایا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە: کە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە کە گوتوویانە: (كُلُّ مَنْ عَصَى اللَّهَ فَهُوَ جَاهِلٌ)، واتە: هەرکەسێك سەرپێچیی لە خوا بکات، ئەوە جاهیلە، نەفامە، (ابن جرير) لە (ابن زيد)ەوە بە ژمارە: (٨٧٣٦) ئەم دەقەی هێناوە: (قَالَ قَتَادَةَ: أجْمَعَ أصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى أنَّ كُلَّ مَعْصِيَةٍ فَهِي بِجَهَالَةِ عَمْداً، كَانَتْ أوْ جَهْلاً، وَقَالَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَقَتَادَةَ، وَالضُّحَاك، وَمُجَاهِد وَالسُّدِّي)، واتە: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکدەنگن کە هەر گوناهێك کرابێ، ئەوە هەر بە نەزانیی و نەفامیی کراوە، (واتە: خاوەنەکەی زانیبێتی گوناهە، یان نەیزانیبێ، ئەوە هەر سیفەتی (بجهالة) دەیگرێتەوە) ئەوە ئیبنو عەبباس و قەتادەو ضەححاك و مجاهیدو سوددیی، هەموویان وایان گوتووەو لەسەر ئەوە یەکدەنگن.

ئنجا من بۆچی ئەم ڕایەم هەڵبژارد؟ چونکە من هەمیشە ئەگەر بمەوێ بزانم وشەیەك و ڕستەیەکی قورئان مانای چۆنە؟ تەماشای ئایەتەکانی دیکە دەکەم، وە بەراستی شتێك کە قورئان تەفسیر بکات، پێش هەموو شتێك قورئان خۆیەتی، (القُرآنُ يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضَاً)، ئنجا با تەماشا بکەین، من چەند بەڵگەیەکم لەوبارەوە هێناوەتەوە:

١- لە سوورەتی (یوسف)دا خوای زاناو شارەزا لەو سیاقەدا کە باسی ئەوە دەکات، دوای ئەوەی مەلیکی میصر ئەو ئافرەتانە کۆدەکاتەوە کە داوا لە یوسف دەکەن کە زینا بکات، لەسەر زمانی یوسف ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٣ ﴾، واتە: پەروەردگارم ! زیندان و بەندکردنم لەلا خۆشەویستترە لەوەی ئەوان منی بۆ بانگ دەکەن، وە ئەگەر تۆ فێڵی ئەوانم لێ لانەدەی، ئەوە من مەیلم بەلایاندا دەچێ، وە لە نەفامان دەبم،

(دەفـەرموێ: لە نەفامان دەبـم، لـە کاتێکـدا کـە دەشزانێ زینـاکردن لەگەڵ ئـەو ئافرەتـانەدا حەرامـە)، کەواتـە: ﴿ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾، یـانی ڕەفتـارێك دەکەم وەکو هی نەفامانە، یانی وانەبێ نەزانێ، دەزانێ کەواتـە: مـەرج نیـە، هەرکەسێك گونـاهی کـرد، نەزانـێ، ئەوجار بە نەزان لە قەڵـەم بـدرێ.

٢- هـەر لـە سـوورەتی (یوسـف) ئایـەتی ژمـارە (٨٩)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: یوسف بە براکانی فەرموو: ﴿ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ بەبیری هێنانەوە سەرزەنشتی کردن: ئایا لـە بیـرتانە چیتان بە یوسفو براکەی کرد، کاتێك کە ئێوە نەفام بوون، کەواتە: ئـەوەی کە برایەکانی یوسف بـە یوسـفو بنیـامینی برایـان کـرد، کـە ئـەوان لـە دایکـێکی دیکـە بـوون، لـەو ڕەفتارەیانـدا نەفامانـە ڕەفتاریـان کـرد، نـەك نەیانـزانیبێ کـە خراپـە.

٣- لـە ئـایەتی ژمـارە (٤٦)ی سـوورەتی (هـود)دا خـوای دادگـەر دوای ئـەوەی نـووح ؑ بـۆ کورەکـەی دەپاڕێتـەوە، کـە خوایـە کورەکـەم دیارنیـەو بەڵێنیشـت پێداوم نزیکانو خزمانی مـن دەربـاز بکەی ! خـوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: ئـەی نـووح ! ئـەو لـە ئەهلـی تـۆ نیـە، ئـەو کـردەوەی باشـی نیـە، یـان کـردەوەی بـاش نـەبووە، (واتـە: حەقیقـەتی ئینسـان بریتیـە لـە کـردەوە)، شـتێکم لـێ داوا مەکـە کـە زانیـارییت دەربارەی نیـە، وە من ئامۆژگارییت دەکـەم کە لە نەفامان بیـت ! جا ئایـا نەفـام کێیـە، ئەوەیـە کـە شـتێك بڵـێ ڕێـی تێنەچـێ، نـەك شـتێك نەزانـێ، بەڵکو تەکلیفـێك بکـاتو داوایەك بکـات کە جێـی خۆی نەبـێ.

٤- لـە ئایـەتی ژمـارە (٦٨)ی سوورەتی (البقـرة)دا خـوا دەربـارەی مووسـا ؑو گەلەکـەی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ

بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: خوا فەرمانتان پێدەکات مانگایەك سەرببڕن (بۆ ئەوەی بکوژی کابرای کوژراو ئاشکرا ببێ) گوتیان: ئایا گاڵتەمان پێدەکەی ؟! گوتی: پەنا بە خوا دەگرم کە من لە نەفامان بم.

کەواتە: گاڵتە بە خەڵك کردن نەفامییە، دیارە دەشزانێ کە گوناهە، کەواتە: لە هیچ کام لەم ئایەتانەدا وشەی: (جهل) بەمانای نەزانیی بەکارنەهاتوە، بەڵکو بەمانای کردەوەیەکی هەڵە بەکارهاتوە، کەواتە: ئەوەی (إمام فخرالدين الرازي) لە تەفسیری خۆی (مفاتيح الغيب)دا، گوتوویەتی: هەرکەسێك بە نەزانیی گوناه بکات، دوایی تۆبە بکات، خوا لەسەرە خۆی پێویستی کردوە کە تۆبەی لێ وەربگرێ، بەڵام ئەوەی بە ئانقەست بیکات، خوا لەسەر خۆی پێویست نەکردوە تۆبەی لێ قبووڵ بکات[1].

ئێمە دەڵێین: ئەوە وانیەو خراپەیەك کە بە نەزانیی بیکات، یان بە ئانقەست بیکات، هەر نەفامانە ڕەفتاریی کردوە، بۆیە خوا ﷻ کەرەمو بەخششەکەی هەمووان دەگرێتەوەو،.. تۆبە لە هەمووان وەردەگرێ، وە وەك لە ئایەتەکاندا باسمان کرد، وشەی: (جهل) لە قورئاندا، بە مانای نەزانیی بەکارهاتوە، بەڵام بە مانای هەر کردەوەو ڕەفتارێکی هەڵەش بەکارهاتوە.

**مەسەلەی شەشەم**: ئایا مەبەست لە ڕستەی: ﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾، چییە؟! کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾، واتە: بێگومان تۆبە لەسەر خوا بۆ ئەو کەسانە پێویستە، کە نەفامانە گوناهان دەکەن دوایی لە نزیکەوە دەگەڕێنەوە، ئەوانە خوا تۆبەیان لێ قبووڵ دەکات، لەوبارەشەوە دیسان

١) التفسير الكبير، ج: (١٠)، ص: (٤).

زانایان مشتومڕی زۆریان بووە:

١/ هەندێكیان گوتوویانە: ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، واتە: كە گوناهی كرد، یەكسەر تۆبە بكاتو پەشێمان ببێتەوە.

٢/ وە هەندێكیان گوتوویانە: ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، واتە: ماوەیەك بۆ وێنە: ساڵێك پێش مردنی، بێ.

٣/ وە هەندێكیان گوتوویانە: ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، واتە: نەكەوێتە نەخۆشیی مردنێ (مرض الموت).

بەلام من دەڵێم: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی ڕوون كردۆتەوە، پاشانیش بەڕاستی لە لێبوردنو بەزەیی‌و بەخششی بێ سنووری خوا وا چاوەڕوان دەكرێ، كە خوا ﷻ ئەوەی نەكردبێتە مەرج كە مرۆڤ یەكسەر پەشێمان بێتەوە، چونكە جاری وایە دە ساڵان لەسەر گوناح بەردەوام دەبێ، یان سی (٣٠) ساڵ گوناهان دەكات، دوایی دەگەڕێتەوە، ئایا دەبێ خوا لێی خۆشنەبێ، چونكە درەنگ تۆبەی كردوە ؟! نەخێر، كەواتە: ئەو رایە ڕاستە كە ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، واتە: پێش ئەوەی كە لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو بێتەوەو، كاتێك كە هەر لە ژیاندایە، پێش ئەوەی نائومێدبێ لە ژیان، واتە: پێش ئەوەی بگاتە سەرەمەرگ، یان پێش ئەوەی كە دڵنیابێ دەمرێ، لەوكاتەدا ئەوە هەمووی پێی دەگوترێ: ﴿مِن قَرِيبٍ﴾، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ»، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٣٧)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦٥٩) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسناد عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَحَسَّنَهُ الألباني)، واتە: بێگومان خوا گەڕانەوەی بەندە وەردەگرێ، مادام ڕووحی نەگەیبێتە گەرووی، (غَرْغَرة) چییە؟ گەروو كە شتێكی دەخرێتێ، دەگوترێ غەرغەرەی پێ دەكات، ئنجا ئایا ڕووح چۆن دەكێشرێ؟ ڕووح سەرەتا لە نووكی پێ وە دێ (لە هەموو شوێنە دوورەكانی

بەدەنەوە ڕووح دەهێنرێ) ئاگاتان لێ بووە کە کەسێك دەکەوێتە حاڵەتی مردن، پێشێ لاقی سارد دەبن، ئنجا دەستی سارد دەبن، دوایی وردە وردە دەگاتە سینگی، یانی ڕووح دەگاتە سینگی، پاشان کە دەگاتە گەرووی، غەڵبەغەڵبێکی لێ دێ، ئنجا کە دەگاتە گەرووی، مانای وایە تازە لەو کاتەدا تۆبە قبووڵ نابێ.

(طبري)یش ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە پێشەوای توێژەرەوانی قورئانە، لەوبارەوە هەر ئەم ڕایەی هەیە، کە ئێمەش هەڵمانبژاردوە وەك گوتوویەتی: (وَأَوْلَى الأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: تَأْوِيلُهُ: ثُمَّ يَتُوبُونَ قَبْلَ مَمَاتِهِم، فِي الْحَالِ الَّتِي يَفْهَمُون فِيهَا أَمْرَ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَنَهيَهُ، وَقَبْلَ أَن يُغْلِبوا عَلَى أَنْفُسِهِم وعقُولِهِم، وَقَبْلَ حَالِ اشْتِغَالِهِم بِكَرْبِ الحَشْرَجَةِ وَغَمِّ الغَرْغَرَةِ...)[1]، واتە: لە پێشترین قسە لە ڕاستییەوە لەوبارەوە، قسەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: ﴿ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴾، واتە: دەگەڕێنەوە پێش مردنیان، وە لە حاڵێکدا بن کە فەرمانی خوا تێدەگەن و، وە لە نەهی خوا حاڵی دەبن، وە پێش ئەوەی کۆنترۆڵی خۆیان لە دەست بچێ و عەقڵیان لەلای خۆیان نەمێنێ، وە پێش ئەوەی بکەونە حاڵەتی گیانەڵاو ڕووحدان و حاڵەتی غەرغەرە.

<u>مەسەلەی حەوتەم</u>: کە لەم چوار ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێ، واتە: ئایەتەکانی (١٥و ١٦و ١٧و ١٨) ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئا ئەوانە خوا تۆبەیان لێ قبووڵ دەکات، دوو شتی لێ وەردەگیرێن:

<u>یەکەم</u>: بۆیە خوا ﷻ لێرەو لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئاندا گفت و بەڵێنی خۆی بە لێبوردن و تۆبە وەرگرتن دووپات دەکاتەوە، چونکە بابای گوناهبار، پیاوە، ئافرەتە هەرکەسێکی هەیە، کە دەیەوێ بگەڕێتەوە،

---

١) جامع البيان، ج: (٤)، ص: (٣١٦).

زۆری مەبەستە بزانێ ئایا: خوا لێی خۆش دەبێ؟! زۆری پێ خۆشە دڵنیابێ، ئایا دەبێ خوا لێی خۆش بێ؟! ئەگەر بزانێ خوا لێی خۆشنابێ، دیارە کە زۆر دڵ نارەحەت دەبێ، وە ئەگەر بزانێ خوا لێی خۆش دەبێ، فەرەحنایی دێو دڵی خۆشدەبێو ئارام دەگرێ، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ ﴾، واتە: تۆبەی ئەوانە لەسەر خوا پێویستە، خوا لەسەر خۆی پێویستی کردوە، کەواتە: مانای وایە ئەوە تەئکیدی کردۆتەوە، بۆ دڵنیابوونی گوناهباران کە دڵنیابن خوا تۆبەکەیان لێ وەردەگرێ.

دووەم: وە ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە هەر ئەوانە خوا تۆبەیان لێ وەردەگرێ کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ وە دان بە هەڵەی خۆیان دا دێنن، وە پێش ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مردنیشدا تۆبە دەکەن، وە ئەوەی وانەبێ، ئەوە وەك لە ئایەتەکەی دوایيدا باسی دەکات، ئەو جۆرە کەسانە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ، کەواتە: تۆبە تەنیا لەوانە وەردەگیرێ، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئەوە زانایان پێی دەڵێن: کورت هەڵێنان (حصر)، هەر ئەوانە خوا تۆبەیان لێ وەردەرگرێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾، واتە: وە تۆبە وەرگرتن لەسەر خوا پێویست نیەو خوا تۆبەی کەسانێك وەرناگرێ کە کردەوە خراپەکان دەکەن {هی پێشێ فەرمووی: ﴿ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ﴾، ئەمەیان دەفەرموێ: ﴿ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾،} بە کۆ هێناویەتی واتە: لەسەر خراپەکان بەردەوام دەبن، هەتا یەکێکیان مردنی دەگاتە سەری، ئنجا دەڵێ:

من ئێستا دەگەڕێمەوە، ئێستا وەختیەتی، تەمای بە ژیان نەماوە، تازە نە گوناح، نە چاکە، نە خراپە، هیچی لە دەست نایەت، ئنجا دەگەڕێتەوە لای خوا، ئەوانە تۆبەیان لێ وەرناگیرێ، هەرچەندە ئیمانداریشن، ﴿ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌ ﴾، وە ئەوانەش کە بە کافریی دەمرن، تۆبەیان لێ وەرناگیرێ، ئەو کەسەی کە ئیماندارەو لەسەر گوناح بەردەوامە تاکو سەرەمەرگ، تۆبەی لێ وەرناگیرێ، وە ئەو کەسەش کە بێ ئیمانە، ئەوە هەر تۆبەی لێ وەرناگیرێ، چونکە تۆبەی مرۆڤی بێ ئیمان ئەوەیە کە ئیمان بێنێ، وە لە سەرەمەرگیشدا ئیمان هێنان، ئیعتیباری پێ ناکرێ، کەواتە: خوای پەروەردگار دوو کەسی هەڵاواردوون لەوەی کە تۆبەیان لێ قبووڵ بکات:

١) ئیماندارانێك کە لەسەر گوناح بەردەوام دەبن، هەتا مەرگیان دەگاتە سەر.

٢) کافرانێك کە لەسەر کوفر دەمرن و لە سەرەمەرگدا دەیانەوێ ئیمان بێنن! لە سەرەمەرگدا فیرعەونیش ئیمانی هێناوە، وەك خوا لەبارەی فیرعەونەوە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ ...﴿٩١﴾ ﴾، واتە: کاتێك کە خنکانی گەیشتێ گوتی: ئیمانم هێناوە کە هیچ پەرستراونین، جگە لەوەی کە وەچەی ئیسرائیل ئیمانیان پێ هێنا، وە من لە بۆ خوا ملکەچانم، بەڵام خوای دادگەر بە ئینکاریی و نکووڵیی لێکردنەوە فەرمووی: ﴿ ءَآلۡـَٰٔنَ ﴾، واتە: ئایا ئێستا؟!، یانی: ئێستا هیچ نیەو بەکەڵك نایەت، ئێستاش با تەماشا بکەین داخۆ ئەوانەی خوا تۆبەیان لێ وەردەگرێ، وە ئەوانەی لێیان وەرناگیرێ، ئەگەر بەراوردیان بکەین چۆنیان دەبینین:

## تۆبــە وەرگـیـراوان:

١/ دەفـەرموێ: ﴿يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ﴾، واتـە: خراپـە دەكـەن، كـە ئەگــەر یـەك خراپــەش بكـەن دەیگرێتــەوە، كەواتــە: دەگونجــێ تەنیــا گوناهێــك یـان چەنـد گوناهێكی كەمیـان هەبن.

٢/ دەفـەرموێ: ﴿بِجَهَٰلَةٖ﴾، واتـە: هەركەسـێك گونــاح و هەڵــە بكــات، هــەر نەزانـەو نەفامـە، بـەڵام جاری وایـە نازانــێ كـە گوناهـە، یـان جـاری وایـە لـە ســزایەكەی بێئــاگایە، ئــەوانیش هــەر دەگرێتـــەوە، ئنجــا خۆیــشی پــێ شــەرمەزارە كـە ئـەو گونــاهەی كـردووە، لـەلای كـەس باسـی ناكـاتو خــوا خوایـەتی كـەس پێـی نـەزانـێ.

٣/ دەفەرمـوێ: ﴿يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ﴾، واتـە: بـە نزیكـی دەگەڕێنــەوە، یـانی: پێش مردنیـان، بەڵام ئـەوەش دەگرێتـەوە كـە گـەڕانـەوەیـان بـۆ لای خــوا بـە زوویی یەو زۆری پێنـاچـێو زۆرناخـایـەنـێ.

## تۆبــە وەرنــەگـیـراوان:

١/ دەفـەرموێ: ﴿يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، واتـە: خراپـەكان دەكـەنو زۆر خراپـە دەكـەن.

٢/ نــەزانو بێئاگــا نیـەو زۆر چـاك دەزانــێ گونــاهەو بـە ئانقەســت دەیكـاتو بەڵكو ڕەنگـە شـانازییـشی پێـوە بكـات، نەتـانــبینیوە: هەیـە، قـەتڵ دەكـات، زینـا دەكـات، دزیـی دەكـات، شــەڕاب دەخواتـەوە، دوایــی دەڵــێ: دوێنــێ وامـان كــردو، پێــرێ وا چــووینو، شـــانازیی پێــوە دەكـــات، لێــرەش یەكـســەر فەرموویـەتی: ﴿يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾،و قەیـدی ﴿بِجَهَٰلَةٖ﴾ی لەســەرنیە.

٣/ دەفەرموێ: ﴿يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾، وشەی: (حَتَّى) لە زمانی عەرەبیدا بۆ (بلوغ الغاية)یە، واتە: لەسەر گوناهان بەردەوام دەبن، هەتا مردنیان دەگاتە سەرێ، ئنجا ئەو كاتە دەڵێ چی؟ دەڵێ: ﴿إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾، من ئێستا دەگەڕێمەوە، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوای كاربەجێ ئەو گوناهبارانەی بەراورد پێكردوون، لەگەڵ ئەوانەدا كە بە كافریی دەمرن، كەواتە: حاڵیان هێندە خراپە، خوا لەگەڵ ئەوانەدا كە بە كافریی دەمرن خستوونیە تەرازووەوە، لەو ڕووەوە كە خوا تۆبەیان لێ قبووڵ ناكات، ئەگەرنا لەو ڕووەوە كە دوایی دەرباز دەبن ئەگەر ئیمانداربن، ئەوە لە كافران جیادەبنەوە.

ئنجا شایانی باسە ئەو ئایەتەی ژمارەی (١٨)ی سووڕەتی (النِّساء) ئەوەی لێ وەردەگیرێ، كە قسەی (خَوَارِج)و (مُعتَزِلَة) هەڵەیە، كە دەڵێن: خاوەن گوناهە گەورەكان كافرن، یان خاوەن گوناهە گەورەكان نە ئیماندارنو نە كافرن!

گوناهیش بۆ زانیارییتان ئەوەنیە بەس بە باری سەلبییەكەی دابێ: حەڕام بخوا، غەیبەت بكات، درۆ بكات، قەتڵ بكات، زینا بكات! بەڵكو ئەگەر نوێژ بچووێنێ، ڕۆژوو بچووێنێ، زەكات بچووێنێ، دڵی خەڵك ئازار بدات، یان مافی خەڵك نەدا، مافی دایكو باب نەدا، صیلەی ڕەحم جێبەجێ نەكات، ئەوانەش هەر هەمووی گوناهنو، گوناهكردن تەنیا بارە سەلبییەكە نیە.

چونكە گوناح دوو جۆرە: یان چوواندنی فەرزەكانە، یان شكاندنی قەدەغەكانە، وەك پێشتریش باسمان كرد، وە بە زۆریی وایە ئەگەر ئینسان گوناهی جۆری یەكەم نەكات، كە چواندنی فەرزەكانە، تووشی جۆری دووەمی گوناهیش نابێ، كە شكاندنی قەدەغەكانە، بۆ وێنە: كەسێك نوێژ بكات، گوناه ناكات، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ ﴿٤٥﴾﴾العنكبوت، وە كەسێك بەڕۆژووبێ، تەقوای پەیدادەبێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ البقـرة، وە كەسێك بەڕاستیی ئەهلی زیکربێ، شـەیتان زەفـەری پـێ نابات، کەواتە: بە هۆی جۆری یەکـەمی گوناهـەکـانەوە، کە چواندنی فەڕزەکـانە، ئینـسان تووشـی جـۆری دووەمـی گوناهـەکانیش دەبـێ، کـە قەدەغـەکانـن، جـا (خَـوَارِج) دەڵـێن: هـەر کەسـێك گوناهێـکی گـەورە بکـات بـە ئیمانـدار لەقەڵـەم نادرێ، وە (مُعتَـزِلَة) دەڵێن: هـەر کەسـێك گوناهێـکی گەورە بکـات ناڵـێین: کافـر بووە، بـەس ئیمـانداریش نەمـاوە، دەڵێن: لـە (الْمَنْزِلَـةُ بَيْنَ الْمَـنْزِلَـتَيْنِ) دايـەو لەنێـو قـەدێدا هـەڵواسـراوە، نـە کـافـرەو نـە مـسـوڵمانە!! مەبەستیـشیان پـێ مونافیقیش نەبووە، بەڵکو گوتوویانە: سـیفەتی ئیمـانی پێوە نەمـاوەو نەشـبۆتە کافـر، چونکە ئەسـڵی ئیعـتیقادەکـەی هـەیە، کە دیـارە ئەوە شتێکی سـەیرە !

ئنجـا ئـەم ئایەتـە موبارەکە قـسـەی هـەردووکیان هەڵدەوەشـێنێتەوە، بۆچـی؟ چونکـە خوا ﷻ دەفـەرموێ: خوا تۆبە لەو ئیماندارانە قبووڵ ناکات کە گوناهـان دەکەن، هەتا یەکیـان کە مەرگی گەیشتە سـەری دەڵـێ: ئێـستا تۆبـەم کـرد، بـەڵام دوایـی کـە دەفەرموێ: ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ﴾، وە خـوا تۆبـەش لەوانە قبـووڵ ناکـات، کە بە کـافریی دەمـرن، ئـەدی ئەوانـە چۆن دەمـرن؟ بەڵـێ گوناهبارنو تۆبەیان نەکردوە، بەڵام بە ئیمانەوە دەمرن، چونکە ئیمانیـان هـەیەو خـوا لەگـەڵ کافرانـدا بـەراوردی کـردوون، وە ئەگـەر کـافر بوونایـە دەیفـەرموو کافریشـن، بەڵام نا، کافرەکانی جیاکردوونەوە، ئەوانەی بـە کـافریـی دەمـرن، خـوای پەروەردگـار بـە جیـا باسـی کـردوون، هـەروەك هەنـدێك لـە زانایـانی هاوچـەرخ یەکێـك لەوانـە کـاك (ناصـری سـبحانی)یـە ڕەحمـەتی خـوای لێـبێ، دەڵـێ: لـە قیامـەتێ خـەڵك دەبێتـە دوو بـەش، یـان بـۆ بەهەشـت، یـان بـۆ دۆزەخ، ئەوەنیـە هەنـدێك بـچـنە دۆزەخ بـسـووتێنرێنو دوایـی پاکببـنەوەو بـچنە بەهەشـت، ئـەم ئایەتـە ئەوە دەگەیەنێ کە ئـەم قـسـەیەش هەڵەیـە، ئنجا هەنـدێکیان ئـەو ئایەتـە قورئانییەیان بە بەڵـگە هێناوەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿... فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى

ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾﴾الشورى، واتە: کۆمەڵێك لە بەهەشتداو کۆمەڵێك لەنێو دۆزەخ دان، ئێمە دەڵێین: ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ، چونکە ئەم ئایەتە دەرەنجام (مُحَصِّلة)ی کۆتایی ڕادەگەیەنێ کە لە ئاکامدا ئینسانەکان‌و جندەکان دەبنە دوو بەش، بەشێك لە بەهەشتێ‌و بەشێك لە دۆزەخ دەبن، ئەوە لە کۆتایی دایە، بەڵام ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ ئیماندارانی گوناهبار کە تۆبەیان نەکردوە تۆبەیەك کە خوا لێی قبووڵ کردبن، بە ئەندازەی گوناهەکانیان نەسووتێنرێن.

ئنجا خوای زاڵی پایەدار ڕایگەیاندوە، دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، واتە: ئەوانەی کە بە گوناهباریی دەمرن‌و ئیماندارن، وە ئەوانەش کە بە کافریی دەمرن، سزایەکی بە ئێشمان بۆ داناون، کەواتە: بێجگە لە کافران، گوناهبارانیش سزا دەدرێن لە دۆزەخدا، ئنجا بێجگە لەم ئایەتە، ئایەتی دیکەشمان لەوبارەوە هەن، بۆ وێنە لە ئایەتی (٣٢)ی سوورەتی (فاطر)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ .... ﴿٣٢﴾﴾، واتە: دوایی کتێبی خۆماندا بەو بەندانەی کە هەڵمانبژاردوون (لەنێو خەڵکیدا هەڵمانبژاردوون بۆ ئیمانداریێتی) هەیانە ستەمی لەخۆی کردوەو، هەیانە میانڕەوە، یاخود میانجییە (نە زۆر پێشکەوتوەو نە زۆریش دواکەوتوە)، هەشیانە لە چاکەکاندا پێشکەوتوە، کەواتە: خوای زاناو شارەزا ئیمانداران پۆلێن دەکات بۆ سێ بەش:

﴿ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾ ﴿مُّقۡتَصِدٞ﴾، ﴿سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، ئنجا ئەگەر ﴿مُّقۡتَصِدٞ﴾، (أصحاب اليمين) بن، ﴿سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، (سابقون)بن، یاخود (مقربون)بن، ئایا ﴿ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾، کێن؟ بێگومان ئەوانەن کە گوناهبارن‌و بەقەدەر گوناهەکەیان سزا دەدرێن، دوایی دەرباز دەبن، وە لەوبارەشەوە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن، کە ناگونجێ ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ نادیدە بگیرێن، بۆ وێنە: ئەم فەرمایشتە بە بەڵگە

دێنینەوە: ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْوًا، فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: لَهُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ...﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٥٩٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٢٠٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥٩٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣٣٩) . (٨٣٤٥)، واته: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من دەزانم کێ دوایین کەس لە ئاگری دۆزەخ دێتە دەرێ، وە کێ دوایین کەس دەچێتە بەهەشت (کەسێك کە کۆتا کەس بێ لە دۆزەخ بێتە دەرێ، وە کەسێك دوای ئەوەی لە دۆزەخ دێتە دەر بچێتە بەهەشت، مانای وایە دیارە ئیمانی هەبووە، بەڵام گوناهبار بووە) پیاوێکە بە گاگۆڵکە دێتە دەر لە دۆزەخ، خوا تبارك وتعالی پێی دەفەرموێ: بڕۆ بچۆ بەهەشتێ...

جا لە درێژەی فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: سێ جاران دەچێ بۆ سەران سوێو دەروازەی بەهەشت، تەماشا دەکات زۆر قەڵەبالغە، دەگەڕێتەوەو دەڵێ: خوایە! جێگام نابێتەوە زۆر قەڵەبالغە، دوایی خوای بەخشەر شوێنێکی دەداتێ، کە وەك خوا ﷻ باسی دەکات بەهەشت پانایییەکەی بە قەدەر ئاسمانەکانو زەوییە، کەواتە: بە دەقی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، نەك هەر ئەم دەقە، بەڵکو لە زۆر حەدیسی دیکەشدا هاتوە، کە ئیماندارانی گوناهبار دەسووتێندرێن لە دۆزەخدا، بەڵام دوایی خوای بە بەزەیی دەربازیان دەکات، مادام ئەسڵی ئیمانەکەیان هەبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەفسیركردنی هەرسێ ئایەتی: (١٩، ٢٠، ٢١) لە سوورەتی (النساء)، دەگرێتە خۆی، لەم سێ ئایەتە موبارەكەدا خوای بەرزو مەزن بۆ یەكەم جار لە سوورەتی (النساء)دا بە نازناوی ئیمان ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، مسوڵمانان بەگشتی و بەتایبەتی پیاوان دەدوێنێ، وە لەبارەی چۆنیەتی هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ ئافرەتاندا چەند ڕێوشوێنێكیان بۆ دادەنێ، وە لێیان قەدەغە دەكات كە بە میراتیان بگرن، نەك میراتیان لێ بگرن، بەڵكو بە میراتیان بگرن، وەك عادەتی سەردەمی نەفامیی وابووە، وە پاشان لێیان قەدەغە دەكات كە پیاوان تەنگ بە ژنەكانیان هەڵبچنن‌و نارەحەتیان بكەن بۆ ئەوەی ناچاریان بكەن داوای جیابوونەوە بكەن‌و دەستبەرداریی مارەییەكەیان ببن، وە فەرمان بە پیاوان دەكات كە بە شێوەیەكی باش لەگەڵ هاوسەرەكانیان، لەگەڵ ژنەكانیاندا مامەڵە بكەن، وە ئەگەر لەسەر سیفەتێكی خراپ ڕقیشیان لێیان بوو با، چاكەكانی دیكەشیان بێننە بەرچاوی خۆیان، وە پاشان خوا ﷻ فەرمان بە پیاوان دەكات كە لە كاتی دەست هەڵگرتنیان لە ژنەكانیاندا، هیچ لە مارەییەكەیان لێ وەرنەگرنەوە، هەرچەندە مارەیی زۆریشیان پێدابن، مادام پیاوان دەستپێشخەریی جیابوونەوەبن، وە دوایی خوا ﷻ لێ وەرگرتنەوەی مارەییەكانیان بە شتێكی زۆر سەیرو بێ مانا دادەنێ، دوای ئەوەی لەسەر بنەمای گرێبەستێك بۆ یەكدی حەڵاڵ بوون‌و چوونە لای یەكدی.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔاۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ ﴾.

## مانای وشـــه به وشـــەی ئایەتەكـان

((ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بۆتـان ڕەوانیـە كـە ئافرەتـان بـە میـرات بگـرن، وە ڕێـی (هاوسـەرگیـریی)یان لـێ مەگـرن تـاكو بەشـێك لـەو ماڵەی پێتـان داون، بۆخۆتـان ببـەن، مەگـەر ڕەفتـارێكی دزێـوی ئاشـكرا ئـەنجام بـدەن {و یـاخی (ناشـز)ببـن}، وە بـە شـێوەی پەسـند هەڵسوكەوتیان لەگـەڵ بكـەن، جـا ئەگـەر (لەسـەر شـتێك) حەزتـان لـە چارەیـان نەكـرد، (زوو دەسـتبەرداریان مەبـن) نزیكـە كـە حـەزتان لـە شـتێك نـەبێو خـواش سـوودێكی زۆری تێبخـات ﴿١٩﴾ وە ئەگـەر ویـستتان هاوسـەرێك بێننـە جێـی هاوسـەرێكو مـارەیی یـەكی زۆریـشتان بەیـەكیان دابـوو، هیـچی لـێ وەرمەگرنـەوە، جـا چـۆن لەسـەر بناغـەی بوختـانو گوناهێكی ئاشـكرا وەریدەگرنـەوە (ئەو بەشـە مارەیی یە)؟! ﴿٢٠﴾ وە چـۆن چـۆنی وەریدەگرنـەوە لـە حاڵێكـدا كـە چـوونەتە لای یەكـدی (وە ئـەو هاوسـەرانەتان كـە دەتانـەوێ لێیـان جیاببنـەوە) پێـشتـر پـەیمانێكی پتـەویان لێتـان وەرگرتبـوو (وگرێبەسـتی هاوسـەرگیـرییتـان پێكـەوە گرێدابوو)﴿٢١﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەکان

(كَرْهًا ): واتە: ڕق لێبوونەوە، حەز پێنەکـردن (قِيلَ الكَـرْهُ والكُرْهُ وَاحِدٌ و قيل: الكُرْهُ: الْمَشَقَّةُ الَّتِي تَنَالُ الإِنْسَانَ مِنْ خَارِجٍ، فِيمَا يُحْمَلُ عَلَيْهِ بِإِكْرَاهٍ والكُرْهُ: ما يَنالُهُ من ذاتِهِ وهو يَعافُهُ)، لە زمانی عەرەبیدا دوو وشە هەن: (كَرْه) و (كُرْه) هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەردووکیان بە یەك مانا دێن، واتە: ڕق لێبوونەوەو حەز پێنەکردن، وە هەندێکیش گوتوویانە: (كَرْه) بۆ شتێکە کە ئینسان لە دەروونی خۆیدا حەزی پێنەکات، بەڵام (كُرْه) شتێکە کە لە دەرەوەی خۆی لەسەری بار کرابێو لەسەری پێویست کرابێ بەزۆر، وە ئەویش حەزی پێنەکات.

(وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ ): واتە: ڕێیان لێ مەگرن، (العضلُ: المنعُ)، لە چییەوە هاتوە؟ دەڵێ: (العَضَلَة: كُلُّ لَحْمٍ صَلْبٍ فِي عَصَبٍ..)، (عَضَلَة) هەر گۆشتێکی پتەوە لەنێو دەماردا، کە بە کوردیی ماسوولکەی پێ دەڵێین، (وَتَجُوِّزُ بِهِ فِي كُلِّ مَنْعٍ شَدِيدٍ..)، واتە: وشەی: (عَضْل) دوایی بەکارهێنراوە بۆ هەر ڕێ لێگرتنێکی توند، وە دەگوترێ: (عَضَّلَتِ الدَجَاجَةُ بِبَيضِهَا، والمرأَةُ بِوَلَدِهَا: إِذَا تَعَسَّرَ خُرُوجُهُمَا تَشْبِيهاً بِهَا) مریشك جاری وایە هێلکەی بۆ ناکرێ، یان بە زەحمەت بۆی دەکرێ، یاخود ئافرەت جاری وایە منداڵی بەزەحمەت لێ جیادەبێتەوە، وشەی: (عَضْل)یان بۆ بەکاردێ.

(بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ): وشەی: فاحیشە، واتە: هەر قسەو کردارێکی ناقۆڵاو ناشیرینو دزێو، وە فاحیشە جاری وایە بە مانای زینا دێ، بە مانای نێربازیی دێ، بە مانای ڕژدییو چرووکیی دێ، بە مانای قسەی خراپ دێ، (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ)

واتە: هەر سێ وشەی: (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِشَةُ) هەر قسەو کردەوەیەکە کە زۆر دزێوو ناقۆلاو ناشیرین بێ، بەلام لێرە کە سیفەتی (مُبَيِّنَة)ی لەگەلْ بەکارهاتوە: ﴿ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾، مانایەکی جیاوازی هەیە، (وهِيَ هُنَا: شَكَاسَةُ الخُلُق وَإِيذَاءُ الزَوج وَأهْلِهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ هِيَ الزّنا، ولَكِن الزّنا فَاحِشَةٌ وَاضِحَةٌ وَلاتَحتَاجُ أن تقيَّد بِمُبيِّنَّة!!) لێرەدا وشەی: (فَاحِشَةُ مُبيِّنَّة) بە مانای بەدڕەوشتیی، زمان شڕیی، یاخیی بوون، بە مانای ئەوە کە ئەو ئافرەتە لەگەلْ مێردەکەی هەلْنەکات دەمەوەر بێ و ئەوانە، هەندێکیان گوتوویانە: (فَاحِشَةُ مُبيِّنَّة) لێرەدا بەمانای زینایە، بەلام وانیە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەمەوە، چونکە زینا بۆ خۆی فاحیشەیەکی ئاشکرایە، پێویست ناکات وشەی: (مُبيِّنَة)ی بخرێتە سەرێ، (مُبيِّنَة)ش یانی ئاشکراکەر، یاخود ئاشکرا (مُبيَّنَة)، وە بە هەردوو قیرائەتەکان هاتوە.

(وَعَاشِرُوهُنَّ ): مامەلْەیان لەگەلْ بکەن، ئەوەش لە چییەوە هاتوە ؟ (العَشِيرة: أَهْلُ الرَّجُلِ الّذِينَ يَتَكثَّرُ بِهِمْ ..)، (عَشِيرة) ئەو خزمە نزیکانەن کە پیاو بەوانەوە زۆر دەبێ، پشتیان پێ دەبەستێ (وَعَاشَرتُهُ: صِرْتُ لَهُ كَعَشرَةٍ فِي المُظَاهَرَة) واتە: بۆی وەك ژمارە دە (١٠)م لێهات لە پتگشیرییکردندا، (وَالعَشِيرُ: المَعَاشِرُ قَرِيبَاً كَانَ أَوْ مُعارِفَاً)، (عَشِير) واتە: کەسێك کە هاودەمی ئینسانە، جا وەك خزمایەتیی، یان لە ڕووی باوو عادەت و نەریتەوە، لەگەلْی تێکەلْ بێ.

(بِٱلْمَعْرُوفِ ): (المَعْرُوف: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ حُسْنُهُ، وَعَكسُهُ المُنْكَرُ)، (مَعْرُوف) ناوە بۆ هەر شتێك کە لە ڕێی شەرعەوە، یان لە ڕێی عەقلْەوە باشیەکەی بزانرێ، وە پێچەوانەکەی (مُنْكَر)ە، (المُنْكَر: مَاعَرَفَ العَقْلُ أَوِ الشَّرْعُ قُبْحَهُ)، (مُنْكَر) هەر شتێکە شەرع یان عەقلْ بزانێ کە ناپەسندو خراپە، کەواتە: (مَعْرُوف)، واتە: شتی پەسند

کراوە، کە ئەوە خوای کاربەجێ حەواڵەی عەقڵو باوی خەڵکی دەکاتەوە، هەڵبەتە زۆرجار شەرعییش چاکیی چاکەکان دەردەخات، بەڵام هەندێك جار بە عەقڵ دەزانرێ.

(قِنطَارًا ): واتە: ماڵێکی زۆر کە ئەندازەکەی دیارنەبێ، هەندێك گوتوویانە: پڕی پێستێك، هەندێك گوتوویانە: هەزار، هەندێك گوتوویانە: چەند هەزار، بەڵام لە ڕاستییدا: (القَنْطَرَةُ: مِنَ المَالِ مَا فِيهِ عبُورُ الحيَاةِ تَشْبِيهَاً بِالقَنْطَرَةِ، وَذَلِكَ غَيْرُ مَحْدُودِ القَدْرِ فِي نَفْسِهِ)، (القَنْطَرَة مِنَ المَالِ) واتە: ماڵو سامانێکی زۆر کە چوێنراوە بە پرد، وەك چۆن ئینسان لەسەر پرد دەپەڕێتەوە، ماڵو سامان زۆریش ئینسان پێی دەگوزەرێنیو پێی لە ژیان دەپەڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە لەبەر زۆریی ئەندازەکەی دیاری نەکراوە.

(بُهْتَنًا ): لە کوردەواریی خۆماندا دەگوترێ: بوختان، تۆمەتی داوێن پیسیی، کە ئەوە لە زمانی عەرەبیدا (قَذْف)ی پێ دەڵێن: (قَذْف) واتە: بوختانی داوێن پیسیی، بەڵام وشەی: (بُهْتَان)، (قَذْف)یش دەگرێتەوە، بەڵام کە لە قورئاندا بەکاردێ، مەبەستی پێ غەیری (قَذْف)ە، واتە: غەیری تۆمەتی داوێن پیسیی، (بُهْتَان) واتە: تۆمەت هەڵبەستن بۆ خەڵك، تاوانبارکردنیان بە ناهەق، (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (بُهْتَان: أَي كَذِبٌ يُبْهِتُ سَامِعَهُ لِفَظَاعَتِهِ، وَقِيلَ كُلُّ فِعْلٍ مُستَبْشَعٍ)، واتە: (بُهْتَان) درۆیەکە، هەر کەس بیبیستێ هێندە درۆیەکی خراپە، پێی سەرسام دەبێ، هەندێکیش گوتوویانە: هەر کردەوەیەکی ناشیرین، پێی دەگوترێ (بُهْتَان).

(أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ): واتە: هەندێکتان چوونە لای هەندێکتان، کە مەبەست لێرەدا جووتبوونی ژنو مێردو سەرجێیی پێکەوە کردنیانە، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی خەڵوەت پێکەوە کردنیانە، با

لەگەڵیشی جووت نەبووبێ، ئەویش لەوە هاتوە: (الفَضَاءُ: المَكَانُ الوَاسِعُ، وَمِنْهُ: أَفْضَى بِيَدِهِ إِلَى كَذَا، وَأَفْضَى إِلى امرَأَتِهِ: خَلاَ بِهَا)، (فَضَاء) واتە: دەشتێکی فراوان، شوێنێکی فراوان، وە دەگوترێ: (أَفْضَى إِلى امرَأَتِهِ: خَلاَ بِهَا) واتە: لەگەڵی چووە شوێنێکی چۆڵ، یاخود لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت بوو، ئەو مانایەش دەگەیەنێ.

(مِّيثَٰقًا غَلِيظًا): (المِيثَاقُ: عَقْدٌ مُؤَكَّدٌ بِيَمِينٍ وَعَهْدٍ)، (مِيثَاق) واتە: هەر پەیمانێکە کە تەئکیدی لەسەر کرابێتەوە بە سوێند لەسەر خواردنو بە بەڵێندانو دەست لەنێو دەستی یەکدی نان، (الغِلْظَةُ: ضِدُّ الرِّقَّةِ، وَأَصْلُهُ أن يُسْتَعْمَلَ فِي الأَجْسَام لَكِنَ قَدْ يُسْتَعَارُ لِلْمَعَانِي كَالْكَبِيرُ وَالكَثِير)، وشەی: (غِلْظَةُ) پێچەوانەی (رقّة)یە، (رقّة) واتە: نەرمو ناسکیی یاخود تەنکیی، بەڵام (غِلْظَةُ)، واتە: ئەستووریی و قەبەیی لە ئەسڵیشدا بۆ شتی ماددیی بەکاردەهێنرێ، بەڵام بۆ شتی مەعنەوییش دەخوازرێتەوە وەك: وشەی: گەورە (کبیر)و زۆر (کثیر) کە ئەویش لە ئەسڵدا بۆ شتی ماددیی بەکاردێ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ شتی مەعنەویی.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هۆی هـاتنه خـوارەوەی ئـەم ئایەتـه کـه دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ...(١٩) ﴾، لەوبـارەوە دوو ڕیوایـەت هـەن:

أ/ ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ ...(١٩) ﴾، قَالَ: كَـانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاءُوا زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذَلِكَ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٥٧٩) وأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٠٨٩)، واتـە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: عەڕەبەکان لە سەردەمی نەفامییدا عادەتیان وابووە، ئەگەر پیاوێك مردبایە خزمەکانی پیاوەکە خاوەن مافتر بوون بە ئافرەتەکە لە خۆی، وە لە خزمانی ئافرەتەکەش، (واتە: باب و براو ئەوانە)، ئەگەر هەرکامێك لە خزمەکانی پیاوەکەی دڵی خواستبای یەکسەر مارەی دەکردەوە، یاخود دەیاندا بە هەرکەسێك کە ویستبایان پێی بدەن، وە ئەگەر ویستباشیان دەیانهێشتەوە، وەك چۆن کەلوپەل بە میرات دەگیرێ، ئەو ئافرەتەشیان بە میرات دەگرت.

مادام پیاوەکەی مردوە، ئافرەتەکە دەبوو بە هی خزمانی پیاوەکەی، ئەوان شایستەتر بوون پێی لە کەسوکاری، ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ب/ ﴿ وَقَالَ الزُّهْرِيُّ وَأَبُو مُجِلز: كَانَ مِنْ عَادَتِهِم إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ يُلْقِي ابْنُهُ مِنْ غَيْرِهَا أَو أَقْرَبُ عَصَبَتِهِ ثَوْبَهُ عَلَى الْمَرأَةِ فَيَصِيرُ أَحَقَّ بِهَا مِنْ نَفْسِهَا وَمِنْ أَوْلِيَائِهَا، فَإِنْ شَاءَ تَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ صِدَاقٍ إِلاَّ الصدّاق الَّذِي أَصْدَقها الْمَيْتُ، وَإِنْ شَاءَ زَوَّجَهَا مِنْ غَيْرِهِ وَأَخَذَ صِدَاقها وَلَمْ يُعْطِهَا شَيْئًا، وَإِنْ شَاءَ عَضلهَا لِتَفْتَدِي مِنْهُ بِمَا وَرَثته مِنْ الْمَيْت أَوْ تَمُوتَ فَيَرِثُهَا، فَأَنْزَلَ اللّٰهُ تَعَالَى:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗا ...﴿١٩﴾ ﴾[١]، واتـــــە: زوهریـــیو ئـــەبو موجلـــیز دەڵـــێن: عەرەبــــەکان لـــە ســـەردەمی نەفامییـــدا عادەتیـان وابوو، ئەگـەر پیـاوێك مردبـایە، کـوڕی ئـەو پیـاوە لـە غـەیری ئـەو ژنـە کـە دەکرێتـە میـرات (یـانی: پیـاوێك کـە دوو خێزانـی هـەبوون، سـێ یـان چـوار خێزانـی هەبـوون کـوڕێکی لـە یەکێـك لـە ژنـەکانی دیکـەی) یاخـود خزمێکی پـشتی پیاوەکـە، دەچـوو پۆشـاکێکی دەخـستە سـەر ئـەو ئافرەتـە (وەك بڵـێی ئەوە نیشـانەیەك بـوو، بـۆ وێنە: کراسـێك، یـان عەمامەیـەك، یـان قوماشـێکی دەخـستە سەر، وەك چۆن لە کوردەواییی خۆماندا دەڵـێن: ئـەوە بـۆ خـۆی گرێـداو، کـردی بـە هـی خـۆی)، ئـەوە ئـەو کـوڕە بـە ئۆتۆمـاتیکی پێـی شـایـستەتر دەبـوو لـە خۆیـشیو لـە کەسوکاریـشی (واتـە: لـە خزمـەکانی ئافرەتەکە) جا ئەگەر ویـستبای مارەی دەکردەوە، بەبێ مارەیـی (واتـە: دەیهێنـا بەبێ مارەیی)، وە جگە لەو میـراتەی کە لە مردووەکە پێـی بـڕاوە، هـەر ئـەوە ئیدی شـتی دیکـەی نەدەدایـە، وە ئەگەر ویـستبای مارەی دەکرد لـە یەکێکـی دیکە، غەیـری خۆی، وە مارەییەکەشی لێ دەستاند، (دوای ئەوەی کابرای دیکەی مارەیی دەدایە، مارەییەکەی لە ئافرەتەکە دەستاند)وە هیچیـشی نەدەدایـە، وە ئەگـەر ویـستباشی ڕێـی لێ دەگرت لەوەی شوو بکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی هەرچـی لـە مردووەکـە بـە میـراتی گرتـوە، دەسـتبەرداریی بـێ، ئنجـا ڕێـی دەدا مێـرد بکاتـەوە، یاخـود ڕێی لێ دەگـرت مێـرد بکـاتەوە، تـا دەمـردو دوایـی میـراتی لـێ دەگرت، ئیـدی خوای دادگـەر ئەم ئایەتـەی نـاردە خوارێ.

بەڵێ ئا ئەوەیە هەڵسـاندنەوەی کەسایەتی ئافرەتو، بەرگرییـکردن لـە مـافی ئافرەتـانو، لابردنی ئـەو هـەموو عـادەتو نەرێتـە خراپانـەی کـە تەنگـیان بـە ئافرەت هەڵچنیوە، لـە سـەردەمی نەفامییـدا، لـە شەریعـەتی دادگەرانـەی خـوادا بێئەوەی هیچکـەس داوای ئەو مافـانە بکـات!

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٨١).

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لە درێژەی باسی ئافرەتانو پیاوانو خێزانو باری کۆمەڵایەتییدا کە بابەتی سەرەکییو سووڕگەی سەرەکیی ئەم سووڕەتە موبارەکەیە، ڕوو لە ئیماندااران دەکات بە نازناوی ئیمانو بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بۆتان حەڵاڵ نیە کە بەزۆر ئافرەتان بە میرات بگرن، نەك میراتیان لێ بگرن، بەڵکو ئەوان وەك کەلوپەلێك دابنێنو ببن بە موڵکی ئێوە، ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ ﴾، وە هەروەها بۆشتان نیە ڕێیان لێ بگرن، دوای ئەوەی کە دەستبەرداریان دەبنو وازیان لێدێنن، تەڵاقیان دەدەن، ڕێیان لێبگرن لەوەی کە شوو بکەنەوە، بۆئەوەی بەشێك لەوماڵو سامانەی کە ئەو کابرایەی دەیەوێ بیهێنێ، پێی دەدا، لێی بستێنن، ئەوە واتایەکی، یاخود: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ ﴾، واتە: تەنگ بە ژنەکانی خۆتان هەڵمەچننو نارەحەتیان مەکەن، کە ناچاریان بکەن بۆخۆیان داوای جیابوونەوە بکەن، بۆئەوەی دەستبەرداریی مارەییەکەیان بن، کە ئەم مانایەیان زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان دەگونجێ، بەڵام ئەوەی دیکەش هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە، ﴿إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾، تەنیا لە یەك حاڵدا بۆتان هەیە مارەییەکە لەو ئافرەتە وەربگرنەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو ژنە ڕەوشتێکی ناقۆڵاو ڕەفتارێکی ناشیرینی ئاشکرای لێ ڕووبدات، کە مەبەست پێی نەگونجانیەتی لەگەڵ مێردەکەیدا: قسە بە مێردەکەی بڵێ، قسە بە کەسوکاری مێردەکەی بڵێ، دەنگە دەنگو هەرای لەگەڵدا بکات، بە ناهەق یەخەی بگرێ، واتە: پیاوەکە ژنەکەی خۆی بوێ، بەڵام ژنەکە نارەحەتی بکاو مێردەکەی نەوێ، لەو حاڵەتەدا پیاو بۆی هەیە بڵێ: ئافرەت مادام لەگەڵم ناگونجێیو نارەحەتی دەکەیو ڕازی نی لەگەڵ مندا

ژیان بەردەوام بکەی، باشە بێنە مارەییەکەم بدەوەو خوات لەگەڵ بێ، لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە ﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، وە بە شێوەیەکی چاك مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ فەرمان بە پیاوان دەکات کە بە شێوەیەکی باش لەگەڵ هاوسەرانیاندا مامەڵە بکەن[1].

خوا دەفەرموێ: بە شێوەیەکی پەسندو بە چاك زانراو پێویستە مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا بکەن، ﴿ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴾، وە ئەگەر ڕقتان لێیان بۆوە، جاری وایە کابرا خێزانەکەی خۆی لەسەر سیفەتێك دەبوغزێنێ، سیفەتێك، دوو سیفەت، سێ سیفەت، یان سیفەتی خراپی زیاتری تێدان، دەفەرموێ: ئەگەر لەسەر شتێك ڕقتان لێیان هەڵساو حەزتان پێیان نەکرد، زوو دەستبەرداریان مەبن، یاخود هەر تەماشای هەڵەو کەمو کورتییو خاڵە لاوازەکانیان مەکەن، ﴿ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴾، زۆر نزیکە ڕقتان لە شتێك بێتەوە، کەیفتان بە شتێك نەیەو حەزی لێنەکەن، بەڵام خوا بەرژەوەندییو سوودێکی زۆری تێدا دانابێ، وەك دوایی باسی دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنْ كَرِهَ

---

١) وشەی: (مَعْرُوف) باسمان کرد، (المَعْرُوف: اسْمٌ لِكُلِّ فِعْلٍ يُعْرَفُ بِالشَّرْعِ وَالعَقْلِ حُسْنُهُ)، (مَعْرُوف) ناوە بۆ هەر شتێك کە لە ڕێی شەرعەوە یان لە ڕێی عەقڵەوە باشییەکەی بزانرێ، بۆیە وشەی: (مَعْرُوف) لە قورئاندا زۆر هاتوە، هەموو جارێ دەفەرموێ: (بالـمَعْرُوف) بە شێوەیەکی پەسند، بە شێوەیەکی بە چاك زانراو، وشەی: (عُرف) لە کوردەواریی خۆمان دەڵێن: باو، باوی ئەم وڵاتە وایە، (عُرف) و (عادة) لەمەوە هاتوە، واتە: ئەو شتەی کە خەڵك لەنێو خۆیاندا بە چاکی دەزانن، بۆیە زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: یەکێك لە سەرچاوەکانی یاسادانان بریتیە لە باوی خەڵك، عادەتی خەڵك، هەڵبەتە عورفو باوی پەسندی خەڵك ئەوەیە کە پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێ، بەڵام بۆ وێنە: خەڵك ڕەش بەڵەك دەکات، ڕەش بەڵەك پێچەوانەی دەقی شەرعیی یە، کە ئافرەتو پیاو نابێ تێکەڵ بنو، نابێ دەستیان بە دەستی یەك بکەوێو، نابێ بە ئارەزووەوە تەماشای یەکدی بکەنو ئەوانە، ئەگەرنا عورفو عادەتو باوی خەڵك مادام باشبێو پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێ، ئیعتیباری پێ دەکرێ، وە شەریعەت زۆرجار هەندێك شت حەواڵەی عورفو عادەتی خەڵك دەکاتەوە،

مِنْهَا خُلُقًا، رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣٤٥)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٤٦٩) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، واتـە: ئەگەر رِقی لـە سیفەتێکی خراپی بێتەوە، سیفەتێکی باشیـشی هـەر هەیـە، تەماشـای سـیفەتە خراپـەکانی نـەکاتو تەماشای سـیفەتە باشـەکانیشی بکـات، چونکە ئەو چۆن کە تەماشای هاوسـەرەکەی دەکـات، سـیفەتی خراپــی تێـدا دەبینــێ، هاوسـەرەکەشــی سـیفەتی خــراپ لــەودا هــەر دەبینـــێ، کەواتـە: دەبـێ چاوپۆشـیی لە یەکدی بکـەن.

ئنجا خـوا ﷻ باسـی مەسـەلەیەکی دیکە دەکات، پێشـێ باسـی ئـەوە دەکات کـە پیـاوان حەزیـان بە ژنـەکانیان نەکرد، نابـێ تەنگیان پـێ هەڵبچنن، وە نابــێ مێــرد لەبەرئـەوەی کـە ژنەکـەی سـیفەتێکی خراپــی تێـدا هەیــە، دەســـتبەرداری ببــێ، بەڵـکو دەبـێ تەماشای چاکەکانیـشی بکـات، ئنجـا دێتـە سـەر ئـەو حاڵـەتەی کـە دەستبەرداری بێ، دەفەرموێ: ﴿وَإِنۡ أَرَدتُّمُ ٱسۡتِبۡدَالَ زَوۡجٖ مَّكَانَ زَوۡجٖ﴾، وە ئەگەر ویستتان هاوسـەرێك بـە هاوسـەرێك بگۆڕن، واتـە: یـەکێکتان هاوسـەرێك تەڵاق بدات کە لەگـەڵی ناگونجـێو نارەحـەتی دەکـاو شـەڕی پـێ دەفرۆشـێ، ئەگـەر دەستبەرداری بوو ویـستی ژنێکـی دیکـە بێنـێ، ﴿وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا﴾، وە یەکێکیـــشیان، واتـــە: ئەوەیـــان کـــە دەســـتبەرداری بـــوونو تەڵاقتـــان داوە (قنطـار)ێـك ماڵــتان پێــدابوو، جـا مـارەیی بـوو، دیـاریی بـوو، کـە زۆربــەی توێـژەرەوان دەڵێن: لێـرەدا مەبەسـت مارەیـی یە، (قنطـار)یش واتــە: ماڵێـکی زۆر، هەندێك دەڵێن: پڕی پێستێك، جا پێستی گـایە، پێـستی مـەڕو بزنـە، ... هتـد، هەندێك دەڵێـن: نا، بەڵکو مەبەسـت پێی ماڵـێکی زۆرە، کـە ئـەم ڕایەشیان زیـاتر ڕاسـتـرە، ئەگەر مارەییەکی زۆریشتان دابـوو بـەو ئافرەتــەی دەســـتبەرداری بـوون ﴿فَلَا تَأۡخُذُواْ مِنۡهُ شَيۡـًٔا﴾، هیچی لـێ وەرمەگرنـەوە، مادام ئێوە بـە ئافرەتــەکە ڕازی نیــن، هیـچی لــێ وەرمەگرنـەوە، ئـەدی ئەگــەر ئافرەتەکـە بـە پیــاوەکە ڕازی نــەبوو؟ ئـەوە باســـمان کـرد کـە دەفـەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، ئەگـەر ئافرەتەکـە بـە پیاوەکــە ڕازی نـەبوو، هــەموو ڕۆژێ شــەڕە هـەرای لەگـەڵ

دەكرد، پیاوەكە بۆی هەیە بڵێ: باشە ئافرەت مادام هەر پێم ڕازی نی، هەموو ڕۆژێ بۆ دەنگە دەنگو هەرا بكەین؟ مارەییەكەم بدەوەو خوات لەگەڵو خوا حافیز، بەڵام ئەگەر پیاوەكە بە ئافرەتەكە ڕازی نەبوو، دروست نیە هیچی لێ وەربگرێتەوە ﴿ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، ئایا لێی وەردەگرنەوە لە حاڵێكدا تۆمەتی بۆ دەكەن، وە گوناهێكی ئاشكرای لەگەڵدا دەكەن؟! تۆمەتەكە چییە؟ تۆمەتەكە ئەوەیە كە وەختێك پیاو مارەیی لە ئافرەتەكە وەربگرێتەوە، مانای وایە ئافرەتەكە كەموكورتییەكی هەیەو ئەو ئافرەتە خۆی داوای كردوە جیابێتەوە، یان ئەو ئافرەتە نەگونجاو بووە، واتە: هەر خودی مارەیی لێ وەرگرتنەوەكەی تۆمەت بۆ هەڵبەستنیەتی، وە ئەوەش گوناهێكی ئاشكرایە، ئنجا دوایی خوای پەروەردگار بە سەرسوورمانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ ﴾، چۆن دەبێ مارەییەكەیان لێ وەربگرنەوە ﴿ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾، لە حاڵێكدا كە چوون بۆ لای یەكدی ؟! لەگەڵ یەكدی جووت بوون، ژنو مێرد بوون پێكەوە، ﴿ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴾، وە ئەوانیش پەیمانێكی پتەویان لە ئێوە وەرگرتوە، كە بریتیە لە گرێبەستی هاوسەرگیریی‌و لەسەر بناغەی پەیمانێكی پتەوو بۆ یەكدی حەڵاڵ بوون، ئەدی نابێ ئەو پەیمانە بێننەوە بیر خۆتان، وە نابێ ئەوە بێننەوە بیر خۆتان، كە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێوە ژنو مێرد بوونو پێكەوە ڕاتانبواردوەو، ژیانی ژنو مێردایەتییتان بەیەكەوە بەسەر بردوە، ئەدی كوا وەفا، كوا جوامێریی ؟! نا مادام تۆ ئەو ژنەت ناوێ بە لەباری دەستبەرداری بەو مارەییەكەشی بدەیەو ئەگەر ماڵی دیكەشت داوەتێ، هیچی لێ وەرمەگرەوە، جوامێریی‌و غیرەت‌و پیاوەتی‌و وەفا، ئەوە دەخوازێ، بەو شێوەیە خوای پەروەردگار ڕێنمایی ئیمانداران دەكات كە ئاوا لەگەڵ ئافرەتاندا بەگشتی وە لەگەڵ ژنەكانیاندا بە تایبەتی مامەڵە بكەن، وە ئەگەر دەستبەرداریشیان بوون هیچیان لێ وەرنەگرنەوە، نە مارەیی‌و نە دیاریی‌و هاوكاریی دیكەش كە پێیان داون.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرمویْ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بۆتان حەلاڵ نیە کە بە زۆر ئافرەتان بە میرات بگرن، وەك: لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا، باسمان کرد، عادەتێکی سەردەمی نەفامیی عەرەبەکان بوو، کە ئافرەت وەختێك مێردی دەمرد، وەك: چۆن کەلوپەل بە میرات دەگیریْ ئەو ئافرەتە ئاوا بە میرات دەگیرا، لە لایەنی خزمانی مێردەکەیەوە، وەك شمەك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا !! جا ئەگەر ویستبایان مارەیان دەکردەوە، یاخود دەیاندا بە کەسێکی دیکە، یاخود ڕێیان نەدەدا شووبکاتەوە، تا ئەو مارەیی یەی کە پێی دەدرا، یاخود ئەو میراتەی کە پێی دەدرا، دەیدا بە خزمەکان، ئیدی خوای دادگەر ئەوەی قەدەغە کردو ڕایگەیاند کە ئافرەت بۆخۆی خاوەنی خۆیەتی، وە هیچ کەس بۆی نیە وەك کەلوپەلو شمەك مامەڵەی لەگەڵدا بکاتو بە میراتی بکریْ، کەواتە: ڕووی دواندن (خِطاب) لێرەدا لە مسوڵمانانە بەگشتی لە کۆمەڵگای مسوڵمانو لە دەوڵەتی مسوڵماندا، واتە: ئەگەر مسوڵمانان دەوڵەتیشیان نەبیْ، وەك کۆمەڵگای مسوڵمان مولزەمن بەوەی کە ئەم فەرمانەی خوای پەروەردگار جێبەجیْ بکەنو، ڕێگە نەدەن کە زوڵم لە ئافرەتان بکریْ، بەتایبەتی ئافرەتێك کە دەبێتە بێوەژنو مێردی دەمریْ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرمویْ: ﴿ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ﴾، لێرەدا ڕووی دواندن لە پیاوانە، ئەو پیاوانەی کە تەنگ بە ژنەکانیان هەڵدەچنن، وە ناچاریان دەکەن کە خۆیان داوای جیابوونەوە بکەنو پیاوەکە دەیەویْ ئافرەتەکە بە دەمی خۆی بڵیْ: من جیادەبمەوە، دیارە ئەوکاتە دەبیْ مارەییەکەی بداتەوە، بەلاّم ئەگەر پیاوەکە

وا بڵـێ ئافرەتەکە بڵـێ: بە تۆ ڕازیم ئەوکاتە مارەییەکـەی دەکەوێتــەوە، کابرا دێنـــێ چـی دەکـات؟ دێنـێ ئافرەتەکـە جـاڕز دەکـات، تـەنگی پـێ هەڵدەچـنێ، ناڕەحەتی دەکات، بۆئەوەی ئەو ئافرەتە بە ناچاریی بڵێ: باشە جیادەبمەوە، تاکو کـە وایگـوت، مارەییەکـەی لـێوەربگرێتەوە، ئنجا خـوای کاربـەجێ ئـەوەی لـێ قەدەغە کردوون.

ئـەدی ئەگـەر پیاوێـك وایکـرد، ئـەوە:

یەکەم: لـێی حـەڕامە ئەو مارەییـە وەربگرێتــەوە.

دووەم: ئەگـەر ئافرەتەکە سـکاڵا بکـات، ئـەوە دەسـتـەڵات (دادگـا)ی شـەرعیی بۆی هـەیە ئەو پیـاوە بێبـەش بکـات لەوە، وە پێی بڵـێ: دەبــێ بـە جوانیـی مامەڵـەی لەگەڵـدا بکـەی، ئەگـەر لێـشـی جیادەبیـەوە، ئـەو مارەییەکـەی هـی خۆیـەتی، واتـە: وە نـەبێ ئـەوە حەواڵـەی ویـژدانو ئینـصـافی پیاوەکـە کرابێتـــەوە، بەڵــکو مـادام خـوای پـەروەردگار دوانـدن (خِطـاب) لەگـەڵ کۆمەڵـگای ئیـسـلامییدا دەکــات، کەواتــە: چ وەك دەوڵــەت، چ وەك هـــەر دامودەزگایـەکی کۆمەڵایـەتیی کـە بـۆ ئـەو کـارە دادەنـرێ، چ وەك کۆمەڵـگا، مولـزەمن کە نەهێڵـن، ئـەو جۆرە زوڵـمو ستەمانە بکەونـە سـەر ئافرەتـان، لەلایـەن پیاوانێکـەوە کـە لـە هاوســەرانی خۆیـان ڕازی نـین، وە دەیانــەوێ دەسـتبەرداریان بـن، بـەڵام بەهـانەیان پـێ دەگـرن، تـاکو ژنـەکە تەنـازول بکـات لە مارەییـەکەی.

لەوبـارەوە عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس ئـەم دەقـەی لــێ گێڕدراوەتـەوە وەك: (طبـري) لـە (جـامع البيـان)دا، بـە ژمـارە: (٨٨٨٤) هێناویـەتی: (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَوْلُـــهُ: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾، يَقُـــولُ: لاَ تَقْهَــــرُوهُنَّ: ﴿لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ﴾، يَعْنِــي، الرَّجُـلُ تَكُـونُ لَـهُ الْمَـرأَة وَهُـوَ كَـارِه لِصُحْبَتِهَا وَلَـهَا عَلَـيْهِ مَهْرٌ، فَيُضِرُّ بِهَا لِتَفْتَدِي)، واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بێ دەڵێ: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ﴾، واتە: ستەمیان لـێ مەکەن، بۆئەوەی هەنـدێك

لەو پارەیەو لەو مارەییەی کە پێتان داون، لێیان بستێننەوە، بۆ وێنە: کابرا ژنێکی هەیە، حەز بە چارەی ناکاتو پێی خۆش نیە ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵدا بەردەوام بکات، وە ئافرەتەکەش مارەییەکی زۆری لەسەر پیاوەکەیەو ئەگەر دەستبەرداری بیو وازی لێ بێنێ، دەبێ مارەییەکەی بداتێ، ئیدی پیاوەکە هەڵدەستێ زیانی پێدەگەیەنێو، نارەحەتی دەکاتو، تەنگی پێ هەڵدەچنێ، بۆئەوەی ئافرەتەکە بڵێ مارەییەکەت دەدەمەوەو وازم لێبێنە !

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، جارێ ئەم وشەی: (مُّبَيِّنَةٖ) بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە: (مُبَيِّنَة) واتە: ڕوونکەرەوە، وە (مُبَيَّنَة) واتە: ڕوونکراوە، ئاشکرا، دەفەرموێ: مەگەر ئەو ژنانە ڕەفتارێکی ناشیرینو ناقۆڵای ئاشکراکەر، یاخود ئاشکرابوویان لێ بپشکوێتەوە، ئەگەرنا بۆتان نیە مارەیی یەکەیان لێ وەربگرنەوە، دیارە لێرەدا زانایان دەربارەی ئەو وشەی: ﴿بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، کە مەبەست پێی چییە؟ ڕاجیایی یان هەیەو بەگشتی سێ ڕایان هەن:

١/ هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لە (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) یان (مُبَيَّنَة) داوێن پیسییو زینایە.

٢/ هەندێکی دی کە (طبري)یان لەنێو دایە، دەڵێن: مەبەست لە (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) بریتیە لە هەر ڕەوشتو ڕەفتارێکی ناشیرین کە زیناو غەیری زیناش وەك: دەمەوەرییو قسەپێگوتنو دەنگە دەنگو پرتەو بۆڵەو زمان درێژییش دەگرێتەوە.

٣/ وە هەندێکیان دەڵێن: (الفَاحِشَةَ الْمُبَيِّنَة: النُّشوزُ وَالعِصْيان، وَبَذَاء اللِّسَانِ، وَغَيْرُ ذَلِكَ)، واتە: (الفَاحِشَةَ الْمُبَيِّنَة) یانی: یاخیی بوونی ژن لە مێردیو، سەرپێچییکردنیو، زمان شڕیی، وە لەگەڵیدا ڕەوشتو ڕەفتاری نارێك بێ.

دیارە من مانای سێیەمم بە دڵە، بۆچی؟ ڕوونی دەکەمەوە: لەبەرئەوە کە خوا ﷻ قورئانی ناردوە، نەك وشەیەکی زیادی تێدا نیە، بگرە پیتێکی زیادیشی تێدا نیە، واتە: یەك پیت لە قورئاندا نیە لە خۆڕاهاتبێ، حەتمەن مانایەکی لەژێردایە، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ۝١ ﴾هود، واتە: ئەلیف، لام، ڕا، ئەم قورئانە کتێبێکە ئایەتەکانی قایم کراون، مەحکەم کراون، واتە: هیچ درزو کەلێنێك و نارێکیی و ناتەواوییان تێدا نیە، قسەیەکیش نارێکیی و ناتەواویی تێدا نەبێ، ناگونجێ وشەیەکی زیادیشی تێدابێ، وشەیەك کە مانایەکی زیادە بەدەستەوە نەدا، بەڵکو نابێ پیتێکی زیادیشی تێدابێ، ئنجا وشەی: فاحیشە لە قورئاندا بە مانای زینا هاتوە، هەڵبەتە بە مانای دیکەش هاتوە، وەك پێشتر بەدرێژیی خستمانەڕوو، بەڵام بەمانای زیناش هاتوە وەك: لە ئایەتی ژمارە (٢٥)ی سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ... ۝٢٥ ﴾، واتە: ئەو کەنیزەکانەی کە مارەیان دەکەن، ئەگەر ئیحصانیان هەبوو (واتە: شوویان کرد، چونکە ئافرەت کە شووی کرد، وەك ئەوە وایە کە بچێتە نێو قەڵاوە، چونکە خۆی دەپارێزێ لە داوێن پیسی، مێردی خۆی هەیە)، هەرکات فاحیشەیەکیان ئەنجامدا، نیوەی ئەوەی لەسەر ئافرەتانی ئازادە سزایان دەکەوێتە سەر، لەسەر ئەو فاحیشەیەی دەیکەن.

ئنجا ئایا ئەو سزایەی لەسەر کەسی ئازادە چەندە؟ سەد قامچیی، وەك: خوای کاربەجێ لە ئایەتی ژمارە (٢)ی سوورەتی (النور)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٍ... ﴾، واتە: ئافرەتی زیناکەرو پیاوی زیناکەر هەر یەکی سەد قامچییان لێ بدەن، کەواتە: کەنیزەکێك ئەگەر زینای کرد، سزای چەندە؟ ئەوە هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پەنجا قەمچییە، کە نیوەی سزای ئافرەتانی ئازادە، کەواتە:

لێرەدا وشەی: (فاحشة) یانی: چی؟ یانی: زینا، ئەدی بۆچی خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، ئەگەر ئەو ئافرەتانە فاحیشەیەکی ئاشکرایان کرد، لێرەدا ناگونجێ بڵێین: فاحیشەی ئاشکراکەر، یان ئاشکراکراو (مُبَيِّنَة)و (مُبَيَّنَة)یش هەر بەمانای زینایە، بەڵکو مادام لێرەدا ئەم وشەی: (مُبَيِّنَة)ی بۆ زیادکراوە، واتە: ئەو ئافرەتە سەرەخەربێ، نەگونجاوبێ، دەمەوەبەربێ، زمان شڕبێ، لەگەڵ مێردەکەی نەگونجێ و باری بەلادا لاربێ، جا بۆ زانیارییتان نەك هەر لێرە لە دوو شوێنی دیکەش لە قورئاندا بەلای کەمەوە، وشەی: (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) هاتوەو هەر بەو واتایەش دێ، واتە: نەگونجانی ژن لەگەڵ مێردیدا، بۆ وێنە لە ئایەتی ژمارە (٣٠، ٣١)ی سوورەتی (الأحزاب)دا بەو مانایە هاتوە، کە من زۆرجار هەندێك تەفسیر دەخوێنمەوە ئەم وشەیە کە بۆ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکارهێنراوە، وە هەندێکیان ئەم (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) بە زینا بەکاردێنن، زۆر پێی قەڵس دەبم، زۆر دەمارم پێی دەگیرێ، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾﴾ النور، واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ! هەر کامێك لە ئێوە فاحیشەیەکی ئاشکرای لێ ڕووبدات (واتە: سیفەتێکی ناشیرینی ئاشکرای لێ ڕووبدات) سزای بۆ دوو قات دەکرێتەوە، وە ئەوەش لەلای خوا ئاسانە، وە هەرکامێك لە ئێوە ملکەچ بێ بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا، وە کردەوەی باش بکات، دووجار پاداشتی دەدەینەوە، وە ڕزقو بژێوییەکی پڕ ڕێزو حورمەتمان بۆ داناوە.

لێرەدا (فَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ) یانی چی؟ یانی نەگونجان، بەپێی سیاقی ئایەتەکە دیارەو بەپێی بەراوردکردنی لەگەڵ ﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، وە هەرکامێکتان ملکەچ بێ بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، جا ئایا پێچەوانەی

ملکەچیی بۆ مێرد چییە؟ هەڵنەکردنە، لەگەڵ مێرد، پاشان هۆی هاتنە خوارەوەکەشی ئەوەبوو کە ئەو هاوسەرانەی پێغەمبەر ﷺ ڕێککەوتن و داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: دەبێ نەفەقەمان بۆ زیاد بکەی، مەسرەفمان بۆ زیاد بکەی، لە ڕووی ماددییەوە، پێغەمبەر ﷺیش لە توانای دانەبوو، یان نەیدەویست ژیانی بەو شێوەبێ، خوای پەروەردگار بەو بۆنەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کەواتە: مەسەلەکە نەگونجانیان بووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺو هیچ پەیوەندیی نیە بە داوێن پیسییەوە، حاشا ئەوە لە هیچ ئافرەتێکی ئیماندار ناوەشێتەوە، چ جای لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ !!

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١)ی سووڕەتی (الطلاق)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ... ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ژنانتان تەڵاقدا، لە سەرەتای عیددەیانەوە تەڵاقیان بدەن (بۆئەوەی کە دوایی عیددەکەی لێ درێژ نەبێتەوە) وە ماوەی عیددەکەش بژمێرن، وە پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، وە لە ماڵەکانیان وەدەریان مەنێن و با نەچنە دەرێ، مەگەر لە حاڵێکدا شتێکی ناقۆڵای ئاشکرایان لێ ڕووبدات، کە بریتیە لە چی؟ بریتیە لەوەی کە لەگەڵ مێردەکەیدا دەنگە دەنگێ بکات، شەڕە قسە بکات، یان لەگەڵ خزمەکانیدا، ئەو کاتە، مێردەکەی بۆی هەیە بڵێ: لە ماڵ دا مەبە، ئنجا لەڕاستییدا وشەی: (فَاحِشَة) ئەگەر بە مانای زینابێ، بێگومان زینا هەر بۆخۆی شتێکی ئاشکرایەو پێویست ناکات ئەو قەیدەی بۆ زیاد بکرێ.

هەڵبەتە ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدرێ ئەوەی گوتمان زۆر ڕوونە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بۆتان حەڵاڵ نیە مارەیی لە ئافرەتان وەربگرنەوە،

مەگەر فاحیشەیەکی ئاشکرایان لێ ڕووبدات، جا ئەگەر بڵێین: مەبەست زینایە، ئایا غیرەتی چ پیاوێك قبوول دەکا ئافرەتەکەی داوێن پیسیی بکاو پێی بڵێ: دەی باشە مادام زینا دەکەی دەبێ مارەییەکەم بدەیەوە ! بێگومان ئەوە شتێکی نەگونجاوە، بەڵام دەگونجێ مێرد بڵێ: مادام لەگەڵم ناگونجێیو قرەقرێ دەکەیو پرتەو بۆڵەم لەسەر دەکەیو پێکەوە ناگونجێین، مارەییەکەم بدەوەو خوا حافیزت بێ، ئەوەیان لەگەڵ ڕووحی ئیسلامو لەگەڵ غیرەتی پیاوو جوامێرییدا دەگونجێ، مەبەستم ئەوەیە تەماشا بکەن زۆرجار هەندێك ئایەتی قورئان بە جۆرێك تەفسیر کراوە، کە بەڕاستیی لەگەڵ ڕووحی شەریعەتو لەگەڵ عەقڵی سەلیمو لەگەڵ قورئاندا ناگونجێ، بۆیەش تەنیا فەرمایشتی خواو فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ هەڵەنە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾، وە بە چاکیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، وشەی: (معاشرة) یانی: (معاملة)، واتە: تێکەڵیيو هەڵسوکەوت پێکەوە کردن[1] (بالمعروف) واتە: بە شێوەیەکی پەسند، لەوبارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چەند فەرمایشتێکی هەن:

**فەرمایشتی یەکەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا، اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٨٨٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٩)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت وەك پەراسوویە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، ئەگەر لێشی گەڕێی بە خواریی دەمێنێتەوەو تۆش سوودی لێ دەبینیو لەگەڵی دەگوزەرێنی.

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٥٦٧).

ئەمە یانی چی؟ خوا ﷻ ئافرەتی لە چاو پیاو وا دروست كردوە، كە عاطیفەو سۆز بەسەریدا زاڵەو وەك پیاو بیرناكاتەوە، وە ئەو جۆرە بیركردنەوەیەكی دیكەی هەیە، پێكهاتەی دەروونیی‌و جەستەیی جیایەو بە شێوەیەكی دیكە بیر دەكاتەوە، ئەو زوو هەڵدەچێ، ئێستا قسەیەك دەكات، دوایی قسەیەكی دیكە دەكات، ئێستا قسەیەك دەكات دوای لەبیری دەچێتەوەو ... هتد، وەك پیاو نیە، ئەگەر پیاو بیەوێ ئافرەت بێنێتە سەر سروشتی خۆی‌و وەك خۆی لێ بكات، دەبێ بیشكێنێ، كە لە حەدیسی دیكەدا هاتوە دەفەرموێ: ﴿وَكَسْرُهَا طَلاَقُهَا﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِم بِرقم: (٦١)، واتە: شكاندنی ئافرەت تەڵاقدانیەتی، پەراسوو ئەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیەوە دەشكێ، ئەدی ئەگەر لێی بگەڕێی ئەوە هەر بە خواریی دەمێنێتەوە.

ئنجا لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وێچواندن (تشبیه)ێكی زۆر جوانی كردوە، چونكە پەراسوو بە هۆی لارییەكەیەوە قەفەزی سینگ دروست دەكات، ئەدی ئەگەر ڕاستەوڕاست بێ، ئەوە قەفەزی سینگ پێ دروست نابێ، بۆیە بە هۆی لاریەكەیەوە بۆتە قەفەزێك‌و صندوقێك بۆ جەرگ‌و سیپەلاك‌و دڵ‌و هەموو ئەو ئەندامانەی كە زۆر گرنگن لە جەستەدا، وە قەفەزی سینگ دەیانپارێزێ بەهۆی لارییەكەیەوە، ئافرەتیش بە هۆی لارییەكەیەوە دەتوانێ منداڵ بەخێو بكاو، دەتوانێ ماڵداریێتیی بكات، ئەگەر ئەو هەست‌و سۆزەی نەبێ، ئەویش وەك پیاو بیر بكاتەوە، كە بێگومان هیچ پیاوێك تەبیعەتی ناهێنێ منداڵی خۆی بشوات، كە خۆی پیس دەكات، وە زۆر شتی دیكە، بەڵام كە تەماشای دەكەی ئافرەت بە عیشق‌و دڵسۆزیی‌و بەوپەڕی خۆشەویستییەوە دەیكات‌و بێزیشی لێ ناكات، خوای كاربەجێ وای خوڵقاندوە، كەواتە: ئافرەت كۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەن‌و جیان لە هی پیاو، بۆیە پیاو نابێ بڵێ ژنەكەم دەبێ وەك من بیر بكاتەوە، ئەگەر وەك خۆی لێ

بكـات بۆی ناكـرێو دەبـێ بیشـكێنـێ، شـكاندنەكەشی بریتیـە لـەوەی كـە دەسـتی لـێ هەڵبگـرێ.

**فەرمایشـتی دووەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، لَنْ تَسْتَقِيمَ لَكَ عَلَى طَرِيقَةٍ، فَإِنِ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا اسْتَمْتَعْتَ وَبِهَا عِوَجٌ، وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَكَسْرُهَا طَلاَقُهَا﴾ (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٤٦٨)، واتـه: ئـەبو هورەیـرە خـوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ئافرەت لە پەراسوو دروسـت بووە (واتە: لە شـێوەی پەراسوو دروسـت بووە، نەك لـە پەراسـوو دروسـت بووبێ، وەك پێشـتـر باسـمان كرد) لەسـەر یـەك ڕێ بـۆت ڕاناوەسـتێ (وەك تـۆ بیـر بكـاتـەوە)، ئەگـەر بتـەوێ بـە لاریـی سـوودی لـێ دەبینـیو لەگەڵـیدا دەگوزەرێنـی، بـەڵام ئەگـەر بتـەوێ ڕاسـتی بكەیـەوە دەیشـكێنیو شـكاندنەكەشیی تەڵاقدانیەتی.

یـانی: دەبـێ تەقـدیری حاڵەتەكەو تایبەتمەندییەكـەی خـۆی بكـەی، ئـەو ئافرەتەو تۆ پیـاوی، هـەروەها ئافرەتـەكـەش نـابـێ چـاوی لەوەبـێ پیـاوەكە وەك خـۆی بـێ، ئەویـش وەك ئـەو عـاطیفـیی بـێو، وە بـە هـەمان شـێوە پیاوەكەش نـابـێ چـاوی لـەوەبـێ كە ئافرەتـەكە وەك خـۆی لـێ بكات، خوای پـەروەردگار پێكهاتەیـەكی تایبـەتی داوە بـە ئـافرەت، وە پێكهـاتەیەكی تایبـەتی داوە بـە پیـاو، خـاڵی هاوبەشـیان هەیـە، وە خـاڵی جیاوازیـشیان هـەیە، بۆیـە ئـافرەت كۆمەڵـە ئـەركێكی تایبـەتی بـۆ دانـراون، كـە لەگـەڵ پێكهـاتەی جەسـتەییو دەروونیـیو عەقڵـییـدا دەگونجـێن، پیـاویش كۆمەڵە ئەركـێكی بۆ دیـاری كراون، لە شـەریعەتدا ئەگـەر ژیانو گوزەران بەپێـی شەریعەت بێ، بەڵام ئەگـەر وەك كابـرا دەڵێ: (منـداڵبـازاڕیـی) بـێ، ژن ئیشی پیـاو بكاو پیـاویش ئیشـی ژن بكـا، وە ژن مـل بە ملـەی پیـاو بكـاو بڵێ دەبێ ژن سالاریی بێو پیاویش بڵـێ: دەبـێ پیـاو سـالاریی بـێ، ئـەوە بـەو شـێوەیە ژیـان تێكدەچـێ، بـەڵام ئێمـە شـەرع سـالارییمان هـەیە،

شەرع دەڵێ: ئەی پیاو! دەبێ ئاوا بکەی ! ئافرەت! تۆش لەسەرت پێویستە ئاوا بکەی ! ئیدی نە پیاو بەسەر ئافرەتدا زاڵەو، نە ئافرەتیش بەسەر پیاودا زاڵە، خوای پەروەردگار ئەرکی هەرکامێکیانی بەپێی سروشتی داناوە.

**فەرمایشتی سێیەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٤٦٨) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم، یان ئامۆژگاریی یەکدی بکەن دەربارەی ئافرەتان بە چاکە. جا ئایا لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن، یانی چی؟ یانی: ئەگەر کەموکوڕییو هەڵەیەکی هەبوو چاوپۆشیی لێ بکەن.

**فەرمایشتی چوارەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْمَلَ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُم لِنِسَائِكُمْ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠١١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٦٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٧٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: صَحِيح، وَهَذَا إِسنَادُ حَسَنٌ، واتە: ئیمان تەواوترینی ئیمانداران ڕەوشت جوانترینیانە، وە باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان.

کێ لەلای خوا باشترین کەسە؟ ئەو کەسەی کە لەگەڵ ماڵو خێزانییدا باشە، هەڵبەتە لە چوارچێوەو سنووری شەرعدا، باشبوون ئەوە نیە ئەو ئافرەتە ئەگەر بە ڕێی ناشەرعییدا بەرێ، بڵێ هەر دەبێ لەگەڵی باشبمو هەر بە دوای دابڕوا، نا لە سنووری شەرعدا لەگەڵی باشبە، ئەرکی خۆتی بەرانبەر جێبەجێ بکەو مافەکانی بۆ دابین بکە، بەو شێوەیەی کە شەرع گوتوویەتی، وە چاوپۆشیی بکە لە هەڵەو کەموکوڕیەکانی.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾، ئەگەر ڕقتان لێیان هەڵسا، زۆر نزیکە

ڕقتان لە شتێك هەڵبستێ، بەڵام خوا سوودو قازانجی زۆریشی تێبخات، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا، رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٣٤٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٤٦٩)، واتە: (لايفرك) یانی: (لايبغض)، واتە: با هیچ پیاوێكی ئیماندار هیچ ئافرەتێكی ئیماندار نەبوغزێنی، (دیارە لە بەرانبەریشدا دیسان ئافرەتی ئیمانداریش نابێ پیاوی ئیماندار ببوغزێنێ، واتە: ژنو پیاو نابێ یەكدی ببوغزێنن) ئەگەر ڕقی لە سیفەتێكی خراپی بوو ئەوە سیفەتێكی دیكەی باشی هەر هەیە، كە لەبەر سیفەتە باشەكەی خۆشی بوێو چاوپۆشییش لە سیفەتە خراپەكەی بكات، عەرەب دەڵێن: (مِنْ فَضَائِلِ الرِّجَال أَنْ تعدَّ مَعَايِبُهُم)، واتە: فەزیڵەتە بۆ پیاوان عەیبەكانیان بژمێردرێن، دیارە بۆ ئافرەتانیش بە هەمان شێوە، ئەگەر عەیبەكانی بژمێردرێن، یەك، دوو، سێ، چوار، ئەوە فەزیڵەتەو مانای وایە چاكەشی زۆرن‌و چاكەكانیشی دەبێ ببینرێن.

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔا﴾، ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ كە دروستە مارەیی زۆر بدرێ بە ئافرەت‌و ئەو مارەییەی دەدرێ بە ئافرەت هەرچەندە زۆربێ دروستە، هەروەها هەرچەندە كەمیش بێ هەر دروستەو، لەبارەی كەمیی مارەییشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ جُلُوسًا، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ تَعْرِضُ نَفْسَهَا عَلَيْهِ، فَخَفَّضَ فِيهَا الْبَصَرَ وَرَفَعَهُ، فَلَمْ يُرِدْهَا، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: زَوِّجْنِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: أَعِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ ؟ قَالَ: مَا عِنْدِي مِنْ شَيْءٍ، قَالَ: وَلاَ خَاتَمٌ مِنْ حَدِيدٍ، قَالَ: وَلاَ خَاتَمٌ، وَلَكِنْ أَشُقُّ بُرْدَتِي هَذِهِ فَأُعْطِيهَا النِّصْفَ وَآخُذُ النِّصْفَ، قَالَ: لاَ، هَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: اذْهَبْ فَقَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي

برقم: (٤٨٣٩)، واتە: ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: من خۆم پێشكەشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەم، ماوەیەكی باش ڕاوەستا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای كردو لێی بێدەنگ بوو، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر پێویستت پێی نیە لەمنی مارە بكە، (من ئامادەم بیهێنم)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچت هەیە (كە وەك مارەیی بیدەیە)؟! گوتی: نەء، هیچم نیە، فەرمووی تەنانەت ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش؟ گوتی: ئەنگوستیلەیەكیش، بەلاّم ئەم پۆشاكەمی لەگەلّ لەت دەكەم، نیوەی بۆ وی‌و نیوەشی بۆخۆم، فەرمووی: نەء، قورئانت هیچ لەبەر نیە؟ گوتی: با، (فلاّن سووڕەت‌و فلاّن سووڕەت چەند سووڕەتێكی باسكردن)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە لێم مارە كردی، كە ئەو سووڕەتانەی فێر بكەی.

كەواتە: كرێی فێركردنی سووڕەتەكانی كرد بە مارەیی ئەو ئافرەتە، ئەوە بەنسبەت كەمیی مارەیی یەوە.

وە بەنسبەت زۆریی مارەیی، ئەم بەسەرهاتە هەیە: ئەبوو یەعلا لە مەسرووقەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕۆژێك عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ چووە سەر مینبەری پێغەمبەر ﷺ گوتی: {أَيُّهَا النَّاس! مَا إِكْثَارُكُمْ فِي صُدُقِ النِّسَاءِ؟ وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ والصَّدُقَاتُ فِيمَا بَيْنَهُمْ أَرْبَعمِائَةِ دِرْهَم، فِمَا دُونَ ذَلِكَ، وَلَوْ كَانَ الإِكْثَار فِي ذَلِكَ تَقْوَىً أَوْ كَرَامَةً لَمْ تَسبقُوهُم إِلَيْهَا، فَلاَ أَعْرِفَنَّ مَا زَادَ رَجُلٌ فِي صِدَاقِ امْرَأَةٍ عَلَى أَرْبَعْمِائَةِ دِرْهَمٍ، قَالَ: ثُمَّ نَزَلَ، فَاعْتَرَضَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالَتْ: لَهُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! نَهَيْتَ النَّاس أَنْ يَزِيدُوا النِّسَاء عَلَى أَرْبَعمِائَةِ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ مَا أَنْزَلَ اللَّه فِي الْقُرْآنِ؟ قَالَ: وَأَيُّ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ اللَّه يَقُولُ: ﴿... وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا ...﴾، الآيَة؟ قَالَ: فَقَالَ: اللَّهُمَّ غَفْرَاً، كُلُّ النَّاسِ أَفْقَهُ مِنْ عُمَرَ، ثُمَّ رَجَعَ فَرَكِبَ الْمِنْبَر، فَقَالَ: أَيُّهَا

النَّاس إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ أَنْ تَزِيدُوا النِّسَاء صَدُقَاتهنَّ عَلَى أَرْبَعمِائَةِ دِرْهَم، فَمَنْ شَاءَ أَنْ يُعْطِي مِنْ مَاله مَا أَحَبَّ}، (ذَكَرَهُ ابْنُ كثير في تَفسيره، وَقَالَ: إسنادهُ جَيد قَوِيّ، وذكره السيوطي في الدر المنثور، وقال: أخرجه سعيد بن منصور، وأبو يعلى، بسند جيد)[1]، واته: (فەرماندەی ئیمانداران عومەر خوا لێی ڕازی بێ گلەیی کرد) گوتی: ئەی خەڵکینە ! بۆچی مارەیی ئافرەتانتان زۆر کردوە؟ پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی (لای زۆریی) چوار سەد درەمیان مارەیی بوو، (بۆ ژنان) یان کەمتر بوو، وە ئەگەر مارەیی زۆر تەقوا بووایە بۆ لای خواو ڕێزو حورمەت بووایە بۆ لای خوا، ئێوە پێش هاوەڵان نەدەکەوتنەوە، (واتە: وامەکەن) دوایی گوتی: دەبێ بزانم داخۆ هەر پیاوێك مارەیی ئافرەت لە چوار سەد درەم زیاتر بکات (واتە: بۆئەوەی سزای بدەم) دوایی لە مینبەر هاتە خوارێ، ئافرەتێك لە قوڕەیش چووە پێشی، گوتی: ئەی گەورەی ئیمانداران! خەڵکت قەدەغە کرد کە مارەیی ئافرەتان لە چوار سەد درەم زیاتر بدەن، گوتی: بەڵێ، گوتی: ئەدی گوێت لێنەبووە خوا ﷻ چی ناردۆتە خوار لە قورئان؟! گوتی: کامە؟ گوتی: ئەدی ئەوەنیە خوا فەرموویەتی:

﴿ ...وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا ... ﴾، واتە: ئەگەر قینتارێکتان مارەیی دابوو بە یەکێك لە ژنەکان (کەواتە: دروستە)، عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: خوایە داوای لێبوردنم هەیە، هەموو کەس لە عومەر شارەزاترە (ئەوە (تَوَاضـع)ی عومەر بوو)! دوایی گەڕایەوەو چووە سەر مینبەرو گوتی: خەڵکینە! من قەدەغەم کردبوون کە مارەیی ئافرەتان لە چوار سەد درەم زیاتریان پێبدەن، بەڵام ئێستا هەر کەسێك زیاتر دەدا با بیدات، واتە: من وەك بۆچوونێکی خۆم ئەوەم پێگوتوون، نەك دروست نەبێو ڕەوانەبێ، دیارە شتێك خوای بەرز ڕەوای کردبێ، کەس بۆی نیە قەدەغەی بکات، بەڵام بە تەئکید مارەیی کەم باشترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٢٨٣).

﴿خَيْرُهُنَّ أَيْسَرُهُنَّ صَدَاقًا﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي برقم: (١١١٠٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٠٣٤)، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ ضَعِيفٌ، واتە: باشترین ئافرەت ئەوانەن كە مارەییان كەم بێ، كەواتە: باشترین مارەیی ئەوەیە كە كەمتربێ، یاخود ئاسانتربێ، یانی: كەسێك بچێ بە قەرز مارەییەكی زۆر بدات بە هاوسەری، ئەوە كەی ئاسانییە؟ ئەگەرنا كابرا كە دەوڵەمەندبێ قەیدێناكا با بچێ زۆری بداتێ، بەڵام مارەیی بە لای كەمییدا بێت باشترە، چونكە مارەیی بریتی نیە لە نرخی ئافرەت، هەتا ئەگەر مارەییەكەی زیاتر بێ، بگوترێ: بە زیاتر فرۆشراوە، مارەیی دیاریی‌و خەڵاتێكە ئەو پیاوە دەیدا بەو ئافرەتە، بۆئەوەی بۆی بسەلمێنێ كە ئارەزووی لێیەتی وە پێی خۆشە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بكات‌و لەگەڵیدا ڕاست دەكات، بۆیەش ناوی لێناوە (صَداق)، چونكە هەر بەڵگەیەكەو نیشانەیەكە، بۆیە دروستە ئەنگوستیلەیەكیش بێ، دروستە شتێكی كەمیش بێ، وە دروستە شتێكی زۆریش بێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخی ئایەتی ژمارە (٢٢٩)ی سووڕەتی (البقرة)ی كردۆتەوە، كە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿...فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ...﴾، واتە: ئەگەر ترسان ئەو ئافرەت‌و پیاوە سنوورەكانی خوا جێبەجێ نەكەن، ژنەكە گوناهی ناگاتێ ئەگەر خۆی بكڕێتەوە، واتە: خۆی دەرباز بكات، جا دەڵێن: ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێ: هەرچەندە مارەیی زۆرتان پێدابن، لێیان وەرمەگرنەوە، ئەم ئایەتەی سووڕەتی بەقەرەی نەسخ كردوە، بەڵام لەڕاستییدا وانیە، چونكە ئایەتەكەی سووڕەتی (البقرة) دەفەرموێ:

﴿... وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا

﴿حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ...﴿٢٢٩﴾﴾، واتـــە: بۆتـان حـەڵاڵ نیـە ئـەو مارەییـەی کـە داوتـانە بـە ئافرەتـان ئەگـەر ترسـی ئـەوەتان هەبـێ کـە سـنوورەکانی خـوا بـەرپا نەکـەن‌و، مەترسـی ئەوەتـان هـەبـێ کـە وەك شـەرع دەڵـێ پێکـەوە بەڕێـوە نەچـن، هیـچیان لـێوەرنەگرنەوە، واتـە: ئایەتـەکەی سوورەتی (البقـرة) کاتێکە کە ژنەکە پیاوەکەی نەوێ، وە ئامادەش بێ بۆئەوەی لێـی دەربـاز بـێ، مارەییەکـەی بداتـەوە، بۆیـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿...فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦ...﴿٢٢٩﴾﴾، واتـە: گوناهیـان ناگـاتـێ لـەوەدا کـە ئافرەتەکە خۆی بکڕێتەوە، واتە: خۆی دەرباز بکات، بـەڵام ئایەتەکەی سوورەتی (النساء) کە دەفەرموێ: ﴿...وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا فَلَا تَأۡخُذُواْ مِنۡهُ شَيۡـًٔا ...﴾، واتە: ئەگەر ڤینتارێکتان مارەیی دابوو بە یەکێکیان، ئەوە بۆتـان نیـە هیـچیان لـێوەربگرنـەوە، ئـەوە بـۆ ئـەو کاتـەیە کە مێردەکە ژنەکەی نـەوێ، چونکە ئەگەر مێـرد ژنەکـەی نـەوێ، نابـێ مارەیـی لـێـوەربگرێتەوە، بـەڵام ئەگـەر ژن مێردەکەی نەوێ، دەڵـێ: هـا ئەوە مارەییەکـەت دەدەمـەوەو تۆم نـاوێ‌و خـۆی لـێ دەربـاز دەکات.

کەواتـــە: ئـــەوەی ســـوورەتی (النـساء) بـــۆ حاڵەتێکـــە کـــە پیاوەکـــە دەستپێـشخەربێ بـۆ جیـابوونەوە، بـەڵام ئـەوەی سـوورەتی (البقـرة) بـۆ حاڵەتێکە کە ژنەکـە دەسـپێشخەربێ، بۆ جیـابوونەوە، بەڵگەشـمان لەسـەر ئەمـە ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ: ﴿...وَإِنۡ أَرَدتُّمُ ٱسۡتِبۡدَالَ زَوۡجٖ مَّكَانَ زَوۡجٖ ...﴾، ئەگـەر ویـستتان ژنێـك بـە ژنێـك بگۆڕنـەوە، واتـە: ژنێك تـەڵاق بـدەن‌و یەکێـکی دیکـە بێنـن، ژنەکـەی کـە تـەڵاقی دەدەی (قنطار)ێکیشت دابیتێ مادام تۆ دەتەوێ دەسـتبەرداری بی، هیچی لـێوەرمەگرەوە، بەڵام ئـەوەی سـوورەتی (البقرة) کاتێکە کە ژنەکە دەیەوێ مێردەکەی لەخـۆی دارنـێ.

**مەسەلەی هەشتەم:** خوای بەرزو مەزن کە دەفەرموێ: ﴿... أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ...﴾، کە لێرەدا مەبەست پێی وەرگرتنەوەی پیاوە بۆ مارەییەك کە داویەتی بە ژنێك، کە دەیەوێ دەستبەرداریی بێ، واتە: دەستپێشخەری جیابوونەوەکە پیاوەکەیە، لەو حاڵەتەدا، وەك پێشتر باسکرا، خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوە، ئەگەر مارەییەکی زۆریشی دابێ بەو ژنە، مادام ئێستا دەیەوێ لێی جیابێتەوە، قەدەغەی کردوە کە هیچی لێوەربگرێتەوە، جا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿...أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ...﴾، ئایا دەتانەوێ مارەییەکەی لێوەربگرنەوە هەمووی یان بەشێکی، لە حاڵێکدا کە بوهتانی پێ دەکەن، وە گوناهێکی ئاشکرا دەکەن؟! لێرەدا مەبەست ئەوەیە کاتێك پیاو مارەییەکە لە ژنەکە وەردەگرێتەوە، هەمووی یان هەندێکی، کە شەرع تەنیا لە کاتێکدا ڕێگە دەدا کە ئەو ئافرەتە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿... إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ...﴾، ئەو ژنە ڕەوشتو ڕەفتارێکی ناقۆڵا لەگەڵ مێردەکەی ئەنجام بدات، کە زۆر ڕوونو ئاشکرابێو نکووڵیی لێ نەکرێ، کە ئەویش مەبەست پێی ئەوەیە لەگەڵیدا زمان شڕبێ، یاخییبێ، بە پرتەو بۆڵە بێ، لە حاڵێکی وادا کە ئەو ژنە بەو شێوەیە تەصەڕووف لەگەڵ مێردەکەیدا بکات، مانای وایە ئەو ئافرەتە بە پیاوەکەی ڕازی نیەو دەیەوێ لێی جیابێتەوە بۆیە پیاوەکە بۆی هەیە بڵێ مارەییەکەم بدەوەو دەستبەردارت دەبم، بەڵام لە حاڵێکدا کە ژنەکە وانەبێ، وە پیاوەکە بۆخۆی دەستپێشخەری جیابوونەوەبێ، وە ژنەکە عەیبی نەبێ، یاخود عەیبێکی وای نەبێ کە لەسەری تەلاقی بدا، ئەوە مانای وایە ئەو ژنە تۆمەتبار دەکاتو بوهتانی پێ دەکات، چونکە (بهتان)، واتە: تۆمەتبارکردن بە غەیری داوێن پیسیی، چونکە بوختانی داوێن پیسیی پێی دەگوترێ: (قذف)، بەڵام بوهتان واتە:

تۆمەتێکی بۆ هەڵدەبەستێ، یاخود هەڵەیەکی پاڵ دەداتەلا کە ئەو هەڵەیەی تێدا نیە ﴿... وَإِثْمًا مُّبِينًا ...﴾، وە گوناهێکی ئاشکراشە، لێرەدا دیارە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە خوا ﷻ زۆری پێناخۆشە پیاوێك ژنەکەی خۆی نەوێ، وە ژنەکەی خەتای نەبێ، بەلاّم پیاوەکە بیەوێ تەلاّقی بداو دەستبەرداری بێ، وە بیەوێ ژنێکی دیکە بێنێ، زۆری پێناخۆشە مارەییەکەی لێوەربگرێتەوە، وە ئەو مارەیی وەرگرتنەوەی ناوناوە بوهتان، لەبەرئەوەی ئەو ئافرەتە کە مارەییەکەی لێوەردەگیرێتەوە، وادێتە بەرچاو باری بەلادا لارەو خەتای کردوە، لە حاڵێکیشدا کە خەتای نەکردوە، کەواتە: بوهتانی پێکردوە، وە گوناهێکی ئاشکراشە، لەبەرئەوەی کە بێ سووچو هۆ دەستبەرداری دەبێ، وە سەرباری ئەوەش ستەمی لێدەکاو مارەییەکەشی لێوەردەگرێتەوە، کە دیارە شەریعەت ڕێگای نادات، وە هەرکەسێك ئەوە بکات مانای وایە بوهتانی کردوەو گوناهێکی ئاشکراشی ئەنجامداوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿...وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ...﴾، واتە: جا چۆن لێی وەردەگرنەوە، لە حاڵێکدا کە هەندێکتان چوونەتە لای هەندێکتان، ژنو مێرد کە پێکەوە دەبن، یان لەگەڵ یەك جووت دەبن، مەبەست پێی ئەوەیە ﴿... وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ...﴾، وە ئەو ژنانە پەیمانێکی پتەویشیان لە ئێوە وەرگرتوە، لێرەدا ﷻ دوو پاساو دێنێتەوە بۆ لێوەرنەگرتنەوەی پیاو بۆ مارەییەك، کە داویەتی بە ژنێك، کە بۆخۆی دەیەوێ وازی لێ بێنێ، نەك ژنەکە داوا بکات، کە ئەگەر ژنەکە داوا بکات ئەوە پێشتر باسمان کردوە، دارنین (خُلع)ی پێ دەگوترێ، وە ئەوکاتە پیاوەکە هیچ لۆمەی ناکرێ، کە مارەییەکەی هەمووی، یان هەندێکی لێوەربگرێتەوە، چونکە ژنەکە دەستپێشخەرەو مێردەکەی لەخۆی دادەڕنێ، بەلاّم ئەگەر وانەبێ خوا ﷻ دوو پاساوی هێناوەتەوە بۆ لێوەرنەگرتنەوەی مارەیی:

١) دەفەرموێ: ﴿ ...وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ... ﴾، واتە: هەندێكتان چوونە لای هەندێكتان، مادام پێكەوە لە ژووریٚ بوون، لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان، واتە: پێكەوە خەڵوەتتان كردوە، یاخود پێكەوە جووتبوون، لەسەر ڕای زۆربەیان، كە ئەو ڕایەیان ڕاستترە، بەڵام خوای پەروەردگار هیچ كاتێك جووتبوونی ژنو مێردی بە زەقی باس نەكردوە بەڵكو وشەی: (ملامسة)ی بۆ بەكارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴿٦﴾ ﴾المائدة، یان لێرە كە دەفەرموێ: ﴿ ...وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ... ﴾، ئاوا بەو تەعبیرانە خوای پەروەردگار باسی كردوە، كە ئەوە كنارە (كِناية)یە، بۆ ئەوەی ئێمەش فێربین ئەو حاڵەتە جینسییە، بە شێوازێكی وا تەعبیری لێ بكەین، كە زەقو ئاشكرا نەبێ.

٢) دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ... ﴾، وە ئەو ژنانە پەیمانێكی پتەویان لە ئێوە وەرگرتوە، دیارە ژن لەسەر بناغەی گرێبەست و پەیمانێكی پتەو بۆ پیاو حەڵاڵ دەبێ و دەبێتە هاوسەری، جا خوای پەروەردگار ناوی لەو گرێبەستە ناوە ﴿ ...مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ... ﴾، واتە: پەیمانێكی ئەستوورو پتەوو مەحكەم، وە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكیدا ئەوەمان بۆ ڕووندەكاتەوەو دەفەرموێ: «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ»، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٩٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٧٤) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، واتە: دەربارەی ژنان پارێز لە خوا بكەن، چونكە ئێوە ئەوانتان وەرگرتوە وەك ئەمانەتو سپاردەی خوا، وە داوێنیانتان بۆ خۆتان حەڵاڵ كردوە، بە وشەی خوا، واتە: بەو

وشـانەی وەك: (إنكـاح و تـزويج) واتـە: مارەكـردنو جووت كـردن، كـە ديـارە ئەو وشانە لە قورئـاندا هـاتوونو وشـەی خـوان.

ئنجـا لێـرەدا دەڵـێين: بەڕاسـتی جێـی سەرسـوڕمانە كـە دوای ئـەوەی كـابرا خێزانەكـەی خۆی نـاوێو، دەيـەوێ وازی لـێ بێنـێو، ژنێكـی ديكـە بێنـێ، وە لـە حاڵێكـدا كـە پێـشتـريش چۆتە لای، وە دوای گرێبەسـتێكی مەحكـەم، ئنجـا مارەييەكەشـی لـێوەربگرێتـەوە !! لێـرەدا دەپرسـين: ئايـا كردەوەيـەك خـوا ﷻ بـەپێ سـەيربوونەوە باسـی بكـات، وە بـە بوهتـانو تۆمـەت هەڵبەسـتن نـاوی بێنـێ، وە بـە گونـاهێكی ئاشـكرا نـاوی بێنـێ، وە پاشـان بفـەرموێ: پێـچەوانەی پێكـەوە بـوونو پێكـەوە جووتبوونتانـە، وە پێـچەوانەی ئـەو گرێبەسـتەيە كـە پێكـەوە بەسـتووتانە، ئايـا ئەگـەر كەسـێك ئيمـانی هەبـێ ناپرينگێتـەوە لـە كردەوەيەكی ئاوا كە بريتيـە لە وەرگرتنـەوەی مارەيـی لەو ژنــە ؟! بـە تەئكـيد با، ئنجا بەڕاسـتی ئەمە ئەوەشـی لـێوەردەگيـرێ كە خوا ﷻ دەيـەوێ پيــاوانی ئيمــاندار زۆر ئەهلــی وەفــابن، جـوامێربن، وە خــوا بــە نــاجوامێريیو بــە بێوەفــايی بەرانبــەر بــە ژن ديــارە زۆر قەڵــسە، وەك لـەو تەعبيــرانەدا كـە بەكــاری هێنــاون، زۆر بــە زەقــی دەبينـــرێ، خــوا هـــەموو لايــەكمان لــە ناجوامێـريیو بـێ وەفاييو هـەموو خووخـدەيەكی خـراپ بپـارێزێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەفسیرکردنی هەر سێ ئایەتی: (٢٢، ٢٣، ٢٤) لە سوورەتی (النساء)، دەگرێتە خۆی، لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ باسی پازدە جۆرە ئافرەت دەکات کە لە پیاو قەدەغەن هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکات، ئەوانیش:

یەکەم: باوەژن (واتە: خێزانی باب کە ئینسان لێی نەبووبێ).

دووەم: دایك.

سێیەم: کچ.

چوارەم: خوشك.

پێنجەم: پوور (واتە: خوشکی باب).

شەشەم: پلك (واتە: خوشکی دایك).

حەوتەم: کچی برا.

هەشتەم: کچی خوشك.

نۆیەم: دایکی شیرپێدەر (واتە: دایکێك کە شیری پێداوی).

دەیەم: خوشکی شیریی.

یازدەیەم: خەسوو (واتە: دایکی هاوسەرت).

دوازدەیەم: کچی ژنێکی گوازراوە، کە لە لای پیاوەکەی بەخێو کراوە (واتە: پیاوێك هاوسەرێکی هەیە ئەو هاوسەرەی کچێکی هەیە لە پیاوێکی دیکە،

بەڵام لەلای ئەو مێردەی بەخێو دەکرێ، مادام چووبێتە لای ئەو ئافرەتـە کە دایکی کچەکەیە، بەڵام ئەگەر نەچووبێتـە لای، لـێی قەدەغـە نیە).

سـێزدەیـەم: هاوسـەری کوڕ (واتە: بـووك).

چواردەیـەم: کۆکردنەوەی دوو خوشك لە یەك کاتـدا.

پازدەیــەم: ئافرەتی هاوسـەردار (واتە: ژنێك کە مێـردی هـەبێ).

﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ
إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ
وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ
وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ
نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم
بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ
أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا
مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ
إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن
تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ
فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ
بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە ئەو ژنانەی باوکـان مارەیان کردبوون، مارە مەکـەن، جگـە لەوەی ڕابــردوە (ئـەوە لەسـەری گوناهبـارنین، بـەڵام پێویـسـتـە دەسـتیان لـێ هەڵـگرن)، بێگـومان هێنـــانی بـــاوە ژن شـــتێکی ناشیـــرینو بـوغزێنراوەو خراپتـــرین ڕێوشـوێنە ﴿٢٢﴾ لێتـان قەدەغـەکراوە هاوسەرگیـــریی لەگـەڵ دایکانتـانو، کـچانتانو خوشـکانتانو، پوورانتـــان (خوشـــکی بـاب)و، پلکـــانتان (خوشکی دایـك)و، کـچانی بـراو، کـچانی خوشـكو، ئەو دایکـانەتان کە شیـــریان داونـێو، خوشـکە شیـــرییەکانتانو، دایکانی ژنەکانتانو، کچانێکی پەروەردەکراو لە ماڵـتاندا، لەو ژنـانەتان کە چوونەتـە لایـــان (لەگەڵیـــان جووتبـــوون)، بـەڵام ئەگـەر نەچـووبنە لایـــان گوناهتـــان ناگـاتـێ (کـە بیانهێنن)، وە هاوســەرانی ئـەو کوڕانـەتان کە لـە پـشـتانن، وە کە دوو خوشك لـە یەك کاتدا پێکەوە کۆبکەنەوە، مەگەر ئەوەی ڕابردوە (ئـەوە لەسـەری گوناهبـارنین، بەڵام پێویستـە دەست لە یەکیان هەڵگرن) بێگومان خـوا لێبـوردەی بـە بـەزەیی یـە ﴿٢٣﴾ وە ئافرەتانی پاكو پارێزراو (یان هاوسـەردار) جگە لەوانـەی (وەك کـەنیزەك) خاوەنیـانن، (ئـەوە) خـوا بـۆی نووســیونو لەسـەری پێویـسـت کـردوون، وە جگـە لەوانەی باسـکران، بۆتـان حەڵاڵ کـراوە، کە بە ماڵو سـامانەکانتان بیـــانخوازن، لـە حاڵێـکدا کە خۆتان دەپارێزنو داوێن پیسـیی ناکـەن، جا هەر کامێـکیان کـە (وەك هاوســەر) لێیـان بەهرەمەنـد دەبـن، ئـەوە پێویـسـتە پاداشـت (مـارەیی)یـەکانیان بدەنـێ، وە ئەوەی کە زیاد لە پێویستـکراویش خۆتان لەسەری پێکهاتن، گوناهتـــان ناگـاتـێ، بێگومان خـوا زانـای کاربەجێیـە ﴿٢٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(**وَمَقْتًا**): واتە: (المَقْتُ: البُغْضُ الشَّدِيدُ لِمَنْ تَرَاهُ تُعَاطِي القَبِيحَ)، (مَقْتُ) بریتیە لە ڕق لێهەڵسانێکی زۆر بەرانبەر بە کەسێك کە شتێکی ناشیرین دەکات.

(**أَرْضَعْنَكُمْ**): واتە: شیریان پێداون، ئافرەت کە دایکی منداڵێك نیەو شیری پێدەدا دەگوترێ: (مُرضِع) واتە: ئەو ئافرەتەی کە شیر دەدا بە منداڵی غەیری خۆی. (رَضَعَ المَولُودُ يَرْضِعُ، وأَرْضَعتْهُ).

(**وَرَبَٰٓئِبُكُمُ**): (رَبَائِب) کۆی (رَبِيبَة)و (رَبِيب)یە، (الوَلَدُ الَّذِي رَبِّي جَمْعُهُ: رَبَائِب) ئەویش بەو منداڵە دەگوترێ جا کوڕبێ یان کچ، کە هی پیاوەکە خۆی نیەو لە مێردێکی دیکەیە، بەڵام لە ماڵی ئەودا بەخێو دەکرێ، واتە: کە پیاوێك ژنێك مارە دەکات وە منداڵی هەن، منداڵەکانی پێیان دەگوترێ (رَبَائِب)، (الرَّابُ والرَّابَّةُ: أَحَدُ الزَّوْجَيْنِ إِذَا تَوَلَّى تَرْبِيَةَ الوَلَدِ مِنْ زَوْجٍ كَانَ قَبْلَهُ) دیارە بە پیاوەکە دەگوترێ: (رَابّ) بە ئافرەتەکەش دەگوترێ: (رَابَّة) یاخود بە هەردووکیان دەگوترێ: (رَابّ و رَابّة)، چونکە ئەو منداڵە بەخێو دەکەنو سەرپەرشتیی دەکەن.

(**حُجُورِكُم**): (حَجْر) کۆیەکەی (حُجُور)ە، دەگوترێ: (فِي حَجْرِ فُلَانٍ أَيِ: فِي مَنْعٍ مِنْهُ عَنِ التَصَرُّفِ فِي مَالِهِ وَكَثِيرٍ مِنْ أَحْوَالِهِ، وَحِجْرُ القَمِيصِ، أَيْضَاً اسْمٌ لِمَا يُجْعَلُ فِيهِ الشَّيءُ فَيُمْنَعُ)، (حِجْر) واتە: کۆش، (حَجْر) واتە: مەنع، بۆچی کەسێك کە منداڵێك سەرپەرشتیی دەکات دەڵێین: لە حەجری ئەو دایە؟ چونکە ئاگای لێ دەبێو ناهێڵێ بەملاولادا بڕوا، ناهێڵێ هەڵسوکەوتی ناشیرینو ناشایست بکات، وە پەروەردەی دەکاتو بەخێوی دەکات.

(وَحَلَٰٓئِلُ ): ﴿ وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ﴾، واتە: بووکی کوڕەکانتان، هاوسەری کوڕەکانتان، (حَلاَئِل) کۆی (حَلِيل)ە، یاخود کۆی (حَلِيلَة)یە، (حَلِيل و حَلِيلَة)، واتە: ئافرەتێك کە بۆ پیاو حەڵاڵە، واتە: (الزوجة) بە (حَلاَئِل) کۆدەکرێتەوە.

(أَصۡلَٰبِكُمۡ ): (أَصْلاَب) کۆی (صُلْب) یان (صَلْب)، (صُلْب)و (صَلْب)، واتە: پشت، بەڵام (صُلْب) واتە: شتی ڕەقو پتەو، بۆیەش بە پشت گوتراوە (صَلْب)، (صُلْب) لە (الصَّلابة)ەوە هاتوە، چونکە ئینسان پشتی ڕەقە، (أَبناءِكُمُ الذين مِن أَصْلاَبِكُم) واتە: ئەو کوڕانەتان کە لە پشتی خۆتانن.

(وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ ): واتە: پارێزراوان، کۆی (مُحْصَنَة)یە، دەشگونجێ بە (مُحْصِنَات)یش بێ، واتە: خۆپارێزان، (مُحْصِنَات)، واتە: ئافرەتانێك خۆ دەپارێزن، لە شتی ناشەرعیو داوێن پیسی، (مُحْصَنَات)، واتە: ئافرەتانێك کە پارێزراون، لە چییەوە هاتوە؟ لە (حِصْن)ەوە، (حِصْن) واتە: قەڵا، چونکە کەسێك کە دەچێتە نێو قەڵاوە دەپارێزرێ، کۆیەکەی (حصُون)ە، بەمانای (قلعة) دێ، جا وشەی: (مُحْصَنَات)، یان (مُحْصِنَات) دەگونجێ بەمانای ئافرەتانی هاوسەرداربێ، واتە: (مزوجات)، یان (متزوجات)، وە دەگونجێ بە مانای ئافرەتانی پاك بێت (العفيفات)، وە دەشگونجێ بەمانای ئافرەتانی ئازاد (حرائر)بێ، وە دەشگونجێ هەر بەمانای ئافرەتی مسوڵمان بێ، لەبەرئەوەی کە ئینسان بە هۆی ئیسلامەتییەوە لە گوناح دەپارێزرێ.

(مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ): واتە: ئەوانەی کە بەدەستی ڕاستتانەوەن (مَمْلُوك) واتە: کۆیلە، (الْمَمْلُوكُ: الرَّقِيقُ مِنَ الإِمتلاَكِ)، واتە: لەبەرئەوەی ئەو کەسە خاوەنی ئەو کۆیلەیە دەتوانێ بیفرۆشێ، وە کڕیویەتی، بۆیە (مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم) واتە: ئەوانەی کە لەبەردەستتانن، ئنجا هەردووك ڕەگەزەکە هەم جینسی نێر، هەم جینسی مێ دەگرێتەوە.

(**مُسَٰفِحِينَ**): واتە: ئەوانەی کە ئاوی خۆیان بە حەرامیی دەڕێژن، واتە: زیناکەران، لە (سفح)ەوە هاتوە، (سَفَحَ الدَّمُ ونَحوه: سفُوحاً وسَفَحاناً: انصَبَّ وسَفَحَ الدَّمَ: سَفَكَهُ فَهُوَ سافح وَسَفَّاح وسَفوحٌ، سافَحها مسافحة وسِفاحاً: أقام معها من غير زواج) ئەگەر بگوترێ: خوێنەکە ڕژا، یان ئاوەکە ڕژا، هەروەها دەگوترێ: (سَفَحَ) واتە: ئاوەکەی ڕشت بێهوودە، (سَفَحَ الدَّمَ: سَفَكَهُ) یانی: خوێنەکەی ڕشت، ئنجا بۆچی کەسێك کە زینا دەکات پێی گوتراوە (مُسافِح)؟ لەبەرئەوەی کە ئەو ئاوو تۆیەی دەڕێژێ لە حەڵاڵی خۆیدا نایڕێژێ، وە بە بێهوودە دەچێ، یاخود منداڵی زۆڵی لێ دروست دەبێ.

(**فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ**): واتە: ئەوەی کە سوودتان لێ وەرگرتو لەزەتتان لێ وەرگرتو خۆشییتان لێ وەرگرت.

(**أُجُورَهُنَّ**): (أُجُور) کۆی (أَجْر)ە، (أَجْـر)یش لێرەدا بە مانای مارەیی دێ، کە مارەییش پاداشتێکەو دیاریی‌و خەڵاتێکە پیاو بە ژنی دەدا.

## هـۆی هـاتنـه خـوارەوەی ئایەتەکـان

١) هـۆی هاتنــه خــوارەوەی ئـەم دوو ئایــەتە کـه دەفــەرموێ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَۚ ﴿٢٢﴾ ...وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾.

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَةِ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ، إلا امْرَأَةَ الأَبِ وَالجَمْعِ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ... وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ ﴾﴾[1] ، واتـــــــه: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیـان ڕازی بێ دەڵێ: له سـەردەمی نەفامییـدا، خەڵکی سەردەمی نەفامیی هەرچی خوا قەدەغـەی کـردوە لـه ئافرەتــان (وەك: دایــك و کــچ و خوشــك و ... هتـد)، ئـەوانیش هـەموو ئەوانەیــان بــه قەدەغـه دەزانــی، جگــه لــه دووان: خێزانــی بــاب (واتــه: هاوســەری بابیــان) لەگــەڵ کۆکردنـەوەی دوو خوشـکان، بۆیـه خـوا ئـەو دووانـەی بـه تایبـەت هێنـاون و بـۆ هـەردووکیان فەرموویـەتی: ﴿إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾، ئـەوەی کـه لـه ڕابـردوودا کردووتانـەو نـەتانزانیوە، کـه خـوای بـەرز قەدەغـەی کـردوە، لەسـەری گوناهبـار نەبوون، یانی نەك ئێستا بیانهێڵنەوە! ئێستا دەستیان لێ بەردەن، بەڵام بۆ کاتی خۆی گوناهبـار نەبوون.

٢) هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئەم ئایەته کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ...﴿٢٤﴾ ﴾.

---

١) جامع البيـان: برقم: (٨٨٣٥)، ج: (٤)، ص: (٣٣٢).

﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ بَعَثَ جَيْشًا إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقُوا عَدُوًّا، فَقَاتَلُوهُمْ فَظَهَرُوا عَلَيْهِمْ وَأَصَابُوا لَهُمْ سَبَايَا، فَكَأَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَحَرَّجُوا مِنْ غِشْيَانِهِنَّ مِنْ أَجْلِ أَزْوَاجِهِنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ فِي ذَلِكَ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ...﴿٢٤﴾﴾، أَيْ فَهُنَّ لَكُمْ حَلَالٌ إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٨١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٥٩٣)، وأَبُوداوُدَ برقم: (٢١٥٧)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٣٢)، وَالنَّسَائيُّ برقم: (٣٣٣٣)، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی حونەیندا سوپایەکی نارد بۆ ئەوطاس (ناوچەیەك بووە)، لەوێ تووشی دوژمن بوونو لەگەڵیان بە شەڕ هاتنو بەسەریاندا زاڵ بوون، وە ئافرەتو منداڵەکانیان لێ بە دیل گرتن، ئنجا وەك بڵێی هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوناهیان زانی ئەو ئافرەتانە بکەنە کەنیزەكو بچنە لایان، لەبەرئەوەی هاوسەردار بوون لە پیاوە کافرو موشریکەکان، (کە ئەو کاتە یاسایەکی گشتی بووە لە دنیادا ئافرەتی بە دیل گیراو کراوە بە کەنیزەك، وەك دوایی باسێکی سەربەخۆی لەبارەوە دەکەین) ئیدی لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوار ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ...﴿٢٤﴾﴾، واتە: وە لێتان قەدەغەیە کە ئافرەتانی هاوسەردار، جگە لەوانەی کە دەبن بە کەنیزەکتان، (یانی: لە شەڕ بە دیل دەگیرێنو دەبن بە کەنیزەکتان)، ئەوانە بۆتان حەڵاڵن هەرکاتێ عیددەیان بەسەرچوو (وە خۆیان شۆردو پاکبوونەوە) ئەوکاتە بۆتان هەیە لەگەڵیاندا جووتبن، وەك کەنیزەك.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشیدا باسی چەند مەسەلەیەکی کرد، دەربارەی چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ ئافرەتان، بە تایبەتی مێرد لەگەڵ ژنیدا، وە پاشان ئەگەر پیاو ویستی لە ژنەکەی جیابێتەوە، بۆی نیە مارەییەکەی لێ وەربگرێتەوە، وە خوای پەروەردگار بە شێوەیەکی زۆر سەیرو جێگای سەرسوڕمان باسی کرد کە پیاوێك مارەیی لە ژنێکی وەربگرێتەوە، کە بۆخۆی دەیەوێ دەستبەرداری بێ، دوای ئەوە خوا ﷻ بۆمان باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە لە حەڵاڵنین پیاو هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکات، کە دیارە خوای زاناو شارەزا بەگشتی پازدە (١٥) جۆرە ئافرەت لێرەدا باس دەکات، واتە: پازدە جۆر وەك: ئەسڵ، هەڵبەتە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺیشدا هی دیکە هاتوون، کە دوایی باسیان دەکەین، هەروەها هەر ئەم پازدە جۆرەش هەندێك جۆری دیکەش دەگەیەنن، کە وەك خۆیانن، بۆ وێنە: کە دایك قەدەغەیە، نەنکیش قەدەغەیە، وە هەروەها دایکی نەنکیش قەدەغەیە، بەو شێوەیەو ... هتد.

خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ﴾، وە ئافرەتانێك مارە مەکەن کە بابتان مارەیان کردوون، مەگەر ئەوەی کاتێ بووەو تێپەڕیوە، ئەگەر کاتی خۆی شتێکی واتان کردوە، ئەوە هەڵە بووەو گوناح بووە، بەڵام ئێوە لەسەرتان نەنووسراوە، چونکە خوا قەدەغەی نەکردوە لێتانو پێتان نەزانیوە، نەك وا لێکبدرێتەوە کەسێك کاتی خۆی ژنی بابی مارە کردبێتەوە، ئێستا بۆی هەبێ دەستی پێوەبگرێ، بەڵام بەنسبەت ئەو کاتی کە ڕابردوە، گوناهتان نەگەیوەتێ، چونکە نەتانزانیوە قەدەغەیە.

هەندێك لە توێژەرەوان ئەمەیان وا لێکداوەتەوە، ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، دەڵێن، واتە: وەك چۆن بابتان ژنیان دەهێنا، ئێوە

وەك بابتـان مەهێنـن، کـە زۆرجـار هـی حـەڕامو قەدەغەشـیان دەهێنـان، وە (طبـري) ئـەو مانایـەی زیـاتر پـێ پەسندە، بـەڵام زۆربـەی توێـژەرەوان دەڵێن: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، واتـه: (ولاتنكحـوا منكوحات آباءكم)، واته: ئەو ئافرەتانەی کە بابتان کـاتی خـۆی هێنـاویانن، جـا چ چووبنـە لایانو لەگەڵیان جووتبـووبن، چ هـەر مارەیـان کـردبنو دەستیان لـێ بەردابـن، تـازە بوونـە دایـكو حـەڵاڵ نیـە بـۆ کـوڕ ئـەو ئافرەتـە بێنـێ، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾، بێگومـان ئـەوە هـەم شتێکی زۆر دزێـوو ناقۆڵایـە، هـەم جێـگەی تـووڕەییو قەڵـسبوونی خـوای باڵادەسـتە، وە هـەم عـادەتو ڕێوشوێنێکی زۆر خراپیشە.

ئەمە جۆری یەکەم لەو ئافرەتانـەی کـە دروسـت نیـە پیـاو بیـانهێنـێ، ئنجـا خوای کاربەجـێ دێتـە سـەر جۆرەکانی دیکەو دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ ﴾، لێتـان قەدەغـە کـراوە، (واتـە: بـۆ هاوسەرگیـریی لەگـەڵ کـردن) دایکانتـان، ﴿وَبَنَاتُكُمْ ﴾، وە کـچانتـان، ﴿وَأَخَوَٰتُكُمْ ﴾، وە خوشـکانتان، چ خوشکی بابیی، چ بابو دایکیی بێ، چ خوشکی دایکیی بێ، ﴿وَعَمَّٰتُكُمْ ﴾، واتـە: خوشکی بابتـان، کە من وشـەی (پـوور)م بـۆ بـەکارهێناوە، ﴿وَخَٰلَٰتُكُمْ ﴾، واتـە: خوشـکی دایکتـان، کـە مـن بـۆ ئەویـش وشـەی: (پلـك) بەکاردێنـم، تـاکو لێـك جیابکرێنـەوە، کە گـوترا: (پـوور) واتـە: خوشـکی بـاب، وە (پلـك)، واتـە: خوشـکی دایـك، ﴿وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ ﴾، وە کـچانی بـرا، بـرازا، ﴿وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ ﴾، وە کـچانی خوشـك، خوشکەزا.

دوای ئـەوەی ئـەو حەوتـەی پێـشێی باسـکردن کـە ئـەوە لـە ڕووی نەسـەبو پـشتەوە دەگەنـەوە بـە مرۆڤ، ئنجـا دێتـە سـەر باسـی ئەوانـەی کـە بـە هـۆی شیـرییەوە قەدەغـەن، یـان بـە هـۆی هەنـدێ هۆکـاری دیکـەوە، دەفـەرموێ:

﴿ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ ﴾، وە ئەو دایکانەتان کە شیریان پێداون، هەر ئافرەتێك شیری بە مرۆڤ دابێ، کە:

هەندێك لە زانایان دەڵێن: یەکجار شیری پێدابێ، دەبێتە کوڕی شیریی و دەبێتە مەحرەمی، واتە: خۆیشی و کچەکەیشی و خوشکەکەیشی و ئەوانە هەموو دەبن بە مەحرەمی ئەو کوڕە کە شیری لێ خواردوە، وە ئەگەر کچیش بێ دەبێتە مەحرەم لەگەڵ کوڕەکانیداو، پێیان ناشێ.

هەندێکیش دەڵێن: دەبێ سێ جار شیری پێدابێ.

وە هەندێك دەڵێن: دەبێ پێنج جار شیری پێدابێ، ئنجا دەبێتە کوڕی یان کچی شیریی. ﴿ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ ﴾، وە خوشکانتان لە شیر پێدانـدا، واتە: ئافرەتێك کە شیری بە تۆ داوە، چەند کچی هەن هەموویان دەبن بە خوشکی تۆ، مانای وایە لێت قەدەغەن، وە ئەگەر کوڕی هەبن، دەبن بە برای ئەو منداڵە، کە ئەگەر کچ بێو شیری خواردبێ، کوڕەکانی دەبن بە برای شیری، ﴿ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ ﴾، وە دایکی ژنەکانتان، واتە: خەسوو، ﴿ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ ﴾، وە کچانێکی پەروەردەکراو لە باوەشی ئێوەدا، واتە: لە ماڵی ئێوەدا لەو ژنانەتان کە چوونە لایان، واتە: لەگەڵیان جووتبوون، ئەدی ئەگەر کەسێك ئافرەتێکی مارە کردبێ، بەڵام نەچووبێتە لایو دوایی دەستی لێ هەڵبگرێ، ئایا کچەکەی لێ قەدەغە دەبێ؟ نەخێر، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمۡ تَكُونُواْ دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، واتە: ئەگەر نەچووبنە لای ئەو ژنانەی کە هێناوتانن، کچەکانیانتان لێ قەدەغە نابن، تەنیا بەوەندەی کە مارەی کردوە، دوایی پێکەوە نەگونجاون و دەستی لێ هەڵگرتوە پێش ئەوەی بیگوازێتەوە، ئەو کاتە کچەکەی لێ قەدەغە نابێ، بەڵام زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئینسان هەر کە کچی ئافرەتێکی مارە کرد،

با نەشچووبێتە لای، دایکی لێ قەدەغە دەبێ، لەبەرئەوەی پێویستە حورمەتی دایك زیاتر بگیرێ، کەواتە: ئەگەر کچێکت بەس مارە کردو دوایی دەستت لێ هەڵگرت، تازە دایکەکەیت لێ قەدەغەیە، ﴿ وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ ﴾، وە هاوسەری ئەو کوڕانەتان کە لە پشتی خۆتانن، ئەو جۆرە ئافرەتانە لە کوردەواریی خۆماندا پێی دەڵێن: بووك، واتە: هاوسەری کوڕ، ﴿ وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ ﴾، وە لێتان قەدەغە کراوە لە یەك کاتدا دوو خوشکان پێکەوە کۆبکەنەوە، واتە: دوو ئافرەت کە خوشکی یەکدین دروست نیە، هەردووکیان لە یەك کاتدا هاوسەری پیاوێك بن، بەڵام ئەگەر یەکیان وەفاتی کرد، یان یەکیان تەڵاق درا، دروستە ئەویدیکە بێنێ، ﴿ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ ﴾، مەگەر ئەوەی تێپەڕیوە، کاتی خۆی ئەگەر شتێکی واتان کردبێ، گوناهتان نەگەیوەتێ، بەڵام کەسێك مسوڵمان بووبێو ئەوکات دوو خوشکی لە ژێر نیکاح دا بووبن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێکیان دەست لێ هەڵگرەو یەکیان بهێڵەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، (بەنسبەت ڕابردووەوە) بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، وە لێتان دەبووری، چونکە ئەوکاتە نەتانزانیوە کە لێتان قەدەغەیە.

ئنجا دێتە سەر جۆری پازدەیەمی ئەو ئافرەتانەی کە لە ئینسان قەدەغەن هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکات، کێن؟ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ئافرەتانێکی هاوسەردار، ئافرەتانێك کە پارێزراون بە هۆی هاوسەریانەوە، واتە: ژنێك کەماڵو مێردی هەیە، قەدەغەیە تۆ بچی هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەی، تاکو لە ژێر نیکاحی ئەو پیاوەدابێ ﴿ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ﴾، جگە لەوانەی بەدەستی ڕاستتانەوە دەبن، واتە: ئێوە دەبنە خاوەنیان کە مەبەست پێی کەنیزەکە، ﴿ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئا ئەوە پێویستبوونی خوایە بەسەر ئێوە،

خـوا لەسـەری فەرز کردوون، بەم شێوەیە ئەوانەتـان لـێ قەدەغەیـە، ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾، وە جگە لەوانـەتان بـۆ حـەڵاڵ کـراوە، یـانی خـوا ﷻ ئەوانـەی قەدەغەن سـەرژمێریی کـردوون، هـەتاکو غـەیری ئەوانـەی سـەرژمێرکراون حـەڵاڵ بـن، هـەر ئافرەتێـك دایك نەبـێ‌و، کـچ نـەبێ‌و، خوشـك نـەبێ‌و، پـوور نەبـێ‌و، پـلـك نەبێ‌و، وە ئافرەتی هاوسـەردار نەبـێ‌و ... هتـد، ئـەوە مانای وایە حەڵاڵە، ﴿أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾، کە بە ماڵ‌و سامانەکەی خۆتان هەوڵبـدەن، ئـەو ئافرەتانـە بێـنن، مارەییـان پـێ بـدەن، مەسـرەفیان بکـەن، بـە مـەرجێك خۆپـارێزەر بـن، وە ئـاوی خۆتـان لـە حەرامـدا مەڕێـژن، واتـە: زیناکـەر مەبـن، ﴿فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، هەرکامێـك لـەو ئافرەتـانەی کـە بـە شـێوەیەکی حـەڵاڵ هێنـاتانن، وە لـەزەتتان لـێ وەرگـرتن‌و پێکـەوە سـەرجێی یەکدیتـان کـرد، وە لێیـان بەهرەمەنـدبوون، پاداشـتەکانیـان بدەنـێ، واتـە: مارەییـەکانیان بدەنـێ، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە ئـەوان ڕازی بـوون هاوسـەرگیـریی لەگەڵ ئێـوەدا بکـەن، ﴿فَرِيضَةً﴾، ئەو مـارەیی پێدانـە لەسـەرتان پێویـسـتە ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾، وە گوناهیـشتان ناگاتـێ لـە دوای ئـەوە کـە فـەرز کـراوە، ئەگـەر بۆخۆتـان پێکـبێن، یـانی چی؟ بۆ وێنـە: پیـاوەکە نـۆزدە مـسقاڵ زێـڕ مـارەیی داوەتـە ئـەو ئافرەتـە، بەڵام دوایی توانای زیاتری هەیـە دەڵـێ: ئافرەت هـا ئـەوە بیـست مـسقاڵی دیکە، یـان پـەنجا مـسقاڵی دیکەشت دەدەمـێ، یـاخود پیاوەکـە ئاتاجـەو نـەدارە سـەری تێوەسـتاوەو دەیـەوێ خـانوو بکـات، یـان قـەرزدارە، بەهـەر حـاڵ پێویـستی بـە پارەکـە هەیـە، ئافرەتەکـە دەڵـێ: جـا مـن چـۆن زێـڕ بەخۆمـەوە بخـەم‌و تـۆش موحتـاج بی، یان قـەرزاربی، یاخود خانوومـان نەبـێ ! ئـەوە مـن زێڕەکـەی خـۆم بۆ تۆ دەفرۆشم، یان بە دیاریی دەتدەمێ، یان بـە قـەرز دەتـدەمێ، ئەگـەر هـەتبوو بمـدەوە، هەرچی بۆخۆیان لـە بـەینی خۆیانـدا لەسـەری پێکبـێن، چ پیاوەکە زیادی بکـات، چ ئافرەتەکـە مـاڵی خـۆی بـدا بـەو، یـاخود مارەییـەکـەی بداتـێ، یـان مـاڵی

دیکەی هەبێ بیداتێ، ئەوە هیچ گوناهیان ناگاتێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە، واتە: خوا زانایەو ئەو یاسا شەرعییانەی داناون، هەموویان لە شوێنی خۆیاندان، وە کاربەجێشە شتی بێجێ ناکات، وە خوای پەروەردگار هیچی لێ قەدەغە نەکردوون کە زیانی نەبێ، وە هیچ شتێکیشی لێ قەدەغە نەکردوون کە سوودی هەبێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەم ڕستە قوڕئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ... ﴾، ئافرەتانێك کە بابتان مارەیان کردوون مارەیان مەکەن، ئەمە عادەتێکی سەردەمی نەفامیی عەڕەبەکان بووە، کە ڕەنگە لە نێو میللەتانی دیکەشدا وابووبێ‌و، پێیان شتێکی ئاسایی بووبێ کوڕ هاوسەری بابی خۆی مارە بکاتەوە، چ ئەگەر تەڵاقی دابووایە، چ ئەگەر بابی وەفاتی کردبووایە، هاوسەری بابی خۆی مارە دەکردەوە، واتە: ئەو ئافرەتەی کە لێی نەبووە، بە کوردیی بە خێزانی باب دەگوترێ: باوەژن، خوای پەروەردگار ئەوەی قەدەغە کرد، چونکە ئەوە هاوسەری بابیەتی، وە ئەو منداڵانەی بابی کە دوایی لەو ئافرەتە دەبن، دەبنە خوشك‌و برای، مانای وایە خۆیشی دایکیەتی، جا دایکی دووەمە، دایکی سێیەمە، لەوبارەوەش چەند فەرمایشتێك گێڕدراونەتەوە:

**یەکەم:** ﴿عَنْ أَبِي أمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: لَمَّا تُوفِي أَبُو قَيْسِ بنِ الأَسْلَتْ أَرَادَ ابْنُهُ أَنْ يَتَزَوَّجَ امْرَأَتَهُ، وَقَدْ كَانَ لَهُمْ ذَلِكَ فِي الجَاهِلِيَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ ... لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ... ﴾﴾، رَوَاهُ النَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (١١٠٩٥)، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ أَبِي حَاتِم)، واتە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێك ئەبو قەیسی کوڕی ئەسلەت

(یەکێك بووە لە هاوەڵانی بەڕێز خوا لە هەموویان ڕازی بێ) وەفاتی کرد، کوڕەکەی ویستی خێزانەکەی مارە بکاتەوە، (کە لە سەردەمی نەفامییدا ئەوەیان بۆ هەبوو) خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بۆتان حەڵاڵ نیە کە بە زۆر ئافرەتان بە میرات بگرن (کە پێشتر باسی ئەوەمان کرد).

**دووەم:** ﴿وَأَخْرَجَ النَّسَائِي، وَابْنُ جَرِير، وَابْنُ أَبِي حَاتِم، وَالطَّبَرَانِيُّ وَالبَيْهَقِيُّ فِي سُنَنِهِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿... وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ...﴾، أنَّهَا نَزَلَتْ لَمَّا أَرَادَ ابْنُ أَبُو قَيْسِ بْنِ الأَسْلَتْ أنْ يَتَزَوَّجَ امْرَأَةَ أبِيهِ بَعْدَ مَوْتِهِ﴾[1]، واتە: نەسائییو ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتیمو تەبەڕانییو بەیهەقیی لە سونەنەکەی خۆیدا دەیگێڕنەوە کە ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ...﴾، لەوبارەوە هاتە خوارێ کە ئەبو قەیسی بەنی ئەسلەت کاتێك بابی مرد، ویستی هاوسەرەکەی بابی مارە بکاتەوە، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە بۆتان نیە هاوسەرەکەی بابتان مارە بکەنەوە.

**سێیەم:** ﴿عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ لَقِيتُ خَالِي وَمَعَهُ الرَّايَةُ، فَقُلْتُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ أَوْ أَقْتُلَهُ وَآخُذَ مَالَهُ﴾، أَخْرَجَهُ أحْمَد برقم: (١٨٥٨٠)، وأبُو دَاوُدَ برقم: (٤٤٥٧)، والنَّسائيُّ برقم: (٣٣٣١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٠٧)، وَالحَاكِم برقم: (٢٧٧٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١١٢)، والدَّارقُطني برقم: (٣٣٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (٢٣٥١)، واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ (یەکێکە لە هاوەڵان) دەڵێ: گەیشتمە خاڵمو ئاڵایەکی پێ بوو، گوتم: بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ منی ناردوە بۆ لای

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٥٦٩)

پیاوێك كە ژنی بابی مارە كردۆتەوە دوای خۆی، فەرمانی پێکردم کە بچم لە گەردنی بدەم، وە ماڵەکەشی لێ بستێنم، (هەرچی ماڵی کە هەیەتی دەستی بەسەردا بگرم، وەك سزایەك لەسەر ئەو گوناهەی کە کردوویەتی، کە دیارە دوای ئەوەی زانیویەتی خوا قەدەغەی کردوە، ئەوەی کردوە).

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، واتە: ئەگەر کەسێك پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ژنی بابی مارە کردبێتەوە، یاخود دوو خوشکی بەیەکەوە کۆکردبنەوە، گوناهی نەگەیوەتێ کاتی خۆی، چونکە نەیزانیوە قەدەغەیە، نەك مەبەست ئەوە بێ مادام نەیزانیوە، ئێستاش بۆی هەبێ ئەم ئافرەتە بهێڵێتەوە، یان ئەو دوو خوشکانە بەیەکەوە بهێڵێتەوە، مەبەست پێی ئەوەنیە بۆ زانیارییتان، لەوبارەوەش ئەم دەقە هەیە: {رَوَى هِشَامُ بْنِ عَبْدِاللَّهِ عَنْ مُحَمَّد بْنِ الحَسَنِ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ يَعْرِفُونَ هَذِهِ المُحَرَّمَاتِ كُلَّهَا الَّتِي ذكرت فِي هَذِهِ الآيَةَ إلاَّ اثنَتَيْنِ؛ إحدَاهُمَا نِكَاح امرأَةِ الأَبِ، وَالثَّانِيَة، الجَمْعُ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ؛ أَلا تَرَى أَنَّهُ قَالَ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، ﴿وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، وَلَمْ يَذكُر فِي سَائِرِ المُحَرَّمَاتِ: ﴿إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾}[1]، واتە: موحەممەدی کوڕی حەسەن (کە قوتابی ئەبو حەنیفەیە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: خەڵکی سەردەمی نەفامیی هەموویان ئەو قەدەغەکراوانەیان دەزانی کە لەم ئایەتەدا هاتوون، (واتە: هێنانی خوشك و دایك و پوورو ... هتد)، جگە لە دووان، یەکەم: مارەکردنی هاوسەری باب، دووەم: پێکەوە کۆکردنەوەی دوو خوشك، بۆیە خوا لە دوای ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾، دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، جگە لەوەی

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (١٠٢).

ڕابـردوو کـە کـاتی خـۆی کردووتـانە، هـەروەها بەنـسبەت کۆکردنــەوەی دوو خوشکیش دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، واتە: لە ڕابردوودا ئەوەتان کردوە، گوناهتـان نەگەیوەتێ، بەڵام بـۆ ئـەوانی دیکـە نەیفەرمووە: ﴿إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَ﴾، چونکە شتی وایانـنەکردوە، کەس نـەبووە کە دایکی خـۆی بێنـێ، خوشـکی خۆی بێنـێ، پـووری خـۆی بێنـێو، پلکی خـۆی بێنێ، ... هتد، شتی وا هەرگیز نەبووە لەنێو عەرەباندا، بەڵام بە دڵنیـایی لـەنێو میللـەتانی دیکـەدا هـەبووە، بـۆ وێنـە: لـەنێو مەجووسـدا ئـەوە هەبووە، بـەڵام خـوای کـاربەجێو زانـاو شـارەزا ئـەم قورئـانو ئیـسلامەی تەنیـا بـۆ عەرەبـان نـەناردوە، تـاکو بگـوترێ: نەدەبووایـە خـوا باسـی ئەوانـەی کردبایـە، چـونکە بۆخۆشـیان دەیـانزانی ئەوانـە قەدەغـەن! نـا ئـەم قورئانـە بـۆ هـەموو بەشـەر هـاتوە تـا دنیـا کۆتـایی دێ، کـە ئـەو کاتـە مەجووسـییەکان جـاری وابـووە کـچی خۆیـانو خوشـکی خۆیان هێنـاوە.

**مەسـەلەی سـێیەم:** خـوا ﷻ کـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقۡتًا وَسَآءَ سَبِيلًا﴾، خوا مارەکردنـەوەی هاوسـەری بـابی، بـە سـێ شـت نـاوزەد کـردوە: (فَاحِشَـة)، (مَقْـتاً)، (سَـآءَ سَبِيلاً)، بۆچـی؟ (إمـام فخرالـدين الـرازي) شیکردنەوە (تحليل)ێکی جوانی بۆ دەکات، دەڵێ:

١- ئـەوە کـە ئینـسان خێزانـی بابـی خـۆی مارەبکـاتەوە، لـە ڕووی عەقڵییـەوە پێـچـەوانەی عەقڵـە، چـونکە بابـت منـداڵی لـەو ئافرەتـە دەبـێو منداڵـەکان خوشـكو بـراتن، بـا تۆشـی لـێ نەبووبـێ، چـۆن دوایـی تـۆ دەچـی مـارەی دەکەیـەوە؟ ئـەوە دیـارە لـەڕووی عەقـڵو فیطـرەتـەوە شـتێکی نـاقۆڵاو خراپە، واتە: (فَاحِشَـة)یـە، چونکە (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَـةُ مَا عَظُمَ قُبْحُـهُ مِـنَ الأَفْعَـالِ وَالأَقْـوَالِ)، واتـە: هـەر سـێ وشـەی: (فُحْشُ، فَحْشَاءُ، فَاحِـشَةُ) هـەر قـسەو کردەوەیەکـە کـە زۆر ناقـۆڵاو ناشـیـرین بـێ لـە ڕووی

عەقڵەوە.

٢- لە ڕووی شەرعییەوە بە (مَقْت) لەقەڵەم دەدرێ، واتە: بوغزێنراو، چونکە خوا ڕقی لێیەتی،

٣- لە ڕووی باو (عرف)یشەوە بە ڕێوڕەسمێکی خراپ (سآء سبيلاً) لەقەڵەم دەدرێ، واتە: پێچەوانەی باو (عرف)و عادەتی چاکی خەڵکە.

**مەسەلەی چوارەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ لە قورئاندا هەمیشە شتە قەدەغەکان سەرژمێر دەکات دوایی دەفەرموێ: غەیری ئەوانەی سەرژمێرم کردوون، بۆتان حەڵاڵن، لە زۆر شتدا وا دەفەرموێ، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ...﴿١٧٣﴾ ﴾، واتە: بێگومان لێتان قەدەغەکراوە: مرداروە بوو، خوێن، گۆشتی بەراز، وە ئەوەی کە بۆ غەیری خوا سەربڕابێ، واتە: ناوی غەیری خوای لێ هاتبێ، یانی: لە گۆشت تەنیا ئەو چوارەتان لێ قەدەغەکراون، غەیری ئەوانە بۆتان ڕەوان، وەك پێشتر لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا باسمان کرد، مەگەر ئەوەی لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتبێ، بەڵێ خوای پەروەردگار لەبەرئەوەی قەدەغەکان سنووردارن، ئەوان سەرژمێریان دەکات و دوایی دەفەرموێ: غەیری ئەوانەی کە باسمکردن ئەوانی دیکە هەموو حەڵاڵن، بۆچی؟ چونکە زانایانی (أصول الفقه) بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێ: (الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ الإِبَاحَةِ) واتە: بناغە لە شتەکاندا بریتیە لە ڕەوایی، هەموو شتێك ڕەوایە جگە لەوەی بە دەقێکی شەرعیی قەدەغەکرابێ، کە دەقی شەرعییش بەس شتێك قەدەغە دەکات کە زیانی هەبێ، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوەی ئەسڵ لە هەموو شتێکدا ڕەوایی یە؟ چونکە خوا ﷻ لە چەندان شوێندا دەفەرموێ: هەرچی هەیە بۆ ئێوەم دروست کردوە، بۆ وێنە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ

جَمِيعًا ... ﴿٢٩﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: خـوا هەرچـی لـەزەوی دایـە بـۆ ئێـوەی دروسـت کردوە، ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾الرّحمن، واتـە: خـوا زەوی دانـاوە بـۆ خـەڵـك، وە دەفـەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ... ﴿٢٠﴾ ﴾لقمان، واتە: ئایا نـابینن کە خوا ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە بۆی دەستەمۆ کردوون، وە نیعمەتـەکانی خۆی بە ئاشکراو بە پەنهانـەوە بەسـەر ئێـوەدا ڕشـتوون، کەواتـە: ئـەم ئایەتانـە ئەوەیان لـێ وەردەگیـرێ کە هـەرچی هەیـە حەڵاڵە، مەگـەر ئـەوەی بـە دەقێـکی شـەرعیی دیـاری کـرابـێ، کـە قەدەغـەیە، بـەڵام دەربـارەی قەدەغەکـان خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ... ﴿١٥١﴾ ﴾الأنعـام، واتـە: بڵـێ: وەرن بـا ئـەوەی کـە پەروەردگـارتان لـێی قەدەغـە کـردوون، بەسـەرتاندا بخوێنمـەوە، دوایـی خـوای زانـاو شـارەزا قەدەغـەکراوەکان بـاس دەکـات، مانـای وایـە غـەیری ئەوانـەی دەخوێنـرێنەوە، حەڵاڵـن، وە لـە سـوورەتی (الـمائدة) دەفـەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ...﴿٣﴾ ﴾، کـە ئەوانـەش هـەموویان دەچـنەوە نێـو ئـەو چـوارانە، بـەڵام چـەند جۆرێـك لـە مردارەوە بـوو بـاس دەکات، ئـەوەی لـە شـاخ کەوتبێتـە خـوار، ئـەوەی بـە لێـدان کوژرابـێ، ئەوەی خنکێنرابـێ، وە ئـەوەی دڕنـدە خواردبێتـیو ... هتـد، لێرەشـدا خـوا ﷻ وەك پێـشتـر باسـمان کـرد، پـازدە جـۆرە ئـافرەت بـاس دەکـاتو دەفەرموێ: ئەوانەتـان لـێ قەدەغـەن، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ ﴾، جگـە لەوانـەتان بـۆ حەڵاڵـە، دیـارە ئەمـەش ئـەوە دەگـەیەنـێ کـە

ئێمە پێویستە لەخۆڕا شت قەدەغە نەکەین، چونکە خوای میهرەبان زۆری پێناخۆشە خەڵك لەخۆڕا شت قەدەغە بکات، بۆیە لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٨٧)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئەو شتە بە سوودو خۆشانەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، قەدەغەیان مەکەن، وە سنوور شکێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوور شکێنانی خۆشناوێن، ئنجا بۆ زانیارییتان خوا زۆری پێناخۆشە بە ناوی دینەوە بڵێی فلانە شت قەدەغەیە، واشنەبێ، بۆیە پێشەوایانی ئێمە ئەگەر شتێك دڵیان لێ نەبووبێتو بە خراپیان زانیبێت، یەکسەر نەیانگوتوە: فلان شتە حەرامە، بەڵکو گوتوویانە: (أَكْرَهُ ذَلِكَ) من ئەوەم پێ چاك نیە، (ئیمام مالیك) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، زۆر بە کەمیی گوتوویەتی: ئەوە حەرامە، بەس گوتوویەتی: من ئەوەم پێناخۆشە، حەزی لێ ناکەم، بەس نەیگوتوە حەرامە، بۆچی؟ چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾النحل، واتە: (ئەی موشریکەکان) وە بەوە کە زمانتان بە درۆ وەسفی دەکات لەخۆڕا مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، مەبەستم ئەوەیە خوا ﷻ زۆری پێ ناخۆشە بە ناوی دینەوە شت لە خەڵك قەدەغە بکرێ، چونکە سەرەنجام خەڵك تەنگی پێ هەڵدەچنرێو دەکەوێتە سەغڵەتییەوە، کە ئەوەش پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای بە بەزەیی ویستوویەتی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ...﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆ ئێوە دەوێو زەحمەتی بۆتان ناوێ، هەروەها خوای بەخشندە لە دیندا شتێکی دانەناوە ئێمە سەغڵەت بکات،

وەك دەفـــــــەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ...﴿٦﴾﴾ المائـدة، واتـە: وە خـوا نایـەوێ تووشـی سـەغڵـەتیی‌و نارەحەتیتـان بکـات لـە دینداریيدا، بەڵام ئەگەرهاتو بـەبێ زانیـاریی‌و شـارەزایی هـەر لـەخۆڕا بگـوترێ: ئـەوە قەدەغەیـە، ئـەوەش قەدەغەیـە ... هتـد، وە دەوری خەڵکـت بـە قەدەغەکراوەکان تەنی، ئنجـا ئەگـەر ئـەو قەدەغەکردنـەش بـە پێـی بەڵـگەی شەرعیی نەبێ، پێچەوانەی سروشـت‌و فیطـرەت‌و عەقڵی خەڵـکی دەبـێ، بۆیـە سەرەنجـام خەڵـك ئـەو قەدەغـانە هـەموو دەشـكێنێ، چونكـە ئـەوە لەگـەڵ واقیعـی ژیانیـاندا ناگونجـێ.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** دەربـارەی ئافرەتـانی قەدەغـەكراو كـە لـەو ئایەتانـەدا پـازدە جـۆرن، پێـشـتریش باسـمان كـرد، بـەڵام سـەرژمێریان دەكەینـەوە، چـونكە هەندێكیان هی دیكەشیان پـێ دەزانـرێن:

١/ بـاوە ژن، ژنی بـاب (زوجـة الأب).

٢/ دایك ﴿أُمَّهَٰتُكُمْ﴾ كە دایكی دایـك (نەنـك)یـش دەگرێتـەوە، بەڵـكو هـەتا سەرێ دەڕوا هـەمووی دەگرێتـەوە.

٣/ کـچ ﴿وَبَنَاتُكُمْ﴾، کـە کـچی کـچ‌و کـچی کـوڕیش دەگرێتــەوە، واتــە: نەوەش دەگرێتـەوە.

٤/ خوشـك ﴿وَأَخَوَٰتُكُمْ﴾، جـا ئـەو خوشـكە خوشـكی بـابیی بـێ، یـاخود خوشـكی دایكی بـێ، یاخود لە بابـی‌و دایكـی بـێ.

٥/ پـوور ﴿وَعَمَّٰتُكُمْ﴾، واتـە: خوشـكی بـاب.

٦/ پلـك ﴿وَخَٰلَٰتُكُمْ﴾، واتـە: خوشكی دایـك.

٧/ كچی بـرا ﴿وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ﴾، بـرازا، كچـە بـرازاو .. هتـد.

٨/ كچی خوشـك ﴿وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ﴾، خوشـكەزا، خوشـكەزازاو .. هتـد.

٩/ دایکی شیریی ﴿ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ ﴾، ئەویش دیارە تەفصیلاتێکی هەیە، ئایا بەیەکجار دەبێتە دایکی شیریی، یان سێ جار، یان پێنج جار ؟ وە ئایا ئەو سێ جارو پێنج جارە دەبێ بە تێریی لێ بخوا، یان چۆنە ؟ دوایی باسی دەکەین.

١٠/ خوشکی شیریی ﴿ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ ﴾.

١١/ خەسوو ﴿ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ ﴾، دایکی ژن.

١٢/ کچی پەروەردەکراوی ژنێك کە مێردی چووبێتە لای ﴿ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ ﴾، باسمان کرد کە کەسێك ئافرەتێکی خواستوە، وە چۆتە لاشی، کچەکەی لێ قەدەغە دەبێ، بەڵام ئەگەر هەر مارەی بکاو نەچێتە لای، ئەوکاتە کچەکەی لێ قەدەغە نابێ.

١٣/ هاوسەری کوڕێك کە لە پشتی خۆی بێ، ﴿ وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ ﴾، واتە: کوڕێك کە لە پشتی خۆتە، بۆچی خوا ئەو قەیدەی خستۆتە سەرێ ؟ چونکە ئەوان جاری وابوو کوڕی خەڵکی دیکەیان دەکردە کوڕی خۆیان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر، زەیدی کردبووە کوڕی خۆیو (مُتَبَنَّی)ی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، واتە: بە کوڕکراو بوو، کە دیارە هاوسەری کوڕێك کە بەکوڕ کراوە، قەدەغە نیە.

١٤/ کۆکردنەوەی دوو خوشك لە یەك کاتدا ﴿ وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ ﴾.

١٥/ ژنی هاوسەردار ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ﴾، ئافرەتێك کە مێردی هەبێ، دیارە کە نابێ هەتا لە ژێر نیکاحی مێردەکەی دابێ، حەڵاڵ نیە مارە بکرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** پێویستە لێرەدا چەند شتێك بزانین:

١) پێغەمبەری خوا ﷺ وێڕای ئەو جۆرە ئافرەتانەی باسکران، نەهی کردوە کە (عمة)و (خالة)، واتە: خوشکی باب و خوشکی دایکی ئافرەتێك کە هێناوتە، کە لەگەڵی کۆبکرێتەوە، ئەگەر خێزانەکەت تەڵاقدا دروستە پوورەکەی بێنی خوشکی بابی، یان خوشکی دایکی، بەڵام هەتا ئەوت هەبێ، دروست نیە، بەپێی ئەم فەرمایشتە:﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلاَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٥١٠٩)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٣٤٢٥)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (٣٢٨٨)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ ئافرەت بەسەر خوشکی بابی، یان بەسەر خوشکی دایکی بهێنرێ.

٢) هەرچی بە نەسەب قەدەغەبێ، بە شیریش قەدەغەیە، واتە: کەسێك کە شیر لە ئافرەتێك دەخوا، ئافرەتەکە دەبێتە دایکی و کچەکانی دەبنە خوشکی، کوڕەکانی دەبنە برای، دایکی ئافرەتەکە دەبێتە نەنکی، وە هەروەها.

٣) زۆربەی زانایان دەڵێن: هەرکەسێك کچێکی مارە کرد، تەنیا بە مارەکردنی دایکی لێ قەدەغە دەبێ، بەڵام ئەگەر دایکی مارەکرد تەنیا کاتێك کچەکەی لێ قەدەغە دەبێ کە بچێتە لای دایکی، واتە: ئافرەتێکت مارە کردوە هەتا نەچیە لای، کچەکەیت لێ قەدەغە نیە، بەڵام کە کچەکەیت مارەکرد، با نەچیە لایشی، دایکەکەیت لێ قەدەغە دەبێ[1].

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم﴾، ئەو کچانەی کە لە باوەشتان دان، واتە: لەژێر سەرپەرشتیی

---

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٩٠).

ئێوەدا پەروەردە بوون، زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە حەتمەن دەبێ ئەو کچە لە ماڵی وی پەروەردە بووبێ، ئەوجار بگوترێ (ربیبة) بەڵکو بە زۆری وابووە کەسێك بێوەژنێکی مارە کردۆتەوە، منداڵەکانیشی لەگەڵ هێناوە بۆ ماڵی خۆیان، ئەگەرنا ئەگەر لە شوێنێکی دیکەش پەروەردە بووبێ، ئەو کچە هەر پێی دەگوترێ: (ربیبة)، وە ئەگەر زۆربن پێیان دەگوترێ: (ربائب) چ کوڕبن، چ کچ بن[1].

**مەسەلەی هەشتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، ئەم (و)وە، زانایان دەڵێن: (و)ی (عَطْف)ە، واتە: ئەمەش دەخاتە پاڵ ئەوانی پێشێ، ئەوانی پێشێ چواردە جۆرە ئافرەت بوون کە خوای پەروەردگار باسی کردوون، کە قەدەغەن لە پیاوان هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، چ بە شێوەی هەمیشەیی وەك دایك و پوورو ئەوانە...هتد، چ بە شێوەی کاتیی، وەك کۆکردنەوەی دوو خوشك، ئنجا: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾، جۆری پازدەمینەو ئەویش لەو ئافرەتانەیە کە قەدەغەن، جا لێرەدا (مُحْصَنَات) لە هەموو قورئاندا دوو قیرائەتی هەیە، دەگونجێ بخوێنرێتەوە (مُحْصَنَات) کە لەم حاڵەتەدا وەك (إسم مفعول) دەبێ، واتە: پارێزراوان، یاخود بە هاوسەرگیراوان، ئافرەتانێك کە بە هاوسەرگیراون، شوویان کردوە، یان بە مانای ئافرەتانی ئازاد دێ، یان بە مانای ئافرەتانی مسوڵمان.

وە خوێنراویشتەوە (مُحْصِنَات)، واتە: ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن، جا بە هۆی ئیمانو ئیسلامەوەبێ، بە هۆی شووکردنەوە بێ، بەهۆی ئەوە بێ کە عیففەت لە خۆیاندا دێننەدی، یان بە هۆی ئازادیانەوە بێ، واتە: ئەم وشەیە هەم بە (مُحْصَنَات)و هەم بە (مُحْصِنَات) خوێنراوەتەوە، تەنها

١) محاسن التـأويل، ج: (٥)، ص: (٩١).

لێرەدا نەبێ، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەبێ بخوێنرێتەوە، (والمُحْصَنَات) بۆچی؟ چونکە لێرەدا بە مانای ئافرەتانێکی خاوەن مێردە، واتە: ئافرەتانی خاوەن مێردتان لێ قەدەغەیە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، ئەوە دیارە کە شتێکی ئاشکرایە، ئەگەرنا لە ئەسڵ دا خۆی ئەم وشەیە بە هەردوو قیرائەتی (مُحْصَنَات)و (مُحْصِنَات) دەخوێنرێتەوە، ئنجا بە مانای ئافرەتانێك كە بە هاوسەرگیراون (مُتَزَوِّجَات) دێ، وە بە مانای ئافرەتانێکی پاكو پاكداوێن (عَفِيفَات) دێ، وە بە مانای ئافرەتانی ئازاد (حَرَائِر) دێ، وە بە مانای ئافرەتانی مسوڵمان (مُسْلِمَات)یش دێ.

ئنجا ئەگەر بە هاوسەرداران (مُتَزَوِّجَات) لێكبدرێتەوە، ئەوە وشەی: ﴿مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، ماناكەی ئاوای لێدێتەوە: ئەو ئافرەتانەی ئێوە بوون بە خاوەنیانو ئەوان بوونە کەنیزەکتان، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو ژنانەیە کە هاوسەرەکانیان کافرنو لە شەڕی مسوڵماناندا بە دیل دەگیرێنو دەکرێن بە کەنیزەك، کە کاتی خۆی بنچینەیەکی گشتی بووە، وەك دوایی لە دەرسێکی تایبەتدا باسی کۆیلە دەکەین.

وە ئەگەر بە داوێنپاکان (عَفِيفَات)، یان بە ئازادان (حَرَائِر)، یان بە مسوڵمانان (مُسْلِمَات) لێكبدرێتەوە، ئەو کاتە دەڵێین: مەبەست لە وشەی: ﴿مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، واتە: ئێوە بوون بە خاوەنیانو مێردیان، بە هۆی گرێبەستی هاوسەرێتی یەوە.

واتە: ئافرەتانی: پاك، ئازاد، مسوڵمان، لە ئێوە قەدەغەن جگە لەوانەی کە بە هۆی گرێبەستی هاوسەرگیرییەوەو، دەبنە مێردیان و خاوەنیان.

**مەسەلەی نۆیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾، واتە: لە پشت ئەوانەوە هەموو ئافرەتانتان بۆ حەڵاڵ کراون کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، شەرعزانان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە ئەمە چەند

حاڵەتێکی لێ هەڵداوێردرێن، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: جگە لەوانە ئافرەتانی دیکەتان بۆ حەڵاڵن کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی دەقی دیکەمان هەن، چەند جۆرێك هەڵاواردن لەم حوکمەدا دەبن:

١/ کەسێك کە چوار هاوسەری هەبن، پێنجەمی بۆ حەڵاڵ نیە، لە ئەسڵدا بۆی حەڵاڵە، بەڵام لەبەرئەوەی چواری هەن، ئەوەی پێنجەمی بۆ حەڵاڵ نیە، هەرچەندە لەو پازدەیەش نیە کە خوای کاربەجێ قەدەغەی کردوون.

٢/ ئافرەتێك کە لە عیددە دابێ، هەتا عیددەی تەواو نەبێ، کەس بۆی نیە داخوازیی بکاو مارەی بکات.

٣/ ئافرەتی (مُلاعِنَة) کە لە سوورەتی (النور)دا خوای بەرزو مەزن باسی کردوە، ئەویش ئەوەیە کاتێك پیاو هاوسەری خۆی تۆمەتبار دەکات بەوەی کە داوێن پیسیی کردوە، ژنەکەش تۆمەتەکە ڕەت دەکاتەوە، وە پیاوەکەش شایەدی نیە، شەریعەت (مُلاعَنَة)ی داناوە، واتە: نەفرین لە یەکدی بکەن، هەرکامێکیان نەفرین لە خۆی بکات و بڵێ، ئەگەر درۆ بکەم، نەفرینم لێ بێ، ئنجا دوای ئەوەی ژن و مێرد نەفرینیان بەیەکەوە کرد، لێك جیادەبنەوە، وە تا کۆتایی لە یەکدی قەدەغە دەبن و، جارێکی دی دروست نیە پێکەوە هاوسەرگیریی بکەن.

٤/ هەروەها کۆکردنەوەی ئافرەت لەگەڵ خوشکیدا لە یەك کاتدا، وە کۆکردنەوەی ئافرەت لەگەڵ خوشکی بابیدا (پوور)، یان لەگەڵ خوشکی دایکی (پلك)، ئەویش دیسان دروست نیە.

٥/ هەروەها بۆ کەسێك کە توانای هێنانی ئافرەتی ئازادی هەبێ، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئافرەتی کەنیزەکی بۆ نیە، کە دیارە ئەوە بۆ کاتی خۆی بووە، ئێستا کەنیزەك نەماون، کە وەك گوتم دوایی زیاتر ئەوە مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە.

**مەسەلەی دەیەم:** خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ﴾، واتە: ئەوانەی کە لێیان بەهرەمەند بوون، ئەوە ئافرەتانەی لەزەتتان لێ وەرگرتوون، واتە: سەرجێییتانکردن، پاداشتەکانیان بدەنەوە، پێویستە لەسەرتان، پاداشت واتە: مارەیی، ئەوە ڕاستە مانای ئەم ڕستە قورئانییەیە، بەڵام توێژەروانی قورئان بۆتە مشتومڕیان کە ئایا ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە نیکاحی موتعەی حەڵاڵ کردبێ، بەڵام دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوننەتدا ڕایگەیاندبێ کە هەڵوەشێنراوەتەوە؟ وە ئایا ئەم ئایەتە باسی نیکاحی موتعە دەکات؟ وە ئایا نەسخکەرەوەی ئەو حوکمە چییە؟ ئایا سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، یاخود ئایەتێکی دیکەیە؟!

## لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی نیکاحی کاتیی (النكاح المؤقت)ەوە:

وەك پێشتر گوتمان: مانای ڕواڵەتی ئایەتەکە هیچ پەیوەندیی بە نیکاحی (موتعە)وە نییە، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ﴾، ئەو ئافرەتانەی کە لێیان بەهرەمەند بوون، واتە: چوونە لایانو لەگەڵیان جووتبوون، ئەوە پێویستە لەسەرتان دیاریی و پاداشتەکانیان بدەنێ، (أجُور) کۆی (أَجْر)ە، (أَجْر) لێرەدا مەبەست پێی مارەیی و دیاریی و خەڵاتێکە لەلایەن پیاوەوە دەدرێ بە ئافرەت، شایانی باسیشە کە زاناو توێژەروانی قورئان لەبارەی ماناو چەمکی ئەم ڕستە قورئانییەوە، بەگشتی دوو ڕایان هەن:

**ڕای یەکەم:** مەبەست پێی هاوسەرگیریی ئاسایی و بەردەوامە: وەك (الشوكاني) لەوبارەوە گوتوویەتی: {قَالَ الحَسَن وَمُجَاهِد وَغيرهُمَا: الْمَعنَى: فَمَا انتَفَعْتُمْ وَتَلَذذتُم بالجِمَاعِ مِنَ النِّسَاءِ بِالنِّكَاحِ الشَّرعِيّ

﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، أَي مُهُورهُنَّ}[(١)]، واتە: حەسەنی بەسرایی‌و موجاهیدو غەیری ئەوان دەڵێن: واتە: ئەو ئافرەتانەی کە لێیان بەهرەمەند دەبن‌و لەزەتتان لێوەرگرتوون بە سەرجێی لەگەڵکردنیان، دوای ئەوەی بە نیکاحی شەرعیی بوونە هاوسەرتان، ئەوە مارەییەکانیان بدەنێ، ئەمە رایەك، کە من ئەم رایەم پێ پەسەندەو دوایی خۆشم بەڵگەی لەسەر دێنمەوە.

**رای دووەم**: مەبەست پێی هاوسەرگیریی کاتیی یە، کە بە (نیکاحی موتعە) ناسراوە: وەك (الشوکاني) گوتوویەتی: {وَقَالَ الجُمهُور: إنَّ الـمُرَادَ بِهَـذِهِ الآيَةَ نِكَاحُ الـمُتْعَةِ الَّذِي كَانَ فِي صَدْرِ الإِسلاَمِ وَيؤَيِّدُ ذَلِكَ قِرَاءَةُ أُبَي بْنِ كَعْبٍ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، وَسَعِيد بْنِ جُبَيرٍ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ إِلى أَجَلِ مُسَمَّى ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾}[(٢)]، واتە: وە زۆربەی توێژەروانی قورئان دەڵێن: مەبەست لەم ئایەتە نیکاحی موتعەیە (واتە: هاوسەرگیریی کاتیی) کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلام (واتە: لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام لە مەدینەدا) ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە هەبووە، وە ئەوەی پشتگیریی ئەم رایەش دەکات، کە ئەو رستە قورئانییە ئەوە دەگەیەنێ، ئەوەیە کە هەر کام لە ئوبەی کوڕی کەعب‌و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیر خوا لێیان رازی بێ، ئەم رستە قورئانییەیان خوێندۆتەوەو وشەیەکیان بۆ زیادکردوە {فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ إِلى أَجَلِ مُسَمَّى}، هەر کامێك لەو ئافرەتانە لەززەتێکتان لێ وەرگرتن بۆ کاتێکی دیاریکراو مارەییەکانیان پێ بدەن، هەڵبەتە قیرائەتی ئەو سێ زانایانە مانای وانیە ئەوە بەشێکە لە قورئان، بەڵکو ئەوە تەفسیری خۆیان بووە، ڕەگەڵ ئایەتەکەیان خستوە، ئەگەرنا ئەگەر

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (٥)، ص: (٥٧٧).

٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگو لاپەڕە.

ئایەتێکی موتەواتیر بووایە بە بەشێك لە قورئان دادەنرا، کە بە دڵنیاییش وانیە، بەڵکو ئەوە هەر جۆرە لێکدانەوەیەکی خۆیان بووە بۆ ئایەتەکە.

ئنجا ئێمە دەڵێین: ئەگەر گریمان واشبێ، یانی هاوسەرگیریی کاتیی (الزواج المؤقت) لە سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامییدا ڕەواش بووبێ، کە دیارە هەر بووە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام هیچ شەیەك لەو ئایەتەدا نیە کە ناچارمان بکات بڵێین: ئەو ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، بەڵێ کاتی خۆی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە هەبووە، بەڵام نەك بە هۆی ئەم ئایەتەوە، ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیی بەوەوە نیە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتی خۆی بۆی ڕەوا کردوون، وەك چۆن ڕووکردنە (بیت المقدس) لە هیچ ئایەتێکدا نیە، خوا نەیفەرمووە: ڕوو لە (بیت المقدس) بکەن، بەڵام خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندوە ڕوو لە (بیت المقدس) بکە، دوایی ئایەت هەیە دەفەرموێ: ڕوو وەرسووڕێنە بەرەو کەعبە، بەڵام هیچ ئایەتێك نیە بفەرموێ: ڕوو بکە (بیت المقدس)، ئەوە هەر بە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بووە، ئەمەش بە هەمان شێوە، نیکاحی موتعە تەنیا لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ڕەواکراوە، بەڵام ئەم ڕستەیەی قورئان ئەوەی لێ وەرناگیرێ و، هیچ شەیەکی تێدا نیە ناچارمان بکات بڵێین: مەبەستی ئەوەیە.

ئنجا هەر چۆن بێت دەپرسین: ئایا نەسخکەرەوە (ناسخ)ی ئەم جۆرە نیکاحە چییە، چ شتێك ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەی نەسخ کردۆتەوەو حوکمەکەی نەهێشتوە؟

کە دیارە نەسخکرانەوەی نیکاحی کاتیی (النكاح المؤقت)کە بە نیکاحی ڕابواردن (نكاح المتعة) ناسراوە، هەموو زانایان لەسەری یەك دەنگن، بێجگە لە شیعە، زانایانی شیعە دەڵێن: نەخێر، ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە ئێستاش هەیە، ئەگەرنا زانایانی ئۆممەت هەموو دەڵێن: بەڵێ ئەوە بووەو کاتی خۆی بە شێوەیەکی کاتیی بۆ کاتێکی دیاریکراو بووەو لە ماوەیەکی دیاریکراوی دەوڵەتی ئیسلامییدا بووە، بەڵام دوایی هەڵوەشێندراوەتەوە، جا

ئایا هەڵوەشێنەرەوە (ناسخ)ی ئەو حوكمە چییە؟ (الشوكاني) لەوبارەوە گوتوویەتی: {وَقَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْر : نَسَخَتْهَا آياتُ المِيرَاثِ إذِ المُتْعَةُ لاَ مِيرَاثَ فِيْهَا، وَقَالَتَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَالقَاسِمُ بْنُ مُحَمَّدٍ: تَحْرِيْمُهَا وَنَسْخَهَا فِي القُرْآن وَذَلِكَ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ ﴾، المؤمنون، والمعارج آية (٢٩، ٣٠)، وَلَيْسَتِ المَنْكُوحَةُ بِالمُتْعَةِ مِنْ أَزْوَاجِهِم وَلاَ مِمَّا مَلَكَت أَيْمَانهُم فَإنَّ مِنْ شَأن الزَوْجَةِ أَن تَرِثَ وَتُورِثَ وَلَيْسَتِ المُسْتَمْتَعُ بِهَا كَذَلِكَ}[1]، واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێ: ئەوەی حوكمی ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی هەڵوەشاندۆتەوە، ئایەتی میراتە، چونكە نیكاحی موتعە میراتی تێدانیە (واتە: پیاوێك بە نیكاحی موتعە ئافرەتێك مارە بكات، نە پیاوەكە میرات لە ژنەكە دەگرێو نە ژنەكە میرات لە پیاوەكە دەگرێ، كەواتە: كە ئایەتی میرات هاتۆتە خوارێ، وە باسی میرات لە یەكدی گرتنی ژنو مێردانی كردوە، مانای وایە ئەوانەی كە میرات لە یەك نەگرن ژنو مێرد نین) كەواتە: ئەو نیكاحە هەڵوەشاوەتەوە، عائیشەش خوا لێی ڕازی بێ، وە قاسمی كوڕی موحەممەد (كوڕی ئەبو بەكری صیددیق، واتە: نەوەی ئەبو بەكری صیددیق خوا لێیان ڕازی بێ، كە دەكاتە برازای عائیشە) هەردووكیان دەڵێن: قەدەغەكردنی ئەو جۆرە نیكاحە، وە هەڵوەشاندنەوەی هەر لە قورئاندایە، ئەویش ئەوەیە كە خوا دەفەرموێ ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ ﴾، المؤمنون، والمعارج آية (٢٩، ٣٠)، واتە: ئەوانەی كە پارێزەری داوێنی خۆیانن، جگە لە بەرانبەر هاوسەرانیان، یاخود ئەو كەنیزەكانەی كە خاوەنیانن، لەوەدا لۆمەیان ناكرێ، جا دەڵێن: مەنكووحە بە (موتعە)، واتە: ئافرەتێك كە بە موتعە دەهێنرێ، لە هاوسەرانیان نیە، هەروەها لە كەنیزەكانیشیان نیەو بە

١) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

هاوسەر لەقەڵەم نادرێ، چونکە ژن میرات دەگرێو میراتی لێ دەگیرێ، بەڵام ئافرەتێك كە بە موتعە دەهێنرێ، نە میرات دەگرێو نە میراتی لێ دەگیرێ، وە دیارە کەنیزەکیش نیە.

ئنجا شایانی باسە لەبارەی نیکاحی (موتعە)وە، لەنێو زانایانی ئیسلامدا لە کۆنداو ئێستاش، مشتومڕی زۆر هەیە، وەك باسمکرد هەموو زانایان لەسەر ئەوەن کە بەڵێ ئەم جۆرە نیکاحە بووە، بەڵام دوایی هەڵوەشێنراوەتەوە، جگە لە زانایانی شیعە (شیعەی دوازدە ئیمامیی) کە دەڵێن: ئێستاش ئەم جۆرە نیکاحە هەر ڕەوایە. دیارە لەسەر ئەوەش کە ئەو جۆرە نیکاحە هەڵوەشێنراوەتەوە، فەرمایشتی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەرمان زۆرن، بۆ وێنە:

**فەرموودەی یەکەم:** ﴿عَنْ عَلِيّ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ﴾، أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (١١٢٩)، وَأَحْمَد برقم: (٥٩٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥١١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٤٢٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٢١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٣٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٤٣) واتە: عەلی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نیکاحی موتعەی قەدەغەکرد، هەروەها گۆشتی کەریماڵی (گوێدرێژ)ی قەدەغەکرد لە ڕۆژی خەیبەردا، (واتە: لە جەنگی خەیبەردا).

**فەرموودەی دووەم:** ﴿عَنْ سَبرَةَ بْن مَعْبَد الْجُهَنِيّ ﵁ عَن النَّبِي ﷺ، أنَّهُ قَالَ يَوْمَ فَتح مَكّة: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الإِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ، وَإِنَّ اللّه قَدْ حَرَّمَ ذَلِك إلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ، وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٣٨٧)، مُسْلِمٌ برقم: (٣٤٠٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٦٢)، واتە: سەبرەی کوڕی مەعبەدی جوهەنیی خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! من مۆڵەتم دابوو کە بە شێوەی کاتیی بەهرە لە ئافرەتان وەربگرن، (واتە:

مارەیان بکەن بە شێوەی کاتیی)، بەڵام خوا ئەوەی قەدەغە کردوە تا ڕۆژی دوایی، بۆیە هەر کەسێك لە ئێوە یەکێك لەو ئافرەتانەی لەلایە، با دەستبەرداری بێ، وە ئەوەی کە پێتان داون وەکو مارەیی، بۆ مارەکردنێکی کاتیی، لێیان وەرمەگرنەوە.

ئنجا ئایا بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەتا ئاوا نەسخ نەبۆتەوە ئەو جۆرە نیکاحە ڕەوا بووە چییە؟ بەڵگە لەوبارەوەش زۆرن، بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە دێنینەوە:

**فەرموودەی سێیەم:** ﴿عَبْدَ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَيْسَ لَنَا نِسَاءٌ، فَقُلْنَا: أَلاَ نَسْتَخْصِي؟ فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، ثُمَّ رَخَّصَ لَنَا أَنْ نَنْكِحَ الْمَرْأَةَ بِالثَّوْبِ إِلَى أَجَلٍ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٥٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٦١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٣٩٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤١٤١)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەنگ دەچووین (جەنگمان دەکرد لەگەڵ کافران‌و موشریکانێك کە چاویان لە دەستدرێژیی بوو) وە ژنمان نەبوو (واتە: ژنمان پێنەبوون لەو جەنگانەدا، جاری وابووە چەند مانگێکیان پێچووە) بە پێغەمبەری خوا ﷺمان گوت: ئایا خۆمان نەخەسێنین؟ (دیارە ئارەزووی جینسییان هەبووە، بۆ ئەوەی یەکجاریی ئارەزووی خۆیان ببڕن)، پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردین، دوایی مۆڵەتی داین کە ئافرەت بێنین بە پۆشاکێك کە پێی دەدەین، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، (یان بە ئەندازەیەك پارە یان بە کەلوپەلێك)، کەواتە: کاتی خۆی ئەو جۆرە نیکاحە حەڵاڵ بووە.

هەروەها (ابْنُ العَرَبِي) لە کتێبی (أحكَامُ القرآن)دا، کە (قُرطُبِي)یش هەمان دەقی هێناوە لە (جامع لأحكَام)دا، دەڵێ: (وَأَمَّا مُتْعَةُ النِّسَاءِ فَهِيَ مِنْ غَرَائِبِ الشَّرِيعَةِ؛ لِأَنَّهَا أُبِيحَتْ فِي صَدْرِ الإِسْلامِ، ثُمَّ حُرِّمَتْ يَوْمَ خَيْبَرَ،

ثُمَّ أُبِيحَتْ فِي غَزْوَةِ أَوْطَاسٍ، ثُمَّ حُرِّمَتْ بَعْدَ ذَلِكَ، وَاسْتَقَرَّ الأَمْرُ عَلَى التَّحْرِيمِ)[1]، واتە: هێنانی ئافرەت بە شێوەی کاتیی لە شتە سەیرەکانی شەریعەتە، چونکە: لە سەرەتای ئیسلامدا ڕەوا کرا، پاشان لە جەنگی خەیبەردا قەدەغە کرا، دوایی لە جەنگی (ئەوطاس)دا ڕەوا کرایەوە، بەڵام دوایی ئەوە بە یەکجاریی قەدەغە کرا (واتە: لە فەتحی مەککەدا) وە حوکمەکەی لەسەر قەدەغە بوون ڕاوەستا.

## ڕای خۆم لەبارەی نیکاحی موتعەوە:

ڕای خۆم دەربارەی هاوسەرگیریی کاتیی (النِّكَاحُ الـمُؤَقت) کە (نكَاحُ الـمُتْعَة)یشی پێ دەڵێن، لە چەند خاڵێکدا دەخەمەڕوو:

یەکەم: ئایەتەکە هیچ پەیوەندیی بە نیکاحی (موتعە)وە نیە، وە هیچ وشەیەکیشی تێدانیە - وەك پێشتر گوتم - کە ئێمە ناچار بکات بڵێین: مەبەست پێی ئەوەیە، وە سیاقی ئایەتەکانیش ئەوە ناگەیەنێ، ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین زۆر جوان ئەوە دیارە، بابزانین چۆن؟ خوای کاربەجێ دوای ئەوەی ئافرەتانی قەدەغە کە هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکرێ کە پازدە جۆرن، خستنیە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ﴾، جیا لەو ئافرەتانەی کە بۆتان باسکران، بۆتان حەڵاڵن، ﴿أَن تَبْتَغُواْ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾، بە ماڵو سامانی خۆتان هەوڵبدەن ئافرەتان بخوازن، خۆتان بپارێزن لە زیناو، داوێن پیسیی مەکەن، ﴿فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً﴾، جا هەرکام لەو ئافرەتانەی کە هێناوتانو هاوسەرگیرییتان لەگەڵ کردوون، لەگەڵتان ڕابواردنو لەزەتتان لێ وەرگرتن، ئەوە مارەییەکانیان پێ بدەن لەسەرتان پێویستە، کەواتە: هیچ

---

١) أحكام القرآن، ج: (١)، ص: (٤٩٩)، الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (١٣).

پەیوەندیی نیە بە نیكاحی (موتعە)وە، بەڵام واپێدەچێ هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، دوای ئەوەی وشەی (نكاح المُتعة) چۆتە سەر زاران، وە پاشان پارەدان بە ئافرەتێك كە بە شێوەی كاتیی مارەكراوە ئەوەش كەوتۆتە سەر زاران، كە وشەی: (أجر)ی بۆ بەكارهێنراوە، ئەمە وایكردوە كە هەندێك لە توێژەرەوان پێیان وابێ كە مادام لە ڕستە قورئانییەكەدا وشەی: ﴿ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ ﴾، هاتووە، وشەی: ﴿ أُجُورَهُنَّ ﴾، هاتوە، كەواتە: مەبەست پێی نیكاحی موتعەیە، بەڵام لەڕاستییدا ئەم بۆچوونە ڕاست نیە، لەبەرئەوەی وشەی: (تَمَتُّعْ)و (اسْتِمْتَاع) لە قورئاندا مانایەكی گشتی هەیە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی ژمارە (١٢٨)دا خوای پەروەردگار كە بانگی مرۆڤو جند دەكات، دوایی ئەوانیش دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٍ ... ﴿١٢٨﴾ ﴾الأنعام، واتە: پەروەردگارمان! هەندێكمان بەهرەمان لە هەندێكمان وەرگرتوە، واتە: هەندێكمان سوودمان لە هەندێكمان وەرگرتوە.

وە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأحقاف) لە ئایەتی (٢٠)دا باسی كافرەكان دەكات لە قیامەتدا كە پێیان دەفەرموێ: ﴿ ... أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا ... ﴾، واتە: خۆشییەكانی خۆتان لە دنیادا تێپەڕاند، وە لەزەتتان لە خۆشییەكانتان وەرگرت، لە رزقو ڕۆزییە خۆشەكان.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٦٩)دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْ ... ﴿٦٩﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەوانی پێش ئێوە لەززەتیان لە بەشی دنیای خۆیان وەرگرت، ئێوەش

لەززەتتان لە بەشی دنیای خۆتان وەرگرت، وەك چۆن ئەوان بەهرەمەند بوون لە خۆشییەکانی ژیانی دنیا.

بە نسبەت (أجُور)یش کە بە مانای (مهُور) دێ، لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٥)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ... ﴾، لێرەدا (أجُورَهُنَّ)، واتە: (مهُورَهُنَّ)، کەواتە: بەس ئەو ئایەتەی کە باسی (اسْتِمْتَاع)ی تێدا کراوە، مارەیی ئافرەتانی بە (أجْر)و (أجُور) نەهێناوە، بەڵکو لە ئایەتی (٥)ی سوورەتی (المائدة)دا کە باسی هێنانی ئافرەتانی ئیماندارو ئافرەتانی ئەهلی کیتاب دەکاتو بە نیکاحی هەمیشەیی (دائمی)یش، لەوێشدا بۆ مارەییەکەیان وشەی: (أجُور)ی بەکارهێناوە.

دووەم: دەڵێین: نکووڵیی لەوە ناکەین کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی بە نیکاحی موتعە داوە، چونکە ئەوە لە چەندان دەقی ڕاست (صحیح)دا هاتوە، کە پێشتر ئاماژەمان بە هەندێکیان دا، وە ئەوە نابێ نکووڵیی لێ بکرێ، کە لە سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامیی‌و کۆمەڵگای ئیسلامییدا، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك شتێکی کاتیی مۆڵەتی بەو جۆرە هاوسەرگیرییە داوە.

سێیەم: بەڵام دیسان نکووڵییش لەوە ناکرێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککەدا قەدەغەی کردوە بە یەکجاریی، کە پێشتر فەرموودەکەمان هێنا.

ئنجا ئەگەر یەکێکیش بڵێ: جا خۆ فەرموودەکەی (عەلی) خوا لێی ڕازی بێ کە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يَوْمَ خَيْبَرَ»، أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (١١٢٩)، وَأَحْمَد برقم: (٥٩٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥١١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٤٢٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم:

(١١٢١)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٣٣٤)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤١٤٣)، واتە: پێغەمبەر ﷺ نیکاحی موتعەی قەدەغەکرد، هەروەها گۆشتی کەری ماڵی (گوێدرێژ)ی قەدەغەکرد لە ڕۆژی خەیبەردا، (واتە: لە جەنگی خەیبەردا)، لەگەڵ فەرموودەکەی (سَبْرَةَ بْن مَعْبَد الْجُهَنِيّ) تێکدەگیرێ کە دەڵێ: هاوسەرگیریی کاتیی لە جەنگی ئەوطاسدا کە دوای ئازادکردنی مەککە بووە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد، ئەویان دەڵێ لە ساڵی حەوتەمدا بووەو لە جەنگی خەیبەردا قەدەغەی کردوە، ئەویدیکەش دەڵێ: لە جەنگی ئەوطاسدا، واتە: دوای ئازادکردنی مەککە کە ساڵی هەشتەم بووە، ئێمە دەڵێین: زانایان دوو وەڵامیان داونەوە بۆ چارەسەری ئەو ئیشکالە:

١/ نیکاحی موتعە هەم ڕۆژی خەیبەریش قەدەغە کراوە، وە پاشان مۆڵەتی پێدراوەتەوە، وە هەم دوای ئازادکردنی مەککەش یەکجاریی قەدەغە کراوە.

٢/ ڕۆژی خەیبەر پێغەمبەر ﷺ تەنیا گۆشتی کەری ماڵیی قەدەغە کردوە، (بۆیە دەڵێین: کەری ماڵیی، چونکە کەری کێوی ئەوانەی کە بەڵەکن، ئێستاش و ئەوکاتیش هەر حەڵاڵ بووە، بەڵام دیارە خەڵك گۆشتی کەریان بەکارهێناوەو ئەویش قەدەغەی کردوە)، بەڵام (عەلی) خوا لێی ڕازی بێ، کە باسی قەدەغە بوونی خواردنی ئەو جۆرە کەرەی کردوە، هاوکات لەگەڵ ئەوە، کە خۆی قسەکەی کردوە لە کۆڕێکدا بووە، کە باسی قەدەغە کردنی نیکاحی موتعەشی کردوە، هەرچەندە ساڵێك دوای ئەوەش بووە کە قەدەغە کراوە.

چوارەم: هەروەها نکوولییش لەوە ناکرێ کە هەندێك لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لە بارەی قەدەغە نەکرانی نیکاحی (موتعە)وە ڕاجیایی یان هەبووە، ئەوە دیارە کە زۆربەیان گوتوویانە: قەدەغە کراوە، بەڵام هەندێکیش هەبوون کە پێیان وابووە قەدەغە نەکراوە، یەکێك لەوانە

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس بووە خوا لێیان ڕازی بێ، کە لێی گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: (أنا أَبَحْتُها لِلْمُضْطَرِ كَالمَيتَةِ والدَّم)[1]، واتە: من ڕێگەمداوە بە نیکاحی موتعە بۆ کەسێك کە ناچاربێ، وەك چۆن کەسێك کە زۆر برسیی بێو لێی بقەومێو هیچی دەست نەکەوێ، لەوکاتەدا، بۆی هەیە بە ئەندازەی ئەوە کە نەمرێ لە مردارەوە بووو لە خوێن بخوا، بە هەمان شێوە کەسێکیش کە زۆر ناچار دەبێ، من بۆ ئەوە فەتوام داوە.

بەڵام دوایی کەسانێك ڕاو فەتواکەی ئەویان بە خراپ قۆستۆتەوە، بۆیە لەو فەتوایەی خۆی پەشێمان بۆتەوە، وەك (القاسمي) خاوەنی (محاسن التأويل)[2]، لێی گێڕاوەتەوە، وە زۆربەی سەرچاوەکانیش هێناویانە.

پێنجەم: بەڵام ئەوە کە دەگوترێ: نیکاحی موتعە شتێکی ڕەوا بووە، هەتا عومەر خوا لێی ڕازی بێ قەدەغەی کردوە، ڕاست نیە، هەرچەندە ئەو قسەیەش لە (صحيح مسلم)یشدا هاتوە، جا زۆرجار شیعە بە هەندێك دەق کە لە سەرچاوەکانی ئێمەدا هاتوون، موناقەشە دەکەن لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا، لەبەرئەوەی ئەهلی سوننەت نەهاتوون لەبەر دەمارگیریی چ قسەیەك لەگەڵ بیروڕاو تێگەیشتنی خۆیاندا نەگونجێ نەیهێنن، هەموو شتێکیان هێناوە، بەس تەماشای کتێبەکانی وان بکەن، تەنیا ئەوەی کە پشتگیریی مەزهەبەکەی خۆیان دەکات هێشتوویانەتەوە، ئەویدیکەیان نەهێناوە، بەڵام زانایانی ئەهلی سوننەت هەرچی هاتوە لەوبارەوە هێناویانە، جا ئیدی موافیقی هەق بێ، یان موافیقی هەق نەبێ، لەگەڵ ڕای زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان کە (ئەهلی سوننەت)یان پێ دەگوترێ، بگونجێ، یان نەگونجێ، هێناویانە، وەك ئەمانەتی زانستیی، جا لە (صحيح مسلم)دا ئەم دەقە هاتوە: ﴿عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه يَقُولُ: كُنَّا نَسْتَمْتِعُ بِالْقَبْضَةِ مِنَ التَّمْرِ وَالدَّقِيقِ الأَيَّامَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَبِي

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (١٠٢).
٢) ج: (٥)، ص: (١٠٢).

بَكْرٍ، حَتَّى نَهَى عَنْهُ عُمَرُ فِي شَأْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٤٨٢)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە بە چەند مستە خورمایەکو بە چەند مستە ئاردێك (واتە: بە ئەندازەیەك خۆراك) ئافرەتمان مارە دەکرد، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺو لە سەردەمی ئەبوبەکریشدا، هەتا عومەر خوا لێی ڕازی بێ قەدەغەی کرد، دەربارەی عەمری کوڕی حورەیث، (کە دیارە ئەوە کابرایەك بووە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی کردوە، عومەری کوڕی خەتتابیش خوا لێی ڕازی بێ ڕایگەیاندوە کە قەدەغەیە).

بەڵام دەڵێین: لە ڕاستییدا ئەم قسەیە ڕاست نیە، واتە: ڕاست نیە کە نیکاحی موتعە حەڵاڵ بووبێتو عومەر خوا لێی ڕازی بێ قەدەغەی کردبێ، چونکە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، زۆر لەوە مسوڵمانترو عاقڵترو عالمترو بەتەقواتر بووە، کە شتێك خواو پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵی بکەن، ئەو بچێ قەدەغەی بکات، شتی وانیە، حەڵاڵی موحەممەد ﷺ حەڵاڵە تا قیامەت، حەرامی موحەممەد ﷺ حەرامە تا قیامەت، هەر کەسێك ئیمانی هەبێ، دەستکاریی ئەو حەڵاڵو حەرامانە ناکات، کەواتە: ئەوە ڕاست نیە عومەر خوا لێی ڕازی بێ وای کردبێ، هەرچەندە شیعە زۆر خۆیان بەو دەقەوە مشەوەش کردوەو، بۆ تانە دان لە عومەر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێن: تەماشا بکەن عومەری کوڕی خەتتاب شتێك کە حەڵاڵ بووە قەدەغەی کردوە، کە گوایە دەستکاریی شەریعەتی کردوە، حەڵاڵی حەرام کردوە، وە من پێموایە شیعە زیاتر لە ڕقی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، هێندە شیرنایەتییان بە نیکاحی موتعەدا چووە، لەبەرئەوەی ئەو ڕایگەیاندوە قەدەغەیە، کە بە داخەوە ئەوان مەسەلەی عاطیفەو دەمارگیریی زۆر کاریگەریی لەسەریان هەیە، بەڵام ئێمە دەڵێین: لەڕاستییدا ئەوەی کە عومەر خوا لێی ڕازی بێ کردوویەتی، تەنیا بریتیی بووە لە ڕاگەیاندنی ئەو حوکمەی کە پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ

ڕایگەیانـدوەو، هەنـدێك لـە مـسوڵمانان لێـی بێئـاگا بـوون، فەرمـاندەی ئیمانداران عومەریش گوتوویەتی: ئەوە قەدەغەیەو حەرامـە، وە لەڕاسـتییـدا ڕاوییـەکان هەندێك جار دەقێـك چ کە لـە پێغـەمبەرەوەی ﷺ دێنـن، یـان لـە ئەبو بەکر، یان عومـەر، یان عوسـمان، یان عەلـی یـەوەی دێـنن، یـان لـە هـەر کـام لـە هـاوەڵانەوەی خـوا لـێیان ڕازی بـێ، دێـنن، ناچـن ئـەوەی گوتوویەتی هەمووی بێنن، بەڵکو کورتی دەکەنـەوە، یان وشـەو تەعبیـرێکی لـێ دەگۆڕن، ئەگـەرنا بـە تەئکـید وەك لـە شـوێنی دیکـەدا هـاتوە عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویـەتی: پێغـەمبەری خـوا ﷺ قەدەغـەی کـردوە، لەبەرئـەوەی ئـەو قەدەغـەی کـردوە، مـن لەمـەو دوا هەرکەسێك بـە شـێوەی نیکاحی موتعە هاوسەرگیـریی بکات، سزای دەدەمو بـەردبارانی دەکەم، یانی: حـوکمی زیناکـەری بەسـەردا دەچەسـپێنم، جـا عومـەر خـوا لـێی ڕازی بـێ هـەر قەدەغەکردنەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ ڕاگەیانـدوە، نـەك بڵـێ: ئـەوە لەلایەن خۆمـەوە قەدەغـەی دەکەم ! وەك پێـشتـر فـەرموودەکانمان هێنـا، کـە یەکێکیان لە عەلـی کوڕی ئەبو تاڵیبـەوە بوو خوا لێی ڕازی بـێ، ئەویدیکەش لەلایـەن سـەبرەی کـوڕی مەعبـەدی جوهـەنیی یـەوە خـوا لـێی ڕازی بـێ، ئنجـا ئایـا زانـایان چۆن وەڵامی ئەوەیـان داوەتـەوە:

١) دەڵـێن: دیـارە جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا خـوا لێیـان ڕازی بـێ، ئـەو قەدەغـەکردنەی پێنەگەیشتوە.

٢) یان ئەوەتـا قسەکەی جابیـری کوڕی عەبدوڵـڵا خـوا لێیان ڕازی بێ ڕاست نیـە، واتـە: ئـەو قـسەیە قـسەی ئـەو نیـەو ئـەو لـە سـەنەدی ئـەو فەرموودەیـەدا نیـە، هەرچـەندە لـە (صـحیح مـسلم)یـشدا هـاتوە، چـونکە (صـحیح مـسلم) خـۆ قورئـان نیـە، وە هەروەهـا (صـحیح البخـاري)یـش قورئـان نیـە، ڕەنگە ڕاوییـەك شـتێکی لـێ هەڵـە بووبـێ، یـاخود شـتێکی لەبیـر چووبێتـەوە، ئەوەی کە ئێمـە دڵنیـابین هەرچی تێیدایە هەمووی هەر ڕاستە لە سەدا سەد (١٠٠٪) تەنیا قورئانە، بـەڵام ئـەوانی دیکە بـە ئەنـدازەی

ئەوە کە دەستی ئینسانی دەچێتێ، زەینو عەقڵی بەشەر کاری تێدا دەکات، ڕێی هەڵەو ڕاستیشی دەچێتێ، هەرچەندە لە دوای قورئان ڕاستترین کتێب کە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە دەقەکانی شەریعەتیان کۆکردۆتەوە، بریتین لە (صحيح البخاري)و (صحيح مسلم)، بەلاّم زانایان تێبینییشیان هەیە لەسەر هەندێك لەو فەرمایشتانەش کە لەوانیش دایە، کە یەکێکیان ئەمەیە، جا دەڵێین: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ یان ئەو قسەییەی هەر نەکردوە، یاخود ئەگەر کردبێشیتی، دیارە قەدەغەکرانەکەی پێنەگەیشتوە، ڕەنگە لەو کاتەدا لەوێ نەبووبێ، یان لەبیری چووبێتەوە، بە هەرحاڵ بەشەر بەشەرە، تەنیا خوا بێ هەڵەو بێ هاوتا ئەوەی کە دەیفەرموێ: هەمووی هەر وایە، بەلاّم بەشەر هەڵەو کەموکووڕیی ڕووی تێدەکات، پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) خوا لە گوناه پاراستوونی، وە بە پاراستنی خوا پارێزراون، ئەگەرنا ئەوانیش جاری وایە تووشی هەڵەی سەهوو و لەبیرچوونەوە بوون، پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە، شتێکی کردوە بە هەڵە کردوویەتی، بۆ وێنە: لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، کە جارێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەصری کرد، دوو ڕکاتی کردو سەلامی دایەوە، هاوەڵان بێدەنگ بوون، یەکێك ناوی (ذُو الْيَدَيْن) بوو (دیارە دەستی مەیلەو درێژ بوون)، گوتی: (يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ، أَمْ نَسِيتَ؟) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نوێژ کورت بۆتەوە (لە چوار ڕکات بۆتە دوو ڕکات) یاخود لەبیرت چۆتەوە؟ فەرمووی: (مَا قَصُرَتِ الصَّلاَةُ وَلاَ نَسِيتُ)، واتە: نە کورت بۆتەوەو نە لەبیریشم چۆتەوە (چوار ڕکاتم کردوە)، ڕووی لە هاوەڵان کردو فەرمووی: (أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَتَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلاَةِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ التَّسْلِيمِ)، واتە: ئایا (ذُو الْيَدَيْن) ڕاست دەکات؟ گوتیان بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیدی پێغەمبەری خوا

ﷺ ئەوەی لە نوێژەکەی مابوو تەواوی کرد (واتە: دوو ڕکاتی دیکەی کردن) پاشان دوو سەجدەی بردن، لە کاتێکدا کە دانیشتبوو دوای سەلامدانەوە لە نوێژ {واتە: سەجدەی هەڵەکردن (سجدَة السَّهو)}، ئنجا بەشەر بەشەرە، چ جای هاوەڵان ئەوەتا پێغەمبەرانیش (علیهم الصَّلاة والسلام) وابوون.

شایانی باسیشە هەر لەبەرئەوەشە کە لەم مەسەلەیەدا ڕاجیایی هەیە، هەرچەندە ڕاجیاییەکی بێهێزە، چونکە وەختێك عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، وەك لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، گوتوویەتی: {فَلَنْ أُوتَى بِرَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً إِلَى أَجَلٍ إِلاَّ رَجَمْتُهُ بِالحِجَارَةِ}، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٣٩) عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا)، واتە: هیچ پیاوێك بۆ لام نایەت، ئافرەتێکی بە شێوەی کاتیی مارەکردبێ و هێنابێتی، مەگەر بەردبارانی دەکەم.

باشە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ کە خەلیفەی مسوڵمانانە، ئاوا بڵێ، لەنێو ئەو هەموو هاوەڵانەدا کە عوسمانو عەلیو هەموو ئەوانیدکەش لەوێ بوون، ئەگەر ئەو شتە شتێکی حەڵاڵ بێ، ئایا ناڵێن: باشە عومەری کوڕی خەتتاب ! ڕاستە تۆ خەلیفەی پێغەمبەری ﷺ، بەڵام شتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵی کردبێ، چۆن قەدەغەی دەکەی؟ وە دوایی چۆن کابرای لەسەر دەکوژی؟! دیارە بە تەئکید هەموو زانیوویانە کە ئەو شتە قەدەغەکراوە و هەرچەندە ڕەوا بووە، بەڵام نەسخ بۆتەوە، بۆیە دەڵێین: بە تەئکید قسەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، یان هەر قسەی ئەو نیەو ئەو ئەو قسەیەی نەکردوە، بەڵکو ڕاوییەك بە لەبیرچوون بێ، یان بە مەبەست بێ، بەهەرحاڵ بە دەمیەوە کردوە، یاخود ئەو ئاگای لێ نەبووە، کە ئەو شتە قەدەغە کراوە، جا بۆیە زانایان دەربارەی ئەوە کە ئایا ئەگەر کەسێك ئافرەتێك بە شێوەی نیکاحی موتعە بێنێ، حوکمی زیناکەری بەسەردا دەچەسپێ یان نا ؟! ڕاجیاییان هەیە:

١- هەنـدێکیان گوتوویانـە: بەڵـێ، وە ئـەو دەقـەی کـە لـە عومـەری کـوڕی (خەتتـاب)ەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویانـە، کردوویانـە بـە بەڵـگەو دەڵێن: دیـارە ئـەوە نەسـخ کراوەتـەوەو قەدەغەیـە، مانـای وایـە وەك زینـای لەگـەڵ بکات وایە، بۆیە هەمان حوکمی زیناکەری بەسەردا دەچەسپێ.

٢- هەنـدێکیش گوتوویانـە: نـەخێر، مـادام کـاتی خـۆی حـەڵاڵ بـووەو دوایـیش هەندێك لە هاوەڵان ڕاجیایی یان هەبووە، بـەلای کەمـەوە شـوبهەی تێدایـە، لەبەرئـەوە تـەنیا (تعزیـر) دەکـرێ، دەبـێ تەمبـێ بکـرێو سـزاش بـدرێ، بـەڵام وەك زینـاکەر مامەڵەی لەگەڵدا ناکـرێ، بـۆ وێنـە: ئەگەر گەنج بـوو سـەد قامچـی لـێ بـدرێ.

**مەسـەلەی یـازدەیەم**: کـە خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿... فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ...﴾، پاداشـتەکانیان، یـان کرێیەکـانیان، یـان خەڵاتـەکانیان بدەنێ بەو ئافرەتانەی کە مارەیان دەکەن، لەسـەرتان پێویسـتە، جێـی سـەرنج لێرەدا ئەوەیـە کە خـوای کاربەجـێ مـارەیی (مَهْر)ی ئافرەتـانی بـە چـوار وشـان باسکردوە، بەڵام لە قورئـاندا وشـەی (مَهْر) نەهـاتوە:

١- وشـەی (صَدُقات) کە کـۆی (صَدُقة)یە.

٢- وشـەی (أجُور)، کە کـۆی (أجـر)ە.

٣- وشـەی (فَرِيضَـة).

٤- وە وشـەی (نِحْلَـة).

ئنجـا (صَدُقات) کـە کـۆی (صَدُقة)یـە، لـە مانـادا وەك (صَدَاق)ە، چـونکە کەسـێك هاوسـەرگیـریی لەگـەڵ ئافرەتێکـدا دەکـاتو ئەنـدازەیەك لـە مـاڵی خـۆی پێـدەدات، مانـای وایـە ڕاسـت دەکـات ئـارەزووی لێیـە هاوسـەرگیـریی لەگـەڵدا بکـاتو خۆشـی دەوێو پێـی ڕازییـە، بۆیـە نـاوی لێنـراوە (صَدُقة) یان (صَدَاق)، وە نیشـانەی ڕاسـتگۆییو ڕاسـتییەتی لەگەڵیـدا دایـە.

وە (أجُور) كـۆی (أجْر)ە، واتە: پاداشت، چونكە وشـەی (أجْر) لـە كوردەواریی خۆمـاندا، یـان لـە زمـانی عـەرەبیـدا، واتــە: كـریّ، بـەڵام لـە بەكــارهێنانی قورئـاندا، واتە: پاداشـت لە بەرانبـەر ئـەوەدا كە ئـەو ئافرەتـە ڕازی دەبـێ شـوو بـەو پیـاوە بكـات، ئـەو پیـاوە دیــاریی دەداتـێو خــەڵاتی دەكـاتو پاداشــتی دەداتـێ.

وە وشــەی (نِحْلَـة)ش كــە بەكارهــاتوە، واتـــە: دیـــارییو خــەڵاتێكی بــێ بەرانبــەر، وە وشــەی (فَرِیضَـة)ش، واتــە: شــتێك كـە ئەركـە لەســەر شـانتو دەبــێ ئەنجــامی بـدەی، ئەوانـەش هــەموویان ئـەوە دەگـەیەنن كـە بەڕاســتیی ئـەو مارەییەی كە لەلایەن پیـاوەوە دەدرێ بـە ئـافرەت، ڕێزلێگـرتنی پیاوەكەیـە بـۆ ئافرەتەكـەو، دەربڕینـی خۆشەویـستییەتیو ڕێـزو حورمەتییـەتی بـۆی، وە دەربڕینی ڕاستگۆییەتی لەگـەڵـیدا، بۆیـە وەك جارێكی دیكـەش باسـمان كـرد، كە هەندێك لە عەلمانییەكـان ڕەخنـە دەگـرن لـە مارەیـی، كـە لـە ئیـسلامـدا پیـاو مارەیی دەدات بە ئـافرەت دەڵـێن: ئـەوە مانـای وایـە ئـەو ئافرەتـە دەكـڕێ، زۆر بە هەڵـەداچوونو، ئەوانەی كە بـێ ئینـصافیی دەكـەنو لادەدەن، وە مـارەیی زۆر دەكەن، - هەرچەندە دروستیش بـێ-، سـەد لیـرە، دوو سـەد لیـرە، سـێ سـەد لیـرە، پێـنج سـەد لیــرە، ئـەوە لەڕاستییـدا ئـەو ڕەفتـارە وای لێوەردەگیــرێ كـە وەك بلّــێ بیـانەوێ ئـەو ئـافرەتـە بـەو پیـاوە بفرۆشــن، ئەگـەرنا سـەد لیـرەو چــەند ســەد لیـــرە، وەك مارەیـــی لــە ئیـــسلامدا نــەبووە، لــە ئیـــسلامدا ئەنگوســتیلەیەكیش دەگونجــێ بكرێتــە مـــارەیی، بەڵــكو چــەند ســوورەتە قورئـانێكیش پیاوەكـە فێـری ئافرەتەكـەی بكـات دەگونجـێ، مـــارەیی بـــێ، وە دەگونجێ لەسەر موصحەفێك ئافرەت مارە بكرێ، مانـای وایـە مـارەیی شـتێكی ڕەمزییـەو، تەنیـا ئەوە دەگەیەنـێ كە ئـەو پیـاوە ڕەغبـەتو ئـارەزووی هەیــە بۆ ئەو ئافرەتـە كە ژیانی هاوســەریی لەگـەڵ پێـكبێنـێو، بیكـاتە هاوســەری ژیـانی خـۆی، وە لەگەڵـیـدا ڕاســت دەكـات، ئەوەتـا دیــاریی پێــدەدات، وە بـۆ زانیارییتــان لــە وڵاتـانی ڕۆژئــاوا زۆرجـار ئـافرەت بـەدوای پیـاودا دەڕواتو

دیاریی‌و خەڵاتیشی دەداتێ، هەر ئەوەندە كە بیهێنێ، كە لەڕاستییدا ئەوە پێچەوانەی فیطرەتە، چونكە ئافرەت بە سروشت حەز دەكات داواكراو و خۆشویستراو بێ، وە پیاو حەز دەكات‌و سروشتی وایە كە دەستپێشخەر بێ، بەڵام ئافرەت پێی خۆشە دەستپێشخەریی بۆ لا بكرێ، بۆیە ئەوەی لە ڕۆژئاوادا هەیە، پێچەوانەی فیطرەتە، بەڵام ناشڵێین: نابێ، چونكە دایكمان خەدیجە خوا لێی ڕازی بێ، چەند گەورە بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەسفیدا دەفەرموێ: (سیدة النساء)! بەڵام ئەو دەستپێشخەریی كردوە بۆ ئەوەی كە هاوسەرگیریی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا بكات، كەواتە: شتێكی ڕەوایە، بەڵام ئێمە باسی حاڵەتی گشتی دەكەین، دیارە هەموو ئافرەتان خەدیجە نین‌و هەموو پیاویش موحەممەد ﷺ نین، پیاوی وا هەیە ئەگەر ئافرەتەكە دەستپێشخەریی بكات، ڕەنگە دوایی ناجوامێربێ‌و بڵێ: خۆ تۆ مەجبووری من بووی‌و ... هتد، بۆیە شەریعەت وایداناوە پیاو زیاتر دەستپێشخەربێ، ئەگەرنا ئەگەر ئافرەتەكەش دەستپێشخەربێ، وە پیاوەكە شایستەبێ، ئەوە هیچ ئیشكالی تێدانیە، پێغەمبەر ﷺ و خەدیجەش خوا لێی ڕازی بێ لەو بوارەدا سەرمەشق بوو ون.

**مەسەلەی دوازدەیەم**: كە خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿...وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِ ...﴾، وە گوناهتان ناگاتێ ئەوەی كە لە نێوان خۆتاندا لەسەری پێكهاتن، لە دوای ئەوەی كە دیاریكراوە، لە دوای ئەوە كە وەك پێویستیی دانراوە، گوناهتان ناگاتێ لەسەر هەر شتێك پێكبێن، زانایان چەند مانایەكیان بۆ داناوە.

١) ئەو پیاوە ئەو ئافرەتەی مارە كردوە بە ئەندازەیەك مارەیی، دوایی زیادەشی دەداتێ.

٢) یاخود ئافرەتەكە مارەییەكەی وەرگرتوە، بەڵام دوایی دەڵێ ئەوە نیوەت لێ خۆشبووم.

٣) یاخود پێشەکی (مقدمة)ییەکەی داوەتێو دواخراو (مؤخّرة)ەکەی ماوە، دەڵێ: ئەوە گەردنم ئازاد کردی.

واتە: هەرچۆن بێ: پیاوەکە مارەیی بۆ ئافرەتەکە زیاد بکاتو زیادەی بداتێ، یاخود ئافرەتەکە لێی کەم بکاتەوە، یاخود گەردنی ئازاد بکات، هەمووی هەر ڕەوایەو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دەستتان نەگیراوە، نە دەستی پیاوەکە گیراوە، نە دەستی ئافرەتەکە، کە چاکە لەگەڵ یەکدیدا بکەن، گرنگ ئەوەیە لەسەر بناغەی لێکتێگەیشتن (تفاهم)و بە تەباییو ڕەزامەندیی نێوانیان بێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار ئایەت دەگرێتە خۆی لە ئایەتی (٢٥ تا ٢٨)، لەم چوار ئایەتەدا سەرەتا خوای کاربەجێ باسی هاوسەرگیریی لەگەڵ کەنیزەکاندا دەکات بۆ کەسانێك کە توانایی ماددییان نیە، کە هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتانی ئازاد بکەن، کە دیارە ئەو کاتە ئەمان مەسرەفی زیاتریان ویستوە، پاشان خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە دەیەوێ ڕاستییەکانمان بۆ بخاتە ڕوو، وە یاساکانی خۆیمان پێشان بدات کە بەسەر گەلانی پێشووماندا جێبەجێ بوون، وە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە خوا دەیەوێ لێمان ببوورێ، وە پاشان دووپاتی دەکاتەوە کە حەز دەکاتو دەیەوێ تۆبەمان لێ وەربگرێ، وە ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانەی شوێن ئارەزووان دەکەون، دەیانەوێ خراپ لامان بدەن، پاشان ڕایدەگەیەنێ کە حەزدەکاتو دەیەوێ باری سەرشانمان سووك بکات، چونکە مرۆڤ بێهێز خوڵقێنراوە، بەتایبەتی لە بەرانبەر غەریزەی جینسییدا.

﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ۚ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾ يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ

عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَاللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾.

## مانای وشـه به وشـەی ئایەتەكـان

((وە هـەر كامێكـتان لـە ڕووی دارایـی یـەوە نەیتـوانی ئافرەتـانی ئـازادی بـڕوادار بێنـێ، بـۆی هەیـە لەوانـەی بـە دەسـتتانەوەن (و خاوەنیـانن) لـە كـچە بڕوادارەكانتـان (بخـوازێ)، (ئیمـان سـەنگی مەحـەكی مرۆڤەكانـەو) خـواش بـە ئیمانتـان زانـاترە، هەنـدێكتان لـە هەندێكـتانن (و هـەمووتان بـە ئـازادو كۆیلـەوە وەچـەی بـابو دایكێكـن)، دەجا بـە مۆڵـەتی خاوەنەكـانیان مارەیـان بكـەن‌و، مـارەیی یەكانیـشیان بـە شـێوەیەكی پەسـندو بـاو پێبـدەن، بـەڵام بـا لـە خراپـە پارێـزراو (و داوێـن پـاك) بـن‌و نـە بـە ئاشـكرا زینـا بكـەن‌و نـە پەنهـانییش دۆسـتتدار بن، ئنجا هەركات (بە هۆی هاوسەرگیریی یەوە) لە خراپـە پارێـزراو بوون، ئەگەر زینـایان كرد، ئـەوە نیـوەی ئـەو سـزایەی كـە لەسـەر ئافرەتـانی ئـازادە لەسـەریانە (كـە پەنجـا قەمچییە) ئـەوەش بـۆ كەسـێكە لـە ئێـوە كـە مەترسـیی گونـاهـ (و تێـشكان لـە بەرانبـەر ئـارەزووودا)ی هـەبێ، وە ئەگـەر خۆشـتان مـەرزەم بكـەن، (وە كەنیزەكـان نەهێنـن) بۆتان چاكتـرە، وە خـوا لێبـوردەی بـە بـەزەیی یـە ﴿٢٥﴾ خـوا دەیـەوێ (ڕاسـتییەكان) بۆتان ڕوون بكاتەوە، وە ڕێنماییـتان بكات بـەرەو ڕێوشـوێن‌و ئەزموونی ئەوانەی پێـش خۆتان (و ئەو یاسایانەی خوا كە بەسەریاندا چەسپیون)، وە (دەیەوێ‌و حەز دەكات) لێتـان خۆشـبێ، وە خـوا زانـای كاربەجێیـە ﴿٢٦﴾ وە خوا دەیەوێ لێتان خۆشبێ، بەڵام ئەوانەی دوای ئـارەزووان دەكـەون، حـەز دەكەن بە لادانێكی مەزن لابدەن ﴿٢٧﴾ خوا حەز دەكات لەسـەرتان سـووك بكـات، وە مرۆڤ (لە بەرانبـەر ئارەزووەكـاندا) بێهێـز دروسـتكراوە ﴿٢٨﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(طَوْلًا ): واتــە: (غِنـًى)، دەوڵەمەنــدیی لــە ڕووی داراییــەوە (والطَّوْلُ خُصَّ بِهِ الفَضْلُ والمَنُّ)، طَولاً: كِنَايةٌ عَمَّا يُصْرَفُ إلى الْمَهْرِ والنَّفَقَةِ)، (طَول) واتــە: چاكــەو منــەتكــردن، وە لێــرەدا وشــەی (طَول) كینایەیــە لــەوەی كــە صــەرف دەكرێ بۆ مارەیی‌و بۆ مەسرەفی ژن هێنان‌و ژن‌و ماڵ بەڕێوەبردن.

(فَتَيَاتِكُمُ ): (جَمع فَتَاة)، (فَتَاةَ: الشَابَّة الأُنثى)، واتــە: مێینــەیەكی گــەنج، (وَيُكَنَّى بِهِ عَن الأمَة، وَيُكنَّى بالفَتَى عَنِ الـمَمْلُوك، (وَقَالَ لفَتيانِهِ اجْعَلوا بَضَاعتهم)، وشــەی (فَتَاةَ) كینــایەیە بــۆ كــەنیزەك، جا ئەگــەر پیــرەژنیش بــێ هــەر پێی دەگوترێ (فَتَاةَ)، وە (فَتَى) یانی: كوڕی گەنج، بــەڵام كینایەیــە بۆ كۆیلــە، واتە: نێرینــە (عَبْد) ئەگەر بە تەمەنیش بــێ، ئــەوەش دیــارە وەك دوایــی باســی دەكــەین بــۆ ڕێزگــرتن‌و پاراســتنی هەســت‌و نەســتیان، خــوای پەروەردگــارو پێغەمبــەر ﷺیــش ئــەو وشــانەیان بەكارهێنــاوە لــەجیاتی (جَارِية) یــان (أَمَة) یاخــود (عَبْد).

(أَخْدَانٍ ): (جَمْعُ خِدْن وخَدِين) كەسێكە بە پەنهانیی داوێن پیسیی بكات، جا ئافرەت بێ، یان پیاو بێ، (أي: المصاحِب، وَأَكْثَرُ ذَلِكَ يُسْتَعْمَلُ فِيمَنْ يُصَاحَبُ بِشَهْوَةٍ)، كەواتــە: وشــەی (خِدْن)و (خَدِين) بــۆ پیــاویش‌و بــۆ ئافرەتیش بەكاردەهێنرێ، دەڵێ: (أي: المصاحِب) كە بەمانای هاوەڵــە، بــە زۆریی بۆ ئەوە بەكاردەهێنرێن، كە بە ئارەزووەوە هاوەڵایەتیی بكرێ.

(الْعَنَتَ ): واتــە: مەشــەققەت‌و ناڕەحەتیــی (الـمعَانَتَةُ كالمُعَانَدَةِ لَكِنَ المُعَانَتَةُ أَبْلَغُ، لأَنَّهَا معَانَدَةٌ فِيهَا خَوْفٌ وَهَلاَكٌ، وَلِهَذَا يُقَالُ: عَنِتَ فُلاَنٌ، إِذَا وَقَعَ فِي أَمْرٍ يُخَافُ مِنْهُ التَّلَفُ، يَعْنَتُ عَنَتاً)، (عَنَت) واتە: ناڕەحەتیی،

وە (معَانَتَة)، وەك (مُعَـانَدَة) وایـە، بـەڵام (معَانَتَـة) مانـای زیـاتری هەیـە، چونكە (معَانَتَة) ئەوەیە كە مەترسـیی بـە هیلاكـچوونی تێـدابێ، دەگوترێ (عَنِـتَ، یَعْـنَتُ) واتـە: كەوتـە نارەحەتییـەوە، كاتێـك مرۆڤ بكەوێتـە نارەحەتییەكەوەو لەخۆی بترسێ.

(سُنَنَ): (السُّنن) كۆی (سُنَّة)یە، واتە: طەریقـەت، بـە مانـای یاسـاو ڕێبازێك دێ كە لە پێشدا گیراوەتەبەر، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ... سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ... ﴾، واتـە: ئـەو یاسـایانەی مـن كـە مامەڵـەم پـێ لەگـەڵ پێشووەكانی ئێـوەدا كـردوون، بوونەتـە ڕێبازێـك و ڕاسـتە شـەقامێك، بۆیـە زانایـان وشـەی (سُنة)یـان بـە طـەریقەت لێكـداوەتەوەو گوتوویـانە: (سُـنَّةَ النَّبِـيِّ: أي طَرِيقَتهُ) ڕێبـازی پێغـەمبەر ﷺ.

(ٱلشَّهَوَٰتِ): (أَصْـلُ الـشَّهْوَةِ: نُزُوعُ النَّفْسِ إلـى مَـا تُرِيدُهُ)، (شَـهْوَة) ئەوەیـە كـە نەفـس بـەرەو لای بـچێ، هـەر شـتێك نەفـس بیخـوازێ، پێـی دەگـوترێ شـەهوەت، جـا (راغب الأصفهاني) دەڵێ: شـەهوەت دوو جـۆرە، شـەهـوەتی ڕاسـت (صَـادِقة) هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە كـە بـەبێ ئـەوە بـەدەن تووشـی نارەحـەتیی دەبـێ، وەك: خـواردن و خواردنـەوەو ئـارەزووی جینـسیی، واتـە: ئەوەی جەستە پێویستی پێیەتی و پەكی لەسەری دەكەوێ.

وە شـەهوەتی درۆ (كَاذِبـة) هەیـە كـە مرۆڤ هـەر پێـی خۆشـە بخـواو بخواتەوە هەرچەندە مایەی قەڵەوبوون و پەیدابوونی گەدەو گیپاڵیشی بێ، واتە: پێویستی پێی نییـە.

(مَيۡلًا): (الـمَيْلُ: العُدُولُ عَنِ الوَسَطِ إلـى أَحَدِ الجَانِبَينِ؛ وَيُسْتَعْمَلُ فـي الجَوْر كَثِيراً)، (مَيْل) واتـە: ئەوەیە كە لـە نێوەڕاسـتەوە بـە لایەكیانـدا لابدات، بـە لای ڕاست یان بە لای چەپدا، وە بە زۆریـی بە مانـای سـتەم بەكـاردێ.

## مانــای گــشـــتــی ئایەتەکـــــان

خـوا ﷻ پـاش ئـەوەی باسـی ئافرەتانێکـی کـرد کـە قەدەغـەن هاوسەرگیـرییان لەگەڵـدا بکرێ، وە دوایـی باسـی کـرد کـە غەیـری ئـەوان ڕەوایە هاوسەرگیـرییان لەگـەڵدا بکرێو مارەییـان پـێبدرێ، مادام بە ڕەزامەندیی هەردوولایـان بـێ، هـەر لەسەر ئەو بابەتە دەڕواتو دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾، وە هەر کامێك لە ئێـوە لە ڕووی دارایـی یەوە نەیتوانی ئافرەتـانی ئیمـانداری ئـازاد بێنـێ (لەبەرئەوەی ئـەوان مارەییـان زیاتر بـووەو پارەیـان زیـاتر تێـچـووە) بـا لەوانـەی کە بەدەسـتتانەوەن لـە کچە ئیماندارەکانتـان، لـە کەنیزەکەکـان، بێنـێ، ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ﴾، وە خـواش بـە ئیمانتـــان زانـاترە، واتـە: ئـەوەی لــەلای خــوا سـەنگی مەحەکە ئیمانە، ئنجا مادام ئەو کەنیزەکە ئیمانـدارە، شایـسـتەی ئەوەیە کـە هـاوسـەرگیـریی لەگەڵـدا بکــەن، هەرچــەندە ئـازادیش نەبــێ، ﴿ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٍ ﴾، لـە ڕووی ڕەچەڵەکیـشەوە هەندێکـتان لـە هەندێکتـانن، ئـازادو کۆیلــە هەمووی دەچنەوە سەر ئادەمو حـەووا، کەواتـە: فـەخرو شـانازیی بەسـەر یەکدییـدا مەکـــــەن، ﴿ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، بــــە مۆڵــەتی خاوەنــەکانیان بیـانهێنن، وە مـارەیی یـەکانیان پــێبدەن بـە شـێوەیەکی پەسندو چاك، ﴿ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٍ ﴾، بـەڵام با ئافرەتانی خۆ پـاك ڕاگیـرو پـاك داوێـن بـن، وە زیناکـەر نـەبن بـە ئاشکرا، ﴿ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٍ ﴾، وە بـە پەنهـانییش دۆسـتیان نەبــێ، دیـارە ئـەو کاتــە عــادەت وابــووەو کەنیزەکەکـان هەیـانبووە بەئاشکرا زینـایـان کردوە، خـاوەن کۆیلـەی وا هـەبووە بەکـرێی داونو بەئاشکرا زینـای پێکـردوون، یەکـێك لەوانـە (عەبـدوڵـڵای کوڕی ئوبەییـەی کوڕی

سـەلول)[1] بووە، وە هەبووە بە پەنهانیی دۆستیان هەبووە، جا خوای پاكو تاك دەفەرمویٚ لەو کەنیزەکانە بێنن، کە نە بەئاشکرا، نە بەپەنهانیی داوێن پیسیی ناکەن، ﴿ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ ﴾، وە هەر کاتێك ئەو ئافرەتانە هاوسەردار بوون، واتە: ئەو کەنیزەکانە شوویان کرد، ﴿ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ ﴾، ئەگەر زینایان کرد، ﴿ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾، ئەوە نیوەی ئەوە کە لەسەر ئافرەتانی ئازادە، سزایان لەسەرە، کە مەبەست پێی سەد قامچییەکەیە، کە نیوەکەی دەبێتە پەنجا قامچیی، ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡ ﴾، ئەوەش بۆ کەسێکە لە ئێوە کە مەترسیی ئەوەی هەبێ تووشی نارەحەتیی بێ، بە هۆی ژن نەهێنانەوەو توانای ژن هێنانی ئافرەتانی ئازادیشی نەبێ، ئەو مۆڵەتە بۆ ئەو کەسەیە، ﴿ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، وە ئەگەر خۆتان ڕابگرن باشترە بۆ ئێوە، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، پاشان خوای بەخشندە دەفەرمویٚ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ ﴾، خوا دەیەوێ بۆتان ڕوون بکاتەوە، ڕاستییەکانتان بۆ ڕوون بکاتەوە، ﴿ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾، هەم حەڵاڵو حەرامی ئێستای شەریعەتتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، وەهەم یاساکانی خۆی دەربارەی گەلانی پێشووی پێش ئێوەشتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ﴿ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴾، وە خوا دەیەوێ لێتان ببووری، وە خوا زانای کاربەجێیە، ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، خوا دەیەوێ لێتان ببووریٚو بگەڕێتەوە سەرتان بە وەرگرتنی پەشیمانییو گەڕانەوەتان. ﴿ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴾، بەڵام ئەوانەی بە دوای ئارەزوو دەکەون، دەیانەوێ بە لادانێکی زۆر مەزنو بێڕەزا لابدەن، ﴿ يُرِيدُ

---

١) قسە ڕۆیشتووی مونافیقەکانی مەدینە، دیارە ئێستاش هەر مونافیقو دەغەڵەکان خەریکی ئەو پیشەیەنو تۆڕ (شبكة)ی جۆراوجۆری بێناموسیی‌و داوێن پیسیی دروست دەکەن !

ﭐللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾، خـوا دەیـەوێ لەسـەرتان سـووك بكـات، دەیـەوێ بـاری شـانتان سـووك بكـاتو بۆیـەش مۆڵەتتـان دەدات، وە ئینسانیش بە بێهـێزیی خوڵقێـنراوە، بەتایبـەت لـە بەرانبـەر ئارەزووەكـانیـدا، بۆیـە خـوای زانـاو شـارەزا هـەم لـێبوردەیە، ئەگـەر مرۆڤـ بیـەوێ تۆبـە بكـاو بگەڕێتـەوە، وە هـەم جارجـاریش مۆڵـەتتان دەدا كاتێـك كە دەكـەونە حاڵـەتە نائاسـایی یەكـانەوەو مۆڵـەتتان دەدات بۆ كردنی هەندێـك شـت كە لـە حاڵـەتی ئاسـاییدا نـاڕەوان، تاكو لەسـەرتان سـووك بكات.

## چـەند مەسـەلـەیـەكی گرنــگ

**مەســەلەی یەكــەم:** كــە دەفــەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم ﴾، واتـە: هـەر كەسـێك لـە ئێـوە لـە ڕووی دارایـی یـەوە نـەیتوانی ئافرەتـانی ئیمانـداری ئـازاد بـە هاوسـەر بگـرێ، بـا لەوانـەی كـە ئێـوە خاوەنیـانن، (واتـە: كەنیزەكـەكان) لـە كـچە ئیمانـدارەكانتـان بێنـێ، ئنجا ئایا هۆكاری ئەوە چی بووە كە خوای كاربـەجێ بۆ كەسێك كـە توانـای خواسـتنو هێنـانی ئافرەتـانی ئـازادی هەبـێ، ڕێگـەی نـەداوە كەنیزەك بێنـێ؟ دیارە هۆكارەكەی ئـەوە بووە كە ئافرەتـانی كەنیـزەك ئـەو كـاتە بەپێـی حاڵـەتی كۆمەڵایەتیـی كـە ئەوكـاتە كەنیزەكەكـانو كۆیلـە بەگشـتی تێیـدا ژیـاون، بەهەرەمەنـد نـەبوون لـە جـەوێكی وا كـە بـاش تێیـدا پەروەردە بكرێـن، بە شـێوەیەكی وا كە لە دواییـدا ببـن بـە دایكـێكی بـاش بـۆ ئەو منداڵانـە كە لێیـان پەیدادەبن، پاشـان بۆیە خوا ﷻ وەك مۆڵەتێك مۆڵەتی داوە بە كەسـانێك كـە توانـای خواسـتنی ئـافرەتی ئازادیـان نیـە، چونكە ئـەو كـاتە دیـارە هێنـانی ئافرەتـی كەنیـزەك هـەم مـارەیی كەمتـر بـووە، هـەم مەسـرەفی كەمتـر بـووە، هـەم شـێوەی ئیـدارەدانو بـەڕێوەبردنی ئـافرەتێكی كۆیلـە، قورسـایی دارایـی كەمتـری خـستۆتە سـەر شـانی ئـەو كەسـەی كـە دەبێتـە هاوسـەری، هۆكـارەكەی ئـەوە بووە.

**مەسـەلەی دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ﴾، نەیفـەرمووە: (مِـنْ إِمَائِكُـمُ الـمُؤْمِنَـات)، (أَمَـة) واتـە: کۆیلـەی مێینـە، وە (عَبْـد) واتـە: کۆیلـەی نێرینـە، خوا ﷻ لە قورئـاندا کاتێـك کە باسـی کەنیزەکـان دەکـات دەفـەرموێ: ﴿مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ﴾، کـە کـۆی (فتـاة)ە، وە (فتـاة) لـە ئەسـڵدا بـە کچـی شـوونە کـردوو دەگوتـرێ، کەواتـە: (فتـاة) واتـە: کـچ، بـەڵام لـە زاراوی بەکارهێنـانی قورئـانو سـوننەتی پێغـەمبەریش ﷺدا بـە مانـای (کەنیزەك)ە، وە (فتـاة) کۆیەکـەی (فتيـات) و (فتـی) کۆیەکـەی (فتيـان)ە، جا ئایـا بۆچی ئەم دوو وشەیە بەکـارهێنراون، بۆ پیـاوو ئـافرەتی کۆیلـە؟ لەڕاسـتییدا تەنیـا وەك ڕێـزو حـورمەت لێنـان، وەك لەوبـارەوە پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿لا يَقُولَـنَّ أَحَدُكُـمْ: عَبْـدِي وَأَمَتِـي، وَلكِـنْ لِـيَقُلْ: فَتَـايَ وَفَتَـاتِي﴾، أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد برقـم: (٨١٨٢)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٥٥٢)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٥٨٣٥)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٤٩٧٥)، عَنْ أَبِي هُـرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتـە: بـا یەکێـك لـە ئێـوە نەڵـێ: بەنـدە نێرینـەکەم، وە بەنـدە مێینـەکەم، بەڵـکو بـا، بڵـێ: گەنجەکـەم، وە کچـەکـەم، بۆئـەوەی وشـەی (عَبْـد)و وشـەی (أمـة) بەکارنەهێنرێـن، چونکە پیاوان هەموویان تەنیا بەندەی خوانو، وە ئافرەتانیش هەموویان تەنیا بەنـدەی مێینـەی خوای پەروەردگارن، واتە: ئەو وشـەیەی کە بۆ لای خوای پەروەردگـار بـەکاردەهێنرێو ئینـسـانی پـێ پـاڵ دەدرێتـە خـوای بێوێنـە بـە سـیفەتی بەندایـەتیی، بـا بـۆ جگـە لـە خـوای بـەرزو مـەزن بەکارنـەهێنرێ، ئنجا کـە دەفـەرموێ: ﴿مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ﴾، واتە: لـە کەنیزەکە ئیمانداره‌کانتـان، ئایـا ئافرەتـی کەنیـزەك کـە ئیمـاندار نەبووبـێ، حـوکمی چـۆن بـووە؟ ئایـا دروسـت بـووە بیهێنـێ؟ یـان دروسـت نـەبووە؟ دەڵـێین: مـادام ئایەتەکـە دەفەرموێ: ﴿مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ﴾، کە دیارە ئەوە بۆ هاوسـەرگیـریی یـە، بـەڵام وەك لایـەنی دیکـە کـە بۆیـان هـەبـێ بچنە لایـانو لەگەڵیـان جـووت بـن، وەك سـیفەتی کـەنیزەك بـا ئیمـانداریش نەبووبـن، بۆیـان ڕەوا بـووە،

بەلاَم وەك هاوسەرگیریی كە بە ڕەسمیی وەك هاوسەری خۆی بیهێنێ، كە دیارە ئەو كاتە هەقی هاوسەرایەتیی دەبێ، ئەوە زۆربەی زانایان ڕایان وایە كە ئەگەر ئیماندار نەبوون، دروست نەبووە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكرێ، بەلاَم هەندێكیان دەڵێن: با ئیمانداریش نەبوون دروست بووە، (ئەبو حەنیفە) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە ئایەتی (٥)ی سوورەتی (المائدة) كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: بۆتان حەلاَڵ كراوە ئافرەتانی پاك لەوانەی كە پێش ئێوە كتێبیان پێدراوە (واتە: جوولەكەو نەصرانییو غەیری ئەوانیش)، دەكاتە بەڵگەی ڕەوایی هاوسەرگیرییكردن لەگەڵ ئافرەتانی كافری كۆیلەدا، (ئەبو حەنیفە) دەڵێ: مادام دروست بێ كە ئافرەتانی ئازادی خاوەن كتێبەكان، بە هاوسەر بگیرێن، كەواتە: وەختێك كە دەبن بە كۆیلەش هەر دروستە، بەلاَم واپێدەچێ ڕای زۆربەی زانایان بەهێزتر بێ، چونكە بەڵگەی تایبەتی پێش بەڵگەی گشتی دەخرێو، ئەوەی (ئەبو حەنیفە)ش بەڵگەیەكی گشتییە، كە ئافرەتانی خاوەن كتێبەكان دروستە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكرێ، بەلاَم ئەوەیان كە دەفەرموێ: كەنیزەكێك كە ئیمانی هەبێ بیهێنن، كەواتە: كەسێك ئیمانی نەبێ دروست نیە بكرێ بە هاوسەر، ئەمە بەڵگەیەكی تایبەتەو پێش ئەو بەڵگە گشتییەی (ئەبو حەنیفە) دەخرێ، ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ ﴾، هەر لە باسی ئەوەدا كە ئینسانی ئیماندار كە توانای نەبوو ئافرەتی ئازاد بێنێ، بۆی هەیە هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتی كەنیزەكدا بكات، دوایی دەفەرموێ: وە خوا بە ئیمانتان زاناترە، هەندێكتان لە هەندێكتانن، واتە: لێرەدا ئیمان بە مەرج گیراوە بۆ ئەو ئافرەتە كە هاوسەرگیریی لەگەڵدا دەكرێ، دیارە حیكمەتی ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۡ ﴾یش ئەوەیە كە ئینسان

بـۆی نیە زۆر لـە ئیمانەکـەی بکۆڵـێتــەوە، مـادام بەڕواڵەت خۆی بـە ئیمانـدار پێـشـاندەدات کـە ئیمــاندارەو حوکـم بـە ڕواڵـەت دەکــرێ، وەك زانــایان وەك بنچینـەکـی شـەرعی گوتوویانـە: (نَحْنُ نَحْكُمُ بِالظَّاهِرِ وَاللَّهُ يَتَولَّى السَّرَائِرِ)، واتـە: ئێمـە حـوکم بـە ڕواڵــەت دەکەین‌و نهـێنییەکان حــەواڵەی خـوا دەکـەین، ئەوە یەك، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە خـوای پەنهـانزان بـە ئیمانتـان زانـاترە، دەبینی ئەو ئافرەتە کەنیزەکە لە مێردە ئازادەکـەی بـە ئیمانتــرە لـەلای خـوای پەنهـانزان، وە خۆشــەویـستتـرە لـەلای خـوای بـە بـەزەیی، کەواتـە: ئیمـان بـە شێوەی ڕاستەقینە بـەس خـوا دەیزانـێ، چونکـە خەڵـك ڕواڵەت دەبینــێ، بـەڵام خوا نێو دڵـی ئینسـانەکان دەزانـێ، وە لەلای خوای دادگەریش سـەنگی مەحــەك ئیمانــە، کەواتــە: ئەگــەر توانــای خواســتنی ئــافرەتی ئازادتــان نــەبوو، مەسڵەمێنەوە لە هێنـانی ئافرەتـی کـەنیزەك، هـەر لەبەرئـەوەی کە کەنیزەکە، چـونکە سـەنگی مەحـەك ئیمانـەو خـواش بـە ئیمـان کـە لـە دڵی بەندەکـانیـدا هەیـە، زانـاترە، ئـەوەش کـە دەفـەرموێ: ﴿ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾، هەندێکـتان لـە هەندێکــتانن، واتـە: لـە ڕووی ڕەچــەڵەك‌و نەسـەبیـشەوە، دیـسان هەمووتــان دەچنــەوە سـەر یـەك دایــك‌و بـاب، کەواتـە: ئـەوەش مەکەنـە پـەرچ‌و ئاســتەنگ لەبەردەمی خۆتانـدا، چونکە لەڕاستییدا ئەوە شتێکی کاتییـە، کە ئـەو ئینسـانە دەبێتــە کۆیلــەو ئەویدیکـە بۆتــە ئــازاد، حاڵـەتێکی ســیاسیی‌و کۆمەڵایــەتیی نەخوازراو ئەوەی پەیداکردوە، کە دیارە کاتێـك کـە ئیـسلام هاتوە، ئـەو حاڵەتـە هــەبووە، وەك لـە دەرسـێکی ســەربەخۆدا خـوا پـشتیوان بـێ باسـی مەســەلەی کۆیلـە دەکــەین، داخـۆ لـە ئیـسلامـدا چۆنــە؟ وە ئیـسلام چـۆن چارەســەری کـردوە؟ کەواتــە: ئـەوە بـە شـێوەیەکـی کاتیــی‌و لەبــەر هــەندێ بــارودۆخی نەخـوازراوو نەویستـراو، هەندێك لە پیاوەکان بوون بـە کۆیلـە، وە ئافرەتەکـان بوون بـە کـەنیزەك، لەبەرئـەوە زۆر تەماشـای ئـەوە مەکـەن، چـونکە لـە ئەسڵدا هەمووتان مرۆڤن‌و دەچنەوە سەر یەك بـاب‌و دایك‌و، هەمووتــان وەچــەی یـەك خێــزانن.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ ﴾، بە مۆڵەتی كەسوكاریان بیانخوازن، مارەیان بكەن، ئەوەش زانایان لەسەری یەك دەنگن كە ئەو ئافرەتە كەنیزەكە خاوەنەكەی هەر كەسێك بووبێ، دەبووایە ئەو كەسەی ویستوویەتی بیهێنێ، بچێ لێی بخوازێ، ئنجا لێی مارە بكرێ، وە بێ ئاگاداریی ئەو دروست نەبووە كە لەگەڵ ئافرەتە كەنیزەكەكە رێك بكەوێو مارەی بكات، وەك چۆن لە حاڵەتی ئاساییدا كە خەڵك ئافرەت دێنێ، دیارە دەبێ سەرپەرشتیار (ولـي) ئاگادار بێو ئامادەبێ لە كاتی مارەكردنیدا، بە هەمان شێوەش سەرپەرشتیاری ئەو كەنیزەكانەش دەبووایە ئاگاداربن، ئنجا نەك هەر بۆ كەنیزەك، بەڵكو بۆ كۆیلەش، واتە: نێرینەی ئەو كۆیلانەش، كە ئەگەر هاوسەرگیرییان كردبووایە، دەبووایە بە ئاگاداریی خاوەنەكانیان بێ، واتە: ئەو كەسەی كە گەورەو خاوەنیانە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: «إِذَا تَزَوَّجَ الْعَبْدُ بِغَيْرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ كَانَ عَاهِرًا»، أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥٩) قال البوصيري: هَذَا إسناد حَسَن، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، أخرجه الحاكم برقم: (٢٧٨٧) عَن جابر رضي الله عنه: وقال: صحيح الإسناد، ووافقه الذهبي، وَحَسَّنَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (١٩٣٣)، واتە: هەر كاتێك كۆیلەیەك بێ مۆڵەتی گەورەكەی (خاوەنەكەی) هاوسەرگیریی بكات، ئەوە بە داوێنپیس لەقەڵەم دەدرێ، ئەوە بە نسبەت پیاویانەوە، ئنجا بەنسبەت كەنیزەكیشەوە، ئەوە ئایەتی لەسەرە كە دەبێ بە مۆڵەتی خاوەنەكەی بێ، هەڵبەتە ئەوە لە رووی كۆمەڵایەتییەوە هەروا دەبێ، چونكە خۆ ئەو كەسەی كە خاوەنی ئەو كەنیزەكەیەو لە ماڵی ئەو دایە، بێگومان ناگونجێ كە ئەو كەنیزەكە بچێ بەبێ مۆڵەتی خاوەنەكەی شوو بكات، چونكە خاوەنەكەی دەتوانێ بیفرۆشێ، كە دیارە ئەو كاتە وابووە، هەروەها پیاوەكەش بە هەمان شێوە بۆی نەبووە هاوسەرگیریی بكات، بێ ئاگاداریی ئەو كەسەی كە خاوەنیەتی.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾، مارەییەکـانیان پـێ بـدەن بـە شـێوەیەکی پەسـند، زۆربەی زانایان ڕایان وایـە مـارەیی ئـەو کەنیزەکـانە کـە مـارە دەکـرێن، دەبـێ بدرێتـە دەسـت خاوەنەکانیـان، واتـە: ئـەو کەسـەی کـە خاوەنیـەتی، بـەڵام مـن پـێم وایـە لەبەرئەوەی کە ئایەتەکە بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾، (أجورهُـنَّ)، ڕاناوەکـە دەچێتـەوە سـەر ئافرەتـەکان کـە مـارە دەکـرێن، وە پێموایـە ئـەو قـسانەی دیکـە بەڵـگەیەکی وایـان لەسـەر نیـە، دەڵێم بەڵـکو پێویـستە مارەییـەکە تەسـلیمی خـودی کەنیزەکـەکە بکـرێ، جـا دیـارە کـە ئێـستا ئێمـە قـسە دەکـەین، کۆیلـە نـەماون، بـەڵام لـەوبارەوە توێـژەرەوانی قورئـان زۆر مـشتومڕیان بـووە، چـونکە لـە سـەردەمی ئەوانـدا کۆیلـە هـەبوون، بۆیە زۆر بـە گرنگـیی پێدانـەوە باسـی ئـەو بابەتـەیان کـردوە، وە هەندێکـیان ئـەوە ئایەتـەیان بـە بەڵـگە هێناوەتـەوە، کـە لـە سـوورەتی (النحـل)دا هـاتوە: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدًا مَّمۡلُوكًا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٍ ...﴿٧٥﴾ ﴾، واتـە: خـوا وێنـەی هێناوەتـەوە بـە بەندەیـەك کـە خاوەنـدارە، (واتـە: کەسێك خاوەنیـەتی) توانـای بەسـەر هیـچ شـتێکدا نیـە، گوتوویانـە مـادام خـوای زانـاو توانـا وا دەفـەرموێ: ﴿ لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٍ ﴾، توانـای بەسـەر هـیچ شـتێکدا نیـە، کەواتـە: ئـافرەتێکی کەنیـزەك کـە مـارە دەکـرێ، نـابێ مارەییەکـەی بدرێتـێ، بـەڵام لەڕاسـتییـدا ئـەوە قـسەیەکی گـشتییە، بەڵـێ دەگونجـێ کۆیلـە توانـای بەسـەر هـیچ شتێکدا نەبێ، بەڵام مادام دەقی لەسـەرە کە مـارەیی کـەنیزەك تەسلیمی خـۆی بکرێ، ئەو دەقە گشتییە بەو دەقـە تایبـەتە تایبـەت (تخصیص) دەکـرێ.

**مەسـەلەی شـەشـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٍ ﴾، واتە: ئەو کەنیـزەکانەی کە مارەیـان دەکەن بـا پـاك داوێن بـن، وە بـە ئاشـکرا داوێـن پیـسیی نەکـەن، وە بـە پـەنهانییش دۆسـتیان نـەبن و داوێـن

پیسیی نەکەن، دیارە ئەو کاتەو ئێستاش داوێن پیسیی دوو جۆری هەیە: بە ئاشکرا بووە، وەك چۆن ئێستاش وەك بڵێی نیمچە ئاشکرایە، وەك دەگوترێ: لە فلان شار چەند شوێنی داوێن پیسیی ئاشکرای لێیە، وە حاڵەتی دووەمیش بە پەنهانیی، کە ئەو ژنانەی بە پەنهانیی زینایان لەگەڵ کراوە، پێیان گوتوون: (أخدَان) کە کۆی (خِدْن) و (خَدِین)ە، واتە: (صَاحبة) یان (صدیقة)، جا خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ئەو کەنیزەکانە چ حاڵەتی داوێن پیسیی ئاشکرایان هەبێ، چ حاڵەتی داوێن پیسیی پەنهانییان هەبێ، مەیانهێنن، دەبێ پاك بن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ ﴾، واتە: هەر کاتێك کە بوون بە (مُحْصَنة) یان ﴿ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ ﴾، واتە: خۆیان کرد بە (مُحْصِنَة) کە پێشتر باسمان کرد (مُحْصَنَة)، واتە: پارێزراو، وە (مُحْصِنَة)، واتە: خۆپارێز، ئنجا بە چوار شتان ئافرەت پێی دەگوترێ: (مُحْصَنَة) یان (مُحْصِنَة):

١- بە ئافرەتی مسوڵمان دەگوترێ، چونکە ئیمانو ئیسلام دەیپارێزێ لە داوێن پیسیی.

٢- وە بە ئافرەتێك کە هاوسەردار بێو شووی کردبێ، چونکە هاوسەریش وا دەکات ئەو ئافرەتە بۆ تێرکردنی لایەنی جیسنیی خۆی پێویستی بە داوێن پیسیی نەبێ، ئەگەر ڕەسەنو شەریف بێ.

٣- وە ئافرەتێك کە پاك (عَفیفة) بێ، واتە: پاکڕاگیراو یان خۆ پاکڕاگربێ.

٤- وە ئافرەتێك ئازاد (حُرَّة) بێو کۆیلە نەبێ، کەواتە: وشەی: (مُحْصِنَة) چوار واتای هەن، بە کورتی: مسوڵمان، هاوسەردار، خۆپاك ڕاگر، ئازاد.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ﴾، هەر کاتێك شوویان کرد بە هۆی

شـووکردنەکەوە پـارێزراو بـوون، وە دوایـیش فاحیـشەیەکیان ئەنجامـدا، (واتـە: داوێن پیسییان ئەنجامدا) ئـەوە نیـوەی ئـەوەی کـە لەسـەر ئافرەتـانی ئـازادە لـە سـزا لەسـەریانە، ئافرەتانی ئـازاد سـزایان چـەند لەسـەرە؟ خـوای پەروەردگـار لە سـوورەتی (النـور)دا باسی کـردوە دەفـەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ... ﴿٢﴾ ﴾، واتـە: ئـافرەتی داوێـن پیـسو پیـاوی داوێـن پیـس، یـەکی سـەد قامـچییان لـێ بـدەن، کەواتـە: سـزای ئافرەتێکـی کەنیـزەك کـە زینـای کردبێ، نیوەی ئەوەیـە کـە دەکـاتە پەنجـا قامـچیی، ئنجـا ئـەم ئایەتـە لێـی وەردەگیـرێ کـە لەڕاستییـدا سـزای زینـاکەران بـەس سـەد قامـچییە، ئـەدی مەسـەلەی بەردبـارانـکردن؟! ئـەوە ئـەو زانایانـەی کـە ڕایـانوایـە دەڵـێن: بەڵـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو سزایەشـی بـەکارهێناوە، بـەڵام ئـەو سـزایە لـە قورئـاندا بـاس نـەکراوە، وە کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ... ﴿٢﴾ ﴾النـور، چونکــە ﴿ ٱلزَّانِيَةُ ﴾، لەگــەڵ ﴿ وَٱلزَّانِي ﴾، هەردووکـیان (أل)ی تەعریفیـان لەسـەرە، واتـە: هـەر ئـافرەتێـك کـە زینـا دەکـات، وە هـەر پیـاوێك کـە زینـا دەکـات، یـەکی سـەد قامـچییان لـێبدەن، کاتێـك کـە ئـەم ئایەتـەی سـوورەتی (النور) هاتۆتـە خوار، ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە سـوننەتی خـۆی کردوویـەتی، کـە بریتـی بـووە لـە بەردبارانـکردنی ئافرەتێـك کـە هاوسـەردار بووبـێو زینـای کردبـێ، وە بەردبارانـکردنی پیاوێـك کـە هاوسـەری هەبـێو زینـای کردبـێ، ئـەوەی نەسـخ کردۆتـەوە، هەڵبەتـە بەڵگەکەشـی بـە بـڕوای مـن بەهێـزە، وە زانـایان لەوبـارەوە ڕاجیـایی یـان هەیـە، بـەڵام مـن لێـرەدا هـەر ویـستم ئامـاژەی پێبـدەم، ئەگـەرنا خـوا پـشتیوان بـێو ئەگـەر خـوا تەمـەن بـدات، لـە کـاتی تەفسیـرکردنی سـوورەتی (النور)دا بە درێـژیی باسـی ئـەو مەسـەلەیە دەکـەین، گرنـگ ئەوەیـە کە خـوا ﷻ ڕایگـەیاندوە سـزای ئـافرەتی کەنیزەکـی زیناکـەر

کە هاوسەردار بێ، بریتیە لە پەنجا قامچیی، ئەویش لەبەر چی؟ لەبەر ئەوە بووە کە ئەوان زیاتر بە حوکمی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی حەصانەو پارێزراوییان کەمتر بووە، وە زیاتر دەرفەتی ئەوە هەبووە کە تووشی خراپە ببن، وە لە ڕووی پەروەردەیی یەوە کەموکوڕیی یان زیاتر بووە، بۆیە خوای بەخشەر سزایەکەشی بۆ سووکتر کردوون.

**مەسەلەی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ﴾، ئا ئەو مۆڵەتە (کە دروستە پیاوێك توانای نەبێ ئافرەتی ئازاد بێنێ، ئافرەتی کەنیزەك بە هاوسەر بگرێ)، بۆ کەسێکە لە ئێوە کە بترسێ بکەوێتە مەشەقەتەوە، واتە: بە هۆی ئەوەوە کە ئارەزووی جینسیی هەڵیدەپێچێ، بکەوێتە مەشەقەتەوەو خۆی بۆ مەرزەم نەکرێ، یاخود بترسێ کە تووشی گوناح ببێ، وە وشەی: (عَنَتْ) پێشتریش باسمان کرد دەڵێ: (العَنَت: كَسْرُ العَظْمِ بَعْدَ الجَبْرِ) واتە: ئێسقانێك کە پێشتر شکابێ دوایی هەڵبەسترابێتەوە، دوایی شکابێتەوە، دیارە ئەو کاتە ئازاری زیاترە، لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ بۆ کەسێك کە مەترسیی ئەوەی هەبێ، بۆی هەیە ئەو مۆڵەتە کار پێ بکات، هەڵبەتە ئەوەش ڕاجیایی تێدایە لەنێو زانایاندا:

هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر، ئەوەی کە مەترسییشی نەبێ، بۆی هەیە ئەوە بکات، بەڵام خوای پەروەردگار لێرەدا حاڵەتی زۆربەی لەبەرچاو گرتووە، چونکە زۆربەی خەڵك ئەگەر هاوسەرگیریی نەکرد لەگەڵ ئافرەتانی ئازاددا، تووشی مەشەقەت دەبێ بە هۆی خۆ کۆنترۆڵکردنەوە، یاخود تووشی گوناحو هەڵە دەبێ، بۆیە خوای کاربەجێ وایفەرمووە.

کەواتە: لەم ڕستەو ڕستەکانی دیکەی پێشێ، وەردەگیرێ کە بە هاوسەر گرتنی ئافرەتانی کەنیزەك، چوار مەرجی هەن:

١/ ئەو پیاوە دەبێ توانای هێنانی ئافرەتی ئازادی نەبێ، لەڕووی داراییەوە.

٢/ ئەو ئافرەتە کەنیزەکە، دەبێ ئەهلی ئیمان بێ.

٣/ دەبێ ئەو کەنیزەکە، داوێن پاك بێ.

٤/ ئەو پیاوە دەبێ مەترسیی ئەوەی هەبێ، کە خۆی پێ ڕانەگیرێ‌و تووشی گوناح ببێ، یان زۆر نارەحەت ببێ.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْۚ وَأَن تَصْبِرُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾، وە ئەگەر خۆڕابگرن چاکترە بۆتان، لەبەر چی؟ واتە: ئەوەی توانای هێنانی ئافرەتی ئازادی نیە، ئەگەر کەنیزەکیش نەهێنێ بە مەرجێك خۆڕابگرێ، قازانجی زیاترەو باشترە، لێرەدا مەبەستی پێ چییە؟ دیارە مەبەستی ئەوە نیە کە لە ڕووی ئینسانیی‌و ئیمانییەوە ئافرەتی ئازاد لە کەنیزەك باشترە، چونکە خوا پێشێ مەدحی ئەو ئافرەتە کەنیزەکانەی کردو فەرمووی: ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ﴾، کەواتە: لێرەدا مەبەست پێی لایەنێکی دیکەیە، ئەویش وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست پێی لایەنی منداڵەکانیەتی، واتە: پیاوێك کە ئافرەتێکی کەنیزەك دێنێ، دیارە کاتی خۆی وابووە، ئافرەتی کەنیزەکیان کە هێناوە ئەو ئافرەتە کەنیزەکە باش پەروەردە نەکراوە، ڕەنگە بە هەندێ عادەتی خراپەوە ڕاهاتبێ، پاشان ئەو ئافرەتە کەنیزەکە بێکەس بووە، چونکە باب‌و مام‌و براو خەڵکی دیار نەبووە، بەڵکو لە شوێنێکی دیکەڕا هاتووە فرۆشراوە، کەواتە: ئەو کاتە کە منداڵەکان لە دایك دەبن، نازانن خاڵیان کێیە؟ نەنکیان کێیە؟ پووریان کێیە؟ وە هەموو یان زۆربەی خزمەکانی دایکیان ناناسن!! ئنجا لە ڕووی پەروەردەشەوە کە بە دڵنیایی ئەو باوەشی ئافرەت‌و کۆشی دایکە کە منداڵی تێدا پەروەردە دەکرێ، زۆر کاریگەریی هەیە لەسەر ئەو منداڵە کەواتە: لەو ڕووەوە خوای کاربەجێ فەرموویەتی وا باشترە خۆڕابگرن‌و، ئەگەر زۆر ناچارو نارەحەت نەبن، ئافرەتانی کەنیزەك نەهێنن، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە لە ڕووی ئینسانییەوەو لە ڕووی ئیمانییەوەو لە ڕووی پارێزکارییەوە، نوقصانیان بداتە پاڵ، نا، بەڵکو لەو ڕووانەوەیە کە ئاماژەمان پێکردن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٦ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ٢٧ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ٢٨ ﴾، لێرەدا کە خوا ﷻ بە ئێمەی ڕادەگەیەنێ: خوا ئەوەی دەوێ، خوا ئەوەی دەوێ، سێ جاران، بە دڵنیایی دیارە ئەو شتەی کە خوا دەیەوێ، وە ئیرادەی خۆی پێشانی ئێمە دەدات، ئەوە شتێکی زۆر گرنگە، هەڵبەتە لێرەدا ئەوەی پێویستە بیزانین ئەوەیە کە مەبەست لە: ویستی خوا (إرادة اللّه) لێرەدا ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ ﴾، یان ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ ﴾، واتە: ئیرادەی شەرعیی خوا، نەك ئیرادەی قەدەریی (تکويني) چونکە ئیرادەی خوای پایەدار دوو جۆرە:

١) **ئیرادەی تەکوینیی:** بریتیە لەوەی کە خوا ویستوویەتی ئێمە دروست بکات، بوون دروست بکات، ئیرادەی تەکوینی خوا هیچ شتێکی لێ هەڵناوێردرێ، وەك: ئاسمان وایە، وەك چۆن هەموو شتێك لە ژێر سێبەری ئاسمان دایە، هیچ شتێکیش بێ ئیرادەی خوا نابێ و ناکرێ، ئەوە ئیرادەی تەکوینیی پێ دەڵێن، وە ئیرادەی قەدەریی (الإرادة القدرية)یشی پێ دەڵێن، ئیرادەیەکە قەدەری خوایە.

٢) **ئیرادەی شەرعیی:** کە ئیرادەی ئەمریشی پێ دەڵێن، وە لێرەدا ئەوەیان مەبەستە، واتە: کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ ﴾، واتە: خوای زانا دەیەوێ کە لە شەریعەتەکەی خۆیدا بۆتان ڕوون بکاتەوە، یان کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، خوا دەیەوێ لێتان ببووری، ئەوە لێرەدا ئیرادە ئیرادە شەرعییەتەکەیەتی، واتە: خوای بە بەزەیی بە شەرعیی خۆی واتان لێ دەکات کە شتێکی وا بکەن لێتان ببووری،

یان کە دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ﴾، دیسان مەبەست ئیرادە شەرعییەکەیەتی، واتە: خوا بە ئیرادەی شەرعیی خۆی دەیەوێ ئەو حوکمانەتان لەسەر سووك بکات، بۆچی ناچارین وا بلێین؟ چونکە ئەگەر ئیرادەی تەکوینی بێ، هەرچی خوا ویستوویەتی دەبێ، کەواتە: خوا کە دەفەرموێ: خوا دەیەوێ بۆتان ڕوون بکاتەوە، ئەوە دیارە کە خوای بێوێنە بە شەریعەتەکەی بۆی ڕوونکردووینەوە، بەڵام ئایا هەموو کەس ڕوونکردنەوەی خوا وەردەگرێ؟ یان کە دەفەرموێ: خوا دەیەوێ لێتان ببووری، ئایا خوا لە هەموو کەس دەبووری؟! یان کە دەفەرموێ: خوا دەیەوێ لەسەرتان سووك بکات، ئایا خوا لەسەر هەموو کەس سووك دەکات؟! ئایا هەموو کەس ئەرکە شەرعییەکانی لەسەر شان سووکە؟! نەخێر، کەواتە: لێرەدا مەبەست پێی ئیرادەی شەرعییە، جا لێرەدا خوا ﷻ چوار شتی خستوونەڕوو، کە دەیەوێ بۆمان بکات:

<u>یەکەم</u>: ڕوونکردنەوە: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ ﴾، دیارە لە دەقی ئایەتەکاندا دەرینەخستوە کە دەیەوێ چیمان بۆ ڕوون بکاتەوە ! بەڵام بەپێی سیاقەکە بۆمان دەردەکەوێ کە حەڵاڵو حەرامە، کەواتە: خوا دەیەوێ یاساکانی شەرع، حەڵاڵو حەرامتان بۆ ڕوون بکاتەوە، وە بێگومان لە شەریعەتی خۆیدا بۆی ڕوون کردووینەوە.

<u>دووەم</u>: ڕێنماییکردن بۆ یاساکانی پێشووان: ﴿ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾، ئەمە ویستراوی دووەمە، کە خوا ﷻ ویستوویەتی چیمان بۆ بکات ؟ دەفەرموێ: وە خوا دەیەوێ کە یاساکانی ئەوانەی پێش ئێوە، بۆ ئێوە ڕوون بکاتەوە، واتە: یاساکانی خوا کە لە ژیانی میللەتانی پێش ئێوەدا هاتوونە دی، بۆتان ڕوون بکاتەوە، ئنجا بە کردەوەش خوای زاناو شارەزا، ئەو یاسایانەی کە بەسەر میللەتانی پێشوودا هاتوونە دیو چەسپاون، بۆی ڕوون کردووینەوە.

سێیەم: لێخۆشبوون: ﴿ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ﴾، ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ ﴾، وە خوا دەیەوێ لێتان ببوورێ، ئەوەش وایەو ڕاستە، چونکە خوای بە بەزەیی بە شەریعەتی خۆی داوای لێکردووین، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴿٨﴾ ﴾التحریم، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تۆبە بکەن، بە گەڕانەوەیەکی ساغ، کەواتە: خوا بۆخۆی بە شەرع داوای لێکردووین بگەڕێینەوە بۆ لای، بۆئەوەی لێمان ببوورێ، ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ ﴾، ئەم مەسەلەیەی دووجار دووبارە کردۆتەوە، لەبەرئەوەی خوا بە ئیرادە تەشریعییەکەی زۆری مەبەستەو دەیەوێ لێمان خۆشبیو بمانبوورێ.

چوارەم: لەسەر سووککردن: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ﴾، خوا دەیەوێ لەسەرتان سووك بکات، واتە: یاسا شەرعییەکانتان لەسەر سووك بکات، لە شتێکدا کە دەزانێ ئەوەتان بۆتان ناکرێ، مۆڵەتی داون، یاخود ئەو فەرزە دوادەخەن، یان کورتی دەکەنەوە، ئێستا نایکەن دوایی دەیکەن، وەك نەگرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان، لە کاتی سەفەرو لە کاتی نەخۆشییدا، کە ئینسان بۆ هەیە دوای بخات، ئنجا دیارە ئەو چوار ویستراوە شەرعییە، هەر چواریان شتی گەورەو گرنگن، بۆیە خوای پەروەردگار ئاوا بە گرنگیی پێدانەوە باسی کردوون.

**مەسەلەی دوازدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾، مرۆڤ بێهێز دروست کراوە، لە چ ڕوویێکەوە؟ بەپێی سیاقی ئایەتەکان، وە زۆربەی توێژەرەوانی قورئانیش دەڵێن: واتە: لە بەرانبەر ئارەزووەکاندا، بەتایبەتی لە بەرانبەر غەریزەی جینسییدا مرۆڤ بێهێزە، زانایان باسیان کردوە کە زاڵترینو بەهێزترین غەریزە لە ئینساندا، بریتیە لە غەریزەی

جینسیی، کە زۆر بەهێزەو ئینسان تووشی هەڵەو پەڵە دەکات، ئەگەر خۆی کۆنتڕۆڵ نەکاتو لەخۆی وریا نەبێ، کەواتە: ئەو بێهێزییەی ئینسان لەو ڕووەوەیە، هەڵبەتە لە ڕووەکانی دیکەشەوە ئینسان بە بەراورد لەگەڵ زۆر لە دروستکراوەکانی خوادا بێهێزە، بەڵام زۆرجار مرۆڤ لەخۆی بایی دەبێو لە بێهێزیی خۆی بێئاگا دەبێ، وەك دەڵێن: تاکو سەری بە بەردی ئەلحەدێ دەکەوێ، وە تووشی نسکۆیەكو نەخۆشییەك دێ، ئەوجار تەماشا دەکات: مێشوولەیەك، میکرۆبێك، ڤایرۆسێك، کە نابیندرێ، لە پەلوپۆی دەخات، پێشێش شان ڕادەوەشێنێ، بە کەشخەو فیزەوە دەڕوا، پێی وایە دەتوانێ عەرز بدڕێ!! وەك خوای بێهاوەڵ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾﴾ الإسـراء، واتە: ئەی ئینسان ! بە فیزو کەشخەوە بە زەویدا مەڕۆ، چونکە مسۆگەر تۆ ناتوانی زەوی بدڕی، وە ناشتوانی بەقەد شاخەکان بەرزبی، بەڵام ئینسان زۆرجاران لە ئەنجامی لە خوا بێئاگا بوون لەخۆی بێئاگا دەبێ، وە هەست بە بێهێزییەکانی خۆی ناکاتو خۆی زۆر پێ بەهێزە، بەڵام خوای هێدیی‌و ئارام وەك حەقیقەتێك دەیخاتە بەرچاوی ئینسان، کە بێهێز خوڵقێنراوە، وە خوای بە بەزەیی ڕەچاوی ئەو بێهێزییەی ئینسان دەکاتو، ئاگای لێیەتی لەقەدەر ئەو بێهێزییەی مۆڵەتی دەداو حوکمە شەرعییەکانی لەسەر سووك دەکات، لە کاتێکدا کە پێویستی پێی دەبێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەشتەم

## لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی كۆیلەو كەنیزەكەوە

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان تەرخان كردوە بۆ لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی كۆیلەو كەنیزەك (العبد والجارية) دیارە من لە چوار خاڵی سەرەكییدا باسی كۆیلەو كەنیزەك دەكەم، كە لە ڕووانگەی ئیسلامەوە: ئەو دیاردەو حاڵەتە چۆن هەڵدەسەنگێندرێ؟ وە چۆن بووە؟ وە ئیسلام هەڵوێستی لە بەرانبەریدا چی بووە؟ وە ئایەتەكانی قورئانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن تەماشای ئەو مەسەلەیان كردوە ؟! لە چوار خاڵدا دەیخەینە ڕوو:

**خاڵی یەكەم: ئیسلام چۆن تەماشای كۆیلایەتیی دەكا؟!**

هەر كەسێك شارەزای ئیسلام بێ، وە شارەزای دەقەكانی قورئانو ئایەتەكانی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، ناهەقی نیە سەری سووڕبمێنێ لە مەسەلەی كۆیلایەتی (الرّق)، واتە: كە مرۆڤێك ببێ بە موڵكی كەسێكی دیكە، وە ئەو كەسەی كە دەبێتە خاوەنی بۆی هەبێ بیفرۆشێ، بۆی هەبێ بەكاری بێنێ لە ئیشوكاردا، وەك چۆن بۆی هەیە كەلوپەلی دیكە بفرۆشێو مامەڵەی پێ بكات، وە ئەو ئینسانە خاوەنی خۆی نەبێ، كە لە كوێ بێ؟ لە كوێ نەبێ؟ وەچی بكاتو چۆن بكات؟ خاوەنی خۆی نەبێ، هەر كەسێك شارەزای ئایەتەكانی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بێ، هەقی خۆیەتی كە سەری سووڕبمێنێ!! كە شتێكی وا لە ئیسلامدا هەبێ، بەتایبەتیش كە تەماشای ئەم ئایەتو فەرمایشتانە دەكات:

١/ خـوای پەروەردگـار لـە سـوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾، واتە: ئەی خەڵکینـە! ئێمـە ئێوەمـان لە نێرو مێیـەك دروسـت کردوە، دوایـی گـێڕاومانن بـە چـەند گەلو تیـرەیەك تاکـو یەکدی بناسـن، بەڕێزترینتـان لـەلای خـوا پارێزکارترینتـانە، بێگومـان خـوا زانـای شـارەزەیـە.

کەواتـە: هـەموو خـەڵك بـە کۆیلـەو ئـازادەوە کە کـاتی خـۆی کۆیلـە بـوون، دەچـنەوە سـەر بـابو دایکـێك، وە بەڕێزترینیـشیان لای خـوای پەروەردگـار ئەوەیـە کـە پارێزکـارتـر بـێ.

٢/ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾النسـاء، واتـە: ئـەی خەڵکینـە ! پـارێز لـەو پەروەردگـارەتان بکـەن کــە لــە یــەك نەفــس هـەمووتانی دروسـت کـردوە، هـەر لـەو جـۆرە نەفــسـەش هاوســەرەکەیــشــی هێنــاوەتە دی، {کــە (ئـــادەمو حـــەووا)ن، ســــەلامی خوایــان لـــێ بـــێ} ، وە لەوانــــەوە پیــــاوانو ئافرەتـانێکــی زۆری بـڵاوکـردوونەوە...

کەواتـە: هـەموو پیـاوانو ئافرەتـان بـە هـەموو جۆرەکـانییەوە، لـەو دوو نەفسـەوە هاتوون.

٣/ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾ البـقـرة، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانــەی پێـش ئێوەشـی دروسـت کـردوە، بۆئـەوەی پارێــزی لــێ بکــەن، واتـە: هـەمووتـان بێ جیاوازیی بـەس عیبـادەتی خوا بکـەن، بۆئـەوەی ببـن بە ئەهلـی تەقـوا.

٤/ وە پاشان کاتێك دەبینی کە پێغەمبەر ﷺ ڕوو لە کۆمەڵگای خۆی دەکات بەرەو کەعبە ڕادەوەستیّو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ، وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ، لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ، إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنْ الْجِعْلانِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتِنَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٧٩١) تَعليق شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ حَسَن، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١١٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٩٥٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ وَحَسَّنَهُ الألباني في (سلسلة الصحيحة) برقم: (٢٧٠٠)، واتە: بێگومان خوا خۆ هەڵکێشانی سەردەمی نەفامییو شانازییکردن بە بابو باپیرانی لە ئێوەدا لابردوە، (واتە: بۆتان نیە وابکەن) خەڵك دوو کەسن: ئیمانداریێکی پارێزکار، خراپەکارێکی حاڵ خراپ، (یان ژیان تاڵ) ئێوە ڕۆڵەی ئادەمن، ئادەمیش لە گڵە، با پیاوانێك شانازییکردن بە کەسانێکەوە واز لێبێنن کە بوون بە ڕەژووو خەڵوز لە دۆزەخدا، ئەگەرنا لەلای خوا لەو قالۆنچەیە کەمتر دەبن، کە بە لووتی خۆی ڕیخو پیسایی دەکاتە تۆپو پاڵی پێوە دەنێ، (واتە: خوای دادگەر وەك ئەو قالۆنچەیە بە بێڕێزیی[١] تەماشایان دەکات، ئەگەر شانازی بە بابو باپیرانیانەوە بکەن بە ناهەق).

٥/ وە لە حەجی ماڵئاوایی (حَجَّةُ الوَدَاع)دا کە زیاتر لە سەد هەزار حاجی لە هاوەڵان لە خزمەتی دابوون، فەرموویەتی: ﴿أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ، كُلُّكُم من آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ، وَلَيْسَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ فَضْلٌ إِلاَّ بِالتَّقْوَى، أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ فاشْهَد، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ﴾، خطبة حجة الوداع، مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبويّة والخلافة الراشدة، محمد حميدالله برقم: (٢)، واتە: ئەی خەڵکینە ! بێگومان پەروەردگارتان یەکێکە، وە بێگومان بابیشتان یەکێکە،

---

١) واتە: ئەو قالۆنچەیە لەلای ئێوە چەندە بێڕێزو بێ بایەخە، ئەو جۆرە کەسانەش لەلای خوای دادگەر، ئاوان.

وە هــەمووتان لـە ئـادەمن‌و ئادەمیــش لـە گڵــە، بابـای عــەرەب پلــەی نیـە بەسەر بابای غەیرە عەرەبدا، مەگەر پارێـزكارتربێ، ئایا پێـم ڕاگـەیاندن ؟! ئەی خوایـە ! شـایەد بە، گوتیـان: بەڵـێ، فـەرمووی: بـا ئـەوەی كـە ئامـادەیە، بـەو كەسـەش ڕابگـەیەنـێ كە لێرە نیـە.

كەواتـە: ئـەو ئایەتـــانەو ئـەو فەرمایـشتانەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ زۆر ڕوون‌و ڕاشكاون، كە خواو پێغـەمبەری خـوا ﷺ وە دینـی خـوا، بـە یـەك چـاو تەماشـای هـەموو مرۆڤەكـان دەكـات‌و هیـچ جیـاوازیی‌یان نیــە.

كەچی لەولاشەوە لە كتێبـە شـەرعییەكاندا دەبیسـترێ باسی كۆیلـەو سـەید دەكرێ، وە خوای پەروەردگاریش لـە ئایەتەكـانی قورئانـدا ئامـاژەی پێكـردوە، وە هەروەها پێغەمبـەری خواش ﷺ لە فەرمایشتەكانیـدا باسـی كـردوە، بۆیــە مرۆڤ هــەقی خۆیــەتی كــە ســەریــسووڕبمێنـێ، كـە ئـایـا ئــەم مەســەلەیە چۆنـە؟! مـادام خـوای دادگـەر بـە یـەك چـاو تەماشـای هـەموویان دەكـات، ئـەدی بۆچـی لـە قورئانـدا، وە لـە سـوننەتی پێغەمبـەردا ﷺ باسـی كۆیلـەو سـەید كـــردوە ؟!! دیـــارە ئــەم مەســـەلەیە لەلایــەن كەســـانێكەوە كــە شـــارەزای مێــژوونین، یاخـود بـە غــەرەزن بەرانبــەر ئیـسلام، زۆرجــار دەورووژێنـــرێ بۆ شـكاندنی ئیـسلام، یان بۆ ناشـیـرینـكردن‌و لەبەرچـاو بێزرانـدنی ئیـسلام، تا بڵێن: بزانن ئیـسلام چی تێدایە !! وە ئیـسلام باســی چـی كـــردوە !! بــەڵام با تەماشـای خـاڵی دووەم بكـەین، ئنجـا ئـەو سـەرسـووڕمانە لادەچـێ‌و، پاشـان بـە خـاڵەكـانی سـێیەم‌و چـوارەمیش سەرسـووڕمانەكەمان هـیـچ شـوێنەواری نامێنـێ.

**خــاڵی دووەم: ئـایـا دیـاردەی سـەیدو كـۆیلایەتیـی لە كـاتی هاتنــی ئیـســلامدا چــۆن بـووە؟!**

كاتێك كە ئیسـلام هـاتوە، ئەو دیـاردەیە كە خـەڵـك دابـەشبـێ بۆ دوو جۆر: ئــازادو كۆیلــە، ئازادەكــان خــاوەنی كۆیلــەكانن، كۆیلــەكان دەكــڕن‌و دەفرۆشـــن‌و مامەڵەیـــان پـــێ دەكــەن، وەك ئـــاژەڵ‌و كەلـوپــەل، كاتێــك كــە ئیـسـلام هــاتوە

بارودۆخی خەڵکی دنیا بەو شێوەیە بووەو، ژمارەی کۆیلە لە ژمارەی ئازادەکان زۆر زیاتر بووە، وە (ئەفلاتوون) لە کۆمارەکەی خۆیدا[1]، باس دەکات کە کاتی خۆی جۆرێك لە سیستەمی دیمۆکراسیی هەبووە، باس دەکات کە کۆیلە بۆیان نەبووە لە هەڵبژاردندا، دەنگ بدەن، هەروەها ئافرەتیش بۆیان نەبووە، ئنجا کۆیلەکان چەند بەرانبەری ئازادەکان بوونو جاری وا هەبووە، یەك کەسی ئازاد هەشت نۆ نەفەری کۆیلەی هەبووە، کەسی وا هەبووە سەد کۆیلەی هەبووە، کەسی وا هەبووە هەزار کۆیلەی هەبووە، وە کۆیلەکان زۆر زۆر زیاتر بوون لە ئازادەکان، کاتێك کە ئیسلام هاتوە دنیا ئاوا بووە، کەواتە: ئیسلام ئەو دیاردەیەی دروست نەکردوە، بەڵکو کە ئیسلام هاتوەو ئایەتەکانی خوای پەروەردگار دابەزیون، واقیعیی بەشەر بەو شێوەیە بووە.

ئنجا ئایا ئەو ڕێیانەی کە خەڵکی لێیانەوە کراون بە کۆیلە، چەندو چۆن بوون؟ من تەماشای چەند سەرچاوەیەکی مێژوویيم کردوە، بە لای کەمەوە یازدە ڕێ هەبوون کە خەڵك لێیانەوە کراون بە کۆیلە، کە بەکورتیی ئاماژەیان پێدەکەین:

١- دیلیی جەنگ: کە ئەو جۆرە دیلە یەکسەر کراوە بە کۆیلە.

٢- ڕفێنراویی: باند هەبوون، باندی مافیا، ئەو کاتە جەردەو ڕێگر بەسەر تیرەکانیاندا دەداو، بەسەر گەلێکیاندا دەداو، هەرچی کەوتۆتە بەردەستیان لە ژنو پیاوو منداڵ، هێناویانەو کردوویانە بە کۆیلە.

٣- قەرزدار: کەسێك قەرزی لەسەر کەسێك هەبووە، قەرزداریش نەیتوانیوە قەرزەکەی بداتەوە لەکاتی خۆیدا، بابای خاوەن قەرز، قەرزدارەکەی کردوە بە کۆیلە، ئەو کاتی سیستەم وابووە.

٤- دزییو چەند تاوانێکی دیکە: کەسێك دزیی لە کەسێك کردبێ، لە زۆر دەوڵەتاندا سزاکەی ئەوە بووە کە ببێتە کۆیلەی ئەو کەسەی کە دزیی

---

١) کە بە کۆماری ئەفلاطوون (جمهورية أفلاطون) ناسراوە.

لێکـــردوە، وەك لــە ســـوورەتی (یوسـف)دا خـوای پەنهـانزان دەفـەرموێ:

﴿قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾﴾،

برایـەکانی یوسـف گوتیـان: سـزای ئـەو کەسـەی کـە دزیـی کردبـێ، ئـەو شتەکەی لە بارەکـەیدا بدۆزرێتـەوە، سـزایەکەی ئەوەیـە کـە ببێتـە کۆیلـە، ئاوا سـزای ستەمکاران دەدەیـن.

٥- راکـردن لـە جـەنگ: هـەر کەسـێك لـە جـەنگ ڕای کـردبێ، کردوویانـە بـە کۆیلـە.

٦- ئینتیما بۆ گەلێکی تایـبەت: جاری وابـووە گەلـێك دەستەڵاتی هـەبووە، بـۆ نمـوونـــە: دەوڵـەتێـــك دەســـتەڵاتی هـــەبووە بەســـەر فلانـــە گەلـــدا، گوتوویانـە: ئـەو گەلـە هـەمووی بـە کۆیلــە لەقەڵـەم دەدرێ، لەبەرئـەوەی بەسـەریاندا زاڵـن، وە خسـتوویاننە ژێـر ڕکێـفی خۆیـانەوە.

٧- هـەژاریـی: لـە ئـەنجامی هەژارییـدا کەسـی وا هـەبووە خـۆی فرۆشـتوە، هەبووە خێـزانو منداڵەکانی فرۆشـتوونو بـوون بە کۆیلـە.

٨- ڕاکردنی ژن لە مێـردی: ژنێك لە مێردەکەی خۆی ڕایـکردبـێ، بە حوکـمی بـاوی زۆر لە دەوڵـەتان، بووە بە کۆیلـەی مێردەکـەی.

٩- ڕاکردنـی منـداڵی بە ڕۆڵـەکراو (مُتبنّـي): کەسـێك کەسـێکی کـردوە بـە منـداڵی خۆی، ئەگەر ڕای کـردبێ، دوایی کردوویـەتی بە کۆیلـە.

١٠- منــداڵی کۆیلـە بـوون: واتە: ئەو ئافرەتو پیـاوانەی کـە بۆخۆیـان کۆیلـە بوون، منداڵەکانیشـیان بە کۆیلە دانراون.

١١- دەسـتبەرداربوونی هۆزێـك بـۆ کەسـێکی تاوانبـارو تەسـلیمـکردنی بـەو هـۆزەی کە تاوانەکەی بەرانبـەر کـردوون، ئـەوانیش یـان دەیانکوشت، یـان دەیانکردە کۆیلـە.

ئەوانـە یـازدە ڕێ بـوون، بـۆ بـوونی خەڵـك بـە کۆیلــە، وەك: لـە کتێبـی (قـصة الحـضـارة)ی (ویـل دیورانـت)، ترجمـة: د. زکـي نجیـب محمـود، ص:

(٤٦٩)، و کتیبی: (الرق ماضِیهُ وحاضرهُ) للأستاذ عبدالسلام الترمانیتي، ص: (٣٨)دا هاتوە.

**خاڵی سێیەم: ئیسلام چۆن دیاردەی کۆیلایەتیی چارەسەرو بنبڕ کرد ؟**

ئنجا با بزانین ئیسلام کە ئەو واقیعەی بینی، چی کرد؟ ئیسلام دینێکی واقیعییە، کە هاتوە شتێکی وا دەبینێ، دیارە ناگونجێ وازی لێ بێنێ، وە ناشگونجێ ئیسلام بە نووکە قەڵەمێك ئەوە هەڵبوەشێنێتەوە، جا ئەوە ئیسلام لەلای خۆشیەوە گوتیشی: دەبێ هەڵبوەشێتەوە، بەڵام ئایا هەڵدەوەشێتەوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە مەسەلەی هەبوونی کۆیلەو سەید، پەیوەندیی هەبووە بە سیستەمی سیاسیی، سیستەمی ئابووریی، سیستەمی کۆمەڵایەتیی، وە کلتوورێکی ڕیشەدارو قووڵبووەوەی لەنێو میللەتاندا هەبووە، لەبەرئەوە بە نووکە قەڵەمێك لاناچێ، وە بەتایبەتیش کە ئیسلام قەوارەیەکی سیاسی تازە پێگرتوو و تازە پێگەیشتوو بووە، کە زۆر دەوڵەتان هەر دانیان پێدا نەهێناوە! بۆ وێنە: کاتێك سوپای ئیسلام چووە جەنگی کردوە لەگەڵ دەوڵەتی فارسدا، گوتوویانە: ئێمە تا ئێستا خێرمان پێ دەکردن !! ئێوەی عەرەبی فەقیرو نەدارو بێدەستەڵات، ئەگەر برسیتانە وەرن با هەندێك پارەو شتتان بدەینێو بڕۆنەوە، هەروەها ڕۆم هەر گاڵتەیان پێکردوون، جا بێگومان دەوڵەتێكو قەوارەیەکی تازەی ساوای ئاوا، ناتوانێ بڕیارێکی وا بدات، ئەگەر بیشیدا دیارە لێی وەرناگیرێ.

پاشان کەسێك بە ژیانی کۆیلایەتییەوە ڕاهاتبێ، بە سەبرێكو دوو قووان فێری ئازادیی نابێتەوە، واتە: ئەگەر گوتیان: ئەی کۆیلەکان ئێوە ئازادن، ڕەنگە زۆر لە کۆیلەکان دوایی چوو بانایەوە لای خاوەنەکانیانو گوتبایان: ئاخر نازانین کەسابەت بکەین، نازانین خۆمان بژێنین، نازانین بەڕێوە بچین!! لەبەرئەوە ئیسلام هەڵساوە بە شێوەیەکی پلەپلەیی ئەو دیاردەیەی چارەسەر کردوە، ئەویش بە دوو قۆناغ:

قۆناغی یەکەم: ئیسلام هاتوە هەموو ئەو سەرچاوانەی کە کۆیلەیان لێوە دێ، وشکی کردوون، چەند حەکیمانەیە !! سەرچاوەکانی هەموو وشك کردوون، با تەماشا بکەین:

١/ چارەسەری دیلی جەنگ: دیارە لە سەرەتاوە دەوڵەتی ئیسلامیی مامەڵەی هاووێنە (بالمِثْل)ی کردوە، مامەڵەی وەك خۆی لەگەڵ دوژمناندا کردوەو دیلەکانی جەنگی کردوون بە کۆیلە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر واینەکردبایە، تۆ هی ئەو دەگری دوایی بەریدەدەی، ئەویش هی تۆ بکات بە کۆیلە، مانای وایە خەڵك زیاتر هاندەدرێ لەسەر ئەوە کە شەڕ لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بکات، دەڵێن بڕۆن ئەگەر نەکوژران خۆ دوایی هەر بەرتان دەدەن، چونکە ئەوان کەس ناکەن بە کۆیلەو کەس ناکەن بە دیل، لەبەر ئەوە ئیسلام ناچار بووە وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بەڵام ئایا دوا بڕیاری شەریعەت دەربارەی دیلەکانی جەنگ چییە؟ لە ئایەتی ژمارە (٤) لە سوورەتی (محمد)دا وەڵامی ئەم پرسیارە دراوەتەوە، بەڵام بێگومان ئەو قسەیەی من دەیڵێم مەرج نیە هی هەموو زانایان بێ، ئێستاش هەندێك زانا هەن، لە مێژوودا دەژینو بە جۆرێکی دیکە بیر دەکەنەوە، بەڵام من لە ڕووی قورئانو سوننەتەوە قسە دەکەم، نەك لە ڕووی فیقهەوە، کە زانایان هەڵیان هێنجاوە بەپێی ئەو بارودۆخەی بۆ خۆیان تێیدا بوونو، ئەو واقیعە سیاسییو کۆمەڵایەتییەی کە خۆیان تێیدا ژیاون، کە بێگومان زۆربەیان لەژێر زەختو فشاری واقیعە سیاسییو کۆمەڵایەتییەکەی خۆیاندا تەماشای قورئانو سوننەتیان کردوە، بەڵام ئەگەر ئێمە تەماشا بکەین یەك ئایەت لە قورئاندا نیە بڵێ: خەڵك بکەن بە کۆیلە، وە تاکە ئایەتێك دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا هاتبێ، ئایەتی ژمارە (٤)ە، لە سوورەتی (محمد)، کە دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن

﴿ لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ ﴾،

واتە: جا هەرکات بەوانەی بێبڕوان گەیشتن لە جەنگدا، لە گەردنیان بدەن، هەتا ئەگەر شڕتان کردنو، لە پەلوپۆتان خستن، ئنجا بیانکەنە دیل، {باشە ئەوە کردیانن بەدیل، دوایی چییان لێبکەن؟} دەفەرموێ:

﴿ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، ئەو دیلانەش دوایی یان بە خۆڕایی بەریان بدەن، یان بە قەرەبوویەك بەریان بدەن، نەیفەرمووە بیانکەنە کۆیلە، لە قورئاندا هیچ دەقێك نیە کە بفەرموێ: دیلی جەنگ بکرێتە کۆیلە، کە گەورەترینو فراوانترین ڕێگەو دەروازەیەك کە خەڵکی لێوە کراوە، بە کۆیلە، دیلی جەنگ بووە، بەڵێ ئیسلام قەدەغەی کرد کە دیلی جەنگ بکرێ بە کۆیلە، بەڵام ئەگەر ئێستا یەکێك تەماشای کتێبە فیقهییەکان بکات، دەبینێ، دەڵێ: حوکمڕانی مسوڵمان سەرپشکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلی کافراندا، لەنێوان چوار شتاندا:

أ) بیانکوژێ. ب) بیانکاتە کۆیلە.

ج) بە خۆڕایی بەریانبدات. د) بە قەرەبوو ئازادیان بکات.

کە لەڕاستییدا ئەوە قسەی زانایانە، بەڵام ئایەت دەفەرموێ: یان بەخۆڕایی بەریانبدەن، یان بەرانبەری قەرەبوویەك، بەڵام باسی کردنە کۆیلەو کوشتنی تێدانیە، کەواتە: ئیسلام لێرەوە ڕێیەکی گەورەی گرت، لە بەکۆیلەکردنی مرۆڤەکانو دەتوانین بڵێین، شاڕێگەی بەکۆیلەکردنی بەست!

٢/ چارەسەری قەرزداریی: کاتی خۆی ئەگەر کەسێك قەرزی لەسەر بووبێ بۆی نەدرابێتەوە لە کاتی خۆیدا، کەسی خاوەن قەرز بۆی هەبووە بیکاتە کۆیلە، کە خوای پەروەردگار ئەویشی قەدەغە کردوە دەفەرموێ:

﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسۡرَةٖ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ ﴾البقرة، واتە: وە ئەگەر بابای قەرزدار تەنگ دەست

بوو، چاوەڕێی بکەن تاکو ئاسانییەکی بۆ دێتە پێش، وە ئەگەر خێریشی پێ بکەن‌و هەر بیبەخشن لە قەرزەکە، باشترە، ئەگەر بزانن (ئەوە چەند خێرە دەیبەخشن، یان چاوەڕێی دەکەن)، کەواتە: نابێ بابای قەرزدار بکرێتە کۆیلە، وەك پێش ئیسلام باوبووە.

٣/ چارەسەری دیاردەی ڕفاندن (إختطاف): ئایا ئەوە چۆنە کۆتایی پێهاتوە؟ خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ المائدة، (خوای پەروەردگار سزای زۆر سەختی داناوە، بۆ ئەوانەی کە ڕێگریی دەکەن‌و خەڵك دەرفێنن‌و شت لە خەڵك دەستێنن)، دەفەرموێ: بێگومان سزای ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، وە لە زەویدا خراپە بڵاودەکەنەوە، ئەوەیە کە بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یاخود دەستی ڕاست‌و چەپیان ببڕدرێ، یاخود دەربکرێن ....، دیارە بەپێی جۆری تاوانەکەیان کە ئەنجامیان داوە.

٤/ چارەسەری حاڵەتی بە کۆیلەکردن، بە هۆی تاوانکردن: پێش ئیسلام ئەگەر کەسێك دزیی کردبا، یان خراپەیەکی کردبا، وەك پێشتر باسمان کرد، دەیانکردە کۆیلە، بەڵام ئیسلام هات هەر تاوانەی سزای خۆی بۆ دانا، بۆ وێنە، زیناکەر سەد قامچیی لێ‌دەدرێ، دز دەستی دەبڕدرێ، بکوژ (قاتل) واتە: ئەو کەسەی کەسێك بکوژێ دەکوژرێتەوە، کەسێك بوختانی داوێن پیسیی کرد، هەشتا قامچیی لێ دەدرێ ... هتد، ئنجا هەر لەبەرئەوەی مرۆڤ فلانە گوناهەی کردوە، بکرێتە کۆیلە، ئەوە شتێکی بێ‌جێیە.

٥/ بەنسبەت ئافرەتیشەوە ئەوە دیارە کە خوای پەروەردگار وایداناوە، کە ئەگەر ئافرەتێك بە مێردی ڕازی نەبێ، دەتوانی داڕنیین (خُلْع) بکات

لەگەڵ مێردەکەیدا، وە هەروەها پیاو ئەگەر بە ژنی خۆی ڕازی نەبوو، ئەوە بۆی هەیە تەڵاقی بدات، نەك بێن یەكدی بكەنە كۆیلە !! نەخێر شتی وانیە.

٦/ منداڵی كۆیلەكان: ئەویش ئیسلام چارەسەرێكی بۆ داناوە، ئەوەیش ئەوەیە كە هەر كاتێك پیاو ئافرەتێكی كەنیزەكی هێنا، منداڵەكانی كە پەیدادەبن ئۆتۆماتیكیو ڕاستەوخۆ ئازادن، ئافرەتی كەنیزەكیش كاتێك كە پیاوێكی ئازاد دەیهێنێو پاشان دەمرێ، منداڵەكانی ئەویش ڕاستەوخۆ ئازادن.

٧/ هەروەها ئیسلام سەرجەم ڕێیەكانی دیكەی بە كۆیلەكردنیشی وشككردن، وەك بوونە كۆیلە بە هۆی ئینتیما بۆ گەلو هۆزێكی تایبەتو، هەژارییو، بە كوڕی خۆكردن (التبنِّي)و ... هتد.

قۆناغی دووەم: ئیسلام هات بۆ نەهێشتنو ئازادكردنی ئەو كۆیلانەی كە ئەو كاتە هەبوون، دە (١٠) ڕێگەی دانان، واتە: دە دەروازەی كردنەوە، بۆ لێوە ئازادبوونی ئەو كۆیلانە:

١) (كَفَّارَةُ القَتَل الخَطَأ)، واتە: ئەگەر كەسێك بەهەڵە یەكێك بكوژێ، كەفارەتەكەی ئەوەیە كۆیلەیەك ئازاد بكات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ ...﴿٩٢﴾﴾النساء، واتە: وە هیچ ئیماندارێك بۆی نیە ئیماندارێكی دیكە بكوژێ، مەگەر بەهەڵە، وە هەركاتێك كەسێك ئیماندارێك یەكێكی بەهەڵە كوشت، ئەوە پێویستە كۆیلەیەكی ئیماندار ئازاد بكات، وە خوێن (دیة)ێك، تەسلیمی كەسوكاری بكات...

٢) (كفَّارة الحنث في اليمين): واتە: كەفارەتی سوێندێك كە دەخرێ، وەك خوای كاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَـٰنِكُمْ وَلَـٰكِن

يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: خوا لێتان ناگرێ لەسەر سوێندی سەرزارەکیی کە بەسەر زارتان دادێ، مادام دڵتان لەسەر نەچەسپاندوە، بەڵکو ئەوەی کە دڵتانی لەسەر دەچەسپێنن، لەسەر ئەوە لێتان دەپرسێتەوە، کەفارەتەکەی بریتییە لە خواردن دان بە دە نەدار لە خواردنێکی میانجیی لەوەی کە دەیدەن بە ماڵو منداڵی خۆتان، یاخود پۆشاکیان، یاخود ئازادکردنی کۆیلەیەك.

٣) (كَفَّارَةُ الظِّهَار): واتە: کەسێك خێزانی بچووێنێ بە دایکی، کە ئەوە کاتی خۆی عادەتێك بووە لە نێو عەرەبەکاندا هەبووە، پیاو بۆ ئەوەی خێزانەکەی لەخۆی قەدەغە بکات گوتوویەتی: (أَنْتِ عَلَيَّ كَظَهْرِ أُمّي) واتە: تۆ وەك پشتی دایکم وای! یان گوتوویەتی: تۆ وەك دایکم وای، ئەوە کەفارەتەکەی دیسان بریتییە لە ئازادکردنی کۆیلەیەك، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ...﴿٣﴾ ﴾ المجادلة، واتە: ئەوانەی کە زیهار (ظِهار) لە ژنەکانیان دەکەن، دوایی دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانیان، دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکەن، پێش ئەوەی دەستیان بگاتەوە یەك، (ئەگەرنا لێیان قەدەغە بوون).

٤) (كَفَّارَةُ الجِمَاعِ فِي رَمَضَان): ئەگەر کەسێك لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا بچێتە لای خێزانیو لەگەڵی جووتبێ، ئەویش پێویستە لەسەری کە کۆیلەیەك ئازاد بکات، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَجُلاً وَقَعَ بِامْرَأَتِهِ فِي رَمَضَانَ، فَاسْتَفْتَى رَسُولَ

اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: وَهَلْ تَسْتَطِيعُ صِيَامَ شَهْرَيْنِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا»، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٩٣٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٥٣)، وأَبُودَاوُد برقم: (٢٣٩٠)، والتِّرمِذيُّ برقم: (٧٢٤)، واتە: ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك لە ڕەمەزاندا چوو بۆ لای خێزانی (لەگەڵی جووتبوو بوو)، لەوبارەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆیلەیەکت هەیە ؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژووبی ؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: دە خواردن بدە بە شەست نەدار.

٥) هەشتیەکی (١/٨ زەکات): ئیسلام زەکاتی دانا بۆ ئازادکردنی کۆیلان، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾ التوبة، واتە: یەکێك لەو هەشت کەسانەی کە دەبێ زەکاتیان پێ بدرێ، وە هەشتیەکی (١/٨) زەکاتیان بۆ سەرف بکرێ، بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلان، ئەو کۆیلانە پێویستە پارە بدرێ بە خاوەنەکانیانو ئازاد بکرێن.

٦) (المكَاتبة): موکاتەبەکردنی خاوەن کۆیلە لەگەڵیدا: خوای بەبەزەیی دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ... ﴿٣٣﴾﴾ النور، واتە: ئەو کۆیلانەی کە مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەن ئەندازەیەك ماڵیان بدەنێو خۆیان بکڕنەوە، ئەگەر خێرتان پێوە بینین، موکاتەبەیان لەگەڵ بکەن، وە لەو ماڵەی کە خوا پێی داون هاوکاریشیان بکەن.

مەبەست لە (المكَاتبة) ئەوەیە: کە کۆیلەکە لەگەڵ خاوەنەکەی ڕێککەوتوە کە ئەندازەیەك پارە بداتە خاوەنەکەیو ئەویش ئازادی بکات،

ئەویش پێی دەڵێ: بچۆ بۆخۆت کەسابەت بکە، جا خوا دەفەرموێ: دەبێ هاوکارییشیان بکەن، بۆ خۆ کڕینەوەو ئازادبوونیان.

٧) هاندانی خەڵك بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان: لەوبارەوەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البلد)دا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: ئەو کەسەی دەرووی سەختی نەبڕیوە، دەزانی دەرووی سەخت چییە ؟! ئازادکردنی کۆیلەیەکە!

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً، أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنَ النَّارِ»، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٤٣١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٥١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧٧٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٤١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيب، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٠٨) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه)، واتە: هەر کەسێك کۆیلەیەکی ئیماندار ئازاد بکات، خوا بە هەر ئەندامێکی ئەو کەسە لە ئاگر دەپارێزێ، هەڵبەتە نەك هەر ئیماندار، ئەگەر کۆیلەیەك کافریش بێ بە هەمان شێوە، وەك بوخاریی هێناویەتی: «عَنْ هِشَامٍ أَخْبَرَنِي أَبِي أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ رضي الله عنه أَعْتَقَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِائَةَ رَقَبَةٍ، وَحَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ، فَلَمَّا أَسْلَمَ حَمَلَ عَلَى مِائَةِ بَعِيرٍ وَأَعْتَقَ مِائَةَ رَقَبَةٍ، قَالَ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ أَشْيَاءَ كُنْتُ أَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا، يَعْنِي أَتَبَرَّرُ بِهَا قَالَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ لَكَ مِنْ خَيْرٍ»، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٢٠)، واتە: حەکیمی کوڕی حیزام لە سەردەمی نەفامییدا سەد کۆیلەی ئازاد کردبوو، وە سەد حوشتریشی دابوو بە کەسانێك کە وڵاخی سواریان نەبوو، کاتێك کە مسوڵمانیش بوو سەد کۆیلەی ئازاد کرد، وە سەد وڵاخیدا بە کەسانێك کە وڵاخی سوارییان نەبوو، (وەك: بڵێی سەد سەیارە بدا بە کەسانێك، دیارە دەوڵەمەند بووە)، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! لە سەردەمی نەفامییدا ئەو شتانەم دەکرد، مەبەستم ئەوە بوو پێی لە خوا نزیك

ببمەوە، چۆنە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: مسوڵمان بووی دوای ئەوەی كە خێرو چاكەت كردوە.

كە دیارە ئەو حەدیسە بوخاریی هێناویەتی، لەژێر ناوونیشانی: (باب عتق المشرك)دا كەواتە: ئەوانە موشریك بوون، كە حەكیمی كوڕی حیزام ئازادی كردوون لە سەردەمی نەفامییدا، پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی بە خێرو چاكە ناوزەد كردوە.

٨) (التدبیر): تەدبیر یانی چی؟ یاسایەك هەبووە وەك لە {المعجم الوسیط، ص: (٢٦٩)}دا هاتوە، دەڵێ: (دبّر العَبْدَ: عَلَّقَ عتقه بِمَوْته) خاوەنی ئەو كەنیزەكە یان ئەو كۆیلەیە گوتوویەتی: هەر كاتێك من وەفاتم كرد، ئەوە تۆم ئازاد كردی، ئیدی هەر كاتێك كە وەفاتی كردوە ڕاستەوخۆ ئەو كەسە ئازاد بووە، ئەوە تەدبیریان پێ گوتوە.

٩) بە زار داهاتنی ئازادكردنی كۆیلە: هەر كەسێك بە زاری داهاتبێ و گوتبێتی من فلان كۆیلەی خۆم ئازاد كردوە، یان فلان كەنیزەكی خۆم ئازاد كردوە، بە ئازاد لەقەڵەم دراوە، وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە: ﴿ثَلاَثَةٌ مَنْ قَالَهُنَّ لاَعِبًا أو غَير لاعبٍ فَهُنَّ جَائِزَاتٍ عَلَيْهِ: الطَّلَاقُ والنِّكَاحُ، والْعِتَاقُ﴾، أَخْرَجَهُ ابْنُ الـمُنذر، وابنُ أبي حَاتِم عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه، وأَخْرَجَهُ الدارقُطني عَن عَلِيّ رضي الله عنه)، واتە: سێ شت هەر كەسێك بە گەمەو یاریی بیانڵێ، یان بە جیددیی بیانڵێ لەسەری تێدەپەڕێنرێن و بەسەریدا جێبەجێ دەكرێن: تەڵاق و، نیكاح كردن و، ئازادكردن.

١٠) ئازاردانی كۆیلە مایەی ئازاد بوونیەتی: هەر كەسێك كۆیلەكەی ئازار دابێ، بە ناهەق ستەمی لێ كردبێ، كەفارەتەكەی ئەوە بووە كە دەبێ ئازادی بكات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ ضَرَبَ غُلاَمًا لَهُ حَدًّا لَمْ يَأتِهِ أَوْ لَطَمَهُ فَإِنَّ كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٤٢٧٥) عَن ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنه، واتە: هەر كەسێك سزایەكی كۆیلەكەی خۆی

بدات، کە لەسەری پێویست نەبێ، یان زوڵمێکی لێ بدات، کەفارەتەکەی ئەوەیە کە ئازادی بکات.

کەواتە: ئیسلام پێشێ ڕێیەکانی بوونە کۆیلەی گرتوون، دوایش چەند ڕێیەکی کردۆتەوە بۆ دەربازبوونی ئەو کۆیلانەی کە هەن.

**خاڵی چوارەم: مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلەدا:**

ئەوەی لێرەدا ماوەتەوە کە بە کورتیی باسی دەکەین، ئەوەیە: ئایا ئیسلام چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو کۆیلانەدا کردوە کە بوو ون؟ سەرەتا دەڵێین: پێغەمبەری خوا ﷺ پێش هەموو شتێك مسوڵمانانی فێر کردوە، کە نەڵێن ئەوە کۆیلەی منە، یان ئەوە کەنیزەکی منە !! وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، فەرموویەتی: ﴿لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، وَلكِنْ لِيَقُلْ: فَتَايَ وَفَتَاتِي﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨١٨٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٥٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٨٣٥)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٤٩٧٥)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: بەندەکەمو کەنیزەکەکەم (بەندە نێرینەکەم، یان بەندە مێینەکەم) بەڵکو با بڵێ: کوڕە گەنجەکەم، کچە گەنجەکەم.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٤٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٢٨٩)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٥١٥٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٤٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٦٩٠)، واتە: ئەوانە براتانن لە دەستتان دان، خوا خستوونیە بەردەستی ئێوە (واتە: بەبێ ئەوەی خوا پێی خۆشبێ وەزعەکە خستوونیەتە بەردەستی ئێوە) هەر کەسێك برایەکەی لەبەردەستی دابوو (هەروەها بەنسبەت کەنیزەك: خوشکی) با بۆخۆی لە چ خواردنێك دەخوا، لەوە بیداتێ، وە چ بەرگێك لەبەر دەکات لەو پۆشاکەش بۆ ئەو بکڕێ،

وە ئیشێکیان پێ مەسپێرن کە لە توانایاندا نیە، وە هەر ئیشێکیشتان پێ سپاردن، هاوکارییان بکەن !!

بەڵێ ئیسلام داینـاوە ئاوا مامەڵە لەگەڵ کۆیلەدا بکرێ، ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ: ئەدی بۆچی لەنێو مسوڵماناندا دیاریدەی کۆیلایەتیی هەر بەردەوام بوو؟ هەتاکو (جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ) ڕاگەیەندرا، کە لە ماددەی یەك دا دەڵێ: (هەموو خەڵك بە ئازادیی لە دایك دەبن، یەکسانن لە ڕێزو مافەکاندا، وە هەموویان خاوەنی عەقڵو ویژدانن، وە پێویستە بە ڕووحی برایەتیی لەگەڵ یەکدیدا مامەڵە بکەن).

دەڵێین: لەڕاستییدا پێش جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ، کە دیارە دوای جەنگی جیهانی دووەم ڕاگەیەندرا، ئیسلام بە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئەوە ڕایگەیاند بوو، بەڵام گرفت ئەوە بوو کە مسوڵمانان لە ئاستی ئیسلامەکەی خۆیاندا نەبوون، پاشان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا کۆیلەکان زۆر کەم بوو بوون، بەڵام دوای ئەوە بوو کە حوکمڕانو دەستەڵاتدارەکان بەڕاستی وەك پێویست پابەند نەبوون بە بڕیارەکانی قورئانەوە، بەتایبەت بەنسبەت دیلی جەنگیی یەوە، وە بەنسبەت ئەوانی دیکەشەوە بەگشتی، هەرچەندە بە تەئکید مامەڵەی ئیسلام لەو کاتیشدا زۆر جیاواز بووە لە مامەڵەی غەیری مسوڵمانان، بەڵام گرفت ئەوە بووە مسوڵمانان لە ئاستی بەرزی ئیسلامدا نەبوون، ئەگەرنا هەر کەسێك تەماشای دەقەکانی قورئانو سوننەت بکات، وەك گوتم: هەقی خۆیەتی سەری سووڕبمێنێ کە چۆن کۆیلایەتیی لەنێو مسوڵماناندا هەبووە ؟! کە لەڕاستیدا ئیسلام دەستی لە پەیداکردنیدا نەبووە، بەڵام ئیسلام دەستی لە بنەبڕکردنو کۆتایی پێ هێنانیدا هەبووەو، پێش هەموو کەس و لایەنو بەرنامەیەك کەوتۆتەوە لەوبارەوە[1].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) بۆ نووسینی ئەم باسە بۆ هەندێك لە بڕگەکانی سوودم لە نامیلکەی (مسْتَنْقَع العبيد والجواري وتجفيفه في القرآن)ی دکتۆر مصطفى الزلمي، وەرگرتووە.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت ئایەت دەگرێتە خۆی لە سوورەتی (النساء)، ئایەتەکانی (٢٩ تا ٣٥)، لەم حەوت ئایەتەدا خوای زاناو توانا سەرەتا بۆ جاری دووەم لەم سوورەتەدا بە نازناوی ئیمان ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! مسوڵمانان دەدوێنێ، وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە قەدەغەیە ماڵی یەکدی بە ناهەق بخۆن، وە یەکدی بکوژن، یان خۆیان بکوژن، وە سزای سەخت دەکاتە هەڕەشە بۆ هەر کەسێك کە ئەو دوو کارە ئەنجام بدات، واتە: چ ماڵی خەڵك بە ناهەق بخوا، چ قەتڵی بە ناهەق بکات، چ خۆی، چ غەیری خۆی، وە پاشان موژدەیان پێ دەدات، کە ئەگەر خۆیان لە گوناهە گەورەکان بپارێزن، وردە گوناهەکانیان لێ دەسڕێتەوە، وە ئامۆژگاریی هەر کام لە پیاوانو ئافرەتان دەکات، کە بە بەشی خۆیان ڕازی بن، وە لە بەخششی خوا داوا بکەن، وە حەسوودیی بە یەکدی نەبەن، وە دوایی ڕایدەگەیەنێ کە خاوەن بەشو نزیکانی دیاری کردوون، بۆ ئەوەی کە بابو دایكو خزمان بەجێی دەهێڵن، واتە: وەك میراتگرتن، وە فەرمانیشیان پێ دەکات کە پابەندی بەڵێنو پەیمانی خۆیان بن، پاشان باسی چۆنیەتی پێکەوە مامەڵەکردنی ژنو مێرد دەکات، کە مێرد سەرپەرشتیاری خێزانە، وە دەیخاتە ڕوو کە لە کاتی هەبوونی گیروگرفتدا، هەبوونی گیروگرفتێك کە هۆکارەکەی ئافرەت بێ، پێویستە پیاو چۆن ئەو گرفتە چارەسەر بکات ؟ سێ قۆناغی داناون، وە پاشان ئەگەر خۆیان کێشەو گرفتەکەیان پێ چارەسەر نەکرا، خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردوون، کە دەبێ دادوەرێك لە کەسوکارو خزمانی ئافرەتەکە دادوەرێك لە هی پیاوەکە، بەیەکەوە دابنیشن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکەیان.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن
يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا
﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم
مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ
مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ
وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ
كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ
عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ
بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ
وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا
﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴿٣٥﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنــاوە ! مـاڵو سـامانەكانتان لـەنێو خۆتانـدا بـە شێوازی ناڕەوا مەخـۆن، مەگـەر ئـەو مامەڵەیـە بازرگانییـەك بـێ بـە پێخۆشبوونی خۆتـان، وە خۆتـان مەكـوژن بێگومـان خـوا لەگـەڵتان بـە بـەزەیی یـە ﴿٢٩﴾ وە هـەر كەسێك ئـەو كـارە (مـاڵ بـە ناهـەق خـواردنو خـۆ یـان خـەڵك كوشـتن) بكـات بـە دەستدرێژیی‌و سـتەمەوە، ئـەوە دەیخـەینە ئاگرێـك (ی تایبــەت)ەوە، وە ئــەوەش بــۆ خــوا ئاســانە ﴿٣٠﴾ ئەگــەر خۆتــان لــە گوناهــە زلــەكان بپــارێزن، خراپــە (بـچووكـە)كانتــان لــێ دەســڕینەوەو، دەتانخــەینە نێــو جێگــاو ڕێگایەكــی زۆر خــۆش‌و پــڕ ڕێــزو حورمەتــەوە ﴿٣١﴾ وە ئــەوەی خــوا هەنــدێكتانی پــێ بەســەر هەندێكــتان هەڵبــژاردوە (ئـەی پیـاوانو ئافرەتـان) بـە خۆزگـە مـەخوازن، پیـاوان پـشك‌و بەشـیان لـەوەدا هــەیە كـە وەدەسـتیان هێنــاوەو، ئافرەتــانیش پــشك‌و بەشیان هەیـە لـەوەدا كـە وەدەسـتیان هێنـاوە، وە لـە بەخـششی خـوا داوا بكـەن، بێگـومان خوا بـە هــەموو شــتێك زانایـە﴿٣٢﴾ وە بـۆ هـەر شـتێك لـەوەی كـە بـاب‌و دایك‌و خزمان بە میـرات بـەجێی دەهێڵـن میـراتگرانێكمان دانــاون، وە ئەوانــەی كـە پـەیمانتان لەگـەڵ بەسـتوون، بەشـی خۆیانیـان پێبـدەن، بێگومـان خـوا بەسـەر هـەموو شـتێكەوە چاودێرە ﴿٣٣﴾ پیـاوان مـشـوورخۆری ژنـانن، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە كە خـوا هەندێكـیانی (لـە هەنـدێك ڕووەوە) بەسـەر هەندێكـیاندا هەڵبــژاردوە، وە بەهـۆی ئەوەوە كە پیاوان لە ماڵی خۆیانیاندا خەرج كردوە (بۆ مـارەیی‌و مەسرەفی ماڵو خێزان)، ئنجا ژنانی باش (ئەوانەن كە) گوێڕایەڵن (بۆ خوا عزّ وجـل، وە بـۆ مێردیشیان لە سنووری شــەرعدا) وە پـارێزەری نهێنـیین (یـان پـارێزەری سـومعەو منـداڵو ماڵو سـامانی مێردیـانن لە كاتێكدا كە لە ماڵ نین)، وە ئـەو (ژن)انـەی كـە مەترسـیی یاخیی بوونیانتـان هەیە، ئامۆژگاریی یان بكەن‌و (ئەگەر سوودی نـەبوو)

واز لەسەر جێگایان بێنن، (ئنجا ئەگەر ئەوەش هەر سوودی نەبوو) لێیان بدەن، جا ئەگەر فەرمانبەریی یان کردن، ئەوە بۆیان لە بیانوو مەگەڕێن، بێگومان خوا بەرزی گەورەیە ﴿٣٤﴾ وە ئەگەر لە (تەشەنەکردنی) ناکۆکیی نێوانیان ترسان، ئەوە دادوەرێك لە خزمانی پیاوەکەو دادوەرێك لە خزمانی ژنەکە ڕەوان بکەن، ئەگەر مەبەستیان چاکسازییو پێکهاتنەوەبێ، خوا ڕێکیان دەخات (و تەبایی یان دەخاتە نێوان) بێگومان خوا زانای شارەزایە ﴿٣٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(تِجَارَةً): بە کوردی دەڵێین: بازرگانیی، (التَّصَرُّفِ فِي رَأسِ الْمَالِ طَلَبَاً للرِّبحِ)، (تِجَارَةً) بریتیە لە بەکارهێنانی دەستمایە بە مەبەستی قازانج، دەگوترێ: (تَجَرَ يَتْجُرُ فَهُوَ تَاجِرٌ، وتَجْرٌ) کە (تَاجِرُ وتَجْرٌ) هەردووکی بەکاردەهێنرێ بۆ بازرگان.

(تَرَاضٍ): (التَّرَاضي: أَي إظهَارُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ الرِّضَا بصَاحِبِهِ)، (تَرَاضِي) واتە: لێك ڕازی بوون، هەرکامێکیان لەو دوو تەرەفە، یان لەو چەند تەرەفە کە بەیەکەوەن، ڕایدەگەیەنن کە لە یەکدی ڕازین.

(مُّدْخَلًا): (الـمُدْخَل من أدْخَلَ يُدْخِلُ، والـمَدْخَلُ من دَخَلَ يَدْخُلُ..) هەردوو قیرائەتەکانی هاتووە، (مُدْخَلاً كَرِيْمَاً)و (مَدْخَلاً كَرِيْمَاً)، ئەگەر (مُدْخَل)بێ لە (أدْخَلَ يُدْخِلُ)ەوە هاتوە، واتە: خستیە نێو بەهەشتەوە، دەیخاتە نێو بەهەشتەوە، وە ئەگەر لە (مَدْخَل)یشەوەبێ، لە (دَخَلَ يَدْخُلُ)ەوە هاتوە، واتە: چووە نێو، دەچێتە نێو.

(كَرِيمًا): (كَرِيْم) واتە: بەخشندە، بەڕێز، بەڵام لە قورئاندا کە بەکارهاتوە: (كُلُّ شَيءٍ شَرُفَ فِي بابِهِ فإِنَّهُ يُوصَفُ بالكَرَمِ، زَوْجٌ كَرِيْم، مَقَامٌ كَرِيْم)،

هەر شتێك لە بواری خۆیدا باشبێ بە (كَرَم) وەسف دەكرێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ١٠﴾لقمان، واتە: لە هەر جووتێكی بەرهەمدار، یان (مقام كَرِيْم) واتە: پێگەیەكی بەرِێزو حورمەت.

(وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ): بە خۆزگە مەخوازن، بە ئاوات مەخوازن، (التَمَنِّي تَقْدِيرُ شَيءٍ فِي النَّفْس وَتَصْوِيرِهِ فِيهَا)، (تَمَنِّي) بریتیە لەوە كە ئینسان شتێك لە دڵی خۆیدا مەزەندە بكات، وە وێنای بكات، بە خەیاڵو ئاواتو خۆزگە.

(مَوَٰلِيَ): (الوَلّي والمَوْلَى: كُلُّ واحِدٍ مِنْهُمَا يُقَالُ في مَعنَى الفَاعِل، وفي مَعنَى الْمَفعُول، وَأَصْلُ مَعناهُ القربُ والتولي)، وشەی: (مَوَالِي) كە كۆی (مَوْلَى)یە، ئەگەر بە مانای (إسم فاعِل)بێ، واتە: سەرپەرشتیكەر، وە ئەگەر بە مانای (إسم مَفعول)بێ، واتە: سەرپەرشتیكراو، لە ئەسڵیشدا وشەی (وَلّي ومَوْلَى) لە نزیكییو بە دوای یەكدی داهاتن دێ، دوو شت بە دوای یەكدا بێنن، پێی دەگوترێ: (توالي) وە (وَلِيَ)، (يلي) واتە: بە دوای داهات، بە دوایدا دێ.

(أَيۡمَٰنُكُمۡ): وشەی: (أَيْمَان) كۆی (يَمين)ە، لە قورئاندا بە دوو حاڵەت هاتوە، (جَمْعُ يَمِينٍ وَهُوَ اليَدُ اليُمنى، وَقَدْ يَكُونُ جَمْعُ يَمِينٍ بمَعنى الحَلِفِ) دەگونجێ بە مانای دەستی ڕاست بێ، واتە: دەستە ڕاستەكانتان، جاری واش هەیە بە مانای سوێند دێ، (واحفَظُوا أيْمانُكُمْ) سوێندەكانتان بپارێزن، سوێند مەخۆن، وە ئەگەر خواردتان، سوێند لە خۆتان مەخەن.

(قَوَّٰمُونَ): كۆی (قَوّامَ)ە، (قَوّام) واتە: زۆر سەرپەرشتیارو زۆر چاودێرییكەر، كە (صِيغَة المُبَالَغَة)ی (قَائِمَ)ە، واتە: سەرپەرشتیارو چاودێرو مشوورخۆر، ئنجا دەڵێ: (وَقيَامٌ للشَيء، هُوَ مُرَاعَاة للشَيء والحِفْظ لَهُ)، وە كە دەگوترێ بەو كارە هەڵسا، واتە: چاودێریی كردو ئاگای لێبووو پاراستی.

(قَٰنِتَٰتٌ ): كۆی (قانِتة)یە، (القُنوتُ: لُزُومُ الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ) (قنوت) ئەوەیە كە كەسێك بە قسەی یەكێك بكاو فەرمانبەریی بكاتو بۆی ملكەچ بێ.

(نُشُوزَهُنَّ ): واتە: یاخیی بوونیان، (النَّشَز: الْمُرْتَفَعُ مِنْ الأَرْضِ، وَنُشُوزُ المَرْأَةِ: بُغْضُهَا لِزَوْجِهَا وَرَفْعُ نَفْسِهَا عَنْ طَاعَتِهِ، وَعَيْنِهَا عَنْهُ إلى غَيْرِهِ)، ئەسڵی وشەی: (نَشَز) واتە: تەپۆلكە، شوێنێك كە بەرز دەبێتەوە لە ئاستی زەوی، وە (نُشُوز)ی ئافرەت كە لە كوردەواریی خۆمان دەڵێن: ئەو ئافرەتە ناشیزەیە، یانی: یاخیی بوونو بە قسە نەكردنو سەرەخەرییكردن، ئەوە لەچی ڕا هاتوە ؟ دەڵێ بریتیە لەوە كە ئەو ژنە پیاوەكەی خۆی خۆشنەوێ، یاخود خۆی بە بەرز بگرێ لە بەرانبەریدا، یاخود بە قسەی نەكات، یان چاوی لە كەسێكی دیكەبێ، ئەوە هەمووی پێی دەگوترێ (نُشُوز).

(وَٱهۡجُرُوهُنَّ ): كۆچیان لێ بكەن، دوورییان لێ بگرن، (هَجْر)، واتە: دووریی گرتنو كۆچكردنو گواستنەوە، ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾، واتە: جێیان لێ بگوازنەوە، لەسەر جێیەكانیان مەخەون، دەڵێ: (الهَجْرُ وَالهِجْرَانُ: مفَارَقَةُ الإنسانِ غَيْرَهُ ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾، كِنَايَةٌ عَنْ عَدَمِ قُرْبِهِنّ)، هەردوو وشەی: (هَجْرُ وَهِجْرَان) بریتیە لەوە كە ئینسان خۆی لە غەیری خۆی دوور بگرێ، بەڵام لێرە كە دەفەرموێ: ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ ﴾، مەبەست پێی ئەوەیە كە نزیكیان مەكەونەوە، واتە: لەگەڵیان جووت مەبن، یان لەگەڵیان مەخەون، ئەویش هەر دەگرێتەوە.

(ٱلۡمَضَاجِعِ): كۆی (مَضْجَع)ە، (مَضْجَع) ئەو شوێنەیە كە ئینسان لێی دەخەوێ، دەگوترێ: (ضَجَعَ، ضَجْعَاً، ضُجوعَاً، وَضَعَ جَنْبَهُ عَلَى الأرض، والمَضْجَعُ: مَوضِعُ الضجُوعِ) ئەگەر مرۆڤ بخەوێ بە عەرەبی دەڵێن: (ضَجَعَ)، واتە: تەنیشتی لەسەر عەرزی دانا، كەلەكەی خستە سەر زەوی.

(شِقَاقَ): نـــاكۆكیی‌و دەمــــەقاڵێ، (شَــاقَّة: خالَفَــهُ وعَــاداه، والــشِّقَاق: المُخَالَفَـةُ وَكَونُـكَ فـي شِـقٍّ غَيْـرِ شِـقِّ صَاحِبِـكَ)، (شَـاقَّة) واتــە: سـەرپێـچیی كـرد، یـاخود دژایـەتیی كـردو دوژمنــایەتیی كـرد، (شِـقَاق)یـش، واتــە: ناكۆكــیی، ئـەویش ئەوەیە كە تۆ لەلایەك بی ئەویدیكە لەلایەكی دیكەبێ، (شِقّ) واتە: لا.

(يُوَفِّقِ ): كە دەفەرموێ: ﴿ يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ﴾، واتە: ڕێكیان دەخات، پێكیـان دێنـێ، (الوفـقُ: الـمطَابَقَةُ بَـيْنَ الـشَيْئَيْن)، (وفـق) ئەوەیــە كــە دوو شــت پێكــەوە گونجاوبن، ڕێك بن (وَوَافقْتُ الأمْرَ: صَادَفتُهُ، والإتّفَاقُ: مُطَابَقَةُ فِعْل الإنسان القَـدَرَ)، (وَافَقْـتُ الأمْـرَ)، واتــە: كارەكـەم لــێ هەڵكـەوت، بــە دەســتم كـەوت، (إتّفَاق)یش ئەوەیە كە ئینسانی لەگەڵ قەدەردا بگونجـێ، ئیتیفـاق بـە مانـای ڕێككەوتن دێ، وەك زاراوەیەكی عورفیی.

## هـۆی هــاتنــە خــوارەوەی ئـایەتەكــان

هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ ﴾، لەوبـــــارەوە دوو گێـڕرانەوە هـەن:

أ/ {عَـنْ أُمّ سَـلَمَةَ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهَـا أَنَّهَـا قَالَـتْ: يَغْـزُو الرِّجَـالُ وَلا تَغْـزُو النِّسـاءُ، وَإِنَّمَا لَنَا نِصْفُ الْمِيرَاثِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ﴿ وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾}، أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيُّ بــرقم: (٣٠٢٢)، وابْــنُ جَريــر، وَصَحَّحَهُ الألباني فـي (صحيح سنن الترمذي)، واتــە: ئومـو ســەلەمە خــوا لێـی ڕازی بێ (كە دایكی ئیماندارانـەو هاوسـەری پێغەمبـەرە ﷺ) دەگێڕێتـەوە دەڵــێ، گـوتم: (لەبەرخۆیـەوە گوتوویـەتی، یـاخود لـە كۆڕێكـدا) پیـاوان جیهـاد

دەکەن‌و دەچن بۆ جەنگ، بەڵام ئافرەتان ناچن بۆ جەنگ (واتە: لەسەریان فەرز نیە، وەك بڵێی ئەوە ئیمتیازێکە) وە ئێمە نیوەی میراتمان هەیە بەگشتی، ئیدی خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوارێ: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، کە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

ب/ {وَقَالَ قَتَادَةَ والسُدِيّ: كَانَ أهل الجَاهِلِيةِ لا يُورّثون النِّساءَ ولا الصبيانَ؛ فَلَمَّا ورِّثوا وَجعل للذَكَرِ مِثْلُ حَظ الأنثَيَيْنِ تَمَنت النِّساءُ أن لَو جُعِلَ أنصباؤهن كأنصباء الرجال. وَقال الرجال: إنَّا لَنَرجُو أن نُفَضَّل عَلَى النِّساء بِحَسَنَاتِنَا فِي الآخِرَة كَمَا فُضِّلنا عَلَيْهِنّ فِي المِيرَاث؛ فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾}، (الجامع لأحكام القُرآن)[١]، وبلفظ قريب منهُ (جامع البيان) للطَّبَري برقم: (٧٣٢٩) و (٧٣٢٦)، واتە: قەتادەو سوددیی دەڵێن: خەڵکی سەردەمی نەفامیی میراتیان نەدەدا نە بە ئافرەتان، نە بە منداڵان، جا کاتێك میراتیان بۆ دانرا، بۆ نێرینە دوو ئەوەندەی مێینە دانرا، ئافرەتان بە خۆزگەیان خواست میراتی ئەوانیش بە ئەندازەی میراتی پیاوان بووایە، وە پیاوانیش گوتیان: ئومێدمان وایە کە لە دواڕۆژدا پاداشتمان بە چاکەکانمان دوو قاتی ئافرەتان بێ، وەك چۆن لە دنیادا دوو قاتی ئەوان میراتمان هەیە، خواش ئەم ڕستە قورئانییەی نارده خوارێ، کە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە مەبەستەکەی چۆنە؟

١) ج: (٥)، ص: (١٤٠)

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بەرزو مەزن دوای ئەوەی کە لە ئایەتەکانی ڕابردوودا باسی کۆمەڵێك یاسای کرد، دەربارەی ژنهێنان‌و هاوسەرگیریی، وە دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئافرەتان‌و پیاوان، بە تایبەتی ژن‌و مێرد بەیەکەوە، ئنجا خوا ﷻ بۆ جاری دووەم (هەڵبەتە لەم سوورەتەدا) ڕوو لە مسوڵمانان دەکات، وە بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، کە بۆ زانیارییتان وەختێك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەرچەندە ﴿ٱلَّذِينَ ﴾، (إسم موصول)ەو بۆ نێرینان بەکاردەهێنرێ، بەڵام زانایانی (أصول الفقة) هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە ئەو صیغەیە، کاتێك کە خوای پەروەردگار بەکاری دەهێنێ، پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە، جا لێرەدا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ﴿لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾، لە نێو خۆتاندا ماڵی خۆتان بە ناهەق مەخۆن، بە شێوازی ناهەق مەیخۆن، شێوازی ناهەق چۆنە؟ دزیی یە، غەصبە، ڕیبایە، فێڵە، زۆر جۆری هەیە، جگە لەوەی کە شەرع دیاریکردوە، کە بازرگانیی‌و کڕین‌و فرۆشتنی بە لێك ڕازی بوونە، کە سەنگی مەحەکی مامەڵەی دروست، چ بازرگانیی بێ، چ غەیری بازرگانی بێ، ئەوەیە کە هەردوو لایان لێك ڕازی بن، وە پێچەوانەی دەقێکی شەرعییش نەبێ، جاری وایە سوود دەرو سوود خۆر ڕازین، بەڵام مادام پێچەوانەی دەقێکی شەرعییە، ئەوە بە تەئکید دروست نیە، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی دەقێکی شەرعیی نەبێ، وە هەردوو لایەنیش لێك ڕازی بوون، ئەوە دروستەو شتێکی ڕەوایە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾، مەگەر ئەو مامەڵەیەیەی کە بەیەکەوە دەیکەن بازرگانییەك بێ بە ڕازیبوونی نێوان خۆتان، ئەگەر بە ڕازیبوون بوو، وە مادام پێچەوانەی

دەقێکی شەرعییش نەبێ، ئەوە دروستە، ئنجا دوای ئەوە شتێکی دیکەیان لێ قەدەغە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾، وە خۆتان مەکوژن، واتە: هیچ کامێکتان خۆی نەکوژێ، کە پێی دەگوترێ، خۆ کوژیی (إنتحار)، یاخود یەکدی مەکوژن، چونکە هەر کامێکتان نەفسی ئەوی دیکە وەك نەفسی خۆی وایە، نەفسی خۆیشی وەك هی ئەو وایە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾، بێگومان خوا لەگەڵتان بە بەزەیی یە، لێرەدا جێی سەرسوورمانە، کە خوای بە بەزەیی دوای ئەوەی باسی ئەوە دەکات کە ماڵی یەکدی بە ناهەق مەخۆن، ئنجا دەفەرموێ: یەکدی مەکوژن ! بۆیە زانایان گوتوویانە: ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، هاوتای خەڵك کوشتنە، چونکە هی وا هەیە ئەگەر بە ناهەق ماڵەکەی بخوێ، دوایی تووشی هەژاریی و نەداریی و قەرزاریی دەبێ، یاخود لە خەفەتان خۆی دەکوژێ، ئنجا پەندی عەرەبیشە دەڵێ: (قَطعُ الأعناقِ وَلَيْسَ قَطْعُ الأرزَاق) واتە: ملی خەڵکی هەڵبڕی نەك رزقیان ببڕی، ڕزق بڕینو نان بڕین، وەك ئەستۆ هەڵبڕینی خەڵك وایە، ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا﴾، وە هەر کەسێکیش وا بکات، واتە: ماڵی یەکی دیکە بە ناهەق بخوات، یاخود کەسێك بە ناهەق بکوژێ، یان خۆی بکوژێ، چونکە خۆ کوشتن هەمیشە ناهەقە، بە دەستدرێژییکردنو بە ستەمەوە ﴿فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا﴾، ئەوە لەمەودوا دەیخەینە نێو ئاگرێکەوە، واتە: ئاگرێکی تایبەت کە ئەو ئاگرە تایبەتە حەفتا هێندەی ئاگری دنیا گەرمە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، یەکێك لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هەر ئەو ئاگرەی دنیا بەس نەبوو؟ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە حەفتا هێندە گەرمە[1]،

وە دەشگونجێ مەبەستی لەو حەفتا هێندە هەر حاڵیکردنی ئەوان بووبێ، یاخود لەنێو عەرەباندا باو بووە شتێك کە ویستبیان زۆر زێدەڕۆیی تێدا بکەن گوتویانە: حەفتا هێندە، ئەگەرنا پلەی گەرمیی ئاگری دۆزەخ ڕەنگە لە

---

١) دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا دەقی فەرموودەکە دێنین.

حەفتا هێندەش زیاتر گەرم بێ ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾، وە سزادانی کەسێك کە ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخوا، یاخود خەڵك بە ناهەق دەکوژێ، بەو ئاگرە لەلای خوا شتێکی ئاسانە، ئنجا خوای پەروەردگار دوای ئەو دوو هەڕەشەیە، واتە: هەڕەشە لەم دوو گوناهە گەورەیە کە ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردنو خوێنی خەڵك بە ناهەق ڕشتنە، یاخود خۆ کوشتنە، موژدەیەکی خۆش بە ئیمانداران دەدات، دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴾، ئەگەر خۆ دوور بگرن لەو گوناهە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراون، خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، خراپەکان لێرەدا واتە: گوناهە گچکەکانن، مادام (سیئات) بەراوردی پێکراوە لەگەڵ (کبائر)دا، کەواتە: ئەگەر (کبائر) گوناهە گەورەکانن، دیارە (سیئات)یش گوناهە گچکەکانن، کە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، هەڵبەتە پێشتریش قسەمان لێ کردوە، کە گوناهە گەورەکان چین؟ چۆنن؟ وە گوناهە گچکەکانیش چین؟ وە چۆنن؟ کە بە کورتیی دەتوانین بڵێین: گوناهە گەورەکان ئەو گوناهانەن کە سزای دنیایی یان لەسەربێ، یان هەڕەشەی قیامەتیی، وە ئەوەی کە وانەبێ ئەوە گوناهی گچکەیە، بۆ نموونە: خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ﴿٣٠﴾ ﴾النـور، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ!) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: لە سەرنجدانو تێڕوانینی چاویان بگرنەوە، بەڵام هیچ هەڕەشەی لەسەر نیە، بەڵام دوایی کە باسی داوێنی خۆ پاراستن دەکات، پێچەوانەکەی هەڕەشەی لەسەرە کە زینایە، کەواتە: دیارە ڕوانین (نظر) گوناهی گچکەیە، بە یەکدەنگیی هەموو زانایان ﴿ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾، وە دەتانخەینە جێگەیەکی پڕ ڕێزو حورمەتەوە، جێگایەك کە ڕێزی تێدایە، یاخود جێگایەك کە لەززەتو خۆشیی تێدایەو نازو نیعمەتی تێدایە، ئنجا خوای بێ وێنە شتێکی دیکە لە مسوڵمانان قەدەغە دەکاتو هۆشدارییان دەداتێو دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾، وە شتێك كە خوای كاربەجێ هەندێكتانی پێ هەڵبژاردوە بەسەر هەندێكتاندا، بە ئاواتی مەخوازن، هەڵبەتە لێرەدا بەگشتی فەرموویەتی، بەڵام دوایی كە دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾، بۆ پیاوان بەشێك هەیە لەوەی كە بە دەستی دێنن، ئافرەتانیش، پشكو بەشی خۆیانیان هەیە، بەرهەمی خۆیانیان هەیەو لەوەی كە بە دەستی دێنن، بەرهەمی خۆیانیان هەیە، لێرەدا بۆمان دەردەكەوێ كە مەبەستی پێ پیاوانو ئافرەتانە، واتە: با پیاوانو ئافرەتان چاو نەبڕنە ئیمتیازەكانی یەكدی، چاو نەبڕنە ئەوەی كە خوای كاربەجێ هێندێ شتی داوە بە پیاوو نەیداوە بە ئافرەت، یان داویەتی بە ئافرەتو نەیداوە بە پیاو، با ئێرەییو حەسوودیی بە یەكدی نەبەن، زیاتر ئەوە دەگەیەنێ، كە ئافرەت ئێرەیی بە پیاوو پیاویش ئێرەیی بە ئافرەت نەبات، هەرچەندە بە گشتیش ئەوە دەگەیەنێ ئینسان حەسوودیی بە خەڵك نەبا، چ پیاوبێ، چ ئافرەت بێ، ئەگەر دەبینی كەسێك خوا نیعمەتێكی پێداوە، ئێرەیی پێ مەبە، تۆش لە بەخششی خوا داوا بكە، تۆش ئەو نیعمەتەی كە خوا پێی داوی هەوڵبدە بەكاری بێنیو بەهرەی لێوەربگری، بەڵام بۆ وێنە: كە تۆ نەبووی بە دەوڵەمەند، یان نەبووی بە حوكمڕان، نەبووی بە زانا، یاخود ئافرەتێك بە قەد ئەویدیكە جوان نیە، یان بە ڕەچەڵەكو نەسەب نیە، ... هتد، نابێ حەسوودیی پێبەری، بەڵكو دەبێ هەوڵبدەی لە فەزڵو بەخششی خوای بەخشەر داوا بكەی، ئەوە باشترە لەوەی چاو ببڕنە بەشو بەرهەمی یەكدی، ﴿وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾، وە لە بەخششی خوا داوا بكەن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە، واتە: بە هەموو شتێك زانایەو دەزانێ هەركەسەچیو چەندی دەداتێ، وەك پیرەمێردی شاعیر دەڵێ:

كاكە خوا كاری نابەجێ ناكا تا كێو نەبینێ بەفری تێ ناكا

هەڵبەتە ئەوە لەو شتانەدا کە خوای بەخشندە داونی بە خەڵك، بەڵام ئەو شتانەی کە خەڵك بە زوڵم دەستی بەسەردا دەگرنو یەکدی لێ بێبەش دەکەن، ئەوە وەك دوایی باسی لێوە دەکەین، ئەوە ئیمتیازی ناشەرعیی پێ دەڵێنو دەبێ ئەوانە لابچن، وە خوای دادگەر فەرمانی نەکردوە بە خەڵکی کە لە بەرانبەر ئەو ئیمتیازە ناشەرعییانەدا بێدەنگ بن، بەڵکو مەبەست ئیمتیازی فیطرییە، یەکێك لە یەکێك جوانو قۆزترە، یەکێك لە یەکێك بە نەسەبو ڕەچەڵك ترە، یەکێك لە یەکێك عاقڵترە، یەکێك لە یەکێك زاناترە، یەکێك توانای جەستەیی زیاترەو، بەهێزترە، ئەوانە نەبن بە شوێنی حەسوودییو ئێرەیی بە یەکدی بردن، چونکە سوودی نیە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ﴾، واتە: بۆ هەر شتێك کە بابو دایكو خزمان بەجێی دێڵن میراتگرمان دیاری کردوون، ﴿ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ﴾، ئەوانەش کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون بەشی خۆیان پێ بدەن، کە ئەمە پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیەو دوایی باسی دەکەین، ﴿ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك چاودێرە، وە ئاگای لە هەموو شتێك هەیە.

ئنجا دێتە سەر باسی چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ژنو مێرد لەماڵیدا، وە مامەڵە پێکەوە کردنیانو دەفەرموێ: ﴿ الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ ﴾، پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ئافرەتانەوە، مشوورگێڕن بەسەریانەوە، سەرافەتیان دەکەنو بەسەریان ڕادەگەنو مشووریان دەخۆن، واتە: لە چوارچێوەی خێزاندا ﴿ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ ﴾، ئەوەش کە پیاو سەرپەرشتیارە بەسەر ژنەوە لە ماڵیدا، بە گۆترە نیە ! خوای کاربەجێ دوو هۆکاری بۆ دێنێتەوە:

هۆکاری یەکەم: دەفەرموێ: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾، لەبەرئەوە کە خوا هەندێکی لە پیاوان‌و ئافرەتان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، واتە: هەندێك ئیمتیازی داوە بە پیاو لە ئافرەتدا نیە، هەندێ ئیمتیازیشی داوە بە ئافرەت لە پیاودا نیە، ئەو سیفەتانەی لە پیاودا هەن، وا لە پیاو دەکەن شایستەی ئەوەبێ سەرپەرشتیار بێ، مشوورخۆر بێ بۆ ئافرەتان، وەك ئافرەتیش لە ڕووی دیکەوە ئیمتیازو تایبەتمەندیی خۆی هەیە.

هۆکاری دووەم: دەفەرموێ: ﴿ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾، وە لەبەر ئەوە کە پیاوان لە ماڵی خۆیاندا دەبەخشن، مارەیی دەدەن بە ئافرەت، خەرجیی‌و نەفەقەی ئافرەت دەکێشن، کەواتە: مادام مەسرەف دەکەن، پێویستە سەرپەرشتیی بکەن.

ئنجا خوای زاناو شارەزا لێرەدا پێناسەی ئافرەتانی باشمان بۆ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ ﴾، ئافرەتانی باش ئەوانەن کە ملکەچن، (واتە: ملکەچن بۆ خوای پەروەردگار، وە بۆ مێردی خۆشیان لە سنووری شەرعدا، یان لەبەر خوا ملکەچن بۆ مێردیان، ئەوە ئەگەر لە ماڵێ بن)، ﴿ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ ﴾، وە ئەگەر مێردەکانیان لە ماڵیش نین، دەیانپارێزن‌و پارێزەرن بۆ سومعەی مێردیان، بۆ ناموسی خۆیان‌و بۆ منداڵەکان، بۆ هەرچی کە لەژێر سەرپەرشتییاندایە، دەیپارێزن. ﴿ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە خوا هەقی وانی پاراستوە، ئەوانیش ئەو شتانە دەپارێزن.

ئنجا دێتە سەر باسی چۆنیەتی چارەسەری پیاو بۆ یاخیبوون‌و سەرپێچیی ژنەکەی: ﴿ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّ ﴾، وە ئەی پیاوینە ! ئەو ئافرەتانەی کە مەترسییتان هەیە لێتان یاخیی بن‌و بە قسەتان نەکەن، سەرەتا ئامۆژگارییان بکەن، ئنجا ئەگەر سوودی

هەبوو باشە، بەڵام ئەگەر ئەوە سوودی نەبوو، ئنجا وازیان لێ بێنن‌و سەرجێییان مەكەن، لەگەڵیان مەخەون، پێشێ عەقڵیان بدوێنن، دوایی سۆز (عَطف)یان بدوێنن، ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو، ئەوجار بە زمانی جەستە قسەیان لەگەڵ بكەن، ئەزیەتیان بدەن، هەڵبەتە دوایی باسی دەكەین كە لێدانەكە دەبێ چۆن بێ؟ لێدانێكی سووك، بایی ئەوەندە كە ئەو ئافرەتە بزانێ ئەو پیاوە دەتوانێ لێی بپرسێتەوەو سزای بدات ﴿ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ﴾، جا ئەگەر بە قسەیان كردن‌و گوێڕایەڵییان كردن، لێیان لە بەهانە مەبن، لێیان بۆ بیانوو مەگەڕێن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە بە ژنەكانتان دەوێرن، خوا زۆر بەرزەو زۆریش گەورەیە، دەستەڵاتی بەسەر هەموو لایەكتاندا هەیە، لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا ﴾، وە ئەی كۆمەڵگای! ئەی خەڵكینە! ئەی دەوروبەرو خزمان! ئەگەر ترسان لەوە كە ناكۆكییەكەی نێوانیان تەشەنە بكات‌و بۆخۆشیان پێیان چارەسەر نەكرا، ﴿ فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾، ئەوە دادوەرێك لە خزمانی پیاوەكەو دادوەرێك لە خزمانی ئافرەتەكە بنێرن، با پێكەوە قسە بكەن‌و تەگبیرێكی لێ بكەن، بە جیاش لەگەڵ پیاوەكەو بە جیا لەگەڵ ئافرەتەكە دابنیشن، ﴿ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ﴾، جا ئەگەر ژن‌و مێردەكە مەبەستیان پێكهاتن بێ، یاخود دوو دادوەرەكە، ئەوە خوا ڕێكیان دەخاتەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾، بێگومان خوا زانایە بە هەموو شتەكان، وە شارەزایە بە هەموو كەسەكان.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ماڵو سامانی خۆتان لە نێوان خۆتاندا بە ناهەق مەخۆن، توێژەرەوانی قورئان، وە شەرعزانان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە کە دیارە لە سوورەتی (البقرة)شدا هەر هاتوە ﴿ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ وَتُدۡلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلۡحُكَّامِ لِتَأۡكُلُواْ فَرِيقٗا مِّنۡ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلۡإِثۡمِ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ﴾، دەڵێن: ئەمە بناغەی قەدەغەکردنی هەموو ئەو مامەڵەو سەودایانەیە کە شەریعەت قەدەغەی کردوون، وە بە ناڕەوای داناون، جا زانایان دەڵێن: کە دەفەرموێ: ماڵی خۆتان لە بەینی خۆتاندا بە باتڵو بە ناحەق مەخۆن، ئەوە سوود (ربا) دەگرێتەوە، قومار دەگرێتەوە، بەرتیل (ڕیشوە) دەگرێتەوە، داگیرکردن (غَصْب) دەگرێتەوە، دزیی دەگرێتەوە، ناپاکییکردن لە ئەمانەت (خیانة) دەگرێتەوە، سوێندی بە درۆ خواردن لەسەر ماڵێك کە هی خۆی نیە دەگرێتەوە، هەقێکی لەلابێتو نکووڵیی لێ بکات دەیگرێتەوە، وە شایەدییدانی بە درۆ دەگرێتەوە، بۆ هەموو ئەمانەش دیارە ئایەتی تایبەتی خوای پەروەردگار هەیە:

١- دەربارەی (ربا) خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ ﴿٢٧٥﴾ ﴾.

٢- دەربارەی قومار خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ المائدة.

٣- لەبارەی بەرتیل (رشوة)ەوە ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە هەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾﴾، ماڵی خۆتان بە ناهەق مەخۆن، کە بیبەن بۆ لای دادوەرەکان تاکو ماڵی خەڵکی بە ناهەق بخۆن، واتە: بەرتیل بدەن بە قازییەکانو ماڵی خەڵکی بە ناهەق بخۆن.

٤- لەسەر زەوتکردن (غَصب)یش ئەم فەرمایشتە دێنینەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «مَنْ اقْتَطَعَ شِبْرًا مِنْ الأَرْضِ ظُلْمًا طَوَّقَهُ اللَّهُ إِيَّاهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ»، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣١٩٨ )، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤١٠٨)، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِم)، واتە: هەر کەسێك بستێك لە زەوی خەڵکی دابڕێ (هەقی خەڵك بێ‌و دەستی بەسەر دابگرێ)، خوا ڕۆژی قیامەتێ بە حەوت تەبەقەی زەمیندا دەیباتە خوارێ.

٥- ئنجا دەربارەی دزیی خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾﴾ المائدة.

٦- وە دەربارەی خیانەت خوای پاك‌و تاك دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾﴾ الأنفال.

٧، ٨، ٩- وە لەبارەی هەر کام لە: أ- سوێندی بەدرۆ، ب- هەق‌و مافێکی لەلا بێت‌و دانی پێدانەهێنێ، ج- شایەدیی بەدرۆ، هەموویان، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەیگەیەنن، کە دەفەرموێ: «مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ إلاَّ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَأَوْجَبَ لَهُ النَّارَ»، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٣٥١)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢٣٢٤)، وَالنَّسائِيُّ بِرقم: (٥٤٣٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط) بِرقم: (٧١٩٤)، واتە: هەر کەسێك هەقی ئینسانێکی مسوڵمان بە سوێند بۆخۆی دابڕێ، (واتە: سوێندی بە درۆ) ئەوە خوا بەهەشتی لێ قەدەغە کردوە، وە دۆزەخیشی بۆ پێویست کردوە.

جا لێرەدا جێی سەرەنج ئەوەیە کە خوای کاربەجێ ماڵو سامانەکانی پاڵداوەتە لای خۆیان، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، نافەرموێ: ماڵی یەکدی مەخۆن، یان ماڵی تەرەفی بەرانبەرتان مەخۆن، دەفەرموێ: ماڵی خۆتان بە ناهەق مەخۆن، لەبەرچی؟ چونکە ئەگەر مسوڵمان بەیەکەوە ڕاست بن، دەبێ هەرکامێکتان ماڵی ئەویدیکەش بە هی خۆی بزانێ، وە هی خۆیشی بە هی ئەو بزانێ، کەواتە: تۆ کە ماڵی برایەکی مسوڵمانت، خوشکێکی مسوڵمانت بە ناهەق دەخۆی، وەك ئەوەیە کە ماڵی خۆتت خواردبێ بە ناهەق، خیانەتێك لە کەسێك دەکەی، وەك لە خۆتت کردبێ وایە، پاشان زیاندان لە ماڵو سامانی مسوڵمانان، دیارە بە زەرەری هەموو لایەکیان تەواو دەبێ، بۆیە خوا ﷻ ماڵو سامانەکەی پاڵ داوەتە لای هەموویان.

کەواتە: ئەم ڕستە قورئانییە وەکو گوتم ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەموو شێوەکانی تەصەڕڕوفکردن لە ماڵو ساماندا کە دەقێکی شەرعیی قەدەغەی کردبێ، وەك دزیی، غەصب، قومار، ڕیبا، وە سوێندی درۆی لەسەر بخۆی، ئەوانە هەموویان قەدەغەن، وە هەموویان ئەم ڕستەیە دەیانگرێتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾، چونکە هەموویان ناهەقن، بەڵام ئەوەی دەقی لەسەر نەبێ، وەك زانایان دەڵێن بناغە لەسەر هەڵسوکەوتەکاندا، لە مامەڵەکاندا لە بازرگانیی‌و سەودایەکاندا، بریتیە لە ڕەوایی، مەگەر دەقێکی شەرعیی شتێکی قەدەغە کردبێ.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡ ﴾، مەگەر ئەو مامەڵەیەی کە بەیەکەوە دەیکەن، بازرگانییەك بێ بە ڕەزامەندیی هەردوولا، پێوەری مامەڵەی شەرعیی ئەوەیە کە ڕەزامەندیی هەردوولای لەسەر بێ، بەڵام لایەك ڕازیبێ‌و لایەك ناڕازی بێ، ئەوە دیارە ناشەرعییە ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡ ﴾، ﴿ تِجَٰرَةً ﴾،

چییە؟ (التجارَةُ: البَيْعُ والشِّراء) بریتیە لە فرۆشتن‌و کڕین، تەرەفێك کڕیارەو تەرەفێك فرۆشیارە، ﴿عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾، یانی چی ؟ واتە: هەردوولا ڕازیبن، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾، چونکە ئەوە لەسەر کێشی (مُفَاعَلَة)یە، کە لە زمانی عەرەبیدا کێشی (مُفَاعَلَة)ە بۆ هاوبەشیی دوو تەرەف، یاخود زیاترە، وە لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ کە بازرگانیی‌و مامەڵە دەبێ هەردوو تەرەف لێی ڕازی بن، فەرموویەتی: ﴿ عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، أَوْ يَقُولُ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ اخْتَرْ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٤١٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٤٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحيح، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٤٤٦٩)، واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو کڕیارو فرۆشیارەکە (بَيِّعان: واتە: ئەو دووانەی شت بە یەکدی دەفرۆشن‌و دەکڕن)، سەرپشکن لە هەڵوەشاندنەوەی سەودایەکەیاندا، هەتا لە یەك جیادەبنەوە، کە لێك جیابوونەوە، تازە دەرفەتی هەڵوەشاندنەوەیان نیە مەگەر یەکێکیان بەوی دیکە بڵێ: تۆ بۆت هەیە پەشێمان ببیەوە، هەرکاتێك پەشێمان بوویەوە شتەکەم بۆ بێنەوە، ئەوە دروستەو، دەگونجێ فرۆشیار وا بە کڕیار بڵێ، بۆ وێنە: فرۆشیار دەڵێ: ئەو خانوەت پێ دەفرۆشم، هەر کاتێك پەشێمان بوویەوە پارەکەم بۆ بێنەوەو خانوەکە هی خۆمە، یان دەشگونجێ کڕیار بڵێ: من ئەو شتەم لێ کڕی، بەڵام هەر کاتێك پەشێمان بوویەوە، شتەکەت دەدەمەوەو پارەکەم بدەوە، دەگونجێ یەکێکیان، وە دەشگونجێ هەردووکیان بڵێن، هەردووکمان یەکدی سەر پشك دەکەین، بەڵام ئەگەر یەکدییان سەرپشك نەکرد، لەو مەجلیسەدا کە مامەڵەکەی تێدا کراوە، وە لە یەکدی جیابوونەوە، تازە مەجالی پەشێمان بوونەوەیان نیە، ئەوە بنچینەی شەرعیی وا دانراوە، دیارە شەرعزانان‌و زانایان لەسەر ئەو شتانە مشتومڕو تەفاصیلیان زۆرە، بەڵام وەك بنچینە ئاوایە، کە سەوداو مامەڵە هەتا لەو مەجلیسە دابێ، هەر کامێکیان بۆی هەیە پەشێمان بێتەوەو

ئەگەر جیابوونەوە، بەبێ ئەوەی کە یەکدییان سەرپشك کردبێ، مافی پەشێمان بوونەوەیان بە یەکدی دابێ، تازە مەجالی تێدا نیە، کەواتە: هەموو شێوەکانی مامەڵەو بازرگانیی کە دەقێکی شەرعیی قەدەغەکەریان لەسەرە، قەدەغەن، بەلاَم ئەوەی کە دەقێکی شەرعیی لەسەر نەبێو شەریعەت قەدەغەی نەکردبێ، لە ئەسڵدا ڕەوایە، مادام ڕەزامەندیی هەردوولای لەسەر بێ.

**<u>مەسەلەی سێیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ...﴾، خوا ﷻ دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە کە بریتیە لە کوشتن، پێشێ باسی ماڵی یەکدی بە ناهەق خواردن بوو، ئنجا دێتە باسی یەکدی کوشتن، جا زانایان دەڵێن: جێی سەرنجە خوای کاربەجێ ماڵی خەڵك بە ناهەق خواردن، لەگەڵ خەڵك کوشتنی پێکەوە باسکردوون ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾، ماڵی یەکدی بە ناهەق مەخۆن، مەگەر بازرگانییەك بێ کە بە ڕەزامەندیی هەردوولا بێ، وە خۆتان مەکوژن، پێشێ بە نسبەت ماڵەکەوە فەرمووی: ماڵی خۆتان بە ناهەق مەخۆن، کە ڕوونمان کردەوە بۆچی ماڵەکەی پاڵداوەتە لای خۆیان؟ چونکە کە ماڵی براو خوشکێکی مسوڵمانت دەخۆی بە ناهەق، وەکو ئەوەیە خیانەتت لە خۆت کردبێ، ئەدی لێرە کە دەفەرموێ: خۆتان مەکوژن ؟ زانایان سێ مانایان لێداوەتەوەو، گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾، سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١/ خۆکوشتن، کەسێك خۆی بکوژێ (الإنتحار).

٢/ خەڵك کوشتن، (قتل الغیر) وەختێ تۆ برایەك خوشکێکی مسوڵمانیشت دەکوژی، لەبەرئەوەی مسوڵمانان وەك یەك جەستەوان، وەك ئەوەیە خۆتت کوشتبێ.

٣/ خۆخستنە حاڵەتێکەوە کە سەرت تێیدا بەفەتارەت بچێ، (تعريض النفس للهلاك)، هەمووشیان دەقیان لەسەرە:

جۆری یەکەم: بەنسبەت خۆ کوشتنەوە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَجُلاً مِمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ أَخَذَتهُ قَرحَةٌ فِي يَدِهِ فَقَطَعهَا فأَراق دَمها حَتَّى مَاتَ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: بَادَرَنِي ابْنُ آدَمَ بِنَفْسِهِ فَقَتَلهَا بِيَدِهِ، فَقَد حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٢٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٠٣)، واتە: لە پێش ئێوەدا، (یانی: ئۆممەتانی پێش ئێوە) پیاوێك هەبوو برینێك لە دەستی پەیدابوو، ئەویش هەستا دەستەکەی خۆی بڕی، وە خوێنی لێ هات هەتا مرد، خوای بەرزیش فەرمووی: ئەو ئادەمیزادە پەلەی کرد پێش ئەوەی من (بە شێوەی ئاسایی) بیمرێنم، بۆخۆی ویستی خۆی بکوژێ، بۆیە ئەوە بەهەشتم لێ قەدەغە کرد، کەواتە: خۆ کوشتن گوناهێکی زۆر گەورەیەو دەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان بەهەشتی لێ قەدەغە بکرێ.

ئنجا هەر لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺیش هەیە، کە دەفەرموێ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيها أَبَدًا، وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فيها أَبَدًا، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٤١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٧٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٤٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسائِيُّ برقم: (١٩٦٥)، (سێ حاڵەتی خۆ کوشتنی ڕوونکردوونەوە لەم فەرمایشتەدا)، واتە: هەر کەسێك لە چیایەك خۆی هەڵدێرێو خۆی بکوژێ، ئەوە لە ئاگری دۆزەخدایە، لەوێشدا هەڵدەدێردرێ لەنێو دۆزەخداو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، وە هەر کەسێك ژەهر بخوا لە دۆزەخدا ژەهرەکەی لە دەست دایە، هەردەیخواتو لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە بە ژەهر خواردنەوە بە هەمیشەیی، وە هەر

کەسێك بە ئاسنەواڵەیەك خۆی بکوژێ (بە چەقۆ، بە خەنجەر، بە تفەنگ) ئەوە ئەو ئاسنەی کە خۆی پێ کوشتوە، لە دۆزەخدا هەر لە ورگی خۆی دەدات، لە ورگی خۆی دەوەشێنێو خۆی پێ دەکوژێو بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە.

لەڕاستیدا ئەم فەرموودەیە بۆ هەر کەسێك ئیمانی هەبێت زۆر ترسناکە، دیارە بۆخۆتان دەبینن بەداخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا خۆکوشتن زۆرە، بەتایبەتی خۆسووتاندنی ئافرەتانو خۆهەڵواسینو... هتد یان، وەڕەنگە خەڵکی دیکەش هەبێ بە دەرزییو بە حەبو بە زەهر خۆی بکوژێتو ئاشکراش نەبێ، هۆکارەکەیشی بە پلەی یەکەم بێهێزیی ئیمانو لە خوا دوورکەوتنەوەو شوێن ئارەزوو کەوتنە.

<u>جۆری دووەم</u>: خەڵك کوشتن، کە دیارە خوای دادگەر خەڵك کوشتنی قەدەغە کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ... ﴿٣٣﴾ ﴾ الإسراء، وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾، کەواتە: کە تۆ براو خوشکێکی مسوڵمانت دەکوژی، وەك خۆتت کوشتبێ وایە، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُؤْمِنُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ إِنِ اشْتَكَى رَأْسُهُ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالْحُمَّى وَالسَّهَرِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٨٤٥٦)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٥٣١)، واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ئیمانداران هەموویان وەکو یەك پیاو (نەفس) وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی پێگەیشت هەموو ئەندامەکانی دیکەی بەتا لێهاتنو بە شەونخوونیی بەشداریی دەکەن.

ئینسان ددانی بێشێ، چاوی بێشێ، گوێی بێشێ، ئەندامێکی بچووکی بێشێ، هەموو ئەندامەکانی دیکەی ئیسراحەتیان لێ هەڵدەگیرێ، ئیماندارانیش ئاوان، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: خۆتان مەکوژن، واتە:

بەانبەرەکــەت مەکــوژە، چــونکە بەرانبەرەکەشــت وەك خــۆت وایــە، وە ئیمانداران پێویستە وەك یەك هەست بە ئازاری یەکدی بکـەن.

جـۆری سـێیەم: بـە نـسبەت مانـای سـێیەمی ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، بریتیـە لەوەی کە ئینسان خۆی بخاتە حاڵەتێکـەوە، یەکسـەر خـۆی نەکـوژێ، بـەڵام خـۆی بخـاتە حاڵەتێکـەوە، کـە ببـێ بـە هـۆی لـە بەینــچوونی، وەك خـوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥ ﴾ البقـرة، واتـە: بـە دەسـتی خۆتـان خـۆ مەفـەوتێنن‌و خـۆ مەخەنـە هیلاکەتـەوە، دیـارە کـاتی خـۆی لـە تەفـسیری سـوورەتی (البقـرة)دا باسـی ئـەوەمان کـردوە، کـە خـۆ خـستنە هیـلاکـەت‌و خـۆ فەوتـاندن قەدەغەیـە، مەگـەر لـە حاڵەتێکدا کـە ئینـسان لـە بەرانبـەر دوژمنــدا وەســتابێ لــە جەنگــدا، وە مــسوڵمانێکی ئــازاو بوێــر، لــەخۆی ڕاببینــێ بـچێتە نێـو ڕیـزی دوژمنـەوە، وە زەبرێکـی باشـیان لـێبدا، ئەگـەر قەناعەتیشی وابێ کە دوایی ناگەڕێتــەوەو دەیکـوژن، بـەڵام مـادام پێـی وابـێ زەبرێکــی باشــیان لــێ دەداو چـاویان دەشـکێنێ، زانایـان هــەموو، یـاخود زۆربەیـان ئەوە بە ڕەوا دەزانـن، بەڵکو بە جیهادێکی گـەورەشی دەزانن.

هەروەهــا هــەر لــەوبارەوە زانایــانی ئیــسلام بەشــێکیان یــان زۆربــەیان، نموونەیــەکی دیکــە دێننــەوەو دەڵــێن: ئەگــەر مــسوڵمانێك بکەوێتــە دەســتی کافرانــەوە، وە نهێنیــی مــسوڵمانانی لــەلابێ، دروســتە خــۆی بکــوژێ، بۆئــەوەی نهێنـییەکان نەدرکێنـێ‌و مسـوڵمانان تووشـی زەرەرو زیـان نەبـن.

بـەڵام لـە غەیـری ئـەو حـاڵـەتە هەڵاوێردراوانـەدا، ئینـسان بـۆی نیــە خــۆی بخـاتە حـاڵـەتێکەوە، کە بزانـێ ئەنجامەکەی فەوتـان‌و لەبـەینـچوونە.

مەســەلەی چــوارەم: کــە خــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ ﴾، هەر کەسێك ئـەوە بکات بـە دەسـتدرێژیی‌و بـە سـتەم، ئەوە دەیخـەینە ئاگـرەوە، ئـەم ڕسـتە قورئانییـە بەڕاسـتیی موژدەیـەکی خۆشـی

تێــدایە، چونکــە دیــارە لێــرەدا مەبەســت پێــی خۆکوشــتنو خــەڵــك کوشــتنەکەیە، نــەك مــاڵی یەکــدی خــواردن بــە ناهــەق، کــە هەمیــشــە هــەر دەستدرێژییــەو زوڵمــە، بــەڵام دەگونجــێ خۆکوشــتنو خەڵــك کوشــتن بــە دەســتدرێژیو بــە زوڵــم نــەبــێ، خەڵــك کوشــتن، ئەگــەر یەکێــك بــێ بتکــوژێ، تــۆش بــۆت هــەیە بــەرگریی لــەخۆت بکــەی، مانــای وایــە (عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا ) نیــە، خۆکوشــتن: مــرۆڤ جــاری وایــە تفــەنگی لەدەســت دەردەچــێ، یــان لــە شــوێنێك دەکەوێتــە خــوارێ، یــاخود دەچــێتە شــوێنێك نازانــێ کــە پێــی لەبــەین دەچــێ، دەرمانــێ دەخــوا نازانــێ ژەهــرە، ئــەوە لــەو حاڵەتانــەدا بــە دەســتــدرێژیو بــە ســتەم نیــە، یــان شــتێکی لــە دەست دەردەچــێ، یــان شــتێك دەکــات بــە نیــەتی دیکــەو دوایــی پێــی دەفــەوتێ، یــان نیــەتی نیــە کەســێك بکــوژێو دەیــەوێ بیتــرســێنێ، دوایــی دەیکــوژێ، یــان ئەوانــەی کــە یــاریی کاراتــەو کۆنفــۆ دەکــەنو ڕاهێنــانو مەشــق دەکــەنو بــەو هۆیــەوە دەفــەوتێن، یــان خەڵــکیان بــە دەســت دەچــێ، ئەوە هیچــی (عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا ) نیــە، بۆیــە هەنــدێك لــە زانایــان فــەتوایان داوە کــە مــادام بــە ئانقەســت نەبــێ، جــاری وایــە هەندێــك جــۆرە تەدریــبو مەشق هەندێك خەسارەتو زیانی لــێ دەکەوێتــەوە، ئــەو حاڵەتانــە هــەموویان هــەڵداوێردرێــن لەو حوکمــە.

هــەروەها ئــەو حاڵەتانــەی کــە لــە دەســتدرێژیو لــە ســتەم هەڵــداوێردرێن، کوشــتنی بــە هەڵەیــە، وەك کەســێك بــە هەڵــە خــۆی بکــوژێ، یــان یەکــێك بــە هەڵــە بکــوژێ، یــان لەبیــرێ بــچێو بــە نــەزانیی تفــەنگ لــە شــتێ بگــرێو بــە دوژمنــی بزانــێ، دوایــی بزانــێ کــە دوژمــن نیــە، یاخــود وابزانــێ نێــچیرێکەو دوایــی کەسێك دەربچێ، هەروەها بە زۆر لێکــران، بــەڵام بــە زۆر لێکران مرۆڤ بــۆی نیــە غــەیر بکــوژێ، بــەڵام هەنــدێك لــە زانایــان دەڵێن بەنــسبەت خۆیــەوە ڕەنگــە ڕێــی تێبــچێ، ئەگــەر دوژمنــانی پێــی بڵێــن: باشــە ئــاوا بتکــوژین، یــان ئــاوا؟ خــۆت دەکــوژی، یــان ئێمــە ئــاوا بــە شــێوەی تەعزیبــدان بتکــوژین؟ هــەندێك لە زانایان هەرچەندە دەڵــێن: واباشــترە کــە ئــەوە نــەکات، بــا ئــەوان

چۆنی دەکوژن، بیکوژن، پاداشتی لەلای خوا زیاترە، بەلاَم هەندێك دەڵێن: مۆڵەتەو مرۆڤ بۆی هەیە، بۆ وێنە: ئەگەر بڵێن: فیشەکێك بە مێشکی خۆتەوە دەنێی، یاخود ئێمە پارچە پارچەت لێ بکەینەوەو یان بتسووتێنین ؟ دەڵێن: لەو حاڵەتەدا دروستە خۆی بکوژێ، مادام یەقینی هەبێ هەر دەیکوژن، لەجیاتی ئەوەی بە ئەشکەنجەو بە تەعزیبەوە بیکوژن، یان چەند ڕۆژان بمێنێتەوە، بەلاَم بێگومان نە زۆر لێکران (إكراه) ئینسان بۆی نیە غەیر بەو بیانووە بکوژێ، بڵێ: ناچارمو زۆرم لێکراوە ئەگەر پێیان گوت: فلاَن کەس دەکوژی یان بتکوژین؟ دەبێ بڵێ: بمکوژن، بۆی نیە خەڵکی دیکە بکوژێ، بەلاَم بە نسبەت گوناهەکانی دیکەوە، تۆزێك بواری تێدا هەیە، بۆ وێنە: شەڕاب بخواتەوە، یان قومار بکات، ئەو شتانە تۆزێك بواریان تێدا هەیە، بەلاَم بەنسبەت کوشتنی کەسی دیکەوە، هیچ بواری تێدانیە، هەتا هەندێك دەڵێن: بە نسبەت زیناشەوە، کە کابرا ناچار بکرێ، تۆزێك بواری تێدا هەیە، بەلاَم زۆریان دەڵێن: ئەمیش بواری تێدانیە، بە هەرحاڵ ئەوە مشتومڕی لەسەرە، بەلاَم بە نسبەت ئەوەوە، کە بڵێن دەی فلاَن کەس دەکوژی، یان بتکوژین ؟ بۆی نیە ئەو بکوژێ، بۆئەوەی خۆی ڕزگار بکات، با بیکوژن، کە ئەگەر بیکوژن شەهیدە، بەلاَم ئەگەر ئەو کەسێك بکوژێ، قاتیلەو تاوانی قەتڵی دێتە سەرێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴾، ئەگەر خۆتان لە گوناهە گەورەکان بپارێزن خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، وە دەشتانخەینە شوێنێکی پڕ ڕێزو حورمەتەوە، لێرەدا ئێمە لە چوار بڕگەدا باسی ئەم ئایەتە، ئەم ڕستە قورئانییە دەکەین، هەرچەندە لە ڕابردووشدا هەر لەوبارەوە باسمان کردوە:

**بڕگەی یەکەم:** لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ، کە گوناهەکان یەکسانو یەکجۆر نین، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ

عَنۡهُ ﴾، ئەگەر خۆتان دووربگرن لەو گوناهە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراون[1]، ﴿نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ ﴾، خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، دیارە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە خراپەکان {(سَيِّئات) کۆی (سَيئة)یە، واتە: خراپە} جیایە لە (كَبَائِر)، بۆیە زانایان دەڵێن: گوناهەکان یەکسان نین، بەڵکو گوناهی گەورە هەیەو گوناهی گچکەش هەیە، لە سوورەتی (النجم)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ ...﴿٣٢﴾ ﴾، ئەوانەی خۆ لە گوناهە زلەکانو فاحیشەکان دەپارێزن جگە لە (اللَّمَم)، (اللَّمَم) چییە؟ واتە: گوناهی بچووك یان ئەوەی کە ئینسان دەیکاتو لەسەری بەردەوام نابێ وە هەندێکیان گوتوویانە: ئەو گوناهەیە کە ئینسانە جارێك لەدەستی دەقەومێ: (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ: (اللَّمَمُ: وَهِيَ الذُّنوبُ الصِّغَار، الَّتِي لا يُصِرُّ صَاحِبُهَا عَلَيْهَا، أَو الَّتِي يُلِمُّ بِهَا العَبْدُ، المرَة بَعْدَ المَرَة، عَلَى وَجْهِ النَّدْرَةِ وَالقِلَّةِ)[2]، واتە: (اللَّمَمُ) ئەو گوناهە گچکانەن کە خاوەنەکەیان لەسەریان بەردەوام نابێ، یاخود ئەو گوناهانەن کە جار لەدوای جار کەسێك بە شێوەی دەگمەن، وە زۆر بە کەمیی تووشی گوناهێك دێ، دیارە لە پێناسەی ئەم زانایەوە دەردەکەوێ کە ئەگەر گەورەش بێ، بەڵام جارێك گوناهێکی لەدەست دەقەومێ، ئەوە بە (اللَّمَمُ) لەقەڵەم دەدرێ.

بەڵام من پێم وانیەو گوناهی گەورە با یەکجاریش بێ، با دوو جاریش بێ، با بەدەگمەنیش بێ، هەر گەورەیەو بە (اللَّمَمُ) لەقەڵەم نادرێ.

**بڕگەی دووەم:** خوا دەفەرموێ بە خۆپاراستن لە گوناهە گەورەکان گچکەکان لادەچن، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەیە: ﴿عَنْ

١) (كَبَائِر) کۆی (كَبيرة)یە، واتە: گوناهی گەورە.
٢) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ص: (٨٢١).

أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُمَا، إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٤)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج نوێژە فەرزەکانو، جومعە تاکو جومعەو، ڕەمەزان تاکو ڕەمەزان، نێوانی خۆیان دەسڕنەوە، ئەگەر ئینسان خۆی لە گوناهە گەورەکان دووربگرێ، واتە: لە نێوانی نیوەڕۆو عەسرداو، لە نێوانی عەسرو شێوانداو، لە نێوانی شێوانو خەوتنانداو، لە نێوانی خەوتنانو بەیانی، وە هەروەها لە هەینی تا هەینیو، لە ڕەمەزان تا ڕەمەزان، یانی: هەم نوێژە فەرزەکان، هەم نوێژەکانی جومعە، هەم مانگە ڕەمەزانەکان، نێوانی خۆیان لە گوناهە وردەکان دەسڕنەوەو خاوەنەکەیان پاك دەکەنەوە، بە مەرجێك ئەو کەسە خۆی لە گوناهە گەورەکان پاراستبێ، کەواتە: لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەم لەڕووی قورئانو هەم لەڕووی سوننەتەوە، گوناح گەورەیان هەیەو گچکەشیان هەیە.

<u>بڕگەی سێیەم:</u> گوناهە گەورەکان چیو چین؟ چۆنن؟ وە چەندن؟ با پێشێ تەماشای چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بکەین:

فەرمایشتی یەکەم: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٦٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٤)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٣٦٧١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٥٦١)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان لە حەوت گوناهە فەوتێنەرەکان بپارێزن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو حەوت فەوتێنەرانە چین ؟ فەرمووی:

هاوبەش بۆ خوا دانان، کوشتنی نەفسێك کە خوا قەدەغەی کردوە، مەگەر بە هەقی خۆی (بە هەقی خۆی چییە؟ ئەوەیە کە نەفەری لێ کوشتبی، بۆت هەیە وەکو تۆڵە بیکوژیەوە، وە ئەگەر یەکێك بێتە سەرتو بیەوێ بتکوژێ بۆت هەیە بەرگریی لەخۆت بکەی) جادوو، خواردنی سوودو ڕیبا، خواردنیماڵی هەتیو، {واتە: بە ناهەقو بە زوڵم نەك دەچێ دەعوەتی دەکەن، یان دەچێ بۆئەوەی دوو قسەی خۆشیشیان بۆ بکاتو دەستیان بەسەر دابێنێو چاپەکیان لە ماڵ بخواتەوە ئەوە جیایە، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا ...﴿١٠﴾﴾ النساء، ئەوانەی کە ماڵی هەتیوان بە زوڵم دەخۆن، ئەدی ئەگەر بە زوڵم نەبێ، دەچی چایەکیان لەماڵ دەخۆیەوەو دەستێکیان بەسەردا دێنیو ڕەنگە دیارییەکیشیان بدەیە، ئەوە جیایە، چونکە هەندێك لە مامۆستایان لەوەدا بەهەڵەدا چوونو گوتوویانە: سێبەری خانووەکەشیان قەدەغەیە، ئاویش لە ماڵیان بخۆیەوە قەدەغەیە، جا مانای وایە دەبێ ئەو ماڵە هەتیوە کەسێ بەلایاندا نەچێ ! نەء، ئەوە ڕاست نیە ئایەتەکە دەفەرموێ: بە زوڵم، وە لێرەشدا مەبەست پێی ماڵی هەتیوان خواردن بە دەستدرێژییو ستەمە، بەو شێوەی کە بتەوێ زیانیان لێ بدەی، ئەمما بتەوێ دڵیان خۆشبکەیو دوو قسەی خێریان بۆ بکەیو ئامۆژگارییەکیان بکەی، ئەوە نەك گوناح نیە، بەڵکو زۆریش خێرە}، ئنجا پشت لە دوژمن کردن لە کاتی هێرش هێنانی دوژمناندا (ئەوەش یەکێکە لە حەوت گوناحە فەوتێنەرەکان)، وە تۆمەتی داوێن پیسیی کردن بۆ ئافرەتانی پاکیی بێ ئاگای ئیماندار.

فەرمایشتی دووەم: ﴿عَنْ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ، قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَكَانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، فَقَالَ: أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ وَشَهَادَةُ

الزُّورِ، فَمَازَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٦٥٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٥٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٧٤)، والتِّرمِذي برقم: (١٢٠٧)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٣٦٧١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٥٦١)، واتە: ئەبی بەکرە لە بابیەوە خوا لێیان ڕازی بێ هێناویەتی، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابوۆوە فەرمووی: هەواڵتان پێ بدەم بە گەورەترینی گوناهە گەورەکان ؟ گوتمان: با، {ئەی پێغەمبەر ﷺ}، هەواڵمان پێ بدە، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، وە ئێشاندنی دڵی دایكو باب(١)، لەوکاتەدا پاڵی دابوۆوە دوایی دانیشت (وەك بڵێی شتێکی گرنگ بفەرموێ) فەرمووی: ئاگاداربن، وە قسەی درۆو شایەدییدانی بە درۆ، قسەی درۆو شایەدییدانی بە درۆ، هەر دووبارەی دەکردەوە، (حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ) هەتا گوتمان: بریا چی دیکە دووبارەی نەکردبایەوەو بێ دەنگ بووبایە، واتە: ئەوەندە خۆی ئەزیەت نەدابایە، پێغەمبەر ﷺ شتێك کە زۆر مەبەستی بووبێ چەند جارێك دووبارەی کردۆتەوە.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خۆ هاوبەش بۆ خوا دانان، پێغەمبەر ﷺ بە یەکەمی گوناهە زۆر گەورەکانی داناوە، هێشاندنی دڵی دایكو بابیشی بە دووەم داناوە، ئەدی بۆچی قسەی درۆو شایەدیی دانی بە درۆی خستۆتە سێیەمو زۆریش دووبارەی کردۆتەوە؟ بە بۆ چوونی من حیکمەتەکەی ئەوەیە کە زۆربەی خەڵك دەزانێ هاوبەش بۆ خوا دانان گوناهە، وە هێشاندنی دڵی دایكو باب گوناهێکی گەورەیە، بەڵام ڕەنگە هەموویان نەزانن کە قسەی درۆو شایەدییدانی بە درۆ، گوناهێکە لە

١) (العُقُوقُ: من عقَّ: شَقَّ ثَوبَهُ، وَعَقَّ الولدُ أباهُ: عصاه وترك الإحسان إليه فهو (عاق) والجمع: عققة) {(المصباح المنير للفيومي، ص: (٢١٨)}، کەواتە: (عُقُوقُ الوالدين)، واتە: سەرپێچیی لێکردنیانو ئازاردانیان، وشەی (عُقُوقُ)یش لە (عقَّ)ەوە هاتوە، واتە: دڕیو لەتی کرد.

ڕیزی ئەوانە، بۆیە چەند جارێك دووبارەی كردۆتەوە، وە لە حاڵەتی پاڵدانەوەشی خۆی گۆڕیوە بۆ حاڵەتی دانیشتن، بۆ ئەوەی بیسەرەكان زیاتر بزانن ئەوە پێغەمبەر ﷺ شتێكی گرنگ دەفەرمویٚ.

فەرمایشتی سێیەم: ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: سأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ، قَالَ قُلْتُ لَهُ إِنَّ ذَلِكَ لَعَظِيمٌ، قَالَ قُلْتُ ثُمَّ أَيُّ، قَالَ: ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قَالَ قُلْتُ ثُمَّ أَيُّ، قَالَ: ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤١٣١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٧٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣١٨٢) وَالنَّسائِيُّ برقم: (٤٠١٣)، واتە: عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ (كە یەكێكە لە چوار عەبدوڵلایەكان: عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود، عەبدوڵلای كوڕی زوبێر، عەبدوڵلای كوڕی عەبباس، عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص، هەر چواریان زانا بوون و هەموو قورئانیان لەبەربووە) عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود دەڵێ: ڕۆژێك پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، چ گوناهێك لە هەمووان گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوە كە هاوبەش بۆ خوا دابنێی كە تۆشی دروست كردوە، (هاوبەشی بۆ دابنێی لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتییدا، كە ئەوە زۆر دەگمەنە، یان لە پەرستراوێتییدا كە ئەوە زۆر باوە، یان لە ناوو سیفاتەكانیدا، یان لە هەر شتێك لە تایبەتمەندییەكانیدا)، گوتم: بێگومان ئەوە شتێكی مەزنە، ئەدی دوای ئەوە ؟ فەرمووی: ئەوە كە منداڵەكەی خۆت بكوژی لە ترسی ئەوەی كە نانت لەگەڵ بخوا، (وەختی خۆی ئەوە لەنێو عەرەبەكاندا هەبووە، منداڵی خۆیان كوشتوە بە تایبەتی كچ، زیندە بەچاڵیان كردوە)، گوتم: ئەدی دوای ئەوە؟ فەرمووی: كە زینا بكەی لەگەڵ خێزانی دراوسێیەكەتدا، عەبدوڵلا دەڵێ: وە خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار، وەك بەڕاست دانان بۆ قسەی

پێغەمبەر ﷺ، ئەو ئایەتەی سوورەتی (الفرقان) کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾، واتە: ئەوانەی کە جگە لە خوا لە هیچ پەرستراوی دیکە ناپاڕێنەوە، وە ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە بە هەقی خۆی نەبێ نایکوژن، وە زیناش ناکەن...

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: گوناهە گەورەکان چەندن؟ وە پێناسەشیان چییە؟ دیارە ئێمە لە ڕابردووشدا باسی ئەوەمان کردووەو لەڕاستییدا ژمارەی گوناهە گەورەکان پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموە بەس حەوتن، فەرموویەتی: خۆتان لە حەوت گوناهە گەورە فەوتێنەرەکان بپارێزن، وە لە فەرمایشتەکەی دیکەدا سێی باسکردوون، هەروەها لەوەی دیکەشیاندا سێی باسکردوون، بەڵام لەڕاستییدا شەریعەت دیاری نەکردوە، کە ئایا ژمارەیان چەندە؟ وە من لە کتێبی (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا، زۆر بە تەفصیلێ باسی ئەوەم کردوە کە گوناهە گەورەکان چیو چین؟ وە چەند جۆرن؟ وە چەندن؟ جا دیارە زانایان لەسەر ژمارەیان ڕێك نەکەوتوون، بەڵام لەسەر پێناسەکەی زۆربەیان ڕێك کەوتوون، یەك پێناسەی گشتی دەڵێن: گوناهی گەورە، هەر گوناهێکە سزایەکی دنیایی لەسەر بێ، یاخود هەڕەشەیەکی قیامەتیی، هەر گوناهێك سزای دنیایی لەسەر بێ، وەك: قەتڵ، زینا دزیی، شەڕاب خۆریی، یاخود سزاو هەڕەشەی قیامەتی لەسەر بێ، وەك: غەیبەت، درۆ، پەیمان شکاندن، گاڵتە بە خەڵك کردن، جاسووسیی بەسەر یەکدییەوە کردن، کە ئەوانە سزای دنیاییان لەسەر نیە، بەڵام هەڕەشەی قیامەتییان لەسەرە، هەر گوناهێك سزای دنیایی لەسەربێ، یان هەڕەشەی قیامەتیی، ئەوە گوناهی گەورەیە، ئەم پێناسەیە زۆربەی زانایان لەسەری ڕێککەوتون، ئنجا ئایا ئەم پێناسەیان لەچی وەرگرتوە ؟ لەڕاستییدا لە کۆی ئایەتەکانی

قورئـانو فەرمایـشـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ، وە لـە قـسـەی هاوەڵانیش، بـۆ وێنـە: عەبـدوڵڵای کـوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ گوتوویەتی: ﴿الكَبِيـرَةُ: كُلُّ ذَنْبٍ خَتَمَـهُ اللَّهُ بِنَـارٍ، أَوْ غَضَبٍ، أَوْ لَعْنَـةٍ، أَوْ عَذَابٍ﴾[1]دا واتـە: گونـاهی گـەورە هـەر گوناهێکـە کـە خـوا ﷻ باسـی کردوە، باسـی ئاگری لەگەڵ کردبێ، یان باسی تووڕەیی خۆی، یـان لەعنـەت، یان باسی عەزابو سزای لەگەڵ کـردبێ.

**بـڕگەی چـوارەم:** ئـەم بڕگەیـە زۆر گرنگـە، ئـەویش ئەوەیـە کـە زۆربـەی خەڵـکی وا دەزانـن کـە گونـاح تـەنیا بریتیـە لـە شـکاندنی قەدەغـەکان!! دەڵـێن: سـوودخۆریی گوناهـە، زینـا گوناهـە، قـەتل گوناهـە، ئنجـا درۆکـردن گوناهـە، بوختـان بـۆ خـەڵك کـردن گوناهــە، ڕێگریـی گوناهـە ... هتـد، بـەڵام پێمـوایە زۆربـەی خـەڵکی نـازانن، کـە گونـاهی گـەورە بەرلـەوەی شـکاندنی قەدەغەکـان بێ، چوواندنی فەرزەکانە! وەك من لە کتێبـی (گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا)دا بـە تەفـصیلێ باسـم کـردوە، ئـەوەش مەسـەلەیەکی زۆر زۆر گرنگـە، بۆچی؟ چونکە لەڕاستییدا کە فـەرمانی خـوا بـچووێنی گـەورەترە لـەوەی کـە قەدەغـەکەی بشـکێنی، چونکە فەرمان چوواندن سـەردەکێشـێ بـۆ قەدەغـەی خـوا شـکاندنیش، پاشـان ئێمـە تەماشـا دەکـەین دوو کـەس لـە ئاسمـان گوناهیـان کـرد: ئـادەم ﷺ، وە ئیبلـیس لەعنـەتی خـوای لـێ بـێ، ئـادەم قەدەغـەی خـوای شـکاند ئیبلیـسیش فـەرمانی خـوای چوواند، ئـەوەی ئـادەم ئەهوەنتـر بـوو، ئـادەم قەدەغـەی خـوای شـکاندو دوایـی دانـی بـە هەڵـەی خۆیداهێنـا، بـەڵام ئیبلـیس فـەرمانی خـوای چوواندو دوایـی فـەرمانی خـوا چوواندنەکەشـی زۆر قەدەغـە شـکاندنی بـەدوادا هـاتن، گـوتی: جـارێ لـە سـەرەتاوە گوناهـەکەی خـۆی پاسـاودایەوەو، گوتی: بۆیـە سـوجدەم بـۆ ئـادەم نەبردوە بە فەرمانی تۆ چونکە من لـەوی چاکتـرم نابـێ هـی چاکتـر سـوجدە بـەرێ بـۆ کەسـێکی دی، مانـای گوناهەکـەی خـۆی کـە فـەرمان چوواندن بـوو

---

١) فتح القدير للشوكاني: ج: (١)، ص: (٥٨٧).

پاساودایەوەو بە گوناهێكی گەورەتر وەك عەرەب دەڵێن: (العُذرُ أقْبَح مِنَ الذَنْبِ)، ئنجا كوردیش دەڵێن عوزر لە قەباحەتی خراپتر! دوایی گوتی: بمهێڵەوە بۆ ئەوەی تووشی گوناهیان بكەمو هەموویان گومڕا بكەم، كەواتە: بەڕاستیی دەبێ زۆر وریابینو بزانین كە فەرمانی خوا چوواندن، چوواندنی فەرزەكان، گەورەترە لە شكاندنی قەدەغەكان، چونكە چوواندنی فەرزەكان زەمینە ساز دەكات بۆ شكاندنی قەدەغەكانیش، بەڵگەمان چییە؟ خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾﴾العنكبوت، واتە: نوێژ خاوەنەكەی قەدەغە دەكات لە هەرچی لە قسەو كردەوەی ناقۆڵاو ناشیرینو وتارو كرداری خراپ، كەواتە: ئەگەر ئینسان نوێژكەری باش بێو فەرمانی خوا نەچووێنێ، كە فەرموویەتی: نوێژ بكەن، ئەوە قەدەغەكانی خواش ناشكێنێ، وە لەڕاستییدا ئەگەر تەماشای گوناهباران بكەین، دەبینین بە زۆریی كێن؟ ئەوانەن كە لە مەیدانی طاعەتدا نایانبینی، ئەوانەن كە لە ماڵی خوادا نایانبینی، ئەوانەن كە فەرزەكانی خوا جێبەجێ ناكەن، ئەوانەن كە بەزۆریی قەدەغەكانی خوا دەشكێنن.

**مەسەلەی شەشەم:** خوای پەروەردگار ڕوو لە پیاوانو ئافرەتان دەكات، واتە: ڕوو لە مرۆڤەكان دەكات بە نێرو مێ وە، بەلاّم دیارە دواندن لەگەڵ ئەهلی ئیمانە، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾، وە ئەوەی كە خوای كاربەجێ هەندێكتانی پێ بەسەر هەندێكتاندا هەڵبژاردوە، یاخود كردوویەتی بە ئیمتیازو پلە بۆ هەندێكتان بەسەر هەندێكتانەوە، بە ئاواتی مەخوازن، دیارە ئەم ڕستە قورئانییە دەگونجێ دوو جۆرە واتای لێ بدرێنەوە:

**یەكەمیان:** ئەوەیە كە خوا ﷻ لێرەدا ئامۆژگاریی ئیمانداران دەكات، كە لە نێوان خۆیاندا، خۆیان لە حەسوودیی‌و ئێرەیی بە یەكدی بردن بپارێزن، واتە: چاكەیەك كە هەركامێكیان لە بەرانبەرەكەیدا، لەوانی دیكەدا هەستی پێ دەكات، نیعمەتێك، چاكەیەك، جا چ پەیوەندیی بە شتێكی زاتییەوە هەبێ، وەك: هێزو توانا، جوانیی‌و قەدو قیافەو عەقڵ‌و زانیاریی، چ پەیوەندیی بە شتێكی دەرەكییەوە هەبێ، وەك: خزم‌و عەشیرەت‌و ماڵ‌و سامان‌و ... هتد، ئەو چاكەو نیعمەتانەی یەكدی بە ئاوات نەخوازن، دیارە مەبەست لێرەدا ئەوەیە كە حەسوودیی بە یەكدی نەبەن، یاخود هەوڵ نەدەن بۆ چاكەو نیعمەتی یەكدی، خوای پەروەردگار نیعمەتەكانی خۆی دابەشكردوە، هەندێ كەس لە شتێكدا زیاتری پێداوە لەوەی دیكە، ئەو نیعمەتە كە فەزڵ‌و ئیمتیازی هەندێكتان بەسەر هەندێكتاندا، بە ئاواتی مەخوازن، واتە: لێرەدا خوای زاڵی پایەدار حەسوودیی‌و ئێرەیی بە یەكدی بردن، قەدەغە دەكات لە ئەهلی ئیمان، ئەدی كاتێك كەسێك شتێكی باش لە بەرانبەرەكانی دەبینێ، نیعمەتێك شك دەبات‌و وەك هی ئەو بە ئاوات دەخوازێ ؟ دوایی باسی دەكەین كە حوكمی ئەوە چییە؟

**دووەمیان:** واتایەكی دیكەش لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ، كە ئەویش زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەكاندا دەگونجێ، ئەویش ئەوەیە كە خوا ﷻ لێرەدا ئامۆژگاریی پیاوان‌و ئافرەتان دەكات، كە چاو نەبڕنە چاكەكانی یەكدی، چاو نەبڕنە تایبەتمەندییەكانی یەكدی، وە خۆزگەیان پێ نەخوازن، خوای بەدیهێنەر پیاوی بە نێر دروست كردوە، ئافرەتیش بە مێ، ئنجا نێرایەتیی پیاو كۆمەڵێك سیفەتی سروشتیی لە پیاودا پەیداكردوون، كە ئەركێك دەكەوێتە سەر شانی پیاو، ئەو سیفەتانە دەیخوازن، وە ئەركێكیش كە دەكەوێتە سەر شانی ژن ئەو سیفەتانەی كە لە ئافرەت دان دەیخوازن، ئەركی سەر شانی پیاو لە ڕوانگەی شەریعەتەوە چییە؟ پیاو دەبێ ماڵ‌و منداڵ بەخێو بكات ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴿٢٣٣﴾﴾ البقرة،

واتە: ئەوەی کە دەبێتە بابی منداڵەکان، دەبێ بژیوی ئافرەتو منداڵەکان دابین بکاتو پۆشاکیان بۆ دابین بکات، بەڵکو دەبێ جێگاو ڕێگایان بۆ دابین بکات، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ ﴿٦﴾﴾ الطلاق، واتە: هاوسەرەکانتان لەو شوێنەدا کە خۆتان لێی نیشتەجێن، بەپێی توانای خۆتان نیشتەجێیان بکەن، کەواتە: جێگاو ڕێگای تێدا نیشتەجێبوونی ئافرەتیش لەسەر پیاوە، هەروەها پیاوان ئەرکی جەنگو جیهادو بەرگریی کردن لە وڵاتو لە کۆمەڵگایان لە ئەستۆدایە، وە کۆمەڵێك ئەرکی دیکە شەریعەت تایبەتی کردوون بە پیاوانەوەو ئەو سیفەتانە دەخوازن کە لە پیاواندا هەن[1].

هەروەها ئافرەتیش کۆمەڵێك ئەرکی سروشتیی لەسەر شانن، ئەرکی دایکایەتیی لەسەر پێویستەو هەر بە سروشت، ئافرەت نەبێ ناتوانی ببێتە دایك، بۆیە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِ ﴿٢٣٣﴾﴾ البقرة، واتە: دایکان منداڵی خۆیان دوو ساڵی ڕەبەق شیر پێدەدەن، دیارە تەنیا ئافرەت توانای شیر پێدانو بەخێوکردنی منداڵو توانای دایکایەتیی هەیە، هەروەها لە چوارچێوەی ماڵێدا دیسان ئیشوکارەکان دابەش دەبن، ئەرکی دەرەوەی ماڵ عایدی پیاوە، وە ئەرکی نێوەوەی ماڵ عایدی ئافرەتە، خوا ﷻ کاربەجێیە، ئەو ئەرکانەی کە دەکەونە سەر شانی پیاو پێویستییان بە کۆمەڵێك سیفەت هەیە، خوا ئەو سیفەتانەی لە پیاودا خوڵقاندوون، وەك: زبریی، بەهێزیی عەقڵ، بەهێزیی جەستەیی، بەهێزیی ئیرادە، کۆمەڵێك سیفەت کە ئەو ئەرکانەی پیاو لەسەر شاننی پەکیان لەسەر ئەو سیفەتانە کەوتوە، ئافرەتیش کۆمەڵێك سیفەت کە ئەرکە سروشتییەکانی پێویستیان پێیان هەیە، خوای پەروەردگار تێیدا خوڵقاندوون، وەك: نەرمو ناسکیی،

١) لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت)دا بە درێژیی باسی ئەو بابەتە کراوە، بڕوانە بەرگی دووەم: بەشی پێنجەم.

عەطفو سۆز، بەزەیی، هەستی ناسك، دەنگی ناسك، کۆمەڵێك سیفەت کە ئەرکی دایکایەتیی و منداڵ بەخێوکردنو کابانێتی پەکیان لەسەریان کەوتوە، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ ئامۆژگاریی پیاوانو ئافرەتان دەکاتو دەفەرموێ: ئەو سیفەتانەی کە بە سروشت خوای پەروەردگار پێکهاتەی جەستەیی و نەفسیی هەرکامێکتانی لەسەر داناون، لەبەرئەوەی کە ئەرکە سروشتییەکانتان ئەو سیفەتانە دەخوازن، هەوڵ مەدەن خۆزگە بەو سیفەتانە بخوازن، جا ئینسان کە خۆزگەی بە شتێکیش خواست، هەوڵ دەدات لاسایی بکاتەوە، بۆیە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: ﴿لَعَنَ اللَّهُ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنْ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣١٥١)، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيح عَلَى شَرْط البُخَارِي، واتە: خوا نەفرینی کردوە لە ئافرەتانێك کە خۆ بە پیاوان دەچوێنن، وە لە پیاوانێك کە خۆ بە ئافرەتان دەچوێننو لاساییان دەکەنەوە، بۆچی؟ چونکە پیاو پیاوەو ئافرەتیش ئافرەتە، خوای کاربەجێ هەرکامێکیانی بە کۆمەڵێك تایبەتمەندییەوە خوڵقاندوە، کە ئەرکە سروشتییەکانیان ئەو تایبەتمەندییانە دەخوازن، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو بیرۆکەیەی لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هەیە، کە وشەی (جەندەر) کۆی دەکاتەوە، کە بریتیە لە نەهێشتنی جیاوازییە سروشتییەکانی نێوان پیاوانو ئافرەتان، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوە بەڕاستیی لادانێکە لە فیطرەتو سروشتێك کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە، وە شتێکی بێ هوودەو بێ سوودیشە، ئافرەت بەوە کە لاسایی پیاو دەکاتەوە، نابێتە پیاو، پیاویش بەوە کە لاسایی ئافرەت دەکاتەوە، نابێ بە ئافرەت، بەڵکو هەرکامێکیان بەو شێوەیەیە کە خوای کاربەجێ لەسەری خوڵقاندوە، وە لەڕاستیدا ژیانیش پێویستی بە هەردووکیان هەیەو ئافرەتو پیاو تەواوکەری یەکدین، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٢٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١١٣)،

عَنْ عَائشة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَأَخْرَجَهُ أَيضاً أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣٦)، وَالدّارمي برقم: (٧٦٤) عَن أنَس ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني، واته: بێگومان ئافرەتان نیوەو لەتکی پیاوانن، ئافرەتو پیاو هەردووکیان دەتوانن ببنە بابو دایك، وە وەچەی بەشەر درێژە پێ بدەن لەسەر زەوی، ئەوە نە بە پیاو بە تەنیا دەکرێو نە بە ئافرەت، هەروەها ماڵیش پێویستیی بە بابیش هەیەو پێویستیی بە دایکیش هەیە، پێویستیی بە پیاویش هەیە، پێویستیی بە ئافرەتیش هەیە، ژیان بۆخۆی وایە، کەواتە: خوای پەروەردگار چۆنی داناوە، پێویستە وابێ، وە ئەگەر تەماشای ڕێژەی پیاوانو ئافرەتان بکەین، دیسان تەماشا دەکەین خوای کاربەجێ وای داناوە کە ڕێژەی ئافرەتانو پیاوان تا ڕاددەك لێك نزیکە، جاری وا هەیە پیاو زیاتر دەبێ، یانی ساڵێك کوڕ، ساڵێك کچ، بەڵام بە هەرحاڵ موعەددەلو کۆی گشتی وەك یەکە، یان بەلایەنی کەمی لێك نزیکە، بۆیە ئەوەی کە ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هەیە، کە وەك گوتم: لەژێر ناوونیشانی (جێندەر)دا کۆدەبێتەوە، کە هەوڵدانە بۆ نەهێشتنی جیاوازییەکانی نێوان نێرو مێ، جیاوازییەکانی نێوان پیاوانو ئافرەتان، کە دیارە بە زۆریش ئەوە لەلای ئافرەتانەوەیە کە هەست بە ناتەواویی دەکەن، وە بەڕاستیی ئەوانەش کە ئەو فەلسەفەیەی بەرگرییکردن لە مێیان تەبەنیی کردوەو، هەوڵدەدەن ئافرەت چاو لە پیاو بکاتو، مل بە ملە لەگەڵ پیاو بکاتو بچێتە مەیدانی چالاکییەکانی پیاوەوە، دیارە ئەوانە مێینە بوونو ئافرەت بوون بە کەموکورتییو عەیب دەزانن، بەڵام شەریعەت مێینەبوونی ئافرەت بە کەموکورتییو عەیبە نازانێ، وە هیچ ئایەتێکمان نیەو هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ نیە کە مێینە بوون، ئافرەت بوون بە کەموکورتییو ناتەواوی لە قەڵەم بدات[1]، بەڵام دیارە ئەوانەی کە ئەو ڕێڕەوو فەلسەفەیە تەبەنیی دەکەن، مێینەبوونو ئافرەت

---

١) لە کتێبی (ئافرەت و خێزان...)دا بە باسی ئەو مەسەلەیە کراوە، بڕوانە بەرگی یەکەم: بەشی سێیەم.

بـوون بـە کـەموکورتیی‌و عەیـب دەزانـن، بۆیـە دەیـانەوێ ئـافرەت بـچێتە مەیدانی چالاکییەکانی پیاوەوە، وە لە مەیدانی بنەڕەتی خۆی بچێتـە دەرێ، کە دایکـایەتییەو کابانـەتییە، چونکە پێیـان وایـە ئـەوە نوقصانییە، یـانی: نوقصانییە کە ئـافرەت دایك بـێ‌و کابان بـێ‌و منـداڵ بـەخێو بکات ! بـەڵام شەریعەت بە نوقصانیی نازانێ، بەڵـکو شـەریعەت ئـەو ئەرکـە سروشـتییەی کە بـۆ ئـافرەتی دیاری کـردوە، وە ئـەو ئەرکـە سـروشـتییەی کە بـۆ پیـاوی دیـاری کـردوە، هـەرکامێکیان بـە تەواوکـەری یەکـدی دەزانـێ، جـا دیـارە لـە ڕۆژگـاری پێغـەمبەر ﷺ یـشدا جۆرێـك لـەو هەسـتە هـەبووە، واتـە: ئـەو هەستە کە پیـاوان هەوڵبـدەن لە ئیمتیازەکانـدا ئیمتیازیـان لە هـی ئافرەتـان زیـاتر بـێ، یـاخود ئـافرەتان هەوڵبـدەن ئیمتیازیـان لـەو بوارانـەی کـە هـی پیـاوانە، وەك ئەوان هـەبێ، لـەوبارەوە چـەند شـتێك هەیـە، بـا سـەرنجی ئـەم دوو دەقـە بدەیـن:

١) ﴿عَن جَابر بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ إذ أقبلت امرأةٌ حتى قامت عند رسول اللّه ﷺ، ثُمَّ قَالَتْ: يا رسول اللّه ﷺ! أنا وافدة النساء إليك، إنَّ اللَّهَ رَبّ الرجال وربّ النساء، وآدم أب الرجال وأب النساء، وحواء أم الرجال وأم النساء، وأنت بعثك رسولاً إلى النساء والرجال، ثُمَّ الرجال إذا خرجوا في سبيل اللّه وَقُتِلُوا فَهُمْ أحياء عند ربهم فرحين، وَنَحن نَحبس عليهم ونَخدمهم فهل لنا من الأجر شَيء؟ فقال رسول اللّه: (اقرئي النساء السلام وقولي لهنّ: (إنّ طاعة الزوج واعترافاً لَحقه يعدلُ ذلك، وقليل منكنّ يفعلهُ)﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَري في (جامع البيان): (٣١٥١)، (٧٣٢١) والطبراني في الكبير برقم: (٦٠٩)، واتە: جابیـری کوڕی عەبـدوڵڵا خوا لـێیان ڕازی بـێ، دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: ئێمـە لـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـووین، ئافرەتێـك هـات، هـەتا هـاتە خزمـەت پێغەمبـەرو بـە پێـوە ڕاوەسـتا، گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! مـن نوێنـەری ئافرەتـانم بـۆ لای تـۆ، خـوای پایـە

بەرزو مەزن پەروەردگاری پیاوانو ئافرەتانە، ئادەم بابی پیاوانو ئافرەتانە، حەووا دایكی پیاوانو ئافرەتانە، وە تۆش وەك پێغەمبەر رەوانەكراوی بۆ پیاوانو ئافرەتان، كەچی پیاوان كاتێك لە رێی خوادا جەنگ دەكەن، ئەگەر بكوژرێن ئەوە لە لای خوا زیندوونو لای پەروەردگاریان دلْخۆشن، وە ئێمەش لە مالْەوە بە ئەركی مالْو حالْی ئەوانەوە حەپسین، (واتە: دەمێنینەوەو ناچین بۆ جەنگو جیهاد، وە خزمەتیان دەكەین) ئایا ئێمە پاداشتمان هەیە، (یانی: پاداشتی ئەو جەنگو جیهادە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سلاْوی من بگەیەنە بە ئافرەتان، وە پێشیان بلْێ: فەرمانبەرییكردنی مێرد، وە دانپێداهێنانی هەقەكەی (واتە: جێبەجێكردنی هەقەكەی) بەرانبەری هەموو ئەوەیە، (یانی: ئەوان دەچن بۆ جەنگو شەهید دەبن پاداشتیان هەیە، ئێوەش ئەگەر مالْدارێتیی باش بكەن، ئەركە سروشتییەكانی سەرشانی خۆتان جێبەجێ بكەن، ئێوەش لەنێو مالْو حالْی خۆتان بە قەدەر پیاوان پاداشتتان هەیە)، هەرچەندە كەمیشتان وەك پێویست بەو ئەركە هەلْدەستن.

٢) هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: ﴿وَقَال قتَادَةُ والسُّدِّيُّ: لَمَا نَزَلَ قَوْلِهِ تَعَالى: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴿١١﴾﴾ فَقَالَ الرِّجالُ: إنَّا لَنَرجُو أن يُفَضِّلَنا اللَّه عَلَى النِّساءِ بِحَسَنَاتِنَا فِي الآخرة، كَمَا فَضَّلَنَا عَلَيْهِنَّ بالمِيراث، فَيَكُونُ أجرُنا مِثلِي أجر النِّساءِ، وَقَالَ النِّساءِ إنَّا لَنَرْجُو أن يَكُونَ الوِزرُ عَلَيْنَا نِصْفَ مَا عَلَى الرِّجَالِ، كَمَا لَنَا فِي الْمِيْرَاثِ النّصف مِن نصيبهم، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾﴾﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ في (جامع البيان): (٧٣٢٦) عن السدي، و (٧٣٢٩) عن قتادة:

وقال السيوطي في الدر المنثور[١]، وَأَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزاق وَالبَزَّارُ وَالطَّبَرَانِي عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ[٢]، واتە: قەتادەو سوددیی دەڵێن: کاتێك خوای بەرز ئەم ڕستە قورئانییەی ناردە خوار: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴿١١﴾﴾، بۆ نێرینە دوو بەرانبەری بەشی مێینە هەیە، پیاوان گوتیان: ئێمە ئومێدمان وایە خوا لە ڕۆژی دواییدا بە چاکەکانمان بەسەر ئافرەتاندا هەڵمانبژێرێ، وەك چۆن لە میراتدا بەسەریاندا هەڵیبژاردووین و زیادەی داوینێ، وە دوو بەرانبەری ئەوان پاداشتمان هەبێ، ئافرەتانیش گوتیان: ئێمەش ئومێدمان وایە کە گوناهی ئێمە نیوەی گوناهی پیاوان بێ، وەك چۆن میراتەکەشمان بە قەد نیوەی وانە، خواش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، (کە نەخێر نە پاداشتی پیاوان دوو بە قەدەر هی ئافرەتانە، نە گوناهی ئافرەتانیش نیو هێندەی پیاوانە، بەڵکو هەر کەس بە قەدەر خۆی پاداشتی هەیەو بە قەدەر خۆی سزای هەیە)، وەك دەفەرموێ: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ﴾، واتە: لە میرات و لە سزا بۆ پیاوان و ئافرەتان، هەر کەسە بەقەدەر خۆی بەشی خۆی هەیە، لێرەدا ئەوەی کە گرنگە ئێمە بیزانین، ئەوەیە کە ئەوەی شەریعەت دەیەوێ، بریتیە لەوەی کە هەر کام لە پیاوو ئافرەت بەو بەشەی خوا پێی داون ڕازی بن، وە ناگونجێ دەستکاریی بکرێ، خوای کاربەجێ ئافرەتی بە مێینە خوڵقاندوە، پیاویشی بە نێرینە خوڵقاندوە، نە مێیینایەتیی ئافرەت نوقصانییەو، نە نێرینایەتیی پیاو فەزیلەت و ئیمتیازە بەسەر ئافرەتدا، بەڵکو ئافرەت کە مێینەیە ئەگەر لە پیاوەکە بە تەقواتر بێ، ئەوە لە سەرووی ئەوەوەیە لە بەهەشت، وە بە پێشی دەکەوێتەوە، وە ئەگەر کەم تەقواتریش بێ لێی دوادەکەوێت، بۆچی؟ چونکە خوای دادگەر دەفەرموێ:

---

١) ج: (٢)، ص: (٥١٦).

٢) التفسير الطَّبَرَاني، ج: (٢)، ص: (٢٢٨).

﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ الحجرات، واتە: بەرێزترینتان لای خوا پارێزکارترینتانە، کەواتە: نێر بوونو مێ بوون، فەزیلەت یان نوقصانییو ناتەواویی نین، بەڵکو تەواوکاریین، یانی: ئیسلامو شەریعەت دەیەوێ پەیوەندیی نێوان پیاوانو ئافرەتان پەیوەندیی تەواوکاریی بێ، نەك دژایەتییو بەگژ یەکدا کردن، وەك ئێستا هەندێ لە عەلمانییەکان دەیکەن، وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، لەژێر ناوونیشانی: (جێندەر)دا، بەڵکو لەسەر ئاستی دنیا ئێستا دەبیسترێ کە ئافرەت ئینکاریی لە مێیینایەتییو دایکایەتیی خۆی بکات، بەڵکو جاری وایە ئافرەت هاندەدرێ کە خۆی بکات بە پیاو، لە ڕێگەی نەشتەرگەریی (عملیات) کردنەوە، هەرچەندە دیارە لە بەرانبەریشدا هەندێ پیاویش هەن، کە دەیانەوێ خۆیان بکەن بە ئافرەت، بەڵام شەریعەت نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی کە خۆ وەك پیاوان لێ دەکەن، بۆچی؟ چونکە دیارە ئافرەتبوونیان پێ ناتەواوییە، لە حاڵێکدا کە خوای پەروەردگار بە نوقصانیی دانانێ، هەروەها نەفرینی کردوە، لەو پیاوانەش کە چاو لە ئافرەتان دەکەنو دەیانەوێ خۆیان بکەن بە ئافرەت، بۆچی؟ چونکە ئەوانیش دیارە پیاوبوونی خۆیان پێ نوقصانییە، لە حاڵێکدا کە خوا بۆخۆی کاربەجێیە، دەزانێ کە ئەم ژیانەی بەشەر پێویستیی بە پیاوانیشو بە ئافرەتانیش هەیە، پێویستیی بە نێرو مێ هەیە، ئاخر ئەگەر ئەو ئافرەتو پیاوە، لەسەر بناغەیەکی شەرعیی پێك نەگەنو، وەچەیان لێ نەکەوێتەوە، وەچەی ئینسان بنەبڕ دەبێ، ئنجا ئەگەر بێتو ئافرەتان هەموویان خۆ بکەنە پیاوو، پیاویش هەموویان خۆ بکەنە ئافرەت، شتێکی زۆر سەیر دەبێ!! وە ئەوە هەڵگەڕانەوەیە لە فیطرەتو سروشتێك کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە، ئەدی بەدیلی ئەوە چییە؟ بەدیل ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾، واتە: وە لە بەخششی خوا داوا بکەن، ئافرەت ! تۆ ئەوە تازە ئافرەتیو خوا وای

خوڵقاندووی، بەڵام هەوڵبدە ئەو ئافرەتایەتیی و دایکایەتییەی خۆت بە شێوەیەك جێبەجێ بکەی، کە بە پێش زۆر لە پیاوان بکەویەوە، پیاو ! تۆش تازە پیاوی و خوا وای خوڵقاندووی، بەدەست خۆت نیە، بەڵام هەوڵبدە بە شێوەیەك ئەرکی پیاوەتیی و باوکایەتیی خۆت جێبەجێ بکەی، کە پێی لە خوا نزیك ببیەوەو، وە بە پێش خەڵکی بکەویەوە، ئەوە شتی ڕەواو ڕاستە، نەك مل بە ملە لەگەڵ یەکدیدا کردن و بەگژ یەکدیدا چوون، بڵێین: دەبێ ژن سالاریی بێ، نەخێر دەبێ پیاو سالاریی بێ!

شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: نە ژن سالاریی، نە پیاو سالاریی، بەڵکو شەرع سالاریی، شەریعەتی خوا چی داناوە بۆ ئافرەتان و پیاوان، پێویستە پێوەی پابەندبن.

**مەسەلەی حەوتەم:** بەڵام پێویستە بزانرێ کە ئەگەر چەمکی ئەم ئایەتە بە گشتی وەربگیرێ و تایبەت نەکرێ بە ژنان و پیاوانەوە، ئەوە وا هەست دەکرێ، لە نێوان مرۆڤەکاندا جیاوازیی هەیە، بۆیە پێویستە وریای چەند تێبینییەك بین:

١/ خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ (٣٢) النساء، دیارە ئەوە دەگونجێ مەبەست پێی پیاوان و ئافرەتان بێ، کە کۆمەڵێك سیفەت لە پیاودا هەن، لە ئافرەتدا نین و، کۆمەڵێك سیفەت لە ئافرەتدا هەن لە پیاودا نین، بەڵام دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە خوای بەخشەر هەندێ لە خەڵکی توانای عەقڵیی زیاتری پێدابن و، هەندێکیان توانای جەستەیی زیاتری دابنێ و، هەندێکیان توانای عاطیفیی زیاتری دابنێ و، هەندێکیان توانای خەیاڵ و ئەندێشەی زیاتری پێداون، وە هەندێکیان توانای ڕووحیی زیاتری دابنێ، وە هەندێکیان لە ڕووی داراییەوە، دەوڵەمەندتر دەبن، یان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پایەی کۆمەڵایەتییان زیاتر دەبێ... هتد، یانی ئەگەر تەماشای خەڵك بکەین ڕاستە جیاوازیی هەیە لە سیفەتەکانیاندا، بەڵام ئایا بۆچی وایە؟ خوای کاربەجێ وەڵامی ئەو

پرســـیارەی داوەتـــەوە، دەفـــەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾الأنعـام، واتە: خوا ئێوەی کـردوە بـە جێنـشین لەسـەر زەوی (پیـاوو ئـافرەت هـەموویان جێنـشینی خـوان، واتــە: خـوا دەسـتی ئـەو ئینسانانەی ئاوەڵا کردوە لەسەر زەوی کـە تەصـەڕڕوف بکەن لە جیـاتی خـوا، بەڵام ئاسمانەکان خوای پایـەدار بۆخـۆی ڕاسـتەوخۆ لـە ڕێـی فریـشتەکانەوە ئیـــدارەیان دەکـــات)، جـــا دەفـــەرموێ: ﴿ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، واتە: هەندێکـتانی بەسـەر هەندێکـتاندا بـە چەند پلــەیەك بــەرز کردۆتــەوە، بۆچــی؟ دەفـەرموێ: ﴿ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾، واتـە: تاکو لـەوەدا کە پێـی داون تاقیتـان بکـاتەوە، ئـەوەی توانـای عەقڵـیی زیاترە، دەچێتـە پێگەی بڕیار دانەوە، ئەوەی توانای عیلمیی زیـاترە، دەبێتـە ئەهلی عیلـم، ئەوەی توانای جەستەیی زیاترە لە بـواری خۆیـدا دەور دەبینـێ، ئــەوەی توانـــای دەروونیـــی زیـــاترە، یـــان ئازایـــەتیی زیـــاترە، هەیـــە ســـەنگی کەسـایەتی زیـاترە، هەیـە بـۆ جـەنگو شــەڕو شـۆڕ ئـازاترە، هەیـە لـە ڕووی عیلمیو فیکرییەوە داهێنان دەکات، هەروەها هەیـە لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە خـــۆش خوڵقتـــرو زمـــان شـــیرینتـــرو ڕووگەشـتـــرە، هـــەر کەســـە خـــوای پەروەردگار شـتێکی پێـداوە، وەك لـە فەرموودەیـەکی پێغەمبـەردا ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: «إِنَّ اللَّـهَ تَعَـالَى قَسَّمَ بَيْنَكُمْ أَخْلاَقَكُمْ، كَمَا قَسَّمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ»، أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ فـي (الأدب الـمفرد) بـرقم: (٢٧٥)، وَالطَّبَرَانِـيُّ فـي (الكـبير) بـرقم: (٨٩٩٠)، قَـالَ الْهَيْثَمِـي: رجالـه رجـال الـصحيح، وَقَـالَ الشَيخ الألبـاني: صَحيح موقوف فـي حكم الـمرفوع)، واتـە: بێگومـان خـوای بەرز ڕەوشتو ئەخلاقی بەسەردا دابەش کردوون، هەروەك چۆن ڕزقو ڕۆزیی بەسەردا دابەشکردوون.

کەسی وا هەیە هەر بە تەبیعەت لەسەر خۆو نەرمو نیانە، هەیە تۆزێك چیکڵدانەی بچووکە زوو تووڕە دەبێ، هەیە هەر بە سروشت ئازایەو، هەیە پێچەوانەی ئەوەیە، هەیە بە سروشت تۆزێك دەست قووچاوە، کەسی واش هەیە زۆر سەخییە، کەواتە: جیاوازیی لە سیفەتەکاندا هەیە، بەڵام ئەو جیاوازییە بۆچییە؟ بۆ یەکدی تەواوکردنە، ئەگەر خەڵك هەمووی لە ڕووی عەقڵییو، لە ڕووی عیلمیی یەوە، وەك یەك بووایە، کەس گوێی بۆ کەس نەدەگرت، کەس بە قسەی کەسی نەدەکرد، ئەگەر خەڵك هەمووی لە ڕووی ئازایەتییەوە وەك یەك بووایە، دەبووایە هەموویان بووبانە سەرباز، هەروەها لە ڕووی کەسابەتەوە دەبووایە هەموو بووبوونایە بازرگان، بەڵام نا، خوای بێوێنە تواناو هێزەکانی جیاجیا خوڵقاندوون، بۆئەوەی کە بە هەموویان هەموو ئیشەکانی ژیانی دنیا پێکەوە ئەنجام بدەن، وەك لە سووڕەتی (الزخرف)دا دەفەرموێ: ﴿ ... لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ...﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: بۆئەوەی هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن، خەڵك حوکمڕانەکان بەکاردێنێ، دەبێ خزمەتی خەڵك بکەن، حوکمڕانەکان خەڵك بەکاردێنن، ئەهلی سیاسەت ئەویدیکە بەکاردێنێ، ئەوانی دیکە ئەهلی سیاسەت بەکاردێنن، هەموویان یەکدی بەکاردێننو خزمەتی یەکدی دەکەن.

٢/ خەڵك بە ئەندازەی ئەو نیعمەتانەی کە پێیان دراون، لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ: کەسێك خوای بەخشەر عەقڵێکی بەهێزی پێداوە، بە قەدەر عەقڵەکەی لێی دەپرسرێتەوە، وە کەسێك توانایەکی جەستەیی زیاتری پێدراوە، لەقەدەر توانا جەستەییەکەی لێی دەپرسرێتەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾ التكاثر، واتە: دوایی لەو ڕۆژەدا لە نیعمەتەکان لێتان دەپرسیتەوە، زیاتری پێدابێ زیاتر، کەمتری پێدابێ کەمتر، ئەوەش دادگەریی خوای بەرزو مەزن

دەردەخـات، بـەڵام ئـەدی ئـەو جیاوازییانـەی کـە پەیـدا دەبـن، نـەك لـە ڕووی ئەوەوە کە خوای بێ وێنـە خەڵکی وا خوڵقاندوە، بەڵکو بەهـۆی بـارودۆخی سیاسـیی‌و کۆمەڵایـەتیی‌و ئـابووریی ناشـەرعییەوە پەیـدادەبن، یەکـێك دێ بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەسـتەڵاتی هەیـە، خـەڵك دەخاتـە ژێـر ڕکێفـی خـۆی‌و دەیانکـاتە ژێردەسـتەو خزمـەتکار، یـانی: بـە چـاوی خزمـەتکار تەماشـایان دەکـات، ئەویدیکـە لـە ڕێـی کەسـابەتی ناشـەرعییەوە پـارەو سـامانێکی زۆر پەزمەنـدە دەکاو دوایی خەڵکی پێ دەچەوسێنێتـەوە، ئەویـدیکـە دێنێـت لـە ڕێـی فێڵبازییـەوە، خەڵـك هەڵدەخـەڵەتێنـێ، ئایـا ئەوانـە چـین؟ بێگومـان ئەوانـە شـەریعەت دایـنـەناون‌و ڕازیـش نیـە بـە مانەوەیـان، وەك لـە تێبیـنی سێیەمدا باسی دەکەین.

٣/ ئەو ئیمتیـازو پلـە ناشـەرعییانەی کە لە ڕێـی ناشـەرعییەوە بەکـارهاتوون ئیسلام دانیان پێدانـاهێنێ، دەڵێ دەبێ لابچن، بۆچی؟ چونکە دەرهاوێشتەی بـارودۆخێکی ناعەدالـەتن‌و دەرهاوێـشتەی بـارودۆخێکی ناسروشـتیی‌و نائاسایین، بۆیە ئیسلام دان بەو پلەو ئیمتیازانەدا نـاهێنـێ، کە لە ئـەنجامی بارودۆخێکی سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی پڕ زوڵم‌و ستەم‌و چینایەتیی‌و قرِوپڕیی دا پەیدادەبن، بەڵام ئەوانەی دیکە کە شتی فیطـرِیی‌و سروشـتیین، جیـاوازن، ئیـسلام دان بـەو جیاوازییانـەدا دێنـێ، ئەویـش بۆئـەوەی لـە ڕووی تەواوکـاریی‌و، لە ڕووی ئەوەوە کە هەر کـاروبـارێکی سەر زەوی ئەنجامـدەرێکی هـەبێ‌و، کەسـێك هـەبێ کـە ئەنجـامی بـدات، بـەپێی توانـاو بـەپێی ئـەو سیفەتانەی کە خوای بـەرزو پاك پێی بەخشـیون.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ ﴾، بۆ هـەر کامێـك میـراتگرانێکمـان دانـاون، لـەوە کـە بابو دایكو خزمـان بەجێی دێڵن.

ئەم ڕسـتە قورئـانییە سێ واتـای هـەن:

یەکەم: (لکل من الرجال والنساء جعلنا موالي عصبة یرثونه مِما ترکه والداه وأقرباؤه من میراثهم)، واتە: بۆ هەرکامێك لە پیاوانو ئافرەتان خزمانێکی پشتو نزیکمان داناون، کە میراتی لێ دەگرن، لەوە کە دوایی خۆی بەجێی دێڵێ وەك میرات، کێ بەجێی دێڵێ؟ ئەوە کە دایكو بابو خزمانی بەجێی دێڵن، بۆ هەرکامێکیان میراتگرانێکمان داناون.

دووەم: (ولکل جعلنا موالي أي ورثة من الذین ترکهم، ثم فسرهم فقال: الوالدان والأقربون)، واتە: بۆ هەر کامێك میراتگرانێکمان داناون، بۆئەوەی کە بەجێی دێڵێ وەك میرات، ئەو میراتگرانە کێنە؟ بابو دایكو خزمان.

سێیەم: (لکل شيء مِما ترك الوالدان والأقربون جعلنا موالي - ورثة - وجعلنا هنا لایتعدی إلی مفعولین بل هو بمعنی: خلقنا)، واتە: بۆ هەر شتێك کە بابو دایكو خزمان بەجێی دێڵن، میراتگرانێکمان داناون.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾، ئەوانەی کە پەیمانتان لەگەڵ داون، بەشی خۆیان پێ بدەن، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە بە ئایەتی (٧٥)ی سووڕەتی (الأنفال) نەسخ کراوەتەوە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...﴿٧٥﴾﴾، واتە: وە خزمان هەندێکیان لە هەندێکیان نزیکترن، لە کتێبی خوادا، واتە: هەندێکیان لە هەندێکیان میرات دەگرن، جا ئەوە ڕای (قتادة) وایە، بەڵام (مجاهد) دەڵێ وا نییەو ئەم ئایەتە نەسخ نەبۆتەوە، بەڵکو مەبەست لەم ڕستەیەی ئێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾، وەك (طبري) گوتوویەتی: ئەوەیە: (أراد بقوله: ﴿فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾: النَّصْرُ والعَقْلُ وَالرِّفَادَة دُونَ الْمِيرَاث)، (جامع البیان برقم: ٧٣٥٤)، مەبەستی لە

﴿ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ ﴾ یارمەتیدانو خوێندانو هاوکاریی کردنە، نەك میـرات. وە (طبـراني)یش لە تەفسیـرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وَلَيْسَ مَعْنَى قَول ابْنِ عَبَّاسٍ أنَّ هَـذِهِ الآيـةَ مَنْسُوخَةَ نُسِخَ حُكْمُهَا مِـنَ الأصْـل، وَلَكِن مَعَنْـاهُ: تَقـديم ذَوِي الأرحَـامِ عَلَـى أَهْلِ العَقْدِ وَهُـوَ كَحـدوث ابْـن لِمَـن لَـهُ أخٌ لايَخـرج الأخ مـن أن يكـون أهلاً للميراث إلاّ أن يكـون الأبـن أولـى منهُ، كذلك أولـي الأرحـام أولـى مـن الحليـف، فـإذا لَـمْ يَكُـن للميـت رحِمٌ ولاعـصـبـة فالـميراث للحليـف، ولـهـذا قال أصحابنا: فَمَـن أسـلم علـى يـدي رَجُـل وَوَالاه – عاقـده - ثُـمَّ مَـاتَ ولا وَارِثَ لَـهُ غـيره، أنَّ ميراثـه لـهُ وَلِهَـذَا قَـالوا: أن مَـنْ أوصـى بِجَمِيـع مَالِـهِ ولا وَارِثَ لَـهُ، صَـحّت الوَصِـية)[1]، تەبـەڕانیی ئـەم ئایەتـە لەگــەڵ ئایـەتی (٧٥)ی ســوورەتی (الأنفـال)دا دەگونجێنــێو دەڵـێ: ئیبنـو عەببــاس کـە دەڵــێ: نەســخ بۆتـەوە، مەبەسـتی ئەوە نیـە حوکمەکەی لە ئەسـڵـدا نەسـخ بۆتـەوە، بەڵـکو مەبەسـتی ئەوەیە کە خزمان لە میـراتگرتنـدا پێـش ئـەو کەسـانە دەخـرێن کـە پـەیمانیان پێدراوە، (لە سەردەمی نەفامییدا عادەتیان وابـووە یەکێـك پـەیمانی بـە یەکـێك دەدا، دەیگوت: من پەیمانت پێـدەدەم، ئەگەر مردم تۆ میـراتگرمی، وە ئەگـەر تـۆ مردی من میـراتـگرتـم، ئـەو پەیمانـەیان لەنێوانـدا دەبـوو)، دەڵـێ: ئـەوەش وەك ئەوە وایە کەسێك برایەکی هـەبێ، بـەڵام دوایـی کوڕێکی پەیـدابێ، دیارە ئەگـەر کوڕەکەی پەیدا نەبووایە برایەکەی میـراتی لـێ دەگرت، بەڵام کـە کـوڕ هـەبوو، برا میــرات نـاگرێ، چونکە کــوڕ بـرا بـێ بــەش (حَجْب) دەکات، دەڵـێ: لێـرەدا برایەکە لەوە نەچۆتە دەرێ کـە میــراتگربێ، بـەڵام ئەوەنــدە هەیــە هەتـا کــوڕ هەبێ، برا میــرات نـاگرێ، کەواتـە: خزمـان پـێش هاوپەیمانەکـان دەخـرێن لـە میـراتگـرتندا، بـەڵام ئەگـەر بـابـای مـردوو خزمـی نــەبوو، وە خزمـی پـشتێی نــەبوو میــراتی لـێ بگـرێ، ئـەوە میـراتەکەی بـۆ ئـەو کەســەیە کـە پەیمـانی لەگـەڵ بەســتوە، بۆیــە هــاوەڵانی ئێمــە (واتــە: حەنەفــیی مەزهەبــەکان) گوتوویــانە: هـەر کەسـێك لەسـەر دەسـتی کەسـێك مـسـوڵمان بـوو، وە پـەیمانی

[1] التفسير الكبير، ج: (٢)، ص: (٢٣٠).

لەگەڵدا بەستبوو، ئەگەر بابای کە پەیمانی لەگەڵدا بەستوە، مرد، وە کەسیش نەبوو میراتی لێ بگرێ لە خزمانی، میراتەکەی دەبێتە هی ئەو کەسەی کە پەیمانی لەگەڵدا بەستوە، هەروەها کەسێك هیچ خزمێکی نەبێ، بۆی هەیەماڵەکەی خۆی هەمووی بکا بە وەصیەت، لەبەرئەوەی کە میراتگری نین.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوای بێهاوەڵ دەفەرموێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە، پاشان حیکمەتەکەی بە دوو شت دەخاتە ڕوو، کە ئێمە دوایی باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا هەڵوەستەیەك دەکەین لە بەرانبەر ئەم ڕستە قورئانییەدا: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە[1]، لێرەدا مەبەست لەو ئایەتە قورئانییە موبارەکە ئەوەیە کە پیاو لە ماڵێدا سەرپەرشتیارە بەسەر ژنو منداڵەوە، بەسەر خێزانەوە، واتە: هەرچەندە لێرەدا خوای زاڵی پایەدار بەگشتی فەرموویەتی، بەڵام بەپێی سیاقی ئایەتەکان هەست دەکەین کە مەبەست پێی خێزانە، لە خێزاندا قسەی کۆتایی بەدەستی پیاوە، چونکە دەبێ سەرپەرشتیی ماڵو خێزان بکاو بەڕێیانەوە بەرێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەنیە کە پیاو کوێخا بێ بەسەر ماڵو خێزانەوە، بەو واتایەی کە کەس لە قسەی دەرنەچێ، هەق بڵێ، ناهەق بڵێ، چاك بکات، خراپ بکات ... نا ! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە دەبێ لەسەر بناغەی ڕاوێژو بە تەبایی ئەو خێزانە ئیدارە بکرێ، بەڵام قسەی کۆتاییو بڕیاری کۆتایی بە دەستی پیاوە، لەبەرچی؟ ئەوە لە مەسەلەی یازدەیەمدا ڕوونی دەکەینەوە.

---

١) وشەی (قَوَّامُونَ) کۆی (قَوَام)ە، (قَوّام) واتە: زۆر سەرپەرشتییکار، زۆر مشوورخۆر، ئەویش ئەوەیە کە شتێك باش بەسەری ڕابگەیو (قَوّام) (صیغة مبالغة)ی (قائم)ە، (قائم)یش، واتە: کەسێك بەسەر شتێك ڕابگاو سەرپەرشتیی بکات، (قِوامة) واتە: سەرپەرشتیکردن، دەڵێ: (القِوامَةُ: القِيَامُ عَلَى الشَّيءِ بِمَا يُصلِحُهُ)، واتە: (قِوَامَة) بریتیە لە سەرپەرشتییکردنێك بە شێوەیەك کە ئەو شتە چاك بکرێو ڕێکبخرێو ئیدارە بکرێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، سەرەتا دەڵێم: بۆ زانیارییتان کەمتر وایە خوا ﷻ حوکمێکی شەریعەت بفەرموێ، مەگەر حیکمەتەکەیشی لەگەڵدا دەفەرموێ، بۆ وێنە: باسی کۆمەڵێك خواردن دەکاتو دەفەرموێ، ئەوانە مەخۆن دوایی حیکمەتەکەی ڕوون دەکاتەوە، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، واتە: بۆیە دەبێ پیاو سەرپەرشتیاری ژنو ماڵ بێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوا هەندێك لە پیاوانو ئافرەتانی بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، واتە: زێدەیی پێداون، هەندێ سیفەتی بە هەندێکیان داوە لەوی دیکەدا نیە، ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، وە لەبەرئەوەش کە پیاوان لە ماڵی خۆیان سەرف دەکەن: پیاو مارەیی دەدات بە ئافرەت، لە دەرێ کەسابەت دەکات، ڕزق دێنێتەوەو ماڵو منداڵی پێی دەژییێنێ، مادام وایە جێی خۆیەتی کە هەر پیاویش ماڵو خێزان بەڕێوەبەرێ، ئنجا خوا ﷻ دوو هۆکاری باس کردوون:

یەکەم: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾.

دووەم: ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾.

ڕستەی: ﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ﴾، ئەوە دیارە، مەبەست پێی ماڵو سامان خەرجکردنی پیاوە، چونکە بە صیغەی (مُذَكّر) هێناویەتی: لەبەرئەوەی کە پیاوان دەبەخشن لە ماڵی خۆیان، لەو ماڵەی کە پەیدای دەکەن بە ئارەقەی نێوچاوانو بە ڕەنجی شان، بۆ ژنو ماڵەکەیان خەرجی دەکەن، کەواتە: پێویستە خۆشیان سەرافەتییو سەرپەرشتیی ماڵو خێزان بکەن، کێ ڕزقو ڕۆزییەکە پەیدا دەکات، زەحمەتی پێوە دەکێشێ، عەقڵ وادەخوازێ ئەویش خەرجی بکاتو سەرفی بکات، وە ئەمرو نەهی لە ماڵێدا بەدەست وی بێ، ئەوە دیارە کە هی دووەمیان مەبەست پێی پیاوە، بەڵام

هـــی یەكەمیـــان كـــە دەفـــەرموێ: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، بەهـۆی ئـەوەوە كـە خـوا ﷻ هەندێكیـانی بەسـەر هەندێكـیاندا هەڵبـژاردوە، ئەوە یـانی چی؟ هەرچی تەفسیـری چنگـم كەوتوەو تەماشام كـردوە هـەمووی هـەر دەڵـێ: لەبەرئەوە خوا پیاوانی بەسـەر ئافرەتانـدا بـەرز كردۆتـەوە، زیـادەی داونـیو هـەڵیبژاردوون، بـەڵام لەڕاسـتییدا مـن ئــەو واتــایە بـە ڕاسـت نـازانم، بۆچـی؟ نەك لەبەرئەوەی بـمەوێ كـە بـە ناهـەق بەرگـریی لـە ئافرەتـان بكـەم، بەڵـــكو لەبەرئـــەوەی ئایەتەكـــە دەفـــەرموێ: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، نافـــەرموێ: (بِمَـا فَـضَّلَ اللّـهُ الرِّجَـال عَلَـى النِّـساء) خـــۆ ئەگـــەر مەبەست ئەوە بووایە، كـە هـەر پیـاو ئیمتیـازو زێـدەیی هەیـە بەسـەر ئافرەتــدا، دەیفـــەرموو: (بِمَـا فَـضَّلَ اللّـهُ الرِّجَـال عَلَـى النِّـساء)، بـــەڵام لێـــرەدا وای نەفـــەرمووە، بەڵـــكو فەرموویـــەتی: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، واتـە: لەبەرئـەوە كـە خـوا هەندێكـتانی بەسـەر هەندێكـتاندا هەڵبـژاردوە، یـانی چــی؟ پیــاو لــە ڕووی جەســـتەییەوە لــە ئافــرەت بەهێــزترە، پیـــاو لــە ڕووی عەقـڵو هۆشـەوە لە ئافرەت بەهێـزترە، ئـەوە ئینكـاریی نـاكرێ، فەیلەسووفمان نیــە لــە مێــژووی بەشـــەردا ئــافرەت بووبــێ، فەیلەسـووفەكان هـــەموو پیـــاون، ســـەرۆكی دەوڵەتـــانو بیـــرمەندەكان، مەگـــەر چـــۆنو بەدەگمـــەن، ئەگـــەرنا هـەموویـان پیـاون، پـاڵەوانو ســەركردەو فەرماندەكــان هــەموو پیـاون، مەگـەر بەدەگمـەن ئافرەتێـك هەڵـكەوتبێت، ئەگـەرنا هـەموویان پیـــاون، هەروەهــا لــە یارییە وەرزشییەكانی وەك: مولاكەمەو جۆدۆو كاراتەو كۆنفـۆو بەرزكردنـەوەی كێشی قورسدا ... هتـد، كەواتـە: كۆمەڵێـك بـوار هـــەن كە پیـاوان تێیـــاندا لـە ئافرەتـــان بــە توانـــاترن، لــە ڕووی عەقڵــیی، لــە ڕووی جەســـتەیی، لــە ڕووی ئـازایەتیـیو هێـزی نـەفس، بـەڵام ئایـا هەر پیاوان زێـدەییو ئیمتیـازیان هەیــە بەسـەر ئافرەتاندا؟ ئەدی ئافرەتانیش هەندێ شتیان نیە كە پیاوان نەیانبـــێ؟! بـــا، ئــافرەتیش جەسـتەی نـەرمو ناسكتــرە لـە هــی پیــاو، دیارە پیـــاو زبــرە،

هەروەها دەنگی پیاو گڕە، بەڵام دەنگی ئافرەت نەرمو ناسکە، دەنگێکی مۆسیقایی ناسكو بە سۆزی هەیە، وە ئافرەت عەطفو سۆزی لە پیاو زیاترە، پاشان زانایانی دەروونناس باسی کۆمەڵێك شتی وردی دیکەش دەکەن دەڵێن: ئافرەت کۆمەڵێك سیفەتی هەیە کە لە پیاودا نیە، بۆ وێنە: ئافرەت هێزی پەیپێبردنی ڕاستەوخۆ (حَدْس)ی زۆرە، زوو فیکری بۆ شت دەچێ، بێ پێشەکییەکان (مقدمات) بە پێچەوانەی پیاوەوە، پیاو زیاتر تەفکیرێکی مەنتیقیی هەیە، پلە بە پلە لە پێشەکییەکانەوە بەرەو پێش دەچێ، بەڵام ئافرەت ڕاستەوخۆ لە نیشانە دەدات، کەواتە: لێرەدا ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾، لەبەرئەوەی خوا هەندێك سیفەتی داوە بە پیاوان لە ئافرەتاندا نین، وە هەندێ سیفەتیشی داون بە ئافرەتان، کە لە پیاواندا نین، وە ئەو سیفەتانەی لە پیاواندا هەن، پیاوان شایستە (مُؤهَّل) دەکەن، کە سەرافەتییو سەرپەرشتیی ماڵو خێزان بکەن، وە ئەو سیفەتانەش کە لە ئافرەتاندا هەن، وای لێدەکەن، کە ئافرەتیش بتوانێ دەوری دایکایەتییو کابانێتییو ماڵدارێتیی ... هتد، ببینێ، واتە: ئافرەت لە هەندێ بواردا پێش پیاو دەکەوێتەوە، پیاویش لە هەندێك بواردا پێش ئافرەت دەکەوێتەوە.

کەواتە: وەك پێشتریش باسمان کرد، ئافرەتانی عاقڵ ئەوانەن، کە ئەو سیفەتانەی خوای پەروەردگار پێی بەخشیون بەهێزیان بکەنو بەکاریان بێنن، تاکو لە بواری خۆیاندا ئافرەتی چاك بن، وە پیاوانی باشیش ئەوانەن، هەوڵبدەن ئەو سیفەتانەی کە خوا پێی داون، بەکاریان بێنن تاکو ببنە پیاوی باش، ئنجا ئەگەر ئافرەت هەوڵبدا پیاوی باش بێ، یان پیاو هەوڵبدا ئافرەتی باش بێ، ئەوە هەردووکیان فەشەل دێنن، چونکە ئافرەت دەتوانێ ئافرەتی باش بێ، خوای کاربەجێ وا دەفەرموێ: ﴿وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾، واتە: لە بەخششی خوا داوا بکەن، سیفەتەکانی خۆتان کە

خوای بەخشەر پێی داون، لە خۆتاندا بەكاربێنن، وە تەواویان بكەن، دەبێ ئافرەت هەوڵبدا ئافرەتی باش بێ، وە پیاو هەوڵبدا پیاوی باش بێ، وە هەردووكیشیان تەواوكەری یەكدی بن، بەپێی ئەم ڕستە قورئانییە، كەواتە: هۆكارو پاساوی ئەوە كە پیاو دەبێ سەرپەرشتیاری ماڵو خێزان بێ، هەندێكی پەیوەندیی بە سیفەتە فیطرییەكانی پیاوانو ئافرەتانەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە كە پیاو زیاتر توانای ئیدارەو بەڕێوەبردنی هەیە، وە هەندێكی پەیوەندیی بە سیفەتەوە هەیە كە وەدەستیان هێناوە، ئەویش ئەوەیە كە پیاو كەسابەت دەكات، ڕزقو بژیو پەیدا دەكات، وە هەر ئەوەش شتێكی مەنتیقییە، وە لەڕاستییدا ئافرەت هەمیشە وا هەست بە بەختەوەریی دەكات كە لە پەنای پیاوێكدا بێت، وە پیاوێك سەرپەرشتیی بكاتو بەرگریی لێ بكاتو ئاگای لێی بێو مشووری لێ بخواتو خۆشی بوێو ڕێزی بگرێ، هەروەك پیاویش حەز دەكات، لە پەنای ئافرەتێك دابێو ئافرەتێك لە پەنای دابێ، كە ڕێزی لێ بگرێو قەدری بگرێو بەقسەی بكات، بۆیە شەریعەت وای داناوە.

ئنجا دوای ئەوە خوای پەروەردگار باسی ئەركی پیاوان دەكات كە بریتییە لە سەرپەرشتیكردنی ماڵو خێزان، لەبەرئەوەی كە هەم توانای زاتییان زیاترە، وە هەم ماڵو سامانیش پەیدا دەكەن، وە لە ماڵو سامانی خۆیان خەرج دەكەن، دیارە هیچ مەعقوولیش نیە پیاو ماڵ پەیدا بكاو، ئافرەتیش لە ماڵێدا بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیار بێ، ئاخر ئەو كەسەی كە پشتی بەو بژیووە هێشاوەو ئارەقی لەپێناودا ڕشتوە، ئەو باشتر دەزانێ چۆن صەرف بكرێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەستیشی ئەوەنیە، كە پیاو ڕاوێژ بە ئافرەت نەكات، بەڵكو دەبێ لەسەر بناغەی ڕاوێژ بێ، چونكە خوای پەروەردگار كە باسی پیاوو ئافرەت دەكات لە كاتێكدا كە لێك جیادەبنەوە، دوایی شیردەرو دایەن بۆ منداڵەكەیان دەگرن، دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ...﴾ (٢٣٣) البقرة، كەواتە: دەبێ بۆ شیردەرو دایەنگرتن بۆ منداڵ، دایكو

بـــاب هــەردووكیان پێكــەوە ڕاوێــژ بكـــەنو ڕازی بــن، هەرچـــەندە لێكـــیش جیابوونەتەوە، بەڵام منداڵێك كە هی هەردووكیـانە، ئەگـەر بیـانەوێ دایـەنی بـۆ بگـرن، شیـــردەری بـۆ بگـرن، پێویـــستە ڕای هـەردووكیانی لەســەربێو، بـە ڕاوێـژی هەردووكیـان بێ، كەواتـە: بـاقی كاروبارەكـانی دیكـەی ماڵو خێـزانیش ئـەو كـاتەی كە پێكــەوە دەبـن، لـە پێشـتـرن كە بـە ڕاوێـژ بـن، واتـە: ئەگـــەر كـاتێك كە ژنو مێرد لێك جیادەبنەوە، لەسەریان پێویست بێ، بە ڕەزامەنـدیی هـەردووكیانو بــە ڕاوێـژی هەردووكیـــان، شیـــردەرو دایــەن بــۆ منداڵەكـــەیان بگـــرن، ئەدی كاتێــك كە پێكــەوەنو حەڵاڵی یەكـدین، دیـــارە زیـاتر لەســەریان پێویســتە كە پێكـەوە ڕاوێـژ بكـەن، بۆ بەڕێوەبردنـی كـاروبـاری مـاڵو خێـزان.

<u>**مەســـەلەی دوازدەیـــــەم:**</u> خـــوای بـــێ وێنـــە باســی ئافرەتـــانی بـــاش دەكـــاتو دەفـــــــەرموێ: ﴿ فَٱلصَّـٰلِحَـٰتُ قَـٰنِتَـٰتٌ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾، ئافرەتانی باش ئەوانەن كـە:

<u>یەكـەم:</u> ﴿ قَـٰنِتَـٰتٌ ﴾ ملكەچن، گوێڕایەڵن بۆ قسەی مێردیـان.

<u>دووەم:</u> ﴿ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ ﴾ وە لـە كاتێكـدا كـە مێردەكـەیان لـە ماڵــێ نیــە، پارێـــزەرن، پارێـــزەرن بۆچـــی؟ بـــۆ ســـومعەی خۆیـــانو مێردیـــان، بـــۆ منداڵەكانیان، بۆ ماڵی مێردیـان، ئـەوە واتــایەكی، واتایـەكی دیكـەی ئەوەیـە كە نهێنییەكانی مێردەكانیان دەپـارێزن، بـەڵام مانـای یەكـەمیان بـەهێزترەو ئەم مانایەی دووەمیشیان دەگرێتە خۆی.

كەواتــە: خـوا ﷻ دوو سیفەتی بنــەڕەتیی بـۆ ئافرەتـانی بـاش دانـاون، ژنـانی بـاش كـێن؟ ئەوانــەن كـە ئـەم دوو سـیفەتەیان تێدایــە: یەكـەم: ﴿ قَـٰنِتَـٰتٌ ﴾: گوێڕایەڵن، گوێڕایەڵن بۆ كـێ؟ بۆ مێـردی خۆیان، چـونكە ئەگـەر ژن بەقـسەی مێــردی نــەكات، شیـــرازەی خێــزان تێكدەچــێ، ژنو مێــرد دەبــێ یەكێكیـــان بەقـسەی ئەویدیكـە بكـات، یـانی كاتێـك مەسـەلەیەك دەگاتـە ئـەوەی بڕیـاری

کۆتایی لەسەر بدرێ، دەبێ یەکێکیان قسەی کۆتایی بەدەست بێ، ئەگەرنا مێردیش دەبێ بەقسەی ژن بکات لە شتێکدا کە ڕەوایە، وە شتێك کە ناڕەواو ناشەرعیی بێ، نابێ ژنیش بەقسەی مێردی بکات، چونکە لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ﴾، رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٦٧٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٥٨٧٠)، وَقَالَ: صَحيح الإسناد، وَالطَّبَراني برقم: (٣٦٧)، عَنْ عِمران والحكم بن عمروٍ الغفاري رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٧٩)، واتە: گوێڕایەڵییکردنی دروستکراو ناکرێ لە شتێکدا کە سەرپێچیی بە دیهێنەربێ، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە دەبێ کەسێك قسەی کۆتایی بەدەست بێ، بڕیاری کۆتایی بەدەست بێ، جا ئایا دەبێ ئەو کەسە کێ بێ، بڕیار بەدەست پیاوبێ، یان بەدەست ژن ؟ شەرع دەفەرموێ: بەدەست مێردە، ئەویش لەبەر ئەو هۆکارانەی کە پێشتر باسمان کردن.

ئنجا سیفەتی دووەمی بنەڕەتیی بۆ ئافرەتانی باش دیاری دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ ﴾: کاتێك کە پیاوەکانیان لە ماڵ نین پارێزەرن، پارێزەرن بۆ ماڵو مێردیان، بۆ سومعەیان، بۆ خۆیان، بۆ منداڵەکانیان، بۆ نهێنییەکانی ماڵ و مێردیان، هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە: گوێڕایەڵیی و ڕێز، لە کاتێکدا کە مێرد لە ماڵێیە، وە پاراستنی خۆیو سومعەو ماڵو سامانی مێردیو منداڵەکانی، لە کاتێکدا لە ماڵێ نیە، ئەم دووانە باشترین دوو سیفەتی ئافرەتی صاڵحن، لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، ئەدی کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ ﴾، ئەوە یانی چی؟ واتە: مادام خوا مافەکانی ژنی پاراستووەو لەسەر پیاوی فەرز کردوە، کە دەبێ چاك مامەڵەی لەگەڵدا بکات، هەروەها لەسەری فەرز کردوە، کە دەبێ مارەیی پێ بدات، وە لەسەری فەرز کردوە کە دەبێ بژیوی بۆ پەیدا بکاتو نانو نەفەقەی بکێشێ، وە دەبێ جێگەو ڕێگەی بۆ دابین بکات، وە دەبێ بیپارێزێو ئاگای لێ بێو... هتد، لە بەرانبەر ئەوەدا ئافرەتیش لەسەری پێویستە مادام خوا ئاوا مافەکانی پاراستوە،

ئەویش پارێزەری مافەکانی ماڵو مێردی خۆی بێو، ئەرکی سەرشانی خۆی بەرانبەر بە ماڵو مێردی خۆی جێبەجێ بکات، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَن أبي هُرَيرة ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ النِّساءِ امرَأَةٌ إذَا نَظَرْتَ إلَيْهَا سَرَّتك، وإذَا أمَرْتَهَا أطاعتك، وإذَا غِبْتَ عَنْهَا حَفِظَتك فِي نَفْسِهَا وَمَالِك﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبري في (جامع البيان) برقم: (٧٣٩١)، وأَحْمَد برقم: (٧٤١٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٦٨٢)، وَقَالَ: صَحيح عَلَى شَرْط مُسْلِم ولَم يخرجاه، وَالطَّبَراني في (الأوسط)، تەماشا بکەن، چەند پێناسەیەکی جوانو کورتو پوخت دەکات بۆ ئافرەتی باش !! واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە، ئەگەر تەماشات کرد پێی دڵخۆشبی، (کەنگێ مێرد بە ژنی خۆی دڵخۆش دەبێ ؟ کاتێك تەماشای دەکات دەستی بەخۆیدا هێنابێو، خۆی بۆ جوانو بۆنخۆش کردبێو، لەگەڵی مۆن مرچ نەبێو لەگەڵی ڕووخۆشو قسە خۆشبێ)، وە کە فەرمانت پێکرد، بەقسەت بکات، وە ئەگەر لە ماڵ نەبووی‌و لەلای نەبووی بتپارێزێ، ماڵەکەت بپارێزێ (بە هەدەری نەداو بڵێ لێرە نیە، بە ملاولایدا بدات، تەخشانو پەخشانی بکات، بێهوودە صەرفی بکات)، وە نەفسی خۆیشی بپارێزێ، شتێك نەکات کە گوناهبار بێو سومعەو ئابڕووی خۆی‌و مێردەکەی لەکەدار بکات.

<u>**مەسەلەی سێزدەیەم:**</u> خوای پەنهانزان باسی ئاوەمان بۆ دەکات، کە ژنو مێرد لە حاڵەتی ئاساییدا دەبێ وابن، پیاو دەبێ وابێ، ئافرەتیش دەبێ وابێ، ئەدی ئەگەر کێشەو مشتومڕیان کەوتە نێوان، دەبێ چۆن چارەسەری بکەن؟ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾، لێرەدا خوای بە بەزەیی ڕێوشوێنمان بۆ دیاری دەکات، لە کاتێکدا کە ئافرەت سەرپێچیی دەکات لە مێردەکەی، وە

خەتاباریشە، نەك خەتای پیاوەکە بێت، ئافرەتەکە فەقیر بێ‌و لە تاو ئازاری خۆی قسەیەك بکات، یاخود لە کاردانەوەدا یاخیبوونێك بکات، لەبەرئەوەی کە مێردەکەی نارەحەتی کردوە، ئەوە نا، شەریعەت دان بەو مافەدا نانێ، بەڵکو لە حاڵی وادا، ئافرەتەکە بۆی هەیە سکاڵا بکات‌و داوای جیابوونەوە بکات، وەك لە ئایەتەکانی سووڕەتی (البقرة)دا خوای زاناو توانا بە ڕوون‌و ڕاشکاویی فەرموویەتی: ﴿... فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ... ﴿٢٢٩﴾﴾، واتە: ئەی کۆمەڵگەی مسوڵمان! ئەگەر مەترسییتان هەبوو ئافرەت‌و پیاو سنوورەکانی خوا نەپارێزن، (بەڵام خەتا هی پیاو بوو)، گوناهیان ناگاتێ ئەگەر ئافرەتەکە خۆی بکڕێتەوەو خۆی دەرباز بکات، کە پێی دەگوترێ: (خُلْع) واتە: لەخۆدارنین، ئافرەت بۆی هەیە مێردەکەی لەخۆی دابڕنێ، وە ئەگەر گریمان شتێکیشی بەدەستەوە نەبێ‌و هەر بڵێ بەو مێردە ڕازی نیم، شەریعەت هەر ڕێگەی داوە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان، وەك پێشتر باسمان کردوە[1].

بەڵام لە کاتێکدا کە خەتا هی ئافرەتەکەیە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾، واتە: وە ئەو ژنانەی کە مەترسییتان لێیان هەیە یاخیی بن، بەڵام هەندێك لە زانایان ئاوایان تەفسیر کردوە، ئەو ئافرەتانەی کە دەزانن لێتان یاخیی بوون، یانی لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿تَخَافُونَ﴾، واتە: دەزانن (تعلمون)، ئنجا دەفەرموێ: ﴿فَعِظُوهُنَّ﴾، واتە: ئامۆژگارییان بکەن، ئامۆژگاریی بکە، بڵێ: ئافرەت ئاخر بەقسەم بکە، وا مەکە، بەبێ ئاگاداریی من مەچۆ دەرێ،

1) لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل لەوبارەوە لە بەشی حەوتەمی کتێبی: (ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەتدا) لە تەوەرەی دووەم: (دارنینی ژن بۆ مێردی)دا کراوە.

یان وا مەڕۆ، وا ڕەفتار مەكە، ئەوە شتێكی خراپو ناشەرعییە، یان كە دێمەوە ماڵ، پاروە نانێكم بۆ ساز بكە، یان ئەو ئیشەت بۆ نەكرد؟ بۆچی ئەو منداڵە خزمەت ناكەی؟ دیارە ئەوەی لە توانایدا هەیە، پیاو با ئامۆژگاریی ژنەكەی بكاتو ئەركەكانی خۆی بخاتەوە بیر، بەشێوەیەكی وا كە كاریگەریی لەسەر عەقڵو عاطیفەشی هەبێ، ئنجا دوای ئەوەی قۆناغی یەكەم، كە بریتییە لە ئامۆژگارییكردن، سوودی نەبوو، لە قۆناغی دووەمدا خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ﴾، واتە: وە وازیان لێ بێنن لە شوێنی خەوتن، یانی: لەگەڵیان جووت مەبن، ئەوە واتایەكیەتی، یاخود هەر لەگەڵی مەخەوە ! واتە: لەگەڵی مەخەوە لەسەر شوێنی خۆی، ئەگەرنا هەر لە ژوورەكەیدا بی.

ئنجا ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو، قۆناغی سێیەم دێ كە دەفەرموێ: ﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّ﴾، واتە: لێیان بدەن، كە ئەم مەسەلەیە لەم ڕۆژگارەدا زۆر قسەی لەسەر دەكەن: جا چۆن پیاو شەریعەت ڕێگەی پێداوە لە ژنی بدات؟! جا ئەوە چۆن دەبێ دنیا كاولبوونە!! بە هەرحاڵ ئێستا باسی دەكەین، خوای كاربەجێ بۆ چارەسەركردنی یاخیی بوونی ژن لەلایەن مێردەوە، واتە: كاتێك ژنەكەی لێی یاخیی بووە، یانی مافەكانی پیاوەكەی جێبەجێ ناكات، سەرپێچیی لێ دەكات لە شتی شەرعییدا، وە ناهەقیەتیو باریشی بەلادا لارە، لەوكاتەدا شەریعەت بۆی داناوە سێ قۆناغی لەگەڵ بەكاربێنێ، بۆ چارەسەر:

١/ ئامۆژگارییكردن، بۆچی ئامۆژگاریی بكات؟ چونكە پێشێ دەبێ عەقڵی بدوێنێ، ئەگەر سوودی هەبوو ئەوە باشە.

٢/ ئەگەر قۆناغی یەكەم سوودی نەبوو، ئەوجار با پیاو عاطیفەی ژن بدوێنێ، ئافرەت زۆرجار بە مێینایەتیی (أنوثة) خۆی شانازیی دەكات، وادەزانێ بەبێ وی ئەو پیاوە ناژی، لەبەرئەوە ئیستیغلالی پیاوەكەی دەكات، دەڵێ: پێویستیی بە من هەیە! بۆیە ئەگەر ئامۆژگاریی سوودی نەبوو، با ئەوجار

جێی لێ جیابکاتەوە تا بۆی دەربخات، کە ئەوەندە لێی توورە بووە، ئەو لایەنی ژنو مێردایەتییەش کاریگەریی لەسەری نیەو بۆی ناچارنیە، لێی توورەیە، دڵی بەلایدا ناچێ، دڵی بۆی ناپشکوێ.

٣/ ئنجا ئەگەر ئەو قۆناغەش هەر سوودی نەبوو، واتە: دوای ئەوە بە زمانی عەقڵ دەیدوێنێ، تێناگات، بە زمانی عاطیفە دەیدوێنی، تێناگات، ئەوجار ماوەتەوە چی؟ ئەوجار ماوەتەوە ئەوە کە بە زمانی جەستە بیدوێنێ، وە بۆی هەیە کە لێی بدات، هەڵبەتە لە مەسەلەی لێدانی ئافرەتدا لەلایەن پیاوەوە، پێویستە ئەو چەند حەقیقەتە بزانین:

یەك: ئەو ڕیزبەندییە کە شەریعەت دایناوە: ﴿فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ﴾، پێویستە ڕیزبەندییەکە ڕەچاو بکرێ، واتە: هەتا ئامۆژگاریی نەکا، بۆی نیە شوێنی خەوتنی لێ جیابکاتەوە، وە هەتا جێی لێ جیانەکاتەوە، دوای ئەوەی کە ئامۆژگاریی سوودی نەبوو، بۆی نیە کە لێی بدات، بەڕیز هەر سێکیان جێبەجێ بکات.

دوو: ئەم شێوازی چارەسەرە، شەریعەت بۆ کەسێك ڕێی داوە، کە خەتای ژنەکەی بێ، لەبیرتان نەچێ! باشە، ئەدی ئەگەر خەتای پیاوەکە بوو؟ لەو کاتەدا ئەو پیاوە ئەوانەی بۆ نیە، وە ئەگەر وا بکات ئەوە زوڵم لە ئافرەتەکە دەکات، وە لەو حاڵەتەشدا ئافرەت بۆی هەیە داوای جیابوونەوەی لێ بکاتو سکاڵای لەسەر تۆمار بکات.

سێ: لێدانی ژن کە دوا چارەسەرە، وەك عەرەب دەڵێن: (وآخر الدَّوَاءِ الكَيُّ)، واتە: دوا چارەسەر سووتاندنە، وە نەبێ شتێکی باشو پەسندبێ، یانی شەریعەت لێدانەکەشی پێ باش نیە، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيَضْرِبُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ، كَمَا يَضْرِبُ الْعَبْدَ، ثُمَّ يُجَامِعُهَا فِي آخِرِ الْيَوْمِ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم:

(٥٢٠٤)، وَمُسْلِم برقم: (٧١٢٠)، واتە: عەبدوللای کوڕی زەمعە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا یەکێکتان لە خێزانەکەی دەدا وەك چۆن لە کۆیلەیەك دەداو، دوایی ئێوارەش لەگەڵی جووت دەبێ ! (واتە: شتێکی نەگونجاوە).

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ طَافَ اللَّيْلَةَ بِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ سَبْعُونَ إمْرَأَةً، كُلُّهُنَّ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ، لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُم﴾، أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢١٤٦)، وَالنَّسائِيُّ في (الكبرى) برقم: (٩١٦٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٨٥)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٤١٨٩)، وَالحَاكِمُ برقم:(٢٧٦٥)، وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، وَالبَيْهَقِي برقم: (١٤٥٥٢)، وَصَحَّحَهُ لألباني في (صحيح أبي داود) برقم: (١٨٦٣)، واتە: دوێنێ شەو حەفتا ئافرەت هاتن بۆماڵی ئێمە، هەموویان سکالایان هەبوو کە مێردەکانیان لێیانداون، ئەزیەتیان داون، ئەوانە پیاوە باشەکانتان نین، واتە: پیاوی باش لە هاوسەری خۆی نادا، کەواتە: وە نەبێ ئەو لێدانە شتێکی پەسند بێ، بەڵام بۆ کاتی ناچارییە، وەك چۆن دەڵێن دەربارەی تەڵاق گوتراوە: (أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى، الطَّلاَقُ)، واتە: بوغزێنراوترین حەڵاڵ لەلای خوا تەڵاقە، جیابوونەوەی ژنو مێردە، بەس کە ناچاریی بوو، بە دیلەکەی خراپتربوو، ئەو کاتە شەریعەت خەڵك عاسێ ناکات.

چوار: لێدانەکەش نابێ ئازار گەیەنەربێو نابێ زۆر توندبێ، نابێ پێستی بریندار بکاتو بیڕووشێنێ، ئنجا نابێ لە دەموچاوی بدرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو فەرموودەکاندا دەفەرموێ: ﴿ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٢٩٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٩٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٧٤)، واتە: لێدانێکی بێ ئازار، لێدانی توند نەبێ، {مُبَرِّحٍ}، واتە: وانەبێ برینداری بکات، ڕەشو شینی بکات، بۆچی؟ چونکە لێدانەکە حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ئەو ئافرەتە بزانێ تۆ دەستەڵاتت بەسەریدا

هەیە، بزانێ کە تۆ لێی تووڕەی‌و لێی پەستی، لەسەر ئەو یاخیبوونەی، لەسەر ئەو کەمتەرخەمییەی، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: ﴿أضربُوا النِّساء إذَا عَصينكُمْ في مَعْرُوف ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَري، وأورَدَهُ القُرطُبي في تفسيره[1]، واتە: لە ژنەکانتان بدەن، ئەگەر سەرپێچییان لێکردن لە شتی باش‌و پەسنددا، بەلاّم لێدانێکی وانا کە بریندارکەرو توندبێ، دەڵێ: (المُبَرِّح: الشدَّةُ والعَذَابُ الشَدِيد والأذى)، (مُبَرِّحٍ)، واتە: سزای توند یاخود ئازار، یان شتێك کە زۆر ئەزیەتی بدا، هەڵبەتە عەلمانییەکان لەسەر ئەو مەسەلەیە زۆر قسە دەکەن، بەلاّم بێگومان هەر ئەوەی کە خوای کاربەجێ دایناوە، ڕێك‌و ڕاستە، وە هەر ئەوە لەگەڵ فیطرەتی پیاوان‌و ئافرەتانیشدا دەگونجێ، ئنجا کە دەشڵێین: شەریعەت ڕێگەی داوە، مەرج نیە بۆ هەموو کەس بێ، بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆی هەرگیز لە هیچ خێزانێکی خۆی نەداوە، وە شەریعەت وە نەبێ بە شتێکی پەسندی بزانێ، بەلاّم نە هەموو ئافرەتێك ئافرەتە ڕەسەنەکان‌و هاوسەرانی پێغەمبەرن ﷺ، کە پێویستییان بە لێدان نەکات، وە نە هەموو کەسیش صەبرو تەحەمولی پێغەمبەری ﷺ هەیە، دیارە شەریعەتیش بۆ هەموو کەس هاتوە، بۆ هەموو جۆرە پیاوێك‌و بۆ هەموو جۆرە ئافرەتێك هاتوە، ئەگەرنا وە نەبێ شتێکی پەسندو خوازراو بێ لە شەریعەتدا کە پیاو لە خێزانی خۆی بدات !! بەلاّم کاتێ کە ناچاربوو، شەرع ڕێگای داوە، ئەویش بەو مەرجانەوە کە باسمان کرد.

**مەسەلەی چواردەیەم:** کە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾، ئەگەر بە قسەیان کردن‌و گوێڕایەڵتان بوون، بەهانەیان پێ مەگرن، واتە: لێیان لە بیانوو

[1] الجامع لأحكام القرآن، ج: (٥)، ص: (١٤٩).

مەبن، هەرچۆنبێ هەر بتانەوێ ئەزیەتیان بدەن، بێگومان خوا بەرزی گەورەیە، واتە: ئەی پیاوینە! بە باڵادەستیی‌و هێزی خۆتانەوە مەنازن، ستەم لە ئافرەتان بكەن، لەبەرئەوەی كە پێیان دەوێرن‌و لەڕووی جەستییەوە لەوان بەهێزترن، چونكە خوا لە ئێوە بەهێزترەو لە ئێوەش گەورەترە، دیارە بەهێزیی‌و گەورەیی خوا دوو سیفەتی خوای بێ وێنەن، كە بۆ خوا شایستەن، نەك وەك هی دروستكراوەكان، چونكە دیارە خوا فەرموویەتی: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ...﴿١١﴾﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك وی (خوا) نیە، نە لە زاتی دا، نە لە سیفەتی دا.

**<u>مەسەلەی پازدەیەم</u>:** كە خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ﴾، وە ئەگەر مەترسیی تەشەنەی ناكۆكیی نێوان ژن‌و مێردتان هەبوو، ئەوە دوو دادوەر لە خزمانی پیاوەكەو لە خزمانی ئافرەتەكە (دوو دادوەر با پێكەوە ڕاوێژ بكەن، وە قسەی بە جیا لەگەڵ پیاوەكەو، بە جیا لەگەڵ ژنەكەدا بكەن) بۆ پێكهێنانەوەی ئەو ژن‌و مێردە، ﴿إِن يُرِيدَآ إِصْلَـٰحًا ﴾، ئەگەر مەبەستیان پێكهێنانەوەبێ‌و چاكسازییان بوێ، خوا پێكیان دێنێتەوە، واتە: ئەگەر دوو دادوەرەكە پێكەوە چاكسازییان بوێ، ژن‌و مێرد پێكدێننەوە، یاخود ئەگەر ژن‌و مێردەكە چاكسازییان بوێ، دادوەرەكان پێك دەگەن، یاخود ئەگەر دادوەرەكان لە حاڵێكدا كە مەبەستیان پێكهاتن بێ خوای بە بەزەیی ژن‌و مێردەكە ڕێك دەخاتەوە، لێرەدا دوێندراو كێیە؟ هەم دەستەڵاتی شەرعییە، هەم كۆمەڵگایە، هەم خزمانی ژن‌و مێردەكەن، ئنجا شەرعزانان لەوبارەوە كە ئایا صەڵاحیەتی دوو دادوەرەكە چەندەو، تا چ ڕاددەیەك دەستیان كراوەیە، بۆ بڕیاردان؟ دەربارەی ئەو ژن‌و مێردە؟ دوو ڕایان هەن:

١) هەندێك دەڵێن: تەنیا صەڵاحیەتی ئەوەیان هەیە، کە پێکیان بێننەوەو صەڵاحیەتی ئەوەیان نیە کە لێکیان بترازێنن.

٢) هەندێکیشیان دەڵێن: صەڵاحیەتی لێك ترازاندنیشیان هەیە.

منیش پێموایە ڕای دووەمیان ڕاستترە، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە لەلایەنی ژن و مێردەکەوە تەخویل دەکرێن، ئەگەر هەردووکیان گوتیان: بەڵێ هەموو صەڵاحیەتێکتان هەیە، چ بڕیارێك دەدەن، بە مەرجێك دوو دادوەرەکەش دادگەربن و سەرڕاست بن، وە دڵسۆزی هەردوولاشیان بن، ئەو کاتە هەر بڕیارێك بدەن، دیارە پابەندکەر دەبێ بۆ ئەو ژن و مێردە.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴾، بێگومان خوا زانای شارەزایە، زانا بە هەموو حاڵ و شتێك، وە شارەزا بە هەموو کەسێك.

کەواتە: ئەی مسوڵمانینە ! بڕواو باوەڕی تەواویان بە یاساو بڕیارەکانی ئایین و شەریعەتەکەی هەبێ و، بەتەواویی تەسلیمیان بن و پێیانەوە پابەندبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت ئایەت دەگرێتە خۆی لە سوورەتی (النساء)، ئایەتەكانی (٣٦) تاكو (٤٢)، لەم حەوت ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن سەرەتا فەرمان بە ئیمانداران دەكات كە تەنیا خوا بپەرستن‌و هیچ شتێك نەكەنە هاوبەشی، دوایی یەكسەر دوا بەدوای فەرمانكردن بە بەندایەتییكردن بۆخۆی، بەبێ هاوبەش بۆدانان، فەرمان دەكات بە چاكەكردن لەگەڵ دە (١٠) جۆرە كەسدا، كە ئەوانیش پێش هەموویان باب‌و دایكن، ئنجا دوایی هەتیوان‌و نەداران ... تا كۆتایی، پاشان خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ كە بابای بەفیزو خۆهەڵكێشی خۆشناوێ، وە هەروەها ئەوانەی كە بۆخۆشیان چرووكن، وە فەرمان بە خەڵكیش دەكەن بە ڕژدیی‌و چرووكیی، وە ئەوانەی كە چاكەو بەخششی خوا دەشارنەوە، وە ئەوانەی كە بە ڕیا نەبێ ماڵی خۆیان نابەخشن، وە ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، ئەو جۆرە كەسانە شەیتان لێیان نزیكەو هاودەم‌و هاوڕازیانە، واتە: هەموو ئەوانە خوای پەروەردگار خۆشی ناوێن، پاشان خوا ﷻ خەڵكی هاندەدا بۆ ئیمان هێنان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە بۆ بەخشین، وە ڕایدەگەیەنێ كە خوای دادگەر لە سزادا تۆزقاڵێك‌و بە ئەندازەی گەردێك ستەم لە كەس ناكات، وە لە پاداشتدانەوەدا بە چەند قات پاداشت دەداتەوە، لە كۆتاییدا خوا ﷻ، دیمەنێك لە دیمەنە ڕاچڵەكێنەرەكانی ڕۆژی قیامەت دێنێتە بەرچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش ئەوەیە كە خوا لە ڕۆژی دواییدا وێڕای پێغەمبەرانی دیكە، پێغەمبەری خاتەمیش دێنێ، بۆ شایەدییدان بەسەر ئۆممەتەكەیەوە، هەروەك پێغەمبەرانی دیكەش دێن‌و چاودێر دەبن، بەسەر ئۆممەتەكانیانەوە، وە لەوكاتەدا

هیچ کەسێك هیچ شتێك لە خوا پەنهان ناکات، وە کەسانی بێبڕوا و سەرپێچییکەران لە فەرمانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) توانای شاردنەوەی هیچ شتێکیان نابێ، وە بە ئاواتیش دەخوازن کە خاك بان و لەگەڵ خاکدا یەکسان کرابان.

﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ
وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ
بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ
مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ
مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ
يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ وَمَن
يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيۡهِمۡ لَوۡ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ
ٱلۡأٓخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمۡ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ
مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا
﴿٤٠﴾ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا
﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ
ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە خوا بپەرسـتن‌و هـیچ شـتێك مەكەنـە هاوبەشی، وە چاكە بكـەن لەگـەڵ بـاب‌و دایـك‌و خزمـان‌و هـەتیوان‌و نـەداران‌و دراوسـێی نزیـك‌و دراوسـێی دوورو هـاوەڵی هـاودەم‌و ڕێبـوارو ئەوانـەی خاوەنیـانن (كۆیلـەكانتان)، بێگومـان خـوا كەسێكی خۆشـناوێ كە خۆ پـێ زۆرو شـانازیی بەخۆكەربێ ﴿٣٦﴾ ئەوانـەی ڕژدیـی دەكەن‌و فەرمان بـە خەڵكـیش دەكـەن بـە ڕژدیـی، وە ئـەو بەخـشش‌و چاكـەیـەی خوا پێـی داون دەیـشارنەوە، وە ئـازارێكی ڕیـسواكەرمان بـۆ كافران ئامادە كـردوە ﴿٣٧﴾ وە ئەوانـەی سامانەكانیان بـۆ ڕووپـامایی خـەڵك دەبەخـشن‌و، بڕوایـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، وە هـەر كەسێكیـش شـەیتان هـاوڕازی بـێ، ئـەوە خراپتـرین هـاوڕازە ﴿٣٨﴾ وە ئایا چـی دەبـوو ئەگـەر بڕوایـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هێنـابایەو، لـەو ڕۆزییـەی خـوا پێـی داون بەخـشیبایان؟ وە خـواش پێیـان زانـایە﴿٣٩﴾ بێگومان خوا بـە قورسـایی گـەردێك (لـە سـزادانـدا) سـتەم ناكـات، بـەڵام ئەگـەر چـاكە بـێ (پاداشـتی) چـەند بەرانبـەری دەداتـەوەو لەلایـەن خۆیـەوە پاداشـتێكی مەزن (بە چاكەكاران) دەبەخشێ ﴿٤٠﴾ جا ئایا (ئەوانە) حاڵیـان چـۆن دەبـێ، لـە كاتێكـدا كـە لـە هـەر كۆمـەڵێك شایەدێك دێـنین (كـە شایەدییان لەسـەر بـدات) وە تۆشـمان بـە شـایەد هێنـا بـۆ سـەر ئەوانـە ؟! ﴿٤١﴾ لـەو ڕۆژەدا ئەوانـەی بێبـڕوان‌و سـەرپێـچیی یـان لـە پێغەمبـەر كـردوە، حـەز دەكـەن لەگـەڵ خاكـدا یەكـسان‌و تـەخت بكـرێن، وە هـیچ قـسەیەكیش لـە خـوا ناشـارنەوە (و هـەموو نهێنـییەكانیان دەخرێنـەڕوو)﴿٤٢﴾ )).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ): (أي البَعِيد) واتە: دراوسێی دوور، لە چی ڕا هاتوە؟ (وجُنِبَ فُلانٌ، أُبْعِدَ عَنِ الخَيْرِ، وَجَنَبْتُهُ: أبْعَدْتُهُ)، (جُنِبَ) واتە: (أبْعِدَ) دوورخرایەوە لە چاكە، (جَنَبْتُهُ: أبْعَدْتُهُ) واتە: دوورم خستەوە.

(وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنْبِ): (أي القَرِيب) واتە: هاوەڵێك، برادەرێك كە زۆر نزیك بێ لە ئینسانەوە، (وَقِيلَ: كِنَايَةٌ عَنِ المَرْأةِ، وَقِيلَ: عَنِ الرَّفِيقِ فِي السَّفَرِ)، هەندێك گوتوویانە: (الصَّاحِبِ بالجَنْبِ) كینایەیە بۆ ژن، كە زۆر لە مێردەوە نزیكە، وە هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست پێی ڕەفیقو برادەری سەفەرێیە.

(مُخْتَالًا): (الخُيلاءُ: التكبُّرُ عَن تخيّلِ فَضِيلَةٍ تَرَاءَت لِلإِنْسَانِ مِن نَفْسِهِ)، (خُيلاءُ) بریتیە لە خۆ بەزلگرتنێك لە ئەنجامی ئەوەدا كە ئینسان سیفەتێكی باش لە خۆیدا ببینێ بە خەیاڵو لە حەقیقەتیشدا وانیە.

(فَخُورًا): (الفَخْر) واتە: شانازیی، (فَخُور) واتە: زۆر شانازییكەر، (فَاخِر) كەسێكە كە شانازی بە خۆیەوە دەكات، (الفَخْرُ: المُبَاهَاةُ فِي الأشياءِ الخَارِجَةِ عَنِ الإنْسَانِ كَالْمَالِ والجَاهِ: فَاخِرٌ وَفَخُورٌ)، (فَخْر) بریتیە لەوە كە ئینسان شانازیی بە خۆیەوە بكات، بە شتێك كە بە دەر لەخۆیەتی، وەك: شانازیی بە ماڵو سامانەوە بكات، یاخود بە جاهوو پێگەی كۆمەڵایەتیی، یان سیاسییەوە بكات.

(رِئَآءَ ٱلنَّاسِ): (رِئَاءَ النَّاس: أي مراءاةً وَتَشَبُّعاً) واتە: ڕووپاماییو ڕوودەربایسیی بۆ خەڵك، شتێك پێشانی خەڵك دەدات، كە لەڕاستیدا لە خودی خۆیدا نەیبێ، وەك ئەوە كە كەسێك خۆی بە بەخشندە پێشان

بدات، بەڵام چرووك بێ، كەسێك خۆی بە ئازا پێشان بدات، بەڵام ترسنۆك بێ، كەسێك خۆی بە زانا پێشان بدات، بەڵام نەزان بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (رِئَاءَ النّاس).

(**قَرِينًا**): (فُلانٌ قَرْنُ فُلانٍ في الوِلادَةِ، وَقرينُهُ وَقِرْنُهُ في الجَلادَةِ وفي القُوَّةِ وفي غَيْرِهَا)، (قَرِين) واتە: بەرانبەر، نزیك، هاودەم، دەگوترێ: فلان كەس قەرِنی فلان كەسە لە لەدایكبووندا، واتە: پێكەوە لەدایكبوون، (وَقِرْنهُ في الجَلادَةِ وفي القُوَّةِ) وە هاوتای فلان كەسە لە ئازایەتییدا یاخود لە هێزو تواناداد، كەواتە: (قَرِين) كەسێكە كە زۆر لە ئینسانەوە نزیكەو هەمیشە لە تەنیشتیەتی، هاودەمیەتی.

(**مِثْقَالَ ذَرَّةٍ**): (مِثقَال) لەسەر كێشی (مِفْعَال)ە، دەڵێ: (ما يُوزَنُ بِهِ الأشياءُ) ئەو شتەیە كە شتی پێ دەكێشرێ، (الذرّ: النَّسْلُ وصِغارُ النَّملِ مَا يُرى في شُعاعِ الشَّمْسِ)، (ذَرَّة) بە مێرووی بچووك دەگوترێ، وە بەو گەردیلانەی كاتێك كە تیشكی خۆر لە پەنجەرەوە دێتە ژووری، دەبینرێن وە بە نەسلو وەچەش دەگوترێ.

(**شَهِيدًا**): (مَن يُؤَدِّي الشَّهَادَة، جَمْعُهُ: شُهَدَاء وأشْهَاد)، شەهید كەسێكە كە شایەدیی دەدا، بە (شُهَدَاء وأشْهَاد) كۆ دەكرێتەوە.

(**تُسَوَّىٰ**): (سوَّى الشَّيءَ: قَوَّمَهُ وَعَدَّلَهُ وَجَعَلَهُ سَوِيّاً) شتێك ڕێكبخەیو تەختی بكەی دەگوترێ: (سوَّاه) ﴿لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، واتە: حەز دەكەن لەگەڵ زەوی، لەگەڵ خاكدا یەكسان بكرێنو تەخت بكرێن، واتە: ببنەوە بە خاك.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوای بەرزو مەزن لە میانەی خستنە ڕووی حەڵاڵو حەڕام، وە ئەمرو نەهییەكانی خۆی، وە لە میانەی خستنە ڕووی كۆمەڵێك یاسای شەرعیی گەورەو گرنگدا لە بواری خێزانو لە بواری كۆمەڵایەتییدا، ئنجا ڕوو دەكاتە ئیمانداران، دەشگونجێ ڕووی لە مرۆڤایەتیی بێ بەگشتی، بەڵام زیاتر واپێدەچێ ڕووی لە ئیمانداران بێ، چونكە ئەم شێوازە دواندنانەو فەرمان پێكردنانە، زیاتر بۆ ئینسانی ئیماندارو بۆ مسوڵمان شایستەیە، بە هەر حاڵ خوا ﷻ فەرمان دەكاتو دەفەرموێ: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا﴾، وە خوا بپەرستنو هیچ شتێكی مەكەنە هاوبەش، لە شوێنی دیكە دەفەرموێ: ﴿... وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾الكهف، واتە: لە پەرستنی پەروەردگاریدا هیچ ناكاتە هاوبەش، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا﴾، چونكە ئەو شتەی كە ئینسان دەیكاتە هاوبەش بۆ خوا، مەرج نیە تەنیا ئینسان بێ، یان جند، یان فریشتە بێ، بەڵكو دەبینی شتێكە لە شتەكان، وەك دوایی باسی دەكەین، جا ئایا شیرك یانی چی؟ یانی: تۆ بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ شتێكدا بكەی، كە تەنیا بۆ خوا شایستەیە، ئنجا ئەو جۆرە مامەڵەیە لە خۆشویستندا بێ، لە لێترساندا بێ، لە مل بۆ كەچكردندا بێ، لەبەر گەورەگرتندا بێ، لە پێشكەشكردنی دروشمەكانی خواپەرستییدا بێ، لە لێوەرگرتنی بەرنامەی ژیاندابێ، لە هەر شتێك لەو شتانەدا، یاخود لە هەموو ئەو شتانەدابێ، كە بۆ خوا نەبێ دروست نین، ئەگەر مامەڵەت كرد لەگەڵ غەیری خوادا، وەك لەگەڵ خوادا دەیكەی، جا ئەو شتە ژیان لەبەر بێ، ڕووح لەبەر بێ، یاخود بێ ژیان بێ، یاخود شتێك بێ، كەلوپەل بێ، دار بێ، بەرد بێ، ئەستێرە بێ، مانگ بێ، خۆر بێ، ئەوە تۆ ئەو شتەت كردۆتە هاوبەشی خوا، خوا دەفەرموێ: وە خوا بپەرستنو هیچ شتێك مەكەنە هاوبەشی ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا﴾، ئنجا پاش فەرمانكردن بە

بەندایەتییکردن بۆ خوا بە پەرستنی خوا بە ساغیی‌و بە خوا بە یەکگرتنەوە، بێئەوەی کە شیرك‌و هاوبەشدانانی تێکەڵ بکرێ، فەرمان دەکات بە چاکەکردن لەگەڵ (دە) جۆرە کەسدا: یەکەم‌و دووەم باب‌و دایك، دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾، وە چاکە بکەن لەگەڵ باب‌و دایك، ﴿وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾، وە لەگەڵ خزمان، ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾، وە لەگەڵ هەتیوان، ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾، وە لەگەڵ نەداران‌و خەڵکی ئاتاج‌و ناچار ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾، وە لەگەڵ دراوسێی نزیك، ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾، وە لەگەڵ دراوسێی دوور، ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ﴾، برادەرو هاوەڵێك کە هەمیشە لە تەنیشتتەو لێت نزیکە، ﴿وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، کوڕی ڕێگا، کە مەبەست پێی ڕێبوارە ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، وە ئەوانەی بەدەستانەوەن، واتە: کۆیلەو کەنیزەکەکانتان.

کەواتە: خوا ﷻ بەندایەتییکردن بۆخۆی لەگەڵ خزمەتکردن‌و چاکەکردن لەگەڵ بەندەکانی، وەك دوو تای تەرازوویەك داناوە: خوا پەرستیی‌و خەڵك دۆستیی، هەڵبەتە ئەو ڕیزبەندییەش کە سەرەتا باب‌و دایك پێش خراون، دوایی خزمان، ئنجا باب‌و دایکیش جاری وایە دەچنەوە نێو چەمك‌و واتای خزمان، بەڵام لە هەموو کەس‌و لە هەموو خزمان نزیکتر کێیە؟ باب‌و دایکن، ئنجا دوایی خزمان، ئنجا برایە خوشکە مام‌و خاڵە، پوورو پلکە... تا کۆتایی هەمووی دەگرێتەوە، ئنجا دوایی دێتە سەر باسی هەتیوان، پاشان ئاتاج‌و نەدارو، ئنجا دوایی دراوسێی نزیك‌و دراوسێی دوورو، ئنجا ڕەفیق‌و برادەرێك کە هەمیشە لە ئینسانەوە نزیکە، ئنجا ڕێبوارو، دوایی کۆیلەو کەنیزەك، کە کاتی خۆی بوون، وە لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾، بێگومان خوا کەسێکی خۆشناوێ کە خۆ بە زلگریی‌و شانازییکەربێ، ﴿مُخْتَالًا﴾، لە (خُیلاء)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە کەسێك کە لە دەروونی خۆیدا

خۆی پێ زۆربێ، ﴿ فَخُورًا ﴾، ئەوەیە کە لە دەرەوەی خۆیدا شانازیی بکات بە شتێکەوە کە لە دەرەوەی خۆیەتی، بەڵام (خُیلاء) وەك گوتم ئەوەیە کە لە دەروونی خۆیدا شتێك لە خۆیدا شك بەرێ، خەیاڵی وابێ کە فلان شتەی هەبێ، واشنەبێ! خوای پەروەردگار ئەو جۆرە کەسانەی خۆشناوێن، لێرەشدا بۆیە خوا ﷻ باسی (مُخْتَال) و (فَخُور) دەکات، واتە: ئەوانەی کە لە دەروونی خۆیاندا خۆیان پێ زۆرە، وە خۆ هەڵدەکێشن بەسەر خەڵکیدا، چونکە لەڕاستییدا ئەو جۆرە کەسانە، هەم ڕێیان لە خوا پەرستیی ناکەوێ، هەم ڕێشیان لە چاکەکاریی و خزمەتکردنی خەڵك ناکەوێ، ئینسانی خۆ بەزلگر کەم وایە بەندایەتیی بۆ خوا بکات، هەروەها کەم وایە خزمەتی خەڵکیش بکات و چاکەیان لەگەڵ بکات، ئنجا خوا ﷻ ئەوانەی کە خۆشی ناوێن، کە خۆ بەزلگرن و شانازییکەرن، بە چەند سیفەتێکی دیکەی خراپیش پێناسەیان دەکات، واتە: چەند ئاوەڵناو وەسفی دیکەی خراپیشیان لێ هەڵدەدات، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ ﴾، ئەوانەی ڕژدیی دەکەن، وە فەرمان بە خەڵکی بە ڕژدیی دەکەن، دەڵێن: ڕەزیل کەسێکە بۆخۆی چرووکە و پێی خۆشە خەڵکیش چرووك بێ، بۆخۆی ڕژدەو پێی خۆشە خەڵکیش ڕژد بێ، کەسی وا هەیە نابەخشێ و ئەگەر خەڵکیش ببەخشێ پێی ناخۆشە، ئەگەر کەسێك سەخیی بێ، بەخشندە بێ، دڵ فراوان بێ، پێی دەڵێ: ماڵی خۆت بۆ دەبەخشی؟ دوایی هەژار دەبی، نەدار دەبی، ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش هەڵبگرە، خەڵك چ منەتی پێیە!! ئا بەو جۆرە قسانە خەڵك لە چاکەکاریی سارد دەکەنەوە، ﴿ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، وە ئەو چاکەو بەخششەی کە خوا پێی داون، پەنهانی دەکەن، یانی چی؟ یانی ئەو کەسە خوا پێیداوە، ئیدی کە خوا پێیداوە، بە حەڵاڵ پێیداوە، بە حەرام پێیداوە، گرنگ ئەوەیە دەوڵەمەندەو سەروەتمەندەو دەستەڵاتی دارایی هەیە، بەڵام دەیشارێتەوە، جا لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَنْ عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ؛ أَنَّ رَسُولَ

اَللّـهِ ﷺ: إِنَّ اَللّـهَ يُحِبُّ إِذَا أَنْعَمَ عَلَى عَبْدٍ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَيْهِ»، أَخْرَجَهُ التِّرمِذِي بِرقم: (٢٨١٩)، قال الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ)، واته: عەمری کوڕی شوعەیب لە بابی ئەویش لە باپیرییەوە خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا حەز دەکات ئەگەر نیعمەتێکی بە بەندەی خۆی بەخشی، شوێنەواری ئەو چاکەو نیعمەتەی خۆی بەسەریەوە ببینێ، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کابرایەك فەرمووی کە هاتە خزمەتی بە قژێکی ئاڵۆزو چڵکنو بەرگێکی شڕەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ماڵو سامانت نیە؟ گوتی: با، فەرمووی: چ جۆرە ماڵو سامانێك؟ گوتی: لە هەموو جۆرێکم هەیە، حوشترم هەن، مەڕو بزنم هەن، ڕەشەوڵاخم هەن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوا ئەگەر چاکەی لەگەڵ بەندەی خۆیدا کرد، (واتە: سەروەتو سامانی پێدا) پێی خۆشە پێوەی دیاربێ، مادام هەژار نی، با پێتەوە دیاربی، مادام دەوڵەمەندی، بۆچی خۆت بە هەژار پێشاندەدەی؟! ئەگەر هەژارو نەدار بی، بە هەرحاڵ، بەڵام کە دەوڵەمەندی خۆت بە هەژارو نەدارو سواڵکەرانە بێنیە بەرچاو، خوا زۆری پێناخۆشە، مانای وایە تۆ نیعمەتی خوات شاردۆتەوە لە خۆتدا، ﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾، ئەمە واتایەکی، واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئەو چاکەو بەخششو نیعمەتەی کە خوا پێی داون، لە جیاتی ئەوەی بڵاوی بکەنەوە لەنێو بەندەکانیدا، دەیشارنەوەو پەنهانی دەکەن، واتە: تەنیا بۆ خۆیانی خەرج دەکەن، یاخود جاری وایە بۆخۆشیانی خەرج ناکەن، ئنجا دەشگونجێ (فَضْل) لێرەدا تەنیا ماڵو سامان نەبێ، هەرچەندە بەپێی سیاق ماڵو سامان دەگرێتەوەو وشەی: (فَضْل)یش لە قورئاندا بە مانای ماڵو سامان هاتوە: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ...﴿١٠﴾﴾ الجمعة، واتە: ئەگەر نوێژی جومعە کرا، بە زەویدا بڕۆن لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: کەسابەت بکەنو بەخششی خوا بەدەست خۆتان بێنن، کە ماڵو سامانە، بەڵام (فَضْل) وێڕای ماڵو سامان بە

چاکەو نیعمەتی دیکەش دەگوترێ، خوا نیعمەتی زانستو زانیاریی داوە بە کەسێك، دەبێ ئەو زانستو زانیارییە بڵاو بکاتەوە، نیعمەتی عەقڵی پێداوە، پێویستە لە تەگبیرکردن بۆ چاککردنی حاڵی خەڵك بەکاری بێنێ، هەر کام لە نیعمەتەکانی خوا کە پێی داون، پێویستە ئەو نیعمەتە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنێ، نەك بیشارێتەوەو لە خۆیدا حەپسی بکات، ﴿ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾، وە بۆ بێبڕوایان ئازارێکی ڕیسواکەرمان داناوە، ئەمە ئەوە لێی وەردەگیرێ، کە ئەو سیفەتانە شایستەی ئینسانی کافرن، واتە: ئەی ئیماندارینە! خۆتان لەو سیفەتانە بپارێزن، کە لەڕاستییدا ئەو سیفەتانە شایستەی ئینسانی مسوڵمانو خەڵکی ئیماندارنین، شایستەی خەڵکی کافرو بێبڕوان، وە بێبڕوایانیش خوا ئازارو سزایەکی ڕیسواکەری بۆ داناون، مادام ئەوان بە کەم تەماشای خەڵکی دەکەن، خۆ بەسەر خەڵکیدا هەڵدەکێشن، خۆ بەزل دەگرن، ئەوەی خۆی بەزلگرت، یانی: خەڵکی بە گچکە تەماشا دەکات، هەر کەسێك شانازیی بەسەر خەڵکدا کرد، مانای وایە خۆی پێ لە خەڵکی زیادەو خۆی پێ لەوان زۆرترە، خوای دادگەریش بەپێی تاوانی خۆی سزای دەدا، سزایەکی ڕیسواکەری دەدا، واتە: سزایەکی دەدا لە ڕووی جەستییەوە، کە دیارە ئەوە ئێشی پێ دەگەیەنێ، وە لە لایەنی ڕووحییو مەعنەوییشەوە، هەست بە ڕیسواییو زەبوونییو شەرمەزاری دەکات، ئنجا دیسان هەر لەسەر پێناسەکردنی ئەو جۆرە کەسانە بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ ﴾، وە ئەوانی کە ماڵو سامانەکانی خۆیان دەبەخشن بۆ ڕیابازیی لەبەرچاوی خەڵك، تەنیا بۆ ڕووپامایی دەیبەخشن، بۆ وێنە: لە مەجلیسێك دا کە خەڵکی لێ دانیشتوون دەڵێ: وەرە فلان کەس ئەوە زەکاتە، یان وەرە ئەو شتە بۆخۆت بەرە، لەبەرچاوی خەڵك بۆئەوەی خەڵك بیبینێ ﴿ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾، بەڵام بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نییە، مەگەر چۆن دەنا ئەوەی ڕیابازیی کردو ڕووپامایی بۆ

خەڵکی کرد، یان ئیمانی هەرنیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، یان ئیمانەکەی زۆر بێهێزە، چونکە ئەگەر تۆ ئیمانت بە خوا هەبێ، مانای وایە هەر شتێك بۆ خوا نەبێ نایکەی، وە پاشان کە قەناعەتی تەواوت وایە کە خوا شتەکە دەبینێ کە دەیبەخشی، وە فریشتەکان دەیبینن و تۆماری دەکەن، پەکت لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە سەرنجی خەڵکی بە لای خۆتدا ڕابکێشی! خەڵکی چی؟! نەدەتوانن پاداشتت بدەنەوە، نەدەتوانن بتبەنە بەهەشتێ، نەدەتوانن بتخەنە دۆزەخ، کەسانێك بەهەشت و دۆزەخیان بە دەست نەبێ و، دەوڵەمەندیی و، هەژارییان بەدەست نەبێ، ساغیی و نەخۆشییان بە دەست نەبێ، پێویست ناکات هیچ شتێك بۆ وان بکەی، بۆیە خوا ﷻ زۆر ڕقی لەو کەسانەیە کە بۆ بەرچاوی خەڵك، بۆ ڕوو دەربایسی و ڕووپامایی شت دەکەن، ﴿ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا ﴾، وە هەرکەسێکیش شەیتان هاوجووتی بێ و نزیکی بی، هاودەم و هاوڕازی بێ، ئەوە شەیتان خراپترین هاودەم و هاوڕازە، کە لەگەڵ ئینساندا نزیك بێ و ببێتە هاودەم و هاوڕاز، واتە: ئەو جۆرە کەسانە کە ئەو سیفەتە خراپانەیان تێدا هەن، لە ئەنجامی نزیکیی و هاوەڵایەتیی شەیتانەوە ئەو سیفەتانەیان تێدا پەیدابوون، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە هەمیشە سیفەتی خراپ ڕیشەکەی دەچێتەوە بۆ شەیتان، بۆ وەسوەسەو دنەدانی شەیتان، هەروەك سیفەتی باش، دەچێتەوە بۆ ئیمان و بۆ ئیلهامی فریشتەکان، وە بۆ ئەو عەقیدەیەی کە لە دڵی ئینساندا جێگیر دەبێ، وە ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دروست دەبێ، کە بەندایەتیی یە.

ئنجا خوا ﷻ، ئەو جۆرە کەسانە هان دەدا بۆ ئیمان هێنان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە هانیشیان دەدا، کە ئەوەی خوا پێی داون ببەخشن، دەفەرموێ:

﴿ وَمَاذَا عَلَيۡهِمۡ لَوۡ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ ﴾، وە چیان لێدێ ئەگەر ئیمان بە خوا بێنن و بە ڕۆژی دوایی بێنن، وە لەوەش کە خوا پێی داون ببەخشن، واتە: چییان لێدێ؟ ئایا ئیمان هێنان هیچ زەرەرێك

لە ئینسان دەدا؟ ئایا بەخشندەییو سەخاوەت هیچ زیانێکی بۆ ئینسان هەیە؟ واتە: ئەوانە بۆچی لە ئیمان دەسڵەمنەوە، بۆچی لە کەرەمو سەخاوەت دەسڵەمنەوە؟ جا ئەوەش بەڕاستیی زۆر جێی سەرنجە کە خوای پەروەردگار ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، لەگەڵ سەخاوەتو کەرەمو بەخشندەییدا پێکەوە باس کردوون، مانای وایە هەر کەسێك ئیمانی هەبوو بە خواو بە ڕۆژی دوایی، سەخییو بەخشندەش دەبێ لە قەدەر ئیمانەکەی، بۆیە ئەگەر دەوڵەمەندێکی نوێژکەری چرووکتان بینی، نەڵێن: ئەوە چۆن وایە؟! چونکە ئەو نوێژکەرە دەوڵەمەندە جۆرێك لە ئیمانی هەیە، بەڵام ئیمانەکەی کزو لاوازە، ئیمانی باش سیفەتی باش لە ئینساندا پەیدا دەکات، بە تایبەتی کەرەمو سەخاوەتو بەخشندەیی، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کە لە ئایەتەکەی پێشێدا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾، وە ئەوانەی سامانەکانیان بۆ ڕیابازیی دەبەخشن، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾، چونکە کەسێك ئیمانی هەبێ ڕزقەکەی لە خوا دەزانێ، بەڵام ئەوەی ئیمانی بە خوا نەبێ، بە هی خۆی دەزانێ، قاڕوون چی دەگوت؟ دەیگوت: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ...﴿٧٨﴾﴾القصص، واتە: ئەو سەروەتو سامانەم بە هۆی زانیاریی خۆمەوە پەیدا کردوە، بەڵام ئیماندار چی دەڵێ؟ وەك سولەیمان فەرمووی: ﴿... هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ... ﴿٤٠﴾﴾النمل، واتە: ئەوە بەخششی پەروەردگارمە، تاقیم دەکاتەوە، بزانێ سوپاسگوزار دەبم، یاخود سپڵە دەبم، بۆیە خوای پایەدار دەفەرموێ: چی دەبوو ئەگەر ئیمانیان بە خواو ڕۆژی دوایی هێنابا، وە لەوەی کە خوا پێیداون وەك بژیو بەخشیبایان؟ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾، واتە: وە خواش پێیان زانایە، با وا نەزانن کە ئەگەر بەخشییان زایە دەبێتو کەس نایبینێو کەس پاداشتی

ناداتـەوە، خـوا بـە هـەموو شـتێك زانـایە، ئنجا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ ﴾، خـوا بـە قـەدەر قورسـایی گـەردێك سـتەم ناکـات، واپێدەچێ مەبەسـت لێـرەدا پێـی سـزادان بـێ، واتـە: وەختێـك خـوا ﷻ سـزای خەڵـك دەدا لەسـەر خراپـەکانیان، بـە قـەدەر قورسـایی گەردێـك ستەمیان لێنـاکات،، بەڵـکو سـزای پڕ بە پێستیان دەدا، خـوا سـزای دادگەرانـە دەدا، بـەڵام پاداشـت دەداتـەوە، بەشێوەیەکـی بەخـشندانەو چاکەکارانە، ﴿ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا ﴾، بـەڵام ئەگەر ئەو کردەوەیە چاکە بێ، چەند قات پاداشـتی دەداتـەوە، ﴿ وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾، وە لەلایەن خۆیەوە پاداشتێکی مەزن دەداتەوە، بە هەرکەسێك کە چاکە بکات، لەسـەر خراپـە وەك خـۆی، بـەڵام بـۆ چـاکە چـەند بەرانبـەرە، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١٦٠ ﴾الأنعام، واتە: هەر کەسێك چاکە بکات بـە دە بەرانبـەر پاداشـت دەدرێتـەوە، (بەڵـکو تـا حـەوت سـەد بەرانبـەریش دەڕوا)، وە هـەر کەسـێك خراپـەیەك بکات بەس بە قـەدەر خراپـەکەی سـزا دەدرێتـەوە.

ئنجا لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴾، خـــوا ﷻ لـــە کۆتایی ئەو ڕوونکردنەوەو ئەو یاساو حوکمـە شـەرعییانەدا، سـەرنجی پێغـەمبەر ﷺ وە لە پشـت پێغەمبـەریش سـەرنجـی ئۆممەتەکەی، ڕادەکێـشـێ بـۆ دیمـەنێکی زۆر ڕاچڵەکـێنـەر، لـە دیمەنـەکانی ڕۆژی قیـامەت، دەفەرموێ: چـی دەبـێ؟ واتـە: شتێکی زۆر سـەیرو سەرسـووڕهێنەر دەبـێ، کاتێك لە هەر کۆمەڵێك چاودێرێکیان بێنـین، شایەدێکیان بێنـین بەسەریانەوە، کە ئەو شـایەدە کێیە؟ پێغەمبەرەکەیانە یاخود شوێنکەوتووانی پێغەمبـەرانن و، میـراتگرانی پێغـەمبەرانن، هـەر کەسـە لـە

قەدەر خۆی دەبێتە شایەدو چاودێر ﴿ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾، وە تۆشمان هێنا وەك شایەد بەسەر ئەوانەوە، واتە: بەسەر ئۆممەتەکەتەوە، ﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی بێبڕوا بوونو سەرپێچییان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، حەز دەکەن، حەز لە چی دەکەن؟ ﴿لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ ﴾، کە لەگەڵ خاکدا یەکسان بکرێن، ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾، وە هیچ قسەیەك لە خوا ناشارنەوە، وە توانای شاردنەوەیان نیە، هەرچی هەیە هەموو نهێنییەکان دەکەونە گۆڕ، خوای پەروەردگار لەو ڕۆژەدا لەگەڵ هەموومان بە کەرەمو بە بەزەییو بە لوتف بێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم**: کە خوای تاكو بێوێنە دەفەرموێ: ﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ... ﴾، وە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، یاخود خوا بپەرستن، وە هیچ شتێك مەکەنە هاوبەشی.

وشەی: (عِبَادَة) یانی چی؟ هەرچەندە من لە کتێبی: (خوا پەرستیی ئیسلامیی) بەرگی (١)، وە لە کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) بەرگی (٣)دا، بە ناوونیشانی: (خوا بە یەکگرتن لە ناوو سیفەتەکانو لە پەرستراوێتییدا) بە تەفصیل باسی چەمكو واتای عیبادەتم کردوە، بەڵام لێرەدا بە کورتیی سێ پێناسەم هێناون، یەکێکیان لە (لِسَانُ العَرَب)ەوە، کە هی (إبْنُ المَنْظُور)ە، یەکێکی دیکەیان لە (مُفْرَدَات الألفَاظ القُرآن) کە هی (رَاغِب الأصْفَهَانِي)یە، ئەویدیکەش لە (إبْنُ تَيْمِيَة)ەوە ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ:

١/ (إِبْنُ المَنْظُور) دەڵێ: (العِبَادَةُ هِيَ الْتَذَلُّلِ والخُضُوعُ والطَّاعَة والدَّيْنُونَة، وَمِنْهُ طَرِيقٌ مُعَبَّدٌ، إِذَا كَانَ مُذَلَّلاً بِكَثْرَةِ الوَطءِ، وَبَعِيرٌ مُعَبَّد إِذَا ذلّله القَطِرَان)[١].

واتە: (عِبَادَة) بریتیە لە زەبوونیی‌و ملکەچیی‌و فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی، وە لەوەوە هاتوە دەگوترێ: ڕێیەکی موعەببەدو حوشترێکی موعەببەدە، واتە: ڕێیەك کە زۆری خەڵك پێدا ڕۆیبێ‌و گرێی تێدا نەمابێ‌و تەخت بووبێ، وە حوشتری موعەببەد کاتێك حوشتر کە نەخۆشیی خروو دەیگرێ، ئەگەر قەترانی لێبدەی خرووەکەی دەشکێ‌و بۆخۆی دادەمرکێ، کەواتە: وشەی عیبادەت یانی: ئەوە کە ئینسان لە بەرانبەر خوادا دابمرکێ‌و هێمن بێ‌و ملکەچبێ بۆ خواو لام‌و جیمیی نەبێ، لە بەرانبەر هەر شتێکدا کە خوا دەفەرمویێ.

٢/ (رَاغِب الأَصْفَهَانِي) دەڵێ: (العبوديّة: إِظْهَارُ التَّذلُّل، والعِبَادَة أَبْلَغُ مِنْهَا، لِأَنَّهَا غَايَة التَّذلُّلِ، ولاَ يَسْتَحِقُّهَا إِلاَّ مَنْ لَهُ غَايَةُ الإِفْضَالِ، وَهُوَ اللَّهُ تَعَالى: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾الإسراء)، واتە: (عُبوديّة) بریتیە لە دەرخستنی ملکەچیی، بەڵام (عِبَادَة) مانای زیاتری تێدایە، چونکە بریتیە لەوپەڕی ملکەچیی‌و گەردنکەچیی، وە شایستەی ئەوپەڕی ملکەچییش نیە، مەگەر کەسێك خاوەنی ئەوپەڕی چاکەو بەخشش بێ، ئەویش خوای بەرزە، بۆیە خوا دەفەرمویێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾ الإسراء، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوەو بڕیاری داوە، کە جگە لەو نەپەرستن، چونکە پەرستن واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی.

٣/ (إِبْنُ تَيْمِيَة) دەڵێ: (الْعِبَادَةُ: هِيَ اسْمٌ جَامِعٌ لِكُلِّ مَا يُحِبُّهُ اللَّهُ وَيَرْضَاهُ: مِنْ الْأَقْوَالِ، وَالْأَعْمَالِ الْبَاطِنَةِ وَالظَّاهِرَةِ ذَلِكَ كَمَالُ الخُضُوعِ مَعَ

١) لِسَانُ العَرَب، ج: (١٠)، ص: (١٠).

كَمَال الـمُحِبَّة، وَكَمَال الخَشْيَةِ وَالتَعْظِيم)، واتە: (عِبَادَة) ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی كە خوا خۆشی دەوێن، وە لە لای پەسندن، لە قسەو، لە كردەوە، ڕواڵەتو پەنهانەكان، هەروەها وێڕای ئەوەش لەگەڵ ئەوپەڕی ملكەچییو ئەوپەڕی خۆشەویستیی لەگەڵ تەواوی لێترسانو بە گەورەگرتن دا بۆ خوا ﷻ.

**مەسەلەی دووەم:** كە خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا﴾، هیچ شتێك مەكەنە هاوبەش بۆ خوا ﷻ، ئایا شیرك یانی: چی؟

## باسێك لەبارەی هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك بالله)ەوە

(شِرك) یانی: هاوبەش بۆ خوا پەیدا كردن، كە (إشراك)یشی بۆ بەكاردێ، واتە: شتێك لە شتێكدا بكەیە هاوبەش، بۆچی دەگوترێ شەریك؟ چونكە هاوبەشە لەگەڵ ئەویدیكەدا، (شِرك) پێچەوانەی (تَوحِيد)ە، (شِرك) واتە: هاوبەشدانان، (تَوحِيد) واتە: خوا بەیەكگرتن، (تَوحِيد) واتە: تەنیا خواپەرستن، (شِرك) واتە: پەرستنی شتێكی دیكە لەگەڵ خوادا ﷻ، ئنجا (شِرك) بەگشتی سێ بەشە:

**یەكەم:** (الشِّرْكُ باللَّهِ في الخالقية والرَّبوبية والمالكية والولاية... ألخ)، هاوبەشدانان بۆ خوا لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتییو خاوەندارێتیو ... هتددا.

**دووەم:** (الشِّرْكُ باللَّهِ في أسمائهِ وصِفاته)، هاوبەشدانان بۆ خوا لە ناوو لە سیفەتەكانیدا.

**سێیەم:** (الشِّرْكُ باللَّهِ في الألوهية)، هاوبەشدانان بۆ خوا لە پەرستراوێتییدا.

## شیـرکی گــەورەو بەڵـگەکـانی و جۆرەکـانی

بەڵـگەی هـەر سـێك لـەو جـۆرە شیـرکانەش کـە هەرسێکیـشیان شیـرکی گـەورەن، ئەم ئایـەتانەی ســوورەتی (الـشعراء)ن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: (دۆزەخییەکان) لە کاتێکدا کـە خـەریکی دەمەقـاڵـێ بـوون لـە دۆزەخـدا گوتیـان: سـوێند بـە خـوا ئێمـە لـە گومڕاییەکـی ئاشـکرادا بــووین، کاتێــك ئێوەمــان یەکــسان دەکــرد لەگــەڵ پەروەردگــاری جیهانییەکـاندا، ئێـوە واتــە: کــێ؟ واتـە: پەرستــراوەکانیان، کەواتـە: شیــرکی گـەورە چییــە؟ ئەوەیە کە تۆ غـەیری خوا لەگـەڵ خوادا یەکسـان بکـەی، جـا چ لــە پەروەردگـــارێتیی‌و خـاوەنـــدارێتیی‌و بەدیهێنەرێتییـــدا، چ لــە نـــاوو سیفەتەکانیـــدا، چ لـە بەندایـەتیی بـۆ کـردن‌و پەرستنیدا، واتـە: لـە بـواری پەرستـراوێتییدا.

ئنجا هاوبەش بۆ خـوا دانـان لە بواری پەرستـراندا، ئـەوە لەڕاستییدا بەشی گــەورەی شیــرك پێکدێنــێ، وە هــەرچی کێــشەو مــشتومڕی پێغەمبــەران (علیهم الصلاة والسلام) بووە لەگەڵ ناحەزانیاندا، لێـرەدا بووە، واتـە: لەسـەر جۆری سێیەمی شیـرك بووە، لەسـەر هـاوبەش بـۆ خـوا دانـان لـە پەرســترانـدا، ئەگـەرنا هاوبــەش بــۆ خــوا دانــان لــە بەدیهــێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتییـــدا، هـەموویــان دانیـان پێـدا هێنـاوە، بـە بەڵـگەی ئـەوە کـە خـوای پـەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ... ﴿٨٧﴾ ﴾الزخــــرف، واتــە: ئەگــەر لێیــان بپرسـی کـێ دروسـتی کـردن؟ دەڵێن: خـوا ﷻ، وە لـە شـوێنێکـی دیکـــەدا دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾الزخــــرف، واتــە: ئەگــەر لێیــان بپرســی: کــێ

ئاسمانەکانو زەوی دروست کردوون؟ دەڵێن: (خوای ﷻ) زاڵی زانا، بەڵام کێشە لەسەر چی بووە؟ لەسەر ئەوەبووە کە: ئایا ئەو خوایە کە تەنیا ئەو بەدیهێنەرە، وە تەنیا ئەو پەروەردگارە، وە تەنیا ئەو خاوەنە، ئایا دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ، یاخود هاوبەشی بۆ دابنرێ؟ واتە: وێڕای ئەوەی کە دەپەرسترێ، یاخود لە جیاتی ئەو خەڵکی دیکە، یاخود شتی دیکە بپەرسترێ؟ کێشە لێرەدا بووەو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گوتوویانە: دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێو هەموو جۆرەکانی پەرستن دەبێ تەنیا بۆ خوای بێ وێنە بن، کە جۆرەکانی پەرستنیش بەگشتی دوو جۆرن: جۆری یەکەم: لە بواری یاسادانان (في مجال التشريع). جۆری دووەم: لە بواری دروشمەکاندا (في مجال الشعائر)، لە بواری یاسادانانەدا خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾﴾ الشورى، واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە بەرنامەیەکیان بۆ داناون لە ئاییندا کە خوا مۆڵەتی نەداوە؟ کەواتە: هەر کەسێك بەرنامە بۆ خەڵك دابنێ، حەڵاڵو حەرامیان بۆ دابنێ، بە جۆرێك کە خوا مۆڵەتی نەدابێ، ئەوە مانای وایە ئەو کەسەی کە بەرنامەی بۆ دادەنێ، کردوویەتی بە هاوبەش بۆ خوا، ئەدی هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری دروشمەکاندا؟ لەوبارەشەوە خوای بێوێنە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾﴾ الحج، واتە: ئاوا بەو شێوەیە وە هەر کەسێك دروشمەکانی خوا بە گەورە بگرێ، ئەوە بە گەورە گرتنی دروشمەکانی خوا لە تەقوایەکە کە لە دڵدایە، واتە: تەقوای ڕاستەقینەیە، کەواتە دروشمەکان هەموویان هی خوان، ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾، دروشمەکان دەبێ هەر بۆ خوابن، دروشمەکان چین؟ نوێژ دروشمە، بەڵکو گەورەترین دروشم نوێژە، چونکە ئەویش کۆمەڵێك دروشمی تێدایە، وەك: سەجدە بردن، ڕکووع بردن،

دووعا کردن، قورئان خوێندن، ئەوانەش هەموویان دروشمن، هەموویان نیشانەی بەندایەتیی کردنن بۆ خوا، هەروەها ڕۆژووگرتن دروشمە، زەکات دروشمە، حەجو عومرە دروشمن، ئنجا قوربانی سەربڕین، نەزرکردن، سوێند خواردن، ئەوانە هەموویان نیشانەو دروشمی بەندایەتییکردنی مرۆڤن بۆ خوا، کەواتە: دروشمەکان هەموو هی خوان‌و نابێ بەشی غەیری خوایان پێوەبێ، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ ﴾الأنعام، واتە: بڵێ: بێگومان من نوێژم، قوربانیی سەربڕینم، ژیانم، مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییەکانە، هیچ هاوبەشی نین، وە من بەوە فەرمانم پێکراوە، (کە هەموو شتێکم بۆ خوا بێ، ژیانم‌و مردنم بۆ خوا بێ، وە نوێژو قوربانی سەربڕین‌و عیبادەت‌و هەموو شتێکم بۆ خوا بێ)، وە من یەکەمینی مسوڵمانانم، هەروەها خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٥٥)دا دوای ئەوەی بەڵێن‌و موژدەی ئەوە بە ئیمانداران دەدات کە بیانکاتە جێنشین لەسەر زەوی، دەفەرموێ: ﴿ ... يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ... ﴿٥٥﴾ ﴾النور، (ئەوە مەرجی خوایە)، ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾النور، واتە: خوا ئەو بەڵێنانەتان پێدەدا، ئەو موژدانەتان پێدەدا بە مەرج، موژدەکان چین؟ دەفەرموێ: خوا بەڵێنی داوە بەوانەتان کە ئیمانیان هێناوەو کردوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کە بیانکاتە جێنشین لەسەر زەوی (واتە: دەستەڵاتیان بداتێ، بیانکاتە حوکمڕان)، وەك چۆن ئەوانی پێش ئێوەشی کرد

بووە حوکمڕان، وە ئەو بەرنامەیەی کە بۆی پەسند کردوون، کە ئیسلامە بۆتان بچەسپێنی، وە دوای ئەوەی ترسیان لەسەر بووە (لە دوژمن دەترسێن بیانگرن، بیانکوژن، نانیان ببڕن، دەریان بکەن، نارەحەتیان بکەن)، ئەو ترسەیان بۆ دەگۆڕێ بۆ هێمنیی و ئاسایش، (بەڵام ئەو بەڵێنانە بە چ مەرجێك؟) تەنیا بەندایەتیی بۆ من دەکەن، هیچ شتێك ناکەنە هاوبەشم.

ئنجا پێویستە بزانین کە دوو جۆرە هاوبەشدانان هەن، هاوبەشدانانی گەورەو، هاوبەش دانانی گچکە، پێشتر باسی هاوبەش دانانی گەورەمان کرد، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری یاسادانان، یان لە بواری دروشمەکاندا، هەرکەسێك یاسایەك لە غەیری خوا وەربگرێ‌و پێچەوانەی شەریعەتی خوابێ، ئەوە شیرکی گەورەی کردوە، بۆ وێنە: مەسەلەی دابەشکردنی میرات، مەسەلەی چەند ژنیی کە لەم ڕۆژگارو سەردەمەدا، لەلایەنی خەڵکێکی خۆ بە دیندار زانەوە، نیشانەی پرسیاریان خراوەتە سەر، هەرکەسێك دژی ئەو یاسایانەی خوا بێ، مانای وایە شیرکی گەورەی کردوە، بە دەقی ئایەت وەك دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾ ﴾الشورى، واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە بەرنامەیەکیان لە ئایین بۆ داناون، کە خوا مۆڵەتی نەداوە؟!

بەڵێ ناگونجێ خۆت بە مسوڵمان بزانیی‌و یاسای خواش ڕەت بکەیەوە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: هیچ پیاوێکی ئیمانداری ئافرەتێکی ئیماندار، بۆیان نیە دوای ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا بڕیارێك دەدەن، خۆیان سەرپشك بکەن (لە گوێڕایەڵ بوونو نەبوون دا) وە هەر کەسێك سەرپێچیی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بکات، ئەوە زۆر بە ئاشکرایی گومڕابووەو، سەری لێشێواوە.

کەواتە: جۆری یەکەمی شیرکی گەورە بریتیە لە لادان لە بواری یاساکانی ژیاندا (شرائع الحیاة)، وە جۆری دووەمی شیرکی گەورە بریتیە لە لادان لە دروشمەکانی دین (شعائر الدین)دا، کەسێك سەجدە بۆ غەیری خوا بەرێ، ڕکووع بۆ غەیری خوا بەرێ، سوێند بە غەیری خوا بخوات، غەیری خوای وەك خوا خۆشبوێ، غەیری خوای وەك خوا لەلا گەورەبێ، وەك بۆ خوا ملکەچە، ئاوا بۆ غەیری خواش ملکەچ بێ، وەك چۆن پشت بە خوا دەبەستێ، ئاوا پشت بە غەیری خوا ببەستێ، قوربانیی بۆ غەیری خوا سەرببڕێ، نوێژ بۆ غەیری خوا بکات... هتد، هەموو ئەوانە شیرکی گەورەن، هەڵبەتە مەسەلەی سوێند خواردن نەبێ، کە مەگەر نیەتی وابێ کە ئەو شتەی سوێندی پێ دەخوا، وەك خوایە، ئەگەرنا سوێند بە غەیری خوا خواردن شیرکی گچکەیە، بەڵام ئەگەر نیەتەکەی وابێو پێی وەك خوا بێ، یان پێی لە خواش گەورەتربێ !! ئەوەش هەر شیرکی گەورەیە، جا شیرکی گەورە ئەو دوو جۆرەیە، شیرکی گچکەشمان هەیە، کە ئەویش دوو جۆرە:

## شیرکی گچکەو جۆرەکانی

<u>جۆری یەکەمی شیرکی بچووك</u>: بریتیە لە هەندێ قسەو هەڵسوکەوت کە لەسەر زمانو ئەندامەکان دەردەکەون، وە بۆنی ئەوەیان لێدێ کە غەیری خوا وەك خوا تەماشا دەکرێ، وەك چی؟ بۆ وێنە ئەم حەدیسە دێنینەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَحَدَّثَهُ بِبَعْضِ الْكَلَامِ، فَقَالَ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، فَقَالَ: أَجَعَلْتَنِي لِلَّهِ عِدْلاً، قُلْ: مَا شَاءَ اللَّهُ﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي برقم: (١٣٠٠٥)، وَالبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد) برقم: (٧٨٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەندێ قسەی بۆ کرد، پاشان گوتی: مەگەر خوا بیەوێو تۆ بتەوێ، فەرمووی: ئایا منت کردە هاوتای خوا؟! بڵێ: مەگەر خوا بیەوێ بە تەنیا.

ڕەفتارێکی دیکە کە شیرکی گچکەیە، بریتیە لە سوێندخواردن بە غەیری خوا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أَشْرَكَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٠٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٣٥) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٥١)، وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٥٩٦٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٥٨) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَصَحَّحَهُ الألباني، واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە کوفری کردوە، یاخود شیرکی کردوە، واتە: کوفرو شیرکی گچکە، بەڵام بە مەرجێك نیەتەکەی وانەبێ، واتە: ئەو شتەی پێ وەك خوا نەبێ، یان پێی لە خوا گەورەتر نەبێ، چونکە دەڵێن: هەبووە گوتوویانە، سوێند بە خوا بخۆ، یەکسەر سوێندی خواردوە، سوێند بە قورئان بخۆ یەکسەر سوێندی خواردوە، گوتوویانە: سوێند بە سەری شێخ بخۆ، گوتوویەتی: چۆن دەبێ؟! مانای وایە سەری شێخی پێ لە خواو لە قورئان گەورەتر بووە!! ئەوە شیرکی گەورەیە، یاخود هەیە کەسێکی زۆر خۆشدەوێ، دەڵێ سوێند بە سەری فلان کەسی ناخۆم، بە درۆ، بەڵام سوێند بە خوا دەخوات، مانای وایە ئەوی پێ لە خوا گەورەترە، ئەوە شیرکی گەورەیە، دەنا لە ئەسڵدا سوێند بە غەیری خوا خواردن، شیرکی بچووکە.

هەروەها یەکێکی دیکە لەو ڕەفتارانەی کە شیرکی گچکەن ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ تَعَلَّقَ شَيْئًا وُكِلَ إِلَيْهِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٨٠٣) تعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ لِغَيْرِهِ، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٧٢) وَقَالَ الشيخ الألباني: حَدِيثٌ حَسَنٌ، واتە: هەر کەسێك شتێك هەڵبواسێ حەواڵەی ئەو دەکرێ، کە دیارە ئەوە جۆرێکە لە شیرك، کەسی وا هەیە نالی کەر هەڵدەواسێ بۆئەوەی لە چاوو زاری خەڵك بەدووربێ، گشتەك و دەزوو هەڵدەواسێ بەدەستییەوە، ئەوانە هەموویان هەڵەو ئەفسانەن، وە ئەوەش جۆرێکە لە شیرك، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ

شِـرْكٌ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٣٦١٥)، وأبـو داود بـرقم: (٣٨٨٣)، وَابْنُ مَـاجَهْ برقم: (٣٥٣٠)، وَالحَـاكِمُ برقم: (٨٢٩٠)، وَقَـال: صَحِيح الإِسنَاد عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٠٩٠)، وَأَبُو يَعلى بـرقم: (٥٢٠٨) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، وَصَحَّحَهُ الألبـاني، ﴿(رُقى) كۆی (رقیـة)یە، واتـە: دووعـاو نوشـتەیەك كە شـەرعیی نەبـێ، یانی: لە قورئـانو سـوننەت وەرنەگیـرابێ، وەك ئـەوەی كە جادووگەرو نوشتەچییەكان دەیكەن، هەندێك هێڵو نەخش، یان هـەندێك نـاوی تێـدایە كە نـازانرێ نـاوی شـەیاتانانن، نـاوی چیـن؟، كەواتـە: (رقـی) ئەوەیـە كـە بنووسـرێ، وە (تَمـائم) كـۆی (تَمیمـة)یـە، ئـەویش ئەوەیـە كـە هەڵبواسـرێ، وە (تِوَلَـة) ئەوەیە كە ژن لەلای مێرد خۆشـەویست بێ، وە مێـرد لـەلای ژن خۆشـەویسـت بـێ، یاخـود ئافرەتێـك لـەلای پیاوێـك، یـان پیـاوێك لەلای ئافرەتێـك خۆشـەویست بكەن، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانـەی هەموو بـە شیـرك دانـاوە، بۆچـی؟ چـونكە بـە زۆریـی ئـەو شـتانە كـە دەكـرێن بـە هـاوكارییو پـشـت بەسـتن بـە شـەیتانەكانە، نـاوی شـەیتانیان تێـدا دەنووسرێ، یاخـود هەنـدێ ژمـارەو ڕەمزو هێمـایان تێـدا دەنووسـرێ، كـە دیـارە مەبەسـتی ناشـەرعییو خراپیـان گرتۆتـە خۆیـان، ئەمـە جـۆری یەكەمـی شیـركی بچـووك.

<u>**جـۆری دووەمی شـیركی بچـووك**</u>: بریتیـە لـە ڕیابـازیی، پێشتریش باسـمان كـرد، وەك خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿... فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴿١١٠﴾﴾الكهـف، واتـە: هـەر كەسێك بە ئومێدی دیداری پەروەردگاری خۆیـەتی، با كـردەوەی بـاش بكاتو لە پەرستنی پەروەردگاریدا هیـچ كەس نەكاتە هاوبـەش، واتـە: كردەوەیـەكی چاك كە بۆ خـوا دەیكـات، با بەشی كەسـی تێنـەخات، كە ئـەوە ڕیـایە، ئنجـا لەوبـارەوە ئـەم فەرمایـشـتە هەیـە: ﴿عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيـدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَخْـوَفَ مَـا أَخَـافُ عَلَيْكُمْ الـشِّرْكُ الأَصْـغَرُ ! قَـالُوا يَـا

رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الشِّرْكُ الأَصْغَرُ؟! قَالَ: الرِّيَاءُ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٦٨٦)، والطَّبراني والبَغَوي في (شرح السُنَّة)، وَقَالَ: شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح، واتە: مەحموودی کوڕی لەبید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شتێك کە زۆر مەترسییم لێی هەیە بەرانبەرتان، شیرکی بچووکە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! شیرکی بچووك چییە؟ فەرمووی: ڕیابازییە، ئەوەیە شتێك بکەی بەشی غەیری خوای تێبخەی، بۆ وێنە: کەسێکی نوێژکەر کە نوێژ دەکات دوای دەبینێ خەڵك وا تەماشای دەکەن، ڕکووعەکەی چاك دەکات، یان قورئانەکەی چاکتر دەخوێنێ، یان خشووعەکەی زیاتر دەکات، بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵك، ئەوە بایی ئەوەندە کە سەرنجی خەڵکی پێ ڕادەکێشێ بەو عیبادەتە تووشی ڕیا بووە، کە ئەوەش جۆرێکە لە شیرك، هەڵبەتە دەربارەی شیرکیش خوای پەروەردگار لەم فەرمایشتە قودسییەدا فەرموویەتی: ﴿ أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِيْ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيْهِ غَيْرِيْ، فأَنَا مِنْهُ بَرِيْءٌ ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٧٤٠٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، واتە: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم، لە هاوبەشێتییدا، هەر کەسێك کردەوەیەك بکات بەشی غەیری منی تێبخات، ئەوە من بەرییم لەوو بەشەکەی خۆشم دەدەم بەو، واتە: خوای تاكو پاك ڕازی نابێ عیبادەتێکی بۆ بکرێ، بەشی غەیری وی تێبخرێ، هەر کردەوەیەك شیركو ڕیای تێکەڵ بوو، ئەوە خوای پایەدار نایەوێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ تَعِسَ عَبْدُ الدِّرْهَمِ، تَعِسَ عَبْدُ الْقَطِيفَةِ، تَعِسَ عَبْدُ الْخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٨) وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٣٥)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٣٢١٨) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، واتە: بەدبەختە، یاخود بێ مورادە، ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی دینار (واتە: زێڕ)، وە بێ مورادە ئەوکەسەی دەبێتە بەندەی درەم (واتە: زیو)، وە بێ

موراده ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی قەتیفە، وە بێ موراده ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی خەمیسە (کە دوو جۆرە قوماشی بەقیمەت بوون)، ئەگەر پێی بدرێ ڕازییە، ئەگەر پێشی نەدرێ تووڕە دەبێ، کەواتە: دەگونجێ ئینسان ببێتە کۆیلەو بەندەی ئەو کەلوپەل‌و شمەکانەش، لەکاتێکدا کە ئەوانەی هێندە لەلا گرنگ دەبن، وەك چۆن خوای لەلا گرنگە، ئاوا بەو شێوەیە، هەڵبەتە دەگونجێ لە ئەسڵدا ئەوانە شیرکی بچووك بن، بەڵام هێندە تۆخ بێتەوە ببێتە شیرکی گەورەش، ئەگەر کەسێك پارەی لە خوا خۆشتر بوێ، مانای وایە شیرکی گەورەی کردوە، قوماش‌و پۆشاك‌و کەلوپەلێکی لە خوا خۆشتر بوێ، یان وەك خوا خۆشی بوێ، یان وەك خوای لەلا گەورەبێ، یان مەبەستی بێ، مانای وایە ئەوە شیرکی گەورەیە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾، لێرەدا خوا دە جۆرە کەسی باسکردوون، کە دەبێ چاکەیان لەگەڵدا بکرێ: باب، دایك، خزم، هەتیو، نەدار، دراوسێی نزیك، دراوسێی دوور، هاوەڵی هاودەم (واتە: برادەرێکی نزیك)، ڕێبوار، کۆیلە، مەبەست لە چاکەکردن لەگەڵ ئەوانەدا چییە؟!

واتە: چاکە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بکەن، یانی لە ڕووی مەعنەوییەوە ڕێزیان بگرن، بە بەزەیی بن لەگەڵیان، بەتایبەتی باب‌و دایك کە دەبێ لە هەموو کەس زیاتر ڕێزیان بگیرێ، دڵیان ڕابگیرێ، وە لە ڕووی مادییشەوە هاوکاریی بکرێن، هەڵبەتە هاوکارییکردنی باب‌و دایك، ئەگەر نەتوانن خۆیان بژێنن، فەرزە لەسەر منداڵ‌و ڕۆڵە، بەڵام هی ئەوانی دیکە جاری وایە فەرزە، ئەگەر خزم بێ، یاخود کەس نەبێ جگە لەو کەسە هاوکاریی بکات، وەك: هەتیوو هەژارو ڕێبوار، جاری واشە سوننەتە، بەڵام هی باب‌و دایك هەموو کات فەرزە، مادام نەتوانن خۆیان بژێنن، ئنجا پێویستە ئەوەش

بزانرێ کە وشەی (إحسان) لە قورئاندا، مەرج نیە هەمیشە مەبەست پێی چاکەکردنی خۆبەخشانە (تطوع و ندب)بێ، بەڵکو جاری وایە مەبەست پێی فەڕزە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الإسراء) فەرموویەتی: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ...﴿٢٣﴾﴾، واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردوە کە تەنیا ئەو بپەرستن، وە لەگەڵ بابو دایك چاکەکاریی بکەن، ئەو چاکەکارییە فەڕزە، چونکە لە دوای خواپەرستییەوە دێ، بەڵێ مەرج نیە هەمیشە چاکەکردن چ لەگەڵ بابو دایك، چ لەگەڵ خزمان، چ لەگەڵ هەتیو، چ لەگەڵ لێقەوماو، چ لەگەڵ ڕێبوارو میوانو ... هتددا، هەر سوننەت بێ، بەڵکو جاری وایە فەڕزە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوای بەخشندە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾، وە دراوسێی نزیكو دراوسێی دوور، دەگونجێ مەبەست لە: ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾، دراوسێی خزم بێ، دراوسێیەو خزمیشە، ئەوە لە پێشترە لە دراوسێیەك کە خزمت نیە، دیارە ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾یش ئەو کاتە دەبێتە دراوسێی بێگانە، کە خزم نیە، دراوسێیەکت هەیە خزمە، پێشی دەبێ چاکە لەگەڵ ئەو بکەی، وە دراوسێیەکت هەیە خزم نیە، ئەوە لە قۆناغێکی دیکەدا دێ، دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾، واتە: دراوسێیەك کە نزیکترە، لە ماڵتەوە نزیکترە، وە: ﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾، واتە: دراوسێیەك کە ماڵەکەی دوورترە، ئەوەی کە نزیکترە هەقی زیاترە لەوەی کە دوورترە، هەردووکی دیارە دەگرێتەوە، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ زۆر باسی چاکە لەگەڵ دراوسێو، ڕێزگرتنی دراوسێو، دڵڕاگرتنیو هاوکارییکردنی دراوسێ کراوە، بۆ وێنە:

١- یەکێك لەو فەرمایشتانە ئەمەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي اللَّهُ عَنْهَا، تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٥٥٨٠)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٦٠١٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٦٢٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٥١٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٩٤٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٣٦٧٣)، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەردەوام جیبریل ئامۆژگاریی دەکردمو ئەوەندە ڕایسپاردم دەربارەی دراوسێ، هەتا گومانم وابوو دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

٢- ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ: خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللَّهِ: خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٦٥٦٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٩٤٤) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥١٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٦٢٠) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيْخَيْن، وَالبُخَارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (١١٥)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٢٥٣٩)، عَنْ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ العَاصِي رِضِيَ اللَّهُ عَنهُم، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) بـرقم: (١٠٣)، واتە: باشترین هاوەڵ لەلای خوا ئەوەیە کە لەگەڵ هاوەڵەکانی باشبێ، وە باشترین دراوسێ ئەوەیە کە لەگەڵ دراوسێکانی باشبێ.

٣- هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَة رضي الله عنه: أن النَّبِيّ ﷺ، قَالَ: وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ ! قِيلَ: مَنْ يَا رَسُول اللَّه؟ قَالَ: الَّذِي لاَ يَأمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ!﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٧٢٠٦)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٦٠١٦)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە خوا ئیماندار نیە، بە خوا ئیماندار نیە، بە خوا ئیماندار نیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! کێ؟ فەرمووی: کەسێك کە دراوسێیەکەی لە شەڕو خراپەی دڵنیا نەبێ، جا

بە هەر شێوەیەك لە شێوەكان زیانی پێدەگەیەنێو جارسی دەكاو تووشی زەرەو زیانی دەكات، ئەو كەسە ئیماندار نیە، واتە: ئیمانداری تەواو نیە.

٤- ئنجا كۆتایی مافی دراوسێیەتی بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین: ﴿لَيْسَ بِمُؤْمِنٍ مَنْ لَمْ يَأْمَنْ جَارُهُ بِوَائِقَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ أَغْلَقَ بَابَهُ دُونَ جَارِهِ مَخَافَةً عَلَى أَهْلِهِ، وَمَالِهِ فَلَيْسَ ذَلِكَ بِمُؤْمِنٍ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا حَقُّ الجَارِ؟ قَالَ: إذا دعاكَ أجبتَهُ، وَإِذَا أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ عُدْتَ عَلَيْهِ، وَإِنِ استقرضكَ أقرضْتَهُ، وَإِن أصَابَهُ خَيْرٌ هَنَّيْتَهُ، وَإِن مرض عدتهُ، وَإِن أصابَتْهُ مُصِيبَةٌ عَزَّيتهُ، وإن مَاتَ شَهِدْتَ جِنَازَتُهُ، وَلا تَسْتَطِيل عَلَيْهِ بالبُنَاء لِتحجِبَ عَنْهُ الرِّيحِ إلاَّ بإذنِهِ، وَلا تُؤْذِيهِ بِقُتَارِ قَدْرِكَ إلاَّ أنْ تَغرِفَ لَهُ مِنْهَا، وإن اشْتَرَيْتَ فَاكِهَةً فَأَهْدِ لَهُ فَإِنْ لَمْ تَفْعَل فَأدخلهَا سِرًّا، وَلا يُخْرِجْ وَلَدُكَ مِنْهَا شَيْئاً فَيُغِيظُ وَلَدَهُ بِهِ﴾، أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٧٠٢٣)، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو كەسە بڕوادار نیە كە دراوسێیەكەی لە زەرەرو زیانی دڵنیا نەبێ، كە تووشی زیانی نەكات، وە هەر پیاوێك دەرگاكەی خۆی داخست بۆئەوەی لە دراوسێیەكەی تووشی زەرەرو زیان نەبێ، ئەوە مانای وایە لە دراوسێیەكەی ئەمین نەبووە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! مافی دراوسێ چییە لەسەر دراوسێ؟ فەرمووی: ئەگەر بانگی كردی وەڵامی بدەیەوە، (یاخود ئەگەر بانگهێشتی كردی بچی)، وە ئەگەر هەژاریی‌و نەدارییەك ڕووی تێكرد هاوكاریی بكەی، وە ئەگەر داوای قەرزی لێكردی، قەرزی پێبدەی، وە ئەگەر چاكەیەكی تووش بوو موناسەبەتێكی خۆشی هەبوو پیرۆزبایی لێ بكەی، وە ئەگەر نەخۆش بوو سەردانی بكەی، وە ئەگەر بەڵایەكی تووش بوو دڵی بدەیەوەو سەرەخۆشیی لێ بكەی، وە ئەگەر مرد لەگەڵ جەنازەكەیدا بچی، وە خانووەكەت بەرز نەكەیەوە بە شێوەیەك كە ڕێی باو تیشكی خۆری لێ بگری، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، وە بە بۆنی مەنجەڵ‌و قابلەمەكەت ئازاری نادەی، مەگەر بۆی هەڵبهێنجیو بەشی بدەی لەو خواردنە، وە ئەگەر میوەت كڕی لەو میوەیە بەشی بدە، ئەگەر بەشت نەدا بە پەنهانیی بیبەوە ماڵ، بۆئەوەی چاوی لێ نەبێ،

وە با منداڵەکەت ئەو میوەیە نەباتە دەرێ، تاکو منداڵی دراوسێیەکەت پێی تووڕە بێ، (کاتێك بابی ناتوانێ ئەو میوەیە بکڕێ).

ئەم فەرمایشتە بەڕاستیی فەرمایشتێکی زۆر کۆکەرەوەیە، بۆ زۆر لە مافەکانی دراوسێ لەسەر دراوسێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوای زاڵو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ﴾ دیارە لە ڕیزی ئەوانەدا کە دەفەرموێ: دەبێ چاکەیان لەگەڵدا بکرێ، یەکێکیان بریتیە لە: ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ﴾، (صاحِب) بە مانای هاوەڵ، برادەر دێ، (جَنْب) واتە: تەنیشت، نزیك، بۆیە توێژەرەوانی قوڕئان چەند ڕایەکیان هەن لەوبارەوە:

١) هەندێکیان گوتوویانە: ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ﴾، واتە: دۆستو هاوەڵێکی زۆر نزیك.

٢) وە هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی هاوسەرە، واتە: ژن بۆ مێرد، مێرد بۆ ژن، چونکە هەمیشە لە تەنیشتو نزیك یەکدین.

٣) هەندێکیش گوتوویانە: واتە: هاوەڵی سەفەرێ.

٤) هەندێکیشیان گوتوویانە: واتە: دراوسێ، کە ماڵیان بە ماڵێ وەیەو پێکەوەن.

بەڵام من پێم وایە زیاتر ڕای یەکەمیان بگرێتەوە واتە: برادەری نزیك، هاوەڵی نزیك، کەواتە: یەکێك لەو دە جۆر کەسانەی کە خوای پەروەردگار لەم ئایەتەدا فەرمانی پێکردوە هاوکاریی بکرێنو چاکەیان لەگەڵ بکرێ، بریتیە لە دۆستو برادەر کە هەمیشە لەگەڵ ئینسانەو لە تەنیشت ئینسانە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾، واتە: کوڕی ڕێگا، کە مەبەست پێی ڕێبوارە، کەسێك کە ڕێبوارە بە سەفەر دەچێ، جا ئایا مەبەست هەر ڕێبوارێکە؟ یاخود مەبەست پێی کەسێکە کە ڕێبوارە، بەڵام

لە ڕێ پەکی کەوتوە، وە کەسی نزیکیشی نیە، کە هاوکاریی لێ وەربگرێ، یاخود کەسێکە دەیەوێ بچێ بۆ سەفەر، بەڵام پێداویستییەکانی سەفەری بۆ دابین ناکرێن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی کەسێك بێ کە میوانت دەبێ، جا دەگونجێ ڕێبوار بێ، وە دەشگونجێ ڕێبواریش نەبێ، گرنگ ئەوەیە میوانی تۆیە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴾، بێگومان خوا کەسێکی خۆشناوێ کە خۆی پێ زۆربێ، وە شانازیی بەخۆکەر بێ، (مختال) کە ئەو کەسەیە لە خودی خۆیدا پێی وابێ کۆمەڵێك سیفەتی باشی هەن، یان شتێکی هەیە، کەچی نەشیبێ، وە لە خودی خۆیدا خۆی پێ زۆر بێ، بە هۆی نیعمەتێکەوە کە لە خودی خۆیدا هەستی پێدەکات، (فخور)یش ئەو کەسەیە کە شانازیی بەسەر خەڵکدا بکات بە هۆی ماڵو سامانێکەوە کە هەیەتی، یاخود خزمو کەسێك کە هەیەتی بە هۆی نیعمەتێکی بەدەر لە خۆی، کەواتە: خوای دادگەر خاوەنی ئەو دوو سیفەتەی خۆشناوێ، چ کەسێك کە لە خودی خۆیدا هەست بە نیعمەتێکی خوا بکات، جا هەیبێ یان نەیبێ، بە هۆی ئەوەوە تەکەببورو خۆ بەزلگریی لێ پەیدابێ، وە چ کەسێك بە هۆی نیعمەتێکی دەرەوەی خۆیەوە شانازیی بەسەر خەڵکدا بکاتو فیزو کەشخەیان بەسەردا بکات.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، ئەوانەی کە ڕژدییو چرووکیی دەکەن، وە ئەو چاکەو بەخششەی کە خوا پێی داون، دەیشارنەوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە ئەو سەروەتو سامانو داراییەی کە خوا پێی داون خەرجی ناکەن، نە بۆ خۆیان، نە بۆ خەڵك، بەڵکو دەیشارنەوە، وە خۆیان وا پیشان دەدەن کە هەژارو نەدارن، لە حاڵێکدا کە

واش نین، یاخود مەبەست ئەوەیە کە ئەو چاکەو نیعمەتە تەنیا لە خودی خۆیاندا حەپس دەکەن، وە بۆ خەڵکی دیکە خەرجی ناکەنو هاوکاریی کەس ناکەن، وە دەشگونجێ مەبەست پێی هەر کەسێك بێ نیعمەتێك کە خوا پێی داوە، نیعمەتەکەی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بۆ خزمەتی خەڵك بەکارنەهێنێ، واتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿مِن فَضۡلِهِۦ﴾، مەرج نیە هەر سەروەتو سامان بێ، بۆ وێنە: کەسێك زانیاریی هەیە بڵاوی ناکاتەوە، یاخود عەقڵو سەلیقەی هەیە بەکاری ناهێنێ، کەسێك ڕاوێژی پێدەکات سوودی پێ ناگەیەنێت بە عەقڵی خۆی، یاخود جاهو پێگەیەکی کۆمەڵایەتییو سیاسیی هەیە، کە دەگونجێ فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بکات، وە دەگونجێ پشتگیریی زوڵم لێکراو بکات، بەڵام نایکات، هەر نیعمەتێك خوا بە ئینسانی داو شاردیەوە، وە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاری نەهێنا، دەیگرێتەوە، کە دیارە خوای بێ نیاز ئەو جۆرە کەسانەی خۆشناوێ، پێچەوانەی ئەوەی خۆشدەوێ، کە چییە؟ ئەوەیە نیعمەتەکانی خواو فەزڵو بەخششو چاکەی خوا، کە پێی داوە لە خۆیدا دەریخات، وە بۆ خەڵکیش بەکاربێنێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾، وە بۆ بێبڕوایان ئازارێکی ڕیسواکەرمان داناوە، ئەمە یانی چی؟ سزاو جەزرەبەی خوای تۆڵەستێن دوو جۆرە: جۆرێکی بۆ جەستەیە، جۆرێکیشی بۆ ڕووحە، ئێستا کەسێك یەکێك ئەشکەنجە دەدا، دەگونجێ جەستەی ئەشکەنجە بدات، وە دەشگونجێ ڕووحی ئەشکەنجە بدات، بە چی؟ بەوەی کە قسەی ناخۆشی پێ بڵێ، سەرزەنشتی بکات، سووکایەتی پێ بکات، وە دەشگونجێ هەم جەستەو هەم ڕووحی، جەستەی بە ئازارو ئەشکەنجەی ماددی سزا بدات، وە ڕووحیشی بە ئازاری مەعنەویی، خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾، دیارە سزای خوا لە دۆزەخدا بۆ بێبڕوایانو ستەمکارانو خراپەکاران جەستەو ڕووحیان

دەگرێتــەوە، واتــە: هــەم ئــازارو ســزایەکی ڕواڵــەتیی یــە، هــەم ڕووحیــی‌و مەعنەوییشــە، بـەڵام لێـرەدا بۆیـە تـەنیا ئاماژە بـە مەعنـەوییەکە دەکات، کـە دەفەرمـوێ: ئـازارێکی ڕیـسواکەرو شــەرمەزارکەرە، لەبەرئـەوەی ئـەوان خۆیـان پــێ زۆر بـووەو خۆیـان بەسـەر خەڵـکدا هەڵکێـشاوە، فیـزو کەشـخەو دەماریـان نوانـدوە بەسـەر خەڵـکـدا، خـوای باڵادەســت بـە پێـچـەوانەی ئـەو عــادەتە خراپــەو، ئـەو سـیفەت‌و ئاکارە خراپەیانـەوە، مامەڵـەیان لەگەڵدا دەکات، کـە ئــەوان خۆیــان بــە زۆر دانــاوەو خۆیــان پــێ زۆر بــووە، تەکەببــورو فیــزو کەشـخەیان بەسـەر خەڵـکدا کـردوە، خـوای دادگـەر بـچووکیان دەکاتـەوەو بـەو سـزایەی کە دەیـاندا ڕیسـواو شـەرمەزاریـان دەکـات.

**مەســـەلەی دەیـــەم:** کــە خــوای بەخــشـندە دەفــەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾، ئەوانــەی کــە ماڵ‌و سامانەکانیـان بۆ ڕیـابازیی‌و ڕووپـامایـی خەڵـك دەبەخـشن، وە بڕوایــان بـە خـــواو بـە ڕۆژی دوایـی نیـــە، پێـشـتـریش باســمان کـرد بـە زۆریـی وایـە، ئینسـان کە ئیمانی هەبوو بە خواو بە ڕۆژی دوایـی، ڕیابـاز نـابێ ڕووپامـایی بۆ خـەڵك ناکات، بۆچی؟ چونکە دەزانـێ خوا ئەو کردەوەیـەی کە دەیکـات، جـا مــاڵ بەخـشـینە، زانیـاری بڵاوکردنـەوەیــە، هــەر کارێکــی چاك کـە دەیکــات، خـــوا دەیبینــێ‌و فریــشـتەکانی خــوا تۆمــاری دەکــەن، وە پاداشــتی لەســەر دەدرێتــەوە، بۆیـە پێویـستی بـەوە نیـە کـە ســەرنجی خــەڵك بـۆ لای خـۆی ڕابکێشـێ بەو کردەوە باشـەی خۆی، بـەڵام بـە زۆریـی وایـە کـە ئینـسان ئیمانی نـەبوو، یـان ئیمانەکـەی بێهــێز بـوو، بـە ئەنـدازەی بێهــێزیی ئیمانەکـەی، کـە کــردەوەی چــاك دەکــات، حــەز دەکـات خــەڵك ببینێــێ بــۆ ڕوودەربایــسیی‌و ڕووپامـایی‌و پێـشـاندانی خـەڵك، وە لـە کاتێکـدا خـەڵك نەیبینێــێ، سـستە لـە کـردەوەی چاکداو، کاتێـك کـە خەڵـك دەیبینـێ گـورج‌و گۆڵـە، چـونکە زیـاتر مەبەستی ئەوەیە کە خەڵك ببینێ.

بەڵێ ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە ئینسان بە ئەندازەی ئەوەی کە ئیمانی کز دەبێو بێهێز دەبێ، سیفەتی ڕیابازیی تێدا پەیدادەبێ، وە بە ئەندازەی ئەوەی کە ئیمانێکی مەحکەمی دەبێ، منەتی بەوەنیە، داخۆ خەڵك دەیبینێ، یان نا، هەڵبەتە ئەگەر خەڵك دیتی، ئەوە دیتی، ئەگەر نەیاندیت مەبەستی نیە، بگرە جاری وایە بە ئانقەست کردەوە باشەکانی خۆی دەشارێتەوە، تاکو خەڵك نەیبینێ، بۆچی؟ بۆئەوەی ڕیای تێکەڵ نەبێ، هەڵبەتە لێرەشدا زانایان زۆر قسەیان کردوە، زانایانی تەزکیەی نەفس، کە ئایا وا باشە ئینسان کردەوە باشەکانی خۆی بشارێتەوە، ئەوانەی کە فەڕز نین؟ بۆ وێنە: زەکات فەڕزە دەبێ بیدەی، نوێژی فەڕز هەر دەبێ بە کۆمەڵ بیکەی لە نێو خەڵکدا، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، حەجو ئەو شتانەی دیکە کە فەڕزن، ئەوە دیارە دەبێ ئەوانە بە ئاشکرا بکرێن، بەڵام ئەوانەی کە فەڕز نین، ئایا وا باشە بە پەنهانیی بکرێن، یان بە ئاشکرا بکرێن؟ هەندێك دەڵێن: ئەگەر ئەو کەسە لە خۆی بترسێ کە تووشی ڕیاو ڕووپامایی دەبێ، واباشە پەنهانیان بکات، هەندێکیش دەڵێن: دووربینیی (إحتیاط) ئەوەیە کە ئەگەر لە خۆشی نەترسێ، بە ئاشکرا نەیانکات، هەندێکی دیکەش دەڵێن: نەخێر مادام لە خۆی نەترسێ، واباشە کردەوە باشە سوننەتەکانی بە ئاشکرا بکات، مادام بێمنەتە، وە لە خۆی ناترسێ کە تووشی ڕیابێ، بۆچی واباشە بە ئاشکرا بێ؟! بۆئەوەی خەڵك چاوی لێ بکات، ئەوکاتە خێرو پاداشتی چاولێکردنی خەڵکی دەگاتێ.

نیشانەی ئەوەش کە ئایا ئینسان ئەو کردەوەیەی بۆ خوایە، یان بەشی غەیری خوای تێدایە؟ ئەوەیە کە کاتێك خەڵك چاوی لێ نیە، لەگەڵ ئەوەدا کە کاتێك خەڵك چاوی لێیە، وەك یەك بیانکات، بەڵکو ئەگەر خەڵك چاوی لێ نەبێ، هەوڵبدات چاکتریشی بکات، ئەوە مانای وایە، ئەوکاتە کاتێك کە لەبەرچاوی خەڵکیش کردەوەیەکی باش ئەنجام دەدات، مەبەستی پێ ڕیاو بینینی خەڵك نیەو مەبەستی ئەوەنیە کە خۆی بنوێنێ

لەبەرچاوی خەڵك، بەڵكو كردەوەی باشی خۆی دەكات، ئیدی بەلایەوە گرنگ نیە داخۆ خەڵك دەیبینێ، یاخود نایبینێ، ئەوەش بە تەئكید بەپێی شەخصەكانو بەپێی حاڵەتەكان دەگۆڕێ، لە شوێنێكداو لە كاتێكدا بۆ كەسێك كە ئیمانێكی بەهێزی هەبێو، خەڵك وەك سەرمەشقو پێشەنگ تەماشای بكەن، وا باشە سوننەتەكانیشی خەڵك بیانبینێ، بۆئەوەی خەڵك لێی فێربێو چاوی لێ بكەن، بەلاّم بۆ كەسێك كە لە خۆی بترسێ، بە تەئكید دووربینیی وایە كە بیانشارێتەوە.

جا لەبارەی كردەوەیەكەوە كە كردەوەی باشەو پێویستە بۆ خوا بكرێ، بەلاّم كەسێك كە دەیكاتو بەشی غەیری خوای تێكەڵ دەكات، ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: أنَا أغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٤٠٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٢)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: خوای پایە بەرزو مەزن دەفەرموێ: من بێنیازترینو دەوڵەمەندترینی هاوبەشەكانم لە هاوبەشداریەتی، هەر كەسێك كردەوەیەك بكات بەشی غەیری منی تێكەڵ بكات، ئەوە من خۆیو شەریكەكەی (ئەو كەسە كردوویەتی بە هاوبەش)، وازی لێ دێنم، (واتە: بەشەكەی خۆشم دەدەم بەو).

بۆیە ئینسان دەبێ زۆر وریابێ كە كردەوەی باش، جا نوێژو ڕۆژووە، ماڵ بەخشینە، بەڵكو قسەی هەقە، بانگەوازكردنی خەڵكە بۆ لای خوا، سیلەی ڕەحمە، هەر چی كردەوەی باش هەیە، واباشە بەڵكو پێویستە لە خۆی وریابێو بە هیچ شێوەیەك مەبەستی پێی سەرنج ڕاكێشانی خەڵك نەبێ، ئەگەرنا لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺی لەسەر جێبەجێ دەبێ، ئەگەر تۆزقاڵێك شیرك تێكەڵ بە كردەوەكەی ببێ، خوای پەروەردگار نایەوێو قبووڵی ناكات، هەندێكیش

دەڵێن: ئەگەر ئەو بەشە كە ڕیای تێكەڵ بووە، كەمتربێ لەو بەشەی كە بۆ خوایە، ئەوە ئەو بەشەی كە بۆ غەیری خوایە، خوای بەرز قبووڵی ناكاتو ئەوەیدیكەی وەردەگرێ، وە ئەگەر وەك یەك بن، ئەوكاتە كردەوە كە ساقیت دەبێ، وە ئەگەر ئەو بەشەی كە بۆ غەیری خوایە زیاتر بوو لەوەی كە بۆ خوایە، ئەوە ئەوكاتە دیارە كە قبووڵ ناكرێ.

**مەسەلەی یازدەیەم**: كە خوای دەرووكەرەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا﴾، هەر كەسێك شەیتان ببێتە هاوەڵی ئەوە خراپترین هاوەڵی پەیدا كردوە، (قرین) كەسێكە كە هەمیشە لەگەڵ كەسێك بێو لێی نزیك بێ، لەگەڵی جووتبێ، لە تەنیشتیەوە بڕوا، چونكە وەك لە مانا زمانەوانییەكەی باسمان كردوە، لە (قَرْن)ەوە هاتوە، واتە: سەدە، جا ئایا بۆچی ئەو ماوە پێی دەگوترێ: (قَرْن)[١]؟

چونكە ئەو خەڵكە كە لەو ماوە زەمەنییەدا دەبن، هەموویان پێكەوەن، وە دەگوترێ: (فلان قَرْن فلان) واتە: كەسێكە لەگەڵ كەسێكدا زۆر دەگەڕێ، یاخود بە ئەندازەی ئەو بەهێزە، یاخود وەك ئەو زیرەكە.

وە ئەم ڕستە قورئانییە لێی وەردەگیرێ، كە كردەوە خراپەكان سەرچاوەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ شەیتان، هەروەكو چۆن كردەوە باشەكان سەرچاوەكەیان خوای بەخشندەیە، هەموو فەزڵو چاكەیەك دەگەڕێتەوە، بۆ خوا، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ٥٣﴾النحل، واتە: هەرچی چاكەو نیعمەتە لە ئێوەدا لە خواوەیە، ئەدی خراپەكان؟ خراپەكان لە شەیتانەوەن، دیارە شەیتانیش بە هۆی نەفسی خۆمانەوە زیانمان لێ دەدا، كەواتە: ئینسان ئەگەر نەفسەكەی تەزكیە كراو بێ، پاكو چاك بێ، وە ئەهلی تەقوابێ، شەیتان ناتوانێ لە ڕێی

---

١) قَرْن: سەدە، بریتیە لە ماوەی (١٠٠) ساڵ، یان (٧٠) ساڵ.

ئەو نەفسەوە زەفەری پێ بەرێ، هانی بدات بۆ كاری خراپ، بەڵكو لە ڕێی نەفسێكی پاكو چاكەوە ئیلهامی خوایی دێ، فریشتەكان دەبن بە هاودەمو هاوڕازی ئینسان، وە خەیاڵو بیرو بۆچوونو خولیای باش دەخەنە دڵی ئینسانەوە، وە بە پێچەوانەوە ئەگەر نەفس پاكو چاك نەبوو وە تەقوای تێدا نەبوو، ئەوە شەیتان ئەو نەفسە دەكات بە هێلانەی خۆی، وە لە ڕێی ئەو نەفسەوە، خوتخوتەو دنەدانی خراپ دەخاتە دەروونی ئینسانەوە، وەك خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾الزخرف، واتە: هەر كەسێك لە بەرانبەر یادی (یان لە بەرانبەر كتێبی خوای) خاوەن بەزەییدا، كوێر بێ، ئەوە شەیتانێكی بۆ ئامادە دەكەین، كە دەبێتە برادەرو نزیكی، وە شەیتانەكان هاوەڵەكانی خۆیان لە ڕێ لادەدەن، كەچی ئەوانیش وادەزانن ڕێگای ڕاستیان گرتوە.

ئنجا بەڵگەمان چییە لەسەرئەوە كە خووو ڕەفتاری خراپ، كردەوەی خراپ، سەرچاوەكەی شەیتانە، بەتایبەتی لەبارەی ڕژدییو چرووكییو، ماڵ نەبەخشینو دەست نووقاندنەوە؟، خوای بێنیاز دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ ﴾البقرة، ئەم ئایەتە قورئانییە زۆر بە ڕوونییو ڕاشكاویی ئەوەی پێشێ گوتمان دەیگەیەنێو دەفەرموێ: شەیتان هەڕەشەی هەژارییتان لێ دەكات، وە فەرمانتان بە ڕژدییو چرووكیی پێدەكات، خواش بەڵێنو موژدەی لێبوردنتان پێدەدا، وە بەڵێنو موژدەی چاكەو بەخششی خۆیتان پێدەدا، كەواتە: كەسێك كە دەبەخشێ، ئەوە خوای پەروەردگار دڵی بەرەو بەخشین وەرچەرخاندوەو هانداوە، لەڕێی فریشتەكانەوە، وە كەسێك كە چرووكیی دەكات، وە لە هەژارییو نەداریی

دەترسیّ‌و دەست دەنووقێنیّ، ماڵەکەی سەرف ناکات لە ڕێی خێرو چاکەدا، نە بۆخۆی، نە بۆ ئەوانەی کە نەفەقەیانی لەسەرە، نە بۆ خەڵك، ئەوە دیارە بەهۆی وەسوەسەو دنەدانی شەیتانەوە، ئەو ڕژدییو چرووکییەی تێدا هاتۆتە دی.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: ﴿ وَمَاذَا عَلَيۡهِمۡ لَوۡ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ ﴾، مانای ڕواڵەتیی ئەم ڕستە قورئانییە ئاوایە، دەفەرمویّ: چی دەبوو ئەگەر ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناباو، لەوەی کە خوا پێی داون، بەخشیبایان؟! واتە: پێچەوانەی ئەوە سەیرە: ئەوە کە ئینسان ئیمان نەهێنیّ، بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە ماڵی خۆی لە پێناوی خوادا نەبەخشیّ، بەوانەی کە شایستەن پێیان ببەخشریّ!! ئەم ئایەتە قورئانییە سیّ ڕاستی گرنگی لیّ وەردەگیرێن:

**یەکەم:** کافربوون سەرچاوەی ڕژدییو چرووکیی یە، بێبڕوایی (کُفر) لەگەڵ ڕژدیی (بُخل) لێك نزیکن، بەڵیّ بێبڕوایی بە خوا، لەگەڵ چرووکییو ڕژدییو نەبەخشین بە خەڵکی، لێك نزیکن، بۆیە خوای زاناو شارەزاش لە قورئاندا زۆرجار تەقواو ئیحسانی پێکەوە باسکردوون، دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨ ﴾النحل، واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانە دایە پارێز لە خوا دەکەن، وە چاکە دەکەنو لەگەڵ خەڵکی خوادا چاکەکارن، تەقواو ئیحسان زۆر پێکەوە دێن، دیارە کوفرو چرووکییو ڕژدیش پێکەوە تێکهەڵکێشن، ئینسان ئەگەر ئیمانی بە خوا نەبوو، چ شتێك پاڵی پێوە دەنیّ ببەخشیّ؟ کە ئیمانی بە دوارۆژ نەبوو چاوەڕێی ئەوەی نەکرد، خوا پاداشتی بداتەوە، هاندەری نابیّ، وە کاتێك کە ئینسان ئیمانی نەبوو بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ڕەحمو بەزەییشی بەرانبەر بە خەڵکی خوا نابیّ، وە چاوەڕوانیشی نابیّ کە خوا پاداشتی بداتەوە، تاکو هانی بدات بۆ بەخشین.

**دووەم**: ئەم ئایەتە قورئانییە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە کافر بوونو چرووکییو ڕژدیی، دوو شتی زۆر بێ ماناو نامەنتیقیین، ئاخر ئینسان بۆ دەبێ کافربێ، کە خوا خاوەنیەتی، بەدیهێنەریەتی !! ئایا تۆ خۆت خۆت دروست کردوە؟ نەخێر، ئەدی کێی دیکە تۆی هێناوەتە دی، بێجگە لە خوای بەدیهێنەر؟ وە خوای بەدیهێنەر بۆخۆی دەفەرموێ:

﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الطور، واتە: ئایا بەبێ بەدیهێنەر پەیداکراون؟ یاخود خۆیان خۆیان پەیدا کردوە؟ واتە: دوو ئەگەر هەن، هەردووکیان پێچەوانەی بەڵگەنەویستەکانی عەقڵن، ئینسان خۆی خۆی پەیدا نەکردوە، بەبێ پەیداکەریش پەیدانەبووە، چونکە هیچ شوێنەوارێك بەبێ کەسێك کە ئەو شوێنەوارەی بەجێهێشتبێ، نیە، ئەوە یاسای هۆکاریی (قانون السببيَّة) وادەڵێ، هەموو پەیدابوویەك پەیداکەرێکی هەیە، هەموو شوێنەوارێك شوێنەوار جێهێڵەرێکی هەیە، ئەوە شتێکی مەنتیقیە[1]، وە پاشان چرووکییو ڕژدییش وەختێك خوا ئەوەی بە تۆی داوە، ئەو ماڵە لە دەستی تۆدا سپاردەیە، بۆ دەبێ نەیگەیەنی بە خاوەنەکانی خۆی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ...﴿٥٨﴾ ﴾ النساء، واتە: خوا فەرمانتان پێدەکات سپاردەکان بگەیەننە خاوەنی خۆیان، جا ئەو سپاردەیە سپاردنی بەرپرسیارێتی بێ بەرانبەر خەڵکی، ماڵو سامان بێ، کە ئەویش ئەمانەتە لەدەستی ئینساندا، دەبێ بیدا بە کەسانێك کە پێویستییان پێیەتی.

**سێیەم**: هەروەها ئەم ئایەتە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە ئینسان دەتوانێ بڕوابێنێو بەخشەریش بێ، کەواتە: ئەوانەی کە دەڵێن: ئینسان دوای ئەوەی کە کافرە بووە، تازە ناتوانێ ئیمان بێنێ، یان ئەو کەسەی کە

١) لە کتێبی (خواناسیی، ئایین، ئیمان)و بەرگی دووەمی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا بەدرێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

چرووكو ڕژدە، یان سیفەتێکی خراپی هەیە ناتوانێ بیگۆڕێ، وانیە، چونکە خوای کاربەجێ گلەیی دەکات دەفەرموێ: ﴿... وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقَهُمُ اللَّهُ ...﴾، واتە: چی دەبوو ئەگەر ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناباو، لەوەی کە خوا پێی داون بەخشیبایان ؟! کەواتە: دیارە دەتوانن بۆیە خوا گلەییان لێ دەکات، چونکە بۆ زانیارییتان کاتی خۆی کەسانێك بوون گوتوویانە: خوای زاڵو مەزن ئەوەی کە بە کافریی خوڵقاندوویەتی، ئەوە هەر کافرە، وە ئەوەی کە بە ئیماندار خوڵقاندوویەتی هەر ئیماندارە، نە کافر دەتوانێ ئیمان بێنێ، وە نە ئیماندار دەتوانێ کافربێ ! بەتایبەتی ئەوانەی کە ویستوویانە ئیرادەو ویستی خوای پەروەردگار بکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ناتوانن ئیمان بێنن، وەك دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا ءَابَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ...(١٤٨)﴾الأنعام، واتە: ئەوانەی کە هاوبەش بۆ خوا دانەرن دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمەو نە بابو باپیرانمان هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەنا، وە هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە قەدەغەیان بکەین، واتە: خوای بەرز ئەوەی پێکردووین !! بەڵام ئەم ئایەتە ئەو جۆرە فیکرانە بە درۆ دەخاتەوە، کە نەخێر، وانیە، وە لەڕاستییدا خوای دادگەر بۆیە بە کافران دەفەرموێ: ئیمان بێننو پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، تاکو خەڵك بانگ بکەن بۆ ئیمانو ئیمان بێنن، چونکە ئینسان دەتوانێ ئیمان بێنێ، وە بۆیە گلەیی لە خەڵك دەکات، کە چرووکییو ڕژدیی دەکەنو دەفەرموێ: ماڵ ببەخشن، دیارە ئینسان لە توانای دایە چرووكو ڕژد نەبێ، سەخییو بەخشندەبێ.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ

ذَرَّةٍ ﴾، واتە: بێگومان خوا بە قەدەر گرانایی زەڕڕەیەك ستەم ناكات، (ذرّة) یانی چی؟ لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (نَملةٌ حميراءُ صَغيرة)، واتە: مێرووڵەیەکی سووری بچووکە، مێرووی سووری گچکە کە لە وڵاتی ئێمەشدا هەیە، کە زۆر وردە، ئەوە پێی گوتراوە: (ذرّة)، هەروەها بەو تیشکەی خۆر دەگوترێ (ذرّة) کە لە پەنجەرەیەکەوە دێتە ژوورێ، شتی ورد ورد دێتە بەرچاو، کە ئەگەر بە هۆی تیشکە خۆرەکەوە نەبێ کە تیشکی خۆر لێی دەداو عەکسی دەکاتەوە، نابینرێ، کە پێی دەگوترێ: (هَبآء) ئەوەی کە زۆر وردە بەوەش گوتراوە (ذرّة)، ئێستا بەچی دەگوترێ: (ذرّة)؟ مادده لە کۆمەڵێك (مۆلکۆل) پێکدێ، بە عەرەبی (جُزَئ)و بە کوردی (گەرد) وە هەر گەردێك لە کۆمەڵە گەریلەیەك پێکدێ، گەردیلەش لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێ، ئەلیکترۆنو پرۆتۆنو نیوترۆن، کە بە تەئکید ئەوەی خوا فەرموویەتی، ئەوەش دەگرێتەوە، ئەوانی دیکەش دەگرێتەوە، واتە: خوای بەدیهێنەر چ شتێك لەلای ئێوە زۆر بچووكو وردە، بە قەدەر ئەوەندەش ستەم ناکات لە کاتی سزاداندا.

**مەسەلەی چواردەیەم**: کە خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾، چی دەبێ ؟ واتە: شتێکی زۆر جێی سەرسووڕمان دەبێو زۆر جێی سەرجو تەماشا دەبێ، کاتێك کە لە هەر کۆمەڵێك چاودێرو شایەدێك دێنین بەسەریانەوە، وە تۆشمان هێنا وەك شایەد بەسەر ئەوانەوە، ئەوانە کێن؟ ئۆممەتی پێغەمبەرن ﷺ، وە ﴿ كُلِّ أُمَّةٍ ﴾یش، کێنە؟ ئۆممەتانی پێش ئۆممەتی ئێمەن، واتە: خوای بەرزو مەزن پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دێنێ بۆئەوەی چاودێرو شایەدبن بەسەر ئۆممەتەکانیانەوە، پێغەمبەری کۆتایی (موحەممەد)یش دێنێ چاودێرو شایەد بێ بەسەر ئۆممەتی خۆیەوە، وەك لە

سـووڕەتی (النحـل) ئایـەتی (٨٩)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ...(٨٩) ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە لـە هـەر ئۆممەتێـك شایەدێك، چاودێرێـك دێـنین لە خۆیان، وە تۆشـمان هێنـا شایەدو چاودێربی بەسـەر ئەوانـەوە، هەروەهـا پێغـەمبـەر عیسـا سـەلامی خـوای لەسـەربێ، لـە سووڕەتی (الـمائدة) لە ئایـەتی (١١٧)دا لە قیـامەتدا بە خـوای بـەرز دەفـەرموێ:

﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (١١٧) ﴾، واتە: مـن بەسـەریانەوە چاودێـر بـووم، تاکـو لـە نێویـاندا بـووم، بـەڵام دوای ئـەوەی کـە منــت مرانــد، لــەو کاتــەوە تـۆ بەسـەریانەوە چاودێری، مـن ئاگادار نەبووم دوایی چییـان کـردوە.

دەربــارەی ئـەم ئایەتــە موبـاڕەکـە، ئـەم فەرمووده‌یـە گێڕدراوەتـەوە: «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اقْرَأْ عَلَيَّ سُورَةَ النِّسَاءِ» . قَالَ قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي، قَالَ: فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ حَتَّى إِذَا انْتَهَيْتُ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾، الآيَـةَ حَسْبُكَ الآنَ، فَرَفَعْتُ رَأسِي فَإِذَا عَيْنَاهُ تَهمِلانِ»، أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٢٥٥٨٠)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٨٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٧٢٣)، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغـەمبەری خوا ﷺ پێی فـەرمووم: قورئـانم بەسـەردا بخوێنـە، دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغـەمبەری خـوا ! ﷺ مـن بەسـە تۆدا بخوێنـم کە بەسـەر تـۆدا دابەزێنـراوە؟! فـەرمووی: بـەڵێ، حـەز

دەکەم گوێم لـێ بێ لە غەیری خۆمـەوە، دەڵـێ: سـوورەتی (النسـاء)م بەسـەردا خوێنـد، تا گەیـشـتمە ئـەو ئایــەتە کـە دەفــەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾، دەڵـێ: فـەرمووی: ئێسـتا بەسـە، ئنجـا تەماشـام کـرد فرمێسـك لـە چاوەکـانیدا دەهاتـە خـوارێ، چونکـە پێغـەمبـەری خــوا ﷺ ئـەم دیمـەنـــەی قیـــامەت کـە خـــوای بـەرز هـەواڵی پێـداوە زانیویەتی ئەوە دێتە جێ، وە هەموو ئیمانداریێکیش دەبێ بـڕوای وابـێ، سـەدا سـەد کە ئەو مەشـهەدو دیمەنـە دێتـە دی.

**مەســـەلەی پـازدەیـــەم:** کـە خـــوای بـــێ هـاوتــا دەفــەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾، ئـــەو ڕۆژە کە پێغـەمبەران دەهێنـرین بەسـەر ئۆممەتەکانیـانەوە چاودێرو بەڵـگەو شــایەدن، دەفەرمــوێ: ئەوانــەی بێبــڕوان سـەرپێـچییان لـە پێغەمبـەر کـردوە، خۆزگـە دەخـوازن لەگـەڵ خاکـدا یەکسـان بکـرێن، وە هـیـچ شـتێك لـە خـوا ناشــارنەوە، ئـەم ئایـەتە وەك ئـەو ئایەتــەی ژمـارە (٤٠)ی ســوورەتی (النبــأ) وایــە، کـە دەفـەرموێ: ﴿ ... يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژەی کـە هـەر کەسـە تەماشـا دەکـات دەسـتەکانی چییـان پێشخسـتوەو، چییــان ئەنجــامداوە، وە ئینسـانی بێبــڕوا دەڵـێ: خۆزگـە گڵ بوومـایە، جـا هەندێـك لـە زانایـان دەڵـێن: کـە کافرەکـان دەبینـن دڕنـدەو ژیـــانداران ئەوانـــیش حیـــسابو کتابیـــان لەگـەڵــدا دەکــرێ، بــەڵام دوایــی دەبنـــەوە بــە خـــاك، ئەویــش دەڵــێ: خۆزگـە منـیش ئـاوا وەك ئـەو ئـاژەڵو ژیانـدارانە بوومـایەو ئینسان نەبوومـایە، بۆئـەوەی منـیش لەگـەڵ ئەوانـدا بـوو بوومایـە بـە خـاك، بۆئـەوەی ئێـسـتا تووشـی سـزا نەبوومــایە، یـەکێك لێـرەدا بـۆی هەیـە بپرسـێ: ئایـا چۆن لێـرەدا خـوا دەفـەرموێ: کـافران هـیـچ لـە خـوا

ناشارنەوە، کەچی لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأنعام، لە وەڵامدا دەڵێین: لە شوێنی دیکەدا باس دەکات کە کافران نکووڵیی دەکەن لەوەی کە کردوویانە، ئێمە دەڵێین: لە حاڵێکدا هیچ ناشارنەوە کە ئەندامەکانی جەستەیان لەسەریان دەبنە بەڵگەو شایەد، بەڵام لە حاڵێکی دیکەدا ئەوەندەی بۆیان بکرێ دەیشارنەوەو نکووڵیی لێ دەکەن، کە پێیان وایە بە شاردنەوەی دەربازیان دەبێ، بەڵام دوای ئەوەی کە ئەندامەکانی خۆیان لەسەریان دەبن بە بەڵگەو شایەدو خوای پەروەردگار بە دیکۆمێنتیی هەموو شتێکیان دەخاتەوە بەرچاوو، دەزانن شاردنەوەو نکووڵیی کردن سوودی نیە، ئەو کاتە هیچ شتێك لە خوا ناشارنەوە، دانیش بە هەموو شتێکدا دێنن، کەواتە: ئایەتەکان پێکەوە تێکناگیرێن، بەڵکو ئایەتێك مەبەست پێی حاڵەتێکە، وە ئایەتێکی دیکە مەبەست پێی حاڵەتێکی دیکەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یەك (١) ئایەت لە سوورەتی (النساء) پێكدێ، كە ئایەتی ژمارە: (٤٣)یە، خوای زاناو شارەزا بۆ جاری سێیەم لەم سوورەتەدا بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان دەكاتو دەیاندوێنێ، وە فەرمانیان پێدەكات كە بەسەر خۆشیی توخنی نوێژ نەكەون، هەتا بەریان دەداو دەزانن چی دەڵێن، هەروەها لێیان قەدەغە دەكات، كە بە لەش پیسیی نوێژ بكەن، یاخود بچنە مزگەوت، كە شوێنی نوێژ كردنە، مەگەر بەرێوەو لە رێگادابن، كە ئەوكاتە بۆیان هەیە خۆنەشۆن، بەڵام دەبێ تەیەمموم بكەن، یاخود ئەگەر بە مزگەوتێكدا تێپەربن بەڵام تێیدا نەمێننەوە، بۆیان هەیە، پاشان پێیان دەفەرموێ: ئەگەر نەخۆش بوون، یاخود لە سەرفەر بوون، یاخود تارەتتان گرتبوو، یان لەگەڵ ژنەكانتاندا جووتبوو بوون، وە ئاوتان چنگ نەكەوت بە رووی پاكی خاكو زەوی تەیەمموم بكەن، دەست بەرووو بە هەردوو دەستییاندا بێنن، وە پاشان رایدەگەیەنێ كە خوا لێبوردەی بەخشندەیە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ ﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بـە سـەرخۆشـیی توخـنی نوێـژ مەکـەون هەتـا (بەرتـان دەداو) دەزانـن چـی دەڵـێن، هەروەهـا بـە لـەش پیـسییش (نوێـژ مەکـەن) هەتـا خۆتـان دەشـۆرن، مەگـەر بـە ڕێگـا بڕینـەوە بـن، وە ئەگـەر نەخۆشبوون، یان لـە سـەفەرێ بـوون، یـان تارەتتـان گـرت، یـان دەسـتتان گەیانـدە ژنـان (چوونە لایـان)، وە ئاوتـان چنـگ نەکـەوت، ڕووی خاکێکـی پـاك بکـەنە ئامـانج (تەیـەممـوم بکـەن)و دەسـت بـەڕوو و دەسـتتاندا بێـنن، بێگـومان خـوا لێبـوردەی بەخشندەیە ﴿٤٣﴾)).

## شـیکـردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەکان

(سُكَٰرَىٰ ): کـۆی (سَكْرَانَ)ە، (سَكْرَانَ) واتـە: سـەرخۆش، جا سەرخۆشـیی یانی چی؟ (السُّكْرُ: حَـالَةٌ تَعْرِضُ بَيْنَ الْمَـرْءِ وَعَقْلِـهِ)، واتـە: (سُكْر) حاڵەتێکـە کە ئینسان عەقڵو هۆشی لای خۆی نەمێنـێ، عەقڵی ئیش ناکات.

(جُنُبًا ): (جَنُـبَ وأَجْنَـبَ واجْتَـنَبَ وَتَجَـنَّبَ: أصَابَتـهُ الْجَنَـابَـةُ لِكَوْنِهـا سَـبَبَاً لِتَجَنُّبِ الصَّلاَةِ)، وشەی: (جُنُبْ) واتە: لەش پیسیی، یانی: بێدەسـتنوێژیی گـەورە، لـە زاراوی شـەرعیدا دەڵـێن: (الحَدَثُ الأصْغَر، وَالـحَدَثُ الأكْبَـر) واتـە: بێ دەستنوێژیی گچکەو بێ دەستنوێژیی گەورە، کە بێدەسـتنوێژیی گـچکە ئەوەیـە کـە ئینـسان هـەر دەسـتنوێژی نەبـێ، بـێ دەسـتنوێژیی گەورەش ئەوەیە کە ئینسان لەشـی پـیس بـێ، واتـە: خۆشـۆردنی لەسـەربێ، جا لە زمانی عەرەبیدا (جُنُبَ) واتـە: لەشـی پیس بـوو، وە هـەروەهـا (أَجْنَبَ وَاجْتَنَبَ وَتَجَنَّبَ) واتـە: لەشی پیس بوو، واتە: خۆشۆردنی لەسـەر پێویسـت دەبێو لە نوێـژ دووردەکەوێتـەوە، بۆیـە پێـی دەگوتـرێ (جُنُب).

(ٱلۡغَآئِطِ ): (الغَـائِطُ: الـمَكَانُ الـمُنْخَفِض مِـنَ الأرْضِ، وَجَمْعُـهُ أغْـوَاط وَغِيطَـان، كِنَايَةٌ عَنِ البِـرازِ)، وشـەی: (غَـائِط) لـە ئەسـڵدا بـە مانـای شـوێنی نـزم دێ لەسـەر زەوی، کـە بـە (أغْـوَاط وَغِيطَـان) کۆدەکرێتـەوە، بـەڵام کینایەیـە بـۆ پاشـەڕۆکی ئینسـان، بۆچـی؟ چـونکە ئەوکاتـە کـە تارەتیـان گرتـوە، بـە زۆریـی وابـووە، چـوونە شـوێنی نـەدیوو شـوێنی نـزم، بۆئـەوەی لـە چـاوی خـەڵك دیـارنەبن، جـا ئەگـەر سـەرنجی قورئـان بـدەین دەبیـنین خـوای پـەروەردگار هەرگیـز وشـەیەك بەکارناهێنـێ کە زەق بـێ، بۆ وێنـە: لە جیاتی جووتبـوون (جِمَاع) وشـەی: (الرَّفَث)ی بەکارهێنـاوە، ﴿ أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡۚ ...﴿١٨٧﴾ ﴾، وە وشـەی: ﴿ ... لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴿٦﴾ ﴾ الـمائدة، ی بەکارهێنـاوە، واتـە: دەسـتتان گەیانـدە خێزانـەکانتان، وە وشـەی (أَفْضى)ی بەکارهێنـاوە: ﴿ ... وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ...﴿٢١﴾ ﴾ النسـاء، واتـە: هەندێکـتان چـوونە لای هەندێکـتان، وە وشـەی: ﴿ تُبَٰشِرُوهُنَّ ﴾ی بەکارهێنـاوە، واتـە: پێـستتان بـە پێـستیان بکـەوێ، کـە هـەموویان تەعبیـرو وشـەی زۆر بـە ئـەدەبو زۆر بـە نەزاکـەتن، بۆئـەوەی ئـەو کـارە جینـسییەی نێوان ژنو پیـاو بەڕاشکاویی باسـی نەکـرێ، بۆیە عەبدوڵـڵای کوڕی عەببـاس کـە دەفـەرموێ: (إنَّ اللَّـهَ كَرِيْمٌ يُكَـنِّي) واتـە: خـوا سـبحانه و تعالـی کـەریمو بـەڕێزە، بۆیـە بـە کینایـەو بـە ڕەمـزو هێمـا باسـی هەنـدێك شـت دەکـات، کـە ناشیـرینە بە زەقیی بـاس بکـرێ، بە گوێرەی عـورفو بـاوی خـەڵك، کەواتـە: ئێمەش دەبـێ هەروابینو تەعبیـری بەڕێزو وشـەی بـە نەزاکەت بەکاربێـنین، بۆ ئەو شتانەی کە ناشیـرینە بە زەقـیی باس بکـرێن.

ئێـستا لـە عـورفی زمـانی عەرەبیـدا (غـائِط) واتـە: پیـسایی، بـەڵام لەڕاسـتییدا وشـەی: (غَائِط) لە ئەسڵی زمـانی عەرەبیـدا بـەمانای شوێنی نـزم دێ، ئەو شـوێنەی خـەڵك چوون لەوێ دەستیان بە ئاو گەیـاندوە.

(﴿لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾): (اللَّمْسُ إِدْرَاكٌ بِظَاهِرِ البَشْرَةِ، كَالْمَسِّ وَيُكَنَّى بِهِ وَبِالمُلامَسَةِ عَنِ الجِمَاعِ) وشەی: (لَمْس) ئەوەیە کە بە پێستی دەست دەست لە شتێك بدەی، (مَسٌّ وَلَمْس) یەك واتایان هەیە، واتە: دەست لە شتێك دان، بەڵام کینایەو (لەبەر ڕاهاوێشتن)ن، لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: لەبەری ڕاهاوێشت، یان (کنارە)ی پێ دەڵێن، واتە: وشەیەکی بەکارهێنا کە ڕاست ئەو واتایە ناگەیەنێ، بەڵام لە پەنا ڕا بۆی دەچێ، جا ئەوانە هەموویان بۆچی بەکارهاتوون؟ بۆ پێکەوە جووتبوونی (جِمَاع)ی ژنو مێرد، کەواتە: ﴿... لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ...﴿٦﴾﴾، واتە: لەگەڵ ژنەکانتان جووتبوون، هەندێکیشیان (لامَسْتُم)- کە دیارە بە (لَمَسْتُم)یش خوێندراوەتەوە - وایان لێکداوەتەوە واتە: دەستتان لێیاندا، دەستتان بە دەستی یەکدی کەوت، بەڵام ئەم واتایە ڕاست نیە، وەك دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا.

(﴿فَتَيَمَّمُواْ﴾): لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (يَمَّمَتُ كَذَا وَتَيَمَّمتُهُ: قَصَدتُهُ)، واتە: ئەو شتەم کردە ئامانج، (ثُمَّ صَارَ عُرْفَاً مَعْنَىً لِلْمَسْحِ بِالتُّرَابِ وَنَحْوِهِ) دوایی بەپێی باوی خەڵك تەیەمموم کراوە بە واتا، بۆئەوە کە ئینسان دەستی بە گڵ دابێنێتو دەموچاوو هەردووك دەستی خۆی پێ بسرێو، پێی مەسح بکات، واتە: وەك عورفو باو وای لێهاتوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴿٤٣﴾﴾، مانایەکەی وانیە، بۆیەش من گوتوومە: ڕووی خاکێکی پاك بکەنە ئامانج، ئەوە ڕاست مانای ئایەتەکەیە، بەڵام لەنێو کەوانەدا گوتوومە (واتە: تەیەمموم بکەن)، بۆیە تەماشا دەکەی زۆرجار خەڵك واتا ئەسڵییە قورئانییەکەی لەبیرچۆتەوەو واتایەکی دیکەیان بۆ بەکارهێناوە، بە پێی عورفو باوی خەڵك، بۆ وێنە: وشەی: (دُبُر) لە قورئاندا واتە: پشت، ئیدی دوایی خەڵك واتایەکی دیکەی بۆ لێکداوەتەوە بە هۆی عورفو باوەوە، ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە خوا لە

قورئـانـدا چـۆن دەفـەرموێ: ﴿...فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾﴾الأنفال، كە (دُبُر) لە زمانی عەرەبی باودا، ئێستا بە پاشی ئینسان دەگوترێ، كە پاشەڕۆكی لێ دێتەدەر، لەوانەیە كەسێك پێی سەیربێ ! بڵێ: چۆن لە قورئـاندا ئەم وشەیە بەكارهاتوە، بەڵام نا، خۆی وشەی: (دُبُر) یانی پشتەوەی ئینسان، نەك ئەندامێكی تایبەت.

(صَعِيدًا): (الصَّعِيدُ: وَجْهُ الأَرْضِ، وأَصْلُ الصُّعُودِ: الذهَابُ فِي المَكَانِ العَالِي..) (صَعِيد)، واتە: ڕووی زەوی، ڕووی خاك (صُعُود) واتە: بەرزبوونەوە، ئنجا بۆچی بە ڕووی خاك دەگوترێ: (صَعِيد) چونكە بەرزبۆتەوە لە ئاستی زەوی.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەكەی كە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾﴾، كە پێشتر ماناكەیمان گوت، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! نزیكی نوێژ مەكەون، لە حاڵێكدا كە ئێوە سەرخۆشن، هەتاكو دەزانن چی دەڵێن، واتە: تاكو سەرخۆشیی بەرتان دەدا، دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەكەی چەند بەسەرهاتێك گێڕدراونەوە، كە ئەمەیان لە ڕووی سەنەدەوە لە هەموویان ڕاستترە: ﴿عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: صَنَعَ لَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ طَعَامًا، فَدَعَانَا وَسَقَانَا مِنَ الخَمْرِ، فَأَخَذَتِ الْخَمْرُ مِنَّا وَحَضَرَتِ الصَّلاةُ، فَقَدَّمُونِي فَقَرَأْتُ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ لا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ﴾ قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾﴾﴾، أَخْرَجَهُ أَبُو

دَاوُدَ بـرقم: (٣٦٧١)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٠٢٦)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٧٢٢٢)، واتـه: عەلی کـوڕی ئـەبی طـالیـب خـوا لێی ڕازی بـێ، دەڵێ: عەبـدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف خواردنێکی بـۆ سـاز کردیـن، (واتـه: دەعـوەتی کـردین، بـانگی کـردین)و شـەڕابیـشی دایـنـێ (ئـەو کـاتە شـەڕاب قەدەغـە نەکـرابوو) مـەی مەسـتی کـردینو عەقـڵی لابـردین، (کـە مـرۆڤ سـەرخۆش بـوو عـەقڵی ئـیش ناکـات)، وە نوێژیش ئامادە بوو، منیـان پێش خسـت، ئـەو ئایەتانـەم خوێنـدەوە ((سـووڕەتی والکافرون))ی خوێنـدەوەو (دوایـی ئەوەندەشـی گوتـوە) ئـەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن ئێمـەش دەیپـەرستین ئـەی کافرەکـان، (دیـارە ئـەوەش کـوفرە) ئیـدی خـوای بـەرز ئـەم ئایـەتەی نـاردە خـوار، کـە دەفـەرموێ: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە ! بە سـەرخۆشیی نوێژێ مەکەن، هەتاکو دەزانن چی دەڵێن.

ئنجا دیارە شیعە زۆر قەڵسن بە ڕیوایەتـکردنی ئـەم فەرموودەیـەو دەڵـێن: ئەمـە ڕاسـت نیـە، چونکـە عەلـی کـوڕی ئـەبی طـالـیب خـوا لـێی ڕازی بـێ، پێـش قەدەغـەکرانی شـەڕابیش شـەڕابی نەخواردۆتـەوە، بـەڵام بەڕاستی ئـەو قسانە هیـچ نیـن، هاوەڵانی بـەڕێز خوا لێیـان ڕازی بـێ، پـێش ئـەوەی خـوای پەروەردگار شـتێکیان لـێ قەدەغە بکات، ئەگـەر کردبـێتیـان زۆر ئاسایی بـووەو وەك باقی شـتەکانی دیکە وابووە، لەبەرئەوە هیچ نوقسانیی نیە، نـە بـۆ عەلـیو نـە بـۆ عەبـدوڕڕەحمانو نـە بـۆ ئەگـەر ئـەبو بـەکر و عومـەریش بـووبن، هـەر کەسێك بووبـێ، شتێك کە خوا قەدەغەی نەکردبـێ، کردبـێتیان، لەبەرئەوە هـیچ هەسـتیاریی نـاوێ، شـتێك مـادام بـە ڕێیـەکی ڕاسـتدا پێمـان گەیـشتبـێ، دەبـێ وەریبگـریـن.

٢) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ڕسـتە قورئانییـە کـە دەفەرموێ: ﴿... وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾﴾، دەربـارەی هـۆی هاتنـە خـواری ئـەم ئایـەتە کـە پێـی دەگوتـرێ: ئایـەتی

تەیەممموم، یەکەم ئایەتێك كە دابەزیوە دەربارەی (تەیەممموم) ئەمەیە، وە لە سوورەتی (المائدة)شدا باسی تەیەممموم هەیە، بەلاّم ئەوەی سوورەتی (المائدة) دوای ئەمەیە، ئەمەیان یەکەم ئایەتێك بووە، چونکە ئەمە بەدیلی خۆشۆردنی تێدایە، دیارە خۆشۆردن (واتە: لابردنی لەش پیسیی گەورە)یش لە پێش دەستنوێژ گرتندایە، كە لابردنی لەش پیسیی گچکەیە، ئنجا لەوێشدا باسی تەیەممموم دەکات، (ئایەتی ژمارە: ٦) كە دەبێتە بەدیل بۆ دەستنوێژ، وە بۆ خۆشۆردنیش، بەلاّم لێرەدا باسی تەیەممموم دەکات، وەك بەدیل بە پلەی یەکەم بۆ بێ دەستنوێژیی گەورە، وە لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ، – أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ– انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ، فَقَالُوا: أَلا تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ، أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبِالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، وَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي، قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَالنَّاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ ، قَالَتْ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعَنُ بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلا يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلا مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى فَخِذِي، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَتَيَمَّمُوا، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ ؟ قَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ، فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣٤)، وَمسْلِمٌ برقم: (٨١٤)، والنَّسائيُّ برقم: (٣٠٩)، واتە: دایکمان عائیشە خێزانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێك لە سەفەرەکانی ڕۆیشتین، هەتاکو لە شوێنێك بووین بە ناوی (بەیداء) یاخود (ذات الجيش) (كە ناوی شوێنێکە)، ملوانکەیەك كە لە گەردنم دابوو پرژا

(كە لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە دەڵێ: هی ئەسمائی خوشكی بوو بە ئەمانەت وەریگرتوە) پێغەمبەر ﷺ كاروانەكەی ڕاگرت، بۆئەوەی كە ئەو گۆبەرۆكە (ملوانكەیە) بچن بیدۆزنەوە، (دیارە بەقیمەت بووە، یاخود بە ئەمانەت بووە، هی خۆی نەبووە) وە خەڵكیش لەگەڵی ڕاوەستان، وە لەسەر ئاو نەبوون، شوێنێك نەبوو ئاوی لێبێ، وە ئاویشیان پێ نەبوو، خەڵك چوونە لای ئەبو بەكر (خوا لێی ڕازی بێ، بابی عائیشە) گوتیان: تەماشا ناكەی عائیشە چی كرد؟ پێغەمبەری خوای لێرە ڕاگرتوە، خەڵكیشی لێرە ڕاگرتوە ئاویشیان پێ نیەو لەسەر ئاویش نین؟ (واتە: لەسەر ئاوو كانیو سەرچاوەی ڕووبارێك نین، وە ئاویشیان پێ نیە لە كوندەو مەشكەو ئەوانەدا هەڵیانگرتبێ بۆ خواردنەوەو دەست نوێژو ئەوانە)، (عائیشە خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی بێ زۆر سەرزەنشتی كردم، وە ئەوەی گوت كە خوا ویستی (دیارە قسەی پێگوتوە وەكو بابو كچ)، وە بە دەستی لە كەلەكەی دەدام، لە كەلەكەیەوە دەژنیم، (دیارە نوقرچكەی لێدەداو لێی توورە بووە) هیچ شتێ ڕێی لێ نەدەگرتم بجووڵێم، ئەوە نەبێ كە پێغەمبەر ﷺ سەری لەسەر ڕانم بوو، (دیارە پێغەمبەر ئەو كاتە خەوتوەو ماندوو بووە) پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت هەتا بەیانی بۆوە، وە ئاویشمان پێنەبوو، وە ئاویشی لێ نەبوو، ئیدی خوا ئایەتی تەیەمومی ناردە خوار، وە خەڵك تەیەمومی كرد {ئەوەی كە لەش پیسیی لەسەر بوو، ئەوەی كە بۆ دەستنوێژ، لە جیاتی دەستنوێژ (تەیەموم)یان كرد} ئوسەیدی كوڕی حوضەیر {كە یەكێكە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺو خەڵكی مەدینە بووەو لە پشتیوانەكان بووەو یەكێك بووە لەو دوازدە كەسەی كە پێغەمبەر ﷺ لە بەیعەی دووەمی عەقەبەدا، كردنی بە سەرپەرشتیار بەسەر ئەوانەی دیكەوە كە (٧٣) كەس بوون، (٧١)ی پیاوو، دوو ئافرەت، وە (١٢)ی نەقیبی تێدا هەڵبژاردن، یەكێك لەو نەقیبانە ئوسەیدی كوڕی حوضەیر بوو دەڵێ} : ئەو گوتی: ئەوە یەكەمین خێرو بەرەكەتو بەرهەمی ئێوە نیە، ئەی بنەماڵەی ئەبو بەكر! (واتە: بە هۆی ئێوەوە كە تۆ ئەو ملوانكەیەت لێ ون بووە، ئێمەش ئاومان پێ نەبووە، خوای

پەروەردگار مۆڵەتی داین، کە لەمەودوا لە هەر شوێنێکی دیکە ئاومان نەبوو تەیەممووم بکەین، ئەوە بەهۆی ئەو شتەی تۆوە بوو، ئەوە بەرەکەتی ئێوە بوو ئەی بنەماڵەی ئەبو بەکر) عائیشە دەڵێ: دوایی ئەو حوشترەی کە من لەسەری بووم، (واتە: کەژاوەکەی ئەوی لەسەر بووە) هەڵمانستاند، تەماشامانکرد ملوانکەکەش هەر لەبن حوشترەکەیە، (دیارە کە لێی کەوتووە، کەوتۆتە بن حوشترەکەیەوە).

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ بۆ جاری سێیەم لێرەدا مسوڵمانان دەدوێنێ بە نازناوی ئیمان، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! دیارە وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی، وە هی دیکەش لە زانایانی پێشوو گوتوویانە: هەرکاتێك گوێت لێبوو خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! گوێ قوڵاغ بەو، باش گوێ بگرە ! چونکە دڵنیابە خوا ﷻ شتێکی چاکە پێت دەفەرموێ: بیکە، یاخود شتێکی خراپە بێت دەفەرموێ مەیکە، وە ئەگەر سەرنج بدەن لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە خوا بە ناوونیشانو نازناوی ئیمان، ئیمانداران دەدوێنێ مەگەر چۆن، دەنا یاساکانی شەریعەتیان پێ دەڵێ، یان دەفەرموێ: ئەو شتە حەڵاڵە، یان فەرزە بیکەن، یان دەفەرموێ: ئەو شتە قەدەغەیەو خۆتانی لێ بەدوور بگرن، هەمووی وایە، ئنجا ڕستەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد، تەنیا لە سوورەتە مەدەنییەکاندا هاتوە، چونکە لە مەدینەدا قەوارەی سیاسی بۆ مسوڵمانان دروست بوو، کۆمەڵگایان بۆ دروست بوو، دەوڵەتیان بۆ دروست بوو، وە شایستەی ئەوە بوون کە یاساکانی شەریعەتیان پێ بسپێررێ، تاکو جێبەجێیان بکەن، لە هەموو بوارەکانی ژیانو گوزەرانیاندا، لێرەشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ

ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! تـوخنی نوێـژێ مەکـەون لـە حاڵێکـدا کـە سـەرخۆشـن، واتـە: بـە سـەرخۆشـیی نوێـژێ مەکەن ﴿ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾، نوێـژێ مەکەن بـە سـەرخۆشـیی تـاکو بـەرتان دەدا، وە دەزانن چـی دەڵـێن، بۆچـی؟ چونکـە نوێـژ ڕازو نیـازە لەگـەڵ خوادا، گفتوگـۆیە لەگـەڵ خـوادا، تۆ دەبێ بزانی دەڵێی چی! بـەڵام مـرۆڤ سـەرخۆش بـێ، نەزانـێ بڵێ چی، یان وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد دەبینین ئایەتەکان بـە هەڵـە دەخوێنـێ، یـان دەبینـی کـوفری بـە دەمـدا دێ، ئـەوە مانـای وایـە لەسـەری قـەرزدار دەبێتـەوە، هەڵبەتـە وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکـاندا باسـی دەکـەین، زانـایان لەوە هـەڵیانهێنجاوە کە نـەك هـەر لە حاڵەتی سـەرخۆشـییدا، بەڵـکو لـەو حاڵەتەنەی دیکەشدا، کە ئینسـان لە حاڵەتێکی نائاسایی دایە، وەك ئەوە کە نـانـی لەپێش دانراوەو زۆری برسـییە، یـان ئـاوی لـە پێشـەو زۆری تینـوە، یـاخود زۆری خەو دێ، یاخود زۆر سـەغڵەتو تەنگاوە، یاخود جۆرە دیمەنێکـی لەبەرچـاوە کـە زۆر سـەرنجی ڕادەکێشـی، هەموو حەدیسـەکان دوایی دێنـین دەڵێن: لـە هـەموو ئـەو حاڵەتانەدا یان حەرامە نوێژ بکەی، یاخود بە لای کەمەوە شتێکی ناپەسندە، دیـارە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەندازەی سەرقاڵ بوونو، ئاگا لـەخۆ نـەمانتو، ئەنـدازەی ئـەوە کـە تـۆ بیـرو هۆشـت لـە شـوێنی خـۆی نەمێنـێ، تـاکو تەفـاعول لەگـەڵ نوێژەکـەتدا بکـەی، چونکـە نوێـژ ئینسان ئەگەر بیـری لـێ بکاتـەوە، بـە (اللَّـهُ أَكْبَـر) دەست پێدەکات، بە (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) کۆتـایی پێـدێ، ئەوە یانی چی؟ کە دەڵێ: (اللَّهُ أَكْبَر) واتە: خـوا لـە هـەموو شـتێك گـەورەترە، بـە هەموو مانای گەورەیی کە بۆ خوا شایستەیە، یانی: من ئەوە لەگەڵ خـوا دەسـتم بە وتووێژ کرد، دەستم بەو عیبادەت و طاعـەتە کـرد کـە نوێـژە، کـە گـەورەترین جۆری عیبادەتە، تەواو دەسـتم لـە هـەموو شـتێك بـەردا، ئـەو (اللَّـهُ أَكْبَـر)ە، پێـی دەگـوترێ: (اللَّـهُ أَكْبَـر)ی (تَحْـرِيم) واتـە: دوای ئـەوە، تـۆ هـەموو شـتێکت لـێ قەدەغەیـە: قسـەکردن، خـواردن، خواردنـەوە، هـەموو شـتەکانی دیکـە، کـە لـە حاڵەتی ئاساییـدا بـۆت حەڵاڵـن، دوای دابەسـتنی نوێـژ هـەموویانت لـێ قەدەغـە

دەبن، پاش دوعای (إستفتاح) سوورەتی فاتیحە دەخوێنی، دوایی سوورەتێکی دیکە یان چەند ئایەتێك ، ئنجا دەچیە ڕکووع و هەڵدەستیەوەو، دەچیە سەجدەو تەحییات دەخوێنیو، دوایی لە کۆتایی نوێژەکەتدا سەلام دەدەیەوە، جا ئەوە یانی چی؟ یانی: تۆ لە سەفەرێك گەڕاویەوە، بۆیە گوتراوە: (الصَّلاةُ مِعْرَاجُ الْمُؤمِنِ) واتە: نوێژ پەیژەی ئینسانی ئیماندارە پێیدا سەر دەکەوێ بۆ لای خوا، ڕاستە نوێژ وەك (مِعْرَاج)ێك وایە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کە شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێکرا، بەرز بۆوەو بەرز بۆوە تا سڵاوی لە خوای پەروەردگار کردو، دوایی لە خزمەتی خوادا، خوای بەرز پێنج نوێژە فەرزەکانی لەسەر پێویست کردنو گفتوگۆی لەگەڵ کرا، دوایی گەڕایەوە، نوێژیش میعراجێکی بچووکە، تۆش بە (اللَّهُ أَكْبَر) دەست پێدەکەی، دوایی بەچی کۆتایی پێدێنی؟ (التَّحيَّات للَّهِ) سڵاو لە خوای پەروەردگار دەکەی، دوای ڕکووعو سەجدەو ڕازو نیاز، ئنجا لە خزمەت خوادا دادەنیشیو دەڵێی: (التَّحيَاتُ الْمُبَارَكَاتُ وَالصَّلوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ للَّهِ) هەموو ئەو وشانەی کە بۆ سڵاو بەکاردەهێنرێن، بەرەکەتن، پاکن، چاکن، بۆ خوا، واتە: تۆ سڵاو لە خوای پەروەردگار دەکەی لە خزمەتیدا دادەنیشی، دوایی سڵاو لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەکەیو شایەتمان دێنیو سەڵەوات لە پێغەمبەر ﷺ دەدەیو دووعا دەکەی، ئنجا دوایی سەلام دەدەیەوە، کەواتە: ئەو شتانەی کە وادەکەن هۆشو زەین لەجێی خۆیدا نەبێ، دەبێ لابچن، ئنجا ئینسان بچێتە نێو نوێژەوە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنُبًا﴾، واتە: هەروەها توخنی نوێژ مەکەون، ئەگەر لەش پیس بوون، ئەگەر سەرخۆش بوون نوێژێ مەکەن، هەتا هۆشتان دێتەوە سەرخۆ، هەروەها ئەگەر لەش پیسیش بوون، دیسان نوێژ مەکەن ﴿إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾، مەگەر ڕێگە ببڕنو لە بڕینی ڕێگەدابن، هەتا خۆتان وەشۆن، واتە: ئەگەر لە بڕینی ڕێگا دابنو ڕێبوار بوون، بۆتان هەیە بەبێ ئەوەی خۆتان بشۆن، نوێژێ بکەن، بەڵام دەبێ تەیەممووم بکەن، جا تەیەممومەکە لە جیاتی دەستنوێژ بێ، یاخود لە جیاتی

خۆشۆردن بێ، واتە: چ بۆ لابردنی لەش پسیی گەورە بێ، چ بۆ لابردنی لەش پیسیی گچکە، کە بێدەستنوێژییە.

هەندێك لە توێژەرەوانیش ئەم ڕستەیان: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغۡتَسِلُواْ ﴾، ئاوا لێکداوەتەوە، واتە: وە بە لەش پیسیی نەچنە مزگەوت مەگەر پێیدا ڕەت بن، هەتا خۆتان دەشۆن، واتە: ﴿ عَابِرِي سَبِيلٍ ﴾، واتە: مەگەر ڕێبواربن‌و مزگەوتەکە دوو دەرگای هەبن، بە دەرگایەکیاندا بڕۆی‌و لەویدیکە بچیە دەرێ، لەو حاڵەتەدا بۆت هەیە، بە مزگەوتدا تێپەڕی بە لەش پیسیی !

بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، ئەم واتایەم زۆر پێ بەهێز نیەو ئەویدیکە بەهێزترە، کە بە سەرخۆشیی نوێژێ مەکەن‌و بە لەش پیسیی نوێژێ مەکەن، هەتاکو خۆتان دەشۆرن، مەگەر ڕێبواربن، ئەگەر ڕێبواربن قەیدێ ناکات، جارێ خۆتان نەشۆن‌و تەیەمموم بکەن، دوایی کە بۆتان دەگونجێ خۆتان بشۆن، چونکە خۆشۆردن لە سەفەرێ زەحمەتە، بە تایبەت کاتی خۆی، وە ئێستاش زۆرجاران هەروایە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا ﴾، خوا ﷻ چوار حاڵەتان باس دەکات، دەفەرموێ:

١/ ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون.

٢/ یان لە سەفەر بوون.

٣/ یان یەکێکتان لە تارەتگرتن دەهاتەوە، واتە: تارەتی گرتبوو.

٤/ یاخود چووبوونە لای ژنەکانتان، واتە: لەگەڵیان جووتبووبوون.

هەرچەندە ڕایەکیش هەیە دەڵێ: (لامَسْتُم) بە مانای دەستتان لێدان دێ، دیارە بە: (لَمَسْتُم)یش خوێندراوە، ئنجا ئەگەر (لَمَسْتُم) بێ، یان (لامَسْتُم)

بێ هەردووکیان، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: واتە: (جَامَعْتُم) لەگەڵیان جووتبوون، بەڵام ئیمام شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، وە هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی دەست لێدانە، کە لە ڕاستییدا مانا لێکدانەوەکەی ئەوان بەهێز نیە، وەك دوایی باسی دەکەین، وە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەریدەخەن کە پێغەمبەر ﷺ دەستیشی لە خێزانی داوە، یان خێزانی دەستی لێداوە، بەڵکو جاری وا بووە خێزانیشی ماچ کردوە، وە چووە نوێژیشی کردوە، بێئەوەی دەستنوێژی هەڵگرتبێتەوە، مانای وایە لێرەدا ناگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە ئەگەر دەستتان لە خێزانەکانتاندا، ئاویشتان دەستنەکەوت لەجیاتی ئاو بچن تەیەمموم بکەن، بۆچی؟ چونکە بە دەست لێدانی ئافرەت دەستنوێژ ناشکێ، تاکو لەجیاتی ئاو کە نەبوو، بچی تەیەمموم بکەی، بەڵکو مەبەست پێی جووتبوونو سەرجێیکردنە، جا دەفەرموێ: ئەگەر یەکێك لەو چوار حاڵەتەتان هەبوون: یان نەخۆش بوونو لەبەر نەخۆشیی نەتانتوانی ئاو بەکاربێنن، جاری وایە نەخۆشیی برینە، یاخود نەخۆشییەکەی وایە ئەگەر ئاو بەکاربێنێ، نەخۆشییەکەی خراپتر دەبێ، یان پێی دەمرێ، ئەوکاتە نابێ ئاو بەکاربینێ بەڵکو دەبێ لەجیاتی ئاو تەیەمموم بکات، ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾، واتە: لە سەفەرێ بوونو ئاوتان دەست نەکەوت، یاخود ئاو هەبوو، بەڵام بۆتان نەدەکرا کە خۆ بشۆرن، جاری وایە ئاویش هەیە، بەڵام لەنێو بەفرو سەرمایەکە، یاخود لە شوێنێکە، کە ئەگەر خۆی بشوات ڕەق دەبێتەوەو دەمرێ! وەك باسی دەکەین، عەمری کوڕی عاص خوا لێی ڕازی بێ، ڕووداوێکی وای لێ ڕوویداوە، ئاویش هەبووە، لەش پیسیی بەسەر هاتوەو خۆی نەشۆردوەو تەیەمموومی کردوە، ئنجا بە تەیەممومیش ئیمامەتیی بۆ هاوەڵان کردوە، وە دواییش پێغەمبەر ﷺ پێکەنیوەو ڕەخنەی لێ نەگرتوە، کەواتە: لە سەفەر بوون مانای وا نیە ئاو نەبێ، چونکە جاری وایە ئاویش هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی لە سەفەریو لە حاڵەتێکی نائاسایی دای، ناتوانی خۆت بشۆی، ئنجا دەفەرموێ:

﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾، یان یەکێکـان لـە شوێنی نـزم (تارەتـگرتن) هاتەوە، جا لە سەفەری بێ، یان لە ماڵێ بێ، یان لە هەر شوێنێك بێ، بەلاّم ئاونیەو دەستناکەوێ، ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، یاخود لەگەڵ ژنەکانتان جووتبوون، ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً﴾، ئاوتان دەستنەکەوت، بۆ هەموو ئەو چوار حاڵەتانە، ئەگەر ئاوتان چنگ نەکەوێ ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾، یانی: (فَاقْصَدوا صَعِيداً طَيِّبَاً) واتە: ڕووی خاك كە پاك بێ، بیکەنە ئامانج، (تەیەمموم)یش وەك زاراوەیەك ئەوەیە کە دەست لە زەوی بدەی، وە بە دەم و چاوتی دابێنی، وە بە هەردوو دەستتی دا بێنی، واتە: تەیەمموم بکەن بە ڕووی زەوی، یاخود لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان بە خۆڵی زەوی، ﴿فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾، وە دەست بێنن بە ڕووتاندا، وە بە هەردوو دەستتاندا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾، بێگومان خوا لێبووردەی بەخشندەیە، واتە: لە ئەنجامی لێبوردەییو بەزەیی خۆیدا مۆڵەتی داون کە ئەگەر ئاوتان چنگ نەکەوت، لە جیاتی ئەوە بە گڵ لەش پیسیی گەورەو لەش پیسیی گچکە، بێ دەستنوێژیی گەورەو بێ دەستنوێژیی گچکە لەسەر خۆتان لابەرن، بۆئەوەی هەمیشەو لە هەموو حاڵاندا نوێژەکانتان هەر بکەن، وە گەورەترین جۆری بەندایەتیی بۆ خوا کە نوێژە هەر ئەنجام بدەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

مەسەلەی یەکەم: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! نزیکی نوێژ مەکەون، لە کاتێکدا کە ئێوە سەرخۆشن، تاکو دەزانن چی دەڵێن، هەندێك گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی ژمارە: (٩٠)ی سوورەتی (المائدة) کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾، کە ئێمە پێشتر گوتوومانە: هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە مەنسووخ بێ، بەو واتا باوەی کە هەیە، واتە: حوکمەکەی لاچووبێ‌و کاری پێنەکرێ، بەڵکو زانایان وشەی نەسخیان بە چەمك‌و واتایەکی دی بەکارهێناوە، واتە: حوکمێك گشتی بووە، دوایی تایبەت کراوە، حوکمێك بە ڕەهایی هاتوە، دوایی بەنددار (مقیَّد) کراوە، حوکمێك ڕوون نەبووە، دوایی زیاتر ڕوونکراوەتەوە، بەلاّم بەو واتایەی کە حوکمێك لە قورئاندا هەبێ، ئێستا کاری پێنەکرێ‌و ئایەتێکی دیکە حوکمەکەی گۆڕی بێ، شتی وانیە، ئەدی ئەو دوو ئایەتە چۆن پێکەوە دەگونجێنین: ئەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة) لەگەڵ ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)؟ دەڵێین: ئێمە کاتی خۆی لەکاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (البقرة)دا، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَـٰفِعُ ...﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة، واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی شەڕاب‌و قومار، بفەرموو: گوناهێکی گەورەیان تێدایە، هەندێك سوودیش بۆ خەڵك، لەوێ باسمان کرد کە لەڕاستییدا لەبارەی قەدەغەکرانی شەڕابەوە چوار ئایەت هەن :

١/ یەكەمیـان لـە سـوورەتی (النحـل) دایـە، كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتـە: لـە بەروبـوومی خورمـاو تـرێ مـاددەی سـەرخۆشكەر دروسـت دەكـەن، لەگـەڵ ڕزقێـكی بـاش (واتـە: دۆشـاو مێـوژو باسووق)، كە مادام ئەوانە ڕزقی بـاش بـن، دیارە ماددەی سەرخۆشـكەر ڕزقی خراپـە، كە ئەمە یەكەم ئایەتە ئاماژەی قەدەغەبوونی شـەڕابی تێدایـە.

٢/ ئنجـا ئایەتی ژمارە (٢١٩)ی سوورەتی (البقرة).

٣/ دوایی ئایەتی (٤٣)ی (النساء).

٤/ ئنجـا لـە كۆتاییـدا ئایـەتی (٩٠)ی (الـمائدة)، هـەر هـەموویان دەربـارەی شـەڕابو قومـارن، بەڵام حوكمی كۆتایی قەدەغەبوونی شـەڕاب خواردنـەوە، لـە ئایـەتی ژمـارە (١٩٠، ١٩١)ی سـوورەتی (الـمائدة)دا هـاتوە، بـەڵام وە نەبـێ ئایەتـەكـانی دیكـەی نەسـخ كردبێتـەوە، لەبەرچـی؟ چونكـە لـە ئایـەتی سوورەتی (النحـل)دا خوای پەروەردگار هەواڵ دەداو دەفەرموێ: ﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾النحـل، واتـە: لـە بەروبـوومی خورمـاو تـرێ مـاددەی سەرخۆشـكەر دروست دەكـەن، لەگـەڵ كە شـەڕابو مەی ڕزقێكی باش، ئـەوە لێـرەدا خوای زانـاو شـارەزا تەنیـا هـەواڵی داوە، وە هەرواشـە خـەڵك هەیـە شـەڕابی لـێ دروسـت دەكـات، یـانی ئەوەنیـە خـوای زانـا بفـەرموێ: شـتێكی باشـە، بەڵـكو ئاماژەیـەكە بـەوەی ڕزقێـكی بـاش نیـە، چونكـە دەفـەرموێ: شـەڕابی لـێ دروسـت دەكـەن، لەگـەڵ ڕزقێـكی بـاش، مانای وایە شەڕاب ڕزقێكی باش نیـە، ئـەوە ئـاماژەیە، بـەڵام دیـارە ڕوون نیـە، تـا بڵـێی قەدەغەیـە، ئنجا ئـەوەی سـوورەتی (البقـرة) كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ

فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ ...﴿٢١٩﴾ ﴾، واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی شەڕابو قومار، بفەرموو: گوناهێکی گەورەیان تێدایە، هەندێك سوودیش بۆ خەڵك.

لێرەشدا دیسان بەس دەفەرموێ: گوناهێکی گەورەی تێدایەو هەندێك سوودیش بۆ خەڵکی، واتە: خەڵك بازرگانییان پێدەکات، کڕینو فرۆشتنیان پێدەکاتو، هەندێك سوودی مادديان پێدەگات، ئەوەش دیسان هەواڵدانێکە، ئنجا ئەوەی سووڕەتی (النساء) کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ئەی ئیمانداریینە ! توخنی نوێژێ مەکەون بە سەرخۆشیی، تاکو دەزانن چی دەڵێن، ئنجا وەنەبێ کە سووڕەتی (المائدة) هاتۆتە خوارێ، دوای ئەوە بە سەرخۆشیی نوێژکردن دروست بێ !! نوێژ بە سەرخۆشیی هەر دروست نیە، کەواتە: هەر لە شوێنی خۆیەتی، بەڵام ئایەتەکەی سووڕەتی (المائدة)، شتێکی زیادەی تێدایە، لە هەموو ئەوانەی پێشێ، وە ئەوانیش هەر لە شوێنی خۆیانن، بەڵام ئەوەی سووڕەتی (المائدة) شتێکی زیادەی تێدایە کە دەفەرموێ: مەی مەخۆنەوەو لێی دووربکەونەوە، نەك هەر نوێژ بە سەرخۆشیی مەکەن، بەڵکو لە غەیری کاتی نوێژیشدا مەیخۆنەوەو بە یەکجاریی دەستی لێ هەڵبگرن، ئنجا ئەو فەرمایشتەی کە پێشتریش هێناومانە لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا، ئەوەی گوتمان ڕوون دەکاتەوە: «عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيم الخَمْرِ، قَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الخَمْرِ بياناً شافِياً، فَنَزَلَت هذِهِ الآيةُ التي في البقَرة: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ ... ﴾البقرة، فَدُعِيَ عُمَر فَقُرِئَت عَلَيهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّن لَنَا فِي الخَمْرِ بياناً شَافِياً، فَنَزَلَت الآيةُ التي في النِسَاء: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...

﴿٤٣﴾ النساء، فكان مُنادي رَسُولَ اللّهِ ﷺ إذَا أقَامَ الصَّلاةَ نَادى: أن لايَقربَنَّ الصَّلاةَ سَكرانٌ، فَدُعي عُمَر فقُرئت عَلَيهِ، فقالَ: اللّهُمَّ بَيِّن لنَا في الخَمْرِ بياناً شَافِياً، فنَزَلَتْ الآيةُ التي في المائِدة: فَدُعي عُمَرُ فَقُرِئَت عليهِ فَلَمّا بَلَغَ إلى ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المائدة ، قالَ عُمَر: إنتَهَينا إنتَهَينا﴾، أَخْرَجَهُ أَحمَدُ برقم: (٣٧٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٤٩)، وَالنَّسَائيُّ برقم: (٥٥٤٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنَن الترمذي) برقم: (٥٣٢٥)، واتە: لە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ گێڕادراوەتەوە کە گوتوویەتی: ئەی خوایە دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بۆ بنێرە خوار (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟ پێش قەدەغەبوونی) ئیدی ئەم ئایەتەی سوورەتی (البقرة) هاتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ .... ﴾، عومەر بانگکراو ئایەتەکەی بۆ خوێندرایەوە (بەڵام تەواو دڵی پێیدانەکەوت) گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بدەیە (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟)، {چونکە ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾، نەیفەرمووە مەیخۆنەوە}، ئنجا ئەو ئایەتەی دیکەی سوورەتی (النساء) هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! توخنی نوێژێ مەکەون بە سەرخۆشیی (واتە: هەتا سەرخۆشن نوێژێ مەکەن)، ئنجا دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی سوورەتی (النساء) بانگدەری پێغەمبەر ﷺ کە بانگی دەداو قامەتی دەکرد، دەیفەرموو: ئەوەی سەرخۆشە با جارێ نەیەتە نوێژ، (واتە: سەرخۆشەکانیش بۆیان هەبوو

نوێـژێ بکـەن، بەڵام دەیفـەرموو: با نـەیـەن بـۆ نوێـژێ، یـانی بابـای سـەرخۆش لـە مـاڵی خـۆی نوێـژێ بکـاتو نـەیـەت بـۆ مزگـەوت، یـان بـا بـە سـەرخۆشـیی نوێژێ نەکـات، تـاکو سـەرخۆشـیی بەریـدەدات)، ئنجا عومـەر دووبـارە بانگکـرا خـوا لـێی ڕازی بـێ، وە ئـەو ئایەتـەی (النسـاء)یـشی بەسـەر خوێندرایـەوە، دووبارە عومەر گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەڕاب خواردنەوە ڕوونکردنـەوەکی باشـمان بدەیـە، {واتە: کە پێویسـتییمان بـەوە نەکـات بڵـێین: دەبـێ شـەڕاب حـەڕام بـێ یان حەڵاڵ؟} ئیـدی ئـەو ئایەتـە کـە لـە سـوورەتی (المائدة) دایـە، هاتـە خـوار، کـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾، سـەرەتا دەفـەرموێ: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە ! بێـگومان مـەیو قومـارو بتـەکانو زەلەمەکـان پیـسن لـە کـردەوەی شـەیتانن، وازیـان لێبـێنن، دوایی دەفەرموێ: ئایا واز ناهێننو دەسـتبەرداری شەڕاب نابن؟! ئنجا کـە بەسـەریدا خوێندرایـەوە، عومـەر گـوتی: (إِنْتَهَيْنَا إِنْتَهَيْنَا) وازمـان هێنـا، وازمـان هێنـا، مادام خوا فـەرمووی: پیسەو لـە کردەوەی شـەیتانە، ئایا هـەر واز ناهێنـن؟!

کەواتـە: ئـەوانی دیکـە ئاماژەیـان تێـدا بـووە، بـەڵام ئـەوەیان بـە ڕوونو ڕاشـکاوییە، کەواتـە هـیچ تێکگیـرانێك لـە نێـوانی ئایەتـەکەی سـوورەتی (المائدة)و ئایەتەکـەی سـوورەتی (النساء)و ئـەوەی (المائدة)دا نیـە، تـا بڵێیـن: ئـەوەی (المائدة) ئـەوەی (النساء)ی نەسخ کردۆتـەوە! بـەڵکو ئـەوەی (المائدة) مانایەکی زیاتری تێدایـە لـەوەی (النساء)، لـە (النساء)دا دەڵـێ: بـە سـەرخۆشـیی نوێژێ مەکـەن، بـەڵام ئـەوەی (المائدة) دەڵـێ: هـەر مەیخۆنـەوە، وە نەبـێ دوای ئەوەی ئایەتەکەی (المائدة) هاتۆتـە خوار، ئێـستا دروست بـێ

بە سەرخۆشیی نوێژێ بکەی !! ئەو هەر لە شوێنی خۆیەتی، هەروەها ئایەتەکانی (النحل)و (البقرة)ش.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾، نوێژ مەکەن هەتا دەزانن دەڵێن چی؟ بۆچی خوا دەفەرموێ: نابێ بە سەرخۆشیی نوێژ بکەن؟ چونکە نوێژ ڕازونیازو وتوێژو گفتوگۆیە لەگەڵ خوا ﷻ، وە بەندایەتییە بۆ خوا، قسە لەگەڵ خوا کردنە، فەرمایشتی خوا دەخوێنیتەوە، بۆیە دەبێ بزانی دەڵێی چی؟ وە ڕستەی: هەتا دەزانن دەڵێن چی؟ لێی وەردەگیرێ کە هەر شتێکی دیکەش ببێتە مایەی ئەوە کە فیکرو زەینی ئینسان بەملاو لادا بەرێ، یاخود ئینسان وا لێبکات ئاگای لە نوێژەکەی نەمێنی، دیسان ئەوەش دەبێ خۆی لێی بپارێزێ، چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەریش ﷺ ئەوە دەگەیەنن:

**یەکەم:** دەربارەی نوێژ نەکردن بە خەواڵوویی: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيّ ﷺ قَالَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَرْقُدْ، حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ﴾، أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (٢٥٧)، أَحمَد برقم: (٢٤٣٣٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٣٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٣١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٥٨٣)، واتە: عائیشە خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان وەنەوزی هاتێ، یان خەواڵوو بوو، (زۆری خەو دەهات) با بخەوێ تاکو خەوەکەی لادەچێ، (وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ: سەرخەوێك بشکێنێ) چونکە نازانێ دەبینی بە حیساب داوای لێبوردن لە خوا دەکات، کەچی قسە بەخۆی دەڵێ، یان: دەبینی لە جیاتی ئەوەی دووعا بکات، دووعا لەخۆی دەکات، یان: دەبینی وشەیەکی هەڵەی بە زاردا دێ کە بۆخۆی خراپە، کەواتە: بە خەواڵوویی

یـان بـە زۆر خـەو هـاتوویی نوێـژ کـردن دروسـت نیـە، مەگـەر وەختـی نوێژەکـە وابـێ کـە ئەگـەر لـەو کاتـەدا نـەیکات نوێژەکـە بـچێ، وەك: کـاتی بەیـانی، یـان هـەر کاتێکـی دیکـە، بـۆ وێنـە: بـۆ نوێـژی بەیـانی درەنـگ خەبـەری بۆتـەوەو ئەگـەر نـەیکات نوێژەکـەی دەچێ، ئـەوە جیایـە لەبـەر ناچـاریی، ئەگـەرنا بـە خـەوالّوویی نوێـژکردن نابـێ، وە بەتایبـەتی نوێـژی سـوننەتو شـەونوێژ، ئەوانـە بـا بـە ئیـسڕاحەت بیانکـات، بۆئـەوەی بـە چالاکیی‌و گـورج‌وگۆڵیی‌و بـێداریی نوێژەکە بکات.

**دووەم**: هەروەهـا لـە کـاتی خواردنـدا کاتێـك برسـیەتی‌و، نانـیش دانـراوە، لەوبارەشـەوە ئەم فەرمایشـتە هەیە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَـالِكٍ رضي الله عنه عَنِ النَّـبِيِّ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَـابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحَمْـد بـرقم: (١٢٠٩٧)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٦٧١)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (١٢٤١)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٥٣)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (٨٥٣)، وَالـدَّارَمِيُّ بـرقم: (١٢٥٣)، وَالطَّبَرَاني فـي (الأوسط) بـرقم: (٥٩٦)، واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالـیك خـوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگـەر نـان خواردنی ئێـوارە ئامـادە کرابـوو، وە نوێـژیش قامـەتی بـۆ کـرابوو، یاخـود نوێـژیش ئامـادە بـوو، (نوێژەکـەش وەختـی هـاتبوو) پێـشێ خواردنەکـەی ئێوارەتـان بخـۆن، ئنجـا دوایـی نوێـژێ بکـەن[1].

**سێیـەم**: هەروەهـا کـاتێك کـە ئینسان تەنگـاوە، سـەغڵـەتە، جا چ تەنگـاویی بچـووك بـێ، چ تەنگـاویی گەورە بـێ، دیسـان لـەو حاڵەتانەشـدا نوێـژ کـردن دروسـت نیـە، یـان بـەلای کەمـەوە ناپەسـندە، ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەندازەی سـەغڵەتیی‌و تەنگاوییەکە، لەوبارەشـەوە ئەم فـەرموودەیە هـەیـە: ﴿عَنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُـولُ: لا صَـلاةَ بِحَضْرَةِ طَعَـامٍ، وَلا هُـوَ يُدَافِعُـهُ الأَخْبَثَـانِ﴾، أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٤٢١٢)

---

١) العشـاء: نانخواردنی ئێوارەیە.

مُسْلِمٌ برقم: (١٢٤٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٨٩) عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: لە کاتێکدا کە خواردن ئامادە کراوە، نابێ نوێژ بکرێ، هەروەها لە کاتێکدا کە دوو شتە پیسەکان سەغڵەتی دەکەن (واتە: پیسایی‌و میز) لەو کاتەشدا نابێ بچێ بە پەلەپەل نوێژێ بکاو لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەڵکو دەبێ بزانێ چی دەڵێ، وە چۆن نوێژەکەی دەکات، دەبێ بە ڕێو جێ بێ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەگەر هەر شتێك سەرنجی ڕابکێشێ، پێویستە یان بەلای کەمەوە پەسندە، خۆی لێ بپارێزێ، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ.

**چوارەم**: لابردنی هەرشتیك كە سەرنج ڕادەكێشێ لە نوێژدا: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَنَّ النَّبِيّ ﷺ صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلاَمٌ وَقَالَ: شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ فَاذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَائْتُونِي بِأَنْبَجَانِيَّةٍ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٥٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٢٣٨)، وأَبُو دَاوُدَ برقم: (٩١٤)، والنَّسائيُّ برقم: (٧٧٠)، عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لە پۆشاکێکدا (خەمیصە دیارە جۆرە پۆشاکێك بووە ڕەنگاو ڕەنگ بووە، بەقیمەت بووە، هەندێك وێنەو دیمەنو خەتی تێدا بوون)، دوایی کە سلاوی نوێژەکەی دایەوە (یان ڕەنگە نوێژەکەی بڕیبێ) فەرمووی: وێنەو دیمەنی ئەم بەرگە، سەرقاڵی کردم، سەرنجی ڕاکێشام، ئەم پۆشاکە بەرن بۆ ئەبو جەهم (کە یەکێك بووە لە هاوەڵان) وە ئەنبەجانییەکم بۆ بێنن، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: (بِأَنْبَجَانِيَّتِه) واتە: ئەنبەجانییەکەی ئەبو جەهمم بۆ بێنن، دیارە ئەنبەجانیی بەرگێکی سادە بووە، جا چ هی وی بۆ بێنن، چ هی دیکەی بۆ بێنن.

ئێستا ڕەنگە یەکێك بپرسێ: باشە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ دالغەی ڕۆیشتبێ بە هۆی بەرگی ڕەنگاو ڕەنگەوە، ئەدی دەبێ ئەبو جەهم چی لێ هاتبێ؟ لێرەدا مەبەست ئەوە نەبووە کە ئەبو جەهم

بچێ ئەو بەرگە لەبەر بكات، لەوانەیە ئەبو جەهم بچێ بیفرۆشێ، بە كابرایەكی جوولەكەی دەفرۆشێ، بە نامسولمانێكی دەفرۆشێ، ئەوە لەلایەك، لەلایەكی دیكەوە پێغەمبەری خوا ﷺ شتی بچووكیشی بۆخۆی بە گەورە حیساب كردوە، هەر تۆزێ دالغەی ڕۆیبێ، بە شتێكی گەورەی داناوە بۆخۆی، بەلام بۆ خەلكی دیكە دیارە، وەنەبێ ئەو شتە بچووكانە هێندە گەورەیان لەسەر حیساب بكرێن، وەك لە شوێنەوار (أثر)ێكدا هاتوە: (حَسَنَاتُ الأبرَارِ سَيِّئَاتُ المُقَرَّبِينَ) واتە: ئەوەی بۆ چاكان باشە، بۆ زۆر لە خوا نزیكان خراپە، یانی بۆ مسولمانێكی سادە كە پێنج فەرزە نوێژەكان بكاو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێو حەج بكاتو، خۆی لە گوناهە گەورەكان بپارێزێ، باشە، بەلام بۆ كەسێك بیەوێ سەرمەشقی خەلكی بێو، بیەوێ زۆر لە خوا نزیك بێ، دیارە بەوەندە بەس (إكتِفَاء) ناكرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی عەبدوللای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، فەرموویەتی: ﴿نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٣٣٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١١٥٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٣٢٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩١٩)، واتە: عەبدوللا پیاوێكی زۆر باش بوو، ئەگەر لە شەوێ دا شەونوێژی كردبایە.

**مەسەلەی سێیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ﴾، (سبيل) واتە: ڕێگا، (عابر) واتە: ڕێبوار، (عابر السبيل) ڕێبوار، واتە: وە بە لەش پیسی توخنی نوێژ مەكەون، مەگەر ڕێبواربن، مەگەر لە ڕێگا بڕیندا بن، یانی: كە لەشتان پیس بوو، وە لە سەفەر بوون، نوێژ مەكەن هەتا خۆتان دەشۆن، وە ئەگەر دەرفەتی خۆ شۆردن نەبوو، دیارە دەبێ تەیەمموم بكرێ، ئنجا وەك لە ڕستەكانی دواییدا هاتوە، وشەی: (جُنُب) (مُؤَنَّثُ) و (مُثَنَّى) و (جَمْع)ی تێدا یەكسانن و بۆ هەموویان بەكاردێ، دەگوترێ: (إمرَاءَةٌ جُنب، وَرَجُلٌ جُنب، وَإمرَأتَانِ جنب، وَرَجُلانِ جُنب، ونساءٌ

جنب، ورجـالٌ جُنُـب) بۆچـی؟ (راغـب) گوتوویـەتی: (لأنَّـهُ علـى وَزْنِ المَـصْدَر، كالبُـعْد والقُـرْب)، واتـە: چـونكە لەسـەر كێشی چاوگـە، وەك دووریـیو نـزیكـیی، كەواتـە: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا جُنُبًا ﴾، واتـە: نـزیكی نوێـژ مەكەونەوە بە لەش پیسیی هەتاكو خۆتان دەشۆن، مەگەر ڕێبـواربن، واتە: كە ڕێبـوار بوون، ئـەو كاتـە بۆتـان هەیـە تەیـەمموم بكەن لـە جیاتی خۆ شۆردن، ئـەوە واتایـەكی، هەروەهـا توێـژەرەوانی قورئـان واتایـەكی دیكەشـیان هێنـاوە، واتە: نوێژ مەكەن بەسـەر خۆشیی، هەروەها نیزیكی شوێنی نوێژ مەكەون، كە مزگەوتـە، مەگـەر كـە بـە ڕێڕەویی بـە نێـو مزگەوتەكـەدا بـڕۆن، هـەتا خۆتـان دەشـۆن، هەندێكـیان وایـان لێكـداوەتەوە كـە لێـرەدا مەبەسـت لـەوە كـە دەفەرموێ: توخنی نوێژ مەكەون بە لـەش پیسیی، واتـە: تـوخنی شوێنی نوێـژ مەكەون كە مزگەوتـە، مەگـەر پێیدا تێپـەڕبن، واتـە: مزگەوتێـك دوو دەرگـای هەیـە، لـە دەرگایەكیانـەوە دەڕۆی لـە دەرگایـەكی دیكـە دەچیـە دەرێ، ئـەوە قەینـاكـات، بـەڵام دروسـت نیـە بـە لـەش پیسیی لـە مزگـەوتدا بمێنیـەوە، زانـایان هەموویان لەسـەر ئەوە یەك دەنگن، كەواتە: لەوبارەوە دوو ڕا هەن:

١/ هەندێكـیان دەڵـێن: مەبەسـت لـە: ﴿ عَابِرِي سَبِيلٍ ﴾، واتـە: ڕەتبـوون بـە مزگەوتدا.

٢/ هەندێكـی دیكـەش دەڵـێن: ﴿ عَابِرِي سَبِيلٍ ﴾، واتـە: ڕێبـوار، كـە ڕێبـواری لەسـەرت نیـە خـۆت بـشۆی، دەتـوانی تەیـەمموم بكـەی، مـادام ئـاوت دەستنەكەوێ، بەڵكو لەسەر ڕای زۆربەی ئەگەر ئاویشت دەسـتبكەوێ، بـەڵام لەبـەر سـەرما نـەتوانی بەكـاری بێـنی، وەك دوایـی باسـی دەكـەین، یـان هەندێكـیان دەڵـێن: لەبەرئـەوەی كـە مەترسـیی دوژمنـت هەیـە، یـان لەبەرئەوەی لە هاوەڵانت دادەبڕێی، یان بەجێ دەمێنـی هەتـا خـۆت دەشـۆی، لە هـەموو ئەو حاڵانەدا بـۆت هەیـە تـەیەمموم بكـەی.

بـەڵام ئـەوەی كـە مـن بـە بەهێـزتری دەزانـم لـەو دوو ڕایانـە: ڕای یەكەمـە،

واتە: بە سەرخۆشیی، وە بە لەش پیسییش نوێژ مەکەن، ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەدی باشە خوا کە دەفەرموێ: ﴿لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، ئەویش هەر بە واتای لەش پیسیی نیە؟ کە ئێمە ئاوای لێکدەدەینەوە: (أو جَامَعْتُمُ النِّساء) واتە: یان ئەگەر لەگەڵ ژنانتاندا جووتبوون، دەڵێین: با، بەڵام لێرەدا (جُنُب) مەبەست پێی حاڵەتی ڕەحەتبوون (إحْتلاَم)ە لە خەودا، کەسێك کە ئیحتیلامی دەبێ، پێی دەگوترێ: (جُنُب)، ئەوی دیکەش ﴿لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، واتە: ئەوەیە کە لە حاڵی بێدارییدا دەچێ لەگەڵ هاوسەری خۆیدا جووت دەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** زانایان دەربارەی ئەوە کە ئایا چ شتێك پێویستکەری خۆ شۆردن (مُوجِب الغُسل)ە، واتە: چ شتێك وادەکات کە غوسل لەسەر ئینسان واجب بێ، لە کاتێکدا کە ئینسان لەگەڵ خێزانیدا مامەڵەیەك دەکات، وەك مامەڵەی ژن و مێردایەتیی؟ ئایا بەس بە بەریەککەوتنی ئەندامی زاوزێیان (إلتقَاءُ الختانين) دەبێتە هۆی ئەوەی کە پیاوو خێزانەکەی خۆشۆردنیان لەسەر پێویست بێ، یان دەبێ ئاوهاتنەوە (إنـزالُ المَنـي)ش ببێ؟! فەرموودە دەربارەی هەردووکیان هەن:

**یەکەم:** ڕای یەکەم دەڵێ ژنو مێرد مادام لەگەڵ یەکدی جووتبوون، ئەگەر ئاویشیان نەیەتەوە، لەبەر هەر هۆیەك بێ، هەر غوسڵیان لەسەر پێویست دەبێ، لەوبارەوە ئەم دوو حەدیسە هەن:

أ/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، وَإِذَا مَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ﴾، رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٨٣)، واتە: لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو لەنێو چوار پەلی ئافرەتەکەیدا، خێزانەکەیدا دانیشتو ئەندامی زاوزێیان بەریەك کەوت ئەوە خۆشۆردنیان لەسەر پێویستە.

ب/ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَعَدَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ، ثُمَّ جَهَدَهَا، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٢٩١)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٧٨١) وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (١٩١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦١٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١١٧٨)، زَادَ مُسْلِمٌ: وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ)، واته: لە ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو لەنێو چوار پەلی ژنەکەیدا دانیشتو ئەندامی زاوزێیان چوونە نێو یەك، ئەوە خۆشۆردنیان لەسەر پێویستە، موسلیم ئەمەشی زیاد کردوە دەڵێ: ئەگەر پیاو ئاویشی نەهاتبێ.

**دووەم**: ڕایەکەی دیکە دەڵێ: بەبێ ئاوهاتنەوە خۆشۆردن پێویست نابێ، لەوبارەوەش ئەم دوو فەرمایشتە هەن:

أ) ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٧٧٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقـم: (٢١٧)، واتـه: ئەبـو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆ شۆردنو بەکارهێنانی ئاو، بەهۆی ئاوەوەیە، واتە: بەهۆی ئاو هاتنەوەیەوەو ئەگەر پیاو ئاوی نەیەتەوە، با لەگەڵ خێزانیشی جووتبێ، ئەوە خۆشۆردنی لەسەر پێویست نیە.

ب- ﴿عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَلَمْ يُنْزِلْ؟ قَالَ: يَغْسِلُ مَا مَسَّ الْمَرْأَةَ مِنْهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي﴾، أَخْرَجَهُ أحْمَد بـرقم: (٢١١٢٥)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٢٩٣)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٧٧٦)، وابْنُ حِبَّان بـرقم: (١١٦٩)، واتـه: ئوبەی کوڕی کەعب گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانی خۆیدا جووت بوو، بەڵام ئاوی نەهاتەوە، چی بکات؟ فەرمووی: ئەو ئەندامەی کە بەر ئافرەتەکە کەوتوە، (واتە: ئەندامی زاوزێی) دەشواتەوەو دوایی دەستنوێژ دەشۆرێو نوێژی خۆی دەکات.

هەڵبەتە زۆربەی زۆری زانایان نزیك بە یەك دەنگیی ڕای یەکەمیان تەبەننیی کردوە، کە تەنیا بەوەی ئەندامی زاوزێی پیاو و ژن بچنە نێو یەك، با ئاویشیان نەیەتەوە خۆشۆردنیان لەسەر پێویست دەبێ، وە گوتوویانە: ئەوەی دیکە کە حەدیسەکە دەلالەتی لەسەر دەکا، نەسخ بۆتەوە، بەڵام بوخاریی ڕەحمەتی خوای لێ بێ ڕایەکی دیکەی هەیە، دەڵێ: هەردووکیان هەر هەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی تەنیا بەوەی کە ئەندامی زاوزێیان دەچنە نێو یەكو بەریەك دەکەون، خۆشۆردنیان لەسەر فەرز دەبێ، ئەوە بۆ ئیحتیاتەو ئەوی دیکەش فەرزە، واتە: یەکەمیان دووربینییەو فەرز نیە، بەڵام ئەوی دیکەیان فەرزە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: (إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ) ئەوە مەبەست پێی حاڵەتی ئیحتیلامە، واتە: ئەگەر کەسێك لە خەودا پێی وابوو جیماعی کردوە، دەبێ تەماشای خۆی بکات، ئەگەر لەشی تەڕ نەبوو، ئاوی نەهاتبوو، خۆشۆردنی لەسەر پێویست نیە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مەبەستی پێ ئەو حاڵەتەیە.

پێشموایە کە ڕایەکەی بوخاریی کە دەڵێ: مەبەست پێی ئەوەیە سوننەتو پەسەند وایە، ئەگەر ئاویشیان نەیەتەوە ژنو مێرد هەر خۆ بشۆن باشە، بەڵام لەسەریان فەرز نابێ، ئەو ڕایە واپێدەچێ لە هەموویان باشتربێ.

دیارە ڕایەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش کە بەو شیوەیەی گوتمان، ئەو حەدیسەی دیکەی تەئویل کردوە، ڕایەکی پەسندو باشە.

هەندێك لە تەفسیرەکان لێرەدا قسەیەکی خۆشیان لە (عبداللّه بن رَواحة) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاوەتەوە، منیش دەیگێڕمەوە:

شەوێکیان (عبداللّه) لە تەنیشت ژنەکەی خۆی دەخەوێ، شەو دەچێ لەگەڵ کەنیزەکەکەیدا جووت دەبێ، کاتێك هاوسەری پێی دەزانێ خەریك دەبێ بیکاتە هەرا، ئەویش نکووڵیی لەوە دەکات کە چووبێتە لای کەنیزەکەکەیو بە ژنەکە دەڵێ: بۆ خۆت دەزانی، دروست نیە بە لەش پیسیی قورئان

بخوێندرێ! بەلاّم گوێت لێم بێ، ئیدی ئەم شیعرانەی بۆ دەلّێ:

وَفِينَا رَسُولُ اللَّهِ يَتْلُو كِتَابَهُ
إِذَا انْشَقَّ مَعْرُوفٌ مِنْ الْفَجْرِ سَاطِعُ

أَرَانَا الْهُدَى بَعْدَ الْعَمَى فَقُلُوبُنَا
بِهِ مُوقِنَاتٌ أَنَّ مَا قَالَ وَاقِعُ

يَبِيتُ يُجَافِي جَنْبَهُ عَنِ فِرَاشِهِ
إِذَا اسْتَثْقَلَتْ بِالْمُشْرِكِينَ الْمَضَاجِعُ

دیارە هاوسەریشی وادەزانێ قورئانەو دەلّێ: تەواو قەناعەتم هات، پاشان (عبداللَّه) ئەم ڕووداوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوەو ئەویش پێدەكەنێ[1].

**مەسەلەی پێنجەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا ﴾، تاكو خۆتان دەشۆن، واتە: بە لەش پیسی نوێژێ مەكەن، تاكو خۆتان دەشۆن، ئەگەر لە مالّ بوونو لە سەفەر نەبوون، وە بەكارهێنانی ئاوتان بۆ گونجاو بوو، دیارە دەربارەی خۆشۆردن دەبێ قسە لەسەر سێ مەسەلان بكەین، كە زانایان كەموزۆر تێیاندا كەوتوونەتە ڕاجیایی یەوە:

**یەكەم: دەست بە جەستە داهێنان لە كاتی خۆشۆردندا كە پێی دەگوترێ:** (الدلك)، یاخود (إمرارُ اليَد عَلَى الْجَسَدِ)، ئایا ئەوە فەرزە، یان هەر سوننەتە؟

ڕای یەكەم: مالیكو هەندێك لە زانایان گوتوویانە: بەلّێ بەبێ دەست بە جەستە داهێنان، خۆشۆردن نایەتە دی.

---

١) الجامع لأحكان القرآن، ج: (٥)، ص: (١٨٣).

ڕای دووەم: بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بە تەنیا بە ئاو بەخۆداکردن خۆشۆردن دێتە دی، وەك (القرطبي)[1] هەردوو ڕایەکانی هێناون، واشپێدەچێ ڕای زۆربەی زانایان ڕاست بێ، بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ إِذَا اِغْتَسَلَ مِنْ اَلْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَأْخُذُ اَلْمَاءَ، فَيُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي أُصُولِ اَلشَّعْرِ، حَتَّى إِذَا رَأَى أَنْ قَدِ اسْتَبْرَأَ حَفَنَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٨٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٧١٦) وَاللَّفْظُ لِمُسْلِمٍ، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە خۆی دەشۆرد بۆ لەش پیسیی لەخۆ دەرکردن (لەش پیسیی گەورە)، دەستی پێدەکرد سەرەتا هەردوو دەستی خۆی دەشۆرد، دوایی بە دەستی ڕاستی ئاوی بە دەستی چەپیدا دەکردو ئەندامی زاوزێی خۆی دەشۆرد (واتە: داوێنی خۆی دەشۆرد) دوایی دەستنوێژی دەگرت، وەك چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەگرێ، ئنجا دەستی دەبردە نێو ئاوو ئاوی وەردەگرت، وە دەستی دەخستە نێو مووەکانی، وە ئاوی بەسەر خۆی دادەکردو سەری خۆی هەڵدەگوشی، هەتا کاتێك کە دەیزانی سەری تەڕ بووە، ئنجا سێ مستی بە سەری خۆی دادەکردن وە دوایی بەسەر هەموو جەستەی خۆیدا دەکرد، وە لە کۆتاییدا هەردوو پێیەکانی دەشۆرد، مانای وایە لەش پیسییشی دەرکردوەو دەستنوێژیشی گرتوە، وەك دەبینن: باسی دەست بە خۆداهێنانی نەکردوە.

بەڵام من پێم وایە جاری وایە ئەگەر ئینسان دەست بە جەستەی خۆدا نەهێنێو دڵنیا نەبێ کە تەڕبووە، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە سەرمایەو پێستی ئینسان گرژ دەبێ، پێموایە ئەو کاتە بەلای کەمەوە دووربینیی

---

١) هەمان سەرچاوە، ج: (٥)، ص: (١٨٣- ١٨٤).

(إحتياط)و پەسند وایە کە دەست بەخۆیدا بێنێ، ئەگەر فەرزیش نەبێ.

**دووەم: نیەت هێنان:** ئایا نیەت هێنان فەرزە یان نا؟

زۆربەی هەرە زۆری زانایان: (مالك وشافعي وأحمد وإسحاق وأبو ثور) رایان وایە: کە بۆ هەرکام لە خۆشۆردنو دەستنوێژو تەیەمموم نیەت پێویستە، هەڵبەتە نیەت هێنانیش بە دڵە، بەڵام (أبو حَنيفَة)و هاوەڵانی دەڵێن: نیەت هێنان فەرز نیە، بەڵام واپێدەچێ رای زۆرینە راست بێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ...﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٩٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٤٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٧٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٧) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابَ رضي الله عنه، واته: کردەوەکان بەپێی نیەتن، یانی کردەوە باشەکان نیەتیان لێ بهێنرێ ئنجا دادەمەزرێن، بەڵام بە تەئکید بێژتن (تَلَفُّظ)ی نیەت نەك فەرز نیە، بەڵکو سوننەتیش نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەت نەیفەرمووە: نیەتم هەیە نوێژ دەکەم، نیەتم هەیە رۆژوو دەگرم، نیەتم هەیە دەستنوێژ دەگرم، یان خۆم دەشۆم... هتد، بەڵکو نیەت ئەوەیە کە لە دڵدایە، چونکە نیەت یانی: نیازو مەبەستی نێو دڵ.

**سێیەم: ئەندازەی ئاوی خۆ پێ شۆردن:**

ئەو ئەندازە ئاوە کە بەکاردەهێنرێ، پێویستە چەند بێ؟ زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن هەتا ئاو کەمتربێ باشترەو لە سوننەتەوە نیزیکترە، واتە: زێدەرۆیی نەکرێ، چ بۆ دەستنوێژ گرتن، چ بۆ خۆشۆردن، وەك لە دەقی سوننەتیشدا هاتوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ إِنَاءٍ هُوَ الْفَرَقُ مِنَ الْجَنَابَةِ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٥٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٢٠١)، واتە:

دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاوی قاپێك خۆی دەشۆری[1] کە فەڕەقی پێ دەڵێن) لەش پیسیی پێ لەخۆی دەردەکرد.

ئنجا هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٠١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٣٥)، ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە مستێك ئاو دەستنوێژی دەگرتو، صاعێك هەتاکو پێنج مست (صاع چوار مستە) خۆی پێ دەشۆرد.

کەسی وا هەیە بە تانکییەکیش لەوانەیە دڵی لەخۆی پاك نەبێتەوە، کە لەڕاستییدا ئەوە وەسوەسەو خوتخوتەی شەیتانە، هەتا ئینسان بە ئەندازەیەك ئاوی کەمتر دەستنوێژی بۆ بگیرێو غوسڵی بۆ دەربکرێ، ئەوە لە سوننەتەوە نزیکترە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾، واتە: وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون، یان لە سەفەر بوون، یان یەکێکتان تارەتی گرتبووو، لە تارەت گرتن هاتبوۆوە، یاخود لەگەڵ ژنەکانتاندا جوتبووبوون، وە ئاوتان چنگ نەکەوت، ڕووی خاکێکی پاك بکەنە ئامانج، واتە: ڕووبکەنە ڕووی خاك، ﴿فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾، وە دەست بەو خاکەدا بێنن و پاشان بە دەموچاوو هەردوو دەستی خۆتانی دابێنن، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێ وەردەگیرێ

١) (فَرَق) دەفرێکە سێ (صاع دەگرێ)، هەر (صاع)ێکیش چوار مست (مدّ)ە، کەواتە: فەرەق دوازدە (١٢) مست ئاوە.

کە چوار جۆرە کەس بۆیان هەیە لە جیاتی ئاو تەیەمموم بکەن، چ بۆ دەستنوێژ کە پێی دەگوترێ: (پاکیی گچکە)، چ بۆ خۆشۆردن لە لەش پیسیی، کە پێی دەگوترێ: (پاکیی گەورە)، وە بێ دەستنوێژیی پێی دەگوترێ: (لەش پیسیی گچکە)، وە بە جەنابەتیش دەگوترێ: (لەش پیسیی گەورە)، بۆ هەردووکیان چوار جۆرە کەس بۆیان هەیە لە جیاتی ئاو تەیەمموم بکەن، وە دوایی باسی دەکەین کە تەیەمموم بە چی دەکرێ؟ چونکە وابـاوە کە تەیەمموم تەنیا بە خۆڵ دەکرێ، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، وەك باسی دەکەین، بەڵێ ئەوە ڕایەکە لە لای هەندێك لە زانایان، بەڵام ڕای بەهێزتر هەیە، کە ئێمە دوایی ڕوونی دەکەینەوە، جا ئەو چوار جۆرە کەسە کێن؟

١/ نەخۆش، ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾.

٢/ ڕێبوار، کەسێك کە بە سەفەر دەچێ، ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾.

٣/ کەسێك کە تارەتی گرتوە، خۆی پاککردۆتەوە لە میزو پیسایی، ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾.

٤/ کەسێك کە لەگەڵ هاوسەری جووتبووە، ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾.

<u>**یەکەم**</u>: نەخۆش، ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾:

سەرەتا با باسی نەخۆش بکەین، زانایان لەسەر ئەوە پێکهاتوون کە ئەو نەخۆشییەی مۆڵەتە ئینسان خۆی نەشواو لە جیاتی خۆشۆردن چ بۆ دەستنویژ، چ بۆ لابردنی لەش پیسیی گەورە، تەیەموم بکات، نەخۆشییەکە کە خاوەنەکەی مەترسیی مەرگ، یان مەترسی زیادبوونی نەخۆشییەکەی هەبێ، یانی: برینـدارە، یان نەخۆشییەکی پێستی هەیە، یاخود نەخۆشییەکی هەیە کە ئەگەر بێتو خۆی بشوات دەمرێ، یاخود نەخۆشییەکەی زیاتر لێ خراپ دەبێ، لەو حاڵەتانەدا ئەو جۆرە نەخۆشە بۆی هەیە تەیەمموم بکات، ئەگەرنا مادام هیچ گرفتی نەبن لە بەکارهێنانی ئاودا، نە بۆ دەستنوێژ، نە بۆ خۆشۆردن، نابێ پەنا بەرێتە

بەر تەیەممومم، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەتا ئاو هەبێ تەیەممومم بەتاڵە)، مەبەستم ئەوەیە هەموو نەخۆشێك بۆی نیە تەیەممومم بكا، بەڵگەمان لەوبارەوە ئەم دوو فەرموودەیەیە:

١/ ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ فَأَشْفَقْتُ إِنِ اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ؟! فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنَ الاِغْتِسَالِ، وَقُلْتُ إِنِّي سَمِعْتُ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٨٤٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٦٢٩)، واتە عەمرِی كوڕی عاص خوا لێی ڕازی بێ (دیارە فەرماندەی سەریەیەك بووە، سەرییەش بەشێكە لە سوپایەك) دەڵێ: شەوێكی زۆر سارد لە جەنگی (ذات السّلاسل) ئیحتیلامم بوو (لە كوردەواریی خۆمان دا دەڵێن: شەیتانیی بوو، ئیحتیلام واتە: لە خەودا ڕەحەتبوون)، منیش ترسام كە ئەگەر بێتو خۆم بشۆم بفەوتێم، بمرم، بۆیە تەیەممومم كرد، وە نوێژی بەیانییشم بەو تەیەممومە بە هاوەڵەكانم كرد، (كە دیارە ئەو فەرماندەو بەرپرسیان بووە) ئنجا بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ئەی عەمر! ئایا نوێژت بە هاوەڵەكانت كرد كە لە كاتێكدا لەش پیس بووی؟! (واتە: خۆت نەشۆرد بوو) منیش هەواڵم پێدا كە چ شتێك ڕێی لێ گرتم كە خۆم بشۆم، وە گوتم: من گوێم لێ بووە كە خوا دەفەرمویّ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾النساء، واتە: خۆتان مەكوژن خوا لەگەڵتان بە بەزەییە، (منیش ترسام كە ئەگەر خۆم بشۆم خۆم بفەوتێنم)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنیو هیچی نەفەرموو.

دیارە پێکەنینەکەی نیشانەی ئەوەیە پەسەندی کردووەو ڕازی بووە، ئەگەرنا دەیفەرموو: نەخێر، جارێکی دیکە ئەوە مەکەو هەڵەت کردوە نوێژەکەشت دەبێ بگێڕیەوە.

٢/ ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ، فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ ثُمَّ احْتَلَمَ، فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أُخْبِرَ بِذَلِكَ فَقَالَ: قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ أَلاَّ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا، فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ﴾، أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٥٧٢)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٧٥٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٣١٤)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٧٣) وَحَسَّنَهُ الألباني، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە بۆ سەفەرێك چووینە دەر، پیاوێك لە ئێمە بەردێك بە سەری کەوت (ئایا بە بن شاخێکدا ڕۆیشتوە، کەسێك لە شوێنێکی نادیارەوە بەردێکی هاویشتوە، یان لە جەنگدا بووە، گرنگ ئەوەیە بەردێك بەر سەری کەوت) سەری شکا (دیارە واپێدەچێ برینەکەشی قووڵ بووبێ) دوایی ئیحتیلامیشی بوو، ئنجا پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد: ئایا مۆڵەتتان بۆ من پێ شك دێ، تەیەمموم بکەم لە جیاتی خۆ شۆردن؟ ئەوانیش گوتیان: پێمان شك نایەت مۆڵەت بۆ تۆ هەبێ، مادام دەتوانی ئاو بەکاربێنی، ئەویش خۆی شۆردو لە ئەنجامی خۆشۆردنەکەیدا مرد، کاتێك گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدرا بەو ڕووداوە، پێغەمبەر ﷺیش فەرمووی: کوشتیان خوا بیانکوژێ، بۆچی ئەگەر نەیاندەزانی پرسیاریان نەدەکرد، چارەسەری نەزانین پرسیارکردنە، (واتە: بە نەزانیی وەڵامیان داوەتەوەو گوتوویانە نەخێر مۆڵەتت نیە، کە فەرمووشیەتی: (قَتَلَهُمُ اللَّهُ) واتە: خوا تۆڵەیان لێبستێنێو سزایان بدا، کە دیارە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە

کەسێك بە نەزانیی شتێ بکات، باجەکەی دەداتو تووشی سزا دەبێ لەسەری، ئەوە نیە هەر بڵێن: نەیزانی، جا نەیزانی دەبێ بپرسێ، مادام دەرفەتی هەبێ بپرسێ، یاخود شتێك کە نازانێ بڵێ نازانم، ڕەنگە ئەگەر گوتبایان نازانین، کابرا بۆخۆی ئیجتیهادێکی دەکرد وەکو (عەمرِی کوڕی عاص)، بەڵام کە گوتوویانە: نەخێر مەجالی تێدا نیە، چووە خۆی شۆردووەو دوایی وەفاتی پێکردوە، کەواتە: لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نەخۆش بۆی هەیە تەیەمموم بکات لە جیاتی ئەوەی دەستنوێژ بە ئاو هەڵبگرێو بە ئاو خۆی بشوا، کە مەترسیی جیددیی هەیە لە خۆی کە بمرێ، یاخود نەخۆشییەکەی زیاتر تەشەنە بکات.

**دووەم**: ڕێبوار، کەسێك کە بە سەفەر دەچێ، ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾:

زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بابای ڕێبوار سەفەرەکەی کورت بێ، یان درێژ بۆی هەیە تەیەمموم بکات، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾، ئەگەر لە سەفەر بوون، وەك (القرطبي) هێناویەتی[1] زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە خوا سەفەری بە موتڵەقیی باسکردووەو نەیفەرمووە: کورت بێ، درێژبێ، چۆن بێ، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: دەبێ سەفەرەکەی وابێ بتوانێ نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، ئەمیش بە هەشتاو سێ کیلۆمەتر تۆزێك کەمتر یان زیاتر دادەنێن، بەڵام لەڕاستییدا هەر دانانی هەشتا کیلۆمەتر کەمتر یان زیاتر بۆ ماوەی سەفەر تاکو بتوانرێ نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، ئەوە بۆخۆی بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، چونکە لە (صحيح مسلم)دا هاتوە، کە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ سێ میل یاخود سێ فەسخ دوورکەوتبایەوە، نوێژی کورتدەکردەوە، کەواتە: ئەو ڕایە بەهێز نیە، بەڵکو ئەو ڕایە بەهێزە کە هەموو جۆرە سەفەرێك دەگونجێ ئینسان تەیەمموی تێدا بکات، وە هەموو جۆرە سەفەرێکیش دەگونجێ ئینسان

---

١) الجامع لأحكام القُرآن: ج: (٥)، ص: (١٩١).

نوێژی تێدا کورت بکاتەوە، وە لە ئایەتەکانی دواییدا باسی دەکەین، کە نوێژ کورتکردنەوەکەی چۆنو لە چ سەفەرێکدا دەکرێو، وە بەڵگەشمان لەسەر ئەوە چییە؟

**سێیەم:** تارەت گرتن، خۆی پاککردۆتەوە لە میزو پیسایی، ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾:

سێیەم کەس لەوانەی کە بۆیان هەیە تەیەمموم بکەن، لە جیاتی دەستنوێژو لە جیاتی خۆشۆردنیش، کەسێکە کە تارەتی گرتوە، واتە: خۆی پاککردۆتەوە لە میزو لە پیسایی، کە دیارە هەر شتێك لە پێشو پاشی ئینسان بێتە دەرەوە، چ میزو پیسایی، چ با، ئەوە دەستنوێژی پێ دەشکێ، هەروەها بە نوستنو خەویش دەستنوێژ دەشکێ، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە: ﴿عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ... فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٨٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٠٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٧٧)، وَحَسَّنَهُ الأَلباني، واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خەوت با دەستنوێژ بگرێتەوە، واتە: دەستنوێژی نەماوە، ئەگەر بە دەستنوێژەوە خەوتبووی، خەوت لێکەوت، تازە دەستنوێژت نەماوە دەبێ دەستنوێژ بگری، هەڵبەتە زانایان لەوبارەوە تۆزێك ڕاجیایی یان هەیە: کە ئەگەر بە دانیشتنەوە بخەوێ، ئەوە حوکمەکەی جیایە، بەڵام بە هەر حاڵ مادام پێغەمبەری خوا ﷺ وا دەفەرموێ، ڕواڵەتی حەدیسەکە وادەگەیەنێ، هەموو جۆرە خەوێك دەستنوێژ دەشکێنێ، هەڵبەتە ئەوانی دیکەش هەندێك بەڵگە دەهێننەوە، یەکێك لەوانە ئەم دەقەیە: ﴿ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ - عَلَى عَهْدِهِ - يَنْتَظِرُونَ الْعِشَاءَ حَتَّى تَخْفِقَ رُؤُوسُهُمْ، ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلا يَتَوَضَّؤُونَ﴾، رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٨٦١)، أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٠٠)، وَالدَّارَقُطْنِي برقم: (٥٧) وَقَالَ الدار قُطْنِي:

صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (١١٤)، واته: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چاوەڕێی نوێژی عیشایان دەکرد، هەتا سەریان، خوار دەبۆوە (یانی خەویان لێکەوتوە) پاشان نوێژیان دەکرد، بێ ئەوەی دەستنوێژیش هەڵبگرنەوە.

کەواتە: ئەو جۆرە خەوتنەی کە ئینسان خۆی لە زەوی چەسپاندبێ، بەو حاڵەتەی خەوتن دەستنوێژ ناشکێ، ئنجا دیارە مادام هاوەڵان وابوون، ئەوەش بەڵگەکی بەهێزە.

**چوارەم**: کەسێك کە لەگەڵ هاوسەری جووتبووە، ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾:

چوارەم کەس لەوانەی کە لە جیاتی بەکارهێنانی ئاو بۆ دەستنوێژو خۆشۆردن دەتوانن تەیەمموم بکەن، کەسێکە کە جیماعی کردبێ لەگەڵ هاوسەری، یاخود ئیحتیلامی بووبێ، ئنجا ئاویشی دەستنەکەوێ، یان نەگونجێ ئاوەکە بەکاربێنێ، ئەویش بۆی هەیە تەیەمموم بکات، جا چ جیماعی کردبێ، چ ئیحتیلامی بووبێ.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡ﴾، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە کەسێك تارەتی گرتبێ واتە: دەستنوێژی نەبێ، وە یاخود کەسێك جیماعی کردبێ، یاخود ئیحتیلامی بووبێ، مادام ئاویان چنگ نەکەوت، بۆیان هەیە لە جیاتی دەستنوێژ گرتن بە ئاو، وە لە جیاتی خۆشۆردن بە ئاو، تەیەمموم بکەن، واتە: خوای پەروەردگار بەگشتی ئەوەی باسکردوە، ئیدی ئەوە پێویست ناکات بگوترێ: لە سەفەرێ بێ، هەر خودی جیماع کردنو ئیحتیلام بوون، بۆخۆی ئەگەر ئاو چنگ نەکەوت، یان نەگونجا بەکاری بێنێ، لە ماڵێ بێ، یان لە هەر شوێنێك بێ، پاساوی ئەوەیە کە تەیەمموم بکرێ لە جیاتی بەکارهێنانی ئاو، هەروەها لەوبارەوە لە

سوننەتیشدا ئەم دەقە هەیە: ﴿عن جُهَيْمِ بْنِ الْحرثِ بْنِ الصِّمَّةِ الأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو الْجُهَيْمِ: أَقْبَلَ النَبِيُّ ﷺ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨٢٠)، (وَأَخْرَجَ الدَّارَقُطْنِي عَنْ ابْنُ عُمَر برقم: (٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٩)، وَالطَّبَرَانِي في (الأوسط) برقم: (٧٧٨٤) قال الشيخ الألباني: ضعيف): (ثُمَّ رَدَّ عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ وَقَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ السَّلاَمَ إِلاَّ أَنِّى لَمْ أَكُنْ عَلَى طُهْرٍ) واتە: جوهەیمی کوڕی حارسی کوڕی صیممەی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای بیری جەمەلەوە دەهات، پیاوێك پێی گەیشت سڵاوی لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە، هەتا چووە لای دیوارو دەستی بە دیوارەکە داهێناو، دەستی بە دەموچاوی داهێناو، دەستی بە دەستی داهێنا، (واتە: تەیەمومی کرد)، ئنجا دوایی وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، (الدار قُطني) ئەمەشی بۆ زیاد کردوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: وەڵامی سڵاوی کابرای دایەوە، وە دواییش فەرمووی: هیچ شتێك ڕێی لێنەگرتم وەڵامی سڵاوەکەت بدەمەوە، ئەوە نەبێ کە لەشم پاك نەبوو، جا ئایا لەشی پاك نەبووە، واتە: دەستنوێژی نەبووەو لەش پیسیی بچووکی هەبووە، یاخود ڕەنگە لەش پیسیی گەورەی لەسەر بووبێ، بە ڕواڵەت ئەوەی دووەمیان بەهێزترە، چونکە بێ دەستنوێژیی گچکە ڕێ ناگرێ لە وەڵامدانەوەی سەلام، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئێمە زیاتر وەرعی کردووەو خۆی پاراستوە، ئەگەرنا نەمزانیوە، زانایان بڵێن: ئەگەر ئینسان لەشی پیس بوو دروست نیە وەڵامی سەلام بداتەوە، یاخود دروست نیە سەلام بکات، بەڵام دیارە پێغەمبەر ﷺ خۆی لە شتی بچووکیش پاراستوە، کە بۆ ئێمە هیچی تێدانیە، بەڵام ئەو دیارە پلەو پێگەکەی لەلای خوای پەروەردگار هێندە بەرز بووە، دەبوایە لەو شتە

بچووکانەش خۆی بپارێزێ.

ئنجا ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ لەنێو شارو ئاوەدانی بووە، بەڵام تەیەمومیشی کردوە لە جیاتی خۆشۆردن، کەواتە: مەرج نیە کە ئینسان لە سەفەرێ بێ، ئەوجار تەیەمموم بکات، بەڵکو ئەگەر لەش پیسیی لەسەر بوو، مادام دەستی بە ئاو ڕانەگەیی، کابرا سڵاوی کردوە، پێغەمبەر ﷺ تا دەچێ خۆ دەشواو دێتەوە، کابرا تێپەڕیوە ! بەڵام یەکسەر تەیەممومی کردوە، بۆئەوەی جارێ وەڵامی سەلامەکەی بداتەوە، ئنجا دوایی حەتمەن چووە خۆی شۆردوەو لەش پیسییەکەی لابردوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾، (لامَسـتُم)و (لَمَسْتُم) هەردووکیان خوێنراونەوە، کە یەکەمیان خوێندنەوەی (نافع وابن کثیرو أبي عمرو ابن عامرو عاصم و أبي جعفرو يَعقوبَ)ە، وە دووەمیان: هی (حَمزة والكسائي وخَلَف)ە.

دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: (لامَستُم النساء) و (لَمَسْتُم النساء) ئەگەر دەستتان لە ئافرەتاندا، دەستتان گەیاندنێ، زانایان لەوبارەوە کە ئایا (لامَستُم) یان (لَمَسْتُم) بە مانای دەستلێدان دێ، یان بەمانای لەگەڵ جووتبوون (جماع) دێ؟! ڕاجیایی یان هەیە:

دیارە وشەی (لَمْس) وەك: (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (اللَّمْس: إدراك بظاهِر البَشرة كالمَسِّ) ئەوەیە ڕواڵەتی پێست بە شتێك بکەوێ، وە (مَسُّ و لَمْس) لە مانادا یەکن، واتە: دەست پێداهێنان، دەست پێکەوتن، ئەوە ڕاستە، بەڵام (وَيُكنَّى بهِ وبالملامَسة عَنِ الجِمَاعِ) بەڵام: (مَسّ) و (لَمْس) و (مُلامسة) بە کینایە بەکاردەهێنرێن بۆ جیماع، لە کوردەواریی خۆمان دا دەڵێن: کنارە، یاخود دەبەر ڕاهاوێشتن، یاخود هێماو ئاماژە بۆکردن، یانی: شتێك بە ڕوونیی نەیڵێی، بۆ وێنە: دەگونجێ بگوترێ: ڕەنگە فلان کەس دەستی گەیاندبێتە خێزانی، یانی لەگەڵی جووتبووبێ، بەڵام جوان نیە

بگوترێ: لەگەڵی جووتبووە، کە کوردەواریی خۆشمان ئەو تەعبیرانە زۆر بەکاردێنن، جا زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: (لامَستُم) و (لَمَسْتُم) بەمانای جووتبوونە، بەڵام بە کینایەو هێما، بەڵگەی ڕاستیی ئەو ڕایەش ئەوەیە کە ئەگەر تەماشا قورئان بکەین، خوای پەروەردگار وشەی (مَس)ی بەکارهێناوە بەمانای جووتبوون، بۆ وێنە:

١) لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٣٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ...﴿٢٣٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئافرەتانتان تەلاقدا پێش ئەوەی دەستیان بگەیەننێ، هەموو زانایان دەڵێن: واتە: پێش ئەوەی لەگەڵیان جووتبن، نەك پێش ئەوە دەستیان لێ بدەن.

٢) هەروەها لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٤٩)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا... ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر ئافرەتانی ئیماندارتان مارەکردن، دوایی تەلاقتان دان پێش ئەوەی دەستیان بگەیەننێ (پێش ئەوەی لەگەڵیان جووتبن) ئەوە لەسەریان پێویست نیە کە عیددە بشۆن، کە دیارە مەبەست پێی ئەوەنیە دەستیان لێدابن، بەڵکو یانی: لەگەڵیان جووتبووبن.

٣) هەروەها لە سوورەتی (المجادلة) ئایەتی (٣)دا دەفەرموێ: ﴿ ... فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ... ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئەگەر پیاوێك بە ژنەکەی خۆی گوت: (أنتِ عَليَّ كَظَهرِ أُمِّي) واتە: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکم وای، ئەوە لێی قەدەغە دەبێ و دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات پێش ئەوەی دەستیان بگاتەوە یەك، ئەمە یانی چی؟ یانی: پێش ئەوەی لەگەڵ یەکدا جووتبن.

کەواتە: لێرەشدا (لامَستُم) و (لَمَسْتُم) یانی: جووتبوون، (أبو جَعْفر

الطَّبَري)یش گوتوویەتی: (وَأَوْلَى القَوْلَيْنِ فِي ذَلِكَ بالصَّوَابِ، قَوْلُ مَنْ قَالَ: عنى اللَّه بقوله: ﴿ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾، الجمَاع دُونَ غَيْره مِن معاني اللَّمْس، لِصِحَّةِ الخَبَر عَن رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَبَّلَ بَعضَ نِسَائِهِ ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأ)[1]، واتە: ڕاستترینی دوو قسەکان، یاخود نزیکترینیان لە ڕاستییەوە لەم دوو قسانە، قسەی کەسێکە کە دەڵێ: خوا کە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾، مەبەستی جیماعە، نەك ماناکانی دیکەی (اللَّمْس)، چونکە بە هەواڵی ڕاست لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمانگەیشتوە کە هەندێ لە خێزانەکانی ماچ کردووەو دوایی نوێژی کردەووەو دەستنوێژی نەگرتۆتەوە، کەواتە: دەستنوێژ بە دەستلێدان ناشکێ‌و، ئەگەر خوای پەروەردگار لێرەدا مەبەستی لە: (لامَستُم) یان (لَمَستُم) دەستلێدان بووایە، ئەوە لەگەڵ کردەوەی پێغەمبەردا ﷺ تێکدەگیرا.

شایانی باسیشە ئەگەر (لامَستُم) یان (لَمَستُم) بە مانای جیماع بێ، مانای وایە بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە بە دەستلێدانی پیاو لە ئافرەتی دیکە دەستنوێژ دەشکێ، هەڵبەتە بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن کە بەوە دەستنوێژ ناشکێ، چەند فەرمایشتێك لەوبارەوە دێنینەوە:

١/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً مِنَ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٠٩٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٨٧٩)، والنسائيُّ برقم: (١٦٩)، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: شەوێك پێغەمبەری خوام ﷺ لەسەر جێگەی خۆی نەبینی، لێیگەڕام دەستم بە بنی پێی کەوت کە چووبووە سەجدە لە مزگەوت، پێیەکانی

---

١) جامع البيان في التأويل القرآن، ج: (٥)، ص: (١٢٣).

چەقاندبوو لە سەجدەدا دەیفەرموو: ئەی خوایە! پەنا دەگرم بە ڕازی بوونت لە تووڕە بوونت، وە بە سەلامەتییت لە سزات، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە تۆ، من ناتوانم ستایشی تۆ بکەم، وەك خۆت ستایشی خۆت کردوە.

مانای وایە دایکمان عائیشە لە نوێژدا دەستی لە بنی پێی پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، جا ئەگەر دەستنوێژی شکابایە دەیفەرموو: دەستنوێژت شکاندمو نوێژەکەی بەتاڵ دەبوو.

٢/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُصَلِّي، وَإِنِّي لَمُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ اعْتِرَاضَ الْجَنَازَةِ حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ مَسَّنِي بِرِجْلِهِ﴾، أَخْرَجَهُ النَّسائيُّ برقم: (١٦٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح أبي داود) برقم: (٧٠٧)، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد من لە پێش دەمیدا وەك جەنازە ڕاکشابووم (دیارە ژوورەکەیان گچکە بووە) ئەگەر ویستبای نوێژی وەتر بکات، لاقێکی دەگەیاندمێ بۆئەوەی کە لاقم بکێشمەوە، (دیارە پێی لە پێی داوە).

٣/ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَنَّ النَّبِيّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ، ثُمَّ يُصَلِّي وَلا يَتَوَضَّأ﴾، أَخْرَجَهُ أبُو دَاوُد برقم: (٦٨)، وَالنَّسائيُّ برقم: (١٧٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە هاوسەرەکانی ماچ دەکرد، دوایی نوێژی دەکردو دەستنوێژی نەدەگرتەوە.

کەواتە: ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دەستنوێژ بەوە ناشکێ، وە مەبەست لە ئایەتەکە دەستلێدان نیە، بەڵکو مەبەست جووتبوونە، ئنجا ڕاجیایی زانایانیش بە کورتی ئاوایە:

**شافیعی**: ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: ئەگەر پیاو دەستی بە جەستەی ئافرەت بکەوێ (واتە: پێست بە پێست)، دەستنوێژی دەشکێ، دەستی پێ بکەوێ، یان هەر ئەندامێکی دیکەی بێ.

**ئەوزاعیی**: ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: تەنیا بە دەست (دەستی ڕووتو پێستی ڕووت) دەستنوێژ دەشکێ، بەڵام بە ئەندامەکانی دیکە دەستنوێژ ناشکێ.

**مالیکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو لەیثی کوڕی سەعد**: ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: ئەگەر بە ئارەزووەوە بێ دەستنوێژی دەشکێ، چ پیاو دەستی بە ژنەکەی بکەوێ، چ ژن بە پیاوەکەی، بەڵام ئەگەر بە ئارەزووەوە نەبێ ناشکێ.

**ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف**: ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: ئەگەر بە شێوەیەکی وا بێ کە زەوقی پێی هەڵسێ، یانی بە خۆیەوە بگوشێو زۆر ماچی بکات، ئەوە دەستنوێژی دەشکێ، ئەگەرنا ناشکێ.

**موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیی**: ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: دەستنوێژ بە هیچ شێوەیەك ناشکێ، ئەوە ڕای عەبدوڵلای کوڕی عەبباسو حەسەنی بەصرییشە[1]، دیارە هەر چۆنبێ ئەم ڕاجیاییانەو ئەم وردە مەسەلانە، نابێ بیانکەینە پاساوی دەمەقاڵێو بگرەو بەردە، چونکە ئەوە زانایان هەر کەسەو قسەی خۆی کردوەو ڕای خۆی هێناوە.

بەڵام بەڕاستی ڕای بەهێزتر ئەوەیە، کە دەستنوێژی پیاو بەوە ناشکێ دەستی بە ئافرەت بکەوێ، بەڵکو بە بۆچوونی من ئەگەر بە ئارەزووەوەش بێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کە خێزانی ماچکردوە بێگومان بە ئارەزووەوە ماچی کردوە، وە بەپێی حەدیسەکانی دیکەش کە عائیشە دەستی لێداوە، وە ئەویش دەستی لە عائیشە داوە، مانای وایە دەستنوێژ بەو شتانە ناشکێ، بەڵام بێگومان ئەگەر ئارەزووەکە ببێتە هۆی مەذیی هاتن، ئەوە دیارە دەستنوێژ دەشکێ، بەهۆی مەذیی هاتنەوەکەوە، نەك دەستلێدانەکە.

---

١) التفسير الكبير للطَّبَراني، ج: (٢)، ص: (٢٤٢).

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءً ﴾، وە ئەگەر ئاوتان وەچنگ نەکەوت کە پێشتر دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءً ﴾، ئەگەر نەخۆش بوون، یان لە سەفەر بوون، یان تارەتتان گرتبوو، یان لەگەڵ هاوسەرانتاندا جوتبوو بوون، وە ئاوتان چنگ نەکەوت دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾، ئەوە ڕووبکەنە ڕووی پاکی خاك، بۆئەوەی کە تەیەمومی پێبکەن، جا هەندێك لە زانایان بۆ لێکدانەوەی ئەم ڕستەیە یاخود چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانەی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ئەگەر ئاوتان چنگ نەکەوت، زۆر مەرجی قورسیان داناون، بۆ وێنە: ئەگەر یەکێك لە سەفەر بوو لە شوێنێکی چۆڵ، دەبێ ماوەیەکی باش میلێك یان زیاتر بڕوا بەلای ڕاستدا، بەلای چەپدا، وە بڕوا بەرەو پێشەوە، وە بۆ لای دواوە بڕواو بە چواردەوری خۆیدا دەبێ بپشکنێ، وە بگاتە دڵنیایی تەواو کە ئاو نیە، ئەوجار بۆی هەیە تەیەمموم بکات ! بەڵام ئەوەی کە لە ڕواڵەتی ئایەتەکە وەردەگیرێ، وە زۆربەی زانایانیش ئەوە ڕایانە، بە مەرجگرتنی گەڕانو سووڕانی زۆر، بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، چونکە بەس دەفەرموێ: ﴿ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءً ﴾، جا ئەگەر ئاوتان چنگ نەکەوت، ئیدی باسی نەکردوە کە زۆر بگەڕێی، تۆ کە لە شوێنێکی دڵنیای ئەو شوێنە ئاوی لێ نیە، پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەی، ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە تۆ بزانی لەو شوێنە ئاو نیە، یان ئاوی لێیە، بەڵام ناتوانی بەکاریبێنی، بۆ وێنە ئاوی لێیە، بەڵام لە بیرێکی قووڵ دایەو بۆت دەرنایە، یاخود ئاوی لێیە، بەڵام شوێنەکە مەترسیی لێیە، یاخود بابایەکی نەخۆشەو ناتوانێ ئاو بەکاربێنێ، یاخود ئاوی لێیە، بەڵام بە نرخێکە بۆی ناکڕێ، لە هەموو ئەو حاڵانەدا بۆت هەیە تەیەمموم بکەی، ئیدی کە شەرعزانان مەرجی قورسیان داناوە، لەڕاستییدا زیاتر وەك دووربینیی (إحتیاط) گوتوویانە، بەڵام دەقی ئایەتەکە دەلالەتی

لەسەر ناكات، گرنگ ئەوەیە ئەو كەسە بگاتە قەناعەت، ئەوە بۆی هەیە تەیەمموم بكات، ئنجا چ لە سەفەربێ، وەك پێشتریش باسمان كرد، یاخود چ نیشتەجێ بێ، جاری وایە كەسێك نیشتەجێیە، بەڵام ئاوی دەستناكەوێ، یان ئاوی دەست دەكەوێ، بەڵام خۆشۆردنی لەش پیسیی لەسەرەو هەتا دەچێ ئاو دێنێ خۆی بشوا، نوێژەكەی دەچێ، لەوكاتەدا بۆی هەیە تەیەمموم بكات بۆ خۆشۆردنەكەی، وە دەستنوێژ دەگرێو نوێژەكەی دەكات، یان ئەگەر نەخۆشە، ئەوە دیسان دیارە پێویستی بە سەفەر نیەو دەتوانێ ئاو بەكاربێنێ.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡ﴾، ڕووبكەنە ڕووی زەوی لە حاڵێكدا كە پاكو خاوێن بێ، وە دەستی پێدا بێنن‌و دەست بە دەموچاوو هەردوو دەستتاندا بێنن.

ئەم ڕستەیە باسی تەیەمموم دەكات، واتە: چۆنیەتی تەیەمموم كردن، جا ئایا تەیەمموم چییە؟ وە بە چی دەكرێ؟ ئێمە لە سێ خاڵدا باسی ئەو مەسەلەیە دەكەین:

## باسێك لەبارەی تەیەممومەوە

یەكەم: تەیەمموم چییە ؟

وشەی: (تەیەمموم) كە لە ئایەتەكەدا هاتوە كە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ﴾، یانی: (فَاقصدوا)، واتە: بیكەنە ئامانج، ڕووی تێبكەن، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (تَيَمَّمْتُ الشيءَ: قَصَدتُهُ)، واتە: ئەو شتەم كردە ئامانج، ئەوە ئەسڵی ماناكەیەتی لە زماندا، بەڵام لە زاراوی شەرعدا دەڵێ: (التَيَمُّمُ: مَسْحُ الوَجه واليدين بالصَّعِيد أو بالتُّرَاب) واتە: دەست بەڕووی زەویی دابێنی، یاخود دەست بە خۆڵدا بێنی‌و بە دەموچاوتیدا بێنی، وە بە هەردوو دەستتی دابێنی، ئەوە مانای تەیەممومە.

دووەم: چۆنیەتی تەیەممووم ؟

هەرچەندە لە بارەی چۆنیەتی تەیەممومکردنەوە زانایان ڕاجیایی یان هەیە: هەندێکیان دەڵێن: پێویستە دوو جار دەست بە زەویدا بدات.

هەندێکیشیان دەڵێن: بەس یەکجار (ضَرْبَةً وَاحِدَةً)و دەموچاوو هەردوو دەستی پێ مەسح بکات. ئنجا لە مەسەلەی دەست بە زەوی دادان دا، کە جارێك بێت، یان دوو جار؟! زانایان ڕاجیاییان هەیە.

هەروەها لەو ڕووەشەوە کە ئایا هەتا کوێ بێ و، کوێ و کوێ مەسح بکات؟ دیسان ڕاجیایی هەیە:

بەنسبەت دەموچاوەوە، ئەوە هەر ڕوو (وَجْهِ)یە کە لە نێوچەوانەوە تاکو چەنەگەیە، لەم گوێیە تا ئەو گوێیە، ئەوە سنووری دەموچاوە.

بەڵام بەنسبەت دەستەوە، سێ ڕایان هەن:

١) هەندێکیان دەڵێن: دەبێ هەتا بن هەنگڵ (إبط)بێ، کە کۆیەکەی (آباط)ە.

٢- هەندێکیان دەڵێن: دەبێ هەتا ئانیشکان (مَرافق) بێ، کە (مِرْفَق)ە، واتە: ئانیشك.

٣- هەندێکیش دەڵێن: دەبێ هەتا مەچەك (رَسْغ)بێ، یانی: هەتا هەردوو لەپە دەست تاکو بازنەی دەست.

بەڵام ئەوە کە ڕای زۆربەیانە، وە بەڵگەی بەهێزتری لەسەرە، ئەوەیە کە بەنسبەت مەسحکردنەوە، یەکجار دەست بە زەوییدا دەدات، وە بۆ هەردووکیشی واتە: هەم بۆ دەموچاوو، هەم بۆ دەستیش، وەك لەم دەقەدا هاتوە: ﴿ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَقَالَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَمَا تَذْكُرُ أَنَّا كُنَّا فِي سَفَرٍ فَأَجْنَبْتُ أَنَا وَأَنْتَ، فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ

النَّبِـيُّ ﷺ: إِنَّمَـا كَـانَ يَكْفِيـكَ هَكَـذَا، فَـضَرَبَ النَّبِـيُّ ﷺ بِكَـفَّيْهِ الأَرْضَ فَنَفَـخَ فِيهِمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨١٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٣)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (١٤٤)، وَالنسائيُّ برقم: (٣١٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٥٦٩))، واته: پیاوێك هات بۆلای عومەری كوڕی خەتتاب (كە دیارە ئەو كاتە حوكمڕانی مسوڵمانان بووە خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: من لەشم پیس بوو ئاویشم دەست نەكەوتوە، (یانی ئەگەر لەشم پیس بوو ئاوم دەست نەكەوت چی بكەم، دیارە ئاوا پرسیاری كردوە) عەمماری كوڕی یاسر (دیارە لە مەجلیسەكەدا بووە خوا لێیان ڕازی بێ) عومەری كوڕی خەتتابی گوت: ئایا بەبیرت نایەت جارێك منو تۆ لە سەفەر بووین، هەردووكمان لەشمان پیس بوو، تۆ نوێژت نەكرد (واته: لەبەرئەوەی ئاوت دەست نەكەوت، دەستنوێژی پێ بگری) بەڵام من هاتم خۆم لە خۆڵی وەرگەوزاند، نوێژەكەم كرد (یانی: وایزانیوە كە تەیەمموم دەبێ هەموو جەستەی خۆی بە خۆڵ، بكاتو خۆی لە خۆڵێ وەرداوە) كە گەڕاینەوە بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕاوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت بەس بوو كە ئاوا بكەی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە زەوی داداو فووی لێكردو بە دەموچاوو دەستی داهێنا.

كەواتە: ئەم دەقە لەوبارەوە هەیە كە تەنیا یەكجار دەست بە زەوی دادانو دەست بە زەوییدا هێنان، وە دوایی دەست بە دەموچاوو هەردوو دەستدا هێنان، بەڵگەی بەهێزترە، بەڵام ئەگەر دووجاریش وا بكات ناڵێین: شتێكی ناشەرعیی كردوە، ئنجا ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ كە لەڕاستیدا هەتاكو هەردوو لەپە دەست شوێنی تەیەممومە، نەك تا ئانیشك، چ جای بن هەنگڵیش، واته: بەڵگەی ئەمە بەهێزترە، هەڵبەته زانایانی دیكەش هەن گوتوویانە: هەتا ئانیشك، وە هەشە دەڵێ: هەتا بن هەنگڵ، بەڵام ئەوەی گوتمان بەڵگەی بەهێزترە، ئەوە بەنسبەت تەیەمموم چۆن دەكرێو، وە ئەندامەكانی تەیەمموم چیو چیو تا كوێن ؟

سێیەم: تەیەمموم بە چی دەکرێ ؟

ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾، ڕووبکەنە صەعیدێکی پاك، (تَيَمَّموا) واتە: ڕووی تێبکەنو بیکەنە ئامانج، (صعيد) واتە: ڕووی زەوی، (طيب) واتە: پاك، وە (صعيد)، (فعيل بِمَعْنَى الفَاعِلِ، أي صَاعد)، واتە: (صعيد) لەسەر کێشی (فعيل)ە، بەڵام بە مانای (فاعل)ە، واتە: (صاعد) یانی: بەرزبووەوە، بۆچی بە ڕووی زەوی دەگوترێ: (صعيد)؟ چونکە بەرزبۆتەوە لە ئاستی زەوی، (زَجَّاج) کە یەکێکە لە شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێ: (الصعيد: وَجْهُ الأرض تُرَاباً كَانَ أَو غَيْره لا أعْلَمُ اخْتِلافاً بَيْنَ أَهْلَ اللُّغَة في ذَلِكَ)[1] واتە: {(صعيد) بریتیە لە ڕووی زەوی، هەرچی لەسەر ڕووی زەوییە پێی دەگوترێ: گڵ، خۆڵ، یان غەیری ئەویش (وەك: لم، چەو، بەفر، گیاوگۆڵ)، نەمزانیوە کە لەوبارەوە شارەزایانی زمان ڕاجیایی یان هەبێ}، وە لە (المصباح المنير)دا کە ئەویش کتێبێکی زمانە، دەڵێ: (الصعيد في كَلاَم العَرَبِ يُطلَقُ عَلَى وجُوه: عَلَى التُّرَابِ الَّذِي عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، وَعَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، وَعَلَى الطريق) [2]واتە: (صعيد) لە زمانی عەرەبیدا بۆ چەند شتێك بەکاردێ: بۆ گڵ بەکاردەهێنرێ کە لەسەر ڕووی زەوییە، وە بۆ ڕووی زەوی بەکاردەهێنرێ بەگشتی، وە بۆ ڕێگاش بەکاردەهێنرێ.

وە لە (لسان العرب)دا دەڵێ: (الصعيدُ: التُّرَابُ أَو وَجْهُ الأَرْضِ)[3]، (صعيد) واتە: گڵ، یان ڕووی خاك، ڕووی زەوی.

ئنجا دیارە دەربارەی مانای وشەی (صعيد)، وە ئەو (صعيد)ەی کە تەیەمموی پێ دەکرێ، کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: بیکەنە ئامانج، زانایان لەوبارەوە بەگشتی دوو بەشن:

---

١) المصباح المنير، للفيومي، ص: (١٧٧).
٢) المصباح المنير، للفيومي، ص: (١٧٧).
٣) ج: (٧)، ص: (٣٤٤).

١/ بەشێكیان دەڵێن: (صعید) تەنیا گڵە، خۆڵە، بەڵكو دەڵێن: هەموو خۆڵێكیش نا، خۆڵێك كە تۆزی لێ هەڵبستێ، وە لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە دێننەوە: ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ: جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ، وَجُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١١٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكُبرى) برقم: (٨٠٢٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٩٧)، وَالدَّارَقُطْني برقم: (٦٨)، واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: بە سێ شتان بەسەر خەڵكدا (واتە: ئۆممەتانی دیكە) هەڵبژێردراوین: (دیارە لە شوێنی دیكە زیاتر دەفەرموێ، بەڵام لێرەدا سێ شت باس دەكات) یەكەم: ڕیزەكانمان وەك ڕیزی فریشتەكان لێكراون، بە ڕیز دەوەستین (دیارە ئۆممەتانی پێش ئێمە بۆ طاعەت بە ڕیز نەوەستاون، هەر یەكە بە تەنیا بۆخۆی طاعەتی كردوە، وە ئێستاش نابینرێ جگە لە ئۆممەتی ئیسلام ئاوا بە ڕیز بووەستن، بەتایبەتی بۆ نوێژ) دووەم: وە زەوییمان هەموو بۆ كراوە بە مزگەوت، (واتە: بۆمان هەیە لە هەر شوێنێك نوێژ بكەین، چونكە ئۆممەتانی پێشوو تەنیا لە شوێنی تایبەتیداو، لە پەرستگاكاندا بۆیان هەبووە خواپەرستیی بكەن) سێیەم: وە گڵی زەوییمان بۆ كراوە بە پاككەرەوە، ئەگەر ئاومان دەست نەكەوت (واتە: هەم لە جیاتی دەستنوێژ بەكاریبێنین، وە هەم لە جیاتی خۆشۆردن).

كەواتە: ئەمە بەڵگەی ئەوانەیە كە دەڵێن: (صعید) تەنیا گڵە، خۆڵە.

٢/ بەشێكیشیان دەڵێن: هەموو ڕووی زەوی بە (صعید) دادەنرێ، وە تەیەممومیشی پێ دەكرێ، جا خۆڵ بێ، لەو زیخ بێ، بەردبێ، گەچ بێ، بەفربێ، گیا بێ، هتد...، بۆچی؟ چونكە مادام هەمووی لەسەر ڕووی زەوییە، هەموو پێی دەگوترێ: (صعید)، بەڵگەشیان ئەم فەرمایشتەی

پێغەمبەری خوایە ﷺ: ﴿ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيّ ﷺ قَالَ: أُعْطِيتُ خَمْساً: لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِن الأَنْبياءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلّتْ لِي الْغَنَائِم، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١١٦٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٣٩٨)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شتم پێدراون لە پێش مندا نەدراون بە کەس: (یەکەم): بۆ ماوەی مانگە ڕێیەك بەهۆی ترس خرانە دڵی دوژمنمەوە، بەسەر دوژمنمدا سەرکەوتووم، (دووەم): وە سەر زەوییم هەموو بۆ کراوە بە مزگەوتو بە پاککەرەوەش (لە هەر کوێیەك ئینسانی مسوڵمان نوێژ بکات دروستە) جا هەر پیاوێك لە ئۆممەتی من نوێژی گەیشتێ، یان کاتی نوێژی لێدا هات، با نوێژ بکات، (سێیەم): وە دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەڵاڵکراونو لە پێش مندا حەڵاڵ نەبوون، (چوارەم): وە شەفاعەتم پێدراوە (پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دواییدا پێش هەموو پێغەمبەران شەفاعەتو تکا دەکات) (پێنجەم): وە پێغەمبەرانی پێش من بۆ گەلێکی تایبەت دەنێردران، بەڵام من بۆ تێکڕای خەڵکی ڕەوانە کراوم.

منیش ڕام وایە کە بەڕاستیی ئەگەر ئەو لێکدانەوەی دووەم نەبێ، کە هەموو ڕووی زەوی پێی دەگوترێ: (صعید)، ئەوە زۆرجار خەڵك پەکی دەکەوێ، کە هەم شارەزایانی زمانیش وادەڵێن، وە هەم فەرموودەکەی پێغەمبەریش ﷺ ئەوە دەگەیەنێ، بەڵێ لە فەرموودەی دیکەدا هەیە باسی خۆڵو گڵ (تراب) دەکات، لەبەرئەوەی گڵو خۆڵ لە زۆر شوێنی زەوی هەیە، بەڵام ئەگەر بەپێی ڕای دووەم نەبێ، یانی: (صعید) بە هەموو ڕووی زەوی لێکنەدەینەوە، مسوڵمانان لە زۆر شوێنان پەکیان دەکەوێ! بۆ وێنە: پێغەمبەری

خوا ﷺو هاوەڵانی لە جەنگی (تەبووك)دا مانگە ڕێیەك لە حیجاز، لە مەدینەوە چوون بەرەو شام كە هەمووی بیابانە، هەمووی لمە، گڵ لە كوێ بێنن ؟! دەبێ چۆن نوێژیان كردبێ ؟! بە تەئكید دەستیان بە لم داهێناوە، یان كەسێك لە چیاو چۆڵێكە بەفر دەبارێ هەمووی هەر بەفرە، گڵ لە كوێ بێنن تەیەممومی پێ بكات؟! كە من بۆخۆم چەندجاران وام بەسەرهاتوە، كاتی خۆی كە پێشمەرگە بووینو لە چیاو چۆڵ بووین، چونكە ئەگەر بەفرەكەش لابەری، جاری وا هەیە مەترێكیش ئاوی بەفرەكە بە زەوییدا چۆتە خوارێو هەمووی هەر قوڕە ! وە جاری وایە شوێنەكە هەمووی بەردو چەوو زیخە، یان جاری وایە بەهارە هەمووی گیاو گوڵە، بۆیە بەپێی ڕای دووەم بێ دەست بەسەر ڕووی زەوی دا دێنی جا گیایە، لمە، بەردە، زیخە، گڵە... هتد، هەرچی هەیە، دەستی پێدادێنی، بەتایبەتی لە زستاندا كە هەمووی دەبێتە قوڕ، هەر دەستی پێدا بێنە، هەڵبەتە نەك بەو شێوەیەش كە قوڕ لە دەموچاوی خۆی هەڵسوێ ! هەر دەستی پێدا بێنێ، بایی ئەوەندە كە مەسحی بكا، چونكە هەندێ كەس وادەزانێ كە دەست بە خۆڵ داهێنان، ئەوەیە كە خۆڵەكە هەڵگرێو دوایی بە دەموچاوی خۆیدا بكات ! نا، وەك حەدیسەكە فەرمووی: (فَنَفَخَ فِيهِمَا) دەستی بە زەویدادا، دوایی فووی لێكرد، بۆئەوەی خۆڵی پێوە نەمێنێ، ئنجا دەستی بە دەموچاوی داهێنا، كەواتە: ئەوە زیاتر شتێكی پەرستش (تعبُّدي)یەو وەك ڕەمزو هێمایەكە كە تۆ ئاوت دەستنەكەوێ، دەست بە ڕووی زەوی دادێنیو بە دەموچاوتی دا دێنیو بە دەستەكانت دا دێنی، وە ئەو طاعەتو عیبادەتەی خۆت ئەنجام دەدەی.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئایا تەیەمموم بۆ هەموو نوێژێ پێویستە، یان ئایا بە تەیەممومێك نوێژی فەرزو سوننەت دەكرێ؟ وەك چۆن بە دەستنوێژێك دەتوانرێ چەند نوێژێك بكرێ؟ لەم مەسەلەیەشدا ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایاندا، بەڵام بەڕاستیی من كە زۆر تەماشای ئەم مەسەلەیەم كردوە، وەك لە كتێبی (خواپەرستی ئیسلامیی)یش لە بەرگی یەكەمدا بە تەفصیلْ باسم كردوە، پێمـوایەو بە سەرنجدانی ڕواڵەتی ئایەتەكە، وە سەرنجدانی

فەرموودەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ بۆمان دەردەکەوێ، کە مادام خوای کاربەجێ تەیەمومی کردوە بە بەدیل بۆ دەستنوێژ (وضُوء)و بۆ خۆشۆردن (غُسْل) لە کاتی نەبوونی ئاو، یان نەگونجانی بەکارهێنانی ئاودا، کەواتە: دیارە ئەو تەیەمومە هەمان حوکمی ئەو دەستنوێژەو ئەو خۆشۆردنەشی هەیە، واتە: چی بە دەستنوێژەکە دەکرێ، بە تەیەمومەکەش دەکرێ، وە چی بە خۆشۆردن دەکرێ بە تەیەمومەکەش دەکرێ، لەوبارەشەوە با تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٣١٣)، وَالحاكم برقم: (٦٢٧) وَقَالَ: صَحِيحٌ، وفي رواية لأبي داود وَصَحَّحَهُ الألباني عَنْ أبي ذَرٍ: (الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ وضُوءُ الْمُسْلِمِ)، واتە: ڕووی پاکی زەوی پاککەرەوەیە بۆ مسوڵمان، ئەگەر بۆ ماوەی دە (١٠) ساڵانیش ئاوی چنگ نەکەوێ، ئاوی چنگ کەوتو توانی بەکاریبێنێ، با ئەوجار ئاو بە بەدەنی خۆیدا بێنێ، (واتە: خۆی پێ بشوات، یاخود دەستنوێژی پێ بگرێ). ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین فەرموودەکە وشەی: (الطَّيِّبَ)ی بەکارهێناوە، هەروەها خوای پەروەردگاریش هەر وشەی: (الطَّيِّبَ)ی بەکارهێناوە، واتە: ئەگەر شوێنێك پیس بێ، یان شتی پیسی لێبێو تۆ دەستی پێدابێنی، ئەوە بەکەڵك نایەت، بەڵكو دەبێ شوێنێكی پاك بێ، بەڵێ ڕووی پاکی زەوی پاککەرەوەی مسوڵمانە، ئەگەر بۆ ماوەی دە ساڵانیش ئاوی چنگ نەکەوێ، بۆ وێنە: کابرا سجن دەکرێ، وە من بەخۆم کە لە زیندانی ئەمریکییەکاندا بووم، هەر ئاوی خواردنەوەشیان بە زەحمەت دەداینێ، ئاوی گەرمیان دەداینێ، ئنجا ئاو لە کوێ بێنین بۆ دەستنوێژ؟ یان یەکێك ئەگەر لەشی پیس بووایە، هەر دەبوو دەست بە دیوارەکاندا بێنێ، دەست بە خۆڵەکەدا بێنێ، شەریعەت پەکی خەڵکی ناخات، مرۆڤ جاری وایە لە زیندانی تاکییدا

بەندی دەکەن‌و ماوەی چەند ساڵان ناهێڵن خۆی بشۆرێ، ناهێڵن دەستی بگاتە ئاوێ، ئەوە چی دەکات؟ حەدیسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ دەکات، ئەگەر ماوەی دە ساڵانیش ئاوی چنگ نەکەوێ، بۆی هەیە تەیەممووم بکات، هەم لەجیاتی خۆشۆردن‌و هەم دەستنوێژیش.

فەرموودەیەکی دیکە کە (أبو داود) لە ئەبو زەڕەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی، وە (الألباني)یش بە (صحیح)ی داناوە، دەڵێ: {الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ وضُوءُ الْمُسْلِمِ}، واتە: ڕووی پاکی زەوی دەستنوێژی ئینسانی ئیماندارە، واتە: هەر لەگەڵ دەستنوێژدا هیچ جیاوازییەکی نیە.

ئنجا ئایا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە کە بە دەستنوێژێك زیاتر لە فەرزێك دەکرێ ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، لە ساڵی ئازادکردنی مەککەدا هەر پێنج فەرزە نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کردن، ﴿عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷛، أَنَّ النَّبِيّ ﷺ صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شيئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ، قَالَ: عَمْدًا صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٤٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٦١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٧٠٨)، واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا هەموو نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کردن، (لە نوێژی بەیانی ڕا تا خەوتنان)، وە مەسحیشی لەسەر خوفەکانی کرد، (واتە: لەسەر گۆرەوی چەرم، هەڵبەتە لەسەر گۆرەوی دیکەش مەسح هەر دروستە)، جا عومەر خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە پێی گوت: ئەمڕۆ شتێکت کرد کە پێشتر نەتکردوە، (دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابووە، بۆ هەموو نوێژەکان دەستنوێژی تازە کردۆتەوە، ئەگەر دەستنوێژیشی هەبووبێ، هەر دەستنوێژی تازە کردۆتەوە، بۆیە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، تێبینیی کردوە ئەو ڕۆژە هەموو فەرزەکانی بە یەك دەستنوێژ کردوە، جا

تەماشا بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئێمە چەند بە ڕەحمو میهرەبان بووە!)، ئەویش فەرمووی: (عَمْدًا صَنَعْتُهُ يَا عُمَرُ) ئەوە بەئانقەست وامکرد ئەی عومەر! ئانقەستەکە بۆچی؟ بۆئەوەی ئەگەر کەسێك کە دەرفەرتی نابێ دەستنوێژ تازە بکاتەوەو ئاوی چنگ ناکەوێ، بزانێ کە هیچ ئیشکالێکی تێدانیە، دەتوانێ دوو نوێژان بکات بە دەستنوێژێك، یان سێ فەرز، یان پێنج فەرزان بکات، کە هەر ئەوەندەش دەکرێ، چونکە خۆ کەس ناچێ دوو ڕۆژان بە یەك دەستنوێژ نوێژان بکات، ئەگەر هەر پێنج فەرزەکان بە دەستنوێژێکی بکات دروستە، ئنجا مادام تەیەمومیش بەدیلی ئاوە، چی بەو ئاوە دەکرێ، دەستنوێژی پێ دەگیرێ، غوسلی پێ دەکرێ، چەند فەرزی پێ دەکرێ، مانای وایە تەیەمومەکەش هەروایەو وەك دەستنوێژەکەیە.

شایانی باسیشە کە لە ئایەتی ژمارە (٦)ی سوورەتی (المائدة)شدا ئەم بابەتە باسکراوە، کە إن شاء اللّٰه لەوێ زیاتر شتی لەبارەوە دەڵێم(١).

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەدا دەڵێم: ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە بزانرێ شەریعەت هەمیشە لای ئاسانیی گرتوە، خوای بە بەزەیی هەر لەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة)دا کە باسی دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمموم دەکات لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾، واتە: خوا نایەوێ بە هیچ جۆرێك سەغڵەتتان بکات، ئەمەش دەقی ئایەتەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ

---

١) سوپاس بۆ خوا لەوێ توێژینەوەیەکی چڕوپڕترو تێروتەسەلترم لەبارەی دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمموم مەسح لەسەر گۆرەویو خوفف کردوەو، هەرچی لێرە نەگوتراوە، لەوێ قەرەبوو کراوەتەوە، چونکە ئەوێ شوێنی تەرخانکراوی باسی دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمومە، وەك دوایین حوکمی شەریعەتو (المائدة)ش دوایین سوورەتی قورئانە کە دابەزیوە.

إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُوا۟ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴿٦﴾﴾.

کەواتە: بەڕاستیی شەرعزانانو، مامۆستایان پێویستە زۆر لەوە وریابن، هی وا هەیە تەیەممومەکەش هێندە لە خەڵك قورس دەکات، هەر یەکجاریی عاسێیان دەکات! نەخێر، وەك باسمان کرد: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بە دیواردا هێناوەو تەیەممومی پێکردوە، یاخود هەرشتێك کە تۆزو خۆڵیشی نەبێ، هەر ڕووی زەوی بێ، مادام پاکبێ دەستی پێدابێنی، ئەوە تەیەممومە، ئنجا لەڕاستییدا بەو شێوەیەی کە شەریعەت دەفەرموێ: خەڵك عاسێ نابێ، وە خەڵك طاعەتو عیبادەتی بۆ ئاسان دەبێ، بەڵام زۆرجار ئێمە خۆمان وەك بەشەر لە ئەنجامی تێنەگەیشتنمان لە دەقەکانی شەریعەت دێنین شتەکە ئاڵۆزو قورسو بە زەحمەت دەکەین، ئەگەرنا وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو زەحمەتی بۆتان ناوێ، وە دیاریشە ئەوەی لە قورئانو سوننەت دا هەیە زەحمەتی تێدانیە، بەڵام دوایی کە هەندێك لە زانایانو مامۆستایان لەبەر دووربینیی (إحتیاط)و زۆر هەڵکۆڵین، دێنن شتەکە زۆر قورسو ئاڵۆز دەکەن، ئەوە خۆمان وە زەحمەتمان خستوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا دین ئاسانەو لەگەڵ فیطرەتی ئینساندا دەگونجێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا، چوارده (١٤) ئایەت لە سوورەتی (النساء) تەفسیر دەکەین، ئەم چوارده ئایەتە، جگە لە دوو ئایەتی کۆتایی واتە: ئایەتی (٥٦ و ٥٧)، ئەوانی دیکە هەموویان واتە: (١٢) ئایەت، تەرخان کراون، بۆ خستنەڕووی کۆمەڵێك بیروڕاو هەڵوێستو ڕەفتاریی چەوتو هەڵەی خاوەن کتێبەکان، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکانو ئەوانی دیکەش، بەڵام بەتایبەت جوولەکەکان، لە چییدا؟ لەوەدا کە بە دوای گومڕایی کەوتوون، وە هەوڵ دەدەن بۆ گومڕاکردنی مسوڵمانان، وە تەعبیرو وشەکان دەگۆڕن، یاخود یاساکانی خوا دەگۆڕن، وە قسەو تەعبیری ناشایستە بەکاردێنن، وە خۆ پەسندنو درۆ هەڵدەبەستن بە ناوی خواوە، وە ئیمان دێنن بە بتو صەنەمو طاغووتو پشتگیریی بێبڕوایان دەکەن لەسەر ئیمانداران، وە ئێرەییو حەسوودیی دەبەن بە پێغەمبەری خوا ﷺو بە ئیمانداران، وە لەمیانەی ئەوەدا خوای پەروەردگار کەموکوڕییەکانیان دەخاتەڕوو، ئامۆژگارییشیان دەکات، کە ئیمان بەو کتێبەی خوا بێنن، کە دایبەزاندوە، کە ئەو کتێبەی وانیش بە ڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەکەی، وە هەڕەشەشیان لێدەکات کە ئەگەر ئیمان نەهێنن، شایستەی سزای سەختی خوای دادگەرن لە دنیاو لە دوارۆژدا، هەروەها لەومیانەدا خوای پەروەردگار خستوویەتە ڕوو کە لە تاوانی شیرك نابووریّ بە هیچ جۆرێك، بەڵام جگە لە شیرك ئەگەر بیەویّ دەگونجیّ لە هەر گوناهێکی دیکە ببووریّ، بەبیّ ئەوەی کە خاوەنەکەی تۆبەی لیّ بکات، دیارە ئەگەر تۆبەی لێبکات، هەموو گوناهێك دەبەخشریّ، بە شیركو کوفریشەوە، وە لە دوو ئایەتی کۆتاییدا، خوای پایەدار باسی سزای بیّبڕوایان دەکات، ئەوانەی کە بیّبڕوان بە ئایەتەکانی خوا، وە پاشان باسی پاداشتی ئیمانداران دەکات، ئەوانەی کردەوەی باش ئەنجام دەدەن.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَـٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟
ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا
بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ
وَأَقْوَمَ وَلَـٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ
ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ
نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ
وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ
يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّـٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ
مِّنَ ٱلْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن
فَضْلِهِۦ ۖ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَـٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ فَمِنْهُم مَّنْ
ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ
نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ
عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ﴾.

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەكـان

((ئایـا سـەرنجی ئەوانـە نـادەی کـە پـشکێك لـە کتێـب (ی خـوا)یـان پێـدراوە، گـومڕایی دەکـڕنو دەیانـەوێ ئێـوەش ڕێ ون بکـەن ﴿٤٤﴾ وە خـوا (لـە خۆتـان) بـە دوژمنـەکانتان زانـاترەو خـواش بەسـە سەرپەرشـتو یاریـدەدەر(تـان) بـێ ﴿٤٥﴾ لـە جوولەکـەکان کەسـانێك هـەن کـە وشـەکان لـە شـوێنی خۆیـان لادەدەن، وە دەڵێن: بیـستمانو سـەرپێچییمان کـرد، وە ببیـستە پـێ بیـستـراو نـەبی، وە چاودێرییمان بکە، بە زمان بادانەوەو بـە تانـە لـە ئایین دانـەوە (ئـەو قسانە دەکـەن)، وە ئەگـەر گوتبایان: بیستمانو فەرمانبـەرین، وە ببیسـتـەو چاوەڕوانییمـان بکـە، ئـەوە بۆیـان باشـتــرو ڕاسـتتــر بـوو، بـەڵام خـوا بـە هـۆی بێبــڕوایی یەکەیانــەوە نـەفرینی لێکردوون، بۆیە کەمێك نەبێ بڕوا ناهێنن ﴿٤٦﴾ ئەی ئەوانـەی کتێبتـان پێـدراوە ! بڕوا بەو (کتێـب)ە بـێـنن کە ئەو (کتێـب)ەی بە ئێوەشـە بـە ڕاسـتی دەزانـێ، (وەك ئەســـڵەکەی)، بــەر لــەوەی هەنــدێك ڕووان (دەمو چـاوان) لــە شـوێنی خۆیــان بسڕینەوەو بیـانگێڕینـەوە بۆ پشـتەوەیان، یـان (بـەر لـەوەی) وەك چۆن هاوەڵانی شـەممەمان نەفرین کـرد، نـەفرینیان لـێ بکـەین، وە ئـەوەی خـوا فـەرمانی پێکـرد، دێتـە دی ﴿٤٧﴾ بـێگومان خـوا لـەوە نـابووری هاوبەشـی بۆ دابنـرێ، بـەڵام جگــە لـەوە هـەر کەسـێك بیـەوێ لـێی دەبـووری، وە هـەر کەسـێك هاوبـەش بـۆ خـوا دابنــێ، گونـاهێکی مەزنــی هەڵبەسـتوە ﴿٤٨﴾ ئایـا سـەرنجی ئەوانـە نـادەی کـە (بـە قسـە) خۆیـان پـاكو چـاك دەکـەن! بـەڵکو خـوا ئـەو کەسـەی بیـەوێ پـاكو چـاکی دەکـات، وە هێنـدەی دەزووی سـەر نێوکـە خورمـا ستەمیان لێناکرێ ﴿٤٩﴾ سـەرنج بـدە ! چـۆن درۆ بـە نـاوی خـواوە هەڵدەبەسـتن، گونـاهیش لـەوە ئاشـکراتر نـابێ ﴿٥٠﴾ ئایـا سـەرنجی ئـەوانەت نـەداوە کـە بەشـێك لـە کتێـب (ی خـوا)یـان پێدراوە، بڕوا بە بـتو طاغووت دێنـنو، بەوانەی بێبـڕوان دەڵێن: ئەوانە ڕێیـان ڕاسـتـترە،

لەوانەی ئیمانیان هێناوە! ئەوانە کەسانێکن خوا نەفرینی لێکردوون، هەر کەسێکیش خوا نەفرینی لێبکات، هیچ یارمەتیدەرێکت بۆی چنگ ناکەوێ ﴿٥١﴾ یان ئایا (ئەوانە) پشکیان لە حوکمڕانییو دەستەڵاتدا هەیە؟ ئەگەر هەیانبێ هێندەی درزو کەلێنی سەر نێووکە خورما (لەو حوکمڕانییە) بەشی خەڵکی نادەن ! ﴿٥٢﴾ یان ئایا ئێرەیی بە خەڵك دەبەن، لەسەر ئەو بەخششەی خوای کە پێی داون! دەجا بێگومان (پێشتریش) کتێبو حیکمەتمان بە ئیبراهیمو نزیکانی دابوو، وە دەستەڵاتێکی مەزنمان پێبەخشیبوون ﴿٥٤﴾ جا هەیانبوو بڕوای پێ هێناو، هەشیان بوو خەڵکی لێ پرینگاندەوە (و دوور خستەوە)، لە دۆزەخیش بڵێسەدارتر نیە! (بۆ سزادانی ئەو جۆرە کەسانە) ﴿٥٥﴾ بێگومان ئەوانەی بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانمان، لەمەودوا لە ئاگرێکدا دەیانبرژێنین، هەر کە پێستەکانیان برژاو داماڵرا، پێستی دیکەیان بە بەردا دەکەین، تاکو (زیاتر) ئازار بچێژن، بەڕاستیی خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿٥٦﴾ وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، لەمەودوا دەیانخەینە چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بۆ هەتا هەتایە تێیاندا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، لەوێدا هاوسەرانێکی چاكو پاككراوەیان هەن، وە دەیانخەینە بن سێبەرێکی خۆشو بەردەوام ﴿٥٧﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(نَصِيبًا): (النَّصِيبُ: الْحَظُّ المَنْصُوب، أي: المُعَيَّن)، (نَصِيب) واتە: بەشێكی دیاریکراو كە دانراوەو تەرخان كراوە، یاخود شتێکە دیاری كرابێ.

(يُحَرِّفُونَ): واتە: لادەدەن، دەگۆڕن، (تَحْرِيفُ الشَّيءِ إمَالَتُهُ كَتَحْرِيفِ القَلَم، وَتَحْرِيف الكَلاَمِ، أَنْ تَجْعَلَهُ عَلَى حَرْفٍ مِنَ الإحْتِمَالِ يُمْكِنُ حَمْلُهُ عَلَى الوَجْهَيْنِ) تەحریفی هەر شتێك بریتیە لە لادانی، بادانی، وەك: قەڵەم چۆن كە دەیسووڕێنی، وە مەبەست لە گۆڕینی قسە ئەوەیە، كە قسەكە بە جۆرێك بكەی دوو واتایان بگرێتەوە، ئەملاش بگرێتەوە، ئەو لایش بگرێتەوە، (وەك قسەیەكی خۆش بۆتان دەگێڕمەوە: جارێك برایەكی ئێمە گیرا بوو لەلای یەكێك لەو حیزبانە، جا دیارە زۆر ڕقیان هەڵساندبوو گوتبووی: وەڵلاهی سوێند دەخۆم نیوەتان كافرن! جا دوایی كە ئازاد كرا، منیش گوتم: هەڵبەتە نەدەبووایە ئەو فەتوایە بدەی، بەڵام قسەكەت زۆر بە لێزانیی كردوە، گوتی: چۆن؟! گوتم: دوایی ئەگەر هەر كەسێك لەو حیزبانە ملی گرتبای‌و گوتبای: من حوكمم چۆنە؟ دەتگوت: تۆ لە نیوەكەی دی، بەڵام ئەگەر گوتبات هەموو كافرن، هیچ مەجالت نەدەما) بە هەرحاڵ تەحریف بریتیە لە گۆڕین‌و لادان واتە: قسەیەك بە جۆرێك بكەی، كە دوو واتایان بگەیەنێ، كە لێرەدا مەبەست پێی ئەو شێوە هەڵسوكەوتەی جوولەكەكانە، كە دوایی باسی دەكەین.

(الْكَلِمَ): كۆی (كَلِمَة)یە، (كَلِمَة) واتە: وشە، (كَلِمْ)، واتە: وشەكان، كە دەگونجێ مەبەست لە (كَلِم) لێرەدا وشەكانی خوابێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو قسەو تەعبیرانەی خۆیان بێ، كە بەكاریان دەهێنا بۆ قسە كردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ.

(غَيْرَ مُسْمَعٍ ): (إسْمَعْ) واته: ببيسته، (غَيْرَ مُسْمَعٍ) واته: نا پێ بيستێنراوبى، نەبيستى، جا ئەوەش دوو ئيحتيمالى هەن: دەگونجێ مەبەست پێى ئەوەبێ: گوێت لێبێ، شتى خراپ قەت نەبيستى، ياخود گوێت لێبێ، شتى باش قەت نەبيستى، ئەوە بە هەردوو لايەكاندا ماناى هەيە.

(وَرَٰعِنَا ): لە زمانى عەرەبيدا دەڵێ: (رَاعَاهُ، يُرَاعِيهِ، رَعِنَا) واته: چاودێرى كرد، چاودێريى دەكا، چاودێرييمان بكە، ڕەچاومان بكە، ئاگات لێمان بێ، بەڵام ئەوان مانايەكى خراپيان پێ مەبەست بوو، دەڵێ: (رَعِنَ الرَّجُلُ يَرْعَنُ رَعَنًا، فَهُوَ رَعِنٌ، وَأَرْعَنٌ، وامرأَةٌ رَعْنَاءُ)، (رَعِنَ الرَّجُلُ) واته: پياوەكە گێلە، يان كەودەنە، يان كەم هۆشە، (أَرْعَن) واته: گێلو نەفام، وە بە ئافرەت دەگوترێ: (رَعْنَاء)، واته: ئافرەتێكى گێل، بەڵام (رَاعِنَا) واته: چاودێرييمان بكە، ڕەچاومان بكەو بمانپارێزە.

(لَيًّا ): (لَيًّا بألسِنَتِهِم) واته: زمانيان پێ بادەدا، زمانيان پێ دەسووڕاند، (اللَّيُّ: فَتْلُ الْحَبْلِ، لَوَيْتُهُ أَلويهِ ليًّا، وَلَوى يَدَهُ وَلَوى رَأسَهُ وَبِرَأسِهِ: أَمَالَهُ، وَلَوى لِسَانَهُ بِكَذَا: كِنَايَةً عَنِ الكَذِب)، (لَيُّ) واته: دەزووێك، پەتێك گرێ بدەی، ياخود دوو لاى بێنيەوە، (لَوَيْتُهُ أَلويهِ ليًّا) واته: دوو لام كردەوە، ياخود بامدا، وە دەگوترێ: (وَلَوى يَدَهُ وَلَوى رَأسَهُ وَبِرَأسِهِ: أَمَالَهُ) دەستى سووڕاند، وە سەرى خوار كردەوەو سەرى سووڕاند، وە لە زمانى عەرەبيدا دەڵێ: (وَلَوىَ لِسَانَهُ بِكَذَا) ئەوە كينايەيە لە درۆ، واته: درۆى كرد.

(وَطَعۡنٗا ): واته: تانەدان، لە كوردەواريى خۆماندا دەڵێين: تانەى لێدا، تانە لە چ ڕا هاتوە ؟ (الطَّعْنُ: الضَّرْبُ بِالرُّمْحِ وَبِالقَرْنِ، وَاسْتُعِيرَ لِلْوَقِيعَةِ)، (طَعْن) بريتيە لە لێدانى شتێك بە ڕمو بە قۆچ، وە دوايى خوازراوەتەوە بۆ جنێودان بە خەڵك، كەسێك جنێو بە كەسێك بدات، زەمى بكات، غەيبەتى بكات، پێى دەگوترێ: (طَعَنَهُ) يان (طعَنَ فيهِ).

(نَّطۡمِسَ ): بیسڕینەوە، (الطَّمْسُ: إِزَالَةُ الأَثَرِ بِالْمَحْوِ)، (طَمْس) ئەوەیە شتێك شوێنەواری نەهێڵی، خوا هەڕەشەیان لێدەكات، دەفەرموێ: بترسێن لەوەی كە دەموچاوتان بسڕینەوە، (عَلَى أدبَارِهَا) واتە: لێرە بیسڕینەوە بیخەینە پشتەوە، یان دەموچاوتان وەرسووڕێنین.

(ٱفۡتَرَىٰٓ ): واتە: هەڵیبەست، درۆیەك كە هەڵبەستری، (الفَرْيُ: قَطْعُ الجِلدِ لِلخَرْزِ والإِصْلاَحِ، وَاسْتُعْمِلَ الإِفتراء فِي القُرآن فِي الْكَذِبِ، وَالشِّرْكِ، وَالظُّلْم)، (إفْتَرَى) لە (فَرْي)ەوە هاتوە، (فَرْي) واتە: (قَطْع) بڕینی چەرمێك، پێستێك، بۆئەوەی پینەی پێ لە شتێك بدات، وە (إفْتَرَاء) بەكارهێنراوە بۆ درۆو هاوبەش بۆ خوا دانانو ستەم، وە كە دەگوترێ: (إفْتَرَاهُ) واتە: درۆی كرد، یاخود زوڵمی كرد، یان شیركی كرد.

(يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ): واتە: خۆیان بە ئینسانی چاك دادەنێن، یاخود ستایشی خۆیان دەكەن، خۆیان پەسند دەكەن، (التَزْكِيَةُ: تَنَمْيَةُ النَّفس بِالخَيْرَات وَالبَرَكَات، وَ التَزْكِيَةُ بِالفعلِ مَحْمودٌ وَبِالقَوْل مَذمومٌ)، (تَزكيَة) بریتیە لەوە كە نەفسی خۆت گەشە پێبدەی بە سیفەتە چاكەكان، وە بە كردەوە بە پێزەكان، وە (تَزكيّة) ئەگەر بە كردەوە بیكەی باشە، بەڵام ئەگەر بە قسە خۆت چاك بكەی، خراپە.

(فَتِيلًا ): (فَتِيل) شتێكە وەك چڵك كە بە دوو سەرە پەنجەت دەیپرووێنی، (فَتَلْتُ الْحَبْلَ فَتْلاً، وَالفَتِيلُ: المَفْتُولُ وَسُمِّيَ مَا يَكُونُ فِي شَقِّ النَّوَاةِ فَتِيلاً، لِكَونِهِ عَلَى هَيْئَتِهِ)، (فَتِيل) شتێكی زۆر تەنكە بەسەر نێوكی خورماوەیە، (لەسەر نێوكەكەی توێكڵێكی زۆر تەنك هەیە پێی دەگوترێ: فەتیل).

(بِٱلۡجِبۡتِ ): (الجِبْتُ والجِبْس: الفَسْل الَّذِي لا خَيْرَ فِيهِ، وَكُلُّ مَا عُبِد مِنْ دُونِ اللَّهِ جِبْت، والسّاحر والكاهن جبْت)، (جِبْت) هەر شتێكە كە خێری پێوە

نەبێ، شتێکی بێ کەڵك، وە لێرەدا کە بەکارهێنراوە بۆ هەر پەرستراوێك لە جیاتی خوا، یان لەگەڵ خوا بپەرسترێ، دەگوترێ: (جِبْت)، هەروەها بە فاڵچیی‌و جادووگەرو کاهینیش دەگوترێ: (جِبْت).

(وَٱلطَّٰغُوتِ ): (طاغوت) واتە: کەسێك کە یاخیی بووەو لە سنوور دەرچووە، (الطغيان: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي العِصيَانِ، والطَّاغوت: كُلُّ مُتَعَبَّد وَمَعبُود مِنْ دونِ اللّهِ)، (طغيان) واتە: سنوور بەزاندن لە سەرپێچییدا، کەسێك هێندە سەرپێچیی بکات تێبپەڕێنێ لە هەموو سنوورێك، وە (طاغوت)یش هەر کەسێکە کە دەپەرسترێ، وە هەر پەرستراوێکە لە جیاتی خوا، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین، من پێم وایە (طاغوت) زیاتر بۆ ئەو کەسانە بەکاردێ کە خاوەن دەستەڵاتن، وە خەڵك ناچار دەکەن بە قسەیان بکەن، وە لە جیاتی خوا حەڵاڵ‌و حەرام بۆ خەڵك دیاری دەکەن، واتە: وشەی (طاغوت) بۆ بت‌و صەنەم بەکارنایەت، بەڵکو بۆ خاوەن ئیرادە بەکاردێ، دوایی ڕوونی دەکەمەوە لەبەر چی وادەڵێم؟!

(نَقِيرًا ): (النُّقْرَة: وَقْبَةٌ في ظَهْرِ النَّواةِ، وَيُضْرَبُ بهِ الْمَثلُ فِي الشَّيءِ الطَّفِيف)، (نُقْرة) بەو درزە دەگوترێ کە لەسەر پشتی نێوکە خورمایە، وە بە وێنە دەهێنرێتەوە بۆ شتی بچووك‌و کەم.

(يَحۡسُدُونَ ): (يَحْسُدُونَ النَّاس) واتە: ئێرەیی بە خەڵك دەبەن، لە کوردەواریی خۆماندا حەسوودییش بەکاردێنن، دەڵێن: حەسوودیی پێ برد، ئێرەیی پێ برد، حەسەد چییە؟ (الحَسَدُ: تَمَنِّي زَوَالِ نِعْمَةٍ مِن مُسْتَحَقٍ لَهَا، وَرُبَّمَا كَانَ مَعَ ذَلِكَ سَعِيٌ فِي إِزَالَتِهَا)، (حَسَد) بریتییە لەوەی کە کەسێك نیعمەتێکی هەیە، وە شایستەی ئەو نیعمەتەشە، تۆ خۆزگە بخوازی ئەو نیعمەتەی نەمێنێ، وە جاری وایە لەگەڵ خۆزگە خواستندا هەوڵدانیش هەیە بۆ لابردنی ئەو نیعمەتە لەو کەسە، (بۆ وێنە: کەسێك کە خەڵك خۆشی دەوێ، حورمەت‌و ڕێزێکی هەیە لەنێو خەڵك، یەکێکی دیکە حەز

ناكـات ئـەو حورمــەتو ڕێــزەی هــەبێ، لەگـەڵ ئەوەشــدا كـە شـایـستـەیەتـی، ئنجـا وێـڕای پێخۆشـبوونی ئـەوە كـە ئـەو نیعمــەتەی لـێ لابـچـێ، هـەوڵیش دەدات، یــانی: زەمـی دەكـات، دەیـەوێ بیـشكێنـێ لـەنێو خەڵـكدا، تۆمــەتو بوختـانی بـۆ هەڵدەبەسـتێ، ئـەوە حەسـەدە، ئـەوەش كـە گوتوویـەتی: (كُلُّ العَدَاوات قَدْ تُرجـى إِزَالَتُهَـا إلاَّ عَدَاوَةَ مَنْ عَـادَاكَ مِـنْ حَسَدٍ) واتـە: هـەموو دوژمنــایەتییەك دەگونجــێ كۆتـایی پــێ بـێ، جگـە لـە دوژمنـایـەتیــی ئـەو كەســەی كـە لەبـەر حەسـوودیی دژایـەتیت دەكـات، ڕاسـت دەكـات، ئـەوە هـیچ چــارەی نیــە، چــونكە گــوتراوە: (لا عِـلاج لِلْحَـسَدِ! إمَّـا مَـوتُ الحَاسِـدِ أو المَحْسودِ)، واتـە: حەسـوودیی هـیچ چارەســەری نیـە، یــان ئەوەتــا دەبــێ بابـای حەسوود بمرێو لـە كـۆڵ بـێـتـەوە، یـان دەبـێ بابـای كـە حەسـوودیی پــێ دەبـرێ، وەفـات بفـەرموێ.

(مُّلْكًا): (المُلْكُ: هُوَ التَّصَرّفُ بِالأَمْرِ وَالنَّهيُّ في الجمهورِ، وَذَلِكَ يَخْتَصُّ بِسيَاسَةِ النَّاطِقِين، وَلِهَـذَا يُقَالُ: مَلِكُ النَّـاسِ، وَلاَ يُقَـالُ: مَلِكُ الأَشَيَاء)، لە زمانی عەرەبیــدا (مَلِك)مان هەیـە، (مَالِك)مـان هەیــە، (مَالِك) واتـە: خـاوەن، (مَلِك) واتـە: پادشــاو حوكمــڕان، دەڵـێ: موڵـك كـە هـی مەلیكـە بریتیـە لـە دەسـتوەردانە فـەرمانو نەهــی، یـاخود فەرمانــكردنو نەهیــكردن لەگــەڵ خەڵـكــدا، ئــەوەش تایبەتــە بــە سـەرپەرشـــتییكردنی خـــەڵكو مرۆڤــەكانەوە، بۆیــە دەگــوترێ: (مَلِكُ النَّاسِ) بــەڵام نــاگوترێ: (مَلِكُ الأَشَيَاء)، پاشــای شـــتەكان، بەڵــكو دەگــوترێ: (مَالِكُ الأَشَيَاء) خــاوەنی شــتەكان، وە دەگـوترێ پادشــای خەڵـكی، چونكە پاشـاو مەلیـكو حوكمـــڕان، ئەو كەسەیە كە تەصەڕڕوف لـە خەڵـكدا دەكـاتو حوكمیـان بەسـەردا دەكات، جـا بە هــەق بـێ، یـان بە ناهــەق.

(نُصۡلِيهِمۡ): واتــە: دەیانبــرژێنین، لـە تەفسیـرەكاندا دەڵـێ: (نُدخِلهُم) بـەڵام لـە ڕاستیدا وشەی (صَلْي) جیایە لە (إدخال)، (أَصْلُ الصَّلي إيقادُ النار، وَصَلَيْتُ

الـشَّاةَ، شَـوَيْتُهَا وَهِـيَ مَـصْلِيةٌ)، وشـەی (صَـلْي) لـە ئەسـڵی زمـانی عەرەبیـدا بریتیـە لـەوەی کـە دەوری شـتێك بـدەی بـە ئـاگر، بـەلاّم سـووتاندن هـەر لەلایەکیشیەوە بێ، پێـی دەگـوترێ سـووتان، بـەلاّم (مَـصْلِيٍّ) ئەوەیـە کە لـە هـەر چـوار لاوە بـە ئاگـر دەورە دەدرێو دەبرژێنـرێ، وەك: ماسـی یـان مریـشك جاری وایـە وای لێدەکـەن، لـە هـەر چـوار لاوە ئاگـری بـۆ دەچـێ، کاتێـك لە فـڕنو تەنـدووردا دادەنـرێ.

(**نَضِجَتْ**): (نَـضِجَت جُلُـدهُم) واتـە: پێـستەکەیان کوڵـی، دامـاڵرا، هـەمووی بـرژا (نَـضَجَ اللَّحـمُ إِذَا أَدرَكَ شَـيُّهُ) گۆشـتەکە کـوڵاو تـەواو بـوو، پێـی دەگـوترێ: (نَضَـجَ).

(**ظَلِيلًا** ): (ظِـلاً ظَلِيـلاً)، (ظِـلٌّ) واتـە: سـێبەر، (ظَلِـيلاً) موبالەغەیـە لـەو سـێبەرەدا، واتـە: سـێبەرێکی بـەردەوام، یـاخود سـێبەرێکی زۆر نـزیك، (ظِـلٌ ظَلِيـلٌ: فَـائِضٌ، وَهُـوَ كِنَايَـةٌ عَـن غـضَـارةِ العَـيْشِ) کینایەیـە لـە ژیـانێکی پـڕخۆشو ئیسـڕاحەت.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١/ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يَشۡتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ ﴾.﴿عَـنِ ابْـنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهُ قَالَ: رَكِبَ كَعْبُ بن الأَشْرَفِ في تسعينَ رَاكِبًا مِنَ اليَهـود فيهـم: حُيَـيُّ بـن أَخْطَبَ وجَدِيُّ بـن أَخْطَبَ وَمَالِـكِ بْـنِ الـصَّيْفِ وغيرهـم إلـى أهـلِ مَكَّـةَ لِيُحَـالَفُوهُمْ عَلَـى رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ، وَينقـضوا العَهـد الـذي كـان بيـنهم وبينه قبل أجَلِه، فَقَال أبو سُفيان: يا أَهلَ الكتاب! أَنشِدكم باللَّهِ أيّهُم أقربُ للهدى نَحْنُ أم مُحَمَّد وأصحابهِ. فأنا نُعَمِّر مَسجِد اللَّهِ، وَنَسْقِي الْحَجِيجَ، وَنَحجبُ الكعبة ونَصِلُ الرَّحِمَ ، وَمُحَمَّدٌ قَطَعَ أَرْحامَنا، وَاتَّبَعَهُ سُرَّاقُ حَجِيجِ

بنو غِفَارٍ، فَنَحْنُ أَهْدَى أَم هُمْ؟ فَقَالَت: اليَهُود: أَنْتُمْ أَهْدَى مِنْهُم سَبِيلاً، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا ...﴿٤٤﴾ ﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (٧٧٣٣) والتفسير الكبير للطبراني[1]، و لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي: (٢٩٣، ٢٩٤)، واته: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: کەعبی کوڕی ئەشرەف سەرۆکی جوولەکەکانی خەیبەر لەگەڵ نەوەد سوار لە جوولەکەکان دا، کە حوییەی کوڕی ئەختەبو جەدیی کوڕی ئەختەبو مالیکی کوڕی صەیف، وە غەیری وانیشیانی تێدابوون، چوون بۆ لای خەڵکی مەککە، بۆئەوەی پەیمانیان لەگەڵ ببەستن و پەیمانی نێوانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کاتەکەی بەسەر بچێ، هەڵیوەشێننەوە، ئەبو سوفیان لێی پرسین: ئەی کۆمەڵی خاوەن کتێبان! خواتان بە گژدا دەکەم، (بە ناوی خواوە داواتان لێدەکەم) ئێمە لە هیدایەتەوە نزیکترین یان موحەممەدو هاوەڵانی؟ ئێمە ماڵی خوا (واتە: مزگەوتی خوا، کەعبە) ئاوەدان دەکەینەوەو، ئاو دەدەین بە حاجیان، پەردە بۆ کەعبە دەکەین، وە پەیوەندیی خزمایەتی دەگەیەنین، کەچی موحەممەد پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندوە (مەبەستی ئەوە بووە کە مسوڵمانان وازیان لە دایکو بابیان هێناوە کە کافر بوون، ئەوەی بە پچڕاندنی پەیوەندیی خزامایەتیی داناوە!) وە حەجاجە خراپەکانی بەنیی غیففار شوێنی کەوتوون، (واتە: خەڵکی خراپ شوێنی کەوتوون) ئایا ئێمە ڕێی ڕاستترمان گرتوە، یاخود ئەوان؟ جوولەکەکان گوتیان: بەڵکو ئێوە لەسەر ڕێی ڕاستن، وە ڕێی ئێوە ڕاستترە، ئیدی خوا ئەم ئایەتەی نارده خوار ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا ...﴿٤٤﴾ ﴾.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾. عَنِ ابْنِ

١) ج: (٢)، ص: (٢٤٨)،

عَبَّاسٍ رضي الله عنه كَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رُؤَسَاءَ مِنْ أحْبَارِ يَهُود مِنْهُمْ عَبْدُاللَّهِ بْن صُوريا، وَكَعْب بْنِ أسد فَقَالَ لَهُمْ: يَا مَعْشَرَ يَهُود اتَّقُوا اللَّهَ وَأسْلِمُوا فَوَاللَّهِ إنَّكُمْ لَتَعْلَمُونَ أنَّ الَّذِي جِئْتُكُمْ بِهِ الحَقُّ، فَقَالوا: مَا نعرِفُ ذَلِكَ يَا مُحَمَّد. وَجَحَدُوا مَا عَرَفُوا؛ فَأنزَلَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ فِيهِم: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم ﴾، أَخْرَجَهُ ابنُ إسْحَاق وابْنُ جَرِير وبْنُ المُنذِر وَابْنُ أَبي حَاتِم، وَالبَيْهَقِيُّ[1]، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قسەی كرد لەگەڵ كۆمەڵێك لە سەرانی جوولەكە، كە لە نێویاندا عەبدوڵڵای كوڕی صوریيا، وە كەعبی كوڕی ئەسەد هەبوون، پێی فەرموون: ئەی كۆمەڵی جوولەكەكان! پارێز لە خوا بكەنو مسوڵمان بن، سوێند بە خوا دەزانن كە ئەوەی من بۆم هێناون، هەقە، وە لە كتێبەكانیشتاندا نیشانەكانی من هەن، ئەوانیش گوتیان: ئەی موحەممەد! شتی وانیەو نایزانین، ئێمە ئەو زانیارییەمان نیە، بەو بۆنەیەوە خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار.

٣/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی كە دەفەرمویّ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ﴾. «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَتِ اليَهُودُ يُقدِّمُونَ صِبيانَهُم يُصلّون بِهِم وَيُقَرِّبُونَ قُربانِهِم يَزْعُمُونَ أنّهم لا خَطَايَا لَهُم وَلا ذنُوبَ، فَأنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم... ﴿٤٩﴾ ﴾، أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ بِرقم: (٩٧٤٣) عَنْ عِكْرِمَة، و بِرقم: (٩٧٤٥) عَن مُجَاهِد وأَبِي مَالِك، وَأَبِي حَاتِم عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، ولُبَاب النقول في أسباب النزول، للسيوطي: (٢٩١، ٢٩٢)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، (كە ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ)، دەڵێ: جوولەكەكان عادەتیان وابوو منداڵی (نابالغی) خۆیان پێشنوێژییان پێ دەكردن، وە ئەگەر

---

١) فتح القدير للشوكاني، ج: (١)، ص: (٦١١)

قوربانییەكیشیان هەبووایە، بەوانیان سەردەبڕی، دەیانگوت: ئەو منداڵانەمان گوناهیان نیەو هەڵەیان نیە، مادام ئەوانە قوربانییەكانمان بۆ سەرببڕنو پێشنوێژییمان بۆ بكەن، كەواتە: ئێمەش بێ گوناهینو بێ خەتاین! ئیدی خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوار، كە دەفەرموێ: سەرنجی ئەوانە نادەی كە مەدحی خۆیان دەكەنو، هێندە خۆیان پێ بێ گوناحو بێ خەتایە!

هەڵبەتە لە شوێنی دیكەشدا هاتوە كە جوولەكەو نەصرانییەكان زۆر مەدحی خۆیان كردوە، بۆ وێنە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾﴾ المائدة، واتە: جوولەكەو نەصرانییەكان گوتیان: ئێمە ڕۆڵەی خواینو خۆشەویستی خواین، دیارە ئاوا مەدحی خۆیان كردوەو ستایشی خۆیانیان كردوەو خوای زاناو شارەزاش ئەو ئایەتەی ناردۆتە خوار كە ئەوە شتێكی خراپە، ئینسان بۆخۆی بە قسە مەدحی خۆی بكات.

## مانای گشتی ئایەتەكان

سەرەتا دەڵێم: ئەم چواردە ئایەتە واتە: ئایەتی (٤٤ تاكو ٥٥)، هەڵبەتە دوو ئایەتی دواییش، واتە: ئایەتەكانی (٥٦ و ٥٧) هەر لەنێو ئەم دەرسەماندان، بەلام ئەم دوازدە ئایەتەی سەرەتا، وەك پێشتریش باسمان كرد، دەربارەی یەك بابەتی گرنگ قسە دەكەن، ئەویش بریتیە لە خستنە ڕووی هەندێك بیروبۆچوونو هەڵوێستو ڕەفتاریی خاوەن كتێبەكان، دیارە خاوەن كتێبەكان بە پلەی یەك جوولەكەو نەصرانییەكانن، بەلام بە سەرنجدانی ئایەتەكان بۆمان دەردەكەوێ، كە هەموو ئەوانەی خۆیان بە خاوەن كتێبی ئاسمانیی دەزانن، ئەگەر بە گومانیش بێ، بە خاوەن كتێب لە قەڵەم دەدرێن، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان دەڵێن: خاوەن كتێبەكان تەنیا جوولەكەو نەصرانییەكانن، بەلام من وای بۆ دەچم كە هەموو ئەوانەی لە دنیادا خۆیان بە خاوەنی كتێبی ئاسمانیی دەزانن، وە خۆیان بە خاوەن شەریعەتێكی ئاسمانیی دەزانن، وە خۆیان بە

شوێنکەوتووی یەکێك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەزانن، با هەڵەو کەموکوڕیشیان هەبێ، هەر بە خاوەن کتێب لەقەڵەم دەدرێن، ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە لە سوورەتی (البقرة)دا کە پێشتر باسمان کرد لە ئایەتی بیستو یەکەوە، تاکو جوزئی یەکەم تەواو دەبێ، واتە: تاکو ئایەتی سەدو چل یەك (١٤١)، واتە: سەدو بیست (١٢٠) ئایەت بەگشتی باسی جوولەکەو نەصرانییەکان، وە بەتایبەت جوولەکەکان دەکات، هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا لە سەرەتای سوورەتەکەوە تاکو ئایەتی سەدو بیستو یەك (١٢١) هەمووی باسی قسەکردنە دەربارەی خاوەن کتێبەکان بەگشتی، بەتایبەت نەصرانییەکان، وە ئەم سوورەتەش دیارە لێرەدا ئەم دوازدە ئایەتە، وە دواییش دیسان لە شوێنی دیکەش دێتەوە سەر باسیان، وە لە سوورەتەکانی دیکەشدا، بە هەمان شێوە زۆر باسی خاوەن کتێبەکان کراوە، حیکمەتی ئەو هەموو باسکردنەی خاوەن کتێبەکانیش بەتایبەت جوولەکانو نەصرانییەکان، ئەوەیە کە ئۆممەتی ئیسلام لە ئەزموونی خاوەن کتێبەکانی پێش خۆی، واتە: لە ئەزموونی ئۆممەتانی پێش خۆی پەند وەربگرێ، لە چاکەکانیان شتی باش فێرببێ، وە لە هەڵەکانیشیان دەرسو پەند وەربگرێ، وە ئەو هەڵانەی ئەوان کردوویانن، دووبارەیان نەکەنەوە، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی دیکەش حیکمەتێکی دیکەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زانیویەتی خاوەن کتێبەکان، بەتایبەت جوولەکەو نەصرانییەکان، دژایەتییو ناحەزایەتیی زۆریان دەبێ، بۆ ئۆممەتی ئیسلام، هەڵبەتە بەگشتی ئەگەرنا دیارە خەڵکی باشو بە ئینصافیشیان لەنێودا هەن، کە خوای دادگەر ئاماژە بەوانیش دەکات، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ...﴿١١٣﴾ ﴾، واتە: وەك یەك نین، هەموویان یەکسان نین، پۆلێنیان دەکات، چاکیان هەیەو خراپیشیان هەیە، بەڵام بەگشتی خوا زانیویەتی کە ئۆممەتی ئیسلام لە لایەنی جوولەکەکانەوە بەتایبەت، وە لە دوای ئەوان، لە لایەنی نەصرانییە قین لە دڵەکانیشەوە، ئەوانەی کە زۆر دەمارگیرو داخ لە دڵن، نەك بەگشتی

هەموویـان، دژایەتیـی زۆریـان دەكـرێ، بۆیـە خـوا ﷻ ئۆممـەتی ئیـسلامی زۆر ئاگـادار كردۆتـەوە، بەرچـاوی ڕۆشـنكردۆتەوە، دەربـارەی ناسـاندنی ئـەو خـاوەن كتێبانـە، بـە ئۆممـەتی پێغەمبـەر ﷺ، بـە ئامـاژەكردن بـە مێـژوویان، بـە هەڵـسوكەوتیان، بـە ڕەفتارییـان، بـە هەڵوێـستەكانیان، تـاكو باشـیان بناسـن، ئێستاش بێینە سەر مانای گشتی ئەم دوازدە ئایەتە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی كە بەشێك لە كتێبیان پێدراوە، بەشێك لە كتێب واتە: بەشێك لە كتێبی خوایان پێدراوە، یانی: وەنەبێ هەرچی كتێبەكانی خوان ﷻ هەمووی بەوان درابـن، وەك ئیددیعـا دەكـەن، بەڵكو بەشـێك لـە كتێبیان پێدراوە، دەفەرموێ: سـەرنجیان نادەی، تەماشـایان ناكـەی! هەڵبەتـە لێرەدا مەبەسـت تەماشاكردنی بە عەقڵو دڵـە، نـەك تەماشـاكردنی چاو، وەك زانایان گوتوویانـە: (الرؤية هُنا رؤية قَلْبِّيـه وَلَيْسَت بَصَرِيةً) مەبەست لە: ئایا تەماشا ناكەی، ئایا سەرنج نادەی؟ یانی: ئایـا بـە چاوی عەقـڵ تێنافكری، بە چاوی دڵ تەماشایان ناكەی، هی ئەوانەی بەشێك لە كتێبیان پێدراوە ﴿ يَشۡتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ ﴾، گومڕایی دەكـرن ﴿ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴾، دەشیانەوێ ئێوەش لە ڕێ ونـبن، یاخود گومڕابـن، سـەرگەردان بـن، ڕێگـە ونبكـەن، چـونكە وشـەی: (ضَـلَّ) واتـە: ونبـوو، (ضـآلّ) كەسێكە كـە ونبـووە، واتـە: بـەڕێ یـە نازانـێ، نازانـێ لـە كوێیـە، بـەڵام ئەگـەر بگـوترێ: (ضـلَّ الطريق، أو ضَـلَّ السبيل) واتـە: ڕێیەكـەی ون كـرد، بـە هـەر حاڵ خوای پەروەردگار دوو لە ڕەفتـارەكانی خاوەن كتێبـەكان باس دەكات:

یەكـەم: گـومڕایی دەكـڕن، سـەرگەردانیی دەكـڕن، واتـە: وەك چۆن كەسێك بـە پارەی خۆی دەچێ بۆ بازاڕ شت دەكڕێ، ئەوانەش ئاوا بەدوای گومڕاییدا عەوداڵـن، وێڵـن، وە سـەرمایەو دەسـتمایەی تەمـەنیان لـە گـرەوی گـومڕایی دەنێن.

دووەم: وە هەڵویستو ڕەفتاریی دووەمیشیان ئەوەیە كە دەیانەوێ ئێوەش لە ڕێی لابدەن، واتە: ئەوە هیچ بۆخۆیان گومڕاییان كرپوە، بەلاّم دەیانەوێ ئێوەش بە مەرەدی خۆیان بەرن، جا دیارە لێرەدا خوای بێوێنە لەم ئایەتانەدا كە باسی ئەو ڕەوشتو ڕەفتارو ئەو هەڵسوكەوتانەی خاوەن كتێبەكان دەكات، كە هەمووی بیروبۆچوونو ڕەوشتو ڕەفتاری خراپن، لە میانەی ئەوانەشدا باسی كۆمەڵێك یاسای حەلاڵو حەرامو فەرمانو نەهی دەكات، بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەوانیش خوای پەروەردگار كتێبی پێداونو حەلاڵو حەرامی بۆ داناونو كۆمەلێك یاسای بۆ داناون، بەلاّم پێیانەوە پابەند نەبوون، واتە: ئەی ئۆممەتی ئیسلام! ئێوە وا مەكەن، ئەوە لەلایەك، پاشان ئەوانە زۆرجار ڕەخنەیان دەگرت لە مسوڵمانان، بۆیە خوای زاناو شارەزا هەڵەو كەموكوڕییەكانی ئەوان، وە دەستكاریی‌و گۆڕانكارییەكانی ئەوان كە لە كتێبەكانیاندا كردوویانە، پێشانیان دەدا، بۆئەوەی بۆیان دەربخات، بۆ ئەوانیش‌و خەڵكی دوای وانیش، كە بیرۆكەی وەرگیرانی قورئان لە كتێبە پێشووەكان، شتێكی پووچو بێ بنەمایە، چونكە ئێستاش شتی وا باس دەكرێ، كە ئەوە موحەممەد ﷺ ئەوەی كە لە قورئاندایە هەر لە خاوەن كتێبەكان فێری بووە، خوای زاناو شارەزا ڕەخنە لە خاوەن كتێبەكان دەگرێ لەو گۆڕانو لادانەی كە كردوویانە لە كتێبەكانیاندا، وە قورئان هەڵەی ئەوان ڕاست دەكاتەوە، كەواتە: ناگونجێ قورئان لەوانەوە وەرگیرابێ‌و (إقتباس) كرابێ، ئنجا خوا ﷻ لەسەر خستنەڕووی هەڵوێستەكانی ئەوان، وە دژایەتیی‌و دوژمنكاریی ئەوان بەردەوام دەبێ، بەلاّم پێشێ بەگشتی دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡ ﴾، خوا لە ئێوە زاناترە بە دوژمنەكانتان، واتە: خوا لە خۆتان شارەزاترە بە دوژنو ناحەزانی خۆتان ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴾، وە بەسە خوا سەرپەرشتیارتان بێ‌و مشوورخۆرتان بێ، وە بەسە خوا یارمەتیدەرو سەرخەرتان بێ، یانی چی؟ یانی ئەوەی كە خوای كاربەجێ پێتان

دەناسێنێ بە ناوونیشانی دوژمن، وەك دوژمن تەماشای بکەن، چونکە خوا زۆر چاك دەزانێ کێ دوژمنی ئێوەیەو کێ ناحەزی ئێوەیە؟ ئەی ئۆممەتی ئیسلام! نەچن دڵ لە دڵدانتان هەبێو گومانو دوو دڵییتان هەبێ، ئەگەر خوا فەرمووی: فلان کۆمەڵە دوژمنتانن، بزانن کە ئەوە دوژمنتانن، چونکە خوا لە خۆتان بە دوژمنەکانتان شارەزاترە، بەڵام ترسو سامو بیمی دوژمنەکانتان نەچێتە دڵتان، ئەگەر ئێوە ئەهلی ئیمان بن، چونکە خوا بەسە سەرپەرشتیارو مشوورخۆری ئێوە بێ، وە خوا بەسە یارمەتیدەرو هاوکاری ئێوەبێ، خوای پەروەردگاریش بە چ مەرجێك سەرپەرشتیاری مسوڵمانان دەکاتو مشووریان دەخواو پشتیان دەگرێو یارمەتییان دەدات؟ بە مەرجێك ئەهلی ئیمان بن، وە پابەندبن بەو شەریعەتو بەرنامەوەوە کە بۆی ناردوون.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴾، بەشێك لەوانەی جوولەکەن وشەکان لە شوێنی خۆیان دەگۆڕن، نافەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴾!! جوولەکەکان هەموویان، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، بۆچی؟ چونکە هەر لە جوولەکەکان هەبووە کە وشەکانی خوایان دەستکاریی نەکردوەو پابەندبوون بە کتێبەکانی خۆیانەوە، وە بە هۆی کتێبەکەی خۆشیانەوە ئیمانیان بە پێغەمبەری کۆتاییش ﷺ هێناوە، چونکە نیشانەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ ئێستاش لەگەڵدابێ لە پەیمانی کۆنو لە پەیمانی نوێشدا، واتە: لە تەوراتو کتێبەکانی دیکە کە لەگەڵ تەورات دان، وە ئینجیلەکانو ئەو کتێبانەی کە لەگەڵیاندان، ئێستاش لەگەڵدابێ نیشانەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لەو کتێبانەدا هەر هەن، دوای ئەو هەموو گۆڕینو دەستکارییکردنو لابردنەش، کە بەپێی باسو بۆنەی باسکردنیانەوە ئاماژەیان پێدەکەین، بۆیە خوای دادگەر ئێمەش فێری ئینصاف دەکاتو دەفەرموێ: بەشێکی جوولەکەکان وان، هەموویان وانین، لێرەدا

وشـەی: لە (مِن) بۆ بەشـکردن (تَبعیض)ە، واتـە: هەندیـّك لەوانـەی جوولەکـەن، (هادوا) یانـی: (یَهُود)، جا بۆ زانیارییتـان (هادوا)، واتە: (رَجَعُوا) لەبەرئـەوەی کە کاتی خۆی گەڕاونەوە بۆ لای خواو تۆبەیان کردوە، دەفەرموێ: لەوانـەی جوولەکەن وشـەکان لـە شـوێنی خۆیـان دەگـۆڕن، دەگونجـێ لێـرەدا مەبەسـت لـە وشـەکان (کَلِم) کە کۆی (کَلِمَة)یە مەبەست هەر ئەوەنەبێ کە یەك وشـە دەگۆڕن، بەڵـکو دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانو تەعبیـرەکانی خـوا بـێ، وە دەگونجێ مەبەسـت پێـی ئـەو وشـەو تەعبیـرانە بـێ کـە خۆیـان بەکاریانـهێناون، کـە وەك دوایی ئاماژەی پێدەکەین، زۆرجار بـە شـێوەیەك قسـەیان کـردوەو تەعبیـرێکـیان بەکـارهێناوە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ کـە وەك تیغـی دوو دەم وابـووە، بەولاشـدا بڕیویـەتی، بەولاشـدا بڕیویەتی، دوو ئەگـەر (إحتمـال)ی هـەبووە، بـە بـاری چاکەشـدا لێـی بـداتو، بـە بـاری خراپەشـدا، کەواتـە: ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ ﴾، کەلیمەکـان دەگـۆڕن، وشـەکان دەگـۆڕن، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی وشـەکانی خـوابێ، کە خوا ناردوونیـە خوار لە کتێبـی خۆیدا، دەشگونجێ مەبەست پێی ئـەو وشانە بـێ کـە خۆیـان وەك قسـەکردن لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ، وە لەگـەڵ مسوڵمانانـدا بەکاریان هێنـاون.

ئنجـا دێتـە سـەر ئـەو وشـەو تەعبیـرانەی کـە بەکاریـان هێنـاوە، کـە هـەم واتـای خراپ دەگەیەنن، وە هەم واتای باشیش دەگەیەنن، ئەوان دیارە واتـا خـراپو هەڵەکانیان مەبەست بـووە، ﴿ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا ﴾، وە دەڵێن: بیـستمانو سـەرپێـچییمان کـرد، ﴿ وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ ﴾، وە ببیـستە یـاخوا قـەت نەبیـستی! یاخود ببیستە پێ بیسـتراو نـەبی، واتـە: گوێبیـسـت نـەبی، ﴿ وَرَٰعِنَا ﴾، (رَاعِنـا)، واتـە: چاودێرییمـان بکـە، یـاخود: تـۆ شـوانی ئێمـەی، چـونکە ئەگـەر ژێـر (كَسْرَة)کە تێر (إشـباع) بکـەی، دەبێتـە (رَاعِينـا)، وە ئەگـەر تەنوینـی بـدەینێ، دەبێتە (رَاعِناً)، واتـە: نەفامو کەودەنو بـێ عەقڵ، کەواتە: ئـەم سـێ وشـەیە کـە بەکـاریانـهێنـاون:

١) ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾، دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە ئەوە قسەی تۆمان بیست، بەڵام بە قسەشت ناکەین کە ئەوە زەممە، یان قسەی تۆمان بیستو بە قسەی غەیری تۆ ناکەین، ئەوەش مەدحە.

٢) ﴿وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾، ببیستە یاخوا نەبیستی، ببیستە، واتە: گوێمان بۆ بگرە یاخوا نەبیستیو کەڕبی کە ئەوە زەممە ، یان: گوێبگرە قەت قسەی خراپ نەبیستی، یاخود هەواڵی ناخۆش نەبیستی ئەوە مەدحە.

٣)- (رَاعِنا)، دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ: چاودێرییمان بکەو ئاگات لێمان بێ، کە ئەوە بۆ مەدحە، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ: تۆ شوانی ئێمەی، یاخود تۆ پیاوێکی نەفامو کەودەنی، کە دیارە چ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەو وشەو تەعبیرانەیان بەکارهێنابێ، چ لەگەڵ مسوڵمانان، وەك گوتم وشەکان وەك تیغی دوو دەم وابوون، ئنجا شایانی باسە: هەموو توێژەرەوانی قورئان ئەوەندەی من تەماشای تەفسیرەکانم کردوە گوتوویانە: ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾، واتە: ئەوە قسەی تۆمان بیست، بەڵام بە قسەت ناکەین، من پێموایە کە وێڕای ئەوە ئەم مانایەشی بووە: قسەی تۆمان بیست، بەڵام قسەی غەیری تۆ نابیستین، بە بارە چاکەکەدا، چونکە ئەگەر مانایەکەی هەر بە بارە خراپەکەیدا با، دیارە شتەکەیان ئاشکرا دەبوو، بەڵام نا، ئەویش دیارە دوو واتای هەبوون، جا دەفەرموێ: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي ٱلدِّينِ﴾، بە زمان بادانەوە (لَيّـاً) بە مانای بادان دێ، کە داوەبەنێك بادەدەی یان گرێی لێدەدەی، یان کەسێك کە مل بادا، (لَوى عُنُقَهُ)، واتە: ملی بادا، سەری سووڕاند، (لَوى رأسَهُ)، یان (لَوى برأسِهِ) سەری بادا، واتە: بە زمان بادانەوە ئەو قسانە دەکەن، ﴿وَطَعْنًا فِي ٱلدِّينِ﴾، وە وەك تانەدان لە دین، وەك قسە گوتن بە ئایین، ئەو قسانە دەکەن، واتە: بە مەبەستێکی

باشەوە قسەکە ناکەن، ئەگەرنا هەر ئەو وشانە دەگونجیٚ کە بە مەبەستی باشیش بکرێن، بۆیە کە دوایی دەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ﴾، وە ئەگەر هاتباو گوتبایان: ئەوە بیستمان، وە فەرمانبەریشین، وە گوێمان بۆ بگرە، وە چاودێرییمان بکە، یاخود چاوەڕوانمان بکە، یاخود ئاگات لێمان بیٚ، ئەگەر وایان گوتبا ئەوە باشتر بوو بۆ ئەوان، وە ڕاستتریش بوو، چاکتر بوو بۆ دنیاو قیامەتیان، عەیبیان نەدەهاتە سەریٚ، وە ڕاستیش بوو، مانای هەڵەی هەڵنەدەگرت، بەڵام بۆچی ئەو وشەو تەعبیرانە بەکاردێنن؟ ﴿وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾، بەڵام بە هۆی کوفرەکەیانەوە خوا نەفرینی لێکردوون، نەفرین یانی: چیی؟ (اللَّعن: الطَّردُ والإبعاد) لەعن: دەرکردنو دوورخستنەوەیە، ئیبلیس کە خوا نەفرینی لێکرد، یانی دووری خستەوە، لەچی دوورخستەوە؟ لە ڕەحمەتی خۆی، هەر شتێك لە ڕەحمەتی خوا دوورکەوتەوە مانای وایە بێخێر دەبیٚ، بۆیە دەفەرمویٚ: ئەوانە بۆیە ئەو وشەو تەعبیرانە وا بەکاردێنن، بە زمان بادانو تانە لە دین دانەوە، چونکە خوا لەعنەتی لێکردوون، بە هۆی کوفرەکەیانەوە، ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، کەمێکیان نەبیٚ ئیمان ناهێنن، هەندێك لە توێژەرەوانیش گوتوویانە: ئیمانێکی کەم نەبیٚ ناهێنن، بەڵام ئەو مانایە من بە هەڵەی دەزانم پێموایە یانی: کەمێکیان نەبیٚ ئیمان ناهێنن، ئەو کەسانەش وەك: عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو سەلمانی فارسییو، ... هەندێك لەوانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە درێژیی مێژووی خاوەن کتێبەکان، کەمێکیان ئەوانەی کە ئەهلی ئینصاف بوون، وە دەمارگیریی لێیان گەڕاوە، ئیمانیان هێناوە، بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، بە قورئانو بە ئیسلام، ئنجا خوای پەروەردگار ڕوو دەکاتە ئەو خاوەن کتێبانەو دەفەرمویٚ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ

أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾، ئـەی ئەوانـەی كتێبیـان پێدراوە ! لە قورئاندا خوای قسـە لـەجێ ئەگەر وەك حاڵەتی ئیجابیی خاوەن كتێبـەكان بدوێنـێ، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ...(٦٤) ﴾آل عمـران، واتـە: ئـەی خـاوەن كتێبەكـان! بـەڵام ئەگـەر حاڵـەتی گلـەیی‌و سـەرزەنـشـت بـێ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾ ئەی ئەوانـەی كتێبیـان پێـدراوە! خـۆ كـتێبەكـە هـەر لەلایـەن خـواوە پێیـان دراوە، بـەڵام وەك بڵـێی ئـەو شـەرەفەیان ناداتـێ كە بڵێ من كتێبـم پێـداون، جا دەفەرموێ: ئـەی ئەوانـەی كتێبیـان پێـدراوە ! ئیمـان بـێنن بـەوەی ناردوومانەتـە خـوار، وە ئـەوەی بـە ئێوەشـەو لەگـەڵ ئێوەشـەو بەڕاسـتی دەزانـێ، واتـە: كتێبـەكانی ئێـوە بەڕاسـت دەزانـێ، قورئـان دان بـە تـەوراتـیش دا دێنـێ، دان بـە زەبـوورو بـە ئینجیـل‌و صـوحوف‌و بـە هـەموو كتێبەكـانی خـوای پەروەردگـاردا دێنـێ، وەك ئەسڵەكەیان كە خوا بۆ پێغـەمبـەرانی نـاردوون، نـەك وەك حاڵـەتی ئێـستایان كە گۆڕدراون‌و دەستكاریی كراون، كـەواتـە: دەبـێ لێمان تێكنەچـێ ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾، یانی وەك ئەسڵەكەیان، كە بـۆ پێغەمبـەرانتان نێـردراون، قورئـان دانیان پـێ دادێنـێ، بۆچی؟ چونكە بـۆ زانیارییتـان جوولەكەكان نـەك دان بـە پێغەمبەرایـەتیی موحەممـەددا ﷺ ناهێنـن، دان بـە (عیسـا)ش دا نـاهێنن، وە دان بـە ئینجـیلیش دا نـاهێنن، هـەروەها نەصـرانییەكانیش دان بـە قورئانـدا ناهێنـن، بەڵام قورئـان‌و ئیسـلام‌و موحەممەد ﷺ دان بـە هـەموو كتێبـەكان‌و هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیاندا دێنن، كەواتـە: هیـچ بیانوویـەكیان نیـە كـە ئیمان بە قورئان نەهێنن، بۆچـی؟ جوولەكەیەك كە ئیمـان بـە موحەممـەد ﷺ دێنـێ، ئیمان هێنانی بە مووسای سەلامی خوای لـێ بـێ لـە خۆیـدا پاراستوە، واتە: وە نـەبـێ ئیسـلام بڵێ دەستبەرداریی تەورات‌و مووسـا بـە، دەڵـێ: ئەگـەر ئیمانت بە مووسـا نەبـێ، مانای وایە ئیمــانت بـە موحەممـەدیش ﷺ نیـە، وە نەصـرانییەك كـە ئیمـان بـە موحەممـەد ﷺ دێنـێ، ئیمـان هێنـان بـە عیسـا

سەلامی خوای لێ بێ لە دەست نادات؟ بەڵکو زیاترو بە شێوەیەکی ڕاستتر ئیمان بە عیسا دێنێ، بۆیە کەسێك کە ئیمان بە موحەممەد ﷺ دێنێ، ئیمان بە قورئان دێنێ، ئیمان بە ئیسلام دێنێ، مانای وایە ئیمان بە کتێبەکانی پێشووش دێنێ، وە بە پێغەمبەرانی پێشووش (علیهم الصَّلاة والسلام)، وە ئیمانەکەی پێشێی هیچ زەرەرێك ناکاو هیچ کەموکورتییەك ڕووی تێناکات، بەڵکو کامڵترو تەواوتر دەبێ، وە لە بێژینگ دەدرێ، لەو کەموکوڕیی‌و هەڵەو پەڵەو گۆڕینانەی کە خاوەن کتێبەکان خستوویاننە نێو ئەو کتێبانەوە، جا خوا دەفەرموێ: ئیمان بێنن ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە ! بەوەی کە ناردوومانەتە خوارەوە، کە ئەوەی بە ئێوەشەو لەگەڵ ئێوەشە بە ڕاستی دەزانێ، ﴿مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ ﴾، بەرلەوەی هەندێك دەموچاوان بسڕینەوەو بیانگێڕینەوە بۆ پشتەوە، واتە: کارێك بکەین کە شێوەکانی (ملامح)ی دەموچاویان لە پێشەوە نەمێنێ، بەڵکو ڕوویان بسووڕێنین بۆ پشتەوە، وەك چۆن ئەوان ئایەتەکانی خوا دەسووڕێنن‌و دەستکاریی دەکەن، بایان دەدەن، یاخود زمانیان بادەدەن بە ئایەتەکان، یان بە وشەو تەعبیرەکان، ئاوا خوای پەروەردگاریش لە سزای ئەوەدا سەریان بسووڕێنێ‌و لە جیاتی ئەوەی ڕوویان لە پێشەوەبێ، ڕوویان لە پشتەوە بێ، ﴿أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ ﴾، یان پێش ئەوەی نەفرینیان لێبکەین، وەك چۆن هاوەڵانی شەممەمان نەفرین کرد، هاوەڵانی شەممە کێ بوون؟ شارێك بوو لە نزیك دەریایەك عادەتیان وابوو ڕاوی ماسییان دەکرد، ئنجا خوای کاربەجێ ڕاوی ماسی لە ڕۆژی شەممەدا لێ قەدەغە کردن، وە تاقیکردنەوە، بەڵام ماسییەکان بە زۆریی ڕۆژانی شەممە دەردەکەوتن، ئەوانیش هەڵسان گوتیان: شەممە ناشکێنین، بەڵام شتێکی دیکە دەکەین، دەچوون دیوارێکیان وەك نێوان بۆ ماسییەکان دروست دەکرد، دەیانبردنە تەنکاوێ‌و ڕاویان نەدەکردن، دوایی ڕۆژی

یەكشەمو دووشەم دەچوون بەكاوەخۆ ڕاوە ماسییان دەكرد[١]! كە دیارە ئەوە حیلە شەرعییە، جا بۆ زانیارییتان فێڵی شەرعی، ڕیشەكەی دەچێتەوە بۆ جوولەكەكان، ئەگەرنا شەریعەت فێڵی تێدانیە، چونكە شەرع هەمووی ڕێكو ڕاستە، وە هەر وشەی: (الحیلة الشرعیة) بۆخۆی هەڵەیە، كە هەندێ لە مامۆستایان بەكاریدێنن، دەڵێن: ئەوە حیلە شەرعییە، نەخێر شەرع وەك گوتم هەمووی ڕێكو ڕاستە، هیچ غەشو فێڵو ژێر بە ژێری تێدانیە، جا دەفەرموێ: ئیمان بێنن بەرلەوەی واتان لێبكەین، یانی دەموچاوتان بسووڕێنین بۆ پشتەوە، یاخود نەفرینتان لێبكەین، وەك چۆن نەفرینمان لە هاوەڵانی شەممە كرد ﴿ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴾، وە فەرمانی خواش جێبەجێ دەبێ، ئەوەی خوا ویستی، كەس ناتوانی ڕێی لێ بگرێ، خوا چ فەرمانێكی كرد جێبەجێ دەبێ، كەواتە: ئەوە هەڕەشەیە لێیان دەكات، دوایی باسی دەكەین لە مەسەلە گرنگەكاندا، كە ئایا ئەو هەڕەشەیە هاتۆتە دی، یان نەهاتۆتە دی؟ وە ئەگەر نەهاتۆتە دی بۆچی نەهاتۆتە دی؟

ئنجا خوای بەرز باسی شتێك دەكات كە زەمینەیان بۆ خۆش دەكات، ڕێیان بۆ هەموار دەكات، بۆ پەشیمانبوونەوەو گەڕانەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾، بێگومان خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ دابنرێ، پێشتریش باسمانكرد هاوبەش بۆ خوا دانان چەند جۆرێكە، كە ئێمە لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشكی دەخەینە سەر:

١/ هاوبەش دانان لە بەدیهێنەرایەتییدا، واتە: وەك چۆن خوا هەموو شتی دروست كردوە، پێت وابێ كەسێكی دیكەش هەیە دروستكردنی پاڵدەیە لا، یان وەك چۆن خوای پەروەردگار مشوورخۆری هەموو شتێكە، پێت وابێ غەیری خواش مشوورخۆرو پەروەردگارە، یان وەك چۆن خوا خاوەنی

---

١) ئەو بەسەرهاتە لە چەند شوێنێكی قورئان دا ئاماژەی پێدراوە، بەڵام درێژەكەی لە سووڕەتی (الأعراف)دا هاتوە، لە ئایەتی (١٦٣) تاكو (١٦٦).

موتڵەقی هەموو شتێکە، پێت وابێ غەیری خواش جۆرێك لە خاوەنداریێتی هەیە، ئەمە جۆرێکی شیرکە.

٢/ جۆرێکی دیکەی شیرك ئەوەیە ئەو ناوو سیفەتانەی کە تەنیا شایستەی خوانو هی خوان، بۆ غەیری خوایان بەکاربێنی، وەك چۆن بەس خوا هیدایەت دەدا، پێت وابێ ئینسانیش دەتوانێ هیدایەت بدات، وە وەك چۆن بەس خوا شیفا دەدات، پێت وابێ غەیری خواش دەتوانێ شیفا بدات، وە وەك چۆن بەس خوا دەتوانێ خەڵك دەوڵەمەند بکات، هەژار بکاتو سەریان بخاتو ژێریان بخات، پێت وابێ غەیری خواش ئەوەی لەدەست دێ.

٣/ جۆرێکی دیکەی شیرك هاوبەش بۆ خوا دانانە لە پەرستڕانیدا، پەرستڕانیش چ لە وەرگرتنی بەرنامەکان (الشرائع)، چ لە پێشکەشکردنی درووشمەکان (شعائر)دا، جا خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾، بەڵام لە خوار ئەوەوە، واتە: جگە لە شیركو کوفر، خوا هەر کەسێکی بیەوێ لێی دەبوورێ، لێی دەبوورێ واتە: بەبێ تۆبە، ئەدی بە تۆبەوە؟ بە تۆبەوە خوا لە کوفریش دەبوورێ، لە شیرکیش دەبوورێو لە نیفاقیش، خوا لە هەموو شتێك دەبوورێ، بەڵام بەبێ تۆبەو گەڕانەوە، خوا لە شیرك نابوورێ، واتە: لە کوفرو لە شیركو ئەوانە نابوورێ، بەڵام دەگونجێ لە گوناهەکانی دیکە ببوورێ، بۆ هەر کەسێك بیەوێ لێی ببوورێ، وە دەگونجێ لێی نەبوورێو پەیوەستی کردوە بە خواست (مَشيئة)و ویستی خۆیەوە ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا﴾، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ئەوە درۆیەکی گەورەی هەڵبەستوە، گوناهێکی گەورەی هەڵبەستوە، چونکە خوا هاوبەشی نیە، خوای پەروەردگار هیچ کەسێك هاوبەشی نیە، بەس خوا پەرستراوە، پاکیو بێگەردیی بۆ خوا، نە لە بەدیهێنەرایەتییدا، نە لە خاوەنداریێتییدا، نە لە مشوورخۆرێتیدا، نە لە ناوەکانیدا، نە لە سیفەتانیدا، نە لە پەرستڕانیدا، لە هیچ شتێکدا، خوا هاوبەشی نیە، ئەدی

بۆچی خوا ناو لەو شتانە دەنێ (شُرکَآء) کە خەڵك دەیانپەرستێ؟ چونکە لە عەقڵی ئەواندا هاوبەشی خوان، بەڵام لە واقیعو خودی بوون(نفس الأمر)دا خوا ﷻ هیچ هاوبەشێکی نیە.

ئنجا دووبارە دێتەوە سەر باسی هەڵوێستو ڕەفتاری هەڵەو تاوانبارانەی خاوەن کتێبەکان، بەتایبەتی جوولەکەکانو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە خۆیان پەسند دەکەن، خۆیان ستایش دەکەن، خۆیان پاكو چاك پێشان دەدەن؟ ﴿ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ﴾، بەڵکو هەر خوا هەر کەسێکی بیەوێ پاكو چاکی دەکات، واتە: کەس بە قسەی خۆی چاك نابێ، بە لاف لێدان کەس چاك نابێ، بەڵکو ئەگەر خوا بیەوێ کەسێك چاك بکات، چاکی دەکات، ئنجا ئایا خوا بە هۆی چییەوە خەڵك چاك دەکات؟ بە هۆی ئیمانو تەقواوە ﴿ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، وە کەسیش بەقەدەر ئەو داوە دەزووەی کە بەسەر نێوکە خورماوەیە (نێوکە ڕەقەکەی خورما شتێکی بەسەرەوەیە وەك داوە دەزوو) بەقەدەر ئەوە، ئەوانە ستەمیان لێناکرێ، نە لە سزاداندا، نە لە پاداشتدانەوەدا، جا دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ ﴾، تەماشا بکەن چۆن درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، وەك پێشتر باسمان کرد، جوولەکەکانو نەصرانییەکان چیان دەگوت؟ ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾ ﴾المائدة، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواینو ئێمە خۆشەویستانی خواین، ئەوە درۆیەکە بە ناوی خواوە دەیکەن، خوا هیچ کوڕی نین، وە بڕیاری نەداوە بە ڕەهایی هیچ کەس خۆشەویستی بێ، مەگەر بەندەی چاك بێ بۆ خوا، مەگەر ئیمانداربێ، بە تەقوابێ، پابەندبێ بە بەرنامەی خواوە، کەواتە: ئەوە درۆیەکە بە ناوی خواوە دەیکەن ﴿ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴾، وە بەسیشە ئەوە کە

گوناهێکی ئاشکرابێ، واتە: ئەوە گوناهێکی زۆر ئاشکرایە، زۆر گەورەیە، کە بە ناوی خواوە درۆ بکرێ، دووبارە دەفەرمویێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، ﴿يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ﴾، ئیمان دێنن بە جیبتو بە طاغووت، (جِبْت) واتە: صەنەم، بت، وە بە مانای جادووگەر دێو بە مانای کاهینو فاڵچیش دێ، (طاغووت)یش هەر کەسێکە لە جیاتی خوا بپەرسترێ، یاخود هەر کەسێکە کە حەڵاڵو حەڕام بۆ خەڵك دیاری بکات، وە پێش خەڵك بکەوێ بە ڕێی غەیری شەرعدا، ئەوە طاغووتە، چونکە طاغووت لە (طُغیان)ەوە هاتوە، واتە: کەسێکە کە لە سەرپێچییکردنی خوادا، هەموو سنوورەکانی بەزاندبن، جا دەفەرموێ: تەماشای ئەوانە ناکەی کە بەشێك لە کتێبی خوایان پێدراوە، کەچی ئیمان دێنن بە بتو صەنەم، وە طاغووت ! ﴿ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴾، وە بەوانەی بێبڕواشن دەڵێن: ئەوانە ڕێی ڕاستتریان گرتوە، لە ئیمانداران، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمانکرد، کە هەندێ لە جوولەکەکانو ئەهلی کیتاب چوونە لای موشریکەکانی مەککەو، ئەبو سوفیان ئەوانیش لێیان پرسین: ئێمە ڕێی ڕاستترمان گرتوە، یاخود موحەممەدو هاوەڵانی؟ گوتیان: ئێوە، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا نەفرینی لێکردوونو لە بەزەیی خۆی دووری خستوونەوە ﴿ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴾، کەسێکیش خوا نەفرینی لێبکات، هیچ یارمەتیدەرێکت بۆی چنگ ناکەوێ، کەسێك خوا لە ڕەحمەتی خۆی دووری بخاتەوە، کەس ناتوانێ هیچ خێرو چاکەیەکی بۆ بکات، ﴿أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴾، یان ئایا ئەوانە بەشێك لە حوکمڕانییان هەیەو دەستەڵاتێکیان دەکەوێتە دەست، کەواتە: بەقەدەر درزی

سەر نێوکە خورما، بەشی کەسی لێنادەن، واتە: ئەوانە ئەگەر دەستەڵاتو حوکمڕانییان بکەوێتە دەست بەشی غەیری خۆیانی لێنادەن، تەماشای جوولەکەکانی فەلەستین ناکەن، ئیسرائیل قەت بەشداریی بە گەلی فەلەستین دەکات! لە هیچ شتێکدا هیچ شتێکیان پێ ڕەوا نابینن، تەنانەت مافی هاوڵاتییبوونیشیان پێ ڕەوا نابینن، نەك مافی بەشداربوون لە حوکمڕانییدا، ئەوەی خوا دەیفەرموێ، سەدا سەد وایە، ﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، یان ئایا حەسوودیی بە خەڵك دەبەن، - لێرەدا مەبەست پێی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزنی - یان ئایا حەسوودیی بە خەڵك دەبەن، لەسەر ئەوەی کە خوا لە بەخششی خۆی پێداون، ﴿ فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، پێشتریش بە ئیبراهیمو نزیکانی ئیبراهیم کتێبیشو حیکمەتیشمان پێدابوون، دیارە حیکمەت لێرەدا مەبەست پێی زانستی بەسوودە، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴾، وە حوکمڕانییو دەستەڵاتێکی مەزنمان پێدابوون ﴿ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ﴾، لە سەردەمی ئیبراهیمیشدا کەسانێك هەبوون، ئیمانیان بە ئیبراهیم هێنا، وە کەسانێکیش هەبوون، خۆشیان ئیمانیان پێ نەدەهێناو خەڵکیشیان لێ لادەدا، خەڵکیان لێ دوور دەخستەوە، کەواتە: ئەوەی ئێستا لەگەڵ موحەممەد ﷺ دەیکەن، کاتی خۆی لەگەڵ باپیریشیدا کە ئیبراهیمە ؈ کراوە، لەلایەنی کافرانی سەردەمی خۆیەوە، ﴿ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴾، وە دۆزەخ بەسە، ئاگرێکی گڵپە سەندوو بەسە بۆ سزادانی ئەو جۆرە کەسانە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا باسی سزای بێبڕوایان بە ئایەتەکانیو، پاداشتی ئیمانداران دەکات کە بڕوا بە ئایەتەکانی دێنن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی ئێمە

لەمەودوا دەیانخەینە نێو ئاگرێکەوە، واتە: دەیانبرژێنین لەنێو ئاگردا، ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ﴾، هەر کە پێستەکانیان برژاو داماڵرا، پێستی دیکەیان بەبەردا دەکەین، هەتاکو ئازاری زیاتر بچێژن، کە ئەوە ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، کە دوایی باسی دەکەین، ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە، خاوەن دەستەڵاتەو زاڵە، وە کاربەجێشە کە بەو شێوەیە سزایان دەدات، کە دیارە ئەوە سزایەکی پڕ بە پێستە بۆ ئەوان، ئنجا دێتە سەر پاداشتی ئیمانداران ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾، وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، وە کردەوەو ڕەفتارو ئاکارە چاکەکان ئەنجام دەدەن، ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾، لەمەودوا دەیانخەینە چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ﴿لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾، هاوسەرانێکی پاککراوەیان هەن، هاوسەرانێك کە پاککراوەن لە هەموو عەیبو عارو کەموکورتیی مەعنەویی و ماددیی ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾، وە دەیانخەینە ژێر سێبەرێکی زۆر فێنك و خۆش و بەردەوامەوە، لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خۆماندا.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوای بێ هاوتا کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، لێرەدا دوو خاڵ دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ ﴾، ئایا تەماشا ناکەی، سەرنج نادەی، مەبەست تەماشاکردنو سەرنجدانی عەقڵە، نەك سەرنجدانی چاو، واتە: لێرەدا بینینی چاو (بَصَر) مەبەست نیە، بەڵکو مەبەست بینینی عەقڵو دڵە، بۆچی؟ چونکە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، هەموو کات لەبەرچاوی نەبوون، ئەوە لەلایەك، پاشان ئەم قورئانە وەك چۆن بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، بۆ ئۆممەتەکەیشی هاتوە، کەواتە: مەرج نیە تاك تاکی ئۆممەت هەمیشە ئاگایان لە حاڵو باڵو هەڵسوکەوتی خاوەن کتێبەکان بێت، کەواتە: لێرەدا مەبەست بینینی عەقڵو دڵە.

**دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، ئەوانەی کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، دیارە لێرەدا مەبەست لە بەشێك لە کتێب، کتێبی خوایە، ئەو کتێبەی یاخود ئەو کتێبانەی کە خوا داونی بە خاوەن کتێبەکان، بە جوولەکەو نەصرانییەکانو ئەوانی دیکە، کە خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانیی دەزانن، کە لەبەرچاویان لەچاو قورئاندا کەمی دەکاتەوە، واتە وامەزانن ئەوەی خوا فەرموویەتی، وە ئەوەی خوا لە ئاسمانەوە ناردوویەتی، وەك وەحی هەمووی لەلای ئێوەیە! بەڵکو بەشێکی لای ئێوەیە ئەو بەشەش بەداخەوە کە ئێوە گۆڕیوتانەو دەستکارییتان کردوە، بەلاّم بەشی تێرو تەواوو دەستکاریی نەکراوو

نەگۆڕدراوی، ئەوە لەلای پێغەمبەری كۆتایی یە كە موحەممەدە ﷺ، هەڵبەتە هەموو كتێبەكانی خوا، یانی فەرمایشتی خواو بۆ ڕۆژگاری خۆیان، كامڵو تێرو تەواو بوون، وە بەڵام خوای پەروەردگار كە فەرمایشتێكی فەرمووە بۆ كاتێك بۆ ئەو كاتە فەرموویەتی، مەرج نیە بە كەڵكی كاتێكی دیكە بێ، واتە: ئەوەی كە خوای زانا بۆ ئیبراهیمی ناردوە سەلامی خوای لەسەر بێ، دوایی ئەگەر بەكەڵكی خەڵكی ڕۆژگاری مووسا نەهات، مانای وانیە ناتەواوە، نا، چونكە خوای كاربەجێ بۆ كاتی خۆی ناردوویەتی، هەروەها ئەوەی كە بۆ مووسای ناردوە، دوایی بۆ عیسای شتێكی دیكەی ناردوە، مانای وانیە كە ناتەواو بوو، نا، بەڵام بۆ ئەو كاتی تێرو تەواو بووە، وە ئەوەش كە بۆ پێغەمبەری خاتەمی ناردوە ﷺ دیارە هەم چاودێرە بەسەر كتێبەكانی پێشووەوە، وە هەم بەڕاستیان دەزانێ، وە هەم ئەو كەموكوڕییانەی كە لە كتێبەكاندا پەیداكراونو ئەو تەحریفو دەستكاریانەی كە كراون لە كتێبە پێشووەكاندا، قورئان هەموویان ڕاست دەكاتەوە، وەك خوا لە سووڕەتی (النمل)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾،

واتە: ئەم قورئانە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا دەخوێنێتەوە، زۆرێك لەوەی كە تێیدا كەوتوونەتە ڕاجیایی، بۆچی دەفەرموێ زۆربەی؟ چونكە هەندێكی كە تێیدا كەوتوونە ڕا جیایی یەوە، خوای پەروەردگار بە پێویستی نەزانیوە باسی ڕای ڕاست بكات، لەوەدا كە تێیدا كەوتوونە ڕا جیایی یەوە، كەواتە: قورئان ئیشكالێك كە خاوەن كتێبە پێشووەكان لە كتێبەكانی خۆیاندا پەیدایان كردووەو، دەستكارییكرانێك كە ئەنجامیان داوە، قورئان بەس ئەوە ڕاست دەكاتەوە.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ ...﴾، واتە: گومڕایی دەكڕن، كە پێشتریش باسمان كرد، یانی چی گومڕایی دەكڕن؟ چونكە كەسێك توانای وەرگرتنی هیدایەتی هەبێ، كەچی گومڕایی هەڵبژێرێ،

وەك ئـەوە وایـە چووبێتـە بـازاڕ، وە سـەرپـشـك كرابـێ لـە نێوان كڕینـی شـتێكی باش‌و كڕینـی شـتێكی خراپدا، كەچی بچـێ شتە خراپەكە بە پارە بكـڕێ، ئـەوە لـەلایەك، هـەروەها دەگونجـێ مەبەست پێی ئەوەبـێ ئەوانـە ئەوەنـدە ئـەو ڕێیـە هەڵەی كـە خۆیـان لەسـەرینـی، واتـە: خـاوەن كتێبـەكان جـوولەكەو نەصـڕانییەكان‌و ئـەوانی دیكـەش، ئەوەنـدە شیـرنایەتییان پێیـدا چووەو، ئەوەنـدە توند دەستیان پێگـرتوەو ئەوەنـدە عـەودالێینـی، وەك ئـەوە وایـە كـە چۆن كەسێك دەچێتـە بـازاڕو بـە پـارەی خـۆی شـتێك دەكـڕێ، بەدوایـدا دەڕوا شار بـە شـار تـا دەیدۆزێتـەوە، ئـەوانیش ئـاوا ئـەو گومڕاییـەو ئەو ڕێیـە هەڵـە كە لەسـەرینی بەو شێوە دەسـتیان پێـوە گرتـوە، وەك بڵـێی بە شتێكی زۆر بەنـرخ‌و گرانبـەها تەماشـای دەكـەن!

**مەسـەلەی سـێیەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴾، دوو ڕاسـتی گـەورەو گرنـگ لـەم ڕسـتە قورئـانییەدا، كـە هـەر ئایـەتێكی سـەربەخۆشـە وەردەگیـرێن:

**ڕاسـتـیی یەكـەم:** كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡ ﴾، خـوا زانـاترە بـە دوژمنەكانتـان، لـە كـێ زانـاترە؟ واتـە: لـە خۆتـان زانـاترە، وە لـە هـەموو كـەس زانـاترە بـە دوژمنـەكانتان، ئەمـە یـانی چـی؟ یـانی: كـە خـوا ﷻ بـە ناوونیشـانی دوژمن كەسێكی پێناسـاندن، ئێوەش بـزانن كـەوا ئـەوەی خـوا فەرموویەتی وایە، بۆ وێنـە: دەفـەرموێ: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ ... ٨٢ ﴾ المـائـــدة، واتـــە: ئێـوە دەبیـنـن سـەرسـەختتـرین دوژمـن بـۆ ئیمانـداران ئەوانـەن كـە جوولەكـەن، وە ئەوانـەش كـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرن، واتـە: بـت پەرسـتەكان، ئنجـا بـە درێـژایی مێـژووش هـەر وابـووە، كـێ زۆر بـە سەرسـەختیی دژایـەتیی ئۆممـەتی ئیسـلامی كـردوە؟ جوولەكـەكان، هەڵبەتـە جوولەكـە كینـەو داخ لـە دڵـەكان، ئەگـەرنا لـەنێو جوولەكەكانیـشدا خەڵـكی بەئینـصاف هەیـە،

ئیمان دێنیّو مسولْمان دەبیّ، یاخود بە لای کەمەوە ئەگەر مسولْمانیش نەبیّ دژایەتیی مسولْمانان ناکات، وەك ئەو جوولەکانەی کە لە فەلەستین خۆپێشاندان دەکەن دژی سیاسەتی قەوارەی زایۆنی، یان لە ئەمریکاو لە ولاْتانی ڕۆژئاوا خۆپێشاندان دەکەن دژی سیاسەتەکانی جوولەکەو ئەمریکا، بەلاْم ئەوانەی کە حاقیدو داخ لە دلْن سەرسەختترین دوژمنی ئەهلی ئیمانن.

هەروەها هاوبەش بۆ خوا دانەرانو بتو گاو مارو مشكو چیو چی پەرستەکانیش، دەبینین بە درێژایی مێژوو ئەوانە سەرسەختترین دوژمنن، کەواتە: کە خوا دەفەرمویّ: ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡ﴾، خوا زاناترە بە دوژمنەکانتان، ئەوە دەبیّ یەقین بۆ ئینسان پەیدابیّ کە خوا فەرمووی: فلاْن لایەنە، فلاْن کەسە، دوژمنتانە، دەبیّ تۆ بزانی دوژمنتە، وە بە دوژمنی خۆتی بزانی، با جاری وایە قسەی لووسیشت لەگەلْ بکات، با ڕووی خۆشیشت پێشان بدات، بۆ وێنە: کە خوای زاناو شارەزا دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ٦﴾فاطر، واتە: بێگومان شەیتان (ئیبلیس) بۆ ئێوە دوژمنە، ئێوەش بیکەنە دوژمن، حزبەکەی خۆی بانگ دەکات بۆئەوەی بیانکاتە هاوەلّی دۆزەخ، یان خاوەنی دۆزەخ، کەواتە: شەیتان دوژمنی ئێمەیە، وە ئەوانەش کە لەگەلْ شەیتانن دوژمنی ئێمەن، یان کە دەفەرمویّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ...٥١﴾المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! جوولەکەو نەصرانییەکان مەگرن بە دۆست، هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن، جا ئایا بۆچی خوا وا دەفەرمویّ؟ چونکە دەزانیّ ئەوانە چییان لە دلْدایە، چییان لە بەرنامە دایە، چی دەکەنو چۆن دەکەن؟ ئەوە ڕاستی یەکەم.

**ڕاستیــــی دووەم**: کــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴾، خــوا بەســە بۆ ســەرپەرشــتیاریی‌و دۆســتایەتیی‌و مشــوورخۆریــی، وە خوا بەســـە بـۆ یارمەتییــدان‌و پـشــتیوانیی، بـۆ کـێ؟ بـۆ ئـەهلی ئیمان، بـەڵام ئـەوە بـە گـۆترە نیــە، خــوا ﷻ کــە ســەرپەرشــتیی ئێمــە دەکـاو مــشــوورمان دەخــواو کاروبارمــان هەڵدەســووڕێنێ‌و، ئاگــای لێمــان دەبـــێ‌و، یارمــەتییمان دەداو، پــشــتگیــرییمان دەکـــات، ئــەوە قـــەت بــەگۆترە نیـــە، بەڵــکو دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ۝٧ ﴾محمـــــــــد، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنــاوە! ئەگەر خــوا ســەربخـــەن خــوا ســەرتان دەخـات، دینــی خــوا ســەربخــەو دڵســۆزبە بـۆ خــوا، خــواش ســـەرت دەخـات، یــان دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝١٣٩ ﴾آل عمـران، واتــە: ئێــوە لەســــەرەوە دەبــن، ئەگـــەر ئیمـــانداربن، کـــەواتە: خــوای بەخــشــەر مەرجی هەیە بۆ ئەوە کە لەگەڵماندابێ‌و سەرپەرشــتییمان بکـاو پـشــتمان بگـرێ، یــان کــە دەفــەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ...۝٥٥ ﴾النـــور، واتــە: خــوا بەڵــێنی داوە بەوانــەتان کــە ئیمانیــان هەیــەو کــردەوە باشـــەکان ئــەنجام دەدەن، بیـــانکاتە جێنــشــین لــە زەوییــدا، وەك چـۆن ئەوانـــەی پــێش ئێوەشـــی کــردە جێنــشــین، وە ئــەو دینـــەی کـــە بـــۆی هــەڵبـــژاردوون، بۆتــان بــچەسپێنێ‌و بیکاتــە ســایەو ســێبەرتان، وە ترســتان بۆ بگـۆڕێ بۆ هـێمنیــی‌و ئاســاییش، بــەڵام لــە بەرانــبــەر چیــدا؟ بــە چ مەرجێــك؟ دەفەرموێ: ﴿ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ﴾، واتــە: بەندایەتیـــی بــۆ مــن دەکــەن، هــیچ شــتێك ناکەنــە هاوبەشــم، کەواتــە: بــە

مەرجی یەکتاپەرستیی‌و خوا بەیەکگرتن، خوای بەخشەر ئەو گفت‌و بەڵێنانە، ئەو مژدە خۆشانە بە ئیمانداران دەدات.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوای شارەزا دەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، وشەی: لە (مِن)، شارەزایانی زمان دەڵێن: بە چەند واتایەك دێ، یەکێ لەوانە بە واتای بەشێك (تَبعِيض)ە، ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، واتە: بەشێك لەوانەی جوولەکەن، وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن، وشەکان دەگۆڕن، لێرەدا پێویستە قسە لەسەر دوو شت بکەین:

**یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾، کەواتە: جوولەکەکان هەموویان وانین، وە لێرەدا خوای دادگەر ئێمە فێری ئینصاف‌و دادگەریی دەکات، عەرەب دەڵێن: (الإنصافُ خَيْرُ الأوصَافِ) دادگەریی باشترین سیفەتە، خوای دادگەر نافەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، جوولەکەکان هەموویان وشەکان لە شوێنی خۆیان دەگۆڕن، جا چ مەبەست پێی وشەکانی خوابێ، وەك دوایی باسی دەکەین، چ مەبەست پێی وشەکانی خۆیان بێ، کە لە قسەکردندا بەکاریاندێنن، مەبەستم ئەوەیە ئێمەش وەك ئیماندار دەبێ وریابین، کەسی وا هەیە دەڵێ: هەرچی جوولەکە هەیە لە دنیادا هەمووی خراپە، هەرچی نەصرانیی هەیە لە دنیادا هەمووی خراپە، هەرچی موشریکە هەمووی خراپە ... هتد، هەروەها لەنێو مسوڵمانانیشدا زۆرجار دەبینی ئەوەی کە مەشرەب سەلەفییە دەڵێ: هەرچی ئەهلی تەریقەت‌و تەصەووفە بەکەڵك نایەت، یان ئەوەی ئەهلی تەریقەت‌و تەصەووفە دەڵێ: هەرچی مەشرەب سەلەفییە بەکەڵك نایەت، یان سەلەفییەك دەڵێ: هەرچی لایەنی ئیسلامییە هەمووی هەڵەیە، کە لەڕاستییدا ئەوە هەمووی

بێ ئینصافییە، خوای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات، کە لەگەڵ ئەهلی کوفریشدا بێ ئینصاف نەبین، جوولەکەش هەموویان وشەکانی خوا ناگۆڕن، نەصرانییەکانیش هەموویان وانین، چ جای ئەهلی قیبلەو ئەهلی ئیمان هەمووی هەر خراپ بێ، یان بەشێك لە مسوڵمانان کە ناوونیشانێکی تایبەتیان هەبێ، بێنی زەربێك بەسەر هەموویان دابێنی، لەنێو هەموو قەومێکدا، لەنێو هەموو کۆمەڵێکدا چاكو خراپ هەیە، دەبێ هەمیشە ئێمە هەوڵبدەین خەڵك پۆلێن بکەین، ئەوەی وابێ باشە، ئەوەی وابێ خراپە، نە بە باری باشیدا، نە بە باری خراپیدا، ئینسان بەشێوەی گشتی حوکم بەسەر خەڵکی نەدات.

ئنجا خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، لە شوێنی دیکە لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿... يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ... ﴿٤١﴾﴾، واتە: وشەکان دەگۆڕن لە دوای شوێنەکانی خۆیان، هەردووکی هەر یەکە، ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن ﴿مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾، وشەکان لە شوێنەکانی خۆیان لادەدەن بۆ شوێنێکی دی، واتە: دوای ئەوەی کە خوا وشەکانی لە شوێنی خۆیان داناون، لایان دەبەن دەیانبەنە شوێنی دیکە، یاخود مەبەستێکی دیکەیان لێ دەگرن، دیارە لێرەدا (كَلِم) واتە: وشەکان، کۆی (كَلِمَة)یە، (كَلِمَة) واتە: وشە، دەگونجێ مەبەست پێی وشەکانی خوابێ، واتە: ئایەتەکانی خوا دەگۆڕن، کە ئەوەی سوورەتی (المائدة) بە تەئکید مەبەستی پێ ئەوەیە، بەڵام ئەوەی ئێرە دەگونجێ مەبەست پێی ئایەتەکانی خوابن: وشەکانی خوا دەگۆڕن، یانی: واتای هەڵەیان لێکدەدەنەوە، یاخود هەر دەیانگۆڕن، چونکە گۆڕین دوو حاڵەتی هەیە: گۆڕینی بێژەیی (التحريف اللفظي)، گۆڕینی واتایی

(التحريف المعنوي)، گۆڕینی بێژەیی ئەوەیە کە وشەکە بگۆڕی، گۆڕینی واتایی ئەوەیە کە ماناکەی هەڵە لێکبدەیەوە، وە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو وشەو تەعبیرانە بێ کە خاوەن کتێبەکان بەتایبەتی جوولەکەکان لە قسەکردنیان لەگەڵ پێغەمبەری خاتەم ﷺو مسوڵمانانی بەکاریاندەهێنان، کە دوایی باسی دەکەین، هەندێك تەعبیریان بەکاردەهێنان دوو واتایان هەبوو، دەگونجا واتای باشیان هەبێو دەگونجا واتای خراپیان هەبێ، ئیدی خوای زانا نەهی لێکردنو فێریکردن کە جۆرە تەعبیرێكو وشەیەك بەکاربێنن کە تەنیا مانای باشی هەبێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا﴾، دەگونجێ ئەمە تەفسیرو شیکردنەوەی ئەوەی پێشی بێ، کە دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەنو دەیانگۆڕن، ئەگەر مەبەست پێی قسەکانی خۆیان بێ، واتە: ئەوان کاتێك کە قسە دەکەن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: چی؟ دەڵێن: ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾، بیستمان وە سەرپێچییمان کرد، وە دەڵێن: ﴿وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾، ببیستە، پێ بیستراو نەبی، یاخود نەبیستی، ﴿وَرَٰعِنَا﴾، واتە: چاودێرییمان بکە، یاخود بە مانای تۆ شوانی ئێمەی، ئەگەر کەسرەکە تۆزێك تێر (إشباع) بکەی، بیکەی بە (يـ)و ببێتە (رَاعینا) تۆ شوانی ئێمەی کە ئەوە جۆرێکە لە سووکایەتیی پێکردن، یاخود ئەگەر تەنوینی بدەیە دەبێتە: (رَاعناً) واتە: کەودەنو بێ عەقڵو نەفام، جا سەرجەم توێژەرەوانی قورئان ڕستەکەی ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾، بیستمان وە سەرپێچییمان کرد، وایان لێکداوەتەوە: کە ئەوە بیستمان ئەی موحەممەد، وە سەرپێچیشت دەکەین!

بەڵام من پێم وانیە، چونکە ئەگەر وابووایە، ئەوە هەر بەئاشکرا دیار دەبوو، کە ئەوە قسەیەکی خراپ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکەن، وە ئاشکرا دەبوون، بۆیە بەڕاستی دوای ئەوەی کە سەرنجی تەفسیرەکانمدا، هیچیان وایان مانا نەکردوە، بەڵام دەگونجێ مانایەکەی ئاوابێ: ﴿سَمِعۡنَا﴾، واتە: ئەوە قسەی تۆمان بیست، (وَعَصَينا غيْرَك)، بەڵام گوێ بۆ غەیری تۆ ناگرین، واتە: بە قسەی تۆ دەکەین، بەڵام سەرپێچیی غەیری تۆ دەکەین، ئەوە لێرەدا مەدح دەگەیەنێ، ئەوە ئەگەر بە باری مەدح دا ئەو وشانە لێکبدرێنەوە، ﴿وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ﴾، ببیستە قەت پێ بیستراو نەبی، یانی تۆ قەت قسەی خراپ نەبیستی، کەس نەتوانێ قسەی خراپت بە گوێ بدات، یاخود هەواڵی ناخۆش نەبیستی، ئەوە بە باری چاکەکەیدا، ﴿وَرَٰعِنَا﴾، واتە: ڕەچاومان بکە، چاودێریمان بکە، ئاگات لێمان بێ، ئەوە ئەگەر مانای باشیان مەبەست بووبێ، کە دیارە ئەوان کە بەکاریانهێناوە مانای خراپیان پێ مەبەست بووە، کە گوتوویانە: ﴿سَمِعۡنَا﴾، ئەوە بیستمان (ئەگەر بە بارە خراپەکەی دابێ) بەڵام بە قسەت ناکەین، ﴿وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ﴾، ببیستە یاخوا نەبیستی، یان قەت قسەی خێرو هەواڵی باش نەبیستی، کە لێرەدا ئەوە دووعاکردنە، ﴿وَرَٰعِنَا﴾، بە بارە خراپەکەیدا، واتە: تۆ شوانی ئێمەی، یاخود تۆ نەفامو کەودەنی، کەواتە: ئەم قسانە وەك تیغی دوو دەم وانە، کە بە هەردوو دیواندا دەبڕێ، بە هەردوو باراندا دەبڕێ، هەم مانای باشیش دەگەیەنێ، هەم مانای خراپیش، دیارە ئەگەر هەردوو واتایان نەبوونایە، واتە: حاڵەتی دوو فلیقانەیی یان نەبووایە، نەیاندەتوانی ئاوا بە ڕاشکاویی ئەو جۆرە تەعبیرو وشانە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بەکاربێنن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ﴾،

وشەی: ﴿لَيًّا﴾، واتە: بادان، سووڕاندن، لە زمانی عەرەبیدا (لي) بە مانای بادانو نوشتاندنەوەو سووڕاندن دێ، دەگوترێ: (اللَّيُّ فَتْلُ الْحَبْلِ، لَوَيْتُهُ أَلْوِيهِ لَيًّا)، (لَيُّ) واتە: دەزوێك، پەتێك گرێ بدەی، (لَوى عُنُقَهُ) یان (لَوى رَأْسَهُ) واتە: ملی بادا، سەری بادا، کە دەفەرموێ: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ﴾، زمانیان لەگەڵ بادەدەن، ئنجا ﴿وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾، وە مەبەستیشیان پێی تانەدانە لە دین، کە ئەو شێوە تەعبیرەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ بەکاردەهێناو بەو جۆرە قسەیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکرد، دەڵێ: لەنێو خۆیاندا دەیانگوت: چووین قسەمان لەگەڵ موحەممەددا کرد دڵخۆشیشیمان کرد، کەچی قسەشمان پێگوت، پێمان گوت: ﴿سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾، بیستمان وە سەرپێچیمان کرد، ئەو پێی وابوو دەڵێین: گوێ بۆ تۆ دەگرین، بەڵام بە قسەی غەیری تۆ ناکەین، بەڵام مەبەستیان ئەوە بوو گوێت بۆ دەگرین، بەڵام بە قسەت ناکەین، وە پێمان گوت: ﴿وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾، ئەو وا دەزانێ پێمانگوتوە: ببیستە قەت پێ بیستراو نەبی، یانی تۆ قەت قسەی ناخۆش نەبیستی، بەڵام ئێمە مەبەستمان ئەوە بوو ببیستە، یاخوا کەڕ بیو، قەت قسەی خێر نەبیستی، وە پێمانگوت ﴿وَرَاعِنَا﴾، ئەو وادەزانێ پێمانگوتوە چاودێریمان بکەو ئاگات لێمان بێ، بەڵام ئێمە پێمانگوتوە: تۆ شوانی ئێمەی، یان پێمانگوتوە: تۆ گێلی، کە مەبەستیان پێ تانەدان بوو لە دین، وە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێك قسە بە پێغەمبەر ﷺ بڵێ، ئەوە مانای وایە کوفری کردوە، چونکە خوای پەروەرگار ئەوانە وەك کوفر لە جوولەکەکانو لە خاوەن کتێبەکان دەگێڕێتەوە، کەواتە: هەر قسەکردنێك بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەك کە سووکایەتیو بێڕێزیو بێحورمەتیی بگەیەنێ، ئەوە دیارە

کوفرە، وە ئینسانی پێ لە بازنەی ئیمان پێ دەچێتەدەر.

**مەسەلەی حەوتەم**: کە خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ﴾، واتە: ئەگەر گوتبایان: بیستمان‌و فەرمانبەرین، وە ببیستەو چاودێرییمان بکە، ئەوە بۆ ئەوان باشتر بوو، وە ڕاستتر بوو، ئەمە سێ شتی لێ وەردەگیرێن:

**یەکەم**: ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسان نابێ وشەو تەعبیری مانا لێڵ بەکاربێنێ، بەڵکو دەبێ ئینسان هەوڵبدا وشەو تەعبیری مانا ڕوون بەکاربێنێ، زۆر جار کەسێك کە وشەیەك بەکاردێنێ، دوو واتای هەبێ، سێ واتای هەبێ، ماناکەی لێڵ بێ، ڕوون نەبێ، بۆ چییەتی؟ دیارە مەبەستێکی خراپی هەیەو، ئەگەر ئەو وشەیە ئەو تەعبیرە دوو سێ مانای هەبوون، لە شوێنێك کە زانی بەرژەوەندیی وایە، دەڵێ: مەبەستم پێی ئەوەیان بوو، لە شوێنێکی دیکە دەڵێ: ئاخر مەبەستم پێی ئەوەبوو، یانی هەرجارەی لە بەرژەوەندیی خۆیدا، مەبەستێك دیاریی دەکات.

**دووەم**: هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەم چوار وشەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا﴾، هەر هەمان مانا باشەکانی وشەکانی ئەوان دەگەیەنن، بەڵام ڕێی تێدانییەو ئەگەری ئەوەی نییە، مانای خراپیان لێ وەربگیرێ، کەواتە: دەبێ ئێمە هەمیشە کە بە خەڵك دەڵێین: وا مەڕۆن، وا مەکەن، ئەوە حەرامە، ئەوە وایە، دەبێ بەدیلیان بۆ دابنێین، لێرەدا خوای کاربەجێ بۆ جوولەکان‌و نەصرانییەکان بۆ ئەهلی کیتاب، ئەڵتەرناتیفی ئەو وشانەی بۆ داناون‌و دەفەرموێ: ئاوا مەڕۆن، ئاوا مەڵێن، بەڵکو ئاوا بڕۆن، ئاوا بڵێن، بڵێن: ﴿سَمِعْنَا﴾، ئەوە قسەی تۆمان بیست ئەی موحەممەد، ﴿وَأَطَعْنَا﴾، وە فەرمانبەریشین بە قسەت دەکەین، ﴿وَٱسْمَعْ﴾، وە گوێمان بۆ بگرە،

بۆئەوەی ئێمە شتی خۆمانت پێ بڵێین، ﴿وَٱنظُرۡنَا﴾، وە چاوەڕوانییمان بکەو چاودێرییمان بکە، ئەم چوار وشە بەکاردێنێ، لە جیاتی ئەو چوار وشەیەی دیکەی، کە پێشتر بەکاریان دەهێنان، کە بەڵێ مانای باشیان هەبووە، بەڵام مانای خراپیشیان هەبووە، واتە: ئەگەر مەبەستیان قسە پێگوتنی پێغەمبەر ﷺ نیەو مەبەستتان ڕاوکردن نیە لە ئاوی لێڵدا، ئەگەر دزنینو بازاڕی ئاڵۆزتان ناوێ، ئەو چوار وشانە بەکاربێنن، کە جگە لە مانای چاك مانای خراپیان لێوەرناگیرێ.

<u>سێیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا﴾، ئەم چوار وشەیە چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵك لەگەڵ قیادە، کۆمەڵگا لەگەڵ حوکمڕانو بەرپرسانی خۆیاندا، دیاری دەکەن، ئێمە دەبێ لەگەڵ بەرپرسانی خۆماندا چۆن بین؟ ﴿سَمِعۡنَا﴾، دەبێ گوێ بگری، داخۆ چ فەرمانێکت پێدەکات؟ چ وە نەهییەکت لێ دەکات، گوێی لێ بگرە داخۆ دەڵێ چی؟ چونکە شوێنکەوتنی کوێرانە نیە لە ئیسلامدا، ئەوە نیە کە (إغمض عَينَيكَ واتّبَعني) چاوەکانت بنووقێنەو بەدوام بکەوە، ئیسلام دەڵێ چاوبکەوە بە چاوکراوەییو بە بەرچاو ڕوونییەوە، بزانە داخۆ چیت پێ دەگوترێ، شەرعییە یان ناشەرعییە، ئنجا بە دوای قسەکان بکەوەو بە دوای فەرمانەکان بکەوە، کەواتە: یەکەم هەڵوێستی خەڵك بەرانبەر بە بەرپرسانی خۆیان، ئەوەیە کە گوێیان بۆ بگرن ﴿وَأَطَعۡنَا﴾، ئنجا بە قسەیان بکەن، تۆ گوێی بۆ بگریو لێی تێبگەی، بەڵام دوایی بە قسەی نەکەی، ئەوە مانای وایە ئەوە وەك هەڵوێستی جوولەکەکانی لێهاتەوە، ﴿وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا﴾، وە هەمیشە دەبێ خەڵكو کۆمەڵگا لە بەرانبەر حوکمڕانو بەرپرسانی خۆیاندا، ئامادەبن هەقیان پێ بڵێن، واتە: قسەیان بۆ بکەنو عەرزی حاڵی خۆیانیان بۆ بکەنو لە بەرانبەریاندا

کــەڕو لاڵ نەبــن، بەڵــکو ڕێنماییــان بکــەن و ئامۆژگارییــان بکــەن، ئەگــەر پێویســتی کرد ڕەخنــەیان لــێ بگرن تێبینــیو سەرنجیان بــۆ بخەنــە ڕوو، بــە پێغەمبــەر ﷺیان گوتــوە: ﴿ وَٱسۡمَعۡ ﴾، گوێمان بــۆ بگرە، ئنجا ﴿ وَٱنظُرۡنَا ﴾، ئاگات لێمــان بــێو چاودێرییمــان بکــەو سەرپەرشــتییمان بکــە، بەڵــێ ئــەو چوار وشەیە، چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگاو خەڵك لەگەڵ بەرپرســانو حوکمڕانانــدا دەخەنــە ڕوو.

<u>مەســەلــەی هەشــتەم</u>: کــە خــوای بالادەســت دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾، ئــەم ڕســتە قورئانییــە دوو شــتی لــێ وەردەگیــرێن:

١) خــوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر جوولەکــەو نەصــڕانییەکان وە خــاوەن کتێبەکــان لە جیاتی ئــەو وشــەو تەعبیــرانەی پێشــێ، ئەمانــەی دواییان بەکارهێنابایــە، باشتــر بــوو بۆیــان، وە ڕاستتــر بــوو، بــەڵام بۆچی وایانــنەکرد؟ دەفــەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ ﴾، بــەڵام خــوا لەعنــەتی لێکــردن بــە هــۆی کوفرەکــەیانەوە، کەواتــە: هــەموو کافرێك مەلعوونــە، (مَلْعُــون) یــانی چــی؟ یــانی (مَطــرُود)، دیــارە (مَلْعُــون)یــش لــە (لَعْــن)ەوە هــاتوە، واتــە: دوورخستنەوەو بێبەشکردن لە بەزەیی خوای بە بەزەیــی، یانی: خوا بە هۆی کوفرەکەیانــەوە دووری خستونەوە لــە بــەزەیی خــۆی ﴿ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾، کەمێکیان نەبێ بڕواناهێنن، ئەمەش ئــەوەی لــێ وەردەگیــرێ کــە کوفــر مایــەی نــەفرینو دوورخــستنەوەی خوایــە بــۆ مــرۆڤ لــە ڕەحمــەتی خــۆی ئاشکراشــە هەر کەسێك لە ڕەحمــەتی خوا دوورکەوتــەوە لە خێــر بێــبەش دەبــێ، وە لەســەر ڕاســتیی بێــبەش دەبــێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ ﴾، ئــەوە چاکتــر بــوو، وە ڕاستتــر بــوو، کەواتــە:

کەسێك کە لە ڕەحمەتی خوا دوورکەوتەوە، لەڕاستییدا لە خێرو چاکە دوور دەبێ، وە لە شتی ڕاستو سەرڕاستیی دوور دەبێ.

٢) ئنجا ئەوەش کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، واتە: کەمێکیان نەبێ ئیمان ناهێنن، وە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان ئاوایان لێکداوەتەوە واتە: ئیمانێکی کەم نەبێ ناهێنن، بەڵام لەڕاستییدا مانای یەکەمیان ڕاستە، چونکە بەڵێ ئیمان لای زۆری هەیە، وە لای کەمیشی هەیە، ئیمانی موتڵەق هەیەو، موتڵەقی ئیمانیش هەیە، بەڵام بە هەرحاڵ لێرەدا ﴿ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، واتە: کەمێکیان نەبێ ئیمان ناهێنن، ئەوانەشیان کە ئیمان دێنن، دیارە واز لەو ڕەوشتو ڕەفتارە دزێوو خراپانەی خۆیان دێننو دەستبەرداریان دەبن، وە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺدا دەکەن، کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ شایستەیە.

<u>مەسەلەی نۆیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾، ئەگەر لە حاڵەتی ئیجابییدا خوای بێوێنە خاوەن کتێبەکان بدوێنێ، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، ئەی خاوەن کتێبەکان! بەڵام لە حاڵەتی گلەییو سەرزەنشتدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە! باسیان دەکات، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾، واتە: ئیمان بەوە بێنن کە ئەوەی لەگەڵ ئێوەیەو ئەوەی بە ئێوەیە (واتە: کتێبەکانی ئێوە) بەڕاست دەزانێ، ئنجا ئایا قورئان: زەبوورو صوحوفو چوار ئینجیلەکانو تەورات بەڕاست دەزانێ؟ دەڵێین: وەك ئەسڵەکەیان بەڵێ بەڕاستیان دەزانێ، بەڵام وەك حاڵەتی ئێستایان کە پڕن لە هەڵەو پەڵەو دەستکاریی زۆر کراون، نەخێر، وە ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە بەڕاستیی کتێبی

خاوەن کتێبەکان ئێستاش هەقی تێدایەو قورئان پشتگیریی هەقەکەیان دەکات، ئەو هەقەی کە ئێستا تێیاندا ماوەو دەستکاریی نەکراوەو نەگۆڕراوە، ئنجا هەر بۆ زانیاریتان ئێستا کتێبی جوولەکەو نەصرانیی یەکان هەمووی پێی دەگوترێ: کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدّس) کە من لە لامە، بە ناوونیشانی: (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس) ئەو کتێبە دوو هەزارو هەشت سەدو دوو (٢٨٠٢) لاپەڕەیە، وە ئەوەی کە پێی دەگوترێ: پەیمانی کۆن (العهد القدیم) تەنیا تەوڕات نیە، بەڵکو سی‌و نۆ (٣٩) (سیفر)ە، کە (سیفر)یش، واتە: کتێب، وە پەیمانی نوێ (العهد الجدید)یش (٢٧) کتێبە، واتە: وێڕای چوار ئینجیلەکان، کۆمەڵێك کتێبی دیکەش کە بە هەموویان (٢٧) کتێبن، وە هەمووی (٢٨٠٢) لاپەڕەیە[1].

شایانی باسە ئەم کتێبانە لە نێوانیاندا زەبووری داوودو مەزامیری داوودو پەندەکان (أمثال)ی سولەیمان‌و ئەوانەیان تێدایە، وە هەندێ شتی ڕاست‌و هەقیان تێدایە، بەڵام هەڵەو پەڵەو کەموکوڕیی زۆریشیی تێدایە.

مەسەلەی دەیەم: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾، پێشتر باسی ئەم ڕستە قورئانییەمان کرد، کە خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە! ئیمان بێنن بەو کتێبەی کە نێرراوەتە خوار، (واتە: بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ)، وە ئەوەی کە بە ئێوەشە، (واتە: کتێبەکانی ئێوەش) بەڕاست دەزانێ‌و دانیان پێدا دەهێنێ، بەرلەوەی کە چەند دەموچاوێك وەرسووڕێنین بۆ پشتەوە، یاخود نەفرینیان لێبکەین، وەك چۆن نەفرینمان کرد لە هاوەڵانی شەممە (پێشتر باسمان کرد هاوەڵانی شەممە مەبەست

---

١) ئەو کتێبە تەفسیرو لێکدانەوەیەکی لەسەر کراوەو، هەر لەگەڵ دەق (متن)ەکەیدا چاپ کراوە، بۆیەش قەبارەکەی هێندە زل بووە.

پێیـان کێیــە؟)، لێـرەدا توێـژەرەوانی قورئـان وەك پرسـیارێك باسـیان کـردوە، دەڵێن: ئایا مەبەست لەوە چییە کە خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە! ئیمان بێنن بەوەی کە نێردراوەتە خوار، وە ئەوەی ئێوەش بەڕاست دەزانن، واتە: ئیمـان بە قورئان بێـنن، بەرلەوەی چەند ڕوویەك لە پێشەوە بسڕینەوە، وە وەریانسووڕێنین بۆ پشتەوە، زانایان دەڵێن: ئایا مەبەست پێی چییە؟ چونکە نەمانبیستوە خوا ﷻ هیچ کەس لە جوولەکەو نەصرانییەکانو لەوانەی دیکەش کە ئیددیعای کتێبی ئاسمانیی دەکەن، لەسەر ئەوە کە ئیمانیان بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، وە بە قورئان نەهێناوە، خوا بەو سزایە سزای دابن، ئەدی بۆچی لێرە وا دەفەرموێ؟ کە دیارە زۆریشیان ئیمانیان نەهێناوە، وە نەشمانبیستوە بەو جۆرە سزا درابن، ئەوە بە ڕواڵەت ئیشکالێکەو توێژەرانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، بەڵام بە ڕای من وەڵامەکەی دوو شتە:

**یەکەم:** خوا ﷻ فەرموویەتی: ئیمان بێنن، ئنجا هەموویان ئیمانیان نەهێناوە، بەڵام هەندێکیان ئیمانیان هێناوەو بەو هەندێکەی کە ئیمانیان هێناوە، خوای لێبوردە سزاکەی لەسەر ئەوانی دیکەش لابردوە، دیارە کە هەندێکیش لە جوولەکەکانو نەصرانییەکانیش، هەم لە سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ و هەم لە چاخو ڕۆژگارەکانی دواییشدا، هەتا ئەم سەردەمەش، کە بە ئینصافن، دوای ئەوەی کە لە قورئان شارەزا دەبن، ئیمان بە قورئانو بە ئیسلام دێنن.

**دووەم:** مانایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئەوانە شایستەی ئەو جۆرە سزایەن، واتە: ئەگەر خوای دادگەر لە قەدەر گوناحو تاوانەکەی خۆیان سزایان بدات، شایستەی ئەو سزایەن، بەڵام مەرج نیە هەر کەسێك شایستەی سزایەك بوو، خوا سزای بدات، بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا ﷻ لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ڕایدەگەیەنێ، کە ئەگەر بە تاوانی خەڵك خوا ڕەفتاری کردبایە، کەسی لەسەر زەوی

نەدەهێشت و هەمووی سزا دەدان و قڕە بڕی دەکردن، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارت لێبوردەیەو خاوەنی بەزەییە، ئەگەر بە هۆی کردەوە خراپەکانیانەوە سزای دابانایە، دەبوو زوو سزای بۆ هێنابانە پێشێ، (واتە: لە دنیادا)، بەڵام مەوعیدێکیان هەیە کە لەوێ هیچ دەرفەتیان نیە خۆی لێ دەرباز بکەن (واتە: خوا ﷻ حیکمەتی وا دەخوازێ کە لە دنیادا بە پەلە نیە، سزای خراپەکاران بدات، بەڵکو هەڵیاندەگرێ بۆ دوارۆژ).

هەروەها لە سووڕەتی (النحل)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةًۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خوا بەهۆی ستەمی خەڵکەوە سزای دابانایە، زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت، بەڵام هەڵیاندەگرێ بۆ کاتێکی دیاریکراو، جا هەر کاتێك ئەجەلیان هات، نە سەعاتێك پێش دەخرێن، نە دوا دەخرێن، وە لەوێ لە ڕۆژی دواییدا، وە لە عالەمی بەرزەخ دا سزای خۆیان وەردەگرنەوە.

هەروەها لە سووڕەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر خوا بە هۆی کردەوەی خەڵك (واتە: کردەوە خراپەکانیانەوە) سزای دابانایە، (لە دنیادا) لەسەر پشتی زەوی زیندەوەرێکی نەدەهێشت هیچ شتێکی نەدەهێشت، بەڵام دوایان دەخات بۆ کاتێکی دیاریکراو، جا هەر کاتێك کاتی خۆیان هات، ئەو کاتە خوا بینەری بەندەکانیەتی و دەزانێ چییان کردوە.

کەواتە: بەم دوو وەڵامە لەو ئیشکالە دەرباز دەبین کە خوا ﷻ هەڕەشە دەکات، دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە! ئیمان بێنن بەوەی ناردوومانەتە خوار، کە کتێبەکانی ئێوەش بەڕاست دەزانێ، بەرلەوەی بەو جۆرە سزاتان بدەین دەموچاوتان بسڕینەوە لە پێشەوە وەریسووڕێنین بۆ دوایە، ئنجا ناشبینین خوا کەسی وا سزا دابێ، کەواتە: مەبەست پێی ئەوەیە کە شایستەی ئەو سزایەن، بەڵام هەڵیاندەگرێ، بۆ ڕۆژی دوایی، یاخود مەبەست ئەوەیە بەو جۆرە سزاتان دەدەین، ئەگەر هیچتان ئیمان نەهێنن، بەڵام لەبەرئەوەی هەندێکیان ئیمانیان هێناوە، خوای بە بەزەیی سزای لەسەر ئەوانی دیکەش لابردوە، وەك عەرەب دەڵێن: (وَمِن أَجلِ عَينٍ أَلْفُ عَيْنٍ تُكرَمُ) واتە: لەبەر چاوێك ڕێز لە هەزار چاو دەگیرێ.

بەنسبەت (لَعْن)یشەوە چونکە خوا ﷻ دوو هەڕەشەی لێکردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿... مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ...﴿٤٧﴾﴾، دەڵێین: لەعنیش سزایەکی مەعنەوییە چونکە (لَعْن) واتە: دوورخستنەوە، (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ والإبْعَادُ) لەعن: دەرکردنو دوورخستنەوەیە لە بەزەیی خوا، کە ئەوە شتێکی مەعنەوییە، زۆر کەس خوا لەعنەتی لێ دەکاتو لە ڕەحمەتی خۆی دووری دەخاتەوە، بەڵام ئێمە هەستی پێ ناکەین، وەك پێشینان دەڵێن: (ماست نیە بە لێویەوە دیار بێت)! مرۆڤ هەیە مەلعوونیشەو لە ڕەحمەتی خواش دوورە، کەسیش هەستی پێ ناکات، بەڵام لە قیامەتێ ئەوە دەبینرێ، چونکە دنیا جێگای تاقیکردنەوەیەو هەر کەسێك خوا لەعنەتی لێ کردبا، قۆچی لێ ڕوابایەو نیشانەیەکی لێ دەرکەوتبایە، ئەوکاتە خەڵك بە مەجبووریی خواپەرستیی دەکرد، بەڵام نەخێر خوا ﷻ بە مەبەستی تاقیکردنەوە خەڵکی لەسەر زەوی داناوە، لەبەرئەوە دەبێ دەرفەتیان هەبێ تاقی بکرێنەوە، نە ئەوەی چاکە دەکات شتەکەی زۆر لێ دیارە، نە ئەوەی خراپە

دەكات، هەڵبەتە ئەوەی چاكە دەكات بە چاكەكەی خۆی دڵ ئاسوودەیەو مورتاحە، وە ئەوەی خراپەش دەكات پێی نامورتاحە، بەڵام شتێكی وانیە بڵێی زۆر پێیانەوە دیاربێ، نە بەرهەمی چاكەكاریی، نە بەرهەمی خراپەكاریی شتێكی وا زۆر زەق نیە، تا وابێ خەڵك ناچار بێ، خواپەرستیی بكات، بۆ وێنە: ئەگەر هەر كەسێك درۆیەكی كردبا ڕووی ڕەش بووبایە، كەس درۆی نەدەكرد، وە هەر كەسێك نەفەرێكی كوشتبایە، یان حەرامێكی خواردبایە، شتێكی بەسەر هاتبا، ئەو كاتە بە مەجبووریی نەك بە ئیختیاریی، لە ترسی ئەوەی سزا نەدرێ، نەك لەبەر خۆشەویستیی، خوا ڕێی چاكەیان دەگرت.

**مەسەلەی یازدەیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾، وە فەرمانی خوا جێبەجێ كراوە، یانی چی؟ یانی: ئەو شتەی كە خوا بیەوێ جێبەجێ دەكرێ، من پێموایە ئەم ڕستە قورئانییە وەڵامی ئەو ئیشكالەی پێشێ دەداتەوە، كە: پێتان وانەبێ لەبەرئەوەی خوای دادگەر ئەوانەی كتێبیان پێدراوە لە پێش پێغەمبەردا ﷺ، واتە: خۆیان بە خاوەن كتێب زانیوە، پێتان وانەبێ لەبەرئەوەی خوا بۆی نەلواوە، سزای نەداون! چونكە ئەگەر خوا فەرمانی كردباو ویستبای سزایەكەی جێبەجێ دەبوو، بەڵام دیارە خوا ﷻ نەیویستوە لە دنیادا سزایان بدا، ئەگەرنا، هەر كات خوا شتێكی ویست، هیچ پەرچو ئاستەنگێك لەبەردەم فەرمانو ئیرادەی خوادا نیە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ... ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ پەیدابكرێ، بەڵام جگە لە هاوبەش بۆ پەیداكردن بۆ هەر كەسێك بیەوێ لێی دەبوورێ، ئێمە پێشتر باسی (شرك)مان كرد، بەڵام ئێستاش تیشكێكی دیكەی دەخەینە سەر، چونكە بەڕاستیی شیرك كە خوا لێرە دەفەرموێ: خوا لە شیرك نابوورێ، بەڵام لە هەر گوناهێكی دیكە

ڕەنگە ببووریٚو دەکەوێتە بەر ویستو خواستی خۆی، مانای وایە شیرك گەورەترین گوناهە، وەك لوقمانی حەکیمیش کە ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات دەڵێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، واتە: ڕۆڵە گیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی زۆر گەورەیە، لێرەدا (مُحَمدُ بن جَرير الطَّبري) کە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان ناسراوە لە تەفسیری خۆیدا دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە دەڵێ: (وَقَدْ أبَانَتْ هَذِهِ الآيةُ كُلُّ صَاحِبِ كَبيرةٍ، فَفِي مَشِيئَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ إنْ شَآء عَفَا لَهُ، وَإنْ شَاءَ عاقَبَهُ، مَا لَمْ تَكُنْ كَبِيرتُهُ شِرْكاً باللَّهِ)[1]، واتە: ئەم ئایەتە دەریخستوە کە هەموو خاوەن گوناهێکی گەورە، ئەوە دەکەوێتە بەر خواستو ویستی خوا، ئەگەر ویستی لێی دەبووریٚ، ئەگەر ویستیشی سزای دەدا، بە مەرجێك ئەو گوناهە گەورەیە هاوبەش بۆ خوا دانان نەبێ، هاوبەش بۆ خوا دانان قەڵەمی عەفووی بەسەر دانایەت، واتە: بەبێ تۆبەکردن، بە تۆبەکردنەوە هیچ گوناهێك نیە کە هەڵاوێردریٚو خوا نەیبووریٚ، کوفرو شیركو نیفاق هەمووی، بەڵام بەبێ تۆبەکردن، بۆ کەسێك کە ئیمانی هەبیٚو مسوڵمان بێ، ئەگەر شیرك بکات، مانای ئیمانەکەی هەڵوەشاوەتەوە، بەس کە شیرك نەبوو، گوناهەکانی دی ڕێی تێدەچێ خوای بەخشندە بەبێ تۆبەش لێیان ببووریٚ، وە ڕێشی تێدەچێ لێیان نەبووریٚ، دەربارەی جۆرەکانی شیرك (أبو البقاء) یەکێکە لە زانایان وەك (جمال الدين القاسمي) خاوەنی (محاسن التأويل)[2] لێی خواستۆتەوە شیرکی کردوە بە شەش جۆرەوە، ئێمە پێشتر باسمان کرد کە شیرك سێ جۆری سەرەکییە، لێرەدا ئەم کردوویەتی بە شەش جۆر، کە دیارە هەندێکیان دەچنەوە نێو هەندێکیان، ئەگەرنا شیرك بەگشتی، یان

---

١) جامع البيان، ج: (٥)، ص: (٤٩٠).

١) ج: (٥)، ص: (٢٠٠).

هاوبەش بۆ خوا دانانە لە بەدیهێنەرایێتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی و سەرپەرشتیکردنیدا بۆ کەون و کائینات، یان هاوبەش بۆ خوا دانانە لە ناوە هەرە چاکەکانی و سیفەتە هەرە پەسەندەکانیدا، یان هاوبەش بۆ خوا دانانە لە پەرستران و بەندایەتیی بۆکراندا، (أَبُو البَقَاء) دەڵێ: {والشِّرْكُ أَنْوَاع :

١/ شِرْكُ الإستِقلالِ: وَهُوَ إثبَاتُ إلَهَيْنِ مُستَقِلَيْنِ، كَشِرْكِ الْمَجُوسِ.

٢/ شِرْكُ التَّبْعِيضِ: وَهُوَ تَرْكِيبُ الإلَهِ مِنْ آلِهَةٍ، كَشِرْكِ النَّصَارَى.

٣/ شِرْكُ التَّقْرِيب: وَهُوَ عِبَادَةُ غَيْرِ اللَّهِ لِيُقَرِّبَ إلى اللَّهِ زُلْفَى، كَشِرْكِ مُتَقَدِّمِي الْجَاهِلِيَّةِ.

٤/ شِرْكُ التَّقْلِيدِ: وَهُوَ عِبَادَةُ غَيْرِ اللَّهِ تَبعَاً لِلْغَيْرِ، كَشِرْكِ مُتَأخِرِي الْجَاهِلِيَّةِ.

٥/ شِرْكُ الأَسْبَابِ: وَهُوَ إسنَادُ التأثيرِ لِلأسْبَاب العَادِيّة، كَشِرْكِ الفَلاَسِفَةِ الطَّبائِعيين وَمِنْ تَبِعهُمْ عَلَى ذَلِكَ.

٦/ شِرْكُ الأَغْرَاضِ: وَهُوَ العَمَلُ لِغَيْرِ اللَّهِ.

فَحُكْمُ الأَرْبَعَةِ الأولَى الكُفْرُ بِإجْمَاع، وَحُكْمُ السَّادِسِ الْمَعْصِيةُ مِنْ غَيْرِ كُفْرٍ بِإجْمَاعٍ، وَحُكْم الْخَامِسِ التَّفْصِيل} .

دەڵێ: هاوبەش بۆ خوا دانان چەند جۆرێکە:

١/ (شِرْكُ الإستِقلالِ): واتە: هاوبەش بۆ خوا دانانی سەربەخۆ، بریتیە لەوەی کەسێك بڕوا بێنێ بە دوو بەدیهێنەر، وەك: شیرکی مەجوسییە ئاگر پەرستەکان، کە بڕوایان بە یەزدان و ئەهریمەن هەیە، یەزدان (ئەهۆرامەزدا)یشی پێ دەڵێن، ڕەمزەکەشی بریتیە لە ڕووناکی، دەڵێن: خوای خێرەو بەس چاکە دروست دەکات، بەڵام ئەهریمەن خوای شەڕە، کە ڕەمزو هێماکەی بریتیە لە تاریکیی دەڵێن: بەس خراپە دەکات، هەڵبەتە

ئەوە ئەفسانەیە، خوا یەك خوایە پاكو بێگەردیی بۆ خوا، ئەوانە هەمووی وا دیارە (ئیبلیس)یان لێ بۆتە خوای شەڕ، کە ئیبلیس دروستکراوێکی خوایە، خوا دروستی کردووەو خوا مۆڵەتی پێداوەو بەس خراپە دەکات بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکان، بە هەر حاڵ دانپێداهێنانی لە خوایەك زیاتر پێی دەگوترێ: (شِرْكُ الإستِقلالِ).

٢/ (شِرْكُ التَّبْعِيضِ): ئەویش ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا دابنێی بە شێوەیەك کە هاوبەشەکان ببنە بەشێك لە خوا، وەك: شیرکی نەصرانییەکان کە بڕوایان بە (الأقَانيمُ الثَّلاثَةُ) هەیە، واتە: سێ توخمەکان، دەڵێن: (خوا یەکەو سێشە، کە دیارە ئەوە شتێکی موستەحیلەو لە عەقڵەوە ناچێ)، بەڵام بە هەرحاڵ ئەوەش ئەفسانەیەکە ئەوان دایانهێناوە دەڵێن: خواو عیسا کە کوڕی خوایەو گیانی پیرۆز (روح القدس) کە ئەویش جیبریلە، بەڵام ئەوان لێیان تێکچووە، ئەوە سێ، دەڵێن: بە هەرسێکیان خوا پێکدێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ...(٧٣)﴾ المائدة، واتە: بێگومان بێبڕوان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە. واتە: یەکێکە لە سێیان سێ کوچکە (ثالوث) کە ئەوە وەك گوتم شتێکی پووچو هەڵەیە، خوا یەکێکە بەڵام عیسا بەندەی خوا بووە، بەڵێ خوای بەدیهێنەر ڕاستەوخۆ عیسای دروست کردوە بەهۆی دایکییەوەو بابی نیە، بەڵام خۆ ئادەمی دروست کردوە، نە بابی هەیەو نە دایکی هەیە، هەروەها حەووای دروست کردوە، نە بابی هەیەو نە دایکی هەیە، وە خەڵکی دیکەشی دروست کردوە کە بابو دایکیان هەیە، وە عیساشی دروست کردوە بابی نیەو دایکی هەیە، بەڵام ئەوان عیسایان لێ بۆتە خوا، وە جیبریلیش (روح القدس) گیانی پیرۆز، کە وەحی هێناوە، ئەویشیان کردۆتە یەکێك لە سێ پێکهێنەرەکانی خوا.

٣/ (وَشِرْكُ التَّقريب) واتە: هاوبەش بۆ خوا دانانی لێ وە نزیکخستن، ئەویش بریتیە لە بەندایەتیی کردن بۆ غەیری خوا، بۆئەوەی لە خوا نزیکی بخاتەوە، دەڵێ: وەك هاوبەش بۆ خوا دانانی موشریکە پێشووەکان، ئەوان دەیانگوت چی؟ ﴿ ... مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ...(٣) ﴾ الزمر، واتە: ئەو پەرستراوانەی خۆمان، ئەو بتو صەنەمانە ناپەرستین مەگەر بۆئەوەی لە خوامان نزیك بخەنەوە.

هەڵبەتە هەندێك لە مسوڵمانانیش گیرۆدەی ئەو جۆرە شیركە دەبن، كە وەك صەنەمێك هەڵسوكەوت لەگەڵ كەسێكدا دەكەن، كە بە پیرۆزی دەزانن‌و پێیان وایە لە خوایان نزیك دەخاتەوە، لێی دەپاڕێنەوە، یاخود لە قەبرەكەی دەپاڕێنەوە، كە ئەوەش لەڕاستیدا هەر هەمان ئەو حوكمەی هەیە، چونكە پەرستن دەبێ بەس بۆ خوا بێ، پەرستن واتە: لێپاڕانەوە، نەزر، قوربانیی، ئەوپەڕی لێترسان، ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، ئەوپەڕی مل بۆ كەچكردن، ئەوانە دەبێ بەس بۆ خوا ﷻ بن‌و هەركام لەو شتانە بۆ غەیری خوا بكرێ، ئەوە مانای وایە وەك خوا مامەڵەی لەگەڵدا كراوە، وە كراوە بە هاوبەش بۆ خوا.

٤/ (وَشِرْكُ التَّقْلِيدِ): واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان لەسەر بناغەی لاساییكردنەوە، ئەویش بریتیە لە پەرستنی غەیری خوا بە چاولێكردن‌و لاساییكردنەوەی غەیر، كە ئەوە لەگەڵ ئەوەی پێشێ هەریەكە.

٥/ (شِرْكُ الأَسْبَابِ): هاوبەش بۆ خوا دانان لە هۆكارەكاندا، كاتی خۆی لە فەلسەفەی یۆنانییدا هەیە بڕوایان بووە بە دە عەقڵەكان (العقول العشرة)، دەڵێ: خوای پەروەردگار عەقڵێكی خوڵقاندوە، ئەوە عەقڵە عەقڵی دووەمی خوڵقاندوەو ئەویش هی سێیەم‌و ... هتد، بە هەر حاڵ هەرشت دروستكردنێك پاڵ بدرێتە لای یەكێكی دیكە، كە ئەو شتەی دروستكردوە، ئەوە بریتیە لەو جۆرە شیركە، شیركی هۆكار، یاخود كەسێك قەناعەتی وابێ بەبێ ویستی خوا، فلان شتە دەبێ بەهۆی فلان

هۆکارەوە، ئەوە دەچێتە ئەو خانەیەوە، ئەگەرنا ئەگەر پێت وابێ: ئاگر دەسووتێنێ، ئاو تینوێتی ئینسان دەشکێنێ، هەوا شت دەجوولێنێ، بەڵام خوا ﷻ ئەو هێزەی لەنێو ئاگردا داناوەو، لەنێو ئاودا داناوەو، لەنێو هەوادا داناوەو لە نێو سەرجەم شتەکاندا داناوە، چەقۆ دەبڕێ، بەڵام لەبەرئەوەی خوای باڵادەست وای لە چەقۆ کردووەو ئەو تایبەتمەندییەی پێداوە، ئەوە شیرك نیە، بەڵام کەسێك پێی وابێ یەکێك لەو هۆکارانە بەرهەمێك و شوێنەوارێك پەیدادەکات، بەبێ ویستی خوا، ئا ئەوە شیرکە.

٦/ (وَشِرْكُ الأَغْرَاضِ): شیرکی ئامانجەکان، ئەویش ئەوەیە کە شتێك بکەی بۆ غەیری خوا، پێشتر باسمان کرد کە پێی دەگوترێ (الرياء) کەسێك عیبادەتێك و طاعەتێك بکاو، مەبەست پێی سەرنج ڕاکێشانی کەسێکی دیکە بێ و، مەبەستی پێ خوا ﷻ نەبێت، واتە: لەو کارانەدا کە بۆ خوا دەکرێن و مامەڵەیان پێ لەگەڵ خوا دەکرێ، ئەو جۆرە کارانە بۆ غەیری خوا ئەنجام بدەی، ئەوە شیرکە.

ئنجا دەڵێ: (فَحُكْمُ الأَرْبَعَةِ الأُولَى الكُفْرُ بِإِجْمَاعٍ، وَحُكْمُ السَّادِسِ الْمَعْصِيةُ مِنْ غَيْرِ كُفْرٍ بِإِجْمَاعٍ، وَحُكْم الْخَامِسِ التَّفْصِيل)، واتە: چوار جۆری یەکەمیان، ئەوە بەیەك دەنگیی هەموو زانایان کوفرن، وە جۆری شەشەمیان تاوانە، وە جۆری پێنجەمیشیان دەبێ تەفصیلی پێ بدرێ، وەك من گوتم، ئەگەر بڵێی: ئاگر دەسووتێنێ، بێ ئەوەی کە خوا بیەوێ، ئەوە شیرکە، بەڵام ئەگەر بڵێی: ئاگر دەسووتێنێ، چونکە خوا وای دروست کردووە کە بسووتێنێ، ئەوە شیرك نیە، وە هیچ ئیشکالێکی تێدانیە، ئنجا با سەرنجی چەند فەرموودەیەکیش بدەین دەربارەی شیرك:

<u>فەرمایشتی یەکەم:</u> ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا الْمُوجِبَتَانِ؟ فَقَالَ: مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٢٣٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٥)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان

ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عەرەبێکی خێڵەکیی بادیەنشین هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! دوو شتە پێویستکەرەکان چین؟ ئەویش فەرمووی: هەر کەسێك بمرێ، هاوبەش بۆ خوا دانەنێ، (هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوا)، دەچێتە بەهەشت، وە هەر کەسێك بمرێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ، دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، واتە: خوا بەیەکگرتنو تەنیا خوا بە پەرستراو زانین، بەهەشت بۆ ئینسان پێویست دەکات، وە هاوبەش بۆ خوا دانان، دۆزەخ بۆ ئینسان پێویست دەکات، کەواتە: دوو شتە پێویستکەرەکان بریتین لە چیو چی؟ تەوحیدو شیرك، خوا بەیەکگرتنو هاوبەش بۆ خوا دانان.

**فەرمایشتی دووەم:** ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: قَالَ لِي جِبْرِيلُ: بَشِّرْ أُمَّتَكَ أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ، فَقُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ قُلْتُ: وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ، قُلْتُ: وَإِنْ سَرَقَ وَإِنْ زَنَى؟ قَالَ: نَعَمْ، وَإِنْ شَرِبَ الْخَمْرَا]﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢١٤٧١)، البُخَارِيُّ بِرقم: (٦٤٤٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٦٤٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) بِرقم: (١٠٩٥٥)، وَابْنُ خُزَيمَة بِرقم: (٣٣٥)، وَابْنُ حِبَّان بِرقم: (١٧٠)، واتە: ئەبو زەڕی غیفاریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جبریل پێی گوتم: موژدە بە ئۆممەتەکەت بدە هەر کەسێك بمرێو هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوا، دەچێتە بەهەشت، گوتم: ئەی جبریل! ئەگەر دزیی بکاو ئەگەر زیناش بکات؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئەگەر دزیی بکاو ئەگەر زیناش بکات؟ دیسان فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئەگەر دزیی بکاو ئەگەر زیناش بکات؟ دیسان فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر شەڕابیش بخواتەوە!

بەڵام لێرەدا لێتان تێکنەچێ، مەبەستی جبریل لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەیە کە هەر کەسێك ئەهلی تەوحید بێو

بەڕاستیی خوا بەیەکگر بێ، تەنیا خوا بە پەرستراوی خۆی بزانێ، با هەڵەو گوناهیشی هەبن، سەرەنجام دەچێتە بەهەشت، جا ئەگەر تۆبەی کردبێ لە دنیادا، ئەوە لە گوناهەکانی پاك بۆتەوە، ئەگەر تۆبەیەکی ڕاستو ڕاستەقینەی کردبێ، وەك لە ڕابردوودا باسی تۆبەی ڕاستەقینەمان کرد، کە مەرجەکانی چین؟ وە ئەگەر تۆبەشی نەکردبێ، مادام ئەهلی ئیمانو خوا بەیەکگرتنو (توحید) بێو گیرۆدەی شیرك نەبووبێ، لە دوارۆژدا ئەگەر خوا لێی بورد ئەوە لێی بورد، وە ئەگەر چاوپۆشیی لێ نەکرد، بە قەدەر گوناهەکانی دەسووتێنرێ، بەڵام دوایی دەرباز دەبێ، وەك لە دەرسەکانی ڕابردوودا باسمان کرد، کەواتە: وانیە بڵێی: مرۆڤ زیناو دزییو شەڕاب خۆریشی هەبێ، یەك ڕێ بۆ بەهەشتێیە! یان لەبەرئەوەی کە دەڵێ: بەس خوا پەرستراوە، نەخێر، ئنجا بەس خوا بەپەرستراوی خۆ زانینیش، ئەویش دیسان بەڕاستیی وا لە ئینسان دەکات، کە لە گوناهی گەورە دوور بێ، تۆ ئەگەر بەڕاستیی خوا بە پەرستراوی خۆت بزانی، بە پەروەردگاری خۆتو بە هەمەکارەی خۆتی بزانی، ئەو ئیمانو عەقیدەو تەوحیدە، دەتگێڕێتەوە لە خراپە، بەڵام ئەگەر گریمان کەسێك خاوەنی ئەو ئیمانە بووو هەڵەیەکی کرد، گوناهێکی کرد، مادام ئەو ئیمانو عەقیدەیەی هەبێ سەرەنجامەکەی هەر دەچێتە بەهەشت، وەك گوتم: جا ئەگەر لە دنیادا تۆبەی کردبێ، پاکبۆتەوە، وە ئەگەر تۆبەی نەکردبێ، وە خوا عەفووی نەکرد، بەقەد گوناهەکانی سزا دەدرێو، دوایی دەچێتە بەهەشت.

**فەرمایشتی سێیەم:** ﴿عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا قَالَ: كُنَّا مَعْشَرَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ لانَشُكُ فِي قَاتِلِ النَّفْسِ، وَآكِلِ مَالِ اليَتِيمِ، وَشَاهِدِ الزُّورِ، وَقَاطِعِ الرَّحِمِ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ... ﴿١١٦﴾ ﴾، فأمسكنا عن الشهادة﴾،

أَخْرَجَهُ ابن أَبي حَاتِم، وَابْنُ جَرير برقم: (٩٧٣٢)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: ئێمە کۆمەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هیچ گومانمان نەبوو، کە ئەوەی کەسێك بکوژێ بە ناهەق (دەچێتە دۆزەخ)، وە کەسێك ماڵی هەتیو بخوات بە ناهەق (دەچێتە دۆزەخ)، وە ئەوەی شایەدیی بە درۆ بدات (حەتمەن دۆزەخییە)، وە ئەوەی پەیوەندیی خزمایەتی بپچڕێنێ (دۆزەخییە)، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: خوا لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ پەیدا بکرێ، بەڵام جگە لەوە لە هەر کەسێکی بوێ دەبوورێ، دوای ئەم ئایەتە وازمان لەوە هێنا کە هەر کەسێك گوناهێکی گەورەی کرد بڵێین: حەتمەن دۆزەخییە، وازمان لەو جۆرە شایەدیی دانەهێنا، کە دەبینی خوا لێی دەبوورێ، ئەگەر تۆبە بکا بە مسۆگەریی‌و ئەگەر تۆبەش نەکات بە ئیحتیمالیی.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە خۆیان تەزکیە دەکەن! واتە خۆیان بە پاك‌و چاك وەسف دەکەن، لێرەدا دوو ئیشکالمان بۆ دێنە پێش:

**ئیشکالی یەکەم:** ئەوەیە کە یوسفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (سەلامی خوایان لەسەر بێ) کاتێك کە پادشای میسر بانگی دەکات دەڵێ: چی؟ دەڵێ: ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ۝٥٥ ﴾یوسف، واتە: من لەسەر عەمبارەکانی زەوی دابنێ، (واتە: بمکە بە وەزیری دارایی‌و ئابووریی بە زاراوەی ئەمڕۆ)، من پارێزەرو زانام، ئەوە جۆرێکە لە مەدحی خۆکردن.

**ئیشکالی دووەم:** ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەدە ﷺ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٩٨٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٨٩٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٧٠)﴾، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من گەورەی ڕۆڵەکانی ئادەمم لە ڕۆژی دواییدا، لە هەموویان پلەم بەرزترە، وەڵامی ئەم دوو ئیشکالە چییە؟

یەکەمیان: وەڵامەکەی ئەوەیە: (یوسف) عليه السلام مەبەستی خۆ هەڵکێشانو خۆ هەڵدانەوە نەبووە، بەڵکو مەبەستی خۆ ناساندن بووە، چونکە لەوێ کەس نەیناسیوەو (یوسف) عليه السلام بە تۆمەتی داوێن پیسی تۆمەتبار کراوە بە زوڵم، دیارە کە بوختانی پێ کراوەو کەسیش نایناسێ دەبێ خۆی بناسێنێ کەچی لە توانادایە، چونکە پادشای میسر پێی گوت: ﴿... إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾﴾یوسف، واتە: تۆ لەلای ئێمە خاوەن مەکانەتو ڕێزی، وە ئەمینداریشی، ئایا چ ئیشێکت پێ بسپێرین؟ ئەویش فەرمووی: من شارەزاییم لەو بوارەدا هەیە.

دووەمیان: وە بەنسبەت پێغەمبەری خاتەمیشەوە موحەممەد ﷺ، دیارە مەبەستی پێ ئەوە بووە کە حەقیقەتێك بۆ ئێمە دەربخات، کە لە ڕۆژی دواییدا، وە لە دنیاشدا پێغەمبەر ﷺ سەروەری هەموو بەشەرە، وە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە، ئەگەرنا بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿لا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ، فَقُولُوا: عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٤)، والبُخَارِيُّ برقم: (٦٨٣٠)، وَالتِّرمِذِيُّ في (الشمائل المحمدية) برقم: (٣٣١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٣٩) عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه، واتە: تێنەپەڕێنن لە مەدحی مندا، وەك نەصرانییەکان لە مەدحی عیسای کوڕی مەریەمدا تێیان پەڕاند، بەڵکو بڵێن: بەندەی خواو، ڕەوانەکراوی خوایە، تەنیا

ئەوەندە بڵێن، کە موحەممەد ﷺ بەندەی خوایە، ڕەوانەکراوی خوایە، بەڵام تێمەپەڕێنن لە پایەی خوا وەنزیکم بخەن، وەك چۆن نەصرانییەکان (عیسا)یان کردە کوڕی خواو، بردیانە ڕیزی خوای پەروەردگار، ئەوە تێپەڕاندنە، کەواتە: بۆخۆی فەرموویەتی تێمەپەڕێنن، بەڵام ئەوەی دیکە کە فەرموویەتی، ئەوە مەبەستی ئەوە بووە کە حەقیقەتێك پێشانی ئێمە بدات کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەی هەموو بەشەریەتە، بۆئەوەی ئێمەش لەقەدەر ئەو گەورەییەی خۆی کە سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، ڕێزو حورمەتی لێ بنێین، وەك پێغەمبەرێکی خوا، وەك بەندەی خوا، نەك وەك نیمچە خوایەك، وەك هەندێ خەڵکی نەزان بەو شێوە مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەکەن.

**مەسەلەی چواردەیەم:** خوای بێ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە خۆیان تەزکیە دەکەن، واتە: خۆیان بە پاك و چاك پێشان دەدەن.

جا ئایا ئەو خۆ بە پاك و چاك پێشان دانەی خاوەن کتێبەکان بەتایبەتی جوولەکەو نەصرانییەکان لە چیدایە؟ با تەماشا بکەین:

١- لە سورەتی (المائدة) لە ئایەتی (١٨)دا - چونکە قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە - خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین، جا لەوە زیاتر خۆ پێ پاك و چاك بوون، دەبێ چی بێ؟!

٢- وە لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزێر کوڕی خوایە، وە نەصرانییەکان گوتیان: عیسا کوڕی خوایە.

دیارە خوای بێ هاوەڵ هاوسەری نیە تا ڕۆڵەی هەبێ، کوڕو کچی هەبن، بە هەرحاڵ ئەوە درۆو دەلەسەو ئەفسانەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە خۆ پەسەندییەکەیان لێرەدایە،

٣- هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ...﴿١١١﴾ ﴾، واتە: وە (جوولەکەو نەصرانییەکان) گوتیان: هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت، مەگەر جوولەکە بێ یان نەصرانیی بێ، واتە: جوولەکەکان گوتیان: بەس جوولەکە دەچنە بەهەشتێ، نەصرانیەکانیش گوتیان: بەس نەصرانیی دەچنە بەهەشتێ، ئەگەرنا بۆ زانیارییتان هەرکام لە جوولەکەو نەصرانییەکانیش بەرانبەر بە یەکدی بڕوایان وایە: جوولەکە دەڵێن: نەصرانیی ناچنە بەهەشتێ، نەصرانییش دەڵێن: جوولەکە ناچنە بەهەشتێ، واتە: جوولەکە دەڵێن: غەیری جوولەکە ناچنە بەهەشتێ، نە نەصرانیی نە مسوڵمان، نە کەس، هەروەها نەصرانییش دەڵێن: غەیری نەصرانیی ناچنە بەهەشتێ، نە جوولەکەو نە مسوڵمانو نە کەس، بەڵام ئێمە وا ناڵێین، ئێمە دەڵێین: کاتی خۆی ئەوەی بە دوای کتێبی خوا کەوتبێ، بە دوای پێغەمبەری خوا کەوتبێ، لە ڕۆژگاری خۆیدا لەگەڵ خواو پێغەمبەری خواو کتێبی خوادا ڕاستی کردبێ، دەچێتە بەهەشت، ئێستاش تاکە کتێبی خوا ئەم قورئانەیەو کتێبەکانی دیکە هەمووی گۆڕدراونو دەستکاریی کراون، بۆیە لە دوای ئەم قورئانە، کتێبەکانی دیکە بە کتێبی خوا لەقەڵەم

نادرێن كە شایستە بن بەشەر شوێنیان بكەوێ، چونكە خوای پەروەردگار بۆ قۆناغێكی دیكەی ناردوونو بۆ هەلومەرجێكی دیكە، وە پاشان دەستكاریی كراونو گۆڕراونو، تاكە كتێبێك لەم سەر زەوییە هەبێو مرۆڤ دڵنیابێ كە كتێبی خوایەو، دڵنیابێ كە فەرمایشتی خوایەو دەستكاریی نەكراوە، نەك هەر دەستكاریی نەكراوە، بەڵكو وشەیەكو پیتێكیشی لێ نەگۆڕاوە، ئەم قورئانەیە، بەلاّم ئەوی دیكە من كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس)م خوێندۆتەوە كە پێشتر باسمكردو گوتم: لە پەیمانی كۆنو پەیمانی نوێ، پێكدێو (٢٨٠٢) لاپەڕەیە، بڕوا بكەن كە دەیانخوێنیەوە وەك حیكایەتی بەر ئاگردان وان، بەڵێ ئێستاش هەندێ شتیان تێدایە كە دەزانی ئەوە فەرمایشتی خوایەو دەزانی ڕاستە، بەلاّم درۆو دەلەسەی زۆریشیان تێدایە، بەلاّم ئەم قورئانە هیچ شتێكی تێدانییە عەقڵی سەلیم بڵێ: ئەوە نەدەبوو ئاوا بووایە، ئنجا قورئان تەحەددای هەموو بەشەریەتی كردوە كە سوورەتێكی وەك قورئان بێنن، كەس نەیتوانیوە، بەلاّم بە تەئكید هەر كەسێك ڕاست بێتەوە، دەتوانێ وەك پەیمانی كۆنو پەیمانی نوێ بنووسێ، چونكە حیكایەتو بەسەرهاتەو گێڕاویانەتەوە، ئنجا هەر ئەوانیش دەیانگوت بەتایبەت جوولەكەكان لە ئایەتی ژمارە (٨٠)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا ...﴿٨٠﴾ ﴾، واتە: (جوولەكەكان) گوتیان: ئاگرمان تووشنابێ مەگەر چەند ڕۆژێكی كەم، دەیانگوت: بەس بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی كە گۆلكمان پەرستوە، چل ڕۆژ بووە، چەند ڕۆژ بووە، كە بابو باپیرانمان گۆلكیان پەرستوە، هەر ئەوەندە سزا دەدرێین! كە دیارە ئەوە بەشێك لە خۆ تەزكیەكردنو خۆ پەسەندییەكەیان بووە.

**مەسەلەی پازدەیەم:** خوا ﷻ باسی ئەوانە دەكات كە خۆیان تەزكیە دەكەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمًا مُّبِينًا

(٥٠) ﴾، تەماشا بکە! چۆن درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، بۆچی وا دەفەرمویٚ؟ چونکە ئەوان ئەو خۆ پیٚ پاکو چاکبوونەیان پاڵداوەتە لای خواو گوتوویانە: ئێمە کوڕی خواین، ئێمە خۆشەویستی خواین، کەس ناچێتە بەهەشت بێجگە لە ئێمە، وە ئێمە جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم سزا نادرێین، مانای وایە ئەوەیان هەموو بە ناوی خواو بە ناوی دینی خواوە گوتوە، جا خۆ تەزکیەکردن بە قسە، وە بەبیٚ شایستەیی خراپە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ ... فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ (٣٢) ﴾النجم، واتە: خۆتان تەزکیە مەکەن، خوا دەزانیٚ کیٚ پارێزکارترە، خۆ پەسند مەبن، خۆتان پیٚ چاك نەبیٚ بە قسە، ئەدی بە کردەوە؟ خوا دەفەرمویٚ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ (١٤) ﴾الأعلى، وە دەفەرمویٚ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا (٩) ﴾ الشمس، واتە: بەڕاستی سەرفرازە ئەوەی کە خۆی تەزکیە کردوە، خۆشبەختە ئەو کەسەی کە خۆی تەزکیە دەکات، واتە: خۆی پاكو چاك دەکات، کەواتە: خۆ تەزکیەکردن بە کردەوە پەسندە، بەڵام خۆ تەزکیەکردن بە قسە خراپە، خوا دەفەرمویٚ: بە قسە خۆتان پیٚ چاكو پاك نەبیٚ، بەڵام هەوڵبدەن بە کردەوە خۆتان پاكو چاك بکەن، ئیسلام ئاوا دەڵیٚ، نەك بە قسە خۆ هەڵکێشیو لافو گەزاف لێبدەی بەسەر خەڵکەوە.

**مەسەلەی شازدەیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرمویٚ: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴾، تەماشا بکە! چۆن درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، وە درۆکردن بە ناوی خواشەوە بەسە کە گوناهێکی ئاشکرابیٚ، یانی: کابرا ئەگەر هەر درۆش دەکات، با بە ناوی خۆیەوە درۆ بکات، بەڵام بە ناوی خواوە درۆ بکات زۆر خراپە، هەر لەخۆوە بڵێی خوا وایفەرمووە، پێغەمبەر وایفەرمووە، دین ئاوایە، ئەوە زۆر زۆر خەتەرێکی گەورەیە، چونکە لە ئەنجامی ئەوەدا خەڵك سەری لیٚ شێواوە، ئێستا ئەو

جوولەکەو نەصرانییانە، ئەو مەجووسییو یەزیدییو صابیئەو هەموو ئەوانەی کە سەریان لێ شێواوە، هەروەها هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لە ئەنجامی چیدا؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە ناوی خواوە قسەیان بۆ کراوە، بە ناوی دینی خواوە قسەیان بۆ کراوە، ئێستا کەسێك کە بت دەپەرستێ، عیسا ﷺ دەپەرستێ، شتێکی دیکە دەپەرستێ، ئەوە بێگومان وەك دین دەیکاتو بە حیساب ئومێدی قیامەتی پێیەتی! بۆیە بەڕاستی بە ناوی خواوە درۆکردن زۆر گوناهێکی گەورەیە، مرۆڤ ئەگەر بەناوی خواوە درۆی بۆ نەکرێ، دەچێ ساغی دەکاتەوە، بەڵام کە بە ناوی خواوە بۆی کرا، دەڵێ: ڕەنگە ئەوە دین بێو وەك دین مامەڵە لەگەڵ ئەو درۆو ئەو ئەفسانەیەدا دەکات، بەڵام ئایا ئەوە بۆ هەموو کەس وایە؟ نەخێر، بەڵکو بۆ کەسانێکە کە بە شێوەیەکی لاف لێدەرانە لاف لێدەدەن، کە دەیانگوت چی؟ ﴿... نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾﴾ المائدة، واتە: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین، کە لێرەدا هەندێك لە مسوڵمانانیش وەبەر ئەوە دەکەون مسوڵمان هەیە خۆی بە سەیداتییەوە هەڵدەکێشێ، هەیە خۆی بە شێخایەتییەوە هەڵدەکێشێ، هەیە خۆی بە مەلازادەییەوە هەڵدەکێشێ، ئێمە بنەماڵەین، ئێمە هەر بەرماڵمان لەسەر ئاوێ دەڕوا، بەهەشت هەر بۆ ئێمە تەرخانکراوە، خۆ هەڵکێشان بە هەموو ئەو شتانەوە کە مرۆڤ هیچ دەستی خۆتی تێدانیە، هەمووی دەچێتەوە سەر ئەو ڕیشەیەی کە جوولەکەو نەصرانییەکان خۆیان پێ هەڵکێشاوە، ئەویش دەچێتەوە سەر چی؟ دەچێتەوە سەر ئەوەی کە کاتی خۆی ئیبلیس گوتوویەتی، وەك خوای پەروەردگار لەسەر زاری دەفەرموێ: ﴿... قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف، واتە: من لە ئادەم چاکترم، منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردوە، ئنجا باشە ئەی ئیبلیس! تۆ بۆخۆت خۆت دروست کردوە یان خوا؟ دیارە خوا، مانای وایە ئازایەتیی خۆتی تێدانیە، کەواتە: بۆچی

خۆت بە شتێکەوە هەڵدەکێشی ئازایەتیی خۆتی تێدانیە؟ ئەگەر گریمان وابێ ئاگر لە قوڕ چاکتر بێ، کە ئاگر شت دەسووتێنێ، بەڵام قوڕ شت سەوز دەکات، قوڕ بەرهەمی هەیە، گوڵ بەرهەمی هەیە، بەڵام ئاگر دەفەوتێنێو فەوتێنەرە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەگەر گریمان ئاگریش باشتر بێ لە قوڕ، مادام نە ئەو دەستی خۆی تێدایە، وە نە ئادەم دەستی خۆی تێدایە، بۆیە نەدەبوو شەیتان خۆی بە شتێکەوە هەڵکێشێو نوقصانیی پاڵداتە لای ئادەم، بە هۆی شتێکەوە کە دەستی خۆی تێدانیە، هەروەها هەموو ئەوانەی خۆیان بە نەسەبو ڕەچەڵەكو بنەماڵەو چیو چییەوە هەڵدەکێشن، لەڕاستییدا هەموویان قسەی بۆش دەکەن، وە هەمووشیان خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن، وە لە قیامەت بۆیان دەردەکەوێ کە هیچ نیەو لەڕاستییدا هەروەك قسەی ئەهلی کیتاب وایە، (کە ئێمە کوڕی خواین، ئێمە خزمی خواین) نەخێر بە خوا خوا خزمایەتیی لەگەڵ کەس نیە، بەڵکو سەنگی مەحەك لەلای خوا ئەم ئایەتەیە: ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات، واتە: بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکارترینتانە، وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ﴾، رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٢٦٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَالدَّارَمِي برقم: (٣٤٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: هەر کەسێك کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات، خوا لە هەموو قورئاندا باسی یەك کافری کردوە، کە ناوی هێنابێ، ئەویش (أبو لهب)ە کە مامی پێغەمبەرە ﷺ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾﴾ المسد، بۆئەوەی هەموو کەس عیبرەتی لێ وەربگرێ، هەروەها ناوی بابی یەك پێغەمبەری هێناوە کە کافر بووە، ئەویش (آزر)ە بابی ئیبراهیم عليه السلام وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ آزَرَ ...﴿٧٤﴾﴾ الأنعام، ئازەر بابی ئیبراهیم بوو، کافر بوو، خوای پەروەردگار گلەیی لە ئیبراهیم کرد کە

داوای لـێبوردنی بـۆ لـە خـوا کـرد، هەروەهـا کوڕەکـەی نـووح ﷺ، وە خێزانـی لـووط ﷺو خێزانـی نـووح ﷺ کـە هەردووکـیان کـافر بـوون، خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ ...فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ... ﴿١٠﴾ ﴾التحـریم، واتـە: لەلایـەن خـواوە هـیچ سـوودیان پـێ نەگەیانـدن، کەواتـە: پێغـەمبەران سـوودیان بـۆ بابیـان نـەبووە، بـۆ کوڕیـان نـەبووە، کـە کـافر بوونـە، بـۆ مامیـان نەبووە، بۆ خێزانیان نەبووە، ئێستا تۆ دوای چل پـشت بەتـەمای چـی؟ ئـەویش ئەگـەر گریمـان واشـبێ نەسـەبەکەت بـچێتـەوە سـەر پێغـەمبەر ﷺ، مـادام کـردەوەی باشت نەبێ، هیچ سوودی نیە، کەواتە: ئـەو خـۆ هەڵکێشـانە بـەو نەسـەب و ڕەچەڵەکـەوە، لەڕاسـتیدا شـتێکە هیچ پەیوەنـدیی بـە دینـەوە نیـە، هەرچـەندە زۆر کەسـیش ڕەنگـە بـەوە هەڵخـەڵەتابێ‌و خـۆی لـە زۆر گوناهـان نەپاراستبێ، چونکە دەڵێن: ئێمە هـەر لـەخۆڕا دەچینە بەهەشـتێ کـردەوەی باشیـشمان هەیـە گونـاهیش بکـەین ئێمـە هـەر خـوای بـەرز دەمانبەخـشێ لەبـەر خـاتری پێغەمبـەر ﷺ، نـەخێر، خـوا لەبـەر خـاتری پێغەمبـەر لـەو کەسـانە خـۆش دەبـێ کـە بەڕاسـتیی بـەدوای پێغەمبـەر کـەوتوون، نـزیکی لـە پێغـەمبەرەوە ﷺ بـە ئیمانێکـی وەك ئیمـانی پێغـەمبەر ﷺو بـە کـردەوەو عیبـادەت‌و طـاعەتی وەك هـی پێغـەمبەر ﷺ دەبێ.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَؤُلَاءِ أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا ﴾، ئایـا سـەرنجی ئەوانـە نـادەی بەشـێك لـە کتێبیـان پێدراوە ! ئیمان بە (جِبْت)و بە طاغـووت دێنـن، (جِبْت) چییـە؟ واتـە: بـت، وە بـە مانـای جادووگـەر دێ، وە بـە مانـای فاڵـچیی‌و کـاهینیش دێ، ئـەدی طاغـووت چییـە؟ طاغووت هەموو ئـەو سـەرکردانەن کـە بـەڕێی ناشـەرعییدا پـێش خـەڵك دەکـەون، حەڵاڵـیان بـۆ حـەڕام دەکـەن‌و حەڕامیـان بـۆ حـەڵاڵ دەکـەن، دینیـان بـۆ دادەنـێن‌و بەرنامـەیان بـۆ دادەنـێن، ئەوانـە طـاغـووتن،

هەندێکــیش دەڵــێن: هــەموو پەرستــراوێك غەیــری خــوا طــاغووتــە، لــە داهاتووشدا زیاتر وشەی طاغووت شــی دەکەینەوە، بەڵام لێرەدا دەڵــێم: لە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەشدا باسـمان کـرد کـە جوولەکـەو نەصـرانییەکان بـە موشریکەکانی مەککەیان گوت: ئێوە ڕێگەی ڕاستترتان گرتوە لە مسـوڵمانان، کاتێــك ئـەبو ســوفیان پرســیاری لێکــردن، گـوتی: ئێمە زیاتر لەسەر ڕێی ڕاستین یان موحەممەدو هاوەڵانی؟ گوتیان: ئێوە لەسەر ڕێی ڕاستن، کە دەشیانزانی ئەو کتێبەی بۆ مەحەممەد ﷺ هاتوە، هەر لەو سەرچاوەوە هـاتوە کـە تـەوراتو ئینجـیلەکەی ئـەوانی لێوە هـاتوە، بـەڵام دەمارگیـریی (تَعَصُّب) لێیان نەگەڕا کە دان بەو فەزڵو چاکەیەدا بنێن، وە ئیمـان بـە موحەممـــەد ﷺ بێـــنن، هەڵــسان گوتیـــان چــی؟ گوتیـــان: کافرەکــان لــە مــسـوڵمانان باشتــرن، جـا ئەمـە هـەندێك لـە مــسـوڵمانانیش ئــەو ڕەگـــە شــینکەیان بـۆ چـووە، هەیـە مەشـرەب سـەلەفیی یـەو خـۆی نەبـێ خەڵـکی دیکـەی ڕەنگە هەر پـێ مـسوڵمان نەبـێ، مەشرەب صۆفـی خۆی نەبـێ ئـەوی دیکـەی پـێ مـسـوڵمانی چـاك نیـە، لایـەنێکی ئیسلامییە خۆی نەبـێ ئـەوی دیکـەی پـێ مـسـوڵمانێکی بـاش نیـە، یان پێیان وایە بەهەشـت تەنیـا بـۆ ئـەوان تەرخانکراوە، ئـەو بیـرۆکانە هـەموویان لەڕاسـتییدا دەچنـەوە سـەر ئـەو ڕەگـە شـینکانە، وە خـوای پـەروەردگار کـە باسـی کەموکورپییەکـانی جوولەکـەو نەصـرانییەکان بـۆ ئێمـە دەکـات، بۆئەوەیـە عیبـرەتی لـێ وەربگریـن، خـۆ جوولـەکە لەبەرئـەوە خـراپ نـەبوون کـە جوولەکـە بـوون، جوولەکـە وەختـی خـۆی باشـترین میللـەت بـوون، کـە لەگـەڵ کتێبـی خـواو پێغەمبـەری خـوادا ڕاسـتیان کـردوە، نەصـرانیی باشـترین خەڵـکی ڕۆژگـاری خۆیان بوون، بەڵام ئێستا بۆ خراپن؟ لەبەرئـەوەی کردەوەیـان خراپـە کـەواتە: مسـوڵمانیش ئەگـەر کـردەوەی خـراپ بـێ، هـەر لەبەرئـەوەی نـاوی مسـوڵمانە نابـێ بـە مرۆڤـی بـاش، دەبـێ کردەوەکانـت بـاش بـن، ئیمـانت بـاش بـێ، هەڵسـوکەوتت بـاش بـێ، ڕەفتـارت بـاش بـێ، ئەگـەرنا بـەوەی تەنیـا نـاوت مسـوڵمانە نابیـە مرۆڤی باش، نابیـە بەندەیـەکی باش، وە مسوڵمان دەبـێ زۆر

خۆی لە خۆ پەسەندیی‌و خۆ پێ چاك بوون‌و، خەڵك پێ خراپ بوون بپارێزێ، جارێك بە نەفەرێكم گوت: گوتم كاكە جەنابت پیاوی باشی‌و ئێمەش گوناهمان هەیە، بەڵام نە تۆ هێندە باشی بە كەڵكی ئەوە نەیێی قسە لەگەڵ ئێمە نەكەی، نە ئێمەش هێندە خراپین بە كەڵكی ئەوە نەیەن قسەمان لەگەڵدا بكرێ، یانی: لێك دەوەشێینەوە لێك نزیكین، بەڵێ جەنابت چاكەت زۆرەو ئێمەش گوناهمان زۆرە، بەڵام بە هەرحاڵ ئێمە تۆزە خێرێكمان پێوەیەو جەنابیشت ڕەنگە نوقصانییەكت هەر هەبێ، ئینسان نابێ یەكجار پێی وابێ ئاسمان كونی تێبووەو ئەوی پێدا هاتۆتە خوارێ، هەر لەبەرئەوەی ناوی سەلەفییە، یاخود ناوی صۆفی‌و ئەهلی تەریقەتە، یان ناوی كۆمەڵی ئیسلامی یە، یان ناوی یەككرتووە، یان ناوی فلان لایەنی ئیسلامییە، یان لەبەرئەوەی شێخە، یان لەبەرئەوەی مەلایە، نەخێر دەبێ هەمیشە ئینسان خۆی بە كەموكوڕ بزانێ‌و كەموكوڕییەكانی خۆی ببینێ، وە فەزیلەت‌و چاكەی خەڵكیش ببینێ.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا﴾، ئایا جوولەكەكان بەشێك لە حوكمڕانییان هەیە، كەواتە بەقەدەر درزی سەر نێوكە خورما بەشی كەسی لێنادەن، ئەوەی خوا فەرموویەتی ئێستا وەك واقیع دەیبینین، ئەوە جوولەكەكان قەوارەیەكی غاصیبانەو داگیركەرانەیان بۆ بنیاتنراوە، كە لە فەلەستین داگیریان كردوە، چۆن مامەڵە دەكەن لەگەڵ گەلی فەلەستیندا؟ بەشی كەسی لێنادەن ئەو حوكم‌و دەسەڵاتەی هەیانە بەشی كەسی لێ دەدەن؟ نەك بەشیانی لێنادەن‌و نایانكەنە شەریك‌و هاوبەش لە حوكمڕانییدا، بەڵكو مافی هاووڵاتییبوونیشیان پێ ڕەوا نابینن، مافی مرۆڤیشیان پێ ڕەوا نابینن، هەرچەندە زۆریش ئەو لافانە لێدەدەن، بەڵام ئەوەی كە قورئان دەیفەرموێ، لە سەدا سەد دێتە دی لە كات‌و شوێنی خۆیدا.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ ... ﴾، یان ئایا حەسوودیی بە خەڵك دەبەن خەڵك، (واتە: پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی) لەسەر ئەوەی کە خوا لە بەخششی خۆی پێیداون، واتە: نەدەبوو حەسوودیی بە پێغەمبەر ﷺو بە هاوەڵانی بەرێزی بەرن، بەڵکو لە جیاتی ئەوە، ئەو نیعمەتەی کە خوا بەوانی داوە بۆ هەموو بەشەریەتی پێداون، با ئەوانیش شوکری ئەو نیعمەتە بکەن، وە ئیمان بەو قورئانە بێنن، ئیمان بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بێنن، کە ئەو قورئانەو ئەو پێغەمبەری کۆتاییە، دان بە هەموو کتێبەکانی ئەوانیشدا دێنێو، دان بە هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆشیدا دێنێو دەڵێ: ئەوانیش پێغەمبەری خوان، جێی ڕێزو حورمەتن ﴿ ...لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ ...(٢٨٥) ﴾البقرة، وە بەبێ جیاوازیی دان دێنین بە هەموو پێغەمبەران دا، ئنجا ئایا (حَسَد) بریتیە لە چی؟ (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الحَسَدُ: تَمَنّي زَوَالِ نِعْمَةٍ مِنْ مُسْتَحِقٍ لَهَا وَرُبَّمَا كَانَ مَعَ ذَلِكَ سَعِي لإزَالَتِهَا)، (حَسَد) بریتییە لە بە خۆزگە خواستنی لاچوونی نیعمەتێك لە کەسێك کە شایستەی ئەو نیعمەتەیە، وە جاری وایە هەوڵدانیش بۆ لابردنی ئەو نیعمەتەی لەگەڵدا دەبێ، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە حەسوودییو دەفەرموێ: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيّ ﷺ قَالَ: لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ تَقَاطَعُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٣٧٨)، والبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٧٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩١٠) وَصَحَّحَهُ الألباني، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی بە یەکدی مەبەن، وە پشت لە یەکدی مەکەن، وە لێك دامەبڕێن، وە بەندەی خوابنو پێکەوە برابن، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك لە سێ ڕۆژ زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی ببڕێتەوەو قسەی لەگەڵدا نەکات.

سێ ڕۆژەکەش بۆئەوەی دڵیان پێکەوە ساف بکەنەوە، ئنجا دوایی کە قسەیان پێکەوە کرد لە دڵەوەبێ، نەك هەر بە ڕواڵەتو ڕووکەشیی بێ، زانایان دەڵێن: حەسەد یەکەمین گوناهە کە لە ئاسمانێ سەرپێچی خوای پێکراوە، لەسەر زەویش ئیبلیس حەسەدی بە ئادەم برد، وەك خوا لێی دەگێڕێتەوە: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ...﴿٦٢﴾ ﴾الإسراء، واتە: تەماشای ئەوەت کردوە کە بەسەر مندا هەڵتبژاردوە؟! واتە: حەسوودیی بە ئادەم برد، وە قابیلیش حەسوودیی بە هابیلی برای برد، گوتی: بۆ صەدەقەی ئەو قبووڵ کراوەو هی من قبووڵ ناکرێ، کەواتە: حەسەد یەکەم گوناهە لە ئاسمانێ کراوە، وە یەکەم گوناهە کە لەسەر زەویشدا کراوە، زانایان گوتوویانە: (صِحَّةُ الجَسَدِ مِن قِلَّةِ الحَسَدِ)، واتە: لەش ساغیی لە کەم حەسوودییە، بە زۆریی ئینسانی حەسوود ڕەنگ زەردو تڵخە، چونکە هەمیشە لەنێو خۆیدا خۆدەخواتەوەو، نیعمەتێك لە هەر کەسێکدا ببینێ پێی قەڵس دەبێ، جا مانای وایە یان دەبێ خوا نیعمەتان ببڕێ لە خەڵکی، یان دەبێ ئەو هەر خەریکی دەردەداریی‌و دەرداژۆیی خۆی بێ.

<u>**مەسەلەی بیستەم:**</u> کە دەفەرمووێ: ﴿ ... فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾، ئێمە کتێب‌و حیکمەتمان دابوو بە نیزیکانی ئیبڕاهیم، بە شوێنکەوتووانی ئیبڕاهیم، جا ئایا (آل)ی ئیبڕاهیم کێن؟ ئێمە لە نوێژدا دەڵێین: ﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ} . (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٧٩٧)، ئالی ئیبڕاهیم واتە: ئەوانەی کە تایبەت بوون بە ئیبڕاهیمەوە، زۆر نزیك بوون لە ئیبڕاهیمەوە، ئەوانەی کە چاك شوێنی ئیبڕاهیم کەوتوون سەلامی خوای لێ بێ، نەك خزمانی ئیبڕاهیم، ئەگەرنا بابی لە هەموو کەس خزمتری بووە، کەچی خوای زاناو توانا دەفەرمووێ:

داوای لێبوردن بۆ بابەت مەکە، کە ناوی (ئازەر) بوو، ئنجا ئایا ئالی نووح کێن؟ ئەوانەن کە بەڕاستیی بەدوای نووح کەوتوون، چونکە خوای لێبوردە کاتێ نووح فەرمووی: ﴿...إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي ...﴿٤٥﴾﴾هود، واتە: کوڕەکەم ئەهلی منە، نزیکی منە، خوا دەفەرمویْ: ﴿قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٍ...﴿٤٦﴾﴾، یان (إِنَّهُۥ عمِلَ غَيْرَ صَٰلِحٍ)، واتە: ئەوە ئەهلی تۆ نیە، چونکە کردەوەی باشی نیە، یان کردەوەی باشی ئەنجام نەداوە، کەواتە: ئالی هەر کەسێك نزیکان و شوێنکەوتووانیی، ئالی موحەممەد ﷺیش بە هەمان شێوە، بۆیە ئەگەر تێبینیتان کردبێ، من لە سەرەتا یان لە کۆتایی دەرسەکاندا دەڵێم: (وآله أجمعين)، باسی (صَحبُ)و ئەوانە ناکەم، هەندێ جاریش ئەوانیش باس دەکەم، یان دەڵێم: (وآلِهِ أَجْمَعِين مِن الصَّحب وَالقَرابَة وَالأزواجِ والتَّابعين لَهُم)، چونکە ئالی موحەممەد ﷺ پێش هەموو کەس هاوسەرانی بەڕێزنی، ئنجا هاوەڵە بەڕێزەکانیی، ئنجا خزمەکانی کە بەڕاستیی شوێنی کەوتوون، ئنجا شوێنکەوتووانیی تا قیامەت، ئەوانە هەمووی ئالی موحەممەدن ﷺ، هەرکەس بەڕاستی بەدوای پێغەمبەر ﷺ بکەویْو بەڕاستی خۆشی بویْو لە خزمەتی دابێ، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (آلِ الرَجُل أَهْلُهُ وَعِيالَهُ وَأتبَاعَهُ وَ أنَصارُهُ)، واتە: ئالی هەر کەسێك خێزانیی و ئەندامەکانی خێزانەکەیی، لەبەرئەوەی لێی نزیکن، هەروەها شوێنکەوتووانیی و پشتیوانەکانیی.

ئنجا خوا دەفەرمویْ: ﴿... أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾غافر، واتە: ئالی فیرعەون بخەنە توندترین سزاوە، ئایا خێزانی فیرعەون ئالی فیرعەونە؟ نەخێر، خێزانی فیرعەون بە دەقی ئایەت مسوڵمان بووە، ﴿... وَٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾﴾التحريم، واتە: خێزانی

فیرعەون کە گوتی: خوایە لەلای خۆت، لە نزیك خۆت کۆشکێکم بۆ بنیات بنێ لە بەهەشتێ، گوتراوە: (الجار ثُمَّ الدار) پێشێ گوتی: لەلای خۆت، ئنجا گوتی: کۆشك، ئنجا بەهەشت، شایانی باسیشە کە هاوسەری فیرعەون ئیماندارێکی زۆر گەورە بووە، لە حەدیسی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ کە گەورەی ئافرەتانی دنیا چوارن: یەکێکیان خێزانی فیرعەونە، کە ناوی ئاسیای کچی موزاحیم بووە، بەپێی هەندێ لە قسەی زانایان، وە مەریەم، وە خەدیجە، وە فاطیمە خوا لێیان ڕازی بێ، کەواتە: ئالی فیرعەون کە دەفەرموێ: ﴿...أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾غافر، یانی دەستو پێوەندو نزیکانی کێن کە لە خزمەت فیرعەوندا بوون، لەگەڵ فیرعەون بیانبەنە جەهەننەمێ، کێش لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دایە، لەگەڵ پێغەمبەر دەچێتە بەهەشتێ، ئیدی با خزمایەتییشی نەبێ، بەڵام کێ لە خزمەتیدا نەبێ، با خزمایەتیی و نزیکی خوێن و گۆشتو نەسەبیشی هەبێ، مادام لە خزمەت پێغەمبەردا نەبێ ﷺ لەگەڵ ڕێبازەکەی نەبێ، ئەوە خزمایەتییەکە هیچ دادێکی نادا، ئنجا شاعیرێکیش لەوبارەوە زۆر جوانی گوتوەو دەڵێ:

آلُ النَّبِيِّ هُمُ أَتْبَاعُ مِلَّتِهِ
مِنَ الأَعَاجِمِ وَالسُّودَانِ وَالْعَرَبِ
لَوْ لَمْ يَكُنْ آلُهُ إلاَّ قَرَابَتُهُ
لصَلَّى الْمُصَلِّي عَلَى الطَّاغِي أَبِي لَهَبِ

واتە: ئالی پێغەمبەر، نزیکانیو شوێنکەوتووانی ڕێبازەکەینتی، لە عەجەمو ڕەش پێستەکانو لە عەرەب ئەگەر ئالی ئەو تەنیا خزمە نزیکەکانی بان، ئەوە کاتێ کەسێك صەڵاواتی دەدا لە پێغەمبەر ﷺ ئەبو لەهەبیش وەبەردەکەوت کاتێك دەگوترێ: (اللَّهُمَّ صَلّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آلِ مُحَمَّد) ئەگەر هەموو

خزمەکانی موحەممەد ئالی موحەممەد بن، ئەبو لەهەبیش وەبەردەکەوێ، کە ئەوەش شتێکی بێجێیە، کەواتە: ئالی موحەممەد ﷺ واتە: ئەوانەی کە بەڕاستیی شوێنی کەوتوونو لێی نزیکنو لە خزمەتیدان، لە جەعفەری صادیقیان پرسی خەڵك دەڵێن: مسوڵمانان هەموویان ئالی موحەممەدن ﷺ، ئالی پێغەمبەرن، گوتی: درۆیان کردوەو، ڕاستیشیان کردوە، گوتیان: یانی چی؟ گوتی: درۆیان کردوە ئەگەر بڵێن هەموو ئۆممەت ئالی پێغەمبەرن ﷺ، لەبەرئەوەی هەموویان بە چاکیی شوێنی ناکەون، وە ڕاستیشیان کردوە، ئەگەر بەدوای شەریعەتەکەی بکەون، ڕاستە هەرچی بە دوای شەریعەتی موحەممەد ﷺ بکەوێ، ئالی موحەممەدە[1].

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە ئایەتەکانی خوا، هەر کە پێستیان داماڵڕاو برژا، پێستی دیکەیان بە بەردا دەکەین، تاکو سزاو ئازار بچێژن.

ئەمە ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە دەمارەکانی هەستکردن بە سەرماو گەرما هەموویان لە پێستدانو پێست کە سووتا، سووتانێك کە گەیشتە قووڵایی گۆشت، ئینسان هەست بە ئازارەکەی ناکات، کەی زیاتری هەست پێ دەکات؟ کاتێك کە لە پێستەکە دایە، جا خوا دەفەرموێ: بێبڕوایان ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە نیە، کە پێستیان داماڵڕاو سووتا، پێستی دیکەیان بە بەردا دەکەین بۆئەوەی ئازار بچێژن، ئەوە حەقیقەتێکی پزیشکییو زانستییە، کە بەم دوایانە زانراوە، دەرکەوتوە، واتە: ئەگەر پێستی تازەیان بە بەردا بکەین دیسان ئازاریان بۆ تازە دەبێتەوە، ئەگەرنا برینی سووتان کە قووڵبووەوە ئازاری هێندە

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص: (٩٨).

نیــە، دوایـی کـە دەفـەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، بەڕاســتیی خـوا بـاڵادەسـتەو زاڵــە، وە کاربەجێشــە، واتـە: هـەر کەسێك بیـەوێ بـە هـەر جۆرێك سـزای دەدا، وە کاربەجێشـەو سزای پـڕ بـە پێسـتە، ئـەوە بـۆ کەسانێك بڕوایـان بە ئایەتەکـانی خوا نەکـردوەو دژایەتیـی خوایـان کردوە.

**مەسـەلەی بیـستو دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴾، وە ئەوانــەی کــە ئیمانــدارنو کــردەوەی باشــیان ئەنجامــداون، دەیانخەینـە چـەند باغێکـەوە کـە ڕووباریـان بەژێـردا دەڕۆن بـۆ ئــەوان هەیـە لـە بەهەشـتەکاندا هاوسـەرانێکی پاکـکراوە، شـایانی باسیـشە وەسـفکردنی هاوسـەرانی پیـاوانی بەهەشـتیی بـە (مُّطَهَّرَةٞ) ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئـەو هاوسـەرانەی پیـاوانی ئیمانـدار هـەر ئـەو ژنانـەی دنیـان، بۆچـی؟ چونکـە ئەوانـەی کە خوا لەوێ دەیانخوڵقێنێ، وەك حۆریـی، پێویسـت ناکـات بفـەرموێ: (مُّطَهَّرَةٞ) پـاك کراونەتـەوە، ئەوانـە هـەر پاکــن بـەو شـێوەو پێکـهاتەیەی کـە لـەوێ دروسـت دەکرێن بـە پاکـیی، بـەڵام ئـەوە ئافرەتـانی دنیـان، کە دەبـێ بـە شێوەیەکی دیکە خـوای پـەروەردگار پێکهاتـەی نەفسـییو جەستەییان دروست بکات، کـە وەك هـی دنیـا نـەبن، ئافرەتـانی دنیـا چۆنن؟ لـە ڕووی جەستەییەوە ئەوە دیارە ئـافرەت هەروەهـا پیـاویش تفی هەیـە، چڵـمی هەیە، پاشـەڕۆکی هەیــە، خوێنــی حەیــزی هەیـە، لـە ڕووی جەسـتەییەوە، وە پاشــان لـە ڕووی مەعنەوییـەوە ئـافرەت جـاری وایـە نەگونجـاوە، قسـە دەڵــێ، پرتــەو بۆڵــە دەکـات، ڕوو گــرژ دەکـات، بــەڵام هاوســەرانێك کـە خــوا بــۆ ئیمــاندارانیان دادەنـێ، ئـەو عەیـبو کەموکوڕییــە ڕواڵــەتییو جەسـتەییو مەعنـەوییو دەروونییانـەیان نـین، کەواتـە: (مُّطَهَّرَةٞ) واتـە: پـاك کراونەتـەوە، ئنجـا ئەمە ئامـاژە بـەوە دەکـات بـەوە کــە لـە قیامەتـێ، لـە بەهەشـتێ، ئێمـە

وەك ئێستا نابین، جەستەمانو خواردنو خواردنەوەو خۆشیی‌و لەزەتەکانمان وەك هی ئێستامان نابن، بۆچی؟ چونکە:

**یەکەم**: ئەگەر ژیانمان هەروەك ئێستابێ، مانای وایە دەبێ ئەو دەرهاویشتان (مضاعفات)ەی کە دێنە سەر ئەو خوارنو خواردنەوەی کە ئێستا دەیخۆین، دەبێ لە بەهەشتیش بێنە سەری، کە بریتین لە پاشەڕۆكو نەخۆشیی، لە ئەنجامی زۆر خواردنو زۆر خواردنەوەو نارەحەت بوونو ئەوانە، بەلاّم نەخێر ژیان لە بەهەشتێ نیعمەتی بێخلّتەیە.

**دووەم**: پاشان خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الواقعة) لە ئایەتی (١٠٤)دا ئاماژەیەکی گرنگ دەکات کە بەپێی زانیاری من لە قورئاندا تەنیا لەو شوێنەدا ئاوا هاتوە، ئەویش ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿...وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ الواقعة، واتە: وە ئێمە بێ دەسەلاّتو دەستەپاچەنین، لەوەدا کە ئێوە لابەرین، ئێوە بگۆڕینو بە شێوەیەك دروستتان بکەینەوە، کە ئێوە نایزانن، کەواتە: با هەموو کەس بزانێ کە ئێمە لە بەهەشتدا، هەروەها بێبڕوایانیش لە دۆزەخ دا، ئەهلی بەهەشتو ئەهلی دۆزەخیش، وەك ئێستا نابین.

هەڵبەتە هەر ئافرەتانیش پاککراوە نابن، بەڵکو پیاوەکانیش هەروادەبن، ئنجا ئایا لەچی پاککراوەن؟! پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا باسی کردوەو فەرموویەتی: ﴿عَن جَابِرِ بن عبداللّهِ رضي الله عنه سَمِعْتُ النَّبيّ ﷺ يَقولُ: إنَّ أهْلَ الجَنَّةِ يَأكُلُونَ فِيهَا وَيَشرَبُونَ، وَلاَيَتْفِلُونَ ولاَيبُولُونَ ولاَيَتَغَوَّطُونَ ولاَ يَمْتَخِطُونَ، قَالُوا: فَمَا بَالُ الطَّعَام والشَّرَاب؟! قَالَ: جُشَاءٌ وَرَشحٌ كَرَشحِ المِسكِ، يُلْهَمونَ التَسْبيح والتَحميد،كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ﴾، رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨١١)، وَمُسْلِم

برقم: (٧٠٨١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٤١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٤٣٥)، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: ئەهلی بەهەشت دەخۆنو دەخۆنەوە، بەلام نەتفیان هەیە، نە میزیان هەیە، نە پیسایيان هەیە، نە بەڵغەمو چڵمیان هەیە، گوتیان: ئەدی ئەو خواردنو خواردنەوەی دەیخۆن، چی لێدێ؟ فەرمووی: دەبێتە قرپو ئارەقە وەك بۆنی میسك وایە (کە قرپیان دێتەوە، وە ئەو ئارەقەی کە لە بەدەنیان دەردەچێ، بۆنەکەی وەك هی میسکە، کە خۆشترین بۆنە) وە خوا بەپاك دەگرنو ستایشی دەکەن، وەك چۆن ئێوە هەناسە دەدەن، بەبێ ماندووبوون.

دیارە ئەو حاڵەتانەی بۆ ئەهلی دنیا هەن لە ژیانی دنیادا، وەك هەبوونی پاشەڕۆكو ئەو کەموکوڕییانەی دیکە، زادەی ئەو جەستە مادديیەن کە بۆ دنیا دروست کراوە، بەلام لە بەهەشتدا ئەهلی بەهەشت بە پیاوو ئافرەتەوە، ڕووحێکی زۆر پاکیان دەبێو، جەستەیەکی زۆر پتەوو چاکیشیان دەبێت، کە ئەو کەموکوڕییانەی کە لە ڕووحو جەستەی دنیادا پەیدادەبن، لەوێ پەیدانابن، مانای وایە ئەو پێکهاتە جەستەیی یەی ئەهلی ئیمان لە بەهەشتدا، وە ئەهلی کوفر لە دۆزەخدا، جیایە لەو پێکهاتەیان کە ئێستا هەیەو، ئەو ئایەتەش دەفەرموێ: ﴿... وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ الواقعة، بە شێوەیەك دروستتان دەکەینەوە کە بۆخۆتان نازانن چۆنە؟ لەوێ کافر جەستەی زۆر گەورە دەبێ، بۆئەوەی زۆر ئازار بچێژێ، ئیمانداریش ئەو جەستەیەی ئێستای نابێ، جەستەیەکی دیکەی دەبێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی بەژنوبالای ئەهلی بەهەشتەوە فەرموویەتی: ﴿أَخْلَاقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧١٦٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٢٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٠٧٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٣٣٣)، واتە: پیاوانی بەهەشت ڕەوشتیان

وەك ڕەوشتی پیاوێکە، وە باڵایان وەك باڵای ئادەمی بابیانە: شەست باسك (گەز).

هەروەها جەستەیان لە ماددەیەکی دیکە تەرکیب دەبێتەوە کە هەر خوا بۆخۆی دەزانێ چ جۆرە ماددەیەکە، کە تەحەمولی ژیانێکی هەتا هەتایی دەکات، چونکە ئەگەر لەم ماددەیەی ئێستا بێ دوای (٥٠، ٦٠، ٧٠) ساڵ، ئەوپەڕی (١٠٠) ساڵ جەستەی مرۆڤ هەڵدەوەشێ، کەواتە: لەوێ دیارە ماددەکە جیایە، وە پێکهاتەکەش جیایە، وە شێوەی پێکهاتەکەشی جیایەو، بەو شێوەیەیە کە لەگەڵ ئەو ژیانەی ئەوێدا بگونجێ، خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە بەهەشتە ڕازاوە نەبڕاوەکانی خۆیانیان شاد دەکات، وە لەو نیعمەتانە بەشیان دەدا، وە خوا عاقیبەتو سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناســـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان سـێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکـانی (٥٨ تـا ٧٠)ن، لـەم سـێزدە ئایەتـەدا خـوا ﷻ سـەرەتا باسـی بابـەتێکی یەکجـار گـرنگ دەکات، کـە بریتیـە لـە دانـانی بـەرپرس‌و حوکمڕانـان، وە حـوکمڕانیی کـردن بـە دادگـەریی‌و فەرمانبەریی ئیمانداران بۆ بەرپرسانی خۆیـان، پـاش فەرمانبـەریی یان بۆ خـوا بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، واتـە: پـاش پابەنـدییان بـە قورئـان‌و سـوننەتەوە، وە پاشـان چارەسـەرکردنی کێـشەو مـشتومڕەکانیان بـە دادوەریـی بردنـە لای قـورئان‌و سـوننەت، نـەك بـۆ لای طـاغووت، وە پاشـان باسـی ئـەو دەغـەڵ‌و دڵ نەخۆشـانە دەکـات کـە لافـی مـسـوڵمانەتیی لێـدەدەن، بـەڵام دادوەریـی خۆیـان واتـە: چارەسـەری کێـشـەو مـشتومڕەکانیان، دەبەنـە لای طـاغووت، کـە دوایـی ڕوونـی دەکەینـەوە طـاغـووت یـانی چـی؟ وە پاشـان خـوا ﷻ بـە ڕاشـکاویی‌و بـە جەختکـردنەوە سوێند دەخوا بە پەروەردگارێتی خۆی‌و ڕایدەگەیەنێ کە بەبێ گێڕانەوەی کێشەو مشتومڕەکانیان بۆ لای شـەریعەت، نـابن بـە ئیمانـدار، ئنجا لـە کۆتاییدا باسی ئەوانە دەکات کە فەرمانبـەریی خـواو پێغەمبـەری خـوا دەکەن ﷺ، کـە ئەوانـە لـە خزمـەت پێغەمبـەران‌و صـیددیقان‌و شـەهیدان‌و صـاڵحاندان لـە بەهەشـتدا، کە ئەوانیش باشـترین هاوەڵن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن
تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ
وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى
ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ
إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا
﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ
عَنكَ صُدُودٗا ﴿٦١﴾ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ
جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ
ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا
﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ
أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا
رَّحِيمٗا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ
لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ أَنَّا كَتَبۡنَا
عَلَيۡهِمۡ أَنِ ٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ أَوِ ٱخۡرُجُواْ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٞ مِّنۡهُمۡۖ وَلَوۡ
أَنَّهُمۡ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴿٦٦﴾ وَإِذٗا لَّأٓتَيۡنَٰهُم مِّن
لَّدُنَّآ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيۡنَٰهُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ
فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ
وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ﴿٧٠﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((بێگومـان خـوا فەرمانتـان پێدەكـات (ئـەی كۆمەڵگـای مـسوڵمان!) كـە سپاردەكـان بەگـشتی (و بەتایبـەت سـپاردەی حـوكمڕانیی) بدەنـە خـاوەنی (شایـستەی) خۆیـان، وە هـەركات (ئـەی حوكمڕانینـە!) لەنێـو خەڵكیـدا دادوەرییتـان كـرد، بـە دادگـەریی دادوەریـی بكـەن، مـسۆگەر ئـەوەی خـوا ئامۆژگـارییتانی پێدەكـات، چاكتـرین شـتە، بەڕاستیی خوا بیـسەری بینـەرە ﴿٥٨﴾ ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! فەرمانبـەریی خـوا بكـەن، وە فەرمانبـەریی پێغـەمبەر بكـەن، وە هـی كـاربەدەستانێك كـە لـە خۆتـانن، جـا هـەر كـات لـە شـتێكدا كەوتنـە كێـشەوە، بیگـێڕنەوە بـۆ لای خـواو پێغـەمبەر (قورئـانو سـوننەت) ئەگـەر بڕواتـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەیـە، ئـەوە چاكتـرەو سەرەنجامیـشی باشتـرە ﴿٥٩﴾ ئایا سـەرنج نادەیـە ئەوانـەی پێیـان وایـە بڕوایـان هێنـاوە بـەوە كـە بـۆ لای تـۆ دابەزێنـراوە، وە بـەوەش كـە پێـش تـۆ دابـەزێنـرا، كەچـی دەیانـەوێ بـۆ دادوەریـی بڕۆنـە لای طـاغـووت ! وە بێگومـان فەرمانیـشیان پێكـراوە كـە بـڕوای پـێ نـەهێنن، وە شـەیتان دەیـەوێ كـە بـە گومڕاییـەكی دوور گومڕایان بكـات ﴿٦٠﴾ وە ئەگەر پێیـان بگـوترێ: وەرن بـۆ پـابەندیی بـەوەوە كـە خوا ناردوویەتـە خـوار، وە بـۆ لای پێغـەمبەر ﷺ، مونافیقەكـان دەبینـی بـە لادان خـۆت لـێ لادەدەن ﴿٦١﴾ جـا ئایـا حاڵیـان چـۆن دەبـێ كـاتێـك بـە هـۆی كردەی دەستیانەوە، بەڵایەكیان تووش بوو، ئنجا هاتنـە لاتو سـوێندیان خـوارد بـە خـوا، كـە بـەس چاكەكـارییو پێكـهێنانمان مەبەسـت بـووە ! ﴿٦٢﴾ ئەوانـە كەسـانێكن كـە بـەس خـوا دەزانـێ چـی لـە دڵیـان دایـە، دەجـا وازیـان لێبێنـەو ئامۆژگـاریی یـان بكـەو، قـسەیەكی وایـان پـێ بڵـێ، كاریگـەریی لەسـەر دەروونیـان هەبـێ ﴿٦٣﴾ وە هـیچ ڕەوانەكراوێكیـشمان نەنـاردوە، مەگـەر بـۆ ئـەوە كـە بـە

فەرمانی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ، وە ئەگەر ئەوانە کاتێك ستەمیان لە خۆیان دەکرد، هاتبانە لات، ئنجا داوای لێبوردنیان لە خوا کردبایەو، پێغەمبەریش ﷺ داوای لێبوردنی بۆ کردبان، دەیانبینی کە خوا زۆر تۆبە وەرگرەو بە بەزەیی یە ﴿٦٤﴾ نەخێر (ڕاست ناکەن کە بڕوادارن) سوێند بە پەروەردگارت! ئیمان ناهێنن هەتا لەوەدا کە لەنێو خۆیاندا، تێیدا دەکەونە مشتومڕەوە، نەتکەنە دادوەر، ئنجا دەبێ هەست بە هیچ سەغڵەتییەك نەکەن لە دەروونیاندا، بە هۆی بڕیارەکەتەوە (ئەگەر بە زیانیشیان بێ)، وە بە تەواویی ملکەچ بن بە ملکەچکردن ﴿٦٥﴾ وە ئەگەر لەسەرمان نووسیبان کە دەبێ خۆتان بکوژن، یان لە ماڵو حاڵتان بچنە دەرێ، کەمێکیان نەبێ نەیاندەکرد (کە ئەوانیش بڕوادارە ڕاستەقینەکانن) ﴿٦٦﴾ وە ئەگەر ئەوەی پێی ئامۆژگاریی دەکرێن بیکەن، بێگومان بۆیان باشترە، وە بەهێزتریش دەیانچەسپێنێ (لەسەر ئیمان) وە ئەو کاتەش پاداشتێکی مەزنمان لەلایەن خۆمانەوە پێدەدان ﴿٦٧﴾ وە بێگومان (زیاتر) بەرەو ڕاستە ڕێ ڕێنماییمان دەکردن، ﴿٦٨﴾ هەرکەسێکیش فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوە ئەوانە لەگەڵ کەسانێك دان، کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون لە پێغەمبەران صیددیقانو شەهیدانو صاڵحان، ئەوانەش باشترین هاوەڵن ﴿٦٩﴾ ئەو بەخششەش لە خواوەیەو، خواش بەسە بۆ زانایی بە هەر شتێك ﴿٧٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(ٱلۡأَمَٰنَٰتِ): کۆی (أَمَانَة)یە، بە کوردی پێی دەڵێن: سپاردە، واتە: کەسێك شتێك لای کەسێك دادەنێو بە ئەمینداریی دادەنێ، ئنجا (الأَمْنُ وَالأَمَانُ وَالأَمَانَةُ: فِي الأَصْلِ مَصَادِر والأَمَانُ: الأَمْن وَمَا يُؤْمنُ الإِنْسان عَلَيْهِ وَالأَمَانَاتُ: مَا أُأتِمنَ عَلَيْهِ الإِنْسان) وشەی (أَمْن، أَمَان، أَمَانَة) لە ئەسڵی زماندا چاوگن، وە (أَمَان) واتە: (أَمْن)، وە (أَمَان) یان (أَمَانَة) ئەو شتەیە کە ئینسان لەسەری دەکرێتە ئەمیندار، وە ئەمەناتیش هەر شتێکە کە بە ئینسان دەسپێردرێ، وە بە ئەمیندار دادەنرێ لەسەری.

(أَن تَحۡكُمُواْ): واتە: کە حوکم بکەن، دادوەریی بکەن، وشەی (حَكَم) دەڵێ: (حَكَمَ: أَصْلُهُ: مَنَعَ مَنْعاً لإِصلاَح، وَمِنْهُ حَكَمَةَ الدابَّةُ: اللِّجَام، والحُكْمُ بالشَّيءِ أن تَقضي بأَنهُ كَذَا أَوْ لَيْسَ كَذَا)، وشەی (حَكَمَ) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە مانای نەهێشتن دێ، بە مەبەستی چاك کردن، وە لەوەوە ئەو لغاوەی لە دەمی وڵاخ دەکرێ لە دەمی وڵاخە بەرزە، پێی دەگوترێ: (حَكَمة)، چونکە رێی لێ دەگرێ لە لەوەڕ خواردن لە کاتێکدا کە خاوەنەکەی نەیەوێ لەو کاتەدا لەوەڕ بخوات، وە حوکم کردن بە شتێك ئەوەیە کە بڕیار بدەی ئەو شتە وایە، یاخود ئەو شتە وانیە.

(بِٱلۡعَدۡلِ): (عَدْل) بە کوردی دەڵێن: دادگەریی یان داد، (العَدْل والعِدْل مُتَقَارِبَان)، (عَدْل) و (عِدْل) لە یەك نزیکن، (عَدْل) دادگەریی یە (عِدل) بەلای بارێك دەگوترێ، بارێك کە هەردوو لای وەك یەکبن پێ دەگوترێ، (عِدْل)، واتە: ئەو شتەی کە هەردوو لای وەكو یەکن، واتە دوو لای هاوسەنگ وەكو یەك، (والعَدَالَةُ والمُعَادَلَةُ: لَفْظ يَقْتَضِي مَعْنَى الْمُساوَاةِ) وشەی (عَدالَة) و (مُعَادَلَة) وشەیەکە ئەوە دەخوازێ کە یەکسانیی هەبێ، کەواتە: (عَدْل و عَدَالَة) لەگەڵ (مُساوَاة) یەکسانیی، زۆر ماناکەیان لە یەك نزیکە.

(تَنَزَعْتُمْ ): واتــە: كەوتنــە ناكۆكـیـیو مـشتومڕەوە (نَـزَع الـشَّيءَ: جَذَبَـهُ مِنْ مَقَـرِّهِ وَنَـزَع، سَلَب، والتَّنَـازُعُ: الْمُجَاذَبَـةُ والْمُخَاصَـمَة)، (نَـزْع): واتـە دارِنـین، یـاخود هەڵقەندن، شتێك كە لـە ڕیشـەوە هەڵیقـەنی، (نَزَع) واتـە: (سَلَب) شـتەكەی وەرگـرتو سـتاندی پـچڕی، وە (تَنـازع) بـە ناكۆكـیـیو موناقەشـەو مـشـتومڕ دەگـوترێ.

(تَأْوِيلًا ): لێـــرەدا واتـــە: ســەرەنجام، (التَّأويـل مِـنَ الأَوْلِ) (أَوْل)، واتــە: (رَجْـع) گەڕانـــەوە (أي الرجـوع إلى الأصْـلِ، الـمَوئِل: الـمَوضِع الَّـذِي يُرجَـعُ إِلَيْـهِ وَالتأَويـل: رَدُّ الـشَّيء، إِلـى الغَايَـةِ الـمُرَادَة مِنْـهُ)، (مُوئـل) ئـەو شـوێنەیە كـە شتێك بـۆی دەگێڕدرێتـەوە، وە (تأویـل) بریتیـە لـە گێڕانـەوەی شـتێك بـۆ ئـەو مەبەسـتەی كـە بـۆی دەویـسـترێ، كـە دەفـەرموێ: ﴿ ... ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ۝٥٩ ﴾، واتە: ئەوە باشـترەو سـەرەنجامیشی چاكتـرە.

(يَزْعُمُونَ ): واتـە: گومـان دەبـەن، یـاخود پێیـان وایـە، وا دەزانـن دەڵـێ: (الـزَّعْمُ: حِكَايَـةُ قَـوْلٍ يَكُـونُ مَظِنَّـةً لِلْكَـذِب..)، وشـەی (زَعـم) بریتیــە لــە گێڕانــەوەی قسەیەك كە جێـی ئەوەیــە بـە درۆ دابنــرێ، كـە گوتــت (زَعَـمَ فُـلان) یــانی پێیوایە، بەڵام تۆش لە پێوابوونەكەیدا پێتوایە كە ڕاست ناكاتو درۆ دەكات.

(ضَلَالًا بَعِيدًا ): واتـــە: گومڕاییـــەكی دوور (ضَـلال) لــە چییـــەوە هـــاتوە؟ (الضَّـلاَلُ: العُـدُولُ عَـن الطَّرِيـقِ الْمُسْتَقِيم، وَضَـلَّ عَنّـي: فَقَـدَتُـهُ..) (ضَـلال): بریتیـە لـەلادان لـە ڕێـی ڕاسـت (وَضَـلَّ عَنّـي) واتـە: ئـەو شـتەم لـێ بـزر بـوو، كەواتــە: (ضَـآل) كەسێكە كە لە ڕێی ڕاســت لایداوە، یـان ون بووەو بزر بووە.

(وَعِظْهُمْ ): واتــە: ئامۆژگــاریی یــان بكــە، (الـوَعْظُ: زَجْـرٌ مُقْتَـرِنٌ بِتَخْوِيـفٍ، أَو التَّـذَكِيرُ بـالْخَيْر فِيمَـا يَـرِقُّ لَـهُ القَلْـبُ، وَالعِظَـة والْمَوْعِظَـة)، (وَعْـظ): لــە

كـوردەواریی خۆمانـدا دەڵـێین ئامۆژگـاریی، ئـەمیش تێـوە خورپینێكـە، سەرزەنـشت كردنێكـە، لەگـەڵ ترسـاندن دا، یـاخود بیرخـستنەوەیەكە بـە شـێوەیەك كە ئینسانەكە دڵی بـۆی نـەرم بـێو هەستی بجووڵێنرێ وە (عْظَـة) و(مَوْعِظَـة) واتە: ئامۆژگـاریی.

(بَلِيغًا ): (البلُـوغُ وَالـبَلاَغُ: الإِنتِهَـاءُ إِلى أَقْـصَى الْمَقْـصَدِ وَالْمُنْتَهَـى)، (بَـلاَغُ بلُـوغ) بریتیـە لـە گەیـشتنە ئەوپـەڕی ئامانجێـك، یـاخود ئەوپـەڕی كۆتـایی شـتێك، كـە دەفـەرموێ: ﴿ ...وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ ﴾، واتە: قسەیەكیان بـۆ بكە كە بگاتـە ئەوپـەڕی ئامـانج، واتـە: ئامۆژگـارییەكیان بكـەن دەرسـی لـێ وەرگرن.

(فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ): (شَـجَر) واتـە: تێكـەڵ بـوونو ناكۆكـیـیو مـشـتومڕ، (والـشِّجَار والـمشَـاجَرَة والتشاجر: الـمنَازَعَة)، لـە زمـانی عەرەبیـدا (شـجَار ومشاجرة وتَشاجر)، واتـە: ناكۆكـیـیو مـشتومڕو دەمەقاڵـێ، ئـەویش لـەوەوە هـاتوە كـە (شَجَرَة) درەخـت لەبەرئـەوەی لـقو پۆپەكـانی پێـك دادەچـنو تێكـەڵ دەبـن، كۆمەڵـە خەڵكـێكیش كـە مـشـتومڕیان دەبـێ، دیـارە تێكـەڵ دەبـنو لەگەڵ یەكدا دەستەو یەخـە دەبن.

(حَرَجًا ): (حَـرَج) واتـە: سـەغڵەتیی، نارەحەتـبوون، (أَصْـلُ الْحَـرَجِ وَالْحِـرَاجِ مُجْتَمـعُ الـشَّيْئَيْنِ)، دوو شـت كـە پێكـەوە كۆدەبنـەوە، پێـی دەگـوترێ (حـرج حِـراج)، (وَقِيـلَ لِلْـضِّيْقِ: الْحَـرَج)، وە بـە سـەغڵـەتیی دەگـوترێ: (حَـرَج) (وَالـحَرَج: الإِثْـم)، هـەروەها بە گونـاهیش دەگوتـرێ: (حَـرَج).

(وَٱلصِّدِّيقِينَ ): كـۆی (صِدِّيق)ە (صـدیق)یـش دوو واتـای هـەیە: (الـصِدِّيق: مَـنْ كَثُرَ مِنْهُ الـصِّدقَ، أَو دَائِم التَّصْدِيق)، (صدِّيق) یان كەسـێكە هەمیشە ڕاسـت دەكات، یاخود كەسـێكە هەمیشە شـتێك بەڕاسـت دەزانـێ، ئەبوبەكری صـیددیق خوا لێی ڕازی بێ، بۆیە وای پێگوتراوەو هەردوو واتـاكەی بۆ ئەو ڕاسـتن، هـەم

زۆر ڕاستگۆ بووە، وە هەم هەر شتێك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، یەکسەر بە ڕاستی داناوە، وە گوتوویەتی ڕاست دەکەی‌و (تصدیق)ی کردوە.

(﴿وَٱلشُّهَدَآءِ﴾): کۆی (شَهِید)ە، (الشُّهودُ وَالشَّهَادَةُ: الحضورُ مَعَ الْمُشَاهَدَةِ، إمَّا بِالبَصَرِ أَوْ البَصِيْرَةِ، وَالشَّهِيدُ: مُؤَدِي الشَّهَادَة، وَشَهِدَ عَلَى كَذَا شَهَادَةً: أَخْبَرَ بِهِ خَبَرَاً قَاطِعَاً)، وشەی (شَهِید) کە کۆیەکەی (شُهَدَاء)ە، وە (شُهود)و (شَهَادَة) بریتیە لە ئامادەبوون لەگەڵ دیتندا، دیتن بە چاوی سەر، یان بە چاوی دڵ، (شَهِید)یش بە کەسێك دەگوترێ کە شایەدیی دەدا، واتە دەڵێ: ئەو شتەم بینیوەو من ئاگاداری ئەو شتە بووم (وَشَهِدَ عَلَى كَذَا شَهَادَةٍ) واتە شایەدیی دا، یانی چی؟ واتە: هەواڵیدا بە هەواڵ پێدانێکی ڕاست، دەڵێ: من چاوم لێبوو کە ئەو شتە وابوو، شەهید بۆ پێی دەگوترێ شەهید؟ لەبەرئەوەی هەواڵ دەداو شایەدیی دەدا کە هەر دینی خوا ڕاستە بە بەڵگەی ئەوە کە خۆی لەسەر بە کوشت داوە.

(﴿وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾): واتە: چاکان، کۆی (صَالح)ە، (الصَّلاَحُ ضِدّ الفَساد وقوبل بالفَساد وَالسَيْئَة)، یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ...﴿٥٦﴾﴾ الأعراف، یان دەفەرموێ: ﴿...خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ...﴿١٠٢﴾﴾ التوبة، وشەی (صَلاَح) پێچەوانەی (فَساد)ە، کەواتە: (فَساد) یانی: خراپە، (صَلاَح) یانی: چاکە، جا وشەی (صَلاَح) هەم پێچەوانەی (فَساد)ە، هەم پێچەوانەی (سَيّئة)یە، (سَيّئة)ش واتە: خراپە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ...﴿٥٦﴾﴾الأعراف، واتە: خراپەکاریی مەکەن لە زەوییدا، دوای چاکسازیی تێداکرانی، یان دەفەرموێ: ﴿...خَلَطُواْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ...﴿١٠٢﴾﴾التوبة، واتە: کردەوەی باش‌و هی خراپیان تێکەڵ کردوە، کەواتە: (صَالح) هەم پێچەوانەی (فَاسِد) هەم پێچەوانەی (سيئة)یە.

(رَفِيقًا ): (رَفِيق) واتە: هاوەڵ، هاوڕێ، کۆیەکەی (رِفَاق)ە، وە (رُفَقَاء)ە، بۆ ئافرەتان دەگوترێ: (رفيقة) وە (رفائق)، واتە: هاوەڵ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾، «عَنْ عَلِيّ رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ سَرِيَّةً وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ فَغَضِبَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَمَا جَمَعْتُمْ حَطَبًا وَأَوْقَدْتُمْ نَارًا، ثُمَّ دَخَلْتُمْ فِيهَا فَجَمَعُوا حَطَبًا، فَأَوْقَدُوا فَلَمَّا هَمُّوا بِالدُّخُولِ، فَقَامَ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، قَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا تَبِعْنَا النَّبِيّ ﷺ فِرَارًا مِنَ النَّارِ، أَفَنَدْخُلُهَا فَبَيْنَمَا هُمْ كَذلِكَ إِذْ خَمَدَتِ النَّارُ، وَسَكَنَ غَضَبُهُ فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: لَوْ دَخَلُوها مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَدًا، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٦٢٢)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٣٤٠)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٨٤٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٦٢٥)، وَالنَّسائِيُّ بِرقم: (٤٢٠٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٥٦٧)، ئنجا لە (صحيح البُخاري)دا لە (كتاب التفسير، سورة النساء، قوله: ﴿ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ... ﴿٥٩﴾ ﴾)دا هاتوە: «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَدِيّ إِذْ بَعَثَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي سَرِيَّةٍ»، واتە:

عەلی کوڕی ئەبی طالیبو عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ (کە ئامۆزای یەکدینو ئامۆزای پێغەمبەرن ﷺ دەگێڕنەوە) دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ سریەیەك (واتە: سوپایەکی بچووك، کۆمەڵە جەنگاوەرو موجاهید)ێکی ناردن، وە پیاوێك لە ئەنصارییەکان (واتە: پشتیوانەکانی مەدینە)ی کردە فەرماندەیان، وە فەرمانیشی پێکردن کە بە قسەی بکەنو لە قسەی دەرمەچن، ئەویش لەسەر شتێك لێیان تووڕە بوو، پرسیاری لێکردن: ئایا پێغەمبەر ﷺ پێی نەفەرموون کە دەبێ بەقسەم بکەنو فەرمانبەرییم بکەن؟ گوتیان: با، گوتی: ئەوە بڕیارمدا بەتەئکید پێتان دەڵێم: دار کۆبکەنەوە دوایی ئاگریان تێبەردەن، دوایی بچنە نێو ئاگرەکەشەوە (ئاوا سزاتان دەدەم)، ئەوانیش داریان کۆکردنەوە ئاگریشیان تێبەردا، خەریك بوو بچنە نێوی، دوایی هەندێکیان تەماشای یەکدییان کردو گوتیان: ئێمە بۆیە بە دوای پێغەمبەر ﷺ کەوتووین، لەم ئاگرە ڕامان کردوە، ئایا بە پێی خۆمان بچینە نێوی؟! ئیدی مانەوە تەماشای یەکدییان دەکرد، ئاگرەکەش خامۆش بۆوە، وە کابراش تووڕەییەکەی نیشتەوە، ئنجا کە گەڕانەوە، بۆ پێغەمبەر ﷺیان باسکرد (ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕدرایەوە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر چووبانە نێوی، هەرگیز لێی نەدەهاتنە دەرێ، فەرمانبەرییکردن تەنیا لە شتی پەسەند دایە.

ئیسلام دەڵێ: لە شتی پەسەنددا بە قسەی سەرۆکی خۆت دەکەی، هەر کەسێکی بێ، با ئەمیرێك بێ، پێغەمبەریش ﷺ دایناب فەرموویشی بە قسەی بکەن، یانی: بە قسەی بکەن لە شتی باشدا، بەڵام لە خۆ سووتاندندا، نەخێر. ئنجا لە ڕیوایەتەکەی دیکەش دا هاتوە کە ئەو بەرپرسە ناوی (عبداللە بن حُذافة) بووە.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن

﴿يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ۝٦٠﴾، لەوبارەوە دوو گێڕانەوە هەن:

أ- ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه. قَالَ: كَانَ أَبُو بَرْزَةَ الأَسْلَمِي كَاهِنًا يَقْضِي بَيْنَ اليَهُودِ فِيمَا يَتَنَافَرُونَ فِيهِ، فَتَنَافَرَ إِلَيْهِ نَاسٌ مِنَ المُسْلِمِينَ، فَأنزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ...﴾ إلى قَوْلِهِ: ﴿إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ۝٦٢﴾﴾، أَخْرَجَهُ إبْنُ أَبِي حَاتِمٍ وَالطَّبَرَانِيُّ بِسَنَدٍ صَحِيحٍ، وَقَالَ الحَافظ إبْنُ حَجَر في (الإصَابَة): إسنَادُهُ جَيّد، وَأَخْرَجَهُ إبْنُ جَرِير برقم: (٩٨٩٦)، (٩٨٩٧)، (٩٨٩٨)، والسيوطي في (لُباب النقول) برقم: (٣٠١)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی فاڵچیی (كاهن) بوو، دادوەریی دەكرد لە نێوان جوولەكەكاندا، لەو شتانەدا كە تێدا دەكەوتنە كێشەوە {دوو نەفەر، چەند نەفەر دەكەوتنە كێشەوە بۆ دادوەرییكردن بۆ چارەسەری كێشەكەیان دەچوونە لای ئەو كاهینە، كە ناوی (ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی) بوو}، هەندێك لە مسوڵمانان لەسەر شتێك كەوتنە كێشەوە، چوون بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی لە جیاتی ئەوەی بچن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، خواش ئەو ئایەتەی ناردە خوار، دیارە ئەوانەی كە چوون بۆ لای ئەو كاهینە، مونافیقو دەغەڵ بوون، بۆیە پەروەردگاریش ئەو ئایەتانەی لەسەر ناردوونەتە خوارێ.

ب- ﴿أخْرَجَ ابْنُ جَرِير عَنِ الشَّعْبِي قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُسْلم وَرَجُل مِنَ اليَهود خصومة، فَقَالَ اليَهودِي: أُحَاكِمُكَ إلى أَهْلِ دِينِكَ، أو قَالَ إلى النَّبِيِّ لأنهُ قَدْ عَلِمَ أنهُ لا يأخذُ الرِشوَة فِي الحُكْم، فَاخْتَلَفَا وَاتَّفَقَا عَلَى أن يأتِيَا

كَاهِنَــاً بِجُهَيْنَــةَ فَنَزَلَــت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ... ﴾، إلـى قَوْلِهِ: ﴿إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾﴾ {(لُباب النقول في أسباب النـزول للسِّيوطِي بـرقم: (٣٠٣)}، واتــە: شــەعبیی (یەكێكـە لـە زانایـانی تـابعین) دەگێڕێتــەوە دەڵـێ: لـە نێـوانی مـسوڵمانێك و پیـاوێكی جوولەكــەدا دەمەقاڵـێیەك بـوو لەسـەر شـتێك، كـابرای جوولەكـە گـوتی: مـن دادوەرییـت لەگــەڵ دەكــەم بــۆ لای ئەهلــی دینەكــەی خــۆت، یــان گـوتی: بــۆ لای پێغــەمبەر ﷺ، چـونكە جوولەكەكـە دەیزانـی پێغــەمبەر ﷺ بــەرتیل وەرناگــرێ لــە حــوكم و دادوەرییــدا، (دیــارە ئــەوەی دیكــە دەبــێ مــسوڵمان نەبووبێ موونافیق بووە، بەلأم بـە ڕواڵـەت مـسـوڵمان بـووە) دوایـی ڕێككـەوتن كــە بــچن بــۆ لای كــاهینێك لــە جوهەینــە (جوهەینــە تیــرەیەك بــوون كاهینێكیان هەبووە فاڵچییەك كە دادوەریی كردوە لەنێـوان خەڵكدا) خـواش لەسەر ئەوە ئەم ئایەتـەی نـاردە خوار، ئەو ئایەتـانە كە دوایـی باسیان دەكەین چی دەگەیەنن.

٣/ هـۆی هاتنە خوارەوەی ئـەو ئایــەتە كـە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾، ﴿عَنْ عَبْدِاللَّـهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنه قَالَ: خَاصَمَ الزُّبَيْرَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ: اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِك، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا رَسولَ اللَّهِ! أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ!! فَتَلَوَّنَ وَجْهُ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: يَا زُبَيْرُ اسْقِ ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِك، وَاسْتَوْعَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ، وَكَانَ أَشَارَ عَلَيْهِمَا قَبْلَ ذَلِكَ بِأَمْرٍ كَانَ لَهُمَا فِيهِ سَعَةٌ، فَقَالَ الزُّبَيْرُ: إِنِّي لأَحْسِبُ هَذِهِ الآيَاتِ إِلاّ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ... ﴿٦٥﴾ ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦١٦١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٣٥٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٠٦٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٣٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٦٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٥٤١٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٥)، واته: عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ (هەردووکیان هاوەڵن)، دەڵێ: زوبێر لەگەڵ پیاوێك لە پشتیوانەکان لەسەر (شِرَاجِ الْحَرَّةِ)، کە ناوچەیەك بوو لە شاری مەدینە، لەسەر ئاودێریی کەوتنە کێشەوە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەی زوبێر تۆ کشتوکاڵەکەی خۆت ئاو بدە، دوایی ئاوەکە بەردەوە بۆ دراوسێکەت (دیارە زوبێر لەلای بنەوانێ بووە، بۆیە فەرموویەتی شتەکەی خۆت ئاوبدە دوایی ئاوەکە بەردەوە، با ئەویش ئاوی بدات)، کابرای پشتیوانیی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! لەبەرئەوەی زوبێر کوڕە پوری خۆتە (واتە: لەبەرئەوەی کە دایکی خوشکی بابتە، کە صەفییەیە دیارە زوبێر کوڕی صەفییەیە کە پووری پێغەمبەرە ﷺ) پێغەمبەری خواش دەموچاوی گۆڕاو تووڕە بوو، فەرمووی: ئەی زوبێر کشتوکاڵەکەی خۆت ئاو بدە، دوایی لێی گەڕێ با ئاوەکە پەنگ بخواتەوە، تا دەگاتە بن دیواری، (واتە: بە تەواویی کشتوکاڵی خۆت ئاو بدە)، ئنجا دوایی ئاوەکە بەردەوە بۆ دراوسێیەکەت، وە بە تەواویی هەقەکەیدا بە زوبێر (پێشێ پێغەمبەر ﷺ شتێکی بڕیار دابوو، کە بۆ دراوسێیەکەش باشتر بوو، فەرمووی: هەر ئاوی بدەو بۆی بەربدەوە، بەڵام دوایی کە کابرا پێغەمبەری خوای ﷺ تووڕە کرد، ئەوجار هەقەکەی زوبێری بە تەواوییدا، گوتی: مادام کابرا ئەو قسە نەفامانەی کرد، تۆ بە تەواویی کشتوکاڵەکەی خۆت ئاوبدە ئەوجار ئاوەکەی بەردەوە) جا زوبێر دەڵێ: من پێمـوایە، ئەم ئایەتانە لەوبارەوە هاتنە خوارێ.

٤/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُواْ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ

مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لەسەرمان پێویست کردبان کە خۆتان بکوژن، یان لە نیشتیمانو ماڵو حاڵی خۆتان دەربچنو کۆچ بکەن، کەمێکیان نەبێ ئەو فەرمانەیان جێبەجێ نەدەکرد، کەمەکە کێن؟ مسوڵمانە ڕاستەقینەکانن، بەلاّم ئەوەی ئیمان بێهێزو دڵ نەخۆشو دەغەڵ بێ، دەستی ناچێتە خۆی خۆی بکوژێ، بەڵکو دەستی ناچێتە ئەوە کە ماڵو حاڵیش بەجێ بهێڵێ، بەڵکو دەستی ناچێتە ماڵەکەشی لەڕێی خوادا خەرجی بکات، لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیەو ئەم ئایەتە بۆیە هاتۆتە خوارێ: ﴿أَخْرَجَ إِبْنُ جَرِيرٍ وَابْنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنِ السُّدِيّ قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّا كَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَنِ ٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ أَوِ ٱخۡرُجُواْ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٞ مِّنۡهُمۡۖ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴿٦٦﴾ ﴾، افْتَخَرَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بنِ شَمَّاسٍ وَرَجُلٌ مِنَ اليَهُودِ فَقَالَ اليَهُودِيُّ: واللَّهِ لَقَدْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْنَا أَنِ اقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ فَقَتَلْنَا أَنفُسَنَا، فَقَالَ ثَابِتٌ: وَاللَّهِ لَوْ كَتَبَ اللَّهُ عَلَيْنَا أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ لَقَتَلْنَا أَنفُسَنَا فَأَنزَلَ اللَّهُ فِي هَذَا: ﴿ ... وَلَوۡ أَنَّهُمۡ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴿٦٦﴾ ﴾﴾، لُبَابُ النقول فِي أسباب النزول للسِّيوطِي برقم: (٣٠٩)، واتە: سوددیی دەڵێ: کاتێك کە ئەم ئایەتە هاتە خوار کە دەفەرموێ: ئەگەر لەسەرمان پێویستکردبان خۆتان بکوژن، یاخود لە ماڵو حاڵی خۆتان دەربچن، کەمێکیان نەبێ جێبەجێیان نەدەکرد، سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس (کە یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ) لەگەڵ پیاوێکی جوولەکەدا پێکەوە موناقەشەیان بوو (تفاخر: خۆهەڵکێشانە بەسەر یەکدیدا، دیارە سابیت گوتوویەتی: دینی ئێمە ڕاستترەو ئێمە پابەندترین بە دینی خۆمانەوە، جوولەکەکەش گوتوویەتی: نەخێر ئێمە چاکترین)، ئیدی کابرای جوولەکە گوتی: سوێند بە خوا ئێمە لەسەرمان پێویست کرا، خوا

فەرمووی: خۆتان بکوژن ئێمەش خۆمان کوشت، (ڕاست دەکا، ئەو کاتەی کە گۆلکیان پەرست باب‌و باپیریان، دوایی مووسا سەلامی خوای لێبێ، کە گەڕایەوە، خوا فەرمووی: سزاکەیان ئەوەیە کە یەکدی بکوژن، ئنجا وەختی خۆی باسمان کرد لە تەفسیری سوڕەتی بەقەڕەدا یەکدی کوشتنەکە چۆن بووە، ئایا ئەوانەی کە گۆلکیان نەپەرستوە، ئەوانە بکوژن کە گۆلکیان پەرستوە؟ یاخود بەربنە یەکدی، هەندێك دەڵێن: تاریکیان بەسەر داهات‌و بەربوونە یەکدی یەکدیان کوشت، تا ماوەیەك هەتا خوای دادگەر فەرمووی: بەسە)، جا ئەو جوولەکە گوتی: ئێمە ئەو فەرمانەمان پێکرا، جێبەجێمان کرد، سابیتی کوڕی قەیسیش گوتی: سوێند بە خوا ئەگەر خوا لەسەرمان پێویست بکات، کە خۆمان بکوژین ئێمەش خۆمان دەکوژین، ئیدی خوا عزّ وجل ئەم ڕستەیەی دوایی ناردە خوارێ کە دەفەرموێ: ﴿... وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾﴾، ئەگەر ئەوەی کە ئامۆژگاریی پێکراون (واتە: بۆیان نێردراوەتە خوار لە یاساکانی شەریعەت) ئەوە جێبەجێ بکەن بۆ ئەوان باشترە، وە زیاتریش دەیانچەسپێنێ لەسەر ئیمان‌و، پێویست ناکات بە خۆزگە بخوازن خوای بەرز فەرمانیان پێ بکات کە خۆیان بکوژن، یاخود بەبێ هۆکار ماڵ‌و حاڵی خۆیان بەجێ بهێڵن، دوایش زیاتر مانای ئەو ئایەتانە ڕوون دەکەینەوە.

٥/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾، واتە: هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە لەگەڵ کەسانێك دایە کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، لە پێغەمبەران و صیددیقان‌و شەهیدان‌و صالحان وە ئەوانەش باشترین هاوەڵن، ئەم ئایەتە بەو بۆنەیەوە هاتۆتە خوارێ: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ

اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَ رَجلٌ إلى النبيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسولَ اللَّهِ! إنَّكَ لأَحَبُّ إليَّ مِن نَفسِي، وَإنَّكَ لأَحَبُّ إليَّ مِن وَلَدِي، وَإني لأَكُونُ في البَيتِ فَأَذكُرُكَ فَمَا أَصبِرُ حتى آتِيَ فَأَنظُر إلَيكَ، وَإذَا ذَكَرتُ مَوتِي وَمَوتَكَ عَرَفتُ أَنَّكَ إذَا دَخَلتَ الجنةَ رُفِعتَ مَعَ النَّبِيِّينَ، وَإني إذَا دَخَلتُ الجنةَ خَشِيتُ أَلا أَرَاكَ، فَلَم يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ شَيئًا حتى نَزَلَ جبريلُ عَلَيْهِ السَّلامُ بهذِهِ الآيةِ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ ...﴾، (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانيُّ فِي (الكبير) برقم: (١٢٥٥٩)، وإبن مردوية بسند لابأس بهِ، وَأَخْرَجَهُ الطَّبَريُّ برقم: (٩٩٢٩) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ مُرْسَلاً، وَالسِّيوطِي فِي (لُباب النقول) برقم: (٣١٠)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٩٣٣)، واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! تۆ لە خۆم لە لام خۆشەویستتری، وە تۆ لە منداڵەکانم (واتە: ڕۆڵەکانم) لەلام خۆشەویستتری، وە من جاری وایە لە ماڵێ دەبم یادی تۆ دەکەمەوە، خۆم ڕاناگرم هەتا دێم تەماشات دەکەم، هێندەم خۆش دەوێی، ئێستاش بیرم کردۆتەوە کە ئەگەر منو جەنابیشت مردین، دەزانم تۆ کە چوویە بەهەشتێ لەگەڵ پێغەمبەران بەرز دەکرێیەوە، بۆ شوێنە بەرزەکانی بەهەشت، وە منیش ئەگەر بچمە بەهەشتێ (دیارە من لە خوارەوە دەبم، لە پلەکانی خوارێ)، دەترسێم کە نەتبینم (ئەو نیگەرانییەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەربڕی)، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە (بۆچی؟ چونکە پێغەمبەر ﷺ شتێك نەیزانیبێ هەر لە خۆوە قسەی نەکردوە، نەیزانیوە چی وەڵام بداتەوە)، هەتا جبریل دابەزیە خوارێو ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە کە دەفەرموێ: هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەریی خوا بکات ئەوە لەگەڵ پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صاڵحان دایە، ئەوانەش باشترین ڕەفیقن، دوایی باسی دەکەین کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە: بە هیچ شتێك دڵخۆش نەبووین هێندەی بەو ئایەتە دڵخۆش بووین، واتە: دڵخۆشبون بەوەی کە ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەبین.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوای بەرزو مەزن لەم ئایەتانەدا بابەتێکی یەکجار گرنگ، وە هەستیار باس دەکات، ئەویش بابەتی حوکمڕانییە: کۆمەڵگای مسوڵمان دەبێ چۆن بەڕێوەببردرێ؟ بەرپرس و حوکمڕانەکان چۆن دیاری دەکرێن؟ بەرپرس و حوکمڕانەکان دەبێ چۆن مامەڵە بکەن؟ خەڵك دەبێ چۆن ڕەفتارو مامەڵە بکات لەگەڵ حوکمڕان و بەرپرسەکاندا؟ وە سنووری بە قسەکردن و فەرمانبەریی کردن بۆ حوکمڕانان هەتا کوێیە؟ لە چیدا بە قسەیان ناکرێ؟ ئەگەر خەڵك و حوکمڕانان، یان حوکمڕانان لەنێو خۆیاندا، یان خەڵك لەنێو خۆیاندا کەوتنە کێشەو مشتومڕو جیاوازیی و ڕاجیایی یەوە، دەبێ چی بکەن؟ وە پاشان باسی ئەوە دەکات کە ئەوەی ئەهلی ئیمان بێ، وەختێ کێشەو مشتومڕێکیان دەبێ، بۆ دادوەریی کردن واتە: بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەی کە لە نێوانیاندا پەیدابووە، بچنەوە بۆ لای کێ؟ دیارە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، کە دیارە لە سەردەمی خۆیدا پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، وە لە دوای پێغەمبەر ﷺ بچنەوە بۆ لای حوکمڕانی مسوڵمانان، کە ئەویش دەبێ حوکم بە شەریعەت بکات، چونکە حوکمڕانێك لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە حوکمڕانی شەرعیی دادەنرێ و بەرپرسێك بە بەرپرسێکی ڕەواو شەرعیی دادەنرێ و، دەبێ بە قسەی بکرێ، کە پابەندبێ بە قورئانەوە، وە بە سوننەت و ڕێوشوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ، جا ئەو ئایەتانە باسی ئەم بابەتە گرنگە دەکەن، خوا ﷻ لە سەرەتادا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾، بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خەڵکی شایستەی خۆیان، لێرەدا بەگشتی خوا فەرموویەتی سپاردەکان، بەڵام بە پێی سیاق و زنجیرەی ئایەتەکان لێمان حاڵی دەبێ کە لێرەدا مەبەست لە ئەمانەت، واتە: سپاردەی حوکمڕانیی، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ کۆمەڵگەی مسوڵمان دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئەی مسوڵمانینە! ئەی کۆمەڵگای

مسوڵمان! خوا فەرمانتان پێدەكات سپاردەكانی حوكمڕانیی تەسلیمی خەڵكی شایستەی خۆیان بكەن، واتە: كەسانێك هەڵبژێرن، كەسانێك دابنێن بۆ بەرپرسێتیی خۆتان، بۆ حوكمڕانییتانو بۆ ئیدارەی وڵاتتان، بۆ بەڕێوەبردنی دینو ژینتان، كە شایستەبن، ئاوا فەرمان بە كۆمەڵگای مسوڵمان دەكات، ئنجا دوایی فەرمان بە حوكمڕانان دەكاتو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ﴾، یانی: (إنَّ اللّهَ يَأمركُمْ إذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أنْ تَحْكُمُوا بالعَدْلِ) خەڵك حوكمڕانان هەڵدەبژێرن حوكمڕانانی شایستە، كە بزانن دادگەر دەبنو پارێزكار دەبنو پابەند دەبن بە شەریعەتەوە، حوكمڕانەكانیش پێویستە حوكمو دادوەریی بكەن بە دادگەرانە لە نێوانی خەڵكدا، دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ﴾، بێگومان خوا ئەوەی ئامۆژگارییتانی پێدەكات، باشترین شتە، جا هیچ شتێك هەیە باشتر لەوەی كە خوا ئامۆژگاریی ئێمەی پێ بكات؟! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾، بێگومان خوا بیسەرەو بینەرە، بیسەرە، هەموو دەنگو قسەو باسێكتان دەبیستێ، بینەریشە، هەموو حاڵو وەزعێكتان دەبینێ، كەواتە: ئەگەر خوا بەرنامەتان بۆ دابنێ، لەبەرئەوەی هەموو شتێك دەبیستێو، هەموو شتێك دەبینێو، هەموو شتێك دەزانێ، وە هەموو شتێكیش دەتوانێ، مانای وایە ئەو بەرنامەیەی كە خوا دایدەنێ، باشترین بەرنامە دەبێ، ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی فەرمانی بە كۆمەڵگای مسوڵمان كرد كە سپاردەی حوكمڕانیی بە كەسانی شایستەی خۆیان بسپێرن، وە فەرمانی كرد بە حوكمڕانان كە بە دادگەریی دادوەریی بكەنو حوكمڕانیی بكەن، ئنجا بۆ جاری پێنجەم لەم سوورەتەدا بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، ئەوە جاری پێنجەمە، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾، فەرمانبەریی خوا بكەن، وە فەرمانبەریی

پێغەمبەر ﷺ بکەن، وە هی کاربەدەستانێك لە خۆتان، لێرەدا جێی سەرنجە کە خوا ﷻ بۆ زاتی خۆی فەرموویەتی: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾، وە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، واتە: وشەی: فەرمانبەریی بکەن ﴿أَطِيعُواْ﴾، بۆ خۆیشی بەکارهێناوەو بۆ پێغەمبەریش ﷺ بەڵام دوایی بۆ کاربەدەستان فەرموویەتی: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، وشەی (إطاعة)ی بۆ بەکار نەهێناون، جا ئایا ئەمە یانی چی لێرەدا؟ واتە: فەرمانبەرانێك فەرمانبەریی یان بۆ دەکرێ و بە قسەیان دەکرێ، گوێڕایەڵییان بۆ دەکرێ، کە لە فەرمانبەریی (إطاعة)ی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دابن و فەرمانبەران وحوکمڕانێك دەبێ بە قسەیان بکرێ، کە پابەند بن بە قورئانی خواو بە سوننەتی پێغەمبەری پێشەواوە ﷺ، دوایی دیارە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو مەسەلە کە ئەوە چۆنە؟

پاشان باسی چۆنیەتی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان دەکات: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، ئنجا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە مشتومڕو ناکۆکییەوە لە نێوخۆتاندا ئەی مسوڵمانینە ! یان ئەی مسوڵمانان! لەگەڵ حوکمڕانەکان، یاخود ئەی حوکمڕانەکان لە نێو خۆتاندا، هەمووی دەگرێتەوە، ئەوە ئەو کێشەو مشتومڕە کە بۆتان چارەسەر نەکرا ﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، بیبەنەوە بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەر، واتە: بۆ لای قورئانی خواو بۆ لای سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ﴿إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾، ئەگەر ئێوە ئیمانتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە وابکەن، واتە: ئەگەر کێشەو مشتومڕەکانتان نەبەنەوە بۆ لای تەرازووی شەریعەت، تەرازووی قورئان و سوننەت، مانای وایە نیشانەی پرسیار لەسەر ئیمان و مسوڵمانەتییەکەتان پەیدادەبێ، تۆ چ مسوڵمانێکی کە ڕازی نەبی بە حوکمی شەرع، کوردەواریی

خۆمان دەڵێن: (دەستێك شەرع بیبڕێ خوێنی لێ نایەت) مەبەستیان ئەوەیە کە شەرع زوڵم لە کەس ناکات شەریعەتی خوای پەروەردگار حوکمی خوایە، خواش بەیەك چاو تەماشای بەندەکان دەکات، وە بەندەکان بۆ خوا هەموویان یەکسانن، خوا خزمایەتیی لەگەڵ کەسدا نیە، کەسی لێ نزیکتر نیە لە کەس، هەمووی بۆ خوا وەك یەکە، کێ لە خوا نزیکترو بەڕێزترە؟ ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات، واتە: بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا پارێزکارترتانە، پارێزکار (متقي) کێیە؟ کەسێکە زیاتر خۆ دەپارێزێ لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون، وە زیاتر ئەو شتانە ئەنجام دەدا کە خوا فەرزی کردوون، چونکە تەقوا بریتییە لە جێبەجێکردنی واجبەکانو نەشکاندنی قەدەغەکان، کەواتە: کێ زیاتر پابەندبێ بە شەریعەتەوەو فەرمانەکانی خوا جێبەجێ بکات، خۆی لە نەهییەکانی خوا بپارێزێ، ئەوە لە خوا نزیکترە، وە لەلای خوا بەڕێزترو خۆشەویستترە، کەواتە: شەریعەتی خوا بۆ هەمووان وەك یەکە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾، ئا ئەوە، واتە: فەرمانبەرییتان بۆ خواو بۆ پێغەمبەر ﷺ وە بۆ کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن، بۆخۆتان داتاناون، وە لە خۆشتانن، مسوڵمانن‌و پابەندن بە شەریعەتەوە، وە پاشان گێڕانەوەی مشتومڕو کێشەکانتان بۆ لای شەریعەتو بۆ لای قورئانو سوننەت، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە لە دنیادا، وە لە قیامەتیش سەرەنجامی باشترە.

ئنجا خوا ﷻ بۆمان باسی هەڵوێستی کۆمەڵێك خەڵکی بەناو مسوڵمانی لەڕاستییدا دەغەڵو مونافیقو دڵ نەخۆش دەکاتو دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە پێیان وایە ئیمانیان

بەوە هێناوە کە بۆ تۆ دابەزێنراوە، وە ئیمانیان بەوەش هێناوە کە پێش تۆش دابەزێنراوە، واتە: پێیان وایەو لافی ئەوە لێدەدەن کە ئیمانیان بە قورئان هەیە کە بۆ تۆ دابەزێنراوە، وە ئیمانیان بە کتێبەکانی دیکەی خواش هەیە، کە پێش تۆ دابەزێنراون، کەچی چی دەکەن؟ ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾، دەیانەوێ دادوەریی خۆیان بەرن بۆ لای طاغووت، کێشەو مشتومڕێکیان هەبێ دەیانەوێ بچن لای طاغووت، چارەسەری بکەن، ﴿وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ﴾، لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانیان پێکراوە کە کوفر بە طاغووت بکەن، وەك خوای بێنیاز لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿... فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾، واتە: هەر کەسێك کوفر بە طاغووت بکاتو ئیمان بە خوا بێنێ، دەستی لە قوڵفەیەکی قایمەوە گرتوە کە ناپچڕێ، کەواتە: فەرمانیان پێکراوە کوفر بە طاغووت بکەن، کەچی ئەوانە لەجیاتی کوفری پێ بکەن دەچن ئیمان بە طاغووت دێننو، کێشەو مشتومڕەکانیان دەبەن بۆ لای طاغووت، طاغووت کێیە؟ هەر کەسێکە کە حوکم بە شەریعەت نەکات، هەر کەسێکە حوکم بەو قورئانو بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نەکات، وە بەو یاسایانەی کە لە قورئانو سوننەت هەڵدەهێنجرێن، نەکات، نەك هەرکەسێك وابێ ئەوە طاغووتە، طاغووت لە ئەسڵدا لە (طُغیان)ەوە هاتوە، دەگوترێ: (طَغَى، يَطْغى، طُغيَانًا) واتە: سەرکێش بوو لە سنوور دەرچوو، طاغووت صیغەی موبالەغەیە، واتە: زۆر یاخیی، زۆر لە سنوور دەرچوو، گوتراوە: (الطَّاغُوت: مَنْ تَجَاوَزَ الحَدّ فِي العِصيَان) واتە: کەسێك کە لە سەرپێچییکردنی خوادا هەموو سنوورەکانی بەزاندوون ئەوە طاغووتە، ئایا ئەو کەسە هەموو سنوورەکان نابەزێنێ، کە شەریعەتی خوا لەوێ بێ، کەچی بۆخۆی بچێ بەرنامە بۆ خەڵکی دابنێ؟

بڵێ: وەرن بە قسەی من بکەن‌و گوێ مەدەنە شەریعەت، گوێ مەدەنە قورئان‌و سوننەت، وەرن بە قسەی من بکەن؟ بێگومان ئەوە طاغووتەو خۆی لە خەڵکی کردۆتە پەرستراو، دەیەوێ خەڵك لە جیاتی خوا ئەو بپەرستێ، چونکە پەرستن یانی: چی؟ یانی: ئەوپەڕی ملکەچی، ئەوپەڕی ملکەچییت بۆ هەر کەسێك بێ، ئەوە ئەو کەسەت پەرستوە، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴾، وە شەیتان دەیەوێ زۆر بە دووریی گومڕایان بکات، واتە: گومڕاییەکی دوور گومڕایان بکات‌و زۆریان دووربخاتەوە، هەر نەیەنەوە سەر ڕاستە ڕێ، کەواتە: لە ئەنجامی بە دادوەر دانەنانی شەریعەتداو بە دادوەر دانەنانی پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ شەریعەتی خوای بۆ بەجێ هێشتووین، ئەوە ئینسان زۆر گومڕا دەبێ‌و دوور دەکەوێتەوەو لە ڕاستە ڕێی خوا لادەدات، ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ ﴾، وە ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆ لای ئەوە کە خوا ناردوویەتە خوار، کە بریتیە لە قورئان، وە بۆ لای پێغەمبەر ﴿ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴾، تۆ مونافیقەکان دەبینی لێت لادەدەن، بۆخۆشیان لێت دوور دەکەونەوە، خەڵکیشت لێ دوور دەخەنەوە ﴿ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴾، واتە: خۆشیان‌و خەڵکیش لادەدەن، لە جیاتی ئەوەی بێن بڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! مادام جەنابت دەفەرمووی‌و مادام مسوڵمانین، جەنابت چی دەفەرمووی لەسەر سەرو چاو دایدەنێین، لە جیاتی بێن کە بانگ دەکرێن، لادەدەن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، ئایا ئەوانە چی دەکەن، ئەگەر بەڵایەکیان تووش بوو بەهۆی کردەی دەستی خۆیانەوە؟! ﴿ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴾، دوایی دێنە لات‌و سوێند بە خوا دەخۆن دەڵێن: تەنیا مەبەستمان چاکەکاریی‌و

مەبەستمان ڕێکخستن‌و ئاشتەوایی بوو، واتە: ئەوانەی کە حوکم بە شەریعەت ناکەن دەڵێن: وەڵڵاهی مەبەستمان ئەوەیە کاروباری وڵاتەکە بەڕێوەبچێ‌و کێشەکان چارەسەربن، وە مەبەستمان بەس چاکەیەو ئێمەش هەر دەمانەوێ کەموکوڕیی‌و مشتومڕەکانی خەڵکی چارەسەر بکەین، واتە: سوێند دەخۆن کە ئەوە هاندەریان بووە، بەڵام خوا دەفەرموێ: نەخێر لەڕاستییدا ئیمانیان بە شەریعەتی خوا نیە، ئیمانیان بە کتێبی خوا نیەو ئیمانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نیە، ئەگەرنا تۆ بڵێی بەندەکانی خوا لە خوا دڵسۆزتربن بۆ بەندەکان؟! تۆ بڵێی ئەوان لە خوا چاکتر بزانن موشکیلەی خەڵکی چۆن چارەسەر دەبێ؟! وەزعی خەڵکی چۆن بەڕێوەدەچێ؟! خوا لە هەموو کەس باشتر نازانێ؟! کەسێك هەر شارەزایی بە ئەلیف‌و بێی ئیسلامەتیی هەبێ، دەزانێ کە خوا ﷻ لە هەموو کەس زاناترەو شارەزاترەو کاربەجێ ترە.

ئنجا ئایا مەبەست لەوە چییە کە بەڵایەکیان تووش بێ بە هۆی کردەی دەستی خۆیانەوە؟! توێژەرەوان زۆر قسەیان لەسەر کردوە کە دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، هەندێك دەڵێن: ئەوەیە لە ئەنجامی نەگەڕانەوە بۆ شەریعەتدا، یان دەبینی مشتومڕو کێشەکانیان تەشەنە دەکەن، یاخود کێیان بەهێزتربێ، زوڵم لەوی دیکە دەکات، یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە دوایی پێغەمبەر ﷺ‌و مسوڵمانان لە ئەنجامی ئەو هەڵوێست‌و ڕەفتارانەدا دەیانناسن، کە ئەوانە مسوڵمان نین، مونافیقن‌و نیشانەی پرسیاریان دەخەنە سەر، وە لەوەودوا بە جۆرێکی دیکە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، کە ئەوە موصیبەتە بۆ ئەوان، لەوکاتەدا دێن سوێند دەخۆن‌و پاکانەی خۆیان دەکەن، خواش دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێ چی لە دڵیاندا هەیە ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴾، لەبەرئەوە وازیان لێبێنە ﴿ وَعِظۡهُمۡ ﴾، ئامۆژگارییشیان بکە، مادام تۆ پێغەمبەری خوای‌و ڕەحمەتی خوای بۆ هەموو خەڵکی، ئامۆژگارییان بکە بەڵکو واز لەو هەڵوێستەی خۆیان

بێنن، ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾، وە قسەیەکیان پێ بڵێ لەنێو دڵیاندا کاریگەریی هەبێ، ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾، تۆ قسەیەکیان بۆ بکە کە کاریگەریی تەواویی هەبێو بەتەواویی مانا لە دڵیاندا بچەسپێ، بۆئەوەی واز لەو ڕەفتارەی خۆیان بێنن کە کوفرو نیفاقەو بگەڕێنەوە سەر جادەی شەریعەت، ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾، وە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر بۆئەوەی کە بە فەرمانی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ، واتە: ئەوانە بۆیان نیە بڵێن: ئەگەر بۆ لای قورئان بێ، باشە، بەڵام بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش بەشەریکە وەك ئێمە، نەخێر پێغەمبەر ﷺ چ ئەوەی وەك قورئان پێمان دەڵێ، چ ئەوەی وەك فەرمایشتی خۆی پێمان دەڵێ، مادام فەرمووی: خوا وایفەرمووەو وەحی خوایە، ئەوە بۆ ئێمە پابەندکەرە، خوا دەفەرموێ: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە مەگەر بۆ ئەوە کە بە قسەی بکرێ فەرمانبەریی بۆ بکرێ بە فەرمانی خوا ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا﴾، دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر ئەوانە وەختێك ستەمیان لە خۆیان دەکرد، جا ئایا زوڵم لەخۆکردنەکەیان چی بوو؟ ئەوەبوو کە ئامادە نەبوون دادوەرییەکەیان بێننە لای شەریعەت، ئامادە نەبوون چارەسەری کێشەکەیان بێننە لای پێغەمبەر ﷺ، وە چوون بۆ لای طاغووت، ئنجا وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد: ئەو طاغووتە ئەبو بەڕەزەی ئەسلەمیی یە، کەعبی کوڕی ئەشرەفە، کاهینێکی دیکەیە لە جوهەینە، سەرکردەو طاغووتێکی دیکەیە، کە ئیمانی بە قورئانو بە ئیسلام نیە، بچی بۆ لای تاکو کێشەکەت چارەسەر بکات ... هتد، جا دەفەرموێ: ئەگەر کاتێك ئەو زوڵمەیان لەخۆیان دەکرد، هاتبانە لای تۆ، وە داوای لێبوردنیان لە خوا کردبا، وە پێغەمبەریش ﷺ

داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کردبان ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾، ئەو کاتە دەیانبینی خوا زۆر تۆبە وەرگرەو زۆریش بە بەزەییو میهرەبانە لەگەڵیان، واتە: خوا ڕێی گەڕانەوەیان پێشان دەدات، دوای ئەوەی بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو وازیان لێبێنە، واتە: سزایان مەدە لەسەر ئەوە، مادام دەڵێن مسوڵمانین، لەسەر ئەوە سزایان مەدە دەغەڵو مونافیقن، بەڵام سزایان مەدە، وە دوایی فەرمووی: ئامۆژگارییان بکە، وە قسەیەکی کاریگەریان بۆ بکە، ئنجا دواییش ڕێی گەڕانەوە بۆ لای خوایان بۆ ئاچووخ دەکاتو دەفەرموێ: با داوای لێبوردن لە خوا بکەن.

ئنجا خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿فَلَا﴾، واتە نەخێر، ئەوانە ئیماندارنین ئەوانە بە بڕوادار لەقەڵەم نادرێن، ﴿وَرَبِّكَ﴾، سوێند بە پەروەردگارت ﴿لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ﴾، ئەوانە ئیمان ناهێنن هەتاکو تۆ نەکەنە دادوەر، ﴿فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾، لە هەر شتێکدا کە تێیدا کەوتوونەتە تێکەڵیی، تێیدا کەوتوونە مشتومڕو ڕاجیاییو، تێیدا دەستەو یەخەبوون، دەبێ تۆ بکەنە دادوەر، ئنجا ئایا هەر بەوەندە تەواو دەبێ، بڵێن: پێغەمبەر ﷺ دادوەرەو شەریعەتی خوا دادوەرە، فەرموو شەریعەت چی دەڵێ؟ نا، ماویەتی !! ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾، دوایی لە دڵیشیاندا هیچ سەغڵەتییەك هەست پێ نەکەن، سەبارەت بەو بڕیارەی، کە تۆ داوتە ئەی پێغەمبەر ﷺ واتە: شەریعەت، بۆئەوەی لێمان تێکنەچێ، چونکە ئەم ئایەتانە هەر بۆ سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەهاتوون، یاخود هەر کەسێك کە لەجێی پێغەمبەری خوا ﷺ شەریعەت پیادە دەکات، حوکمڕانی مسوڵمانان، بەرپرسانی مسوڵمانان کە شەریعەت پیادە دەکەن، دەبێ ئەوان ببنە دادوەر کێشەو مشتومڕەکانی مسوڵمانانو کۆمەڵگا چارەسەر بکەن، ئنجا ئەو بڕیارەی کە دەدرێ لەلایەن دەسەڵاتی شەرعییەوە بە پێی شەریعەت، دەبێ،

ئەو کەسە کە بڕیارەکەی بۆ دراوە، چ بە قازانجی بێ، چ بە زیانی بێ، هەست بە هیچ سەغڵەتییەك نەکات، واتە: پێی ناخۆش نەبێ، ﴿وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾، وە دوای ئەوەش دەبێ بە تەواویی ملکەچبن و گەردنکەچبن، واتە: موویان لێ نەلەخشێ لە بەرانبەری شەریعەتداو، بێ گنج و بێ گرێ و گۆڵ بن، ئەوجار بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێن، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُوا۟ مِن دِيَـٰرِكُم﴾، واتە: ئەگەر ئێمە لەسەرمان نووسیبان، واتە: لەسەرمان پێویست کردبان، کە خۆتان بکوژن، یاخود لە ماڵ و حاڵی خۆتان دەرکەون ماڵ و حاڵ بەجێبهێڵن لە پێناوی خوادا، ﴿مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾، کەمێکیان نەبێ ئەوەیان ئەنجام نەدەدا، یانی: ئەو خۆ کوشتنەو ئەو ماڵ و حاڵ بەجێهێشتنەیان ئەنجام نەدەدا، لێرەدا مەبەست چییە؟ ئەوەی من تێیدەگەم مەبەست ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: من لە شەریعەتی خۆمدا شتێکم لەسەر پێویست نەکردوون قورس بێ، واتە: بۆتان نەکرێ ئەدی ئەگەر خوا فەرمووبای: خۆتان بکوژن؟ ئەدی ئەگەر فەرمووبای: دەبێ ماڵ و حاڵی خۆتان بەجێبهێڵن؟ ئەگەر فەرمووبای: دەی هەرچی هەتە دەبێ هەمووی ببەخشی؟ خۆ تۆ خوا هەرچی فەرمووە، دەبێ جێبەجێی بکەی، خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ئەوەم پێنەگوتوون، ئەگەر پێم گوتبان، کەمێك نەبێ نەتاندەکرد، واتە: مسوڵمانە ڕاستەقینەکان ئەگەر ئەوەشیان پێ گوترابایە هەر دەیانکرد، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوە باسمان کرد، کە (ثابت بن قیس) گوتی: وەڵڵاهی ئەگەر خوا لەسەری پێویست کردبایین خۆمان بکوژین خۆمان دەکوشت، دیارە ئینسانی ئیمانداری بەڕاستی وایە، جا فەرقی چییە، کابرا دەچێ سوور سوور دەزانێ لە جەنگ لە دژی کافران دەکوژرێ، کەچی دەشچێ! بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: من شتێکم لەسەر پێویست نەکردوون زۆر قورس بێ، ئەوەی کە لەسەرم پێویست کردوون، لە تواناتاندا هەیە زۆر قورس

نیە، واتە: بە هەمووتان دەکرێ، بە کەسێك كە هەر ئیمانێکی مام ناوەندیشی هەبێ، پێی دەکرێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾، وە ئەگەر ئەوەی پێی ئامۆژگاریی دەکرێن، ئەنجامیان دابایەو کردبایان، واتە: یاساکانی شەریعەت کە بۆیان نێردراون، ئەوە بۆ ئەوان باشتر بوو، وە توندتریش دەیچەسپاندن، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە دیارە هەموو خێرێك لە ملکەچیی بۆ شەریعەت دایە، وە بەهۆی پابەندییمان بە شەریعەتەوە، ئیمان زیاتر لە دڵماندا دەچەسپێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)شدا دەربارەی ماڵ بەخشین دەفەرموێ: ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ ...﴿٢٦٥﴾﴾، واتە: وە وێنەی ئەو کەسانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن لە پێناوی ڕازیکردنی خواداو، وە بۆئەوەی کە دەروونیان زیاتر بچەسپێنن لە ئەنجامی پابەندیی بە شەریعەتەوە، ﴿وَإِذًا لَّءَاتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجْرًا عَظِيمًا﴾، وە ئەگەر ئەوان ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی دەکرێن، جێبەجێیان کردبا، ئێمە پاداشتێکی مەزنمان دەدانێ، ﴿وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا﴾، وە ڕێی ڕاستمان پێشان دەدان، کەواتە: ئینسان تا زیاتر پابەندبێ بە شەریعەتەوە، زیاتر دەکەوێتە سەر ڕێی ڕاست، وە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە گرتنی ڕێی ڕاست، ڕێی شەریعەت، ئەوەنیە کە وەك سکەی شەمەندەفەر بکەویە سەری و بڕۆی! بەڵکو هەمیشە ئینسان پێویستی بەوە هەیە، چاو بە خۆیدا بگێڕێتەوە، وە ئاگای لە خۆی بێ و خۆی پابەند بکات بە شەریعەتەوە، ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾، وە هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکاتو،

له قسەیان دەرنەچێ‌و گوێڕایەڵیان بێ، كە فەرمانبەریی خوا، پابەندییەی بە قورئانەوەو، فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا ﷺ پابەندیی یە بە ڕێوشوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ ئنجا ئایا ڕێوشوێن‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ چییە؟ ئەویش هەر بریتیە له جێبەجێكردنی قورئان، سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەر قورئانە، بەڵام بە جێبەجێكراویی‌و بە بەرجەستەكراویی، وەك لەم حەدیسەدا هاتوە: ﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا فَقُلْتُ: أَخْبِرِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ﴾، رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٦٤٥) وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، واتە: سەعدی كوڕی هیشام دەڵێ: پرسیارم كرد لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بوو، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سوننەتەكەی بریتیە لە جێبەجێكردنی قورئان، بەڵام بە جێبەجێكردنەوە، بە شەرح‌و ڕوونكردنەوەوە، جا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: هەر كەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا بكات، ئەوە لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كە خوا چاكەی لەگەڵ كردوون، ئەوانەی كە خوا چاكەی لەگەڵ كردوون كێن؟ چوار جۆرە كەسن:

١/ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) كە لە هەموو كەس پلەیان بەرزترە.

٢/ لە دوای ئەوان صیددیقان، ئەوانەن كە زۆر بە مەحكەمی بڕوایان بە پێغەمبەران هەبووە، وە هەرچی پێغەمبەران گوتوویانە بە ڕاستیان دانـاون، وە بڕوایان پێ هێناون، سەرۆكی هەموو صیددیقانیش ئەبو بەكری صیددیقە خوا لێی ڕازی بێ، هەڵبەتە مانای وانیە هەر (ئەبو بەكر) صیددیق بووە، بەڵكو عومەری كوڕی خەتتابیش‌و (عوسمان)یش‌و (عەلی)یش‌و زۆرێك لە هاوەڵانی دیكەی پێغەمبەریش ﷺ صیددیق بوون، صیددیق واتە: زۆر ئیمانێكی پتەوی هەبێ بە پێغەمبەر ﷺ، بەڵام دیارە ئەبو بەكر ئەو نازناوەی زیاتر پێ بڕاوە، لەبەرئەوەی كە لە هەموویان زیاتر پێغەمبەری خوای ﷺ بە ڕاست داناوە،

وە لە پێش هەموویاندا پێغەمبەری خوای ﷺ بە ڕاست داناوە، یەکەمین کەس لە پیاوان پێغەمبەری خوای ﷺ بە ڕاست داناوەو ئیمانی پێ هێنا، ئەبو بەکری صیددیق بوو، خوا لێی ڕازی بێ.

٣- ئنجا شەهیدان، واتە: ئەوانەی کە شایەدیی دەدەن کە هەر دینی خوا ڕاستە، وە شەهیدیش بۆیە پێی دەگوترێ: شەهید، چونکە بە خوێنی خۆی شایەدیی دەدات کە دینی خوای بەڕاست داناوە، تا خۆی لە پێناودا شەهید کردوە.

٤- وە (صالحين) واتە: چاکان، چاکەکاران، ﴿وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾، ئەوانەش باشترین هاوەڵو ڕەفیقن ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا﴾، ئەوەش بەخششێکە لە خواوە، وە خوا بەسە بۆ زانایی بە هەموو کەس‌و، خوا دەزانێ کێ شایستەی ئەو پلەو پایانەیە، بۆئەوەی کە بە نسیبی بکاو هیدایەتی بدا بۆی.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** خوا ﷻ لە ئایەتەکانی: (٥٨، ٥٩)ی سووڕەتی (النساء)دا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ٥٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾، ئەم دوو ئایەتە وەك من لە زنجیرە وتاری: (ئیسلامو دەوڵەتداریی‌و حوکمڕانیی)دا باسم کردوە، تاکە دوو ئایەتێکن لە هەموو قورئاندا کە ئاماژە دەکەن بە چەند بنەمایەکی گەورەو گرنگی حوکمڕانیی‌و دەوڵەتداریی، وە ئاماژە دەکەن بە بنەما گرنگەکانی سیستەمی حوکمڕانیی لە ئیسلام دا، چونکە لە ئایەتی یەکەمیان کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ...٥٨﴾، وەك دواییی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە: ڕووی دواندن لە کۆمەڵگای مسوڵمانانەو دەفەرموێ: بێگومان خوا ﷻ فەرمانتان پێدەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خەڵکی شایستەی خۆیان، لێرەدا بە پێی سیاقی ئایەتەکە (وەك دوایی دەیسەلمێنین) دەردەکەوێ کە مەبەست لە ئەمانەت هەرچەندە لە ئەسڵدا وشەی (أمَانَات) کۆی (أمَانَة)یە، بە مانای سپاردە (وَدیعَة) دێ، شتێك کە بە خەڵکێك دەسپێردرێ بۆئەوەی بیپارێزێ، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (أمَانَات) واتە: بەرپرسیارەتییەکان، بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردن‌و ئیدارەکردنی کۆمەڵگاو دەوڵەت، خوا ﷻ لە ڕستەی یەکەمی ئایەتی یەکەمدا، ڕوو لە کۆمەڵگای مسوڵمان دەکات‌و

دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێدەکات بەرپرسیارێتییەکان کە ئەمانەتن‌و گەورەترین ئەمانەتیشن، بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن، واتە: بەرپرسانی شایستە دابنێن‌و کەسانێك دابنێن حوکمڕانتان بن، کە شیاوولێهاتووبن، وە لە ڕستەی دووەمیدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴾، ئەوە فەرمان دەکات بە حوکمڕان‌و بەرپرسان‌و دەفەرموێ: وە ئەگەر دادوەرییتان لە نێوانی خەڵکدا کردو حوکمڕانییتان کرد، بە شێوەیەکی دادگەرانە دادوەریی‌و حوکمڕانیی بکەن، کەواتە: ئەوە دوو بنەما:

١/ بنەمای یەکەمیان فەرمان بە کۆمەڵگا دەکات کە بەرپرسان‌و حوکمڕانانی شایستە هەڵبژێرن، وە ئەمانەتی بەرپرسیارێتیی‌و حوکمڕانییان پێ بسپێرن.

٢/ ڕستەی دووەم کە بنەمای دووەمی تێدایە، فەرمان دەکات بە حوکمڕانان کە بە دادگەریی حوکمڕانیی بکەن، ئنجا ئایەتی دووەم کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن‌و فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، وە هی کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن، ئەمەش بنەمای سێیەمی حوکمڕانیی یە کە چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵکە لەگەڵ حوکمڕاناندا، هی پێشێ چۆنیەتی مامەڵەکردنی حوکمڕانان بوو لەگەڵ خەڵکدا، کە دەبێ بە دادگەریی حوکمڕانیی بکەن، ئنجا چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵك‌و کۆمەڵگا لەگەڵ حوکمڕاناندا، کە پێویستە فەرمانبەریی خوا ﷻ بکەن، واتە: پابەندبن بە قورئانەوە، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن‌و پابەندبن بە سوننەتەوە، وە فەرمانبەریی کاربەدەستانی خۆیان بکەن، کاربەدەستانێك کە پابەندن بە قورئان‌و سوننەتەوەو مسوڵمانانیش خۆیان دایان دەنێن، ئنجا لە ڕستەی دواییدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي

شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾، بنەمای چوارەم لە سیستەمی حوكمڕانییدا دەخاتە ڕوو، کە کاتێك کە حوكمڕانو خەڵك، یان حوكمڕانان هەندێكیان لەگەڵ هەندێكیاندا، یان خەڵك لەنێو خۆیاندا، کەوتنە کێشەو مشتومڕێکەوە، پێویستە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، واتە: بیبەنەوە بۆ لای پێوەرو تەرازووی قورئانو سوننەت، بۆئەوەی ئەو ناکۆکییە چارەسەربێ، وە لە کۆتاییشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ﴾، ئەگەر ئیمانتان بە خواو بە ڕۆژیی دوایی هەیە، دەبێ وا بکەن واتە: دەبێ چی بکەن؟ دەبێ سپاردەی بەرپرسیارێتی بە کەسانی شایستەی خۆیان بسپێرن، ئەی کۆمەڵگەی مسوڵمان! وە خەڵکی باش بکەنە حوكمڕانو بەرپرسی خۆتان، وە حوكمڕانەکان دەبێ بە دادگەریی حوكمڕانیی بکەن، وە دەبێ خەڵك فەرمانبەرییو گوێڕایەڵی بەرپرسانی خۆی بکات، وە کاتێك کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە، دەبێ بیبەنەوە بۆ لای قورئانو سوننەت.

**مەسەلەی دووەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾، بۆچی وشەی (أَمَانَات) لێرەدا بە مانای بەرپرسیارێتییەکان دێو بە مانای حوكمڕانیی دێ؟ دەڵێین: چونکە وشەی (أمانات) کۆی (أمانة)یە، (أمانة) پێشتر توێژیمانەوە، لە ئەسڵی زماندا هەر شتێك کە کەسێکی لەسەر بکرێتە ئەمیندارو بە دەستپاكو بە ئەمیندار دابنرێو پێی بسپێردرێ، بەڵام بە پێی سیاقی ئەو شوێنە کە تێیدا دێ ماناکەی دیاریی دەکرێو ئەمە وەك بنچینەیەك وایە، چونکە وشە هەیە لە قورئاندا چەند واتایەك هەڵدەگرێ، چۆن واتاکەیمان بۆ دیاریی دەکرێ؟ تەماشای سیاقەکە واتە: زنجیرەی ئایەتەکان دەکەینو بە پێی زنجیرەی ئایەتەکان دەزانی لەو شوێنەدا ئەو وشەیە مانای چییە؟ بۆ وێنە: وشەی (فتنة) جاری وایە بە

مانای ئازاردان دێو جاری وایە بە مانای تاقیکردنەوە دێو جاری وایە بە مانای شیركو كوفر دێ، چۆن دەزانین؟ دەبێ تەماشای شوێنەكە بكەین، لێرەدا وشەی (أَمَانَة) ئەگەر تەماشا بكەین لە ئایەتی ژمارە (٧٢)ی سوورەتی (الأحزاب)دا هاتوە، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُ... ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەمانەتمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەكانو زەویو چیاكان، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرنو لێی ترسان، بەڵام ئینسان هەڵیگرت، لێرەدا ئەمانەت یانی چی؟ (إبن كثير) لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: (قَالَ عُوفِيُّ عَنِ إِبْنِ عَبَّاسٍ يَعنِي بالأمَانَة الطَّاعَةِ)[1]، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس گوتوویەتی وشەی: (أمانة) لێرەدا بە مانای فەرمانبەریی، دێ، یانی خوای پەروەردگار لەسەر ئاسمانەكانو زەویو چیاكانی ڕانواندوە كە ئایا ئامادەن بە ئیرادەو ویستی ئازادانەی خۆتان ملكەچی خوا بن؟ ئەوانیش ئامادە نەبوون، واتە: لە توانایاندا نەبووە، چونكە خاوەنی عەقڵو ئیرادە نەبوون هەروەها (ابن كثير) دەڵێ: (وَقَالَ عَلِيّ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ عَنِ إِبْنِ عَبَّاسٍ الأَمَانَة الفَرَائِض) ئەوەش ڕیوایەتێكی دیكەیە لە (عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس)ەوە كە دەڵێ: ئەمانەت بە مانای فەرزەكانە: ئەو شتانەی كە خوا فەرزی كردوون، كە لەگەڵ طاعەتدا تێكدەكاتەوە.

وە (عَبدالرَّحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ: (يُعَظِّمُ تَعَالى شَأنَ الأمَانَةِ الَّتِي أئتَمَنَ اللَّهِ عَلَيهَا الـمُكَلَّفِينَ الَّتِي هِي: إمتِثَالُ الأوامِرِ وَاجتِنَابُ الْمَحَارِمِ)[2] واتە: خوای بەرز لێرەدا پێگەی ئەمانەت كە بە خەڵكی سپاردوە كە بیپارێزن بەرزی دەكاتەوە، كە بریتیە لە جێبەجێكردنی فەرمانەكان، وە خۆ دوورگرتن لە قەدەغەكان، وە لە (صفوة البيان لِمَعَانِي القُرآن)دا كە

١) (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير، ص: (١١٠٨).
٢) (تيسير كَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفسير كَلَامِ الْمَنَان، ص: (٦٧٣).

هـی (الـشیخ حـسین محمـد مخلـوف)ە، لـەوبارەوە هـاتوە: (هِـي التَّكِيـالِفُ وَالفَـرَائِض أوكُـلُّ مَـا يُـؤتَمن عَلَيْـهِ مِـنَ أَمْـرٍ وَنَهْـي وَشَـأن دِيـنٍ وَدُنيـا)[1]، واتـە: ئەمـــانەت لێـــرەدا (واتـــە: لـــە ســـوورەتی -الأحـــزاب- دا) بریتیـــە لـــە ئەرکـــە شـەرعییەکانو پێویستییەکان، وە هەر شـتێك لە فەرمـانو لـە ڕێ لێگـــرتن، وە لە کاروبـاری دیـنو ژین کە خەڵکی تێدا دەکرێتـە ئەمینـدار.

ئـەدی چ شـتێك ناچـارمان دەکـات بڵێین: لە ئایـەتی ژمارە (٥٨)ی سـوورەتی (النسـاء)دا مەبەست لە (الأمانات) بەرپرسیارێتیەکانن، واتە: حوکمڕانیـەتیـی ئیـدارەکردنی وڵات؟ چوار بەڵگە ناچـارمان دەکـەن:

**بەڵـــگەی یەکـــەم:** سـیاقی ئایەتـەکان کـە باسـی حـوکمڕانییو سـیاسەتو بـەڕێوەبردنی کۆمەڵـگا دەکـەن، وە پێویـسـتە وەك پێـشتـر باسمـان کـرد وشـەکانی قورئـانیش بـە پێـی سـیاقی ئایەتـەکان تەمەشـا بکـرێنو واتایـان لەبەرچاو بگیـرێ، ئەوجار واتاکەیانمان بۆ دەردەکەوێ.

**بەڵـــگەی دووەم:** لـە ڕوانگـــەی ئیـسـلامەوە خـاوەنی ئەسڵـیی دەسـتەڵاتی شـــەرعیی لـە کۆمەڵگـای ئیـسلامییدا، خەڵـكو کۆمەڵـگایە، وەك مـن لـە زنجیـــرە وتـاری: (ئیـسلامو دەوڵەتـداریی)دا، گوتوومـە: ، وەك چـۆن خـوای کاربـەجێ خـاوەنی حاکمیـەتی موتڵـەقە، (الحاكمیة المطلقة) خەڵکیش خـــاوەنی دەســـتەڵاتە، واتـــە: خـــوای پەروەردگـــار شــەریعەتی بــە خەڵــك سـپاردووەو پێـی فـەرموون: خەڵکینـە! جێبەجـێی بکـەن، جا هـەتا خەڵـك بەرپرسـان دیاری نەکات، شەرعییەتیان نابێ، یانی: هـەتا خـەڵك هەڵنەسـتێ بڵـێ فـلان کـەس! تۆ ئەو ئەمانەتەمـان بـۆ هەڵگـرەو ئـەو کارەمـان بـۆ بکـە، ڕەوایـەتیی (شـرعیة)یـان نابـێ، بۆچـی؟ چونکە خـوای کاربـەجێ دەفـەرموێ:

﴿... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ... ٣٨﴾ الشـوری، کاروبـاری مـسوڵمانان، بـە ڕاوێـژە لەنێوانیاندا، کاروباری سیاسیی، کۆمەڵایەتیی، ئیـداریی، دەبـێ بـە ڕاوێـژبێ،

---

١) صفوة البيان لِمعاني القرآن، ص: (٥٣٨).

کەواتــە: تــا خەڵــك ڕاوێــژ نەکــەن، وە کارەکــان بــە کەســێك نەســپێرن، شـەرعیەتیی نابێ، بۆیە خـوا پـێش ئـەوەی قسـە لەگـەڵ حوکمڕانـان بکـاتو بفەرموێ: بە دادگـەریی حـوکمڕانیی بکـەن، قسـە لەگـەڵ خـەڵكو کۆمەڵگادا دەکــات، دەفــەرموێ: حوکمڕانانتــان دیــاریی بکــەنو ســپاردەو ئەمانــەتی حوکمڕانیـی بە کەسانی شایستە بسـپێرن، ئنجا دوایی جا بە حوکمڕانەکان دەفەرموێ: بە دادگـەریی حوکمڕانیــی بکەنو دادوەریــی بکەن.

**بەڵگەی سـێیەم:** چەند فەرموودەیەکی پێغەمبـەرمان ﷺ هــەن، کە سپاردە بە حوکمڕانیی تەفسیـر دەکەن، بۆ نموونە:

١) ﴿إِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ، قَالُوا : يَا رَسولَ اللَّهِ ! مَا إِضَاعَتُهَا ؟ قَالَ: إِذَا أُسْنِدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ﴾، رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٦٤٩٦)، وَأَحْمَـد بــرقم: (٨٧١٤) وَغَيْــرهُم عَــنْ أَبِــي هُرَيْــرَةَ رضي الله عنه، واتــــە: پێغــەمبەر ﷺ ڕۆژێــك فــەرمووی: ئەگــەر ســپاردە زایــە بــوو، چــاوەڕێی قیــامەت بکـەن، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! بـە زایـەدانی سپاردە چییــە؟ فــەرمووی: هەرکــاتێك کاروبــار بــە خەڵــکی ناشیاو سـپێردراو بــە کەسـی شایستەی خۆی نەسـپێردرا، چاوەڕێی قیـامەت بکەن.

لێــرەدا قیــامەت یــانی چــی؟ واتــە: هەرکاتێــك بــە خەڵــکی نائەهــل بــسـپێردرێ، کارەکــە کۆتــایی دێ، کــارەکە ســـەری تێـدا دەچــێ، ئەگــەرنا مەبەست پێی قیامەتی گەورە نیە، مەبەســت پــێ قیــامەتی ئـەو کــارەیە، کـە لەڕاسـتییدا هــەر ئیشـێك بــە کەســێکی نائەهــل ســپێردرا، ئیـشـەکە ســەری بە فەتارەت دەچێو کۆتایی پێـدێ.

٢) ﴿عن أَبي ذرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسـول اللَّـه! ألا تَسْـتَعْمِلُني؟ فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَـى مَنْكِـبي، ثُـمَّ قَـالَ: يَـا أَبَـا ذَرٍّ، إنَّـكَ ضَـعِيفٌ، وإنّهـا أمــانةٌ، وَإِنَّهَـا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ خِـزْيٌ وَنَدَامَـةٌ، إِلاَّ مَـنْ أَخَـذَهَا بِحَقِّهَـا، وَأَدَّى الَّـذِي عَلَيْـهِ فِيهَـا﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٤٦٩٦) والحاكم برقم: (٧٠٢٠)، واتە ئەبـو زەڕ خـوا

لێـی ڕازی بــێ دەڵــێ: ڕۆژێــك گــوتم ئــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ! بەرپرسـیارییەتێکم پـێ ناسـپێری، پێغـەمبەر ﷺیش دەستی لـە شـانمدا (وەك مولاتەفـە)، ئنجـا فـەرمووی: ئـەی ئەبـو زەڕ! تـۆ بـێهێـزی، ئـەوەش ئەمانــەتە، (واتـە: بەرپرسـیارێتی سپاردەیە)، وە لـە ڕۆژی قیامەتـدا مایـەی سـەرشـۆڕیی‌و پەشـیمانییە، مەگـەر کەسـێك بـە هـەقی خـۆی وەریگرتبــێ، (واتــە: شایــستەی بووبــێ)، وە ئــەو ئەرکــەی کــە لەسـەریـشیەتی لــەو ئەمانەتـەدا، جێبـەجێ، کردبـێ، واتـە: هـەقی خۆیـشی پێدابــێ، بـە هـەق وەریگـرتبـێ‌و هـەقی خۆیشـی پێـدابـێ.

هەڵبەتــە کــە پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: تــۆ بێهــێزی دیــارە بێهێزییـەکـەی ئـەبو زەر خـوا لـێی ڕازی بێ، ئــەوە نەبــووە کـە ڕاستــبێژ نەبـێ، بـە تـەقوا نەبـێ، ئـەهلی عیبـادەت نەبـێ، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ شـایەدیی بۆ داوە فـەرموویەتی: [مَا أَظَلَّتْ الْخَضْرَاءُ وَلا أَقَلَّتْ الْغَبْرَاءُ مِنْ رَجُلٍ أَصْدَقَ لَهْجَةً مِنْ أَبِي ذَرٍّ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٢)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٣٤٠)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٨٤٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٦٢٥)، وَالنَّسائِيُّ بــرقم: (٤٢٠٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٤٥٦٧)، واتـــە: زەوی هەڵیـــنەگرتوەو ئاسمان سـێبەری نەکـردوە، لە پیـاوێك ڕاسـتگۆتر لـە ئـەبو زەڕ، پیاوێکــی زۆر عابیــدو خوانـــاس بــووە، بــەڵام دیــارە لــە ڕووی حــوکمڕانیی‌و کــار بەڕێوەبردنــەوە، توانــای نــەبووە، بۆیـە پێغـەمبـەر ﷺ فەرموویــەتی تـۆ شـایـستە نـی بـۆ ئـەو کـارە، کەواتـە: لێرەشـدا دەبیـنین کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی ئەمـانەت، واتـە: بەرپرسـیارێتـی.

**بەڵگــەی چــوارەم:** مـادەم وشـەی (الأمانـات) بـە ڕەهـایی (مُطلـق)ی هـاتوە، پێویـسـتە بـە گـەورەترین مـوفرەدەی خـۆی‌و بـە چاکتـرین واتـای تەفـسیری بکـەین، کـە بریتیـە لـە سـپاردەی حـوکمڕانیی، چـونکە لەڕاسـتییدا ئەگـەر سـپاردەی حـوکمڕانیی، بـە کەسـی شایـستەی خـۆی سـپێردرا سـپاردەکانی دیکەش هـەموو دەپـارێزرێن، بـەڵام ئەگـەر ئـەو ئەمانەتـە گەورەیـە زایــە

بـووو، كەســانی نائــەهل بوونــە حــوكمڕانو كاربەدەســتی مــســولْمانان، سپاردەكانی دیكـەش هــەموو زایـە دەبـن، هەڵبەتـە بۆیـەش تـۆزێ لەســەری ڕۆیشـتم، چونكە تەفسیرەكانی دیكە هــەموویان ئەمانەتیــان بـە شـتی دیكە (واتـە: بـە شــتی ســپێردراو - ودیعـة -) تەفـسیر كـردوە، بـەڵام مـن بـۆم دەركەوتوە كە لێرەدا وشەی: (الأمانات) بە مانـای بەرپرســیارێتیو، ئەركــی بەڕێوەبردنـی كۆمەڵـگـاو دەوڵــەت دێ.

**مەســــەلەی ســــێیەم:** كــە دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾، بۆچـی لـە ئایـەتی یەكـەمدا، واتـە: لـە ئایـەتی ژمـارە (٥٨)دا خـوا ﷻ نەیفــەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئنجــا بفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾، وە بۆچـی لـە ئایـەتی ژمـارە (٥٩)دا یەكسـەر ئـاوا دەست پێدەكاتو دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾؟ ســەرجەم ئــەو تەفـسیرانەی ســەرنجم داون نــەمبینیوە ئــەو پرسیارەیان ورووژاندبـێ، كە بۆچـی خـوا ﷻ لـە ئایـەتی ژمـارە (٥٨)دا بەتایبـەت دووانــدن لەگــەڵ ئیمــانداراندا ناكــات؟ بــەڵام پــاش ئــەوەی زۆر ســـەرنجم دا، پێموایــە هۆكارەكــەی ئەوەیــە، كــە كۆمەڵــگای ئیــسلامیی بــە هــەموو پێكـهاتەكانییەوە، بەرپرسـیارە بەرانبـەر بـە دانـانی حوكمڕانـانو بەرانبـەر بـە دانانی كاربەدەستان، كە دەبـێ ئیـدارەی بكـەن، واتـە: دانـانی بـە زاراوی ئـەمڕۆ: هەر سێ دەسەڵاتەكەی: یاسـا دانــانو، جێبەجێكـردنو، دادوەریـی، (التشریع، والتنفیـذ، والقـضَاء)، ئنجـا لەبەرئـەوەی كـە كۆمەڵـگای مـسولْمان هـەمووی بەرپرسیارە، خوا ﷻ نەیفەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئـەی ئیمانداریـنــە! تاكــو ئەگــەر لــە كۆمەڵــگای ئیــسلامییدا خەڵــكی دیكــەش هــەبوون كــە نامــسولْمانانن، ئــەوانیش بگرێتــەوە، چونكــە ئــەوانیش بەرپرســیارن، وە ئەوانیـش خـاوەن هەقـن، وەك مـن لـە زنجیرە وتـاری (ئیـسلامو دەوڵەتـداریی‌و

حوکمڕانیی)دا باسمکردوە، ئەوانیش خاوەن هەقن، ڕایان هەبێ‌و بۆچوونیان هەبێ دەربارەی دانانی کەسانێك کە سەرپەرشتییان دەکەن‌و وڵات بەڕێوەدەبەن، بەڵکو جگە لە هەندێك پۆست‌و پێگەی دیاریکراو، ئەوانیش (واتە: نامسوڵمانانیش) هەقی خۆیانە کە بەشدارییش بکەن لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، وە لە پێسپێررانی ئەو ئەرکانەدا، جگە لەوەی کە بە دەقێکی شەرعیی تایبەت کرابێ، بە ئەهلی ئیمانەوە، بەڵام لە ئایەتی دووەمدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾، لەبەرئەوەیە کە بە قسەکردنی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: پابەندیی بە قورئان‌و بە سوننەتەوە) لەسەر نامسوڵمانان فەرزنیە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، پێشێ بە هەموو کۆمەڵگا دەفەرموێ: بەرپرسانی خۆتان دیاریی بکەن‌و سپاردەی حوکمڕانیی بە کەسانی شایستەی خۆیان بسپێرن، دوایی بە بەرپرسەکان دەفەرموێ: بە دادگەریی حوکمڕانیی بکەن، ئنجا بە ئەهلی ئیمان دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بە پیاو ئافرەت، بە وردو درشتەوە، فەرمانبەریی خوا بکەن، کە لە پابەندیی قورئاندا بەرجەستە دەبێ، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، کە لە پابەندیی بە سوننەتدا بەرجەستە دەبێ، وە هی کاربەدەستانێ کە خۆتان دایاندەنێن، وە لێیان ڕازین وە بە پێی شەریعەتێکیش کە ئێوە شوێنکەوتوونی، ڕەفتار دەکەن.

<u>**مەسەلەی چوارەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴾، ئەم تەعبیرە لە قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ﴾، واتە: خوا ئەوەی ئێوەی پێ ئامۆژگاریی دەکات، باشترین شتە، باشترین شتێك کە خوا ئامۆژگاریی ئێوەی پێ دەکات ئەوەیە، ئەمە یانی چی؟

یانی: باشترین ئامۆژگارییەك كە خوا بۆ ئێمەی ناردوە ئەوەیە كە ئێمە ئەمانەتو سپاردەی حوكمڕانییو بەرپرسیارێتی بە كەسانی شایستە بسپێرین، وە پاشان باشترین ئامۆژگارییەك كە خوا كردوویەتی ئەوەیە كە حوكمڕانەكان بە دادگەریی حوكمڕانیی بكەن، وە دوایش ئەهلی ئیمان فەرمانبەریی خوا، وە فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا ﷺ وە هی كاربەدەستانی خۆیان بكەن، وە ئەگەر كەوتنە كێشەوە بیبەنەوە بۆ لای تەرازووی قورئانو سوننەت، كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾، واتە: خوا بیسەری بینەرە، واتە: قسەكانتان دەبیستێ، وە هەموو هەڵسوكەتێكیشتان دەبینێ، هیچ شتێكتان لە خوا پەنهان نیە، كەواتە: بزانن چۆن لەگەڵ ئەو ئامۆژگارییە گەورەو گرنگەی خوای پەروەردگاردا ڕەفتار دەكەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، وشەی طاعەت یانی چی؟ كە دەفەرموێ: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الطَّاعَة والطَّوع: الإنقِياد، وَيُضَادُّه الكُره.. والطَّاعَةُ مِثْلُهُ لَكِن أكثَرُ مَا تُقَالُ فِي الإئتِمَارِ لَمَا أُمِرَ والإرتِسامِ فِيمَا رُسِمَ)، واتە: (طَاعَة) لەگەڵ (طوع) یەكن، واتە: ملكەچیی، پێچەوانەی ملكەچیی، پێخۆش نەبوونو ڕق لێ هەڵسانە، وە طاعەتیش هەر بە مانای (طوع) دێو یەك مانایان هەیە، بەڵام وشەی طاعەت زیاتر بۆ ئەوە بەكاردەهێنرێ فەرمانێك كرابێو جێبەجێ كرابێ، ڕێ پێشاندرابێو پابەندیی پێوە كرابێ، كەواتە: طاعەت یانی چی؟ یانی ملكەچییو گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی و بەقسەكردن، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە كە خوای زاناو كاربەجێ بۆخۆیو بۆ پێغەمبەر ﷺ وشەی (طَاعَة)ی بەكارهێناوە، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، بەڵام بۆ كاربەدەستان هەر فەرموویەتی: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ

مِنكُمۡ ﴾، وشەی (طَاعَة)ی بۆ دووبارە نەکردوونەتەوە، ئەوە چی دەگەیەنێ؟ ئەوە دەگەیەنێ کە فەرمانبەرییمان بۆ خوا کە بریتییە لە پابەندیی بە قورئانەوە، سەربەخۆیە، وە فەرمانبەرییمان بۆ پێغەمبەر ﷺیش، ئەویش هەر سەربەخۆیە، بەڵام گوێڕایەڵیی بۆ حوکمڕان و کاربەدەستان و بەرپرسان، شتێکی سەربەخۆ ڕەها (مطلق) نییە، بەڵکو بەستراوەتەوە بەوەوە کە ئەو کاربەدەستانە لە خۆمان بن، وە پابەندیش بن بە شەریعەت و دینەکەمانەوە، ئەگەر وانەبن بەقسەیان ناکرێ، وەك دوایی باسی دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ﴾،( أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٣٤٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٤٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٢٥)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٤٢٠٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٥٦٧)، واتە: فەرمانبەریی کردن بۆ کاربەدەستان و حوکمڕانان تەنیا لە شتی پەسەندو چاکدایە، دەبێ فەرمانەکە مۆری شەرعی پێوە بێ، ئەگەرنا بە قسەی ناکرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾، وە فەرمانبەریی کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن بکەن، ئایا ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾، کێن؟ جارێ وشەی: ﴿ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ ﴾، یانی: (ذووا الأمر: أصحاب الأمر) واتە: خاوەنانی فەرمان، چونکە وشەی (أُولوا) کۆیە، بەڵام تاکەکەی بریتییە لە (ذو) واتە: لە جینسی خۆی تاکی نییە، (أولوا) یانی خاوەنەکان، بەڵام (ذو) واتە: خاوەن، بۆ کەسێکیش بەکاردێ، وەك وشەی (النساء)، وە وشەی (الإبل)، وشەی (الخَيْل) کە ئەوانە هەموویان پێیان دەگوترێ: (إسْم الجَمع)، وشەی: (النساء) تاکەکەی لە خۆی نییە، دەڵێ: (إمرَأَة) ئافرەتێك، ژنێك، بەڵام (النساء) واتە: ئافرەتان، (الخَيْل) وڵاخە بەرزە، (إبل) واتە: حوشتر، بەڵام

تاكەكـەیان لـە بێــژە (لَفْظِ)ی خۆیــان نیـە، (أولـي الأمـر) واتـە: خاوەنـانی فەرمـان، ئەوانەی كە دەبـێ بـە قـسـەیان بكرێ، جا ئایا ئـەو (أولـي الأمـر)انـە، كـێن؟ زانایان لەوبـارەوە ڕاجیـایی یان هەیـە:

١/ هەندێكیان دەڵێن: زانـایـانن.

٢/ شـیعــەكان دەڵــێن: دوازدە ئیمامــەكانن، كــە ئــەوان دەڵــێن دوازدە ئیمامــە مەعـصوومەكان، بـەڵام ئێمـە بێجگـە لـە پێغەمبـەران كـەس بـە پـارێزراو لـە هەڵە (معصوم) نازانیـن.

٣/ وە هەندێكیـان دەڵـێن: هەر كەسێك كە لەنێو خەڵكیدا قسـە ڕۆیـشتوو بـێ، بەگـوێی بكـرێ، (أولوا الأمر)ە.

بەڵام لەڕاستییدا (أولوا الأمر) بە زاراوی ئەمڕۆ واتە: هەر سـێ دەسـەڵاتەكەی یاســادانان، جێبــەجێكردن، دادوەریــی، بۆچــی؟ چونكــە (أَولـي الأَمـر) واتــە: خاوەنانی ئەمر، كەواتە: دەبـێ فەرمانیان هەبێ، زانـایـەك كە بە قسـەی نـەكرێ خـاوەنی ئـەمری چییە؟ ئیمامێك كە كـەس بـە قسەی نـەكردووەو دانیـان پێـدا نەهێناوە، خاوەنی ئەمری چییە؟ كەواتە: لێرەدا مەبەست لە (أولـي الأَمـر) واتە: ئەوانەی كـە بـڕواداران هەڵیاندەبـژێرن، كۆمەڵـگای ئیـسلامیی هەڵیاندەبـژێرن، وە ئەرك و بەرپرسـیارێتـیی بەڕێوەبردنــی وڵاتیــان پــێ دەسـپێرن.

<u>مەســەلەی حەوتـەم</u>: كە دەفـەرموێ: ﴿وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾، واتــە: كاربەدەســـتان كە لـە خۆتـان بـن، ئایا ئـەو وشـەی: لـە (خۆتـان) ﴿مِنكُمْ﴾ە، ڕێگـرە لەبـەردەم نامـسوڵمانانـدا كـە لـە كۆمەڵـگای ئیـسلامیدا ئـەرك و كاریـان پـێ بـسـپێردرێ و بەرپرسـیارێتییان پـێ بـسـپێردرێ؟ لـە وەڵامـدا دەڵـێین: نــەخێر، جگـە لــە بەرپرسـیارێتیی سـێ سـەرۆكـایەتییەكـانی:

١- دەســەڵاتی یاســادانان، سـەرۆكەكەی دەبـێ ئـەهلی ئیمـان بـێ، بۆچـی؟ چـونكە یاســا هەڵدەهێنجــێ لــە قورئــان و ســوننەت و، كەسـێك ئیمـانی بـە قورئـان و

سـوننەت نـەبێ، ناگونجـێ ببێتـە سـەرۆکی دامەزراوەیـەکی وا، بـەڵام ئایـا دروسـتە ببێتـە ئەندام؟ بەڵێ دروستە.

٢- سـەرۆکایەتیی دەسـەڵاتی جێبەجـێ کـردن، واتـە: حکوومـەت، ئـەویش دیـارە دەبـێ ئەهلـی ئیمـان بـێ، بۆچـی؟ چـونکە کەسـی یەکـەم لـە دەوڵـەتی ئیسـلامییدا ناگونجێ مسـوڵمان نەبـێ.

٣- هـەروەهـا کەسـی یەکـەمی دەسـەڵاتی داوەریـیش بـە هـەمان شـێوە دەبـێ ئەهلـی ئیمـان بـێ، کەواتـە: وشـەی: ﴿ مِنكُمْ ﴾، بـۆ سـەرۆکایەتیی‌و بـۆ کەسـی یەکەمی دەوڵەتی ئیسـلامیی، یاخود دامـەزراوەکانی دەوڵـەتی ئیسـلامیی بـە تایبـەتی، سـێ دامـەزراوە گرنگەکـە دەچـێتەوە، وە هـەر کـارێکی دیکـەی کـە مـۆرکێکی شـەرعیی هـەبێ‌و مـۆرکێکی ئیسـلامیی هـەبێ، بـۆ وێنـە: نابـێ کابرایـەکی نامـسوڵمان بکرێتـە دادوەر (قَاضِـي)ی مـسوڵمانان، هـەروەك مـسوڵمانێکیش نابـێ ببێتـە (قَاضِـي) بـۆ نامـسوڵمانان، بـۆ چارەسـەری کێشـەکانیان[1]، هەروەها فەرماندەی سوپاو پێـشنوێژو خـەطیـب، وە باقـی ئـەو ئەرکانـەی کە مۆرکێکی دینـییان هەیـە، ئـەوە هـەم بـۆ مـسوڵمانانیش، نابـێ نامسوڵمانان ببنە بەرپرسیان، هەم بۆ نامسوڵمانانیش نابـێ مـسوڵمانان ببنە بەرپرسیان، ئنجا دیارە ئەگەر کەسی یەکەمیش لە سـێ دەسـەڵاتەکاندا ئەهلـی ئیمان بوو، مسوڵمان بوو، مانای وایە خاوەنانی فەرمـان بە شـێوەیەکی بنـەڕەتیی لـە مـسوڵمانانن، وە ئـەو کاتـە ڕێگـر نابـێ لەبـەردەم ئـەوەدا کـە نامسوڵمانان پۆسـتو پێگەی دیکەی سیاسی‌و ئیداریی یان پێ بسـپێرن، مـادام کەسی یەکـەمی پێگـە گرنگو بنـەڕەتییەکـان، ئەهلی ئیمـانن.

**مەسـەلەی هەشـتـەم:** خـوای بـێ هـاوەڵ کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾، ئەگـەر لـە شـتێکدا کەوتنـە نـاکۆکیی‌و دەمەقاڵـێ،

---

١) مەگـەر خۆیـان داوا بکـەن .

بیگێڕنەوە بۆ لای خواو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەمە چی دەگەیەنێ؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر ئەهلی دەسەڵات هەر دەسەڵاتێك لەنێوخۆیدا کێشەی هەبوو، دەبێ بیگێڕنەوە بۆ لای تەرازووی شەریعەت، بۆ لای قورئانو سوننەت بۆ وێنە: ئەگەر لەنێو حکوومەتدا کێشە هەبوو، دەبێ بۆ چارەسەری بیگێڕنەوە بۆ تەرازووی قورئانو سوننەت، وە ئەگەر لەنێو دەسەڵاتی یاساداناندا کێشە هەبوو، بە هەمان شێوە، وە لەنێو دەسەڵاتی دادوەرییدا، بە هەمان شێوە، واتە: ئەگەر بە خۆیان چارەسەر نەکرا، دەبێ بیبەنەوە بۆ لای تەرازووی قورئانو سوننەت، پاشان ئەگەر لەنێوان سێ دەسەڵاتەکاندا بۆ وێنە: دەسەڵاتی دادوەریی تێکگیرا لەگەڵ دەسەڵاتی یاساداناندا، یاخود لەگەڵ دەسەڵاتی جێبەجێکردندا، بە هەمان شێوە، یاخود ئەگەر لە نێوان کۆمەڵگاو دەسەڵاتدا تێکگیران هەبوو، بە هەمان شێوە دەبێ قورئانو سوننەتو شەریعەت دادوەر بێ.

<u>**مەسەلەی نۆیەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾، ئەگەر ئێوە بڕواتان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی پێشێ، واتە: ئەگەر ئیمانتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەی خەڵکینە! سپاردەی حوکمڕانییو بەرپرسیارێتیی تەسلیمی کەسانی شایستە بکەن، وە ئەی حوکمڕانەکان! بە دادگەریی حوکمڕانیی بکەن، وە ئەی ئیماندارینە! فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، وە کاربەدەستانی خۆتان بکەن، وە ئەگەر کەوتنە کێشەوە بیگێڕنەوە بۆ لای قورئانو سوننەت، دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ هەمووی، هەندێکیش دەڵێن: تەنیا مەبەست پێی ئەوەیە، کە ئەگەر کەوتنە کێشەوە، بیگێڕنەوە بۆ لای قورئانو سوننەت، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژیی دوایی هەیە، بەڵام وا ڕاستترە کە بگێڕدرێتەوە بۆ هەموو ئەوانی پێشێ، چونکە هەر کەسێك ئەهلی ئیمان بێ، دەبێ بەو شێوەیە کە خوای پەروەردگار ئامۆژگاریی کردوەو ناویشی لێناوە باشترین ئامۆژگاریی، ڕەفتار بکات، وە ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە

هەر کاتێك کۆمەڵگای مسوڵمان وانەبوو، نیشانەی پرسیار دەکەوێتە سەر ئیمانەکەیانو مسوڵمانەتییەکەیان، ئەگەر هەوڵیان نەدا کەسانێك بکەنە حوکمڕانو بەرپرسی خۆیان، کە کەسانێکی شایستەو ئەهلن، وە ئەگەر حوکمڕانەکان بە دادگەریی حوکمڕانییان نەکرد، وە ئەگەر خەڵك پابەند نەبوو بە قورئانو بە سوننەتو بە فەرمانی کاربەدەستانی خۆیانەوە، کە لە خۆیانن مادام پابەندبن بە قورئانو سوننەتەوە، وە ئەگەر کێشەکانیان نەگێڕایەوە بۆ لای قورئانو سوننەت، مانای وایە ناگونجێ بڵێن: ئێمە بڕوامان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام دیارە لێرە دەبێ وریابین (أولي الأمر)، واتە: خاوەنانی فەرمان، تەنیا کاتێك بە خاوەنانی فەرمان دادەنرێن کە:

یەکەم: کە لەسەر بناغەی شەریعەت ئەو ئەرکەیان پێسپێردرابێو، ئەو بەرپرسیارێتییەیان پێ سپێردرابێ، شەریعەت چی دەفەرموێ؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ... ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى، واتە: کاروباری ئیمانداران بە ڕاوێژە، وە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ ...وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ... ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: لە کاروبارياندا ڕاوێژیان پێبکە، کەواتە: کاتێك (أولي الأمر) خاوەنانی فەرمانو حوکمڕانانو کاربەدەستان، دەسەڵاتەکەیان بە شەرعیی دادەنرێ، کە لەسەر بناغەیەکی شەرعیی پێیان سپێردرابێ، نەك بە میراتیی پێیان گەیشتبێ، یاخود بە زۆر خۆیان سەپاندبێ.

دووەم: دەبێ تەنیا لە سنووری شتی پەسەندو چاكو، لە سنووری شەریعەتدا فەرمانبەریی یان بۆ بکرێ، چونکە وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ»، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٢)، والْبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٢٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٤٠)، واتە: بێگومان فەرمانبەریی کردن فەرمانبەریی بۆ کران، تەنیا لە شتی پەسندو باشدایە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ، فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٤٦٦٨)، والْبُخَارِيُّ بـرقم: (٧١٤٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤٧٤٠) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، واتە: ئینسانی مسوڵمان بیستن‌و بە قسەکردنی لەسەرە، یاخود گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی لەسەرە، لە شتێکدا کە حەزی پێ دەکات‌و، لە شتێکیشدا کە حەزی پێ ناکات، مەگەر فەرمانی پێبکرێ بە سەرپێچیی، (سەرپێچیی لە شەریعەت) ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچیی، نە گوێ دەگرێ‌و نە بەقسەش دەکات، نە گوێڕایەڵ دەبێ‌و نە فەرمانبەریش دەبێ.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾، ئەوە باشترە وە سەرەنجامیشی چاکترە، ﴿تَأْوِيلًا﴾، یانی چی؟ پێشتر باسمان کرد، واتە: بە تەئکید پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە، بە شەریعەتەوە، بۆ دنیا باشترەو، سەرەنجامیشی بۆ قیامەت چاکترە.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، زانایانی (أصول الفقه) گوتوویانە: چاوگەکانی یاسادانان (مصادر التشريع) کە هەموو زانایان، یاخود زۆربەی هەرە زۆریان لەسەریان یەك دەنگن چوارن، (قورئان، سوننەت، ئیجماع، قیاس) گوتوویانە ئەم چوارە هەر چواریان لەم ئایەتە موبارەکە وەردەگیرێن، بەم شێوەیە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ﴾، واتە: فەرمانبەریی قورئان، ﴿وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، واتە: فەرمانبەریی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، واتە: یەك دەنگیی زانایان (إجماع)، چونکە کاربەدەستان دەبێ زانابن، یانی: دەبێ شارەزابن لەو کارەی کە پێیان سپێردراوە، ئنجا ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ

﴿فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، ئەگەر کەوتنە ناکۆکیی لە شتێکدا، بیگێڕنەوە بۆ لای کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەش قیاسە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾، سەرنجی ئەوانە نادەی! کە پێیان وایە ئیمانیان هێناوە بەوە کە بۆ تۆ دابەزێنراوەو بەوەش کە بۆ پێش تۆ دابەزێنراوە، واتە: ئیمانیان هێناوە بە قورئان کە بۆ تۆ دابەزێنراوە، وە ئیمانیان هەیە بە کتێبەکانی پێش تۆش کە بۆ پێغەمبەرەکانی دیکە دابەزێنراون، کەچی دەیانەوێ داوەریی خۆیان بەرنە لای طاغووت، دەفەرموێ: سەرنجیان نادەی! لێرەدا وشەی (زعم) کە دەفەرموێ: ﴿يَزۡعُمُونَ﴾، (زعم) یانی چی لە زمانی عەرەبیدا؟ (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الزَّعْمُ حِكَايَةُ قَوْلٍ يَكُونُ مَظِنَّةً لِلْكَذِبِ)، واتە: (زعم) بریتیە لە گێڕانەوەی قسەی کەسێك کە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێ درۆ بکات، یاخود لەبەرئەوە کە بڕوای پێ نیە، لێرە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿يَزۡعُمُونَ﴾، واتە: پێیان وایە، واتە: ئیمانیان نیە بەوە کە بۆ تۆ دابەزێنراوە، وە بەوەی پێش تۆ دابەزێنراوە، بەڵام بۆخۆیان لاف لێدەدەن، کەواتە: لێرەدا خوای پەروەردگار نەفی ئیمان دەکات لە کەسانێك کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانو یەکلاییکردنەوەی گرفتو مشتومڕەکانیان، پەنا دەبەنەبەر کێ؟ بەر طاغووت.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** ئنجا با بزانین داخۆ طاغووت کێیە؟ کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾، نەك لەبەرئەوەی کە حوکمڕانییو دادوەرییەکەی خۆیان بردۆتە لای طاغووت، بەڵکو بەس لەبەرئەوەی کە ویستوویانە بیبەنو تەنیا ئیرادەیان هەبووە، جارێ بە کردەوەش نەیانکردوە.

ئنجا ئایا طاغووت چییە؟ وە کێ طاغووتە؟ (طَبَري) دەڵێ: (الطَّاغوتُ:

كُلُّ مَعْبُودٍ سوى اللّه)، واتە: هەموو پەرستراوێك غەیری خوا طاغووتە، پەرستنیش وەك باسمان كرد، ئەوپەڕی مل بۆ كەچكردنو، ئەوپەڕی بە گەورە گرتنو، ئەوپەڕی خۆشویستنو، ئەوپەڕی لێ ترسان، هەركامێك لەوانە بۆ غەیری خوا بێ، ئەوە ئەو غەیرە پەرستراوە، واتە: ئەگەر ئەوپەڕی خۆشویستنت بۆ غەیری خوا بوو، یاخود ئەوپەڕی لێترسانت بەرانبەری هەبوو، یان ئەوپەڕی شەرم كردنو سام كردنت بەرانبەری هەبوو، یان ئەوپەڕی ملكەچییت بۆی هەبوو، یان ئەوپەڕی بە گەورە گرتنت بۆی هەبوو، هەركامێك لەوانە جیاجیا ئەوە بە پەرستن دادەنرێ، وە دەبێ هەموویانت بۆ خوا بێ، ئەوجار بەڕاستی خوات پەرستوە.

(طَبَرِي) لە تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا كە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّـٰغُوتِ﴾، دەڵێ: (يَعنِي إِلى مَنْ يُعَظِّمُونَهُ وَيَصدُرُونَ عَنْ قَولِهِ وَيرْضَونَ بِحُكْمِهِ مِنْ دُونِ حُكْمِ اللَّهِ)[1]، واتە: دەیانەوێ دادوەریی خۆیان، چارەسەری كێشەی خۆیان، بەرن بۆ لای كەسێك كە بە گەورەی دەزانن، وە ئەو چ بڵێ وا دەكەن، فەرمانی جێبەجێ دەكەن، وە ڕازین بە حوكمەكەی لە جیاتی حوكمی خوا، كەواتە: هەر كەسێك وا مامەڵەی لەگەڵدا كرا، طاغووتە.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: طاغووت لە (طَغَى)وە هاتوە، (طَغَى يَطْغَى طُغيَانًا)وە دەڵێ: (الطُّغيَانُ: تَجَاوُزُ الْحَدِّ فِي العِصْيانِ، والطَّاغُوتُ عِبَارَةٌ عَنْ كُل مُتَعَبَّد وَكُلُ مَعْبُودٍ مِنْ دُونِ اللَّه)، (طُغيَان): بریتیە لە سنوور شكێنیی و تێپەڕاندن لە سەرپێچییكردنی خوادا، وە (طاغوت) بریتیە لە هەر كەسێك كە بەندایەتیی بۆ بكرێ، وە هەر پەرستراوێك جگە لە خوا.

بەڵام ئەوەی من بۆم دەركەوتوە ئەوەیە كە وشەی طاغووت، واتە: ئەو كەسانەی كە خۆیان لە خەڵك دەكەنە پەرستراوو پەروەردگار، خۆیان لە خەڵك دەكەنە هەمەكارە، كە خەڵك بەبێ قەیدو شەرت بۆیان ملكەچ بێ،

---

١) جامع البيان، ج: (٥)، ص: (١٨٠).

بـێئەوەی فەرمانەکانیانو نەهییەکانیـان بچنەوە سەر شــەریعەت، واتە: حوکمی دیکتـاتۆریی، بەڵـگەم چییە لەسـەر ئـەوە؟ لێرەدا مـن دەمـەوێ بڵێم طـاغـووت بریتی نیە لە هەر پەرستراوێك غەیری خوا، چونکە خەڵك مـانگ دەپەرســتێ، خۆر دەپەرسـتێ، مانگو خۆر طـاغووت نین، وە نەصـرانیی یەکان عیسا ﷺ دەپەرستنو عیساش ﷺ طاغووت نیە، خەڵك هەیە دارو بـەرد دەپەرســتێ، وە هیندییـەکان گـا دەپەرسـتن، وە بـوذییـەکان هەیکـەل دەپەرسـتن، خەڵـکی دیکـە هەیە مشكو مار دەپەرسـتێ، لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسـیا[1]، ئەوانە طاغـووت نین، من پـێم وایـە طاغـووت واتـە: ئـەو سـەرکردەیەی کـە بەڕێـی ناشـەرعییدا پـێش خـەڵك دەکـەوێ، وە ئیـرادەی خـۆی بەسـەر خەڵـکدا فـەرز دەکات، واتـە: حوکمی دیکتاتۆریی، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە ئەگەر تەماشای وشــەی طـاغووت بکەین لە ئایەتەکـاندا هـاتوە - کە بۆ تێگەیشتنی ئایەتەکانی قورئان جاری دیکەش گوتوومانە دەبـێ هەمیشـە بگەڕێینــەوە بـۆ ئایەتەکـانی قورئـان، قورئان هەندێکی تەفسیـر دەکات – بە ڕوونی دەبینیـن کـە طاغـووت ناگونجـێ هـەر پەرسـتـراوێك بێ، با بزانیـن چـۆن؟!

١/ خـوا ﷻ لـە ئایـەتی (٢٥٦)ی سـووڕەتی (البقـرة)دا دەفـەرموێ: ﴿... فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ... ﴿٢٥٦﴾﴾، واتـە: هەر کەسـێك کوفر بە طـاغووت بکـاو، ئیمـان بـە خـوا بێنـێ، دەسـتی بـە قوڵـفەیەکی مەحکــەمەوە گرتـوە، هەرگیــز پـچـڕانی بـۆ نیە، کەواتە: طـاغووت لە بەرانبــەری خوادا قــەراری گرتــوەو دەبـێ کوفــری پــێ بکـرێ.

٢/ ئنجا لـە ئایــەتی (٢٥٧)ی سـووڕەتی (البقـرة) خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا

---

١) وەك (کەمبۆدیا) و (مالیزیـا) کە لە سالّی (٢٠١١)دا بە سـەفەرێك چـووم‌و ئەو دیـاردانەم بینـین.

﴿أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ ...﴿٢٥٧﴾﴾، واتە: خوا دۆستو پشتیوانی ئیماندارانە، لە تاریکاییان دەربازیان دەکات بەرەو ڕۆشنایی، وە ئەوانەی بێبڕوان، دۆستو پشتیوانیان طاغووتەکانن، لە ڕووناکیی دەریاندێنن بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن، چونکە وشەی طاغووت بۆ تاکیش بەکاردێ، بۆ دووانیش بەکاردێ، بۆ کۆش بەکاردێ، کەواتە: بەپێی ئەم ڕستە قورئانییە، طاغووتەکان ئیرادەیان هەیەو هەر کەس لەگەڵیان بێ، لە ڕووناکیی دەریاندێننو بەرەو تاریکایی دەیانبەن.

٣/ وە لە سووڕەتی (النساء)دا، پێشتر باسمان کرد، کە خوای پەروەردگار دەربارەی جوولەکەکان فەرمووی: ﴿...يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ ..﴿٥١﴾﴾ جوولەکەکان ئیمان دێنن بە (جبت)و بە (طاغوت)، (جبت)، واتە: بتو صەنەم، کەواتە: طاغووت بتو صەنەم نییە، طاغووت وەك گوتمان، واتە: سەرکردەیەکە کە بەڕێی ناشەرعییدا دەیەوێ حوکمڕانیی بکا.

٤/ وە لە سووڕەتی (النحل) ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ...﴿٣٦﴾﴾، واتە: لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانەکراوێکمان ناردوە، فەرمانیان پێکردوون، کە بەندایەتییی بۆ خوا بکەن، وە خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، کێن ئەوانەی ڕێی بەندایەتی بۆ خوا، لە خەڵك دەگرن؟ دیارە طاغووتەکانو سەرکردەکانن، ئەگەرنا بتو صەنەم ڕێ ناگرێ، ئیرادەی نیە ڕێ بگرێ، بەڵام طاغووتو دیکتاتۆرەکان ئەوانەن کە ڕێگە دەگرن، دەیانەوێ خەڵك کۆیلەو خزمەتکاری ئەوان بێ، بۆچی طاغووتو دیکتاتۆرەکان زۆر بە دین قەڵسن؟ بۆ بە فیکرەی یەکتاپەرستییو خوا بە یەکگرتن قەڵسن؟ چونکە ئەگەر خەڵك خوای نەناسیو خوای نەپەرست، زەمینەیان بۆ خۆش دەبێو دەڵێن: کەواتە: مادام خوا نەبوو،

وەرن ئێمە بپەرستن، وەرن ببنە كۆیلەو خزمەتكاری ئێمە، بەلاّم ئەگەر خەلّك خوا بناسێ، خواناسینو خواپەرستییو خوا بە یەكگرتنەكەی عیززەتی بۆ پەیدا دەكاتو وای لێدەكات دەڵێ: تۆ چی؟ تۆش بەشەرێكی وەك من، وە ئەگەر بەشەریش نەبێ، شتەكانی دیكە لە خۆشی بە كەمتر دادەنێ، بە بەشەرەكەش دەڵێ: تۆش وەك منیو هیچت لە من زیاتر نیە، بۆ بتپەرستم؟ تەمەشا بكەن! جادووگەرەكانی كە فیرعەون هێنانی بۆ دژایەتییكردنی مووسا ﷺ، پێش ئەوەی خوا بناسنو پێش ئەوەی ئیمان بە خوا بێنن، چییان گوت؟ ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ ﴾الشعراء، واتە: كاتێك جادووگەرەكان هاتنە لای فیرعەون گوتیان: ئایا كرێمان دەدەیە (خەلاّتمان دەكەی)، ئەگەر ئێمە زاڵبووین؟! ﴿ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾الشعراء، گوتی: بەڵێ، وە زۆریش لە خۆمتان نزیك دەخەمەوەو دەتانكەمە موقەڕڕەبی خۆم، بەلاّم تۆزێك دوای ئەوەی ئیمانیان هێنا، نەك هەر چاوەڕێی خەلاّتو بەراتی فیرعەون نەبوون، نەك چاوەڕێی كرێو پاداشتی نەبوون، بەڵكو گوتیان: ﴿ ... فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ... ﴿٧٢﴾ ﴾طه، واتە: هەرچی لەدەستت دێ بیكە، دوای ئەوەی فیرعەون هەڕەشەی لێكردنو گوتی: ﴿ ... لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الشعراء، واتە: دەستی ڕاستو پێی چەپتان دەبڕم، وە هەڵیشتان دەواسم هەتا دەمرن بە دەستو پێ بڕاویی، ئەوانیش گوتیان: ﴿ ... فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ... ﴿٧٢﴾ ﴾، هەرچی لەدەستت دێ بیكە، واتە: ئیمان بە عیززەتی كردن، بێ ئیمانیی وای لێكردبوون ماستاویان دەكرد بۆ فیرعەونو چاوەڕێی خەلاّتو بەرات بوون، بەلاّم ئیمان وای لێكردن لە دنیاو ئەوەی لە دنیادا هەیە بێ منەت بوونو، لە هەڕەشەی مەرگ بێ منەت بوون.

٥/ وە لە سوورەتی (الزمر)، ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾﴾، واتــە: ئەوانــەی خۆیان دوور گرتوە لە طاغووت کە بەندایەتیی بۆ بکەن، وە گەڕاونەوە بۆ لای خـوا، ئەوانە موژدەی خۆشیان بۆ هەیە.

کەواتە: لەم ئایەتانەوە دەردەکەوێ، کە طاغووت خاوەنی ئیرادەیە، وە خەڵك لە ڕووناکیی تەوحیدو فیطرەتی خواناسیی دەردێنێ، بەرەو تاریکایی گومڕایی‌و سەرگەردانیی‌و کۆیلایەتیی‌و خزمەتکاریی خۆی دەیانبا.

ئنجا لێرە خوا دەفەرموێ: ﴿...يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ ...﴾، دەیانەوێ دادوەریی خۆیان بەرنە لای طاغووت، کە فەرمانیشیان پێکراوە کوفر بە طاغووت بکەن، لە کوێ فەرمانیان پێکراوە؟ لە ئایەتی (٢٥٦) سوورەتی (البقرة)دا، کە دەفەرموێ: ﴿... فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ... ﴿٢٥٦﴾﴾، ئەوەی کوفر بە طاغووت بکاو ئیمان بە خوا بێنێ، ئەوە دەستی بە قوڵفەیەکی مەحکەمەوە گرتوە، کەچی ئەوانە لە جیاتی ئەوەی کوفر بە طاغووت بکەن، واتە کوفر بە هەر کەسێك بکەن کە غەیری شەریعەتیان پێشان دەدا، وە کێشەکانیان بە غەیری تەرازووی شەریعەت چارەسەر دەکات، لەجیاتی کوفری پێ بکەن، دەیانەوێ بیکەنە دادوەریی خۆیان‌و ئیمانی پێ دێنن، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوانە بەشیان بە ئیمان‌و خواپەرستییەوە نییە.

**مەسەلەی چواردەیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾، وە ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆئەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ،

تۆ مونافیقەکان دەبینی، لە تۆ لادەدەن، وە خەڵکیشت لێ دوور دەخەنەوە، ئەمە زۆر ڕۆشن و ڕاشکاوە، کە خوای دادگەر مۆری نیفاقی بە نێوچەوانی ئەو کەسانەوە ناوە، کە خۆ بە مسوڵمان پێشان دەدەن، کەچی بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەو مشتومڕەکانیان دەچنە لای طاغووت، واتە: دەچنە لای کەسێك کە بە شەریعەت حوکم ناکات، ئیدی هەر کەسێك هەیە، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾، وە شەیتانیش دەیەوێ زۆر بە گومڕاییەکی دوور گومڕایان بکات، کەواتە: کەسێك حوکم بە شەریعەت نەکات، وە بۆ چارەسەری کێشەو مشتومڕەکانی نەگەڕێتەوە بۆ شەریعەت و بچێ بۆ لای هەر کەسێك ئەوە طاغووتە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشیدا باسمان کرد، کە لەنێو عەرەبەکاندا کاهین و فاڵچیی هەبوون، خەڵك کێشەیان دەبوو دەچوونە لای کاهین، وە یەکێك لەوانە (ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی) بوو کە ئایەتەکە هەندێك دەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەوە بووە کە مسوڵمانێك لەگەڵ جوولەکەیەك کێشەیان بوو، جوولەکەکە گوتی: با بچین بۆ لای پێغەمبەری خۆتان، چونکە دەیزانی بەرتیل وەرناگرێ، مسوڵمانەکەش گوتی: نەخێر ناچین بۆ ئەوێ، دوایی ڕێککەوتن بچن بۆ لای (ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی) کە کاهین و فاڵچییەك بوو، ئیدی خوای بەرز ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: تەماشای ئەوانە ناکەی کە پێیانوایە، ئیمانیان بە خواو بەوە هەیە کە بۆ تۆ هاتووەو ئەوەی کە لەپێش تۆدا هاتوە، کەچی دەیانەوێ بچن بۆ لای طاغووت، واتە: نەشچوو بوون هەر بە ئیرادەی چوونەکەو بە نیەتەکەیان، خوای دادگەر ئیمانەکەی زەربی سفر کردن، کە فەرموویەتی ئیمانیان نیە، بەڵکو پێیانوایە ئیمانیان هەیە، وە دوایی مۆری نیفاقیشی بە نێوچەوانەوە ناون.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾، چی دەکەن ئەگەر بەڵایەکیان تووش بوو بەهۆی کردەی

دەستی خۆیانەوە؟ ئەمە دوو واتای هەن:

**واتای یەكەم**: وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوەیە كە لە ئەنجامی ئەوەدا ئەوانە ناسنامەی خۆیان دەردەخەنو جەوهەری خۆیان دەردەخەن، كە بۆ یەكلاییكردنەوەی كێشەكانیانو بۆ چارەسەری مشتومڕەكانیان، ناچنە لای پێغەمبەر ﷺ و ناگەڕێنەوە بۆ شەریعەت، بەڵكو دەچن بۆ لای بەدیلێكی دیكە، ئەلتەرناتیڤێك پەیدادەكەن بۆخۆیان كە طاغووتە، لە حاڵێكی وادا دیارە مسوڵمانان لێیان دەكەونە گومان، وە متمانەیان پێناكەنو نیشانەی پرسیاریان دەخەنە سەرێ، وە دووریان دەخەنەوە لە خۆیان، كە ئەوەش بەڵاو گرفتاریی یە بۆیان، وەك لە چەند ئایەتێك لە قورئاندا ئاماژە بەوە كراوە، بۆ وێنە: خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾ ﴾الأحزاب، واتە: ئەگەر مونافیقەكانو ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە (واتە: نەبوونە مونافیق بە تەواویی، بەڵام دڵیان نەخۆشیی تێدایەو بەرەو نیفاقیان دەبات، ئەگەر خۆیان چارەسەر نەكەن)، وە ئەوانەی كە قیلو قالو بانگەشەی خراپە بڵاودەكەنەوە لەنێو شاردا، ئەگەر ئەوانە واز نەهێنن تۆیان لێ هاندەدەین، وە دوایی لە نزیك تۆوە نابن، وە ئەوانە نەفرین لێكراو دەبن، وە لە هەر شوێنێك بەرپەل بكەون، پێویستە سزا بدرێنو بكوژرێن (دوای ئەوەی كە كوفرەكەیان ئاشكرا دەكەنو لە مسوڵمانان دەچنە سەنگەرەوە)[1].

---

١) چونكە كردەوەو سوننەتی **پێغەمبەری خوا** ﷺ - كە ڕوونكەرەوەو بەرجەستەكەری قورئانە – وابووە.

هەروەها لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (٨٣)دا لەبارەی هەندێك لەو جۆرە کەسانەوە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ...﴿٨٣﴾ ﴾ واتە: ئەگەر خوا تۆی گێڕایەوە بۆ لای کۆمەڵێك لەوان و مۆڵەتیان لێ وەرگرتی کە لەگەڵت بێن بۆ جەنگ (چونکە بۆ جەنگی تەبووك نەچوو بوون) بڵێ: هەرگیز نابێت لەگەڵم بێن، وە هەرگیز نابێ لەگەڵ مندا جارێکی دیکە ئێوە جەنگ لە دژی هیچ دوژمنێك بکەن، وە متمانەتان پێ ناکەین، کەواتە: دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە لە ئەنجامی ئەوەدا بەو هەڵوێستە سیاسییەیان ماهیەتی خۆیان دەردەخەن، دەسەڵاتی ئیسلامیی بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بەڵێ سزایان نادا، بەڵام نیشانەی پرسیاریان لەسەر دادەنێ، وە حەزەری خۆی لەوانە وەردەگریٌ و وریا دەبێ.

**واتای دووەم:** وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە وەك توێژەرەوان دەڵێن: خوای پەروەردگار موژدەی داوە بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەوانە سەرەنجام بەڵای وایان تووش دێ، کە دوایی ناچار دەبن بێنەوە لای تۆ داوای لێبوردنت لێ بکەن، وە هەمیشە ئەوانەی کە لەسەر دوو پەت یاریی دەکەن، مونافیق و دەغەڵ و دووڕووەکان، سەرەنجام ئاشکرا دەبن، وە دوایی خەڵك لێیان تێدەگات، وە ناچار دەبن داوای لێبوردن بکەن، وە ناچار دەبن پاساوی هەڵوێستەکانی خۆیان بدەنەوە، یاخود سوێندی بە درۆ بخۆن.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ...ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَـٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ ﴾، دەفەرموێ: دوایی دێن بۆ لای تۆ سوێند بە خوا دەخۆن دەڵێن: هەر مەبەستمان پێی بەرژەوەندیی و چاکەکاریی و مەبەستمان پێ ڕێککەوتن و ڕێکخستن بوو، جا بۆ هەموو مونافیقەکان هەر واناڵێن! ئەوانەی ئێستاش کە بانگەشە دەکەن بۆ عەلمانییەت و لیبڕالیزم و بانگەشە

دەكەن بۆ هەموو ئەو شتە (ئیزمدارانەی) كە لەگەڵ قورئانو سوننەت دا تێك دەگیرێن، دەڵێن: چی؟ خۆ ئەوانیش ناڵێن ئێمە دوژمنی ئەو خەڵكەین، بەڵكو دەڵێن: ئێمەش هەر مەبەستمان ئەوەیە كۆمەڵگا بەرەو پێشەوە بەرینو، گەشەی پێ بدەین چاكی بكەینو ... هتد، كاتی خۆیشی مونافیقەكان هەر وایاندەگوت ﴿...إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَـٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴾، دەمانەوێ چاكەكاریی بكەینو، دەمانەوێ وەزعەكەی رێك بخەینو، كێشەكان چارەسەر بكەین، وڵاتەكەمان باش بكەین!

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** بەڵام خوا ﷻ تەوجیهێك دەداتە پێغەمبەر ﷺ، وە كۆمەڵگای مسوڵمان، كە چۆن لەگەڵ ئەواندا مامەڵە بكەن؟ دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ ﴾، ئەوانە كەسانێكن خوا دەزانێ چییان لە دڵ دایە، هەر خوا دەزانێ واتە: ئەوەی بەزار دەیڵێن بە دڵو كردەوە وانینو، ئەوانە ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێرانن، ئەوانە وەستای قسانو كۆڵەواری دەستانن، ئەوانە دوور كوژی نزیك خەسارن، بە قسە هیچیان تێدا نەهێشتۆتەوە، بەڵام بە كردەوە وانین، بەس خوا دەزانێ چییان لە دڵدا هەیە ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴾، سێ شت بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بۆ چۆنیەتی مامەڵە كردن لەگەڵ ئەواندا كە دیارە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێو لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئێمەش دەفەرموێ:

١/ ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ ﴾، واتە: وازیان لێ بێنە، واتە: مەچۆ زۆر لێیان بكۆڵیەوەو دەی ئەوە چۆن بوو؟ دادگای بۆ دابنێی، لێیانگەڕێ، مادام شتەكە یەكجاریی كەشف نەبووە، مادام خۆی هەر بە مسوڵمان پێشان دەدات، مونافیق كێیە؟ ئەوەیە كە لە ئەسڵدا كافرە، بەڵام خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدا، تۆش هەر بە ڕواڵەتی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا

بکـەو وازیـان لـێبێنەو لێیانگەڕێ، بـا هـەر بـەو عـەیبو عـارو کەموکوڕییانەی خۆیان زیاتر خۆیان کەشف بکەن.

٢/ ﴿ وَعِظۡهُمۡ ﴾، ئامۆژگارییشیان بکە (وَعْظ) بریتیە لە قسەی باش لەگەڵ جووڵاندنی هەستدا، لەگەڵ جووڵاندنی دڵو دەروونو عاطیفەدا.

٣/﴿ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴾، وە قسەیەکیان پێ بڵێ کە کاریگەریی هەبێ لەسەر دڵو دەروونیان، واتە: باش ئامۆژگارییان بکە، وە قسەیەکی کاریگەریان پێ بڵێ، بەڵکو دەست هەڵبگرن، واتە: سزایان مەدە، بەڵام بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ...﴿٦٤﴾ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە مەگەر کە بە فەرمانی خـواو بـە مۆڵـەتی خـوا فەرمانبـەریی بـۆ بکـرێ، توێـژەرەوانی قورئـان گوتوویانە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەڵەو گوناح پارێزراو (مەعصوم)ن، بۆچی؟ خوا دەفەرموێ: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر دەبێ فەرمانبەریی بۆ بکرێ بە فەرمانی خوا، خوای پەروەردگار وەختێك بە خەڵك دەفەرموێ: فەرمانبەریی بۆ ئەو پێغەمبەرە بکەنو بە قسەی بکەن، وە هەڵاوردنیشی تێناخات، هیدیکە هەڵاوردنی تێدایەو دەبێ پابەندبێ بە شەریعەتەوە، دەبێ لە شتی پەسند دابێ، بەڵام بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خوای بەرز بە ڕەهایی فەرموویەتی: ﴿ ...أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ...﴿٥٩﴾ ﴾، ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم ...﴿٦٩﴾ ﴾النساء، بە موتڵەقیی فەرموویەتی، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ هیچ هەڵەیەك ناکاتو هیچ گوناهێك ناکات، هەڵە ناکات بەو واتایە نا کە لە هیچ شتێکدا بە هەڵەدا نەچێ، هیچ

شتێکی له بیر ناچێ، پێغەمبەر ﷺ جاری وابووە شتی لەبیر چووە، جاری وایە ئیجتیهادی کردووەو لە ئیجتیهادەکەیدا نەیپێکاوە، بەڵام دوایی خوای زاناو شارەزا بۆی ڕاست کردۆتەوە، بەڵام هیچ پێغەمبەرێك گوناح ناکات، واتە شتێك ناکات کە بزانێ گوناهەو بیکات، بەڵام جاری وابووە پێغەمبەر ﷺ شتێکی هاتۆتە پێش، خوا وەحی بۆ نەناردوە، ئەویش بە عەقڵی خۆی گوتوویەتی وابکەم باشە، کردوویەتیو دوایی دەرکەوتوە کە خوای کاربەجێ پێی ڕازی نیە، بۆ وێنە:

١- کاتێك کە فیدیەی لە دیلەکانی جەنگی بەدر وەرگرت، خوای کاربەجێ ڕەخنەی لێگرت، وەك فەرموویەتی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾الأنفال.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی مەکتووم هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئامۆژگاریم بکە، پێغەمبەری خوا ڕووی لێ وەرچەرخاند، چونکە لەوکاتەدا لەگەڵ زلە زلەکانی قوڕەیشدا خەریك بوو قسەی بۆ دەکردن، خوای پەروەردگاریش ڕەخنەی لێگرتو فەرمووی: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ ﴾عبس، واتە: ڕووی خۆی گرژ کردو ڕووی وەرسووڕاند لە کاتێکدا کە کوێرەکە هاتە لای، واتە: خوا فەرمووی: ڕاست وابوو لەگەڵ کوێرەکەدا قسە بکەی ئەوانی دیکە ئیهمال بکەی، مادام ئەو ئیماندارەو هاتوە بۆ لات.

٣- هەروەها لەبارەی ئەوانەوە کە داوای مۆڵەتیان کرد نەچن بۆ جەنگی تەبووك، خوا فەرمووی: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ...﴿٤٣﴾ ﴾التوبة، واتە: خوا عەفووت بکات بۆچی مۆڵەتت پێدان، دیارە ڕەخنەی لێ دەگرێ،

بەڵام ئەوانە هیچی ئەوە نەبووە بۆ پێغەمبەر ﷺ دیاربێ کە گوناهەو بیکات، واتە: پێغەمبەران لە گوناح پارێزراون، بەڵام لەوەدا کە ئیجتیهاد بکەنو نەیپێکن، ئەوە گوناح نیە، لەبەرئەوە لەوە پارێزراو نین، هەڵبەتە خوای پەروەردگاریش دوایی هەر پێغەمبەرێکیش ئیجتیهادێکی کردبێو نەیپێکابێ، هەڵەکەی بۆ ڕاست کردۆتەوە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿... وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾، تەماشا بکەن ! خوای ئێمە چەند میهرەبانە ﷻ، چەند بەخشندەیە، چەند لێبوردەیە! ئەوانە ئاوان: دەغەڵ، مونافیق، موخەننەت، دڵ ڕەش، وە دەشیانەوێ بە حیسابی خۆیان، وەك خوا دەفەرموێ، خواو پێغەمبەرو ئیمانداران هەڵخەڵەتێنن: ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾البقرة، واتە: دەیانەوێ فێڵ لە هەموو لایەك بکەن، کەچی خوای لێبوردە، وێڕای ئەو هەڵوێستە خراپەیانو ئەو دڵ ڕەشییەیان، دەرگای تۆبەو پەشیمانییان بۆ دەکاتەوە، خوا چەند لێبوردەیە! دەفەرموێ: وە ئەوانە ئەگەر وەختێ ستەمیان لە خۆیان دەکرد، واتە: کە بە مونافیقیی و دەغەڵیی، پەنا دەبەنە بەر طاغووتو زوڵم لە خۆیان دەکەن، دەنا هیچ زەرەرێك بە خوا ناگات، زەرەر بە پێغەمبەریش ﷺ ناگات، وە زەرەر بە ئیمانداراني عاقڵو واقیع بینو دووربینیش ناگات، ئەوانیش لە فێڵەکانیان تێدەگەن، زەرەر لە خۆیان دەدەن، کاتێ کە ستەمیان لە خۆیان دەکرد، ئەگەر هاتبانە لای تۆو داوای لێبوردنیان لە خوا کردبایە، وە پێغەمبەر داوای لێبوردنی بۆ کردبانایە ﴿... لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾، دەیانبینی خوا زۆر تۆبە وەرگرە، وە زۆریش بە بەزەیيو میهرەبانە، ئەم ئایەتە دەرگا کردنەوەی تۆبەو گەڕانەوەیە، ئێمە ئەگەر تەماشای

ئایەتەكانی قورئان بكەین، دەبینین خوا ﷻ لە چەندان ئایەتدا دەرگای تۆبەی بۆ گوناهباران كردۆتەوە، بۆ وێنە:

١) ئەوانەی بوختان دەكەن بۆ ئافرەتانی پاك، وە بۆ پیاوانی پاك، بوختانی داوێن پیسییان بۆ دەكەن، خوا باسی ئەوەی كردوە كە ئەگەر بگەڕێنەوە، خوا لێیان خۆش دەبێ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾ ﴾ النور، واتە: ئەوانەی بوختان دەكەن بۆ ئافرەتانی پاك، دوایی چوار شایەد ناهێنن، یەكی هەشتا قامچییان لێ بدەن، وە هەرگیز شایەدییشیان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە لە ڕێ دەرچوون، مەگەر ئەوانەی كە دەگەڕێنەوەو دوایی چاكسازیی دەكەن، ئەوە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٢) هەروەها دەربارەی دزیی، بە هەمان شێوە لە ئایەتی (٣٨، ٣٩)ی سوورەتی (المائدة) دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: بەڵام كەسێك كە دوای ئەو زوڵمە گەڕایەوەو چاكەی كرد، ئەوە خوا لێی خۆش دەبێ، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٣) هەروەها دەربارەی ئەوانەی ڕێگریی دەكەن، هەر لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٣٣، ٣٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ ....﴿٣٣﴾ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن

﴿ قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾المائدة، واتە: جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوە، پێش ئەوەی ئێوە دەسەڵاتتان بەسەریاندا ببێت، بزانن کە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

٤) هەروەها ئەوانەی کە نێربازیی دەکەن، لە سووڕەتی (النساء) لە ئایەتی (١٦)دا دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَـٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا ۖ فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا۟ عَنْهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی کە ئەو فاحیشەیە دەکەن لە ئێوە (پیاوەکان) سزایان بدەنو ئازاریان بدەن، جا ئەگەر گەڕانەوەو چاکسازیی یان کرد، وازیان لێ بێنن، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەیی یە.

٥) هەروەها تەنانەت دەربارەی مونافیقەکانیش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ...﴿١٤٥﴾ ﴾النساء، دوایی دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ ﴾النساء، واتە: مونافیقەکان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان، مەگەر ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە، چاکسازیی دەکەن، دەست بە خواوە دەگرنو دینداریی خۆیان بۆ خوا ساغ دەکەنەوە، ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران دان، وە خوا پاداشتێکی مەزن دەداتەوە بە ئیمانداران.

وە هەروەها، تەماشا دەکەین خوا ﷻ هەمیشە دەرگای گەڕانەوەو تۆبەو پەشیمانیی بۆ بەندەکانی خۆی دەخاتە سەرپشت.

**مەسەلەی بیستەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا

﴿ قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، واتـە: نـەخێر (ڕاسـت ناكـەن كـە ئیمانـدارن) سوێند بە پەروەردگارت ئیمان ناهێنن، تاكو تۆ نەكەنە دادوەر لەوەدا كە تێدا كەوتوونـە كێـشەو مـشتومڕەوە، دوایـی لـە دڵـی خۆیانـدا هەسـت بـە هـیچ سـەغڵەتییەك نەكـەن، بەرانبـەر بـەو بڕیـارەی كـە تـۆ داوتـە، یـا بـە زیـانی خۆشـیان بێ، وە بەتەواویی تەسلیم نەبـن. كەواتـە: سـێ مـەرج هـەن بـۆ بـە ئیماندار لەقەڵەمدرانی ئینسـان:

**یەكـەم:** دەبـێ بـە دادوەریـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕازی بـێ، واتـە: ئـەو شەریعەتەی كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، چونكە خۆ پێغەمبەر ئێستا لـە نێوماندانیـە، بـەڵام شەریعەتەكـەی، قورئـانو سوننەتەكـەی لەنێوماندانو، دەبـێ ئـەوە بیانكـەینە دادوەرو یەكلاییكەرەوە بـۆ كێـشەو مشتومڕەكانمان.

**دووەم:** وە دوایـی دەبـێ بەرانبـەر بـە بڕیارەكـانی شـەریعەت، هەسـت بـە هـیچ سـەغڵەتییەك نەكـەین.

**سێـیەم:** وە دوایـی دەبـێ بـە قەلـبو قالـبەوەو بـە دەروونو بـە ڕواڵـەتیش ملكەچ بیـن، ئەوجار ئێمە بە ئیمـاندار لەقەڵەم دەدرێیـن.

ئنجا كـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴾، ئـەم ئایـەتە موبارەكە لـێی وەردەگیـرێ، كە هەرچی لە ڕێیەكی ڕاست (صـحیح)ەوە لـە پێغـەمبەری خـواوە ﷺ پێمـان گەیـشتبێ لـە بڕیـارو یاساكانی، كە سـوننەت گرتوونیـە نێوخـۆی، هـەمووی دەچێتە بازنـەی ﴿ مِّمَّا قَضَيۡتَ ﴾ەوە، ئـەوەی تـۆ بڕیـارت داوە، كـە ئـەویش چۆنە؟ خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، نـەخێر، ئەوانـە كـە ئیـددیعای ئیمـان دەكـەن،

بەبێ ئەوەی کە ملکەچ بن بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بەو شەریعەتەی کە تۆ هێناوتە بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێن، ﴿حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾، هەتا تۆ نەکەنە دادوەر، لەوەدا کە تێیدا دەکەونە ناکۆکیی، ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ﴾، وە دوایی هەست بە هیچ سەغڵەتییەك نەکەن لە دڵی خۆیاندا بەرانبەر بەو بڕیارەی کە تۆ دەیدەی، کەواتە: هەرچی لە پێغەمبەر ﷺەوە بە ئێمە گەیشتوە لە ڕێیەکی ڕاست (صحیح)ەوە کە سەنەدەکەی ڕاست بێ و دڵنیابین کە هی پێغەمبەرە ﷺ ئەوە هەمووی دەچێتە نێو بازنەی: ﴿مِّمَّا قَضَيْتَ﴾، (ئەوەی کە تۆ بڕیارت داوە)، وە پێویستە هەر کەسێك خۆی بە ئیماندار بزانێ، ملکەچ بێ بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە وا دەڵێم: چونکە هەندێ جار کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئێمە قورئانمان بەسە، وە ئێمە لە قورئان دڵنیاین کە ئەوە هەمووی فەرمایشتی خوایە، بەڵام ئەوەی پێغەمبەر ﷺ جۆراو جۆرە ڕاست (صحیح)ی تێدایەو، باش (حسن)ی تێدایەو، بێهێز (ضعیف)ی تێدایە، وە هەڵبەستراو (موضوع)ی تێدایە بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ، ئێمەش دەڵێین: ئەو جۆرە بڕو بیانووانە هیچ نین، چونکە زانایان ئەوەی کە بە سەنەدێکی ڕاست دەردەکەوێ کە فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، یاخود کردەوەی پێغەمبەرە، یان دان پێداهێنانی ئەوە، هەموویان جوان ساغ کردۆتەوە، چونکە سوننەت بەگشتی سێ جۆرە: یان فەرمایشتەو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، یاخود کردەوەیەکەو ئەو ئەنجامی داوە، یاخود قسەیەکە یان کردەوەیەکە لای ئەو گوتراوە، یان کراوەو ئەویش دانی پێداهێناوە، کە پێی دەگوترێ (تقریر) واتە: سوننەت یان فەرموودە (قول)یە، یان کردەوە (فعل)یە، یان دانپێداهێنان (تقریر)ە، بەڵێ: زانایان سوننەتی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەریان ﷺ لە بێژینگ داوەو جیایان کردۆتەوەو ئەوەی کە هەڵبەستراوو بێهێزە، وەك سەرکۆتەڵ و بنزیل جیایان کردۆتەوە، بۆیە هیچ کەس نابێ ئەوە بکاتە بیانوو، بەڵێ قورئان جیایە، چونکە

فەرمایشتی خوایەو دڵنیاین کە هەمووی فەرمایشتی خوای پەروەردگارە، وە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵێ هەمووی یەك پلە نیە، چونکە قورئان هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، بەلاَم سوننەت کەمێکی موتەواتیرە[١]، ئەوی دیکەی ڕاستە، یاخود باشە، وە تێیدا هەیە کە لە خوار ئەوانەوەیە، بەلاَم بە هەرحاڵ ئەم ئایەتە وە گەلێك ئایەتی دیکە بەڵگەن لەسەر پێویستبوونی پابەندیی بە سوننەتەوە، بۆ وێنە:

١) کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾، فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، فەرمانبەریی خوا بە پابەندیی بە قورئانەوەیە، فەرمانبەریی پێغەمبەریش بە پابەندیی بە سوننەتەوەیە.

٢) لە سوورەتی (الحشر) خوای پەنهانبین دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ...﴿٧﴾ ﴾، واتە: هەرچی پێغەمبەر ﷺ پێیداون لێی وەربگرن، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن قورئانی پێداوین، کۆمەڵێك سوننەتیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئێمە گەیشتوون، کەواتە: دەبێ ئەوانیشی لێوەربگرین، ﴿ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ﴾، وە هەرشتێك کە پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە کردوون، ئێوەش وازی لێبێنن، لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕینەوە: ﴿عَنْ بِلاَلِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنَ عُمَرَ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ إِذَا اسْتَأْذَنَّكُمْ إِلَيْهَا»، فَقَالَ بِلاَلُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: وَاللَّهِ لَنَمْنَعُهُنَّ، فَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ: أَقُولُ قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتَقُولُ وَاللَّهِ لَنَمْنَعُهُنَّ؟!﴾ وفي رِوايَةِ سالِم عَنْ

---

١)(متواتر) ئەوەیە کە ژمارەیەك کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، هەواڵێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بگوازنەوەو وە هەروەها هەتا دەگاتە ئێمە. بڕوانە: (الوجيز في أصول الفقه) للدكتور عبدالكريم زيدان، ص: (١٦٨)، (السنة المتواترة:..... التي رواها جمع كبير تُحيلُ العادَة تواطؤهم على الكذب، أو وقوعه منهم من غير قصد التواطؤ عن جمع مثلهم حتى يصل المنقول الى النَبيِّ عليه الصلاة والسلام...).

أبيهِ قَالَ: ﴿فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ فَسَبَّهُ سَبًّا سَيِّئاً مَا سَمِعْتُهُ سَبَّهُ مِثْلَهُ قَطُّ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٩٩٤)، واتە: بیلالی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر لە بابیەوە دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ، (واتە عومەری کوڕی خەتتاب کوڕێکی هەیە بە ناوی عەبدوڵلا، عەبدوڵلاش کوڕێکی هەیە بە ناوی بیلال)، ئەو بیلالە لە عەبدوڵلای بابیەوە دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتان قەدەغە مەکەن لە مزگەوتەکان، ئەگەر مۆڵەتیان لێ وەرگرتن، بیلالی کوڕی عەبدوڵلاش گوتی: بە خوا ڕێیان لێدەگرین، عەبدوڵلاش بە کوڕەکەی دەڵێ: من دەڵێم پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، تۆش دەڵێی ڕێیان لێدەگرین؟ وە لە ڕیوایەتی سالیم لە بابیەوە (واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر کوڕێکی دیکەشی هەیە بە ناوی سالیم هەر لە بابیەوە) دەڵێ: عەبدوڵلا ڕووی لە بیلالی کوڕی کرد وە بە جۆرێك جنێوی پێگوتو قسەی پێ گوت، کە هەرگیز ئاوا قسەی پێ نەگوتبوو، وە گوتی: من هەواڵت پێدەدەم لە پێغەمبەرەوە ﷺ تۆش دەڵێی وەڵلاهی ڕێیان لێدەگرین؟ لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، دەڵێ گوتی: قسەت لەگەڵ ناکەم، وە ناتدوێنم، (واتە تا پەشێمان نەبیەوە) کەواتە: هەر شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئێمە گەیشت، دەبێ لەسەر سەروچاومانی دابنێین، ئەگەر ڕاست دەکەین ئیمانمان بە پێغەمبەری خوا هەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: سوێند بە پەروەردگارت بە ئیماندار لەقەڵەم نادرێن، هەتا هەرچی تۆ بڕیاری لەسەر دەدەی، لێت وەرنەگرن، وە بۆی تەسلیم نەبن، وە پێی ڕازی نەبن.

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا۟ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ...﴿٦٦﴾﴾، واتە: ئەگەر ئێمە لەسەرمان پێویست کردبان کە خۆتان بکوژن، یاخود لە ماڵو حاڵی خۆتان وەدەرکەونو ماڵو نیشتیمانتان بەجێبهێڵن، کەمێکیان نەبێ ئەو فەرمانەیان جێبەجێ نەدەکرد، واتە: خۆکوشتنو ماڵ بەجێهێشتنیان

جێبەجێ نەدەکرد، ئایا مەبەست لەو کەمە کێن؟ دیارە مسوڵمانانی ڕاستەقینەن، چونکە ئەم ئایەتانە قسە دەربارەی کۆمەڵگای مسوڵمان دەکەن، کە دیارە مسوڵمانی باش و ڕاست و ساغ و خۆڕاگری تێدا هەبوون، وە هەندێ خەڵکی بەناو مسوڵمان و دەغەڵ و مونافیقیشیان لەنێودا هەبوون، جا دیارە کە خوا دەفەرموێ: کەمێکیان ئەو فەرمانەیان جێبەجێ دەکرد، واتە: ئەو مسوڵمانانەی کە ڕاست و ساغن، لەوبارەشەوە ئەم گێڕدراوەیە هەیە: ﴿أَخْرَجَ ابْنُ جَرِيرٍ بِسَنَدِهِ إِلَى أَبِي إِسْحَاقَ السُّبَيْعِي لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ...﴿٦٦﴾﴾، قَالَ رَجُلٌ: واللهِ لَوْ أمَرَنَا لَفَعَلْنَا، فَالْحَمْدُ للهِ الَّذِي عَافَانا، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إنَّ مِنْ أمَّتِي لَرِجَالاً، الإيْمَانُ أثْبَتُ فِي قُلُوبِهِم مِنَ الجِبَالِ الرَّوَاسِي)[1]﴾، واتە: ئیبنو جەریر بە سەنەدی خۆی دەیگەیەنێتە سەر ئەبی ئیسحاقی سوبەیعی، کە کاتێك ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ کە خوا دەفەرموێ: ئەگەر لەسەرمان پێویست کردبان، خۆتان بکوژن یان ماڵو حاڵتان بەجێبهێڵن، کەمێکیان نەبێ جێبەجێیان نەدەکرد، پیاوێك گوتی: وەڵڵاهی ئەگەر فەرمانمان پێکرابا جێبەجێمان دەکرد، بەڵام ستایش بۆ ئەو خوایەی کە سەلامەتی کردووین و ئەوەی لەسەر پێویست نەکردووین، ئنجا کە ئەوە بە پێغەمبەر گەیشتەوە ﷺ فەرمووی: لە ئۆممەتی من پیاوانێك هەن کە ئیمان لە دڵیاندا وەك چیای داکوتراو وایە.

**مەسەلەی بیست و دووەم:** کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿... وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾﴾، واتە: ئەگەر ئەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کراون، واتە: ئەو یاسایانەی کە بۆیان دانراون و ئەو ئاڕاستانەی

---

١) (محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٢٩٥).

کە بۆیان نێردراون، جێبەجێیان کردبانایە، ئەوە بۆ ئەوان چاکتر بوو، وە زیاتریش دەیچەسپاندن، وە لەلایەن خۆمانەوە پاداشتێکی مەزنمان دەدانەوە، وە بەرەو ڕێیەکی ڕاستیش ڕێنماییمان دەکردن، لێرەدا دوو شت دەڵێین:

**یەکەم**: خوا ﷻ یاساکانی شەریعەتی ناو ناوە (وَعْظ)، ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ﴾، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ هەر حەڵاڵو حەرامێکی دیاری کردوە، لە قورئاندا، وە هەر فەرمانێکی کردوە، وە هەر قەدەغەیەکی کردوە، ئاوێتەی کردوە لەگەڵ ئامۆژگاریی کردندا، لەگەڵ ئەوەدا کە هەستمان دەجووڵێنێو هانمان دەداو، دەمانترسێنێ لە سزای خۆیو دڵخۆشمان دەکات بە پاداشتی خۆی، کە ئەوەش پێی دەگوترێ (وَعْظ)، ئامۆژگاریی.

**دووەم**: ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ کە پابەندیی بە شەریعەتەوە، چوار بەرهەمی هەن:

بەرهەمی یەکەم: دەفەرموێ: ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، واتە: چاکترە بۆ ئەوان، بە تەئکید هیچ شتێك لەوە چاکتر نیە ئینسان پابەند بێ بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، خێری دنیاو قیامەتی تێدایە، چونکە ئەم قورئانە، وە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێك نیە فەرمانیان پێکردبێو لە بەرژەوەندیی دنیاو قیامەتماندا نەبێ، لە بەرژەوەندیی تاكو خێزانو کۆمەڵدا نەبێ، وە هیچ شتێك نیە قەدەغەیان کردبێو لە زەرەرو زیانی دنیاو قیامەتی تاكو خێزانو کۆمەڵگاو دەوڵەت نەبێ، بۆیە پابەندیی بە شەریعەتەوە، هەر بە خێرو خۆشییو قازانج تەواو دەبێ.

بەرهەمی دووەم: دەفەرموێ: ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾، ئینسان تاکو زیاتر پابەندبێ بە شەریعەتەوە، زیاتر دڵی دەچەسپێ لەسەر طاعەتو زیاتر دامەزراو دەبێ، واتە: ئینسان تاکو شارەزایی زیاتر بێ، دەگونجێ کردەوەی باشی زیاتربێ، هەتا کردەوەی باشیشی زیاتر بێ، زیاتر دڵی

دەچەسپێ لەسەر ئیمان، یەکێك لەو هۆکارانەش کە ئیمان لە دڵی ئینساندا دەچەسپێنێ، بریتیە لە کردەوەی باش.

بەرهەمی سێیەم: دەفەرموێ: ﴿أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، واتە: پاداشتێکی مەزنمان دەدانەوە، دیارە ئەوەش لە دوارۆژ دایە.

بەرهەمی چوارەم: دەفەرموێ: ﴿وَلَهَدَيۡنَٰهُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾، وە ڕێیەکی ڕاستمان پیشان دەدان، ئەمە یانی چی، چونکە ئینسان تا ڕێی ڕاستی پێشان نەدرابێ، کردەوەی باش ئەنجام نادات؟! ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هیدایەتدرانی ئینسان، یەك حاڵەتی نیەو یەك شت نیە، بڵێی: تازە ئەوە هیدایەتی وەرگرت، جاری دیکەش باسم کردوە، مەسەلەی دینداریی‌و مسوڵمانەتیی‌و ئیمان هەبوون، ئەوە نیە ئینسان وەك شەمەندەفەر بچێتە سەر سککەو بڕوا، یان وەك حەبێك نیە بیخۆیی‌و تەواوبێ، هەمیشە پێویستیمان بەوە هەیە هیدایەتمان زیاد بێ، پێویستیمان بەوە هەیە، زیاتر دڵمان دامەزراو بێ‌و زیاتر بەرچاومان ڕۆشن بێ، بۆیە ئێمە لە سووڕەتی (الفاتحة)دا، کە خوا ﷻ سووڕەتی (الفاتحة)ی لەسەر زمانی بەندەکانی فەرمووە، پێنج فەرزە دەڵێین: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ الفاتحة، واتە: ڕێی ڕاستمان پێشان بدە، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، چونکە ڕێی ڕاست گرتن لە هەموو کاتێکدا بۆ ئینسان پێویستە، قسەیەك دەکەی پێویستە لە نیشانە بدەی، هەمیشە نیەتی چاك پێویستەو، بۆ هەموو نیەتێکی باش پێویستیت بەڕێی ڕاست هەیە، هەروەها بۆ هەموو کردەوەیەك‌و بۆ هەموو هەڵسوکەوتێك، هەڵسوکەوت لەگەڵ خودی خۆتدا، لەگەڵ خەڵکدا، لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، هەمووی پێویستی بەوە هەیە کە تۆ ڕێی ڕاست بگری، بۆیە کەوتنە سەر ڕێی ڕاست، وەك گوتم حەبێك نیە ئینسان بیخواو تەواو بێ، یان سکەیەکی ئاسن بچیە سەری‌و بڕۆی، بەڵکو هەمیشە ئینسان پێویستی پێی هەیە.

**مەسەلەی بیستو سێیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم ... ﴿٦٩﴾﴾، هەر کەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە ئەوانە لەگەڵ کەسانێکدان کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، ئەمە موژدەیەکی زۆر خۆشە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: هەر کەسێك گوێ ڕایەڵیی و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ بکات، لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، ئەوانەی خوا چاکەی لەگەڵ کردوون کێن؟ دوایی خوا باسیان دەکات، کە چوار جۆرە کەسن: ﴿مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ﴾، لە پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صالحان، لەوبارەوە چەند فەرمایشتێك هەن:

١- ﴿عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الأَسْلَمِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسولِ اللّهِ ﷺ، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوْءِ وَحَاجَتِهِ، فَقَالَ لِي: سَلْنِي، فَقُلْتُ: أَسأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ؟ قَالَ: أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٦٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٩٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٣٢٠)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (١١٣٨)، واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمیی خوا لێی ڕازی بی، دەڵێ: من لە شەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەمامەوەو خزمەتم دەکرد، وە ئاوی دەستنوێژم بۆ دەهێنا[1]، وە پێداویستییەکانم بۆ دەهێناو خزمەتم دەکرد، پێی گوتم: داوام لێبکە چ شتێکت لە من دەوێ؟ منیش گوتم: داوات لێدەکەم لە بەهەشتێ ڕەفیقی تۆبم (بێگومان داوایەکی زۆر گەورەی کردوە!) فەرمووی: جگە لەوە چی دیکە؟ گوتم: هەر ئەوە فەرمووی: ﴿فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ﴾، واتە: کەواتە یارمەتیم بدە لەسەر خۆت بە زۆر سەجدە بردن، یانی نوێژکەری باشبە، خواپەرستی باشبە، لەمن زیاتر نزیك دەبی لە بەهەشتێ.

---

١) (وَضُوء) واتە: ئاوی دەستنوێژ پێگرتن، (وُضُوء)، واتە: دەستنوێژ گرتن.

٢- ﴿عَن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ رضي الله عنه جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ يَا رَسولَ اللَّهِ: كَيْفَ تَقُولُ فِي رَجُلٍ أَحَبَّ قَوْمًا وَلَمْ يَلْحَقْ بِهِمْ؟ فَقَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦١٦٩)، وَمُسْلَمٌ برقم: (٦٦٦٠)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەربارەی پیاوێك چی دەڵێی کەسانێکی خۆشدەوێ، بەڵام ناشگاتە ئەوان؟ (واتە: کردەوەی وەك ئەوانی نیە، بەڵام خۆشی دەوێن)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئینسان لەگەڵ کەسێکدایە کە خۆشی دەوێ، کێت خۆشبوێ لە دنیادا، لە قیامەت لەگەڵ ئەودای، دیارە ئەمە زۆر مایەی دڵ خۆشییە.

٣- ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ لِرَسولِ اللَّهِ ﷺ مَتَى السَاعَةُ؟ قَالَ لَهُ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ حُبَّ اللَّهِ وَرَسولِهِ، قَالَ: أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ البُخَارِيُّ برقم: (٦١٧١)، وَمُسْلَمٌ برقم: (٦٦٥٢)، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمِ، ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ (کە زۆر خزمەتی پێغەمبەری ﷺ کردوەو لە تەمەنی دەساڵییەوە لە خزمەتیدا بووە، تا وەفاتی کردوە)، دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! قیامەت کەی دێ؟ ئەویش فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردوە؟ (دیارە خۆ پێغەمبەر ﷺ، نەیزانیوە قیامەت کەی دێ، بەڵام وەك بڵێی بەو پیاوەی گوتوە: وا لێی بەپەلەی چیت بۆ ئامادە کردوە؟)، ئەویش گوتی: خۆشەویستیی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسە دای کە خۆشتویستوە، ئەنەس دەڵێ: لە دوای مسوڵمانەتیی و لە دوای هاتنە نێو ئیسلام، بە هیچ شتێك هێندە دڵخۆش نەبووین، وەك بەو قسەیەی پێغەمبەر ﷺ، کە فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسە دای کە خۆشتدەوێ، دڵخۆش بووین، واتە: لە دنیادا کێت خۆش ویستوە لە قیامەت لەگەڵ ئەودای، ئەنەس دەڵێ من خوام خۆشدەوێ، پێغەمبەری خوام ﷺ،

خۆشدەوێ، ئەبو بەکرم خۆشدەوێ، عومەرم خۆشدەوێ، وە ئومێد دەکەم کە لەگەڵ ئەواندا بم، هەرچەندە کردەوەی ئەوانیشم بۆ نەکرێ.

ئەم فەرموودانە لێیان وەردەگیرێ کە بەڕاستیی خۆشویستن لەبەر خوا زۆر پایەیەکی گەورەی هەیە، وە شتێکی گرنگە، چونکە هەرچەندە ئەنەس گوتوویەتی: کردەوەمان وەك وان نیە، بەڵام بەڕاستیی ئینسان هەر کەسێکی خۆشویست، هەوڵدەدا وەك ئەویش بکا، هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، بۆچی لە هەموو کەس زیاتر پابەندبوون بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ، چونکە لە هەموو خەڵك زیاتر پێغەمبەریان خۆشویستوە، وە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە کەسێك غەیری پێغەمبەری لە پێغەمبەر ﷺ خۆشتر بوێ‌و، غەیری ئیسلامی لە ئیسلام خۆشتر بوێ‌و، غەیری مسوڵمانانی لە مسوڵمانان خۆشتر بوێ، نابێ خۆی بە مسوڵمان بزانێ، ئەوە خەیاڵ پڵاو دەکات، وە کاتێك فەرمانێکی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ فەرمانی طاغووتێك سەرکردەیەك کە بەڕێی کوفردا پێش خەڵك دەکەوێ، تێکدەگیرێ، تۆ فەرمانی سەرکردەکەت زاڵ دەکەی، یاخود سەرکردەکەی خۆت لە پێغەمبەر ﷺ خۆشتر دەوێ، یاخود سەرکردەکەی خۆت لە کەسێك خۆشتر دەوێ کە بە ڕێی پێغەمبەردا ﷺ پێشت کەوتوەو، دەشزانی کە بە ڕێی پێغەمبەردا دەتبا، کەچی ئەوت لەم خۆشتر دەوێ، لەبەرئەوەی کە ئەو پارەی هەیە، یاخود لەو دەترسێی، یاخود تەماعت پێیەتی، ئەوە مانای وایە نابێ خۆت بە مسوڵمان بزانی لەو حاڵەتانەدا، وە بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان خۆشەویستیی بۆ غەیری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، زیاتر دەبێ لە خۆشەویستیی بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا، وە بۆ ئەوانەی کە لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادان، دەبێ لە ئیمانەکەی خۆی بترسێ.

<u>**مەسەلەی بیست‌و چوارەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿...مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾﴾، ئەوانەی خوا چاکەی

لەگەڵدا کردوون لە پێغەمبەرانو صیددیقانو شەهیدانو صالْحان، خوا ﷻ چوار جۆرە کەسی باس کردوون:

١- ﴿مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە لووتکەی بەندە چاکەکانی خوادان، لە زۆر شوێن خوای پەروەردگار باسی پێغەمبەران دەکات، بۆ وێنە:

أ/ لە سوورەتی (النمل) دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ...﴿٥٩﴾﴾، واتە: بڵێ ستایش بۆ خوا، وە سەلام لەسەر بەندە هەڵبژاردراوەکانی خوا، لەسەر ئەو بەندانەی کە خوا هەڵیبژاردوون، کە بێگومان ئەو بەندە هەڵبژێردراوانە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام).

ب/ خوا لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ...﴿٧٥﴾﴾، واتە: خوا لە فریشتەکان نوێنەرانێك هەڵدەبژێرێ، وە لە خەڵکیش نوێنەرانێك هەڵدەبژێرێ، هەرچی خوا دەیکاتە نوێنەری خۆی، چ لە فریشتەکان وەك جبریل، وە چ لە بەشەرەکان کە پێغەمبەرانن، دیارە خوا کە کەسێك هەڵدەبژێرێ لە نێو خەڵکیکدا، لە هەموویان چاکترە، ئەوە بە نسبەت پێغەمبەرانەوە.

٢- ﴿وَٱلصِّدِّيقِينَ﴾، بە نسبەت (صیددیقین)ەوە، لە قورئاندا ئاوا باسکراون: لە سوورەتی (الحدید) ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ...﴿١٩﴾﴾، واتە: ئەوانەی ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا هێناوە، ئا ئەوانە صیددیقینن، پێشتر باسمان کرد صیددیق یان کەسێکە کە زۆر ڕاست دەبێژێ، واتە درۆی نیە، یاخود کەسێکە کە زۆر خواو پێغەمبەری خوا بەڕاست دادەنێ، واتە: صیددیق یا

بە مانـــای (كـثـیر الـصِّـدق) یـان (كـثـیر الـتـصـدیق)ە، كـە ئـەبو بـەكری صـیددیق خـوا لـێی ڕازی بـێ، لـە لووتكـەی صیددیقانە، وە مـەرجیش نیـە هەر ئەو صـیددیق بووبـێ، بـەڵام ئـەو لـە هـەموو صیددیقان پلـەی بـەرزترە، بێگومـان كـە تەمەشـای ژیـانو هەڵوێستەكانی ئـەبو بـەكر دەكـەی خـوا لێـی ڕازی بـێ، چ لـە ڕۆژگـاری پێغـەمبەردا ﷺ كـە لـە پـێش هـەموو كەسـدا ئیمـانی پێهـێناوە، وە كاتێـك هـەواڵی شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە (الإسـراء والـمعراج)یان پێداو گوتیـان: ئـەوە موحەممـەد شتێكی وا دەڵـێ، گوتی: (إِنْ كَانَ قَالَ فَقَد صَـدَقَ)، واتـە: ئەگـەر وای گوتبـێ ڕاسـت دەكـات ! گوتیـان: چۆن؟ گوتـی: مـن لـەوە سـەیرترو سـەرسوڕهێنەرتر هەیـە كە ئیمانم پێـی هەیـە، ئیمانم پێی هەیە كە جبـریل لـە یـەك لـەحزەدا لـە سـەرووی حـەوت ئاسـمانەوە دێ بـۆ لای، ئـەوە كـە خـوا بـەرزی بكـاتەوە، مـادام بۆخـۆی گوتبێتـی، ڕاسـت دەكـات، هـەروەها لـە دوای وەفـاتی پێغەمبـەریش ﷺ لـە بەسـەرهاتی كۆچـكردنی پێغەمبـەردا ﷺ، وە دوایـی لـە مەسـەلەی جـەنگ لەگـەڵ هەڵـگەڕاوەكان (مرتـدِّین)دا تەمەشـا دەكـەین، ئـەبو بـەكر لـە پـێش هـەموو هـاوەڵانەوە بووە، خـوا لێیـان ڕازی بـێ.

٣- ﴿وَٱلشُّهَدَآءُ﴾، خـوا لـە سـوورەتی (الحدیـد) لـە ئایـەتی (١٩)دا دیـسان دەفـەرموێ: ﴿... وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡ ...﴿١٩﴾﴾، واتـە: شـەهیدان لای پەروەردگاریان پاداشـتی خۆیانیـان هەیـەو ڕووناكی خۆیانیـان هەیـە، بـەڵام لێمان تێكنەچێ، شـەهید كە بـە (شُـهَدَاء) كۆ دەكرێتـەوە، وە بـە (أَشْـهَاد)یـش كۆ دەكرێتـەوە، شـەهید تـەنیا كەسـێك نیـە كـە لـە ڕێـی خـوادا كوژرابـێ، بەڵكو شـەهید كەسێكە شـایەدیی دەدا بـەوە كـە هـەر دینـی خـوا ڕاسـتەو هـەر بەرنـامەی خـوا ڕاسـتە، جا ئـەوەی لـە ڕێـی خـوادا دەكـوژرێ، بۆیـە پێـی دەگـوترێ شـەهید، چـونكە بـە خـوێنی خـۆی ئـەو شـایەدییە دەدا، بـەڵام هـەر كەسـێكی دیكـەش ئـەو شـایەدیە بـدات یـانی

ژیانی بەرجەستەکەری ئەو شایەدیی دانە بێ، ئەویش بە شەهید لە قەڵەم دەدرێ (إمام فخرالدين الرازي) لە (التفسير الكبير)ەکەی خۆیدا شیکردنەوەیەکی جوان دەکات بۆ وشەی شەهید دەڵێ: (الشَّهِيدُ: "فَعِيلٌ" بِمَعْنَى "الفَاعِل"، وَهُوَ الّذِي يَشْهَدُ بِصِحَّةِ دِينِ اللَّهِ تَارَةً بالْحُجَّةِ وَالبَيَانِ، وَأُخْرَى بِالسَّيْفِ وَالسِّنَان، فالشُّهَدَاءُ هُمُ القَائِمُون بالقِسْط، وَهُمُ الَّذِين ذَكَرَهُم اللَّه تَعَالى فِي قَوْلِهِ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِ ...﴿١٨﴾ ﴾آل عمران، يُقَال لِلْمَقْتُول فِي سَبِيلِ اللَّهِ: شَهِيدٌ؛ مِنْ حَيْثُ إنَّهُ بَذَلَ نَفْسه فِي نُصْرَة دِينِ اللَّهِ، وشَهَادَتهِ لَهُ بأَنَّهُ هُوَ الْحَقُّ، وَمَا سِواهُ هُوَ البَاطِلُ)[1]، واتە: شەهید (فعیل)ە بە مانای (فاعِل) ، واتە: لەسەر کێشی (فَعیل)ە، بەڵام بە مانای (فَاعِل)ە، واتە بکەر، ئەنجامدەر، ئەویش کەسێکە شایەدیی دەدا بەڕاستیی بەرنامەی خوای بەرز، جا جارێك بە بەڵگەو بە ڕوونکردنەوە، جارێکیش بە هێزو بە بەکارهێنانی چەك، شەهیدانیش کەسانێکن کە دادگەریی ئەنجام دەدەن، وە ئەوان ئەوانەن کە خوا باسی کردوون، کە دەفەرموێ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِ ...﴿١٨﴾ ﴾آل عمران، واتە: خوا شایەدیی دا کە بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، وە فریشتەکانیش شایەدییاندا، وە زانایانیش شایەدییاندا، خوا هەمیشە دادگەریی بەڕێوەدەبات، ئنجا دەڵێ: وە ئەو کەسەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێ لەو ڕووەوە پێی دەگوترێ شەهید کە لە پێناو سەرخستنی دینی خوادا، وە لە پێناو شایەدییدانی دا بەوەی کە هەر دینی خوا ڕاستەو غەیری بەرنامەی خوا هەڵەیە، گیانی خۆی بەخت کردوە.

---

١) ج: (١٠)، ص: (١٥٤).

کەواتە: شەهید تەنیا ئەوەنیە کە لە ڕێی خوادا دەکوژرێ بە پێی زاراوی قورئان، هەرچەندە وەك و عورف و باوی خەڵك شەهید ئەو کەسەیە کە لە ڕێی خوادا دەکوژرێ، بەڵکو ئێستا وای لێهاتوە کە کەسێك لە ڕێی کوفریشدا بکوژرێ هەر دەڵێن شەهید بووە، کابرا لە ڕێیەکی پووچ و بەتاڵیشدا بڕوا هەر دەڵێن: شەهید بووە! لەسەر دزییش بکوژرێ هەر دەڵێن: شەهید بووە! ئەوە دیارە هیچ نیەو هەر بەکارهێنانێکی ئەو وشەیە لە غەیری شوێنی خۆیدا.

٤- ﴿ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، ئایا (صالِحِین) کێن؟ خوای بەخشندە دەربارەی (صالِحِین)یش دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ٩﴾العنكبوت، واتە: ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، دەیانخەینە نێو صاڵحانەوە.

صاڵح واتە: چاك و پێچەوانەی خراپ (فاسد)ە، وە (مُصلِح) واتە: چاکەکار، وە (مُفسِد) واتە: خراپەکار، ئنجا پێویستە بزانرێ (صالح) بوون، پلە پلەیە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو کەس صاڵح تر بوون، بەلاَم لای کەمی مسوڵمانەتیی ئەوەیە کە ئینسان چاك صاڵح بێ، یانی: ئیمانی هەبێو کردەوەی باشی هەبێ، بەلاَم صاڵحیی وەك چۆن لای کەمی هەیە، کە مسوڵمانانی سادەن، لای زۆریشی هەیە، کە پێغەمبەرانن، بە بەڵگەی چی؟ خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأنبیاء)، ئایەتی (٧٢)دا دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا صَٰلِحِينَ ٧٢﴾، واتە: ئیسحاقو یەعقووبیشمان بە زیادە بە ئیبراهیم بەخشی، وە هەر کامێك لەوانەشمان صاڵح کردن.

هەروەها (یوسف) لە كۆتا بەسەرهاتی خۆی لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (١٠١)دا كە لە خوا دەپاڕێتەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: خوایە! ڕەگەڵ صالحانم بخە، كەواتە صالح بوون، پلەی بەرزی هەیە كە هی پێغەمبەرانە، وە پلەی لای خوارێشی هەیە، كە هی كەسێكە ئیمانو كردەوەی باشی هەبێ.

ئنجا پێویستە بزانرێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) صیددیقیشن، شەهیدیشن، صالحیشن، هەروەها صیددیقین، شەهیدیشن، صالحیشن، وە شەهیدەكانیش، شەهیدیشنو صالحیشن، واتە: هەركامێك لەوانەی سەرێ سیفەتی ئەوانەی خوار خۆشی لە خۆیدا كۆدەكاتەوە، بەڵام مەرج نیە ئەوەی لە خوارێیە سیفەتی ئەوەی سەرێی تێدابێ.

<u>**مەسەلەی بیستو شەشەم كۆتایی**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ﴾، ئا ئەو بەخششە لە خواوەیە، وە خوا بەسە بۆ زانایی بەوانەی شایستەی بەخششی خوان، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٥٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ... ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: هەر چاكەیەك لە ئێوەدا هەیە (لە خۆتاندا لەماڵتاندا لە دەوروبەرتاندا)، ئەوە لە خواوەیە، هەموو نیعمەتەكان لە خواوەن.

هەر بۆیەش بەندە چاكەكانی خوا كە دەچنە بەهەشت دەڵێن: ﴿ ... ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ... ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ڕێنمایی كردین بۆ ئەمە، (واتە: كە بێینە نێو ئەم بەهەشتەوە) وە ئەگەر خوا ڕێنمایی نەكردبااین، ئێمە مسۆگەر ڕێی ڕاستمان نەدەگرت، كەواتە: پێویستە ئینسان هەر چاكەیەكی لە خۆیدا

شـــك بـــرد بیگـــێڕێتەوە بـــۆ خـــوای بەخـــشـــەرو، خـــوا ســـەرچاوەی هـــەموو نیعمـــەتو چاکـــەکانە.

ئنجـــا کـــە دوایـــیش دەفـــەرموێ: وە خـــوا بەســـە بـــۆ زانینـــی ئـــەوە کـــە کـــێ شـــایستەیە ئەو بەخشـــشـــەی پێبـــدرێ، یـــانی: ئیـــشـــی خـــوا هیـــچـــی بـــە گـــۆترەو بـــێ حیکمـــەت نیە، خوای پەروەردگـــار وامـــان لێبکـــات شـــایـــستەی ئـــەوە بیـــن، لە نیعمەتەکـــانی خۆی – نیعـــمـــەتی دینـــیی و ژینـــیی – پێمـــان ببەخشـــێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوارده (١٤) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکانی (٧١ تاکو ٨٤)ن، لەم چوارده ئایەتەشدا سەرەتا خوای کاربەجێ بۆ جاری پێنجەم لەم سووڕەتەدا بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێو، فەرمانیان پێدەکات کە دەستە دەستەو تێکڕا بچن بۆ جەنگو جیهاد، پاشان باسی هەڵوێستی خراپی هەندێك لە مسوڵمانانی ئیمان بێهێزو دانەمەزراو دەکات، دوایی خوا فەرمان بە مسوڵمانانی ڕاستو ساغ دەکات، کە جەنگو جیهاد لە ڕێی خوادا بکەن، وە لەوەش کە جەنگ لەڕێی خوادا سەرەنجامی چاکی هەیە، دڵنیابن، چ سەربکەون، چ بکوژرێن، پاشان بە گلەیی کردنەوە بە مسوڵمانان دەفەرموێ: کە بۆچی لە پێناو ڕازیکردنی خواو دەربازکردنی چەوساواندا تێناکۆشنو ناجەنگن؟ ئنجا هاندەرو ئامانجی جەنگکردنی ئیمانداران و بێبڕوایان دەخاتە ڕوو، کە ئیمانداران لە ڕێی خوادا دەجەنگن، وە بێبڕواپانیش لە ڕێی طاغووتو شەیتاندا دەجەنگن، وە پاشان باسی هەڵوێستی هەندێك لە مسوڵمانانی هەڵەشەی ئیمان لەرزۆك دەکات، کە سەرەتا پەلە دەکەن بۆ جەنگو جیهاد، دواییش کە پێویست دەبێ، ئامادە نابن! واتە: زۆر دەخورن، بەڵام کەم دەبڕن!! وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە لە هەر کوێیەك بن، دەرباز نابن، واتە: بۆچی لە کاتێك جەنگتان لەسەر پێویست دەبێ لێی دەترسێن، خۆ مردن هەر دێو لێی قوتار نابن، ئنجا باسی هەندێك بیروڕاو هەڵوێستی هەڵەی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، کە چاکەو خۆشیی دەگێڕنەوە بۆ خوا، وە خراپەو ناخۆشیی دەگێڕنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لە حاڵێکدا کە وەك قەدەر هەمووی لەلایەن خواوەیە، بەڵام وەك هۆکار، نیعمەت لە خواوەیەو، بەڵا لە خۆمانەوەیە،

پاشان باسی فەرمانبەریی کردن بۆ پێغەمبەر دەکات، کە فەرمانبەریی کردنمان بۆ پێغەمبەر، فەرمانبەریی کردنمانە بۆ خوا، ئنجا باسی هەندێك هەڵوێستو ڕەفتاری دیکەی ئەو جۆرە کەسانە دەکات، وەك گۆڕینی قسەی پێغەمبەر ﷺ، یاخود ئامادەیی دەربڕینی خۆیان، پێشی بە ڕواڵەتو لە ڕوودا ئامادەیی دەردەبڕن بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە لە خزمەتی دان، بەڵام پاشەملە پیلانی دیکە دەگێڕن، وە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ئاشتییو جەنگ بەبێ گێڕانەوەی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاربەدەستو مشوورخۆرانی قووڵو شارەزا، وە لە کۆتاییدا خوا فەرمان بە پێغەمبەر دەکات، کە لە ڕێی خوادا بجەنگێو مسوڵمانانیش هانبدات، بۆ ئەوەی هەڕەشەو مەترسیی ئەهلی کوفر بەرپەرچ بدرێتەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ٧١
وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن
مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ٧٢ وَلَئِنۡ أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ
وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ فَوۡزًا عَظِيمٗا ٧٣ فَلۡيُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ٧٤ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ
ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ٧٥ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ
أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ٧٦ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ

أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ
يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ
أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا
﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ
يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ
عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ
ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا
﴿٧٩﴾ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾
وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ۖ
وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ۖ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا
يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا
جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى
ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ
لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ
وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ
تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! لـە خۆتـان وریـابن، ئنجـا دەســتە دەســتە یـان بە تێکڕا بچـنە جەنگ (لە ڕێی خوادا) ﴿٧١﴾ وە بێگومان هی واتـان هەیـە کـە (لـە جـەنگو جیهـاد) سـستیی دەکـاتو خـۆی وەپـاش دەدات، جـا ئەگـەر بەڵایەکتان تووش بوو، بـە جەختکردنـەوە دەڵـێ، وەك هـیچ خۆشەویـستییەك لـە نێوان ئێوەو ئـەودا نـەبووبێ: بەڕاستیی خـوا چاکەی لەگـەڵ کـردم کـە لەگـەڵیان نـەبووم! ﴿٧٢﴾ بـەڵام ئەگـەر بەخشـشێکتان لـە خـواوە پـێ ببـڕێ، بـە مکـووڕیی دەڵـێ: ئـەی خۆزگـە لەگەڵیـان بـام، دەسـتکەوتێکی مـەزنم چـنگ دەکـەوت! ﴿٧٣﴾ دەجا با کەسانێك کە ژیانی دنیـا بـە دواڕۆژ دەدەن، لـە ڕێـی خـوادا بجـەنگن، هـەر کەسێك لـە ڕێـی خـوادا بجەنگـێ چ بکوژرێ، چ زاڵ بـێ، ئـەوە بێگومـان لەمـەودوا پاداشـتێکی مـەزنی دەدەینـەوە ﴿٧٤﴾ وە لەبەرچـی لـە ڕێـی خـواو (لـە پێنـاو دەربـازکردنـی) چەوسـاواندا لە پیـاوانو ژنـانو منداڵان، ناجەنگـن؟ ئەوانـەی (لە خـوا دەپاڕێنـەوە) دەڵـێن: پـەروەردگارمان! لـەم شـارە کـە خەڵـکەکەی سـتەمکارە، قوتارمـان بکـەو لەلایـەن خۆتـەوە مـشوورخۆرێکمان بـۆ برەخـسێنە، وە لەلایـەن خۆتەوە پشـتیوانێکمان بۆ پەیدابکـە ﴿٧٥﴾ ئەوانـەی ئیمـانیان هێنـاوەو، لـە ڕێـی خوادا دەجەنگنو، ئەوانەش کە بێبـڕوان، لە پێنـاو طـاغووتـدا دەجـەنگن، دەجـا لـە دژی دۆسـتانی شـەیتان بجـەنگن، بێگومـان فێڵـی شـەیتان بێهێـزە ﴿٧٦﴾ ئایـا سـەرنجی ئەوانەت نـەداوە، کـە پێیـان گـوترا: دەسـتتان لـە جەنگـکردن بگێڕنـەوەو نوێـژ بـەرپا بکـەنو زەکـات بـدەن، کەچـی کاتێـك جـەنگیان لەسـەر پێویـست کـرا کۆمەڵێکـیان هێنـدەی ترسـان لـە خـوا، لـە خەڵـکی (بێبـڕوای دوژمـن) ترسـانو گوتیـان: پـەروەردگارمان! بۆچـی (جـارێ) جەنگـت لەسـەر پێویـست کـردین، دەبووایە بـۆ کـاتێکی (دیکـەی) نـزیك دوات خـستباین! بڵـێ: ڕابواردنـی (ژیـانی)

دنیا تەنیا کەمێکە (نەدەبوو ئاوا باوەشتان لێدابایە)، وە (ژیانی) دوارۆژ بۆ کەسێك پارێز بکات باشترە، وە هێندەی دەزووی سەر نێوکە خورما ستەمتان لێناکرێ، (لە پاداشتدانەوەو لە سزاداندا) ﴿٧٧﴾ لە هەر جێیەك بن تەنانەت ئەگەر لە قەلا قایمەکانیش دابن، مەرگتان دەگاتێ، وە ئەگەر خێرو خۆشییەکیان تووش بێ (ئەوانە) دەڵێن: ئەوە لە خواوەیە، بەڵام ئەگەر خراپەو ناخۆشییەکیان بەسەربێ، دەڵێن: ئەوە لە تۆوەیە (ئەی موحەممەد)! بڵێ: هەمووی هەر لەلایەن خواوەیە، ئەوە ئەو کۆمەڵە (خەڵکە) بۆچی وان، نزیکە لە قسە تێنەگەن! ﴿٧٨﴾ هەرچاکەو خۆشییەکت بێتەرێ، ئەوە لە خواوەیە، وە هەر خراپەو ناخۆشییەکت بەسەربێ، ئەوە لە خۆتەوەیە، وە تۆمان بە ڕەوانەکراو بۆ خەڵك ناردوە، خواش بەسە کە ئاگادارو چاودێربێ ﴿٧٩﴾ هەر کەسێك فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە فەرمانبەریی خوای کردوە، وە هەر کەسێکیش پشت بکاتەوە، ئەوە (خۆی بەرپرسیارەو) ئێمە تۆمان نەناردوە کە پارێزەریان بی (لە لادان) ﴿٨٠﴾ وە دەڵێن: فەرمانبەریی دەکەین، بەڵام کاتێك لە لای تۆ هەڵسان کۆمەڵێکیان بە پیلانگێڕیی، پێچەوانەی ئەوە کە گوتوویانە (کە گوێڕایەڵییانە) بڕیار دەدەن (کە بریتیە لە بە قسە نەکردن‌و سەرپێچیی) خواش ئەو پیلانگێڕیی یە کە دەیکەن دەینووسێ، دەجا وازیان لێبێنەو پشت بە خوا ببەستە، خواش بەسە بۆ کار پێسپێردراویی‌و مشوورخۆریی ﴿٨١﴾ ئایا ئەوانە لە قورئان نافکرن‌و وردنابنەوە! وە ئەگەر لەلایەن جگە لە خواوە بووایە، ناڕێکیی زۆریان تێدا دەبینی ﴿٨٢﴾ وە ئەوانە هەرکات هەواڵێکیان لە ڕوی هێمنیی یان ترسەوە پێبگات (یەکسەر) بڵاوی دەکەنەوە، وە ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ لای کاربەدەستانیان ئەوە ئەوانەی لەوان توانای هەڵهێنجان‌و ئەنجامگیریی یان هەیە، دەیانزانی (کە ئایا بڵاوی بکەنەوە یان نا؟) وە ئەگەر بەخشش‌و بەزەیی خوا بەسەرتانەوە نەبووایە، کەمێکتان نەبێ هەمووتان

شوێن شەیتان دەکەوتن (٨٣) دەجا (ئەی موحەممەد!) لە ڕێی خوادا بجەنگە، تەنیا خۆت فەرمانپێکراوی، وە بڕوادارانیش هان بدە، بۆ جەنگو جیهاد ڕەنگەو نزیکە خوا زەبرو هێرشی ئەوانەی بێبڕوان (بە هۆی جەنگو جیهادەوە) بەرپەرچ بداتەوە، وە خوا زەبری توندترە (لە هی دوژمنانتان)(٨٤)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(خُذُواْحِذۡرَكُمۡ): ﴿خُذُواْ﴾، واتە: وەربگرن، ﴿حِذۡرَكُمۡ﴾، واتە: شتێك كە ئینسان پێی لە خۆ وریا دەبێ، وەك چەكو هەر شتێكی دیكە، (الحَذَرُ: إِحْتِرَازٌ مِنْ مُخِيفٍ)، (حَذَر) بریتیە لە وریابوونو خۆپاراستن لە شتێك كە جێگەی مەترسیی بێ، ﴿خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ﴾: (لأَي: مَا فِيهِ حَذَر كَالسِّلاَحِ)، واتە: شتێك كە ئینسان پێی لە خۆ وریا دەبێ، وەك چەك.

(فَٱنفِرُواْ): واتە بڕۆن بۆ جەنگ، (النَّفْرَةُ: الإِنزِعَاجُ عَنِ الشَّيءِ وَإلى الشَّيءِ)، (نَفْرَة) لە زمانی عەرەبیدا: ئەوەیە كە ئینسان لە شتێك بێزار بێ، یاخود بەرەو شتێك بە هەڵپەو بە پەلە بچێ، (وَالنَّفْرُ إِلى الحَرْبِ، يَنْفِرُ نَفْرَاً)، واتە: بەرەو جەنگ چوون، وەك لە شوێنی دیكەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ...(٤١)﴾التوبة، واتە: بە سووكییو قورسیی بچن بۆ جەنگ.

(ثُبَاتٍ): كۆی (ثُبة)یە، (ثُبةَ: أي: جَمَاعَةٌ مُنْفَرِدَة ويُجْمَعُ عَلَى ثُبَاتٍ وَثُبِين)، (ثُبةَ) واتە: كۆمەڵێك خەڵك، مەفرەزەیەك، دەستەیەك، كە بە (ثُبَات)، وە (ثُبِين)یش كۆ دەكرێتەوە.

(لَّيُبَطِّئَنَّ): واتە: سستیی دەكات، یاخود خەڵك سست دەكات، (البُطءُ: تَأَخُّرُ الإنبعَاثِ فِي السَّيْرِ)، (بُطء): بریتیە لەوە كە ئینسان بە سستیی بڕوات، بە

سستیی هەڵسێ، (لَيُبْطِّئَنَّ: يُثَبِّطُ غَيْرَهُ، أَوْ يَكْثُرُ هُوَ التَثَبُّطُ فِي نَفْسِهِ)، (لَيُبْطِّئَنَّ): واتە غەیری خۆی سست دەكاتو دوای دەخات، یاخود بۆخۆی سستییو تەنبەڵیی دەكات، هەردوو واتاكەی هەیە.

(**يَشۡرُونَ**): واتە: دەفرۆشن، ﴿يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾، واتە: ئەوانەی ژیانی دنیا بە دواڕۆژ دەدەن، دیارە وشەی (شِـرَاء) بە مانای كڕینیش دێ، بە مانای فرۆشتنیش دێ، بەڵام بەپێی شوێنەكە دەزانین كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾، واتە: ژیانی دنیا دەفرۆشن بە دواڕۆژ، ئەوە بۆ كەسانێك كە جەنگو جیهاد دەكەن، وە ئەگەر مەبەست پێی ئەوانە بێ كە جەنگو جیهاد ناكەن، واتە: كەسانێك كە ژیانی دنیا دەكڕن بە دواڕۆژ، واتە: دوا ڕۆژ دەكەنە نرخێكو دنیای پێ دەكڕن، خوا دەفەرموێ: ئەوانە كە تا ئێستا وابوون، با جەنگو جیهاد بكەنو لەمەودوا پێچەوانەی بكەنەوە، دنیا بە دواڕۆژ بدەن، نەك دواڕۆژ بە دنیا بدەن، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (خورما بە خوا بدەن، نەك خوای پەروەردگار بە خورما بدەن)، دەڵێ: (الشِّرَاءُ وَالبَيْعُ يَتَلازمَانِ..)، كڕینو فرۆشتن پەیوەستن پێكەوە، چونكە كەسێك كە شتێك دەكڕێ، نرخەكە دەدات، بەڵام نرخ لەسەر دانراوەكە وەردەگرێ، (يَدْفَعُ الثَّمَنَ وَيأخُذُ المُثْمَنَ)، بەڵام كەسێك كە دەفرۆشێ، نرخ لەسەر دانراوەكە دەدات، وە نرخەكە وەردەگرێ.

(**كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ**): (كَيْد) واتە: فێڵ، دەفەرموێ: فێڵی شەیتان بێ هێزە، (الكَيْدُ: ضَرْبٌ مِنَ الإحتِيالِ، وَقَدْ يَكُونُ مَذْمُوماً أَوْ مَمْدُوحَاً)، وشەی: (كَيْد) واتە: فێڵو پیلان، جا جاری وایە بە باری زەمكراوو خراپەو، جاری واش هەیە بە باری ستایشكراوو مەدحكراو دەبێ، كەسێك نەخشەیەك دابنێ بۆ شتێكی باشو مەبەستێكی باشی هەبێ، ئەوە باشە، وە ئەگەر نەخشەیەك دابنێ بۆ شتێكی خراپ، ئەوە خراپە.

(كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ): دەستی خۆتان بگێڕنەوە، (الكَفُّ كَفُّ اليَد)، (كَفّ) واتە: لەپە دەست، وە لەوەوە هاتوە (كَفّ يَدَهُ) واتە: دەستی گێڕایەوە، (الكَفّ: الدَّفْعُ) دەستگێڕاوە.

(بُرُوجٖ ): (البُرُوج) كۆی (بُرج)ە، (البُرجُ: القَصْرُ) واتە: كۆشك، كە دەفەرموێ: ﴿بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖ ﴾، واتە: كۆشكو قەڵای مەحكەم، كاتی خۆی عادەت وابووە، كۆشكو قەڵا چوار دیواری بۆ كراوە، ساتری هەبووە، پاشان بورجی دیكەی هەبوون، حەرەسیاتیان تێداگیراوە.

(مُّشَيَّدَةٖ ): (جَمْعُ مشِيد، مَبْنِيٌ بِالشِّيدِ وَهُوَ الجِصُّ وَنَحْوُهُ، وَشَيَّدَهُ: أَحْكَمَهُ، وَالإِشَادَةُ رَفْعُ الصَّوْتِ)، (مُشَيَّدَة) كۆی (مَشِيد)ە، وەك خوای پەروەردگار لە شوێنی دیكە لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ: ﴿... وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾﴾، واتە: كۆشكێكی (مشید) یانی چی؟ یان بە مانای بەرزە، یان بە مانای سواغ كراوە، كە بە گەچ لەبغ كرابێ، سواغ كرابێ، بە گەچ، یان بە شتێك وەك گەچ بێ، (وَشَيَّدَهُ: أَحْكَمَهُ)، واتە: قایمی كردوە، وە (الإِشَادَةُ)، واتە: مەدحی كردو دەنگی پێ بەرز كردەوە.

(لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ): واتە: نزیكە تێنەگەن، تێدەگەن، بەڵام خەریكە تێنەگەن، (كَادَ: لِمُقَارَبَةِ الفِعْل)، وشەی (كَادَ) واتە: خەریكە، نزیكە بۆ نزیككەوتنەوەیە لە كردەوەیەك، (يُقَالُ كَادَ يَفْعَلُ، إِذَا لَمْ يَكُن قَدْ فَعَلَ، وَإِذَا كَانَ مَعَهُ حَرْفُ نَفِيٍّ يَكُونُ لِمَا قَدْ وَقَعَ)، وەك ﴿... لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾﴾، ئەگەر گوتی: (كَادَ يَفْعَلُ)، واتە: شتەكەی نەكردوە، وەك خوا لە قورئاندا لە سوورەتی (الإسراء)دا، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَآ

﴿أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾﴾، واتە: تۆ خەریك بوو بەلایاندا بچی (بە لای کافرەکاندا)، خەریك بووە، بەڵام نەچووە، بەڵام ئەگەر پێتی (نَفی) لەسەر بوو، وەك (لَمْ يَكِد يفعل) ئەوە کردوویەتیو شتەکە واقیع بووە، ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿... لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾﴾، واتە: نزیکە تێنەگەن، بەڵام تێدەگەن.

(**بَيَّتَ**): دەفەرموێ: ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ ... ﴿٨١﴾﴾، کۆمەڵێکیان پیلانیان گێڕا بە شەوێ، (البَيُّوتُ: مَا يُفْعَلُ بِاللَّيْلِ)، (بَيُّوت) هەر تەگبیرێکە بە شەو بکرێ (وَيُقَالُ - بُيِّتَ - كُلُّ فِعْلٍ دُبِّرَ بِلَيْلٍ) هەر تەگبیرێكو نەخشەیەك دابنرێ بە شەو پێی دەگوترێ: (بُيِّتَ).

(**يَتَدَبَّرُونَ**): (التَدبيرُ والتَدَبُّر: التَفَكُّرُ فِي دُبُرِ الأُمُورِ)، (تَدبير، تَدَبُّر) واتە: بیرکردنەوە لە سەرەنجامی ئیشوکارەکان، ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ... ﴿٨٢﴾﴾، واتە: بۆچی لە قورئان نافکرن؟ لە سەرەتای ڕستەکە تا کۆتاییەکەی تێبفکرن.

(**ٱخْتِلَٰفًا**): (إِخْتَلَفَ شَيْئَان: لَمْ يَتَّفِقَا). واتە: ڕێك نەکەوتن، ناکۆکیی، کە دەفەرموێ: ئەگەر قورئان لەلای غەیری خواوە بووایە، ئیختیلافی زۆریان تێدا دەبینی، (إختلاف) یانی چی؟ واتە: ناڕێکیی‌و ناکۆکیی‌و پێکەوە نەگونجان.

(**يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ**): (النَّبَطُ: الْمَاءُ الْمُسْتَنبَطُ)، ئاوێك کە لە بیر دەربهێنرێ، پێی دەگوترێ: (نَبَط)، (يَسْتَنْبِطُونَهُ) یانی: (يَسْتَخْرِجُونَهُ) دەریدێنن، هەڵیدەهێنجنن، کە مەبەست پێی هەڵهێنجانی یاساکانە.

(**لَا تُكَلَّفُ**): واتە: لەسەرت پێویست ناکرێ، (التَّكَلُّفُ: إِسْمٌ لِمَا يُفْعَلُ بِمَشَقَّةٍ، أَوْ تَصَنُّعٍ، أَوْ تَشَبُّعٍ، لاَ تُكَلَّفُ: لاَ تُلْزَمُ، لاَ تُؤمَرُ)، (تَكَلُّف): بە هەر شتێك دەگوترێ کە بە زەحمەت بکرێ، یاخود بە خۆپێشاندانەوە بکرێ، یاخود بە

ڕیابازیی بکرێ، وە (لا تَكَلُّف) یانی: (لاَ تُلْزَمُ، لاَ تُؤمَرُ)، واتە: تۆ پابەند ناکرێیو لەسەرت پێویست ناکرێ، ﴿ ...لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ... ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: بەس خۆت لەسەر پێویستە.

(وَحَرِّضِ ): (تَحْرِيض)، واتە: هاندان، (حَرِّضَ) واتە: هان بدە، (التَّحْرِيضُ: الْحَثُّ عَلَى الشَّيءِ بِكَثْرَةِ التَزيين وَتَسْهِيل الخَطْبِ، لأنهُ إِزَالَةُ الحَرَضِ)، (تَحْرِيض) بریتیە لە هاندان لەسەر شتێك بەوەی كە بۆی جوان بكەیو بۆی ئاسان بكەی، وە بلێی هیچ نیە بۆت دەكرێ، وەك ئەوە وایە كەسێك نەخۆشەو حاڵەتی خراپە تۆش نەخۆشیی (حَرَض)ی لێ لادەبات، وە (حَرَض) بە مانای نەخۆشیی دێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾يوسف.

(بَأۡسًا ): (البُؤْسُ وَالبَأسَاءُ وَالبَأسُ، الشِّدَّةُ وَالْمَكْرُوهُ، وَالبَأسُ والبَأسَاء: النِكَايَةُ) واتە: (بُؤس، بَأساءُ، بَأسْ)، بە مانای سەغڵەتییو نارەحەتییو شتی ناخۆش دێ، وە بە مانای تۆڵە لێ سەندنەوەش دێ.

(تَنكِيلٗا ): (نَكَلَ عَنْ الشَّيءِ وضَعُفَ وَعَجزَ، وَنَكَلْتُهُ قَيَّدتُهُ)، (نَكَلَ) واتە: بێهێز بوو شتەكەی بۆ نەكرا، (وَنَكَّلْتُهُ)، واتە: كۆتم كرد، زنجیرم كرد، (النِّكْلُ: قَيْدُ الدابَّةِ، وحَديدِة اللِّجَام لِكونِهمَا مَانِعَيْنِ، والجَمْعُ: أنكالُ)، (نِكْل) بە پێوەندی پێی وڵاخ دەگوترێ، وە بەو ئاسنە دەگوترێ كە دەكرێتە لغاوی وڵاخە بەرزەو دەخرێتە نێو زاری، چونكە هەم ئەو پێوەندەی كە دەخرێتە پێی وڵاخەوە قەدەغەی دەكات لەوە كە بەملاو بەولادا بڕوا، وە هەم ئەو ئاسنەی دەخرێتە نێو دەمی ئەسپیشەوە، ڕێی لێدەگیرێ لەوە كە گیاو لەوەڕ بخوات، كۆی (نِكْل)یش (أَنكَال)ە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ ﴿عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ وَأَصْحَابًا لَهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ بِمَكَّةَ فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ كُنَّا فِي عِزٍّ، وَنَحْنُ مُشْرِكُونَ فَلَمَّا آمَنَّا صِرْنَا أَذِلَّةً، فَقَالَ: إِنِّي أُمِرْتُ بِالْعَفْوِ فَلاَ تُقَاتِلُوا الْقَوْمَ، فَلَمَّا حَوَّلَهُ اللَّهُ إِلَى الْمَدِينَةِ أَمَرَهُ بِالْقِتَالِ فَكَفُّوا فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ ...﴿٧٧﴾ ﴾﴾ أَخْرَجَهُ النَّسائيُّ برقم: (٣٠٨٦)، وَابْنُ جَرِير برقم: (٩٨٦٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنَن النسائي)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ)و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی چوونە لای پێغەمبەر ﷺ لە مەککە (ئەوکاتە لە مەککە بوون)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئێمە خاوەنی عیززەت بووین، وە باڵادەست بووین کاتێك کە هاوبەشدانەر بووین، بەڵام کاتێك کە ئیمانمان هێنا، ئێستا زەبوونو زەلیل بووین، (هەرچی لەولاڕا دێ، شەڕمان پێ دەفرۆشێو ئەزیەتمان دەدا، واتە: مۆڵەتمان بدە جەنگ بکەین) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فەرمانم پێکراوە بە لێبوردنو چاوپۆشیی، جەنگ مەکەن لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، جا کاتێك خوا پێغەمبەری ﷺ تەشریفی بردە مەدینەو گواستیەوە بۆ ئەوێ، فەرمانی پێکرد بە جەنگ، ئەوانەی کە پێغەمبەریان هەڵدەپێچا بۆ جەنگ، ئەوجارە دەستیان گێڕایەوەو، وە ئامادە نەبوون، ئەم ئایەتە لەوبارەوە هاتە خوار.

بەڕێزان بۆ ئاگادارییتان!

هەندێك لە زانایان ئەم دەقە ڕەت دەكەنەوە، هەرچەندە شێخ ئەلبانیی بە ڕاست (صحیح)ی داناوە، وە زانایان هەندێكیان بە ڕاست (صحیح)یان داناوە، لە ڕووی سەنەدەوە، بەڵام دەڵێن: (مَتْن)ی ئەم دەقە ئیشكالی تێدایە، لەگەڵ پێگەو مەقامی پیاوی وەك (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ) خوا لێی ڕازی بێ كە یەكێك بووە لەو شەش كەسانەی عومەری كوڕی خەتتاب كاندیدی كردوە بۆئەوەی لەدوای خۆی ببێتە خەلیفەی مسوڵمانان، وە پیاوێكی زۆر گەورە بووە، لە هەموو جەنگەكاندا بەشدار بووە، پیاوێكی زۆر ئازا بووە، یەكێك بووە لە پاڵەوانانی ئیسلام، دەڵێن: ئەوە لەگەڵ ئەو ناگونجێ، بۆیە زانایانی شارەزاو قووڵبووەوە لە شەریعەتدا، جاری وایە دەقێك دێت لە ڕووی سەنەدەكەیەوە ڕاستە، بەڵام لە ڕووی (مَتْن)ەوە بە گونجاوی دانانێن‌و ڕەتی دەكەنەوە، با نەك لە (سُنَن النسائي)دا هاتبێ‌و (إِبْنُ جَرِير) هێنابی، بەڵكو جاری وایە ئەگەر (بوخاریی و موسلیم)یش هێنابیان، مادام مەتنەكەی نەگونجاوبێ، ڕەتی دەكەنەوە.

بەڵام من پێموایە: دەگونجێ بڵێین: مادام لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستە پێویست ناكات ڕەتی بكەینەوە، بەڵكو دەڵێین: (عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْف) خوا لێی ڕازی بێ لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵان لە مەككە چوونە لای پێغەمبەر ﷺ‌و گوتیان: مۆڵەتمان بدە جەنگ بكەین، بەڵام دوایی كە جەنگ فەرز كراوە مادام لە گێڕراوەكەدا نەهاتوە بڵێ: هەموویان وایانكرد، ڕەنگە چەند كەسێك كە لەگەڵ (عَبْدَ الرَّحْمَنِ)دا چوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، لەو كاتەدا گوتبێتیان ئێستا كاتی نیە، یاخود ڕەنگە كەسانێكی دیكە بووبن‌و مەرج نیە هەر خودی ئەوانەی كە لە مەككە بە پێغەمبەریان ﷺ گوتوە مۆڵەتمان بدە جەنگ بكەین، دوایی هەر ئەوانە لە مەدینە ئامادە نەبووبن، یاخود بێهێزییان پێشاندابێ بەرانبەر بە جەنگكردن لە پێناوی خوادا !.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ ...﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: وە کاتێك کە هەواڵێکیان پێدەگات کە پەیوەندیی بە هێمنییو ئاسایش، یان ترسەوە هەیە، یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە واتە: ئەو مسوڵمانە ناشیو کرچو کاڵانە، کە وەك دوایی باسی دەکەین هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوانە مسوڵمانانێکی کرچو کاڵو ناشیو ئیمان لاواز بوون، وە هەندێکیان دەڵێن: دەغەڵو مونافیق بوون، بەڵام وەك من دوایی باسی دەکەم، پێموایە هەر مسوڵمان بوون، بەڵام مسوڵمانی ناشیو کرچو کاڵو سادە بوون، جا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: یەکسەر هەواڵەکە بڵاودەکەنەوە، وە ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو بۆ لای کاربەدەستانیان، ئەوانەی کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی داخۆ ئەوە بڵاوبکەنەوە، یان بڵاوی نەکەنەوە، واتە: نابێ مسوڵمان هەرچی پێگەیشت یەکسەر بڵاوی بکاتەوەو وەك سەبەتەی کون وابێ، هەرچی تێی بکەی لێی بکەوێتە خوارێ، جا لەوبارەوە ئەمە گێڕدراوەتەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أنَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ قَالَ لَمَّا اعْتَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا النَّاسُ يَنْكُتُونَ بِالْحَصَى، وَيَقُولُونَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُؤْمَرْنَ بِالْحِجَابِ، فَقُمْتُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ فَنَادَيْتُ بِأَعْلَى صَوْتِي لَمْ يُطَلِّقْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ. وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ ...﴿٨٣﴾ ﴾﴾ (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٣٦٧٥)، وَابْنُ جَرِيرٍ)، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ لە عومەری کوڕی خەتتابەوە دەگێڕێتەوە خوا لەویش ڕازی بێ، کە گوتوویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك (ماوەی بیستو نۆ شەو) وازی لە هاموشۆی خێزانەکانی هێنا، (واتە: هاموشۆی نەکردنو نەچۆوە ماڵێ، شوێنێکی هەبوو

لەوێ ئیسراحەتی دەکرد، ماوەی مانگێك لەسەر ئەوە لێیان تووڕە بوو کە خێزانەکانی پێغەمبەریان ﷺ هەڵپێچا، گوتیان: دەبێ نەفەقەمان بۆ زیاد بکەی، ئێمەش وەك ئەو خەڵکە ژیانو گوزەرانمان خۆشبێو مەسرەفی زیاترمان بۆ بکەی، پێغەمبەریش ﷺ نەیدەویست ئەو ژیانە سادەیەی خۆی بگۆڕێ، بۆ ئەوەی سەرمەشق بێ، بۆ سەرجەم مسوڵمانان لە دنیا (بەکەم گرتنو سادە ژیاندا، جا دەنگۆیەك بڵاوبووەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاوسەرەکانی تەڵاق داوە، هەموویان یان هەندێکیان، عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ): چوومە مزگەوت تەماشام کرد خەڵك بە چیلکەو شتی وا لە زیخو چەویانەوە دەژەنی، (وەك بڵێی دالْغەیان لێدابوو، خەمیان دەخوارد)، وە دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکانی خۆی تەڵاق داوە، کە ئەو کاتە جارێ پەردەگرتنەوەیان لەسەر پێویست نەکرابوو، (دیارە ئەوە لێرەدا بە کورتی هاتوە، ئەگەرنا وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، پێشێ چۆتە لای دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گلەیی لێکردوە عائیشەش گوتوویەتی: جا تۆ هەقی منت چییە؟ تۆ بچۆ چارەسەری گرفتی کچەکەی خۆت بکە، حەفصە، ئنجا چۆتە لای حەفصەو گلەیشی لەو کردوە، ئنجا دوایی دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەسەرهاتەکە بە تەفصیلێ هاتوە، دەرفەت نیە ئێستا هەمووی باس بکەین، وە هەندێ قسە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکاتو لێی دەپرسێ ئایا خێزانەکانت تەڵاق داوە؟ دەفەرموێ: نەخێر، ئەویش (اللّٰهُ أكبَر)ێك دەکات، منیش لە دەرگای مزگەوت هاوارم کرد، گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکانی تەڵاق نەداوە، وە لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ (کە ئەو هەواڵە درۆییە کە بڵاوبووەوەو، ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای یەکێکی وەك عومەر خوا لێی ڕازی بێ، کە توانای هەڵهێنجان (إستنباط)ی هەیە، نەیدەهێشت بڵاوببێتەوە، وەك دوایی هەواڵەکەی، یاخود بانگەشە درۆیەکەی، هەڵوەشاندەوە بە هەواڵی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ کە لە خێزانەکانی هەر تووڕە بووە، بەڵام تەڵاقی نەداونو وازی لێ نەهێناون، بەڵکو بەس لێیان دوورکەوتۆتەوە بە مەبەستی سەرزەنشت کردنو تەئدیب کردن).

## مانـای گـشــتـی ئایەتەکـــان

خـوای بـەرزو مـەزن لـە ئایــەتی ژمـارە (٧١)ی سـوورەتی (النـساء)ەوە دەسـت دەكات، بە باسكردنی بابەتێكی گرنگ كە جەنـگ و جیهادو فیداكارییـە لـە پێنـاوی دینـی خـوای پەروەردگـاردا، بـۆ جـاری پێنجـەم لـە سوورەتـی (النـساء)دا بـە نـازنـاوی ئیمـان مـسـوڵمانان دەدوێنـێ و دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنـاوە! وریـایی خۆتـان وەربگـرن، واتـە: لە خۆتـان وریـابن (حِذْر) بە مانای وریـاییە، یان هـەر شـتێكە كـە ئینـسان پێـی لـە خـۆ وریـا دەبـێ، وەك چـەك و قەڵـغان و هـەر شـتێك كـە وەك ئـامرازێك بەكاری بێنـێ، بۆئەوەی كە پێی لـە خـۆی وریابـێ، خـوا ﷻ لـەم ئایەتـەدا فـەرمان دەكـات بـە ئێمـەی ئیمانـدارو دەفـەرموێ: لـە خۆتـان وریـابن، هۆشـیاربن، ئنجـا دوایـی دەفەرموێ: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، كۆمەڵ كۆمەڵ بـۆ جیهادو جـەنگ بـچن، یـاخود تێكـڕا بـچن، دیـارە ئـەو دەسـتە دەسـتە بـوون، یـاخود بـە تێكڕایی جەنگ و جیهاد كردنە، دەگەڕێتـەوە بۆ حاڵەتـە جیـا جیاكـان، جـاری وایـە پێویـست دەكات مەفرەزەیەك بچـێ، ژمارەیەك جەنگاوەر بچـن، جـاری واش هەیـە وا پێویست دەكـات، هەموویان بچـن، جـا خـوای كاربـەجێ فـەرمان بـە هـەردووكیان دەكات، بە پێی حاڵـەتە جیاوازەكان، ئنجا خـوا ﷻ دێتـە سـەر باسـی خـستنەڕووی كەسانێك كە لەنێو مـسوڵمانـاندان، بـەڵام هەڵوێـستی سـەلبییان هەیـە لـە بەرانبـەر جەنگ و جیهادو فیداكاریی لە پێنـاوی ئیـسلام و پاراسـتنی حورمـەتی مـسوڵمانان و پاراستنی وڵاتی مـسوڵمانان و پاراسـتنی پیـرۆزییەكانی مـسـوڵمانـاندا، جـا هەنـدێ لـە توێـژەرەوانی قورئـان دەڵـێن: ئەوانـەی كـە لێـرەدا خــوای بــێ هــاوەڵ لــەم ئایەتانـەدا تا كۆتایی دەرسـەكەمان باسـیان دەكات، واتـە: تـا كۆتـایی ئـەو چـواردە ئایەتـە، هەنـدێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان ڕایـان وایـە كـە ئەوانـە دەغـەڵ و

موونافیقەکانن، هەندێکیش دەڵێن: نەخێر لەڕاستییدا هەر مسوڵمانن، بەڵام مسوڵمانی کرچو کاڵو ئیمان بێهێزن، کە من ڕای دووەمم پێ پەسەندە، چونکە خوای لێبووردە پێشێ دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لە خۆتان وریابن، دەستەو دەستەو تێکڕا هەمووتان بڕۆن بۆ جەنگ دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ ﴾، واتە: وە بێگومان لەنێو ئێوەدا کەسانێك هەن کە سستیی دەکەن، یاخود خەڵك سست دەکەن، کەواتە: دیارە مەبەست پێی مسوڵمانانن، بگرە ئیمانداران، نەك هەر مسوڵمانانی بە ڕواڵەتیی، چونکە موونافیقەکانیش بە ڕواڵەت مسوڵمان بوون، بەڵام دیارە ئەوانە مسوڵمانانێکی کرچو کاڵو سادەو، مسوڵمانانێکی ئیمان دانەمەزراو بوون، وە خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا هۆشیارییان دەداتێو ئامۆژگارییان دەکاتو بەرچاویان ڕوون دەکاتەوە، وە سەرزەنشتیان دەکات لەسەر کەموکوڕییەکانیان، بۆئەوەی کە خۆیان چاك بکەن، ئەم ڕایە زیاتر لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا دەگونجێ، وە لەگەڵ سەرەتای ئەم ئایەتانەش کە بە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دەست پێدەکات، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! مانای وایە دیارە ئەوانی دیکەش کە خوا ﷻ سەرزەنشتیان دەکاتو کەموکوڕییەکانیان دەخاتە ڕوو، هەر لە ڕیزی ئیمانداراندان، بەڵام دیارە ئیمانێکی مەحکەمو دامەزراویان نەبووە، بۆیە هەڵوێستەکانیشیان لەقەدەر ئیمانەکەیانە، وەك گوتراوە، (گۆزە چی تێدا بێ ئەوەی لێ دەرژێ)!! بە عەرەبییش دەڵێن: (وَكُلُّ إِنَاءٍ بِالَّذِي فِيهِ يَنْضَحُ)، واتە: هەر قاپە چی تێدابێ ئەوەی لێ دەرژێ، ئینسان لەقەدەر ئیمانی هەڵوێست دەنوێنێ، لەڕاستیدا کردەوەی ئینسانو هەڵوێستی ئینسانو ڕەفتاری ئینسانو ڕەوشتی ئینسان، هەمووی لەقەدەر ئیمانەکەیەتی ئیمان بناغەیە، وە کردەوەکانو هەڵوێستەکانو ڕەوشتەکان دیوارن لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەچنرێن، ئیمان وەك سەرچاوە وایە، هەڵوێستو کردەوەو ڕەفتارەکان وەك ئاوێکن کە لەو سەرچاوەیەوە هەڵدەقوڵێو دەڕوات، ئیمان وەك درەختێك وایە، وە بەرو میوەکەشی بریتییە لەو ڕەوشتو ڕەفتارو ئاکارو ئەو هەڵوێستانەی کە لێی

پەیدادەبــن، جـا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ ﴾، وە بێگومـان لـە نێـوان ئێـوەدا كەسـانێك هـەن كـە سـستی دەنـوێنن، واتـە: لـە كاتێكدا كـە پێیـان دەگـوترێ: وەرن بـۆ جـەنگ‌و جیهـاد، بـۆ بەرگرییـكردن لـە ئیـسلام‌و مـسوڵمانان سـستیی‌و تەنبـەڵیی دەنـوێنن، ئـەوە واتـایەكی، واتایـەكی دیكەشـی ئەوەیـە كـە غـەیری خۆیـان سـارد دەكەنـەوە، واتـە: ئـەوە هـیچ كـە بۆخۆیـان ناچـن، خەڵكـی دیكـەش سـارد دەكەنـەوەو، ئـەوانیش سـستو تەنبـەڵ دەكـەن، چـونكە: (أَبْطَـأَ، يُبْطِيءُ)وە (بَطَّأَ يُبَطِّيءُ) لـە زمـانی عەرەبییـدا دەگونجـێ (فعـل لازم) بـێ، واتـە: پێویسـتی بە (مَفْعُول) نەبێ، (أَبْطَـأَ) وە (بَطَّـأَ) واتە: سـسـتبوو، وە دەشـگونجـێ، (فعـل متعـدِّي) بـێ، واتـە غـەیری خـۆی سـست كـرد، كـە ئـەو كاتـە پێویـست بـە (مَفْعُول) دەكات، ئنجا دێتە سـەر باسی هەڵوێـستەكانی دیكـەیان: ﴿ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ﴾، ئەگەر چوون بۆ جەنگ‌و جیهادو بەڵایەكتان تووش بوو، دەڵـێ: خـوا چـاكەیەكی گـەورەی لەگـەڵ كـردووم كـە لەگـەڵیان نـەبووم‌و ئامـادەی ئـەو جەنگـە نـەبووم، كوردەواریی خۆمـان دەڵێن: (ئەوەی بچێ بۆ ڕاوە ماسی لەشـی هـەر تـەڕ دەبـێ)! لـە جـەنگ یـان دەكوژێ، یـان دەكـوژرێ، یـان برینـدار دەكـەی، یـان برینـدار دەبـی، نارەحـەت دەبی، برسـی دەبـی...هتـد، واتـە: ئەگـەرنا منـیش تووشـی ئـەو بـەڵاو نارەحـەتیی‌و گرفتارییـە دەبووم، ئـەوە لـە حاڵـەتی نەهاتییـدا، بـەڵام لـە حاڵـەتی هاتـدا: ﴿ وَلَئِنۡ أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴾، وە ئەگـەر لـە خـواوە بەخششێكتان تـووش بـوو، دەستكەوتێكتان دەستكەوتو، سـەركەوتنتان بەدەسـت هێنـاو، بە سـەلامەتیی گەڕانـەوە، ئـەو جـۆرە كەسـە وەك هـیچ خۆشـەویستییەك نەبـێ لـە نێـوانی ئێـوەو ئـەودا، دەڵـێ: ﴿ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ ﴾، خۆزگـە منـیش لەگەڵـیان بوومایـە ﴿ فَأَفُوزَ فَوۡزًا

عَظِيمًا ﴾، ئەو کاتە بردنەوەیەکی گەورەم دەستگیر دەبووو سەرکەوتنێکی گەورەم وەدەست دەهێنا، دەستکەوتێکی گەورەم دەبوو! تەماشا بکەن لە حاڵەتی یەکەمدا دەڵێ: خوا نیعمەتێکی گەورەی لەگەڵ کردووم کە لەوێ نەبووم، بۆچی؟ چونکە بریندار دەبووم، تووشی ناڕەحەتیی دەبووم، شەهید دەبووم، خوا شەهیدی دەفەرمووم!! لە حاڵەتی دووەمیشدا پێی وایە کە شتێکی زۆر گەورەی لە دەست چووە، کە لەوێ نەبووەو ئەمەش بۆتە هۆی ئەوە کە بەشدار نەبێ لەو دەستکەوتەدا، لەو سەرکەوتنەدا، واتە: هەم شکستەکەی پێ شتێکی زۆر گەورەیە، کە خوا پاراستوویەتی لێی، وە هەم دەستکەوتەکەشی پێی وایە کە ئامانجێکی زۆر گەورەی لەدەست چووە، جا ئەوە وەك عەرەب دەڵێن: (وتَعْظُمُ في عَينِ الصّغيرِ صغارُها، وَتَصْغُرُ في عَينِ العَظيمِ العَظائِمُ)، واتە: ئینسانی گچکە ئامانجی گچکەشی لەلا گەورە دەبێ، وە ئینسانی گەورە ئامانجی گەورەشی لەلا گچکە دەبێ، ئەوانە چونکە هەر دنیایان پێ شك هاتوە، لەبەرئەوە پێیانوابووە ئەگەر سەلامەت بن، ئەوە مانای وایە خوا نیعمەتێکی گەورەی لەگەڵ کردوون، بە بارەکەی دیکەشدا، ئەگەر سەرکەوتن‌و دەستکەوتێك وەدەست هاتبا، دەیگوت بریا لەگەڵ دابام، بۆئەوەی سەرکەوتنێکی گەورەم بەنسیب بووایە، ئەوەشی زۆر پێ گەورەیە ئەو دەستکەوتو غەنیمەتەی کە پشکی تێیدا نەبووەو لە دەستی چووە.

ئەوجار خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾، با لەڕێی خوادا بجەنگن کەسانێك کە ژیانی دنیا بە دواڕۆژ دەفرۆشن، واتە: دواڕۆژ هەڵدەبژێرن بەسەر دنیادا، چونکە تەنیا کەسێك جەنگ‌و جیهادی بۆ دەکرێ کە دواڕۆژی لە دنیا خۆشتر بوێ، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە لێرەدا خوا ﷻ هەر قسە لەگەڵ وان دەکات‌و دەفەرموێ: با ئەوانە لەڕێی خوادا بجەنگن، کە دنیا بە دواڕۆژ دەکڕن، چونکە ﴿ يَشْرُونَ ﴾، هەم دەگونجێ بە مانای دەکڕن (یشترون) بێ، هەم

دەشگونجێ بەمانای دەفرۆشن (يَبِيعُون) بێ، جا كەسێك دنیا بە دوارۆژ بدات، مانای وایە دوارۆژی هەڵبژاردوە، وە كەسێك دوارۆژ بە دنیا بدات، مانای وایە دنیای هەڵبژاردوە، هەردووك واتاكەش هەر ڕاستن، ئەگەر هی یەكەمیان بێ، واتە: خوای زانا مەدحی ئەوانە دەكات كە دوارۆژ بەسەر دنیادا هەڵدەبژێرن‌و دنیا بە دوارۆژ دەدەن، ئەگەر ئەوی دیكە بێ، دەفەرموێ: كەسانێك كە تا ئێستا دوارۆژیان بە دنیا داوەو، دنیایان كڕیوەو دوارۆژیان لە بەرانبەردا داناوە، با لەمەودوا وەزعەكەی خۆیان بگۆڕن: دنیا هیچ نیە، بابیكەنە نرخێك‌و دوارۆژی پێبكڕن، وە بتوانن لە ڕێی خوادا جەنگ‌و جیهاد بكەن، ﴿وَمَن يُقَـٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾، وە بێگومان هەر كەسێك لە ڕێی خوادا بجەنگێ‌و بكوژرێ، یان زاڵ بێ، ئەوە لەمەودوا پاداشتێكی مەزنی دەدەینەوە، كەواتە: لە هەردوو حاڵەتدا پاداشتی گەورەی هەیە، چ بكوژرێ‌و شەهید بێ، چ زاڵ بێ بەسەر دوژمنداو سەربكەوێ، لە هەردوو حاڵەتدا پاداشتی مەزنی خوای بەخشەر مسۆگەرە، كەواتە: بۆچی لە جەنگ‌و جیهاد دەترسێ؟

ئنجا خوا ﷻ بە سەرزەنشتەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَـٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَـٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾، واتە: ئەوە بۆچی ناجەنگن لە پێناوی خوادا؟ واتە: لە پێناوی بەرزكردنەوەی ناوی خوادا، لە پێناوی پاراستنی شەریعەتی خوای بێهاوەڵداو، لە پێناوی پاراستنی وڵاتی مسوڵماناندا، كە شەریعەتی لەسەر پیادە دەكرێ، وە لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەكانی مسوڵماناندا لەبەر ڕازیكردنی خوا، وە لە پێناو چەوسێنراواندا، واتە: بۆ دەربازكردنی ئەوان، ﴿مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ﴾، ئەو چەوسێنراوانە لە پیاوان‌و لە ژنان‌و لە مندالان ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ ﴾، ئەو

چەوســـێنراوانەی کـــە دەڵـــێن: ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا ﴾، پەروەردگـارمان! ئـەم شـارەی کـە خەڵـکەکەی سـتەمکارە دەربـازمان بکـە لـێی، لێـرەدا بـە یەکدەنگـیی هـەموو توێـژەرەوانی قورئـان مەبەسـت لـەو ﴿ ٱلْقَرْيَةِ ﴾، شـاری مەککـەیە، بـەڵام مـن پێموایـە وێـڕای (مەککـە)ی ئەوسـاکە هـەر شـارو ئاوەدانییـەکی دیکـەش دەگرێتـەوە کـە هەمـان حاڵـەتی هەبـێ‌و سـتەم‌و چەوساندنەوەی خەڵکی بێدەستەڵاتی تێدابێ.

وشەی: ﴿ ٱلْقَرْيَةِ ﴾، لـە بـەکارهێنانی قورئانـدا، واتـە: شـاری گـەورە، نـەك بـە مانـای گونـدو دێ، خەڵـکی مەککـە (موشـریکەکان) زوڵمیـان دەکـرد لـەو مـسوڵمانانەی کە لـەوێ بـوون، کـە هـەبوو ئیمانەکـەی خـۆی دەشاردەوە، خـوا ﷻ دەفـەرموێ: بۆچـی لـە پێنـاوی ڕزیکردنـی خـواو لـە پێنـاوی دەربـازکردنی ئـەو چەوسێنراوانە لە پیاوان‌و لە ژنـان‌و لـە منـداڵان جـەنگ ناکـەن، کـە دەپاڕێنـەوە دەڵێن: پەروەردگارمان! لەم شارە دەربازو قوتارمان بکە، کە خەڵکەکەی ستەمکارە ﴿ وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴾، وە لەلایـەن خۆتـەوە سـەرپەرشتێکمان بۆ بنێـرە، وە لەلایـەن خۆتـەوە پـشتیوان‌و یارمەتیدەرێکـمان بـۆ بنێرە، پشتمان بگـرەو لەو زوڵـم‌و مەینەتییە قوتارمان بکە.

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی هانـدەری جـەنگ‌و جیهـادی ئیمانـداران دەکـات، وە باسـی هاندەرو پاڵنـەری جـەنگ‌و شـەڕکردنی بێبـڕوایانیش دەکات‌و دەفـەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە، لـەڕێی خـوادا جـەنگ دەکەن، تەنیـا لەڕێـی خوادا، نە بۆ نـاوو شـۆرەتە، نە بـۆ ئـەوەیە بڵـێن ئـازان، نـە بـۆ دەسـتکەوت‌و غـەنیمەتە، نـە لەبـەرئەوەیە ڕقیـان لـە خەڵـك هەڵدەسـتێ، نـا، تەنیـا لەبـەر خۆشـەویستیی خوایـەو، لەبـەر ئەوەیـە کـە خـوا فـەرمانی کـردوە، لـە شوێنی خۆی‌و لە کاتی خۆیدا جەنـگ بکرێ، بۆیە جەنـگ دەکـەن، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟

﴿يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان لە ڕێی طاغووتداو لە پێناوی طاغووتدا جەنگ دەکەن، پێشتر باسمان کرد طاغووت هەر سەرکردەیەکە، بە لاڕێدا پێش خەڵك بکەوێ، بە ڕێی غەیری شەریعەتدا، وە هەواو ئارەزووی خۆی یان هەواو ئارەزووی غەیری خۆی لە خەڵك بکاتە دین‌و بەرنامەو بە سەریاندا بسەپێنێ، طاغووت واتە: سەرکردەیەك کە بەڕێی ناهەق (باطل)دا پێش خەڵك دەکەوێ‌و، دەیەوێ ئیدارەی خەڵك‌و وڵات لەسەر بناغەی ستەم‌و سەپاندن بکات، ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾، کەواتە: ئەی ئیمانداریـنە! ئەی مسوڵمانینە! بجەنگن لە دژی دۆستەکانی شەیتان، بێگومان فێڵ‌و پیلانی شەیتان بێهێزە، لێی مەترسێن، چونکە ئینسان لە بنەڕەتدا ئەگەر لە ڕووی مەعنەوییەوە لە دوژمن نەترسا، مانای وایە لە مەیدانیشدا پشتی تێناکات‌و لە بەرانبەریدا ناشکێ.

پاشان خوا ﷻ هەر لەسەر دەرخستن‌و کەشفکردنی خاڵە لاوازەکانی ئەو جۆرە کەسانە، کە لە مەیدانی جەنگ‌و ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگارییدا دامەزراو نین، لەسەر ئەوە بەردەوام دەبێ‌و دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە پێیان گوترا: دەستی خۆتان بگێڕنەوە، وە نوێژ بەرپا بکەن‌و زەکات بدەن! کاتی خۆی لە مەککە هەندێ لە هاوەڵان بە پێغەمبەری خوایان ﷺ دەگوت: مۆڵەتمان بدە با جەنگ بکەین‌و دەست بکەینەوە لەبەر کافرەکان، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: فەرمانم پێکراوە بە چاوپۆشیی‌و جەنگ لەگەڵ ئەو دوژمنانەدا مەکەن، کاتی نەهاتوە، جا دەفەرموێ: تۆ تەماشا ناکەی کاتی خۆی ئەوانە پێیان دەگوترا: دەست بگێڕنەوە، جارێ جەنگ مەکەن‌و سەرگەرمی بەرپاکردنی نوێژو زەکات دان بن، واتە: هەقی خوا جێبەجێ بکەن‌و هەقی خەڵك جێبەجێ بکەن، خۆتان لە ڕووی طاعەت‌و دینداریییەوە پێبگەیەنن،

﴿ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ ﴾، ئنجا کاتێك جەنگیان لەسەر پێویست کرا، هەتا پێویست نەکرابوو، دەیانگوت با بیکەین، کە لەسەریان پێویست کرا: ﴿ إِذَا فَرِيقٌ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةً ﴾، دەستەیەکیان، هەموویان نا هەندێکیان هێندە لە خەڵکی دەترسان، وەك ترسان لە خوا، ئاوا لە خەڵکی دەترسان، واتە: پێشێ زۆریان دەخوری و دوایی کەمیان دەبری!! جا پێشینان پەندێکیان هەیە دەڵێن: (ئەوەی زۆر بخورێ کەم دەبرێ)! هەروەها دەڵێن: (هەر ئاوێك خوڕڕەی هات بزانە تەنکە)! ئاوی مەند ئاوی قووڵە، بە بێدەنگی دێ، بەڵام ئاوی تەنك خوڕڕەی دێ، ئەوەی زۆر دەنگە دەنگو گاڵەو هەڕەشە بکات، کە سەری خەڵکی دەبرێو هەڵیان ناگرێتەوە، ئەوە زۆر تێیرا مەبینن! بەڵام ئەوەی دیکە مەرج نیە زۆر هەڕەشەو گوڕەشە بکات، وەك کوردەواریی دەڵێن: (لە ئاوی مەند بترسێ)! ئنجا ﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ ﴾، وە گوتیان: پەروەردگارمان! بۆ جەنگت لەسەر پێویست دەکردین جارێ؟ واتە: جارێ زوو بوو، خۆمان ئامادە نەکردبوو! لە مەککە دەیانگوت درەنگە، لێرەدا دەڵێن: زوویە، هەڵبەتە هەموویان نا هەندێکیان، ﴿ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ ﴾، دەبووایە دوات خستباین بۆ کاتێکی نزیك، تۆزێکی دیکەی مابوو، بنیادەم زۆر عەجایبە! جاری وایە پێشنیاران بۆ خوای کاربەجێش دەکات، دەڵێ: خوایە! ئەو شتە نەدەبوو وابێ، دەبوو وابێ!! ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئیمانەکە کرچو کاڵە، هەڵبەتە: هەندێ لە توێژەران دەڵێن: ئەوانە هەر مونافیقو دەغەڵن، بەڵام من ڕام وایە کە جاری وایە مسوڵمانی کرچو کاڵیش ئەو جۆرە بیرۆکەو ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەی دەبن، لەبەرئەوەی ئیمانەکەی کرچو کاڵو سادەیە، سەرکێڵەو کامڵ نەبووەو دانەمەزراوە، مەرج نیە هەرچی هەڵوێستێکی نەگونجاوی لێ بینراو، قسەیەکی نەشیاوی لێ بیسترا، یەکسەر مونافیقو دەغەڵ بێ، دەبینی ئیمانەکەی کرچو کاڵەو، جارێ کامڵ نەبووەو دانەمەزراوە،

جـا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، واتە: چەند شتێکیان پێ بڵێ، ئەی پێغەمبەر ﷺ! بڵێ:

یەکەم: ڕابواردنی دنیاو خۆشییو لەززەتی دنیا شتێکی کەمەو، لەچاو دوارۆژ زوو تێپەڕە، ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا ﴾.

دووەم: وە بۆ کەسێك کە پارێز بکات، ژیانی دوارۆژ باشترە، ﴿ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾.

سێیەم: وە بەقەدەر ئەو پەردە تەنکەی کە بەسەر نێوکە خورماوەیە نێوکی خورما نێوکە ڕەقەکەی شتێکی تەنکی بەسەرەوەیە، بەقەدەر ئەوەش ستەمتان لێناکرێ﴿ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾.

ئنجا خوا ﷻ شتێکی دیکەیان پێ دەفەرموێ: ﴿ أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ ﴾.

چوارەم: لە هەر جێیەکی بن مردنتان دەگاتێ، لێرەدا مردن وەك دڕندەیەك تەماشا کراوە، کە بەدوای کەسێکەوەیە دەیەوێ ڕاوی بکات، لە هەر جێیەك بن، مردنتان دەگاتێ، هەڵبەتە ئەوانەی کە زۆر لە مردن دەترسێنو زۆر لە دوژمن دەترسێنو ڕووحی فیداکارییان نیە، لە پێناوی خوادا، بۆ ئەوانە مردن شتێکی زۆر سامناکە، وەك دڕندەیەك وایە! ﴿ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖ ﴾، ئەگەر لەنێو قەڵا مەحکەمەکانیشدا بن، (بروج) کۆی (بُرج)ە واتە: قەڵا، (مُّشَيَّدَةٖ) واتە: بەرز هەڵچووەکان، یاخود سواغ کراوەکان، یاخود مەحکەم کراوەکان، ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، وە ئەوانە عادەتیان وایە ئەگەر چاکەیەکیان تووش بوو، نیعمەتێك، سەرکەوتنێك، خۆشییەك، دەڵێن: ئەمە لە خواوەیە، ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ

عِندِكَ ﴾، ئەگەر بەڵایەك خراپەیەكیان تووش بوو، دەڵێن: ئەمە لە تۆوەیە، مەبەستیان پێ پێغەمبەرە ﷺ، ﴿ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ ﴾، بڵێ: هەموویان نیعمەتەكانیش و نیقمەتەكانیش و، خۆشییەكان و، ناخۆشییەكانیش، خێرەكەش و شەڕەكەش، هەمووی لە خواوەیە، وەك تەقدیرو ئەندازەگیریی، وەك ویست و ئیرادەی خوای بالادەست، كە هەموو شتێك دەگرێتەوەوە گشتگیرە بۆ هەموو شتێك، ﴿ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ حَدِيثٗا ﴾، ئەو كۆمەڵە بۆچی وان؟ خەریكن لە قسە تێنەگەن، چۆن دەبێ بڵێن: ئەگەر خۆشیی بوو لە خواوەیەو، ئەگەر ناخۆشیی بوو خەتای پێغەمبەرە ﷺ ! ئەگەر مەبەستیان پێ ئیرادەو ویست بێ، هەموو شتێك بە ویست و ئیرادەی خوای زاڵ و مەزنە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ﴾، هەر نیعمەتێكت تووش بێ ئەی پێغەمبەر! ﷺ، یاخود ئەی ئەو كەسەی كە قورئان دەخوێنی! ئەوە لە خواوەیەو، هەموو چاكەو نیعمەتێك لە خواوەیە ﴿ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ ﴾، وە هەر خراپەیەكیشت تووش بێ، لەخۆتەوەیە، دیارە ئەمە تێكناگیرێ لەگەڵ ئەوەی پێشی، ئەوەی پێشی دەفەرموێ: هەموو شتێك بە ئەندازەگیریی خوایە، بەویستی خوایە، بەڵام لێرەدا هۆكارەكەی بەیان دەكات، هۆكاری نیعمەتەكان خوایە، بەڵام هۆكاری خراپەو كەموكوڕییەكان، خۆمانین، هەمووی بە ویستی خوایە، بەڵام هۆكارەكەی ئەگەر خراپە بێ، غەڵەتێك بێ، كەموكوڕییەك بێ، بەڵایەك بێ، خەتای خۆتەو، ئەگەر چاكەیەكیش بێ، ئەوە بەخشش و فەزڵی خوای پەروەردگارە، ﴿ وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴾، وە تۆمان بە ڕەوانەكراو بۆ لای خەڵك ناردوە، وە بەسە خوا چاودێربێ و ئاگاداربێ و شایەدبێ بەسەر هەموو شتێكەوە.

ئنجا خوا ﷻ ڕاستییەکی زۆر گەورە بەیان دەکات، کە لە ئایەتەکانی ڕابردووشدا هەر فەرموویەتی: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾، هەر کەسێك فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە فەرمانبەریی خوای کردوە، لە هەر شتێکدا بە قسەی پێغەمبەر ﷺ بکەی، بە قسەی خوای بەرزو مەزنت کردوە، چونکە خوا دەفەرموێ: دەبێ بە قسەی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾، هەر کەسێکیش پشتی هەڵکردو پشتی لە تۆ کردو ڕووی وەرگێڕا لە تۆ، ﴿فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾، ئەوە ئێمە تۆمان نەناردوە پارێزەربی بەسەریانەوە، واتە: ئەی پێغەمبەر! ﷺ ئەوەی بە قسەت دەکاتو فەرمانبەریی بۆ تۆ دەبێو بۆ تۆ گوێڕایەڵ دەبێ، ئەوە بە قسەی خوای خۆی کردوەو پاداشتەکەی لەلای خوایە، ئەوەی پشتیش لە تۆ بکاتو بە قسەت نەکاتو ڕووت لێ وەربگێڕێ، ئەوە تۆ گوناح بارنیو لەسەر ئەوە لێت ناپرسرێتەوە: بۆچی فلان کەس پشتی تێکردی؟ چونکە تۆ پارێزەرنی بەسەریانەوە، تۆ ئاگادارکەرەوەیو ڕێنماییکەری، بەلام ناتوانی بیانپارێزی لەوەی کە لانەدەنو غەڵەتو گوناح نەکەن.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات ﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ﴾، وە ئەوانە هەتا لە ڕووی تۆدا قسە دەکەنو لە مەجلیسی تۆنو بەرەو ڕووتن، دەڵێن: (طَاعَةٌ: يعني أَمرُك طَاعَة)، فەرمانی تۆ فەرمانبەریی بۆ دەکرێ، قسەی تۆ جێبەجێ دەکرێ، ئەی پێغەمبەر ﷺ! واتە: تا لە ڕووی تۆدانو لە کۆڕو مەجلیسی تۆدان، هیچ عەیبیان نیە، ﴿فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ﴾، بەلام کاتێك لەلای تۆ هەڵسان، کۆمەڵێکیان شتێکی دیکە دەڵێ، جیا لەوەی کە لەلای تۆ گوتوویەتی، ئەم واتایە کاتێکە کە ڕاناوی: ﴿تَقُولُ﴾، بچێتەوە بۆ لای ﴿طَآئِفَةٌ﴾، بەلام ئەگەر بچێتەوە بۆ لای

پێغەمبەر ﷺ واتە: کاتێك کە لە لای تۆن دەڵێن: لە قسەی تۆ دەرناچینو فەرمانبەریین، بەڵام کە پشتت تێدەکەن، شتێکی دیکە رێك دەخەنو پیلانێکی دیکە دەگێڕنو بە جۆرێکی دیکە لەگەڵ تۆدا مامەڵە دەکەن، جیاواز لەوەی کە تۆ فەرمووتە، واتە: قسەکەت دەگۆڕن ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٌ﴾، (بَيَّتَ) یانی: بە شەوێ تەگبیریان کرد، دەڵێ: (بُيّتَ هَذَا الأمْرُ بليل) ئەوە لە زمانی عەرەبیدا، واتە: ئەو کارە، ئەو تەگبیرە، بە شەوێ کراوەو بە شەوێ رێك خراوە، واتە: تا لەرووی تۆدان ئەوە هیچی تێدا ناهێڵنەوەو دەڵێن: لە خزمەتینو بە هەموو شێوەیەك فەرمانبەریین، بەڵام کە هەڵدەستن بە شەوو بە پەنهانیی پیلانێکی دیکە، وە تەگبیرێکی دیکە دەکەن، پێچەوانەی ئەوەی کە لە لای گوتوویانە، یان پێچەوانەی ئەوە کە تۆ فەرمووتە.

جا ئایا پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟ دەفەرموێ: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾، وازیان لێبێنە، وە پشت بە خوا ببەستە، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾، بەسە خوا کار پێسپێردراو بێ، ﴿وَكِيلًا﴾، یانی: کار پێسپێردراو، ئەگەر تۆ کاری خۆت بە خوا بسپێری، خوات بەسە، کەواتە: وازیان لێ بێنەو، پشتگوێیان بخە، وە پشتیشت بە خوا قاییم بێو لێیان مەترسێ، لێرەدا ئەوانە زیاتر لەوە نزیك دەبنەوە کە مونافیقو دەغەڵ بن، چونکە کەسێك پیلان دەگێڕێ لە دژی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان، کە مسوڵمان نەبێ، دەشگونجێ لێرەدا بە تایبەت لەگەڵ دەغەڵەکانی بێ، یاخود لەگەڵ مسوڵمانانێکی زۆر سادە کە مونافیقو دەغەڵەکان ئیستغلالیان دەکەن، ئەوەش هەر دەگونجێ، هەیە مسوڵمانە، بەڵام سەرکێڵو سادەو خۆش باوەڕەو حیزبێکی کافر، سەرکردەیەکی کافر، کەسێکی بێبڕوا ئیستیغلالی دەکاتو بەکاری دێنێ وەك ئامرازێك.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴾، ئایا لە قورئانێ ڕانامێنن، لە قورئان نافکرن، بیری لێناکەنەوە، خۆ ئەگەر لە لای جگە لە خواوە بووایە، جیاوازیی‌و ناکۆکیی زۆریان تێدا دەبینی، واتە: ئایەتەکان تێکدەگیران، من پێموایە ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەو دوو ئایەتەی پێشێ، کەوا نەزانن تێکدەگیرێن، چونکە ئەوەی پێشێ کە دەفەرموێ: ئەگەر چاکەیەکیان تووش بێ دەڵێن: لە خواوەیەو ئەگەر خراپەیەك بێ دەڵێن: لە تۆوەیە، خوای بەرزیش دەفەرموێ بڵێ: هەمووی لەلایەن خواوەیە، کە بە ڕواڵەت تێکدەگیرێن، بەڵام وانیەو وەك پێشتر گوتمان مانایەکەیان ئاوایە: مەبەست لە هی یەکەم ئەوەیە: کە هەمووی بە ویست‌و بڕیاری خوایە، بەڵام هی دووەم کە دەفەرموێ: ئەگەر چاکەت تووش بێ، لە خواوەیەو ئەگەر خراپەت تووش بێ لە خۆتەوەیە، واتە: هۆکاری هەموو نیعمەت‌و چاکەکان خوایەو، هۆکاری خراپەو کەموکوڕییەکانیش خۆتی، بۆیە تێکناگیرێن.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ ﴾، وە کاتێك هەواڵێکیان پێدەگات کە پەیوەندیی بە هێمنیی‌و ئاساییشەوە هەبێ یاخود پەیوەندیی بە ترسەوە هەبێ بۆ وێنە: دوژمنێك بەسەر مەدینەدا بدات‌و هێرش بکات، یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە، ﴿ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر ئەو هەواڵەیان گێڕابایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە بۆ لای کاربەدەستانی مسسوڵمانان‌و مشوورخۆرانیان، ﴿ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾، ئەوانەی کە توانای هەڵهێنجانیان هەیەو توانای ئەنجامگیرییان هەیە لە قسەو هەواڵان، ئەوانە دەیانزانی کە ئایا ئەو هەواڵە بڵاوبکرێتەوە، یان بڵاونەکرێتەوە؟ یان

ئەو بانگەشەیە ڕاستە، یان درۆیە؟! بۆیە دەبوو گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ لای مشوورخۆرو کاربەدەستانی خۆیان، نەك یەکسەر بڵاوی بکەنەوە، ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَـٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾، وە ئەگەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە بەسەر ئێوەوە، جگە لە کەمێکتان، هەمووتان بە دوای شەیتان دەکەوتن، بەڵام خوا ﷻ بە بەخششی خۆیو بە ڕەحمەتی خۆی وای لێکردوون ئیمانی دامەزراو کردوون، کە خواتان خۆشتر دەوێ لە غەیری خوا، بۆیە بە دوای شەیتان ناکەون، بەڵام ئەگەر بەخششی خواو بەزەیی خوا نەبووایە، جگە لە کەمێکتان هەمووتان بە دوای دەکەوتن، بەڵام کەمێکتان دیارە فیطرەتەکان ئەوەندە پاكو مەعدەنەکەتان ئەوەندە ساغە، بەپێی ئەو فیطرەتەی خۆتان ڕێی ڕاستتان هەر دەگرت.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ﴾، لە ڕێی خوادا بجەنگە بەس خۆتت لەسەر پێویستە، واتە: بەس لەسەر خۆت پێویست کراوە ﴿ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بەڵام ئیماندارانیش هان بدە، هانیان بدە کە جەنگ بکەنو فیداکاریی بکەنو لە پێناوی خوادا، ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، نزیکە خوا بە هۆی جەنگو جیهادی ئێوەوە، زەبری کافرەکان بەرپەرچ بداتەوە، هێرشیان بەرپەرچ بداتەوەو، ئەو تینو فشارەی کە بۆ مسوڵمانانی دێنن، لووتیان بشکێو بەرپەرچ بدرێنەوە، ﴿ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴾، وە بێگومان خوا زەبری زۆر توندترە، وە سزاو جەزرەبەشی زۆر توندترە لە هی دوژمنتانو کافرانێك کە دژایەتیی ئێوە دەکەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! لە خۆتان وریابن، وشەی: ﴿ خُذُوا۟ ﴾ واتە: وەربگرن، ﴿ حِذْرَكُمْ ﴾ واتە: شتێك كە خۆی پێ دەپارێزن، هەندێکیان گوتوویانە: یانی (أسْلِحَتَكُم)، بەلاّم لەڕاستییدا وشەی: (حِذْر) بەلّێ دەگونجێ بە مانای چەکیش بێ، بەلاّم بە مانای غەیری چەکیش دێ، واتە: هەر شتێك كە دەبێتە هۆی ئەوە كە وریایی خۆتانی پێبکەن، پارێزی پێ لەخۆتان بکەن، لێرەدا ئەم ئایەتە موبارەکەو ئەم ڕستە بە بڕستە ئەوە دەگەیەنێ، کە لە خۆ وریابوونی مسوڵمانانو هۆشیاربوونیان پێویستە.

ئینجا لە خۆ وریابوون لە هەر حاڵەداو لە هەر مەقامەدا بە چەند شێوەیەك دەکرێ:

١/ لە ڕووی هەواڵگیرییەوە، دەبێ بە شێوەیەك وریابی، خەڵك هەڵتنەخەڵەتێنیو جاسووسو سیخوڕت بنێرێتە نێوو زانیارییت لێ بدزێ.

٢/ وە لە ڕووی سەربازییەوە، کە لە جەنگ دای لە بەرەی جەنگدا، بە شێوەیەکی دیکە وریایی لە خۆت دەکەی.

٣/ وە لە ڕووی بازرگانییەوە بە شێوەیەکی دیکە دەکرێ.

٤/ وە لە ڕووی سیاسییەوە بە شێوەیەکی دیکە وریایی دەکرێ، کە هەڵوێستی سیاسی نەدۆڕێنی.

٥/ وە لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە دەبێ وریابی قسەیەکت لە دەم دەرنەچێ کە بە کەڵك نەیەتو، ناشەرعیی بێ ... هتد، بە هەرحاڵ خوا ﷻ کە

دەفەرموێ: ﴿ خُذُواْ حِذْرَكُمْ ﴾، لە خۆتان وریابن، هۆشیاربن، یانی: لە هەموو بوارەکاندا، ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە ئێمە مادام پشت بە خوا دەبەستینو پشتمان بەو قایمە، چ پێویست دەکات هێندە لە خۆمان وریابین؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە لەڕاستییدا پشت بە خوا بەستن، لەگەڵ لە خۆ وریابوون تێکناگیرێ، ئەو خوایەی کە پێت دەفەرموێ: تەنیا پشت بە من ببەستە، هەر ئەویش پێت دەفەرموێ: وریابە، خوا کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾آل عمران، واتە: با ئیمانداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، هەر ئەویش دەفەرموێ: لە خۆتان وریابن، کەواتە: هەردووکی خوا فەرموویەتی، مادام وایە نابێ تێکبگیرێن، ئەوە لەلایەك، پاشان پشت بە خوا بەستن، زیاتر پەیوەندیی بە دڵو دەروونەوە هەیە، بەڵام لە خۆ وریابوون، پەیوەندیی بە لایەنی هۆکارەکانەوە هەیە، واتە: ئیمانداران دەبێ تەنیا پشت بە خوا ببەستنو، تەنیا خوا بکەن بە وەکیل بۆ کاروباری دینو دنیا، ئەوە مانای (تَوَكُّل)ە، جا ئایا پشت بە خوا بەستنو خوا کردنە وەکیلی خۆمان، مانای وایە ئێمە گوێ نەدەینە هۆکارەکان؟ نەخێر، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: ﴿عَنْ أنَسِ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاء رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَرَادَ أَنْ يترك ناقَتَهُ، وَقَالَ: أَأَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ؟ فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: إِعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ﴾ (أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣١)، والتِّرمِذِي برقم: (٢٦١٧)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني)، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ویستی حوشترەکەی بەرەڵڵا بکات لە دەرێ، وە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئایا بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم، یاخود بەرهەڵدای بکەمو پشت بە خوا ببەستم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە، کەواتە: بەستنەوە

پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، بەڵکو تەواوکەری یەکدین، بەڵکو ئەگەر پشتت بە خوا بەست، دەبێ دڵت بە خواوە پەیوەست بێ، بەڵام دەبێ دەستت بە هۆکارەکانەوە بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە.

ئنجا (قُرطُبي) خاوەنی تەفسیری (الجامع لأحكام القُرآن) هەروەها هەندێك لە توێژەرەوانی دیکەش لە کاردانەوەیان بۆ (مُعْتَزِلَة)، کە دیارە (مُعْتَزِلَة) زۆر جەختیان لەسەر عەقڵ کردۆتەوە، وە لەو بابەتەشدا زۆر جەختیان کردۆتەوە کە ئینسان هۆکارەکان ڕەچاو بکات، لە کاردانەوەی ئەواندا، هەندێك لە زانایانی خۆمان، یەکێك لەوان (قُرطُبي) کە توێژەرەوەیەکی گەورەی قورئانە، تووشی هەڵەیەك بووە، بابزانین داخۆ دەڵێ چی؟ دەڵێ: (خِلَافاً لِلْقَدَرِيَة فِي قَوْلِهِم: إنَّ الحَذَرَ يَدْفَعُ وَيَمْنَعُ مِنْ مَكَائِدِ الأَعْدَاءِ، وَلَوْ لَمْ يَكُن كَذَلِكَ مَا كَانَ لأمرُهُمْ بَالحَذَر مَعْنَىً، فَيُقَالُ لَهُمْ: لَيْسَ فِي الآيَة دَلِيلٌ عَلَى أنَّ الحَذَرَ يَنْفَعُ مِنَ القَدَرِ شَيْئاً، وَلَكِنَّا تَعَبَّدنا بِأَلاّ نُلْقِي بِأَيدِينَا إلى التَّهْلُكَةِ)[1]، واتە: (قُرطُبي) دەڵێ: بە پێچەوانەی ئەوەوە کە قەدەرییەکان (مُعْتَزِلَة) دەیڵێن، کە دەڵێن: ئەگەر لە خۆ وریابوون سوودی نەبووایە، پیلانی دوژمنانی لە کۆڵ نەکردباینەوە، ئەوە هیچ مانای نەدەبوو کە خوا فەرمانمان پێبکاتو بفەرموێ: لە خۆ وریابن، (قسەکەیان ڕاستە، بەڵام قورتووبی دەڵێ:) نا پێیان دەگوترێ: لە ئایەتەکەدا هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە کە ئەگەر لە خۆمان وریابین، هیچ لە قەدەری خوا دەگۆڕێ، بەڵام خوا وەك بەندایەتیی کردن بۆخۆی پێی فەرمووین، کە خۆمان نەخەینە فەوتانەوە.

لێرەدا (قُرطُبي) ڕەحمەتی خوای لێبێو خوا لێی خۆشبێ، وایزانیوە کە لە خۆ وریابوون جیایە لە قەدەری خوا، بەڵام لە خۆ وریابوونیش بەشێکە لە قەدەری خوا، وەك: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٢٤٠).

ڕازی بێ خەلیفەی مسولْمانان بوو ویستی بچێ بۆ شام، بیستی لە شوێنێك لە شام طاعوون بلاوبۆتەوە، ڕاوێژی بە هاوەلان کرد: بچین بۆ شام یان بگەڕێینەوە؟ گوتیان: با بگەڕێینەوە، بڕیاریدا بگەڕێنەوە، ﴿فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ ﷺ أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ فَقَالَ: عُمَرُ ﷺ لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ لَجَعَلْتَهُ نَكَالاً لِلنَّاسِ، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ فَهَبَطْتَ وَادِيًا لَهُ عُدْوَتَانِ إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ﴾؟! أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٥٧٢٩)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٥٧٤٥)، واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئایا لە قەدەری خوا ڕادەکەی؟ عومەر، خوا لێی ڕازی بێ گوتی: ئەبو عوبەیدە ئەگەر تۆ نەبای یەکێکی دیکە ئەو قسەیەی کردبایە، دەمکردە پەند بۆ خەلْکی (واتە: سزام دەدا)، بەلْێ لە قەدەری خوا بۆ قەدەری خوا ڕادەکەین، (دوایی وێنەیەکی بۆ هێنایەوەو گوتی) ئایا ئەگەر تۆ ڕانە حوشترێکت پێبێ، وە دۆلْێك دوو لای هەبن، لایەکیان پڕبێ لە لەوەڕو گیا، لایەکیشیان قاتو قڕو دێمەکاربێ، ئەگەر لە هەر دۆلْێکیان دا بیانلەوەڕێنی هەر بە قەدەری خوا نیە؟ گوتی: با، گوتی: بەلام ئەگەر لەو شوێنە کە لەوەڕی تێدابێ بیلەوەڕێنی، قازانج دەکەی، لەویدیکەش زەرەر دەکەی).

بەلْێ لەڕاستییدا ئێمە کە لە خۆشمان وریا دەبین، وریا بوونیش بە قەدەری خوایە، چونکە قەدەری خوا وەك ئاسمان وایە، هەرگیز لە بنی ناچییە دەرێ، کەسێك کە خۆی دەکوژێ، بە قەدەری خوا خۆی دەکوژێ، ئەوەی وریاش دەبێ، بە قەدەری خوا وریا دەبێ، ئەوەی دەرمان دەخواو چاك دەبێتەوە لە نەخۆشیی، بە قەدەری خوا چاك بۆتەوە، وە ئەوەی کە دەرمانیش ناخواتو دەمرێ، ئەویش بە قەدەری خوا مردوە، بەلام خوا دەفەرموێ: دەرمان بەکاربێنن و دەفەرموێ: لە خۆتان وریابن، وە دەفەرموێ: پێداویستییەکانی جەنگ ئامادە بکەن، وە دەفەرموێ: بۆ کارەکانتان

هۆکارەکان دابین بکەن، جا ئەوەی هۆکارەکان دابین دەکات، هەر بە قەدەری خوا دابینی کردوون، وە هۆکارەکانیش سوودی پێدەگەیەنن، وە ئەوەی هۆکارەکانیش دابین نەکات، بە قەدەری خوا وایکردوە، بەلاّم لەسەری گوناهبارە، چونکە خوا فەرموویەتی: هۆکارەکان دابین بکەن، وەك خوای پەروەردگار دەربارەی (ذو القرنين) دەفەرموێ: ﴿ ...وَءَاتَيْنَهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾الكهف، واتە: بۆ هەموو شتێك هۆکارێکمان پێدابوو، ئەویش بە دوای هۆکارەکە دەکەوت، وە سەرەنجام کارەکەی کرد.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوای زاڵو بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، دەستە دەستە بڕۆن بۆ جەنگ، یاخود بە تێکڕایی بڕۆن، وەك پێشتریش گوتم: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی مسوڵمانان، جاری وایە پێویست دەکات مەفرەزە مەفرەزە بچن، وە جاری وایە پێویست دەکات هەموو پێکەوە بچین، وەك لەشکرێك، وشەی: (نَفَر) واتە: ڕۆیی بۆ جەنگ، پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمان کرد، لە ئەسڵدا وشەی: (نَفْر) ئەوەیە کە لە شتێك بسڵەمیەوە، یان بە پەلە پەل بەرەو شتێك بچی، بەلاّم لە قورئاندا (نَفَرَ) یاخود (إنْفِرُوا) بە زۆریی بۆ چوونە جەنگ بەکارهاتوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ...﴿٣٨﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆچی ئەگەر پێتان بگوترێ: هێرش بکەن لە پێناوی خوادا، هەندێکتان خۆ بەزەوییەوە دەنووسێنن!!

٢- ﴿ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ...﴿٣٩﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەگەر نەڕۆن بۆ جەنگ ئەوە خوا سزایەکی بە ئێشتان دەدات.

٣- ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴿٤١﴾ ﴾ التوبة، واتە: بچن بۆ جەنگ بە سووکیی‌و بە قورسیی، وە لە ڕێی خوادا تێبکۆشن بەماڵ‌و سامانتان‌و بە گیانتان.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، مانای وایە جەنگ فەرزە، دیارە جەنگ لە حاڵەتی ئاساییدا (فَرْضُ الْكِفَايَة)یە، بەڵام لە هەندێك حاڵدا دەبێتە (فَرْضِ الْعَيْن)، (فَرْضِ الْكِفَايَة) ئەوەیە ئەگەر کۆمەڵێك لە مسوڵمانان بیکەن ئامانجەکە بێتە دی‌و تەحقیق ببێ[1]، بەڵام (فَرْضِ الْعَيْن) ئەوەیە دەبێ تاك تاکی مسوڵمانان بەوکارە هەڵسن[2]، وەك پێنج نوێژە فەرزەکان.

(إبْنُ خُويزَ مَنداد) کە یەکێکە لە زانایانی حەنەفی مەزهەب دەڵێ: (إنَّ هَذِهِ الآيةَ مَنْسوخَةٌ بِقَوْلِهِ تَبارَكَ وَتَعالَى: ﴿ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ...﴿٣٩﴾ ﴾ وبِقَوْلِهِ: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ...﴿٤١﴾ ﴾التوبة)، واتە: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: دەستە دەستەو بە تێکڕا بڕۆن بۆ جەنگ، نەسخ کراوەتەوە بەو ئایەتەی خوا کە دەفەرموێ: بە سووکیی‌و بە قورسیی بڕۆن، وە بەو ئایەتەی دیکە کە دەفەرموێ: ئەگەر نەڕۆن بۆ جەنگ خوا سزایەکی بە ئێشتان دەدات، بەڵام (قُرطُبي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، جوان وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: (ولأن يكون ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾، مَنْسوخاً بِقَوْلِهِ: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، وبِقَوْلِهِ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً...﴿١٢٢﴾ ﴾، أَولى؛ لأن فَرْضَ الجِهادِ تَقَرَّرَ عَلَى الكِفايَةِ، فَمَتَى

---

١) الواجب الكفائي: هو ما طلب الشارعُ حصولَه من جماعة المكلَّفين، لا من كل فردٍ منهم... الوجيز في أصول الفقه، ص: (٣٦).

٢) الوجب العَيني: هو ما توجَّه فيه الطَّلَبُ اللازمُ الى كل مكلَّف ... الوجير ، ص:(٣٦).

سَدَّ الثغُورَ بَعْضُ المُسْلِمِينَ أُسْقِطَ الفَرضُ عَنِ البَاقِين. وَالصَّحِيحُ أنَّ الآيَتَينِ جَمِيعَاً مُحْكَمَتَانِ، إحْدَاهُمَا فِي الوَّقْتِ الذِي يُحْتَاجُ فِيهِ إلى تَعيّنِ الجَمْيعِ، والأخْرَى عِنْدَ الإكتفاءِ بِطَائِفَةٍ دُونَ غَيْرِهَا)[1]، (قُرطُبي) لێرەدا بەرپەرچی (إبْنُ خُويزَ مَنْدَاد) دەداتەوە کە دەڵێ: ئەم ئایەتە مەنسووخە (دیارە ئێمە پێشتر باسمان کردوە کە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا مەنسووخ نیە)، (قُرطُبي) دەڵێ: ئەگەر بڵێین: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾، مەنسووخ بۆتەوە بەم ئایەتەی ئێرە کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، وە بەوەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً...﴿١٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەگەر بڵێین ئەم ئایەتەی سوورەتی (النساء) وە ئەوەی کۆتایی سوورەتی (التوبة) ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً...﴿١٢٢﴾ ﴾، ئایەتی: ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾یان نەسخ کردۆتەوە، زیاتر ڕێی تێدەچێ، بۆچی؟ دەڵێ: چونکە جەنگو جیهاد فەرزی کیفایەیە، کەواتە: ئەگەر کۆمەڵێك لە مسوڵمانان توانیان سنووری وڵاتی مسوڵمانانی بپارێزن، مانای وایە ئەرکەکە لەسەر ئەوانی دیکە لاچووە، واتە: ئەگەر بەدەستەیەك لە مسوڵمانان، ئامانجی جەنگ تەحقیق بێ، پێویست ناکات هەموویان بچن (ئیبنو خوەیز مەنداد بۆچی پێی وایە مەنسووخە دەڵێ: چونکە خوا دەفەرموێ: دەستە دەستە، یاخود هەموو تێکڕا بچن، بەڵام ئایەتەکانی دیکە دەڵێن: هەمووتان تێکڕا بچن) (قُرطُبي)یش دەڵێ: ئەگەر بە دەستەیەك ئەو ئامانجە جیهادییە جێبەجێ بێ، مانای وایە جیهاد لە ئەسڵدا فەرزی کیفایەیە، کەواتە: ئەو کەمە مادام کیفایەت بکەن، لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێ، بەڵام ئەگەر ئامانجەکە نەهاتە دی حوکمەکەی جیاوازە. جا دوایی دەڵێ: (وَالصَّحِيحُ أنَّ الآيَتَينِ جَمِيعَاً مُحْكَمَتَانِ، إحْدَاهُمَا فِي الوَّقْتِ الذِي يُحْتَاجُ

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٢٤١).

فِيـهِ إِلـى تَعيُّن الجَمْيـعِ، والأخْرَى عِنْدَ الإكتفاءِ بِطَائِفَـةٍ دُونَ غَيْرِهَا) ڕاست ئەوەیـە کـە ئایەتەکـان هـەردووکیان موحکـەمن‌و هیـچیان مەنـسـووخ نـین، یەکێکـیان لەوکـاتەدا کـە پێویـسـت دەکـات هـەموو بـچـن کـە دەفـەرموێ:

﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، ئـەوە ئەگـەر پێویـسـت بکـات هـەموو بچـن دەبـێ هەموو بچن، ئـەوی دیکەشیان لەوکـاتەدایە کە بەدەستەیەك‌و بـە کۆمـەڵێکیان ئامانجەکـە تەحقیـق بـێ، کەواتـە: ئایەتەکـە کـە دەفـەرموێ:

﴿ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا ﴾، کۆمـەڵ کۆمـەڵ بچـن یان هـەموو بـچـن، ئـەوە کۆمـەڵ کۆمـەڵ، کاتێك کە بـە کۆمەڵـێك ئامانجـەکە بێتـە دی، بـەڵام ئەگـەر بـە هـەمووان نەبـێ، ئامانجەکـە جێبەجـێ نەبـێ بـە هـەمووان نەبـێ وڵاتەکە نەپـارێزرێ، دەبـێ هـەموویان بـچـن، کەواتـە: پێویـسـت ناکات بڵـێین مەنـسـووخە، چـونکە نەسـخ ئەوەیـە کـە ئـەو دوو ئایەتـە تێکبگیـرێن‌و هـیچ تێکگیـرانێکـیش لێـرەدا نیـە.

<u>**مەسـەلەی سـێیەم:**</u> کە خـوای شـارەزا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ ﴾، لـە ئێـوەدا کەسانێك هەن کە سـستیی دەکەن، یاخود خەڵك سست دەکەن‌و خەڵك دوادەخـەن، هەردوو واتاکەی هەیە، پێشـتر باسـمان کـرد کـە ئەگـەر (لازم) بـێ، واتـە: خـۆی سـستە، (بَطَّـأَ) یـانی: سـست بـوو و تەنبـەڵ بـوو، وە ئەگـەر (مُتَعَـدّي) بوو واتـە: غـەیری خۆی دواخـسـت‌و نەیهێشـت بـچـێ بـۆ جـەنگ‌و جیهـاد، وە لەڕاسـتییدا لە یەك کاتیشـدا دەگونجـێ بڵـێین: ئـەو جـۆرە کەسـەی کە بۆخـۆی تەنبەڵ‌و سـسـت بـێ، پێی خۆشـە خەڵکی دیکەش تەنبـەڵ‌و سـسـت بـێ، وە بە تەئکید ئەوەی کە بـە خەڵـکی بڵـێ مەچن، بۆخـۆی هـەر ناچـێ، بەڵام کەسی واش هەیە کە بۆخۆی ئیـشی چـاك ناکات، پێـی خۆشـە خـەڵکیش نـەیکات، بۆئـەوەی کـە عـەیبی خـۆی زۆر دەرنەکـەوێ‌و کەموکورییەکـانی زۆر دەرنەکەون، ئەگـەر هەر بە تەنیا بەجێ بمێنـێ دەڵـێن: ئەوە بـۆ بەجێمـاوی؟! بەڵام ئەگەر هی دیکـەی لەگـەڵدابن، دەڵـێ: ئنجا خۆ کـەس نـەچووە!!

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾،

لێرەدا خوای زاناو شارەزا ماهییەتو جەوهەری ئەو جۆرە کەسانەمان بۆ دەردەخات، کە وەك گوتم: من ئەو ڕایەم پەسند کرد، کە مسوڵمانانی سادەو کرچو کاڵو نەکامڵن، وە ئیمانیان دانەمەزراوە، دەفەرموێ: ئەگەر بەڵایەکیان تووش بێ دەڵێن: خوا چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ کردم، کە من ئامادەی ئەو جەنگو جیهادە نەبوومو تووشی ئەو بەڵایە نەبووم، بەڵام ئەگەر لە خواوە بەخششێکتان دەستبکەوێ، سەرکەوتنێك، دەستکەوتێك، هەرچی بێ، ئەوە دەڵێ: وەك هیچ خۆشەویستییەك لە نێوان ئێوەو ئەواندا نەبووبێ، دەڵێ: بریا منیش لەگەڵ ئەواندا بووبام، بۆئەوەی منیش سەرکەوتنێکی گەورەم بەدەست هێنابایەو، ئەو ئامانجە گەورەیەم بە دەستکەوتبایە، یانی پێشێ کە نارەحەتییەکە کە هاتۆتە ڕێی برا جەنگاوەرەکانی، پێی وایە ئەو کە لەگەڵدا نەبووە، خوا نیعمەتێکی گەورەی لەگەڵ کردوە، کە تووشی ئەوە نەبووە، وە دواییش کە ئەوان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، دیسان پێی وایە لە خێرێکی زۆر بێبەش بووە، کە لەڕاستییدا هیچیان وانین، نە ئەوەی پێشێ بەڵایەکی هێندە گەورەیە، بەڵکو شانازییە ئینسان لە ڕێی خوادا بریندار بێو شەهیدبێو نارەحەت بێو برسی بێو تینوو بێ، کێ ئەو شانازییەی دەست دەکەوێ؟ ئەویدیکەشیان دەستکەوتو غەنیمەت لە جەنگدا، ئەویش وەنەبێ شتێکی هێندە گەورەبێ ئینسان خۆزگەی پێ بخوازێ، ئەوەی کە ئینسان دەبێ خۆزگەی پێ بخوازێ، دەبێ ئەوەبێ کە خوا لێی ڕازی بێو خوای بەخشەر یارمەتی بدات، کە بەندایەتیی بۆ بکات.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوای تاكو پاك دەفەرموێ: ﴿ فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾، وشەی: (يَشْرُونَ) لە زمانی

عەرەبیدا بە مانای فرۆشتی (باع)یش دێ، وە بە مانای کڕی (إشتَرَی)ش دێ، هەردوو واتاکەی هەیە، جا لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی ئاوابێ خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانەی ئیمانیان هێندە دامەزراوە، کە دوارۆژ هەڵدەبژێرن بەسەر دنیاداو، دنیا دەکەنە نرخێكو دوارۆژی پێدەکڕن، بەهەشتی پێدەکڕن، با لە ڕێی خوادا بجەنگن، واتە: هەر بەوانە دەکرێ، وە ڕاستیشە جیهاد بە کێ دەکرێ؟ بە کەسێك دەکرێ کە لە مردن نەترسێ، کێ لە مردن ناترسێ؟ کەسێك دوارۆژی پێ چاکتربێ لە دنیا، ئینسانی وا لە مردن ناترسێ، وەك لە حەدیسی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە: ﴿عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا»، فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ، قَالَ: «بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ وَلَيَنْزِعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ»، فَقَالَ: قَائِلٌ يَا رَسولَ اللَّهِ! وَمَا الْوَهَنُ؟ قَالَ: «حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ»﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٢٩٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة)، برقم: (٩٥٨)، واتە: ثەوبان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نزیکە ئۆممەتان گەلە کۆمەکییتان لە دژ بکەن، وەك چۆن کۆمەڵێك خواردن خۆر دەوری قاپە خواردنەکەیان دەدەن، قسەکەرێك گوتی: لەو ڕۆژەدا ئێمە کەم دەبین؟ فەرمووی: بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژەدا زۆردەبن، بەڵام کەم سەنگ دەبن، وەك پووشو پەڵاشی سەر لافاو، وە خوا ترسان لە ئێوە لە دڵی دوژمنتان دەردێنێو، وە بێهێزییتان دەخاتە دڵەوە، قسەکەرێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! بێهێزیی (وهن) چییە؟! فەرمووی: خۆشویستنی دنیاو حەزنەکردن لە مردن (لە پێناوی خوا) وە ئەگەر بەبارەکەی دیکەشیاندا بێ، وەك بڵێی خوا ﷻ سەرزەنشتیان دەکاتو دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کە تا ئێستا دنیاتان هەڵبژاردوە! کە لێرەدا (يَشْرُونَ ) واتە: دنیا دەکڕنو قیامەتی پێدەدەن، پێیان دەفەرموێ: لەمەودوا وا مەکەن ئەوەتان هەڵەیە، وەرن جەنگو جیهاد

بکەن‌و بەهەشت بکڕن‌و دنیای پێ بدەن، نەك دنیا بکڕن‌و بەهەشتی پێ بدەن، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (خورما بە خوا بدە، خوا بە خورما مەدە)، (ژینت بە دینت بدە، دینت بە ژینت مەدە).

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، پێشتر باسمان کردوە هەرکەسێك لە ڕێی خوادا جەنگ بکات‌و بکوژرێ، یان زاڵ بێ‌و سەربکەوێ، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە وشەکانی: (يُقَٰتِلۡ )، (فَيُقۡتَلۡ )، (يَغۡلِبۡ )... هتد، لە قورئاندا هاتوون، وشەکانی: (أُستشهدُ) یان (يُستَشْهَدُونَ) نەهاتوە، کەواتە: ئاسایی یە، کە بۆ شەهیدان بڵێین: لە ڕێی خودا کوژراون، چونکە جاری وایە ئەگەر نەڵێی لە ڕێی خوادا شەهید بووە، کەسانی وا هەن وا دەزانن غەدرت لەو کەسە کردوە، کە لە پێناوی خوادا ڕۆیشتوە، نا ! لە قورئاندا وشەی: (أُستشهدُ) و (يُستَشْهَدُونَ) نەهاتوون، بەڵکو وشەی: (قُتِلُ)، (قَاتَلُ) (قاتَلُوا) (قُتِلُوا) (قاتِلُوا) هاتوون، بۆیە ئەگەر بۆ کەسانێك کە لە ڕێی خوادا شەهید بوون، بڵێی لە ڕێی خوادا کوژراون، مانای وایە زاراوەو وشەیەکی قورئانییمان بەکارهێناوە، هەرچەندە ئێستا وشەی شەهیدیان وا لێکردوە کە کابرا لە قاچاغییش بکوژرێ‌و لە پێناوی کوفرو ستەمیشدا بڕوا، هەر دەڵێن: شەهید بووە، نەخێر وانیە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ﴾، بۆ لە ڕێی خواو لە پێناوی چەوسێنراواندا، لە پیاوان‌و ژنان‌و منداڵان ناجەنگن؟ ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە دەگونجێ لەگەڵ ڕەزامەندیی خوادا، ڕەچاوی ئامانجی دیکەش بکرێ، کە ئەو ئامانجانەش هەر لە ڕەزامەندیی خوادابن،

بەڵێ لێرەدا کە خوای دادگەر دەفەرموێ: بۆ لە پێناوی خواو لە پێناوی چەوسێنراواندا ناجەنگن، لە پێناوی خوادا، ئەوە دیارە دینی خوا سەردەخەین، لە پێناوی چەوسێنراواندا یانی: چی؟ یانی: ئەوانیش دەرباز بکەین لەبەر خوا، هەر لەبەر خواو لە پێناوی خوادا، وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە بەڕاستی ئامانجی جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا، ئەوەیە کە هیچ کەس لەسەر زەوی نەچەوسێنرێتەوە، چونکە خوای کاربەجێ لێرەدا بە ڕەهایی فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾، چەوسێنراون لە پیاوانو لە ژنانو لە منداڵان، هەر کەسێك بچەوسێنرێتەوە لەم سەر زەوییە، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر توانای هەبێ، ئەرکی شەرعییەتی دەربازی بکات لەو چەوسانەوەیە، وە نەهێڵێ ستەمی لێ بکرێ، وەك چۆن جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا دەکرێ بۆ پارێزگاریی لێکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی، وە بۆ ئەوەی کە شەریعەتی خوای پەروەردگار بەرقەرار بێ، سایەو سێبەری خەڵك بێ، وە حورمەتەکانی مسوڵمانان پارێزراوبن، بە هەمان شێوە جەنگو جیهاد بۆیەش دەکرێ کە خەڵك زوڵمی لێنەکرێ، با نامسوڵمانیش بن، ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامیی دەستەڵاتی هەبێ، لەوپەڕی دنیا زوڵم لە میللەتێك بکرێ با کافریش بن، دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی زەختو فشارو هێزی خۆی بەکاربێنێ، وە ئەو زوڵمە لەسەر ئەوانە لابچێ، بە پێی ئەم ئایەتە موبارەکە، چونکە خوا بە نکوولێی لێکردنەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ﴾، بۆ لە ڕێی خواو لە پێناوی چەوسێنراواندا ناجەنگن؟ ئەوانەی کە لە خوا دەپاڕێنەوە دەڵێن: خوایە دەربازمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەممان لێدەکات.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوای بالادەست دەفەرمویّ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ڕێی خوادا دەجەنگن، پێشی فەرمووی: بۆچی لە پێناوی دەربازکردنی چەوساواندا، بەلام لێرەدا دەفەرمویّ: لە پێناوی خوادا؟ ئایا ئەمە چۆنە؟! وەلامەکەی ئەوەیە کە هی دووەمیان هەر دێتەوە نێو هی یەکەمیان، بەڵکو ئەگەر بڵێی لە پێناوی ئەوەدا کە خەڵك خراپە بلاو نەکاتەوە، هەروەها کۆمەڵێك ئامانجی دیکە دەتوانیّ ڕیز بکەیو، هەمووی هەر دەچێتەوە نێو یەك، مادام لەبەر خوابیّو لەبەر ئەوەبیّ کە خوا فەرمانی پێکردوە، هەمووی هەر دەبێتەوە بۆ خوا، واتە: ئامانجە دنیاییەکان ئەگەر لەبەر خوابن، لەگەڵ ئامانجە قیامەتییەکە تێکناگیرێن، چونکە تۆ بۆیە ئامانجە دنیاییەکان دێنیە دی، چونکە خوا وای فەرمووەو لەبەر ئەوەی خوا پاداشتت دەداتەوە لە دوارۆژدا، کەواتە: تێکناگیرێن، بەڵیّ ئامانجی دنیاییو قیامەتیی، مادام ئامانجە دنیاییەکە لەبەر قیامەتییەکە بیّ، تێکناگیرێنو دژناوەستن.

**مەسەلەی نۆیەم:** کە دەفەرمویّ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴾، کەواتە بە دیلی ڕێی خوا هەر ڕێی طاغووتە، هەر کەسێك لە ڕێی خوادا نەجەنگا، دیارە لەڕێی طاغووتدا جەنگیوە، طاغووتیش هەر کەسێکە ملکەچیی بۆ بکریّو پابەندیی بە بەرنامەکەیەوە بکریّ، وە بەرنامەکەشی غەیری شەریعەتی خوای پەروەردگاربیّ.

**مەسەلەی دەیەم:** کە خوای بیّ وێنە دەفەرمویّ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، لێرەدا دوو هەڵوەستە دەکەین:

یەكـەم: ئەوانـە كێ بوون؟ ئایا مسـوڵمان بوون یان مونافیـق؟ توێـژەرەوانی قورئـان لەوبـارەوە زۆریـان قسـە كـردوە، هەنـدێك دەڵـێن: بەشـێك لـەو قسانەی كـە ئەوانـە كردوویـانن‌و هەنـدێك لـە بیـروبۆچوونەكانیـان لـە مسـوڵمان ناوەشـێنەوە، لەبەر ئەوە دەڵـێن: ئەوانە مونافیقـن، بـەس مـن لـە سـەرەتاوەش باسـمـكرد، مـادام سـەرەتای ئایەتەكـان ئـاوا دەست پێـدەكات:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! لە خۆتان وریـابن، كەواتە: ئـەو دوانـدن (خطـاب)ە، هـەمووی لەگـەڵ ئیمـاندارانە، بـەڵام دیارە كەسـانێكی ئیمان بێهـێزن، وە لەڕاستییدا ئینسان نابـێ میسـالیی‌و خەیـاڵـییش بـێ، لە نێو مسوڵمانـاندا مسـوڵمانی باش هـەیە، كـە لـە لوتكـە دایـە، وە مـسـوڵمانیش هـەیە مـام نێوەندییـەو مـسـوڵمانیش هـەیە لـە خـواری خوارێیـەو بـە عاسـتەم ئیمـانی هەیـە، زانایـانیش دەڵێن: ئیمانی ڕەهـا (الإیمان المطلـق) هـەیە، واتـە: ئیمـانی كامـڵ، وە ئیمانی واجب هەیـە واتـە: ئیمانێكـی مـام نێوەنـدیی، وە ئیمـانی ڕووت (مطلـق الإیمـان) هەیـە واتـە: لای كـەمی ئیمان، ئنجـا هەرچی لای كەمی ئیمانە، بـەس ئینسـانی پـێ لە دۆزەخ دەربـاز دەبـێ، وە ئیمانی مام نێوەنـدیی، ئینسـان لـە گوناهـە گەورەكـان دەپـارێزێ، وە ئیمـانی كامـڵ‌و پەسند (مسـتحب) ئینسان وا لـێ دەكات سـوننەتەكان بكات‌و خۆی لە شتی ناپەسـەندیش بپـارێزێ، وەك لە بەرگی یەكەمی كتێبـی: (ئیمـان عەقـیدەی ئیسـلامیی)دا، بە تەفصـیڵ باسی ئەو مەسـەلەیەم كـردوە.

ئنجـا ئـەم ئایەتـە دەریـدەخات كـە جەنگـكردن وەسـیلەیە نـەك ئامـانج، بۆچـی؟ چونكـە لـە قۆناغێكدا خـوای كاربەجـێ بـە مـسـوڵمانانی فـەرموو: ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ ﴾، دەسـتی خۆتـان بگێڕنـەوەو جـەنگ مەكـەن، بـەڵام لـە قۆناغێكی دیكەدا لەسەری پێویست كـردن، كەواتـە: جەنگـكردن لە پێنـاوی خـوادا، شـتێك نیـە كـە مـسـوڵمان هەمیـشـە چـەكی بەشـانەوە بـێ‌و

هەردەبێ بیكات ! بەڵكو وەسیلەیە، پێویستت پێ بوو دەیكەی، پێویستت پێ نەبوو نایكەی، ئنجا لەڕاستیدا ئەگەر لە قەزیەی جەنگو جیهاد وردبینەوە، وەك من لە هەندێك كتێبو نامیلكەی خۆمدا باسمكردوە، جەنگو جیهادكردن پێنج حوكمەكانی بەسەردا دەچەسپن:

١/ جاری وایە واجبە، ئنجا جاری وایە دەبێتە واجبی عەینی، یانی: تاك تاكی مسوڵمانان لەسەریان پێویست دەبێ، مادام بە هەموویان نەبێ ئەو جەنگو جیهادە نەكرێ، لەسەر تاك تاكیان فەرز دەبێ، وە لە ئەسڵدا جیهاد فەرزی كیفایەیەو لەسەر كۆی مسوڵمانان پێویستە، واتە: ئەگەر كۆمەڵێكیان پێی هەڵسانو بەوان ئامانجەكە جێبەجێ بوو، لەسەر ئەوانی دیكە لادەچێ.

٢/ وە جاری وا هەیە جیهاد سوننەتە، واتە: ئەگەر بیكەی خێرت دەگاتێ، ئەگەر نەیكەی گوناهت ناگات، مادام یەك لەسەر تۆ نەكەوتبێ.

٣/ وە جاری وا هەیە جیهاد ناپەسەند (مكروه)ە، ئەویش ئەوەیە كە ئەگەری زیانی پتر بێ لە ئەگەری قازانجی .

٤/ وە جاری وا هەیە جیهاد حەرامە، بۆ وێنە: جیهادێك بكەی ئیسلامو مسوڵمانان تێدا تووشی زەرەر بنو، هیچ ئامانجێك بۆ ئیسلام تەحقیق نەكاتو هەر فریای خۆشاردنەوە بكەوی، ئەو جیهادە هەرنەكەی باشترە، ئیعلانی جەنگ بكەی لە بەرانبەری دوژمناندا، بەڵام دوایی هەر ئەوەندە فریای بكەوی، كە خۆت بشاریەوەو مسوڵمانانی دیكە، بەربەلابن، ئەوە مانای وایە هەر نەیكەی چاكترە.

٥/ وە جاری واش هەیە جیهاد موباحە، ئەویش لە حاڵێك دایە كە فەرزێكو سوننەتێك پەكی لەسەری نەكەوتبوو، وە نەدەبوو بە هۆی ئەوەش كە ئەنجامێكی خراپی هەبێ.

بەڵێ پێنج حوكمەكان بەسەر مەسەلەی جەنگو جیهاددا دەچەسپن، نەك تەنیا یەك حوكمی هەبێ، كە لە هەموو حاڵاندا زەرەرت بێو

قازانجـت بـێ بـۆت بکـرێو بـۆت نـەکرێ، هـەر واجب بـێ، شـتی وانیـە، چونکە جیهـاد وەسیلەیەو بـە گوێرەی ئـەو ئامانجـە شـەرعییانەی پـەکیان لەسـەری دەکـەوێ، حوکمەکـەی دەگـۆڕێ، چـونکە بنـچینەیەکی شـەرعییە: (للوسـائل حکـم المقاصـد)، واتـە: ئامڕازەکـان هـەمان حـوکمی ئامانجەکانیـان هەیـە.

**مەسـەلەی یازدەیـەم:** کە دەفەموێ: ﴿ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗ ﴾، کاتێـك جەنـگو کوشتاریان لەسـەر فـەرز کرا، هەندێکیـان لە خەڵـکی ترسـان، وەك ترسـانیان لە خـوا.

لێـرەدا دەڵێیـن: ئایا دەگونجـێ ئـەو قسـانە هی مـسـوڵمانان بـن؟ هەڵبەتـە وەك پێـشـتـریش باسـکـرد توێـژەوان گوتوویـانە ناگونجـێ، بـەلاّم مـن پێموایـە دەگونجـێ، چـونکە مـسوڵمانی وا هەیـە کـە ئیمانەکـەی دامـەزراو نەبـووە، جاری وایـە مەرج نیە هەمیشـە لە شـتێك بترسـێ وەك خـوا، یـان لـە خـوا زیـاتر، بـەلاّم جـاری وایـە حاڵـەتێکی بـۆ دێتـە پێـشـێ، ڕەنگـە ترسی بەرانبـەر بـەو شـتە لـە ترسـی بەرانبـەر بـە خـوا زیـاتر بێـتو، هـەر دەشـگونجـێ ئیمـانداریش بـێ، بـەلاّم دیـارە ئیمـانەکـەی ناتـەواوەو کەموکوڕیـی هـەیـە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾، لێـرەدا بۆیـە خـوا ﷻ وا دەفـەرموێ، چونکـە ئـەوەی وا لـە خەڵـك دەکات، نەچـێ بـۆ جـەنگو جیهـاد فیداکاریی نـەکات، خۆشویسـتنی دنیـاو بـاوەش کردنـە بـە دنیـاداو، هەڵبـژاردنی دنیایـە بەسـەر دواڕۆژدا، بۆیـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ ﴾، بڵـێ ڕابواردنی دنیـاو خۆشیی دنیا شتێکی کـەمو کـەم بایەخە لەچـاو دواڕۆژ، ئەوە لەلایـەك، پاشـان ئایـا کەمێتـیی دنیا لـە چ ڕوویەکەوەیە؟

١/ لە ڕاستییدا لە ڕووی ژمارەی شتەکانەوە، نیعمەتەکانی دنیا لەچاو نیعمەتەکانی دواڕۆژ کەمنو، هی دواڕۆژ زۆر زۆر زیاترن، ئەوە لە ڕووی ژمارەوە.

٢/ پاشان لە ڕووی بەردەوامیی یەوە، ژیانی دنیا وەك خەونۆچکەیەك وایە لەچاو ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت.

٣/ نیعمەتەکانی دنیا هەمیشە بەڵاو ناخۆشییشیان لەگەڵدا ئاوێتەن.

٤/ ژیانی دنیاو نیعمەتەکانی دنیا هەرگیز مرۆڤ ناتوانێ گرەنتی بدا بڵێ: ئێستا لە خۆشیی دامو دوای سەعاتێکی دیکەش ئەو خۆشییەم بۆ بەردەوام دەبێ، یاخود بەیانیش بەردەوام دەبێ وانیە، بەڵام نیعمەتەکانی بەهەشت وانین، کەواتە: لەوچوار ڕووەوە نیعمەتەکانی بەهەشت چاکترن، وە دەبێ هەڵیانبژێرین بەسەر هی دنیادا.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ وَلَوۡ كُنتُمۡ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖۗ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە کە بە کورتیی واتاکەی ئاوایە: لە هەر کوێیەك بن مردنتان دەگاتێ، واتە: لە دەست مردن قوتار نابن، ئەگەر لەنێو قەڵا مەحکەمەکانیش دا بن، لێرەدا خوا ﷻ حەقیقەتێك دەخاتەوە بیری ئێمە، کە ئێمە ڕۆژانە لەگەڵی ڕووبەڕووین، بەڵام زۆرجار ئینسان هەندێك شت تا لە خۆی نەبێ، وەك پێویست دەرکی ناکات، ئەویش بریتیە لەوە کە کەس لە مردن دەرباز نابێتو قوتار نابێت، ئێستا ئەگەر لە هەر کەسێك بپرسن: تۆ پێت وایە چەند ساڵی دیکە دەژی؟ ئەگەر نەخۆش نەبێو، ساغ بێ، ئەگەر وامان دانا، تەمەنی پەنجا ساڵ بێ، دەڵێ: سی ساڵی دیکە، بیست ساڵی دیکە، چلی دیکە، ئەوپەڕی پەنجای دیکە، کەچی تەماشا دەکەی بە شێوەیەك ژیان دەباتە سەرو ژیان دەگوزەرێنێ کە هەرگیز نەمرێتو، مردنی هەر لەبیر نیە، بۆیە خوای پەروەردگار لێرە ڕووی دواندنی کەسانێکە کە لەبەر مردنو لە ترسی مردن، وە لەبەر

خۆشەویستیی ژیانی دنیا ئامادە نەبوون جەنگ‌و فیداكاریی بكەن لەپێناوی خوادا، لە كاتێكدا كە پێویست دەبێ لەپێناوی ئیسلامدا جەنگ بكەن، خۆ بە كوشت بدەن‌و خەڵك بكوژن، بۆیە پێیان دەفەرموێ: لە هەر كوێیەك بن مردنتان دەگاتێ، ئەگەر لەنێو قەڵا مەحكەمەكانیش دابن، واتە: لێرەدا هەر خوای پەنهانزان ئەو ڕاستییە دەخاتەوە بیری ئەوان‌و بیری ئێمەش، كە هیچ كەس لە مردن دەرباز نابێت‌و مردن هیچ كەس جەب نادات.

**مەسەلەی چواردەیەم:** كە خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾، لێرەدا خوای زاناو توانا وەك پێشتریش باسمان كرد، بیروبۆچوون‌و هەڵوێستێكی دیكەی هەڵەی ئەو جۆرە كەسانە كە مسوڵمانی كرچ‌و كاڵن، وە بەپێی هەندێك ڕاش كەسانێكی دەغەڵ‌و مونافیقن، دەخاتە ڕوو، كە بریتیە لەوەی كە ئەگەر چاكەیەكیان تووش بووبا دەیانگوت: ئەوە نیعمەتی خوایەو لە خواوەیە، وە ئەگەر خراپەو ناڕەحەتییەكیان تووش بووبا دەیانگوت: ئەوە، خەتای پێغەمبەرە ﷺ، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ بڵێ: هەمووی لەلایەن خواوەیە، دوایی دەفەرموێ: ئەوانە بۆچی وان! نزیكە لە قسە تێنەگەن، بەڵام دوایی لە ئایەتی دواتردا دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ﴿٧٩﴾﴾، واتە: هەر چاكەیەكت تووش بێ‌و هەر نیعمەتێكت بێتە ڕێ، لە خواوەیە، وە هەر بەڵایەكت بەسەربێ، لە خۆتەوەیە، كە بەڕواڵەت ئایەتی دووەم لەگەڵ هی یەكەمدا تێكدەگیرێ ! بەڵام وەك ڕوونی دەكەینەوە وا نیە.

١- جارێ پێشێ با تەماشا بكەین ئەو فیكرەیە كە گێڕانەوەی نیعمەتەكانە بۆ خوا، وە گێڕانەوەی بەڵاو نەهامەتییەكانە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصَّلاةُ

والسَّلام)، ئەوە عادەتێکی لە مێژینەی ئەهلی کوفر بووە، لە سوورەتی (الأعراف)دا لە باسی ئەوەدا کە مووسا ﷺ دەچێت بۆ لای فیرعەون، ئەوانەی کە لەبەردەستی فیرعەون دابوون لە میسر، ئەوانیش بە هەمان شێوە قسەیان کردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣١﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾، واتە: {دوای ئەوەی کە مووسا ﷺ چوو بۆ لای فیرعەونو خەڵکی میسر}، ئێمە دارو دەستەی فیرعەونمان سزادا بە ساڵانی گرانیی[1] و هەروەها کشتوکاڵو بەروبوومیان نەدەهاتە بەرهەم (بۆچی وای لێکردن) بۆئەوەی پەند وەربگرنو بگەڕێنەوەو تۆبە بکەن (کەچی ئەوان چۆن بوون)؟ ﴿ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ﴾، کاتێك کە خێرو خۆشیی و چاکەیەکیان تووش دەبوو، دەیانگوت: ئەوە هی ئێمەیە (واتە: ئێمە هەر شایستەی ئەوەین کە ئەو هاتو نیعمەتو چاکەیەمان هەبێ)، ﴿ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ﴾، وە ئەگەر بەڵاو خراپەیەکیان تووش بووبا، دەیانگێڕایەوە بۆ لای مووسا ﷺو ئەوانەی کە لەگەڵ مووسادان ﷺ، واتە: دەیانگوت خەتای ئەوانەو لە شوومیی ئەوانو لە بێخێریی و نەگبەتیی و نێوچەوان ڕەشی ئەوانە ئەوەمان بەسەر هاتوە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، با ئاگاداربن نەگبەتیی و نەهامەتییەکەیان کە بەسەریان هاتووە، لەلایەن خواوەیە، واتە: بە ویستی خوایە ﷻ وە بەپێی یاسای خوایە، بە پێی یاسای خوا هەر میللەتێك لە ڕێی خوا لایدا، وە لەگەڵ پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة

---

١) (سِنِينَ) کۆی (سَنَة)یە، کە بریتییە لە ساڵانێك کە گرانیی و قاتوقڕیی یان تێدایە.

والسلام) كۆك‌و تەبا نەبێ‌و بە قسەی پێغەمبەران نەكات، خوا سزای دەدا بۆئەوەی بگەڕێتەوە، كەواتە: نەگبەتیی‌و بێخێرییەكەیان‌و ئەو قات‌و قڕیی‌و گرانییە كە بەسەریان هاتوە، بە ویست‌و ئیرادەی خوایە ﷻ، بەڵام خەتای خۆیانە: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن.

هەروەها لە سووڕەتی (النمل) ئایەتی (٤٧)دا پێغەمبەر صالح ﵇ كە دەچێ بۆ لای گەلی (ثمود) بە هەمان شێوە ئەوانیش وا دەڵێن: ﴿ قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: گەلی (ثمود) بە صاڵحیان گوت: ئێمە بە هۆی تۆو ئەوانەوە كە لەگەڵتدان، تووشی بێخێریی بووین‌و تووشی نەهامەتیی‌و نەگبەتیی هاتووین، ئەویش فەرمووی: ﴿قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ بەڵكو ئەو نەهامەتییە كە بەسەرتان هاتوەو ئەو شوومیی یە كە هاتۆتە ڕێتان، لەلایەن خواوەیە ﷻ، ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ﴾، بەڵكو ئێوە كۆمەڵێكن تاقی دەكرێنەوە، سزا دەدرێن لەسەر هەڵوێستی سەلبییتان لە بەرانبەر بانگەوازی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

هەروەها لە سووڕەتی (یس) ئایەتی (١٨، ١٩)دا دەفەرموێ: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: ئەو سێ ڕەوانە كراوە، كە سێ پێغەمبەر بوون، یا خود سێ ڕەوانەكراوی عیسا ﵇ بوون، چوون بۆ لای ئەو گەلە كە خوا ناوی نەهێناون، ناوی شارەكەشیانی نەهێناوە لە قورئاندا، ئەوانیش پێیان گوتن: ئێمە بە هۆی ئێوەوە تووشی نارەحەتی بووین، وە ئەگەر وازنەهێنن لەو بانگەوازەی

دەمانکەن، بەردبارانتان دەکەین، وە سزایەکی بە ئێشتان دەدەین، ئەوانیش (ڕەوانەکراوەکان) وەڵامیان دانەوە گوتیان: نەگبەتییەکە هی خۆتانەو لەگەڵ خۆتانەو بە هۆی کردەوەی خۆتانەوە تووشی بوون ﴿أَئِن ذُكِّرْتُم﴾، ئایا بە هۆی ئەوەوە کە ئامۆژگاریی کراون‌و بیرتان خراوەتەوە، شوومیی‌و نەگبەتییەکە لەوە دەزانن؟ ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆیی کەرن‌و بە هۆی زێدەڕۆییکردنی خۆتان‌و بە هۆی تێپەڕاندنی خۆتانەوە تووشی ئەوە بوون، وە لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا خوا ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو و دەفەرموێ: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: تاقیتان دەکەینەوە بە خراپەو بە چاکە، یاخود بە شەڕو بە خێر، واتە: (بەو شتەی کە پێتان خراپەو بەو شتەی کە پێتان باشە، تاقیتان دەکەینەوە) بە تاقیکردنەوە، وە دوایی بۆ لای ئێمەش دەگێڕدرێتەوە.

٢- ئنجا ئایا مەبەست لە (حَسَنةً)و (سَيِّئَةَ) چییە لەو ئایەتەدا؟ دەڵێین: وشەی (حَسَنَة) لە زمانی عەرەبی‌و لە بەکارهێنانی قورئاندا، بە مانای نیعمەت‌و چاکە دێ، وە (سَيِّئَة)ش پێچەوانەیەتی، واتە: خراپە، ئنجا ئایا مەبەست لەو (چاکە) و (خراپە)یە چییە؟ دەڵێین: (حَسَنَة) و (سَيِّئَة) لە قورئاندا بە دوو واتا هاتوون: یەکەم: (حَسَنَة) بە مانای طاعەت‌و چاکە دێ، کە ئینسان ئەنجامی دەدا، وە (سَيِّئَة)ش بە مانای خراپەو گوناح دێ، دووەم: واتایەکی دیکەیان (حَسَنَة) بە مانای خێرو نیعمەتێك دێ کە دێتە ڕێی مرۆڤ و پێی خۆشە، وە (سَيِّئَة)ش بە مانای خراپەو بێخێریی‌و بەڵایەك گرفتارییەك دێ، کە ئینسان پێی ناخۆشە، وەك خوای پاك‌و تاك لە سووڕەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَتْهُمُ

ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ﴾ واتە: ئەگەر نیعمەتێكیان تووش دەهات، دەیانگوت: ئەوە بۆ ئێمەیە، وە ئەگەر خراپەو نارەحەتیەكیان تووش دەهات، دەیانگێڕایەوە بۆ لای مووساو ئەوانەی لەگەڵی بوون، وەك پێشتر باسمان كرد، وە لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٦٠)دا وشەی (حَسَنَة) و (سَيِّئَة) بە مانای طاعەتو بەمانای گوناح بەكاردێنێ، دەفەرمویْ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات دە بەرانبەر پاداشتی هەیە، وە هەر كەسێك خراپەیەك بكات تەنیا بەقەدەر خراپەكە سزای دەدرێتەوە، كەواتە: لەم ئایەتەی دووەمدا (حَسَنَة) بە مانای طاعەت دێ، وە (سَيِّئَة) بە مانای گوناهو سەرپێچیی دێ، لە قورئاندا هەر دوو واتایەكە بەكارهاتوون، بەلاّم بەپێی سیاقی ئایەتەكانو بە پێی ئەو شوێنەی ئەو وشانەی تێدا هاتوون، سەرنجی دەدەین، بۆمان دەردەكەویْ كە لەو شوێنە (حَسَنَة) بە مانای طاعەتە، یان بە مانای نیعمەتە، وە (سَيِّئَة) بە مانای بەلاّیە، یاخود بەمانای گوناهە، لێرەدا لەم ئایەتانەی سوورەتی (النساء)دا (حَسَنَة) و (سَيِّئَة) بە مانای خۆشیی‌و نیعمەتو بەلاّو گرفتارییە، جا هەندیْ لە توێژەروان گوتوویانە: لە ئایەتی دووەمدا (حَسَنَة) بە مانای چاكەو طاعەتە، وە (سَيِّئَة)ش بەمانای گوناهو سەرپێچییە (مَعْصِيَة)، بەلاّم لە راستییدا ئەگەر باش سەرنجی ئایەتەكان بدەین، بۆمان دەردەكەویْ كە نەخێر لە هەردوو ئایەتەكەدا (حَسَنَة) بەمانای نیعمەتو چاكەیەو (سَيِّئَة)ش بە مانای بەلاّو گرفتارییە، كە دێتە رێی ئینسان.

ئێستاش با تەماشای ئەم دوو ئایەتە بكەین: ئایەتی یەكەمیان خوای بێ وێنە تێیدا رەخنە لەوانە دەگریْ كە چاكەو خۆشیی لە خواو، خراپەو

ناخۆشیی لە پێغەمبەری خوا دەزانن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ﴾، واتە: ئەوانە ئەگەر خۆشیی و نیعمەتێکیان بێتەڕێ دەڵێن: ئەوە لە خواوەیە، وە ئەگەر بەڵاو خراپەیەکیان تووش بێ، دەڵێن: ئەوە لە تۆوەیە، ئنجا خوا ڕەخنەیان لێ دەگرێ و دەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾، بڵێ هەردووکیان لەلایەن خواوەن، ﴿فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾، ئەو کۆمەڵە بۆ وان! خەریکن لە قسە تێنەگەن ؟ وە لە ئایەتی دووەمدا هەر دوا بەدوای ئەوە خوای پەروەردگار یەکسەر دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾، هەر چاکەو نیعمەتێکت بێتە ڕێ، لە خواوەیەو هەر خراپەو ناڕەحەتیی و بەڵایەکت تووشبێ، لە خۆتەوەیە، دیارە ئەوانیش هەر وایانگوتوە، جا ئایا ئەو دوو ئایەتە تێك ناگیرێن؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، ئەوان مەبەستیان پێ ئەوە بوو کە هەر چاکەیەکیان بێتە ڕێ، لە خواوەیەو لەبەرئەوەی ئێمە شایستەین ئەو نیعمەتو چاکەیەی پێداوین، بەڵام هەر خراپەیەك و بەڵایەکمان تووشبێ، خەتای تۆیە، لەبەرئەوەی ئەو دینەی تۆ بۆت هێناوین وایە، وەك بڵێی شوومییەکەیان دەگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، خوای پەروەردگاریش لێرەدا ڕەخنەیان لێ دەگرێ و دەفەرموێ: بڵێ هەردووکیان لەلایەن خواوەن، واتە: لەو ڕووەوە کە بە ئیرادەو ویستی خوایە نیعمەتت بێتە ڕێ و بەڵات بێتە ڕێ و بەسەر بێ، هەر لە خواوەیە، ئنجا خوای کاربەجێ حەقیقەتێکی دیکەش دەردەخات کە دەفەرموێ: هەر چاکەیەکت تووشبێ لە خواوەیەو، هەر خراپەو ناڕەحەتییەکت تووشبێ لە خۆتەوەیە، لێرەدا خوای تاك و پاك سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەوە کە

سەرچاوەی نیعمەتو چاكەو خۆشییەكان خوایەو، لەلایەن خواوە بەس چاكەو نیعمەت هەیە، بەڵام سەرچاوەی نەهامەتیو خراپەو بەڵاو گرفتارییەكان خۆمانین، ئینسان لە ئەنجامی كەمتەرخەمیی خۆیدا، تووشی نەخۆشییو تووشی گرفتاریی دێ، بەڵام ئەگەر بە قسەی خوا بكەینو بەپێی شەریعەتی خوای بەرزو بەپێی یاساكانی خوا هەڵسوكەوت بكەین، لەو گرفتارییو خراپانە سەلامەت دەبینو دەپارێزرێین، كەواتە: ئایەتی دووەم كە دەفەرموێ چاكە لە خواوەیەو، خراپەو نارەحەتیی لە خۆتەوەیە، مەبەستی ئەوەیە كە سەرچاوەی نیعمەتەكان خوایەو سەرچاوەی نەهامەتییەكان خودی ئینسانەو كردەوەكانی ئینسانن، وەك لە سووڕەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾﴾، واتە: خراپەو شكانییو دەریای گرتۆتەوە بە هۆی كردەوەی خەڵكەوە، (واتە: بە هۆی خراپەكانی خەڵكەوە) تاكو سزای هەندێ لە كردەوەكانیان پێ بچێژێ، بەڵكو بگەڕێنەوە، هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾﴾ الشورى، واتە: هەر بەڵایەكتان تووش دێ، كردەی دەستی خۆتانە، لە زۆریش دەتانبوورێ

**مەسەلەی پازدەیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾، واتە: هەر كەسێك فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكات، فەرمانبەریی خوای كردوە، چەند شتێك هەن كە پەیوەندییان بە خواو بە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەیە: سێ جۆرە ماف هەن یەكێكیان تایبەتە بە خواوەو، یەكێكیان تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺو، یەكێكیشیان هەردووكیان تێیدا بەشدارن هەرسێكیشیان ئەركی سەر شانمانن:

یەكەم: ئەوەی كە تایبەتە بە خواوەو مافێكی خوایە لەسەر ئێمە، بریتیە لە پەرستنی خوای تاك‌و پاك، وەك لە سوورەتی فاتیحەدا خوا لەسەر زمانی بەندەكانی فەرموویەتی: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة، واتە: هەر بەندایەتیی بۆ تۆ دەكەین‌و یارمەتیش بەس لەتۆ دەخوازین، پەرستن تەنیا بۆ خوایەو، تەقواش تەنیا بۆ خوایە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ۝٤١﴾ البقرة، ئەمە تایبەتە بە خوای بەرزو مەزنەوە، هەڵبەتە تەقواش هەر دەچێتەوە نێو پەرستنی خوای بێ وێنەوە، هەروەها پشت بە خوا بەستنیش هەر دەچێتەوە نێو تەنیا خواپەرستن‌و، لە هەموو شتێك زیاتر خۆشویستنی خواش هەر دەچێتەوە نێو پەرستن‌و، لە هەموو كەس زیاتر لێترسانی خواش هەر دەچێتە نێو پەرستن، دیارە پەرستنیش تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە.

دووەم: وە ئەوەی كە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ بریتیە لە ڕێز لێگرتن‌و پشت گرتن‌و شوێنكەوتنی، وەك خوای میهرەبان لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٥٧)دا دەفەرموێ: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ... ۝١٥٧﴾، واتە: ئەوانەی ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناوەو ڕێزیان گرتووەو، پشتیان گرتوە، وە بەدوای ئەو ڕۆشنایی یە كەوتوون كە لەگەڵی نێردراوەتەوە خوار.

بەڵێ شوێنكەوتن، تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەها ڕێزلێگرتن‌و پشت گرتن، تایبەتە بەوەوە.

سێیەم: وە ئەوەی كە هاوبەشە لە نێوان خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە ئەركێكە لەسەر شانی ئێمە، بریتیە لە ئیمان پێ هێنان‌و گوێ بۆ گرتن‌و بە قسەكردن (الإيْمَانُ وَالسَّمعُ والطَّاعَة) ئەو سێیە هەم مافی خوان‌و هەم مافی پێغەمبەرن ﷺ وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی

(النساء) ئایەتی (١٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن بە خواو بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کەواتە: ئیمان هێنان بە هەردووکیان پێویستە، دەربارەی (إطاعة)ش لە ئایەتی (٥٩) سوورەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! فەرمانبەری خوا بکەن، وە فەرمانبەری پێغەمبەر ﷺ بکەن، هەروەها لە ئایەتی پێش کۆتایی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ﴾، واتە: بیستمان‌و فەرمانبەرین، خوایە! فەرمانی تۆمان بیست‌و هی پێغەمبەرمان ﷺ بیست، ﴿ وَأَطَعْنَا ﴾، وە فەرمانبەری تۆ دەکەین‌و فەرمانبەری پێغەمبەریش دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە کە فەرمانبەرییمان بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمانبەرییە بۆ خوا، وە سەرپێچییمان بۆ پێغەمبەر ﷺ سەرپێچییمانە لە خوای پەروەردگار، فەرموویەتی: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي» أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٢٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٧١٣٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧٢٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: هەر کەسێك فەرمانبەریی من بکات، ئەوە فەرمانبەریی خوای کردوە، وە هەر کەسێك سەرپێچیی من بکات، سەرپێچیی خوای کردوە، وە هەر کەسێك فەرمانبەریی فەرماندەو بەرپرسەکەی خۆی بکات، ئەوە فەرمانبەریی منی کردوە، وە هەر کەسێك سەرپێچیی فەرماندەو بەرپرسەکەی خۆی بکات، سەرپێچیی منی کردوە، واتە: کاتێك ئێمە بە قسەی بەرپرسانی خۆمان دەکەین بە ڕێی شەرعدا، مانای وایە طاعەتێك بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام دەدەین.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ﴾، واتە: ئەوانە لە ڕووودا دەڵێن: فەرمانبەرین، وشەی (طاعة) بە (طاعةٌ) خوێندراوەتەوە، واتە: (أَمرُكَ طَاعَةٌ) یان (شَأْنُكَ طَاعَةٌ) ئیشی تۆو فەرمانی تۆ لەلای ئێمەوە فەرمانبەریی بۆ دەکرێ، وە خوێندراویشەتەوە (طَاعَةً)، واتە: (نُطِيعُكَ طَاعَةً) ئێمە فەرمانبەریی تۆ دەکەین بە فەرمانبەریی کردن، ئەوە لە ڕووودا وادەڵێن، بەلاّم ﴿ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ﴾، واتە: کاتێك لە لای تۆ هەڵدەستن، کۆمەڵێکیان بە شەو پیلان دەگێڕن جیا لەوەی کە بەتۆیان گوتووە لە ڕووودا، یاخود جیا لەوەی کە تۆ گوتووتە وشەی (تَقُولُ) دەگونجێ ڕاناوەکەی بچێتەوە بۆ (طَائِفَةُ)، واتە: فێڵێك دەکەن، جیا لەو هەڵوێستەی کە لە ڕووودا پێشانیاندا کە گوتیان: بە قسەت دەکەین، لە قسەت دەرناچین، کەچی کە پشتیان کردەوە، بە شەو سەریان پێکەوەناوەو چپەچپیان پێکەوە کردوە، کە پێچەوانەی ئەوەی لەلای تۆ گوتوویانە بیکەنە هەڵوێستی خۆیان، یاخود مەبەست ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەوەی تۆ گوتووتە کە چاکەی پێ گوتوون، بەلاّم ئەوان شتێکی دیکە دەکەنە هەڵوێستی خۆیانو شتێکی دیکە تەبەننیی دەکەن، بە کورتیی یانی: بەڕوو بێ عەیبن، بەلاّم پاشملە خەریکی پیلانو فێڵن، هەڵبەتە ئەمە لێی وەردەگیرێ کە دەبێ ئەوانە مونافیقو دەغەڵ بن، هەرچەندە ئایەتەکانی دیکە زۆربەیان دەگونجێ کە مەبەست پێیان مسوڵمانانی سادەو سەرکێڵو کرچو کاڵ بن، بەلاّم ئەمە زیاتر وای لێ وەردەگیرێ کە ئەوانە کەسانێکی دەغەڵو مونافیق بن، چونکە مسوڵمان ناچێت فێڵو پیلان ساز بکات لە دژی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ مەگەر بڵێین ئەوانە مسوڵمانانێکی سادەو گێلنو ئیستیغلال دەکرێن، ئەوە دەگونجێ کەسێك جۆرێك لە ئیمانی هەیە، بەلاّم ئیستیغلال دەکرێ، کەسانێکی فێڵباز دێنن بەکاریان دێنن بۆ مەرامو غەرەزی تایبەتی خۆیان

کە دیارە ئەوانە گوناهبارن، بەڵام مادام لە ڕووی نەزانییو نەفامییو بێئاگایی یەوە بێ، پێی لە بازنەی ئیسلام دەرناچن، مادام لە دڵەوە خۆشیان نەوێنو، لە دڵەوە دۆستایەتی موطلەقیان بۆیان نەبێ.

**مەسەلەی حەڤدەیەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴾، ئایا لە قورئان ڕانامێننو لێی وردنابنەوە[1].

ئەگەر لەلایەن جگە لە خواوە بووایە، جیاوازیی زۆریان تێدا دەبینی، واتە: ناکۆکییو دژایەتییان تێدا دەبینی، شایانی باسیشە خوای مەزن لە چەندان ئایەتدا فەرمانی کردوە بە بیرکردنەوە لە قورئانو تێدا قووڵبوونەوەو تێوەڕامانی، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (محمد) ئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئایا بیر لە قورئان ناکەنەوە، یان دڵیان قوفڵی لێدراوە، واتە: کەسێك عەقڵو دڵی قوفڵ نەبووبێو جام نەبووبێ، دەبێ لە قورئان ڕابمێنێو بیری لێ بکاتەوە لێی بەهرەمەند بێ.

٢/ هەروەها لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٢٩)دا دەفەرموێ: ﴿ كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ إِلَيْكَ مُبَـٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَـٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەمە کتێبێکە بۆ تۆمان ناردۆتە خوار بە پیتو پێزە، بۆئەوەی لە ئایەتەکانی وردببنەوە، تاکو خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن. ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴾، واتە: ئەگەر لەلایەن جگە

---

١) (التَّدبُّرُ: التَفَكُّر في دُبُر الأمُورِ والتأمُّل والتعمُّق)، (تدبّر) بیرکردنەوەیە لە سەرنجامی کارەکان، وە بە مانای تێوەڕامانو قووڵبوونەوەش دێ. مختار الصحاح، ص: (١٨٥).

له خواوه بووایـه، تێكگیـران‌و ناكۆكییـان تێدا دەبینـی، بـەڵام مـادام لەلایـەن خـوای پەروەردگـارەوەیە، هـەمووی پێكـەوه گونجـاوه، كەواتــه: بـا هیــچ كـەس وا نەزانـێ كه ئەو دوو ئایەتـەی پێشـێ پێكەوه تێكدەگیـرێن، بەڵـكـو وەك ڕوونمــان كـردەوه، یەكێكــیان مەبەسـت پێـی شـتێكه، ئـەوی دیكـه مەبەسـتی پـێ شـتێكی دیكەیـه، هەرچـەندە وشـەكانیان وەك یەكـن، بـەڵام مەبەسـتەكانیان جیـان.

ئنجــا ئــەم ئایەتــه ئــەوەمان بــۆ دەردەخـــات كــه ئێمــه لــه ئەنجــامی وردبوونــەوەو قووڵـبوونەوە لـه قورئانـدا، دەگەینـه ئـەوەی كـه ئایەتـەكان تێك ناگیـرێن، بـەڵام ئـەوەی بـه ڕواڵـەت تەماشـای قورئــان بكـاو بـه ڕووكەشــیی‌و ســەر كێڵــیی، پێــی وایـه تێكدەگیــرێن، بـا وێنەیــەكتان بــۆ بێنمــەوه: خــوای پەروەردگار دەربـارەی ئەوە كە ئینسان لەلایەن كـێ وە گیـانی دەكێشـرێ؟ لـه ســـوورەتی (الزمــر)دا ئایــەتی (٤٢)دا دەفــەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ﴿٤٢﴾ ﴾، واتـه: خـوا ڕووحـەكان وەردەگـرێ لـه كــاتی مردنیــانــدا، وە ئــەوەی نەشـــمردبێ لــه كــاتی خــەودا ڕووحەكـەی وەردەگـرێ، ئــەوە لێره وا دەفەرموێ، كەچـی لـه سـوورەتی (السجدة) ئایـەتی (١١)دا دەفــەرموێ: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ﴿١١﴾ ﴾، واتــه: بڵــێ: فریشـتەی گیان كێشـان، فریشــتەی مـەرگ كـه پێتـان سـپێردراوه دەتانمرێنــێ، لێــرەش مردنـی پـاڵ دایـه لای ﴿ مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ﴾، ئنجـا لـه سـوورەتی (الأنعـام) ئایەتی (٦١)دا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتـه: هـەتا كاتـێ یـەكێكتان مردنـی گەیشـتە سـەر، فریشـتە ڕەوانەكـراوەكانمـان گیــانی دەكێشــن، لێـرەش خـوا، گیـان كێشـانی كـردووه بـه ئـەركی فریشــتەكان، بەڕواڵـەت دەڵێـی ئـەوه تێكگیــرانه! بــەڵام ئەگــەر لێــی وردبیــەوه، وانیــه:

خوای بالادەست فەرمان دەکات بە: فریشتەی مەرگ ﴿ مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ﴾، ئەویش سەرپەرشتیاری گیان کێشانی هەموو گیاندارەکان دەکات، هەموو ئینسانو جند، بەلام فریشتەی مەرگ ﴿ مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ﴾ بۆخۆی ناچێ ڕووحی هەمووان بە تاك تاك بکێشێ؟ بەڵکو فریشتەی زۆری لەبەردەستدان، ئەوان دەنێرێ، کەواتە: هەمووی هەر دەبێتەوە بە یەك: خوا فەرمان دەکاتو فریشتەی مەرگ ﴿ مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ﴾، سەرپەرشتیی دەکاتو، ئەو فریشتانەی کە لەبەردەستی فریشتەی مەرگ دان جێبەجێی دەکەن، ئەگەر بە قووڵیی تێی بفکرین ئاوایە، بەلام ئەگەر بە ڕووکەشییو ڕواڵەتیی بێ دەڵێین: خوا لە شوێنێك دەفەرموێ: بۆخۆم ڕووحەکان دەکێشمو، لە شوێنێك دەفەرموێ: فریشتەی مەرگ ﴿ مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ﴾ ڕووحەکان دەکێشێ، لە شوێنێکی دیکەش دەفەرموێ: مەلائیکەتەکان دەیکێشن! ئنجا ئەوە چۆن پێکەوە دەگونجێ؟! ئاوا بە ڕووکەشییو ڕواڵەتییو سەرکێڵیی وایە، بەلام کە پێیدا قووڵ دەبیەوە وانیە، بەڵکو خوای کاربەجێ هەر جارە تەعبیری کردوە لە بەشێك لەو حەقیقەتەو، بە هەر کام لەو ئایەتانە تەعبیری کردوە لە بەشێك لەو حەقیقەتە مەزنەی کە بریتیە لە گیان کێشرانی مرۆڤەکان.

**مەسەلەی هەژدەیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ﴾، واتە: وە کاتێك هەواڵێکیان لە هێمنییو ئاسایش، یان لە ترسو بیم پێ دەگات، یەکسەر بلاوی دەکەنەوە، وەك پێشتر باسمان کرد خوای پەروەردگار سەرزەنشتیان دەکات، کە بۆچی هەر هەواڵێکتان پێدەگات، یان بانگەشەیەك، یەکسەر بلاوی دەکەنەوە بەنێو خەڵکدا؟! ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا هەموو قسەیەك هی کردنو هەموو قسەیەك هی بلاوکردنەوە نیە، وە ئینسان نابێ وەکو سەبەتەی بن بەتاڵ بێو نابێ وەك بێژینگ بێ، هەموو شتێکی لێ بکەوێتە خوارێ! بەڵکو دەبێ مەحکەم بێ، هەندێ قسە هی

ئەوەنیە بڵاوی بکەیەوەو دەبێ لەلای خۆت بیپارێزی، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧)، عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ ﵁، واتە: ئینسان ئەوەندە درۆیەی بەسە کە هەرچی ببیستی بیگێڕێتەوە، چونکە هەرچی بیستت بیگێڕیەوە، ئینسان زۆر تووشی درۆیان دەبێ، چونکە ئەوەی دەیبیستی زۆری درۆیەو تۆش بیگێڕیەوە، دەبی بە یەکێك لە درۆکەرەکان، وە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٩٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٨١) ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٠) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ وصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٠٢٥)، واتە: ئینسان ئەوەندە گوناهەی بەسە هەرچی بیستی بیگێڕێتەوە، هەرچی بیستت بیگێڕیەوە تووشی زۆر گوناهان دەبی، خەڵك زەمی یەکدی دەکات، غەیبەتی یەکدی دەکات، بوختان بۆ یەکدی دەکەن، بانگەشەی خراپ لە دژی یەکدی دەکەن، جا تۆ هەرچی بیستت بیگێڕیەوە، مانای وایە دەبیە شەریکی هەمووان لەو درۆو بوختانو غەیبەتو شتانەدا، کەواتە: مسوڵمان دەبێ قایم بێو هەموو قسەیەك هی کردن نیەو، هەموو شتێك هی بڵاوکردنەوە نیە، بەڵکو پێویستە ئینسان بە سەلیقەو حەکیمو لێزان بێو بزانێ چ قسەیەك پێویست دەکات بکرێ، وە چ قسەیەك پێویست بەوە دەکات هەڵبگیرێ، وە چ قسەیەك دەبێ ئیهمال بکرێو هەر نەگێڕدرێتەوە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم**: خوای زاناو توانا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ﴾، پێشی دەفەرموێ: ئەوانە هەر هەواڵێکیان پێ بگات، پەیوەندیی بە هێمنییو ئاسایشەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بە ترسەوە هەبێ، یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە، هەواڵیش یان پەیوەندیی بە هێمنییو ئاساییشەوە هەیە، واتە: یان جێی دڵخۆشیی خەڵکە، یاخود جێی نیگەرانییو ترسو نارەحەتییانە، ئەوانە هەر

جۆرە هەواڵێكیان پێ بگات بەبێ تێفكرین بڵاوی دەكەنەوە، جا خوا دەفەرموێ: وە ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ لای كاربەدەستانی خۆیان ئەوانەی كە توانای هەڵهێنجانو ئەنجامگیرییان هەیە دەیانزانی واتە: دەیانزانی ئەو هەواڵە بڵاوبكرێتەوە باشە، یان بڵاونەكرێتەوە، دیارە ئەو كاتە مەبەست پێی ئەوە بووە كە جاری وابووە، گوتوویانە: ئەوا فلان هێزە، فلان عەشیرەتە هێرشی كردە سەر مەدینە، نەخێر ئەوە فلان كەس وایكرد، ئەوە فلان دەوڵەتە هەڕەشەی كردوە لە دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەوە لە ڕووی ترسەوە، وە لە ڕووی مەسەلەی هێمنییو ئاساییشەوە: ئەوە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ فلان شتە خۆشە ڕوویدا، ئەوە لە فلان جەنگەدا فلان هێزەمان سەركەوت، ئاوا جار جار خەڵك شتی خۆشو ناخۆش بڵاودەكاتەوەو بانگەشە دەكرێ، جا خوای پەروەردگار ئامۆژگاریی مسوڵمانان دەكات، پێشێ هی ئەو كاتی، دوایی هی ئێمەش كە مسوڵمانان پێویستە بە سەلیقەو عاقڵ بن، هەموو هەواڵێك هی ئەوە نیە هەر كەسێك پێت بگات بڵاوی بكەیەوە، شتێكت پێ دەگات، زانیارییەكت پێ دەگات، هەواڵێكت پێ دەگات، بیگەیەنە بە سەرووی خۆت، ئەرێ شتێكی وامان بیستوە، ئەو زانیارییەمان بیستوە، ڕەنگە ئێوە باشتر بتوانن مامەڵەی لەگەڵدا بكەن، دەبێ وابێ وا نەبێ؟ جا چ بە باری خۆشیی، چ بە باری ناخۆشییدا بێ، ئەو كاتە ئەو قیادەیە ئەو بەرپرسە، چاكتر دەتوانێ شی بكاتەوەو، بزانێ داخۆ ئەو هەواڵە: ڕێی تێ دەچێ ڕاست بێ؟ وە پاشان ئەگەر ڕاست بێ، ئایا بڵاوبكرێتەوە باشە؟ ئایا كاریگەریی سەلبیی نابێ بۆ مەعنەوییاتی خەڵك؟ یاخود واباشە بڵاونەكرێتەوە؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە مشوورخۆرانو بەرپرسان زیاتر توانای ئەوەیان هەیە كە تەبەننیی ئەو شتانە بكەن، كە ئایا بڵاوبكرێنەوە یان بڵاونەكرێنەوە.

<u>**مەسەلەی بیستەم**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە ڕێی خوادا بجەنگە، تەنیا خۆت

لەسەرت پێویست دەكرێ، (لَا تُكَلَّفُ ) یانی: (لاتُلْزَمُ) واتە: بەس لەسەر تۆ پێویستە ئەی پێغەمبەر ﷺ! یانی: تۆ تەنیا بەرانبەر بە خۆت بەرپرسیاری‌و، ئەگەر خەڵكی دیكە جەنگ‌و جیهادی نەكردو سستیی نواندو تەنبەڵیی كرد، تۆ لەسەر ئەوان گوناهبار نیی‌و لێت ناپرسرێتەوە، بەڵام لەسەر خۆت لێت دەپرسرێتەوە، مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەرنا وەنەبێ جەنگ‌و جیهاد تەنیا لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرز بووبێ، واتە: بەرپرسیارێتی تۆ تەنیا بەرانبەر بە خۆتە، لەو ڕووەوە كە ئەگەر كەمتەرخەمیی بكەی گوناهباری، بەڵام ئەگەر فەرمانی خوات پێت ڕاگەیاندن‌و ئەوان كەمتەرخەمییان كردو سستیی‌و تەنبەڵییان نواند، خۆیان دەبێ وەڵامی خۆیان بدەنەوە، بەرپرسیارێتیی لە ئەستۆی خۆیانەو، تۆ لەسەر ئەوان خوای دادگەر لێپرسینەوەت لەگەڵدا ناكات، ئەركی خۆت بەرانبەر بەوان ئەنجامداوە، ئنجا ئایا ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾، لێی وەردەگیرێ كە جەنگی تاكیی (القتالُ الفردي) لە ئیسلامدا هەیە؟ هەندێك لە مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە كە لە كاردانەوەی ڕژێمە طاغوتییەكان، وە لە كاردانەوەی ئەم بارودۆخە نەویستراوانەدا كە بەسەر مسوڵماناندا سەپێنراون، زۆرجار لە سنووری شەرع تێدەپەڕێنن، یەكێك لەوانە ئەوەیە كە فیكرەیەكی وا هەیە لەنێو هەندێك لەو مسوڵمانانەدا كە جەنگ‌و كوشتار دەكەن، دەڵێن: ئینسان بە تەنیاش دەتوانێ جەنگ‌و كوشتار بكات، چونكە خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾، دەپرسین: ئایا ئەم ئایەتە ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێ وەردەگیرێ؟! لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، چونكە:

یەكەم: چەند ئایەتێك پێش ئەم ئایەتەی خەریكی لێكدانەوەینی خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾، واتە: سەرنجی ئەوانە نادەی كە پێیان گوترا: دەستی خۆتان بگێڕنەوەو جەنگ مەكەن، ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، وە نوێژ بەرپا بكەن، وە

زەکـات بـدەن، کەواتـە: لـە قۆناغێکـدا خـوا بـە مـسـولْمانـانی فـەرمووە جـەنگ مەکـەن، هەرچـەندە مـسـولْمانان ژمارەیـەکیش بـوون، نـەك تـەنیا پێغـەمبـەر ﷺ، مانـای وایـە جـەنگـو بەرەنگاربوونـەوە دەبـێ کـاتی بـێ، کە زەمینەی بۆ بڕەخسـێ، ئەگـەر زەمینـەی بـۆ نەڕەخسـێ، دەڵێـی: ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾ تۆ مادام تەنیای دەبێ دەسـت بگێڕیەوە، پێغەمبەر ﷺ لە هـەموو کـەس ئـازاتر بوو، بەڵام نـەك بۆخۆی لە مەککە جەنگی نەکـرد، ڕێـی نـەدا هاوەڵەکانیـشی بیکـەنو دەیفـەرموو: ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾، دەسـتی خۆتـان بگێڕنـەوە، وەك خـوای پـەروەردگار فەرموویـەتی، وە پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِنِّـي أُمِـرْتُ بِـالْعَفْوِ فَلا تُقَـاتِلُوا﴾ (أَخْرَجَـهُ النَّـسَائيُّ بـرقم: (٣٠٨٥)، عَنْ ابْنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنه، وَقَالَ الشيخ الألباني: صحيح الإسناد)، دوای ئـەوەی هـەندێ لـە هـاوەڵانی گوتیـان: ئەمـە هاتووین مۆڵـەتمان بـدەی بـا جـەنگ بکـەین فـەرمووی: فـەرمانم پێکـراوە بـە لێـبوردنو چاوپۆشـیی، بۆیە جارێ مەجەنگن واتە: کاتی نەهـاتوە، نەك دروسـت نیـە.

دووەم: بەڵگەیەکـی دیکـە ئەوەیە کە خوای پەروەردگـار لە دوای ئـەم ڕسـتەیە کـە دەفـەرموێ: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾ دوایـی دەفـەرموێ: ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، وە ئیمـانداارانیش هانبـدە، واتـە: بەڵـێ تەنیـا بەرانبـەر بـە خـۆت بەرپرسـیاری، بـەڵام ئەگـەر بتـەوێ جـەنگـو کوشـتار بکـەی، دەبـێ لەگـەڵ هاوەڵانتـداو ئـەوانیش هانبـدەی لەگەڵـت دابێـنو پێکـەوە جەنگەکـە بکـەن، بەڵـکو جـاری وا هەیـە پێغەمبـەر ﷺ ڕاوێـژی کـردوە بـە هـاوەڵانی، وە ئەگـەر ئامادە نەبوونایـە نەدەچـوو، بـۆ وێنـە: لـە جـەنگی (بـەدر)دا دەفـەرموێ: ﴿أَشِيروا عَلَـيَّ أيّهـا النَّـاس﴾، خەڵکینـە! داخۆ دەڵـێن چی؟ ئنجـا دوای ئـەوەی کـە کۆچـکەرەکان قسـەیان کـرد، هـەر دەیفـەرموو: ﴿أَشِيروا عَلَـيَّ أيّهـا النَّـاس﴾، خەڵـکینە پـێم بڵـێن داخـۆ بـچین یـان نەچیـن، ڕاتـان چییـە؟ ئینجـا سـەعدی کـوڕی موعـاذ

گوتی: ئایا مەبەستت پێ ئێمەیە؟ فەرمووی: بەڵێ مەبەستم پێ پشتیوانەکانە، ئەویش بە ناوی ئەوانەوە گوتی: بەڵێ ئێمە لە خزمەتت داین، وە چی بفەرمووی ئێمە ئامادەینو فەرمانبەریین، ئەوجار پێغەمبەر ﷺ بڕیاری ڕووبەڕووبوونەوەی دا[1].

کەواتە: بەڕاستیی ئەوە لە تێنەگەیشتنی دینو ژینو واقیعە، کە ڕستەیەکی قورئان ئاوا بێنی بیکەی بە فەلسەفەیەك بۆ جۆرێك لە جەنگو جیهاد، کە لەڕاستییدا ئەوە ئەو جەنگو جیهادە نیە کە خوا داینـاوە، چونکە بە تەنیا چی دەکرێ؟ هیچ ئامانجێك جێبەجێ ناکرێ، وە لە ڕاستییدا ئیسلام ناڵێ: لەبەر خودی کوشتنی کافران، کافران بکوژە، وە لەبەر ئەوەی ئیسلام کە پێی خۆشە خوێن بڕژێ، خوێنیان بڕێژن، وە لەبەر خودی ئەوەی کە ئیسلام پێی خۆشە بکوژرێی، خۆت بەکوشت بدە، بەڵکو خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴿١٩٣﴾ ﴾البقرة، لەگەڵیان بجەنگن هەتا فیتنە نامێنێ، واتە: تاکو توانای ئەوەیان نامێنێ مسوڵمانان ئازار بدەنو لە دین هەڵیان بگێڕنەوە، یانی: هەمیشە جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا وەسیلەیە بۆ هێنانە دی ئامانجو، دەبێ بزانی ئایا ئەو ئامانجە تەحقیق دەبێ یان نا، ئەگەر ئامانجەکە بێتە دی بیکە، ئەو وەسیلەیە بەکاربێنە، بەڵام ئەگەر ئامانجەکە نەیەتە دی، واز لەو ئامرازە بێنەو لەوانەیە بە ئامرازێکی دیکە باشتر بێتەدی، وەك پێغەمبەر ﷺ لە مەککە هەرچەند زوڵم لە هاوەڵان دەکراو ئازارو ئەشکەنجە دەدران، بەڵام دەیفەرموو دەست بگێڕنەوە، کاتی جەنگ نەهاتوە، چونکە دەیزانی ئەو کاتە جەنگو جیهادو بەکارهێنانی هێز، نەك هیچ ئامانجێکی باش تەحقیق ناکات، بگرە لەسەریشی قەرزار دەبنەوە! کەواتە: لە هەرکاتو شوێنێك دا مسوڵمانان زانیان کە لەسەر بەکارهێنانی هێز قەرزار دەبنەوەو، ئامانج تەحقیق ناکەن، دەبێ نەیکەن، ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج: (٣)، ص: (١٦٢).

لەڕاستییدا جەنگو جیهاد هەر یەك حوكمی نیە، بەڵكو پێنج حوكمەكانی بەسەردا دەچەسپێو جاری وایە واجبە، واجبی عەینیی، وە جاری وایە دەبێتە واجبی كیفائیی‌و، جاری وایە قەدەغە دەبێ ﴿كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ﴾، واتە: قەدەغەیە نەیكەن، وە جاری وایە دەبێتە شتێكی سوننەتو جاری وایە نا پەسند دەبێ‌و، جاری واش هەیە تەنیا ڕەوا دەبێ.

**مەسەلەی بیستو یەكەمو كۆتایی:** كە خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، وشەی: ﴿عَسَى﴾، لە زمانی عەرەبیدا واتە: لەوانەیە، ڕەنگە، نزیكە، واتە: نزیكە خوا زەبرو پەلاماری ئەوانەی بێبڕوان بەرپەرچ بداتەوە، بە هۆی جەنگو جیهادی ئێوەوە، كەواتە: جەنگ لە ئیسلامدا ئامانجەكەی بەرپەرچدانەوەو پرینگاندنەوەی ئەهلی كوفرە، ئەهلی كوفری دەستدرێژكارو دوژمن، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، جەنگو جیهاد بكەن بەڵكو خوا بە هۆی ئەو جەنگو جیهادەی ئێوەوە، زەبرو زەنگی كافرەكان بەرپەرچ بداتەوە، ئەوە ئامانجەكەیە، وە ئەگەر تەماشای گەلێك ئایەتی دیكەی قورئانیش بكەین، ئەو ڕاستییەمان زۆر جوان بۆ ڕوون دەبێتەوە، كە لەڕاستییدا ئامانج لە جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا، بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژكارانە، ئنجا كە دەڵێم جەنگو جیهاد لەبەرئەوە كە جەنگ تەنیا بریتیە لە كوشتنی خەڵكو خۆ بەكوشتدان بە بەكارهێنانی هێز، بەڵام جیهاد ماڵ سەرفكردنیش دەگرێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ۝٩٥﴾النساء، واتە: لە ڕێی خوادا تێدەكۆشن بە ماڵو نەفسیان، ئنجا بۆیە وشەی (جِهاد) بەكاردێنین، بۆ ئەوەی كە ماڵ سەرفكردنەكەش بگرێتەوە، چونكە بە تەئكید جەنگیش بەبێ ماڵ خەرجكردن ناكرێ، واتە: فیداكاریی بە گیان، بەبێ بەخشینی سامان ناكرێ.

هەروەهـــا دەربـــارەی ئامانجـــی جـەنگو جیهـــاد تەماشـــا بکـەن خـــوای پەروەردگـار چی دەفەرموێ؟ لـە سـوڕەتی (الأنفال) ئایـەتی (٣٩)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: وە لەگەڵیان بجەنگن هەتا فیتـنە نامێنـــێ (فیتنـــە لێـــرەدا واتـــە: ئەشـــکەنجەدانو ئـــازاردانی مـــسوڵمانان)، وە ملکـــەچیی هـەمووی بـۆ خـوا دەبــێ، واتـە: ئـایینو بەرنامـەی خـوا باڵادەست دەبێو، هـیچ کـەس دەسـەڵاتی ئـەوەی نابـێ خـەڵك بـە زۆر کافر بکات، یـاخود نەهێڵــێ مـسـوڵمان بـبن ﴿ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، ئنجـا ئەگـەر دەسـتیان هەڵـگـرت، خوا بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن.

وە هەروەها هەر لەوبـارەوە لە سووڕەتی (البـقرة) ئایـەتی (١٩٠)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾، واتـــە: لـەڕێی خـــوادا بجـــەنگن لەگـەڵ ئەوانـەی کـە لـە دژتــــان دەجەنگـــــن، بـــەڵام دەســـــتدرێژیی مەکـــــەن، بێگــــومان خــــوا دەسـتدرێژکەرانی خـۆش نـاوێ، واتـە: شــەڕ لەگـەڵ کەسـێك مەکەن شـەڕتان پێ نافرۆشێ، ئەوە دەسـتدرێژییـە.

وە هەر لـە سـووڕەتی (البـقرة) ئایـەتی (١٩٣)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ﴾، واتە: وە لەگـەڵیان بجەنگـن هـەتا فیتنـە نامێنــێ، (واتـە: تـا دەرفـەتی ئـەوەیان نامێنــێ مسوڵمانان هەڵگێڕنـەوە لە دیـن، یاخود ڕێ نەدەن خـەڵك مـسـوڵمان بـێ)، وە ملکەچـیی هـەمووی بـۆ خـوا دەبـێ، ئنجـا ئەگـەر دەسـتیان هەڵـگرت، ئـەوە دەسـتدرێژیی ناکرێتـە سـەر غـەیری سـتەمکارانو، تـەنیا سـتەمکاران دەبـێ بەرپەرچی دەستدرێـژیـیو سـتەمەکەیان بدرێتـەوە.

هەروەها لە سوورەتی (الأنفال) ئایەتی (٦٠- ٦١)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾، واتە: هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێزو ولاخە بەرزەی بەستراوە، بۆیان ئامادە بکەن، دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن، وە کەسانێك کە لە پشت ئەوانەوەن، ئێوە نایانزانن، خوا دەیانزانێ، وە ئەوەی لەڕێی خوادا بیبەخشن، پاداشتتان دەدرێتەوەو ستەمتان لێ ناکرێ، وە ئەگەر باڵیان بۆ ئاشتی شۆڕ کردو مەیلی ئاشتیان هەبوو، تۆش باڵی بۆ شۆڕ بکەو لای ئاشتی بگرە، وە پشت بە خوا ببەستە، بێگومان خوا بیسەری زانایە.

وە لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٣٦) کە دەفەرمویٚ: ﴿وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾﴾، هەندێك لەوانەی کە بە هەڵە لەم ئایەتە تێدەگەن، دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەموو کافرو موشریکێك تۆ بۆت هەیە بیکوژیو شەڕی لەگەڵدا بکەی، خوێنی حەڵاڵەو ماڵی حەڵاڵە!! کە دیارە ئاوای لێکدەدەنەوە: لەگەڵ هەموو کافرو موشریکەکاندا بجەنگن، وەك چۆن ئەوان هەموویان لەگەڵتاندا دەجەنگن، وە بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە! بەڵام ئەم ڕستەیە مانایەکەی وانیە، بەڵکو مانایەکەی ئاوایە: هەمووتان لەگەڵ موشریکەکاندا بجەنگن، وەك چۆن ئەوان بە هەموویان لەگەڵتان دەجەنگن، واتە: هیچتان خۆ وە پاش مەدەن، نەك لەگەڵ هەموو موشریکەکاندا بجەنگن، بەڵکو هەمووتان ئەی مسوڵمانینە! ئامادەی جەنگو جیهاد بن لەگەڵ موشریکەکاندا، ئەگەر پێویستی کرد،

وەك چـــۆن ئـــەوان هـــەموویان ئامـــادەن، نـــەك بڵـــێی لەگـــەڵ هـــەموو موشـــریکەکاندا، چـونکە کافرێـك ڕێککـەوتن‌و پـەیمانی هـەبـێ، وە کەســێك ئەهلـی کیتــاب بــێ، وە کەســێك بــێ لایـەن بــێ، -وەك دوایـی باسـی دەکەین- خـوای دادگـەر ڕێگـای گـرتوە کە جەنگیان لە دژ بکـرێ !

کەواتــە: ئـــەو جـــۆرە تێگەیــشتنە هەڵەیـــە، وشـــەی: ﴿ كَآفَّةً ﴾، وەك زانایـانی شـــارەزای زمـان دەڵـــێن: پەیوەســـتە (مُتَعلِقة) بـە(و)ی (قاتِلوا)وەوە واتــە: هـــەمووتان بجـــەنگن لەگـــەڵ موشـــریکەکاندا، وەك چـــۆن ئـــەوان بـــە هـــەموویان لەگەڵتانـــدا دەجـــەنگن، (ابـــن كثيـــر) دەڵـــێ: {﴿ وَقَـٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً ﴾، أي: جميعكـــــم، ﴿ كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ۝٣٦ ﴾ أي: جميعهـم}[1].

وە لـە ئایـەتی ژمـارە (٩٠)ی ســوورەتی (النـساء)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ۝٩٠ ﴾ واتـە: ئەگـەر کافرەکـان کـەناریان گـرت‌و جـەنگیان لـە دژی ئێـوە نەکـرد، وە ئاشـتیان لەگەڵ ئێـوەدا بەرپـاکرد، ئەوە خوا ڕێگـای نـەداوە کـە لـە دژی ئـــەوان بجـەنگن.

هەروەها لە ســوورەتی (الـممتحنة) ئایـەتی (٨) دەفـەرموێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ۝٨ ﴾، واتــە: خـوا ڕێگــەتان لــێ ناگــرێ ئەوانــەی کـە لەســەر دیـن دژایـەتیتان ناکـەن، جەنگــتان لەگـەڵ ناکــەن، وە لـە ماڵ‌و حـاڵی خۆتـان وەدەرتــان نانێــن، کـە چاکەیان لەگــەڵدا بکــەن، وە لـە ماڵی خۆتــان

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (٥٦٧).

پێیان ببەخشن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ، کەواتە: نەك هەر دروست نیە لەگەڵ هەموو کافراندا بجەنگی، بەڵکو هەندێکیان دەبێ چاکەشیان لەگەڵدا بکەی، مادام ئەو لە دژی دینو ژینت نەجەنگێ.

ئنجا لێرەدا خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ پرسیارێك دروست دەبێ کە (عَسَى) واتە: نزیکە، جا هەندێك لە زانایان دەڵێن: (عَسَى مِنَ اللَّهِ وَاجِبَةٌ)، واتە: خوا ئەگەر فەرمووی: (عَسَى) مانای وایە لەسەر خۆی واجب کردوە، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا بۆچی کافر توندوتیژیی‌و زەبرو زەنگیان هەر بەردەوامە، هەرچەندە مسوڵمانیش جەنگ‌و جیهاد دەکەن، کەچی تەماشا دەکەین هەتا لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ زەبرو زەنگیان هەر هەبووەو لە دوای ویش کە هاوەڵان‌و خەلیفە ڕاشیدەکان جەنگ‌و جیهادیان کردوە، بەڵام کافرانی فارس‌و ڕۆم‌و دەوڵەتانی دیکە زەبرو زەنگیان هەر هەبووە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە لێرەدا (عَسَى) واتە: لەوانەیە، ڕەنگە، ئنجا ئایا بۆچی خوا وا دەفەرموێ؟ چونکە دیارنیە ئایا ئێمە وەك پێویست هۆکارەکان ڕەچاو دەکەین، یان نا، ئایا ئامادە سازییەکەمان وەك پێویستە، یان نا؟ چونکە خوای زاڵ‌و توانادار نەیفەرمووە: هەرکات مسوڵمان لەگەڵ کافر بەشەڕ هات، حەتمەن مسوڵمان سەردەکەوێ، بەڵکو لە سووڕەتی (الأنفال) ئایەتی (٦٥)دا دەفەرموێ: ﴿إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: ئەگەر بیست (٢٠)ی خۆڕاگرتان هەبن بەسەر دوو سەد (٢٠٠)دا زاڵ دەبن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ ﴿٦٦﴾﴾، واتە: ئێستا خوا لەسەری سووك کردوونە، ﴿وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗا﴾، وە زانی کە بێهێزن ﴿فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِ﴾، واتە: ئەگەر

سـەد (١٠٠)ی خۆڕاگرتـان هـەبێ بە دوو سـەد (٢٠٠) دەوێـرن، كەواتە: لەڕووی ژمـارەیی یـەوە، دەبـێ ژمارەیـەك هـەبن لـە حـاڵی بـەهێزیی مـسـوڵمانانـدا، لەڕووی ئیمـانییـەوە، ئەگـەر زۆر ئیمتیـازیان هـەبـێ، ئـەوە یـەك بـە دەیـە، بیست بەسـەر دوو سـەددا زاڵ دەبـن، بـەڵام لـە حاڵـێكدا كـە ئیمـانەكەیان لـەو ئاسـتەدا نەبـێ، یەك بـە دوویـە، مانـای وایـە دەبـێ یـەك بـە دوو هـەر ببـن، دەبێ لە بەرانبـەر هەر دوو كافراندا مسوڵمانێك هەر ببـێ، بـەڵام مـسـوڵمانێك بۆ دە هەزار كافر بچێتە مەیدانـێ، ئنجا بڵـێ: خوا فەرموویـەتی: ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، دەڵێین: مانای وایـە: ئەگـەر بەوپێیـەی كـە خـوا بـۆی دانـاون، جەنـگو جیهـاد بكـەن لەگـەڵ كافرانـدا، نـزیكە سـەربكەون، بـەڵام ئەگـەر بەوپێیـە نەبـێو مەرجـەكان نەیەنـە دی‌و، ئاسـتێكی ئیمـانیی بەرزتـان نەبـێ، یـاخود پێداویـستییەكانی جەنگـتان تـەواو نەبـن، وە كـاتی جـەنگ گونجـاوبـێ، ئـەویش دەبـێ ڕەچـاو بكـرێ، ئـەو كاتـە دەبـێ ئـەو چاوەڕوانییـە هەبـێ لـەو مـوژدەو بەڵێنـەی خـوای پەروەردگـارو بەخـشـەر، ئەگەرنا بەبێ هاتنـەدی مەرجـەكان چاوەڕوانـییەكە لە جێـی خـۆی نیـەو خـوا بەبێ مەرج مـوژدەی سـەركەوتنـی نـەداوە ! .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْـتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

خوا پشتیوان بێ لەم دەرسەدا، ئایەتەکانی (٨٥، ٨٦، ٨٧) لە سووڕەتی (النساء) تەفسیر دەکەین، خوای بەرزو مەزن لەم سێ ئایەتەدا، باسی سێ بابەت دەکات:

یەکەم: باسی شەفاعەتو تکاکردن دەکات، کە ئەگەر تکاکردن بە مەبەستی باش بێ، پاداشتی هەیە، وە ئەگەر بە مەبەستی خراپ بێ سزای لەسەرە.

دووەم: وە پاشان باسی سڵاو لێکران دەکات، کەسێك کە سڵاوی لێ دەکرێ، پێویستە وەك خۆی، وە وا پەسندە بە باشتر لە خۆی وەڵام بدرێتەوە.

سێیەم: وە دواییش خوای زاناو توانا باسی ئەوە دەکات کە جگە لە خۆی هیچ پەرستراو نین، وە بۆ ڕۆژی دوایی بەندەکانی کۆدەکاتەوە.

﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((هەر كەسـێك تكایەكی باش بكـات، بەشی لە (پاداشــتی) ئـەو تكـایەدا هەیـە، وە هـەر كەسـێك تكـایەكی خـراپ بكــات، پـشـكی لـە (سـزای) ئـەو تكـاكردنە خراپـەدا هەیــە، وە خـوا لەســەر هــەموو شــتێك بـالا دەسـتە ﴿٨٥﴾ وە ئەگـەر بـە (هـەر جـۆرە) سـلاوكردنێك سـلاوتان لێكـرا (لـە هـەر كەسـێكەوە بـێ) ئـەوە (پەسـندە) بـە باشـتـر لـە خـۆی سلاوی لـێ بكەنـەوە، یـان (لای كـەم) وەك خـۆی وەلامـی بدەنــەوە، بێگومـان خـوا لەسـەر هــەموو شـتێك لێپرسـەرەوەیە ﴿٨٦﴾ خـوا جگـە لـەو هـیچ پەرسـتـراو نین، بێگومـان بـۆ ڕۆژی هەڵسـانەوە كۆتـان دەكـاتەوە كـە هـیچ دوو دڵـیی لـە هـاتنی دا نیـە، ئنجـا ئایـا قسـەی كـێ لـە هـی خـوا ڕاسـتـتـرە ﴿٨٧﴾؟!)).

## شـیكردنــەوەی هــەندێـك لە وشـــەكان

(شَفَٰعَةً): (الـشَّـفْعُ: ضَـمُّ الـشَّـيءِ إِلى مِثْلِـهِ)، (شَـفْع) بریتیـە لـەوە كـە شـتێك وێنــەی خـۆی لەگــەڵ كـۆ بكەیـەوەو جـووتی بكـەی، (شَـفْع) بـۆ خـۆی یـانی جـووت، وەك خـوای بـێ هاوتـا دەفـەرموێ: ﴿وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ﴿٣﴾﴾ الفجـر، واتـە: سـوێند بـە جـووتو بـە تـاك، (والـشَّـفَـاعَـةُ: الإِنْـضِمَامُ إِلى آخَـرَ نـاصِـراً لَـهُ وَسَـائلاً عَـنْهُ، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمِلُ فـي انضِـمامِ مَنْ هُوَ أَعْـلَـى حُرْمـةً ومُرتَبَـةً إِلى مَـنْ هُـوَ أَدنَـى)، (شَـفَاعَةً) بریتیــە لـەوە كـە یـەكێك بـچێتە پـاڵ یەكـێكی دیكـە، پـشـتی بگـرێ، وە داوای بـۆ بكـات، وە بـە زۆریـی كاتێـك بـەكاردەهێنرێ ئــەوەی كە داوا دەكــات بـۆ ئـەوی دیكــە، پلــەی بـەرزتر بـێ، لــەوەی دیكــەو داوا بـۆ كراوەكــە پلــەی نزمتــر بـێ، بـۆ وێنــە: پێغـــەمبەری خـــوا ﷺ شـەفاعەت دەكــات بۆ گوناهبارانی ئۆممەتی.

(كِفۡلٞ ): (الكَفَالَةُ: الضَّمانُ والكِفْلُ، الكَفيلُ)، وشەی (كِفل) بە مانای بەش دێ، بەڵام كەفالەت بە مانای (ضمان) دێ، واتە: شتێك كە گرەنتی بكەی‌و (كِفل) بە مانای (كَفيل)یش دێ، وە (كِفل) بە مانای نەصیبو بەش دێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ...﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! پارێز لە خوا بكەن، ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بێنن، دوو بەش لە بەزەیی خۆیتان پێ دەدات.

(مُّقِيتٗا ): (مُقيتاً: مُقْتَدِراً أَو حَافِظاً)، واتە: بە توانایە، یاخود پارێزەرە، (قَائِماً عَلَيْهِ يَحْفَظُهُ) سەرپەرشتیی دەكات، وە دەیپارێزێ، (وَيُقيتُهُ) واتە: بژێوی پێ دەدات، (القُوتُ: ما يُكسِبُكَ الرِّمَقَ، قَاتَهُ يَقُوتُهُ وَأَقَاتُهُ يُقيتُهُ) واتە: بژێوی پێدا.

(بِتَحِيَّةٖ): (التَحِيَّةُ: حَيَّاكَ اللَّهُ، أي: جَعَلَ لَكَ حَيَاةً)، (تَحِيَّة) لە چی ڕاهاتوە؟ كە یەكێ بە یەكێ دەڵێ: (حَيَّاكَ اللَّهَ) واتە: خوا بتژێنێ، ژیانت پێبدا، وە لە پێش ئیسلامدا عەرەب وشەی (تَحِيَّة)ی یان بەكارهێناوە.

(حَسِيبًا): (الحَسِيبُ: المُحَاسِبُ الكَافي) حەسیب، واتە: لێپرسەرەوە، یاخود ئەوە كە بەس بێ بۆ ئەوە كە ئاگای لێی بێ‌و لێی بپرسێتەوە.

## مـانـای گـشــتــی ئایەتەکــــان

خوای بێ وێنــە دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی پێـشـێدا باسـی جـەنگـو جیهادی کـردوەو، مـسـوڵمانانی هانـداوەو، سـەرزەنـشـتی ئەوانـەی کـردوە کـە ئیمـان لاواز بوون، یاخـود دڵ نەخۆشو دەغـەڵ بوون، لەسـەر هەڵوێـسـتە خراپـەکانیانو قـسـە ترسنۆكو لەرزۆکەکانیان، وە لە کۆتاییدا فـەرمانی بـە پێغـەمبـەر ﷺ کـرد کـە تـۆ تـەنها بەرانبـەر بـە خـۆت بەرپرسـیاری، وە بجەنگـە لـە پێنـاوی خـوادا، وە مـسـوڵمانانیش هانبـدە، دوای ئـەوە خـوای تـاكو پـاك باسـی تکـاکردن دەکـاتو دەفـەرموێ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ﴾، هـەر کەسـێك تکایەکی باش بکـات پاداشـتی هەیـە لـەو تکـا باشـەدا، واتـە: لـە بەرهـەمـی ئـەو تکـاو شـەفاعەت کردنـە باشـەدا کـە ئەنجامێکـی باشـی لـێ دێتـە دی، بـۆ وێنـە: کەسـێك دەیەوێ لە کەسـێك بدات، تـۆش تکـای بـۆ دەکـەی، دەڵـێی لـێی مـەدەو، ئەو کەسـە دەربـازی دەبـێ، یـان کەسێك دەیـەوێ چـاکە لەگـەڵ کەسـێك نەکـات، تـۆش تکـای بـۆ دەکـەیو دەڵێـی چاکەی لەگـەڵ بکـە، مانـای وایـە ئـەو کەسـە بەهرەمەنـد دەبـێو تـۆش لـە پاداشـتی ئـەو بەهرەمەندبوونـەی ئـەودا بەشـداری، مادام تکـایەکی باشـت بـۆ کـردوە، ئنجـا باسـی تکـاکردنی خـراپ دەکات: ﴿ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ﴾، وە هـەر کەسـێك تکایـەکی خـراپ بکـات بەشـی تێیـدا هەیـەو پـشکی هەیـە لـە سـزای ئـەو تکـا خراپـەدا، وە لـە بەرهـەمو دەستکەوتی ئەو تکـا خراپـەدا، بـۆ وێنـە: یەکێـك تکـا لـە کەسـێك دەکـات کـە بچـێ گوناهێکی بکـات، زوڵمێـك بکـات، دەڵێ: تـۆ وەرە لەگـەڵم تکـات لـێ دەکـەم، وەرە بـا بـچـین فلان کەسی بکـوژین، بـچیـن ڕێ لـە فـلان کەسـی بگـرین، یـان فـلان گوناهـە بکـەین، بـۆ نـموونە: داوات لێدەکات لـە هەڵبژاردنـەکان دا سـاختە (تزویـر)ی بـۆ بکـەی !، ئـەویش وەك پاسـاودانەوە دەڵـێ: تکـای لـێکـردووم داوای لێکـردووم، دەچـم، ئـەوە لەڕاسـتییدا بابـای خراپـەکار خـۆی گوناهبـارە، بـەڵام ئـەو

کەسەش کە تکا دەکات بۆ شتێکی خراپ، ئەویش بەشداره لەو خراپەیەدا کە لە ئەنجامی ئەو تکاکردنەدا پەیدادەبێ، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ﴾، وە بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێ بالادەستەو توانادارە، یاخود: پارێزەرە.

ئنجا لێرەدا هەندێ لە توێژەرەوان لەبارەی چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانە بەوانەی پێشەوەوە دەڵێن: لەبەرئەوەی کە خەڵك کە دەچن بۆ جەنگو جیهاد، هی وا هەیە یەکێ دەچێ تەکلیفی لێدەکات، بۆخۆی ناچێ، بەلام دوای ئەوەی کە دوو سێ دۆستو برادەر دەچن دەڵێن: کاکە تۆش وەرەو لە پێناوی خوادایەو جەنگو جیهادە، خێرمان دەگاتێ، لەگەڵیان دەچێ، مانای وایە ئەوەش کە تکای کردوە، پاداشتی ئەویشی هەیە، یاخود بە پێچەوانەوە جاری وایە تکای خراپ دەکرێ: کاکە مەچۆ، بۆ کوێ دەچی؟! خۆت بەکوشت مەدە، ئەو شەڕە بێ ئەنجامەو جیهاد نیەو حاڵی واو حیسابی وا، ئەویش دیارە لە سزای ئەو تکا کردنە خراپەدا بەشدارە، هەندێك ئاوا ئەو ئایەتانە بەوانی پێشەوەوە پەیوەست دەکەن.

ئنجا دێتە سەر باسی سلاو لێکران دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ ﴾، وە ئەگەر سلاوتان لێکرا بە سلاوکردن بە (ما لم يُسمَّ فاعلُهُ) هێناویەتی، واتە: لە هەر کەسێكو لە هەر لایەکەوە، سلاوتان لێکرا ﴿ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآ ﴾ بە باشتر لە خۆی وەلامی بدەنەوە، وا پەسندە، ﴿ أَوۡ رُدُّوهَآ ﴾، یان بە لای کەمەوە، پێویستە وەك خۆی وەلامی بدەنەوە، سلاوکردن سوننەتە، وەلامدانەوەی وەك خۆی فەرزە، وەلامدانەوەی بە باشتر لە خۆی سوننەتە، دواتریش زیاتر ئەمە شی دەکەینەوە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ﴾، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك لێپرسەرەوەیە، واتە: لەوەش دەپرسێتەوە سلاوت لێبکرێ، وەلام نەدەیەوە، سلاوت لێبکرێ، وەك خۆی وەلامی نەدەیەوەو، یان بە کەمتر لە خۆی وەلامی بدەیەوە، گوناهباری، وە ئەگەر وەك خۆی وەلامی

بدەیەوە، ئەوە فەرزێکت جێبەجێ کردوە، بەڵام ئەگەر بە پەسندترو بە چاکتر لە خۆی وەڵامی بدەیەوە، ئەوە سوننەتێکت جێبەجێ کردوە.

ئنجا لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ خوا جگە لەو هیچ پەرستراو نین، ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾، هیچ گومانتان نەبێو دڵنیابن (ل)ەکە بۆ تەئکیدو سوێندە، واتە: سوێند بە خوا بە تەئکید کۆتان دەکەینەوە (ن)ەکەش بۆ تەئکیدە، یانی: دڵنیاو مسۆگەر بن، کۆتان دەکەینەوە بۆ ڕۆژی هەڵسانەوە ﴿لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ هیچ گومانی تێدا نیە کە دێ، دڵ لە دڵ مەدەن، وەك چۆن دەژینو دەمرن، هەر ئاواش زیندوو دەبنەوەو هەڵدەستنەوەو کۆ دەکرێنەوە، ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾، خوا سوێندی لەسەر دەخواو بۆتان جەخت دەکاتەوە قسەی کێش لە قسەی خوا ڕاستترە؟! هی هیچ کەس، بە تەئکید قسەی هیچ کەس لە هی خوای پەروەردگار ڕاستتر نیە، کەواتە: خوا ڕاست دەفەرموێ، زیندوو دەکرێنەوەو کۆ دەکرێنەوە، ئەگەر تێبینیتان کرد بێ، بە زۆریی خوای پەروەردگار لە نێوان ئایەتەکاندا کە باسی یاساکان دەکەن، باسی جەنگو جیهاد دەکەن، باسی حەڵاڵو حەڕامو ئەمرو نەهی دەکەن، باسی وەحدانیەتی خۆیو باسی ڕۆژیی دوایی دێنێتە پێشێ، بۆئەوەی ببێتە هاندەر بۆ مسوڵمانان، کە لە ڕاستییدا ئیمانو عەقیدەی خوا بەیەك گرتنو بڕوا بوون بە دوا ڕۆژو بە سزاو پاداشت، پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ، پابەند بێ بە شەریعەتەوە، وە واجبەکان جێبەجێ بکاتو خۆی لە حەڕامەکان بپارێزێو جەنگو جیهاد بکاتو لە پێناوی خوادا فیداکاریی بکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوە کە خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقِيتًا ﴾، واتە: هەر کەسێك تکایەکی باش بکات، پشكو بەشی هەیە لەو تکا باشەدا، واتە: لە بەرهەمەکەیدا، وە هەر کەسێك تکایەکی خراپ بکات، پشكو بەشی هەیە لە بەرهەمی شوومی ئەو تکا خراپەدا، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یاخود پارێزەری هەموو شتێکە. دەربارەی شەفاعەتو تکا کردن ئێمە چەند شتێك دەخەینەڕوو:

### باسێك لەبارەی شەفاعەتەوە

**یەکەم: شەفاعەت یانی چی؟**

ئێمە پێشتر باسمان کرد وشەی (شَفع) واتە: جووت، پێچەوانەکەی (وَتر)ە، واتە: تاك، (قُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆی (الجامع لأحكام القُرآن)[1]، ئاوا پێناسەی شەفاعەت دەکات: دەڵێ: (أَصلُ الشَّفَاعَةِ وَالشُّفْعَةِ وَنَحوهَا مِنَ الشَّفْعِ وَهُوَ الزَوج فِي العَدَدِ، وَمِنْهُ الشَّفِيعُ لأَنهُ يَصِيرُ مَعَ صَاحِبِ الحَاجَةِ شَفعاً، وَمِنْهُ نَاقَةٌ شَفُوع إِذَا جَمَعَت بَيْنَ مَحْلَبَيْنِ فِي حَلْبَةٍ وَاحِدَةٍ، وَنَاقَةٌ شَفِيعٌ إِذَا اجْتَمعَ لَهَا حَمْلٌ وَوَلَدٌ، يَتْبَعُهَا وَالشَّفْعُ ضَمٌّ وَاحِدٍ إِلى وَاحِدٍ، وَالشُّفْعَةُ ضَمُّ مُلْكِ الشَرِيك إِلى مُلْكِك فَالشَّفَاعَةُ إِذاً: ضَمُّ غَيْرِكَ إِلى جَاهِكَ وجَعلُهُ وَسَيلَتَكَ فَهِيَ عَلَى التَّحْقِيق: إِظهَارٌ لِمَنزِلَةِ الشَّفِيعِ عِنْدَ المُشَفَّعِ وَإِيصالُ المَنْفَعَةِ إِلى المَشْفُوعِ لَهُ)، واتە: ئەسڵی وشەی شەفاعەتو شوفعە لە (شَفْع)ەوە هاتوە، (شَفْع) واتە: جووت، جووتە

---

١) ج: (٥)، ص: (٢٥٧).

لە ژمارەکاندا، وە (شَفِيع) واتە: تکا کار، بۆیەش وای پێ دەگوترێ، چونکە لەگەڵ ئەو کەسەی کە تکای بۆ دەکات ئەویش دەبن بە دوو، (کەسێك داوایەکی هەیە یەکێکی دیکەش تکای بۆ دەکات، لەگەڵ ئەو دەبن بە جووت) وە عەرەب گوتوویانە: (نَاقَةٌ شَفُوع) واتە: حوشترێکی شەفووع، ئەگەر لە دوو شوێن بدۆشرێ، هەروەها گوتوویانە (ناقَةٌ شَفِيع) کە بەچکەشی لەبەر بێتو ئاوسیش بێ، کەواتە دوون، دوو بەچکەی هەن، یەکێکیان لە زگی دایە، ئەویدیکەیان بە دوای دەکەوێ، وە (شَفْع) ئەوەیە کە شتێك لەگەڵ دانەیەکی دیکەدا کۆبکەیەوە، وە (شُفْعَة) لە کتێبە فقهییەکاندا ئەوەیە کە دراوسێیەك موڵکی دراوسێیەکی دیکە ببێتە هی ئەو، کەواتە: شەفاعەت یانی: ئەوە کە تۆ غەیری خۆت بێنی بۆلای خۆت، وە بیکەی بە وەسیلە، وە لەڕاستییدا شەفاعەت بریتیە لە دەرخستنی پێگەی کەسێك کە تکا دەکات لە لای کەسێك کە تکای لەلا دەکرێ، وە گەیاندنی سوودێك بەو کەسەی کە تکای بۆ دەکرێ.

یانی: سێ تەرەف هەن تکا کەر(شافع)، تکا لەلا کراو (مُشَفَّعٌ)، تکا بۆکراو (مشفوع لە)، تکاکەر (شافع وشفیعْ)، دیارە لێرەدا لەم ئایەتەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً ﴾، وا پێدەچێ مەبەست پێی تکاکردن بێ، خەڵك تکا بۆ یەکدی دەکات، جا ئەگەر تکایەکە باش بێ، ئەوە تکاکردنی باشە، ئەگەر خراپیش بێ، خراپە.

بەڵام (طَبَري) لێرەدا بە جۆرێکی دیکە وشەی (شَفَاعَة) مانا دەکاتو دەڵێ: {يَعْنِي بِقَوْلِهِ جَلَّ ثَنَاؤُهُ: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ﴾، مَنْ يَصِرْ يَا مُحَمَّد، شَفْعاً لِوَتْرِ أَصْحَابِكَ، فَيَشْفَعْهُم فِي جِهادِ عَدُوهِمْ وَقِتَالِهِمْ فِي سَبِيل اللَّهِ، وَهُوَ: (الشَّفَاعَة الحَسَنَة...) يَكُنْ لَهُ مِنْ

شَفَاعَتِهِ تِلْكَ نَصِيبٌ، وَهُوَ الحَظُّ مِنْ ثَوَابِ اللَّهِ وَجَزِيلِ كَرَامَتِهِ، ﴿وَمَن يَشْفَعْ شَفَعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا﴾، يَقُولُ: وَمَنْ يَشْفَعَ وَتراً أَهْلِ الكُفْرِ بِاللَّهِ عَلَى المُؤْمِنِينَ بِهِ، فَيُقَاتِلهُم مَعَهُمْ، وَذَلِكَ هُوَ: (الشَّفَاعَةُ السَيِّئَة) (يَكُن لَهُ كِفْلٌ مِنْهَا)، يَعني بالكفل: النَّصِيبُ وَالحَظُّ مِن الوِزرِ وَالإِثْمِ}[١]، واتە: (تەبەریی ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان ناسراوە) دەڵێ: خوای بەرزو مەزن کە دەفەرموێ: هەر کەسێك تکایەکی باش بکا، بەشی لەو تکا باشەدا هەیە، (واتە: ئەی موحەممەد! هەر کەسێك ببێتە جووت بۆ تاکی هاوەڵانت، وە لە جەنگکردن دژی دوژمنانـدا، وە جەنگکردن لە پێناوی خوادا، لەگەڵ وان دابێ، کە ئەوان تاك بوون ئەویش ببێتە جووت، کە ئەوە تکاکردنی باشە، ئەوە لەو بوونە جووتەی دا پاداشتی هەیە، کە بریتیە لەو پاداشتەی لای خوای بەرزو ڕێزگرتنی، وە کە دەفەرموێ: هەر کەسێك تکایەکی خراپ بکات، دەڵێ: مەبەستی ئەوەیە هەر کەسێك پاڵ داتە لای ئەهلی کوفر، کە ئەوان وەك تاك وانو ئەویش بۆیان ببێتە جووت لە دژی ئیمانداران، وە لەگەڵ واندا بجەنگێ لە دژی ئیمانداران، کە ئەوە بریتیە لە شەفاعەتی خراپ، ئەوە بەشی هەیە لەو گوناحو تاوانەدا کە کافرەکان دەیکەن، کە ئەویش چۆتە پاڵ ئەوانەوە.

بەڵێ (طَبَرِي) ئاوای لێکدەداتەوە، هەڵبەتە لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە هەڵدەگرێ، بەلام بە پێی سیاقی ئایەتەکان، وە بە پێی ئەوەی کە هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لێرەدا لە (شەفاعەت) داواو تکاکردنە، جا ئەگەر باش بێو بۆ مەبەستێکی باش بێ، ئەوە شەفاعەتێکی چاکەو، ئەگەر خراپیش بێ خراپە، ڕایەکی (طَبَرِي) بەهێز نیە.

١) الجامع البيان، ج: (٥)، ص: (٢٠٧).

**دووەم: حوكمی شەفاعەت چییە؟**

دیارە تكاكردنی خەڵك بۆ یەكدی، ئەگەر ئەو مانایەی لێ وەربگرین كە هەڵمانبژارد، حوكمەكەی بە پێی جۆری تكاكردنەكەیەو بە پێی ئەو ئامانجەیە كە تكای بۆ دەكرێ، ئەگەر ئەو كەسە كە تكا دەكات، جا پیاو بێ، یان ئافرەت، بە هاندەرێكی باش ئەو تكایە بكات، وە بۆ ئامانجێكی باش بیكات، وە لە شوێنی خۆی دابێ، ئەوە پاداشتی هەیەو مانای وایە تكاكردنەكەی باشە، بەڵام ئەگەر بە هاندەرێكی خراپ ئەو تكایە بكاتو بیەوێ هەقێك بە ناهەقێك بگۆڕێ، یان ناهەقێك بكاتە هەق، وە بۆ ئامانجێكی خراپ بێ، وە لە شوێنی خۆی دانەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: تكاكردنێكی خراپ (زَمَخْشَرِي) لە تەفسیری (الكشاف)دا كە خاوەنی (محاسِنُ التـأويل)، لێی نەقڵ دەكات، پێناسەیەكی جوانی (شَفَاعَةُ) دەكات، دەڵێ: (الشَّفَاعَةُ الْحَسَنَةُ هِيَ الَّتِي روعيَ بِهَا حَقُّ مُسْلِمٍ، وَدُفِعَ بِهَا عَنْهُ شَرٌّ، أَوْ جُلِبَ إِلَيْهِ خَيْرٌ وَابْتَغَي بِهَا وَجْهُ اللَّهِ، وَلَمْ تُؤْخَذْ عَلَيْهَا رِشْوة، وَكَانَت فِي أَمْرٍ جَائِزٍ، لاَ فِي حَدٍ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ، وَلاَ فِي حَقٍ مِنْ الحقُوقِ، وَالسَيِّئَةُ مَا كَانَ بِخِلاَفِ ذَلِكَ)[*] واتە: تكاكردنی باش ئەوەیە كە مافی مسوڵمانێكی تێدا ڕەچاو كرابێ، وە بویسترێ خراپەیەكی لێ لابدرێ، یاخود قازانجێكی پێ بگات، وە لەبەر ڕەزامەندیی خوا بێ، وە بەرتیلیی لە بەرانبەردا وەرنەگیرابێ (چونكە مرۆڤ جاری وایە واستە دەكات، جا ئەگەر هەر تكا بكات، بەبێ ئەوەی هیچ وەربگرێ بە ناوی دیارییەوە، ئەوە مانای وایە تكاكردنێكی باشە، ئەگەرنا بە پێچەوانەوە دەبێتە تكاكردنێكی خراپ، لەبەرئەوەی بەرتیل وەردەگرێ)، وە لە كارێك دابێ كە دروست بێ، وە لە پەكخستنی یەكێك لە سنوورەكانی خوادا نەبێ (واتە: بۆ ئەوە نەبێ سزایەكی شەرعیی لەسەر كەسێك لا بچێ)، هەروەها لە یەكێك لەو مافانەدا نەبێ كە لەسەری

١) محاسِنُ التأويلِ، ج: (٥)، ص: (٣٣٢).

واجبە، (کەسێك کە ھەقێکی لەسەر واجبە، ئەوە ھیچ منەت نیە کە تکای لەلا بکات) ئەوە پێی دەگوترێ شەفاعەتی باش، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوەش بێ، پێی دەگوترێ: تکاکردنی خراپ، با دوو فەرموودەش لەوبارەوە بهێنینەوە:

**فەرمایشتی یەکەم:** ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَاءَهُ السَّائِلُ أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، قَالَ: اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا وَيَقْضِي اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ مَا أَحبَّ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٥٩٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٣٦٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٢٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: رقم (٥١٣١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٧٢) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٥٦)، واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو، ئەگەر کەسێك ھاتبایە لای شتێکی لێ داواکردبا، یاخود پێویستییەکیان لەلای باس کردبایە، داواکارییەکی ئاڕاستە کرابایە، دەیفەرموو: تکا بۆ یەکدی بکەن، (تکای باش) پاداشتتان دەبێ، وە خواش لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆی ﷺ ھەر شتێك کە پێی خۆشبێ جێبەجێی دەکات، واتە: ئێوە قسەی خۆتان بکەنو تکای خۆتان بکەن، جا ئەگەر ڕێی تێچوو، ئەوە خوای پەروەردگاریش دەیخاتە سەر دڵو زمانی منو منیش داواکەتان دەگرمەوەو، تکاکەتان جێبەجێ دەکەم، ئەگەرنا ئەوە ئێوە بەپێی نیەتی خۆتان پاداشتی خۆتان ھەیە.

**فەرمایشتی دووەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، أَنَّ زَوْجَ بُرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ: مُغِيثٌ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي، وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ: يَا عَبَّاسُ أَلا تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بُرِيرَةَ، وَمِنْ بُغْضِ بُرِيرَةَ مُغِيثًا ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَوْ رَاجَعْتِهِ فَإِنَّهُ أَبُو وَلَدِكِ؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَتَأْمُرُنِي ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا أَنَا أَشْفَعُ فَقَالَتْ: فَلا حَاجَةَ لِي فِيهِ﴾ أَخْرَجَهُ

البُخَارِيُّ برقم: (٥٢٨٣)، وابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٢٧٣) وَغَيرهُم، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: هاوسەری بوڕەیرە كۆیلە بوو (بوڕەیرە ئافرەتێك بووە كەنیزەك بووە، هاوسەری بوڕەیرە كۆیلە بوو، ناوی موغیث بوو) دەڵێ: مـن ئێستا دیمەنەكەیم لەبەرچاوە: بوڕەیرە دەڕۆیی ئەویش لە پشتیەوە دەڕۆیشت، دەگریا، وە فرمێسكی بەسەر ڕیشی دا دەهاتە خوارێ (دیارە ژنەكەی پێی ڕازی نەبووەو ویستوویەتی لێی جیابێتەوە، ئەویش پەرۆشی بووەو خۆشی ویستوەو بەدوایدا ڕۆیشتوەو گریاوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبباسی فەرموو: ئەی عەبباس (عەبباسی مامی) پێت سەیر نیە موغیث چەندەی بوڕەیرە خۆشدەوێ، بوڕەیرەش چەندەی ڕق لە موغیث هەڵدەستێ؟ دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بە بوڕەیرەی گوت، بۆ ناگەڕێیەوە لای، بابی مندالەكانتە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمانم پێ دەكەی؟ فەرمووی: نا، تەنیا تكای بۆ دەكەم، گوتی: پێویستم پێی نیە (ئەگەر فەرمانی پێ كردبا واجب بوو دەبوو بگەڕێتەوە لای، بەڵام مادام كە تكا دەكات، دەتوانێ تكاكە وەرنەگرێ).

**مەسەلەی دووەم:** دەربارەی سڵاوكردن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴾، ئەگەر سڵاوتان لێكرا لە هەر لایەكەوە بوو، بە هەر شێوەیەك بوو، بە باشتر لە خۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، سوننەتە بە باشتر لە خۆیو، پێویستە وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

لەوبارەوە چەند شتێك دەخەینەڕوو:

**یەكەم: (تَحِيَّة) یانی چی؟**

كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ ﴾، وشەی (تَحِيَّة) كە لە شوێنی دیكەشدا هاتوە: بۆ وێنە: لە سوورەتی (المجادلة)دا خوای بە بەزەیی

دەفـــەرموێ: ﴿وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوۡكَ بِمَا لَمۡ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ۝٨﴾، هـــەروەها لـــە سوورِەتی (النـور)یشـدا دەفەموێ: ﴿فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗ ۝٦١﴾، (قُرطُبي) لە تەفسیـرەکەی خۆیدا ئاوا پێناسەی تەحییـەی کـردوە، دەڵـێ: (التَحِيَّـةُ تَفْعِلَـةُ مَـن حَيَّيـتُ... وَالتَحِـيَّةُ السَّلاَمُ، وَأصْلُ التَحيَّـةِ الدُّعَـاءُ بالْحَيَّـاة)[١].

(تَحِيَّـة) ئێمـە بـە کـوردیی دەڵـێین: ســڵاو، ســڵاوکردن، تەفعیلــەیە لـە (حَيَّيتُ)، (حَيَّيـتُ) واتە: پێمگـوت: بژیــەی، وە (تَحِيَّـة) ســەلامە، وە (تَحِيَّـة) لە ئەسـڵدا ئەوەیـە کە تۆ دوعـا بۆ کەسـێك بکـەی کە بژیـێ و بـەردەوام بـێ.

<u>دووەم</u>: (تَحِيَّـة) چـەند جۆرەو بە چەند جـۆر دەگونجـێ سـڵاو بکـرێ؟

لـە ڕاسـتیدا ئـەوە بەپێـی عـادەت و بـاوی میللــەتانە، یـانی: ئینگلیـز بـە شـێوەیەك سـڵاو دەکـەن، ئەمریکـیی بـە شێوەیەك، فەرەنسـیی بـە شێوەیەکی دیکــە، هینــد بــە شــێوەیەك، کــورد بــە شــێوەیەك، وە هەروەهــا چــەند میللــەت هـەن لەوانەیـە ئەوەنـدە جـۆرە ســڵاوکردنە هــەبن، هـەر کەسـە بـە زمــانی خـۆیو بە شـێوەی خـۆی، هەیـە بـە دەست ئیشـارەت دەکـات، هەیــە دەست بـە سـینگیەوە دەنـێ، هەیـە بـە پەنجـەی ئیشـارەت دەکـات، هەیـە سـەر دەلەقێنــێ، هەیـە بـە قسەی دەریـدەبڕێ، سـڵاوکردن زۆر جـۆری هەیـە، بـەڵام سڵاوکردنێك کە بـۆ مسـوڵمانان دانـراوەو پەسندەو چاکەو خـوا هەڵیبـژاردوە، ئەوەیــە کـە خـوا دەفــەرموێ: ﴿فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗ ۝٦١﴾، واتـە: ئەگــەر چـوونە ماڵەکــانەوە سـڵاو لـە خۆتـان بکـەن، یـان ســڵاو لـە یەکـدی بکەن، ســڵاوێك کـە لەلایــان

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٢٥٩).

خواوەیە، بە پێزەو پاكو چاكە، كە بریتیە لە: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وبركاتُهُ) واتە: ئەو سڵاوە لە یەكدی بكەن.

بەڵام مادام خوا سبحانەو تعالى دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ﴾، هەر كات سڵاوتان لێكرا بە هەر سڵاو لێكردنێك، بە باشتر لە خۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، كەواتە: هەر جۆرە سڵاوێكت لێكرا، پێویستە وەڵام بدرێتەوە، جا جاری وا ڕەنگە ئەو جۆرە سڵاوكردنەی كەسێك دەیكات، ئەوەی تۆ نەبێ‌و هی ئیسلامەتیی نەبێ‌و نەڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) بەڵام گرنگ ئەوەیە دەبێ تۆ وەڵامی بدەیەوە، بە باشتر لە خۆی، یان بە لای كەمەوە وەكو خۆی.

سێیەم: حوكمی سڵاولێكردن (تَحِيَّة) چییە؟

زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە سڵاوكردن سوننەتە، واتە: بیكەی پاداشتی هەیە، نەیكەی گوناهت ناگاتێ، بەڵام وەڵامدانەوەی فەرزە، وەك (قُرطُبي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (أَجْمَعَ العُلمَاءُ عَلَى أنَّ الإبتَدَاء بِالسَلامِ سُنَّة مُرَغّبٌ فِيهَا وَرَدُّهُ فَرِضَةٌ...)[1]، واتە: زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوە كە لە سەرەتاوە سەلامكردن سوننەتەو شتێكە خەڵكی بۆ هاندراوە، بەڵام وەڵامدانەوەكەی پێویستە، واتە: لەسەر وەڵامنەدانەوەی سڵاو، ئینسان گوناهبار دەبێ.

مەسەلەی سێیەم: لەم مەسەلەیەدا چەند شتێك باس دەكەین دەربارەی سڵاوكردن‌و، وەڵامدانەوەی، لە حەوت كورتە خاڵدا:

١/ سڵاوكردن‌و وەڵامدانەوەی یەكێك وەبری كۆمەڵێك دەكەوێت: كۆمەڵێك دەچن بۆ شوێنێك، یەكێكیان سڵاو بكات، وەبری ئەوانی دیكەش دەكەوێ، كۆمەڵێك دانیشتوون سڵاویان لێدەكرێ، یەكێكیان وەڵام

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٢٦٠).

بداتەوە، ئەوە وەبری ئەوانی دیکەش دەکەوێ، بەڵگەمان لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەیە: ﴿عَنْ عَلِيّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ ﷺ «يُجْزِئُ عَنْ الْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ، وَيُجْزِئُ عَنْ الْجَمَاعَةِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ»﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢١٠) وَحَسَّنَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٧٧٨)، واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: وەبری کۆمەڵێك دەکەوێ ئەگەر بە شوێنێکدا تێپەڕین، یەکێکیان سەلام بکا، وەبری هەموویان دەکەوێ، کە یەکێکیان وەڵامداتەوە.

بۆ ئەوەی کە سڵاو دەکەن، نەبێتە گەڕەلاوژە، وە وەڵامدانەوەکەش بە هەمان شێوە، ئیسلام بۆ هەموو شتێك ڕێك و پێکیی پێ چاکەو، ڕێك و پێکیی داناوە.

٢/ سوار سڵاو لە پیادە دەکا، ڕێڕەویی لە دانیشتوو، کەم لە زۆران، گچکە لە گەورە: بە پێی ئەم فەرموودەیە: ﴿عَنْ أبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ والصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٦٣٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٢٣٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦١١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٧٠٣)، واتە: ئەبو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوار سڵاو لە پیادە دەکات، وە ڕۆیشتوو (ئەوەی ڕێڕەوییە) سڵاو لە دانیشتوو دەکات، وە کەم سڵاو لە زۆران دەکات، وە گچکە سڵاو لە گەورە دەکات، وە هی کەم تەمەن لە هی بە تەمەن.

٣/ ئەگەر کەسێك سڵاوی کەسێکی پێ گەیەندرا لە کەسێکەوە، دەبێ سڵاوی لێ بکاتەوە: لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ! هَذَا جِبْرِيلُ

يَقْـرأُ عَلَيْـكِ الـسَّلام، فَقُلْـتُ: وَعَلَيْـهِ الـسَّلامُ وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وَبَرَكَاتُـهُ» ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٦٢٥٣)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٢٥١)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٧٠٩٨)، وَالطَّبَرانـيُّ فـي (الكبيـر) بـرقم: (٨٨)، واتـە: عائیـشـە خـوا لــێی ڕازی بــێ دەڵــێ: ڕۆژێـك پێغەمبــەری خــوا ﷺ پێــی فــەرمووم: ئــەی عائیـشــە! ئــەوە جیبـریلــە سـەلامت لــێ دەکـات، منـیش گـوتم: سـەلام‌و ڕەحمـەت‌و بەرەکەتەکانی خوای لـێ بێ، ئنجـا عائیشـە دەڵـێ: ئەو شـتێکی دەبینـی کە من نەمدەبینـی، واتە: ئەو جیبـریلی دەبینی من نەمدەبینـی.

٤/ وا باشـە بابـای سـڵاو گەیەنـەریش سـەلامی لـێ بکرێتـەوە: بـە پێـی ئـەم فەرموودەیـە: ﴿جَـاءَ رَجُـلٌ إلى النَّبِـيِّ ﷺ فَقَـالَ إنَّ أَبِـي يُقْرِئُـكَ الـسَّلامَ، فَقَـالَ النَّـبِيِّ ﷺ: «عَلَيْـكَ وَعَلَـى أَبِيـكَ الـسَّلامُ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٣١٥٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢٣١)، وَالنَّسَائِيُّ فـي (الكُبرى) بـرقم: (١٠٢٠٥)، وَالبَيْهَـقِيُّ فـي (شعب الإيمان) بـرقم: (٨٩٢٠)، وَحَسَّنَهُ الألبـاني فـي (سُنَن أبي دَاوُد)، واتە: پیاوێك هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺ گوتی: بابـم سەلامت لـێ دەکـات، ئـەویش فـەرمووی: سەلام لە تـۆش‌و لە بابیشــت بێ.

٥/ کە یەکێك سـەلامت لـێ دەکـات نابێ بڵـێی: (عَلَيْكَ السَّلام): لەوبـارەوە ئەم فەرمایشـتە هـەیە: ﴿عَنْ جَـابِرِ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ قَالَ: لَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْـتُ: عَلَيْـكَ الـسَّلَامُ يَـا رَسُــولَ اللَّــهِ! فَقَــالَ: «لاَ تَقُــلْ عَلَيْـكَ الـسَّلَامُ، فَإِنَّ عَلَيْكَ السَّلَامُ تَحِيَّةُ الْمَيِّتِ، ولكـنِّي قُل: السَّلَامُ عَلَيْكَ»﴾ أَخْرَجَــهُ أَبُــو دَاوُدَ بــرقم: (٤٠٨٤)، وصَــحَّحَهُ الألبــاني فــي (السلــسلة الصحيحة) بـرقم: (٢٨٤٦)، واتـە: جابیـری کوڕی سـولەیم خوا لێی ڕازی بــێ دەڵــێ: گەیــشتمە پێغەمبــەر ﷺ، گـوتم: (عَلَيْـكَ الـسَّلام) ئــەی پێغـەمبەری خوا ﷺ ! ئەویش فەرمووی: مەڵـێ (عَلَيْـكَ الـسَّلام) چونکە (عَلَيْكَ السَّلام) سـڵاوکردنی مردوە، بەڵکو بڵـێ: (السَّلامُ عَلَيْكَ).

٦/ دروستە سڵاوکردن لە منداڵانو لە ئافرەتانیش: وەك لەم دوو فەرموودەیەدا هاتوە: ﴿عن سَيَّارٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَذَكَرَ أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ أَنَس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَحَدَّثَ أَنَس أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ﴾، أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٢٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦٢٨)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٩٦)، واتە: سەیار (ناوی یەکێکە لە پێشینانی چاك) دەڵێ: لەگەڵ ثابیت دەڕۆیشتم ثابیت (دیارە یەکێك بووە لە شوێنکەوتووان - تابعین-) بە لای کۆمەڵە منداڵێکدا تێپەڕی سەلامی لێکردن، وە باسی کرد (واتە: ثابیت باسی کرد) کە لەگەڵ ئەنەس (ئەنەسی کوڕی مالیك)دا بە لای منداڵاندا ڕۆیشتوە بە ڕێگەدا سەلامی لێکردوون، وە ئەنەسیش باسی کردوە کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە ڕێ دا ڕۆیشتوە، بەلای منداڵاندا تێپەڕبووە، سەلامی لێکردوون، کەواتە: ثابیت لە ئەنەس، ئەنەسیش لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەریگرتوە، ئەوە بە نسبەت سڵاوکردن لە منداڵان، وە بە نسبەت سڵاوکردن لە ئافرەتانیش، ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ أَسْمَاءُ بِنْتُ يَزِيدَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ فِي نِسْوَةٍ فَسَلَّمَ عَلَيْنَا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٩١٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٥٢٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٨٢٣)، واتە: ئەسمائی کچی یەزید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ئێمە کۆمەڵە ئافرەتێك بووین پێغەمبەر ﷺ بە لاماندا تێپەری، سڵاوی لێکردین.

٧/ سڵاوکردن لە گۆڕستان: ئەگەر بە لای گۆڕستانێکی ئیمانداراندا ڕۆیشتی، ئەوە سوننەتە سڵاویان لێ بکەی، بە پێی ئەم فەرمایشتە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ قُلْتُ: كَيْفَ أَقُولُ لَهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟! قَالَ: قُولِي: «السَّلامُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ

اللَّهُ بِكُمْ لَلاحِقُونَ» ﴾، (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٢٢٥٢)، واتـه: عائیشـه خوا لێی ڕازی بێ (دیاره له پێغەمبەری خوای ﷺ پرسیوه که چۆن سڵاو له مردووان بکات، له گۆڕستاندا) گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆنیان سڵاو لێ بکەم؟ ئەویش فەرمووی: بڵێ: سڵاو له خاوەنی ئەو مەنزڵگایانه له ئیمانداران و له مسوڵمانان، وه خوا بەزەیی بێتەوه به پێشووەکانمان داو بەوانی دواییشماندا، وه ئێمەش هەر کاتێ خوا ویستی پێتان دەگەین، ئێوه ڕۆیشتوون (چوونه شاری خامۆشان) ئێمەش له نۆرەی خۆماندا پێتان دەگەین. کوردەواریی به گۆڕستان دەڵێن: شاری خامۆشان.

**مەسەلەی چوارەم:** گرنگیی سڵاوکردن: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی گرنگیی سڵاوکردن دەفەرموێ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ» ﴾، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٠٧٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٢)، واته: ناچنه بەهەشتێ، هەتا ئیمان نەهێنن، ئیمانیش ناهێنن تاکو یەکدیتان خۆشنەوێ، شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن ببێته هۆی یەکدی خۆشویستنتان؟ سڵاو بڵاوبکەنەوه له نێوان خۆتاندا، (دیاره مەبەست هەر ئەوەنیه له ڕێی پێی بگەی بڵێی: سەلامون عەلەیك! بچۆ سەردانیشی بکه، به نامه بۆی بنێره، تەلەفۆنی بۆ بکه، یانی: به هەر شێوەیەك له شێوەکان، هەواڵی یەکدی بپرسن و سڵاو له یەکدی بکەن).

**مەسەلەی پێنجەم:** سڵاوکردن و سڵاو لێکران لەلایان کافرانەوه، چۆنه و حوکمەکەی چییه؟ لەوبارەوه زانایان ڕاجیاییان هەیه:

هەندێك دەڵێن: دروسته سڵاو له کافران بکەین.

هەندێك دەڵێن: دروست نیه.

هەندێك دەڵێن: دروستە وەڵامیان بدەیەوە.

هەندێك دەڵێن: دروست نیە.

بەڵام من بە بۆچوونی خۆم دوای ئەوەی کە زۆر لەو مەسەلەیەدا لێکۆڵینەوەم کردوەو زۆر شتم خوێندۆتەوە، پێموایە لەبەرئەوەی خوای دادگەر فەرمانی بە ئیمانداران کردوە، کە چاکە بکەن و چاکە بڵێن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة، واتە: چاکە بکەن خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ٨٣﴾ البقرة، واتە: چاکە بە خەڵکی بڵێن، وە پاشان خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٨﴾ الممتحنة، واتە: خوا لێتان قەدەغە ناکات کەسانێك کە جەنگتان لەگەڵ ناکەن لە دیندا، (لەسەر دین لەگەڵتان بە شەڕ نایەن)، وە لە ماڵ و حاڵی خۆشتان وەدەرتان نانێن (با کافریش بن، خوا ڕێتان لێ ناگرێ) کە چاکەیان لەگەڵ بکەن، وە لەگەڵیشیان بەخشندە بن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێن.

بۆیە من پێموایە مسوڵمان پێویستە هەمیشە دەستی چاکەو جوامێریی و چاکەکارییان بەسەر غەیری خۆیانەوە بێ، بۆیە پێویستە نامسوڵمانانیش لە بواری سڵاوکردندا، هەمان مامەڵەی مسوڵمانیان لەگەڵدا بکرێ، یانی: سوننەت و پەسندە سڵاویان لێ بکرێ و، کە سڵاویشیان کرد پێویستە وەڵامیان بدرێتەوە، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ: ئەدی ئێمە هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ هەن کە دەفەرموێ: سڵاو مەکەن لە کافران، چۆن لێکیان بدەینەوە؟ بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَلاَ النَّصَارَى بِالسَّلاَمِ، فَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ»﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٥٤٢)،

وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦٢٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢٠٥) وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٧٠٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کە دەگەنە جوولەکەو نەصرانییەکان، ئێوە دەستپێشخەر مەبن بۆ سڵاولێکردنیان، وە ئەگەر لە ڕێیەکدا بە یەکێکیان گەیشتن هەوڵبدەن بیخەنە شوێنی تەنگەبەرەوە، واتە: بۆخۆتان بە نێوە ڕاستی ڕێدا بڕۆنو با ئەو بکەوێتە کەناری ڕێیەکە، هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»﴾، مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٨٥٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦١٨)، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خاوەن کتێبەکان سڵاویان لێکردن بڵێن: (وَعَلَيْكُمْ) لە ئێوەش، هەر ئەوەندە، بڵێن. جا ئایا ئەمە چۆنەو چۆن وەڵام دەدرێتەوە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە من پێمـوایە ئەوە مامەڵەی مسوڵمانانو پێغەمبەر ﷺ بووە لەو کاتەدا، لەو بارودۆخە سیاسییەدا کە جوولەکەو نەصرانییەکان دژایەتیی ئەهلی ئیسلامیان کردوە، وەکو لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ الْيَهُودَ أَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ، قَالَ: وَعَلَيْكُمْ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٦٢١)، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: کە جوولەکەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ دەیانگوت: (السَّامُ عَلَيْكَ) واتە: ﴿(المَوتُ عَلَيْكَ) مردن بۆ تۆ، پێغەمبەر ﷺیش بڵێ چی؟} ئەویش دەیفەرموو: (وَعَلَيْكُم) لەسەر خۆتان، یانی: ئەگەر سەلامە لەسەر خۆتانو، ئەگەر مردنیشە هەر لەسەر خۆتان، کەواتە: دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە بارودۆخی تایبەتیی ئەو کاتە وایکردوە کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا بفەرموێ، ئەگەرنا بەپێی چەمکی گشتی ئایەتەکانو، وە چەمکی گشتی فەرمایشتەکانی دیکەی پێغەمبەر ﷺ، کافریش مادام چاکەکاربێو مادام شەڕانیی نەبێو دژایەتیی

مسوڵمانان نەكات، پێویستە مامەڵەی باشی لەگەڵدا بكرێ، بەڵكو پێویستە ئێمە لەوان چاكتر بین، وەك لەوان بۆ ئێمە.

ئینجا لەوبارەشەوە دەتوانین زۆر بەڵگە بێنینەوە:

یەكەم: ئایەتەكان بە گشتی كە باسی چاكە كردنو چاكە گوتن دەكەن لەگەڵ خەڵكدا، بە گشتی، بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە، كە پێشتر ئاماژەمان پێدان.

دووەم: هەروەها فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺیش هەر ئەوە دەگەیەنن، كە ئامانە هەندێكیانن:

١/ ﴿عَنْ عَبدِاللَّهِ بْنِ السَّلامِ رضي الله عنه قَالَ: قال رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الأَرْحَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلامٍ»﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٨٣٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٨٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٣٣٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٢٨٣)، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَيْنِ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٥٦٩)، واتە: عەبدوڵلای كوڕی سەلام خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵكینە! سەلامكردن بڵاوبكەنەوە، خواردن بدەن بە خەڵك، پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنن، بە شەوێ كە خەڵك خەوتوە نوێژێ بكەن، بە سەلامەتیی دەچنە بەهەشتێ.

مانای وایە بە گشتی فەرموویەتی سەلام بڵاوبكەنەوە.

٢/ ﴿عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرِو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ أَيُّ الإِسْلامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٥٨١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٩٤)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم:

(١١٧٣١)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٣٢٥٣) وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٥٠٥)، واتـــه: پیـــاوێك هـــاته لای پێغـــەمبەری خـوا ﷺ گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ چ جـــۆره مـــسوڵمانەتییەك باشتــــره؟ (واتـــه: چ كردەوەیـــەك لـــه ئیسـلامدا باشـه؟)، فـەرمووی: خـواردن بـده بـه خەڵكـی، وه سـەلام بكـەی لەو كەسـەی كه دەیناسـیو لـەوەی كه نایناسـی.

دیـــاره ئـــەوەی كـه نایناســـی، دەگونجـــێ نامـــسوڵمان بـــێ، كەواتـــه: سلاّولێـكردنی نامسوڵمانان دروسـته .

٣/ ﴿عَنْ أُسَـامَةُ بْنُ زَيْدٍ رضي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ مَـرَّ عَلَى مَجْلِـسٍ فِيـهِ أَخْلاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ، وَالْيَهُودِ، فَسَلَّمَ عَلَـيْهِمْ النَّـبِيُّ ﷺ»﴾، مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ: أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٦٢٤٧)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٥٦٢٨)، والتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢٦٩٦)، واتـه: ئوسـامەی كـوڕی زەیــد خــوا لێیـــان ڕازی بـــێ دەگێڕێتـــەوه دەڵـــێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ بـەلای مەجلیـسـێكدا تێپـەڕی، كۆمەڵـه خەڵكێكـی تێكەڵـی لێـبوو، لـه مـــسوڵمانانو لــه هاوبەشــدانەرەكان، ئەوانــەی كــه بــت دەپەرسـتن، وه لــه جوولەكـەكان، پێغـەمبەریش سـەلامی لـێكـردن.

٤/ ﴿وَقَـالَ أَبُـو هُرَيْـرَةَ ﷺ: إِنَّ أَبْخَـلَ النَّـاسِ مَـنْ بَخِـلَ بِالـسَّلَامِ﴾، أَخْرَجَـهُ الدَيْلَمِي برقم: (٨٢٧)، وَحَسَّنَهُ الألبـاني فـي (السلسلة الصحيحة) بـرقم: (٦٠١)، وابْنُ حِبَّـانَ برقم: (٤٤٩٨)، وَقَالَ شُعيب الأرنـؤوط: إِسـنَادُهُ صَحِيح عَلَـى شَـرْطِ مُـسْلِم)، واتــه: ئــەبو هـــوڕەیرە خـــوا لێـــی ڕازی بـــێ دەڵـــێ: ڕژدتـرینو چرووكتـرین كـەس، كەسـێكه كه له سـلاّوكردنیشـدا چرووكـەو سـلاّو له خەڵكی ناكـات.

٥- هـەروەها پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمودەیـەكی دیكـەدا كـه (الطبرانـي و البيهـقي) لـه ئـەبو ئومــامەوه هێنــاویانه، فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ اللَّـه تَعَـالَى جَعَـلَ الـسَّلامَ تَحِـيَّة لأُمَّتِنَـا وَ أَمَانَـاً لأَهْلِـي ذِمَّتِنَـا﴾، رَوَاهُ البَيْهَقِـيُّ فِـي

(الـشعب) بـرقم: (٨٧٩٨)، وَضَـعَّفَهُ الألبـاني فـي (السلـسلة الـضعيفة) بـرقم: (٣٠٦٤)، واتـــە: خـــوای بـــەرز ســـەلامكردنـــی كـــردوە بـــە ســـڵاوی ئۆممەتمـــان (الـسَّلاَمُ عَلَـيْكُم وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ وبرِكـاتـهُ) ســـڵاوی ئۆممـــەتی ئێمـــەیە، وە كردووشـــیەتی بـــە ئەمـــان بـــۆ ئەوانـــەی كـــە لەگەڵمانـــدا هـاوپەیمـــانن، واتـــە: نامـــسوڵمانن، بـــەڵام لەگەڵمانـــدا دەژیـــن‌و لـــە وڵاتـــی مسـوڵمانانـدا، دەبـێ سـەلام لەوانیش بكـرێ.

٦/ ﴿عَنْ إبن أبي حَـاتِم عَنْ عِكْـرَمَة عَنْ عَبْداللَّهِ ابْن عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ سَـلَّمَ عَـلَيْكَ من خَـلْقِ اللَّهِ، فَـارددْ عَلَيْهِ وَإنْ كَانَ مَجُوسـيّاً﴾[1]، واتـە: ئیبنـو ئەبی حاتەم لە عیكرِمەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسـەوە دەگێڕێـتەوە: كـە عەبدوڵڵای كوڕی عـەبباس گوتوویـەتی: هـەر كەسێك سڵاوی لـێـكردی لـە دروسـتكراوانی خـوا، ئەگـەر مەجووسـییو ئـاگر پەرسـتیش بـێ، وەڵامـی سـەلامەكەی بـدەوە.

٧/ هـەروەهـا (إبـن أبـي حـاتم) ئـەم دەقەشـی هێنـاوە: ﴿عَنِ الـشَّعبي أَنَّـهُ قَـالَ: لِنَـصـرَانيّ سَـلَّمَ عَلَيْـهِ، وعليـكَ الـسَّلاَم وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ، فَقِيـلَ لَـهُ فـي ذَلِكَ، فَقَـالَ: أَلَيْسَ فِي رَحْمَةِ اللهِ يَعيش﴾[2]، واتە: شەعبیی (كە یەكێكە لـە زانایـانی تابیعـین) نەصـرانییەك سـڵاوی لێكـرد، ئـەویش گـوتی: (وَعَلَيْـكَ الـسَّلاَم وَرَحْمَـةُ اللَّـهِ) سـەلام‌و ڕەحمـەتی خـوات لـێ بـێ، لەوبـارەوە پرسـیاریان لێكـرد، چۆن ڕەحمـەتی خـوای بـۆ دەنێـرێ؟ گـوتی: ئەدی ئەوە نیـە لـە ڕەحمـەتی خـوای دا دەژی، واتـە: ئەگـەر بـە ڕەحمـەتی خـوا نەبـێ نـاژی، خوا باران دەبارێنـێ، ڕەحمـەتی خوایـە، خـوا لەشـی سـاغ كـردوە، ڕەحمـەتی خوایـە، منداڵـی داوەتـێ، ڕەحمـەتی خوایـە، ڕزقـی دەدا ڕەحمـەتی خوایـە، كەواتـە: دروسـتە بـە شێوەیەكی جوان وەڵامـی سـەلامی نامسـوڵمانان بدرێتـەوە.

١) محاسـن التـأويل، ج: (٥)، ص: (٣٣٧).
٢) محاسـن التـأويل، ج: (٥)، ص: (٣٣٧).

وە لەڕاستییدا من پێم وایە ئەگەر لە سەرەتاشەوە بڵێی: (السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّه) هەر دروستە، با خوا ڕەحمی پێ بکاو هیدایەتی بدات، تۆ مەبەستت ئەوەیە خوا هیدایەتی بدات، نەك مەبەستت ئەوەبێ کە کافریش بێتو خوا بیباتە بەهەشتێ، کە ئەو دوعایە خوا لە ئیبراهیمی وەرنەگرتوە بۆ بابی، تاکو لە ئێمەی وەربگرێ، کەواتە: ئەگەر تۆ بە بابایەکی کافر بڵێی: (السَّلامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّه) هیچ ئیشکالی تێدانیە، چونکە مەبەستت ئەوەیە خوا ڕەحمی پێ بکاتو هیدایەتی بداو ببێتە مسوڵمان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا شەش (٦) ئایەت لە سوورەتی (النساء) دەتوێژینەوەو تەفسیر دەکەین، کە ئایەتەکانی (٨٨ هەتا ٩٣)ن، لەم ئایەتانەدا سەرەتا خوای کاربەجێ گلەیی لە مسولمانان دەکات کە بۆچی لەبارەی موونافیقەکانەوە بوونەتە دوو کۆمەڵ، لە حاڵێکدا کە دەبوو لە بەرانبەریاندا یەك دەستو یەك هەڵوێست بن، پاشان نیەتی ئەو دەغەڵو دووڕووانەیان پێ دەڵێ، کە بریتیە لەوەی وەك خۆیان کافریان بکەن، وە هۆشداریی یان پێ دەدات کە نابێ دۆستایەتییان بکەن، مەگەر پەشێمان ببنەوە لە کوفر، وە کۆچ بکەنو بێنە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی، وە فەرمان بە مسولمانان دەکات کە ئەگەر دەغەڵەکان لەسەر پشتکردنە ئیسلامو دژایەتییان بەردەوام بوون، وە ئامادە نەبوون ببنە پێکهاتەیەکی ساغی کۆمەڵگای ئیسلامیی، ئەوە سزایان ئەوەیە کە لە جەنگدا پێیان گەیشتن بیانگرنو بیانکوژن، ئنجا باسی دوو جۆرە خەڵکی دیکە دەکات لە نامسولمانان، کە کۆمەڵێکیان پەیوەندییان هەیە بە کۆمەڵێکەوە کە لەگەڵ مسولماناندا هاوپەیمانن، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دۆستی دۆستم دۆستمە)، یاخود حەز ناکەن نە لەگەڵ مسولماناندا، نە لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیاندا، تووشی جەنگو تێکگیران ببن، کە ئەوانە خوا لەسەر مسولمانانی پێویست دەکات کە دەبێ بێلایەنییەکەیان لێ بسەلمێنن، وە لەگەڵیاندا تێکنەگیرێن، ئنجا باسی کۆمەڵێکی دیکە دەکات لە دەغەڵو موونافیقەکان، کە بە پێچەوانەوە وەك سەگی نەێنگر هەر لە دەرفەتێك دەخەفتێن بۆ زەبر وەشاندن لە مسولمانان، وە ئەوانە مسولمانان نابێ دەستیان لێ بپارێزن، کە لە جەنگدا لێیان هەڵکەوتن، پاشان خوای دادگەر باسی هەردوو جۆرە کوشتنی هەڵەو کوشتنی بە ئەنقەست دەکات،

واتــە: (القَتْـلُ الْخَطَـأ) (القَتْلُ الْعَـمْـد)، وە بـە وردیـی باسـی سـزای کوشـتنی بـە هەڵـە دەکـات، وە سـزای قیـامەتی کوشـتنی بە ئەنقەسـتیش دەخـاتەڕوو.

﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ
مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ
فَتَكُونُونَ سَوَآءًۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ
وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ
يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ
يُقَٰتِلُواْ قَوْمَهُمْۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ
وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ
أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ
إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمْ
جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔاۚ
وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن
يَصَّدَّقُواْۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍۖ
وَإِن كَانَ مِن قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ
وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ
ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ
جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{(ئەی مسـولْمانینە!) ئەوە بۆچی لەبـارەی مونافیقەکانـەوە کە خوا بـە هـۆی ئـەوەوە کە (لە ڕەفتـارو کرداری خـراپ) وەدەسـتیان هێنـاوە، سـەرەوبنی کـردوون، بوونەتـە دوو دەسـتە (واتـە: ئێـوە لـە بەرانبەریانـدا بوونەتـە دوو دەسـتە!) ئایـا دەتـــانەوێ ڕێنمـــایی کەســـانێك بکـــەن کـــە خـــوا گومـــڕای کـــردوون؟ وە هەرکەســـێکیش خـوا گومـڕای بکـات، هیـــچ ڕێ(ی دەربـازبوون)ت بـۆی چنـــگ ناکـەوێ ﴿٨٨﴾ حەزیـان کرد وەك چۆن خۆیـان بێبـڕوا بـوون، ئێوەش بێبـڕوابن‌و وەك یەکـتان لـێ بـێ، مادام وایـە هـیچ کـەس لـە نێوانیانـدا بـە دۆسـت مـەگرن، هـەتـا لـە ڕێـی خـوادا کـۆچ دەکـەن، جـا ئەگــەر پـشـتیان کـردەوە (وە لەسـەر دژایـەتییـکردنتان بـەردەوام بـوون) ئـەوە لـە هـەر جێیـەك بینیتـانن، بیـانگرن‌و بیـانکوژن‌و، هیچ کەسێکیان لەنێودا مەکەنـە پـشـتیوان‌و یاریـدەدەر ﴿٨٩﴾ بێجگـە لەوانـەی کـە پەیوەســتن بـە کۆمەڵێکـەوە کـە لـەنێوان ئێـوەو ئەوانـدا پەیمـان هەیـە، یـان هـاتوونە لاتـان‌و سینەیان تـەنگ بـووە کـە (ناچـاربن) جـەنگی ئێـوە بکـەن، یـان جـەنگی خەڵکەکـەی خۆیـان بکـەن، وە ئەگـەر خـوا ویـستبای بەسـەر ئێـوەیدا زاڵ دەکـــردن، وە لـــە دژتـــان دەجەنگـــان، جـا ئەگـــەر خۆیـان لـــێ دوورگرتـــن‌و لـە دژتـان نەجەنگـان، وە ئاشـتییان لەگەڵـتان نوانـد، ئـەوە (بـزانن کـە) خـوا بـە هیـــچ جۆرێـك ڕێـی نـەداون لـە دژیـان (بجـەنگـن) ﴿٩٠﴾ بـەڵام کەسـانێکی دیکـــە لـــەوان (بێبـــڕوایان) دەبیـنن، دەیانـەوێ کـە لەلایـەن ئێـوەش دڵنیـاو هێمـن بن‌و، لەلایەن خەڵکە (بێبـڕوایە)کەی خۆشـیانەوە دڵنیـاو هێمن بـن، هەرکـــات گێڕدرانـەوە بـۆلای ئەهلــی کـوفرو گرفتـاریی تێیـدا ســەرەو بـن دەکـرێن، جـا ئەوانـە ئەگـەر خۆیـان لـە ئێـوە دوور نـەگرت‌و، ئاشـتییان لەگـەڵ نەنـواندن‌و، دەستیان (لێتـان) نەپاراست، ئەوە لە هـەر جێیـەك بەرپەلتـان کەوتن

لـە جەنگـدا، بیـانگرنو بیـانکوژن، وە ئەوانـە بەڵگـەی ئاشـکرامان بۆتـان ڕەخسـاندوە لەسـەریان ﴿٩١﴾ وە هـیچ بڕوادارێـك بـۆی نیـە بڕوادارێـك بكـوژێ، مەگـەر بـە هەڵـە لـە دەسـتی بكوژرێ، وە هـەر كەسـێكیش بـە هەڵە بڕوادارێـك بكـوژێ دەبـێ (لـە كەفارەتیـدا) كۆیلەیـەكی بـڕوادار ئـازاد بكـاتو، خوێنێكـیش بگەیەنێتـە دەسـتی كەسوكارەكـەی مەگـەر (كەسوكارەكـەی) چاكـەو خێـر بكـەن (و خـوێن وەرنـەگرن، هـەمووی یـان بەشـێكی) وە ئەگـەر كوژراوەكـە لـە كۆمـەڵێكی دوژمنتـان بـوونو ئـەویش بـڕوادار بـوو، ئـەوە (خـوێنی نیـەو) كەفارەتەكـەی ئـازادكردنی كۆیلـەیەكی بـڕوادارە، وە ئەگـەر (كـوژراوەكە) لـە كۆمەڵـێك بـوون كـە لـەنێوان ئێـوەو ئەوانـدا پـەیمان هـەبوو، ئـەوە (سزایەكـەی) خوێنێكی تەسـلیم كـراوە بـە كەسـوكاریو ئـازادكردنی كۆیلـەیەكـی بڕوادارییشـە، جا هـەر كـەس (كۆیلـەی) چـنگ نەكـەوت، دەبـێ وەك گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا دوو مانـگ بـەڕۆژووبوونی لەسـەر یـەك (كەفـارەت)ی لەسـەرە، وە خـواش زانـای كـاربەجێیە ﴿٩٢﴾ وە هـەر كەسـێك بڕوادارێـك بـە ئانقەسـت بكـوژێ، ئـەوە سـزایەكەی (لـە دواڕۆژدا) دۆزەخـە، تێیـدا هەمیـشـەیی دەبـێ، وە خـوا لێـی تـووڕەبـووەو، نەفرینـی لێكـردوەو، ئازارێكـی مەزنـی بۆ ئامـادە كردوە﴿٩٣﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(أَرْكَسَهُم ): (الرَّكْسُ: قَلْبُ الشَّيءِ عَلَى رَأسِهِ، ﴿ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ﴾: أي رَدَّهُمْ إلى كُفرِهِم)، (رَكْسُ) بریتیە لە سەرەوبنکردنی شتێك، قەڵبی بکەیەوە، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ﴾، واتە: خوا گێڕاونیەوە بۆ کوفرەکەیان بە هۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە ئینسان بە هۆی کردەوەی خراپەوە بەرەو کوفر دەچێ.

(يَصِلُونَ ): (الإتِصالُ: إتِّحَادُ الأَشياءِ بَعْضُهَا بِبَعْض،وَيُضَادُّهُ الإنفِصَال)، (يَصِلون)، واتە: پەیوەست دەبنەوە، چونکە دەڵێ: (إتصال) بریتیە لەوە کە چەند شتێك پێکەوە بلکێن، وە پێچەوانەی (إتصال)، (إنفِصَال)ە، واتە: لێکپچڕان.

(حَصِرَتْ ): واتە: تەنگ بوون، (الحَصْرُ: التَّضْيِّيق، حَصَرت: ضَاقَتْ) بە مانای تەنگ پێ هەڵچنین دێ (حَصِرَتْ)، واتە: (ضَاقَتْ) تەنگ بوو.

(ٱعۡتَزَلُوكُمۡ ): واتە: کەناریان گرت، یاخود خۆیان لێ دوورگرتن، (الإعتِزَالُ تَجَنُّبُ الشَّيءِ بِالبَدَنِ أَو بِالْقَلْبِ)، (إعتِزَال) بریتیە لە خۆ دوورگرتن لە شتێك بە جەستە، یاخود بە دڵ.

(ٱلسَّلَمَ ): (السَّلاَمُ، والسَّلَم، والسَّلْم: الصُّلْح)، (السَّلَمْ) واتە: ئاشتییو تەباییو پێچەوانەکەی بریتیە لە جەنگو شەڕ.

(يَأۡمَنُوكُمۡ ): واتە: لێتان ئەمین بن، لێتان دڵنیابن، (أَصْلُ الأَمْنِ طَمْأنِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ، أَمِنَ يَأمَنُ أَمناً وأَمَاناً: اطْمَأن وَلَمْ يَخَف)، وشەی: (أَمْن) لە ڕیشەدا بە مانای ئارامگرتنی دڵو لاچوونی ترس دێ، دەگوترێ: (أَمِنَ يَأمَنُ أَمناً وأَمَاناً) واتە: دڵنیا بووەوەو نەترسا.

(ٱلْفِتْنَةِ ): (وأَصْلُ الفِتْنَةِ إِدْخَالُ الذَّهَبِ النَّارَ لَتَظْهَرَ جَوْدَتُهُ مِنْ رِدَاءَتِهِ)، وشەی (فِتْنَة) لە ڕیشەی زماندا بە مانای ئەوە دێ زێڕ لەنێو ئاگردا دابنێی بۆئەوەی زێڕە ساغەکە لەگەڵ ئەو کانزایانەی ڕەگەڵی خراون، لێك جیاببنەوە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (زێڕی سور لە ئاگر ناترسێ)، زێڕی سوور هەرچەندە بیسووتێنی کەم ناکات هەر زێڕە، بەڵام ماددەکانی دیکەی لێ جیادەبنەوە، ئەسڵی وشەی فتنە لەوەوە هاتوە، بەڵام دوایی بە مانای ئازاردانیش هاتوە، یاخود واتە: سزادان، وە بە مانای هۆکارەکانی سزادان دێ، وە بە مانای ئەشکەنجەدانیش دێ.

(ثَقِفْتُمُوهُمْ ): واتە: بەر پەلتان کەوتن، (الثَّقِفُ: الحِذقُ في إدرَاكِ الشَّيء وَفِعْلِهِ) (ثقف) ئەوەیە شتێك بە وریایی بیزانی، یان بە هۆشیارانەو بە وردیی یاخود بتوانی بە چاکیی‌و بە وریایی بیکەی، (ثُمَّ يُتَجَوَّزُ بِهِ فَيُسْتَعْمَلُ في الإِدرَاك) دوایی بەکارهێنراوە بۆ هەر شتێك کە بەر پەلت بکەوێ.

(خَطَـًٔا) واتە: هەڵە، (الخَطأُ: العُدُولُ عَنِ الجِهَةِ. وَهُوَ نَوعَان: أَحَدُهَا: أَنْ تُريد غَيْرَ مَا تَحْسُنُ إرادَتُه فَتَفْعَلُهُ: خَطِئَ، يَخْطأُ خَطَأً وخِطْأ)، واتە: هەڵە ئەوەیە کە ئینسان لەو شوێنەی کە دەیەوێ بۆی بچێ لێی لادا، ئەویش دوو جۆرە جۆری یەکەمیان: ئەوەیە کە تۆ شتێکت بوێ کە باش نەبێ بتەوێ، عەرەب بۆ ئەوەیان دەڵێن: (خَطِئَ يَخْطأُ خَطَأً وخِطْأ) واتە: گوناهی کرد، (والثَّاني: أَن تُريدَ ما تَحْسُنُ فِعْلُهُ، وَلَكِنْ يَقَعُ مِنْهُ بِخلافِ ما تريد، فَيُقَالُ: أَخْطَأَ يَخْطَئُ فَهُوَ مُخْطِئُ، وَهَذَا قَدْ أَصَابَ في الإِرادة وأَخطأَ في الفِعْلِ)، بەڵام جۆری دوومیان ئەوەیە کە تۆ شتێکت بوێ کە باش بێ بویستریێت‌و ئەنجام بدرێ، بەڵام تۆ تێیدا بە هەڵەدا بچی، عەرەب بۆ ئەوەیان دەڵێن: (أَخْطَأَ يُخْطِئُ، خَطَأ) یانی: ئەگەر گوترا: (أَخْطَأَ) واتە: شتێکی باشی دەویست، بەڵام بە هەڵەداچووو نەیپێکا، بەڵام

ئەگـەر گـوترا: (خَطِأ يَخْطِيءُ خِطـئاً) ئـەوە مانـای وایـە هـەر لـە ئەسـڵدا نیەتەکەی باش نـەبووەو بەرەو شـتێکی خـراپ چـووە.

(وَدِيَةٌ ): واتـە: خـوێن بەهـا، کـوردەواریی خۆمـان خـوێنی پـێ دەڵـێن، ئـەو قەرەبووەی کە لە کەسێك وەردەگیـرێ کـە کەسێکی بـە هەڵە کوشتوە، یـاخود ئەگـەر بـە ئانقەسـت کوشـتبێتی، بـەڵام کەسـوکارەکەی چاوپۆشـیی بکـەن لـە تۆڵەسـتاندەوەو لە کوشـتنەوەی بـابـای بکـوژو، خوێن وەربگـرن.

(مُتَعَمِّدًا ) واتـە: بـە ئەنقەسـت (التعَمُّـدُ: قَصْدُ الشَّيء وَالإِسـتِنَادُ إِلَيْـهِ)، (تعَمُّد): بریتیـە لـەوەی شتێکـت مەبەسـت بـێ، وە پاڵـدەیە سـەر شـتێك، (العَمْـدُ وَالتَعَمُّـدُ فِـي التَّعَـارفِ خِـلافُ الـسَّهْوِ وَهُـوَ المَقْـصُودُ بِالنِيَّـةِ)، (عَمْد و تَعَمُّد) پێچـەوانەی (سـهو)یە، ئەگـەر گـوترا: (سـها) واتـە: سـەهووی کـرد، یـانی: بەهەڵـەداچووە، بـەڵام ئەگـەر بگـوترێ: (عَمَد، تَعَمّد) واتـە: بـە ئانقەسـت ئەو شـتەی کرد.

## هــۆی هــاتنــە خــوارەوەی ئایەتەكــان

١) هــۆی هاتنــە خــوارەوەی ئــەو ئایــەتە كــە دەفــەرموێ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾﴾، لــەم ئایەتــەدا خــوا سەرزەنــشتی مــسوڵمانان دەكاتو گلـەیی یان لـێ دەكات، دەفەرموێ: بۆچی دەربـارەی مونافیقـەكان بوونـە دوو بەش، كە خوا سەرەو بنی كردوون بـە هۆی كـردەوە خراپەكانیانـەوە، واتـە: گێڕاونیـەوە بـۆ كوفر، پێشـێ هـاتوونە نێو ئیسـلام، دوایـی بـە كردەوەكانیـان شـتی وایـان كـردوە، كـە پێـی كـافر ببنــەوە، لـەوبارەوە چـەند بەسـەرهاتێك گێڕدراونەوە:

أ- ﴿عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى أُحُدٍ فَرَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِيهِمْ فِرْقَتَيْنِ، فِرْقَةٌ تَقُول: نَقْتُلُهُمْ و فِرْقَةٌ تَقُول: لاَ، فَأنزَلَ اللَّهُ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾﴾، (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٨٧)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٥٨٩)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٢٧٧٦)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (٣٠٢٨)، وَالنَّسَائيُّ في (الكُبرى) برقم: (١١١١٣)، وَالطَّبَرَانيُّ برقم: (٤٨٠٤)، وَالطَّبَري)، واتـە: زەیدی كوڕە سـابیت خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە دەربـارەی ئـەوە هاتـە خـوار كـە پێغەمبـەر ﷺ چوو بۆ جەنگی ئوحود، كۆمەڵێك لەوانـەی كـە لـە خزمەتیـدا چووبوون بـۆ جەنـگ، گەڕانـەوە، هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ كەوتنـە ڕاجیـایی لەبارەیانـەوە، دووڕا بوون: هەندێكیان دەیانگـوت: با بیانكوژین، وە هەندێكیان دەیانگـوت: نــەخێر، (یاخــود هەندێكــیان دەیانگــوت: هــەر مــسوڵمانن و هەنــدێكیان دەیانگــوت: مــسوڵمان نــین، مەبەســت لــە كوشــتنەكە هــەر ئەوەیــە واتــە:

هەندێکیان گوتوویانە کافر بوونەتەوە، چونکە کافر خوێنی حەڵاڵە لە جەنگدا، وە هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر).

ب- ﴿أَخْرَجَ سَعيد بْنُ مَنْصُور وَابْنُ أَبِي حَاتِم عَنْ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ ﷺ، قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّه ﷺ النَّاسَ، فَقَالَ: مَنْ لِي بِمَن يُؤْذِينِي وَيَجْمَعُ فِي بَيْتِهِ من يُؤْذِينِي؟ فَقَالَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ: إِنْ كَانَ مِنَ الأَوس قَتَلْنَاهُ، وَإِنْ كَانَ مِن إِخوَانِنَا مِنَ الخَزْرَجِ أَمَرتَنا فَأَطعْنَاك، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَة، فَقَالَ: مَا بِكَ يَا ابْنَ مُعَاذ طَاعَةُ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَلَقَدْ عَرَفْتَ مَا هُوَ مِنْكَ، فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ: إِنَّكَ يَا ابْنَ عبادة مُنَافِقٌ وَتُحِبُّ النِّفَاقَ، فَقَامَ مُحَمَّد بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: أُسْكُتُوا يَا أَيُّهَا النَّاس فَإِنَّ فِينَا رَسُولُ اللَّه ﷺ وَهُوَ يَأْمرُنَا فَنُنَفِّذُ أَمْرَهُ، فَأَنزَلَ اللَّه: ﴿فَمَا لَكُمْ فِى ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾﴾، لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣١٧)، واتە: سەعیدی کوڕی مەنصوورو ئیبنو ئەبی حاتیم لە سەعدی کوڕی موعاذ خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ وتاری دا بۆ خەڵك گوتی: خەڵکینە! کێ پشتم دەگرێ لە بەرانبەری کەسێکدا کە ئازارم پێ دەگەیەنێ، وە کەسانێك لە ماڵی خۆیدا کۆدەکاتەوە کە ئازارم پێ دەگەیەنن! (کە دیارە لە بارەی بەسەرهاتی بوختان کردنەوە بە دایکمان عائیشەیەوە خوا لێی ڕازی بێ)، سەعدی کوڕی موعاذ (کە سەرۆکی هۆزی ئەوس بوو) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ئەو کەسە لە هۆزی ئەوسە، دەیکوژین‌و سزای دەدەین، وە ئەگەر لە خەزرەجییەکانی برامانن (لە هۆزی بەرانبەر) ئەوە فەرمانمان پێ بکە، ئێمە جێبەجێی دەکەین، سەعدی کوڕی عوبادە (کە سەرۆك هۆزی خەزرەج بوو، وە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەش لە هۆزی خەزرەج بوو، کە سەرۆکی مونافیقەکان بوو، وە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەو بوو) هەڵساو گوتی: ئەی کوڕی موعاذ! تۆ مەبەستت فەرمانبەریی پێغەمبەر نیە ﷺ، بەڵام دەزانی ئەو کەسە لە چ هۆزێکە بۆیە وا دەڵێی (واتە: دەزانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە لە هۆزی منە)، ئنجا ئوسەیدی

کوڕی حوضەیر هەڵساو گوتی: ئەی سەعدی کوڕی عوبادە تۆ مونافیقیو مونافیقەکانت خۆشدەوێن، (یانی: لێك تووڕە بوون)، ئەوجار موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەڵساو گوتی: ئەی خەڵکینە! بێ دەنگ بن، پێغەمبەری خوامان لە نێودایە، چ فەرمانێکمان پێ بکات، جێبەجێی دەکەین، (پێویست ناکات قسە بە یەکدی بڵێین).

بەڵام من ئەو بەسەرهاتە بە دوور دەزانم کە ئەو ئایەتە لەوبارەوە هاتبێتە خوار.

ج- ﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، أَنَّ قَوْمًا مِنَ الْعَرَبِ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ فَأَسْلَمُوا وَأَصَابَهُمْ وَبَاءُ الْمَدِينَةِ وحُمَّاهَا فَأُرْكِسُوا فَخَرَجُوا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَاسْتَقْبَلَهُمْ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالُوا لَهُمْ: مَا لَكُمْ رَجَعْتُمْ؟ قَالُوا: أَصَابَنَا وَبَاءُ الْمَدِينَةِ فَاجْتَوَيْنَا الْمَدِينَةَ، فَقَالُوا: أَمَا لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ؟ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَافَقُوا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَمْ يُنَافِقُوا هُمْ مُسْلِمُونَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٦٧)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف، وقَالَ: والصحيح في سبب نزول الآية ما رَوَاهُ البُخَارِيُّ وَمُسْلِمٌ مِنْ حَدِيث زَيد بْن ثَابت، وَأَخْرَجَهُ الوَاحِدِي في (أَسباب النزول) برقم: (٣٤٢)، والطَّبري برقم: (١٠٠٦٤) عن السُّدِّيّ، (ئەمەیانە زیاتر پێ دەچێت ئایەتەکە بەو بۆنەوە هاتبێتە خوارێ) عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك لە عەرەب مسوڵمان بوونو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، دوای ماوەیەك نەخۆشییان گرت لە مەدینەدا (دیارە ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوتوە)، تاو لەرزی مەدینەیان گرت وە هەڵگەڕانەوە، (واتە: هەڵگەڕانەوەو لە مەدینە چوونە دەر) هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان گەیشتن گوتیان: بۆ دەگەڕێنەوەو دەچنەوە بۆ شوێنی کافرەکانتانو مەدینەی پێغەمبەر بەجێ دەهێڵن؟ گوتیان: دەردی

نێو شاری مەدینەمان تووش بووەو ئاوو هەوای مەدینەمان پێ ناکەوێ، ئەوانیش پێیان گوتن: ئایا لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرمەشقێکی باش نیە بۆ ئێوە، ئێوەش لەگەڵ پێغەمبەری خوابن مادام ئەو لە مەدینە دایە، جا هەندێك لە مسوڵمانان گوتیان: بوونە مونافیق، وە هەندێکیان گوتیان: نەخێر هەر مسوڵمانن، ئیدی خوا لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار.

دیارە ئەم بەسەرهاتە زیاتر پێدەچێ، هۆی هاتنە خوارەوەبێ، ئەدی ئەوانی دیکە چۆن وایانگوتوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەم ئایەتە لەگەڵ دوو بەسەرهاتەکەی دیکەشدا دەگونجێ، ئنجا هەندێك لە بەسەرهاتو هۆیەکانی هاتنە خوارەوە، مەرج نیە ئەو ئایەتەی دەکرێتە هۆی هاتنە خوارەوەی لەوبارەوە هاتبێتە خوار، بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ ویش دەگونجێ، زانایان گوتوویانە: لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەش گێڕراوەتەوە.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾﴾، لەوبارەوە دوو بەسەرهات هەن:

أ- ﴿عَنِ الحَسَنِ أنَّ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكٍ المُدلجي حَدَّثَهُمْ قَالَ: لَمَا ظَهَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ وَأُحدٍ وَأَسْلَمَ مَن حَوَلَهُمْ، قَالَ: سُرَاقَةُ بَلَغَنِي أنهُ يُريدُ أَنْ يَبْعَثَ خَالِدِ بْنِ الوَلِيدِ إلى قَوْمِي بَنِي مُدلِج، فأتيتُهُ فَقُلْتُ: أَنشدُكَ النِّعْمَةَ بَلَغَنِي أنَّكَ تُريد أنْ تَبْعَثَ إِلى قَوْمِي وَأَنا أُريدُ أَن توادِعَهُمْ فَإِن أَسلَمَ قَومُكَ أَسلَمُوا وَدَخَلوا في الإسلام، وَإِنْ لَمْ يُسْلِمُوا لَمْ يَحْسُن تَغْلِيبُ قَومِكَ عَلَيْهِم، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِ خَالِدِ فَقَالَ: اذهَبْ مَعَهُ فَافْعَل مَا يُريد، فَصالَحَهُمْ خَالِدُ عَلَى أَنْ لاَ يُعينوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

وَإِنْ أَسْلَمَتْ قُرَيشُ أَسْلَمُوا مَعَهُمْ وَأَنزَلَ اللَّهُ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ... ﴿٩٠﴾﴾ أَخْرَجَهُ إِبْنُ أبي حَاتِم، وإبنُ مَردَوية، لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣١٩)، واتە: حەسەنی بەصرِیی دەگێرِێتەوە، كە سورِاقەی كورِی مالكی مودلەجیی، بۆی باس كردوون كە گوتوویەتی: كاتێك پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدرو جەنگی ئوحوددا سەركەوت، وە خەڵكی دەوروبەریان مسوڵمان بوون (سورِاقە دەڵێ:) پێمگەیشتەوە كە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ خالیدی كورِی وەلید بنێرێ بۆ لای هۆزەكەی من كە بەنی مودلیجن (واتە: بینێرێتە سەریان) منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێمگوت: بە هەقی ئەو كەسەی كە خاوەنی نیعمەتە (كە خوایە) (واتە: داوات لێ دەكەم) پێمگەیشتوە كە دەتەوێ سوپا بنێری بۆ سەر هۆزەكەی من، وە منیش دەمەوێ موادەعەیان بكەی (موادەعە: ئەوەیە كە شەرِیان نەكاو شەرِی نەكەن، ئاوا بێ لایەن بێ لەگەڵیاندا) ئەگەر هۆزەكەی تۆ (كە قورەیشن) مسوڵمان بوون، ئەوە هۆزی ئێمەش مسوڵمان دەبین، وە دێینە نێو ئیسلامەوە، وە ئەگەر مسوڵمان نەبووین، باش نیە تۆ هۆزەكەی خۆت بەسەر هۆزی ئێمەدا زاڵ بكەی! پێغەمبەریش ﷺ دەستی خالیدی گرتو فەرمووی: برِۆ لەگەڵی چی دەوێ وای بۆ بكە، ئیدی خالید صولحی لەگەڵدا كرد كە لە دژی پێغەمبەر ﷺ هاوكاریی كەس نەكەن، وە هەر كاتێ قورەیشییەكان مسوڵمان بوون، ئەوانیش مسوڵمان بن، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ.

ب- ﴿أَخْرَجَ الطَّبَرِي عَن مُجَاهِد أَنَّهَا نَزَلَتْ فِي هِلَالِ بْنِ عُوَيْمِر الأَسْلَمِي، وَكَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عَهْدٌ، وَقَصَدَهُ نَاسٌ مِنْ قَوْمِهِ فَكَرِهِ أَنْ يُقَاتِلِ الْمُسْلِمِينَ وَكَرِهَ أَنْ يُقَاتِل قَوْمَهُ﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (١٠٠٥٨)، (١٠٠٥٩)، لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣٢١)، واتە: طەبەریی لە موجاهیدەوە دەگێرِێتەوە كە دەربارەی هیلالی كورِی

عویمیـری ئەسلەمیـی، كـە لـە نێوانی ئـەوو مـسـوڵمانانـدا پـەیمان هـەبوو، وە كۆمەڵێك لە قەومەكەی چوونە سـەری، ئـەویش پێـی نـاخۆش بـوو كـە دژی مسـوڵمانان بجەنگێ، وە دژی قەومەكەی خۆیشی بجەنگێ (پێی خۆش بوو بێلایـەن بێ)، ئیدی خوای بە بەزەیی فەرمووی: لێیـانگەڕێن با ئەوانـەی دەیـانەوێ بـێلایـەن بن، بێلایـەن بن.

٣) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە كـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَئًا... ﴿٩٢﴾﴾، واتــە: هــیچ ئیمـانداریــك بــۆی نیــە ئیمـانداریێك بكـوژێ، مەگـەر بـە هـەڵە: ﴿أَخْرَجَ ابْنُ جَرِيرٍ عَنْ عِكْرَمَةَ قَالَ: كَانَ الحَارِث ابن يَزِيد مِنْ بَنِي عَامِر بْن لُؤَي، يُعَذِّبُ عَيَاشَ بْن أَبِي رَبِيعَةَ مَعَ أَبِي جَهْلٍ، ثُمَّ خَرَجَ الحَارِثُ بن يَزِيد مُهَاجِرًا إِلى النَّبِيّ ﷺ، فَلَقِيَهُ عَيَّاشُ بِالْحَرَّةِ، فَعَلاهُ بِالسَّيْفِ حَتَّى سَكَت، وَهُوَ يَحْسَبُ أنهُ كَافِرٌ، ثُمَّ جَاءَ إِلى النَّبِيّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَنَزَلَتْ﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (١٠٠٩٧)، ولُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣٢٢) و أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ عَن مُجاهِد والسُّديّ برقم: (١٠٠٩٦، ١٠٠٩٨) ئیبنـو جـەریر لـە عیكرِەمـەوە لـە موجـاهیدەوە گێـڕاویەتەوە كـە حاریـسی كـوڕی یەزیـد لـە بەنـی عامیـری بەنـی لوئـەی، لەگـەڵ ئـەبو جەهلـدا، كاتێـك كـە عەییـاش مـسـوڵمان بـوو، گرتبوویـان ئەشـكەنجەیان دەدا ئنجـا حـاریس مـسوڵمان بـوو و، چـوو بـۆ لای پێغەمبەر ﷺ كۆچی كرد بۆ مەدینـە، عەییـاشیش لـە حـەڕڕە (كە شـوێنێكە لـە نـزیك مەدینـە) پێیگـەیـشـت وە شـمـشێری لـێ بـەرزكردەوەو كوشـتی، وایـزانی هـەر كافرە، دوایـی هـاتە لای پێغـەمبەر ﷺو هەواڵی پێـدا.

ئیدی لەوبارەوە ئـەو ئایـەتە هاتـە خـوار، كـە هیـچ ئیمـانداریـك بـۆی نیـە هـیچ ئیمانـداریك بكـوژێ مەگـەر بـە هەڵـەبـێ، وە سـەرەنجام خوێنیانـدا بـە كەسوكارەكەی.

٤) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك ئیمانداریێك بە ئانقەست بکوژێ شوێنی دۆزەخە: ﴿أَخْرَجَ ابْنُ جَرِير وَابْنُ الْمُنْذرِ مِن طَرِيق ابْنُ جُرَيْج عَنْ عِكْرِمَة، قَالَ: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ قَتَلَ مَقْيَسْ بْن ضُبَابَة فَأَعطاهُ النَّبِيّ ﷺ الدية فقبلها ثُمَّ وثبَ عَلَى قَاتِل أَخيهِ فَقَتَلَهُ، فقَالَ النَّبِيّ ﷺ: لاَ أُؤَمِّنْهُ فِي حِلٍ وَلاَ حَرمٍ فَقُتِلَ عَامَ الفَتْحِ، قَالَ ابْنُ جُرِيج وَفِيهِ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (١٠١٩١)، وَعَزاهُ الواحدي برقم: (٣٤٤) للكلبي، ولُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣٢٦)، واتە: لە عیکرِمەوە هاتوە کە پیاوێك لە ئەنصارِییەکان (مَقْيَس بن ضُبَابة)ی کوشت، پێغەمبەر ﷺ خوێنی دا بە برای کابرای کوژراو، ئەویش خوێنەکەی وەرگرت (واتە: برای کوژراوەکە خوێنەکەی وەرگرت) پاشان بکوژی براکەی لێ هەڵکەوتو کوشتی (هەرچەندە خوێنیشی وەرگرتبوو صوڵحیشی کردبوو، کەچی کوشتیشی) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نە لەو شوێنەی حەلاڵەو نە لەو شوێنەی کە حەرامە، (واتە: لە حەرەمی مەککەو لە دەرەوەی مەککەش) دڵنیایی نادەمێ (واتە: ئەمانی نادەمێ) ئیدی لە ڕۆژی جەنگی فەتحدا (کە فەتحی مەککە کرا)، کوژرا، هەتا هەندێك دەڵێن: خۆی بە پەردەی کەعبە هەڵواسیبوو گوتیان: نەخێر هەر دەبێ بکوژرێ، چونکە صوڵحیشی کردوە، کەچی کابراشی هەر کوشتەوە.

## مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لەم شەش ئایەتەدا باسی سێ بابەتی سەرەكییمان بۆ دەكات، وەك پێشتر گوتمان: یەكێكیان هەڵوێست دەربارەی مونافیقو دووڕوو و دەغەڵەكان، كە پێویستە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ، وە هەروەها كافرانو بێبڕوایانێكی دیكە كە یان دۆستو هاوپەیمانی مسوڵمانانن، یاخود لاشەڕو بێلایەنن، پاشان باسی كوشتنی هەڵە دەكات، وە دوایی باسی كوشتنی بە ئانقەست دەكات، سەرەتا خوا ﷻ ڕوو لە ئیمانداران دەكاتو دەفەرموێ:

﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ ﴾، خوا ﷻ بە گلەییكردنەوە ڕوو لە مسوڵمانان دەكاتو دەفەرموێ: بۆچی دەربارەی مونافیقەكان بوونە دوو دەستە، بوونە دوو كۆمەڵ؟ واتە: ڕاجیاییتان پەیدابووە، ﴿وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ﴾، لە حاڵێكدا كە خوا سەرەوبنی كردوون بە هۆی كردەوەكانیانەوە، وشەی: (رَكْس) واتە: (قَلْب) ئەوەیە كە شتێك سەری بچێتە خوارێو لاقی بچێتە سەرێ، كە دیارە حاڵەتی نیفاق وایەو دوای ئەوەی كەسێك ئیمان دێنێو دوایی كافر دەبێتەوە، مانای وایە پێشێ لە حاڵەتێكی ڕاوەستاوی ڕێكوپێكدا بووەو، دوایی هەڵگەڕاوەتەوەو چۆتە حاڵەتێكی دیكەوە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ﴾، ئایا دەتانەوێ ڕێنمایی كەسانێك بكەن كە خوا گومڕای كردوون، واتە: كەسانێك كە خوا گومڕای كردبن، هیچكەس ناتوانێ بیانهێنێتەوە سەر ڕاستەڕێ، هەڵبەتە دوایی ڕوونی دەكەینەوە كە خوا ﷻ لەخۆوەو بە هەوەنتە كەس گومڕا ناكات، بەڵكو كەسانێك گومڕا دەكات، كە خۆیان ڕێی گومڕایی هەڵدەبژێرن، یان لە ئەنجامی هەڵوێستو كردەوە خراپەكانیانەوە، شایستەی ئەوە دەبن كە خوا سەریان لێبشێوێنێ، جا خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴾، هەر كەسێك خوا گومڕای بكات، تۆ هیچ ڕێیەكت بۆی چنگ ناكەوێ، كە لەو

ڕێیەوە دەربازی بکەی‌و، لەو گومڕاییە قوتاری بکەی، ئنجا باسی هەڵوێستەکانیان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ ﴾، ئەو مونافیق‌و دەغەڵانە بە ئاوات دەخوازن، حەز دەکەن کە ئێوەش بێبڕوابن ﴿ فَتَكُونُونَ سَوَآءً ﴾، وەك چۆن ئەوان بێبڕوابوون، وەك یەکتان لێبێ یەکسان بن لە کوفردا، هەمیشە ئینسانی خراپ پێی خۆشە ڕەفیق‌و دۆستی زۆربن، هەروەك چۆن ئینسانی باشیش پێی خۆشە هاوەڵی زۆر بن، ئەوە شتێکی سروشتییە، خراپەکاران پێیان خۆشە دنیا پڕبێ لە خراپەکار، بۆئەوەی ئەوانیش تێیدا ون بن، چاکەکارانیش پێیان خۆشە هەموو خەڵك چاکەکار بێ، بۆئەوەی کە هاوکارو دەستبارگریان بن، جا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، لە نێوان ئەواندا کەس مەگرن بە دۆست هەتاکو لەڕێی خوادا کۆچ دەکەن، هەتا ئامادە دەبن کە نیشتیمان‌و ماڵ‌و حاڵی خۆیان بەجێ بهێڵن‌و پەیوەست بن بە قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامییەوەو بێنە ژێر سایەی حوکمڕانێتیی ئیسلامیی، ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾: ئنجا ئەگەر پشتیان تێکردن‌و ڕوویان وەرسووڕاند لە ئێوە، بیانگرن‌و بیانکوژن لە هەر شوێنێك بەرپەلتان کەوتن، واتە: ئەگەر ئامادە نەبوون لەگەڵ ئێوەدا دۆستایەتیی بکەن‌و، بێنە ژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی ئیسلامییەوە، بەڵکو سەنگەری دژایەتیی‌و دوژمنایەتییان لێتان گرت، ئێوەش لە هەر شوێنێك زەفەرتان پێبردن‌و لێتان هەڵکەوتن، بیانگرن‌و بیانکوژن ﴿ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ: هیچ کەسێکیان لەنێودا مەگرن بەدۆست‌و پشتیوان، یاخود بە یارمەتیدەرو هاوکار.

ئنجا خوا دوو کۆمەڵو دوو جۆرە کەسانی دیکە کە بێبڕواو کافرن، هەڵبەتە مونافیق نین، ئەوانە کافری بە ئاشکران، هەڵیانداوێریو جیایان دەکاتەوە لەو حوکمە، کە مسوڵمانان بۆیان نیە کە لەگەڵیاندا میانەیان هەبێت، وە ڕایدەگەیەنێ کە بۆیان نیە دژایەتییان بکەن، دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾، جگە لە کەسانێك کە پەیوەندییان هەیەو پەیوەستن لەگەڵ کۆمەڵێکدا کە لە نێوانی ئێوەو ئەو کۆمەڵەدا پەیمانو بەڵێن هەیە، وەك کوردەواریی دەڵێن: (دۆستی دۆستم دۆستمە)، واتە: ئەوانە خۆیان لەگەڵتان هاوپەیمان نین، بەڵام پەیوەستن بە کۆمەڵێکەوە، کە ئەو کۆمەڵە لەگەڵ ئێوەدا پەیمانیان هەیەو بەڵێنتان پێکەوە هەیە، واتە: بەڵێنو پەیمانی ئەوە کە شەڕ لەسەر یەك بکەن، یاخود بەلای کەمەوە شەڕ لە دژی نەکەن ﴿أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾، ئەوەش کۆمەڵێکی دیکەیە: یاخود دێن بۆ لاتان لە حاڵێکدا کە سینەیان تەنگ بووەو پێیان ناخۆشە کە دژی ئێوە بجەنگن، یاخود لە دژی خەڵکەکەی خۆیان (کە بێبڕوان) بجەنگن، واتە: کەوتوونە حاڵەتێکەوە کە خۆیان بە سەغڵەت دەبینن، پێیان ناخۆشە دژی ئێوە بجەنگن، یاخود لە دژی قەومەکەی خۆیانو خەڵکەکەی خۆیان بجەنگن، واتە: حەز دەکەن کە بێلایەن بنو لاشەڕ بن ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡ﴾، وە ئەگەر خوا ویستبای ئەوانی بەسەر ئێوەدا زاڵ دەکردو لە دژتان جەنگیان دەکرد، واتە ئێستا کە خوا وایکردوە ئەوانەی لەکۆڵ ئێوە کردۆتەوەو لە دژتان جەنگ ناکەن، ئێوەش ستایشی خوا بکەن ﴿فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا﴾، هەر کام لەم دوو کۆمەڵە کە یان پەیوەستن بە کۆمەڵێکی هاوپەیمانی ئێوەوە، یاخود نایانەوێ لە دژتان بجەنگنو دەیانەوێ بێلایەن بن، لە نێوانی ئێوەو خەڵکە کافرەکەی خۆیانداو نایانەوێ لە تەرازووی ئێوەدابن دژی خەڵکەکەی

خۆیان بنو ناشیانەوێ دژی ئێوەش بن، بەڵکو حەزدەکەن بێلایەن بن ﴿ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ ﴾، ئنجا ئەگەر کەناریان گرت لە ئێوە، ﴿ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ ﴾، لە دژی ئێوە جەنگیان نەکرد ﴿ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ ﴾، وە لەگەڵ ئێوەدا ئاشتییان نواند ﴿ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴾، ئەوە خوا هیچ ڕێیەکی بۆ ئێوە دانەناوە، کە لەو ڕێیەوە دژایەتییان بکەنو لەگەڵیاندا بجەنگن، واتە: هیچ بیانوویەکتان بەدەستەوە نیە.

ئنجا خوای کاربەجێ دێتە سەر باسی کۆمەڵێکی دیکە، کۆمەڵێکی دیکەی سێیەم هەر لە بێبڕوایان، کە ئەوانە لە حاڵەتی نیفاقو دووڕوویی یەوە نیزیکنو دەفەرموێ: ﴿ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ ﴾، کەسانێکی دیکە دەبینن هەر لە بێبڕوایەکان، دەیانەوێ هەم لەلای ئێوەوە دڵنیابن، وە هەم لەلای خەڵکەکەی خۆشیانەوە دڵنیابن، واتە: دەیانەوێ کە وەك کوردەواریی دەڵێن: (لەسەر دوو پەتان یاریی بکەن) یان (لە دوو ئاخوڕان دا بلەوەڕێن) هەم لەلای ئێوە زیانیان پێ نەگات، وە هەم لەلای خەڵکەکەی خۆیانەوە، هەڵبەتە ئەوە ئەگەر بێلایەن بن، باشە، بەلاّم ئەوان بە شێوەیەکی دیکە دەیانەوێ لە لای مسوڵمانان هێمن بن، وە لەلای خزمو خەڵکەکەی خۆشیانەوە هێمن بن، وەك دەفەرموێ: ﴿ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَا ﴾، هەر کاتێك کە گێڕدرانەوە بۆ لای فیتنە، کە لێرەدا فیتنە واتە: کوفرو شیرك، یان ئاژاوەگێڕیی، ﴿ أُرۡكِسُواْ فِيهَا ﴾، ئەوە تێیدا سەرەوبن دەبن، واتە: هەر لە دەرفەتێك دەگەڕێن کە ئیعلانی کوفریان بکەن، یان زەربەتان لێبدەن، بەلاّم دەیانەوێ بە ڕواڵەتو ڕووکەشیی لە لای ئێوەشەوە هێمن بن، وە لەلای بەرانبەرەکانیشیانەوە هێمن بن، ﴿ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ ﴾، جا ئەگەر کەناریان

نەگرت لە ئێوە، (واتە: لاشەڕ نەبوون) وە ئاشتییان بۆ لای ئێوە پێشان نەدا، وە دەستی خۆیان نەپاراست لە ئێوە، بەڵكو هەر دەرفەتێكیان چنگ دەكەوت زەڕبەیان لە ئێوە دەدا، ﴿ فَخُذُوهُمْ ﴾، ئێوەش بیانگرن، ﴿ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ ﴾، وە لە هەر شوێنێك بەرپەلتان كەوتن، بیانكوژن، مادام ئەوان لە دژی ئێوە جەنگ دەكەن ﴿ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴾، وە ئا ئەوانەتان خوا بەڵگەیەكی ئاشكرای داوەتە دەست ئێوە لەسەریان، مادام ئەوان ئەگەر لێیان هەڵكەوتن، دژایەتییتان دەكەن‌و زەڕبەتان لێ‌دەدەن، ئێوەش لە هەر شوێنێك بەرپەلتان كەوتن، مامەڵەی وەك خۆیانیان لەگەڵدا بكەنەوە.

ئنجا خوای دادگەر باسی بابەتێكی دیكە دەكات كە مەسەلەی كوشتنی بە هەڵەیە، ئێمە دوو جۆر كوشتنمان هەن: كوشتنی بەئانقەست، ئەوەیە كە بەئانقەست كەسێك كەسێك بكوژێ، وە كوشتنی بە هەڵە، ئەوەیە كە كەسێك كەسێكی لە دەست بكوژرێ‌و نەیەوێ بیكوژێ، بەلام لە دەستی بكوژرێ بە هەڵە، خوا لەم ئایەتەدا باسی ئەو جۆرە دەكات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٍ أَن يَقۡتُلَ مُؤۡمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ﴾، وە هیچ بڕوادارێك بۆی نیە بڕوادارێكی دیكە بكوژێ، مەگەر بە هەڵە، واتە: ئەگەر بە هەڵە لە دەستی بكوژرێ، ئەگەرنا بڕوادار بڕوادار ناكوژێ، مسوڵمان مسوڵمان ناكوژێ، ئنجا دێتە سەر باسی سزای كوشتنی بە هەڵە: ﴿ وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـًٔا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ وَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ ﴾، وە هەر كەسێك ئیماندارێكی بە هەڵە كوشت، لەسەریەتی گەردنێكی ئیماندار ئازاد بكات، واتە: كۆیلەیەكی بڕوادار ئازاد بكات ئەو كاتە كۆیلە هەبوون، دوایی باسی دەكەین كە لەم ڕۆژگارەدا كۆیلە نین، بە دیلەكەی چییە؟ ئەڵتەرناتیڤەكەی چییە؟ ﴿ وَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ ﴾، وەك سزایەكی داراییش، دەبێ خوێنێكی تەسلیمكراو

بگەیەنێتە دەست کەسوکاری واتە: کەسوکاری ئەو کەسە کە بە هەڵە کوژراوە، ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ ﴾، بابای بکوژ ئەو خوێنەی لەسەرە، مەگەر کەسوکارو خزمانی کوژراوەکە خێرو چاکە بکەن‌و بیبەخشن، جا لە هەمووی بیبەخشن‌و بڵێن خوێنت لێ وەرناگرین، یان تەنیا لە هەندێکی بیبەخشن، ئەوە ئەو کاتە ئەگەر لە هەمووی بەخشییان، ئەوە هیچی ناکەوێتە سەر، وە ئەگەر لە هەندێکی بەخشییان، ئەوە ئەو بەشەی کە لێی بەخشراوە مولزەم نیە کە بیدا، ئنجا ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئیماندارێك ئیماندارێك دەکوژێ‌و لەنێو مسوڵمانانیشدایە، بەڵام ئایا ئەگەر مسوڵمانەکە لە نێو کۆمەڵێکی کافر دابوو، وە بە دەست مسوڵمانێك بە هەڵە کوژرا، ئەوە سزایەکەی چۆنە؟ ﴿ فَإِن كَانَ مِن قَوۡمٍ عَدُوّٖ لَّكُمۡ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ ﴾، بەڵام ئەگەر کوژراوەکە لەگەڵ کۆمەڵێکی دوژمن بە ئێوە بوو، خۆیشی بڕواداربوو ﴿ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ ﴾، ئەوە بکوژەکەی تەنیا کۆیلەیەکی ئیماندار ئازاد دەکات، وەك کەفارەت، بەڵام خوێنی نیە، بۆچی؟ چونکە مادام کوژراوەکە لەنێو دوژمنی ئیمانداراندایە، ئەگەر خوێنەکەی بدرێ بە دوژمنەکان، مانای پێی بەهێز دەبن لە ڕووی ئابوورییەوە، لەبەرئەوە خوێنیان ناکەوێ، چونکە دوژمنن، بەڵام بۆیە کەفارەت دەدات، چونکە ئیماندارێکەو بە هەڵەش کوژراوە، هەڵبەتە بە ئانقەست هەر بۆی نیە بیکوژێ، با لە نێو کافرانیش دابێ، مەگەر کافران هێنابیان بۆ جەنگو ڕووبەڕوو بووبێتەوە، ئەوە حوکمێکی دیکەی هەیە، ئنجا باسی حاڵێکی دیکە دەکات، کە کوژراوەکە بێبڕوایە وە بە هەڵە دەکوژرێ لە نێو کۆمەڵێکدا کە هاوپەیمانن لەگەڵ مسوڵمانان، ئایا ئەوە سزایەکەی چۆنە؟ ﴿ وَإِن كَانَ مِن قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ ﴾، وە ئەگەر بابا بە هەڵە کوژراوەکە، لە کۆمەڵێك بوو، کە لە نێوانی ئێوەو ئەواندا پەیمان هەبوو ﴿ فَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ ﴾، ئەوە

سزایەکەی خوێنێکی تەسلیمکراو بە کەسوکاری کوژراوەکە، وە ئازادکردنی کۆیلەیەکی ئیماندارە.

واتە: ئەو کوژراوە خوێنی هەیە، چونکە لە کەسانێکە کە لەگەڵ ئیمانداراندا هاوپەیمانن، ئەو خوێنە کە پێیان دەدرێ، پێی بەهێز دەبن، بەڵام مادام هاوپەیمانی ئیمانداران، بە زیانی مسوڵمانان تەواو نابێ‌و بە قازانجیان تەواو دەبێ، ئەوە لە حاڵێکدا کە کۆیلەی بڕوادار هەبێ، وەکو کاتی خۆی بووە، بەڵام ئێستا سوپاس بۆ خوا کە شتی وا نەماوەو ئیسلام بنبڕی کرد، وە لەڕاستییدا یەکەمین بەرنامەیەك کە نەخشەی دانا بۆ ڕیشەکێشکردنی دیاردەی کۆیلایەتیی ئیسلام بوو، وەك لە دەرسەکانی پێشوودا بە درێژیی باسمان کرد، بەڵام ئایا ئەگەر کۆیلە نەبوو، کەفارەتەکەی چییە؟ ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾، جا ئەگەر کۆیلەی دەست نەکەوت ئازادی بکات، وەك کەفارەت، با دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ ﴿تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ﴾، ئەوە دەبێتە گەڕانەوە بۆ لای خواو، دەبێتە هۆی ئەوە کە خوا تۆبەی لێ قبووڵ بکات، واتە: دەبێ دوو مانگان لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ لە جیاتی ئەوەی کە کۆیلەیەك نیە ئازادی بکات ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، وە بێگومان خوا زانای کاربەجێ یە، زانایە کە ئەو حوکم‌و بڕیارانەی داناوەو، کاربەجێ یە کە دەفەرموێ دەبێ ئاوا بەو شێوەیە مامەڵە بکەن‌و، فەرمانەکەی لە شوێنی خۆیدایە.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکەی سێیەم کە بریتییە لە کوشتنی بە ئانقەست، بەڵام تەنیا باسی سزا قیامەتییەکەی دەکات، چونکە لە شوێنەکانی دی: لە سووڕەتی (البقرة)و لە (المائدة)و لە (الإسراء)دا باسی سزا دنیاییەکەی کردوە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام لێرەدا بەس باسی سزا قیامەتییەکەی دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾، وە هەر کەسێك

ئیمانـدارێك بـە ئانقەسـت بکـوژێ، سـزایەکەی دۆزەخـە، بـە هەمیـشەیی تێیـدا دەمێنێتـــەوە، وە خـــوا لـــێی تـــووڕەبووەو لەعنەتـــی لـــێکردوە، وە سـزایەکـــی مەزنیـشی بـۆ دانـــاوە، دیـارە سـزاش لـەوە قورسـتـر نیـە بـۆ زانیارییتـــان، لـە قورئـــاندا مـن نـەمبینیوە سـزا لـەوە قورسـتـرو گەورەتـر بـێ، بۆیـە وەك دوایـی باسی دەکەین، لە نێو زانایاندا مشـتومڕ هـەیـە، کـە: ئایا کەسـێك مـسولمانێـك بـە ئانقەسـت بکـوژێ، تۆبـەی لـێ قبـوول دەکـرێ؟ هەنـدێ دەڵـێن: لێـی قبـوول ناکـرێ، بـەڵام زۆربەیـان دەڵـێن: لـێی قبـوول دەکـرێ، وەك دوایـی باسـی دەکـەین، بەڵام گرنـگ ئەوەیـە لێـرەدا خـوای باڵادەسـت سـزایەکی زۆر قورسـی دانـاوە، وەك دوایـی بڕگـە بڕگـە شیـدەکەینەوە، کـە ئـەو سـزایە لـە چـوار بڕگـە پێکـدێ، وە قورسـتـرین سـزایە، هەڵبـەتـە قورسـتـرین سـزایە، بـۆ ئـەو گونـاحو تـاوانو خراپانـەی کـە دەکـرێن، جا بکـەرەکەیان مـسوڵمان بـێ، یـان نامـسوڵمان، دیـارە سـزای قورسـتـرو گەورەتر هـەیـە، بـەڵام نـەك لەسـەر کـردەوەی خـراپ، بـەڵکو لەسەر شـیـركو کوفـرو نیفـاق.

## چـەند مەسـەلـەیـەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ﴾،

بەڕێـزان! ئـەم قورئانـە هـەمووی بـۆ پـەروەردەکردنی کۆمەڵـگای مـسوڵمانە، پـەروەردەکردنیانو ڕاهێنانیـانو بنیاتـنانیان، لـە ڕووی فیکریـیو عەقیـدەییو ئـەخلاقییو عیبـادیی کۆمەڵایـەتییو سـیاسییو خێزانیـیو تـاکییو... هتـد، لێـرەدا خـوا ﷻ گلـەیی دەکـات لـە ئیمانـدارانو جۆرێـك سەرزەنـشتیان دەکـاتو دەفەرموێ: بۆچی دەربارەی مونافیقـەکان بوونـە دوو کۆمـەڵ، ئێمـە پێـشتـر لـە هـۆی هاتنەخـوارەوەدا باسمانـکرد، چـەند بەسـەرهاتێکمـان باسـکرد، بـەڵام وەك دوایـی ڕوونـی دەکەینـەوە، لەڕاسـتیدا ئـەو مونافیقانـەی کـە لێـرە خـوای پەنهانـزان سـەرزەنشتی ئیمـاندارانیان لەسـەر دەکـات، کـە لـە شێوەی مامەڵە

لەگەڵکردنیاندا بوونەتە دوو کۆمەڵ، ئەو مونافیقانە بوون کە لە دەرەوەی مەدینە بوون، چونکە دوایی دەفەرموێ: هەتا کۆچ دەکەن، کەواتە: دیارە لە دەرەوەی مەدینە بوون، بۆیە دەفەرموێ: هەتا دێنە شاری مەدینەو دێنە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی پێویستە مامەڵەتان ئاوابێ لەگەڵیاندا، لێرە دیارە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بەڕاستی حاڵەتی نیفاق کە بە کوردی پێی دەڵێن: دەغەڵیی، دووڕوویی، وە وشەی مونافیقییش هەر بەکاردەهێنرێ، حاڵەتێکی لێڵو تەمومژاوییە، بۆیە عەجایب نیە کە مسوڵمانان لە مامەڵەکردن دەربارەی مونافیقەکان، ڕاجیایی یان هەبێت، بەتایبەت خەڵکی سادەو خۆشباوەڕو سافیلکەو ڕواڵەت بین، کە مونافیقەکان بە مسوڵمان تێدەگات، بەڵام ئەوەی کە قووڵو وردبینو دووربین بێ، نەخێر، دەیانناسێ، ئنجا لەبەرئەوەی هەموو خەڵکیش هەمیشە لە ئاستێکدا نینو، هەموویان وردبینو دووربین نینو، هەموویان سەرناس نین، بۆیە لەنێو کۆمەڵگای مسوڵماناندا هەمیشە دەربارەی مونافیقەکان ڕاجیایی هەر هەبووەو هەر دەشبێ، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا وەك خوا ﷻ باسی دەکاتو، لە سەردەمی ئێمەشدا ئێستاش زۆر کەس هەیە مونافیقەو خەڵکی سادەش بە مسوڵمانی باشی دەزانێ، مونافیق یانی چی؟ یانی: بە ڕواڵەت خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدات، بەڵام لە دەروونداا کافرە، جا چۆن دەزانی لە دەرووندا کافرە، خۆ دڵت نەخوێندۆتەوە؟ تەماشا هەڵسوکەوتەکانی دەکەی: مسوڵمانانی خۆشناوێن، دڵی بە ئەهلی ئیسلام خۆش نیە، ئەهلی کوفری خۆشدەوێ، پێی خۆشە کافر بەسەر مسوڵماناندا زاڵ بن، بابای واش مونافیقە، کەچی تەماشا دەکەی مسوڵمانی سادەو سەرکێڵو سافیلکەو خۆشباوەڕ هەیە، بەوانە هەڵدەخەڵەتێ، لەبەرئەوەی کە دوو ڕکات نوێژی درۆینە دەکات، وە خۆی بە مسوڵمان پێناسە دەکات! خەڵك پێیان هەڵدەخەڵەتێ، بەڵام خوا ﷻ لێرە سەرزەنشتی مسوڵمانان دەکات، دەفەرموێ:

مەبنە دوو تاقمو دوو دەستە دەربارەی مونافیقەکان، لە حاڵێکدا کە: ﴿وَٱللَّهُ

﴿أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ﴾، خوا سەرەوبنی کردوونەوە بە هۆی کردەوەکانیانەوە، واتە: دوای ئەوەی کە بە پێی یاسای خوا ﷻ سەرەوبن بوونەتەوە، پێشی خوا هیدایەتی داون، هاتوونە نێو مسولمانانەوە، دوایی هەڵگەڕاونەوە، دیارە ئەوانە لەو بابەتە بوون، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ هەر بە ڕواڵەت خۆیان بە مسولمان پێشانداوە، بەڵام کردەوەو ڕەفتارو هەڵوێستی وایان نواندووە، دوایی ئەو مسولمانەتییە ڕووکەشەشیان هەڵوەشاوەتەوە، وە دەشگونجێ ئیمانیان هێنابێ، بەڵام دوایی بە هۆی کردەوەو هەڵوێستەکانیانەوە، ئیمانەکەیان هەڵوەشابێتەوە، هەردوو واتاکەی ڕاستو دروستن.

<u>مەسەلەی دووەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ﴾، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە خوا ﷻ ئەو خەڵکەی بۆ هەڵگێڕاوەتەوەو سەرەوبنی کردوونەوە، بێگومان خوا پێی خۆشە خەڵك هیدایەت بدرێ، ئەدی بۆچی ئەو مونافیقانەی سەرەوبن کردۆتەوە؟ چونکە (رَكس) یانی: (قَلب)، وەڵامەکەی ئەوەیە: کە خوا ﷻ لێرەدا یاسایەکی خۆی دەخاتە ڕوو، وەك ئەگەر کەسێك ژەهر بخواتەوەو دوایی بمرێ، دیارە ژەهرەکە کوشتوویەتی، بەڵام ئەگەر بڵێی: خوا کوشتی بە هۆی ژەهرەوە، یانی: خوا ﷻ تایبەتمەندیی وای لەنێو ژەهردا داناوە، کە هەر کەسێك بیخواتەوە، پێی دەمرێ، وە نەبێ خوا پێی خۆش بووبێ بەو ژەهرە بمرێ، یانی خوا ڕاستەوخۆ نەیکوشتوە، بەڵام بە پێی یاسای خوا، هەر کەس ئەو ژەهرە بخوا دەمرێ، یان کەسێك لە بینایەکی بیست قاتەوە خۆی هەڵدێرێو خۆی بخاتە خوارێ، یان یەکێك خۆی بخاتە بن تایەی سەیارەیەکەوە، ئەگەر بڵێین خوا کوشتی واتە: بە هۆی یاسای خوا کە خوا وای داناوە کەسێك لە شوێنێکی هێندە بەرزەوە خۆی هەڵدێرێ دەمرێ، وە کەسێك خۆی بخاتە ژێر تایەی سەیارەوە دەمرێ، یان کەسێك خۆی لەنێو ئاگر باوێ دەمرێ، کەواتە: لێرەدا خوای دادگەر باسی یاسایەکی خۆی دەکات، ئەوەتان بۆیە بۆ ڕوون دەکەمەوە، بۆئەوەی هیچ کەس وا تەصەووڕ نەکات، بڵێ: دیارە خوا لە

بەندەکانی لە بەهانەیەو پێی خۆشە هەڵیانگێڕێتەوەو کافریان بکاتەوە ! یاخود مونافیقیان بکاتەوە ! لێرەدا خوا ﷻ یاسایەکی خۆی دەخاتە ڕوو بە بەڵگەی ئەوە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْ ﴾، خوا سەرەوبنی کردوونە بە هۆی ئەوە کە وەدەستیان هێناوە، بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە، یاسایەکی خوایان لەسەر چەسپیوە، کە خوا دایناوە هەر کەسێك ئەو کردەوانە بکاتو، ئەو هەڵوێستانە بنوێنێ، سەرەنجام کافر دەبێ، زانایان دەڵێن: بەردەوامیی لەسەر گوناهی گچکە دەبێتە گوناهی گەورەو، گوناهی گەورەش ئینسان بەرەو کوفر دەبەن.

**مەسەلەی <u>سێیەم</u>:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴾، ئایا دەتانەوێ کەسانێك ڕێنمایی بکەن کە خوا گومڕای کردوون؟ وە هەر کەسێك خوا گومڕای بکات هیچ ڕێیەکت بۆی چنگ ناکەوێ، بۆئەوەی دەربازی بکەی لە کوفر، مادام خوا گومڕای کردبێو سەری لێ شێواندبێ، لێرەدا پرسیار دەکرێ: ئایا خوا بۆچی خەڵك گومڕا دەکات؟ وە خوا کێ گومڕا دەکات؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوای دادگەر هەر لە قورئاندا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، چونکە قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوەو تەفسیر دەکات، خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (إبراهیم) لە ئایەتی (٢٧)دا دەفەرموێ: ﴿...وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ٢٧﴾، واتە: خوا ﷻ ستەمکاران گومڕا دەکات، وە خوا ئەوەی بیەوێ ئەنجامی دەدات، کەواتە: خوا ﷻ کێ گومڕا دەکات؟ ئایا هەر لە خۆوە ملی خەڵك دەگرێ گومڕایان بکات؟ نەخێر، ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، ئەوانەی کە زوڵم لە خەڵكو لە خۆیان دەکەنو خراپەکارن، ئەوانە خوا گومڕایان دەکات.

پاشان لە سوورەتی (الزمر) لە ئایەتی (٣)دا دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ۝٣ ﴾، واتە: بێگومان خوا ڕێنمایی کەسێك ناکات کە درۆزنەو سپڵەو بێوەفایە، کەواتە: بە هۆی درۆزنیی‌و بە هۆی سپڵەیی‌و بێ نمەکیی یەوە، خوای کاربەجێ ئینسان گومڕا دەکات.

وە لە سوورەتی (فصلت) لە ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ... ۝١٧ ﴾، واتە: بەڵام گەلی ثەموود ئێمە ڕێنماییمان کردن، بەڵام خۆیان کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، کەواتە: خوای بە بەزەیی پێی خۆشە خەڵك هیدایەت وەربگرێ‌و ڕێنمایی بەندەکانی بکات، بەڵام کە خۆیان کوێریی‌و گومڕایی هەڵبژێرن بەسەر هیدایەتدا، دیارە خوا بە زۆر ملیان ناگرێ بەرەو هیدایەتیان بێنێ، خوا زۆر لە کەس ناکات، نە بۆ هیدایەت‌و نە بۆ گومڕایی، بەڵکو خوا بەندەکانی سەرپشك کردوە، تاکو ئەوەی کە دەیەوێ‌و حەز دەکات ئیمان هەڵبژێرێ، وە ئەوەی حەز دەکات کوفر هەڵبژێرێ، وەك بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ ۝٢٩ ﴾، واتە: وە بڵێ هەق لە پەروەردگارتەوەیە، جا کێ دەیەوێ با بڕوا بێنێ‌و، کێش دەیەوێ با بێبڕوا بێ...

<u>مەسەلەی چوارەم:</u> کە دەفەرموێ: ﴿ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗ ﴾، ئەو مونافیق‌و دەغەڵانە حەز دەکەن‌و پێیان خۆشە، ئێوەش بێبڕوابن، وەك چۆن خۆیان بێبڕوان ﴿ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗ ﴾، تاکو وەك یەکتان لێبێ، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (النمل)ە کە لە شوێنەکانی دیکەشدا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخۡرِجُوٓاْ ءَالَ

لُوطٍ مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ٥٦﴾، وەڵامـی گەلـی لـووط بـۆ لـووط هەر ئەوەبوو کە گوتیان: (لووط)و ئەوانەی کە لەگەڵیدان - (آل لوط) یانی: ئەوانەی کە شوێنکەوتووی (لووط)ن - ، لە شاری خۆتان دەریان بکەن مادام وەك ئێوە پیس نین، پیسو گڵاونینو نێربازیی ناکەن، وەك گوتراوە: (ودّت الزنية لو زنت النساء كلها)، واتە: ئافرەتی داوێنپیس حەز دەکات هەرچی ئافرەتی دنیایە زینا بکەن، هەمیشە خراپەکار پێی خۆشە خراپەکار زۆربن، تاکو ئەویش دیار نەبێ، وەك چۆن چاکەکاریش پێی خۆشە چاکەکار زۆربن، چونکە بۆی دەبنە هاوکارو دەست بارگر، وە ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە ئێمە هیچ کاتێك مونافیقو کافرەکان ئومێدی ئەوەمان پێیان نەبێ، کە شتێکی چاك بۆ ئێمە بە ئاوات بخوازن، بەڵکو هەمیشە چ شتێك بۆ ئێمەی مسوڵمان خراپە، ئەوەمان بۆ بە ئاوات دەخوازن، وەك دەڵێ: (هەر کەسە لە هەمبانەی خۆی گوێزان دەژمێرێ)، وەك چۆن ئیماندار پێی خۆشە هەموو خەڵك ئەهلی ئیمانو چاك بێ، خراپەکارو دەغەڵو مونافیقو فاجیرەکانیش، پێیان خۆشە هەموو خەڵك وەك ئەوان بێ.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾، دیارە هەر قسە لەسەر مونافیقو دەغەڵەکانە، دەفەرموێ: لەنێو ئەوانەدا کەس بە دۆست[1] مەگرن، کەس لەنێو ئەوانەدا مەکەن بە دۆستو نزیكو پشتیوانی خۆتان ﴿حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾، هەتاکو لە ڕێی خوادا کۆچ دەکەن، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هۆی هاتنەخوارەوەکەی کە پێشتر چەند بەسەرهاتێکمان باسکرد، ئەوەیان هۆی هاتنەخوارەوەکەیەتی کە ئەوانە کۆمەڵێك بوون لە دەرەوەی شاری مەدینە

---

١) (أولياء) کۆی (ولي)یە، (ولي) واتە: دۆستو خۆشەویستو پشتیوانو یاریدەدەر، ئەو واتایانە هەمووی دەگەیەنێ، بڕوانە: مختار الصحاح، لفظ: و ل ي.

بـوونو هاتوونــە نێـو مەدینــەو مــسوڵمان بـوون، دوایـی هەڵگــەڕاونەتەوەو چوونەتەوە شـوێنی خۆیـان، چـونکە خـوا دەفـەرموێ: هـەتاکو کـۆچ نەکەنـەوە جارێکی دیکە، لـە وڵاتـی خۆیـانو شـوێنو ناوچەکانی خۆیـان بەجـێ نەهێڵـنو نەیەنــە نێــو شــاری مەدینــــە، بەدۆســـتیان مەگـــرنو هەرچـــەندە بڵـــێن مـسوڵمانین، متمانـەیان پێـی مەکـەنو باوەڕیـان پـێ مەکـەن، دیـارە هەنـدێك بەسـەرهاتی دیکـە گێڕدرانـەوە، کـە هەنـدێ لـە هـاوەڵانی گوتوویـانە ئـەوە دەربـارەی ئەوانەیە کە لە جەنگی (ئوحود) پاشەکشـەیان کـرد، بـەڵام بێگومـان بـەو هۆیـەوە نەهاتۆتـە خـوار، هەرچـەندە چـەمكو واتـای ئـەم ئایەتـە ئـەوەش دەگرێتەوەو، ئەوانەش نابـێ بـە دۆسـت بگیـرێن، بـەڵام بۆیـە دەڵـێین لـەوبارەوە نەهاتۆتــە خــوار، چــونکە ئەوانــە هــەر لــە مەدینــە دابــوون، کەچــی خــوای پەروەردگار باسی کـۆچ کـردن دەکات، کە دیـارە مادام هـەر لـە مەدینـە دابـووبن، بۆ کـوێ کۆچ بکـەن؟، کەواتە: دیارە ئەوانە کەسانێك بـوون لـە دەرەوەی شــاری مەدینە بوونو، لـە دەرەوەی دەوڵـەتی ئیـسلامیی بـوون، جـا خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: هـەتا نەیــەنە ژێـر سـایەی دەوڵـەتی ئیـسلامییەوە، بـا بـشـڵێن مسوڵمانین، بـاوەڕو متمـانەیان پـێ مەکـەن، ئنجـا ئەمە ئەوەشـی لێوەردەگیـرێ کە پەیوەست بوون بە قـەوارەی سیاسـیی مـسوڵمانانو دەوڵـەتی ئیـسلامییەوە، مەرجی بە دۆسـت گیـرانەو، مسوڵمانان دەبێت تەنیا کەسێك بـە دۆسـت بگـرنو پـشـتیان پـێ ببەسـتنو خۆشـیان بـوێن، کـە پەیوەسـت دەبـن بـە قـەوارەی سیاسـییو دەوڵەتی ئیسلامییەوە، وەك خوا لە سـوورەتی (الأنفـال) لـە ئایـەتی ژمارە (٧٢)دا ئـەو مەسـەلەیە زۆر جوان ڕوون دەکـاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ

﴿إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کۆچیان کردووەو لە ڕێی خوادا تێکۆشاون، وە ئەوانەش کە ئەوانەیان پەنا داوەو حەواندۆتەوە پشتیان گرتوونو یارمەتییان داون (واتە: کۆچکەران پشتیوانان) هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن (هەڵبەتە کۆچکەرانو پشتیوانان مەرج نیە هەر ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر بن هەمیشە مسوڵمانان دەبنەوە بەو دوو بەشە، بەشێکیان لە شوێنی خۆیان جێیان نابێتەوەو جێیان پێ لێژ دەبێت، بۆیە بەجێی دەهێڵن دەچنە شوێنێکی دیکە، کە لەوێ مسوڵمانان بەهێزن، جا ئەوانەی کۆچ دەکەن دەبنە کۆچکەرو ئەوانی ئەوێش دەبنە پشتیوانو پشتیان دەگرن)، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کۆچیان نەکردوە، بۆتان نیە دۆستایەتییان بکەنو، هیچ پەیوەندیی دۆستایەتییتان پێکەوە نیە، هەتا کۆچ نەکەن، (پەیوەندیی دۆستایەتیی یانی: چی؟ واتە: ئەو لایەنە شەریکی دەبێ، تۆ بۆت نیە بچی پشتی بگری، داوای یارمەتییو هاوکاریی دەکات، بۆت نیە بچی هاوکاریی بکەی؟ چونکە ڕەنگە ئەو هاوکارییە بە قازانجی دوژمن تەواو بێ)، تەنیا لە یەك حاڵەت دا بۆتان هەیە پشتیان بگرن، ئەویش ئەوەیە کە لەسەر دین داوای یارمەتییان لێکردن، (واتە: لایەنێك ستەمێکی دینییان لێ دەکات، بۆتان هەیە پشتیان بگرن) بەڵام بە مەرجێك ئەو ستەمە دینییە کە لێیان کراوە لەلایەنی کەسانێکەوە نەبێ، کە هاوپەیمانی ئێوەن، (کۆمەڵە کافرێکن هاوپەیمانی دەوڵەتی ئیسلامیین، زوڵم دەکەن لە مسوڵمانانێك کە لە نێوانیاندان، یان لە مسوڵمانانێکی شوێنێکی دیکە، دەوڵەتی ئیسلامیی مولزەم نیە بچێ پشتگیریی بکات لەو مسوڵمانانەی کە ستەمیان لێکراوە، لە لایەنی هاوپەیمانانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، کە کافرن)، وە خوا بینەری ئەوەیە کە ئەنجامی دەدەن.

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾، ئنجا ئەگەر ئەوانە پشتیان لە ئێوە کرد، بیانگرن، وە لە هەر شوێنێك بەرپەلتان کەوتن، بیانکوژن، وە هیچ کامیان لەنێودا مەگرن بە دۆستو یارمەتیدەرو پشتیوانی خۆتان، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا هەر کەسێك وابوو، ئیسلام دەستی مسوڵمانانی کردۆتەوە بچن بیانگرنو بیانکوژن؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، ئەوە بۆ کەسانێکە کە سەنگەر لە ئەهلی ئیسلام دەگرنو دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانان دەکەن، ئەوانەی کە کافری جەنگیین، چونکە کافر دوو جۆرن: کافرێك کە ئاشتەوایی‌و تەبایی دەوێ، وە کافرێك کە دژو جەنگکەرە لە دژی ئیسلام، کە لێرەدا مەبەست پێی کافری جەنگییە، ئەگەرنا لەڕاستییدا - وەك دوایی باسی دەکەین -، ئیسلام ڕێگا نادات بە مسوڵمانان کە دەستدرێژیی بکەنە سەر کافرانێك کە دژی مسوڵمانان نینو سەنگەریان لێناگرن، وە لە دژیان ناجەنگن، وە دەشفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾، لە نێو ئەواندا هیچ کەس مەکەن بە دۆستو نیزیکی خۆتانو یارمەتیدەرو پشتگیری خۆتان، چونکە کەسێك کە ئامادە نەبێ لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بێو، ئامادە نەبێ لەگەڵ مسوڵماناندا بێ، ئەوە بەکەڵکی دۆستایەتیی‌و پشت پێبەستن نایەت.

**مەسەلەی حەوتەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ﴾ ، لێرەدا خوای کاربەجێ دوو کۆمەڵ لە کافران هەڵداوێرێو جیایان دەکاتەوە، لەوەی کە مسوڵمانان بۆیان هەبێ لە دژیان بجەنگن، دەفەرموێ: دوو کۆمەڵی کافر هەن، دوو جۆرە کافر، بۆتان نیە سەنگەریان لێبگرنو شەڕیان لەگەڵدا بکەن:

**جـــۆری یەکـــەم:** ﴿يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾، پەیوەســتن بــە کۆمەڵێکەوە کـە لـە نێـوان ئێـوەو ئـەو کۆمەڵـەدا پـەیمان هەیـە، مـسوڵمانان پەیمانیان هەیە لەگـەڵ کۆمـەڵێکی کافردا، پـەیمانی چییان هەیـە؟ پـەیمانی ئـەوەیان هەیـە کـە شـەڕ لەگـەڵ یەکدی نەکـەن، یـان لەسـەر یەکدی شـەڕ بکـەن، وەك پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ خوزاعـە پـەیمانی هـەبوو، کـە لەسـەر یەکدی جـەنگ بکـەن، ئـەوەبوو کاتێـك هـۆزی بـەنی بـەکری هاوپەیمـانی قورەیـشییەکان، هێرشـیان کـردە سـەر هـۆزی خوزاعـەی هاوپـەیمانی پێغەمبەر ﷺ، وە بیست نەفەریان لـێ کوشـتن، سـەرۆکی هـۆزی خوزاعـە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئـەی موحەممەد ! ئێمـە هاوپـەیمانی تـۆین، (ئەوانیش ڕەنگە مسوڵمانیان لەنێودا بووبن، بەڵام بەگشتی کـافر بوون)، هاوپەیمانەکانی قورەیش کە بەنی بەکرن، هێرشـیان کردۆتـە سـەر ئێمـەو بیست نەفەریـان لـێ کوشـتووین، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: «نُـصِرْتَ يَـا عَمْـرَو بْـنَ سَـالِمٍ» (أَخْرَجَـهُ البَيْهَقِـيُّ فـي الكُبرى برقم: (١٩٣٣١)، واتــە: ئـەی عـەمری کـوڕی سـالم تـۆ سـەرخرای، مـادام مـن هاوپـەیمانتم، شـەڕت لەسـەر دەکـەم، بەڵـێ هـاوپەیمان بـا کـافریش بـێ، دەبـێ پـەیمانی لەگەڵ ببـڕێتە سـەر، ئنجا خـوا لێـرە دەفـەرموێ: ئەوانـەی کـە پەیوەسـتن بـە کەسـانێکەوە کـە هـاوپەیمانی ئێـوەن، بۆتـان نیـە شـەڕیان لـە دژ بکـەن، چونکە وەك گوتراوە: (دۆستی دۆستم دۆستمە).

**جـــۆری دووەم:** لـەو کـافرانەی کـە بۆتـان نیـە لەگەڵیـاندا بجـەنگن، ﴿أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُواْ قَوْمَهُمْ﴾، یـاخود دێـن دڵیـان تەنگەو سینەیان تەنگـە، کـە لـە دژی ئێـوە جـەنگ بکـەن، یـان لـە دژی خـەڵکەکەی خۆیـان، کە کۆمەڵێکی کافرن لە نـاوچەیەکدان خەڵکێکی کـافریان بەدەورەوەیـە، پێیـان ناخۆشـە لـە دژی خەڵکەکـەی خۆیـان شـەڕ بکەن، لە خۆیـان ڕانـابینن، وە پێـشیان ناخۆشــە لـە دژی ئێـوەش جـەنگ

بکەن، ئێوە بۆتان نیە لە دژی ئەوانیش بجەنگن، با کافریش بن، مادام شەڕتان لە دژ ناکەنو بێ لایەنن، ئەوانەی پێشێ پەیوەستن بە هاوپەیمانەکانی ئێوەوە، بەڵام ئەمانە بێ لایەنن، لاشەڕن، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئیسلام هەمیشە هەوڵ دەدات دوژمنان کەمبکاتەوە، هەندێك مسوڵمان وادەزانن، مسوڵمان هەمیشە عەودالی ئەوەیە دوژمنان بۆخۆی زۆر بکات، بەرەی ئیسلامیی لە دژی هەرچی جوولەکەیەو نەصرانییو کافرو بتپەرستەو هەرچی کافرە !! بەڵام نەء، ئیسلام نەهاتوە جەنگ لە دژی هەرچی کافرە بکات، بەڵکو ئەو قەوارەیەی کە بۆ مسوڵمانان دروست دەبێ، دەبێ هەوڵبدەن بەپێی توانا دوژمنان کەمبکەنەوە، ئەوەی کە بۆشیان نەکرێتە دۆست، بەلای کەمەوە بێلایەنی بکەن، پێغەمبەر ﷺ وایکردوە، (بنو ضمرة) هۆزێکی کافر بوون، پێغەمبەر ﷺ (مُوَادَعَة)ی لەگەڵ کردن، واتە: بێلایەن (محاید)ی کردن، نە شەڕمان بکەن، نە شەڕتان دەکەین، نە دژمان بن، نە دژتان دەبین، ئیدی مەرج نیە هەموو خەڵك ببێتە دۆستو مسوڵمان بێ، وە مەرج نیە هەمووشی ببێتە هاوپەیمان، هەروەك مەرجیش نیە کە هەمووشی ببێتە دوژمن، با کابرا بێلایەنیش بێ هەر چاکە، کە دیارە ئەم حیکمەتەی کە لە سیرەو ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەردەکەوێ، زۆر لە مسوڵمانان لەم سەردەمەی ئێمەدا لەو حیکمەتە بێبەشن، دەڵێن: هەرچی لەگەڵ من نەبێ، دوژمنمە، وەك چۆن جۆرج بۆش کاتی خۆی ڕایگەیاند: (ئەوەی لەگەڵمان نەبێ دژمانە)! ئێمەش مسوڵمانی وا سادەو سەرکێڵمان هەیە کە دەچێتە مەیدانی جەنگو جیهادەوەو دەڵێ: (ئەوەی مسوڵمان نەبێ دژمە)، نەخێر، هەیە مسوڵمان نیە، بەڵام دوژمنیش نیە، ئەوەتا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا هەبووە مسوڵمان نەبووەو هاوپەیمان بووە، وە هەبووە مسوڵمان نەبووەو بێلایەن بووە، ئەو لایەنەی کە دەڵێ: مسوڵمان نیمو هاوپەیمانیشت نیم، بەڵام شەڕیشت لە دژ ناکەم، ئیسلام دەڵێ: بۆتان نیە، دژی ئەوانە بجەنگن.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** خـوا ﷻ کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ﴾، ئەگـەر خـوا ویـستبای دوژمنانتـان بـۆ زۆر بکـات، ئەوانەشـی بەسـەر ئێـوەدا زاڵ دەکـردو لـە دژتـان دەجـەنگین، کەواتـە: کـە خـوا ئـەو دوژمنـەی بـۆ کەمکردوونـەوەو لـە کـۆڵ کردوونـەوەو، لـە جیـاتی ئـەوەی سـەنگەرتان لێبگـرن، بێلایـەن وەسـتاون، بـزانن ئـەوە نیعمـەتێکی خوایـە، خـوای کـاربەجـێ لـێرەدا ئەگـەر هـەندێك لـە کـافران لـە بەرانبـەری مسوڵماناندا بێلایەن بن و لە دژیـان شـەڕ نەکەن، بە نیعمەتی داناوە، بەڵـێ ئەوە چاکەو نیعمەتێکە خوا لەسەر مسوڵمانانی حیساب دەکات.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾، ئەو دوو جـۆرە کـافرانە، ئـەو دوو جـۆرە نامـسوڵمانانە، کـە یـان پەیوەسـتن بـە هاوپەیمانەکانتانـەوە، یـان بێـلایەنن، هـەرکات کەناریـان گـرتو خۆیـان لـە ئێـوە دوور گـرت، واتـە: لـە دژایەتیـیکردنی ئێوەدا خۆیان دوور گرت، لە دژتـان نەجەنگـین، وە ئاشـتییان لەگـەڵ ئێـوەدا نوانـد، (ألقـى)، واتـە: بـۆی هاوێـشـت، (سَـلَمَ) واتـە: ئاشـتیی، هـەرکات ئاشـتیان بـۆ ئێـوە هاویـشـت، واتـە: پێـشـانی ئێوەیـاندا کـە لەگـەڵ ئێـوەدا ئاشـتی خـوازن و ئەهلـی شـەڕنین، ئـەهلی سـیلم و صـوڵح و تـەبایین، ﴿ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾، ئـەوە لـەو حاڵەتـەدا خـوا هـیچ ڕێیـەکی دانەنـاوە بـۆ ئێـوە لـە دژی ئـەوان، واتـە: شـەرع ڕێگـای نـەداوە لـە دژیـان بجـەنگن، با کـافریش بـن.

**مەسـەلەی دەیـەم:** ئنجـا خـوا ﷻ باسـی کۆمەڵێکـی دیکە دەکات، جا تەماشا بکـەن ! خوای بێوێنـە چەند بـە وردبینیـی و دووربینیـی و چـەند بـە لـێزانیی کـە هـەر لـە خـوا دەوەشـێتەوە، خەڵـکی کـافرمان بـۆ پۆلـێن دەکـات، وەك گوتـم: ئێسـتا مسـوڵمانی وا هەیە کافران هەموو بـە یـەك چاو تەماشا دەکات،

جوولەكەو نەصرانیی یەكان هەموویان وەك یەك تەماشا دەكاتو پێی وایە رۆژئاوا هەمووی یەك شتە، رۆژهەلات هەمووی یەك شتە، نا وانیە، لەنێو جوولەكاندا جوولەكەی تەبا هەیەو، جوولەكەی سەنگەرگرو دژیش هەیە، وە لەنێو نەصرانییاندا نەصرانیی تەبا لەگەلْ تۆ هەیە، وە نەصرانیی تینوو بە خوێنی سەرت هەیە، بۆیە دەبێ پۆلێنیان بكەی، وە لە رۆژهەلاتو رۆژئاوادا دەولەتی وا هەیە حەز دەكات لەگەلْ عالەمی ئیسلامیی پەیوەندیی باشی هەبێ، بە پێچەوانەوەش هەیە پیلانت لە دژ دادەنێو، دەیەوێ بنەبڕت بكات، دەبێ ئەوانە هەموویان پۆلێن بكرێن، جا لێرەدا خوای پەروەردگار بۆئەوەی كە مسولْمانان فریو نەخۆنو پێیان وابێ كە هەر كەسێك گوتی: من لاشەرم، شەڕتان ناكەم ڕاست دەكات دەفەرموێ: ﴿ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَا ﴾، كۆمەلێكی دیكەتان وەچنگ دەكەوێو دەیانبینن، دەیانەوێ لە لای ئێوەشەوە هێمنو دلْنیابن، وە لە لای خەلْكەكەی خۆشیانەوە هێمنو دلْنیابن، واتە: كۆمەلێكی كافرن دەیانەوێ مسولْمانانیش هێمن بكەنەوە، لە لای ئەوانیش هێمنو دلْنیابن، وە كافرانیش، جا دیارە ئەگەر لەگەلْ بێلایەنییدا ڕاست بكەن باشە، بەلاّم خوا دەفەرموێ: ﴿ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَا ﴾، هەر كاتێك گێڕدرانەوە بۆ نێو فیتنە، واتە: ئاشووبو ئاژاوە، یانی كوفر ﴿ أُرْكِسُواْ فِيهَا ﴾، ئەوە تێیدا سەرەوبن دەبن، واتە: هەر كاتێك دەرفەتیان دەستكەوێ، كە چوونەوە لای كافرەكان و پیلانێكیان دەستكەوت، لە دژی ئێوە ئاوی لێ ناخۆنەوە، واتە: هەر لێتان لە كەلێن دەگەڕێن، لەڕوودا خۆیان بە دۆست پێشان دەدەن، بەلاّم لە پاشملە لێتان دەخەفتێن، كە زەفەرتان پێ بەرن.

**مەسەلەی یازدەیەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ﴾، ئەگەر کەناریان نەگرت لە ئێوەو خۆیان دوورنەگرت لە شەڕی ئێوە، وە ئاشتییان بۆ ئێوە پێشان نەدا، وە دەستی خۆیان نەگێڕایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئیعلانی جەنگیان کردو دەستیان لە ئێوە نەپاراست، وە چوونە بەرەی دوژمنەکانتانەوە، ﴿فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ﴾، ئەوانە بیانگرنو بیانکوژن لە هەر شوێنێ بەر پەلتان کەوتن، ﴿وَأُولَٰئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾، وە بۆ ئێوە بەڵگەیەکی ئاشکرامان لەسەر ئەوانە داناوە، واتە: بەڵگەیەکی ئاشکراتان بەدەستەوەیە کە لە دژیان بجەنگن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە شەریعەتی خوا لەسەر بناغەی بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا نەبێ، ڕێگا نادات بە مسوڵمانان بجەنگنو، ڕێگا نادات کەسێك بکوژن خوێنیبڕێژن، مەگەر بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان بەدەستەوە بێ، کە ئەوە کافرێکە سەنگەری لێگرتوونو دژایەتیی یان دەکات، لە سووڕەتی (الأنفال)دا خوای پەروەردگار لە باسی ئەوانەدا کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە، دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾، واتە: وە ئەگەر مەترسی پەیمان شکاندنت لە کۆمەڵێك هەبوو، دەبێ پەیمانەکەیان بدەیەوەو بە ئاشکرا پێیان ڕابگەیەنی، ئنجا بۆتان هەیە کە لەگەڵیاندا بجەنگن، چونکە خوای بەرز خائینەکانی خۆشناوێن، واتە: ئەگەر لەگەڵ کەسانێکدا پەیمانتان هەبوو با ئەوانیش پەیمانیان شکاندبێ، ئێوە بۆتان نیە یەکسەر ئیعلانی جەنگ بکەن، هەتا ئەوان بە ڕواڵەت بڵێن: پەیوەستین بە پەیمانەکەوە، دەبێ پێیان بڵێین: ئێوە چەندان جار پەیمانتان شکاند بە پەنهانیی، هەرچەندە ئاشکرای ناکەن، ئێمە ئەوە ئاگادارمان کردوونەتەوە کە پەیمانمان لە نێواندا نەما، ئنجا مسوڵمانان بۆیان هەیە بە چاوی دوژمن تەماشایان بکەن، وە مامەڵەی

دوژمنكارانەیان لەگەڵدا بكەن، بۆچی؟ بۆئەوەی كە نامسوڵمانان، مسوڵمانان تۆمەتبار نەكەن بەوەی كە بێ بەڵێنو بێ پەیمانن.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَئًا﴾، باسی كوشتنی بە ئانقەست دەكات، دەفەرموێ: هیچ بڕوادارێك بۆی نیە بڕوادارێك بكوژێ، مەگەر بە هەڵە، دیارە ئێمە لە سوورەتی (البقرة) لە تەفسیری ئایەتی (١٧٩)دا باسی كوشتن (قَتْل)مان كرد، ئێستاش دەڵێین: پێویستە بزانرێ كە سێ جۆرە كوشتن هەنو، تۆڵە تەنها ڕوو لە یەكێكیان دەكات، كە بریتین:

یەكەم: كوشتنی بە ئانقەست (عَمْد).

دووەم : كوشتنی بە هەڵە (خَطَأ).

سێیەم: كوشتنی بە ئەنقەست چوو (شِبْهَ عَمْد).

ئنجا با پێناسەی ئەم سێیانە بكەین:

یەكەم: (القَتْلُ العَمْد): كە (العَمْد المحض)یشی پێدەگوترێ: ئاوا پێناسە كراوە: (وَهُوَ أن يَقصِد مَن يَعلَمُهُ مَعصوماً بِمَا يَقتلُ غالِبَاً)، ئەوەیە كە بابای بكوژ بە شتێك كە بە زۆریی ئینسانی پێ دەكوژرێ، نەفەرێك بكاتە ئامانج كە نابێ بكوژرێو خوێنی پارێزراوە، سەرەنجام بیكوژێ، كەواتە:

١) ئامرازی كوشتنەكە شتێكە بە زۆریی وایە ئینسانی پێ بكوژرێ.

٢) وە كوژراو كەسێكە كە كوشتنی لەسەر نیە.

٣) وە بكوژ مەبەستیەتی بیكوژێ، واتە: بكوژ هەم ئامرازی كوژەر بەكاردێنێو، هەم نیەتی كوشتنیشی هەیەو، هەم ئەو كەسەش كە دەیكوژێ هیچ هەقی لەسەری نیەو شایستەی كوژران نیە، ئەوە كوشتنی ئانقەستە.

دووەم: (القَتْلُ شِبْهُ العَمْـد): كە (الخَطَأ العَمْـد)یشی پێ دەگوترێ: (وَهُوَ أَن يَضـرِب شَخْصَاً بِمَا لاَ يَقتلُ غالِبَاً). ئەوەیە كە بە شتێك كەسێك بكوژێ كە بە زۆریی بەو شتە خەڵك نامرێو ناكوژرێ، بۆ وێنە: گۆچانی لێدا، زللەیەكی لێدا، كە عادەت نیە خەڵك بە یەك گۆچان، یان بە یەك زللە، یان بە كەستەكە گڵێك، مرۆڤ بكوژرێ، ئەوە كوشتنی وەك ئانقەست چوویە.

سێیەم: (القَتْلُ الخَطَأ): كە (الخطأ المحض)یشی پێ دەگوترێ: (وهو أَنْ يَرمِي صَيْدَاً أَو هَدَفاً فَيُصِيبُ إِنْسَاناً بِغَيرِ عِلْمِهِ وَلاَ قَصْدِهِ)، ئەوەیە تیرێك یان فیشەكێك یان بەردێك لە نێچیرێك یاخود لە ئامانجێك بگرێ، بەڵام بە ئینسانێك بكەوێ، بێئەوەی كە مەبەستی بووبێتو بێئەوەی كە پێشی زانیبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: كوشتنی هەڵە، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا پێناسەی كوشتنی بە ئانقەست چوو (شِبْهُ العَمْد) دەكاتو دەفەرموێ: ﴿أَلاَ إِنَّ قَتِيلَ الْعَمْـدِ الْخَطَإِ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا شِبْهِ الْعَمْدِ، فِيهِ مِائَـةٌ مِنْ الإِبِلِ مُغَلَّظَةٌ مِنْهَا أَرْبَعُونَ خَلِفَةً فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا﴾ رَوَاهُ النَّسَائِي بـرقم: (٤٧٩٤)، قَالَ الشيخ الأَلباني: صَحيح لِغَيرِهِ، فـي (سنن النسائي)، واتە: ئاگاداربن كوشتنی عەمدی هەڵە، یاخود بە ئانقەست چوو، ئەوەیە كە بە قامچیی بێ یاخود بە گۆچان بێ، كە خوێنەكەی بریتیە لە سەد (١٠٠) حوشتر كە چل (٤٠)یان ئاوس بن، بەچكەیان لە زگدا بێتو شەست (٦٠)ەكەی دیكەیان تەمەنەكانیان جیاجیابێ.

بەڵام شەرعزانان دەڵێن: كوشتنی هەڵەش دوو جۆرە:

١- (خَطَأ في الفعل): هەڵە لە كردەوەدا، وەك كەسێك تفەنگ لە شتێك، لە نێچیرێك دەگرێو بە كەسێك دەكەوێ، یان مسوڵمانێك لە جەنگ تیرێك بۆ كافرێكی جەنگیی داوێ، بە مسوڵمانێك دەكەوێ، مەبەستی نیە بەڵام كردەوەی هەیە.

٢- (خَطَأ فـي القَصْد): هەڵــە لـە نیـازو مەبەسـتی نێـو دڵـدا، وەك كەسـێك شـتێك لە كەسـێك دەگریَ، كە بە دوژمنـی خۆی تێدەگات، قەصدی هەیـە ئـەو كەسـە بكــوژێ، بـەڵام دوایـی دەردەكـەوێ كـە بابایـەكی بـێ خەتایـە، كەواتە: لە مەبەستەكەی دا بە هەڵـەدا چـووە.

<u>مەسەلەی سێزدەیەم</u>: خوا ﷻ كە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾، بە پێی ئەم ئایـەتە موبارەكە، كـوژراوی بـە هەڵـە، سـێ حاڵـەتی هـەن، یان كەسـێك كە بە هەڵە دەكوژرێ، سـێ حاڵەتی هـەن:

<u>یەكـەم</u>: مــسوڵمانێكە لــەنێو مــسوڵماناندا، ئــەوە كەفارەتەكــەی: ئــازادكردنی كۆیلـەیەكـە، وە خوێنـێكە كە دەبێ تەسلیم بە كەسوكاری بكـرێ.

<u>دووەم</u>: مــسوڵمانێكە لـەنێو دوژمنــان دایــە، ئــەوە خــوێنی نیـەو كەفارەتەكـەی تەنیـا ئـازادكردنی كۆیلـەیەكـە.

<u>سێیەم</u>: بابایەكی هـاوپەیمانە، واتـە: مـسـوڵمان نیـە، بـەڵام لەگـەڵ كەسـانێكـە كــە لەگــەڵ مــسوڵماناندا هاوپــەیمانن، ئــەوە هــەم خــوێنی هەیــە، هــەم كەفارەتیشـی هەیـە، كە ئازادكردنـی كۆیلـەیەكـە.

<u>مەسـەلەی چواردەیـەم</u>: خـوا ﷻ كـە دەفـەرموێ: ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾، خـوای زانـاو شـارەزا زانیـویەتی كاتێـك دێ ئیـسلام كۆیلایـەتیی ناهێڵـێ، ئیـسلام بناغەیـەكی دانـاوە بـۆ بنـەبڕكردنو ڕیشەكێـشكردنیو كاتێك دێ نامێنــێ[1]، بۆیـە بـە دیلی بۆ دانـاوە، لـە هەموو

١) وەك پێشتـر لە باسێكی سـەربەخۆدا خسـتمانە ڕوو.

حاڵەتەكـــاندا بەدیلـــی دانـــاوە، بـــۆ كـــەفارەتی ظیهـــار بەدیلـــی دانـــاوە، بـــۆ كەفـــارەتی كوشـــتن بەدیلـــی دانـــاوە، بـــۆ كـــەفارەتی ســـوێند بەدیلـــی دانـــاوە، لێرەشـــدا دەفـــەرموێ: كەســـێك كۆیلـــەی چـــنگ نەكـــەوت، ﴿ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ ﴾، بە ڕۆژووبوونی دوو مانگی لەسەر یەكی لەســەرە، واتە: دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژووبێ، زانایان لێرەدا لەبارەی بەدوای یەكدا هـاتن (تتـابع)ی ڕۆژووەكـان، زۆریان قسـە كـردوە، چونكە جاری وایە كەسێك شوفێرەو سـەیارە لـێدەخوڕێ، نەفەرێكی لەدەست دەكوژرێ بێئەوەی مەبەستی بووبێ، كە دیارە لەلای خوا گوناهبار نیە، مادام كەمتەرخەمیی لە خـۆی و لـە سـەیارەكەیدا نەبووبێ، بـەڵام كـەفارەتی هەیـە، كەفارەتەكەی ئەوەیە كە كۆیلەیەك ئازاد بكات، وە ئەگەر نەبوو، وەك ئـەم ڕۆژگارە، دەبێ دوو مانگ لەسەر یەك بـەڕۆژووبێ، جا وەك گوتم: زانایان لەوبارەوە زۆریان قسـە كردوە، لە كتێبـە شـەرعییەكاندا زۆر باسكراوە، وە ڕاجیـایی زۆریشـی لەســەرە، كە ئایا بە دوای یەكدا هاتنی دوو مانگە ڕۆژەكە چۆنـە؟

بـەڵام ئـەوەی مـن بـۆم دەركـەوتوە بـە كـورتیی ئەوەیـە: كـە هـەموو ئـەو عـوزرانەی مرۆڤ بـۆی هـەیە ڕۆژووی ڕەمەزانیـان پـێ بـچوێنێ، بۆشـی هەیـە ئـەو ڕۆژووگرتنەشیان پـێ بپسـێنێ، واتـە: خـوای بـە بـەزەیی كـە دەفـەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ...﴿١٨٤﴾ ﴾ البقـــرة، واتـە: ئەگـەر یـەكێك لـە ئێـوە نـەخۆش بـوو، یـان لـە سـەفەر بـوو (بـۆی هەیـە ڕۆژووەكـانی ڕەمـەزان بخـوات) دوایـی چـەند ڕۆژێكـی دیكـە بـە قـەدەر ئـەوە بگرێتـەوە لـە مانگەكانی دیكـە، واتـە: وەك چۆن بـە نەخۆشـیی و بـە سـەفەر چوون، هۆكارن بۆئـەوەی ئینسـانی مسـوڵمان لە ڕەمەزانـدا بـەڕۆژوو نەبـێ، ئـەو دوو مـانگ بەڕۆژووبوونـەش، بـە هەمـان شـێوەیە، ئەگـەر مرۆڤ نـەخۆش بـوو، یـان بـە سـەفەر چـوو، بـۆی هەیـە، یـاخود ئـافرەت دەكەوێتـە زەیـستانییو حەیـزەوە، ئەوانـە بـە عـوزر دادەنـرێن، ئەگـەرنا نابـێ ئـەو دوو مانگـە بپسێنرێتەوە، وە ئەگەر كەسێك بە ئانقەست لەو دوو مانگە ڕۆژێكـی خـوارد،

دەبێ دووبارە دوو مانگ لەسەر یەك بگرێتەوە، یانی: نەك ئەو ڕۆژە بەڵكو دوو مانگ لەسەر یەك، چونكە خوا دەفەرموێ: دوو مانگی بە دوای یەكدا، بەڵام ئەگەر عوزرێكی هەبوو، وەك چۆن لە مانگی ڕەمەزاندا بۆی هەیە بە هۆیەوە ڕۆژوو بچوێنێ، بە هەمان شێوە ئەوەشی بۆ هەیە.

**مەسەلەی پازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ﴾، خوێنێكی تەسلیمكراو بە كەسوكاری، وشەی: (دِيَة) واتە: (خوێن)، كوردەواریی خۆمان (خوێن بەها)ی پێ دەڵێن، واتە: ئەو پارەو تۆڵەیەی كە دادەنرێ لە جیاتی ئەوە كە ئەو نەفەرەی كوشتوە.

## سزای كوشتنی بەهەڵە

لەوبارەوە پێویستە ئێمە چەند شتێك بزانین:

**یەكەم:** كوشتنی هەڵە دوو سزای هەن: خوێنو كەفارەت، خوێن بداتو، دوو مانگیش بەڕۆژوو بێ، بەڵام سزای سێیەم كە بریتیە لە كوشتنەوە (قصاص) لەسەری نیە، چونكە ئەوە تایبەتە بە كوشتنی ئانقەستەوە، وە ئەمە یەكدەنگیی زانایانی لەسەرە، كە بكوژی كوژراوی بە هەڵە، تۆڵەی لەسەر نیە، وە ئەوە تایبەتە بە كوشتنی بە ئانقەستەوە (القَتْلُ العَمْد)، وەك خوای دادگەر باسی دەكاتو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَـٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾﴾الإسراء، واتە: هەر كەسێك بە ستەملێكراویی كوژرا، (بە ئانقەست كەسێك دەستدرێژیی كردە سەری) ئەوە بۆ كەسوكارو سەرپەرشتیارەكەی دەستەڵاتمان داناوە، با زێدەڕۆیی نەكات لە كوشتندا، چونكە سەرخراوە، واتە: لەلایەن خوای بالادەستەوە سەرخراوەو پشتگیریی لێكراوە.

دووەم: ئەو خوێنە كە دەكەوێتە سەر بكوژی كوشتنی هەڵە، تەنیا ناكەوێتە سەر خودی خۆی، بەڵكو دەكەوێتە سەر خزمەكانی پشتێی، كە بە عەرەبی پێیان دەگوترێ: (عَاقِلَة)، وە پێشیان دەگوترێ: (عَصَبَةُ)، واتە: دەبێ خزمانی پشتێ ئەو خوێنە بدەن، نەك تەنیا خۆی، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ اقْتَتَلَتْ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى بِحَجَرٍ فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ، وَقَضَى بِدِيَةَ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٩١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٦٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٥٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٠٢٠)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: دوو ئافرەت لە هۆزی هوزەیل بەشەڕ هاتن، یەكێكیان بەردێكی بەویدیكە دادا، ئافرەتەكەشی كوشتو ئەو كۆرپەیەی كە لە سكیشی دابوو، كوشتی، (دیارە ئافرەتەكە كۆرپەی لە سكدا بووە) چوونە لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: خوێنی كۆرپەكەی كە لە سكی ئافرەتەكە دابووە، دەبێ كۆیلەیەك بێ (جا كۆیلەیەكی پیاو، یان ئافرەت بە مەرجێك دەبێ سپی پێست بێ)[1]، وە خوێنی ئافرەتەكەش لەسەر خزمانی ئافرەتە بكوژەكەیە، نەك تەنیا ئافرەتە بكوژەكە خۆی.

پێناسەی (عَاقِلَة): {وال(عَاقِلَة) القَرَابَاتُ مِنْ قِبَلِ الأَب وَهُم عَصَبَة وَهُم الَّذينَ كَانوا يَعْقِلُون الإبلِ عَلَى بَابِ وَلِي المَقْتُول وَسُميت الدية عَقْلاً تَسْمِية بالمَصْدَر، لأن الإبل كَانَت تُعْقَلُ بِفنَاءِ ولي المَقْتُول ثُمَّ كثرُ الإستعمَال حَتَّى أُطْلِقَ العَقْلُ عَلَى الديةِ وَلَو لَمْ تَكُن إبلاً}[2]، واتە: (عَاقِلَة) خزمانن لەلای بابەوە، واتە: خزمانی پشتێ، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چونكە دەهاتن حوشتریان دەبەستنەوە لەبەر دەرگای ئەو كەسە كە

---

١) وادیارە ئەوكاتە كۆیلەی سپی پێست نرخی زیاتر بووە، نەك پێغەمبەر ﷺ جیاوازیی بخاتە نێوان مرۆڤی سپیو ڕەشەوە، با كۆیلەش بێ.

٢) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٣٥٨).

لێی کوژراوە، لەوەوە بە دییە گوتراوە (عَقل) چونکە حوشترەکان لەوێ بەستراونەوە، جا دوایی بەگشتی بۆ خوێن بەکارهاتوە، نەك بە تەنیا بۆ ئەو حوشترانەی کە لەبەر دەرگا دەبەسترێنەوە.

سێیەم: ئەگەر بابای بکوژ (عَاقِلة)ی نەبوو، واتە: خزمی پشتێی نەبوون کە خوێنەکەی لە جیاتی بدەن، یاخود هەژار بوون، ئەوە خوێنەکە دەکەوێتە سەر خەزێنەی دەوڵەت، وەك (جمال الدين القاسمي) هێناویەتی[1].

چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو خوێنە وەك میرات لە نێوان میراتگرانی کوژراوەکەدا دابەش دەکرێ و، خوێنەکە دەدرێ، هەمان حوکمی میراتی هەیەو، وەك دابەشکردنی میرات دابەش دەکرێ.

پێنجەم: ئەندازەی ئەو خوێنە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: سەد (١٠٠) حوشترە، وەك لەم دەقەدا هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ كِتَاباً وفِيهِ: «إِنَّ فِي النَّفْسِ الدِّيَةَ، مِائَةً مِنَ الإِبِلِ (وَفِيه) وَعَلَى أَهْلِ الذَّهَبِ أَلْفُ دِينَارٍ﴾ أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٤٨٥٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٥٥٩)، وَاخْتَلَفُوا فِي صِحَّتِهِ، وضَعَّفَهُ الشيخ الألباني)، واتە: پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نووسیوە بۆ خەڵکی یەمەن فەرموویەتی: هەر کەسێك کەسێکی کوشت دییەی لەسەرە، کە بریتیە لە سەد حوشتر، وە هەر لەو نووسراوەدا هاتوە، فەرموویەتی: ئەوانەی زێڕیان هەیە، دەبێ هەزار دیناری زێڕ بدەن، هەزار لیرە.

ئنجا هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أنهُ فَرَضَ فِي الدِّيَةِ عَلَى أَهْلِ الإِبِلِ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَعَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ، وَعَلَى أَهْلِ الشَّاةِ أَلْفَيْ شَاةٍ، وَعَلَى أَهْلِ الْحُلَلِ مِائَتَيْ حُلَّةٍ﴾ أَخْرَجَهُ

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٣٥٨).

أَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٥٤٣) وَضَـعَّفَهُ الألبـاني فـي (إرواء) بـرقم: (٢٢٤٤)، واتــە: جابیـر خوا لە خـۆیو بابی ڕازی بـێ لە پێغـەمبـەرەوە ﷺ دێنـێ، كـە فـەڕزی كـردوە لـە خـوێن: ئەوانـەی حوشتـریان هەبـێ، سـەد حوشتـر، وە ئەوانـەی مانگایان هەبێ، دوو سـەد مانگا، وە ئەوانـەی مـەڕیان هـەبـێ، دوو هـەزار مـەڕ، وە ئەوانـەی كـە جلوبەرگیـان هـەبـێ، دوو سـەد پۆشـاك (دیـارە ئـەو كاتـە ئـەو جلوبەرگـانە شتێكی دیاریكـراو بوون).

بـەڵام لـەوبارەوە ڕاجیـایی هەیـە، كـە ئایا لـە جیـاتی ئـەو سـەد حوشتـرە، دروستە هـەزار دینـاری زێـڕ بـدرێ؟ كـە ئـەو كـاتە دینـار بـووە، یـانی هــەزار مـسـقاڵ زێـڕ، یـاخود دوازدە هـەزار دەرەم زیـو، یـاخود دە هـەزار دەرەم، كـە هەندێك لە زانایان دەڵـێن: دەگونجـێ لـە جیاتی حوشتـرو مانگاو مـەڕو بـزن، زێڕو زیو، یاخود پارەی دیكە وەربگیـرێ.

(إبـنُ الـمُنذر) دەڵـێ: (ديـةُ الْحُـر الـمُسْلِمِ مِائَـةُ مِنَ الإبْـلِ فـي كُـلّ زَمَـانِ كَمَا فَرَض رَسُـولُ اللَّـه)[1]، واتە: خوێنی مـسوڵمانێكی ئـازاد بریتیـە لـە سـەد حوشـتـر، لـە هـەر ڕۆژگارێكـدا پێغەمبـەری خـوا وای پێویـست كـردوە، ئەمـە قسـەی (إبنُ الـمُنذر)ە، بەڵام بەڕاستیی ئـەوەی كـە لەگـەڵ واقیـع دەگونجـێ، وە لەگەڵ ڕووحی شـەریعەتدا دەگونجێ، وە من پێمـوایە ئـەوە بەڵـگە نەویستە كـە ئەو سەد حوشتـرە، یاخود ئەو دوو هەزار سەر مەڕە، یان ئەو دوو سەد مانگایـە، یـاخود ئـەو زێـڕە، یـان ئـەو زیـوە، پێویـسـتە بـە پـارەو دراوی ئـەو ڕۆژگــارەی ئێـسـتای ئێمــە: دینـارە، دۆلارە، تمەنــە، لیــرەی توركییــە، ماركــە ... هتــد، بخەملێنرێ، وە لەگەڵیدا بەرانبەر دەكرێتەوە، گرنگ ئەوەیـە ئـەو نرخــە بـایی سـەد حوشـتـر بـێ، یان بایی دوو هەزار مەڕ، یان بایی دوو سەد سەر مانگا بـێ، شـایانی باسیـشە لـەبارەی تەمـەنی حوشتـرەكانیـشەوە، ڕاجیــایی هــەیەو لـە كـتێبە شـەرعییەكاندا وردەكارییەكان خراونــە ڕوو.

---

١) جامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (١٧٦).

**مەسەلەی شازدەیەم:** زانایان لەوبارەوە کە ئایا (قتل) تەنیا دوو جۆری هەیە، کوشتنی بە ئانقەست (القَتْلُ العَمْد)و کوشتنی بە هەڵە (القَتْلُ الخَطَأ)، یاخود سێ جۆرە، وێڕای: (عَمْد) و (خَطَأ) جۆرێکی دیکەش هەیە بەناوی (شِبه العَمْد) واتە: بە ئانقەست چوو؟

هەندێکیان دەڵێن: تەنیا دوو جۆرە قەتڵ هەیە، یان ئانقەستە، یان هەڵەیە.

زۆربەی زانایانیش دەڵێن: سێ جۆرە قەتڵ هەیە، قەتڵی سێیەم لە سەرێکەوە بە قەتڵی ئانقەست دەچێ، لە سەرێکیشەوە بە قەتڵی هەڵە دەچێ، کە ئەویش پێی دەگوترێ: (شِبه العَمْد)، یان پێشی دەگوترێ: (الخَطَأ العَمْد)، واتە: هەڵەی ئانقەست، یاخود وەك ئانقەست چوو.

هەڵبەتە زۆربەی زانایان وەك گوتم، ڕایان وایە کە کوشتن (قتل) ئەو سێ جۆرەی هەیە، کە دیارە بۆچی دابەشی دەکەن بۆ دوو جۆر، یان بۆ سێ جۆر، ئەوە لە جۆری سزایەکەدا جیاواز دەبێ، زۆربەی زانایان کە: (الشعبي والحَكَم وحمّاد والنخعي وقتادة و سفيان الثوري وأهل العراق والشافعي)یان لەنێودانو لە (عُمَر) و (عَلي)یشەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێن: وێڕای (القَتْلُ العَمْد) و (القَتْلُ الخَطَأ)، (شِبه العَمْد)یش هەیە، (شِبه العَمْد) ئەوەیە کەسێك بە شتێك کە عادەت نەبێ خەڵك بکوژێ لە کەسێك بداتو سەرەنجام بمرێ، کە زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە، دەڵێن: (الضرب مقصود والقتل غير مقصود) لێدانەکەی مەبەستە، بەلاّم کوشتنەکەی مەبەست نیە، واتە: بە شتێك لێیداوە کە عادەت نیە خەڵك بەوە بکوژرێ، بۆ وێنە: کەس بە مستێك، یا زللەیەك، یان بەردێکی گچکە، یان بە پارچە دارێکی گچکە، دەکوژرێ؟ نەخێر، ئەوە پێی دەگوترێ: (قتل شِبه العَمْد)، کە لە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خواش دا ئاماژە بەو جۆرە کوشتنە کراوە:

یەکـەم: ﴿أَلاَ إِنَّ دِيَـةَ الْخَطَـإِ شِبْهِ الْعَمْدِ مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَـا مِائَـةٌ مِنَ الإِبِلِ مِنْهَـا أَرْبَعُـونَ فِـى بُطُونِهَـا أَوْلاَدُهَـا﴾ أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٥٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٧٩٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٢٧)، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا؛ وَحَسَّنَهُ الأَلباني في(صَحيح سُنن ابْنُ مَاجَه) برقم: (٢١٢٧)، واتە: ئاگاداربن کوشتنی عەمدی هەڵە، یاخود بە ئانقەست چوو، ئەوەیە کە بە قامچیی بێ، یاخود بە گۆچان بێ، کە خوێنەکەی بریتیە لە سەد (١٠٠) حوشتر کە چل (٤٠)یان ئاوس بن، بەچکەیان لە زگدا بێتو، شەست (٦٠)ەکەی دیکەیان تەمەنەکانیان جیاجیا.

دووەم: ﴿العَمْدُ قَوَدُ اليَـدِ وَالْخَطَأ عقل لا قَـود فِيـهِ، وَمَـنْ قَتَـلَ فِـي عَمِيَّـة بِحَجَـرٍ أَو عَـصَا أَو سَـوْطٍ، فَـهُوَ دِيَـةٌ مُغَلَّـظَةً فِي أَسْنَانِ الإِبِـلِ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٤٥٤٠)، وَابْـنُ مَـاجَهْ بـرقم: (٢٦٣٥)، عَنِ ابْنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، وَصَحَّحَهُ الأَلبـاني)، واتـە: کوشـتنی بـە ئانقەسـت، تۆڵـەی لەسـەرە، دەسـت بـە دەسـت، وە هەڵـە خـوێنی لەسـەرە، بـەڵام کەسـێك بـە شێوەیەکی لێڵ بکوژرێ، تۆڵـەی لەسـەر نیە، وەك: کەسێك بـە بـەردێك، یان بـە گۆچانێك، یـان بـە قامچییـەك بکـوژرێ، ئـەوە خوێنێکـی گـەورە (دِيَـةً مُغَلَّظَـةً)یـە، کـە لـە تەمـەنی حوشتـرەکاندا فـەرق دەکات، وە شـەرعزانان لەوەشدا تا ڕاددەیەك ڕاجیـایی یان هـەیە.

سـێیەم: ﴿عَقْـلُ شِـبْهِ الْعَمْـدِ مُغَلَّـظٌ مِثْـلُ عَقْـلِ الْعَمْـدِ وَلاَ يُقْتَـلُ صَـاحِبُهُ﴾ أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٦٧١٨)، وأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٥٦٥)، الـدَّارَقُطني بـرقم: (٣١٢٠) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِـيهِ عَنْ جَدِّهِ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا، وَحَسَّنَهُ الأَلبـاني: في (صَحيح سُنن أبي داود)، واتـە: خـوێنی وەك ئانقەست چوو (مُغَلَّظٌ)ە، (واتە: خوێنەکەی قورسـتـرە، لـە خـوێنی ئاسـایی، وەك کەسێك کە بە ئانقەست کەسـێك دەکـوژێ)، بـەڵام خاوەنەکـەی لـە تۆڵە چاوپۆشـیی دەکاتو دەگوازرێتەوە بۆ خوێن، دیارە خوێنـەکەی قورسـەو فـەرق دەکـات

لـە تەمـەنی حوشتـرەکاندا، یـاخود لـەو پـارەیەدا کـە لـە بەرانبـەری حوشتـرەکاندا دەدرێ، بـەڵام خاوەنەکـەی نـاکوژرێ، ئـەوە بەنـسبەت ئـەوەی کە لەسـەر ڕای زۆربەی زانـایان قەتـڵ دابـەش دەبـێ بۆ سـێ جۆر.

**مەسـەلەی حەڤدەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾، دوای ئـەوەی باسـی خـوێن دان دەکـات، وە پاشـان باسـی کەفارەت دەکات کە ئـازادکـردنی کۆیلـەیەکە، یاخود لـە جیـاتی ئـەوە دوو مـانگ بـەڕۆژوو بوونـە، دەفەرموێ: ﴿ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، واتـە: وە خـوا بـەهۆی دانـی خوێنـەوە، وە بەهـۆی ئـەو کەفارەتـەوە، تۆبـە لـە کەسـێك کـە بـە ئانقەست نـا، بەڵـکو بـە هەڵـە کەسـێکی کوشـتوە، قبـووڵ دەکـات، بۆچـی؟ چـونکە بەڵـێ ڕەنگـە لـە بـەینی خـۆیو خـوادا گوناهبـار نەبـێ، بـەڵام بۆئـەوەی خەڵـك دووربینیی (إحتیـاط) بکـات، تـاکو بـە هەڵـەش خەڵـکیان لـە دەست نەکـوژرێ، بۆیـەش خوای پەروەردگار وشەی تۆبـەی بـەکارهێناوە، چـونکە دەبینـی جۆرێـك کەمتەرخەمیی خۆی تێدا هەیـەو ئەگەر کابرا زیـاتر دووربینـی بکـات، ڕەنگـە تووشـی کوشتنی بە هەڵە نەبێ، بە هەرحـاڵ ئـەو خوێن دانو ئـەو کەفـارەتە، کـە ئازادکردنـی کۆیلەیـەك بـۆ کـاتی خـۆیو، ئێـستا دوو مـانگ لەسـەر یـەك بەڕۆژووبوونـە، دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە خـوا لـەو کەسـە خۆشـبێ، واتـە: هـەم هـەقی دنیـای لەسەر نامێنـێ، هـەم هـەقی قیـامەتیش.

**مەسـەلەی هـەژدەیەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ ﴾، ئـەوە بـە نـسبەت کەسـێك ئیمانـدارێك بەهـەڵە بکـوژێ، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ﴾، وە ئەگەر بابـای کوژراو لـە کۆمەڵـێك بـوو، کـە لـە نێـوانی ئێـوەو ئەوانـدا پـەیمان

هـــەبوو، ئـــەوە خوێنێـــك تەســـلیم بـــە كەســـوكاری دەكـــرێ، وە كۆیلەیـــەكی ئیمانـداریش ئـازاد دەكـرێ، وەك دەبینیـن خـوای كاربەجـێ سـزای كەسـێك كـە ئیمانـدارێك بـە هەڵـە دەكـوژێ، یـاخود كـافرێك بـە هەڵـە دەكـوژێ، بـەلاّم كـافرێكی هاوپـەیمان، سـزایەكەی وەك یەكـە؟ لێـرەدا بەشـێك لـە زانایـان ڕایـان وایــە: كــە خــوێنی ئینســانی كــافر، واتــە: كــافری هاوپــەیمان (ذمـي) خــوێنی مــسوڵمان، یەكـسانن، هەڵبەتـە هـەر ئەوانـە ڕاشـیان وایـە، وەك چـۆن ئەگـەر كەســـێك مـــسوڵمانێك بـــە ئانقەســـت بكـــوژێ، پێـــی دەكوژرێتـــەوەو تۆڵـــەی وەردەگیـرێ، بە هـەمان شـێوەش ئەگـەر نامـسوڵمانێكی هاوپـەیمانیش بكـوژێ، كە لەنێو دەوڵـەتی ئیسـلامییدا بێ، پێی دەكوژرێتـەوە، بەلاّم وەك لە تەفسـیری سـووڕەتی (البقـرة)دا باسمان كـرد، لێـرەدا بـاس باسـی خوێنـــە، واتـە: خـوێنی كوشـتنی بـە هەڵـــە، هـی مـسوڵمان بـێ، یـان هـی نامـسوڵمان، خوێنەكەی وەك یەكـە، هەڵبەتـە لێـرەدا زانـایان ڕاجیـایی یـان هـەیە، بـەلاّم هەندێكـیان ڕایـان وایە، وە بەڕاستیی منیش پێمـوایە كە ئـەم ئایەتـە مادام خـوای كـاربەجـێ لـە یـەك ئایەتـــدا، وە لـە یـەك سـیاقدا باسـی خوێنـــی كوشـــتنی مـــسوڵمانێكی بـە هەڵـــەی كـــردوە، وە كوشـــتنی كافرێكی خـــاوەن پەیمـــانی بـە هەڵەی كـردوە، وە بـۆ هەردووكیـشـیان دەفـەرموێ: ئـازادكردنی كۆیلەیـــەك، لەگـەڵ دانـی خوێـــن، هەردووكیـــان وەك یەك، كەواتە: ئەم ئایەتـە پێمـوایە بەڵـگەیەكی زۆر بەهێـــزە لەوبارەوە كە خوێنـــی مسـولّمانێك كـە بـە هەڵـە دەكـوژرێ، وە كـافرێكی خـاوەن پەیمـــان (ذمـــي)، كافرێـك كـە لـەژێر سـایەی دەوڵـەتی ئیـسـلامییدا دەژی، جـا جوولەكەیـە، نەصـــڕانیی یـە، هـەر كەســـێكی هەیـە، ئـەم ئایەتـە بەڵـگەیەكی بەهێزە لـەوبارەوە كـە هـەردووكیان خوێنیـان یەكسـانە، وە لـەوبارەوە هەنـدێك دەقی سوننەتیش هـەن، بۆ وێنـــە:

یەكـــەم: ﴿عَـنْ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اَللَّـهُ عَنْهُمَـا أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى ﷺ وَدَى الْعَـامِرِيَّيْنِ اللَّذَينِ قتَلَهما عَمْرو بن أُمَيَّةَ الضَّمريَ، وَكَانَ لَهُمَا عَهْـد مـن النَّبِـيِّ ولَـمْ يَـشعر بـه عَمْـرو، بِدِيَـةِ الْمُـسْلِمِينَ﴾ أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيُّ بـرقم:

(١٤٠٤)، وَقَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، وَقَالَ الشيخ الألباني: ضعيف الإسناد)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: دوو عامیرییەكان، (واتە: دوو پیاو كە عامیریی بوون) كە عەمری كوڕی ئومەییە هەردووكیانی كوشتبوو، وە ئەوانیش كافر بوون، بەڵام هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ بوون (بەڵام عەمر نەیزانیبوو كە هاوپەیمانن، پێغەمبەر ﷺ خوێنی ئەوانی دا، وەك هی مسوڵمانان).

دووەم: ﴿عَنِ الزُّهْرِيِّ أنها: كَانَتْ دِيَةُ الْيَهُودِيِّ وَالنَّصْرَانِيِّ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ دِيَةِ الْمُسْلِمِ، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، فَلَمَّا كَانَ مُعَاوِيَةُ أَعْطَى أَهْلَ الْمَقْتُولِ النِّصْفَ وَأَلْقَى النِّصْفَ فِي بَيْتِ الْمَالِ﴾ أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ فِي (سُنَن الكبرى) برقم: (١٦٧٨٩)، واتە: زوهریی (كە یەكێكە لە زانایانی تابیعین، وە زۆر لە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزەوە نزیك بووە خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خوێنی جوولەكە، وە خوێنی نەصرانیی لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دا، وەك خوێنی مسوڵمان بوو، هەروەها لە سەردەمی ئەبوبەكرو عومەرو عوسمانیشدا خوا لێیان ڕازی بێ، (دیارە هی عەلی باس نەكردوە، ڕەنگە زانیاریی لەبارەوە نەبووبێ) بەڵام لە ڕۆژگاری موعاویەدا، موعاویە نیوەی خوێنی كوژراوی كافری خاوەن پەیمانی تەسلیمی كەسوكاری كرد، نیوەكەی دیكەشی خستە خەزێنەی دەوڵەتەوە.

واتە: موعاویە شتەكەی گۆڕیوە، ئەگەرنا لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو ئەبو بەكرو عومەرو عوسمانیشدا خوا لێیان ڕازی بێ خوێنی خاوەن كتێبەكان، یاخود خوێنی خاوەن پەیمانەكان، با خاوەن كتێبیش نەبن، چونكە (ذمي) هەر كەسێكە پەیمانی لەگەڵ مسوڵماناندا هەبێ، وە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامییدا بژی، هاووڵاتی بێ لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، خوێنیان لەگەڵ خوێنی مسوڵمانان یەكسان بووە.

سێیەم: ﴿عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيّ ﷺ ودى ذِمِيًّا دِيَةَ الْمُسْلِمِ﴾ مَعرفة السّنن والآثار للبَيْهَقيُّ برقم: (٥١٨٦)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنی بابایەکی زیممی دا، وەك خوێنی ئینسانی مسوڵمان.

هەڵبەتە ڕایەکەی دیکەش هەندێك بەڵگە دێننەوە، کە یەکیان ئەمەیە: ﴿عَقْلُ الْكَافِرِ نِصْفُ دِيَةِ الْمُسْلِمِ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٦٩٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤١٣)، وَالدَّرَقُطنيُّ برقم: (٢٦٠)، وَالنَّسائيُّ برقم: (٤٨٠٧)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٢٨٠) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، وَقَالَ الشيخ الألباني: إِسنادُهُ حَسَنٌ)، واتە: خوێنی ئینسانی کافر نیوەی خوێنی ئینسانی مسوڵمانە، بەڵام بەڕاستیی بەڵگەی ئەوانی پێشێ بەهێزترە، مادام لە ئایەتەکەشدا خوای پەروەردگار زۆر بە ڕوونیی بۆ هەردووکیان، فەرموویەتی: ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ﴾، وە وشەی (دية)ش دیارە چەمك و واتایەکی دیاریکراوی هەیە، کە بریتیە لە سەد حوشتر، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، مانای وایە خوێنی مسوڵمان چەندە، هی نامسوڵمانەکەش مادام هاوپەیمانە، هەمان ئەندازەیە.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾، ئەم ئایەتە موبارەکە باسی سزای قەتڵی بە ئانقەست دەکات، دەفەرموێ: هەر کەسێك ئیمانداریك بە ئانقەست بکوژێ، سزایەکەی دۆزەخە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوا لێی تووڕە بووە، لەعنەتیشی لێکردوە، وە سزاو ئازارێکی مەزنیشی بۆ داناوە.

## باسێك لەبارەی كوشتنی بەئانقەستەوە

دیارە ئێمە لەبارەی كوشتنی بە ئانقەستەوە، پێویستە چەند شتێك ڕوونبكەینەوە:

یەكەم: لە دوای شیرك‌و كوفرو نیفاق، قەتڵ گەورەترین گوناهە: ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتە موبارەكە بكەین، هەروەها چەند لە ئایەتی دیكەش كە باسی قەتڵ دەكەن، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەكەوێ، بۆ وێنە: لە ئایەتی (٣٢)ی سووڕەتی (المائدة)دا كە دەفەرموێ: ﴿... مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ... ﴿٣٢﴾﴾، واتە: هەر كەسێك یەك كەس بكوژێ (دیاریشی نەكردوە ئەو كەسە مسوڵمانە، یان كافرە، یەك كەس بە ناهەق بكوژێ) یاخود ئەوەی خراپەی لەسەر زەوی كردبێ، وەك ئەوەیە هەموو خەڵكی سەر زەوی كوشتبێ، دیارە ئەو تاوانە یەكجار گەورەیە، لە دوای شیرك‌و كوفرو نیفاق، قەتڵ گەورەترین گوناهە، وەك لە ئایەتەكانی قورئان‌و فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەكەوێ، ئەگەر تەماشای ئایەتەكانی قورئان بكەین، بۆ وێنە:

١- لە ئایەتی (١٧٨)ی سووڕەتی (البقرة)دا خوای بالادەست دەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ... ﴿١٧٨﴾﴾، هەڵبەتە لێرەدا خوای بالادەست سزای قەتڵی بە ئانقەست دیاریی دەكات، كە بریتیە لە تۆڵە، واتە: كەسێك كەسێكی كوشتوە دەكوژرێتەوە، بەڵكو ئەگەر بە دە كەس، یان بە سەد كەسیش كەسێكیان كوشتبێ، بۆئەوەی خوێنەكەی بلاو بكەن، وەك كاتی خۆی لە تەفسیركردنی ئەم ئایەتە لە سووڕەتی (البقرة)دا باسمان كرد، دەبێ ئەو دە كەسە، یان ئەو سەد كەسە، هەموویان بكوژرێنەوە، وەك لە ژیانی خەلیفە عومەردا هاتوە،

خوا لـێی ڕازی بـێ، لە سەردەمی ئـەودا دە نەفـەر لە خەڵـکی (صَـنعَاءَ) گەلە کۆمەکییـان کردبوو، بە دە نەفەران، نەفەرێکیان کوشـتبوو، بۆئـەوەی خوێنـەکەی بـڵاوبـێ، وایانزانی ئەگـەر بـە دە نەفـەران بیکـوژن، تۆڵـەیان لـێ ناسـتێندرێتـەوە، عومـەر خـوا لـێی ڕازی بـێ، کە ئەو کاتە خەلیفـەی مسـوڵمانان بوو، بڕیاری دا هەر دە نەفەریان کوشـتنەوە، فەرمووی: ئەگـەر خەڵکی (صَنعَاءَ) هەموو لەسەری کۆبووبانەوەو گەلە کۆمەکییان کردبا بۆ کوشـتنی، هـەموویانم پێدەکوشـتنەوە، وە ئـەو سـزایەی شـەریعەت بـەو شێوەیە، بۆئـەوەی خوێنـی خەڵك زایـە نەبـێ.

٢- لـە ئایــەتی (٤٥)ی سـووڕەتی (المـائـدة)دا خـوای دادگــەر دەفـەرموێ: ﴿...أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ...﴿٤٥﴾﴾، واتـە: نەفـس بـە نەفـس، ئەگـەر کەسێك کەسێکی کوشـت دەکـوژرێتەوە، لێـرەدا بەگـشـتی فەرموویـەتی، وە لە ئایەتەکەی سووڕەتی (البقرة)شدا هەر بەگشتی فەرموویەتی.

٣- لـە ئایــەتی (٣٣)ی سـووڕەتی (الإسـراء)دا خـوای کاربەجـێ دەفـەرموێ: ﴿... وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾﴾، واتە: هەر کەسێك بـە ستەملـێکراویی‌و بە غـەدر کوژرا، ئەوە بۆ سـەرپەرشتیارەکەی‌و کەسـوکارەکەی دەسـتەڵاتمان داوە (شـەرع دەسـتەڵاتی داوەتـێ) بەڵام بـا زێـدەڕۆیی نـەکات لـە کوشـتندا، چونکـە سـەرخراوە، واتە: سـەردەخرێ هەتا لەسـەر هـەق بـێ، بۆی هەیـە تۆڵەی خۆی بکاتەوە، ئنجا خوای تۆڵەستێنەر سزای قیامەتیی کوشـتنی بـە ئانقەسـت، لـە چـوار بڕگــەدا بـاس دەکات، دەفـەرموێ: دەخرێتــە ئاگـری دۆزەخ، بە هەمیشـەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوا لێی تووڕە بـووەو لەعنـەتی لێکردوە، وە سـزاو ئـازارێکی مەزنیـشـی بـۆ ئامـادەکردوە، وە لێـرەدا بۆمـان دەردەکەوێ، کە بەڕاستیی سـزای تـاوانی کوشـتنی خـەڵك بـە ئانقەسـت، لـە هەموو گوناهێك گەورەترە، لە دوای شـیـرك‌و کوفـرو نیفـاق.

دووەم: خوێنی کوشتنی بە ئانقەست لەسەر خودی بابای بکوژە:

وەك گوتمان لەبەرئەوەی کوشتنی بە ئانقەست سزایەکەی بریتیە لە تۆڵە، کەواتە: خوێنەکەی دەکەوێتە سەر خودی بابای بکوژ، نەك کەسوکارەکەی، ئێمە پێشتر باسمان کرد دەربارەی کوشتنی بە هەڵە، کە خوێنەکەی دەکەوێتە سەر خزمی پشتێی بابای بکوژ، بەڵام کوشتنی بە ئانقەست دەبێ خودی بکوژ لە ماڵی خۆی خوێنەکەی بدات، ئەمە یەکدەنگیی هەموو زانایانی لەسەرە، وەك (القرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (أَجْمَعَ العُلَمَاءُ عَلَى أنَّ العَاقِلَةَ لا تَحْمِلُ دِيَةَ العَمد وأنَّها فِي مَالِ الجَانِي)[1]، واتە: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە خزمانی پشتێی بابای بکوژ خوێنی ئەو قەتڵە نادەن، بەڵکو ئەو کەسەی کە نەفەرەکەی کوشتوە، (بکوژەکە) بۆخۆی دەبێ خوێنەکە بدات، مادام تەرەفی بەرانبەر چاوپۆشییان لەوە کرد، کە بیکوژنەوە، ئەوە ئەو کاتە دەکەوێتە سەر خوێن، ئنجا ئەگەر لە خوێنەکەش عەفوویان کرد، ئەوە بۆخۆیان سەرپشکن.

سێیەم: ئایا قەتڵی ئانقەست کەفارەتی هەیە؟

پێشتر گوتمان کوشتنی بە هەڵە کەفارەتی هەیە، کە بریتیە لە ئازادکردنی کۆیلەیەك کە ئەو کاتە کۆیلە هەبوون، یاخود دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژووبێ، بەڵام ئایا کوشتنی بە ئانقەست کەفارەتی هەیە، دوای ئەوەی کەسوکاری کوژراو، بابای بکوژ دەبوورن کە بیکوژنەوە؟

زانایان لەوبارەوە ڕاجیایی یان هەیە:

١- (الشافعي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: کوشتنی بە ئانقەستیش کەفارەتی هەیە، دەبێ بابای بکوژ دوو مانگ لەسەر یەك بەرۆژووبێ.

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٢٨٨).

٢- (سُفيان الثوري و أبو ثَور، أبو حَنيفة وأصحابه) دەڵێن: نەخێر، کوشتنی بە ئانقەست کەفارەتی نیە.

٣- (إبنُ المنذِر) کە ئەویش زانایەکی بەرجەستەی سەر بە مەزهەبی شافیعییە، وە هەندێك جار وا دەردەکەوێ کە بۆخۆی ئیجتیهادی ڕەهای کردبێ، ئەویش لەسەر ئەو ڕایە کە کوشتنی بە ئانقەست کەفارەتی نیە، دەڵێ: (وَكَذَلِكَ نَقُولُ؛ لأنَّ الكَفَّارَاتِ عِبادَاتٌ وَلا يَجوزُ التَمْثِيل، وَلَيْسَ يَجوزُ لأَحَدٍ أَنْ يَفرِضَ فَرْضَاً يُلْزِمهُ عِبادَ اللَّهِ إلاَّ بِكِتَابٍ أَوْ سُنَّة أَوْ إجْمَاع، وَلَيْسَ مَعَ مَنْ فَرَضَ عَلَى القَاتِلِ عَمْدَاً كَفَارَةً، حُجَّةٌ مِنْ حَيْثُ ذَكَرَتُ)[1]، واتە: ئێمەش هەر وا دەڵێین، کە کوشتنی بە ئانقەست کەفارەتی نیە، چونکە کەفارەت (یانی: سڕینەوە، ئەو شتە دەکرێ بۆئەوەی ئەو گوناهەی لێ بسڕێتەوە لە مابەینی خۆی‌و خوادا) جۆرێکە لە عیبادەت (واتە: مامەڵەکردنە لەگەڵ خوا) وە ئەوەش قیاسی تێدا دروست نیە، (عیبادەت لەسەر دەق دەوەستێ، بەڵام لەبواری هەڵسوکەوتەکاندا دەگەڕێینەوە بۆ قیاس، بەڵام لە عیبادەتدا دەبێ چی دەقی لەسەرە لەوێ بوەستی) وە هیچ کەسێك بۆی نیە شتێك فەرز بکات‌و بەندەکانی خوای پێوە پابەند بکات، مەگەر بەڵگەی قورئان یان سوننەت یان ئیجماع هەبێ، (بەڵکو من دەڵێم: لە عیبادەتدا ئیجماعیش بەڵگە نیە‌و دەبێ حەتمەن یان قورئان، یان سوننەت بێ، چونکە بە ئیجماعیش ناتوانین جۆرێك لە عیبادەت دیاریی بکەین‌و عیبادەت دەبێ تەنیا خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریی بکەن)[2]، وە کەسێك کە لەسەر بکوژی بە ئانقەست کەفارەتی پێویست کردوە، هیچ بەڵگەیەکی لەو جۆرەی کە باسمکرد بەدەستیەوە نیە، نە بەڵگەی قورئان، نە بەڵگەی سوننەت، نە بەڵگەی ئیجماع.

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٣١).

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست، یان خستنەڕووی ڕایەکی خۆم.

**مەسەلەی بیستەمو کۆتایی**: ئایا بکوژی بە ئانقەست تۆبەی لێوەردەگیرێ یان نا؟ هەڵبەتە لێرەدا زانایان کەوتوونەتە مشتومڕێکی خەستو قووڵەوە، هەندێکیان دەڵێن: کەسێك مسوڵمانێك بە ئانقەست بکوژێ، هەرگیز تۆبەی لێوەرناگیرێ، وە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە، واتە: وەك مامەڵەی کافرو مونافیقو موشریکانی لەگەڵدا دەکرێ، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: بابای بکوژی بە ئانقەستیش، تۆبەی لێوەردەگیرێ، ئنجا با پێشێ بەڵگەی ئەوانە بێنینەوە کە دەڵێن: تۆبەی لێوەرناگیرێ:

**بەڵگەی یەکەم**: ئەو ئایەتەیە لە سوورەتی (النساء) کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾، دەڵێن: ئەوە خوا دەفەرموێ سزاکەی دۆزەخە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوا لێی تووڕە بووە، لەعنەتی لێکردوە، وە سزاو ئازارێکی مەزنی بۆ داناوە.

**بەڵگەی دووەم**: ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە دەفەرموێ: ﴿قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا﴾ أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٣٩٩٠)، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَقَالَ الشيخ الألباني: صَحيح موقوف، وَهُوَ فِي حُكْمِ الْمَرْفُوعِ، (صحيح الجامع) برقم: (٤٣٦١)، واتە: کوشتنی ئیماندار لە لای خوا لە تێکچوونی دنیا گەورەترە، یانی: کوژرانی ئیماندارێك بە ناهەق لە لای خوای بەرزومەزن، گەورەترە لە ڕووخاندنو تێکچوونی هەموو دنیا.

**بەڵگەی سێیەم**: ئەم فەرمایشتەیە: ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَوَّلُ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلاةُ، وَأَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ﴾ أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٣٩٩٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٧٤٨)، واتە: عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەمین شتێك کە بەندە

لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ (لە قیامەتدا) نوێژە، وە یەکەمین شتێك کە لە نێوان خەڵکدا دادوەریی لەسەر دەکرێ، بریتیە لە خوێن، (یانی: کوشتن).

**بەڵگەی چوارەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللَّهُ عَنْهُمَا أَنهُ سَأَلَهُ سَائِلُ فَقَالَ: يَا أَبا العَبَّاسِ هَلْ لِلْقَاتِلِ مِن تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ كَالْمُتَعَجِّبِ مِن مَسألَتِهِ: مَاذَا تَقُولُ؟ فَأَعَادَ عَلَيْهِ المَسأَلَة فقَالَ لَهُ: مَاذَا تَقُولُ ؟ مَرَّتَيْنِ أَو ثَلاثاً ثُمَّ قَالَ ابْنُ عَبَّاس: وَيْحَكَ أَنَّى لَهُ التَّوْبَة؟ سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يقولُ: يَأتِي المَقْتُولُ مُتَعَلِّقاً رَأسَهُ بإحْدَى يَدَيْهِ مُتَلَبِّبَاً قَاتِلَهُ بِيَدِهِ الأُخْرَى تَشْخَبُ أَو دَاجُهُ دَمَاً حَتَّى يُوقفا فَيَقُولُ المَقْتُولُ للَّهِ: رَبّ هَذَا قَتَلَنِي، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ لِلْقَاتِلِ: تَعِسْتَ وَيُذْهَبُ بِهِ إِلى النَّارِ﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ برقم: (٣٩٩٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة برقم: (٢٦٩٧)، واتە: پیاوێك هاتە لای عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: ئەی ئەبولعەبباس! (كە ئەوە كونیەی بووە) ئایا كەسێك كەسێك بكوژێ، ڕێی تۆبەی هەیە (واتە: بكوژی بە ئانقەست)؟ عەبدوڵلای كوڕی عەبباس بە سەرسووڕمانەوە لە پرسیاركردنەی! دووجار، یان سێ جار لێی پرسی: چی دەڵێی؟! دوایی عەبدوڵلای كوڕی عەبباس گوتی: بێ قەزابی چۆن ڕێی تۆبەی هەیە، من لە پێغەمبەرەكەتانم ﷺ بیستوە كە فەرموویەتی: بابای كوژراو ڕۆژی دوایی دێ، سەری لەسەر دەستێكیەتی، بە دەستەكەی دیكەشی كابرای بكوژ كە كوشتوویەتی گرتوویەتی، یەخەی گرتوە، وە دەمارەكانی خوێنیان لێ دەتكێ، هەتا ڕادەوەستێنرێن، بابای كوژراو بە خوای زاڵی پایەدار دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەمەبوو بە ناهەق كوشتمی، خوای بەرزیش بە بكوژ دەفەرموێ: تۆ بەدبەختی، ماڵوێرانی، وە دەبرێ بۆ نێو ئاگری دۆزەخ.

ئەمانە بەڵگەكانی ئەوانەن كە دەڵێن: كەسێك مسوڵمانێك بە ناهەق بكوژێ تۆبەی لێوەرناگیرێ.

بەڵام ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە کە دەڵێن: تۆبەی لێوەردەگیرێ، ئەوانیش چەند بەڵگەیەك دێننەوە:

**بەڵگەی یەکەم:** ئەو هەموو ئایەتانەی کە بەگشتیو بە ڕەهایی باسی لێخۆشبوونی خوا دەکەن بۆ گوناهباران، جا شیركی كردبێ، كوفری كردبێ، نیفاقی كردبێ، دزیی كردبێ، قەتڵی كردبێ، زینای كردبێ، هەرچی كردبێ، بۆ نموونە:

١- خوا ﷻ لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾، باسی سێ جۆرە گوناح دەكات، دەفەرموێ: وە ئەوانەی كە لەگەڵ خوادا پەرستراوێكی دیكە ناپەرستنو لێی ناپاڕێنەوە، وە ئەو نەفسەی كە خوا قەدەغەی كردوە، بە ناهەق نایكوژن (بە هەقی خۆی نەبێ نایكوژن)، وە زینا ناكەن، وە هەر كەسێك ئەوە بكات، (واتە: یەكێك لەو گوناهانە بكات) ئەوە تووشی گوناهو تاوانێكی گەورە بووە، وە لە ڕۆژی دواییدا سزای بۆ دوو چەندان دەكرێتەوە (بۆ چەند قات دەكرێتەوە)، وە بە ڕیسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، مەگەر كەسێك بگەڕێتەوەو ئیمان بێنێو كردەوەی باش ئەنجام بدات، ئا ئەوانە خوا خراپەكانیان بە چاكە بۆ دەگۆڕێ، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئەم ئایەتە بەگشتی باسی شیركی كردوە، باسی قەتڵی كردوە، باسی زینای كردوە، بەڵام دەفەرموێ: كە تۆبە كرا، خوا دەیسڕێتەوە.

٢- خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الزمـر)دا دەفـەرموێ: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾، واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانەی من کە دەربارەی خۆیان زێدەڕۆییان کردوە، لە بەزەیی خوا نا ئومێد مەبن، بێگومان خوا لە تێکڕای گوناهان دەبوورێ، بێگومان هەر ئەو لێبوردەی بە بەزەیی یە، کەواتە: ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە.

**بەڵگەی دووەم:** ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ، فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَمَنْ أَصَابَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَعُوقِبَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ﴾ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٧٨٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٤٣٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٤٣٩)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤١٦٢)، واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆڕێك دانیشتبووین، (کە دیارە ئەوکاتە بوو کە بەیعەتی لێوەرگرتن، لە پەیمانی دووەمی عەقەبەدا) فەرمووی: پەیمانم پێ دەدەن کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خوا، وە زینا نەکەن، وە ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە، بە هەقی خۆی نەبێ نەیکوژن، هەر کەسێك لە ئێوە پەیمانی بردە سەر، پاداشتی لەسەر خوایە، وە هەر کەسێك لە ئێوە یەکێك لەو گوناهانەی کرد، ئەگەر لە دنیادا پێی سزا درا، ئەوە بۆتە مایەی پاکبوونەوەی، وە ئەگەر یەکێك لەو گوناهانەی کردو خوا بۆی پۆشیی (واتە: لە دنیا سزا نەدراو خوا بۆی پۆشیی بوو) ئەوە کارەکەی عایدی خوایە، ئەگەر ویستی لێی دەبووری، وە ئەگەر ویستیشی سزای دەدا.

کەواتە: لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنی کە ئەگەر سزای درا، (یان ئەگەر تۆبەی کرد) ئەوە بە مسۆگەریی خوا لێی خۆشدەبێ، ئەگەرنا ڕێی تێدەچێ بەبێ تۆبەش خوا لێی ببووری.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەو قسەیەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسە خوا لێیان ڕازی بێ، ﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: أَلِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا تَوْبَةٌ ؟ قَالَ: لاَ، إِلَى النَّارُ، فَلَمَّا ذَهَبَ قَالَ لَهُ جُلَسَاؤُهُ: مَا هَكَذَا كُنْتَ تُفْتِينَا، كُنْتَ تُفْتِينَا أَنَّ لِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا تَوْبَةً مَقْبُولَةً، قَالَ: إِنِّي أَحْسَبُهُ رَجُلاً مُغْضَبًا يُرِيدُ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا، قَالَ: فَبَعَثُوا فِي أَثَرِهِ فَوَجَدُوهُ كَذَلِكَ﴾ أَخْرَجَهُ ابْنُ أبـي شـيبَه بـرقم: (٢٨٣٢٦)، واتە: سەعدی کوڕی عوبەیدە دەڵێ: پیاوێك هاتە لای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: ئایا کەسێك ئیمانداریێك بە ئانقەست بکوژێ، ڕێی تۆبەو گەڕانەوەی هەیە؟ گوتی: نەخێر، بۆ دۆزەخە، ئنجا دوای ئەوەی کە ڕۆیی، دانیشتووەکان لە مەجلیسەکەیدا گوتیان: تۆ پێشتر ئاوا فەتوات بۆ نەدەداین، تۆ پێشتر فەتوات بۆ دەداین کە کەسێك قەتڵ بکات، ئەگەر تۆبە بکات خوا تۆبەی لێ قبووڵ دەکات، گوتی: ڕاستە، بەڵام ئەم کابرایە بینیم کابرایەکی تووڕەیە، دەیویست بچێ ئیمانداریێك بکوژێ، هاتبوو فەتوا لە من وەربگرێ، ئەگەر بزانێ خوا لێی خۆشدەبێ بچێ بیکوژێ، دەڵێ: دوایی ناردیان بە دوای کابراداو پرسیاریان لێکرد، تەماشایان کرد (فیراسەتەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ) ڕاستە.

کابرا هاتبوو فەتوا وەربگرێ بۆ کوشتن، بۆیە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ بەو بارەیاندا کە قورسە وەڵامی دایەوە، تاکو قەتڵەکە نەکات، کەواتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباسیش خوا لێیان ڕازی بێ، ڕای وابووە کە خاوەنی کوشتنی بە ئانقەستیش، ئەگەر تۆبە بکات خوا لێی قبووڵ دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمان یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، کـە ئایەتـەکانی (٩٤ تـاکو ١٠٤)ن، لە سوورەتی (النساء)، لەم ئایەتانەدا خوای پەروەردگار سەرەتا بۆ جاری شەشەم، لەم سوورەتەدا، بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! وە ئامۆژگاریی یان دەکات کە لە کاتی ڕۆیشتن بۆ جەنگو جیهاددا وریابن، وە لە خەڵك بە بیانوو نەبن، وە هەر کەسێك سەلامی لێکردنو خۆی بە مسوڵمان پێشاندا ئەوانیش وەك مسوڵمان مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، نەك لەبەرئەوەی کاروانێکی پێیە، یان پارەو سامانێکی پێوە شك دەبەن، بیانووی پێ بگرن، پاشان پێیان ڕادەگەیەنێ کە بڕوادارانی دانیشتوو لە ماڵ، مادام عوزریان نەبێ، واتە: نەخۆش نەبنو کەمئەندام نەبن، بێهێز نەبن، لەگەڵ تێکۆشەرانو جەنگاوەرانی ڕێگای خوادا یەکسان نینو ناچنە تەرازوویەکەوە، بەڵکو فیداکارانی سەرو ماڵ لە ڕێی خوادا، چەندان پلەیان بەسەر دانیشتووانەوە هەیە، بەڵام دیارە ئەوانیش هەر ئیماندارن، بەس ئەو پاداشتە گەورەیان نیە، هەڵبەتە ئەوە لە حاڵێکدا کە جەنگو جیهادیان لەسەر فەرز نەبووبێو نەبووبێتە فەرزی عەین، دەنا ئەگەر بووبێتە فەرزی عەین، بە نەکردنی گوناهباریشن، پاشان خوای باڵادەست سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە بەبێ بەڵگەو پاساو لە ژێر ڕکێفی کافرانو لە ژێر سایەی شوومیاندا دەمێننەوە، لە حاڵێکدا کە ناتوانن دینداریی بکەن، وە کۆچ ناکەن بۆ شوێنێك کە بتوانن دینداریی لێبکەن، وە هەڕەشەی سزای سەختیان لێدەکات، بەڵام کەسانێکی چەوساوەو کەسانێکی بێ توانـاو

بێدەرەتان لەو حوکمانە هەڵداوێریٚو جیایان دەکاتەوە، وە ئومێدەواریان دەکات بە لێبوردنی خۆی، ئنجا باسی پاداشتو بەرهەمی قیامەتییو دنیایی کۆچکردن دەکات، کە هەر کەسێك لە ڕێی خوادا کۆچ بکات، پاداشتی قیامەتی هەیەو لە دنیادا دەرووی خێری لێدەکاتەوە، وە دوایی هەر بەو بۆنەیەوە خوا باسی کورتکردنەوەی نوێژەکان دەکات، چونکە کەسێك کە کۆچ بکاتو سەفەر بکات، بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، نوێژە چوار ڕکاتییەکان بکاتە دوو ڕکات، وە لە کاتی سەفەرو لە کاتی ترسی دوژمندا، بەڵام وەك دوایی باسی دەکەین زانایان گوتوویانە: لەبەرئەوەی ئەو کاتە زۆربەی کۆچو کۆچباریی مسوڵمانان ترسی دوژمنی تێدابووە، ئەگەرنا لە دوژمنیش نەترسیٚ، هەر بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، وە پاشان باسی نوێژی ترس دەکات کە لە کاتی ترساندا لە جەنگدا، ئەگەر مسوڵمانان ترسی دوژمنیان هەبوو، چۆن نوێژ بکەن؟ چۆنیەتییەکەی دەخاتە ڕوو، وە پاشان خوا ﷻ بە ئیمانداران دەفەرمویٚ: کە هەر کات نوێژیان تەواو کرد، واتە: نوێژی ترس، با بە پێوە بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا بکەن، وە پاشان کە کەوتنەوە حاڵەتی ئاسایی نوێژەکانیان لە کاتی خۆیاندا، هەر نوێژە لە کاتی خۆیدا، وە بەو شێوەیەش کە دیاری کراوە نوێژەکانیان بەرپا بکەن، لە کۆتاییدا خوا ﷻ بە ئیمانداران دەفەرمویٚ: کە لە لیٚ خەفتانی دوژمنیاندا سستیی نەکەن، مادام ئەوان لە ئیمانداران دەخەفتێنو زەبریان لێدەدەن، ئەوانیش با لە دوژمنانیان بخەفتێن، وە سستیی نەکەن، چونکە وەك چۆن ئەوان لە جەنگو جیهاددا تووشی ئازارو نارەحەتییو برینداریيو سەرماو گەرماو شەهیدیی دێن، کافرەکانیش بە هەمان شێوە تووشی ئازار دێن، بەڵام دیارە ئیمانداران شتێك لە خوا ئومێد دەکەنو چاوەڕێی دەکەن، کە کافرەکان ئەو ئومێدەشیان نیە، کەواتە: پێویستە ئیمانداران لە کافران خۆڕاگرترو بە زەبرتربن، وە ئارامگرتربن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ
إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ
مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ
ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٩٤﴾ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ
أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ
وَأَنفُسِهِمۡ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ دَرَجَةٗۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ
أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٖ مِّنۡهُ وَمَغۡفِرَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ
أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾
إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ
سَبِيلٗا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن
يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا
إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا
﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ
أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ
فِيهِمۡ فَأَقَمۡتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلۡتَقُمۡ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُم مَّعَكَ وَلۡيَأۡخُذُوٓاْ أَسۡلِحَتَهُمۡۖ فَإِذَا
سَجَدُواْ فَلۡيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمۡ وَلۡتَأۡتِ طَآئِفَةٌ أُخۡرَىٰ لَمۡ يُصَلُّواْ

فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کات لە ڕێی خوادا بە سەفەر چوون، بەرچاوتان ڕوون بکەنەوەو کەسێك کە سەلامتان لێدەکات (و ئاشتیی تان پێشان دەدات) مەڵێن: ئیماندار نی! کە مەبەستتان (بیانوو پێگرتنو) وەدەستخستنی تەماعوماڵی دنیابێ، ئەوە خوا سامانو دەستکەوتی زۆری لەلایە، ئێوەش پێشتر هەر وابوون، بەڵام خوا چاکەی لەگەڵتان کرد، دەجا بەرچاوتان ڕوونبکەنەوە، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە ﴿٩٤﴾ بڕوادارانی دانیشتووی ساغو سەلیمو، تێکۆشەرانی ڕێی خوا بە سامانو گیانیان، یەکسان نین، خوا تێکۆشەران بە سامانو گیانیانی، بەسەر دانیشتوواندا پلەیەك بەرز کردۆتەوە، وە بەڵێنی پاداشتی هەرەباشی بە هەموویان داوە، بەڵام تێکۆشەرانی بەسەر دانیشتوواندا بە پاداشتێکی مەزن بەرز کردۆتەوە ﴿٩٥﴾ (ئەو پاداشتەش)

چــەندان پلــەیە لــە خــواوە، وە لێبــوردنو بەزەیــی یــەکی تایبــەتە، وە خــوا لێبوردەی بە بـەزەیی یـە ﴿٩٦﴾ بێگومـان ئەوانـەی فریـشتەکان گیانیـان کێـشان، لـە حاڵێکدا کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو، پێیـان گوتـن: ئێوە لە چ حاڵێکدا بـوون، (بۆچــی کۆچــتان نــەکردو لــە ژێــر ڕکێفــی کافرانــدا مانــەوە؟) گوتیــان: ئێمــە چەوسـێنراوە بـووین لـە زەویـدا، (فریـشتەکان) گوتیـان: ئـەدی زەوی خـوا فـراوان نەبوو، کە کۆچی تێدا بکەن؟ ئـا ئەوانـە جێگای ئیـسراحەتیان دۆزەخـەو ئـەوێش خراپتــرین ســەرەنجامە ﴿٩٧﴾ جگـە لـە چەوسـێنراوانو بێدەرەتــانان لـە پیــاوانو ژنــانو منــداڵان، کــە هــیچ چارەیەك نــاتوانن (بکـەن)و بـە هـیچ ڕێیـەکیش نـازانن (لێــوەی دەربــازبن) ﴿٩٨﴾ ئــا ئەوانــە نــزیکــە خــوا لێیــان خۆشــبێ، وە خــوا لێخۆشــبووی لـێبوردەیــە ﴿٩٩﴾ وە هــەر کــەس لــە ڕێــی خــوادا کــۆچ بکــات، ئــەوە جێگــاو ڕێگــای زۆرو مــاڵو سامانی فراوانــی لـە زەویـدا چـنگ دەکـەوێ، وە هـەر کەسێك بە کۆچکـەریی بـەرەو لای خـواو پێغەمبەرەکەی لە ماڵ دەربـچێ، پاشـان مەرگــی بگاتــێ، ئـەوە بێگـومان پاداشـتی لەسـەر خوایـە، وە خـوا لـێبـوردەی بـە بـەزەیی یــە ﴿١٠٠﴾ وە (ئــەی بڕوادارینــە!) هەرکــات بــە زەویــدا ڕۆیــشتن، ئەگــەر ترســان ئەوانەی بێبــڕوان ئازارتــان بـدەن، گوناهتـان ناگـات ئەگـەر لـە نوێژەکـەتان کــورت بکــەنەوە، بێگومــان بێبــڕوایان دوژمنێکــی ئاشــکراتانن ﴿١٠١﴾ وە هــەر کــات تۆیـان لەگـەڵ بووی (و لە کاتی ترسـان لـە دوژمنـدا) نوێـژت بـۆ بەرپاکـردن (ئـەوە بیــانکە بــە دوو کۆمــەڵو) بــا کۆمەڵێکــیان لەگــەڵت ڕاوەســتن (بــۆ نوێــژ) وە بــا (هەموویـان) چەکەکانیان پـێ بـێ، جا هـەر کـات (کۆمەڵـە ڕاوەستاوەکە بـۆ نوێـژ) سـەجدەیان برد (وە ڕکاتەکەیان تەواو کرد) با کۆمەڵێکی دیکە بێن، کە نوێـژیــان نەکـردوەو با نوێـژت لەگـەڵ بکـەن، وە با وریـابنو چـەکەکانیان پــێ بــێ، ئەوانـەی بێبــڕوان حـەز دەکەن کـە لـە چەکەکانتــانو کـەلو پەلـەکانتان بێئــاگابن، ئنجا بـە یەکجار هێرشـتان بکـەنە سـەر، وە ئەگـەر بـە هـۆی بارانــەوە ئـازارێکـتان هـەبوو،

یـان نەسـاغ بـوون، گوناهتـان ناگـات کـە چەکەکانتـان دابنـێن، بـەڵام وریـابن مسۆگەر خـوا ئـازارێکی ڕیسواکەری بـۆ بێبـڕوایان ئامادە کردوە ﴿١٠٢﴾ ئنجا هەر کات نوێژەکەتان تـەواو کـرد، بەپێـوەو بـە دانیشتنەوەو لەسـەر تەنیشـتتان یادی خوا بکـەن، جـا هـەر کـات هێمـن بوونــەوە (و ترسـتان نـەما لـە دوژمنتـان) ئـەوە (وەك حاڵـەتی ئاسـایی) نوێـژ بەرپـا بکــەن، بێگومـان نوێـژ لەسـەر بـڕواداران لـە چەنـد کاتێکی دیاریکـراودا پێویسـت کراوە ﴿١٠٣﴾ وە لە لێخەفتانی خەڵکی (کافری دوژمنتان)دا سسـتیی‌و بێهـێزیی مەکەن، چونکە ئەگەر ئێوە ئێشـتان پێدەگات، ئەوە بێگومان ئـەوانیش وەك ئێوە ئێشـیان پێدەگات، وە ئێوەش ئومێدێکـتان بـە خوا هـەیـە (وە چاوەڕوانییەکتان هەیە) کـە ئـەوان ئـەو ئومێدەیـان نیـە، وە خـوا زانـای کـاربەجێیـە ﴿١٠٤﴾)).

## شـیکـردنـەوەی هـەندێـك لە وشــەکان

(﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾): واتـە: ڕوونبکـەنەوە، یـاخود سـاغیی بکەنـەوە، یـان سـەرنج بـدەن، (فَتَبَيَّنوا: اطلبوا بَيانَ الأَمْرِ، تَحَقَّقوا) واتە: کارەکـە ڕوونبکەنـەوە، بەرچاوی خۆتان ڕوونبکـەنەوە، وە باش سـەرنج بدەن.

(﴿عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾): واتـە: ڕابـواردن، یـاخود کەلوپەلـی ژیـانی دنیـا، (العَـرَضُ: مَـا يطـرأ ويـزولُ مِـنْ مَـرض، وَنَحـوهُ، ومَتَـاعُ الـدنيا قَـلَّ أَو كَـثـر)، (عَـرَض) حاڵەتێکـە کـە بەسـەر ئینسـاندا دێ‌و تێدەپـەڕێ، وەك نەخۆشـیی، یان خـەو، وە هەروەهـا بە کەلـوپـەل‌و شـتێکیش دەگوترێ، کە ئینسـان ژیـانی دنیـای پـێ دەگوزەرێنـێ، جـا کـەم بـێ یـان زۆر، چونکـە شـتێکی کەمـەو زوو تێپـەڕە.

(غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ): واتە: ئەوانەی کە بێ زیانن، لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە نەخۆش نەبن، پەککەوتە نەبن، وە بێهێز نەبن، (الضَّرَرُ: الضِّيْقُ والعِلَّةُ تُقْعِدُ عَنِ الجِهَادِ ونَحوه)، (أولي الضَّرَر) بە مانای بێهێز دێ، بە مانای نەخۆش دێ، (ضَرَر) بە مانای تەنگیی و سەغڵەتیی و نەخۆشییەك دێ، کە ئینسان پەك بخات و ڕێی جەنگ و جیهادی لێ بگرێ، وە (أُولي) واتە: (أَصْحَاب) واتە: ئەوانەی کە خاوەن زیانن، کە مەبەست پێی ئەوەیە کەم ئەندام بن، یان بێهێزبن، یان نەخۆش بن، وە توانای جەنگ و جیهادیان نەبێ.

(حِيلَةً): (الحِيلةُ والحَوِيلة: ما يُتَوَصَّلُ بِهِ إلى حَالَةٍ مّا في خُفيةٍ)، (حِيلةُ وحَوِيلة) لە زمانی عەرەبیدا بە هەر شتێك دەگوترێ کە ئینسان بە شێوەیەکی پەنهان پێی بگاتە ئامانجێك، هەر لە کوردیشدا دەڵێن: پیاوێکی فێڵبازە، وە بە زۆریی وایە وشەی حیلەو فێڵ بۆ حاڵەتی مەزمووم و خراپە بەکاردێ، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا مەرج نیە هەر بۆ خراپە بێ، وەك عەرەب دەڵێن: (رُبَّ حِيلَةٍ أنفَعُ مِنْ قَبِيلَةٍ)، (حِيلَة) واتە: تەگبیرکردنێکی پەنهان، جا ئەگەر بۆ خراپە بێ، ئەوە خراپەو ئەگەر بۆ چاکەش بێ، چاکە.

(مُرَٰغَمٗا): (الرُّغامُ: التُّرَابُ الدَّقِيقُ، وَرَغِمَ أَنْفُ فُلاَنٍ، وَقَعَ فِي الرُّغَامِ والمراغم المَذهَب (يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ) أي مَذْهَباً يَذْهَبُ إِلَيْهِ إذَا رَأى مُنْكَراً يَلْزَمُهُ أَن يَغْضَبَ مِنْهُ) وشەی: (مراغَم) لە (رُغَام)ەوە هاتوە، (رُغَام) واتە: گڵی ورد، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (رَغِمَ أَنفُ فُلاَنٍ) واتە: هەرچەند پێی ناخۆشبێ، یان: هەرچەندە لووتیشی لە عەرزێ بچەقێ، (مراغَم) واتە: شوێنێکە کە ئینسان بۆی دەچێ، وە دوژمنەکەی پێی ناخۆشەو لە دوژمنەکەی دەرباز دەبێ، واتە: لووتی دوژمنەکەی لە گڵ چەقاندوە، کە

دەفــەرموێ: ﴿ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ ﴾، واتــە: هــەر کەسـێك لــە پێنـاوی خـوادا کـۆچ بکـات، شـوێنی زۆری دەسـت دەکـەوێ، جێگـاو ڕێگـای فراوانـی دەسـت دەکـەوێ، کە دەبێتـە هـۆی پێنـاخۆشـبوونی دوژمنـەکانی، وە فراوانیشـی لە ماڵو سامانـدا دەستدەکەوێ، واتـە: با دەربەسـت نەبـێ.

(وَسَعَةٗ): (السَّعَةُ: تقـالُ فـي الأمكَنَـةِ وفـي الحَـالِ وفـي الفِعْـلِ)، (سَعَة) واتــە: فراوانیی کە هـەم بۆ شـوێن بەکاردەهێنرێ، هـەم بـۆ حـاڵ، هـەم بـۆ کـرداریش، عـەرەب دەڵـێن: (أَنْـتَ فـي سَـعَةٍ مِـنْ كَـذَا) واتــە: تـۆ بـۆت هــەیە ئەوەشـیان بکـەی، ئەوەشـیان بکـەی، واتــە: دەسـتت کراوەیــە.

(تَقۡصُرُواْ): (قَصَـرَ) واتــە: کورتــی کـــردەوە، (القِـصَـرُ خِـلاَفُ الطُّـولِ، وَقَـصَـرْتُ كَـذَا: جَعَـلْتُهُ قَصِيراً)، (قِصَـرُ) واتـە: کورتیـی، پێـچەوانەی (طُـول)ە، واتـە: درێـژیی، (وَقَصَـرْتُ كَـذَا) واتە: ئـەو شــتەم کــورت کـردەوە، یـان: درێــژ بــوو بــە کورتیـی کـردم.

(يَفۡتِنَكُمُ): (يَبْتَلِيكُم وَيُعَذِّبَكُم، أو يُوقِعونَكُم فَي بَلاَءِ وَشِدَّة) کە دەفەرموێ: ﴿ إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ ﴾، واتە: ئەگەر مەترسییتان هەبوو کە کافرەکان تووشــی فیتنەتــان بکــەن، ئازارتــان پــێ بگەیــەنن، یــاخود تووشــی بــەڵاو سـەختییتـان بکـەن.

(حِذۡرَهُمۡ): (مَا فيهِ الحَذَر كالسِّلاَحِ وَغيْرِهِ)، (حِذْر) هەر شتێکە کە ئینسـانی پێـی لـە خـۆی وریــا دەبـێ، وەك چەكو هـەر شـتێکی دیکـە کـە ببێتـە هـۆی وریـایی مرۆڤ و پارێزرانی.

(فَيَمِيلُونَ عَلَيۡكُم): واتە: بە یەکجار هێرشتان دەکەنـە سـەر، (الـمَيْلُ: الْعُدُولُ عَنِ الوَسَطِ إِلى أَحَدِ الجَانِبينِ)، (مَيْل) بریتیـە لـە لادان لـە خـەتی نێوەڕاسـتەوە

بۆ یەکێك لەلا تەنیشتەکان، (وَمِلْتُ عَلَيْهِ: تَحَامَلْتُ عَلَيْهِ)، واتە: ستەمم کرد.

(قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ): واتە: نوێژەکەتان تەواو کرد، (القَضَاءُ فَصْلُ الأَمْرِ قَولاً كَانَ أَو فِعْلاً، قَضَى الدَّيْنَ: ردَّه)، (قَضَاء) بریتیە لەوە کە ئیشێك تەواو بکات، جا بە قسە یاخود بە کردار، (قَضَى الدَّيْنَ) واتە: قەرزەکەی دایەوە.

(مَّوْقُوتًا ): واتە: کات بۆ دیاریی کراو، دەگوترێ: (وَقَتُّ كَذَا: جَعَلْتُ لَهُ وَقْتاً)، ئەو شتە کاتم بۆ دیاری کردبوو.

( وَلَا تَهِنُوا۟ ): واتە: بێهێز مەبن، یاخود خۆتان پێ بێهێز نەبێ، (الوَهْنُ: ضَعْفٌ مِن حَيْثُ الخَلْق والخُلُق)، (وَهْن) بریتیە لە بێهێزیی لە ڕووی جەستەییەوە، یاخود لە ڕووی مەعنەوییو ڕەوشتییەوە.

(تَأْلَمُونَ ): واتە: هەست بە ئازار دەکەن، ئێشتان پێ دەگات، (الأَلَم: الوَجْعُ الشَّدِيدُ، أَلِمَ يَأْلَمُ أَلَماً فَهُوَ آلِمٌ، وَأَلِيمُ مُؤْلِم)، (أَلَمْ) بە ئازارێکی بە ئێش دەگوترێ، وە دەگوترێ: (أَلِمَ يَأْلَمُ أَلَماً فَهُوَ آلِمٌ) واتە: بە ئێشە، یان ئێشدارە، (أَلِيمُ مُؤْلِم) یەکن، واتە: بە ئازار.

(وَتَرْجُونَ ): واتە: ئومێد دەکەن، (الرّجاءُ: ظَنٌّ يَقْتَضِي حصول مَا فِيهِ مَسَرَّةٌ) (رجَاء) بریتیە لە گومانێك کە ئینسان پێی وابێ شتێکی دەست دەکەوێ، کە مایەی دڵخۆشیی بێ.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ... ﴿٩٤﴾ ﴾ لەوبارەوە سێ گێڕرانەوە هەن:

أ- ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ بِنَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَسُوقُ غَنَمًا لَهُ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا: مَا سَلَّمَ عَلَيْنَا إِلاَّ لِيَتَعَوَّذَ مِنَّا فَعَمَدُوا إِلَيْهِ فَقَتَلُوهُ وَأَتَوْا بِغَنَمِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَنَزَلَتْ الآيَةُ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ... ﴿٩٤﴾ ﴾﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٢٠٢٣)، وَالبُخَارِي برقم: (٤٥٩١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٠٢٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٩٧٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٣٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٩٢٠) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٥٢)، والطَّبَرَانِيُّ في (الكبير) برقم: (١١٧٣١)، لُباب النقول: (٣٢٧١)، وَفِي غَيْرِ البُخَارِي: وَحَمَلَ رَسُولُ اللَّهِ دِيَّتَهُ إِلى أَهْلِيهِ وَرَدَّ عَلَيْهِ غُنَيْمَاتِهِ)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك لە (هۆزی) بەنی سولەیم بە لای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی، وە ڕانە مەڕێکی پێبوو لێی دەخوڕی، سەلامی لێکردن، ئەوانیش (دیارە نەیانناسیوە) گوتیان: ئەوە بۆیە سەلامی لێکردووین تاکو تووشی زیانی نەکەین، (لەوانەیە کافر بێ، بۆیە سەلاممان لێدەکاتو خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدات، هەتا سەلامەت بێ) ئیدی پەلاماریانداو کوشتیان، وە ڕانە مەڕەکەشیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، {لە حەدیسەکانی دی غەیری بوخارییدا هاتوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنەکەی بۆ کەسوکاری برد، وە مەڕەکانیشی بۆ بردنەوە}، ئەو مەڕەی لێیان داگیر کردبوو، وە

پێیان وابوو غەنیمەتیان گرتوە ! وە خوای دادگەر ئەم ئایەتەی نارده خوارێ، کە ئەگەر لە ڕێی خوادا بۆ جەنگو جیهاد بەرێدا ڕۆیشتن، چاو وردبکەنەوە.

ب- ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَرِيَّةً فِيهَا المقدَادُ بْنُ الأَسْوَد فَلَمَّا أتوا القوم وجُدوهُم قَدْ تَفَرَّقوا وَبَقِي رَجُل لَهُ مَالٌ كَثِير، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهَ، فَقَتَلَهُ المقدَادُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: كَيْفَ لَكَ بِلاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهَ غَداً ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ... ﴿٩٤﴾ ﴾﴾ أَخْرَجَهُ البَزَّار بِرقم: (٥١٢٧)، وَالطَّبَرَنِيُّ في (الكبير) برقم: (١٢٣٧٩)، لُباب النقول: (٣٢٩)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد، (واتە: بەشێك لە سوپایەکی نارد) میقدادی کوڕی ئەسوەدیان تێدابوو (ڕەنگە فەرماندەیان بووبێ) چوون بۆ لای کۆمەڵێك لە کافران تەماشایان کرد هەموویان ڕایان کردو بڵاوبوون، تەنیا پیاوێك مابووەوە ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو، کاتێك لێی نزیك بوونەوە گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهَ) شایەدیی دەدەم کە بێجگە لە خوا پەرستراوی دیکە نیە (واتە: مسوڵمانم) بەڵام میقداد کوشتی، (وایزانی کە ئەوە هەر بۆئەوەی سەلامەت بێو ماڵەکەی لێ نەستێنن، شایەتمان دێنێ، ئەگەرنا مسوڵمان نیە، دیارە دوایی کە چوونەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕایەوە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سبەینێ چی لە (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهَ) دەکەی؟ وە خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارێ.

ج- ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي حَدْرَدٍ الأَسْلَمِي، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فِيهِمْ أَبُو قَتَادَة، وَمُحَلِّمُ بْنُ جَثَّامَة، فَمَرَّ بِنَا عَامِرُ بْنُ الأَضْبَطِ الأَشْجَعِيُّ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا، وَحَمَلَ عَلَيْهِ مُحَلِّمُ بْنُ جَثَّامَةَ، فَقَتَلَهُ، فَلَمَّا

قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَخْبَرْنَاهُ الْخَبَرَ، نَزَلَ فِينَا الْقُرْآنُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ... ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٩٤﴾ ﴾» أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٣٩٢٧)، وَالبيْهَقِيُّ في (سُنَن كبرى) برقم: (١٨٠٤٧)، ولُباب النقول: (٣٢٩)، وَقَالَ الشيخ الألباني: إسنَادُهُ حَسَنٌ)، واته: عەبدوڵڵای کوڕی حەدرەدی ئەسلەمیی دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە مسوڵمانان ئێمەی نارد کە ئەبو قەتادەو موحەللیمی کوڕی جەسسامەشمان لەگەڵدابوو بەلای عامیری کوڕی ئەزبەطی ئەشجەعییدا تێپەڕین، سەلامی لێکردین، بەڵام موحالیمی کوڕی جەسسامە هێرشی کردە سەرو کوشتی، کاتێك چووینەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەمان بۆ گێڕایەوە، وە قورئان لەوبارەوە هاتە خوار.

دیارە سێ بەسەر هات دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە باسکراون، دەگونجێ هەرسێکیان ڕوویاندابێ، خوای پەروەردگاریش ئەو ئایەتەی ناردۆتە خوار بۆ ئامۆژگارییکردنی مسوڵمانان، کە ئەو جۆرە شتانەیان هاتە پێش، چاو باش وردبکەنەوەو سەرنج بدەنو هەر لەخۆڕا پەلاماری خەڵك نەدەن.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ... ﴿٩٥﴾ ﴾: «عَنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمْلَى عَلَيْهِ: ﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ قَالَ: فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمِلُّهَا عَلَيَّ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ،

وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ، وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي فَثَقُلَتْ عَلَيَّ حَتَّى خِفْتُ أن تَرُضَّ فَخِذِي ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٥٠٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٣٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٩٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: زەیدی كوڕی ثابت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندمەوە، پێشێ بەو شێوەیە بوو: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئیماندارانی دانیشتوو لەگەڵ تێكۆشەرانی ڕێی خوادا وەك یەك نین، دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی ئوممی مەكتوومیش خوا لێی ڕازی بێ، هات لەو كاتەدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بەسەردا دەخوێندمەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! سوێند بە خوا ئەگەر توانیبام جیهاد بكەم، منیش دەچووم بۆ جەنگو جیهاد، (بەڵام دیارە كوێر بووە) ئیدی خوای بە بەزەیی دوایی ئەم وشەیەی نارده خوار بۆ سەر پێغەمبەرەكەی، كە لەوكاتەدا ڕانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم بوو، هێندە ڕانی قورس بوو، هەتا ترسام كە ڕانم وردبێ لە ژێر ڕانی پێغەمبەردا ﷺ، (پێغەمبەری خوا ﷺ كە وەحی بۆ هاتوە بەدەنی زۆر قورس بووە)، دوایی حاڵەتەكە لاچوو، وە خوا ئەم وشەیەی نارده خوار: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾، واتە: ئیماندارانی دانیشتووی كە پەككەوتە نەبن، بەدەنیانو جەستەیان تەواوبێ، یەكسان نین لەگەڵ تێكۆشەرانو موجاهیدانو جەنگاوەراندا، بەڵام ئەوانەی كە عوزرێكیان هەبێو نەخۆش بن، ئەوانە لەگەڵ موجاهیداندا هەروەك یەكن، واتە: ئیماندارانێكی دانیشتووی بێ زیانی بێ عوزر، لەگەڵ موجاهیداندا پاداشتیان وەك یەك نیە، پلەیان وەك یەك نیە، بەڵام ئەوەی كە بە عوزرێكەوە نەتوانێ بچێتە جەنگو جیهاد، كە وەك

عەبدوڵڵای کوڕی ئوممی مەکتووم کوێربێ، یاخود شەل بێ، یاخود بێهێز بێ، یان نەخۆش بێ، ئەوە وەك دواییش باسی دەکەین، ئەوەی عوزرێکی هەبێ، بەپێی نیەتەکەی خۆی پاداشتەکەی خۆی هەر هەیە.

٣) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ... ﴿٩٧﴾ ﴾: ﴿عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ نَاسًا مِنْ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا مَعَ الْمُشْرِكِينَ يُكَثِّرُونَ سَوَادَ الْمُشْرِكِينَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي السَّهْمُ فَيُرْمَى بِهِ فَيُصِيبُ أَحَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ، أَوْ يُضْرَبُ فَيُقْتَلُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ... ﴿٩٧﴾ ﴾﴾ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٩٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير) برقم: (١١٥٠٥)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: کەسانێك لە مسوڵمانان هەبوون لەگەڵ موشریکاندا دەبوونو ئاپۆراو ڕەشایی ئەوانیان زۆر دەکرد، (واتە: بەشدارییان لەگەڵدا دەکردن لە جەنگدا، هەرچەندە مسوڵمانیش بوون، بەڵام لەگەڵ ئەواندا دەچوون بۆ جەنگ لە دژی مسوڵمانان) لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ، هەبوو تیرێك دەهاوێژرا بە یەکێکیان دەکەوت، یاخود شمشێر لێی دەدا، یاخود شتێکی دیکە لێی دەدراو دەکوژرا، (واتە: لە ڕیزی کافراندا دەکوژرا) لەوبارەوە خوای زاناو شارەزا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ، کە ئێمە دوایی مانای گشتی چەمكو واتای ئەم ئایەتە زیاتر ڕوون دەکەینەوە.

٤) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا

﴿١٠٠﴾: ﴿أَخْرَجَ ابْنُ جَرِير عَن ابْنُ زَيْدٍ قَالَ: هَاجَرَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَة يُرِيدُ النَّبِيّ ﷺ فَمَاتَ فِي الطَّرِيقِ فَسَخَر بهِ قَوْمُهُ، وَاسْتَهْزَؤوُا بهِ، وَقَالوا: لا هُوَ بَلَغَ الَّذِي يُرِيدُ، وَلاَ هُوَ أَقَامَ فِي أَهْلِهِ يَقومُونَ عَلَيْهِ وَيُدْفَنُ، فَنَزَلَ القُرآن: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ... ﴿١٠٠﴾﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَري برقم: (١٠٢١٣)، واته: ئیبنو جەریر لە ئیبنو زەید دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: پیاوێك لە هۆزی بەنی کینانە کۆچ دەکات (لە شوێنێك کە هۆزەکەی تێیدا نیشتەجێیە) بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو لە ڕێگادا مرد، خەڵکەکەی، (هۆزەکەی) گاڵتەیان پێکرد: گوتیان: نەوابوو بگاتە ئەو شوێنەی کە دەیەوێ، وە نەواشبوو کە لە نێو کەسوکارەکەی خۆشیدا دابنیشێ، کە سەرپەرشتیی بکەن، لە کاتی سەرەمەرگداو بە لەباریی کفن بکرێو بنێژرێ، ئیدی لەوبارەوە قورئان هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: هەر کەسێك لە ماڵی خۆی بچێتە دەرێو کۆچ بکات بەرەو لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان مردنی بگاتە سەرێ، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە.

ئنجا دەربارەی ناوی ئەو کەسەی ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزیوە، ئەمە هەیە: (وَقَالَ عِكْرِمَة مَوْلَى ابْنُ عَبَّاسٍ: طَلَبْتُ اسْمَ هَذَا الرَّجُلُ أَرْبَعَ عَشْرَة سَنَةً حَتَّى وَجَدْتُه، وَهُوَ: جُنْدبُ بْنُ ضَمْرَة الجندعي)[١]، واته: عیکرِمە کە مەولای عەبدوڵلای کوڕی عەبباسە، (مەولا واتە: ئازادکراو، یانی کۆیلە بووە عەبدوڵلا ئازادی کردوە، جاری واشبووە مەولا بە ئازادکەر گوتراوە، واتە: وشەی مەولا لە زمانی عەرەبیدا هەم بە مانای (مُعْتَق)و واتە: کۆیلەی ئازادکراو، هەم (مُعْتِق) واتە: کەسێك کە کۆیلەیەك ئازاد دەکات، هاتوە، بەڵام بەپێی سیاقی ئایەتەکان دەردەکەوێ کە مەبەست پێی کامیان بووە)، جا

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٠٤).

عیکرِمەمە دیارە کۆیلە بووەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئازادی کردوە، دەڵێ: بۆئەوەی بزانم ئەو پیاوە کێیە کە کۆچی کردووەو، لە ڕێگادا مردووەو، ئەم ئایەتە دەربارەی هاتۆتە خوارێ؟ چواردە ساڵان بە دوای کەوتم، هەتا ناوەکەم پەیدا کرد، کە بریتیە لە (جُنْدبُ بْنُ ضَمْرَة الجندعي)، جا (قُرطُبي) کە ئەوەی هێناوە دەڵێ: تەماشا بکەن ئەوانە چەند مەبەستیان بووە، چواردە ساڵان گەڕاون پشکنینی کردوە، تاکو ناوی ئەو هاوەڵە بەرِێزەی دۆزیوەتەوە، یان ناوی ئەو مسوڵمانە، ئەگەر مەرج بێ هاوەڵ تەنیا ئەو کەسەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ ببینێ.

٥) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿... إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ ... ﴿١٠٢﴾﴾ ﴿عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ رضي الله عنه قَالَ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعُسْفَانَ فَاسْتَقْبَلَنَا الْمُشْرِكُونَ عَلَيْهِمْ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ وَهُمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَالُوا: قَدْ كَانُوا عَلَى حَالٍ لَوْ أَصَبْنَا غِرَّتَهُمْ، ثُمَّ قَالُوا: تَأْتِي عَلَيْهِمْ الآنَ صَلاةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَبْنَائِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ، قَالَ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلام بِهَذِهِ الآيَاتِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِن وَرَائِكُمْ ... ﴿١٠٢﴾﴾ قَالَ: فَحَضَرَتْ فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَخَذُوا السِّلاحَ قَالَ فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ فَرَكَعْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ رَفَعَ فَرَفَعْنَا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ بِالصَّفِّ الَّذِي يَلِيهِ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ يَحْرُسُونَهُمْ، فَلَمَّا سَجَدُوا وَقَامُوا جَلَسَ الآخَرُونَ فَسَجَدُوا فِي مَكَانِهِمْ، ثُمَّ تَقَدَّمَ هَؤُلَاءِ إِلَى مَصَافِّ هَؤُلاءِ، وَجَاءَ هَؤُلاءِ إِلَى مَصَافِّ هَؤُلاءِ، ثُمَّ رَكَعَ فَرَكَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ رَفَعَ فَرَفَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ

النَّبِيُّ ﷺ بالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ يَحْرُسُونَهُمْ فَلَمَّا جَلَسَ جَلَسَ الآخَرُونَ فَسَجَدُوا فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٦٣٠)، وأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٢٣٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٥٤٩) وَالطَّبرانيُّ في (الكبير) برقم: (٥١٣٢)، وَالوَاحِدِي: (٣٥٨)، وَغيرهُم، واتە: ئەبو عەییاشی زورەقیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە عوسفان (ناوی شوێنێکە) هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بەرەو ڕوومان هاتن، خالیدی کوڕی وەلید فەرماندەیان بوو، وە ئەوان کەوتنە نێوان ئێمەو قیبلەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان لەلای مەدینەوە هاتوون بەرەو مەککە، خالیدو سوپاکەشی لە مەککەوە هاتوون و پێشیان پێگرتوون و کەوتوونە نێوان ئەوان و کەعبەوە) کاتی نوێژ هات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی پێکردین بە ئاسایی، (دیارە هەواڵیان پێنەگەیشتوە کە کافرەکان لێیان دەخەفتێن) هاوبەشدانەرەکان گوتیان: (دیارە دوای ئەوەی زانیویانە کە وایانگوتوە) ئەگەر زەبرێکمان لێدابان شتێکی باش دەبوو، (چونکە لە حاڵێکدا بوون دەمانتوانی زەفەریان پێ ببەین) ئێستا نوێژێکی دیکەیان کاتی دێ، کە ئەو نوێژەیان لە خۆیان و لە ڕۆڵەکانیان لەلا خۆشەویستترە، (کە مەبەستیان پێی نوێژی عەسر بووە، زانیویانە کە دوای نوێژی نیوەڕۆ، نوێژی عەسریش دێ) ئیدی جبریل سەلامی خوای لێ بێ ئەم ئایەتانەی لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ عەسردا دابەزاندن: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ ...﴿١٠٢﴾﴾، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ!) ئەگەر تۆ لەگەڵیان بووی، وە نوێژیشت بۆ کردن، با کۆمەڵێکیان لەگەڵت بوەستن، وە چەکەکانیان پێ بێ، لە خۆیان وریابن، ئەگەر ئەوانە چوونە سەجدە، با ئەوانی دیکە حەرەسیات بگرن، دوایی ئەوانی دیکە بێن سەجدە بەرن و... هتد، (کە ئێمە دوایی تەرتیبەکەی باس دەکەین).

جا دەڵێ: وە کاتی نوێژ ئامادەبوو (یانی: نوێژی عەسر) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین، چەکەکانمان هەڵگرت، وە لە دوای خۆیەوە کردنی بە

دوو ڕیز، دوایی نوێژی دابەستو هەموومان پێکەوە نوێژمان دابەست، وە ئەو ڕکووعی برد، ئێمەش هەموومان پێکەوە چووینە ڕکووع، دوایی هەڵسایەوە، ئێمەش هەموومان لەگەڵی هەڵساینەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ چووە سەجدە، وە ئەو ڕیزەش کە لێیەوە نزیك بوو (دیارە ڕیزێك لە پشتیەوە بووە، ڕیزێکیش لە پشت ئەوانەوە بوون) لەگەڵی چوونە سەجدە، ڕیزی دوای وان بەپێوە مانەوەو ئێشکەیان گرتبوو بە چەکەوە، کاتێك کە سەجدەیان بردو هەڵسانەوە، ئنجا ڕیزی دووەم دانیشتن سەجدەیان برد لە شوێنی خۆیان، دوایی ڕیزی دووەم هاتنە پێش، هاتنە شوێن ڕیزی یەکەم، وە ڕیزی یەکەم کشانەوە بۆ شوێن ڕیزی دووەم، ئنجا دووبارە بۆ ڕکاتی دووەم پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ڕکووع، ئەوانیش هەموویان لەگەڵی چوونە ڕکووع، دوایی هەڵسایەوەو هەموویان لەگەڵی هەڵسانەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕیزەی کە لە پشتیەوە بوو (واتە: ڕیزی دووەم کە هاتبوونە پێشێ) لەگەڵیان چووە سەجدە، ئەوانی دیکەش لە پشتیانەوە بەپێوە مانەوە ئێشکەیان دەگرت، دوایی دانیشتن، وە ئەوانی دیکەش دانیشتن، وە سەجدەیان برد، (واتە: سەجدەی بە کۆمەڵیان برد کە ئەوان دانیشتوون بۆ تەحییات، ئنجا ڕیزەکەی دوای ئەوانیش سەجدەیان بردووەو دانیشتوون بۆ تەحییات)، ئنجا سەلامی پێداونەوە.

ئەوە جۆرێکی نوێژی ترسە، هەڵبەتە جۆری دیکەشی هەن، کە ئێمە خوا پشتیوان بێ دوایی باسیان دەکەین.

٦) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن كَانَ بِكُمۡ أَذٗى مِّن مَّطَرٍ أَوۡ كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسۡلِحَتَكُمۡۖ وَخُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ... ﴿١٠٢﴾﴾: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَزَلَتْ: ﴿إِن كَانَ بِكُمۡ أَذٗى مِّن مَّطَرٍ أَوۡ كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ ...﴾ فِي عَبْدُ الرَّحمَن بْنِ عَوْفٍ حِينَمَا كَانَ جَرِيْحَاً﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٤٥٩٩)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكبرى) بِرقم:

(١١١٢١)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٣٢٠٢) تَعلِيـق الذهبــي فــي التلخـيص: صَحيح عَلَـى شَـرْطِ البُخَـارِي وَمُـسْلِم، واتـه: عەبدوڵـڵای کوڕی عەببـاس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە کـە دەفەرموێ: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ ...﴾، واته: ئەگەر ئـازارتـان هـەبوو، بـە هـۆی بارانــەوە لەشـتان تــەڕ بـوو، یــان نــەخۆش بـوون، هـیچ گوناهتـان ناگــاتێ، ئەگـەر چـەکەکانتان دابنێن، دەربارەی عەبدوڕڕەحمانی کـوڕی عـەوف هاتـە خـوارێ، لـە کاتێکـدا کـە برینـدار بوو.

کەواتـە: ئـەم ئــایەتە دەربـارەی عەبـدوڕڕەحمانی کــوڕی عـەوف هــاتۆتە خــوار، بـەڵام ئێمـە وەك هـەموو جارێـك باسـمان کـردوە، بنـچینەیەك هەیـە لـەوبارەوە کـە لەلایـەن زانایـانی (أصُـول الفِقـْه) دانـراوە، دەڵـێ: (إِنَّ خـصُوصَ السَّبَبِ لايَمْنَـعُ شمُـولَ الـمَعْنَى) واتـە: تایبەتمەنـدبوونی هۆکاری هاتنـە خـوار، ڕێگـا ناگــرێ لـە گـشتگیـریی واتایەکــەی، یـانی: هــۆی هاتنــە خوارەوەکـەی دەربـارەی یەکـێك بـووە، بـەڵام واتایەکـەی بـۆ هــەموو لایەکــە، بـۆ وێنــە ئـەم ئایــەتە وەك گوتمـان دەربــارەی عەبـدوڕڕەحمانی کوڕی عـەوف هاتۆتــە خــوار کـە بریندار بـووە، خـوای بـە بـەزەیی فەرموویـەتی: قەیناکـا ئەگـەر چەکەکەی پێــنـەبێ بـە برینـداریی لـە نوێــژێ دا، ئەگــەرنا ئەوانــی دی دەبـوو چەکیــان پــێ بێ، بەڵام واتایەکەی گـشتییە، هـەر کەسـێکی دیکـە نـەخۆش بـوو، برینـدار بـوو، بێهــێز بـوو، ئـەوە عــوزری هەیــەو، دەگونجــێ کـە لـە کـاتی نوێژەکـەدا چەکەکـەی پـێ نەبـێ.

## مانـای گـشــتـی ئایـەتەكــان

خـوا ﷻ لـەم ئایەتانـەدا بـۆ جـاری شەشـەم لـە سـوورەتی (النـساء)دا ڕوو لـە ئیمانداران دەكات، وە بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێ، پێشتر ئێمە باسمان كرد كـە لـە سـوورەتی (النـساء)دا نـۆ جـار خـوا ﷻ بـە نازنـاوی ئیمـان ئیمانـداران دەدوێنـێ، لەبەرئـەوەی ئـەم سـوورەتی (النـساء)ە، لـە دوای سـوورەتی (البقـرة) زۆرترین یاساكانی شەریعەتی گرتوونە خۆی، بەڵكو لـە قـەدەر قـەبارەی خـۆی لـە سوورەتی (البقرة) زیاتر یاسـای شـەرعیی تێدا هـەن، چونكە سوورەتی (البقـرة) دوو جوزئو چارەگێك زیاترە، دوو جوزئو نیو شتێك كەمە، بەڵام ئـەم سـوورەتە جوزئو نیوێكە، كەچی یاسـای زۆری تێدا هـەن، بۆیە خـوای پەروەردگـار نـۆ جار ئەم ڕستە موبارەكەی تێدا دووبارە كردۆتەوە، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئـەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنـاوە! چـونكە تـەنیا ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو ئەوانـەی كە بیـروبڕوای ئیـسلامییان هەیـە، شایـستەی ئـەوەن كـە خـوای كاربەجـێ ئەركـە شـەرعییەكانیان پـێ بـسپێرێ، وە هـەر ئەوانیـش ئامـادەیی ئەوەیـان هەیـە كـە ئەركە شـەرعییەكانیان جێبـەجێ بكـەن.

جا خوا لێرەدا بۆ جاری شەشەم دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتــان هێنــاوە ! ﴿إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ﴾، ئەگـەر لـە ڕێـی خـوادا ڕۆیــشتن بــە ڕێــدا، بەرچـاوی خۆتـان ڕوونبكەنــەوە (فَتَبَيَّنـوا) یـانی: (فَتَحَقَّقُـوا) وە خوێندراویشتەوە: (فَتَثَبَّتوا)، واتـە: چـاك شـت سـاغ بكەنـەوە، هـەر لـەخۆوە مەڵـێن: ئـەوە مـسوڵمانە، ئـەوە كـافرە ! هـەر لـەخۆوە تفـەنگ بـە تاریكییەوە مەنێن، واتـە: ئەگـەر لـە پێنـاوی خـوادا لـە ماڵ دەرچوونو بـە ڕێگادا ڕۆیشـتن، بـە سـەفەر چوون بـۆ جـەنگو جیهـاد، هۆشـیارو وریـابن، ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴾، وە بـە كەسـێك كـە سـلاوتان لــێ

دەكات، مەڵێن تۆ ئیماندار نی، وەك لە هەوێ هاتنە خوارەوەكەیدا پێشتر باسمان كرد، واتە: لە خەڵك لە بیانوو مەبن، كەسێك كە سڵاوتان لێ دەكات، سەلامی مسولْمانانەتان لێ دەكات، یاخود هەر نیشانەیەك لە نیشانەكانی مسولْمانەتییتان پێشان دەدات، ئێوەش پێویستە وەك مسولْمانان مامەڵەی لەگەڵدا بكەن، ﴿ تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەگەر ئێوەش لە خەڵك لە بیانوو بن، وە بە سڵاو لێكردنیان دڵتان ئاو نەخواتەوە، لێیان لە بیانووبن، ئەوە دیارە مەبەستتان پێی تەماعی دنیایە، ﴿ فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ﴾، لای خوا دەستكەوتی زۆری هەیە، كە دەگونجێ مەبەست پێی دەستكەوتبێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی پاداشت بێ، واتە: پاداشتی قیامەتیی زۆری هەیە، وە دەستكەوتی دنیایی زۆریشی هەیە، لە رێی حەڵاڵەوە، كەواتە: لە رێی شوبهەو حەرامەوە بۆ مەتاعی دنیاو تەماع هەوڵمەدەن، ئنجا خوا ﷻ شتێك دەخاتەوە بیر بڕواداران‌و دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ ﴾، ئێوەش لەمەوپێش هەروا بوون، واتە: ئێوەش مسولْمان نەبوون، دوایی مسولْمان بوون، وەك ئەوانە كە تازە مسولْمان بوون، رەنگە ئێوە لە مسولْمانەتییەكەیان زۆر دڵنیا نەبن، یاخود مەبەست ئەوەیە: وەك چۆن ئەوانە مسولْمانەتییەكەی خۆیان لە گەل‌و هۆزەكەی خۆیان دەشارنەوە لە ترسان، لەبەرئەوەی بێهێزن لە نێو گەلەكەی خۆیاندا، بەڵام لە لای ئێوە كە مسولْمانن مسولْمانەتییەكەیان ئاشكرا دەكەن، بە هەمان شێوە ئێوەش كاتێك بوو ئاوا بوون‌و لە ترسی كافرەكان مسولْمانەتیی خۆتان پەنهان دەكرد، ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ ﴾، بەڵام خوا چاكەی لەگەڵتاندا كردو، هیدایەتی دان، یاخود چاكەی لەگەڵدا كردن‌و بەهێزی كردن، كە ئێستا بێ‌منەتن‌و بە بێ‌منەتیی مسولْمانەتیی خۆتان دەردەبڕن، جارێكی دی دووبارەی دەكاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ﴾، بەرچاوی خۆتان رۆشنكەنەوە، وە وریابن‌و هۆشیاربن، بەرپێی

خۆتــان ببیــنن، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾، بێگومــان خــوا بەوەی دەیکەن شارەزایـە.

ئنجا خــوا ﷻ هــەر لــە سـیاقی باسـی جـەنگو جیهـاددا، باسـی نایەکـسـانیی دانیشـتووانو جەنگاوەران دەکات، ئەوانەی کە لە مـاڵ دادەنیـشـن، وە ئەوانــەی کە لە ڕێی خوادا جەنگ دەکـەن، دەفـەرموێ: ﴿لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، یەکسان نـین ئیمانـدارانی دانیـشـتوو، کـە لـە مـاڵی خۆیـان دادەنیـشن، ﴿غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾، ئەوانەی کە هیچ عوزرێکیان نیە، هیچ ئازارێکیان نیە، هیچ نوقصانییو ناتەواوییەکیان نیـە، واتە: نوقصـانییو ناتەواویی لە جەستەیاندا، یان لە ماڵـیاندا، کە نەتوانن بچنە جەنگو جیهـاد، ئەوانە ﴿وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ﴾، لەگەڵ تێکۆشـەرانی ڕێی خوا بە سامانو بـە گیانیـان، یەکسـان نـین، ﴿فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ دَرَجَةٗ﴾، خـــــوا ﷻ تێکۆشــەران بــە مــاڵو گیانیــانی بەســەر دانیــشــتواندا، بــە پلەیــەکی گـەورە، بــەرز کردوونـــەوە، واتـــە: جیاوازییـــان زۆرە ! ﴿وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾، بـــەڵام بـــە هەرکامێکیشیان بەڵـێنی پاداشتی باشـی پێـداون، واتـە: ئیمانـدارانێکی دانیـشـتوو کـە ناچن بۆ جەنگو جیهاد، ئەوانیش مادام ئەهلـی ئیمـان بـن (إن شـاء الله) هـەر بەهەشـتیین، وە تێکۆشـەرانی ڕێی خـوا بـە سـەرو ماڵیـان ئـەوانیش چاکتـرو زیـاتر خوا بەڵـێنی باشی پێـداون، ﴿وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، بەڵام خوا تێکۆشـەرانی بەسەر دانیشـتوواندا بە پاداشـتێکی مەزن بـەرز کردۆتـەوە، بەڵــێ هـەموویان ئەهلـی بەهەشــتن، بـەڵام پلــەی موجاهیـدان زۆر زۆر بـەرزترە، ئەوە واتایەکی، واتایەکـی دیکەی واتە: ئەوانـەی ناتەواویی لە بـــەدەنو لـە ماڵیانـدا هـەیەو ناتوانن جـەنگو جیهاد بکەن، خوا بەڵێنی باشـــی پێـداون، بـەڵام ئەوانـەی

كە جەنگو جیهاد دەكەن، پاداشتیان لەوان بەرزترە، ﴿ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ ﴾، چەند پلەیەك لە پەروەردگارەوە، ئەو پلە (درجة)یە كە خوا پێشتر باسیكرد، بریتیە لە چەند پلەیەك لە پەروەردگارەوە، ﴿ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ﴾، وە لێبوردنێكی تایبەتو بەزەییەكی تایبەت، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، وە بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانو بە بەزەیی یە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەوانەی كە ناچن بۆ جەنگو جیهاد، وە سەرەنجام لەبەر دەستو پێی كافراندا دەفەوتێن، یان لەنێو ڕیزی واندا دەكوژرێن، یان لەژێر ڕكێفی واندا گیان دەسپێرن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، بێگومان ئەوانەی كە فریشتەكان گیانیان كێشان لە حاڵێكدا كە ستەمیان لە خۆیان كردبوو، ستەم لە خۆ كردنەكەیان چی بوو؟ ئەوەبوو كە ئامادە نەبوون كۆچ بكەن، ماڵو سامانو حاڵی خۆیان بەجێ بهێڵن، بەرەو مەنزڵگای ئیسلام بچن، فریشتەكان كە گیانیان كێشان ﴿ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ﴾، پێیان فەرموون: ئەوە چیتان بوو؟ یانی: بۆچی لێرە ماونەوە؟! ﴿ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، گوتیان: ئێمە چەوسێنراوە بووین لە زەویدا، واتە: بێ دەستەڵاتو بێ دەرەتان بووین، ڕێیەكمان نەبوو! ﴿ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ﴾، فریشتەكان پێیان گوتن: ئەدی سەر زەمینی خوا فراوان نەبوو، كە پێیدا بڕۆنو ئێرە بەجێ بهێڵنو كۆچ بكەن؟! واتە: دەتانتوانی كۆچ بكەن، ئەگەر لێرەدا بێ دەستەڵات بوون، بۆچی بەبێ دەستەڵاتیی دەمانەوە؟ كۆچتان كردبایە بۆ شوێنێك كە دەستەڵاتی ئیسلامی لێیە، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾، ئا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە، وە

خراپتـــرین سەرەنجــامیش دۆزەخــە، ئنجـا خــوا ﷻ هەندێکــیان لــەو حوکمــە هەڵداوێــرێ، دەفـەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ﴾، بێجگـە لـە چەوسـێنراوان لـە پیاوانو ژنـانو منـدالان، ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴾، ئەوانــەی کــە هــیچ تەگبیـرێکــیان بۆخۆیــان پێنــاکرێ، وە بەرێیـەکیش نـازانن، نـە هـیچ چارێکـیان هەیـە، نـە بەرێیـەش دەزانـن، واتـە: هـیچ دەرەتـانێکــیان نیــە، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ﴾، ئەوانــە نــزیکە خــوا لێیــان ببــوورێ، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾، وە بێگومــان خــوا لــێبوردەی تــاوان پۆشە، واتە: تەنانەت ئەوانەش نـزیکە خوا لـێیـان ببـوورێ، بۆیــە وا دەفەرمــوێ: بۆئەوەی کە هەر کەسـە لەخۆوە پاڵنەداتەوە بڵـێ: وەڵـڵا منیـش بـێ دەسـتەڵاتمو هیچم لەدەست نایەت، بەڵکو دەبـێ ئەوپـەڕی توانـای خۆی بخاتە کـار.

ئنجــا خــوای تــاكو پــاك بــەو بۆنــەوە باسـی کۆچکــردن دەکــات لـە پێنـاوی خۆیدا، دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ﴾، وە هـەر کەسـێك لـە پێنــاوی خـوادا کـۆچ بکــات، لـە زەوییـدا شـوێنی حەوانـەوە، جێگـەو ڕێگایـەك کـە ئینسـان تێیـدا هەناسـەی ئـازادی هەڵـمژێ، وە دوژمنەکەشـی پێی نارەحــەت بــێ، فراوانیــی ڕزقو بـژیوی چنــگ دەکــەوێ، بـا دەربەسـت نەبـێ بڵـێ ڕێو جێـم نـابێ، بژێوم دەسـتناکەوێ، ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ ﴾، وە هـەر کـەس لـە ماڵەکـەی بـچێتـەدەرێ بـەرەو خـواو پێغـەمبەرەکەی کۆچ بکــات، پاشان مردنـی بگـاتـێ ئـەو کەسـەی کـە کـۆچ دەکــات لــە پێنـاوی خـوادا دوو حــاڵەتی هــەن: یـان دەگاتـە مەنزڵـی خـۆی، یـان لـە ڕێگـادا دەمـرێ، ئەگـەر بگـاتە مەنـزڵ بـا دەربەسـت نەبـێو دڵنیـابێ کـە خـوا جێگـاو ڕێگاشـی بۆ فەڕاهەم دێنـێ، هەروەها ڕزقو بژێویـش، وە ئەگـەر لـە ڕێیـەش بمـرێ

﴿ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ ﴾، ئەوە پاداشتی کەوتۆتە سەر خوا، واتە: خوا لەسەر خۆی پێویست کردوە کە پاداشتی بداتەوە، با نەشگەیبێتە مەنزڵگای ئیسلام، ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

ئنجا خوای بەرز هەر بەو بۆنەوە باسی کورتکردنەوەی نوێژەکان دەکات، چونکە ئینسان لە سەفەردا، چ لە سەفەری جەنگو جیهاددا، چ لە سەفەری ئاساییدا، پێویستیی بەوە هەیە کە نوێژەکان کۆبکاتەوە، کورت بکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، وە ئەگەر بە زەوییدا، بە ڕێگادا ڕۆیشتن، گوناهتان ناگاتێ، یاخود سەغڵەتیتان لەسەر نیە، کە لە نوێژەکان کورت بکەنەوە، بۆیە فەرموویەتی: لە نوێژەکان کورت بکەنەوە، چونکە هەموویان کورت ناکرێنەوە، نوێژی بەیانی هەر دوو ڕکاتەو، هی شێوانیش هەر سێ ڕکاتەو کورت ناکرێنەوە، ئەوانەی کە کورت دەکرێنەوە چوار ڕکاتییەکانن، کە نیوەڕۆو عەسرو خەوتنانن، ﴿ إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ ﴾، ئەگەر ترستان هەبوو کە ئەوانەی بێبڕوان ئازارتان پێ بگەیەنن، جا زانایان دەڵێن: ئەم ڕستە قورئانییە لەبەرئەوەیە کە مسوڵمانان بە زۆریی ترسیان هەبووە کە لە ماڵ دەرچوون، ئەوکاتە بارودۆخەکەی وابووە، ئەگەرنا بەمەرج نەگیراوە کە ترس هەبێ لە دوژمن، ئەوجار بۆت هەبێ نوێژ کورت بکەیەوە، بەبێ ترس لە دوژمنیش نوێژ کورت دەکرێتەوە، کە دوایی زیاتر باسی ئەوە دەکەین، بەڵام لەبەرئەوەی حاڵەتی باو (غالب) وابووە دەڵێ: (خُرِّجَ مَخْرَجَ الغَالِب) بە زۆریی وابووە، ئەوکاتە مسوڵمانان لە دوژمن ترساون، بۆیە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ئەگەر ترستان هەبوو لە دوژمن نوێژەکانتان کورت بکەنەوە قەیناکات: ﴿ إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴾، بێگومان کافرەکان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکران.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی کورتکردنەوەی نوێژی کرد، دێتە سەر باسی چۆنیەتی نوێژی ترس لە دوژمن، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ﴾، وە (ئەی پێغەمبەر ﷺ)! ئەگەر تۆ لەگەڵیان بووی‌و لەنێویان دا بووی، وە نوێژت بۆ کردن، با کۆمەڵێکیان لەگەڵ تۆ هەڵسن، وە با چەکەکانیان بگرن، چەکەکانیان پێ بێ، ﴿فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ﴾، ئەگەر ئەوان ڕکاتێکیان لەگەڵ تۆ کردو سەجدەیان برد، با بچنە دواتانەوەو کۆمەڵێکی دیکە بێن کە نوێژیان نەکردوە، با نوێژت لەگەڵ بکەن، ﴿وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾، وە با وریای خۆیان بن، وە چەکەکانیشیان پێ بێ، بۆچی؟ چونکە: ﴿وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە ئاوات دەخوازن کە لە چەکەکانتان‌و لە کەل‌و پەلەکانتان غافڵ بن‌و یەکجار هێرشێکتان بکەنە سەرێ، ئنجا باسی حاڵەتێك دەکات کە کابرا ناچار دەبێ‌و ناتوانێ چەکەکەی پێ بێ لە کاتی نوێژێدا، ئەویش ئەوەیە کە ئازاری هەبێ بە هۆی لەش تەڕبوونەوە، یان بە هۆی نەخۆشییەوە، یان بە هۆی بێهێزییەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ﴾، وە گوناهتان ناگاتێ ئەگەر ئازارتان هەبوو بە هۆی بارانەوە، یان نەخۆش بوون کە چەکەکانتان دابنێن، لە کاتی نوێژدا، ئەگەرنا بەبێ حاڵەتی ئازارو تەڕبوون‌و نەخۆشیی، دروست نیە لە کاتی ترس لە دوژمن دا کە نوێژی ترس دەکرێ، چەکەکان دابنرێن، ﴿وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾، وە لە هەموو حاڵانیشدا لە خۆتان وریابن، ﴿إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾، بێگومان خوا بۆ بێبڕوایان ئازارێکی ڕیسواکەری ئامادە کردوە.

ئنجــا باســی دوای نوێژەكــە دەكــاتو دەفــەرموێ: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾، ئنجــا ئەگــەر نوێژەكــەتان تـەواو كـرد، یـادی خـوا بكــەن، بـە پێـوەو بـە دانیـشـتنو لەسـەر تەنیـشـتتان، لـە هـەموو حــاڵاندا یــادی خـوا بكــەن، ﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، ئەگـەر ئارام بوونــەوە، واتـە: حاڵـەتی ترسـتان لەسـەر نـەماو كەوتنــەوە حاڵـەتی ئاسایی ﴿فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژەكــەتان بكــەن، یــانی ئـەو نوێــژەی كـە لـە حاڵـەتی ئاسـاییـــدا دەكـــرێ، ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا﴾، بێگومـان نوێــژ لەسـەر ئیمانـداران لـە چـەند كـاتێكی دیـاریكـراودا پێویـست كـراوەو، دەبــێ لە كاتی خۆیـداو بە شـێوەی خۆی ئەنجـام بدرێ.

ئنجا لە كۆتـاییدا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ﴾، وە ئێوە بێهێز مەبـن لە بە دواداگـەڕانی خەڵكـدا، واتە: خەڵكـی كافری دوژمن، وەك چۆن ئـەوان لە ئێوە دەخەفتێـن، ئێـوەش لە لێخەفتـانی ئەواندا بێهـێز مەبن، مەترسێن، ﴿إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ﴾، ئەگـەر ئێـوە ئازارتــان هەیــە ئەوانیش ئازاریــان هەیـە، وەك چۆن ئێوە ئـازارتان هەیەو ماندوو دەبن، ئەوانیـش وەك ئێوە ماندوو دەبنو بریندار دەبنو تینووو برسیی دەبن، كەواتـە: لـەوەدا وەك یەكـن، ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ﴾، بەڵام یەك جیـاوازییتـان هەیە، ئێـوە ئومێدێكـتان بە خوا هەیە، كە ئەوان ئەو ئومێدەیان نیـە، ئێـوە ئومێـدتان بـە خـوا هەیە، كە ئەوەتان بۆ بكاتە كەفارەتو پاداشت، وە بە بەهەشـت پاداشـتتان بداتـەوە، بـەڵام ئـەوان ئـەو ئومێدەشـیان نیـە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾، وە بێگومـان خـوا زانای كـاربەجێیە، واتە: زانایە كـە ئـەم یاسـایانەی دانـاون، وە كاربەجێشـە كـە بـەم شێوە بۆی دیاری كردوون، ئێوەش متمـانەتان بـە خــوای خۆتـان بـێ، هەرچـی خـوا فەرموویەتی هەموو ئەركەكانی بەو شـێوەیەی كە فەرموویەتی، جێبەجێ بكەن.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر لە ڕێی خوادا ڕۆیشتن، واتە: لە کاتی جەنگو جیهاددا بە ڕێگادا ڕۆیشتن، بەرچاوی خۆتان ڕوونبکەنەوە، شت ساغ بکەنەوە، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە هەمیشە وریایی پێویستە، بەلاّم بەتایبەت لە کاتی جەنگو جیهاددا پێویستترە، ئینسان دەبێ وریا بێو چوار چاوبێو هۆشیاربێ، بۆچی؟ چونکە لە کاتی جەنگو جیهاددا خۆ بەکوشت دان هەیە، خەلّك کوشتن هەیە، بریندار بوون هەیە، وە شتی گرنگ دێتە پێشێ، بۆیە ئینسان دەبێ زۆر بە وریاییەوە مامەڵە بکات.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴾، وە بە کەسێك کە سلاّوتان لێ دەکات، سەلامتان لێ دەکات، یاخود ئاشتییتان بۆ ڕادەنوێنێو پێشان دەدا، مەڵێن: تۆ ئیماندارنیو لە ترسان وادەکەی، بۆچی؟ چونکە زانایان بنچینەیەکیان داناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا دەڵێ: (نَحْنُ نَحْكُمُ بالظَّاهِرِ، وَاللَّهُ يَتَوَلَّى السَّرَائِرَ)، واتە: ئێمە ئیش بە ڕواڵەت دەکەین، وە نهێنییەکانیش حەواڵەی خوا دەکەین، ئێمە لەسەرمانە بە ڕواڵەت چیمان بینیو چیمان بیست، بینا لەسەر ئەوە بکەین، بەلاّم بڵێی نەخێر ئەو قسەیەی ئەو دەیکات ڕاست نیە، یاخود ئەو نوێژەی کە دەیکات بە درۆیەتی، ئەوە لەڕاستیدا هیچ کەس ئەوەی بۆ نیە، بۆچی؟ چونکە هیچ کەس نهێنیی دڵەکان نازانێ، جگە لە خوا، ئێمەش تەنیا ڕواڵەتمان لەسەرە، ئەوەی دەبیسترێ، وە ئەوەی کە دەبینرێ، هەر کەسێك ئیسلاممان لێ بیست، وە ئیسلاممان لێ بینی،

مسولْمانەتییمان لێ بینی، دەبێ بە مسولْمان لە قەڵەمی بدەین، هەتا هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامی لێ دەبینین، واتە: شتی وا زۆر زەقی لێ دەبینین، تاكو كوفرێكی لێ دەبینین، كە ئیسلامەكەی هەڵبوەشێتەوە، كە دیارە ئەوەش هەموو كەسێك بۆی نیە، هەر لەخۆوە، كەسێك كە لە لایەكەوە مسولْمانەتیی لێ دەبینرێو لێ دەبیسترێ، وە لە لایەكی دیكەشەوە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامی لێ دەبینرێو لێ دەبیسترێ، دیسان ئەوەش ئیشی هەموو كەس نیە، حوكم بدات بەسەر خەڵكدا، بەڵكو دەبێ زانایانو پسپۆڕانی شەریعەت ئەو بڕیارە بدەن، كە ئایا كام لای زاڵ بكەن بەسەر كام لایدا؟ مسولْمانەتییە ڕواڵەتییەكەی یاخود هەڵوەشێنەرەوەی مسولْمانەتییەكەی؟ ئەوە ئیشی زانایانو پسپۆڕانە، وەك: لە بەرگی یەكەمو بەرگی شەشەمی كتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا باسم كردوە.

**مەسەلەی سێیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، ئێوە كە كەسێك سڵاوتان لێ دەكات پێی دەڵێن ئیماندارنی، مسولْمان نی، مەبەستتان پەیداكردنی بەرژەوەندیی‌و تەماعی ژیانی دنیایە، كە ئەویش شتێكی زوو تێپەڕە، ئەم ڕستە قورئانییە هۆی هاتنە خوارەوەكەی ئەوەبوو وەك پێشتر باسمان كرد، كە كۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێكدا تێپەڕین، هەندێ مەڕو ماڵاتی پێ بوو، ئەوانیش تەماعیان لە مەڕو ماڵەكەی كرد، وە كابرا هەرچەندە سڵاوی لێكردن‌و لە ڕیوایەتێكدا دەڵێ شایەتمانیشی هێنا، بەڵام هەر كوشتیان، چونكە تەماعیان لە ماڵەكەی دابوو، لە ڕیوایەتێكی دیكەدا دەڵێ: یەكێك لە نێو هاوەڵاندا هەبوو كۆنە قینی لە دڵیدا هەبوو لە بەرانبەریدا بۆیە كوشتی، بە هەرحاڵ هەم هۆی هاتنە خوارەوەكەی ئەوە دەگەیەنێ‌و، هەم ئەوەشی لێ وەردەگیرێ كە حاڵەتی گشتی خەڵك كە یەكدی دەكوژن لەسەر تەماعە، كە دەوڵەتان یەكدی داگیر دەكەن لەسەر تەماعە، بۆ وێنە: ئەمریكا كە دێنێ بنكەی سەربازیی لە هەموو دنیادا بڵاودەكاتەوە، عێراق داگیر دەكات،

ئەفغانستان داگیر دەکات، کوێ داگیر دەکات، لەڕاستییدا هەمووی بۆ تەماعە، بۆ بەرژەوەندیی ئەو خەڵکە نیە کە لەسەر زەوییە، بەڵکو بۆ ئەو تەماعەیە کە لە ژێر زەوییە، وە بۆ ئەو بەرژەوەندییانەیە کە لەو وڵاتانەدا هەن، جا چ لەسەر ئاستی وڵاتانو دەوڵەتان شەڕو کوشتار بە زۆری لەسەر تەماعو لەسەر بەرژەوەندییە ماددییەکانە، وە چ لەسەر ئاستی تاکەکان کە تێکدەگیرێن، بە زۆریی لەسەر بەرژەوەندییە ماددییەکانە، ئەوە لەلایەكو، شتێکی دیکەش لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ، ئەویش ئەوەیە کە لە ئیسلامدا جەنگو جیهاد، دروست نیە بە هاندەری ماددیی بکرێ، دروست نیە مسوڵمانان بۆیە بچن بۆ جەنگو جیهاد تاکو دەستکەوتیان دەستکەوێ، تاکو بەرژەوەندیی دنیایی دابین بکەن، بەڵکو دەبێ تەنیا بۆ ئەوەبێ، ڕەزامەندیی خوا وەدەست بێنن، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، أَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٦٤٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨١٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٨٩٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥١٧)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٨٣)، واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری لێکرا: کەسێك بۆیە جەنگ دەکات تا بڵێن: ئازایە، یاخود لەبەر دەمارگیریی (نەتەوەیيو هۆزو ناوچەگەریی) جەنگ دەکات، یان بۆ ئەوەی کە باسبکرێ جەنگ دەکات، کامە لەوانە لە پێناوی خوایە؟! فەرمووی: هەر کەسێك بۆ ئەوە جەنگ بکات کە وشەی خوا بەرزبێ، بەس ئەوە لە ڕێی خوادایە، ئەویدیکە هیچی لە ڕێی خوادا نیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ: ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾، (مَغَانِم) کۆی (مَغْنَم) واتە: دەستکەوت، شتێك کە دەست ئینسان دەکەوێ، ئەوەی کە لە جەنگدا لە دوژمنتان دەستگیر دەبێ، ئەم ڕستەیە لێرەدا دوو واتای هەن: هەم دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە خوای بەرز دەفەرموێ:

لە ڕێی بیانووگرتن بە خەڵکەوە چاوەڕێی ئەوە مەبن کە دەستکەوتێکی ماددییتان دەستبکەوێ، بەڵکو لە لای خوا دەستکەوتی جەنگو جیهادی حەڵاڵو زەڵاڵ زۆرە، ئێوە بەو ڕێبازەدا کە شەرع دیاری کردوە جەنگو جیهاد بکەن، دەستکەوتیشتان دەستدەکەوێ، وە چاوتان لەوە نەبێ کە بە هۆی لادان لە شەرعەوە شتێکتان دەستبکەوێ، چونکە ماڵەکەشتان لێ حەڕام دەبێ، تووشی گوناهیش دەبن، ئەوە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە (مَغَانِم) مەبەست پێی ئەوەیە کە خوای بەخشەر لە دواڕۆژدا پاداشتێکی زۆری هەیە، واتە: (مَغَانِم) لێرەدا مەبەست پێی پاداشتی مەزن، (الثَّوابُ الجَزِيل)، واتە: خوا پاداشتێکی گەورەی لەلایە لە دواڕۆژداو، ئێوە پابەندبن بە شەریعەتەوە، بۆئەوەی پاداشتی زۆرتان دەستبکەوێ، وە لامەدەن لە شەریعەت بۆ ئەوەی دەستکەوتێکتان دەستکەوێو ئەو پاداشتە گەورەی لای خواتان لە دەست بچێو تووشی گوناح ببن.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾، واتە: وەك پێشتریش باسمان کرد، خوای زاناو شارەزا لێرەدا ڕاستییەك دەخاتەوە بیر مسوڵمانانو دەفەرموێ: ئێوەش لەوەو پێش وابوون، بەڵام خوا چاکەی لەگەڵ کردن، جا کە دەفەرموێ: ئێوەش لەوەو پێش وابوونو خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، مەبەست پێی چییە؟ دوو واتایان هەڵدەگرێ:

**یەکەم**: واتە ئێوەش لەوەپێش مسوڵمان نەبوونو دوایی هاتنە نێو ئیمانو ئیسلامەوە، ئەوانەش دەبینی ئەو کاتەی کە ئێوەیان بینیوە، یاخود ماوەیەك کە ئێوە ئاگاتان لێ نەبووە، مسوڵمان بوونو هاتوونە نێو ئیسلامەوە.

**دووەم**: واتایەکی دیکەی: ئێوەش کاتێك بوو لەبەرئەوەی کە ئیسلام دەستەڵاتی نەبوو، مسوڵمانەتییەکەی خۆتان پەنهان دەکرد، هەندێکتان

مسوڵمانیش بوون، بەڵام لە ترسی كافرەكان، نەدەوێران بڵێن مسوڵمانین و خۆتان پەنهان دەكرد، ئیمانەكەتان دەشاردەوە، ئەوانەش بەڵێ ئێوە ئاگاتان لە ئیمانەكەیان نیە، ئاگاتان لە مسوڵمانەتییەكەیان نیە، لەبەرئەوەی لە لای قەومەكەی خۆیان ئیمان و مسوڵمانەتییەكەیانیان ئاشكرا نەكردوە، بەڵام ئێوە چونكە لێتان ناترسێن برای دینییتانن، دەڵێن: مسوڵمانین، ئێوەش وابوون كاتی خۆی ئیمان و مسوڵمانەتیی خۆتان لە قەومەكەی خۆتان دەشاردەوەو خۆتان دەرنەدەخست، ئەوانیش بە هەمان شێوە، واتە: ئەوەی كە ئێوە بە خۆتانتان ڕەوا بینیوە، بەوانیشی ڕەوا ببینن!

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَيَّنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾، دیارە وشەی: (فَتَبَيَّنُوٓاْ) لەم ئایەتەدا دووجار دووبارە بۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ ﴾، دوایی لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ فَتَبَيَّنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴾، (تَبَيَّنُوا) كە خوێندراویشەتەوە: (فَتَثَبَّتوا)، (تَبَيُّن) و (تَثَبُّت) ئەوەیە ئینسان شتێك چاك ڕوون بكاتەوە، چاوی وردبكاتەوە، ساغی بكاتەوەو بچێتە بنج و بنەوانییەوەو، هەر لەخۆڕا بە نێو نەكەوێ بە پێخواسیی، یاخود حوكمێكی هەڕەمەكیی بەسەردا نەدات، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە بەڕاستیی لە گەرمەی جەنگ و جیهاددا، وە لە كاتی كاری ئیسلامییدا بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ خەڵكدا، وریایی و چاوكردنەوەو هۆشیاریی زۆر پێویستە، بۆ ئینسان بۆ ئەوەی تووشی هەڵە نەبێ، تووشی ئەوە نەبێ كە كەسێك بە كافر دابنێ و زوڵمی لێ بكات، وە تووشی ئەوە نەبێ كە دەستی بچێتە خوێن و ماڵی كەسێكەوە بە ناهەق، لە جیاتی ئەوەی خێرو پاداشت لە لای خوا تۆمار بكات، خۆی شەرمەزاری خواو عەیبداری لای خەڵك بكات، وە ئیسلامیش تووشی حەرەج و سەغڵەتیی بكات.

دیارە کە لەم ئایەتە موبارەکەدا کە دووجار وشەی: (فَتَبَيَّنُوٓاْ) دووبارە بۆتەوە، مانای وایە ئەوە شتێکی زۆر گرنگە، چونکە بۆ زانیارییتان هیچ وشەیەك، بەڵکو هیچ پیتێکیش لە قورئاندا زیاد نیە، بڵێی هەر دووبارە بۆتەوە بۆ تەئکید، نا، ئەوە دیارە پێویستە، کەواتە: ئەوە (تَبَيُّن)ە، واتە: چاو وردکردنەوەیە، زۆر پێویستە، بەتایبەت بۆ جەنگاوەران و موجاهیدان، وە ئەوەی کە ئەزموونی هەبێ لە ژیانی جەنگو جیهاددا، لە ژیانی پێشمەرگایەتیی دا، ئەو ڕاستییە دەزانێ، چونکە جاری وایە لە ئەنجامی هەڵەی موجاهیدو پێشمەرگەیەکەوە، بەڵاو موصیبەتێکی گەورە بەسەر خەڵك دێو، عەیبەیەکی گەورە دێتە سەر مسوڵمانان، وەك ئەوانەی کە ئێستا لەم ڕۆژگارەدا بێ پەروا خوێنی خەڵك بە ناهەق دەڕێژن، وە هەندێ شێواز بەکاردێنن بە حیساب بۆ بەرهەڵستییکردنی دوژمنان، کە لەڕاستییدا ئیسلام و مسوڵمانانی پێ ناشیرین دەبن، چونکە لە شیرازەی شەرع بەدەرە، بەڵێ، کەسێك کە خەتابارو بێ خەتا پێکەوە دەکوژێ، یان جاری وایە هەتا دەستی دەگاتە خەتابارێك، سەد بێ خەتاشی پێوە دەکوژێ!! لە کاتێکدا کە شەریعەت دەڵێ: ئەگەر بە هۆی کوژرانی سەد خەتابارەوە، بێ خەتایەك تووش دەبوو، دەبێ دەست لە سەد خەتابارەکەش بپارێزی، نەك بە هۆی خەتابارێکەوە کە خوێنی حەڵاڵە، سەدی دیکەی بێ خەتا بکوژێ، کە ئەوە لەڕاستیدا بە هیچ شێوەیەك لە شەریعەتدا جێی نابێتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَـٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ...﴾، لە بەرانبەر ئەم ئایەتە قورئانییەدا سێ هەڵوەستە دەکەین:

**هەڵوەستەی یەکەم:** هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە، پێشێ ئایەتەکە ئاوا بووە: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَـٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ

﴿بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ...﴾، کـە پێــشتر باسمــان کــرد ئــەوە لــە (صـحيح البخاري)دا هاتوە، واتە: ئیماندارانی دانیشتوو لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێی خوا بە سامانو گیانیان، یەکسان نین، لەو کـاتەدا (عَبْداللَّه بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ) کە یەکێك بوو لە هـاوەڵان، وە کوێر بـوو هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خوا ﷺ گوتی: ئـەی پێغــەمبەری خـوا ﷺ ! ئەگـەر توانیبـام پێمخۆشـبوو بـێم بـۆ جەنگو جیهاد، بەڵام نابینم، لەو کاتەدا ئەم ڕستە قورئانییـە هاتـە خـوار:

﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾، ئنجـا لێـرەدا ڕەنگـە یـەکێك پرسـیار بکـات، بڵــێ: بۆچـی ئـەم ئایەتــە پێـشتـر نەدەهاتـە خـوار؟ خـوای پەروەردگـار پێـشتـر دەیزانــی (عَبْداللَّه بْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ) دێو ئـەو پرسـیارە دەکـاو دەڵــێ: منـیش ئامادەم جەنگو جیهاد بکەم، بەڵام نابینم؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بە بۆچوونی مـن خـوای زانــاو شــارەزا دەیــەوێ پێـشانی ئێمـەی بـدات، کـە ئـەم قورئانـە بەرنامەی ژیـانە، وە تێکهەڵکێشـە لەگـەڵ ژیـان، لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ لەگەڵ ڕووداوەکاندا هاتۆتە خـوار، واتە: قورئان حاڵەتێکی تەجریـدیی‌و تیۆریی نیە، هاتبێتە خوار، ئنجا خەڵـك جێبـەجێی بکـات، بەڵـکو پـێ بـە پـێ، هەنگاو بـە هەنگـاو هاتۆتـە خـوار، مـسوڵمانان کەوتوونـە قۆناغێکـەوە، ئایـەتێك هاتۆتـە خـوار، هاوەڵـێك کێـشـەیەکی بـووە، ڕسـتەیەکی دیکـە لـەو ئایــەتە زیـاد کـراوە، ئـاوا بـەو شـێوەیە، کـە ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ، ئـەم ئیسـلامە لەگەڵ ژیاندا تێکهەڵکێشەو شـتێکی تیـۆریی (نَظَري) نیـە، لـەوێ دابنرێ وەك: کۆماری ئەفلاتوون لەسەر ڕەففە دایبنـێی، قورئــان بەرنامـەی ژینەو بۆیە هـاتۆتە خـوار، کە لەگەڵ ژینـدا ئاوێتـەبێو کاری پـێ بکـرێ.

**هەڵوەســتەی دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾، بـە سـێ شــێوە خوێندراوەتــەوە: (غَيْـرُ أُولـي الـضَّـرَرِ)، (غَيْـرَ أُولـي الـضَّـرَرِ)، (غَيْـرِ أُولـي الضَّـرَرِ) دیـارە کـە ئەگـەر بـە بـۆر (ضَمّ) بێ، یــانی: (غَيْرُ) بخوێنرێتـەوە،

ئـەوە دەبێتـە سیفەت بـۆ (قاعِدون)، وە ئەگـەر بـە سـەر (فَتْح) بـێ، یـانی: (غَیْرَ) بخوێنـرێتەوە، ئەو کاتە دەبێتـە (حـال)، واتـە: لـە حاڵـێکدا کـە هیـچ گرفتێکیان نیـە، وە ئەگەر بە ژێر (کَسْر) بێ، یـانی: (غَیْـرِ) بخوێنرێتـەوە، ئەو کاتە دەبێتـە سیفەت (مُؤمِنین) هەر سـێ قیـرائەتەکان هـاتوون.

**هەڵوەسـتەی سـێیەم:** ئەوەیـە کـە ئایـا خـوای کاربـەجێ بۆچـی فەرموویـەتی: ﴿لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (غَيْرُ)، (غَيْرَ)، (غَيْرِ) أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾؟! بۆچـی وشـەیەکی دیکـەی بەکارنەهێنـاوە؟ بـۆ وێنـە: فـەرمووبای: ئیماندارانێك کە پەککەوتـەن (مُعَوَّقِین)، یـان نەخۆشـن (مرضی) ... هتـد، دەڵـێین: ﴿غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾، وشـەیەکە پەککەوتـەو نـەخۆشو شـەلو کوێرو بێهێزیش دەگرێتـەوە، وە بـێ توانـایی مـاددییش دەگرێتـەوە، چـونکە هـەیە نەخۆشـەو، هەیـە کوێـرەو، هەیـە بێهـێزەو توانـای شـەڕکردنی نیـە، یـاخود توانـای مـاددیی نیـە، هـەموو ئەوانـە زەرەرێکیـان تێدایـە، واتـە: کەموکورییەکیان تێدایـە، کـە ڕێگـایان لـێ دەگرێ جـەنگو جیهـاد بکـەن، بۆیـە خـوای کاربەجـێ وشـەیەکی بەکارهێنـاوە، کـە هـەموو حاڵەتـەکان بگرێتـەوە، هـەم کـەم ئەنـدامیی، هـەم بێهـێزیی، هـەم نەخۆشـیی، وە هـەم کەم توانـایی ماددیش بگرێتـەوە، ئـەوەش یەکێکـە لـە ڕووەکـانی موعجیـزە بوونی قورئـان، ئەگەر فەرمووبـای: نـەخۆش، هـەر نەخۆشـی دەگرتـەوە، وە ئەگـەر فـەرمووبای: شـەل، هـەر شەلـی دەگرتـەوە... هتـد، بـەڵام لێـرەدا وشەیەکی بەکارهێنـاوە، هەموویان دەگرێتـەوە.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ...﴾، ئیماندارانی دانیشـتووی بـێ زیـانو بـێ نوقـصـانییو بـێ عـوزر، لەگەڵ تیکۆشـەرانی ڕێـی خوا بە سـەروماڵ، وەك یـەك نـین، قورئـان هەمیـشە کـە باسـی جـەنگو جیهاد

دەکات لە پێناوی خوادا، ماڵ پێش نەفس دەخات، بۆ وێنە: لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ﴾، واتە: ئەوانەی لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن، بە سامانو بە گیانیان، وە لە سووڕەتی (التوبة) دەفەرموێ: ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ... ﴿٤١﴾﴾، لێرەش دیسان ماڵ پێشخراوە، وە هەر لە سووڕەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ... ﴿٨٨﴾﴾، هەروەها لە سووڕەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ... ﴿١٥﴾﴾، وە لە سووڕەتی (الصف)دا دەفەرموێ: ﴿تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾﴾، ئایا بۆچی هەمیشە ماڵ پێش دەخرێ؟! چونکە وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (بەردی گەورە نیشانەی نەهاویشتنە!) کەسێك دڵی لەبەر ماڵەکەی نەبێتەوە لە پێناوی خوادا، دڵی لەبەر ڕووحەکەی چۆن دەبێتەوە؟! وەك شاعیر دەڵێ: (والجُودُ بالرُّوحِ مِنْ أعْظَمِ الجوُدِ) واتە: بەخشینی ڕووح گەورەترین سەخاوەتە، کەسێك نەتوانێ ماڵ ببەخشێ، ڕووحەکەی هەر پێ نابەخشرێ، بەڵام لە قورئاندا لە یەك شوێندا نەفس پێش ماڵ خراوە، ئەویش لە سووڕەتی (التوبة) ئایەتی (١١١)دا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ ... ﴿١١١﴾﴾، واتە: بێگومان خوا گیانو سامانیانی لە ئیمانداران کڕیوە کە بەهەشتیان بداتێ، لە ڕێی خوادا دەکوژنو دەکوژرێن!

ئایا بۆچی لێرەدا نەفس بەخشین، پێش ماڵو سامان بەخشین خراوە؟ لەبەرئەوەی لێرەدا خوا ﷻ باسی کڕین دەکات، خوا لە ئیمانداران ڕووحەکەشی لێ کڕیونو ماڵەکەشی لێ کڕیون، لێرەدا خوای زاناو شارەزا ئەوەی بە قیمەتترە پێشی خستوە، کە بێگومان ڕووح بە قیمەتترە، ئنجا باسی ماڵی کردوە، بەڵام لە بەخشینێ دا، دەبێ لە کەمەوە بۆ زۆر بچێ، ئینسان سەرەتا شتی سادە دەبەخشێ، ئنجا دوایی شتی بە قیمەتی پێ دەبەخشرێ، ئەوەی ماڵی پێ نەبەخشرێ، سەری پێ نابەخشرێ، بەڵام لە کڕینێ دا ڕووحەکە پێش دەخات، چونکە ڕووح بە قیمەتترە لە ماڵ، بەڵکو ماڵ وەسیلەیە بە دەستی ڕووحەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** ئەگەر سەرنجتان دابێ وشەی: (مجاهدون) یان (مجاهدین) لەم ئایەتەدا سێ جار دووبارە بۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾﴾، بەم شێوەیە:

لە جاری یەکەمیاندا دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾، واتە: تێکۆشەرانی لە ڕێی خوادا بە سامانیانو بە گیانیان، بۆچی؟ لێرەدا خوای پەروەردگار هەم ئامانجی جیهاد کە دەبێ لە ڕێی خوا دابێ، هەم وەسیلەو ئامڕازی جیهاد کە بریتیە لە بەخشینی سامانو گیان، هەردووکی باسکردوون.

لە جاری دووەمیان دەفەرموێ: ﴿فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً﴾، واتە: خوا تێکۆشەرانی بە ماڵو گیانیان بەرز کردۆتەوە

بەسەر دانیشتوواندا بە پلەیەك، تەنیا باسی وەسیلەی کردوە، پێویست ناکات باسی ئامانجەکە بکات، چونکە پێشتر باسکراوەو ئامانج هەر دەبێ لە ڕێی خوا دابێ.

لە جاری سێیەمیاندا دەفەرموێ: ﴿ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، واتە: خوا تێکۆشەرانی بەسەر دانیشتوواندا بەرز کردۆتەوە، تەنیا ئیکتیفای بەوە کردوەو پێویستی نەکردوە، نە باسی ئامانجەکەو نە باسی هۆکارەکە بکات.

**مەسەلەی دەیەم:** ئایا بۆچی خوا ﷻ لە ئایەتێکیاندا دەفەرموێ: ﴿ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ﴾، پێشێ دەفەرموێ: بە یەك پلە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ۝٩٥ دَرَجَٰتٍ ﴾، بە چەند پلەیەك، هۆی ئەوە چییە؟ زانایان لێرەدا سێ واتایان بۆ لێکداونەوە، کە هەرسێکیان جوانن:

**یەکەم:** سەرەتا خوا فەرموویەتی: پلە، دوایی دەفەرموێ: چەند پلەیەك، ئەوە بۆ جەختکردنەوەیە کە ئەو پلەیە چەندان پلەی لەنێو خۆوە گرتوون، واتە: دەگوترێ: (مجاهد) تێکۆشەر لە ڕێی خوادا، گیانفیدا لە ڕێی خوادا، چاکترە لە کەسێك کە دانیشتوە، وا مەزانن هەر چاکترەو هیچی دیکە، بەڵکو ئەوانیش لەنێو خۆیاندا چەند پلەن، ئەو پلەیە چەندان پلەی لەنێو خۆیەوە گرتوون.

**دووەم:** دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ: گیانبازان و فیداکارانی ڕێی خوا بە ماڵ و سامانیان، بە پلەیەك بەرز کراونەتەوە بەسەر کەسانێکدا کە (غَيْرُ أُولي الضَّرَرِ) واتە: خاوەن عوزرن و کەموکوڕییان هەیە لە جەستەیاندا، یاخود لە

ماڵو سامانیانداو ناتوانن جەنگو جیهاد بکەن، پلەیان لەوان زیاترە، بەڵام بۆ ئەوانی دیکە کە خاوەن عوزر نین، بە چەندان پلە لە سەرووی ئەوانەوەن.

**سێیەم:** وە دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿ دَرَجَةً ﴾، (الفَضْلُ والعُلُوّ) واتە: بەخشش و بەرزیی بێ، مەبەستیش لە: ﴿ دَرَجَٰتٍ ﴾، بەهەشت بێ، واتە: لە ئەسڵدا بە ڕەهایی ئەوانە پایەدارترنو پێگەیان بەرزترە، بەڵام لە بەهەشت هەمووی پلە پلەیە، ئێستاش چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنینەوە، کە باسی ئەو پلەو پایانە دەکات:

**فەرمایشتی یەکەم:** ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ، كُلّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٤٥٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٩٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٦١١)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە، خوا بۆ تێکۆشەرانی ڕێی خۆی دایناون، نێوانی هەردوو پلەیەك، وەك نێوانی ئاسمانو زەوی وایە، (واتە: نێوان هەر دوو پلەیەك هێندەی ئاسمانو زەوی لێك دوورن، سەد پلەی ئاوا بۆ کەسانێك کە لە ڕێی خوادا فیداکاریی دەکەنو سەرو ماڵی خۆیان دەبەخشن، لە بەهەشتدا هەیە).

**فەرمایشتی دووەم:** وە دەربارەی ئەوە کە کەسێك بە هۆی عوزرو نوقصانییەکەوە کە لە جەستەیدا هەیە، یاخود بە هۆی کەم توانایی دارایی، نەتوانێ جەنگو جیهاد بکات، ئەگەر نیەتی باش بێ، هەمان پاداشتی موجاهیدانی هەیە، لەوبارەوەش ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجَعَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ فَدَنَا مِنْ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا، وَلا قَطَعْتُمْ وَادِياً إِلاَّ وَهُم مَعَكُمْ

فيـهِ، قَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! وَهُـمْ بِالْمَدِينَـةِ؟! قَـالَ: نَعَـم، حَبَـسَهُمْ الْعُـذرُ] (أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٢٠٢٨)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٨٣٩)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٢٥٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٤٧٣١)، واتـه: ئەنەســی کوڕی مالیـك خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـك کـە دەگەڕایـەوە لـە جـەنگی تەبـووك، کە نـزیکی مەدینـە کەوتینـەوە، فـەرمووی: لـە مەدینـەدا کەسانێك هەن، بـە هـیچ ڕێیەکدا نەڕۆیشـتوون، وە هـیچ شیوێکـتان نـەبڕیوە، مەگـەر ئـەوانیش لـە پاداشــتەکەی لەگــەڵ ئێـوەدا بەشـدار بـوون، گوتیـان: ئـەی پێغـەمبەری خـوا ﷺ! لـە حاڵێکـدا کە ئـەوان لـە مەدینەشـن؟! فـەرمووی: بەڵــێ، بـەڵام هۆکـارێك بۆتـە ڕێگـریان‌و نەیانتــوانیوە بـێن، واتـە: مـادام نیەتیـان لەگـەڵ ئێوەبـێ، پاداشـتیان لەگـەڵ ئێوەیـە، بەڕاسـتیی هـەر ئـەوەش لە بەخشـشی بـێ سـنووری خوای پەروەردگـار چـاوەڕێ دەکـرێ.

**مەســـەلەی یـازدەیـــەم:** کــە دەفەرمـــوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾، ئـــــەم ڕسـتە قورئـانییـە چەند شـتێکی لـێ وەردەگـیرێ:

**یەکـــــەم:** کەسـێك توانـای کۆچـکردنی هــەبێ‌و کـۆچ نــەکات ســتەمکارەو گوناهبارە، واتە: کەسێك کە لە شـوێنێك ڕێـی دینـداریی لێگـیراوەو دەشـتوانێ ئــەو شـــوێنە جـێ بهێڵـــێ، بـــەڵام هـــەر بـــەجێی نەهێڵــێ لەبـەر تــەماع‌و بەرژەوەندیی دنیـا، ئـەوە ئـەو کەسـە گوناهبـارە، دیـارە گوناهبارییەکەشی پلـە پلـەیە، ئەگەر وای لـێبـێ بـە هۆی مانەوەیـەوە لـەوێ، تووشـی کوفربـێ، ئـەوە دیـارە لـە ئیـسلام دەچـێتە دەر، وە ئەگـەر تووشـی گونـاهی گـەورەبێ، ئـەوە گوناهبـاریی گەورەیـە، کە دیـارە ئەویش پلە پلـەیە.

**دووەم:** ئەوەش لەو ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ، كە مەرج نیە هەركەسێك خۆی بە چەوساوە زانیو خۆی بە بێ دەرەتان زانی، وابێ! جاری وایە ئینسان لەخۆوە دەست لە كراسی دەردێنێ، دەڵێ: هیچم پێناكرێ، هیچم لە دەست نایەتو بێ دەرەتانم، بەڵام مەرج نیە وابێ، بە بەڵگەی چی؟! بە بەڵگەی ئەوە كە ئەوانە گوتوویانە: ﴿قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ئێمە بێ دەستەڵات بووین لە زەویدا، بەڵام فریشتەكان پێیان گوتوون: ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا﴾، واتە: ئایا زەمینی خوا فراوان نەبوو، كۆچی تێدا بكەن؟! كەواتە: دیارە ڕاستیان نەكردوە، ئەوەش شتێكی زۆر گرنگە، چونكە زۆر لە مسوڵمانان هەر لەخۆوە دەڵێن: وەڵلا من ناتوانم، ئەوەم لە توانادا نیە، هەر لەخۆوە هەڵخزاوە، تووشی تەنبەڵیو نەتوانین بووە، لە تواناشیدا هەیە، بەڵام هیممەتی نیە، ئا ئەوانە، بە دوو قسەی وا، بە دوو بیانووی وا، خۆیان ناپەڕێننەوە.

**سێیەم:** ڕاستییەكی دیكە كە لەم ئایەتە وەردەگیرێ، ئەوەیە كە هەر كەسێك لە جێیەك ڕێی دینداریی لێ گیرا، پێویستە كۆچ بكاتو لەسەری فەرزە ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێ، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلاَ تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٩٥٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٧٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٩٠٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنن أَبي دَاوُدَ) برقم: (٢٢٤١)، واتە: موعاویە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: كۆچكردن لە پێناوی خوادا كۆتایی پێنایەت هەتاكو (دەرگای) تۆبە دانەخرێ، وە دەرگای تۆبە داناخرێو تۆبەش كۆتایی پێنایەت تاكو خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت، واتە: تا نیشانە گەورەكان دەرنەكەون.

وە لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْعَدُوُّ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٣٧٨)، عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ السَّعْدِيِّ، وَقَالَ: شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيح، وَهذَا إِسناد قَوِي رجالهُ رجال الصحيح)، واتە: کۆچکردن لە پێناوی خوادا کۆتایی نایەت، هەتاکو جەنگ لەگەڵ دوژمندا بکرێ.

ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ باشە ئەدی بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لاَهِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٩١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٦٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٤٨٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٩٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤١٧٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٥٩٢)، واتە: لە دوای ئازادکرانی مەککە کۆچکردن نیە، بەڵام جەنگ کردن هەیەو نیەتی چاك هەیە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە بەنسبەت ئەو ڕۆژگارەوەیە، بەنسبەت شاری مەدینەوە، کە مەدینە مادام بوو بە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیی، وە دوورگەی عەرەبی هەمووی هاتە ژێر کۆنترۆڵی ئیسلامەوە، تازە پێویست ناکات خەڵك بچێ بۆ مەدینە، هەم لە مەککەش مسوڵمانەتیی لێیەو، هەم طائیفو هەم لە شوێنی دیکەش، کەواتە: ئەوە بەنسبەت ئەو کاتەوە بووە، نەك بڵێی بەگشتی کۆچکردن نەماوە، جا ئەوەیە کە تێنەگەیشتن لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە بە ڕواڵەتیو ڕووکەشیی تەماشاکردنیان، ئینسان تووشی هەڵە دەکات، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: تازە هیجرەت نەماوە! نا، بەڵکو بە نسبەت ئەو کاتەوە پێویست ناکات، خەڵك لە طائیفو مەککەوە بچێ بۆ مەدینە، چونکە هەمووی بۆتە مەنزڵگای ئیسلام (دار الإسلام) بەڵام بەنسبەت ئێستاوە، لە شوێنێك مرۆڤ لێی تێکدەچێو ناتوانێ دینداریی بکات، دەبێ بچێ بۆ شوێنێك بتوانێ دینداریی بکات، کۆتایی ئەم مەسەلەیەش بەم قسەیەی (الزمخشري) خاوەنی تەفسیری

(الكشاف) دێنین کە خاوەنی کتێبی (محاسن التأويل)[1] لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: (وَهَذَا دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا كَانَ فِي بَلَدٍ لا يَتَمَكَّنُ فِيهِ مِنْ إِقَامَةِ أَمْرِ دِينِهِ، كَمَا يَجِبُ لِبَعْضِ الأَسْبَابِ وَعَلِمَ أَنَّهُ فِي غَيْرِ بَلَدِهِ أَقْوَم بِحَقِّ اللَّهِ وَأَدْوُم عَلَى العِبَادَةِ، حَقَّتْ عَلَيْهِ الْهِجْرَة)، واتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسێك لە وڵاتێك بۆ نەتوانێ دینەکەی بەرپا بکات وەك پێویست، لەبەر چەند هۆکارێك، وە بشزانێ کە دەتوانێ لە شوێنێکی دیکە زۆر چاك دینداریی بکات، وە باشتر دەتوانێ مافەکانی خوا جێبەجێ بکات، کۆچکردنی لەسەر پێویستە.

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هەرچی شەریعەت فەرمانی پێکردوە، لە کاتو شوێنی خۆیدا جێبەجێی بکەین.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾، خوای پەروەردگار لە ئایەتی پێشوودا باسی ئەوانە دەکات کە توانای دەربازبوونیان هەیە لە ژێر ڕکێفو دەستەڵاتی کوفر، بەڵام لەژێر سایەی شوومی ئەواندا دەمێننەوە، وە دووچاری گوناهبارییو دەستبەرداربوونی بەشێك ئیسلامەتییو دینداریيان دەبن، لەم ئایەتەدا خوا ﷻ باسی کەسانێك دەکات کە چەوساوەو بێ دەرەتانن لە پیاوانو ژنانو منداڵان، دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴾، نە هیچ چارێکیان هەیە، وە نە بە ڕێگاش دەزانن، خۆیان دەرباز بکەن، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ﴾، ئەوانە ڕەنگە خوا لێیان ببووری، واتە: نزیکە

---

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٤٠٣).

خـوا ﷻ چاوپۆشـییان لێبكـات لەسـەر ئـەوە كـە لـە ژێـر دەسـتەڵاتی ئەهلـی كوفردا دەمێننـەوە، ئەم ڕستە قورئانییـە دوو ڕاستیی لـێ وەردەگـیرێن:

**ڕاستیی یەكەم:** كەسێك شـتێكی لـە توانـادا نەبـێ، قەڵەمی عەفوو بـە سـەر ئـەو كـردەوەو ڕەفتـارانەی دادەهێنـرێ، كـە بـە ناچـاریی دەیانكـات، كەسـێك شـتێكی لە توانـادا نەبـێ، وە تووشی سـەرپێچیی ببـێ، بـە هـۆی بـێ توانـایی و بێ دەسـتەڵاتیی و بە ناچاریی، ئەوە دەكەوێتە بەر لـێبوردنی خوای لێبوردەوە، وەك خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ...﴿٢٨٦﴾﴾ البقرة، واتە: خوا لە هیچ كەس داوا ناكات، مەگەر ئەوەی كە لە توانـای دایـە، كەسێك شـتێكی لە توانـادا نەبـێ، پێـی موكەللـەف نیـە، كەسـێك كە ناتوانـێ خۆی دەربـاز بكات لـەژێر دەسـتی ئەهلـی كوفرو بـە ناچـاریی دەمێنێتـەوەو تووشـی ناشـەرعیی دەبـێ، یان تووشـی چواندنی هەنـدێ لـە فـەرزەكان دەبـێ، یان هەندێ شتی قەدەغە ئەنجام دەدات بە ناچـاریی، ئـەوە نـزیكە كـە خـوای بە بەزەیـی لـێی ببووری.

**ڕاسـتیی دووەم:** ئەوەیـە كـە خـوای بەخـشـندە دەفـەرموێ: ﴿عَسَى ٱللَّهُ﴾، وشـەی: ﴿عَسَى﴾، لـە زمـانی عەرەبیـدا واتـە: نـزیكـە، (عَسَى) و (لَعَلَّ) واتە: نـزیكە، ڕەنگـە، لەوانەیـە، بۆچی ئەم وشـەیە بەكـارهاتوە؟ بۆئـەوەی كـە خـوا ﷻ دڵنیایـان نـەكات، كـەوا مـسۆگەر خـوا لێیـان دەبووری، بۆچـی؟ نەوەك كەسێك كە لە تواناشـی دا هـەبێ خۆی دەربـاز بكـات، هەر دەسـت بـە خۆیـدا بەربداتـەوەو خـۆی بـێ دەسـتەڵات بكـاو بمێنێتـەوە، واتـە: ئـەوە دەبێتـە هانـدەریان كـە كـابرا وزەو تینـی خـۆی بخـاتە گـەڕ، كـە خـۆی لـەو واقیعـە دەربـاز بكـات، وە كۆچ بكـات لـە پێنـاوی خواداو وە لـە ژێـر هەیمەنـەو دەسـتەڵاتی ئەهلـی كوفردا نەمێنێتـەوە، چـونكە خـوا ﷻ مـسۆگەرو دڵنیـای نـەكردوە كـە لـێی خۆشـدەبێ، بـەڵكو خـستوویەتە ئەگـەر (إحتمـال)ەوە،

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡ﴾، ئەوانە نزیکە خوا لێیان خۆشبێ، دیارە ئەو ڕەنگەو نزیکەش پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە، چونکە لە لای خوای پەروەردگارەوە شتەکە بڕاوەتەوە، لە کێ خۆشدەبێ، لە کێ خۆشنابێ، بەڵام بە نسبەت ئەوانەوە نەبڕاوەتەوە، کە ئایا کێ کەمتەرخەمیی دەکات، وەبەر عەفوو ناکەوێ، وە کێش کەمتەرخەمیی ناکاتو، هەر ئەوەندەی لە توانادا هەیە، بەر لێبوردنی خوای لێبوردە دەکەوێ، ئەوە مەسەلەیەکی وردە، چونکە یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە خۆ خوای زاناو شارەزا دەزانێ لەو کەسە خۆشدەبێ یان خۆشنابێ، بۆچی فەرموویەتی: (عَسَى) نزیکە، ڕەنگە؟ چونکە ئێمە بۆ شتێك دەڵێین: ڕەنگە، نزیکە، کە دڵنیا نەبین ئەو شتە چۆنە؟ بەڵام خوای پەروەردگار بە مسۆگەریی دەزانێ چۆنە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: کە ئەوە پەیوەندیی بە کردەوەی ئینسانەکانەوە هەیە، ئەوانە پێویستە کۆچ بکەن، جا ئایا هەموو توانای خۆیان خستۆتە گەڕو نەیانتوانیبێ کۆچ بکەن، یاخود کەمتەرخەمییان کردوە؟ کەواتە دوو دڵیی و مسۆگەر نەبوونەکە پەیوەندیی بە مرۆڤەکانەوە هەیە، نەك بە خوای زانا بە هەموو شتێك و شارەزا بە هەموو کەسێك .

<u>**مەسەلەی سێزدەیەم**</u>: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾، هەر کەسێك لە ڕێی خوادا کۆچ بکات، لەسەر زەمیندا مورغەمی زۆری دەستدەکەون، وە فراوانی دەستدەکەوێ (مُـرَاغم جمع مُـرَغَم أي مُهَاجَرا ومُتَحَوَّلاً)، واتە: شوێنێك کە کۆچی بۆ بکات، وە لە شوێنێکەوە لێی بگوازرێتەوە بۆ ئەوێ، وە ڕێگایەك کە پێیدا بڕوا (والَّذِي يَخْرُجُ مِنْ قَوْمِهِ مُراغِمًا، أي: مُغْضِباً لَهُم)، (مُرَاغِم) سیفەتی کەسێکە خەڵکێك بەجێ بهێڵێو لێیان تووڕەبێو بچێ بۆ شوێنێکی دیکەو لەوان دەرباز بێ، واتە: هەر کەسێك لە پێناوی خوادا کۆچ بکات، جێگاو ڕێگایەکی دەستدەکەوێ، کەواتە: ئەمە ماناکەیەتی: هەر کەسێك لە پێناوی خوادا کۆچ

بکاتو سەری خۆی هەڵبگریو ملکەچ نەکات بۆ ئەهلی کوفرو سەریان بۆ شۆڕ نەکاتو سەریان بۆ دانەوێنێ، وە نیشتیمانو ماڵو حاڵی خۆی بەجێ بهێڵێ، با دڵنیابێ خوا ﷻ جێگاو ڕێگایەکی بۆ دابین دەکات، ﴿وَسَعَةً﴾، واتە: فراوانیی لە ڕزقو ڕۆزییدا، فراوانیی لە دڵو دەروونـدا، فراوانی لە هەڵسوکەوتدا، ئەگەر پێشتر لەوێ تەنگی پێ هەڵچنراوە، ئەگەر پێشتر لەوێ پشووی پێ سوار کراوەو نارەحەت کراوە، دوای کۆچکردن دەچێتە فەزایەکی فراوانەوەو لەو سەغڵەتییە دەربازی دەبێ.

بەڵام خوای کاربەجێ بەستوویەتەوە بەچییەوە؟ نەیفەرمووە: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾، هەر کەسێك کۆچ بکات، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ...﴾ دەبێ ئێمە ئەوەمان لەبەرچاوبێ، دەبێ نیەتەکەت بۆ خوا بێو لەبەر خواو لە پێناوی خوا دابێ، ئنجا خوا ئەو بەڵێنەی خۆی دێنێتە دی، کەواتە: ئەگەر کەسێك کۆچی کردو سەری خۆی هەڵگرت، بەڵام نیەتەکەی ساغ نەبوو، بۆ خوا نەبوو، دوایی لەو شوێنەی کە کۆچی بۆ دەکات زیاتر تووشی سەغڵەتیی بوو، ئەوە بابزانێ نیەتەکەی ساغ نیە، چونکە خوای پەروەردگار بە ڕەهایی (مطلق)ی نەیفەرمووە: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾، هەر کەسێك لە ڕێی خوادا کۆچ بکات، ئەوە خوای دەرووکەرەوە جێگاو ڕێگاو ڕزقو ڕۆزییەکی فراوانی بۆ فەراهەم دێنێ.

<u>مەسەلەی چواردەیەم</u>: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾،

ئینسان کە کۆچ دەکاو لە ماڵو حاڵی خۆی دەچێتەدەرو نیشتیمانی خۆی بەجێ دێڵێ، لە دوو حاڵان بە دەرنییە: یان دەگاتە مەنزڵگاو شوێنی خۆی، ئەو شوێنەی کە بۆی دەچێ، یان لە ڕێگادا دەمرێ، ئنجا لە حاڵەتی مانەوەیدا، جێگاو ڕێگای دەستدەکەوێ، وە فراوانیی لە ڕزقو ڕۆزییدا دەستدەکەوێ، یا وانەزانێ یەکی دەکەوێ، وە لە حاڵەتی وەفات کردنیشدا، وەك خوای لێبوردە لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ: وە هەر کەسێك لە ماڵی خۆی کۆچ بکاو بچێتە دەرێو بەرەو خواو پێغەمبەری خوا، دوایی مردنی بگاتە سەر، ئەوە بە تەئکید پاداشتی لەسەر خوایە، چونکە وشەی: (قَدْ) بۆ (تَحْقیق)ە لە زمانی عەرەبیداو لێرەدا (فَقَد) یانی: بە مسۆگەریی پاداشتی کەوتۆتە سەر خوا، وە بێگومان خوا ﷻ لێبوردەیەو بە بەزەییە، لێرەشدا دیسان مەسەلەی نیەت هاتۆتە پێش، نیازو مەبەستت چییە؟ هاندەرو پاڵنەرت چییە؟ ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، هەر کەسێك لە ماڵی خۆی بچێتە دەرێ، کۆچ بکات بەرەو خواو پێغەمبەری خوا، یانی چی؟ واتە: بەرەو ئەو شوێنە کە دەتوانێ لەوێ خوای پەروەردگار لە خۆی ڕازی بکاو فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکات، بەرەو واقیعێك کۆچ بکات کە دەتوانێ دینداریی تێدا بکات، وە کاتێك مسوڵمانان لە مەککەوە کۆچیان کردوە بۆ مەدینە، ڕاستە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە بووە، بەڵام خۆ خوای بێ وێنە، وە نەبێ بڵێی لە مەککە نەبێو لە مەدینە بێ! خوای تاكو پاك لەسەر عەرشی خۆیەتی بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە ڕەزامەندیی خوا لەو شوێنەیە، چونکە لە مەدینە دەیانتوانی دینداریی بکەن، لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا مرۆڤ دەتوانێ بەو شێوەیە دینداریی‌و مسوڵمانەتیی بکات، کە خوا فەرمانی پێکردوە، بەڵام لە مەککە یان نەیاندەتوانی، یان بە نیوە چڵیی دەیانتوانی، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾، بەرەو ئەو شوێنەو ئەو واقیعەی کە

ڕەزامەنـدیی خـواو پێغەمبـەری خـوا لەوێیـە، لـەوبارەوە ئـەم فەرمایـشتەی پێغـەمبەر ﷺ هەیـە: ﴿عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٦٨)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (١)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤٩٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٦٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (٣٤٣٧)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٤٢٢٧)، وَابْنُ خُزَيْمَة بـرقم: (١٤٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٨٨) وَغَيْرُهُم)، واتـە: عومـەری کوڕی خەتتـاب خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: بێگومـان کردەوەکـان بـە پێـی نیـازو مەبەسـتی نێـو دڵـن (مەبەسـت لـە کردەوەکـانیش کـردەوەی شـەرعیی‌و ڕاسـت‌و دروسـتن، ئەگـەرنا کـردەوەی خـراپ مرۆڤ نیـازی بـاش بـێ یـان خـراپ، ئـەوە دیـارە هـەر خراپـە، وەك دەگـێڕنەوە، کـە کەسـێك دز بـووە، دەچـوو دزیـی دەکـرد، دوایـی ئـەوەی دزی بـووی دەیکـردە خێـر! دەیگـوت: خوایـە هـەر ئەوەنـدەم لەدەسـت دێ!! ئـەوە مانای وایە هیچی نەکردوە، تۆ بچی دزیی بکـەی ئنجـا دوایی بیکـەیە خێـر)، وە بۆ هەر کەسێك هەیە بە پێی نیەتەکەی (کەسێك کردەوەیەکی باش ئەنجام دەدات، ئەگەر نیەتی باشی لێ هێنابێ، بۆی قبووڵە، بەڵام ئەگەر نیەتی باشی لێ نەهێنابێ لە جیاتی ئەوەی کردەوەکەی لێ وەربگیرێ، ڕەنگە لەسەری سزاش بدرێ، بۆ وێنە: کەسێك نوێژێك دەکات بە ڕیا، یاخود حەج دەکات بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر متمانەی پێ بکەن، لە کاتی کڕین‌و فرۆشتندا، بڵێن: حاجی تازە هاتۆتەوە لە حەجێ إن شاء اللّه درۆ ناکات! یان کەسێك ڕیشێك دێڵێتەوە، یان شتێکی سەوز دەبەستێ بە ناوی سەیداتی... هتد، هەر شتێك لەو شتانەی کە خەڵك پێیان وایە نیشانەی دینداریی‌و مسوڵمانەتییە بیکات، جا لە ئەسڵدا ئەو شتە لە شەرعدا دانرابێ بە نیشانەی دینداریی: وەك: ڕیش هێشتنەوە، یان دانەنرابێ، وەك: بەرگ‌و پۆشاك کە عورف‌و عادەتی

خەڵکەکە پەیدای کردوە، گرنگ ئەوەیە ئەو کردەوەیەی کە دەیکات، مەبەستی پێی ئەوەبێ کە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، نەك خوا ڕازیی بکات، ئەوە لە جیاتی ئەوەی پاداشتی بدرێتەوە، لەسەری سزا دەدرێ، بەڵام هەر کەسێك کردەوەیەکی باش بکاتو نیەتەکەی بۆ خوا بێ، ئەوە پاداشتی لەسەر وەردەگرێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا وێنەیەك بۆ کردەوە باشەکان دێنێتەوە، دەفەرموێ:) جا هەر کەسێك کۆچکردنەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا بێ (نیەتەکەی وابێ) ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەری خوایە (بەو پێیەی کە نیەتەکەی لێ هێناوە)، بەڵام هەر کەسێك کۆچ کردنەکەی بەو مەبەستو نیازەوەبێ، بەو هاندەرەبێ کە دنیایەکی دەست بکەوێ، بەرژەوەندییەکی دنیایی دەست بکەوێ، یاخود ئافرەتێك مارە بکاتو بێنێ، ئەوە کۆچکردنەکەی بە پێی ئەو نیازو مەبەستەی، کە لە دڵی گرتوە، بۆی دەنووسرێ.

لەبارەی هۆی هاتن (سبب ورود)ی ئەم فەرموودەیەوە ئەم گێڕراوەیە هەیە:

دەڵێن: کابرایەك هەبووە لە مەککە حەزی لە ئافرەتێك کردوە لە مەدینە، ناوی ئوممو لقەیس بووە، ئیدی کابرا لە مەککەوە چووە بۆ مەدینە گوتوویەتی: کۆچم کردوە لە پێناوی خوادا، بەڵام ئەسڵی مەبەستو ئامانجەکەی ئەوە بووە کە ئافرەتەکە بێنێ، جا ئافرەتەکە چ خەڵکی مەککە بووبێ چووبێتە مەدینە، چ هەر خەڵکی مەدینە بووبێ، گرنگ ئەوەیە بۆ ئەو ئافرەتە چووە کە بیخوازێو بیهێنێ، نەك لەبەر خواو لەبەر پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کردبێ، هەندێك دەڵێن لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرمووە[1].

کەواتە: ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بابای کۆچکەر (مهاجر) ئەگەر بڕێو بگاتە مەنزڵگای خۆی، ئەوە وێڕای پاداشتی خوا لە ڕۆژی دواییدا

١) عن ابن مسعود قال: كان فينا رجلٌ خطب امرأة يقال لها: (أم قيس) فأبت أن تزوَّجَهُ حتى يهاجر، فهاجر، فتزوَّجَها، فكنَّا نُسَمِّيه: مهاجر أُمِّ قيس. أخرجه الطبراني في المعجم الكبير: (٨٥٤٠). بڕوانە جامع العلوم والحكم، لإبن رجب الحنبلي، ص: (٣٨).

جێگاو ڕێگاو ڕزقێكی باشی مسۆگەرە، وە ئەگەر بشمرێ بەهەشتو پاداشتی خوای پەروەردگاری مسۆگەرە، كەواتە: لە هەردووك حاڵاندا براوەیە، بە مەرجێك كە نیەتەكەی بۆ خوابێ، لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین: كە دیارە ئێمە كاتی خۆی تووشی كۆچو ئاوارەییو دەربەدەریی بووینو ناڕەحەتییو گرفتاریی زۆرمان بینی، بۆیە نابێ باباى كۆچكەر وا تەصەووڕ بكات كە مادام لەبەر خوا كۆچی كرد، ئەوە حەتمەن لەوێ كۆشكێكی بۆ ڕازاوەتەوە، وە لە هیچ شتێك پەكی ناكەوێ، بەڵكو دەبێ ئەویش ئەهلی قەناعەت بێ، ئێمە كاتی خۆی لە سەردەمی ڕژێمی ڕووخاوی بەعس دا كۆچمان كرد چووینە ئەو شاخو داخو چیاو چۆڵی قەندیلو مەلەكانو خۆشناوەتیو قەرەداغو هەورامانو... هتد، لە پێناوی خوادا كۆچمان كرد، بەلاّم زۆریش ژیانێكی سادەمان هەبوو، جاری وابووە بە سێ چوار مانگ جارێك گۆشتمان دەست نەدەكەوت، بەڵكو جاری وا بوو نانیشمان وەك پێویست دەست نەدەكەوت، كەواتە: مانای وانیە كە خوا دەفەرموێ: جێگاو ڕێگای دەستدەكەوێ، وە فراوانی لە ڕزقو ڕۆزییدا، واتە: سفرەی بۆ ڕازاوەتەوە، جێگاو ڕێگایەكی باشی بۆ ئامادەیە، نا، گرنگ ئەوەیە كە دەربازی دەبێ، وە لە برسان نامرێ، وە ڕاستیشە ئێمە كاتی خۆی كەسمان نەبوو لە برسان بمرێ، بەڵێ برسی بووین، بەلاّم لە برسان نەمردین، وە كەس نەبووە لەبەر بێ جێگاو ڕێگایی پەكی بكەوێ، بەلاّم دەبێ ئینسانیش خاوەنی قەناعەت بێ، وەك چۆن خوای پەروەردگار بەنی ئیسرائیلی بە هۆی مووساوە ﵇ لە ژێر چەكمەو پۆستاڵی فیرعەونو دارو دەستەی فیرعەون دەرباز كرد لە میسر، بەلاّم دوایی كە هاتن بۆ دەشتی سینا، دەبوو بە ژیانێكی سادە مەدار بكەن، ئەوە بوو كە خوای بەخشەر (مَنّ) واتە: گەزۆی بۆ دەبارانـدن لەجیاتی میوەو، وە (سەلوا)ش كە جۆرە باڵندەیەكە وەك كەو، لە جیاتی خۆراك بۆی دابین كردن، بەلاّم ئەوان قەناعەتیان نەدەكرد، خوا لەسەر زمانیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ

وَٰحِدٍ فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَاۖ قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌۚ ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلۡتُمۡۗ ...﴿٦١﴾ ﴾البقـــرة، واتــە: وە یادبکـــەنەوە کاتێك گوتتـان: ئـەی مووسـا ! لەسـەر یـەك جـۆرە خـواردن خۆڕانـاگرین، ئـارام نـاگرین، بۆمـان داوا لـە پەروەردگـارت بکـــە کـە لـە زەوی: سـەوزیو خەیـاریو گەنـمیو نیـسکیو پیـوازی بۆمـان دەربێنـــێ (مووسـاش ﷺ دەفـەرموێ:) ئایـا ئـەوەی کـە خراپـە بـەوەی کـە چـاکە دەیگـۆڕنەوە ! واتـــە: ئایـا ئـەو جـۆرە خواردنـانەتـان دەوێ کـە خـواردنی بـاش نـین، دەشـۆڕبنەوە بـۆ شـارێك (دەبـێ بگـەڕێنەوە ژێـر دەسـتەڵاتی فیـرعەونێك)، ئنجـا ئـەوەتان دەسـتدەکەوێ، واتـە: ئینـسان ئەگـەر بیـــەوێ ژیـانی ســەربەرزانە بگـوزەرێنـــێ، دەبـــێ بـە بژێـــوو خۆراکـی سـادەش ڕازی بـێ، کەواتـە: نـابـێ بـە هەڵـە لـە ئایەتەکـان تێبگـەین، پێمـان وابـــێ کـە هـەر کەسـێك کۆچـی کـرد، پـەکی ناکـــەوێ، گۆشـتی دەبـــێ، خـواردنی دەبـــێ، میـوەی دەبـــێ، جێگـاو ڕێگـای باشـی دەبـــێ، نـوێنو پێخـەفی باشـی دەبـێ ... هتـد، نا، مەرج نیـە، بەڵکو دەبـێ ئـەو بە ژیـانی سـادەو ساکار قەناعەت بکات، جا ئەوکاتە با دڵنیابێ پەکی ناکـەوێ.

<u>مەسـەلەی پازدەیـەم:</u> کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ ﴾، وە هـەر کاتێك بە زەویدا ڕۆیشتن، گوناهتـان ناگـاتـێ کە لە نوێژەکانتان کورت بکەنـەوە، ئەگـەر ترسـان ئەوانـەی بێـبڕوان ئازارتــان بـدەن، لـێرەدا زانایـان کەوتوونـە مـشـتومڕەوە، بۆیـە ئێمـەش تۆزێـك بـە درێـژیی قـسە لەسـەر ئـەم ئایەتـە دەکەینو، وەڵامی دوو ئیشکال دەدەینەوە:

## باسی نوێـژكورتكـردنـەوە لە سـەفەرداو وەڵامـی دوو ئیشـكال

**ئیشـكالی یەكـەم**: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ دوو مەرجی باس كردوون، بۆ ئـەوە كە ئینسان نوێژ كورت بكـاتەوە:

١- ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: ئەگـەر بە سەفەر چوون، كەواتە: مەرجی یەكـەمی نوێـژ كـورتـكـردنەوە، بە سـەفەر چوونـە.

٢- ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، واتـە: ئەگـەر ترسـتان بـوو لەوانـەی بێبـــڕوان، كـە ئازارتـــان بـــدەن، زەبرێكـــتان لـــێ بـــدەن، بۆتـــان هـــەیە نوێژەكـەتان كورت بكـەنەوە، كەواتـە: مـەرجی دووەم بریتیـە لـەوە كە تـرس هـەبێ لە زیـانی بێـبـڕوایـان.

لێرەدا زانایان پرسیارەكەیان ئەوەیە: ئایا ئەگـەر كەسێك ترسی نـەبوو لـە دوژمن، بەڵام بە سەفەر چوو بـوو، بـۆی هەیـە نوێـژ كورت بكاتـەوە، یـان نـا، دەبێ وێڕای سەفەر ترسـیش هـەبێ؟! زۆربـەی هـەرەزۆری زانایـان نـزیك بـە یەكدەنگیی (إجماع) ڕایان وایە كە هـەبوونی تـرس مـەرج نیـەو دەڵێن: ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، وەك ئـەو ڕسـتە قورئانییەیـە كـە لـە سـوورەتی (النسـاء)دا هـاتوە، كە باسی ئەو ئافرەتانە دەكـات كـە لـە پیـاو حـەرامن هاوسەرگـیرییان لەگەڵـدا بكـاتو دەفـەرموێ: ﴿ ... وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ... ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: وە ئەو كچانەی كە لە كۆشـی ئێـوەدا پـەروەردە دەبـن لـەو ئافرەتانـەی كە چوونەتە لایان، واتە: ئەگەر كچێك لە ماڵی تۆدا بەخێوكرابێ، دایكەكەیت مارەكردبێو چووبیتە لای، ئەوە ئەو كچەت لـێ قەدەغەیەو وەك كچی خـۆتی

لێدێ، بە مەرجێك دەفەرموێ: ﴿فِي حُجُورِكُم﴾، ئەو كچانە لە ماڵی ئێوەدا بەخێوكرابن، بەڵام هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە ئەگەر پیاوێك ئافرەتێك مارە بكاتەوە، كچێكی هەبێ، با ئەو كچە لە ماڵی پیاوەكەشدا گەورە نەبووبێ‌و لە شوێنێكی دیكەش بووبێ، كچەكەی هەر لێ قەدەغە دەبێ، ئەدی بۆچی لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فِي حُجُورِكُم﴾؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە ئەو كاتە چونكە بە زۆریی وابووە، ئەو بێوەژنانەی كە مارە كراونەتەوە، كچەكەشیان لەگەڵ خۆیان بردوە، بۆ ماڵی ئەو پیاوەی كە مارەی كردوونەتەوە، واتە: لە كۆش (حِجْر)ی پیاوەكەدا بوون، حاڵەتی حاڵەتی (غالب) وابووە، ئەگەرنا ئەو كچە هەرچەندە لە باوەش‌و لە كۆشی ئەو پیاوەشدا گەورە نەبووبێ، هەر لێی قەدەغە دەبێ.

لێرەشدا ئەوكاتەی ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار، بە زۆریی وابووە مسوڵمانان كە سەفەریان كردوە لە دوژمنیان ترساون، چونكە بە زۆریی لە حاڵەتی جەنگدا بوون لەگەڵ ئەهلی شیرك‌و كوفرو جوولەكەو...هتدا، وەك زانایان تەعبیرێكیان بەكارهێناوە: (خُرِّجَ مَخْرَجَ الغَالِب) ئەم ڕستە قورئانییە دەرچوێنراوە لەسەر شێوەو حاڵەتی باو (غالب)، بە زۆریی وابووە لەوكاتەدا كە مسوڵمانان سەفەریان كردوە، ترسی دوژمنانیان هەبووە، (الشوكاني) لە (فتح القدير)[1]دا، لەوبارەوە گوتوویەتی: زانایانی (أَصول الفقه) بنچینەیەكیان داناوە، كە پێی دەگوترێ: چەمكی پێچەوانە (مفهوم المخالفة)[2]، بۆ وێنە: هەركات خوای پەروەردگار فەرمووی: ئەگەر ئیماندارن، ئەوەتان لەسەر فەرزە، كەواتە: چەمكی پێچەوانەكەی ئەوەیە، كە ئەگەر ئیماندار نەبن لەسەرتان فەرز نیە، لێرەشدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر ترستان هەبوو لە دوژمنانتان،

١) ج: (١)، ص: (٦٧١).

٢) مفهوم المخالفة: هو دلالة اللفظ على ثبوت نقيض حكم المنطوق للمسكوت عنه، الوجيز في أصول الفقه، ص: (٣٦٦)، د. عبدالكريم زيدان.

گوناهـتان ناگاتـێ نوێـژ کورت بکەنـەوە، واتـە: دوو مـەرجی تێـدایە: یەکـەم ئەوەیە کە لە سـەفەرێ بێ، دووەم ئەوەیە کە ترسـی هـەبێ.

پاشـان دەڵـێ: (مَفْهُـومَ الـشَّرْطِ لا يَقْـوَى عَلَـى مُعَارَضَـةِ مَـا تَـوَاتَرَ عَنْـهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ القَصْرِ مَعَ الأَمْنِ) واتـە: چەمکی مـەرج لێـرەدا کە دەفەرموێ: ئەگەر ترستان لە دوژمنان هەبوو، توانای بەرهەڵستییکردنی ئەوەی نیـە کە لەوبـارەوە لـە پێغـەمبەرەوە ﷺ بـە تـەواتور گێڕدراوەتـەوە، کە بەبـێ ترس لە دوژمن هـەبوون، نوێـژی کورت کردۆتـەوە، کە ئایەتەکە وا دەفەرموێ: ئەگەر ترسـتان لە دوژمن هـەبوو، ئەوجـار نوێـژ کورت بکەنـەوە، دەڵێین حاڵـەتی بـاو (غالب) وابووە، ئەگەرنا مـادام لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ هاتوە کە نوێژی کورت کردۆتەوەو ترسیشی لەسـەر نەبـووە، کەواتـە: لێـرەدا ئەو چەمکی مـەرج (مفهوم الشرط)ە، کـاری پێنـاکـرێ، هەڵبـەتە ڕای واش هەر هەیـە کە دەڵـێ: مەرجی کورتـکردنەوەی نوێـژ، ئەوەیـە کە ئینسـان:

<u>یەکەم</u>: ڕێبـوار بـێ.

<u>دووەم</u>: ترسـی دوژمنیشـی هـەبـێ.

بـەڵام بەڕاسـتیی ئـەم ڕایـە ڕایـەکی بێهـێزە، چـونکە ئێمـە فەرمایـشتی پێغەمبـەرمان ﷺ زۆر هـەن، بـە ڕوونیـیو ڕاشـکاویی ئـەوە دەگەیـەنن، کـە پێغەمبـەر ﷺ بـەبێ تـرس هـەبوون لـە دوژمـن، نوێـژی کـورت کردۆتـەوە، ئەمـەش چـەند فەرموودەیـەك لـە بـارەی کورتکردنـەوەی نوێـژە چـوار ڕکاتییەکانەوە لە سەفەردا بەبێ تـرس:

**فەرمایشـتی یەکـەم**: ﴿عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ آمَنَ مَا كَانَ بِمِنًى، رَكْعَتَيْنِ﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (١٠٨٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٩٦)، وفي لفظ: (صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِمِنًى أَكْثَرَ مَا كَانَ النَّاسُ وَآمَنَهُ، رَكْعَتَيْنِ)، واتـە: حاریسـەی کوڕی وەهب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغـەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە مینـا پێکـردین

بـە دوو ڕكــات (واتـە: نوێــژی كـورت) لـە كاتێكـدا كـە زۆر هێمنـیــیو ئاسایش بوە.

لە بێژە (لفظ)ێكی دیكــەدا هــاتوە، كە هەر حاریسـەی كوڕی وەهب خـوا لێـی ڕازی بـێ، گێڕاویەتـەوە دەڵـێ: ﴿صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِمِنًى أَكْثَرَ مَا كَانَ النَّاسُ وَآمَنَهُ رَكْعَتَيْنِ﴾، واتـە: نوێـژی نیــوەڕۆو عەســرم لەگــەڵ پێغــەمبەری خـوادا ﷺ كـرد لـە مینــا لــە حاڵێكـدا كـە زۆرتـرین خەڵـكی لێـبوو (وا دیـارە لـە حـەجیماڵـئاوایی دا بووە) وە زۆر هێمنو ئاسایش بوو، بـە دوو ڕكـات (واتـە: نوێـژی نیــوەڕۆ بە دوو ڕكـات، نوێژی عەسـر بە دوو ڕكـات)، كەواتـە: بـە مـەرج نەگـیراوە كە ترسـت هـەبێ لە دوژمن، ئنجا نوێژ كـورت بكـەیەوە.

**فەرمایشــتی دووەم:** ﴿عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه أَرَأَيْتَ إِقْصَارَ النَّاسِ الصَّلَاةَ، وَإِنَّمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾، فَقَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ الْيَوْمُ، فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بـرقم: (١٦٨)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٥٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٣٠٣٤)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (١٠٦٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٨٨) وَغَيْرُهُم، واتە: یەعلای كوڕی ئومەییە دەڵێ: لە عومەری كوڕی خەتتــابم خوا لـێیان ڕازی بـێ، پرسـی: پێمگوت: قسەی خـوای بـەرز كـە دەفـەرموێ: گوناهتان ناگـاتـێ كە نوێژ كورت بكەنەوە، ئەگەر ترسـتان هەبوو لەوانـەی بێبــڕوان زیانتــان پــێ بگەیـەنن، ئێـستاش خــەڵك كەوتوونـە هێمنیـیو ئاسایـشەوە (یـانی: بۆچـی نوێـژ كـورت دەكەینـەوە؟) عومـەر پێـی گـوتم: منــیش ســەرم ســووڕماوە، لـەوەی تـۆ سـەرت لێـی سـووڕماوە ! لـەوبارەوە

پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە چاكەیەكە خوا لەگەڵی كردوون، چاكەی خوا وەربگرن.

**فەرمایشتی سێیەم:** ﴿عَنْ أُمَيَّةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَالِدِ بْنِ أَسِيدٍ أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ قَصْرَ الصَّلاَةِ فِي السَّفَرِ إِنَّا لاَ نَجِدُهَا فِي كِتَابِ اللَّهِ. إِنَّمَا نَجِدُ ذِكْرَ صَلاَةِ الْخَوْفِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: يَا ابْنَ أَخِي إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَرْسَلَ مُحَمَّدًا ﷺ وَلاَ نَعْلَمُ شَيْئًا فَإِنَّمَا نَفْعَلُ مَا رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ. وَقَصْرُ الصَّلاَةِ فِي السَّفَرِ سُنَّةٌ سَنَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٣٣٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٠٦٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٤٥١) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنن إبن ماجه) برقم: (٨٧٤)، واتە: ئومەییەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی خالیدی كوڕی ئوسەید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پرسیارم لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر كرد خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، گوتم: تۆ دەبینی نوێژ كورتكردنەوەی سەفەرێ، ئێمە لە كتێبی خوادا نوێژ كورتكردنەوە لە سەفەردا نابینین، بەڵكو نوێژی ترس دەبینین (واتە: ئەگەر ترسمان لە دوژمن هەبوو، بۆمان هەیە نوێژ كورت بكەینەوە) عەبدوڵڵای كوڕی عومەر گوتی: ئەی برازام ! خوا موحەممەدی ڕەوانە كرد، ئێمە هیچمان نەدەزانی، ئێستا ئێمە ئەوە دەكەین كە پێغەمبەری خوا ﷺ كردوویەتی، وە نوێژ كورتكردنەوە، ئەو سوننەتەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە.

**فەرمایشتی چوارەم:** ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ فَقُلْتُ: هَلْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: نَعَمْ أَقَمْنَا بِهَا عَشْرًا﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَاللَّفْظُ لِلْبُخَارِيِّ: أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٠٨١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٨٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٢٣٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٤٣٧)، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە

دەرچووین بەرەو مەككە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكانی دوو ڕكات دوو ڕكات دەكردن، هەتا گەڕاینەوە مەدینە، (واتە: چوار ڕكاتییەكان، چونكە نوێژی شێوان كە سێ ڕكاتە كورت ناكرێتەوە، وە نوێژی بەیانیانیش كە دوو ڕكاتە هەر دوو ڕكاتە)، منیش گوتم: ئایا هیچ لە مەككە مایەوە؟ گوتی: بەڵێ، دە شەوان لە مەككە ماینەوە، (ئنجا دوایی گەڕاینەوەو لە ماوەی ئەو دە شەوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكانی هەر كورت دەكردەوە).

**ئیشكالی دووەم**: وە دوایین ئیشكال دەربارەی ڕەوایی كورتكردنەوەی نوێژە چوار ڕكاتییەكان لە سەفەرێ دا، ئەوەیە كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾، گوناهتان ناگاتێ كە لە نوێژەكانتان كورت بكەنەوە، لێرەدا خوا نەیفەرموە، سوننەتە، یاخود مۆڵەتتان هەیە، بەڵكو فەرموویەتی: گوناهتان ناگاتێ، كەواتە: مەرج نیە ڕەوابێ !

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة) وایە، كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ...﴿١٥٨﴾﴾، واتە: بێگومان صەفاو مەڕوە دوو لە درووشمەكانی خواپەرستیی‌و بەندایەتیی بۆ خوان، هەر كەسێك حەجی كرد، یان عومرەی كرد، گوناهی ناگاتێ كە طەوافیان بكات، واتە: بە نێوانیاندا بێت‌و بچێ، كە (سَعِي) پێ دەڵێن، بۆچی؟ چونكە ئەو صەفاو مەڕوەیە كاتی خۆی شوێنی دوو صەنەم بوون، (إِسَاف و نَائِلَة) دوایی هەندێ لە مسوڵمانان پێیان وابوو گوناهیان دەگاتێ لە نێوانیاندا بێن‌و بچن، خوای بە بەزەیی فەرمووی: نەخێر گوناهتان ناگاتێ، لێرەش خوا فەرموویەتی: گوناهتان ناگاتێ ئەگەر نوێژ كورت بكەنەوە، بۆچی؟ چونكە مسوڵمانان عادەت وایە نوێژە چوار ڕكاتییەكان بە تەواویی

دەکەن، ترساون گوناهیان بگاتێ، بۆیە خوا فەرموویەتی: گوناهتان ناگاتێ کە لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە.

مەسەلەی شازدەیەم: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾، لەم ئایەتەدا خوا ﷻ باسی نوێژی ترس دەکات، کاتێك کە مسوڵمانان ترسیان لە دوژمن هەیەو دەیانەوێ نوێژی بە کۆمەڵ بکەن، دەبێ چۆن بیکەن؟ دەفەرموێ: با کۆمەڵێکیان هەڵسن لەگەڵ تۆدا ڕابوەستن، وە کۆمەڵەکەی دیکە لە بەرانبەر دوژمندا بوەستن، زانایان لێرەدا پرسیاریان کردوە: ئایا تەنیا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هەبووە لە کاتی ترس لە دوژمندا ئیمامەتیی‌و پێش نوێژییان بۆ بکات ؟ یاخود هەر پێشەوایەکی مسوڵمانان کە لەگەڵ کۆمەڵێك لە مسوڵمانان دەبێ، کاتێك کە ترسیان لە دوژمن هەیە، بۆی هەیە پێشیان بکەوێ‌و ئیمامەتییان بۆ بکات، لە کاتی نوێژی ترسدا؟ هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵام بێگومان ئەو ڕایە بێهێزە، وە ڕای بەهێز ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچی کردوویەتی، بۆ ئێمەش فەرزە، یان سوننەتە، یان بەلای کەمە ڕەوا (مُباح)یە، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو شتە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺیش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە گوتمان: ﴿صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٦٣٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٣٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٦٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٥٨)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٣٩٧) مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ ﷺ)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: نوێژ بکەن وەك چۆن منتان بینی نوێژم کرد، کەواتە: لە کاتی هێمنیی‌و ئاسایشداو لەکاتی ترسدا پێغەمبەر ﷺ چۆن نوێژی کردوە، ئێمەش بۆمان هەیە، یان لەسەرمان پێویستە، یان بۆمان سوننەتە، بە هەمان شێوە نوێژ بکەین.

## نوێـژی تـــرس

**مەسـەلەی حەڤدەیـەم**: ، ئایـا نوێـژی تـرس (صـلاة الخـوف) بـە چـەند شـێوە دەكـرێ؟ سـەرەتا سـێ قـسەی زانایـان دێنیـن، ئنجـا دێینـە سـەر جۆرەكـانی نوێژی تـرس، كـە زۆر جۆری هـەن:

هـەندێكیان دەڵێـن: سـی (٣٠) جـۆرە.

هـەندێكیان دەڵێـن: شـازدە (١٦) جـۆرە.

هـەندێكیان دەڵێـن: هەشـت (٨) جـۆرە.

هەڵبەتە من پێنـج (٥) جۆریـانم هێنـاوە، بـەڵام پـێش ئـەوە، ئـەم چـەند دەقـە دێنیـن:

**یەكـەم**: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢١٧٧)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٥٧٤)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (١٢٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (٤٥٥)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (١٠٦٨)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٢٨٦٨)، واتە: عەبدوڵـڵای كوڕی عـەبباس خـوا لـە خۆیو بـابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: خوا نوێژی لەسەر پێغەمبەرەكەتان فەرز كردوە، لە حاڵەتی نیـشتەجێبووندا چـوار ڕكـات، (واتـە: نوێـژە چـوار ڕكـاتییەكان) وە لـە سـەفەرێدا دوو ڕكـات، وە لە كـاتی ترسـدا یەك ڕكات.

ئنجـا (الْحَـافِظ اِبْـن حَجَـر) خـاوەنی كتـێبی (فَـتح البَـارِي شَـرح صَـحيح البُخَارِي) وەك (محاسن التأويل)[1]، لێی خواسـتۆتەوە، دەڵـێ: (وَبِالإقْتِصَارِ عَلَى رَكعَةٍ وَاحِدَةٍ فِي الخَوْفِ يَقُـولُ: الثَـورِيُّ وإِسْحَاق وَمَنْ تَبِعَهما، وَقَالَ بِهِ أَبُو هُرَيْـرَة وَأَبُو مُوسَى الأَشْـعَرِيُّ وَغَيْر وَاحِدٍ مِنَ التَّابِعِيْن)، واتـە: وە لـە كاتی ترسـدا ئیكتیفا كردن بە ڕكاتێك، ئـەوە قـسەی ثـەوریی (كـە یەكێكـە

١) ج: (٥)، ص: (٤٣٥).

لەسەر مەزهەبەکان)و ئیسحاقو ئەوانەی کە شوێنیان کەوتوون، هەروەها ئەبو هورەیرەو ئەبو مووسای ئەشعەریی خوا لێیان ڕازی بێ، وە زیاتر لە زانایەك لە زانایانی تابیعین ڕایان وابووە، کە نوێژی ترس یەك ڕکاتە.

**دووەم**: (قرطبي) گوتوویەتی: ﴿وَقَالَ أحْمَد بن حَنْبَل: لاَ أَعْلَمُ أنهُ رَوي فِي صَلاَةُ الخَوْفِ إلاَّ حَدِيثٌ ثَابِتٌ، هِيَ كُلُّهَا ثَابِتَةٌ فَعَلَى أي حَدِيثٍ صَلَّى المُصَلّي صَلاَةَ الخَوْفِ أجزَأهُ إنْ شَاء اللَّه﴾[1]، واتە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویەتی: نەمزانیوە لەبارەی نوێژی ترسەوە جگە لە فەرموودەی ڕاست هیچ فەرموودەیەکی دیکە گێڕدرابێتەوە، وە بابای نوێژکەر بەپێی هەر کام لەو فەرموودانە نوێژی ترسی کرد ئەوە ئەگەر خوا بیەوێ بۆی بەردەکەوێ.

چونکە وەك گوتمان چەند جۆرێك نوێژی ترس گێڕدراوەتەوە، کە دوایی باسیان دەکەین.

**سێیەم**: ئنجا قسەیەکی (الخَطَّابيُّ) لەوبارەوە دێنینەوە: (قَالَ الخَطَّابِيُّ: صَلاَةَ الْخَوْفِ أَنْوَاعٌ صَلاَّهَا رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّه تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَيَّام مُخْتَلِفَةٍ، وَأَشْكَال مُتَبَايِنَةٍ يُتَحَرَّى فِي كُلّهَا مَا هُوَ أَحْوَطُ لِلصَّلاَةِ وَأَبْلَغُ فِي الْحِرَاسَةِ)[2]، واتە: خەتتابی (کە زانایەکی گەورەی زانستی فەرموودەناسییە) دەڵێ: نوێژی ترس چەند جۆرێکە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند ڕۆژێکی جیاوازدا، وە بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر نوێژی ترسی کردوە، وە لە هەموو جۆرەکانی نوێژی ترسدا، ڕەچاوی ئەوە دەکرێ کە کامیان زیاتر بۆ نوێژەکە باشترە، وە کامیشیان بۆ ئێشکگرتنو پاسەوانیی کە لە ڕووی پاراستنی هێمنییو ئاسایشی مسوڵمانانەوە، باشترە، ئەو جۆرە نوێژەیان دەکرێ.

---

١) (الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٢٠).

٢) (الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٢٠).

كە دیارە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی بە چەند جۆرێك كردوە چونكە هەر جارەی حاڵەتەكە بە شێوەیەك بووە، جارێك دوژمن لە قیبلەوە بووە، بە جۆرێك نوێژەكە كراوە، جارێك دوژمن لە پشتیانەوە بووە، بە جۆرێكی دیكە نوێژەكە كراوە، جارێك لە لای ڕاست بووە، جارێك لە لای چەپ بووە، جاری وابووە دوژمن زۆر لێیان دوور نەبووەو ترسیان هەبووە هێرشیان بكەنە سەر، بۆیە بەپێی جیاوازیی ئەو حاڵەتانەی ئەوان تێیكەوتوون، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەكەی گۆڕیوە.

## پێنج شێوە لە شێوەكانی نوێژی ترس

**شێوەی یەكەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الْخَوْفِ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا وَقَامُوا فِي مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ مُقْبِلِينَ عَلَى الْعَدُوِّ، وَجَاءَ أُولَئِكَ ثُمَّ صَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَضَى هَؤُلاَءِ رَكْعَةً وَهَؤُلاَءِ رَكْعَةً﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٦٣٥١)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٤١٣٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٩٣٩)، وَأَبُو دَاوُد بِرقم: (١٢٤٣)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٢٨٧٩)، وَالنَّسائيُّ بِرقم: (١٥٣٧)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی ترسی كرد مسوڵمانانی كردنە دوو بەشەوە، بە كۆمەڵێكیان ڕكاتێكی كرد، وە كۆمەڵەكەی دیكە لە بەرانبەری دوژمن بوون، دوایی ئەوانەی ڕكاتەكەی پێكردن، ڕۆیشتن بۆ بەرانبەری دوژمن، وە لە شوێنی ئەوانەی دیكە ڕاوەستانو ڕوویان لە دوژمن كرد، كۆمەڵەكەی دیكە هاتن پێغەمبەری خوا ﷺ ڕكاتێكیشی بەوان كرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە، دوایی ئەوانەی لە خزمەتی دابوون ڕكاتێكیان بۆخۆیان كرد، ئەوانی دیكەش دوایی بۆخۆیان ڕكاتێكیان كرد.

**شێوەی دووەم:** ﴿ وَعَنْ حُذَيْفَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى صَلاةَ الْخَوْفِ بِهَؤُلاءِ رَكْعَةً، وَبِهَؤُلاءِ رَكْعَةً، وَلَمْ يَقْضُوا ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد بِرقم: (١٢٤٨)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (١٥٣٠)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٤٥٢)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (١٣٤٤) وَصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: حوزیفەو ئەبو هورەیرەو عەبدوڵلای كوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای مسوڵمانانی كردۆتە دوو بەش، بە هەر كام لەم دوو بەشە ڕكاتێكی كردوە، وە دوایی ڕكاتەكەی دیكەیان نەگێڕاوەتەوە. واتە: یەكی یەك ڕكاتیان كردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ وا دیارە دوو ڕكاتی كردوون.

**شێوەی سێیەم:** ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: فَصَلَّى بِطَائِفَةٍ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ تَأَخَّرُوا وَصَلَّى بِالطَّائِفَةِ الأُخْرَى رَكْعَتَيْنِ، قَالَ فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ وَلِلْقَوْمِ رَكْعَتَانِ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٤٩٧٠)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٤١٣٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٩٤٦)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٢٨٨٣)، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە كۆمەڵێكیان دوو ڕكاتی كردوونو دوایی ئەوان لاچوون، پاشان بە كۆمەڵەكەی دیكەش دوو ڕكاتی كردن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕكاتی كردن، ئەوانیش یەكی دوو ڕكات دوو ڕكاتیان كرد.

**شێوەی چوارەم:** ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِطَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى بِآخَرِينَ أَيْضًا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ﴾ (أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (١٥٥٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنَن النَّسَائي)، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕكاتی بە كۆمەڵێكیان كردو سەلامی دایەوە، پاشان دوو ڕكاتی بە كۆمەڵەكەی دیكەش كردو سەلامی دایەوە.

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو نوێژی کردوون، ئەوەی پێشێیان - واتە: جۆری سێیەم - دیارە پێغەمبەر سەلامی نەداوەتەوە، دوو ڕکاتی بۆ کۆمەڵێکیان کردوون، ئەوان ڕۆیشتوون دوایی دوو ڕکاتی بۆ کۆمەڵەکەی دیکە کردوەو، یەکجار سەلامی داوەتەوە، بەڵام لەمیان - لە جۆری چوارەم - دا دووجار سەلامی داوەتەوە.

**شێوەی پێنجەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا إِذَا كَانَ الخَوْفُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ صَلَّى رَاكِبًا وَقَائِمًا يُومِيُ إِيْمَاءً﴾ (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٩٤٣)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٩٤١)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئەگەر ترس لەوە زیاتر بێ، (نەیانتوانی ئاوا بە کۆمەڵ بەو شێوەیە نوێژ بکەن) بابای جەنگاوەری مسوڵمان نوێژەکەی دەکات بە سواریی یان بە پێوە، یان لە حاڵەتی ڕۆیشتندا، دیارە لە حاڵەتی سواربوونی وڵاخ، یان سەیارەدا ئاماژە دەکات، مەرج نیە بچێتە سەجدەو ڕکووعەوە، وەك خوای پەروەردگاریش زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی:

﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾،
واتە: پارێزگاریی بکەن لەسەر نوێژەکان، وە نوێژی نێوەڕاست (کە زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست پێی نوێژی عەسرە) وە بۆ خوا بە ملکەچیی ڕابوەستن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ۖ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾﴾البقـرة، واتـە: ئەگەر ترستان هەبوو لە دوژمن لە کاتی نوێژدا بە پێوە، یان بە سواریی، وە ئەگەر ترستان نەماو هێمن بوونەوە، یادی خوا بکەن وەك چۆن فێری کردوون کە یادی خوا بکەن، کە نەتاندەزانی.

ئنجا دەربارەی حاڵەتی تێکچڕژانی سوپای کوفرو ئیسلام لە کاتی جەنگدا کە زۆر خەست دەبێتەوە، کە من بۆخۆم ئەو حاڵەتەم بەسەر هاتوە،

قسەیەکی (قُرطُبي) دێنین، دەڵێ: (وَاخْتُلَفُوا فِي صَلاَةِ الخَوْفِ عِنْدَ التِحَامِ الحَرْبِ وَشِدَّةِ القِتَالِ وَخَيْفِ خُروجِ الوَقْتِ، فَقَالَ مَالِكُ وَالثوريُّ وَالأوزَاعِي وَالشَّافِعِيُّ وَعَامَةِ العُلَمَاءِ: يُصَلِّي كَيْفَمَا أَمْكَن، وَدَلِيلُهُم حَدِيثٌ ابْنُ عُمَرَ السابق، وَقَالَ أَبُو حَنِيفَة وَأَصْحَابُهُ مُتَّفقُونَ عَلَى أنَّهُم لاَ يُصَلُّونَ وَالحَالَةُ هَذِهِ بَلْ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَة، وَدَلِيلُهُم: رَوى البُخَارِي عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: جَاءَ عُمَرُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ وَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا صَلَّيْتُ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ الشَّمْسُ أَنْ تَغِيبَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا بَعْدُ قَالَ: فَنَزَلَ إِلَى بُطْحَانَ فَتَوَضَّأَ، وَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَابَتْ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ بَعْدَهَا)[١]، واتە: زانایان کەوتوونەتە ڕاجیایی یەوە دەربارەی نوێژی ترس، لە کاتی تێکچڕژان، کە کوشتارو جەنگ زۆر خەست دەبێتەوە، وە ئەگەر مەترسییش هەبوو لەوەی هەتا ئەو جەنگە کۆتایی دێ، کاتی نوێژەکە بەسەر بچێ، (مَالِك والثوري والأوزَاعِي والشّافعي)و زانایان بە گشتی گوتوویانە: چۆن بۆی گونجا نوێژەکەی دەکات، (کە هەر ئەم ڕایەش ڕاستە)، بەڵگەشیان فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی عومەرە، کە پێشتر هێنامان بەڵام ئەبو حەنیفەو هاوەڵانی دەڵێن: لەو حاڵەتەدا بابای جەنگاوەر نوێژ ناکات، بەڵکو نوێژەکەیان دوا دەخەن، هەتا هێمن دەبنەوە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، لە ڕۆژی خەندەق دا (واتە: جەنگی ئەحزاب) هات قسەی بە کافرەکانی قوڕەیش دەگوت، دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ نوێژی عەسرم نەکرد هەتا نزیك بوو خۆر ئاوابێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە خوا تا ئێستا منیش نوێژی عەسرم نەکردوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی بۆ بوطحان (کە شوێنێك بووە)، دەستنوێژی گرتو نوێژی عەسری کرد، دوای ئەوەی کە خۆر ئاوا بوو، (واتە: نوێژی شێوان بوو بوو)، ئنجا دوای عەسر نوێژی شێوانیشی کرد.

---

١) (الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٢٤).

هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە:

﴿ وَقَالَ أَنَس بن مَالِكٍ رضي الله عنه حَضَرْتُ مُنَاهَضَةَ حِصْنِ تُسْتُرَ عِنْدَ إِضَاءَةِ الفَجْرِ، واشْتَدَّ اشْتِعَالُ القِتالِ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى الصَّلاَةِ، فَلَمْ نُصَلِّ إلاَّ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ، فَصَلَّيْناهَا وَنَحْنُ مَعَ أبِي مُوسَى فَفُتِحَ لنَا، قَالَ أنَسٌ: وَمَا يَسُرُّنِي بِتِلْكَ الصَّلاَةِ الدُّنْيا وَمَا فِيهَا﴾ رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٩٤٤)، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: من ئامادە بووم لە کاتی ئابڵووقەدانی قەڵای (توستور)دا کە (قەڵایەکە کاتی خۆی لە ئێران بووە) لەکاتی بەرەبەیاندا جەنگ زۆر گەرم بوو، نەیانتوانی نوێژ بکەن و نوێژەکەیان بۆ نەکرا (ئەگەر نوێژیان کردبایە تێکدەشکان، یان قەڵاکەیان بۆ نەدەگیراو ئیشی چەند ڕۆژەیان دەچۆوە هیچ) هەتاکو ڕۆژ بەرزبۆوە (چونکە هەر خەریکی گرتنی قەڵاکە بوون) دوای ئەوە گەیشتینە حاڵەتی چێشتەنگاو یان دەمەو نیوەڕۆ، ئنجا نوێژەکە (نوێژی بەیانی)مان کرد، وە ئێمە (لەو جەنگەدا) لەگەڵ ئەبو مووسای ئەشعەریی بووین خوا لێی ڕازی بێو قەڵاکەمان گرت، ئەنەس دەڵێ: من دڵخۆش نیم کە بەو نوێژە دنیاو هەرچی لە دنیادا هەیە بمدەنێ‌و، ئەو نوێژەیان بدەمێ، نایگۆڕمەوە.

واتە: هێندە ئومێدم بەو نوێژە هەیە کە لە وەختی خۆیشیدا نەکراوە، بەڵام لەو کاتەدا دیارە شتێکی لە نوێژی پێویستتر لە ئارادا بووە کە بەرژەوەندیی ئیسلام‌و مسوڵمانانی پێوە پەیوەست بووە.

من پێمـوایە مەسەلەکە ئاوایە کە جاری وایە مرۆڤ بە ئیشارەتیش بۆی ناکرێ، شەڕەکە هێندە گەرمەو هێندە خەست بۆتەوە، بۆیە بە ناچاریی دەبێ نوێژەکەی دوا بخات‌و ئەوەش مەجالی تێدا هەیە، وە ئەگەر دەرفەتیش بوو، دەتوانێ بەو شێوەیەی کە بۆی گونجا نوێژەکە بکات.

ئەوەش بەڵگەی قسەی ئەبو حەنیفەو هاوەڵەکانی کە لە حاڵی وادا نوێژەکەیان ناکەن، تاکو لێ دەبنەوە.

بەلاّم من پێموایە قسەکەی ئەبو حەنیفە بۆ حالّەتێکە کە زۆر کەوتبنە نێو جەنگەوە، هیچ نەپەڕژێنە سەر خوێندنی تەحییاتو، بە ئاماژەش نەتوانن‌و، لەگەلّ دوژمنندا دەستەو یەخە بووبن، یاخود زۆر کوشتارو شەڕێکی خەست بێ، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەندەقدا حالّەتەکەیان وابووەو[1] نوێژەکەیان دواخستوە، بەلاّم لە حالّێکدا کە وانەبێ‌و بۆیان بکرێ بە ئاماژە بیکەن، بە پێیان، یاخود بە سوارییەوە، بەگوێرەی حەدیسەکانی دیکە، نوێژەکەیان دەکەن.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** لەم مەسەلەیەدا چەند بابەتێك باس دەکەین:

## چەند بابەتێکی مشتومڕ هەلّگر

**یەکەم:** ماوەی کورتکردنەوەی نوێژەکان، واتە: نوێژە چوار ڕکاتییەکان:

دەبێ ماوەی ئەو سەفەرە چەند بێ، ئنجا بۆیان هەیە نوێژە چوار ڕکاتییەکان کورت بکەنەوە؟ من لە کتێبی (خوا پەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا) لە بەرگی (٢) لە لاپەڕە (٢٧٧) تاکو (٢٨٦)دا، باسم کردوە کە ئەم مەسەلەیە ڕاجیایی زانایانی لەسەرەو ڕاجیایی یەکەیان بەمجۆرە:

١) مالیکییەکان‌و شافیعییەکان‌و حەنبەلییەکان دەلّێن: دەبێ سەفەرەکە چوار بەرید، یان شازدە فەرسخ ببێ، کە دەکاتە چل‌و هەشت میل، ئەویش دەکاتە: هەشتاو هەشت کیلۆمەترو حەوت سەدو چوار مەتر {٨٨ کلم‌و (٧٠٤)م}، ماوەکە دەبێ ئەوەندە ببێ، ئنجا بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە.

٢) بەلاّم حەنەفییەکان بە مەسافە دیارییان نەکردوە، بەلّکو بە کات دیارییان کردوە، دەلّێن: دەبێ ماوەی سەفەرەکە سێ ڕۆژە ڕێ ببێ، بە ڕۆیشتنی ولاّخ‌و بار لە کورتترین ڕۆژەکانی سالّدا، لە بەیانییەوە تاکو نیوەڕۆ، کە

---

١) دیارە لە جەنگی خەندەق دا کوشتاری وا نەبووە، بەلاّم لە حالّەتی ئابلّووقەدران دا بوون‌و زۆر سەرقالّ بوون.

ئەویش هەر دەكاتەوە ئەو دەوروبەرە.

٣) ظاهیرییەكان دەڵێن: ئەگەر لە ماوەی یەك میلیشدابێ، ئینسان مادام بە سەفەر بچێ، ئەگەر مەسافەكە یەك (میل)یش بێ، واتە: (١٧٠٠ یان ١٨٠٠ یان ١٦٠٠) مەتر، بۆی هەیە نوێژ كورت بكاتەوە، لە (بدایة الْمُجتهد)[1]دا هەموو ئەو ڕایانە هێنراون.

وە ئەوەی كە من بە ڕاستی دەزانم لەوبارەوە، بە پێی دەقی ئایەتەكە كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئەگەر لە ڕێی خوادا ڕۆیشتن، بە سەفەر چوون، مانای وایە هەموو جۆرە سەفەرێك دروستە نوێژی تێدا كورت بكرێتەوە، پاشان ئەم دوو دەقەی سوننەت كە ئێستا دەیانهێنین، بەڵگەن لەسەر ئەوە كە هەموو جۆرە سەفەرێك كە پێی گوترا سەفەر، دروستە نوێژی تێدا كورت بكرێتەوە:

**فەرمایشتی یەكەم:** ﴿ وَقَالَ عَنْ يَحْيَى بْنِ يَزِيدَ الْهُنَائِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه عَنْ قَصْرِ الصَّلاَةِ، فَقَالَ: أَنَسٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلاَثَةِ أَمْيَالٍ أَوْ ثَلاَثَةِ فَرَاسِخَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٢٣٣٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٥٨١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٢٠١)، واتە: یەحیای كوڕی زەیدی هونائیی دەڵێ: لە ئەنەسی كوڕی مالیكم پرسی دەربارەی نوێژ كورتكردنەوە، ئەنەس گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سێ میل، یان سێ فەرسخ لە ماڵ دەرچووباو دووركەوتبایەوە، نوێژی كورت دەكردەوە.

**فەرمایشتی دووەم:** ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَافَرَ فَرْسَخًا يَقْصِرُ الصَّلاَةَ﴾ أَخْرَجَهُ سعيد بْنُ مَنصور ذَكَرَهُ الحافظ في " التلخيص " وَأَقَرَّهُ بِسُكُوتِهِ عَلَيْهِ)، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی

---

١) ج: (١)، ص: (١٧١).

خـوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ ئەگـەر فەرسـەخێك (واتـە: سـێ میـل) بە سـەفەر چووبـا، نوێـژی كـورت دەكردەوە.

ئنجا ئێمە دەتـوانین بـۆ دووربینیـی (إحتیـاط) بڵێین: بـا سـێ فەرسـخ بـێ واتـە: نـۆ میـل، وە هـەر میلـێك دەكـاتە: (١٨٤٨)، بـە پێـی بـاوترین پێوانـە، كەواتە: نۆ میـل، واتە: شـازدە (١٦) كیلـۆمەترو شـەش سـەدو سـیو دوو مـەتر، كـە ئـەویش دەكاتـە: (١٦٦٣٢) مـەتر، هـەركات مـاوەی شـازدە كیلۆمـەتر بـە مەبەسـتی سـەفەر لە مـاڵ دەرچوو، بـۆی هەیـە نوێـژ كورت بكـاتەوە.

ئنجا مادام شەرع دیاریی نـەكردوە كە سـەفەر دەبـێ چەندبـێ؟ كەواتـە بـۆ چەمـك و واتای سـەفەر دەبـێ بگـەڕێینەوە بۆ زمانی عـەرەبی، وە بۆ عـورفو بـاوی خـەڵك، كـە دیـارە لـە زمـاندا چەمـكو واتـای وشـەی (سـفر) دیـاریی نەكراوە، بۆیە دەڵێین: سـەفەر بەپێـی عـورفو بـاوی خـەڵك هەرچـەندی بـوو، كـەم یـان زۆر، دەڵێین سـەفەرە، بـەڵام بـە هـەر حـاڵ دەگونجـێ بـۆ دووربینیـی (إحتیـاط) پـازدە (١٥) كیلـۆمەتر بـە پـشـتەوە بـە سـەفەر دابنـرێ، دروسـتە نوێـژ لـەو ماوەیـەدا كـورت بكرێتـەوە، وە ئـەم ڕایـە ڕای (إبـن تیمیـة)[١] و (شوكاني)[٢]، (إبن حزم)[٣] و (إبن قدامة المقدسي)[٤] و (صدیق بـن حسن خاني القنوجي) له (الروضة الندیة)[٥] داو (صَنْعَاني) له (العِدّة على إحكامِ الأحكام، شرح عُمْدة الأحكام)[٦] وه (د. وهبـة الزحیلـي)یـش لـه (الفقـه الإسلامي وأدلتها)[٧]، تا ڕاددەیـەك ڕای ئەویشـە.

١) مجموعة الفتاوى، ج: (٢٤)، ص: (١٠ - ٧٦).
٢) نیل الأوطار: (٣)، ص: (٢٥٢).
٣) المحلّى شرح المجلّى، ج: (٥)، ص: (٥)، مسألة: (٥١٣).
٤) المُغْني : ج(٢)، ص: (٩٤ و ٩٥).
٥) الروضة الندیة: ج(١)، ص: (٢٨٨).
٦) العِدَّة على الحكام شرح عمدة الأحكام، ج: (٢)، ص: (٤٩١).
٧) الفقه الإسلامي وأدلّته، ج: (٢)، ص: (١٣٤٤).

**دووەم**: ماوەی دروست بوونی کورت کردنەوەی نوێژەکان:

ئەمیش دیسان ڕا جیایی زانایانی لەسەرە، کە ئایا ڕێبوار (مسافر) ماوەی چەندی بۆ هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە؟

### کە ئەمە پوختەو گوشراوی ڕاجیایی یەکەیانە :

١- ئەگەر کاتی گەڕانەوەی دیار نەبێ، هەر ئەمڕۆ ئەمڕۆی بێ، یانی چووە بۆ سەفەرێو نازانێ کەی لە سەفەر دەگەڕێتەوە، ئەوە جگە لە شافیعی لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا، کە دەڵێ: (١٧ یان ١٨) ڕۆژ بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، مادام نەزانێ کەی دەگەڕێتەوە، بەڵام بەشێك لە زانایانی دیکە کاتێکی تایبەتیان دیاری نەکردوە، گوتوویانە چەند بمێنێتەوە، بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە.

٢- بەڵام ئەگەر بزانێ چەند دەمێنێتەوە، ئەوە (سُفیان الثوري وأبو حنیفة) دەڵێن: مادام نیازی مانەوەی کەمتر لە پازدە ڕۆژی هەبێ، بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە، واتە: مادام بزانێ لە پازدە ڕۆژ کەمتر دەمێنێتەوە، چواردە ڕۆژ، یان سێزدە ڕۆژ، یان حەفتەیەك، بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، بەڵام ئەگەر زانی لە پازدە ڕۆژ زیاتر دەمێنێتەوە، ئەوە بۆی نیە نوێژ کورت بکاتەوە، بەڵام مالیکییەکانو شافیعییەکان دەڵێن: ئەگەر نیازی لە سێ ڕۆژ زیاتر مانەوەی هەبوو، بە مسۆگەریی زانی لە سێ ڕۆژ زیاتر دەمێنێتەوە، بۆی نیە نوێژ کورت بکاتەوە، بەڵام ئەگەر زانی سێ ڕۆژ یان کەمتر دەمێنێتەوە، ئەوە بۆی هەیە واتە: ئەگەر زانی چوار ڕۆژ یان پێنج ڕۆژ یان زیاتر دەمێنێتەوە، ئەوە بۆی نیە کورتیان بکاتەوە، بەڵام ئەگەر زانی سێ ڕۆژ یان دوو ڕۆژ یان یەك ڕۆژ دەمێنێتەوە، ئەوە بۆی هەیە، هەندێکیش دەڵێن: تا لە سەفەربێ بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە، وە لەڕاستییدا لەوبارەوە ئێمە بەڵگەیەکی

یەکلاییکەرەوەمان نییە کە ماوەی کورتکردنەوە (قَصر)ی نوێژەکان دیاریی بکات[1].

**سێیەم**: دەربارەی کۆکردنەوە (جَمْع)ی نوێژەکان:

لەوبارەوە زانایان زۆربەیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە لە کاتی سەفەردا نوێژەکان کۆدەکرێنەوە، یانی: نوێژی شێوانو خەوتنان، لە کاتی نوێژی شێواندا، یاخود لە کاتی نوێژی خەوتناندا دەکرێن (جَمْعُ تقديمٍ) یان (جَمْعُ تأخِيرٍ)، هەروەها نیوەڕۆ عەسر بە هەمان شێوە، نیوەڕۆ بێنیە لای عەسر، واتە: (جمع تأخير)، یان عەسر ببەیە لای نیوەڕۆ (جمع تقديم)، ئەگەر لە سەفەر بێ چوار ڕکاتەکان دەکەیەوە بە دوو، وە پێکەوەش کۆیان دەکەیەوە، دیارە هەر نوێژەو قامەتی خۆی بۆ دەخوێنرێ، لە کاتی سەفەردا.

وە لە کاتی سەرماو باران باریندا، بۆت هەیە نوێژ کۆبکەیەوە، بەڵام بۆت نیە کورتیان بکەیەوە، مادام لە سەفەر نەبی، وە لە کاتی نەخۆشیی و نەتوانیندا بۆت هەیە نوێژەکان کۆبکەیەوە، واتە: شێوانو خەوتنان، وە نیوەڕۆو عەسر، وە ئەگەر مرۆڤ کارێکی تایبەتیشی هەبێ بەمەرجێك نەیکاتە عادەت، بەڵکو هەرکات پێویست بکات، بۆ وێنە: میوانێکی هەیە، یان وەعدێکی هەیە، یان کۆبوونەوەیەکی هەیە، یان کارێکی پێویستی هەیە، دیسان بۆی هەیە نوێژەکان کۆبکاتەوە، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەوبارەوە؟ ئەم دەقەیە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ، قيلَ: لاِبْنِ عَبَّاسٍ لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ كَي لاَ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ﴾ (أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (١٦٢٧)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە نیوەڕۆو عەسری پێکەوە کردن، وە خەوتنانو شێوانیشی پێکەوە

---

١) بڕوانە: خواپەرستی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا، بەرگی: (٢)، لاپەڕە: (٢٨٢و ٢٨٣)، چاپی دووەم : (٢٠٠٩)

کردن، بێئەوەی کە ترس هەبێ لە دوژمن، وە بێئەوەی باران و سەرماش هەبێ، بە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی وایکرد؟ مەبەستی چی بوو؟ گوتی: مەبەستی ئەوە بوو کە ئۆممەتەکەی سەغڵەت نەکات و، هەرکات پێویست بوو نوێژەکانیان ئاوا بکەن.

ئنجا تەماشا بکەن ! ئەو پێغەمبەرە ﷺ! بە خۆڕایی خوا نەیفەرمووە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء، واتە: وە ئێمە تۆمان نەناردوە مەگەر بە ڕەحمەت بۆ جیهانییان، وە ئەم ئیسلامە ئەگەر وەکو خۆی تێیبگەین، وە فەتواکانی زانایان، ئەوانەی کە لە حاڵەتی جیاجیادا فتوایانداوەو قسەیان کردوە، لە خۆمانیان نەکەینە دین و دەستو پێی خۆمانیان پێ نەبەستین، بەڵکو بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت، ئەوە بەڕاستیی ئیسلام زۆر لەگەڵ فیطرەتی ئینسان و وە لەگەڵ ژیانی ئینساندا گونجاوەو ئینسان سەغڵەت ناکات.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرمویێ: ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ تَغۡفُلُونَ عَنۡ أَسۡلِحَتِكُمۡ وَأَمۡتِعَتِكُمۡ فَيَمِيلُونَ عَلَيۡكُم مَّيۡلَةٗ وَٰحِدَةٗ﴾، ئەوانەی بێبڕوان حەزیان دەکرد کە لە چەکەکانتان و لە کەلوپەلەکانتان بێ ئاگابن، ئنجا بە یەکجار هێرشتان بکەنە سەر، ئەم ڕستەیە سێ ڕاستیی لێ وەردەگیرێن:

**ڕاستیی یەکەم:** هەمیشە دوژمنان بۆ ئێوە لە بۆسەدان، وە دەبێ ئێوەش هەمیشە چوار چاوو وریابن، دوژمن لە غەفڵەتدا زەفەرت پێدەبات، بەتایبەتی لە کاتی جەنگدا، کە لێرەدا مەبەست کاتی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەیە.

**ڕاستیی دووەم:** خوای پەروەردگار وێڕای چەك (أَسلِحَة)ە، باسی کەلوپەل (أمْتِعَة)شی کردوە، دەفەرمویێ: ﴿أَسۡلِحَتِكُمۡ وَأَمۡتِعَتِكُمۡ﴾، چونکە کەلوپەلیش، ئنجا سەیارەیە، وڵاخە، خواردن و خۆراکە ... هتد، ئەویش وەك چۆن پێویستیت بە چەك هەیە، ئاوا پێویستیت بە کەلوپەلەکەش

هەیە، هەردووكیان بۆ ئینسانی جەنگاوەر پێویستن، هەندێ جار جەنگاوەر یەكی لەسەر مەتارە ئاوێك دەكەوێ.

**ڕاستیی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە یەكجار هێرش بردن دەبێتە هۆی شكست هێنان، یانی ئەوە پلانێكی جەنگییە، كە هێزەكان هەموو كۆبكەیەوە، بە یەكجار هێرش بەری، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی كە زەفەر بە دوژمن ببەی.

**مەسەلەی بیستەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ أَن تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ﴾، پێشتریش باسمان كرد ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَزَلَت: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ ...﴾ فِي عَبْدُ الرَّحمَن بْنِ عَوْفٍ حينَمَا كَانَ جَرِيْحَاً﴾ (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٥٩٩)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (١١١٢١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٢٠٢) تَعلِيق الذهبي في التلخيص: صَحيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي وَمُسْلِم)، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ ...﴾، واتە: ئەگەر ئازارتان هەبوو، بە هۆی بارانەوە لەشتان تەڕ بوو، یان نەخۆش بوون هیچ گوناهتان ناگاتێ، ئەگەر چەكەكانتان دابنێن، دەربارەی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف هاتە خوارێ، لە كاتێكدا كە بریندار بوو، ئەم ڕستە قورئانییە بۆ ئەو بووە بە تایبەت، بەڵام لە دوای ئەویش بۆ هەر كەسێكە كە لە حاڵەتیكی وەك ئەودابێ، كە بە هۆی سەرماوە نەخۆش بووە، یان بێهێزە، یاخود برینداروە ناگونجێ چەكەكەی هەر پێبێ لە كاتی نوێژدا، قەیناكا كە چەكی پێنەبێ، بەڵام ئەوانی دیكە دەبێ چەكەكەیان هەر پێبێ.

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾، ئەگەر نوێژتان تەواو کرد، یادی خوا بکەن بە پێوە بە دانیشتنەوە وە لەسەر تەنیشتتان، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾﴾الأنفال، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر بە کۆمەڵێك لە دوژمنتان گەیشتن، بچەسپێن، چەسپاوبنو پشتیان تێمەکەن، وە یادی خوا زۆر بکەن، بەڵکو سەرفرازبن، لێرەشدا خوا دەفەرموێ: ئەگەر نوێژی ترستان تەواو کرد، یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتتان، ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئینسان هەموو کاتێك پێویستیی بەوە هەیە لەگەڵ خوادا پەیوەندیی مەحکەم بێ، بەتایبەتی لە کاتی جەنگو جیهاددا، کە ترسو گەرماو سەرماو نارەحەتیی هەیە، هەتا پەیوەندیی لەگەڵ خوادا مەحکەمتر بێ، لە بەرانبەر دوژمندا چەسپاوتر دەبێ، بۆیە لە ئایەتی ژمارە (٣٥)ی سوورەتی (الأنفال) دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئەگەر گەیشتن بە کۆمەڵێك لە دوژمنانتان چەسپاوبن، وە زۆر یادی خوا بکەن بۆئەوەی سەرفرازبن، بەڵێ کەسێك زۆر یادی خوا بکات، لە دوژمن بێباكو بێ ترس دەبێ، پێ چەسپاو دەبێ لە مەیداندا.

**مەسەلەی بیستو دووەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، ئەگەر ئارام بوونەوە نوێژ بەرپاکەن، واتە: لەکاتی ترسدا بەو شێوەیە بیکەن، بەڵام کە هێمن بوونەوە، لە حاڵەتی ئاساییدا، ئەو نوێژە بکەن کە لە حاڵەتی ئاساییدا لەسەرتان فەرز کراوە، ئەمە وەك ئەو ڕستە قورئانیە وایە کە دەفەرموێ: ﴿... فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم

مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ ﴾البقرة، واتە: ... ئەگەر هێمن بوونەوە یادی خوا بکەن، (واتە: نوێژ بکەن) بەو شێوەیەی کە خوا فێری کردوون، واتە: لە حاڵەتی ئاساییدا نوێژی ئاسایی دەکرێ‌و، لە حاڵەتی ترسدا، یاخود لە سەفەردا، ئەو نوێژە دەکرێ کە شەریعەت دیاری کردوە.

**مەسەلەی بیست‌و سێیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴾، واتە: بێگومان نوێژ لەسەر ئیمانداران نووسراوە، یاخود پێویست کراوە وە کاتی بۆ دیاری کراوە، یانی: لە کاتی خۆیدا نوێژەکانتان بکەن، بەڵام لە کاتی سەفەردا بۆتان هەیە کۆیان بکەنەوەو کورتیان بکەنەوە، هەروەها لە کاتی ترسدا، ئەگەرنا لە حاڵەتی هێمنیی‌و ئاساییشدا، پێویستە لە کاتی خۆیاندا بکرێن، چونکە خوای پەروەردگار نوێژی لەسەر ئیمانداران پێویست کردوە لە کاتێکی دیاریکراودا، کە پێنج کاتن.

**مەسەلەی بیست‌و چوارەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَهِنُواْ فِي ٱبۡتِغَآءِ ٱلۡقَوۡمِۖ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَ ﴾، وە ئێوە بێهێز مەبن لە لێخەفتانی دوژمنتاندا، لەوەدا کە هەوڵبدەن زەفەر بە دوژمنتان بەرن، ئەگەر ئێوە هەست بە ئازار بکەن، ئەوانیش وەك ئێوە ئازاریان هەیە، بەڵام ئێوە ئومێدێکتان بە ڕەحمەتی خوا هەیە، کە ئەوان ئەو ئومێدەیان نیە، تۆ ئومێدی ئەوەت پێی هەیە ئەگەر تووشی ئازارێك بووی ئەوە بۆت دەبێتە کەفارەت، وە ئەگەر بریندار بووی، ئەوە شانازییە بۆ دنیاو قیامەتت، مەدالیایەکە، وە ئەگەر شەهید بی ئەوا پلەو پایەیەکی زۆر بەرزت هەیە، ئەو ئومێدانەتان بە ڕەحمەتی خوا، هەن، بەڵام ئەوان هیچ ئومێدیکیشیان نیە، کەواتە: ئێوە لەوان بێهێزتر مەبن‌و لەوان بەهێزتربن، چونکە ئێوە پاڵنەرو هاندەری مەعنەوییشتان هەیە، ئەوان تەنیا پاڵنەرو هاندەری دنیایی یان هەیە، ئێوە هی دنیایی‌و قیامەتیشتان هەیە.

**مەسەلەی بیستو پێنجەمو كۆتایی:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾، پێشتر تەفسیرمان كرد، زانایانو توێژەرەوان دەڵێن: چەند حوكمێكی لێوەردەگیرێن، لە پاڵ ئەو شتانەشدا كە پێشتر باسمان كردن:

**حوكمی یەكەم:** ڕەوابوونی نوێژی ترسو نەگێڕانەوەی: واتە: نوێژی ترس كاتێك كە دەكرێ، پێویست ناكات بگێڕدرێتەوە، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ﴾، وە ئەگەر تۆ لە نێویاندا بووىو نوێژت بۆ بەرپاكردن، ئەوە (أل)ى سەر وشەی: (الصَّلاة) واتە: ئەو نوێژەی كە خوا فەرزی كردوە، ئەگەر بۆت بەرپاكردن، كەواتە: ئەو نوێژە ئەو نوێژەیە كە خوا فەرزی كردوە، بۆیە گێڕانەوەی ناوێ، واتە: نوێژێكی تەواوە، مادام لە كاتی ترسدایە، ئەگەر بە یەك ڕكاتیش ئەنجام بدرێ، كە ڕای زۆرێك لە زانایان ئەوەیە نوێژی ترس یەك ڕكاتە.

**حوكمی دووەم:** ڕواڵەتی ئایەتەكە پشتگیریی ئەو ڕایە دەكات، كە نوێژی ترس یەك ڕكاتە، بۆچی؟ چونكە ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ﴾، واتە: ئەگەر ئەوان كڕنووشیان برد (یانی: دوای ئەوەی ڕكاتێكیان كرد، ڕكووعو

سەجدەیان برد) با ئەو کۆمەڵە بچنە پشتتانەوەو کۆمەڵەکەی دیکە بێن کە نوێژیان نەکردوە، ئەوانیش نوێژت لەگەڵ بکەن، دیارە لەم ڕستە قورئانییەدا تەنیا باسی ڕکاتێك کراوە، وە بە نوێژیش ناوبراوە، کەواتە: نوێژی ترس یەك ڕکاتە، دیارە ئەگەر بە دوو ڕکات بکرێ، یاخود بە زیاتریش لەبەرئەوەی کە حاڵەتەکانی نوێژی ترس جۆراوجۆرن، دەگونجێ نوێژەکانیش جۆراو جۆربن‌و هەر دروستە، بەلاَم لەڕاستییدا بەڵگەی ئەوانەی کە دەڵێن: نوێژی ترس یەك ڕکاتە، بەهێزترە وێڕای ڕواڵەتی ئایەتەکە، چەند فەرمایشتێکیش لەوبارەوە هەن، بۆ وێنە:

**یەکەم:** ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِذِي قَرَدٍ فَصَفَّ النَّاسُ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، صَفًّا خَلْفَهُ وَصَفًّا مُوَازِيَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ خَلْفَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ انْصَرَفَ هَؤُلاءِ إِلَى مَكَانِ هَؤُلاءِ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً وَلَمْ يَقْضُوا رَكَعَةً﴾ أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (١٥٣٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٢٤٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٨٧١) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح أَبي دَاُود) برقم: (١١٣٣)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دێی (ذي قَرَدٍ) (کە ناوی شوێنێك بووە) خەڵکی لە پشت خۆیەوە کردنە دوو ڕیز، ڕیزێکیان لە پشتیەوە بوو، وە ڕیزێکیان لە بەرانبەر دوژمن وەستابوون، ئەوانی لە پشتیەوە بوون ڕکاتێکی پێکردن، دوایی ئەوانەی کە ڕکاتە نوێژەکەیان کرد، چوونە شوێنی ئەو کۆمەڵەی دیکە کە لە بەرانبەر دوژمن وەستا بوون، وە ئەوانیش کە لە بەرانبەری دوژمن وەستابوون هاتن نوێژیان لەگەڵ کرد، ڕکاتێکی پێکردن، وە ڕکاتەکەی دیکەیان نەگێڕایەوە، واتە: هەر کام لە دوو کۆمەڵەکە یەکی ڕکاتێکیان کرد.

**دووەم:** ﴿ وَعَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ صَلَّى بِطَبَرِسْتَانَ بِهَؤُلآءِ رَكْعَةً، وَبِهَؤُلآءِ رَكْعَةً، وَلَمْ يَقْضُوا﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٢٤٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم:

(١٥٣٠)، وَصَحَّحَهُ ابْنُ حِبَّانَ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح أَبي دَاُود) برقم: (٥٨٧)، واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێ (کە دیارە پێشەوای مسوڵمانان بووە لە تەبەرِستان، کە تەبەریی بۆخۆی خەڵکی ئەوێیە، شارێکە لە ئێران) نوێژی کرد بە کۆمەڵێکیان ڕکاتێك، وە بە کۆمەڵێکی دیکەیان ڕکاتێك، وە هیچیشیان ڕکاتەکەی دیکەیان نەگێڕایەوە.

**سێیەم:** ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ الصَّلاَةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٧٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٠٧)، أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٢٤٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٥٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٨٦٨)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: خوا نوێژی لەسەر پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرز کردوە لە کاتێکدا کە نیشتەجێیە لە ماڵی خۆیەتی چوار ڕکات (واتە: نوێژە چوار ڕکاتییەکان چوار ڕکات) وە لە سەفەردا دوو ڕکات (واتە: چوار ڕکاتیی دەبنەوە بە دوو) وە لە کاتی ترسدا (نوێژی چوار ڕکاتیی دەبێتەوە بە) ڕکاتێك، کەواتە: نوێژی دوو ڕکاتییش هەر دەبێتەوە بە یەك، وە نوێژی سێ ڕکاتیش کە هی شێوانە هەر دەبێتەوە بە یەك.

بەڵام دیارە وەك پێشتر باسمان کرد لە چەند فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەر ﷺیشدا هاتوە، کە جاری واش هەبووە دوو ڕکاتی پێکردوون، وە جاری بووە نوێژەکەی خۆی بۆتە چوار ڕکات، وە ئەوانەی کە نوێژی پێکردوون یەکی دوو ڕکات دوو ڕکات پێیکردوون، بە هەر حاڵ هەموو جۆرەکانی نوێژی ترس ڕەوان، بەڵام بەڵگەی ئەوە کە نوێژی ترس یەك ڕکاتە بەهێزترە، واش پێدەچێ پێغەمبەر ﷺ بە زۆریی بەم شێوەیە نوێژی بە هاوەڵانی بەڕێزی کردبێ.

**حوكمی سێیەم**: كە لەم ئایەتە وەردەگیرێ ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر یەكسان نەبوونی ئەو دوو كۆمەڵە كە نوێژی ترسیان پێ دەكرێ، چونكە دیارە هەمیشە پێغەمبەر ﷺ ئەو سوپایەی كە لەگەڵی دابووە كردوونیە بە دوو بەش، یەكێكیان نوێژی كردوە، بەشەكەی دیكەش ئێشكچیی بووە، لە بەرانبەر دوژمندا، دوایی ئێشكچییەكانیش هاتوون نوێژیان كردوە، ئەوانی دیكە چوونەتە بەرانبەری دوژمن، لێرەدا ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە مەرج نیە ئەو دوو كۆمەڵە یەكسان بن، واتە: یەكی چوار سەد نەفەر، یان یەكی پێنج سەد نەفەر، بەڵكو دەگونجێ كەم و زۆرییان لە بەینیدا هەبێ و بەرزیی و نزمییان لەبەینیدا هەبێ، بەڵكو بە بۆچوونی من دەگونجێ دوو كۆمەڵیش نەبن و ببنە سێ چوار كۆمەڵە، چونكە جاری وایە دوژمن لە سێ چوار لاوەیە، كە دیارە زانایان باسیان نەكردوە، بەڵام من پێموایە ئەوەش هەر لە ڕواڵەتی ئایەتەكە وەردەگیرێ.

وە (ابن حجر العسقلاني) دەربارەی وشەی: (طائفة) گوتوویەتی: (والطائِفَةُ: تُطْلَقُ عَلَى الكَثيرِ وَالقَليلِ حَتَّى عَلَى الوَاحِدِ)[1]، واتە: وشەی (طائفة) لە زمانی عەرەبیدا بە ژمارەیەكی زۆر وە بە ژمارەیەكی كەم دەگوترێ، بەڵكو جاری وایە بە یەك كەسیش دەگوترێ.

**حوكمی چوارەم**: نوێژی بە كۆمەڵ زۆر شتێكی گەورەو گرنگە، چونكە لە كاتی جەنگ و كوشتاریشدا، شەریعەتی ئیسلام بڕیاری داوە كە دەبێ نوێژ هەر بە كۆمەڵ بكرێ، وە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە نوێژی بە كۆمەڵ فەرزە، وەك بەشێك لە زانایان گوتوویانە (فرض الكفاية)یە، بەڵكو هەندێكیان گوتوویانە: (فرض العَين)ە، واتە: نوێژ بە كۆمەڵ نەبێ

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٤٣٩)، لە (فتح الباري)یەوە هێناویەتی.

بەرناکەوێ، مەگەر ئینسان کەسی دەستنەکەوێ نوێژەکەی لەگەڵدا بکات، بەلام زۆرێك لە زانایانیش هەر دەڵێن: نوێژی بە کۆمەڵ سوننەتێکی داکۆکیی لەسەر کراوە، هەرچۆن بێ، ئەوە کە نوێژی ترس لە بەرانبەر دوژمنیشدا دەبێ بە کۆمەڵ بکرێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەڕاستیی نوێژی بە کۆمەڵ پایەو پێگەیەکی گرنگی هەیە لە شەریعەتی ئیسلامدا.

**حوکمی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَلۡيَأۡخُذُواْ حِذۡرَهُمۡ وَأَسۡلِحَتَهُمۡ﴾، واتە: با چەکەکانیان بە دەستەوە بگرن، زانایان پرسیویانە: ئایا بەس بۆ پاسەوانانو ئێشکگرانە کە دەبێ هەموویان چەکەکانیان بە دەستەوە بگرن، وە ئەوانەی کە بەرانبەر دوژمن وەستاون، یان بۆ هەموو سوپاکەیە؟ واپێدەچێ گشتی بێ، واتە: هەم ئەوانەی نوێژ دەکەن، وە هەم ئەوانەش کە لە بەرانبەر دوژمندا وەستاون، کە لە حاڵەتی پاسەوانیی و ئێشکگرییدان، با چەکەکانیان پێبێ.

**حوکمی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَخُذُواْ حِذۡرَكُمۡ﴾، واتە: لە خۆتان وریابن، ئەوە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە گرنگ هۆشیاریی و وریایی یە، بۆیەش شێوەی ئەنجامدانی نوێژەکان جۆراوجۆرە !

کەواتە: ئەوەی کە گرنگە لە نوێژی ترسدا، ئەوەیە کە مسوڵمانان وریابنو هۆشیاربن، ئیدی بە چ شێوەیەك لە شێوەکان وریایی باشتریان پێدەکرێ، پێویستە نوێژەکەیان بەو جۆرە بکەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەدا یازدە (١١) ئایەت دەتوێژینەوە، لە ئایەتی (١٠٥ تا ١١٥)، ئەو یازدە ئایەتە هەموویان لە یەك بابەت دەدوێن کە دوایی بە درێژیی باسی دەکەین، وە پوختەکەی ئەوەیە کە بابایەکی مونافیق دزییەك دەکات، وە دەیەوێ ئەو دزییە بەسەر جوولەکەیەکی بێ گوناح دابینێ، پێغەمبەریش ﷺ نزیك دەبێ لەوبارەوە تووشی هەڵەیەك ببێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ غەیبی نەزانیوە، چووزانێ کابرای مونافیق دزیی کردووەو شتە دزراوەکەی بردۆتە ماڵی جوولەکەیەك داینـاوە ! ئنجا بەپێی ڕواڵەتی حوکمی شەرعیش: دەست دەست دەناسێ، وە حوکم بە ڕواڵەت دەکرێ، بەڵام خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە، وە حەقیقەتی مەسەلەکە ڕادەگەیەنێ‌و ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺیش دەکات کە لەوبارەوە وریابێ تووشی هەڵەی نەکەن، پاشان هەر بەو بۆنەیەوە خوا ﷻ باسی چپەچپو سرکەسرك دەکات، کە مەگەر بۆ ئامانجی خێرو چاکە بێ، ئەگەرنا خێری پێوە نیە، واتە: قسەی پەنهان‌و بە چپەچپ لە نێو کۆمەڵێکدا دوو نەفەر جیابنەوە، یان سێ نەفەر جیابنەوە، ئەوە نەهی لێکراوە، مەگەر بەرژەوەندییەکی تێدابێ، وەك دوایی باسی دەکەین، وە لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار ڕایدەگەیەنێ کە هەر کەس سەرپێچیی پێغەمبەر ﷺ بکات، وە بە ڕێبازی غەیری ئیمانداراندا بڕوات، سەرەنجامەکەی دۆزەخە.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن
لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٦﴾ وَلَا
تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ﴿١٠٧﴾
يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا
يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ
عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ
عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ
ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ
عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ
بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿١١٢﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ
أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ
عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ
عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾ لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ
أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ
أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ
سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئێمـە كتێبمـان بـە هـەق بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاكـو بـەو جۆرەی خـوا پێـشانی داوی، دادوەریـی لـە نێـوان خەڵـكدا بكـەی، وە مـشتومڕ لەسـەر خائینـان مەكـە ﴿١٠٥﴾ وە داوای لـێبوردن لە خوا بكە، بـە ڕاستیی خوا لێبوردەی بـە بەزەییـە ﴿١٠٦﴾ وە شـەڕە قـسە لەسـەر ئەوانـە مەكـە كـە ناپـاكیی لەگـەڵ خۆیانـدا دەكـەن، بێگومان هەر كەسێك زۆر ناپاكو گوناهبـار بـێ، خـوا خۆشـی نـاوێ ﴿١٠٧﴾ خۆیـان لـە خـەڵك پەنهـان دەكـەن (لـە كـاتی ناپاكـیی كـردنو دزیـیو فزیـی دا)، بـەڵام خۆیـان پـێ لـە خـوا ناشـارڕێتەوە، وە ئـەو لەگـەڵیاندایە لـە كاتێكـدا بـە شـەو قـسەیەك بـە پـیلان سـاز دەكـەن، كـە خـوا پەسـەندی ناكـات، وە خـوا دەورەی كردەوەكـانی داون ﴿١٠٨﴾ ئنجـا ئـەوە ئێـوەش لـە ژیـانی دنیـادا شـەڕە قـسەتان لەسـەریان كـرد، ئایـا كـێ لـە ڕۆژی قیامەتـدا لەسـەریان مـشتومڕ لەگـەڵ خـوادا دەكات؟! یان ئایا كـێ دەبێتـە وەكیلیـان؟! ﴿١٠٩﴾ وە هەر كـەس خراپـەیەك بكـات، یان ستەم لە خۆی بكات، پاشـان داوای لـێبوردن لـە خوا بكات، ئـەوە دەبینـێ كـە خوا لـێبوردەی میهـرەبانە ﴿١١٠﴾ وە هـەر كـەس گوناهـێ بكات، ئـەوە بێگومـان بـە زیـانی خـۆی كردوویـەتی، وە خـوا زانـای كاربەجێیـە ﴿١١١﴾ وە هەركەسـێك خراپـەیەك (لـە نێـوان خـۆیو خەڵـكدا) یان گوناهێك (لـە نێوان خـۆیو خـوادا) بكـات پاشـان بیخـاتە ئەسـتۆی بێخەتایەكـەوە، ئـەوە بوختـانێكو گوناهێكـی ئاشـكرای هەڵگرتـوە ﴿١١٢﴾ وە ئەگـەر بەخـششو بـەزەیی خـوا نەبووایـە لەسـەرت (ئـەی موحەممـەد) ئـەوە مـسۆگەر دەسـتەیەكیان دەیانویـست كـە گومـڕات بكـەن، بـەڵام هـەر خۆیـان سـەرگەردان دەكـەنو هیـچ زیانـت پـێ ناگەیـەنن، وە خـوا كـتێبو حیكمـەتی دابەزاندۆتـە سـەرتو ئـەوەی فێركـردووی كـە نەتـدەزانی، وە بەخششـی خـوا لەسـەر تـۆ مەزنـە ﴿١١٣﴾ زۆربـەی چپـەچپیـان خێـری تێـدانیە،

مەگەر کەسێك فەرمان بە بەخشینو چاکەو ئاشتەوایی نێوان خەڵك بکات، وە کەسێك بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ئەوە بکات، لەمەودوا (لە دوارِۆژدا) پاداشتێکی مەزنی دەدەینێ ﴿١١٤﴾ وە هەر کەس پاش ئەوەی ڕێنمایی (خوای) بۆ ڕوون بۆتەوە، دووبەرەکێی پێغەمبەر بکاتو بە دوای ڕێیەکی جیا لە ڕێی ئیمانداران بکەوێ، ئەوە حەواڵەی خۆی دەکەینو دەیخەینە نێو (ئاگری) دۆزەخەوە، ئەویش خراپترین سەرەنجامە ﴿١١٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(لِّلْخَآئِنِينَ): (خَائِن) کە بە (خَائِنِين) یان (خَائِنُون) کۆ دەکرێتەوە، واتە: ناپاکان لە زمانی کوردی دا دەڵێن: ناپاك، یان موخەننەت، یان پەیمان شکێن، (الخِيانَةُ والنِّفَاقُ واحدٌ، إلاَّ أَنَّ الْخِيَانَةَ تُقَالُ اعتِبَاراً بالعَهْدِ، والنِّفَاق يُقَالُ اعتِبَاراً بالدّين، وَنَقيضُ الخِيَانَةِ: الأَمَانَة)، وشەی خیانەتو نیفاق ماناکەیان یەکە، ئەوەندە هەیە وشەی (خِيَانَة) بە ناپاکیی کردن لەگەڵ پەیمانو بەڵێندا دەگوترێ، وە وشەی (نِفَاق) بە ناپاکیی کردن لە دینداریی دا دەگوترێ، ئەوەیە کە یەکێك ئیمانی بە دین نەبێو خۆی بە مسوڵمان پێشان بدا، وە پێچەوانەی خیانەت، ئەمانەتە، ئەمانەت واتە: دەست پاکیی، یان پەیمان بردنە سەر.

(خَصِيمًا): (الخَصْيمُ: الكَثيرُ المُخَاصَمَة، وَالمُخَاصَمَةَ: أَن يتعلَّق كُلُّ واحدٍ بِخُصْمِ الآخَر)، (خَصِيم) واتە: کەسێك کە زۆر مشتومڕو شەڕە قسە دەکات، (مُخَاصَمَة)ش یانی: شەڕە قسەو دم بەدمە، لەوەوە هاتوە کە هەرکامێك لە دوو تەرەف یەخەی ئەوەی دیکە بگرێ، جا چ بە ڕواڵەت یەخە (خُصْم)ی بگرێ، یاخود بە مانا، وەك بڵێی یەخەی گرتوە، یەك بە یەکی دەڵێ: کاکە یەخەم بەردە یەخەشی نەگرتوە، یان یەخەم بەردە ! واتە: دەمەقاڵێم لەگەڵدا مەکەو چی دیکە شەڕە قسەم لەگەڵدا مەکە.

(يَخْتَانُونَ ): واتــە: خیــانەت دەکــەن، (الإِخْتِيَــانُ: مُـرَاوَدَة الخِيَــانَة، أي: تَحـرّك شَـهْوَة الإِنـسان لتَحـرِّي الخيـانة)، (إِخْتِيَـان) ئەوەيــە کــە ئينـسان بيــەوێ خيـانەت بکات، ئەوە کە ئارەزووی بجووڵێ بۆ ئـەوە کە ناپاکیی بکات، واتـە: جارێ نەيکـردبێ، بـەڵام بەتەمابێ بيکات.

(يُبَيِّتُونَ ): واتە: پیلان گێڕیی دەکەن بە شەو، یان بە پەنهانیی، (البَيات والتبييتُ: قَصْد العَدو ليـلاً، بُيِّتَ: دُبِّـرَ بالليـل)، ئەسڵی وشـەی (البيـات) يـان (التَّبييـت) ئەوەيە کە کەسێك بيـەوێ بەرەو دوژمن بچێ بە شـەو دەرفـەت لــە تاريکـيی شـەو وەربگرێ، وە لە زمانی عەرەبيدا (بُيِّـت) واتە: ئەو پيلانە گێـڕدراوە، ئەو نەخشەيە کێشـراوە بە شـەو، لەبەرئەوەی شـەو تاريکـەو خـەڵك پێی نـازانــێ.

(خَطِيٓـَٔةً ): واتــە: خراپــە، (الخَطِـيئَةُ: الـسَيّئَةُ، جَمْعُهَـا الخَطِيئَـاتُ وَالْخَطَايَـا. وَالخَـاطِــيءُ: هُـوَ القَـاصِـدُ للذَّنــب)، (خَطِيئَــة) بـــە (خَطِيئَــات وَخَطَايَــا) کۆدەبێتــەوە (خَـاطِـيء) کەسـێکە کـە بــە ئانقەسـت گونـاح بکـات، بــەڵام (مُخطِيءُ) کەسـێکە کە بە هەڵـە گونـاهێك بکـات.

(نَّجۡوَىٰهُمۡ ): واتە: سـرکەسرك‌و چپـەچپيـان، دەگوترێ (ناجيتُـهُ: سـارَرتُهُ وَأَصْلُـهُ أَنْ تَخـلو بـهِ فِـي نَجْـوَةٍ مِـنَ الأَرْضِ...)، (نَاجَيْتـةُ) واتــە: قــسـەی پــەنهانم لەگـەڵدا کــرد، ئـەوەش لـە چـی ڕا هــاتوە؟ دەڵــێ: ئەوەيــە کـە لـە شــوێنێکی چـــۆڵ لــە زەويــدا (نَجْــوَى) واتــە شـــوێنێکی چـۆڵ، پێکـەوە لەگـەڵی بـیو قسـەيەکی پەنهـان بکـەی.

(يُشَاقِقِ ): (الشِّقَاق: المخالفة، وكونک في شِقٍّ غَيْر شِقّ صاحبک)، (شقاق) واتــە: ناکۆکــيیو دووبەرەکــيی، ئــەويش لــەوەوە هـاتوە (شـق) واتــە: (لا) تــۆ لەلايـەکیو تەڕەفـەکەی ديکـەش لەلايـەکی ديکـەيـە.

(نُوَلِّهِۦ ): (نَتركـهُ وَشَأَنهُ)، واتـە: لێـی دەگەڕێيــن، وازی لــێ دەهێنيــن، حــەواڵەی خۆی دەکـەين.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەكـان

چـەند بەسـەرهاتێك دەربـارەی ئـەم یـازدە ئایەتـە گێڕدراونـەوە، وەك پێـشتر باسمان كـرد، كە ئەمـانە سێـیانن:

أ- ﴿ عَنْ قَتَادَةَ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ هَؤُلاءِ الآيَاتِ أُنزِلَتْ فِي شَأنِ طُعْمَةَ بْنِ أبَيْرَق، وَفِيمَا هَمَّ بِهِ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ مِن عُذْرِهِ، وَبَيَّنَ اللَّهُ شَأن طُعْمَةَ بْنِ أبَيْرَق، وَوَعَظَ نَبِيَّه وَحَذَّرَهُ أَن يَكُونَ لِلْخَائِنِينَ خَصِيماً ﴾ أَخْرَجَهُ الطَّبَرِي فِي تَفسيرِه[1]، واتە: قەتـادە بۆی باس كردووین كە ئەم ئایەتانە لەبارەی طوعمـەی كوڕی ئوبـەیرەقەوە هاتوونە خوارێ، وە لـەوبارەوە كـە پێغـەمبەر ﷺ ویـستی چاوپۆشـیی لـێ بكات، وە خـوا ڕوونـی كـردەوە كـە دزی ڕاسـتەقینە ئـەوە، كـە بەتەمایە بەسەر جوولـەكەكـەیدا بێنـێ، وە ئامۆژگاریی پێغـەمبـەری خـۆی ﷺ كـرد، وریـای كـردەوە كـە بـەرگریی لـە ناپاكـانو خائینـان نـەكات (كـە دیـارە نەیزانیوە ناپاكە، ئەگەرنا خۆ پێغەمبەر ﷺ بەرگریی لە ناپاكـان ناكات!!) جا (طبـري) دەڵـێ: (وَكَانَ طُعْمَةَ بن أُبيْرَق رَجُلاً مِنَ الأَنصَار، ثُمَّ أَحد بَنِي ظفر، سَرَقَ دِرْعَاً لِعَمِّهِ كَانَت وَدِيعَةً عِنْدَهُ، ثُمَّ قَذَفَهَا عَلَى يَهُوديّ كَانَ يغشاهم، يُقَالُ لَهُ: زَيدُ بْنُ السَّمين، فَجَاءَ اليَهُوديُّ إلى نَبِي اللَّهِ ﷺ يَهْتِفُ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَوْمُهُ بَنُو ظفر، جَاؤوا إلَى نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهِ عَلَيْهِ وَسَلَّم لِيَعْذروا صَاحِبَهُمْ، وكَانَ نَبِيُّ اللَّهِ عَلَيْهِ السَّلاَم قَد هَمَّ بعُذْره، حَتَّى أنزَلَ اللَّهُ فِي شَأَنهِ مَا أنزَلَ) واتـە: طوعمـەی كـوڕی ئوبـەیرەق پیـاوێك بـوو لـە ئەنصـاڕییەكان بە ڕواڵەت مسـوڵمان بـوو، (بـەڵام دیـارە مونـافیق بـووە) وە لـە نێـو ئەنصـاڕییەكانیـشدا لـە (بَنِي ظفـر) بـووە كـە تـیرەیەك بـوون، زرێیـەك دەدزێ كـە هـی مامـی قەتـادەیە، كـە بـە ئەمانـەت لای دانـاوەو بـە سـپاردە لای بووە لـێی دەدزرێ، ئـەویش دوایـی تۆمەتـەكە بـە ملـی جوولەكـەیەكـدا دێنـێ كـە هاموشـۆی مـاڵی طـوعمـە دەكـات، نـاوی زەیـدی كـوڕی سـەمین بـووە،

---

١) جامع البيان، ج: (٥)، ص: (٣١٣).

جوولەكەكەش دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، دەڵێ: من تۆمەتم پێكراوەو هیچ دزییم نەكردوە، كاتێك خزمەكانی طوعمە (بَنِي ظفر) ئەوە دەزانن، دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی كە عوزر بۆ هاوەڵەكەیان بهێننەوە، تاكو تەبریەی بكات، پێغەمبەریش ﷺ خەریك بوو ئەوە بكات (لەبەرئەوەی بە ڕواڵەت زرێكە لای جوولەكەكە بووە، ئەو كابرایەی كە دزیویەتی لای ئەوی داناوە گوتوویەتی: بۆم هەڵگرە پێغەمبەریش ﷺ نەیزانیوە كە ئاوا بووە) هەتا خوا لەوبارەوە ئەم ئایەتانە دەنێرێتە خوارێ.

ب- {أَخْرَجَ ابْنُ سَعْد فِي الطَّبَقَاتِ بِسَنَدِهِ عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيْدٍ، قَالَ: عَدا بُشَيْر ابن الحَرثِ عَلَى عُلِّيَةِ رُفَاعَةَ بْن زَيدٍ عَمِّ قَتَادَةَ بْنُ النُّعْمَان فنقبها مِن ظَهرِهَا وَأَخَذَ طَعَامَاً لَهُ وَدِرْعَيْنِ بِأَدَاتِهِمَا فَأَتى قَتَادَةَ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَدَعَا بَشيراً فَسَأَلَهُ فَأَنكَرَ وَرمَى بِذَلِكَ لبيد بن سَهل رَجُلاً مِنْ أَهْل الدار ذَا حَسَبٍ وَنَسَب، فَنَزَلَ القُرآنُ بِتَكْذِيب بَشير وَبَرَاءَة لَبيد: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ﴾، فَلَمَّا نَزَلَ القُرآن فِي بَشير وَعُثِرَ عَلَيْهِ هَرَبَ إلى مَكَّةَ مُرْتَداً، فَنَزَلَ عَلَى سُلامَةَ بَنت سَعْدٍ فَجَعَلَ يَقَعُ فِي النَّبِيّ ﷺ فَنَزَلَ فِيهِ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ ﴿١١٥﴾ ﴾، وهجاهُ حَسَّانَ بنُ ثَابتٍ حَتَّى رَجَعَ وَكَانَ ذَلِكَ فِي شَهْرِ رَبيع سَنة أَرْبَعَةَ مِنَ الهجْرَةَ} لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي برقم: (٣٦١)، واتە: ئیبنو سەعد لە (طَبَقَاتِ)ی خۆیدا بە سەنەدی خۆی لە مەحموودی كوڕی لەبید دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەشیری كوڕی حاریس هێرشی بردە (یاخود پارێزی برد) بۆ قاتی سەرەوە (عُلِّیة: باڵەخانەی پێ دەگوترێ)ی ڕوفاعەی كوڕی زەید مامی قەتادە (قەتادەی كوڕی نوعمان) لە پشتەوە ڕا دیوارەكەی بڕی، وە هەندێ خواردنی تێدا بوو (دەڵێ: جەواڵە[1] ئاردێك بوو) لەگەڵ دوو زرێ كە

---

١) جەواڵ: شتێكە وەك گونیە لە موو دەچنرێ‌و ئاردو دەغڵ‌و دانەوێڵەی تێدەكرێ.

ئامێرەکانی خۆیان لەگەڵدا بوون، دزینی، قەتادەش چووە لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا، پێغەمبەریش ﷺ بەشیری بانگ کرد {لێرەدا (بەشیری کوڕی حاریس) دزەکەیە، لە ڕیوایەتەکانی دیکەدا (طوعمەی کوڕی ئوبەیرەق) دزەکەیە} لێی پرسی: تۆ ئەو دزییەت کردوە؟ ئەویش ئینکاریی کرد، وە گوتی: لەبیدی کوڕی سەهل ئەو دزییەی کردوە، کە لەبیدی کوڕی سەهلیش پیاوێك بوو لە خەڵکی مەدینە خاوەن نەسەبو ڕەچەڵەکێکی چاك بوو، (بەڵام دیارە جوولەکە بووە) دوایی خوا قورئانی ناردە خوارو بەشیری بەدرۆ خستەوە، وە بێ خەتایی (براءة)ی لەبیدی دەرخست، ئنجا کاتێ کە قورئان هاتە خوار، وە پێی زانرا، بەشیر ڕایکرد بۆ مەککەو لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، وە لەوێ چووە لای سولامەی کچی سەعد (ڕەنگە بێوەژنێك بووبێ، یان هەرچۆنێك بووبێ ئەوی کردە خانەی خۆی) وە لەوێ دەستی کرد بە شیعر گوتن دژی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، ئیدی لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ ﴿١١٥﴾ ﴾، وە حەسسانی کوڕی سابیتیش بە شیعر جوابی دایەوە، (دیارە ئەو شیعری لە دژی پێغەمبەرو مسوڵمانان گوتوە، حەسسانیش شاعیرێکی زۆر زەبر دەست بووە بە شیعر جوابی داوەتەوە) تاکو بێدەنگی کرد، (واتە: هێندەی شیعری پێگوتن هەتا وازی هێنا) ئەو ڕووداوەش لە مانگی ڕەبیعی ساڵی چواری کۆچیی دابووە.

ج- {عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعمَان: أَنَّ هَؤلاءِ الآيَاتِ أُنزِلَتْ فِي شَأنِ طُعْمَةَ بْنِ أَبَيْرَق، وَكَانَ طُعْمَةَ بن أُبَيْرَق رَجُلاً مِنَ الأَنصَارِ، ثُمَّ أحد بَنِي ظفر، سَرَقَ دِرْعَاً لِعَمِّهِ كَانَت وَدِيعَةً عِنْدَهُ، وَقَدْ خبّأها في جراب دقيق، فجعل الدَقيق يَنتَثِرُ مِنْ خَرقٍ فِيهِ، وَخبّأها عِنْدَ ابَنِ السمين اليَهُودي، فَالتَمَسوا الدِّرْع عِنْدَ طُعْمَة، فَلَمْ يَجِدُوهَا، وَحَلَفَ باللَّهِ مَا أَخَذَهَا، وَمَا لَهُ بِهَا مِنْ عِلْمٍ، فَسَاروا في أَثرِ الدَّقِيق حَتَّى انتَهَوا إِلَى مَنْزِل اليَّهُودِي فَأَخَذوها، فَقَالَ اليَّهُودي: دَفَعَهَا إِليّ طُعْمَة، وَشَهِدَ لَهُ نَاسٌ، مِنَ اليَّهُودِ بِذَلِكَ، وَلَكِن طُعْمَة أَنْكَرَ ذَلِكَ، فَقَالَتْ: بَنو ظفر، وَهُم قَوم طُعْمَة: إِنطَلَقُوا بِنَا إِلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

فَسَأَلُوهُ أَن يُجَادِل عَنْ صَاحِبِهِم، وَقَالُوا: إنْ لَمْ تَفْعَلْ هَلَكَ صَاحِبُنَا وَافتضَحَ، وَبَرِيء اليَهُودِيُّ، فَهَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أن يَفْعَل وَكَانَ هَوَاهُ مَعَهُم وَيُعَاقِبَ اليَهودِيُّ، فنزلت الآية، وَهَذَا قَول جَمَاعَة مِنَ المُفَسرين}[1]، واتە: قەتادەی کوڕی نوعمان دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتانە (واتە: ئەم یازدە ئایەتە) دەربارەی طوعمەی کوڕی ئوبەیرەق هاتوونەتە خوار، کە پیاوێك بوو لە پشتیوانەکان وە لە (بَنِي ظفر) بووە، زرێیەك دەدزێ کە هی مامی قەتادەی کوڕی نوعمانەو بە ئەمانەت لەلای داناوە، وە زرێیەکە کە دەدزرێ لە جەواڵە ئاردێکدا شاردراوەتەوە، جەواڵە ئاردەکەش کون دەبێ‌و لەو کونەوە ئارد دەڕژێ‌و ڕێچکە دەبەستێ، ئەویش دەیباتە لای ئیبن‌و سەمین کە کابرایەکی جوولەکە بووەو دەڵێ: ئەو جەواڵە ئاردەم بۆ هەڵگرە، (ناڵێ زرێم دزیوەو زرێیەکیشی تێدایە، دیارە ئەوان زرێکەیان بەلاوە گرنگ بووە، وە ناشزانێ جەواڵە ئاردەکە کونێکی تێبووەو ئارد ڕژاوە ڕێچکەی بەستوە لەو شوێنەی لێی دزیوە تا ماڵی جوولەکەکە) ئەوانیش بۆ زرێکە دەگەڕێن‌و دەچنە لای طوعمە دەڵێن: زرێکەمان بدەوە، ئەویش سوێند دەخوا دەڵێ: نەزرێکەم بردووەو نە زانیارییشم دەربارەی هەیە، (لە حاڵێکدا کە وەدیعەش بووەو بە ئەمانەت لەلای دانراوە، بەڵام دیارە ئەوەی لە لای داناوە، پێدەچێ شایەدی نەبووبێ) ئەوانیش بە شوێن ڕێچکەی ئاردەکەدا دەڕۆن، هەتا دەگەنە ماڵی جوولەکەکەو زرێکەو جەواڵە ئاردەکە وەردەگرنەوە، کابرای جوولەکەش دەڵێ: طوعمەی کوڕی ئوبەیرەق ئەو زرێو جەواڵە ئاردەی لە لای من داناون، وە کۆمەڵێکیش لە جوولەکەکان شایەدیی بۆ دەدەن، بەڵام طوعمە نکوولیی لەوە دەکات، وە (بَنُو ظفر)یش کە خزمانی طوعمەن دەیانەوێ کە

---

١) أسباب النزول للنيسابوري، ص: (٩٩،١٠٠)، وە (أسباب النزول)، للواحدي، ص: (١٠٣)، وە سەرنجی (الإستيعاب في بيان الأسباب)، ج: (١)، ص: (٤٩٣ - ٤٩٥)، تأليف: سليم بن عيْد الهلالي و محمد بن موسى آل نصر، بدە، کە بەسەرهاتەکەی بە درێژی هێناوەو گوتوویەتی: (أخرجه الترمذي: (٣٠٣٦)، وابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني: (١٩٥٨)، والطبراني في المعجم الكبير: (١٥)، والطبري وابن أبي حاتم في تفسيره: (٥٩٣٣)، والحاكم...).

بەرگریی لە طوعمە بکەن دەڵێن: با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وە داوای لێ دەکەین کە موناقەشە بکاتو بەرگریی لە هاوەڵەکەمان بکات، دەڵێن: (ئەی پێغەمبەر!) ئەگەر وانەکەی ئەوە ڕەفیقەکەمان دەفەوتێو ئابرووی دەچێ، وە جوولەکەکەش تەبریە دەبێو بێ خەتا دەردەچێ، پێغەمبەریش ﷺ خەریک دەبێ وابکات (نەك لەبەرئەوەی مونافیقەکەی خۆشدەوێو ڕقی لە جوولەکەکەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی بەڕواڵەت جەواڵە ئاردەکەو زرێکە لە ماڵی جوولەکەکە بووە)، وە عاطیفەو هەستی لەگەڵ واندا دەبێو بە ڕواڵەت وادەزانێ طوعمە لەسەر هەقەو، خەریك دەبێ سزای جوولەکەکە بدات، بەڵام خوای دادگەر ئەم ئایەتانە دەنێرێتە خوارێو بەرگریی لەو جوولەکە بێ خەتایە دەکات، وە حەقیقەتی کارەکە بەیان دەکات، کە کابرای مونافیقی بە ڕواڵەت مسوڵمان، دزی کردوەو بابای جوولەکە بێ خەتایە، وە ئەمە قسەی کۆمەڵێك لە ڕاڤەکەران (مفسِّرين)ی قورئانە.

## مانـای گـشـتی ئایەتەکـان

وەك پێشتریش باسمان کرد کە ئەم یازدە ئایەتە هەموویان دەربارەی یەك ڕووداو هاتوونەتە خوارێ، ئەویش ئەوەیە کە مسوڵمانێکی مونافیق دزییەك دەکات، بەڵام زۆر بە لێزانانەو زۆر زانانە دزییەکە دەکات، کابرایەك شتێکی بە ئەمانەت لەلا داناوە، بەڵام بەڵگەو شایەدی نیە، دەیباتە لای جوولەکەیەك دەڵێ: بۆم هەڵگرە بۆئەوەی ئەگەر کابرای خاوەن ئەمانەت هات گوتی: بمدەوە بڵێ: ڕاست ناکەی لای من نیە، ماڵەکەم بگەڕێ! ئنجا لە کوێی داناوە؟ لە لای جوولەکەیەك، بەڵام دیارە زرێیەکە لە جەواڵە ئاردێك دایە، وەك پێشتر باسمان کرد، وە جەواڵە ئاردەکە، دیارە کونی تێدابووەو ئاردی لێ ڕژاوە، کە ئەوە بەڵگەیەکی ڕواڵەتیی بووە، بەڵام بایی ئەوە نەبووە ئیسپاتی دەعوایەکەی پێ بکات، بۆیە خوا ﷻ ئەم یازدە ئایەتەی ناردوونە خوار، بەو بۆنەیەوەو بۆ بەرگریی لە جوولەکەیەکی بێ خەتا، وە خەتاباركردنی مسوڵمانێکی مونافیق،

ئەوەش لە حاڵێکدا بووە کە ئەو کاتە جوولەکە لەوپەڕی پیلانگێڕیی دابوونە دژی ئیسلامو مسوڵمانان، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە دادگەریی ئیسلام، دادگەرییەکی ڕەهاو موتڵەقەو ئیسلام لە مەسەلەی هەقو ناهەقدا جیاوازیی بە مسوڵمانانو نامسوڵمانان ناکات، وە ئەوە کە خوای دادگەر کردوویەتیو یازدە ئایەتی لەسەر بەرگرییکردن لە جوولەکایەتی بە ناهەق تۆمەتبارکراو، ناردۆتە خوار، ئەوە گەورەترین دەرسە بۆ مسوڵمانان، کە ئێمە پەند وەربگرینو بزانین کە لە بواری دادوەریی داو لە بواری هەقو ناهەقدا، ئیسلام فەرق بە مسوڵمانو نامسوڵمان ناکات، وە شەریعەتی ئیسلامی بەدوای بەڵگەدا دەڕوا، نەك بەدوای عاطیفەدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴾، دیارە لێرەدا خوای کاربەجێ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەدوێنێو دەفەرموێ: ئێمە کتێبمان بە هەق بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو لە نێوانی خەڵکدا دادوەریی بکەی بەو شێوەیەی کە خوا پێشانت دەدا، وە مشتومڕو موناقەشە لەسەر ناپاکان مەکە ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، وە داوای لێبوردنیش لە خوا بکە، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، ئنجا ئایا بۆچی داوای لێبوردن لە خوا بکات؟ چونکە گومانی خراپی بەو جوولەکەیە بردوە، ئەگەرنا خۆ هیچی لێ نەکردوە، لەوە زیاتر کە گومانی خراپی پێ بردو، وایزانی کە ئەو دزییەکەی کردوە، بەڵام لەسەر ئەوەندەش دەبێ داوای لێخۆشبوون لە خوای لێبوردە بکات، کە ئەوە ئەگەر پێغەمبەری خوا نەبێ، پێویستی بە داوای لێبوردن لە خوا ناکات، چونکە هەر کەسێکی دیکەش بێ، دەست دەست دەناسێو ئینسان ڕواڵەت دەبینێ، وە پێغەمبەریش ﷺ، پەنهان نازانێو بەس خوا غەیب زانە، بەڵام دیارە پایەی پێغەمبەر ﷺ هێندە بەرزە، لە شتی ئاوا گچکەش کە لە ئیجتیهادێکدا بە هەڵەدا چووە، لەوەشدا دەبێ داوای لێبوردن لە خوا ﷻ بکات ﴿ وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡ ﴾، وە شەڕە قسە

مەکە بۆ بەرگریی کردن لەوانەی کە دەیانەوێ خیانەت لە خۆیان بکەن، واتە: ئینسان کە غەڵەتو گوناهێك دەکات، مانای وایە خیانەتو ناپاکیی لەگەڵ خۆی دەکات، مانایەکی دیکەشی ئەوەیە کە هەر کەسێك خیانەت لە براو خوشکێکی مسوڵمانی بکات، مانای وایە وەك خیانەتی لە خۆی کردبێ وایە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا﴾، بێگومان خوا هەر کەسێکی کە زۆر خیانەت بکاو زۆر گوناهکاربێ خۆشی ناوێ، کەواتە: خوای پەروەردگار کە خیانەت کاران‌و گوناهکارانی خۆش ناوێن، ئەدی چ هەڵوێستێکی بەرانبەریان هەیە؟ ئاشکرایە کە ڕقی لێیان هەڵدەستێ‌و دەیانبوغزێنێ ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەی خۆیان لە خەڵکی پەنهان دەکەن کاتێ پیلان دەگێڕن، بەڵام خۆیان لە خوا پەنهان ناکەن واتە: ناتوانن خۆیان لە خوای بەرز بشارنەوە، ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾، وە خوا لەگەڵیان دایە کاتێك قسەیەك ڕێك دەخەن کە خوا پەسندی ناکات، جا ئایا قسە ڕێکخستنەکە چی بوو؟ دیارە لێرەدا واتای ئایەتەکان گشتییە، بەڵام هۆی هاتنە خوارەوەکەی تایبەتییە، واتە: ئەم ئایەتانە ئەوە دەگەیەنن کە دەبێ ئینسان خۆی بپارێزێ لە ڕێکخستنی قسەیەکی ناڕاست، بۆ بەداو وەکردنی کەسێکی بێ خەتا، یان بۆ خۆ تەبریە کردن، لە کاتێکدا کە هەڵەیەکی کردووە، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: خوا لەگەڵیان دایە کە بە شەو پیلان دەگێڕن‌و، قسەیەك ڕێك دەخەن کە بۆ خوای بەرزو مەزن پەسند نیە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾، وە خوا دەورە دەری ئەوەیە کە دەیکەن، واتە: دەورەی هەموو هەڵسوکەوتەکانی ئەوانی داوە، بە زانیاریی، بە دەسەڵاتی، بە ویستی هیچ شتێکی لێ ون نابێ، پاشان خوای بێ وێنە ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات وە لەوانەش کە بەتەمابوون بەرگریی بکەن لەو کابرا خەتابارەو

دەفەرموێ: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، وشەی (ها) لێرەدا بۆ ئاگادارکردنەوەیە، یانی: ئەوە دامانا ئێوە لە ژیانی دنیادا موناقەشەتان لەسەر ئەواندا کردو شەڕەقسەتان لەسەریان کرد، بۆئەوەی کە بێ خەتایان دەربێنن، وە بە ناهەق بەرگرییان لێ بکەن ﴿ فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، ئەدی لە ڕۆژی قیامەتی کێ موناقەشە لەگەڵ خوادا دەکات لەسەریان؟ چونکە خوا بە هەموو شتێ ئاگادارەو لەبەرئەوەی ئێوە نازانن، بۆیە ئەوان دێن موناقەشەتان لەگەڵدا دەکەن، کە کابرا بێ خەتایە، بەڵام خوا ﷻ ئاگاداری هەموو شتێکەو پەنهان زانە ﴿ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴾، یان لە ڕۆژی قیامەتدا کێ دەبێتە وەکیلیانو کێ دەبێتە پارێزەریانو پشتیوانیان؟

ئنجا خوا ﷻ بینا لەسەر ئەوە چەند شتێك دادەڕێژێو چەند حوکمێك دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، دوای ئەوە خوا ﷻ هەڕەشەی توند دەکات لە خیانەتو لە ناپاکیی و لە دزیی‌و، وە لە کەسانێك کە دیفاع دەکەن لە ناپاکان، ئنجا دەرگای گەڕانەوەو پەشیمانبوونەوە دەکاتەوەو دەفەرموێ: وە هەر کەسێك خراپەیەك بکات، یان ستەم لە خۆی بکات، دوایی داوای لێبوردن لە خوا بکات، دەبینێ کە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، کەواتە: هەرچەندە ئینسان خراپەی هەبێ، وە ستەمی هەبێ، بەڵام مادام داوای لێبوردن لە خوا بکاتو پەشیمان بێتەوە، خوای بە بەزەیی دەبینێ کە لێبوردەو بە بەزەیی یە، ﴿ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، لە ئایەتی پێشیدا باسی ئەوە دەکات کە هەر کەسێك هەر جۆرە خراپەیەك بکات، لە نێوانی خۆیو

خەڵکدا، یان لە نێوانی خۆیو خوادا، بەمەرجێ بگەڕێتەوە لای خواو داوای لێبوردن بکات، وەبەر عەفوو لێبوردنو بەزەیی خوادا دەکەوێ، ئنجا لەم ئایەتەیاندا باسی ئەوە دەکات کە زەرەری گوناح بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە: وە هەر کەسێك هەڵەیەك بە دەست بێنێ، یان گوناهێك بکات، پاشان بیەوێ بیخاتە سەر بابایەکی بەریی‌و بێتاوانو، ئەوی پێ تۆمەتبار بکات ﴿فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾، ئەوە بوختانی کردوە، بوختان ئەوەیە کەسێك بە شتێك تۆمەتبار بکەی کە نەیکردبێ ﴿وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا﴾، گوناهێکی ئاشکراشی کردوە، واتە: هەم بوختانی کردوە، هەم گوناح، کە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا چەمکی ئەو وشانە دەتوێژینەوە ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖ﴾، ئنجا ئەوە دەخاتە بەرچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر بەخششو بەزەیی خوا لەسەر تۆ نەبووایە، دەستەیەکیان دەیانویست کە تۆ گومڕا بکەنو ڕێت لێ تێکبدەنو سەرت لێ تێکبدەن، وە جوولەکەیەکی بێ خەتات پێ بە دز دەربێنن، کە دزییشی نەکردوە، بەڵام بێگومان هەر خۆیان سەر لێ دەشێوێننو گومڕا دەکەن ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖ﴾، وە هیچ زیانێك لە تۆ نادەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەرگیز هەڵەی نەکردوەو، گوناهی نەکردوەو، خوا پاراستوویەتیو ئاگای لێی بووە، وێڕای ئەوە کە بۆخۆی فیطرەتو ئیمانو تەقوایەکەی لە لووتکەدا بووەو ڕێی لێ گرتوە، گوناح بکات، ئەو شتانەش کە نەك لەبەر بێ تەقوایی، بەڵکو لەبەر ئاگا لێ نەبوونو لەبەرئەوەی کە غەیب نازانێ، خەریك بووە تووشی هەڵەبێ، خوای پەنهانزان ئاگاداری کردۆتەوەو نەیهێشتوە بە هۆی بێئاگاییشەوە تووشی هەڵە ببێ ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾، وە

خوا دایبەزاندۆتە سەر تۆ كتێبو حیكمەت، دوایی باسی دەكەین كە كتێب واتە: شەریعەتو حیكمەت واتە: ئەو ڕەوشتو بەها بەرزو جوانو ئەدەبە پەسندانەی كە لە قورئان وەردەگیرێن، واتە: كیتابو حیكمەت هەردووكیان نێوەڕۆكو ناواخنی قورئان پێكدێنن، چونكە قورئان دەبێ بە دوو بەش، بەشێكی یاساكانن، بەشێكی دیكەی بەهاكانن ﴿وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُ ﴾، وە خوا شتێكی فێری تۆ كرد كە تۆ نەتدەزانیو نەشدەگونجا بیزانی، ئەگەر وەحییت بۆ نەهاتبایە، ﴿وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴾، وە بەخششو چاكەی خوا لەسەر تۆ زۆر مەزنە.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەكات لەبەرئەوەی ئەوانە دیارە بە فسكەفسكو بە چپەچپ ئەو پیلانو فێڵەیان ساز كردوە، وە واش پێدەچێ كە كابرای خائین بە تەنێ نەبووبێو خەڵكێكی دیكە هەبووبێ تەگبیركەری بووبێ، بۆیە حوكمێكی گشتی لەوە وەردەگرێو دەفەرموێ: ﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ ﴾، هیچ خێرو بەرژەوەندییەك نیە لە زۆربەی چپەچپیانداو، لە زۆربەی قسەی پەنهانیاندا ﴿إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ ﴾، مەگەر كەسێك فەرمان بكات بە ماڵ بەخشینو هاوكاریی ماددیی، یاخود بە چاكەكاریی مەعنەویی، یاخود بە ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا واتە: مەگەر لەو سێیانەدا پەنا ببرێتە بەر چپەچپو قسەی پەنهانو تەگبیركردن بە شەو، ئەگەرنا دروست نیە چپەچپ بكرێتو قسەی پەنهان بكرێ، مەگەر بۆ بەرژەوەندییەك كە بەرژەوەندییەكەش، یان لە هاوكاریی ماددیی دایە، یان لە هاوكاریی مەعنەوییو قسەی باش، یان لە ئاشتەواییو پێكهێنانەوەی خەڵكدا ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾، هەر كەسێكیش هەركامێك لەوانە بكات بۆ

وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، ئەوە لەمەو دوا پاداشتێکی مەزنی دەدەینەوە، واتە: ئەو کارە چاکانەش ئەگەر بە خوا پێ مەبەستبوونەوە نەبن و، تەنها بۆ خوا نەبن، ئەوانیش دیسان خاوەنەکانیان دەبنە سەپانی پووشێ و هیچیان پێ نابڕێ.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾، وە هەر کەسێك دوای ئەوەی ڕێنمایی خوای بۆ ڕوون بۆتەوە، دووبەرەکێی پێغەمبەر ﷺ بکات، وە بکەوێتە شوێن ڕێبازێك جیا لە ڕێبازی ئیمانداران، ئەوە حەواڵەی خۆی دەکەین، وە دەشیخەینە دۆزەخەوەو لەوێدا دەیبرژێنین، وە خراپترین سەرەنجامیش دۆزەخەوە، واتە: ناپاکیی کردن و دزیی کردن و بەرگریی کردن لە ناپاکان و دزان و، پیلانگێڕیی بۆ بە داوەوە کردنی خەڵکی بێ خەتا، هەموو ئەوانە، بە دووبەرەکی کردن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، وە بە لادان لە ڕێبازی ئیمانداران لە قەڵەم دەدرێن، وە هەر کەسێکیش ئەوە بکات لە دنیادا خوای دادگەر حەواڵەی خۆی دەکات، وە لە دوارۆژیشدا خراپترین جێگاو سەرەنجامی هەیە کە دۆزەخە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئێمە کتێبمان دابەزاندوە بۆ سەر تۆ بە هەق، ئەم ڕستە قورئانییە سێ هەڵوەستەی کورتی لە بەرانبەردا دەکەین:

**هەڵوەستەی یەکەم:** زۆر کەس ئەو پرسیارەی کردوە، کە ئایا بۆچی خوای باڵادەست وشەی: ﴿ إِنَّآ ﴾ بەکاردێنێ، خۆ خوا یەکێکە؟ لە زۆر شوێنان وادەفەرموێ: بۆ وێنە: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ ﴾ الدخان، ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ ﴾ القدر، ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر، وەڵامەکەی ئەوەیە کە: لە زمانی عەرەبیدا کەسێك بیەوێ خۆی بە گەورە پێشانبدا، ڕاناوی کۆ (ضمیر الجمع) بۆخۆی بەکاردێنێ، کەواتە: خوای بێ هاوەڵ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ ﴾ واتە: ئێمە، وە لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر کەسێك ڕاناوی کۆ بۆخۆی بەکاربێنێ ئەوە (تَعظِیم)ی خۆی دەکات، جا ئایا کێ لە خوا مەزنترو گەورەترە؟ کێ لە خوا شایستەترە بۆئەوەی خۆی بە گەورەو مەزن پێشانبدا؟ بێگومان گەورەو مەزنو بەرزی ڕەها (مُطلَق) بەس خوایە، بەڵێ حیکمەتو نهێنی ئەو جۆرە تەعبیرە، هەر ئەوەیە کە خوای گەورەو مەزن خۆی بە گەورەو مەزن پێشانبدات، کە دیارە خوا بەپێی عەقڵی ئێمە قسان دەکاتو، کۆمەڵێکیش لە یەکێك گەورەترن، بۆیە خوای کاربەجێ ڕاناوی کۆی بۆخۆی بەکاردێنێ، بۆئەوەی بزانین کە خوای پەروەردگار خاوەنی ئەوپەڕی گەورەییو بەرزییو مەزنییە.

**هەڵوەستەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ أَنزَلْنَآ ﴾، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ أَنزَلْنَآ ﴾، دامانبەزاندوە ناردوومانەتە خوار؟ لەبەرئەوەی خوای بێ وێنە لە ڕووی مەعنەوییەوە خاوەنی بەرزترین پلەو پایەو مەقامە، پاشان خوای تاكو پاك لەسەر بارەگای خۆیەتی بەو شێوەیەی كە بۆ خوا شایستەیە، وە لە سەرووی دروستكراوەكانی خۆیەتیو، لە دەرەوەی بازنەی دروستكراوانی خۆیەتی، وە خوا خاوەنی ئەوپەڕی بەرزییە، بۆیە دەفەرموێ: دامانبەزاندوە، ناردوومانەتە خوار.

**هەڵوەستەی سێیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، وشەی: ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ دوو واتای هەن: واتە: ئەم قورئانەمان دابەزاندوە هەقی لەنێو خۆیەوە گرتوە ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾: (أي متلبساً بالحق) واتە: هەقی گرتۆتە نێوخۆی، واتای دووەم: ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾: (إنزالاً حَقّاً) واتە: دابەزینێكی هەقە، ئەم قورئانە هەر ئایەتێكی بە شێوەیەكی ڕێكو ڕاست دابەزیوەو شێوەی دابەزینەكەی لە كاتی خۆیدا بووە، وە ئامانجی خۆی پێكاوە، كەواتە: ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ دوو واتای هەن:

**یەكەم**: ئەم قورئانە، ئایەت بە ئایەتیو ڕستە بە ڕستەیو وشە بە وشەی، هەقی لەنێودا هەیەو، هەمووی ڕاستو هەقو تێرو تەواوە.

**دووەم**: وە شێوەی دابەزینەكەیو، كاتەكەیو، ئەو ئامانجەی كە بۆی دابەزیوە، ئەویش هەقە.

**مەسەلەی دووەم**: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ﴾، بۆئەوەی لە نێوان خەڵكدا دادوەریی بكەی بەو شێوەیەی كە خوا پێشانت دەدا، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە قورئان بۆ دادوەرییو حوكمكردن هاتوەو، بۆ ئەوە هاتوە كە حاكم بێ، پاشان پێشاندانی خوا ﷻ بۆ

پێغەمبەر ﷺ پێشاندانی دڵیی (قَلْبي)و عەقڵییە، نەك پێشاندانی چاویی (بَصَرِي) واتە: خوای کاربەجێ کە دەفەرموێ: ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ﴾، بەو شێوەیەی کە خوا پێشانت دەدا، واتە: پێشانی عەقڵو دڵتی دەدات، نەك پێشانی چاوتی دەدا، ئەوە لەلایەك، پاشان پێشاندانی خوا ﷻ هەم (وحي) دەگرێتەوە هەم کۆشش (إجتهاد)یش، واتە: هەم ئەو شتانەی کە خوا دەقی لەسەر ناردوون، هەم ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ کۆششی کردووەو بیری کردۆتەوە بۆئەوەی بگاتە هەق، هەردووکیان دەگرێتەوە، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە: ﴿ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَبِيِّ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ خُصُومَةً بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: ألا إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ وَإِنَّما أَقْضِي بنحو مَا أسْمَعُ وَلَعَلَّ أَحَدَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقضَي لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا} رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٤٥٨)، وَمُسْلِم برقم: (٤٤٤٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٨٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٤٠١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣١٧)، واتە: ئومموو سەلەمە (دایکی ئیمانداران و خێزانی پێغەمبەر ﷺ) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە مشتومڕو دەنگەدەنگی کۆمەڵە کەسێك بوو کە ناکۆك بوون، هاتنە بەر دەرگای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش چووە دەرێ پێی فەرموون: ئاگاداربن! من بەشەرێکم، منیش ئینسانم، وە بەو پێیەی کە دەبیستم بڕیار دەدەمو دادوەریی دەکەم، وە ڕەنگە هەندێکتان قسەزانتربن لە هەندێکتان (هەبێ باشتر بتوانێ قسەی خۆی بکات، تەنانەت ئەگەر لەسەر ناهەقیش بێ، وا خۆی پێشاندەدا کە لەسەر هەقە، ئەوەی دیکە ڕەنگە زارو زمانێکی وای پێوەنەبێ، کە لەسەر هەقیش بێ، نەتوانێ هەقی خۆی بسەلمێنێ) ئنجا هەر کەسێك من هەقی مسوڵمانێکم پێدابێ، بابزانێ ئەوە پارچەیەك ئاگری پێ دەدەم، جا با هەڵیبگرێ یان وازی لێ بێنێ، واتە: ئەگەر دوو نەفەر ناکۆکییان بوو، یان کۆمەڵێك ناکۆکییان بوو، من

گوێیان لێ دەگرم، ڕەنگە یەكێكیان زمان لووسترو قسەزانتر بێو ناهەقیش بێ، بەڵام من وابزانم هەقیەتیو هەقەكەی پێ بدەم، با بزانێ ئەوە بۆی حەڵاڵ نیە، با منیش بڕیارم بۆ دابێ بە گوێرەی ڕواڵەتی شەرع، بەڵام لە لای خوا بۆی نابێ بە هەق، وە با بزانێ كە پارچەیەك لە ئاگری بۆ دەبڕن، وە لە دۆزەخدا تووشی سزا دەبێ.

كەواتە: لێرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ یش ئیجتیهادی بۆ كردوە، هەر لەوەیە كە خوا پێشانی دەداو بە ڕواڵەت حوكم دەكات، بەڵام لە لای خوای دادگەر هەق چۆنە هەر وایە.

**مەسەلەی <u>سێیەم</u>:** كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا﴾، واتە: تۆ موناقەشەكەرو مشتومڕكەر مەبە بۆ ناپاكان، واتە: بەرگریی ناهەق لە موخەننەتو ناپاكان مەكە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە هیچ كەسێك بۆی نیە بە هیچ شێوەیەك دیفاع لە كەسێك بكات كە دەزانێ لەسەر ناهەقە، وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا كە پارێزەر (مُحامي) هەن، ئەو پارێزەرانە بۆیان نیە تەبەنیی قەزیەیەك بكەن، كە دەزانن خاوەنەكەی ناهەقە، با پارەی زۆریشیان بداتێ، یەكێك كێشەی زەوییەكی هەیە، كێشەی خانوویەكی هەیە، لەگەڵ خزمی، یان لەگەڵ بێگانەدا، دەشزانێ كە لەسەر ناهەقە، بەڵام زۆر دەوڵەمەندەو دەچێ زیاتر لەوەش كە موڵكەكە دەیهێنێ دەیدا بە موحامییەكو دەڵێ: هەرچی قوەتت هەیە بیخەكار، بەس لە بابای بەرانبەرم ببەمەوە، ئەوە لەو حاڵەدا ئەو موحامییە دروست نیە ئەو كارە بكات، مادام دەزانێ شتەكەی ناهەقە دروست نیە تەبەننیی بكاتو ئەو پارەیەشی لێ قەدەغە دەبێ، خوای دادگەریش فەرموویەتی: ﴿... وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ...﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە: وە لەسەر گوناهو دەستدرێژیی هاوكاریی یەكدی مەكەن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ﴾، داوای لێبوردن لە خوا بکە، هەندێك لە توێژەرەوان ئەوەیان لێبووە بە ئیشکالێك: ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆچی داوای لێبوردن لە خوای لێبوردە بکات، چونکە داوای لێبوردن لە خوا، مانای وایە ئینسان گوناهی کردوە، جا ئایا پێغەمبەر ﷺ لێرەدا گوناهەکەی چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: شتێك کە بە زاراوی ئێمە بە گوناح دادەنرێ، پێغەمبەر ﷺ لێرەدا دیار نیە هیچ گوناهێکی کردبێ، بەڵکو ئەوەی بۆ پێغەمبەر بە هەڵە دانراوە، نەك گوناح، وە پێویستی بەوە بووە کە داوای لێبوردن لە خوا بکات، ئەوەبوو کە گومانی خراپی بە جوولەکەکە بردو، وایزانی دزیی کردوەو لەوەشدا ناهەقی نەبوو، چونکە شتە دزراوەکە لە ماڵی ئەودا بوو و لە دەستی ئەودا گیرا بوو، بەڵام تەنانەت ئەوەش خوای گەورە ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات کە جارێکی دیکە وردتربە زوو بڕیار مەدە، وە ئاگات لە دڵی خۆت بێ، گومانی خراپ بە خەڵکی مەبە، هەتا شتەکە تەواو ساغ دەبێتەوە، کەواتە: با کەس وانەزانێ لێرەدا ئەو ﴿وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ﴾، داوای لێبوردن لە خوا بکە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەو مەسەلەیەدا، یان لە هەر مەسەلەیەکی دیکەدا، تووشی گوناهێك بووە، واتە: شتێك زانیویشیەتی گوناهەو کردووشیەتی، نەء، ئەوپەڕی پێغەمبەر ﷺ تووشی هەڵە بووە واتە: شتێك بە جۆرێك لێی حاڵی بووە، بەڵام واش دەرنەچووە، وەك بۆخۆشی لە فەرموودەکەی پێشووتردا کە لە ئومەو سەلەمەوە هێنامان، فەرموویەتی: جاری وایە بڕیار دەدات بۆ کەسێك، بەڵام لە واقیع دا هەق بەجۆرێکی دیکەیە، کە ئەوە دیارە وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ وَأَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ وَاحِدٌ﴾ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٣٥٢)، وَمُسْلِم برقم: (١٧١٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٧٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٠٦٠)، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، واتە: دادوەر کاتێ ئیجتیهاد دەکات (واتە: بیردەکاتەوەو کۆشش

دەكات) ئەگەر پێكای، دوو پاداشتی هەن، وە ئەگەر نەیپێكا، پاداشتێكی هەر هەیە، واتە: پێغەمبەر ﷺ پاداشتێكی هەر هەبووە لەوەشدا كە نەیپێكاوە، بەڵام خوای بەرزو مەزن لەبەرئەوەی مەقامی پێغەمبەر ﷺ زۆر بەرزە، پێی فەرمووە داوای لێبوردن لە خوا بكەو، جارێكی دیكە وردتربە، بۆئەوەی تووشی تەنانەت ئەو هەڵە بچووكانەش نەبی.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە گوناح كردن خیانەت لە خۆ كردنە، كاتێك ئینسان گوناح دەكات، ناپاكیی لەگەڵ خۆی دەكات، واتە: هەر گوناهێك كە دەیكەی ئەوە خیانەتت لە خۆت كردوەو خۆت تووشی سزا كردوە، یاخود مەبەست لە: ﴿ أَنفُسَهُمۡ ﴾، واتە: مسوڵمانان، وەك لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ ﴾النور، واتە: دەبووایە پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار گومانی باشیان بە خۆیان ببردایە، كە مەبەست لە (أنفسهم) هاوسەری بەرێزی پێغەمبەرە ﷺ دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، كەواتە: لێرەدا مسوڵمانانیش وەك نەفسی خۆتن، كاتێك كە تۆ گوناهێك بەرانبەر بەوان دەكەی، وەك ئەوەیە، بەرانبەر بە خۆتت كردبێ.

**مەسەلەی شەشەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، خۆیان لە خەڵك پەنهان دەكەن، بەڵام خۆیان لە خوا پەنهان ناكەن، واتە: دەتوانن لە خەڵك خۆبشارنەوەو چاوی خەڵك نەیانبینێ، بەڵام ناتوانن خۆیان لە خوا بشارنەوە، جا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ واتە: چۆن شەرم لە خەڵكی دەكەی لە پێش چاوی خەڵكی گوناهان ناكەی و، غەڵەتان ناكەی و خۆت دەشاریەوە تاوەكو نەتبینن، ئەدی بۆچی خۆت لە خوا ناشاریەوە؟ واتە: چۆن لە شەرمی خەڵكی گوناهان ناكەی، لە شەرمی

خواش گوناهان مەکە، چونکە خۆ لە خوا ناشاردرێتەوە، ئنجا دیارە هەر وایەو هیچ کەس لەبەرچاوی خەڵکی گوناهان ناکاتو خۆی دەشارێتەوە، کەواتە: چۆن لەبەرچاوی خەڵکی پێت عەیبە گوناهان بکەی‌و، شەرم لە خەڵکی دەکەی، ئەو شەرمەش لە خوا بکە، دیارە ئەگەر شەرمیشت لە خوا کرد، نە بە دزیی‌و نە بە ئاشکرا گوناهان ناکەی، چونکە خۆ هیچ کەس هیچ کاتێ ناتوانێ خۆی لە خوای زاناو ئاگادار پەنهان بکاو بشارێتەوە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ الْقَوْلِ﴾، وە خوا لەگەڵیاندایە کە قسەیەك ڕێك دەخەن‌و بەپیلان سازی دەکەن، کە خوا پەسندی ناکاتو پێی خۆش نیە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی ژمارە (٧) سووڕەتی (المجادلة) وایە کە دەفەرموێ: ﴿... مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَا أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا ...﴿٧﴾﴾، دەفەرموێ: چپەچپی سێ کەسان نیە، مەگەر خوا چوارەمیانە، وە هەر پێنج کەسێك چپەچپ بکەن، خوا شەشەمیانە، وە کەمتر لە سێ کەس‌و چوار کەس‌و، وە ئەگەر زیاتر لە پێنج‌و شەش کەسیش چپەچپ‌و فسکەفسك پێکەوە بکەن، خوا لەگەڵیاندایە لە هەر جێیەك بن، کە ئەمە بەڕاستیی بەڕێزان! ئەگەر ئینسان ئیمانی بەوە هەبێ، قەت ناتوانێ قسەیەکی غەڵەت بکات، نە بۆخۆی بە تەنیاو نە لەگەڵ خەڵکی دیکەش، وە نە بە ئاشکراو نە بە پەنهانیی.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، هەر کەسێك خراپەیەك بکات، یاخود ستەم لە خۆی بکات، دوایی داوای لێبوردن لە خوا بکات، دەبینێ خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، ئەم ئایەتە بە بۆچوونی من یەکێکە لەو ئایەتانەی

کە لە هەمووو ئایەتەکان زیاتر ئومێد بەخشن بۆ گوناهباران‌و بۆ خەتاباران‌و بەهەڵەداچووان، بۆچی؟ چونکە گوناح دوو جۆرە: یان لە نێوانی خۆت‌و خەڵکدا گوناح دەکەی، یان لە نێوانی خۆت‌و خوادا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا ﴾، واتە: هەر شتێك کە بۆ خەڵکی خراپ بێ‌و خەڵك پێی خراپ بێ، کەواتە: ئەوە نێوانی خۆت‌و خەڵك ﴿أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ﴾ یاخود گوناهێك دەکەی لە نێوانی خۆت‌و خوادا، کە هەر بۆخۆت خراپەو زوڵم لە خۆت دەکەی، کەواتە: گوناح ئەو دوو جۆرەیە، جا خوای بەخشندە بۆ هەردوو جۆرەکە دەفەرموێ: هەرکامێکیان بکات ﴿ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، دوایی داوای لێبوردن لە خوا بکات، دەبینێ خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، کەواتە: بە داوای لێبوردن لە خوا کردن‌و گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە هەردوو جۆرە گوناهەکان ئینسان دەربازی دەبێ.

کۆتایی ئەم مەسەلەی هەشتەمە بەم فەرمایشتە دێنین: ﴿عَنْ عَلِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كُنْتُ إِذَا سَمِعْتُ حَدِيثًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَفَعَنِي اللَّهُ بِمَا شَاءَ مِنْهُ، وَإِذَا سَمِعْتُهُ مِنْ غَيْرِهِ حَلَّفْتَهُ، وحَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَيَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاَّ غَفَرَ لَهُ، ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا ﴾﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٥٢١)، وَصَحَّحَهُ الألباني، واتە: عەلی کوڕی ئەبو طالب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: من هەر فەرمایشتێکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ ببیستایە، خوا سوودی پێ دەگەیاندم بە هۆی ئەو فەرمایشتەوە (واتە: جێبەجێم دەکرد)، وە ئەگەر بۆخۆم فەرمایشتەکەم لە پێغەمبەر ﷺ نەبیستبایەو لە یەکێ لە هاوەڵەکانم ببیستایە، لێم وەرنەدەگرت تا سوێندم نەدابایە (سوێندم دەدا بە خوا ئایا ئەوەت لە پێغەمبەر ﷺ بیست) وە ئەبو بەکر قسەی بۆ کردم‌و ئەبو بەکریش ڕاست دەکات (واتە: ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، پێویستی نەکردوە کە سوێندی بۆ بخوات کە ئەوەی لە

پێغـەمبەر بیـستوە) گـوتی: پێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: هیـچ بەنـدەیەك نیـە گوناهێك بكات، پاشان دەسـتنوێژ بگـرێو دوو ڕكات بكات، وە داوای لێبـوردن لـە خـوا بكـات، مەگـەر لێـی دەبـوورێ، دوایـی ئـەو ئایەتـەی خوێنـــــدەوە: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، هەر كەسێك خراپەیەك بكات، یاخـود ستەم لـەخۆی بكات، پاشان داوای لێبوردن لە خوا بكـات، ئـەوە دەبینـێ خـوا لـێبوردەی بـە بـەزەیی یە، خوا بە لوتفو كەرەمی خۆی لەگەڵ ئێمـەش بە بـەزەیی بـێ.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** كە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴾، وە هـەر كەسـێك گوناهێـك بەدەسـت بێنـێ، ئـەوە بـە زەرەری خـۆی وەدەسـتی دێنـێ، وشـەی (كَسب) دەڵـێ: (مَا يَجِرُّ بِهِ الإنسَان إلى نفسِهِ نَفْعَاً أُو يدفَع عَنْهُ ضَرَّاً) وشەی (كَسب) كە لـە كوردییـدا واتە: وەدەست هێنـان، بـە هـەر شـتێك دەگـوترێ كـە ئینـسان قـازانجێكی پـێ بـۆ خـۆی دەسـتەبەر بكـات، یـاخود زیـانێكی پـێ لەخـۆی دووربخـاتەوە، لـێرەدا خـوای میهرەبـان ئـەو ڕاسـتییە دەخاتـە ڕوو، كـە گونـاحو تـاوانو سـەرپێچیو لادان، بـۆ خـودی ئینـسان زەرەری هەیـە، ئەگـەرنا خـوای بـەرز لـەوە بـەرزترو مەزنـترە كـە بـە گونـاحو لادانـی ئێمـە زەرەرمـەندبـێ، یاخـود بـە چاكـەو طـاعـەتی ئێمـە بەهرەمەنـدبێ، كەواتـە: خـوا بۆچـی گوناهـەكانی قەدەغـە كردوون؟ لەبەرئەوە كە بەندەكـانی خـۆی خۆشـدەوێ، وە بەزەیـی پێیـاندا دێ، وە لەگەڵـیاندا بـە پەرۆشـەو، دەیـەوێ تووشـی شـتێك نـەبن، كـە زەرەری لـێبكـەن، نـەك لەبەرئـەوە گونـاحو لادانـی قەدەغـە كردبـێ كـە بۆخـۆی لێـی تووشـی زەرەربـێ، هـەروەك خوای بێنیـاز كە چاكـەو كـردەوە باشـەكانی لەسـەر ئینـسان فـەرز كـردوون، لەبەرئەوەیـە كـە بـەزەیی بـە بەندەكـانی دا هـاتوەو، خۆشـی دەوێـنو، چـاكەی بۆیـان دەوێو، دەیـەوێ بـە هـۆی ئـەو چـاكانەوە بەهرەمەندبـنو قـازانج بكـەن، نـەك لەبەرئـەوەی كـە بۆخـۆی قـازانجێكی پـێ بگـات، بە هۆی كـردەوەی چاكی بەندەكانییەوە.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، ئەم ئایەتە بەپێزە دیارە پێویستە چەند هەڵوەستەیەكی لەبەردەمدا بكەین، وە ڕاستە مانای ئایەتەكە ئاوایە: هەر كەسێك هەڵەیەك یان گوناهێك ئەنجام بدات، پاشان بێ خەتایەكی پێ تاوانبار بكاتو، لە ملی بێ خەتایەكی ببێچێ، ئەوە بوهتانێكو گوناهێكی ئاشكرای هەڵگرتوە.

**هەڵوەستەی یەكەم:** ئەوەیە كە ئایا وشەی: (خَطِيئَة) و (إِثْم) جیاوازییان چییە؟ كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ﴾، زانایان سێ شتیان باس كردوون:

أ- **ڕای یەكەم:** دەڵێن: (الخَطِيئَةُ: مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ النَّاسِ، والإِثْمُ: مَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ اللَّهِ)، واتە: (خَطِيئَة) هەر گوناهێكە لە نێوانی خۆتو خەڵكیدا بیكەی، (إِثْم) هەر گوناهێكە لە نێوانی خۆتو خوادا بیكەی، بۆ وێنە: قسە بە خەڵك گوتن، (خَطِيئَة)یە، بەڵام شتێك كە زەرەری بۆ خەڵك نەبێو لە زاتی خۆتدا بیكەی، بۆ وێنە: ڕوانینی حەڕام، یان گومانی خراپ بردن، یاخود شتی حەڕامو خواردنو هەر شتێك كە زەرەری بۆ خەڵك نەبێو، تەنها بۆخۆت زەرەری هەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (إِثْم).

ب- **ڕای دووەم:** دەڵێن: (الخَطِيئَةُ: الصَّغِيرة، والإِثْمُ: الكَبِيرَة)، (خَطِيئَة) واتە: گوناهی بچووك، وە (إِثْم) واتە: گوناهی گەورە.

ج- **ڕای سێیەم:** دەڵێن: (الخَطِيئَةُ: عَنْ عَمْدٍ وَخَطَأ، والإِثْمُ: لا يكونُ إلاَّ عَنْ عَمْدٍ) واتە: (خَطِيئَةُ) ئەوەیە چ بە ئانقەست بكرێو چ بە هەڵە، واتە: چ بزانی ئەو شتە گوناهە بیكەیو، چ نەزانی، بەڵام (إِثْم) ئەوەیە كە بزانی گوناهەو ئەنجامی بدەی.

كەواتــە: هــەركامێكیان بــێ هەردەگونجــێ، گــرنگ ئەوەیــە خــوای پەروەردگــار دەفــەرموێ: هــەر كەســێك هــەر جــۆرە گوناهێــك بكــات، چ پەیوەنــدیی بــە نێوانــی خــۆیو خــواوە هــەبێ، چ بــە نێوانــی خــۆیو خەڵكەوە، چ گچكە بێو چ گـەورە بێ، چ بە ئەنقەسـت بـێو چ بە هەڵـە بێ (ثُمَّ يَرمِ بِهِ بَرِيئاً) دوایی ئەو گوناهە ئەو هەڵەیە لە ملی كەسێكی بێ تـاوان ببێـچێ، ئـەوە دیـارە ﴿ فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾، بوختـانو گونـاهێكی ئاشكرای لە كۆڵـێ نـاوە !.

**هەڵوەســـتەی دووەم**: وشــەی ﴿ بُهْتَٰنًا ﴾، یانی چی؟ دەڵـێ: (البُهتَانُ: مِنَ البَهْتِ وَهُوَ التحيُّرُ والدّهشة) وشــەی: بوهتــان لــە ئەسڵی زمانـدا لـە (بهت)ەوە هـاتوە، كە بریتیـە لـە سەرسام بوونو سەرسوورمان، وە لـەوبارەوە كـە ئایا بوهتـان یـانی چی؟ ئەم فەرمایـشتە هەیـە: ﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَدرُونَ مَا الْغِيبَةُ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ، قِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اغْتَبْتَهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَقَدْ بَهَتَّهُ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٦٥٣٦)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٤٨٧٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٩٣٤)، وَالدَّارِمِيُّ بـرقم: (٢٦١٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٧٥٨)، واتە: ئـەبو هورەیـرە خوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵــێ: پێغــەمبەری خــوا ﷺ ڕۆژێــك فــەرمووی: دەزانــن غەیبەتــكردن چییــە؟ (غەیبــەت واتــە: لـە پاشـملە باسـی خـەڵك كـردن بـە شـێوەیەكی خــراپ، كــە ئەگــەر بــۆی بگێڕرێتــەوە پێــی نــاخۆش بــێ) گوتیــان: خــواو پێغەمبــەری خــوا زانــاترن، فــەرمووی: غەیبــەت بریتیــە لــەوە كــە باســی برایــەكەت بكــەی بــە هــەر شــێوەیەك پێــی نــاخۆش بــێ (تەنانــەت زانایـان دەڵێن: ئەگەر بڵێی قۆڵی چۆغەڵەكەی فراوانە، یاخـود: ڕەنگی مـووی وایـە، یـاخود: دەسـتی وایـە، یـان: خانووەكـەیان وایـە، بـە شـێوەیەك ئەگـەر پێـی بگاتەوە پێـی نـاخۆش بـێ، ئـەوە بـە غەیبـەت لـە قەڵـەم دەدرێ) گوترا: ئایا ئەگـەر ئـەو شـتەی كـە دەیڵێم: لـە برایەكمـدا هـەبێ، ئـەوە هـەر غەیبەتـە؟

فەرمووی: ئەگەر ئەو شتەی کە دەیڵێی (باسی دەکەی پاشملەو پێی بگاتەوە پێی ناخۆش بێ) تێیدا هەبێ، ئەوە غەیبەتت کردوە، وە ئەگەر ئەو شتەی تێدانەبێ، ئەوە بوختانت بۆ کردوە، کەواتە: بوختان واتە تاوانبارکردنی کەسێك بە خراپەیەك، کە ئەو خراپەیەی نەکردبێ‌و، ئەو شتەی تێدا نەبێ.

**هەڵوەستەی سێیەم:** ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴾، کە خوا لێرەدا گوناح‌و تاوانی بە کۆڵێکی قورس وێنا کردوە، کە ئینسان بە کۆڵیدا دەدا، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ النحل، واتە: با کۆڵ‌و قورسایی خۆیان هەڵگرن، وە کۆڵ‌و قورسایی دیکەش لەگەڵ هی خۆیان هەڵگرن، واتە: ئەو کەسانەی کە خەڵکیان گومڕا کردوە، گوناهی خۆشیان وەك کۆڵێکی قورس لە کۆڵیان دەنێن، وە گوناهی ئەو کەسانەش کە گومڕایان کردوون، هی ئەوانیش هەر لە کۆڵێ دەنێن، کەواتە: گوناهو تاوان کۆڵێکی قورسە، ئینسان دەیخاتە سەر شانی خۆی بۆ ڕۆژی قیامەت، کە بەرەو لای خوا دەیباتەوە، لە جیاتی ئەوەی کردەوەی چاك لەگەڵ خۆی بەرێتەوە، گوناهو تاوان لە کۆڵێ دەنێ!.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖ ﴾، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبووایە لەسەر تۆ (ئەی پێغەمبەر! ﷺ) کۆمەڵێکیان (واتە: لەوان) دەیانویست کە سەرت لێ بشێوێنن‌و گومڕات بکەن، واتە: ڕێت لێ تێکبدەن، وە تەنیا ڕێ لە خۆیان تێکدەدەن‌و هیچ زیانێك بە تۆ ناگەیەنن.

ئـەم ڕسـتە قورئانییـە بەڵـگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە گونـاح پارێزراو (معصـوم)ە، هەڵبەتـە پێغەمبـەر ﷺ لـە هەڵەی ئیجـتیهادی پـارێزراو نەبووە، واتە: کە شتێکی هاتۆتە پێش‌و وەحی لەسەر نەهـاتوەو بۆخـۆی بـیری لـێ کردۆتـەوە، یاخـود ڕاوێـژی بـە هـاوەڵانی کـردوە، لـەوە نـەپارێزراوە کـە بەهەڵەدابـچێ، جاری وابـووە بەهەڵەداچـووە، وەك لـە ئـازادکـردنی دیلـەکانی جەنگـی بـەدردا کـە حەفتـا (٧٠)یـان لـێ بـە دیـل گـیرابوون، پێغـەمبەر ﷺ ڕاوێـژی بە هـاوەڵانی کـرد، هەندێکـیان ڕایـان وابـوو کە بکـوژرێن، هەندێکـیان ڕایـان وابوو کە فیدیـەیان لـێ وەربگیرێ، پێغەمبەر ﷺ ئـەو ڕایـەی تەبەننـیی کرد کە فیـدیەیان لـێ وەربگیرێ‌و ئـازاد بکـرێن، بـەڵام دوایـی خـوای بەخـشندە ڕەخنەی لـێ گـرتن، کەواتـە: پێغەمبـەر ﷺ لە گوناهـو تـاوان پـارێزراو بـووە، بـەڵام لـە هەڵـەی ئیجتیهـادیی نـا، شـتێك کـە دەقـی لەسـەر نـەبووبێ‌و دیـار نەبووبێ داخۆ خوای بەخشـەر کامیانی پێ چاکە؟ ئەویش یەکێکیان تەبەننـیی بکات، لـەوەدا پارێـزراو نـەبووە کە بەهەڵەدا بچـێ، بـەڵام خـوای پەروەردگـار بۆی ڕاست کردۆتەوە، کە هەندێك لە زانایان بـەوە نالـێن هەڵە (خَطأ)، بەڵـکو پێـی دەڵـێن: هەڵبـژاردنی شـتێك کـە پێـچەوانەکەی باشـترە (إختیـار خِـلاف الأولـی) کەچی ئەگەر پێغـەمبەر ﷺ دوو شتی لە پێـش بـووبن‌و، یەکێکـیانی هەڵبژاردبـێ، ئەوی دیکەیان باشـتر بووبـێ، ئـەوە دەگونجـێ بـە هەڵـە تەعبـیر بکرێتـەوە، بەڵام بەتەئکید بە گوناح دانـانرێ، واتـە: مرۆڤ لەسـەری سزا نادرێ، واتـە: خـوای پـەروەردگار ئەگـەر گـلەیی لـە پێغـەمبەر کردبـێ لـە هەڵـەیەکی ئیجتهـادییدا، لـەو ڕووەوە نیـە کـە گونـاهبـارە، بەڵـکو لـەو ڕووەوە کـە مەقـام‌و پایـەی پێغەمبـەر ﷺ ئەوەنـدە بـەرزە، دەبـێ لـە خـۆی وریابـێ لـە ئیجتیهـادو بۆچوونەکانیشـی دا هەڵـە نەکـات، هەرچـەندە هەڵـە کردن لـە بۆچـووندا، بـە گونـاح لەقەڵەم نادرێ‌و سـزای لەسـەر نیـە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا﴾، وە خـوا تـۆ

کتێب و حیکمەتی دابەزاندۆتە سەرت، وە شتێکی فێرکردووی کە نەدەگونجا تۆ بیزانی، وە بەخششی خوا لەسەر تۆ زۆر مەزنە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەوەی لە خواوە هاتوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە قورئانە، وە قورئانیش حیکمەتیشی لە نێودایە، نەدەگونجا پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی فێری بێ، واتە: چ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ چ پێغەمبەرانی دیکە، ئەوەی کە خوا فێری کردوون، نەدەگونجا بۆخۆیان فێری ببن، ئەگەر خوای زانا فێری نەکردبان، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە هەندێك لە ئەهلی تەصەووف پێیان وایە ئەگەر ئینسان زۆر نەفسی خۆی تەزکیە کردو، زۆر لە خوا نزیك بۆوە دەگونجێ یاساکانی شەریعەت فێربێ، با خوێندەواریش نەبێ و، شارەزای قورئان و سوننەتیش نەبێ! وە دەڵێن: هی پێغەمبەرانیش ﷺ وابووەو لە ئەنجامی ئەوەدا کە نەفسیان زۆر پاکبووە، خوای پەروەردگار ئەو زانیارییانەی دابەزاندۆتە سەر دڵ و دەروونیان، منیش دەڵێم: دەگونجێ ئینسان لە ئەنجامی تەزکیەبوونی نەفسیدا دڵ ڕۆشنییەکی هەبێ، بەڵام ناگونجێ وەحی بۆ بێ، دەگونجێ فریشتەکان ئیلهامی خێری بۆ بکەن، دەگونجێ خەوی باش ببینێ، دەگونجێ خوای بە بەزەیی دڵی ڕۆشن بکاتەوە، بەڵام هەرگیز ناگونجێ وەحی بۆبێ، ئەوە کە خوا فریشتەیەك بنێرێ، وە فەرمایشتی خۆی پێدا بنێرێ، ئەوە تەنیا تایبەتە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) وە لەو ڕێیە تایبەتییەوە کە خوا دیاری کردوە، دێ و لە غەیری ئەو ڕێیە تایبەتییەوە نایەت، وە تایبەتیشە بە پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام) ئنجا ئەو ئایەتە لێی وەردەگیرێ کە حیکمەتیش هەر لە نێو قورئاندایەو شتێکی جیاواز نیە لە قورئان، وەك هەندێ لە زانایان وشەی حیکمەتیان بە سوننەت لێکداوەتەوە، کە من لە زۆر شوێنی دیکەدا باسم کردوە، حیکمەت بە مانای سوننەت نیە، لە قورئاندا (حكمة) کە لەگەڵ (كتاب)دا هاتوە، (كتاب) واتە: بەرنامە، یاسا شەرعییەکان، (حكمة)یش، واتە: پەندو ئامۆژگاریی و بەها بەرزەکان، ڕەوشتە پەسەندەکان و ئەدەب و ئاکارە بەرزەکان.

هەروەها بە سەرنجدانی چەند ئایەتێکی دیکەش ئەو ڕاستییە ئاشکرایە، بۆ وێنە:

١- کە خوا عزوجل بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِ ... ﴿٣٤﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: یاد بکەن، باس بکەن ئەوەی لە ماڵەکانتاندا دەخوێندرێتەوە لە ئایەتەکانی خواو لە حیکمەت، کەواتە: ئایەتەکانی خوا دیارە حیکمەتیشیان لە نێودایە، چونکە وشەی خوێنرانەوە (تلاوة) هەر بۆ قورئان بەکارهاتوە .

٢- هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٣١﴾ ﴾، واتە: ئەوەی کە بۆی دابەزاندوون لە کتێبو حیکمەت، (کتێب) واتە: بەرنامەو شەریعەت، (حیکمەت)یش واتە: ئەو پەندو ئامۆژگارییو ئەدەبو ڕەوشتە بەرزانەی ئێوەی پێ ئامۆژگاریی دەکات، کەواتە: هەردووکیان لەلایەن خواوە دابەزێندراون.

٣- هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)دا کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾، کەواتە: حیکمەتیش هەر بە وەحی بۆ پێغەمبەر هاتوە ﷺ، وە کە دەشفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، لە سوورەتی (الإسراء)دا باسی پازدە، بیست (١٥، ٢٠) لە سیفەتی بەرزو پەسەند(فضائل) وەك ڕێزگرتن لە بابو دایكو، پێش ئەوەش تەنیا خوا پەرستنو کۆمەڵێ سیفەتی بەرزو پەسەند، دوایی باسی کۆمەڵێك سیفەتی خراپ دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئەو سیفەتە بەرزو پەسەندانە، کە خۆتانیان پێ برازێننەوە، وە ئەو سیفەتە نزمو خراپانە، کە خۆتانیان لێ بە دوور

بگـــرن ﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ ... ﴿٣٩﴾ ﴾، ئـــەوە ئـــەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆی ناردووی.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتــە: هــیچ ســوودێك و خێرێك نیە لە زۆر لە چپەچپیاندا، مەگەر کەسێك فەرمان بکات بە ماڵ بەخشین و هاوکاریی ماددیی، یاخود چاکەکاریی، یاخود فەرمان بکات بە ئاشــتەوایی نێوان خــەڵك، وشــەی (نجوی) پێشتریش باسمان کرد، واتـە: چپەچپی نێوان دوو کەس یان زیاتر، کە بە پەنهانیی پێکەوە قسە بکەن، وە دەشگونجێ وشەی (نجوی) بە مانای کۆمەڵە کەسێك بێ کە بەیەکەوە چپەچپی دەکەن، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا قەدەغەی کردوە کە کۆمەڵە خەڵکێك پێکەوە دابنیشن دوویان، یان سێیان لە پەنایەك دابنیشن و لە سووچێك بەیەکەوە چپەچپ بکەن: ﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٩٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٩٣٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦٦٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٨٢٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٧٥)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون، با دوویان جیا لەوەی دیکە چپەچپ نەکەن، چونکە ئەوە دەبێتتە هۆی ئەوەی خەفەتی پێ بخوا، (وە گومانی لە دڵدا دروست بێ، کە ڕەنگە باسی ئەو بکەن)، لێرەدا خوای کاربەجێ ڕێگەی داوە چپەچپ بکرێ و قسەی پەنهان بکرێ لە سێ حاڵەتاندا:

١- (**صَدَقَة**)، یانی: دوو کەس پێکەوە ڕاوێژ بکەن، کە یارمەتی کەسێك بدەن و هاوکاریی ماددیی بکەن.

٢- (**مَعرُوف**) چاكەیەكی مەعنەویی لەگەڵدا بكەن: ئامۆژگاریی بكەن، یان لە هەڵەیەك بیگێڕنەوە.

٣- (**إصلاح بین الناس**) یاخود بۆ ئاشتەوایی‌و پێكهێنانەوەی خەڵك، وشەی (مَعْروف) دیارە (صَدَقَة)ش دەگرێتە نێوخۆی، چونكە (مَعْروف) واتە: چاكە، هەر شتێك بە چاكە دەزانرێ، جا چ ماددیی بێ، چ مەعنەویی، بەڵام لێرەدا كە لەگەڵ وشەی: (صَدَقَة)دا هاتوە، (صَدَقَة) واتە: بەخشینی ماددیی، (مَعْروف)یش واتە: چاكەی مەعنەویی‌و، (إصْلاح)یش واتە: پێكهێنانەوەی خەڵك، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكدا دەفەرموێ: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَمِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٧٥١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٧٠) وَقَال: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٣١١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح بطرقه وشواهده، واتە: هەموو بە چاك زانراوێك چاكەیەو پاداشتی هەیە، وە لە چاكەیە كە ئینسان بە ڕوویەكی خۆشەوە بگاتە برای خۆی، واتە: لەگەڵ خەڵكدا ڕووخۆش‌و قسەخۆش بێ، ئەوەش بۆخۆی لە خۆیدا طاعەتێكەو چاكەیەكە پاداشتی لەسەر هەیە.

<u>**مەسەلەی چواردەیەم**</u>: كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، هەر كەسێك یەكێك لەم سێیانە بكات، یان (صَدَقَة) واتە: بەخشینی ماددی، یان (مَعْروف) واتە: چاكەی مەعنەویی‌و، یان (إصْلاح) واتە: ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا بكات، بەڵام ﴿ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾، مەبەستی ئەوەبێ كە ڕەزامەندیی خوا بەدەست بێنێ، كەواتە: تەنانەت ماڵ بەخشین، وە چاكەكاریی مەعنەویی، وە ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا كردنیش، بەبێ خوا پێی مەبەست بوون، هیچ پاداشتێكی نیە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ...﴾

(مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٩٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٤٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٧٩٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٧) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابَ رضي الله عنه)، واتە: کردەوەکان بەپێی نیازو مەبەستن، یانی: کردەوە باشەکان دەبێ نیەتیان لێ بهێنرێ، ئنجا دادەمەزرێن.

بێگومان مەبەست لە کردەوەکان کردەوە باشەکانن، ئەگەرنا کەسێك خراپەیەك بکات بڵێ: مەبەستم پێی ڕەزامەندیی خوایە ئەوە هیچ ! بەڵکو کردەوەی چاکیش، ئەگەر مەبەستت پێی ڕەزامەندیی خوا نەبێ، پاداشتی نیە، دیارە کردەوەی خراپیش چ مەبەستت پێ ڕەزامەندیی خوابێ، چ مەبەستت پێ ڕەزامەندیی خوا نەبێ، هەر خراپە، کردەوەی چاك بە نیەتی چاکەوە پاداشتی هەیە، ئەگەرنا کردەوەی چاکیش بەبێ نیەتی چاك پاداشتی نیە، وە کردەوەی خراپیش ئەوە هەر لە ئەسڵدا بە کەڵك نایەت، عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی چاکەکاریی قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: (لا يَتِمُّ الْمَعرُوفُ إلاَّ بِثَلاثِ خِصَالٍ: تَعْجِيلُهُ وَتَصْغِيرُهُ وَسَتْرُهُ)[1]، واتە: چاکەکاریی بە سێ سیفەتان نەبێ تەواو نابێ: بە پەلە بیکەی، (واتە: دوای نەخەی) وە لە پێش چاوت بچووك بێ، وە بیشاریەوەو بیپۆشی، واتە: کەسێك کە چاکەیەکی لەگەڵدا دەکەی، کە بەڵێنت پێدا، زوو بۆی جێبەجێ بکەی‌و لە چاوەڕوانییدا داینەنێی، ئەوە یەك، پاشان کە چاکەکەت لەگەڵدا کرد، چاکەکەت پێ شتێکی گەورە نەبێ، پێت شتێکی بچووك بێ، با لە زاتی خۆشیدا گەورەبێ، وە پاشان داشیپۆشی‌و باسی نەکەی لەملاولا.

مەسەلەی پازدەیەم: ئەم مەسەلەیە گرنگییەکی تایبەتی هەیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾، کە پێشتریش

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٣٦).

مانامان کرد دەفەرموێ: هەر کەسێك دووبەرەکێی پێغەمبەر ﷺ بکاتو سەرپێچی لێ بکات، دوای ئەوەی کەوا ڕێنمایی بۆ ڕۆشن بۆتەوەو بکەوێتە دوای ڕێبازی جگە لە مسوڵمانان، ئەوە حەواڵەی خۆی دەکەین، وە دەیخەینە دۆزەخەوە، کە ئەوێش خراپترین سەرەنجامە.

لەم ئایەتە بەپێزە وەردەگیرێ کە هەر کەسێك سەرپێچیی لە پێغەمبەر ﷺ بکات، وە بشزانێ ئەوە سەرپێچییە لە پێغەمبەر ﷺ، ئەوە گوناهبارە، جا ئەگەر سەرپێچییکردنەکەی وابێ بڵێ: ئەوە من خۆم پێ گوناهبارە، ئەوە دیارە هەر گوناهبارە، بەڵام ئەگەر سەرپێچیی لە پێغەمبەر ﷺ بکاتو بە ڕەواشی بزانێ، ئەوە وێڕای گوناهباریی، پێشی کافر دەبێ، واتە: هەر کەسێك فەرمانێکی پێغەمبەر ﷺ، یاخود ڕێگرییەکی پێغەمبەر ﷺ ڕەت بکاتەوە، یاخود پێیەوە پابەند نەبێ، ئەگەر بڵێ: کەمتەر خەمم‌و خۆی بە گوناهبار بزانێ، ئەوە هەر گوناهبارە، بەڵام ئەگەر بڵێ: پێغەمبەر ﷺ وایگوتوە، بەڵام بە قسەشی ناکەم، وە فەرمانەکەشی بەڕاست نازانم، ئەوە پێشی کافر دەبێ، جا ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ بچووکبێ یان گەورەبێ، چونکە کاتێك کەسێك شتێك بەسەر پێغەمبەردا ﷺ دەداتەوە، مانای وایە پێغەمبەری خوای بە ڕاست نەزانیوە، بە ڕاست نەزانینی پێغەمبەریش پێچەوانەی ئیمانە کە پایەی گەورەی ئیمان بریتیە لە بە ڕاست زانین (تصدیق)، بەڕاست زانینی خواو پێغەمبەر ﷺ، وە هەرچی کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناویەتی، کەواتە: سەرپێچیی کردن لە پێغەمبەر ﷺ یەك حاڵەتی نیە، بەڵام ئەدی کەسێك سەرپێچیی لە پێغەمبەر ﷺ دەکات، یاخود سوننەتێکی پێغەمبەری خوا ڕەت دەکاتەوە، بەڵام لەو ڕووەوە نا کە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ! بەڵکو لەو ڕووەوە بڵێ: من قەناعەتم نیە کە ئەوە هی پێغەمبەر بێ، ئایا لەو حاڵەتەدا وەبەر ئەو ئایەتە دەکەوێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە زۆر لە زانایان هەندێك شتیان ڕەت کردۆتەوەو گوتوویانە: پێمانوانیە ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووبێتی، من بۆخۆم هەندێ شت هەیە بە ناوی پێغەمبەرەوە ﷺ گوتراوە، بەڵام کە تەماشای قورئان‌و سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەکەم، وە تەماشای باقی سوننەتەکانی پێغەمبەر

ﷺ دەكەم، دەڵێم: ئەوە وەك هی پێغەمبەر ناچێ، بۆیە ڕەتی دەكەمەوە، نەك لەو ڕووەوە كە ئەوە هی پێغەمبەرە ﷺ! بەڵكو لەو ڕووەوە كە پێموایە هی ئەو نیە، ئەوە لەو حاڵەتەدا ئینسان ناكەوێتە بەر ئەوە كە موخالەفەی پێغەمبەری كردبێ و، دووبەرەكیی پێغەمبەری ﷺ كردبێ.

ئنجا لەو ئایەتە ئەوە وەردەگیرێ كە مسوڵمانان دوو شتیان لەسەر پێویستە، كە هەردووكیان پێچەوانەی ئەم ڕستەیەن: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، پێچەوانەی ئەو دووانە واتە: پێچەوانەی سەرپێچییكردنی پێغەمبەر ﷺ، وە پێچەوانەی شوێنكەوتنی ڕێبازێك جیا لە ڕێبازی ئیمانداران، بریتیە لە چی؟ پێچەوانەكەیان بریتیە لە فەرمانبەرییكردنی پێغەمبەر ﷺ وە شوێنكەوتنی ڕێبازی ئیمانداران كەواتە: ئێمەی مسوڵمان بەپێی ئەم ئایەتە دوو شتمان لەسەر پێویستن:

**یەكەم:** فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكەین.

**دووەم:** بە دوای ڕێبازی ئیمانداران بكەوین، كە دیارە جەوهەرو كاكڵی ئیماندارانیش هەر فەرمانبەرییكردنی پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام وەك دوایی باسی دەكەین، جاری وایە جیاوازییەكی تێدا پەیدادەبێ.

ئنجا ئیمام شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ گوتوویەتی: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئیجماع، دوایی باسی دەكەین كە ئیجماع یانی: چی؟ بەڵام شەوكانیی گوتوویەتی: ئەم ئایەتە بەڵگە نیە لەسەر ئیجماع، واتە: قسەكەی شافیعیی ڕەت دەكاتەوە، شەوكانیی دەڵێ: (وَلا حُجَّة فِي ذَلِكَ عِنْدِي لأَنَّ الْمُرَاد بِغَيْرِ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِين هُنَا هُوَ الْخُرُوج مِن دِينِ الإِسلامِ إِلى غَيْرِهِ كَمَا يفيده اللَّفظ وَيشْهَد بِهِ السَّبَب)[1]، واتە: من پێموایە بەڵگە لەم ئایەتەدا نیە لەسەر ڕەوایی ئیجماع، چونكە مەبەست لە غەیری ڕێی مسوڵمانان واتە

---

١) (فتح القدير، ج: (١)، ص: (٦٦٠).

دەرچوون لە بازنـەی ئیسـلام، بۆ شـوێنکەوتنی غـەیری ئیسـلام، وەك ڕواڵەتی وشـەکانی دەیگەیەنـێ، وە هۆی هاتنـە خـوارەوەکەشی دەیگەیەنـێ.

ئنجـا پێغـەمبەر ﷺ لەوبـارەوە کـە ئینـسـان دەبـێ لەگـەڵ کـۆی مسـوڵماناندابـێ، چەند فەرمایشـتێکی هـەن:

**فەرمایـشـتی یەکـەم:** ﴿عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لايَجْمَعُ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ عَلَى الضَّلالَةِ أَبَداً، وَيَدَ اللَّهِ عَلَى الْجَمَاعَةِ، (فَمَنْ شَذَّ شَذَّ فِي النَّارِ)﴾ أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢١٦٧) عَنْ أبي مالـك الأشـعري، وَالطَّبَرانـيُّ بـرقم: (٣٤٤٠)، وَأَحمـد وغيرهـم، فالحـديث حَسَن أو صَحيح بـشواهِدِهِ، كَمَا قَالَ عَبدالرزاق المهدي مُحقق فتح القـدير، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٧) وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) بـرقم: (١٨٤٨) وَمَا بَيْنَ القَوْسَين ضَعِيف عِنْدَ الألبـاني، واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: خـوا ئـەم ئۆممەتـە هـەرگیز لەسـەر گـومڕایی کۆناکاتـەوە، (واتـە: هـەرگیز نابـێ ئۆممـەتی پێغەمبەر ﷺ یەك دەنگ بـێ لەسەر شتێك کە گومڕایـیو سـەرگەردانییە)، وە دەسـتی خـوا لەگـەڵ کۆمەڵـدایە، (واتـە: کۆمـەڵی مـسوڵمانان) وە هـەر کەسێك ڕیزپـەڕبـێ بەرەو دۆزەخ لادەداو ڕیـزپەڕ دەبـێ.

**فەرمایشـتی دووەم:** ﴿عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنْ الاثْنَيْنِ أَبْعَدُ مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمْ الْجَمَاعَةَ﴾ أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢١٦٥) وَقَـالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيـب، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٧٢٥٤)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٣٨٧) وَقَـالَ: صَحِيح عَلَـى شَـرْطِ الـشَّيْخَيْنِ وَصَـحَّحَهُ الألبـاني)، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: لەگـەڵ کۆمەڵدابن (کۆمـەڵی مـسوڵمانان) وە خۆتـان لـە پەرتـەوازەیی بپارێزن، چونکە شـەیتان لەگـەڵ یـەك نەفـەرە،

بەڵام لە دووان دوورترە (واتە: یەك كەس دەگونجێ شەیتان لەگەڵی بێ‌و ڕێی لێ تێكبدات، بەڵام كە بوونە دوو، لێیان دوور دەكەوێتەوە، چونكە ئامۆژگاریی یەكدی دەكەن)، وە هەر كەسێك بیەوێ بچێتە نێوەڕاستی بەهەشتێ با لەگەڵ كۆمەڵی مسوڵمانان دابێ.

كەواتە: لادان لە ڕێبازی مسوڵمانان‌و جەماوەری مسوڵمانان، سەرگەردانیی‌و سەرلێشێوانە.

ئنجا لێرەدا ئێمە دەڵێین: ئەگەر مەبەست یەك دەنگیی (إِجماع)ی زانایان ئەوەبێ كە هەندێك لە زانایان (إِجماع)یان ئاوا پێناسە كردوە، بۆ وێنە:

(عبداللّه بن یوسف الجدیع) لە (تیسیر علم أصول الفقه)، ص: (١٥٠))دا دەربارەی پێناسەی (إِجماع) دەڵێ: (الإجماع: هُوَ ما اتَّفَقَ عَلَيْهِ المسلمون مِنَ الأحكام الثابتة في الكتاب والسُنَّة) واتە: یەكدەنگیی ئەوەیە كە مسوڵمانان لەسەری ڕێككەوتبن لە یاسا چەسپاوەكانی قورئان‌و سوننەت، ئەگەر مەبەست لە ئیجماع ئەوەبێ، لەڕاستییدا ئەوەی كە شەوكانیی گوتوویەتی ڕاستەو، ئەم ئایەتە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە زانایانی (أصول الفقه) گوتوویانە دەربارەی ئیجماع، كە ئەوان چەند پێناسەیەكیان كردوە، كە ئەمانە چەند نموونەیەكیانن:

١- (د. مصطفى الزلمي) لە (أصول الفقه في نسیج الجدید، ص: (٨٧))دا دەڵێ: (الإجماع: إتّفاق جَميع المجتهدين مِن أمَّة مُحَمَّدٍ بَعْدَ وَفاتِهِ في عَصْرٍ مِنَ العصُور عَلَى حُكْم شرعِي اجتهَادِي لسَنَدٍ) واتە: ئیجماع بریتیە لە یەكدەنگیی تێكڕای ئەو زانایانەی كە دەتوانن یاساكان لە قورئان‌و سوننەت هەڵهێنجن، لە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ، لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمێك لە سەردەمەكاندا، هەموو یەكدەنگبن لەسەر یاسایەكی شەرعیی كە لە ڕێی كۆششەوە هەڵیانهێنجابێ، بە هۆی پشت بەستنی بە بەڵگەیەكی شەرعییەوە.

٢- (جلال الدين المحلّي) لە (توضيح المشكلات من كتاب الورقات، ص: (٣٠٢))دا كە شەرحیشی لەسەرە دەربارەی پێناسەی یەكدەنگیی و ئیجماعی زانایان دەڵێ: (الإجماع: إتّفاق عُلَمَاء أَهل العَصرِ عَلَى حُكم حادثة) یەكدەنگیی زانایانی سەردەمو چاخێكە لەسەر حوكمی ڕووداوێك كە لە ڕووی شەرعییەوە حوكمەكەی ئاوایە.

٣- (د. عبدالكريم زيدان) لە (الوجيز في أصول الفقه، ص: (١٧٩))دا كە ئەویش لە (إحكام الأحكام)ی (الآمدي، ج: (٤)، ص: (١١٥))دا هێناویەتی، دەربارەی یەكدەنگیی زانایان دەڵێ: (الإجماع: إجماع المُجتهدين مِنَ الأمَّة الإسلامية عَلَى حُكْم شرعي في عَصر مِنَ العصور بَعدَ وَفَاة النَّبيّ ﷺ) واتە: یەكدەنگیی زانایان بریتیە لە كۆبوونەوەی تێكڕای كۆششكەران لە ئۆممەتی ئیسلامی لەسەر حوكمێكی شەرعیی، لە سەردەمێك لە سەردەمەكاندا، لە دوای كۆچی پێغەمبەر ﷺ.

٤- (د. نورالدين مختار الخادمي) لە (تعليم علم الأصول، ص: (١٦٨)) بە هەمان شێوە پێناسەی دەكات.

كەواتە: ئەو ئیجماعەی زانایانی (أصول الفقه) مەبەستیان بووە ئەوەیە، نەك لەسەر یاسا چەسپاوەكانی قورئانو سوننەت، بەڵكو ڕووداوێك دێتە پێش مەسەلەیەك دێتە پێش، زانایان كۆدەبنەوە لە سەردەمێك لە سەردەمەكاندا لە دوای پێغەمبەر ﷺ، چونكە ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەردابێ ﷺ، خۆی حوكمەكەی بەیان دەكات، بۆیە دەبێ لە دوای پێغەمبەر ﷺ زانایان كۆببنەوەو هەموویان یەكدەنگ بن، كە ئەو ڕووداوەی هاتۆتە پێش، لە ڕووی شەرعییەوە حوكمەكەی ئاوایە، بۆ وێنە: جەنگ لە دژی قەوارەی جوولەكە، یان صولْح پێكهاتن لەگەڵ جوولەكە، وە منداڵی نێو بۆڕی، چوونە سەر مانگ، وە نوێژ لەنێو فڕۆكەدا چۆن دەكرێ؟ هەروەها ئەو مەسەلانەی كە كاتی خۆی نەبوون، دوایی پەیدابوون، ئەگەر زانایان كۆببنەوەو یەكدەنگبن لەسەر حوكمێكی شەرعیی لەبارەیانەوە، ئەوە پێی

دەگوترێ: ئیجماع، كەواتە: بەو پێیە بێ، قسەكەی شەوكانیی ڕاستەو ئەو ئایەتەی كە باسمان كرد، نابێتە بەڵگەی ئیجماع، هەرچەندە ئیمام شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ وایگوتوە.

بەڵام دیارە دەشگونجێ بە بارێكی دیكەیاندا بڵێین كە خوا دەفەرموێ: ﴿غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، مادام ئیمانداران لەسەر شتێك ڕێككەوتن، هەموو زانایانو مشوورخۆرانو چاوساغانی مسوڵمانانو پسپۆڕانی شەریعەت لەسەر شتێك ڕێككەوتن، كەواتە: ئەویش دەچێتە ڕیزی ڕێبازی مسوڵمانانەوە، وە دەچێتە ڕیزی ئەو حوكمانەی لە قورئانو سوننەتدا چەسپاون، بەو واتایە دەگونجێ بڵێین: ئەو ئایەتە دەبێتە بەڵگە بۆ ئیجماع، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان گوتوویانە بۆ وێنە (ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، وەك (القاسمي) لێی نەقل كردوە[1].

دەڵێ: {هیچ پرسێك نیە یەكدەنگیی لەسەر دروست بێ، مەگەر دەقێكی شەرعیی لەسەر بێ، بۆ وێنە: دەڵێن: نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕكاتە، ئیجماعی لەسەرە، نوێژی شێوان سێ ڕكاتە ئیجماعی لەسەرە، چونكە دەقی لەسەرە}، بەڵام من پێمولیە هەر شتێك كە بەڵگەی قورئانو سوننەتی لەسەر بوو، بۆخۆی چەسپاوە بە بەڵگەی قورئانو سوننەت، وە یەكەمین سەرچاوەی بەڵگە شەرعییەكان قورئانە، پاشان سوننەتی پێغەمبەرە ﷺو پەكیان لەسەر یەكدەنگیی زانایان نەكەوتوە، بەڵكو ئەو حوكمە شەرعییانە پەكیان لەسەر یەكدەنگیی زانایان كەوتوە، كە نە بەڵگەی قورئانیان لەسەرە، نە بەڵگەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، لە كۆتایی قسەكردنماندا لەبارەی ئەم ئایەتەوە، دەڵێم: وشەی: ﴿غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، لەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ

[1] محاسن التأویل، ج: (٥)، ص: (٦٦).

سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، هەر کەسێك سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بکات، دوای ئەوەی ڕێنمایی خوای بۆ ڕۆشن بۆتەوە، وە شوێن ڕێبازێك بکەوێ جیا لە ڕێبازی ئیمانداران، ئەم وشەی: ﴿ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ە، هەم شتێکی جیاواز، لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا دەگرێتەوە، وە هەم هەر بیروبڕواو هەڵوێستێکی ڕیزپەر لە یەکدەنگیی زانایانیش دەگرێتەوە، واتە: هەر کەسێك بە دوای ڕێبازێك بکەوێ، کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ قورئاندا تێك بگیرێ، یان ڕاستەوخۆ لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ، یاخود بە دوای ڕێیەكو ڕایەك بکەوێ، کە لەگەڵ یەکدەنگیی زانایاندا تێکبگیرێ، وشەی: ﴿ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، دەیگرێتەوە، بەلام دیارە یەکدەنگیی زانایانیش دەبێ پشت ئەستوور بێ بە بەڵگەی بەهێز، ئەگەرنا هەر زانایەك قسەیەکی کرد، پێچەوانەی ڕای کۆمەڵێك لە زانایانی دیکە بوو، یان پێچەوانەی ڕای هەمووشیان بوو، مادام قسەیەك بکات بەڵگەی بەدەستەوەبێ، ناگونجێ بڵێین: ئەوە لە ڕێبازو ڕیزی ئیمانداران لایداوە، بەڵکو زۆرجار زانایەك ڕایەکی زۆر جوانو بەهێزو پێزی بۆ پەیدادەبێ، کە ڕەنگە لەگەڵ ڕای زۆربەی زانایان تێکبگیرێ، بەلام ڕەنگە پێکابێتی، بەڵێ ڕای زۆرینە بە زۆریی وایە کە دەیپێکێ، بەلام جاری واش هەیە ڕای کەمینە دەیپێکێ، وەك مامۆستایان لەوبارەوە دەڵێن: هەندێك (قیل) وەك (فیل)ن! واتە: قسەیەك کە گوتراوە، جاری وایە قسەیەکە وەك (قیل) وەرگیراوە، بەلام لە ڕای جەماوەر بەهێزترە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا یازدە (١١) ئایەت تەفسیر دەکەین، کە لە ئایەتەکانی (١١٦ تا ١٢٦) پێکدێن، سوورگەی تێدا خوولانەوەی ئەم ئایەتە موبارەکانە، واتە: مەبەستی سەرەکیی کە ئەو ئایەتانە قسەی لێوە دەکەن، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (التوحید)، وە پێچەوانەکەی هاوبەش بۆ خوادانان (الشرك)، وە خستنە ڕووی ئەو ڕاستییەی کە شەیتان دامەزرێنەری بیرۆکەی شیرك‌و هاوبەش بۆ خوادانانە، هەروەك چۆن خوا بە یەکگرتن لەلایەن خواوە بە پێغەمبەراندا نێردراوە، وە فیطرەت‌و سروشتی ساغی ئینسان پشتگیریی دەکات، وە هەر بەو بۆنەیەوە خوای کاربەجێ ڕاستەوخۆ مسوڵمانان‌و ناڕاستەوخۆ خاوەن کتێبەکان دەدوێنێ‌و، تێیان دەگەیەنێ کە سەنگی مەحەك بریتیە لە ڕێبازی ئیبراهیم (خلیل اللّٰه)، واتە: دۆستی خوا، خۆشەویستی تایبەتی خوای پەروەردگار.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن
يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثٗا وَإِن
يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ
نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ
وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ
ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡۖ وَمَا يَعِدُهُمُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ﴿١٢١﴾
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴿١٢٢﴾ لَّيۡسَ
بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ
أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ وَمَنۡ
أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ
وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ
ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ﴿١٢٦﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـــەی ئایەتەکـــان

((بێگومان خـوا لەوە نـابووریٚ کە هاوبەشـی بۆ دابنـریٚ، بـەڵام جگـە لـەوە هـەر کەسـێك کە بیـەویٚ لـێی دەبووریٚ، وە هەر کـەس هـاوبەش بۆ خـوا دابنـیٚ، ئـەوە بـە گومڕایـی یەکی دوور گومـڕا بووە ﴿١١٦﴾ (بتپەرستو هاوبەش دانەرەکان) لـە جیـاتی خوا بەس لـە مێینـان دەپاڕێنـەوە، وە بـەس لـە شـەیتانی هـەڵگـەڕاوەو بـیٚ خێـر دەپـاڕێنەوە ﴿١١٧﴾ خـوا نـەفرینی لێکـردوە، وە (بـە هەڕەشـەوە) گـوتی: (بـە خـوا) بەشـێکی دیـاریکراو لـە بەنـدەکانت بۆخـۆم دادەبـڕم ﴿١١٨﴾ وە بێگـومـان گومڕایـان دەکەمو بە خەیاڵـپڵاو فریویان دەدەم، وە فەرمانیـان پێدەکـەم کـە گوێی ئـاژەڵان بـبڕن، وە فـەرمانیان پێدەکـەم کـە دروسـتکراوی خـوا بگـۆڕن، هـەر کەسـێکیش لـە جیـاتی خوا شـەیتان بـە دۆسـت بگـریٚ، ئـەوە بـە زیانبـارییەکی ئاشـکرا زیـانبـار بووە ﴿١١٩﴾ (شـەیتان) گفـتیان پێـدەداو تەمـاعی درۆیـان وەبەردەنـیٚ (خەیاڵـپڵاویان پێدەکـات) وە شــەیتان تـەنیا گفـتی فریودەریـان پێـدەدات ﴿١٢٠﴾ ئەوانـە شـوێنی حەسـانەوەیان دۆزەخـەو، هیـچ ڕێـی دەربازبوونیـشیان لێـی نیـە ﴿١٢١﴾ وە ئەوانـەی ئیمـانیان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکان ئـەنجام دەدەن، لـە مـەودوا دەیانخـەینە چـەند باغێکـەوە کـە ڕووبـاریان بـە ژێـردا دەڕۆنو، بـە هەمیـشەیی تێیـاندا دەمێننـەوە (ئەمە) گفتی خوایەو ڕاستە، وە ئایا قسـەی کـیٚ لە هی خوا ڕاسـترە! ﴿١٢٢﴾ نـە بـە خۆزگەو خەیاڵپڵاوی ئێوەو نە بە خۆزگەو خەیاڵـپڵاوی خـاوەن کـتێبەکـانە، هـەر کـەس خراپـە بکـات، لەسـەر ئـەوە سـزا دەدریٚ، وە جگــە لــە خوا هیــچ دۆسـتو پـشتیوانێکی چنـگ ناکـەویٚ ﴿١٢٣﴾ وە هـەر کـەس لـە (کـردەوە) چاکەکان ئەنجـام بدات لـە نێـرو مـیٚ، وە بـڕواداریش بـیٚ، ئـا ئەوانـە دەچنە بەهەشـتەوەو، هێنـدەی شـوێنکەی نێوکـە خورما ستەمیان لێنـاکریٚ ﴿١٢٤﴾ ئنجا ئایـا دینـداریی کـیٚ لـە هـی کەسـێك باشـترە کە ڕووی خۆی بـۆ خـوا ملکـەچ کـردوە (و خـۆی بـۆ سـاغو یـەکلا

کردۆتەوە) وە چاکەکاریشە، وە شوێن ڕێبازی ئیبڕاهیمیش کەوتووە؟ وە خواش ئیبڕاهیمی کردە دۆستو خۆشەویستی تایبەتی خۆی ﴿١٢٥﴾ وە هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەویدایە هی خوایە، وە خوا دەورەی هەموو شتێکی داوە ﴿١٢٦﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(إِنَٰثٗا): (جَمْع أُنثى، وَحَديدُ أنيث: لَيِّن وَذَلِكَ إذَا اعتُبِرَ فِيهِ المَعْنى اللغوي)، وشەی: (إناث) واتە: مێینەکان کۆی (أُنثى)یە، واتە: مێینە، لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (حَديدُ أنيث) واتە: ئاسنێك کە نەرم کرابێ، ئاسن کە گەرم بکرێ، نەرم دەبێو پێی دەگوترێ: (حَديدُ أنيث)، ئەگەر لێرەدا مانا زمانەوانییەکەی تێدا ڕەچاو بکرێ، کەواتە: (أُنثى) بۆیە پێی دەگوترێ: (أُنثى) چونکە دەنگی ناسکە، بەدەنی ناسکە، هەستو سۆزی ناسکە، جیا لە پیاو کە زبرو بەهێزە.

(مَّرِيدٗا): (مَرَدَ: تَجَرَّد، المارِدُ والمَريدُ مِن شَيَاطِين الجِن وَالإِنس: المُتَعَرّي مِنَ الخَيْرَاتِ، وَشَجَرٌ أَمردٌ: إذَا تَعَرَّى مِنَ الوَرَق، وَالأَمْرَدُ: المُجَرَّدُ مِنَ الشَّعْرِ)، وشەی: (مَرَدَ) واتە: (تَجَرَّد)، ڕووت بۆوە، (مارِدُ، ومَريدُ) لە شەیتانەکانی جینو ئینس، کەسێکە کە هیچ خێری پێوە نەمابێ، جا جینی بێ، یان ئینسی بێ، وە درەختێك کە گەڵاکەی ڕووتابێتەوە، پێی دەگوترێ: (شَجَرٌ أَمردٌ) واتە: ڕووتاوە، وە کوڕ کە تازە پێدەگات پێش ئەوەی کە ڕیشو سمێڵ دەربکات، پێی دەگوترێ: (أَمرد) واتە: بێ موو.

(لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ): واتە: خوا نەفرینی لێکردوە، (اللَّعْنُ: الطَّرْدُ وَالإِبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ السَّخَطِ وَفِي الآخِرَةِ عُقُوبَةُ وَفِي الدُّنيا انقِطَاعٌ مِنْ قَبُولِ رَحْمَتِهِ وَتَوفِيقِهِ)، (لَعْن) واتە: (طَرْد) یانی: دەرکردنو دوورخستنەوە لەسەر

شێوەی تووڕەیی، کە (لَعْن) لە دواڕۆژدا سزایە، وە لە دنیاشدا بریتیە لەوە کە خوا ڕەحمەتو بەخششی خۆی لەو کەسە ببڕێ.

(وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ): واتە: خۆزگەو هیوایان دەخەمە نێو دڵ، خەیاڵ پلاویان پێ دەکەم، چونکە دەڵێ: (التَمَنِّي: تَقدِيرُ الشَّيءِ في النَّفْسِ وَتَصويرهُ فِيها.. وَأَكْثَر التَمَني تَصَوُّرٌ لا حَقِيقَةَ لَهُ، وَلَما كَانَ الكَذِبُ تَصَوُّرُ ما لا حَقِيقَةَ لَهُ، صَارَ التَمَنِّي كَالْمَبْدَإِ لَهُ)، (تَمَنِّي) بریتیە لەوە کە ئینسان شتێك لە مێشکی خۆیدا وێنا بکات، وە زۆربەی شت وێنا کردن لە دڵو مێشکی خۆدا، شتێکە کە حەقیقەتی نیە، بۆ وێنە: کەسێك دەریایەك لە جیوە بێنێتە بەرچاوی خۆی، یان کێوێك لە زێڕ، بێنێتە بەرچاوی خۆی، کە دیارە ئەوە بوونی نیە، وە لەوەوەیە کە درۆش بریتیە لە شتێك کە حەقیقەتی نیە، بۆیە (تَمَنِّي) وەك بڵێی بناغەی درۆیە، بۆیە لێرەدا خوا لەسەر زمانی شەیتان دەفەرموێ: ﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ ﴾، واتە: خەیاڵ پلاویان پێدەکەم، واتە: شتی خراپیان دەخەمە دڵ، جا لەوەوە بزانن هەرچی خولیاو خەیاڵو شتی خراپە، هەمووی لە شەیتانەوەیە.

(فَلَيُبَتِّكُنَّ ): واتە: بە تەئکید دەبڕن، (البَتْكُ: يُقَارِبُ البَتَّ، لَكِنَّ البَتْكَ يُسْتَعْمَلُ فِي قَطْعِ الأَعْضَاءِ وَالشَّعْرِ)، وشەی: (بَتْك) نزیکە لە وشەی: (بَتّ)، (بَتّ) واتە: (قَطْع)، بەلام (بَتْك) بۆ بڕینی ئەندامەکان بەکاردێ، گوێی حەیوان ببڕی، یان لووتی ببڕی، یان مووی لێ بکەیەوە، پێی دەگوترێ (بَتْك)، بەلام (بَتْ) بریتیە لە بڕینی هەر شتێك.

(غُرُورًا ): (الغَرُور: كُلُّ مَا يَغُرُّ الإِنْسَانَ مِنْ مَالٍ وَجَاهٍ وَشَهْوَةٍ وَشَيْطَانٍ)، (غَرُور) واتە: فریودەر، هەر شتێك کە ئینسان فریو بدات لە ماڵو سامان لە پلەوپایە، لە ئارەزوو، لە شەیتان، پێی دەگوترێ: (غَرُور)، بەلام (غُرُور) واتە: فریودان، یاخود فریو خواردن.

(**مَحِيصًا** ): واتــە: شـوێنی لـێ دەربـاز بـوون، (مَحْـصَ: أَصْلُ الْمَحْصِ: تَخْلِيصُ الـشَّئِ مِمَّـا فِيـهِ مِـنْ عَــيْبٍ) وشــەی (مَحْـص) لــە ئەسڵــدا بریتیــە لــە لەبێـژینگدانو پاڵاوتـنی شتێك کە کەموکوڕیی پێوەبێو لێی بپاڵێوی.

(**أَمَانِيِّ** ): (أَمـانيّ: جَمْـعُ أُمنيَّـة: البُغْـية)، واتـە: ئـاوات و هیـوا، شـتێك کـە ئینـسان خولیـای بـێ.

(**نَقِيرًا** ): (النقيـرُ: وَقبَةُ فِي ظَهْـرِ النَّـوَاةِ وَيُضْـرَبُ بِـهِ الْمَثَـلُ فِـي الـشَّئِ الطَّفِيـفُ)، (نَقـیر) کـە لـە قورئانـدا بەکـارهاتوە، بریتیـە لـەو درزە بـچووکەی کـە لەسـەر دەنکــی نێوکــە خورمــایە، نێوکــی خورمــا خەتێکــی لەســەرە، ئــەوە پێــی دەگـوتـرێ: (نَقیــر).

(**حَنِيفًا** ): (الْحَنَـفُ: هُـوَ مَيْـلٌ عَـنِ الـضَّلاَلِ إِلـى الإِسـتِقَامَةِ، وَالجَنَـفُ: مِيْـلٌ عَـنِ الإِسـتِقَامَةِ إِلـى الـضَّلاَلِ)، (حَنَـفْ) پێـچـەوانەی (جَنَــفْ)ە، (جَنَــفْ) واتــە: لادان لـە ڕاســتەوە بـۆ چــەوت، بـەڵام (حَنـفْ) واتـە: لادان لـە ڕێـی چەوت بـۆ ڕاسـتە شــەقام.

(**خَلِيلًا** ): (خَلیـل) واتـە: دۆسـتو خۆشـەویـسـتێکی زۆر نـزیك، (الخُلَّـةُ: الـمَوَدَّةُ لإِنَّهَـا تَتَخَلَّـلُ الـنَّفْسِ أَي تَتَوَسَّـطُها)، (خُلَّـة) واتــە: خۆشـەویـستیی، چـونکە کەسـێك کەسـێکی خۆشــبوێ دەچێتـە نێو دڵـیەوە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

دەربارەی هۆی هاتنــە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾، چەند شـتێك گێڕدراونــەوە، مـن سـێ نـموونەیانـم لـێ هێنـاونەوە:

أ- ﴿أَخْـرَجَ ابْنُ أَبِي حَاتِم عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَـتِ النَّصَارَى: لا يَـدْخُلُ الْجَـنَّةَ غَيـرُنا وَقَالَـتِ قُـرَيشُ: إِنـا لاُنبْعَـث فَـأَنزَلَ اللَّـهُ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾﴾[1]، واتە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس خـوا لە خۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: جوولەکـەو نەصـڕانییەکان گوتیـان: جگـە لـە ئێمـە کەسـی دیکـە ناچـێتە بەهەشـت، {وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ...﴿١١١﴾ ﴾البقـرة، واتـە: وە گوتیـان: کـەس ناچێتە بەهەشت مەگەر ئەوەی جوولەکەبێ، یان نەصـڕانیی بـێ}، قوڕەیشییە موشریکەکانیش گوتیان: زیندوو ناکرێینەوە، خواش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ... ﴾، بـە خۆزگـە خواسـتنو هیـواو ئاواتــی ئێـوە نیـە، هەروەهـا بـە هـی خـاوەن کـتێبەکـانیش نیــە، کـە لێــرەدا بــەپێی ئــەم هــۆی هاتنـــە خــوارەوە بــێ، دەبــێ (أَمَانِيِّ ) ڕاناوەکـــەی بچێتەوە بۆ موشریکەکان، نەك بۆ مسـوڵمانان.

ب- ﴿ وَأَخـرَجَ ابْنُ جَرِير عَن مَسْرُوقٍ، قَالَ: تَفَـاخَرَ النَّصَـارى وَأَهْل الإسْلاَمِ فَقَـالَ هَـؤلاءِ: نَحْـنُ أَفْـضَلُ مْنْكُـمْ، وَقَـالَ هَـؤلاءِ نَحْنُ أَفْضَـلُ مِنْكُـمْ، فَـأَنزَلَ اللَّـهُ:

---

[1] لُبـاب النقول في أسباب النزول للسيوطي، برقم: (٣٦٢)، ص: (٨٦-٨٧).

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ﴾[١]، واتە: ئیبنو جەریر لە مەسرووقەوە هێناویەتی (مەسرووق یەکێکە لە تابیعین) دەڵێ: نەصرانییەکانو مسوڵمانەکان شانازییان بەسەر یەکدیدا کرد، نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە لە ئێوە چاکترین، مسوڵمانەکان گوتیان: نەخێر ئێمە لە ئێوە چاکترین، خواش ئەم ئایەتەی نارده خوار.

کەواتە: ئەم ئایەتە ئەوەی لێوەردەگیرێ: کە ئەی مسوڵمانینە! هەر لەبەرئەوەی پێتان دەگوترێ مسوڵمان، لە خەڵك چاكترنین، ئەگەر خراپە بکەن لەسەرتان دەنووسرێو لەسەری سزا دەدرێن، وە مافی ڤیتۆتان پێنەدراوە لە بەرانبەر گوناهان !!

ج- ﴿ أَخْرَجَ الطَّبَرِيُّ عَنْ قَتَادَةَ وَالضَّحَّاك وَالسُّدِيُّ وأَبِي صَالِح: تَفَاخر أَهل الأَديان وفي لَفْظِ جَلَسَ نَاسٌ مِنَ اليَهود وَنَاسٌ مِنَ النَّصَارَى وَنَاسٌ مِنَ المسلِمِينَ فَقَالَ هَؤلاء: نَحْنُ أَفْضَلُ، فقَالَ هَؤلاء: نَحْنُ أَفْضَلُ، فَنَزَلَتْ﴾[٢]، واتە: کۆمەڵێك شوێنکەوتووی دینەکان شانازییان بەسەر یەکدیدا کرد، لە لەفزێکی دیکەدا دەفەرموێ: کۆمەڵێ لە جوولەکەکانو، کۆمەڵێ لە نەصرانییەکانو، کۆمەڵێ لە مسوڵمانان پێکەوە لە کۆڕێکدا دانیشتن، هەر کامێکیان گوتی: ئێمە لە ئێوە چاکترین، هەر کامێکیان خۆی پێ چاکتر بوو، ئیدی ئەم ئایەتە هاتە خوار.

دواتر لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕوونی دەکەینەوە، ئەم ئایەتە حەقیقەتێکی گەورە فێری مسوڵمانان دەکات.

---

١) لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي، برقم: (٣٦٢)، ص: (٨٧)، والطبري برقم: (١٠٤٩٥)، (١٠٤٩٧).

٢) لُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي، برقم: (٣٦٤)، ص: (٨٧)، والطبري برقم: (١٠٤٩٨)، (١٠٥٠٩).

تێبینی: بۆ هەرسێك گێڕراوەکانو هەڵسەنگاندنی سەنەدەکانیان بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب )، ج: (١)، ص: (٥٠٤- ٥٠٩)، کە وێڕای ئەو سێ گێڕراوەیە، حەوتی دیکەشو سەرجەم دە (١٠) گێڕراوەی هێناون، بەڵام سەرجەمیانی بە بێهێز (ضعيف) داناون.

## مانـای گـشــتی ئایەتەكـــان

خوا ﷻ وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان، لەم یازدە (١١) ئایەتـەدا باسی دوو بابەتی گەورەو گرنگ دەكات، یەكەم: باسی ئیمانو تەوحید، دووەم: باسی شیركو گوناحو تاوان دەكات.

سەرەتا خوا ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ كە لە شیرك نابوورێ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴾، ئـەم ڕسـتە قورئانییـە لـە ئایـەتی (٤٨)ی سـوورەتی (النساء)یشدا هات، لەگەڵ تۆزێك جیاوازییدا، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾، بەڵام ئەم ڕستەیە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾، لـە هـەردوو ئایەتدا هاتوە، واتە: خوا لەوە نابـوورێ كە هاوبەشـی بـۆ پەیدابكرێ، بـەڵام جگـە لەوە واتە: جگە لە شیرك، بۆ هەر كەسێك بیـەوێ خـوا لـێی دەبـوورێ، واتە: بـەبێ تۆبـە، بـەڵام بـە تۆبـەوە خـوا لـە شـیركو لـە كوفرو لـە نیفـاقیش، وە لـە هـەموو گوناهێـك دەبـوورێ، وەك دەفـەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴿٥٣﴾ ﴾الزمـــر، ئـەوە ئەگەر تۆبە بكات، بەڵام ئەگـەر تۆبـە نەكات، با ئیمانـدارو مـسوڵمانیش بـێ، لە شـیرك نـایبوورێ، بـەڵام ئەگـەر گـیرۆدە نـەبووبێ بـە شـیركەوە، هـەر گوناهێكی دیكە، دەگونجـێ خـوا بیبـوورێو دەشـگونجێ نەیبـوورێ، مـسۆگەر نیـە، بـەڵام بـە تۆبـە مسۆگەر دەبـێ جـا دەفـەرمووێ: بێگـومان خـوا لـەوە نابـوورێ هاوبەشـی بـۆ بڕیـار بـدرێ، بـەڵام جگە لەوە لە هەر كەسێك دەبوورێ كـە بیـەوێ، ﴿ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴾، وە هـەر كەسـێك هاوبـەش بـۆ خـوا دابنـێ، بـە

گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە، واتە: زۆر دوور کەوتۆتەوە لە ڕاستە شەقامو، بە زەحمەت دێتەوە سەر ڕێگا.

ئەوجار باسی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا ﴾، بتپەرستەکان هەر لە مێینە دەپاڕێنەوە، کە زۆربەی زانایان دەڵێن: زۆربەی ئەو بتانەی بتپەرستان دەیانپەرستنو ئێستاش، لە شێوەی مێینەدا وێنایان دەکردن: مەنات، لات، عوززا، (مناة) (مؤنَّث)ی (مَنَّان)ە، (لات) (مؤنَّث)ی (إلە)ە، (عُزّى) (مؤنَّث)ی (عزیز)ە، یاخود هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەستیان پێیان مەلائیکەتان بوونو گوتوویانە: کچی خوانو پەرستوویانن!! ﴿ وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴾، وە ئەوانە ناپاڕێنەوە جگە لە شەیتانی داڕووتاوو بێ خێر، کە هیچ خێرێکی پێوەنیە، ﴿ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ ﴾، کە خوا نەفرینی لێکردوە، ﴿ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴾، وە شەیتان بە هەڕەشەوە گوتوویەتی: من بەشێکی دیاریکراو لە بەندەکانت دادەبڕم، واتە: ئەو کاتی خوا نەفرینی لێکرد، لەبەرئەوەی کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد، لەو ڕۆژەوە ئیبلیس هەڕەشەی کردو گوتی: ئەی خوایە! نەوەو وەچەی ئەو ئادەمە بەشێکیان لێ دادەبڕم، کەواتە: ئێوە بزانن کاتی خۆی شەیتان هەڕەشەی کردووە، ئاگاتان لێبێ ئێوە لەو بەشە نەبن کە شەیتان دایاندەبڕێ، وە لەگەڵ خۆی دەتانباتە دۆزەخ، چونکە تازە کە شەیتان دەستی لە ڕەحمەتی خوا شۆرد، گوتی: مادام من لەسەر ئەو ئادەمە کە کڕنووشی ڕێزم بۆ نەبرد، وام بەسەرهات، منیش ئەوەندەی بۆم بکرێ، دەبێ وەچەو منداڵەکانی ئادەم لەگەڵ خۆم ببەمە دۆزەخ، ئەوجار خوای باڵادەست، باسی هەڕەشەو گوڕەشەکانی شەیتان دەکات، کە گوتوویەتی: ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ ﴾، بە تەئکید گومڕایان دەکەم، واتە: سوێند بە تۆ ئەی خوایە! گومڕایان دەکەم،

﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ ﴾، خەیاڵپڵاویان پێدەکەم، یان خولیاگەلی درۆیان دەخەمە نێو دڵ، چەند کەس بە دوای کڵاوی خوارو خولیاو خەیاڵی بێ ئەنجام دەکەون زۆرن، ئەوە هەمووی لە شەیتانەوەیە، ﴿ وَلَأَمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَامِ ﴾، وە فەرمانیان پێدەکەم گوێی ئاژەڵەکانیان ببڕن، کاتی خۆی خەڵکی سەردەمی نەفامیی گوێی ئاژەڵیان دەبڕی بە وەسوەسەی شەیتان، وە دوای ئەوەی گوێی ئەو ئاژەڵەیان دەبڕی، لە خۆیان قەدەغە دەکردو دەیانگوت: دروست نیە گۆشتی بخۆین، ئێمە تازە داومانە بە خوا، خوای بەرز ئاژەڵی گوێ بڕاوی بۆ چییە؟ جا (أنعام) بە چوار جۆرە ئاژەڵ دەگوترێ: (حوشتر، مانگا - ڕەشە وڵاخ - مەڕ، بزن) ﴿ وَلَأَمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ﴾، وە فەرمانیان پێدەکەم دروستکراوی خوا بگۆڕن، وە ئەندامەکانی خۆیان بگۆڕن، دوایی باسی دەکەین کە خاڵ کوتانو، دەستکارییکردنی ددانو، برۆو ئەندامەکانی دیکە، وەبەر ئەوە دەکەون، ﴿ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴾، وە هەر کەسێك شەیتان لە جیاتی خوا بکات بە دۆستی خۆی، بە زیانبارییەکی ئاشکرا زیانبار بووە ﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ﴾، شەیتان گفتیان پێدەداو دڵیان خۆش دەکاو خولیاو خەیاڵی درۆیان دەخاتە نێو دڵ، ﴿ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴾، وە ئەو گفتو بەڵێنانەی شەیتان پێیان دەدات، واتە: بە وەسوەسەو خوتخوتە، هەر فریودانەو هیچی دیکە نیە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ﴾، ئا ئەوانە جێگاو شوێنی تێدا حەسانەوەیان دۆزەخە، چونکە مەئوا ئەو شوێنەیە کە ئینسان پەنای بۆ دەباو تێیدا دەحەسێتەوە، واتە: تاکە شوێنێك ئەوانە تێیدا بحەسێنەوەو ئیسراحەتی تێدا بکەن، بریتیە لە دۆزەخ، ﴿ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴾، لێشی دەرباز نابن،

جاری وایە ئینسان، تووشی چاڵێك، گرفتێك، بەڵایەك دەبێ، دەگونجێ دەرباز بێ، بەڵام ئەوان تووشی دۆزەخ دێن، وە لێشی دەرباز نابن.

ئنجا ئەوە بەنسبەت شوێنکەوتووانی شەیتانەوە، ئەدی بەنسبەت شوێنکەوتووانی ئیمانەوە؟ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗا﴾، وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، لەمەودوا دەیانخەینە چەند باغێکەوە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا﴾، بەڵێنی خوایەو ڕاستە، وە قسەی کێ لە هی خوا ڕاستترە؟! کەواتە: ئەهلی ئیمان خوای بە بەزەیی بەڵێنێکی ڕاستی پێداون، وە فەرمایشتی خوای پەروەردگاریش ڕاستە، وەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ٨٧﴾النساء، فەرمایشتی کێ لە هی خوا ڕاستترە، ئنجا ڕوو لە مسوڵمانانو خاوەن کتێبەکان، یان ڕوو لە مسوڵمانانو خاوەن کتێبەکانو بتپەرستەکان دەکات، کە ئەوە مانای ڕاستە، کە لێرەدا هەموویان دوێنراون، دەفەرموێ: ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ﴾، مەبەست پێی هەموو لایەکە مسوڵمانو نامسوڵمان، نە بە خۆزگە خواستنی ئێوەیە ئەی ئیمانداران! نە بە هی موشریکەکان، ﴿وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، وە بە خۆزگەو خولیاو خەیاڵپلاوی ئەهلی کیتابیش نیە، کوردەواریی خۆمان بە (أمنیة) دەڵێن: (خەیاڵپلاو، خۆزگە، بریا)، باشە ئەدی بە چییە؟ دەفەرموێ: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾، هەر کەسێك خراپەیەك بکات پێی سزا دەدرێ، سزایەکەی وەردەگرێتەوە، ئیدی هیچ کەسێك مەعفوو نیە، جوولەکە بڵێ: ئێمە گەلی هەڵبژاردەی خواین! نەصرانیی بڵێ: عیسا بۆ ئێمە خۆی کردۆتە فیداو

قوربانیی! مسولمان بلێ: نەخێر، ئێمە لەبەرئەوەی پێغەمبەرمان سەرەوەری پێغەمبەرانە، کەواتە: گوناهانیش بکەین قەیناکات! ئەوە هیچی وانیەو هەر کەسێك خراپەیەك بکات، سزاکەی وەردەگرێتەوە، ﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾، وە جگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانو یارمەتیدەرێکی نابێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا﴾، وە هەر کەسێك لە کردەوە باشەکان ئەنجام بدات، نێربێ، یان مێ، پیاوبێ یان ئافرەت، بە مەرجێك ئیمانداربێ، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە، وە بە قەدەر شوێنکەی سەر نێوکە خورماش ستەمیان لێ ناکرێ، ئەو درزە کە لەسەر نێوکە خورمایە پێی دەگوترێ: (نقیر)[1]، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا﴾، وە دینداریی کێ چاکترە لە هی کەسێك کە ڕووی خۆی بە خوا سپاردوە، وە چاکەکاریشە، وە شوێن ڕێبازی ئیبراهیمیش کەوتوە بە پاکیی، وە خواش ئیبراهیمی کردوە بە دۆستو خۆشەویستی خۆی، واتە: ئا ئەم جۆرە دیندارییە لە هەموو جۆرە دینداریییەك ڕاسترە، ئنجا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا﴾، وە هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەویدایە هی خوایە، وە خوا دەورەی هەموو شتێکی داوە، واتە: خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو شتێکە، ئەوەی لە ئاسمانە، وە ئەوەی لەسەر زەوییە، ئەوە خوای زاڵو باڵادەست بە زانیاریی‌و تواناو ویستی بێسنووری، دەورەی هەمووی داوە.

---

١) مختار الصحاح، ص: (٥٨٠)، لفظ: ن ق ر.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾، خوای بێ هاوەڵ لێرەدا ڕاستییەك ڕادەگەیەنێ کە پێشتریش هەر لە سوورەتی (النساء)دا، هەمان ڕاستیی ڕاگەیاندوە، بەڵام دیارە بە تۆزێك جیاوازییەوە، ئەویش ئەوەیە کە خوا لە تاوانی شیرك نابوورێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ ﴾، خوا ﷻ لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ دابنرێ ﴿ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾، بەڵام جگە لەوە (واتە: جگە لە شیرك) بۆ هەر کەسێك بیەوێ، خوای لێبوردە لێی دەبووری ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾، وە هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ئەوە بە شێوەیەکی زۆر دوور گومڕا بووە، واتە: بە جۆرێك لە ڕاستە شەقام دوور کەوتۆتەوەو سەرگەردان بووەو سەری لێ شێواوە، کە بە زەحمەت دێتەوە سەر ڕێ، وشەی شیرك لە زمانی عەرەبیدا، واتە: هاوبەش دانان، (الإشرَاكُ باللَّه) یان (الشركُ باللَّهِ) واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان، هاوبەش بۆ خوا دانان لە چیدا؟ لە بەدیهێنەرێتیی دا، لە پەروەردگارێتییدا، لە خاوەنداریێتییدا، لە پەرستراانیدا، لە هەموو ئەو شتانەی کە تایبەتن بە خواوە ﷻ، لە سوورەتی (الشعراء) لە ئایەتی (٩٧- ٩٨) خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو دۆزەخییانەی کە دەچنە دۆزەخ، بەهۆی شیرك و کوفرەوە، زۆر جوان پێناسەی شیرکمان بۆ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾الشعراء، واتە: (کافرەکان لە دۆزەخدا سوێند

دەخۆن، دەڵێن:) بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ڕوونو ئاشکرادا بووین، لەبەر چی؟ ﴿ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، کە کاتێك ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانەکاندا، کەواتە: شیرك یانی چی؟ یانی: یەکسانکردنی غەیری خوا لەگەڵ خوادا ﷻ، جا ئەو یەکسانکردنە لە بەدیهێنەرایەتیی دا بێ، وەك بڵێی خوای بەدیهێنەر شتێکی دروست کردووە، غەیری خوا شتێك دروست دەکات، یان لە پەروەرگارێتییدا، وەك چۆن خوای خاوەنی موڵكو مشوورخۆرو پەروەردگارە، پەروەردگارێتیی پاڵ بدەیە لای غەیری خواش، یان لە ناوو سیفەتەکاندا، واتە: ئەو ناوو سیفەتانەی بۆ خوا بەکاردێن، بۆ غەیری خواش بەکاریان بێنین، بۆ وێنە: تەنیا خوا شیفا دەدات، تۆ پێت وابێ غەیری خواش ﷻ شیفا دەدات، وە تەنیا خوا دووعا قبووڵ دەکات، پێت وابێ غەیری خوای بەرزو مەزنیش دووعا قبووڵ دەکات، یان غەیری خواش دەتوانێ لە گوناح ببووری، هەروەها دەبێ پەرستران تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێ، جا ئەو پەرسترانە، چ پەیوەندیی بە بواری دروشمەکان (شعائر)ەوە، هەبێ، وەك: (نوێژ، ڕۆژوو، دووعا، سەجدە، قورئان خوێندن، سەربڕین، ... هتد) چ پەیوەندیی بە بەرنامەکانی ژیان (شرائع الحیاة)ەوە دەبێ پەرسترانو بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێو، ئەو پەرسترانە بۆ هەر کەسێکی دیکە ئەنجام بدرێ، مانای وایە ئەویش کراوە بە هاوبەش بۆ خوا، کەواتە: هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن واتە: مامەڵە بکەی لەگەڵ غەیری خوادا، وەك ئەوە کە لەگەڵ خوادا دەیکەی، جا وەك گوتم ئەوەش چ بەوەبێ کە پەروەردگارێتیی، یان بە دیهێنەرایەتیی، یان خاوەنداریێتیی، یان ناوەکان، یان سیفەتەکانی خوا بۆ غەیری خوا بەکاربهێنرێن، یاخود بەوەبێ کە ئەو بەندایەتییەی بۆ خوا دەکرێ، بەشێکی یان هەمووی بۆ غەیری خوای تاكو پاك ئەنجام بدرێ.

ئنجا تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن، وە خاوەنی هەموو ناوو سیفەتە بەرزو پەسەندەکان بێ، وە تەنیا خوا بە پەرستراو دابنرێ،

کەواتە: هەر شتێك لەگەڵ ئەوە تێکبگیرێ، ئەوە لەڕاستییدا بە کوفرو شیرك لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام چەمك و واتای کوفر لە شیرك فراوانترە، چونکە کەسێك بڕوا بە یەکێك لە ئایەتەکانی خوا نەکات، ئەوە کوفری کردوە، وە کەسێك بڕوا بە ڕۆژی دوایی نەکات، کوفری کردوە، وە کەسێك بڕوا بە یەکێك لە پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) نەکات، کوفری کردوە، بەڵام ئەوانەو هاوێنەکانیان هیچ کامیان بە شیرك دانانرێن، شیرك هەمووی پەیوەندیی بە خوای تاکەوە هەیە، بەڵام کوفر پەیوەندیی بە خواوە هەیە، وە پەیوەندیی بە هەموو ئەو شتانەشەوە هەیە، کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوە، ئیمانیان پێ بهێنرێ، هەر کەسێك کوفر بە یەکێك لەو شتانە بکات، کە خوا فەرمانی پێکردوە ئیمانیان پێ بهێنرێ، هەڵبەتە تووشی کوفر بووە، بەڵام شیرك جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفرو باوترین جۆری کوفر، وە زۆربەی خەڵکیش کە تووشی کوفر دێ، بە هۆی شیرکەوە تووشی کوفر دەبێ.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: بۆچی خوا ﷻ لەم سوورەتە قورئانییەدا، لە سوورەتی (النساء)دا، ئەو ئایەتەی دووجار دووبارە کردۆتەوە؟ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾، لێرەو لە ئایەتێکی پێشتریشدا کە تەفسیرمان کردوە، وەڵامەکەی ئەوەیە:

**یەکەم**: خوا ﷻ ئەو ڕاستییانەی کە زۆر گەورەو گرنگن، لە قورئاندا دووبارەو دووپاتیان دەکاتەوە، بۆئەوەی زیاتر بچەسپێن لە عەقڵو دڵی خەڵکدا.

**دووەم**: هۆکاری دووبارەبوونەوەی هەندێك لەو ڕاستییانە، ئەوەیە کە سیاقو بابەتەکە دەیخوازێ، لە ئایەتی پێشیدا کە خوا ﷻ باسی خاوەن کتێبەکانی کردوە، باسی جوولەکەو نەصرانیی کردوە، کە تووشی لادانو گومڕاییو سەرگەردانیی بوون ون، بە شێك لە هەڵەکانیان بریتی بووە

لە چی؟ بریتی بووە شیرك، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾، لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾ النساء، هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ئەوە بوختانێكی گەورەی كردووەو درۆیەكی گەورەو مەزنی هەڵبەستوە، بەڵام لێرەدا سیاقەكە باسی موشریكەكان دەكات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾، هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ بە گومڕایی یەكی دوور گومڕا بووە، وە زۆر لە ڕاستە شەقام دوور كەوتۆتەوە.

<u>**مەسەلەی دووەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا﴾، خوا ﷻ باسی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەكات، دەفەرموێ: ئەوانە لەجیاتی خوا، تەنیا مێیینان دەپەرستن ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا﴾، واتە: تەنیا لە مێیینان دەپاڕێنەوە، كە دیارە پاڕانەوەو دووعا گرنگترین بەشی پەرستنە، ﴿وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا﴾، وە تەنیا لە شەیتانی یاخی بوو لە خوا دەپاڕێنەوەو، تەنیا ئەو دەپەرستن، لێرەدا توێژەرەوانی قورئان باسیان كردوە، بۆچی خوا ﷻ پەرستراوەكانی كە دەكرێن بە هاوبەش بۆ خوا، بە مێینان (إناث)ی ناو بردوون، چونكە (إناث) كۆی (أُنثى)یە، (أُنثى)ش واتە: مێیینە؟

زانایان سێ وەڵامیان داونەوە:

١- هەندێكیان گوتوویانە: لەبەرئەوەی زۆربەی پەرستراوەكان كە لە جیاتی خوا، وە لەگەڵ خوادا پەرستراون، مێیینە بوون، واتە: لە زەینو خەیاڵی

ئەوانەدا کە پەرستوویانن، مێینە بوون، ئەگەرنا لە واقیع دا هەموویان شتی بێ بنەماو ئەفسانەن، (مَنَاة)، (مُؤنث)ی (مَنَّان)ەو (لاة) (مؤنث)ی (إِلـه)ەو (عُزَّى)، (مُؤنث)ی (عَزِيز)ە، ئنجا لەنێو عەرەبەکاندا باوبووە، لە جیاتی بڵێن: صەنەمی فلان تیرەیە، گوتوویانە: (أُنثى بَني فُلان) مێیینەی فلان هۆزە، چونکە پەرستراوەکانیان بە زۆری لە شێوەی مێیینەدا وێنا کردوون، پاشان ئەوانە مەلائیکەیان بە کچی خوا داناون، لە حاڵێکدا خوا ﷻ بۆخۆی خۆی پێناسەی خۆی کردوەو فەرموویەتی: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤﴾ الإخلاص، واتە: نە کەسی لێ بووە نە لە کەسیش بووە، وە هیچکەس هاوتای نیە، ئیدی نە کوڕی بووە، نە کچی بووە، بەلاّم عەرەبەکانی سەردەمی نەفامیی دەیانگوت: (الشّياطين أَبناءُ اللّه، والمَلائِكةُ بَنَاتُ اللّه)، واتە: شەیتانەکان کوڕانی خوان، وە فریشتەکانیش کچانی خوان، کە لەڕاستییدا ئەوە بیرێکی پووچی ئەفسانەیی بووە، بەڵێ لەنێو (شَياطين)دا ڕەگەز (جنس) هەیە، نێرایەتیی و مێیایەتیی هەیە، بەلاّم لەنێو فریشتەکاندا ڕەگەز نیەو ئەوان نەنێرن، نەمێن، وەك چۆن ماددەی بێ ژیان کە دەیبینین نێرایەتیی و مێیایەتیی تێدانیە، مەگەر بە شێوەی (تَجَوّز) بۆ نموونە: کە دەگوترێ: گەردیلە لە پرۆتۆن و ئەلیکترۆن و نەیترۆن پێکهاتوە، کە پرۆتۆن بارگەیەکی ئەرێنیی (موجب)ی، هەیە ئەلکترۆن بارگەیەکی نەرێنیی (سالب)ی هەیەو، نەیترۆن هیچ بارگەیەکی نیە، کە ئەوە تەعبیرێکی چاوپۆشییکەر (متجوِّز)انەیە، ئەگەرنا لەڕاستییدا نێرایەتیی و مێیایەتیی، ئەوەیە کە لەنێو ئینسان و نێو ئاژەڵ و ژیاندارانی دیکەدا هەیە.

٢- هەندێکیان گوتوویانە: کە خوای بێ وێنە دەفەرموێ: ئەوانەی مێیینە دەپەرستن، مەبەست ئەوەیە کە (إِنَاثًا) واتە: (ضِعَافًا) واتە: بێهێزەکان، ئنجا توێژەروان بەمجۆرە پاساوی ناونرانی بت و صەنەمەکانیان بە

مێینـان (إنـاث) داوەتـەوە: (لأن الأُنثى أضْعَفُ مِنَ الذَّكر في كُلّ أصْنَافِ الْحَيْوَان) لەبەرئەوەی كە مێیینە لە هەموو جۆرەكانی ژیانداراندا هەمیشە لە نێرینە بێهێزترە، لەبەرئەوە مێیینەبوون، ڕەمزو هێمای بێهێزیی بووە، ئنجا كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا ﴾، یانی: (ضِعَافًا) واتە: ئەو صەنەمانەی كە ئەوان دەیانپەرستن بێهێزن، صەنەمێك نەتوانێ مێش لە خۆی دەربكات، مانای وایە بێهێزە، وە لەنێو عەرەباندا وا باوە كە بە ئینسانی بێهێزو بێ دەستەڵات دەڵێن: (أُنْثَى)یە.

٣- هەندێكیان گوتوویانە: واتایەكی دیكەی (إِنَاث) یانی: (مَوَاتًا) دەڵێ: (لأن الجَمَادَ لاحَرَكَةَ فِيه ولاحَيَاة) چونكە ماددەی بێگیان (بێ ژیان) نە جووڵەی تێدایە نە ژیان. خوای پەروەردگاریش بۆیە بە صەنەمەكانی فەرمووە (إناثاً) لەبەر ئەوە كە ژیانیان تێدانیەو جووڵەیان تێدانیە، دیارە هەمووشیان لە یەك كاتدا، هەرسێ مانایەكە كۆدەبنەوە: ئەو بتو صەنەمانەی كە پەرستراون بە زۆریی وابووە كە شێوەی مێیینەیان پێداون، وە بێهێزیش بوون، وە بێ ژیانو بێ جووڵەو بێ جموجۆڵیش بوون.

**مەسەلەی سێیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴾، وە ئەوانە جگە لە شەیتانی یاخی، لە شتێكی دیكە ناپاڕێنەوەو ناپەرستن، بۆچی خوای بێ هاوەڵ وای فەرمووە، لە حاڵێكدا كە مەرج نیە ئەوانەی بت پەرستن هەموویان شەیتانیان پەرستبێ؟ ئەوە دیارە یەزیدییەكان شەیتان بە بەرزو مەزن دەگرن، هەرچەندە دەڵێن: ناپەرستین! وە شەیتان پەرستی دیكە هەن، بەڵام مەرج نیە ئەو بت پەرستانەی دیكە هەموویان شەیتانیان پەرستبێ، ئەدی بۆچی خوای زاناو شارەزا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴾؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: كە شەیتان هۆكاری پەرستراني غەیری خوایە، وەك دەفەرموێ: ﴿ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ...﴿٤٨﴾ ﴾الأنفال،

واتە: شەیتان کردەوەکانی بۆ جوان کردوون، هەمموو ئەوانەی کە جگە لە خوا دەپەرستن، ئنجا بتو پەیکەری بووزایە، مانگو ئەستێرەو خۆرە، گاو مانگایە، دارو درەختە، مشکە، ماری کوبرایە، ... هتد، کە ئەو جۆرە پەرستراوانە لە ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ئاسیا زۆرن، ئەوە هەموویان شەیتان ئەو جۆرە پەرستنەیان بۆ جوان دەکات.

ئەو کاتەی چووم بۆ کەمبۆدیاو[1] مالیزیا، ئەوانە پەیکەری ماری کوبرایان دانابوو، گوتم: ئەوە چییە؟! گوتیان: ئەوە دەیپەرستین، لێمپرسین بۆچی دەیپەرستن؟ گوتیان: ئەو مارە ژەهرەکەی زۆر بە قووەتە، هەر کەسێ پێی وەبدات لینگان ناگرێ! ئەوانە ماری کوبرایان پەرستوە بە حیساب بۆ ئەوەی پێیانەوە نەدات! لە شەڕی سەلامەت بن! وەك چۆن یەزیدیەکانیش دەڵێن: ئەوە خوا بەخشندەو بە بەزەیی یەو، هەمیشە هەرخێرو چاکەی لێ چاوەڕوان دەکرێ، بەلاّم (مَلَک طَاوس) (کە شەیتانە) دەیپەرستین لەبەرئەوەی شەیتان زەرەرێ دەدات، ئنجا بۆئەوەی زەرەرمان لێنەدا دەیپەرستین! جا ئەوە فەلسەفەی هەندێك لە موشریکەکان بووە کە گوتوویانە: ئێمە هەندێ لەو شتانە دەپەرستین بۆ وێنە: هەورە تریشقەیان پەرستوە، خۆریان پەرستوە، شەویان پەرستوە، ئاگریان پەرستوە، لافاویان پەرستوە، گوتوویانە: ئەوانە زیانمان پێ دەگەیەنن، ئەگەر بیانپەرستینو قوربانییان بۆ بکەینو کڕنووشیان بۆ بەرین، بەزەییان پێماندا دێتەوەو لە دەستیان تووشی زەرەرو زیان نابین، ئنجا بەچی دەزانین کە دووعاو پاڕانەوە بۆ هەر کەسێك تەقدیم بکرێ، جۆرێکە لە پەرستن؟ چونکە ئایەتەکانی قورئان ئەوە دەگەیەننو خوای پەروەردگار لە هەندێ شوێن باسی دووعا دەکات، دوایی یەکسەر باسی عیبادەت دەکات، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (مریم)دا، باسی پاڕانەوە لە غەیری خوا دەکات ﴿وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ...﴿٤٨﴾﴾، دوایی

---

١) لە ساڵی (٢٠١١)ی زایینی دا، کە بانگهێشت کرابووین بۆ کۆنگرەیەکی پەرلەمانتارانی کیشوەری ئاسیا.

دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ... ﴿٤٩﴾ ﴾مريم، کەواتە: دووعا عیبادەتە، هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤١٥)، وَالبُخَارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (٧١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٧٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٦٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٢٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٩٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨٠٢) وَقَال: صحيح الإسناد، عَنْ النُّعمَانِ بنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه، وَحَسَّنهُ الألباني في (صحيح سنن أبي داود)، واتە: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە. واتە: بەشێکی گەورەو گرنگی خوا پەرستیی بریتیە لە پاڕانەوە لە خوا.

**مەسەلەی چوارەم:** کاتێك شەیتان هەڕەشە دەکات و دەڵێ: ﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾، کە دیارە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ئاخاوتنی کردووە دواوە، گوتوویەتی: ﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾، وە لە بەندەکانت بەشێکی دیاریکراو بۆخۆم دەپچڕم ! ئایا مەبەست پێی چی بووە؟ بێگومان مەبەستی پێ ئەوە بووە کە من ژمارەیەك لە بەندەکانی تۆ وا لێدەکەم کە تۆ نەپەرستن، جا مانگو خۆر بپەرستن، ئەستێرە بپەرستن، دارو بەرد بپەرستن، هەواو ئارەزووی خۆیان بپەرستن، حیزبێکی کافر بپەرستن، طاغووتێك بپەرستن، فیرعەونێك بپەرستن، گرنگ ئەوەیە شەیتان وایان لێدەکات کە غەیری خوا بپەرستن، دیارە هەر کەسێکیش هەرچەندە خۆی بە خوا پەرست دابنێ، بەڵام کە لەگەڵ پەرستنی خوادا، غەیری خوای پەرست، خوای تاك و بێنیاز ئەو پەرستنەی کە بۆ ویشی ئەنجام داوە، نایەوێ، وەك خوای بەرزو مەزن لەم فەرمایشتە قودسیەدا فەرموویەتی: ﴿أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِيْ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيْهِ غَيْرِيْ، فَأَنَا مِنْهُ بَرِيْءٌ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٧٤٠٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٠٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، واتە: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم، لە

هاوبەشێتییدا، هەر کەسێك کردەوەیەك بکات بەشی غەیری منی تێبخات، ئەوە من لێی بەرییم‌و بەشەکەی خۆشم دەدەم بەو.

واتە: خوای پەروەردگار ڕازی نابێ عیبادەتێك بۆ خوا بکرێ بەشی غەیری خوای تێبخرێ، هەر کردەوەیەك شیرك‌و ڕیای تێکەڵ بوو، ئەوە خوای پایەدار نایەوێ، جا لێرەدا کە شەیتان دەڵێ: ﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا﴾، بەشێك لە عەبدەکانت بۆخۆم دادەبڕم، پرسیارێك دەکرێ: ئایا شەیتان توانای ئەوەی هەیە خەڵکی بە تۆبزی بپچڕێ‌و دایانبڕێ‌و لە خوایان دوور بخاتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، شەیتان توانای ئەوەی نیە خەڵکی دابڕێ، واتە: پەلکێشیان بکاو ڕایان بکێشێ‌و لە خوا پەرستییان دوور بخاتەوە، ئەدی مەبەستی چییە لێرەدا؟ مەبەستی ئەوەیە کە من سەریان لێ دەشێوێنم‌و گومڕایان دەکەم‌و هەڵیاندەخەڵەتێنم‌و فریویان دەدەم، مەبەستی ئەوەیە، نەك یەکێك بڵێ: تازە ئەوە نیە شەیتان گوتوویەتی: بەشێکیان لێ دادەبڕم، تازە من شەیتان دایبڕیوم‌و ئەوە کە ڕامدەکێشێ‌و پەلکێشم دەکات‌و ئیرادەم لەدەست خۆمدا نەماوە! شتی وا نیە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (إبراهیم) لە ئایەتی (٢٢)دا فەرموویەتی ، - کە دیارە قورئانیش هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات، وەك زۆرجاران گوتوومانە: (القُرآن يُفسِّرُ بَعْضُهُ بَعْضاً) لە هەر شوێنێك ویستمان لە ڕستەیەکی قورئان شارەزابین، یان ئەگەر ئیشکالێکمان هەبوو، با تەماشای ئایەتەکانی دیکەو ڕستەکانی دیکەی قورئان کە لەو بابەتەوە هاتوون بکەین، ڕۆشنایی باش دەخەنە سەر ئەوەی کە لەبەرچاومان لێڵییەکی تێدایە -، بەڵێ جا لە ئایەتی (٢٢)ی سوورەتی (إبراهیم)دا دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا

تَلُومُونِى وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾

إبـراهيم، کـە ئەمـە قـسەی شـەیتانەو خـوا لەسـەر زمـانی وی دەفـەرمویْ: وە شـەیتان دوای ئەوەی هـەموو شـتێك تەواو بوو (واتـە: لـێپرسینەوە کـرا) گـوتی: (بە کێی گوت؟ بەوانەی شوێنی کەوتوون) خـوا بەڵـێنێکی ڕاسـتی پێـدا بـوون، منیـش بەڵێنـێکم پێـدان، کـە لـە بەڵـێنەکەمدا ڕاسـتم نـەکرد، وە هـیچ دەسـەڵاتێکم بەسـەرتاندا نـەبوو، ئەوەنـدە نـەبێ کـە بانـگم کـردنو ئێـوەش وەڵامتان دامەوە، کەواتە: دەسـەڵاتی شەیتان بۆ گومڕاکردنی خەڵك هەر ئەوەیـە کە بانگـیان دەکـات، چۆنیان بانگ دەکات؟ وە بە دوو شێوەی سەرەکیی:

**یەکـــەم:** یان لەسەر زمانی ئەو ئینسانانەی کە شـەیتان وەك خۆیان لێدەکـات بانگیـان دەکـات، وەك خـوای بـێ هاوتـا دەفـەرمویْ: ﴿ ...شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴿١١٢﴾ ﴾الأنعـــــــــــــام، شـــەیتانەکانی مرۆڤـــو جنـــد، هەندێکـــیان قـــسەی ڕازاوە بـــە مەبەســـتی فریـــودان فێـری یەکـدی دەکـەن، کەواتـە: شــەیتان کەسـێکە کـە لـە هـەق دوورەو لە خـوا دوورە، هەر کەسـێك لە خـوا دووربـێ، مرۆڤ بـێ یان جنـد، ئـەوە شـەیتانە، جـا شــەیتان لەســەر زمـانی ئینـسـانێکەوە، کـە وەك خـۆی لێکـــردوە، کردوویەتـی بـە شـەیتان، خـەڵك لـە خـوا دوور دەخاتـەوەو بـانگی خـەڵکی دەکـات بـۆ گومڕایـی، ئـەوەی کـە خەڵـك بـانگ دەکـات بـۆ ڕێـچکە شـەیتانییەکان بۆ گومڕایـی بۆ هـەموو ئەو بەرنامانەی کە غەیری ئیسـلامن، ئەوە لەڕاسـتییدا بانـگکـردنی شـەیتانە.

**دووەم:** یـان بـە شـێوەی پەنهـان بانگـیان دەکـات، کـە ئـەویش بریتیـە لـە خوتخـوتەو خەیـاڵ خـستنە دڵـی خەڵـكو دنـەدان بـە شـێوەی پەنهـان، ئەوەش شێوازێکی دیکەی بانگکردنی شـەیتانە، بەڵـێ شـەیتان دەڵێ: ﴿ وَمَا

كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ﴾، هیچ دەسەڵاتێکم بەسەرتاندا نەبوو، ئەوەندە نەبێ کە بانگمکردنو ئێوەش وەڵامتان دامەوە، بۆیە ﴿فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُم ﴾، لۆمەی من مەکەن، بڵێن بە تۆبزیی ئێمەت گومڕا کردوە، لۆمەی خۆتان بکەن، بۆخۆتان بەدەممەوە هاتن، هەر بۆخۆتان کەیفتان بەوە دەهات کە من ئێوەم بۆ بانگ دەکرد، ئەگەرنا من بە تۆبزی پەلکێشم نەکردنو ڕام نەکێشاون، دوایی دەڵێ: ﴿مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ﴾، نە من لە فریای ئێوە دێمو نە ئێوەش لە فریای من دێن ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ﴾، ئەوە من بێ بڕوام بەرانبەر بەوەی کە منتان کردە هاوبەشی خوا لەمەو پێش ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بێگومان ستەمکاران ئازارێکی بە ئێشیان هەیە.

کەواتە: شەیتان ئاوا تەماشا ئەوانە دەکات کە شوێنی کەوتوونو دەوروبەری ئەویان قەرەباڵغ کردوە.

**مەسەلەی پێنجەم**: شەیتان هەڕەشە دەکاتو دەڵێ: ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَأٓمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَأٓمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ﴾ لێرەدا شەیتان چۆنیەتی گومڕاکردنی ئەو کەسانەی کە شوێنی دەکەون دەخاتە ڕوو، لە چوار بڕگەدا: ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ ﴾، واتە: بە تەئکید گومڕایان دەکەمو سەریان لێ دەشێوێنمو لە ڕاستە شەقامی تۆ دووریان دەخەمەوە ﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ ﴾، (أمْنِيَة) واتە: خۆزگەو خەیاڵ، خۆزگە خواستن بە شتێك کە شیاوی پەیدابوون نەبێ، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ خەیاڵ پڵاو، واتە: خەیاڵ پڵاویان پێ دەکەم ﴿ وَلَأٓمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ

﴿ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾، فەرمانیان پێ دەکەم کە گوێی ئاژەڵەکانیان ببڕن ﴿ وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِ ﴾، وە فەرمانیان پێ دەکەم کە دروستکراوی خوا بگۆڕن، واتە: شەیتان لێرەدا بەرنامەی خۆی دەخاتە ڕوو، کە من ئاوا لەو بەندانەی تۆ دەکەم کە بە دوام دەکەون، وە دەکەونە ژێر ڕکێفو کۆنترۆڵی منەوە، من ئەو حاڵەتانەیان بەسەردا دێنم:

**برگەی یەکەم:** ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ ﴾، (إِضْلال) واتە: گومڕاکردنو ونکردن لە ڕێی هەقو سەر لێ تێکدانو، سەر لێ شێواندنو دوورخستنەوە، ئنجا بێگومان گومڕاکردن (إِضْلال) ئەوانی دیکەش ئەو شتانەی کە دواییش دێن ئەوانیش دەگرێتەوە.

**برگەی دووەم:** ﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ ﴾، وە خۆزگەیان پێ دەخوازمو خەیاڵپلاویان پێدەکەم، ئەوە جۆرێکە لە گومڕاکردن جۆرێك لە گومڕابوون بەدەستی شەیتانە، کە ئینسان خەیاڵ پلاو بکاتو بە دوای خۆزگەو بریایەك بکەوێ، کە نەیەتەدی، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (فلان کەس ئیمانێ بە نیسکێ دەسپێرێ) یانی: بەتەمای خۆزگەو خەیاڵ پلاوێك لە شتێك دەگەڕێ، ئەوە کاری شەیتانە، هەر کەسێك بە دوای خۆزگەو بریاکەوتو بە دوای خەیاڵ پلاوکەوت، وە بەتەمای شتێك لە شتێك گەڕا کە هیچ نەبوو، وەکو ئەوانەی بە تەمای شەجەرەی خزمایەتیی کە خزمی پێغەمبەرن ﷺ، وە بەتەمای ئەوە کە فلان کەس بابی پیاوی چاك بووە، یان فلان کەس خزمی فلان کەسە، یان لەبەرئەوەی کە ئەهلی عیلمە، یان لەبەرئەوەی پێی دەگوترێ ئیسلامیی، هەر کەس بەتەمای ئەو ناوونیشانانە لەخۆی گەڕاو، خەمی لە کردەوەی باش نەخوارد، لەڕاستییدا ئەوە هەمووی جۆرێکە لە هەڵخەڵەتان بە وەسوەسەی شەیتان.

**بڕگـــــەی ســـــێیەم:** ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾، وە بێگومان فەرمانیـان پێدەکـەم گوێـی ئـاژەڵان بـبڕن.

**بڕگـەی چـوارەم:** ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِ ﴾، وە پێیـان دەڵـێم کـە دەسـتکاری دروسـتـکراوەکانی خـوا بکـەن.

**مەسـەلەی شـەشـەم:** کە شـەیتان وەك خـوا ﷻ لـێـی دەگـێڕێتـەوە، گوتوویـەتی: ﴿ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِ ﴾، وەك پێـشـتـر باسـمان کـرد هـەر جـۆرە لادانێـك لـە ڕاسـتە شـەقامی خـوا، پێـی دەگـوترێ (ضَلال) وە (إِضلال) یـانی: سـەر لـێ تێکدانو دوورخسـتنەوەو گومڕاکردن، وە ﴿ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ ﴾، ئـەمیش ئەوەیـە کـە ئینسـان بۆ هـەندێ ئامانج، هەندێ خۆزگـەو خولیـاو ئـاواتـی لـە دڵـدا هەبـێ، بـێ ئـەوەی کـە کاریـان بـۆ بکـات، وەکـو کـوردەواریی خۆمـان ئـەو تەعبـیرە بەکـاردێنن: (ئیمـانـێ بە نیسـکێ دەسـپێرێ)! بـەڵام ئایـا ئـەو دووانـەی دیکە کە شـەیتان هەڕەشەیان پێدەکاتو دەڵـێ: ﴿ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ وَلَآمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِ ﴾، وە فەرمانیـان پـێ دەکـەم کـە گـوێی ئاژەڵەکانیـان بـبڕن، وە فەرمانیـان پـێ دەکـەم کـە دروسـتـکراوی خـوا بگۆڕن، ئایا ئەو دووانە چینو چۆنن؟! دەڵێین: لـەوبارەوە چـەند فەرمایـشـتێکی پێغەمبـەر ﷺ هـەن، بـە سـەرنجدانیان چـەمكو واتـای هەرکـام لـە: بـڕینو لەتکـردنی گـوێی ئـاژەڵو، گـۆڕینی دروسـتکراوی خوا، زۆرباش ڕوونـدەبێتـەوە:

**فەرمایشـتـی یەکـەم:** ﴿ عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ذَاتَ يَوْمٍ فِي خُطْبَتِهِ: «أَلاَ إِنَّ رَبِّي أَمَرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا، كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلاَلٌ، وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ، وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ

مَـا أَحْـلَلْتُ لَـهُمْ وَأَمَـرَتْهُمْ أَنْ يُـشْرِكُوا بِـي مَـا لَـمْ أُنْـزِلْ بِـهِ سُـلْطَاناً...﴾، أَخْرَجَهُ مُسْلَمٌ برقم: (٧١٣٦)، واتە: عیاضی کوڕی حیمار خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتـەوە، کـە ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ لـە وتارەکەیـدا فەرموویـەتی: ئاگاداربـن! پەروەردگـارم فەرمـانی پێکـردووم کـە ئەمـڕۆ هەرچـی خـوا فێرمی کردوە، فێری ئێوەی بکەم، چونکە ئێوە نایزانن (جا ئەوە فەرمایشتی خوایـە) هەر ماڵێك کە داومە بە یـەکێك لـە بەنـدەکانی خـۆم ئـەوە حەڵاڵـە، (واتە: با لەخـۆوە شتی حـەڵاڵ لـە خۆیان قەدەغـە نەکـەن، لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیە کە هەر ماڵێك کە خوای بەخشندە بـە بەنـدەکانی خـۆی دەدا، لە ڕێ یـەکی حەڵاڵـەوە، ئـەوە حەڵاڵە)، وە مـن بەنـدەکانی خـۆم هـەموو بـە پاکـیی خوڵقاندوون، بەڵام دوایی شـەیتانەکان هـاتوون بۆ لایان، وە لە دین دووریـان خسـتوونەتەوە (واتـە: تووشـی شـیرك‌و لادانیـان کـردوون لـە ئەسـڵـدا خـوا بەندەکانی وا خولقـاندوە پاك‌و چاك بـن فیطـرەتێکـی پـاك‌و سـروشـتێکی پـاکی پێـداون، بەڵام شـەیتان ئـەو فیطـرەت‌و سـروشـتەیان لـێ تێکـدەدات، وە ئـەوەی کـە مـن بـۆم حـەڵاڵ کـردوون لێیـان قەدەغـە کـردوون، چـۆن؟ وەسوەسـەیان بـۆ کـردوون کـە گـوێ یـان بـبڕن‌و نیـشـانەداریان بکـەن)، وە شەیتانەکان فەرمانیان پێکـردن کـە شـتێك بکـەن بـە هـاوبەش بـۆ مـن کـە هیچ بەڵگەیەکم لەسەر نەنـاردۆتـە خـوار.

**فەرمایـشـتی دووەم:** ﴿ عَـنْ أَبِي الأَحْوَصِ عَـنْ أَبِيـهِ رضي الله عنه قَـالَ: أَتَيْـتُ سُولَ اللَّـهِ ﷺ وَأَنَا قَشِفُ الْهَيْئَةِ، فَقَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ مَالٍ»؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: مِنْ أَيِّ الْمَـالِ؟ قُـلْتُ: مِـنْ كُلِّ الْمَالِ: مِـنَ الْخَيْـلِ والإِبِـلِ وَالرَّقِيـقِ وَالْغَنَمِ قَالَ: فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مَالاً فَلْيُرَ عَلَيْكَ ثُمَّ قَالَ: «هَلْ تُنْتَجُ إِبِلُكَ صِحَاحاً آذَانُهَا؟ فَتَعْمِدُ إِلَى الْمُوسَى فَتَشُقُّ آذَانَهَا وَتَقُولُ هَذِهِ بُحُرٌ فَتَشُقُّ جُلُودَهَا وَتَقُولُ: هَذِهِ صُرُمٌ، فَتُحَرِّمُهَا عَلَيْكَ، وَعَلَى أَهْلِكَ»؟ قَالَ قُلْتُ: أَجَلْ قَالَ: «وَكُلَّ مَا آتَـاكَ اللَّـهُ حِلٌّ، وَإِنَّ مُوسَى اللَّـهِ أَحَدُّ مِن موسكَ، وَسَاعِدَ اللَّهِ أَشَدُّ مِـن سـاعَدك»، قُلْتُ: يَـا رَسُولَ اللَّـهِ رَجُـلٌ نَزَلْتُ بِـهِ فَلَـمْ يَقْرِنِـي وَلَـمْ

يُكْرِمْنِي ثُمَّ نَزَلَ بِي أَقْرِيهِ أَوْ أَجْزِيهِ بِمَا صَنَعَ؟ قَالَ: «بَلْ أَقْرِهِ» ﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٨٩١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٠٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنن التِّرمِذِي) وبقيتهُ عندَ إبْنُ حِبَّانَ، ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە من شکڵێکی دژوێنم هەبوو و بەرگێکی شڕم لەبەردابوو، پێغەمبەر پێی فەرمووم: ماڵو سامانت هەیەو هەبووی؟ گوتم، بەڵێ، گوتی: چ جۆرە ماڵو سامانێکت هەیە؟ گوتم: هەموو جۆرە ماڵو سامانێکم هەیە، وڵاخە بەرزەم هەیە، حوشترم هەن، کۆیلەم هەن، مەڕو بزنم هەن، گوتی: جا خوا کە ماڵو سامانی پێدای، با شوێنەواری ئەو ماڵو سامانەت پێوە ببینرێ، (واتە: مادام هەبووی خۆت ڕووتو ڕەجاڵ پێشان مەدە)، دوایی پێغەمبەر پێی فەرمووم: ئایا حوشترەکانت حوشتری ساغیان نابێ کە گوێیان ساغن، بەڵام تیغێك دێنی گوێیان شەق دەکەی، وە دەڵێی ئەوە (بُحُرٌ) لە خۆوە ناوێکی لێ دەنێی، وە دوایی هەر بەو تیغە پێستیان لەت دەکەی وە دەڵێی ئەوە (صُرُمٌ) ئەو ناوەیان لێ دەنێی، بۆئەوەی کە گۆشتەکەی قەدەغە بکەی لەسەر خۆتو لەسەر ماڵتو لەسەر خێزانت؟ گوتم: بەڵێ وا دەکەین، (بە حیسابی خۆیان بۆیە وایان لێکردوون، بۆئەوەی پێی لە خوا نزیك بنو، بۆ صەنەمەکانیان وا لێکردوەو گوتوویانە: ئەوە لە پێناوی ئەو صەنەمەدا ئەو حوشترەمان گوێ شەق کردوەو گۆشتی ناخۆین، ئەو حوشترە دوگەکەیمان شەق کردوەو پێستەکەیمان شەق کردوەو نیشانەدارمان کردوەو سواری نابینو بەکاری ناهێنین بۆ بار، لە پێناوی خوادا، بەڵام بۆ فڵان صەنەمە!) ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر شتێك کە خوا پێیداوی، ئەوە حەڵاڵە وە تیغی خوا لە تیغی تۆ تیژترە، وە باسکی خوا لە باسکی تۆ بەهێزترە، (واتە: قوەتی خوا لە قوەتی تۆ زیاترە مەچۆ دەستکاری شتێك مەکە کە خوا حەڵاڵی کردوە، لە خۆوە حەرامی بکەی) منیش لێم پرسی گوتم:

ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! ئایـا پیاوێـك مـن لێـی دەبمـە میـوان، بـەڵام میوانـدارییم ناكـات، (واتـە: ڕامـناگرێ یـان مەبەسـتی ئـەوە بـووە دەعـوەتم ناكاتو خواردنی باشـم بـۆ ساز ناكات) دوایـی ئەوجـار ئـەو دەبێتـە میوانی من، ئایا من میوانداریـی بکـەم ؟ یـاخود منـیش وەك خـۆی سزای بدەمـەوە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو تۆ میوانـداریی بکـە، (واتـە: ئـەو خراپـەی کـرد تـۆ خراپـە مەکـە)، کەواتـە: لـەم فەرمایـشتەشـەوە دیـارە کـە دەستکارییکـردنی گوێو جەسـتەی ئـاژەڵ قـەدەغەیـە.

**فەرمایشتـی سـێـیـەم:** ﴿ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَـنْ صَـبْرِ الـرُّوحِ وَخِـصَاءِ الْبَهَـائِمِ﴾، أَخْرَجَـهُ البَيهَقـيُّ فـي (سُـنن الكبرى) برقم: (١٩٥٧٥)، وَأَبي يَعلى برقم: (٢٤٩٧)، قال حسين سليم أسد: إسنادُهُ صحيح، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٦٩٦٠)، واتـە: عەبـدوڵای کـوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغـەمبەری خوا ﷺ قەدەغـەی کردوە هەر شتێك ژیانی تێـدا بێ ڕابگیرێو بکرێتە نیشانە، وە هەروەها قەدەغەشی کردوە کە ئاژەڵ بخەسێنـرێ.

**فەرمایــشـتی چــوارەم:** ﴿عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ رضي الله عنه قَـالَ: لَعَـنَ اللَّـهُ الوَاشِـمَاتِ وَالمُـسْتَوْشِمَاتِ، وَالنَّامِـصَاتِ وَالْمُتَنَمِّـصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَــاتِ لِلْحُــسْنِ، الـمُغَيِّرَاتِ خَلْـقَ اللَّـهِ، قَـالَ: فَبَلَـغَ ذَلِـكَ امْـرَأَةً مِـنْ بَنِـي أَسَـدٍ، يُقَـالُ لَهَـا أُمُّ يَعْـقُوبَ وَكَـانَتْ تَقْرَأُ الْقُـرْآنَ فَأَتَتْهُ فَقَـالَـتْ: مَا حَـدِيثٌ بَلَغَـنِي عَنْـكَ أَنَّـكَ لَعَنْـتَ الْوَاشِـمَاتِ وَالْمُـسْتَوْشِمَاتِ، وَالمُتَنَمِّـصَاتِ وَالـمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُـسْنِ المُغَيِّـرَاتِ خَلْـقَ اللَّـهِ؟ فَقَـالَ: عَبْـدُ اللَّـهِ وَمَا لِـيَ لاَ أَلْعَـنُ مَـنْ لَعَـنَ رَسُولُ اللَّـهِ ﷺ وَهُـوَ فِـي كِتَـابِ اللَّـهِ فَقَالَـتِ الـمَرْأَةُ: لَقَـدْ قَـرَأْتُ مَـا بَـيْنَ لَـوْحَيِ المُصْحَفِ فَمَا وَجَـدْتُهُ، فَقَـالَ: لَـئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيـهِ لَقَدْ وَجَدْتِيـهِ، قَالَ اللَّهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: ﴿... وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧﴾ الحشر، فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّى أَرَى شَيْئًا مِنْ

هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الآنَ، قَالَ اذْهَبِي فَانْظُرِي، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكِ لَمْ نُجَامِعْهَا﴾، أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٢٣٠)، الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٨٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٢٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤١٦٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٧٨٢)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ ، وَابْنُ مَاجَهُ برقم: (١٩٨٩)، ئەوەیان دەربارەی ئینسانە، کە دەستکاریی خۆی بکات، بە تایبەتی ئافرەت، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ ڕۆژێك گوتی: خوا لەعنەتی کردوە لەوانەی خەڵك دەکوتن (خاڵی لەسەر دروست دەکەن) وە ئەوانەی داوا دەکەن بکوترێن، وە ئەوانەی کە بڕۆی خەڵك دەکەن، وە ئەوانەی کە داوا دەکەن بڕۆیان بۆ بکرێ، وە ئەوانەی کە ددانیان تەنكو باریك دەکەن بۆ جوانیی، ئەوانەی کە دروستکراوی خوا دەگۆڕن، ئەم هەواڵە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود لەعنەتی لەو جۆرە ئافرەتانە کردوە، بە ئافرەتێك لە بەنی ئەسەد گەیشت، کە ناوی (أم یعقوب) بوو، وە (ئافرەتێکی شارەزا بوو)، وە قورئانی دەخوێند، هات بۆ لای عەبدوڵڵا خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: پێمگەیشتوە کە تۆ لەعنەتت کردوە لە ئافرەتانێك کە خاڵ دەکوتن، وە ئافرەتانێك کە بڕۆ دەکەن، وە ئەوانەی کە داوا دەکەن خاڵیان لەسەر بکوترێ، وە ئافرەتانێك کە داوا دەکەن بڕۆیان بۆ بکرێ، وە ئافرەتانێك کە ددانی خەڵك یان هی خۆیان تەنكو باریك دەکەنەوە بۆ جوانیی، ئەوانەی دروستکراوی خوا دەگۆڕن، بۆ واتگوتوە؟ عەبدوڵڵاش گوتی: جا بۆچی لەعنەت لە کەسێك نەکەم کە پێغەمبەری خوا لەعنەتی لێکردوە، وە لە کتێبی خواشدا هەیە، (ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ ئەوەی کە گوتوویەتی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە، ئەوە وەك فەرموودە لە حوکمی مەرفووع دایە[1].

---

١) مرفوع: ئەو فەرمایشتەیە کە یەکێك لە هاوەڵان یان زیاتر بەرزی بکاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بە پێچەوانەی (موقوف)ەوە، کە ئەوە لەسەر هاوەڵان وەستێنرابێو بە قسەی وان دابنرێ، نەك هی پێغەمبەر ﷺ.

ئافرەتەکە گوتی: من نێوان دوو بەرگی قورئانم خوێدۆتەوە (واتە: قورئانم هەموو خوێندۆتەوەو تەماشام کردوە) شتی وام تێدا نەبینیوە، عەبدوڵلاش گوتی: ئەگەر قورئانت خوێندبێتەوە، دیتووتە کە خوا دەفەرموێ: هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدا لێی وەربگرن‌و هەرچی لێتانی قەدەغە دەکات خۆتانی لێ بەدوور بگرن، ئافرەتەکە گوتی: دەنا من شوێنەواری هەندێ لەو شتانە بەسەر خێزانەکەتەوە دەبینم، گوتی: بچۆ تەماشا بکە، چووە ژووری تەماشای خێزانی عەبدوڵلای کرد، هیچی نەبینی‌و هاتەوە بۆ لای، گوتی: هیچم نەبینی، گوتی ئاگاداربە ئەگەر شتێکی وا ببووایە لەگەڵ من نەدەبوو. {ڕستەی (لَمْ نُجَامِعْهَا)، لێرەدا واتە: لەگەڵی لەماڵەوە نەدەبووم، وە لێرەدا بە مانای جیماع نیە، بە مانای ئەگەر وایکرد بووایە، هاوسەری من نەدەبوو}.

**فەرمایشتی پێنجەم:** ﴿ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ لِي ابْنَةً عَروساً أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا أَفَأَصِلُهُ؟ فَقَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ» ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٩٤١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٥٣٠)، واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکری صیددیق خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ دەڵێ: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! کچێکم هەیە بە بووك دەچێ، دەردی حەصبە (خروێلکە)ی تووش بووە، مووەکانی سەری هەمووی وەریون، ئایا مووی سەری کەسێکی دیکەی بدەمێ لە سەری خۆی ببەستێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لەعنەتی کردوە لە ئافرەتێك کە قژی خۆی دەداتە یەکێکی دیکە، وە لەعنەتی لەو ئافرەتە کردوە کە قژی ئافرەتێکی دیکە بۆخۆی بەکاردێنێ {(وَاصِلَةَ) ئەوەیە کە دەیداتێ، (مُسْتَوْصِلَةَ) ئەوەی کە وەریدەگرێ}.

بەڵام زانایان لە دەستکارییکردنی جەستەدا یەك هەڵاواردنیان تێدا کردوە، هەم لە هی ئاژەڵدا، هەم لە هی ئینساندا، بە نسبەت هی ئاژەڵەوە،

دروستە ئاژەڵ بریندار، یاخود داخ بکرێ بۆ ناسینەوە، ئەوەی کە قەدەغە کراوە، ئەوەیە کە بۆ بتو صەنەم وای لێ بکرێ، بەڵام بۆ ناسینەوە دروستە، وەك (قُرطُبي) گوتوویەتی: (فَاعْلَم أن الوَسْم والإشعار مستثنىً من نَهيهِ عَلَيْهِ السَّلَام عَن شَرِيطَة الشَّيطَان)[1]، واتە: بزانە کە داخکردن، وە برینداركردن هەڵاوێردراوە لە قەدەغەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەوەی کە پێی دەگوترێ: (شَرِيطَة الشَّيطَان) واتە: بە خوتخوتەی شەیتان ئاوای لێ دەکرێ، وە ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەوبارەوە، ﴿ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ فِي يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمِيسَمَ[2] وَهُوَ يَسِمُ إِبِلَ الصَّدَقَةِ ﴾، أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (١٥٠٢)، وَمُسْلَمٌ برقم: (٥٥٢٣)، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: من لە دەستی پێغەمبەردا ﷺ مەیسەمم بینی، کە حوشتری زەکاتی پێ داخ دەکرد، بۆئەوەی نیشانەیان بکاتو بناسرێنەوە.

وە بەنسبەت ئینسانەوە ئەوە هەڵاوێردراوە کە دەستکاریی هەر ئەندامێکی بکات کە لە ڕووی تەندروستیەوە دەستکارییکردن بخوازێ، بۆ وێنە: لووتی خوارە، شتێکی زیادەی لە دەموچاو هاتوە، ئافرەت بڕۆی تێکەڵە وەك پیاو، بۆئەوەی وەك پیاو نەچێ، یان مووی لە چەناگەی هاتوە، ... هتد، کەواتە: دەستکارییکردنێك کە چ لە ڕووی تەندروستییەوە پێویست بێ، چ لە ڕووی خۆ جوانکردنێکەوە کە ڕەوا (مُبَاح)یە بۆ هاوسەری خۆی، ئەوانە دروستن، ئەو شتانەی دیکە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردوون، وەك: بڕۆ کردن، خاڵ کوتان، وە ددان تەنککردن، قژ لەخۆنان.. کە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەریان لەسەرە ﷺ قەدەغەن، بەڵام کەسێك کە دوو ددانی بە جووت هاتوونە دەرێ، یان ددانی خوارە ڕاستیی بکاتەوە، ئەوە دەچێتە بواری تەندروستییەوەو مادام پێویستیی تەندروستیی بیخوازێ، ئەوە قەدەغە نیە.

١) الجامع لأحكام القرآن، ج: (٥)، ص: (٣٤٢- ٣٤٣).

٢) میسم: ئاسنێك بووە لە ئاگردا سووریان کردۆتەوەو، ئاژەڵیان پێ داخکردوەو، بۆ ناسینەوەی نیشانەداریان کردوە.

**مەسەلەی حەوتەم**: كە دەفەرمویْ: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾، شەیتان گفتیان پێ دەدات، وە خەیاڵ پلاویان پێدەكات، وە ئەو گفتانەی شەیتان پێیان دەدا، هەر مایەی هەڵخەڵەتاندنو فریودانیانە، لە زمانی عەرەبی دا دەڵێ: (غَرَّ فُلانٌ فُلاناً) فلان كەس فلان كەسی فریودا، هەڵیخەڵەتاند، (غُرور) واتە: هەڵخەڵەتاندن، (غَرور) واتە: هەڵخەڵەتێنەر وەك خوای زاناو توانا دەفەرمویْ: ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾﴾لقمان، واتە: با هەڵخەڵەتێنەر (واتە: شەیتان)، هەڵتان نەخەڵێتێنێ بەرانبەر بە خوا، لێرەدا ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، كە هەموو ئەو شتانەی كە خولیاو خەیاڵی خراپو دنەدانی خراپن، هەرچەندە ئێمە شەیتان نابینین، بەلام هەمووی لە شەیتانەوەیە، بەڵێ كە ئینسان بەرەو گوناحو تاوان دەچێو لە طاعەت سارد دەبێتو، تووشی سەرپێچیی لادان دەبێ، هەمووی لە شەیتانەوەیە.

**مەسەلەی هەشتەم**: كە دەفەرمویْ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾، واتە: قسەی كێ لە هی خوا ڕاستترە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأنعام) وایە كە دەفەرمویْ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾﴾، فەرمایشتی پەروەردگارت تەواوی كردوە لە ڕاستییو دادگەرییدا، قورئان بەگشتی دوو بەشە: یان خەبەرە، یان حوكمە، خەبەرەكان هەموو ڕاستنو، حوكمەكانیش هەموو عەدلن، لێرەدا كە خوا دەفەرمویْ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا﴾، یانی: فەرمایشتی كێ لە هی خوا ڕاستترە، هەر لە سوورەتی (النساء)دا هاتوە، دەفەرمویْ: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾﴾، فەرموودەی كێ لە هی خوا ڕاستترە؟ بێگومان هی كەس، جا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ بەرێزان! كە هەرچی خوا فەرموویەتی لە قورئاندا، وە

بۆمـان دەردەكـەوێ كـە خـوا بـە وەحـی بـۆ پێغەمبـەر ﷺ ناردوویـەتی، دەبـێ (١٠٠٪) سـەدا سـەد دڵـنیابیو مـسۆگەربی كـە ڕاسـتە، یـانی: دەبـێ ئینـسان وریابێو شـەیتان فێڵـی لـێ نـەكات، خوا ئـەوەی فـەرمووە، جا تـۆ بڵـێی وابێ، وانـەبێ؟! كە دەزانـی پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی، نابـێ تۆزقاڵێك گومانو دوو دڵـییت لـە دڵـدا هـەبێ بەرانبـەر بـە ڕاسـتیی ئـەوەی كـە خـوا فەرموویـەتی، یـاخود پێغەمبـەر ﷺ كـە خـوای پەروەردگـار بـە وەحـی پێـی ڕاگەیـاندوە، بیفـەرموێ.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، ئێمە پێشتـر لە هۆی هاتنە خـوارەوەكـەیدا باسـمان كـرد واتــە: بـە خۆزگـە خواسـتنی ئێوەو خۆزگـە خواسـتنی خـاوەن كتێبـەكان نیـە، ئەمـە وەك چی وایـە؟ وەك ئەو دوو ئایـەتەی (٢٣- ٢٤) سـوورەتی (آل عمـران) وایـە كـە خـوا تێیـاندا دەفـەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتـە: تەماشـای ئەوانـە ناكـەی كـە بەشـێك لـە كتێبی خوایان پێـدراوە، بانگ دەكـرێن بۆ لای كـتێبـی خـوا كە دادوەریـی لـە بەینیاندا بكـات، كەچی كۆمەڵێكـیان پـشت هەڵدەكـەن، وە ئامـادە نـابنو مل نـادەن بـۆ حوكمی شەرع، بـە هـۆی ئـەوەوە كە گوتیـان: چەند ڕۆژێكـی كـەم نەبێ ئاگرمـان تـووش نابـێ (جوولەكەكـان گـوتوویـانە: چـەند ڕۆژێكـی كـەم نەبـێ لـە دۆزەخدا نامێنینـەوە)، ﴿ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾،

وە لە دینەکەیاندا شتێك فریویدان کە هەڵیانبەستبوو، هەڵبەتە ئێستا ئەوە لەنێو مسوڵمانانیشدا هەیە، زۆر شت کە لە دیندا هەڵبەستراوەو ئەسڵ و بنەمایەکی نیە، مسوڵمانانی تووشی گوناح کردوە، کاتی خۆی بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ هەندێ کتێب دەخوێندرانەوە هەندێ شتیان تێدا بوون کە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿... مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ ...﴿٤٠﴾﴾ یوسف، چەندان کەس بەهۆیانەوە هەڵخەڵەتاوە: هەر کەسێك بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە ﷺ درەمێك ببەخشێ، ئەوە گوناهەکانی دەبەخشرێن، دەبێ چەند کەس بەو هۆیەوە پشتێنی لێ کردبێتەوە؟! یان بە هۆی مەسەلەی سەیدایەتییەوە: هەر کەسێك خزمی پێغەمبەر بێ ﷺو بە نەسەب بچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەوە بەرو پشتی ئەتلەسەو ناچێتە دۆزەخێ، دەبێ چەند سەیدو شێخ بەوە هەڵخەڵەتابن کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە لە دینداو، ڕێزو حورمەت لە لای خوا تەنیا بە تەقوایە، وەك خوای زاناو شارەزا بۆخۆی فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ...﴿١٣﴾﴾ الحجرات، وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ﴾ رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٢٦٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)، وَالدَّارَمِي برقم: (٣٤٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه ، واتە: هەر کەسێك کردەوەکەی دواى بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات، وە بۆخۆی فەرموویەتی ئەی فاطیمە! ئەی فلان کەس ! ئەی فلان کەس ! من هیچ سوودتان پێ ناگەیەنم، بۆخۆتان کردەوەی چاك بکەن.

کەواتە: ئەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، نە بە خۆزگە خواستن و خەیاڵپلاوی ئێوەیە، نە بە خۆزگە خواستنی خاوەن کتێبەکانیشە، دەرس و پەندێکی گەورەی تێدایە بۆ ئێمەی مسوڵمان.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾، هەر كەسێك خراپە بكات، تۆڵەی لێ دەسەنرێتەوەو سزا دەدرێ، واتە: مسوڵمانەتیی شەفاعەت ناكات بۆ ئینسان، مادام ئەو كەسە مسوڵمانە گوناحانیش بكات، عەفووبێو مافی ڤیتۆی هەبێ!! وەك چۆن جوولەكەتییو نەصرانێتیی شەفاعەت ناكات، وە سەیدایەتییو شێخایەتییش شەفاعەت ناكات، وە ئیسلامیی بوونو فلان لایەنە بوون، شەفاعەت ناكات، وە خزمی فلان شێخ بوون، شەفاعەت ناكات، بەڵكو هەر كەسێك خراپە بكات، سزا دەدرێ ﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾، وە لەلایەن خواوە هیچ یارمەتیدەرو هیچ سەرخەرێكیشی چنگ ناكەوێ، كە لە سزای خوا چەپاڵەی داو بیپارێزێ، جا ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە كە دەفەرموێ: ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٤٦﴾فصلت، واتە: هەر كەسێك چاكە بكات قازانجی بۆخۆیەتیو، هەر كەسێك خراپە بكات زەرەری بۆخۆیەتی، كە ئەوە هەم لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی (٤٦)دا هاتووە، هەم لە سوورەتی (الجاثیة) ئایەتی (١٥)شدا هاتوە: هەر كەسێك كردەوەی باش بكات قازانجی بۆخۆیەتی بۆخۆی بەهرەمەندەو، هەر كەسێكیش كردەوەی خراپ بكات، بۆخۆی لێی زەرەرمەندەو، زیانەكەی بەر لە هەر كەسی دیكە بۆخۆیەتی.

**مەسەلەی یازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾، هەر كەسێك خراپە بكا، سزای دەدرێتەوە، لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: ﴿ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾، بَلَغَتْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَبْلَغًا شَدِيداً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَارِبُوا وَسَدِّدُوا فَفِي كُلِّ مَا يُصَابُ بِهِ الْمُسْلِمُ كَفَّارَةٌ حَتَّى النَّكْبَةِ يَنْكَبُهَا، أَوِ الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا» ﴾ رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٦٥١٤)، ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی

بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ڕستە قورئانییە هاتە خوار، هەر کەسێك خراپە بکات سزای دەدرێتەوە، مسوڵمانان زۆر پێی نارەحەت بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆتان نزیك بخەنەوەو هەوڵبدەن خەتی نێوەڕاست بگرن، چونکە هەرچی مسوڵمان تووشی دێ، لە ئازارو نارەحەتیی بۆی دەبێتە مایەی سڕینەوەی گوناهەکانی، تەنانەت کە ڕەتەڵ دەداو هەڵدەنگوێ و هەڵدەخلیسکێ، وە تەنانەت کە دڕکێکی پێدادەچێ، واتە: ئەوانەش هەموویان گوناهتان لێ دەسڕنەوە، وەك چۆن هەموو خراپەیەك سزای هەیە، هەموو ناخۆشیی و نارەحەتیەکیش، مایەی سڕینەوەو خاوێنبوونەوەی ئینسانە لە گوناهەکان.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴾، وە هەر کەسێك لە چاکەکان ئەنجام بدات، لە نێر یان لە مێ، بە مەرجێك ئیماندار بێ، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشت، وە بە قەدەر نەقیرێك ستەمیان لێ ناکرێ، ﴿ نَقِيرٗا ﴾، کە پێشتر باسمان کرد چییە؟ واتە: تۆزقاڵە شتێکی بچووك، لێرەدا ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە کردەوەی باش سەنگی مەحەکە، بەڵام کردەوەی باش بە ئیمانەوە، ئەدی کەسێك ئیمانی نەبێ؛ جاری وایە هەندێ کەس دەپرسێ: ئایا نامسوڵمانان کردەوە باشەکانیان چی لێدێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: کەسێك ئیمانی نەبێ، مانای وایە کردەوە باشەکەی بە نیەتی خواو بۆ خوا ئەنجام نەداوە، لەبەرئەوە نابێ چاوەڕێی پاداشت لە خوا بکات، دەڵێن: فلان کافرە فلان ئامێرەی داهێناوە، خەڵك هەمووی ئیسراحەتی لێکردوە، چۆن خوا پاداشتی ناداتەوە؟ ئەگەر بۆ خوای کردبێ خوا پاداشتی دەداتەوە، ئەگەر ئیمانی هەبێ لە دنیاو لە قیامەت پاداشتی دەداتەوە، ئەگەر ئیمانی نەبێ، لە دنیا پاداشتی خۆی وەرگرتووە، ناوبانگی دەرکردووە، خەڵك مەدح و ستایشێکی زۆریان کردوە، بەڵام بۆ خوای نەکردوە تاکو پاداشتی بداتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیستەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا هەشت (٨) ئایەت دەتوێژینەوە کە ئایەتەکانی: (١٢٧ تاکو ١٣٤)ن، چوار ئایەتی یەکەمی باسی مافی ئافرەتانە بەگشتی، وە کچانی هەتیو بەتایبەتیو منداڵانی بچووكو هەتیوان بەگشتی، کە دەبێ ستەمیان لێنەکرێ، وە دادگەریی یان لەگەڵ دا ڕەچاو بکرێ، پاشان باسی چۆنیەتی چارەسەری کێشەی نێوان ژنو مێرد دەکەن، لە حاڵێکدا کە هۆکارەکەی - واتە: هۆکاری کێشەکە – یاخیبوونی پیاو بێ، وە پاشان باسی دادگەریی گونجاو لە حاڵەتی چەند ژنیی دا دەکەن، وە ئەگەر هەر پێکەوە نەگونجان، باسی لێك جیابوونەوە کراوە، وە لە چوار ئایەتی دووەمدا خوای پەروەردگار چەند جارێك باسی خاوەنداریێتیی خۆی دەکات بۆ ئاسمانەکانو زەوی، وە باسی ئەوە دەکات کە وەصیەتی کردوە بە پارێزکاریی بۆ ئۆممەتی ئیسلام، وە بۆ ئۆممەتانی پێش ئۆممەتی ئیسلام، وە پاشان ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوای بەرزو بێ هاوتا، بێنیازی ستایشکراوە، وە سەرپەرشتیاری کائیناتە، پاشان بۆ جاری دووەم واتە: لەم سووڕەتەدا، بانگی مرۆڤایەتیی دەکات بە وشەی: ﴿أَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، وە ڕایدەگەیەنێ کە خوای پەروەردگار دەتوانێ هەموو مرۆڤەکان لابەرێ، وە کەسانی دیکە بێنێ، وە ئەو ڕاستییەش ڕادەگەیەنێ کە خوا پاداشتی دنیاو دوارۆژی لەبەر دەست دایە.

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي
ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ
وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِۚ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ
خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا
فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًاۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ
ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن
تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ
فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾
وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ
أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا
حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ
يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن
كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا
بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە لـەبارەی ئافرەتانـەوە داوای فـەتوات لێدەکـەن، بڵـێ: خـوا لەبارەیانـەوە فـەتواتان پـێ ڕادەگەیەنـێ، وە ئـەوەی لـە کتێبـدا بەسـەرتاندا دەخوێندرێتـەوە، ئەویش فەتوای خوایە، لە بارەی ئەو کچە هەتیوانـەوە کە ئـەو (بەشـە میرات)ەی لـە کتێبـدا بۆیـان دیاریکـراوە نایانـدەنێ، وە حـەزیش دەکـەن هاوسـەرگیریی یـان لەگـەڵ بکـەن، وە ئـەوەی کـە لـەبارەی منـداڵانی گـچکەی بـێ دەسـتەڵاتەوە بۆتـان نێـردراوە، (پێیـەوە پابەنـد بـن)، وە پێویـستە کە بـە دادگـەریی لەگـەڵ هەتیوانـدا ڕەفتار بکـەن، بێگومـان هەر شتێك لە چاکـە بکـەن، ئـەوە خـوا پێـی زانـایە ﴿١٢٧﴾ وە ئەگـەر ژنێـك مەترسیی یـاخیی بـوون، یـان پـشتگوێ خستنی لـە مێردەکـەی هـەبوو، ئـەوە گوناهیـان ناگاتـێ کـە پێکـەوە ڕێـك بکـەون، (ژنەکە چاوپۆشیی لـە هـەندێك مافـی خـۆی بکـات)، وە پێکـهاتنیش چاکـترەو نەفـسەکانیش ڕژدییـان تێدایـە، وە ئەگـەر چاکـە بکـەنو پارێـز بکـەن، ئـەوە بێگـومان خـوا بـەوەی دەیکـەن شـارەزایە ﴿١٢٨﴾ وە هەرچـەندە سـووریش بـن لەسـەری نـاتوانن دادگـەریی (تـەواو) لە نێوان ژنـاندا بکـەن (لە کاتی چـەند ژنیی دا)، بـەڵام یەکجـارییش (بـە لای یەکێکیانـدا) دایمەشـکێنن، بـە جۆرێـك کـە ئـەوەی دیکـەیان وەك هەڵواسـراو وێـڵ بکـەن (کـە نـە هاوسـەردار بـێ نـە بـێ هاوسـەر) وە ئەگـەر پێکـهاتن بکـەنو پـارێز بکـەن، ئـەوە بێگومـان خـوا لـێبوردەی بـە بـەزەیی یـە﴿١٢٩﴾ وە ئەگـەر لـە یەکـیش جیـاببنەوە، ئـەوە خـوا لـە چاکەی فراوانـی خـۆی هـەردووکیان بـێ نیـاز دەکات، وە خوا (سیفەت) فراوانـی کاربەجێیـە ﴿١٣٠﴾ وە هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو لە زەوی دایە هی خوایە، وە ئەوانەی کـە پـێش ئێـوە کتێبیـان پێـدراوەو ئێوەشـمان ڕاسـپاردوە کـە پـارێز لـە خـوا بکـەن، وە ئەگـەر بێـبڕوابن ئـەوە هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو زەوی دایـە هـی خوایـە، وە خـوا دەوڵەمەنـدی سـتایـشکراوە ﴿١٣١﴾ وە هـەرچی لـە ئاسـمانەکانو زەویدایـە موڵـکی خوایـە، وە خـوا بەسـە بـۆ پاراسـتنو

سەرپەرشتیاریی ﴿١٣٢﴾ ئەی خەڵكینە! ئەگەر خوا بیەوێ ئێوە لادەباتو خەڵكی دیكە دێنێ، وە خوا لەسەر ئەوە بە توانایە ﴿١٣٣﴾ هەر كەس پاداشتی دنیای بوێ، ئەوە خوا پاداشتی دنیاو دوارۆژی لەلایە، وە خوا بیسەری بینەرە﴿١٣٤﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( وَيَسْتَفْتُونَكَ ): (أي يطلبون مِنْكَ الفَتْوى) (يَستَفتونَكَ)، واتە: داوای فەتوات لێدەكەن، (الفُتْيَا والفَتْوَى: الْجَوابُ عَمَّا يُشْكِلُ مِنَ الأَحْكَامِ)، وشەی: (فُتْيا وفَتْوى) وەڵامی ئەو حوكمو یاسایانەیە كە خەڵك لێیان ئالۆزكاوەو نازانن بە كام لایە دایە، لەوبارەوە فەتوا وەردەگرن.

(بَعْلِهَا ): (البَعْلُ: هُوَ الذَّكَرُ مِنَ الزَّوجَيْنِ، وَجَمْعُهُ: بَعُولَة: نَحو: فَحْل وَفَحُولَة)، (بَعْل): واتە: مێرد بریتییە لە نێری جووتە پیاوو ژنێك، جووتێ لە پیاوو ژن كامەیان نێرە پێی دەگوترێ: (بَعْل) كۆیەكەی (بَعُولَة)یە، وەك (فَحْل وَفُحولَة)، (فَحل) واتە: نێر (فحُولَة) واتە: نێرەكان، (بَعل) واتە: مێردی ژن، وە (بعولة) واتە: مێردەكان.

(نُشُوزًا ): بە مانای یاخیبوون دێ‌و، بە مانای سەرپێچیی دێ‌و، بە مانای خۆ بە بەرزگرتن دێ، لە چی ڕا هاتوە؟ دەڵێ: (النُّشُوزُ مِنَ النَّشزِ: النَّشْزُ: المرتَفِعُ مِنَ الأَرْضِ)، شوێنێك كە لە زەوی بەرزدەبێتەوە، تەپۆڵكەیەك، پێی دەگوترێ: (نَشْز)، (وَنَشَزَ: نَبا وَكُلُّ نابٍ نَاشِزٌ، وَالنُّشوزُ: البُغْضُ وَعَدَمُ الطَّاعَةِ)، كە دەگوترێ (نَشَز) واتە بەرزبۆوە، وە هەموو بەرزاییەك پێی دەگوترێ (ناشِز)، ئافرەت كە بە قسەی مێردی ناكات دەڵێن: ئافرەتێكی (ناشِزة)یە، واتە: خۆی بە بەرزگرتوە، وە پیاویش كە لە خێزانی

خۆی یاخیی ببێ‌و ستەمی لێ بکات، ئەویش دیسان پێی دەگوترێ پیاوێکی (ناشِز) واتە خۆی بە بەرزگرتوە لەوەی کە مافەکان بۆ خێزانەکەی دابین بکات، (نشوز) بە مانای ڕق لێ هەڵسان‌و بە مانای فەرمانبەریی نەکردن دێ.

(﴿وَٱلصُّلۡحُ﴾): (الصَّلاَحُ ضِدُّ الفَسَادِ، وَالصُّلْحُ: إِزَالَةُ النِّفَارِ بَيْنَ النَّاس)، (صَلاَح) پێچەوانەی (فَسَاد)ە، (صَلاَح) واتە: چاکە، (فَسَاد) واتە: خراپە، (والصُّلْحُ: إِزَالَةُ النِّفَارِ بَيْنَ النَّاسِ) واتە: لابردنی ناکۆکی لە نێوان خەڵکیدا، کەواتە: (صلح) یانی ڕێکخستن‌و ئاشتەوایی‌و پێکهێنان.

(﴿ٱلشُّحَّ﴾): (الشُّحُّ بُخْلٌ مَعَ حِرْصٍ، وَرَجُلٌ شَحِيحٌ، وَالْجَمْعُ: أَشْحَة)، (بُخْل) واتە: نەبەخشین چرووکیی‌و ڕژدیی، (شُحّ) بریتیە لە ڕژدییەك لەگەڵ ئەوەی کە ئینسان سووربێ لەسەر ماڵ‌و سامانەکەی، واتە: ڕژدییەکی بەهێزتر، وە دەگوترێ: (رَجُلٌ شَحِيحٌ) واتە: پیاوێکی چرووك‌و ڕژد، (إمرأةٌ شَحِيحَةٌ) واتە: ئافرەتێکی چرووك، کۆی (شَحِيح)یش (أَشحَة) واتە: ڕژدو چرووکەکان.

(﴿حَرَصۡتُمۡ﴾): (الحِرْصُ: فَرْطُ الشَّرَهِ وَفَرْطُ الإِرَادَةِ) ئەوە کە ئینسان زۆر ئارەزووی بۆ شتێ بچێ، یاخود زۆر شتێکی مەبەست بێ، پێی دەگوترێ (حِرص) لەسەر ئەو شتە (حَريص)ە، واتە زۆری مەبەستەو زۆری ئارەزوو لێیە.

(﴿سَعَتِهِۦ﴾): (السَّعَةُ: الطَّاقَةُ وَالْقُوَّة، والدَّعَة وَالغِنَى وَالرُّفَاهِيَة) ﴿يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦ﴾، واتە: خوای بێنیاز باسی ئەوە دەکات کە ژن‌و مێرد لێك جیابوونەوە هەر کامێکیان لە (سَعة)ی خۆی بێ نیاز دەکات، (سَعة) واتە: توانا، وە دەستەڵات، وە بە مانای دەوڵەمەندیی‌و ڕوفاهیەت‌و خۆشگوزەرانیی دێت.

(وَكِيلًا ): واتە: كارپێ سپێردراو، دەڵێ: فلان وەكیلی منە، كاری خۆم بەو سپارد (التَوكِيلُ: أَنْ تَعْتَمِدَ عَلَى غَيْرِكَ وَتَجْعَلَهُ نَائِباً عَنْكَ، وَالوَكِيلُ فَعِيلٌ بِمَعْنَى الْمَفْعُول) ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، (أي: إكتُفِ بِهِ أَنْ يَتَولَّى أَمْرِكَ، وَيَتَوَكَّلَ لَكَ)، (تَوْكِيل) بریتیە لەوەی كە تۆ پشت بە غەیری خۆت ببەستی، وە بیكەیە جێگری خۆت لە شتێكدا (وَكِيل: فَعيل بمَعْنَى المَفْعُول)، (وكيل) واتە: كارپێ سپێردراو، كە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، واتە: خوا بەسە كاری تۆ سەرپەرشتیی بكات، وە وەكیلی تۆ بێو كار پێ سپێردراوی تۆ بێ.

(ثَوَابَ ): واتە: پاداشت، یاخود بەرهەم، (الثَّوَابُ: مَا يَرْجِعُ إِلى الإنسانِ مِن جَزَاءِ عَمَلِهِ) كاتێك ئینسان كردەوەیەك ئەنجام دەداتو بەرهەمێكی دێتەوە دەست لە ئەنجامدانی ئەو كردەوەداو پاداشتی دەدرێتەوە، ئەوە پێی دەڵێن: (ثواب)، لە ئەسڵیشدا (ثَابَ، يَثوبُ: رَجَعَ، يَرجَعُ) چونكە ئەو كارە پاداشتو بەرهەمەكەی بۆ ئینسان دێتەوە، وەك بڵێی هی خۆی بووەو بۆی گەڕاوەتەوە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

١) هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾ ﴾، دوو گـێڕرانـەوە هـەن:

أ- ﴿ نَزَلَتْ بِسَبَبِ سُؤَالِ قَوْمٍ مِنَ الصَّحَابَةِ عَنْ أَمرِ النِّسَاءِ وَأَحكَامِهِنَّ فِي المِيرَاثِ وَغَيْرِ ذَلِكَ، فَأمرَ اللّه نَبَّيهِ أَنْ يَقُولَ لَهُمْ: اللَّهُ يُفتِيكم فيهِنَّ، أي: يُبِّين لَكُمْ حُكْمَ مَا سَأَلْتُمْ عَنْهُ ﴾[1] قورتـووبیی: دەڵێ: ئـەم ئایەتـە بـە هـۆی پرسـیارکردنی کۆمەڵـێك لـە هـاوەڵان دابـەزی، کـە دەربـارەی کاروبـاری ئافرەتـان پرسیاریان لە پێغـەمبەری خوا ﷺ کـرد، وە دەربـارەی ئـەوە کـە ئایـا ئافرەتـان چـۆن مـیرات دەگـرن؟ وە جگـە لـەوەش کـە ئـەوە چـۆن مامەڵەیان لەگـەڵدا بکرێ؟ خوا فـەرمانی بـە پێغەمبـەری خـۆی کـرد ﷺ کـە پێیـان بفـەرموێ: خـوا دەربـارەی ئـافرەتـان فەتواتـان بـۆ دەدات، واتـە: وەڵامتـان دەداتـەوە، وەڵامـی ئـەو ئیشـکالەتـان دەداتـەوە، کـە بۆتـان دروسـت بووەو نـازانن چـی بکـەن؟

ب- ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: هُوَ الرَّجُلُ تَكُونُ عِنْدَهُ الْيَتِيمَةُ هُوَ وَلِيُّهَا وَوَارِثُهَا فَأَشْرَكَتْهُ فِي مَالِهِ، حَتَّى فِي الْعَذْقِ، فَيَرْغَبُ أَنْ يَنْكِحَهَا وَيَكْرَهُ أَنْ يُزَوِّجَهَا رَجُلاً فَيَشْرَكُهُ فِي مَالِهِ بِمَا شَرِكَتْهُ فَيَعْضُلُهَا فَنَزَلَتْ

١) (الجامع لأحكام القرآن، ج: (٥)، ص: (٣٥٢).

هَـذِهِ الآيَـةُ﴾ رَوَاهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٤٩٤)، وَمُـسْـلِمٌ بـرقم: (٧٤٤٤)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٢٠٦٨)، واتـە: دایکمـان عائیـشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ (کـە زۆر شـارەزا بووە، لە کاروباری خێزانو لایەنی کۆمەڵایەتییو هەڵسوکەوتی ژنو مێـرد) دەڵـێ ئـەم ئایەتـە دەربـارەی پیاوێك هاتۆتـە خـوار، کـە کچێکی هەتیـوی لـەلا دەبـێ (لـە مـاڵی ئـەودا پـەروەردە دەکـرێو بـەخێوی دەکـاتو خـۆی سەرپەرشـتیکـاری دەبـێ، وە خۆشـی مـیراتگـری دەبـێ (ئـەو کاتـە عـادەتی عـارەبـان وابـووە، کـە سەرپەرشـتیاری هـەتیو مـیراتیـشی لـێ گرتـوە) وە ئـەو منداڵـە هەتیـوە هاوبـەش بـووە لـە مـاڵو سـامانی ئـەو پیـاوەدا تەنانـەت ئەگەر دارخورمایەکیشـی بوو بـێ[1]، ئنجـا دەڵـێ: جـاری وابـووە ئـەو پیـاوە ئـارەزووی نـەبووە کـە ئـەو کـچە هەتیـوە بێنـێو مـارەی بکـات، وە پێـشی نـاخۆش بووە کە بیدات بـە پیـاوێکی دیو سـەرەنجـام بـە هـۆی شـووکـردنی بـە پیـاوێکی دیکـەوە، مێـردی ئـەو کـچە هـەتیوە ببێتـە هـاوبەش لـە مـاڵو سامانی ئەو پیاوەدا کە سـەرپەرشـتیاریی ئەو هەتیوەی کـردوە، بۆیـە پیاوەکـە ڕێـی گرتـوە لـەوەی ئـەو کـچە هەتیـوە شـوو بکـات. {واتـە: ئەگـەر جـوان بـووبێو ماڵی بووبـێ، مارەی کـردوەو ئەگـەر بە دڵیـشی نـەبووبێ، بۆخۆیـشی مـارەی نەکـردوەو نەشیهێـشتوە شـووش بکـات، بۆئـەوەی بـە هـۆی شووکردنەکەیەوە مێردەکەی نەبێتـە شـەریك لە مـاڵو سـامانەکـەی دا}.

٢) هـۆی هـاتنە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾﴾ لەوبارەشـەوە دوو گێـڕرانـەوە هـەن:

---

١) عَـذْق: بە دارخورمـای بـەردار دەگوتـرێ، هـەروەها بە هێشووی خورمـا دەگوتـرێ. بڕوانـە: مختـار الصحاح، ص: (٣٧١)، لفظ: ع ذ ق .

أ- ﴿عَـنْ عَائِــشَةَ رَضِــيَ اللَّــهُ عَنْهَــا ﴿ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا ﴾، قَالَـتْ: هِيَ الْمَـرْأَةُ تَكُـونُ عِنْـدَ الرَّجُـلِ لا يَـسْتَكْثِرُ مِنْهَـا فَيُرِيـدُ طَلاَقَهَـا وَيَتَـزَوَّجُ غَيْرَهَـا، تَقُـولُ لَـهُ: أَمْـسِكْنِي وَلا تُطَلِّقْنِـي، ثُـمَّ تَـزَوَّجْ غَيْـرِي فَأَنْتَ فِي حِلٍّ مِنْ النَّفَـقَـةِ عَلَيَّ، وَالقِسْـمَةِ لِي، فَذَلِـكَ قَوْلُهُ تَعَالَـى: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ﴾﴾ (رَوَاهُ البُخَــــارِيُّ برقم: (٤٦٠١)، واته: دایکمان عائیشــه خوا لێـی ڕازی بێ، دەڵێ: ئـەم ئایەتـه دەربـارەی حاڵـەتێك هاتۆتــه خـوار، کــه ئافرەتێـك لـه لای پیاوێکــه (واتــه: خێزانــی پیاوێکـه) ئـەو پیـاوه زۆر کەیفـی پـێ نایــەت، (یـان لەبەرئـەوەی کەوتۆتـه تەمەنـەوە، یـان لەبـەرئەوەی نەخۆشــه، لەبـەر هـەر هۆیـەك بـێ) دەیــەوێ تــەڵاقی بــداو ژنێکــی دیکــه بێنــێ، ئافرەتەکــەش پێـی دەڵـێ: بمهێڵــەوه لـه لای خـۆتو تـەڵاقم مـەده، وه ژنـی دیکه بێنـەو تـۆ لەلایـەنی منــەوه لـه بـواری نەفــەقه کێـشانم، وه لـه بـواری شــەو لـەلا مانەوەمـدا گـەردنت ئـازادبێ، ئەوه ئەوەیه کـه خـوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ﴾ که دواییش زیاتر مەبەستەکەی ڕوون دەکەینەوه.

ب- هـەروەها لەوبـارەوه ئـەو ڕیوایەتـەش هـاتوه: ﴿ عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهُما، قَالَ: خَشِيتْ سَـوْدَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَـا أَنْ يُطَلِّقَهَـا النَّبِـيُّ ﷺ، فَقَالَـتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لا تُطَلِّقْنِي، وَاجْعَلْ يَوْمِي لِعَائِشَـةَ، فَفَعَلَ، وَنَزَلَـتْ هَـذِهِ الآيَـةَ﴾ أَخْرَجَـهُ التِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٠٤٠)، وَحَـسَّنَهُ، وَابْـنُ الْمُنْـذِرِ، وَالطَّبَرَانِـيُّ فــي (الكَبير) بـرقم: (١١٧٤٦)، وَالبَيْهَقِـي فـي سُنَن (١٤٥١٢)، وَصَحَّحَهُ الألبـاني في (إرواء الغليـل) برقم: (٢٠٢٠)، واتـه: عەبدوڵڵای کوڕی عـەبباس خـوا لـه خــۆیو بــابی ڕازی بــێ، دەڵــێ: ســەوده (ی کــچی زەمعــه کــه خێزانــی پێغـەمبــەر ﷺ بــووه، دوای خەدیجــه ســەودەی هێنــاوەو، ئـافرەتێکی بــه

تەمەنو بێوەژن بووە)، مەترسیی ئەوەی هەبووە کە پێغەمبەر ﷺ دەستبەرداریی بێ (دیارە ئەو خەیاڵی وا کردوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی نەکردوە)، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەستبەردارم مەبەو، نۆرە ڕۆژی خۆم دەدەم بە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەر ﷺیش وایکرد (کە دیارە عائیشە ئەوکاتە ئافرەتێکی گەنج بووە، وە سەودە خوا لێیان ڕازی بێ، ئەو کاتە تەمەنی لە سەرووی حەفتا ساڵەوە بووەو پیرێژنێك بووە)، ئیدی لەوبارەوە ئەو ئایەتە هاتۆتە خوارێ کە ئەو جۆرە صولْحە دروستە لە نێوان ژنو مێرددا.

## مانای گشتی ئایەتەکان

دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشێدا کۆمەڵێك بابەتی دیکە هاتنە پێش بەتایبەتی باسی شیركو باسی ئیمانو، باسی ئەوە کە ئایا سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیی چییە؟ ئنجا خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە سەر باسی ئافرەتانو ئەو یاسایانەی کە پەیوەندییان پێیانەوە هەیە، چونکە ئەم سوورەتە بۆخۆی بە ناوی (النساء)ەوە ناونراوە، لەبەرئەوەی زۆرێك لەو یاساو دەستوورانەی کە پەیوەندییان بە ئافرەتانەوە هەیە، وە پەیوەندییان بە هەقو مافی ئافرەتانو مامەڵەی پیاوان لەگەڵ ئافرەتانەوە هەیە، چ هاوسەریان بن، چ کچیان بن، چ هەر حاڵەتێکی دیکەیان هەبێ، زۆر لە حوکمەکان دەگرێتە خۆی، بۆیە خوای پەروەردگار پانتاییەکی زۆری لەم سوورەتە موبارەکەدا بۆ باسو خواسی ئافرەتان تەرخان کردوە، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ﴾، واتە: وە داوای فەتوات لێی دەکەن دەربارەی ئافرەتان، داوای فەتوای چییان لێکردوە؟ دیارە کۆمەڵێك بابەت کە لێرەدا باسیان دەکات، هەروەها لە ئایەتەکانی پێشتردا هاتوون هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، ئەوە حوکمی

چۆنــە؟ ئـەوە حـوکمی چۆنە؟ وە ئەگـەر پیـاو زیـاتر لـە هاوسـەرێکی هەبـێ چۆن مامەڵـەیان لەگـەڵدا بکـات؟ مـیراتیان چۆنــە؟ هەڵسـوکەوت لەگەڵیـاندا دەبـێ چـۆن بـێ؟ ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴾، بفـەرموو: خـوا لەبارەیـــانەوە فەتواتـــان بـــۆ دەدات ﴿ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ ﴾، وە ئەوەش کە لە کتێبدا بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە، واتە: چ ئـەوەی لە ئایەتەکانی پێشـێدا هـاتوە، چ ئایەتەکـانی دیکە کە دێـن، ئـەویش دیسـان هـەمووی فـەتوای خـوای زانـاو شـارەزایە دەربـارەی ئافرەتـان، ﴿ فِى يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ﴾، وە ئـەوەی لـە کـتێب بەســەرتاندا دەخوێنــدرێتەوە دەربارەی ئەو کچە هەتیوانـەی کە ئەوەی کە خـوا بـۆی دانــاون‌و بۆیـان نووسـراوە، وەك مـیرات پێیـان نادەن، وە ئارەزووشـتانە کـە هاوسـەرگیرییان لەگەڵدا بکـەن، لـە حاڵێکـدا کـە جـوان‌و بەرچـاوو سـامانداربن، یـاخود ناتانـەوێ هاوســەرگیرییان لەگـەڵدا بکـەن، لە حاڵێکـدا کە بەرچـاو نـەبن، وە مـاڵ‌و سامانیان نەبـێ، چـونکە وەك دوایـی باسـی دەکـەین ﴿ وَتَرْغَبُونَ ﴾، هـەردوو واتایـەکان دەگرێتـەوە، ئەگـەر (فـي) دابنرێ: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، ئەوە یـانی: دەتانـەوێ هاوسـەرگیرییان لەگەڵـدا بکـەن، بـەڵام ئەگـەر (عـن) دابنـرێ: ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، واتـە: ناتانــەوێ هاوســەرگیرییان لەگەڵـدا بکـەن ﴿ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ ﴾، هـەروەها خـوا فەتواتــان بـۆ دەدات دەربــارەی منـداڵانی بـێ دەســتەڵات، منـداڵانی بێهـێز، واتـە: منـداڵانی گـچکە ﴿ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ﴾، وە هـەروەها خوا فەتواتـان بـۆ دەدات دەربـارەی هـەتیوان، کـە بـە دادگەرانـە مامەڵـەیان لەگەڵدا بکـــەن ﴿ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴾، وە هـــەر چـــاکەیەك

بیکەن، بێگومان خوا پێی زانایە، هەڵبەتە خوا بە خراپەش زانایە، بەڵام ئێوە ئەی مسوڵمانینە! چاکەتان لێ چاوەڕوان دەکرێ، هەر چاکەیەك بکەن جگە لەوەی لەسەرتان فەڕزە، چونکە مسوڵمان مەرج نیە ئەوەی لەسەری فەڕزە هەرئەوەندە چاکەیە بکات، بەڵکو شتێکیش کە لەسەرت فەڕز نیە، جا لەگەڵ هەتیوە، لەگەڵ منداڵە، لەگەڵ خێزانە، لەگەڵ دراوسێیە، لەگەڵ هەر کەسێکە، ئەوەی کە فەڕزە، ئەگەر نەیکەی گوناهباری، بەڵام مەرج نیە هەر بەوەندە وازبێنی، بەڵکو هەوڵبدە ئەوەش کە لەسەرت فەڕز نیە، ئەنجامی بدەی تاکو خێرو پاداشی زیاترت دەستبکەوێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ ﴾، وە ئەگەر ئافرەتێك مەترسیی هەبوو لە مێردەکەی کە لێی یاخیی بێ، یاخود پشت گوێی بخات، گوناهیان ناگاتێ کە لەنێوان خۆیاندا پێکبێن بە پێکهاتن، وە پێکهاتنیش باشترە، ﴿ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ﴾، وە نەفسەکانیش ڕژدییو چرووکیان تێدایە، واتە: وریای ئەو ڕژدییو چرووکییەبن، کە هەر کەسێك دەیەوێ هەقی خۆی بە زیادەوە وەربگرێ، بەڵکو هەقی دیکەش بەلای خۆیدا بێنێ، ئێوە وریابن ئەو چرووکییو ڕژدیی یە تووشی گوناهتان نەکات، تووشی ئەوەتان نەکات هەقی بەرانبەر نەدەن، ﴿ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ﴾، وە ئەگەر چاکەکاربنو پارێزکاربن، بێگومان خوا بەوەی کە دەیکەن شارەزایە، وە پاداشتتان دەداتەوە، دیارە دوایی ئێمە زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، کە ئەو صوڵحو پێکهاتنەی نێوان ژنو مێرد چۆنە؟ وە چەند حاڵەتی هەیە؟ وە حوکمەکەی چۆنە؟

پاشان خوای پەروەردگار دەربارەی مامەڵەکردنی پیاوێك کە زیاتر لە هاوسەرێکی هەیە، واتە: دوو، سێ، تا چوار هاوسەر، باسی ئەوە دەکاتو

دەفـــــــــــەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾، هەرچەندە زۆریش مەبەستتان بێو سووربن لەسەری، بەڵام هەر ناتوانن بە تەواویی دادگەربن لە نێوان ژنانتاندا، لە نێوان هاوسەرانتاندا واتە: دادگەریی تەواوتان بۆ جێبەجێ ناکرێ، دادگەریی تەواو چییە؟ ئەوەیە کە بە دڵیش وەك یەکت خۆشبوێن، وە لە ڕووی سەرجێیشەوە، وەك یەك هەقیان پێ بدەیو لە هەموو ڕووەکانەوە، کە ئەوە ناکرێ، لەبەرئەوەی لە توانای ئینسان بەدەرەو، ئینسان توانای بەسەر دڵی خۆیدانیە، مرۆڤ جاری وایە هەر لەخۆوە، خواردنێکی پێ خۆشترە لەوەی دیکە، یان شتێکی پێ جوانترە لە شتێکی دیکە، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە، پێغەمبەر ﷺیش دیارە خۆ نەیشاردۆتەوە کە هەندێ لە خێزانەکانی لە هەندێکیانی خۆشترویستوە، ﴿ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ ﴾، بەڵام کە ناتوانن دادگەریی تەواو بکەن، زۆریش بەلای یەکێکیاندا دایمەشکێنن، واتە: وامەبن کە دادگەرییەك کە بۆشتان دەگونجێ، ئەویش ڕەچاو نەکەن، دادگەرییەك کە بۆتان ناکرێ، بریتیە لە دادگەریی تەواو، ئەوە کە بە دڵو بە چاوو بە هەموو شێوەیەك وەك یەك مامەڵەیان لەگەڵ بکەی ئەوە ناکرێ، بەڵام دادگەرییەك کە دەکرێ، وە فەرزیشە لەسەرتان کە بیکەن، وەك لە ئایەتی ژمارە (٣) سووڕەتی (النساء)دا هاتوە: ﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ﴿٣﴾ ﴾، ئەگەر مەترسییتان هەبوو دادگەر نەبن، با یەکێك بێ، واتە: ئەگەر مەترسییتان هەبوو دادگەریی پێویست نەکەن، ئەوە با هەر یەکێك بێ، بەڵام دادگەریی تەواو بە مەرج نەگیراوە، جا دەفەرموێ: زۆر بە لای یەکێکیاندا دایمەشکێنن بە تەواویی، ﴿ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِ ﴾، کە ئەو ئافرەتە وەك هەڵواسراو بێ، واتە: نە هاوسەردار بێ، نە بێ هاوسەریش بێ، ﴿ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، وە ئەگەر چاکەکاریی

بکەن، یاخود ئاشتەوایی بکەن، پێکهاتن بکەن، وە پارێز بکەن، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾، وە ئەگەر لەیەکیش جیابنەوەو هەر پێکەوە نەگونجێن، ئەوە خوا هەر کامێکیان، - هەر کامێك لەو ژنو مێردە کە لێك جیابونەتەوە - لە بەخششی فراوانی خۆیو لە دەوڵەمەندیی خۆی، بێنیاز دەکات ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾، بێگومان خوا سیفەت فراوانی کاربەجێیە، عیلمی فراوانی هەیە، ڕەحمەتی فراوانی هەیە، بەخششی فراوانی هەیە، چاکەی فراوانی هەیە، وە کاربەجێشە ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، وە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، هی خوایە، وە ئەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێدراوە، وە ئێوەشمان ڕاسپاردوە کە پارێز لە خوا بکەن ﴿وَإِن تَكْفُرُوا۟ ﴾، بەلام ئەگەر بێبڕوابن، یاخود سپلەبن، ﴿تَكْفُرُوا۟ ﴾، بە هەردوو مانا دێ، چونکە کوفر یان بە مانای بێبڕوایی دێ، کە پێچەوانەی ئیمانە، یاخود پێچەوانەی شوکرە، کە بریتیە لە سپلەییو بێ وەفایی، ئەگەر ئێوە سپلەبن، یاخود بێبڕوابن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەوە بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، موڵکی خوایەو هی خوایە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴾، وە بێگومان خوا بێنیازی ستایشکراوە، واتە: بێنیازە لە ئێوە، وە ستایشیش دەکرێ، وە حەمدو سەنای دەکرێ لەلایەن فریشتەکانو لەلایەن تەنانەت ماددەی بێ ژیانیشەوە، وەك لە سووڕەتی (الإسراء)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن

شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾ ﴾،

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، دووبارە تەئكید دەكاتەوە بۆ جاری سێیەمو دەفەرموێ: هەرچی لە ئاسمانەكانو زەوی دا هەیە هی خوایە ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، وە بەسە خوا كاری پێ بسپێردرێو بكرێتە وەكیل، واتە: خوا بۆ سەرپەرشتیارییو بۆ كار پێ سپاردن بەسەو، پێویستیی بە كەسی دیكە ناكات.

ئنجا خوا ڕوو لە تێكڕای بەشەر دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، لەم سوورەتەدا بۆ جاری دووەم دەفەرموێ ئەی خەڵكینە! ئەگەر خوا بیەوێ لاتان دەبات ﴿ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ ﴾، وە جگە لە ئێوە دێنێ، كەسانی دیكە دێنێتە شوێنی ئێوە ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴾، وە خوا لەسەر ئەوەش بە توانایە، واتە: ئاگاتان لە خۆتان بێ، كە كارێكی وا نەكەن شایستەی ئەوەبن، خوا گەسكتان لێبداو ڕاتانبماڵێو، خەڵكێكی دیكە لە شوێنی ئێوە دابنێ.

لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾، هەر كەسێك پاداشتی دنیای دەوێو دەستكەوتو بەرهەمی دنیای دەوێ، ئەوە لەلای خوا پاداشتو بەرهەمو دەستكەوتی دنیاو دوارۆژ هەیە ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴾، وە بێگومان خوا بیسەری بینەرە، دەزانێ كێ چی دەوێو؟ كێ چی ناوێ؟ وە هەموویان دەبینێ، وە دەنگیشیان دەبیستێ، وە پێداویستییەكانیشیان دەزانێو دەبیستێ.

## چـەند مەسـەلەیـەكی گرنـگ

**مەسـەلەی یەكـەم:** خوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ وَأَنْ تَقُومُوا لِلْيَتَامَى بِالْقِسْطِ ﴾، ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگـیرێ كـە خـوای پەروەردگـار بۆخـۆی فـەتوای داوە لـەبارەی كاروبـاری ئافرەتانـەوە بەگـشتی، چ هاوسـەردار بـن، چ بـێ هاوسـەر، چ دایـك بـن، چ كـچ بـن، چ خوشـك بـن، بەگـشتی وە بەتایبـەت دەربـارەی ئافرەتانێـك كـە هاوسـەردارن، وە بەتایبـەتتر ئافرەتانێـك كـە كـچانێكی بـێ بـاب بـن، واتـە: كـچانێكی هەتیـو، هـەروەها منداڵانی هـەتیوو منداڵانی گچكە، وەك دوایی باسـی دەكـەین، چونكـە عـەرەب لـەنێوان خۆیانـدا، وە ڕەنگـە میللـەتانی دیكـەش عادەتیـان وا بووبـێ، مـیراتیان نـەدەدا نـە بـە ژنـان، نـە بـە منـداڵان، جا كچ بـان، یـان كـوڕ بـان، جارێ ئـەوە ئافرەت هەر مـیراتی نەبوو گەورە بووایـە، یان بـچووك، بـەڵام كوڕیش مـیراتیان پـێ نـەدەداو، دەیـانگوت ئـەوەی كـە نەتوانـێ سـواری ئەسـپ بـێو نەتوانـێ تـیر بهـاوێژێو دیفـاع بكـا، مـیراتی ناكـەوێ، خـوای دادگـەر ئـەو عادەتانـەی هـەموو هەڵوەشـاندەوە، وەك لـێرەدا دەفـەرموێ: خـوا فەتـواو بڕیارتـان بـۆ دەدا دەربـارەی هەموو ئەوانە.

ئنجـا مەبەسـت لـەوە كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ ﴾، واتـە: ئـەوەی كـە بەسـەرتاندا دەخوێنرێتـەوە لـە كتێبـدا كـە مەبەسـت پێـی قورئانـە، یـان ئـەوەی كـە پێـشتر نێـردراوەو لەمـەو دواش دەنێـردرێ، ئـەوە هـەمووی فـەتواو حـوكمی خوایـە، جـا چ بـۆ ئافرەتـانو منـداڵان، چ بـۆ غـەیری ئەوانیش، ئنجا ئایا ئەمە چی لـێ وەردەگیرێ؟ ئـەوەی لـێ وەردەگیرێ كـە ئـەو

یاسایانەی کە لە قورئاندا هاتوون وە لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەر ﷺدا هاتوون، ئەوە هەمووی فەتوای خوایەو حوکمی خوایە، واتە: پابەندکەر (مُلْزِم)ە بۆ هەموو کەسو، هیچ کەس مافی ئەوەی نیە لە بەرانبەر فەتوای خواو حوکمی خوادا، مافی سەرپشك بوونو هەڵبژاردن بە خۆی بدات، وەك لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴿٣٦﴾﴾، واتە هیچ پیاوێکی ئیماندارو ئافرەتێکی ئیماندار بۆیان نیە، دوای ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیارێك دەردەکەن، سەرپشك بن لەبارەی خۆیانەوە، واتە: مافی هەڵبژاردنیان هەبێ، ئەو فەرمانە جێبەجێ بکەن، یان جێبەجێ نەکەن، مادام خۆت بە ئیماندار دەزانی، تۆ تازە پابەندی بە فەرمانی خواو بە فەرمانی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ﴾، هاوەڵان تەنیا لەبارەی ئافرەتانەوە پرسیاریان کردوەو داوای فەتوایان کردوە، بەڵام خوای کاربەجێ باسی ئافرەتان بەگشتیو، کچانی هەتیوو، مندالانی وردو بێهێز، باسی هەموویانی کردوە، ئنجا شایانی باسە کە ئەم ڕستەیە کە دەفەرموێ: ﴿لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾، ئەوەی کە خوا بۆی نووسیون، پێیان نادەن، مەبەست پێی بێ بەشکردنی کچانی هەتیو بووە لە میرات، هەڵبەتە وەك گوتم کوڕیشیان هەر بێ بەش دەکردن، بەڵام خوا لێرەدا بەشێوەی تایبەت بەرگریی دەکات لە کچان، وە لەوبارەشەوە هەرچەندە پێشتریش باسمان کرد، بەڵام دووبارە ئەم دەقە دێنینەوە: ﴿ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ

أهْلُ الجَاهِلِيةَ لاَ يُوَرِّثُونَ البَنَات وَلاَ الصِّغَارَ حَتَّى يُدرِكُوا، فَمَاتَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُ: (أوس بن ثابت) وَتَرَكَ ابْنَتَيْنِ وَابنَاً صَغِيراً، فَجَاءَ ابنا عَمَّهِ وَهُمَا عَصَبَتُهُ إلى رَسُول اللَّهِ ﷺ فَأَخَذوا مِيْرَاثه كُلّه، فجاءت امْرَأَتْهُ إلى رَسُولِ الله ﷺ فَنَزَلَتِ الآية فَأَرْسَلَ إلَيْهَا رَسُولُ اللَّه فقَال: «لاَتُحَرِّكَا مِن المِيرَاثِ شَيْئَاً فإنَّهُ قَدَ أَنْزَلَ عَلَيَّ شَيء إحترتُ فيه، إن لِلْذَكَرِ وَالأُنثى نَصِيبَاً» ثُمَّ نَزَلَ بَعْدَ ذَلِكَ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴾، ثُمَّ نَزَلَ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ﴾، فَدَعى بِالمِيرَاث فأعطى المَرأَةَ الثُّمْن وقَسَم مَابَقِيَ لِلْذَكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأنثَيَين﴾[1]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لە سەردەمی نەفامییدا خەڵك عادەتیان وابوو میراتیان نەدەدا بە کچان و بە منداڵان (واتە: جا کوڕ، یان کچ بان) هەتاکو باڵغ دەبوون، ئنجا پیاوێك لە ئەنصارییەکان وەفاتی کرد ناوی ئەوسی کوڕی سابیت بوو، وە دوو کچ و کوڕێکی لەدوا بوون، دوو کوڕە مامی هەبوون (واتە: دوو ئامۆزای هەبوون) کە عەصەبەی بوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ میراتەکەیان هەموو برد، خێزانی پیاوە مردووەکە (واتە: خێزانی ئەوسی کوڕی سابیت) هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داوای کرد کە من دوو کچ و کوڕێکم لەو پیاوە هەن، هیچ میراتیشی نەماوە، هەمووی دوو ئامۆزایەکەی بردوویانە؟! خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوار بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: میراتەکە دەستکاریی مەکەن، چونکە خوا شتێکی بۆ ناردوومە خوار دەربارەی شتێك کە من نەمدەزانی حوکمەکەی چییە؟! خوا بەشی نێرو مێی داناوە (واتە: بەشی کوڕو کچی داناوە، گەورە بن یان گچکە بن)، ئنجا دوای ئەوەش ئەم ئایەتەش هاتە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴾، دوایی ئەم

---

١) لُباب النقول فِي أسباب النزول للسيوطي، (٢٥٧)، و(الفتح القدير) للشوكاني، ج: (١)، ص: (٥٥١)، وأسباب النزول الوحدي، ص: (٢٩٥).

ئایەتەی دیکە کە دەفەرموێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ ﴾، خوا دەربارەی منداڵەکانتان ئامۆژگارییتان دەکات، بۆ کوڕ دوو ئەوەندەی کچ هەیە، ئیدی پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد میراتەکەیان هێناو دابەشی کرد، هەشت یەکی دا بە ئافرەتەکە، وە ئەوەی دیکەشی لە نێوانی کوڕەکەو دوو کچەکەدا دابەش کرد، وە دوو ئامۆزایەکەی کابرا هیچ میراتیان نەبرد.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە دوو واتای هەن، کە وەك پێشتریش باسمان کرد ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ ئارەزووتانە هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکەن، وە دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ ئارەزووتان نیە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، بۆچی؟ هەڵبەتە سەعیدی کوڕی جوبەیر خوا لێی ڕازی بێ کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین گوتوویەتی: ئەم ڕستە قورئانییە هەردوو مانایەکەی هەن لە یەك کاتدا، بەڵام توێژەرەوانی دیکەی قورئان هەندێکیان مانایەکیان هەڵبژاردوە، هەندێکیش مانای دیکە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾ ئەگەر (في) (تقدير) بکرێ: ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾ مانای وایە ئارەزووتانە کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، بەڵام ئەگەر (عن) (تقدير) بکرێ: ﴿ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، واتە: ئارەزووتان نیە کە بیانهێنن، وە لەڕاستییدا هەر دوو مانایەکە بۆ ئەم ڕستە قورئانییە لە یەك کاتدا پێویستن، بۆچی؟ چونکە ئەوانە عادەتیان وابووە ئەو کچە هەتیوەکە لەماڵیاندا پەروەردە بووە، ئەگەر جوان بووبێ و ماڵ و سامانێکی بووبێ ڕەغبەتیان هەبووە کە بیهێنن، وەك تەماع کردنە لە جوانییەکەی و سەروەت و سامانەکەی، وە ئەگەرنا بەرچاویش بوو بێ و ماڵ و، سامانی نەبووبێ و ئارەزوویان نەبووە بیهێنن، کەواتە: خوای زانا بە جۆرێك ڕستە قورئانییەکەی هێناوە، کە لە یەك کاتدا هەردوو مانایەکەی هەبن، چونکە

جاری وا هەبووە ئارەزوویان هەبووە بیهێنن‌و، جاری واش بووە ئارەزوویان نەبووە بیهێنن، وەك گوتم: لەبەر جوانیی‌و ماڵ‌و سامان، یاخود نەبوونیان، ئنجا لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە، کە لە دایکمان عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە: ﴿ عَنْ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ...﴿٣﴾ ﴾النساء، فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي! هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ[1] وَلِيِّهَا تَشْرَكُهُ فِي مَالِهِ، وَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا عَنْ أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا لَهُنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ فِي الصَّدَاقِ فَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنْ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ: وَإِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴾، قَالَتْ عَائِشَةُ وَقَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى فِي آيَةٍ أُخْرَى ﴿ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ﴾، رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، قَالَتْ فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَنْ رَغِبُوا فِي مَالِهِ وَجَمَالِهِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ إِلاَّ بِالْقِسْطِ، مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ إِذَا كُنَّ قَلِيلاتِ الْمَالِ وَالْجَمَالِ﴾ (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي بِرقم: (٤٣٦٤)، واتە: عورووەی کوڕی زوبێر (واتە: خوشکەزای عائیشە، زوبێر مێردی ئەسمائی خوشکی عائیشەیە خوا لێیان ڕازی بێ، عورووەش کوڕی زوبێرە، واتە خوشکەزای خۆی بووە، لە پووری) لە عائیشە دەپرسێ خوا لێی ڕازی بێ، دەربارەی قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ...﴿٣﴾ ﴾النساء، ئەگەر ترستان هەبوو کە

١) الحَجْرُ والحِجْر: الحُضْنُ= کۆش، باوەش، ژێر چاودێریی‌و سەرپەرشتیاریی. بڕوانە مختار الصحاح، ص: (١٢٠)، لفظ: ح ج ر.

دادگـەریی نەکـەن لەگـەڵ هەتیـوان، ئـەوە لـە ئافرەتـانێ کـە بۆتـان حەڵاڵـن، یاخود پێتان چاکن، بێنن دوو دوو و سێ سێو چوار چوار، لەوبارەوە پرسیاری کـردو دایکمـان عائیـشەش گـوتی: ئـەی خوشـکەزام ! ئـەوە دەربـارەی کـچێکی هەتیوە کە لە کۆشی سەرپەرشتیارەکەی دا دەبێ (واتـە: لـە مـاڵی ئـەودا بـەخێو دەکـرێت) بەشـدار دەبێ لـە مـاڵو سامانیدا، وە ئـەو پیـاوەش سەرسـام دەبـێ بـە مـاڵو سـامانەکەیو جوانییەکەشـیو دەیـەوێ کـە بیهـێنێ، بێئـەوەی کـە مارەییـەکی وای بداتـێ، کـە غـەیری ئـەو پێـی دەدات (واتـە: فـەرقی پێـدەکات لەبەرئـەوەی کـچێکی هـەتیوە، مارەیـی کەمـتری دەداتـێ، لـەو مارەییـەی کـە دەدرێ بـە هاوکـوفی)، ئنجـا خـوا قەدەغـەی کـردو نەهیـان لێکـرا کـە ئـەو ئافرەتانـە بێنـن، مەگـەر بـە تـەواویی لەگەڵیانـدا دادگـەربن، وە ئەنـدازە مـیراتێکیان بدەنـێ کە بیگـەیەنن بە ئەوپـەڕی ئەنـدازەی خۆیـان، کـە دەدرێ بـە هاو وێنەکانی ئەوان، وە فەرمانیـان پێکـرا لـە حاڵـێکی وادا کـە لـەخۆڕانەبینـن دادگەربن لە میرات پێدانیانداو لە هەڵسوکەوت لەگەڵ کردنیانـدا، بـا ئافرەتـانی دیکـە بێنـن، ئنجا دایکمان عائیشـە دەڵـێ: قـسەی خـوا لـە ئـایەتێکـی دیکـەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾، ئـەوە مەبەسـت پێـی ئـارەزوو نـەبوونی یەکێکـیانە دەربـارەی ئـەو کـچە هـەتیوەی کـە بـەخێوی کـردوە، لـە حاڵێکـدا کـە مـاڵو سـامانێکی نیـە، وە جوانییـەکی وای نیـەو ئـارەزووی نیـە بیهێنـێ، نەهیان لـێکرا ئـافرەتێك کـە ڕەغبـەتیان هەیـە لـە مـاڵو سامانو لـە جوانییـەکـەیـدا بیهـێنن، (کـچە هەتیوێـك لەبـەر مـاڵو سـامانەکەی بهـێنن)، بـەڵام ئـەوەی دیکـە کـە مـاڵو سـامانی نیـەو جوانییـەکی وای نیـە نەیهـێنن، نـەهیان لێکـرا لـەوە، مەگـەر لەگەڵیانـدا دادگـەربن، چـونکە لـە حاڵێکـدا کـە خـاوەنی مـاڵو سـامانو خـاوەنی جوانیی نـەبن نـایهێنن، کەواتـە: کـە خـاوەن مـاڵو سـامانو جـوانییش بـوون، مەیانهـێنن، مەگـەر لەگـەڵیاندا دادگـەربنو، وەك ئافرەتـانی دیکـە مامەڵـەیان لەگـەڵدا بکـەن، بـەمجۆرە کـە دەیبیـنین ئایەتەکانی قوڕئان تێکهەڵکێشنو یەکدی دەبەستنەوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا﴾، هەر شتێك لە چاکە بکەن، بێگومان خوا پێی زانایە، بەڕێزان ! ئایا حیکمەتی کۆتایی هاتنی زۆر لە یاسا شەرعییەکان چییە کە خوای پەروەردگار بە هەندێ لە ناوو سیفەتەکانی خۆی کۆتاییان پێ دێنێ؟ ئەگەر تەماشای ئەو هەشت ئایەتە بکەین کە لەم دەرسەدا ئێمە خەریکی توێژینەوەیانین، تەماشا دەکەین خوای کاربەجێ، دوازدە ناوو سیفەتی خۆی کردۆتە کۆتایی ئەو یاسا شەرعییانە بەم شێوەیە:

١- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ١٢٧﴾، مسۆگەر خوا پێی زانایە، زانیاریی (علم)ی خۆی دەخاتە ڕوو.

٢- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ١٢٨﴾، بێگومان خوا بەوەی کە دەیکەن شارەزایە، شارەزایی (خبرة)ی خۆی دەخاتەڕوو.

٣- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٢٩﴾ بێگومان خوا لێبوردەی بەزەییە، لێبوردنو بەزەیی خۆی دەخاتە ڕوو.

٤- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ١٣٠﴾ بێگومان خوا فراوانی کاربەجێیە، سیفەت فراوانیی خۆیو کاربەجێیی خۆی دەخاتە ڕوو.

٥- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا ١٣١﴾، وە خوا بێنیازیی ستایشکراوە، دەوڵەمەندییو بێنیازیی خۆیو ستایشکراویی خۆی دەخاتە ڕوو.

٦- ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ١٣٢﴾، بەسە خوا وەکیلو کارپێ سپێردراو بێ، سەرپەرشتیاریی خۆی دەخاتە ڕوو.

٧- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ١٣٣﴾، خوا لەسەر ئەوە بە توانایە، توانای خۆی دەخاتە ڕوو.

٨- ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾﴾ بێگومان خوا بیسەری بینەرە، بیستنو دیتنی خۆی باس دەکات.

ئایا ئەمە حیکمەتەکەی چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە: کە خوای بەرزو مەزن دەیەوێ ئێمە لە کاتێکدا کە حوکمە شەرعییەکان جێبەجێ دەکەین، بزانین کە مامەڵە لەگەڵ خوادا دەکەین، واتە: ئەوە خوا کردەوەی تۆ دەبینێ، خوا قسەی تۆ دەبیستێ، خوا لەگەڵت بە بەزەییە، خوا لەگەڵت میهرەبانە، خوا عیلمی هەیە بە تۆو پێت شارەزایە، کەواتە: ئاگات لێ بێ! دیارە ئەمەش وادەکات کە وێڕای هاندەری دەرەکییو قانوونیی، هاندەرێکی دەروونییشت هەبێ بۆ پابەندیی بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، دیارە هەر کامێك لە سیفەتەکانیش کە خوای بێ وێنە دەیانکاتە کۆتایی ئایەتەکان، زۆر پێویستە ئینسان باش سەرنجیان بدات، چونکە حوکمی شەرعیی زۆریان لێ وەردەگیرێن، جاری وایە حوکمە شەرعییەکە لە کۆتایی ئایەتەکەوە وەردەگیرێ، بۆ وێنە: ئەگەر باسی لێبوردنی خۆی بکات، مانای وایە ئەو تاوانەی کە کراوە، ئەگەر مرۆڤ لێی بگەڕێتەوە، لێبوردنی بەسەر دادێ، بەڵام ئەگەر باسی عیززەتو حیکمەتی خۆی بکات، مانای وایە سزا لە ئارادایە.

بەڵێ زۆرجار سەرنجدانی ئەو سیفەتانەی کە خوا دەیانخاتە کۆتایی ئەو ئایەتانەوە، کە باسی حوکمە شەرعییەکان دەکەن، تیشك دەخاتە سەر ئەو حوکمە شەرعییانەی کە لەو ئایەتانەدا هەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا﴾، لە سێ لایەنەوە باسی ئەم ئایەتە دەکەین:

١- لێرەدا زانایان لەبارەی مانای (خَافَتْ )ەوە چەند شتێکیان گوتوە، هەندێکیان گوتوویانە: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ ﴾، واتە: ترسا، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (خَافَتْ ) واتە: (ظَنَّت) گومانی وابوو، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (خَافَتْ ) واتە: (تَيَقَّنَت) یەقینی وابوو، بەلاَم من پێموایە (خَافَتْ ) واتە: ترسی هەبوو، لە شوێنی خۆیەتی، چونکە جاری وایە تۆ ترست هەیە لە شتێك بەلاَم تێیدا نەگەیشتوویە یەقینو گومانت هەیە ئەو شتە پەیدابێ، وە جاری وایە ترست لێی هەیە، لەبەرئەوەی یەقینت تێیدا پەیدا بووە، واتە: ترس هەم بۆ گومانیش بەکاردێ، هەم بۆ شتێکیش کە تێیدا گەیشتبیە دڵنیایی.

٢- ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەگەر ئافرەتێك مەترسیی هەبوو لە مێردەکەی کە لێی یاخی بێ، یاخود پشتگوێی بخات، گوناهیان ناگاتێ کە لە بەینی خۆیان پێکبێنو صولْح بکەنو، ئافرەتەکە دەستبەرداری هەندێك لە مافەکانی خۆی بێ، بۆئەوەی لەگەڵ مێردەکەی صولْح بکات، بە هەر شێوەیەك، لە شێوەکان، وەك دوایی باسی دەکەین زانایان لەوبارەشەوە کە ئایا (نُشُوزًا ) قورسترە، یاخود (إِعۡرَاضًا )؟ دیسان مشتومڕیان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: (نُشُوزًا ) واتە: یاخیی بوون، ئەوە قورسترە لە (إِعۡرَاضًا ) پشتگوێ خستن، وە هەندێکیان گوتوویانە: بەڵکو پشتگوێ خستن قورسترە، چونکە بریتیە لەوەی کە ئیهمالی بکاتو هەر لێی نەپێچێتەوە، بەلاَم یاخییبوون (نُشُوزًا ) ئەوەیە کە مێردەکەی هەر لەگەڵی دابێ، بەلاَم لەگەڵی باش نەبێ، دیارە دەشگونجێ بە هەردوو دیوەکەدا تەفسیریان بکەینو، هەر کامێکیان بە قورستر لەوی دیکە دابنرێ، بەلاَم ئەگەر بڵێین: خوای پەروەردگار لە نزمەوە بۆ بەرز چووە، دەڵێین: (نُشُوزًا ) سووکترە لە (إِعۡرَاضًا ).

٣- ئنجـــا کـــه دەفـــەرموێ: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا﴾، گوناهیان ناگـاتـێ کە لە بەینـی خۆیان پێکبـێنو پێکهاتن بکەن، سەعیدی کوڕی جوبەیر خوا لـێی ڕازی بێ، تیشکمان بۆ دەخاتە سەر ئەم مەسەلەیە: ﴿عَنْ سَعِيد بْنُ جُبَيْرٍ قَالَ هِيَ الْمَرأَةُ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ قَدْ طَالَتْ صُحبتهَا وَكَبُرَتْ فَيُرِيدُ أَن يستبدِلَ بِهَا، فَتَكْرَهُ أَن تفارقه، فَيَتَزَوَّج عَلَيْهَا فَيُصَالِحُهَا عَلَى أَنْ يَجْعَلَ لَهَا أَيَاماً وَللأخرى الأيام وَالشَّهْر﴾[1]، واتە: سـەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ئەم ئایەتە مەبەست پێـی ئافرەتێکە لـەلای پیاوێکە لەمێژە لە لایەتیو کەوتۆتە تەمەنەوە (بۆخۆتان دەزانن پیاو درەنگتر لە ئافرەت ئارەزووی جینسـیی کز دەبێ، یان نامێنێ)، ئنجا دەیەوێ ئەو ئافرەتە بگۆڕێ بە یەکێکی دیکە، (واتە: دەیەوێ کە ژنێکی دیکە بێنێ) ئافرەتەکەش پێی ناخۆشە لێی جیابێتەوە، ئەو پیاوەش دەچێ ژنێکی دیکە دێنێ، وە صوڵح دەکات لەگەڵ ژنەکەیدا، کە چەند ڕۆژێکی دیاریکراو بۆ ئەو ژنە بە تەمەنەی دابنێ، بەڵام بۆ ئەوی دیکە ڕۆژانی زیاتر، بەڵکو مانگی بۆ دابنێ، واتە: لەسەر ئەوە صوڵحو پێکهاتن دەکەن، ئەم ئایەتە مەبەستی پێی ئەوەیە.

(قُرطُبي) زیاتر تیشك دەخاتە سەر ئەوە لە تەفسیرەکەی خۆیداو دەڵێ: ﴿قَالَ عُلَمَاؤُنا: وَفِي هَذَا أن أنواعَ الصُّلْحِ كُلُّهَا مُبَاحَةٌ فِي هَذِهِ النَازِلَة، بِأن يُعْطِيَ الزَّوْجُ عَلَى أَن تَصْبِرَ هِيَ، أَو تُعْطِي هِيَ عَلَى أَن يُؤْثِرَ الزَّوجُ، أَو عَلَى أَن يُؤْثِرَ وَيَتَمَسَّكَ بِالعِصْمَةِ، أَو أَن يَقَعَ الصُّلْح عَلَى الصَّبْرِ والأثرة مِن غَيْرِ عَطَاءٍ، فَهَذَا كُلّه مُبَاحٌ، وَقَدْ يَجُوزُ أَن تصَالِح إِحدَاهُنَّ صَاحِبَتَهَا عَنْ يَوْمِهَا بِشَئٍ تعطيها، كَمَا فَعَلَ أَزواج النَّبِيِّ ﷺ﴾، ﴿عَنْ سُمَيَّةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى صَفِيَّةَ فِي شَيءٍ، فَقَالَتْ لِي صَفِيَّةُ: هَلْ لَكِ أَنْ تُرْضِينَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِّي وَأَجْعَلُ لَكِ يَوْمِي، قُلْتُ: نَعَمْ، فَلَبِسْت خِمَارًا

---

١) جامع البيان للطبري، ج: (٥)، ص: (٣٥٦)، برقم: (١٠٥٠٨).

كَانَ عِنْدِي مَصبُوغًا بِزَعْفَرَانٍ وَنَضحتْهُ ثُمَّ جِئتُ فَجَلَستْ إِلَى جَنْبِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِلَيْكِ عَنِّي فَأَنهُ لَيْسَ بِيَوْمَكِ، فَقُلْتُ: ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ، ثُمَّ أَخْبَرْتُهُ خَبَرِي، فَرَضِيَ عَنْهَا﴾] رَوَاهُ النَّسائيُّ في (الكبرى) برقم: (٨٩٣٣)، وَأَحْمَد برقم: (٢٥١٦٥)، وَالطَّبَرَانِي بسنَد حَسَن. وَقَال الشيخ الألباني: وَرجالُهُ ثِقَات رجالُ مُسْلِم غير سُمّيَّة هذِه وهِيَ مَقبولة عِندَ الحَافظ ابْنُ حَجَر[1].

واتە: (قُرطُبي) دەڵێ: زانایان گوتوویانە: لەم ئایەتە وەردەگیرێ، کە هەموو جۆرەکانی پێکهاتن لەنێوان ژنو مێردا، (واتە: پیاوێك زیاتر لە هاوسەرێکی هەیە هەموو جۆرەکانی پێکهاتن) ڕەوان، ئەوە کە مێردەکە ئەندازەیەك ئیمتیازی زیادە بدات بە ژنەکەو، ژنەکە صەبر بگرێ (واتە: صەبر بگرێ لەسەر ئەوەی کە ژنی بەسەر هاتوە، صەبر بگرێ لەسەر ئەوەی فەرقی پێدەکات لەگەڵ ئەوی دیکە)، یاخود ئافرەتەکە ئیمتیازێکی زیادە بدات بە مێردەکەی‌و مێردەکەشی ئیمتیازی پێ بداتو شەوانی زیاتر لەلای بمێنێتەوە، یاخود مافی زیاتری پێبدات، یان پیاوەکە یەکێك لە خێزانەکانی هەڵبژێرێ بەسەر ئەوانی دیکەدا، وە ئەوی دیکەش هەر لە ژێر نیکاحی خۆیدا بهێڵێتەوە، یاخود صوڵحو پێکهاتنیان ببێ‌و ئافرەتەکە صەبر بگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا فەرقیشی پێدەکرێ، بەبێ ئەوەی کە هیچیشی بداتێ، لەم ئایەتە وەردەگیرێ کە مادام بە پێکهاتنی ژنو مێردەکە بێ، هەمووی ڕەوایەو موباحە، بەڵکو ئەگەر یەکێك لە ژنەکان (واتە: یەکێك لە هەوێیەکان) صوڵح بکات لەگەڵ ئەوی دیکەدا بە شتێك کە پێی دەدات، وەکو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ وایانکردوە، ئنجا ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر شتێ لە صەفییە تووڕە بوو، صەفییە پێی گوتم: وەرە پێغەمبەری

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٤٠٥).

خـوام ﷺ لەگـەڵ ئاشـت بکـەوە، مـن ئـەم نـۆرە ڕۆژەی خـۆم دەدەم بـە تـۆ، دەڵـێ: گوتـم باشـە، منـیش سـەرپۆشـەکەم لەسـەر خۆمنـا کـە سـەرپۆشـێکم لـەلا بوو بە زەعفـەران ڕەنگ کرابـوو، وە بـۆنی خۆشـیشـم لەخۆمـدا، وە چووم لە تەنیشـت پێغـەمبەری خـوا ﷺ، دانیشـتم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: خـۆت دوور بخـەوە، چـونکە ئـەمڕۆ نـۆرەی تـۆ نیـە، دەڵـێ: گـوتم ئـەوە بەخشـشی خوایـە دەیـدات بـە هـەر کەسـێك کـە بیـەوێ، وە هەواڵـم پێـدا کـە صـەفییە تەکـلیفی لێکـردووم بێـم ئاشـتت بکـەمەوە لەگـەڵ صـەفییەداو، نۆرەی ڕۆژی خـۆی داوە بـە مـن، پێغـەمبەریش ﷺ بـەوە ڕازی بـوو و لەگەڵـی ئاشـت بـۆوە.

هەروەها لە صـەحیحی بوخـاریی دا هـاتوە: ﴿ عَنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهَـا: لـما كَبُرَتْ سَـوْدَةُ بِنْتِ زَمْعَةَ وَهَبَـتْ يَوْمَهَـا لِعَائِشَـةَ، فَكَـانَ النَّبِـيُّ ﷺ يَقْسِمُ لَـهَا بِيَـوْمِ سَـوْدَةَ﴾ رَوَاهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٥٢١٢)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٤٦١٤) وَغيرهما، واتـە: دایکمـان عائیشـە خـوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: کـاتـێ سـەودەی کچی زەمعـە کە خێزانـی پێغـەمبەر ﷺ بـوو، کەوتـە تەمەنـەوە (کە دەڵێـن: ئەوکاتـە تەمـەنی دەوری حەفتـا سـاڵ بـووە)، ڕۆژەکـەی خـۆی دا بـە عائیـشـە، پێغـەمبەر ﷺ هـەموو جارێ کە نـۆرەی عائیـشـە دەبـوو، ڕۆژێکـیش زیـادە لـە لای عائیشـە دەمـایەوە، کە ڕۆژی سـەودە بوو پێـی دابـوو.

کەواتـە: ئەم ئایـەتە باسی ئەو جۆرە صـوڵحو پێکهاتنـە دەکات، لـە حاڵێکـدا کە پیاو زیاتر لە هاوسـەرێکی هـەیە، دەگونجـێ سـەنگو سـووکیی بکـرێ مـادام بە ڕازیی بـوونو قبووڵـیی هـەموو تەرەفـەکان بـێ، هـیچ ئـیشکالـێکی تێدانیـە، بـەڵام وەك دوایـی باسـی دەکـەین ئـەوەی دیکـە کـە ڕێـكو ڕاسـتە شـەرعە، دیـارە ئـەوەیان حاڵـەتی ئاسـایی یـە، بـەڵام لـە حاڵـەتی نائاسـایی دا، کـە پیـاو دوو خێـزانی هـەن، سـێی هـەن، چواری هـەن، دەگونجـێ سـەنگو سووکـیی بکـات لـە مـافو ئیمتیـازەکانیـاندا، مادام بە ڕەزامـەندیی هـەموو لایەکیـان تـەواوبـێ.

**مەسـەلەی شەشـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ﴾، وەك پێشتـر گوتمـان: باسـی ئەوە دەکـات، ئەگەر ژنێـك ترسـی لـە مێردەکەی هەبوو کـە لێـی یاخیـی بـێ، یـاخود پـشتگوێی بخـات، گوناهیـان ناگـاتێ کـە لـەنێوان خۆیاندا صولْح بکـەن و پێکبێن، ئێمـە لە مەسەلەی پێنجەمدا ڕوونمان کـردەوە ئـەو صـولْح و پێکهاتنـە چـۆنە؟ لێـرە خـوای کاربـەجێ دەفـەرموێ: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ﴾، پێکـهاتن باشـترە، واتـە: ژن و مێـرد پێکـەوە ڕێـك بکـەون و پێکـبێن باشـترە لەوەی کە ژنەکە لە هیچ مافێکـی خۆی نەیەتـە خـوار، پیاوەکـەش لـە هیچ مافێکـی خـۆی نەیـەتە خـوار، وە سـەرەنجـام هـەر مـشـتومڕو ناکۆکییـان بـێ، یاخود سـەربکێشـێ بـۆ لێکتـرازانیان، بـەڵام ئەگەر ئافرەتەکە لـە هەنـدێ هەقـی خۆی بێتـە خوار، وە پیـاوەکەش لە هـەندێ هـەقی خـۆی بێتـە خـوار، وە لـە نێوەڕاسـتدا بگەنـە یـەك، لێکتێگەیـشتن و پێکهاتنیـان باشـترە، لێـرەدا ئـەم ڕسـتە قورئـانییە دیـارە لـە بابـەت چارەسـەری کێشـەی ژن و مێـرد هاتۆتـە خوار، لە حاڵێکدا کە خەتـای پیـاوە، واتە: کاتێـك کە پیاوەکە یـاخیی دەبـێ لـە ژنەکـە، یاخـود ژنەکـەی ئیهمـال دەکـات، لـەو حاڵەتـەدا بـا ئافرەتەکـە دان بـە خۆیـدا بگـرێ و، لـە هەنـدێ لـە مافـەکانی خـۆی بێتـە خـوارو پێکبـێ لەگـەڵ مێردەکەیـدا، باشـترە، یـاخود پیاوەکـە لـە هەنـدێك لـە مافـەکانی خـۆی بێتـە خـوارێ و لەگەڵ ژنەکەیدا پێکبـێ، باشـترە، لـەو سیاقەدا ئـەم ڕسـتە قورئانییـە هـاتوە، بـەڵام چەمـك و واتایەکـەی گـشتییە، بۆیـە زۆرجـار کـە باسـی صـولْح دەکـرێ دەڵـێن: (والصُّلحُ خَيْر) پێکـهاتن باشـترە، واتـە: پێکـهاتن باشـترە لـە شـەڕو ناکۆکـیی و ناتەبـایی، کـە بێگـومان هـەردوولا زەرەر دەکـەن، یـان لایـەك بۆیە صولْحـێ ناکـات، دەیـەوێ هەموو مافەکەی خۆی ئـەوەی بـە هـەقی دەزانـێ وەری بگـرێ، بـەڵام ڕەنگـە سـەرەنجـام هەندێـك لـەو مـافەش کـە بـە هـۆی صـولْحەوە دەستـی دەکـەوێ، ئەویـشی لەدەست بـچێ، کەواتـە: صولْح باشـترە،

بەڵـێ ئـەم ڕسـتەیە چـەمكو واتـای گـشتییەو بـۆ غەیـری كێـشەی ژنو مێردانیـش ئەم ڕسـتە قورئـانییە بەكاردێو دەیگـرێتـەوە.

بەڵام لـێرەدا دەبـێ ئـەوە بزانیـن كە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ ﴾، واتـە: صـوڵحێك لەسـەر بنـاغەی دادگـەریی بـێ، ئەگـەرنا صـوڵحێك لەسـەر بناغـەی زاڵـمو مـەزڵووم، بـێ چاك نیـە، بـۆ وێنـە: صولْحی نێوان مـسوڵمانانی فەلەسـتینو جوولەكـەكان، ئایـا ئـەو صـوڵحە باشـە؟ نـەخێر، بۆچـی؟ چـونكە جوولەكـــە هــاتوە، خــاكی مـــسوڵمانانی داگــیر كــردوە، كــە خــاكی هــەموو مسوڵمانانیـشە، چـونكە یەكـەمین قیبلـەی مـسوڵمانانی لێیـە، كـە مزگـەوتی (أقـصـی)یــە، ئــەو خاكــەی داگــیر كــردوە، دەوڵــەتۆكەیەكی لەســەر قیــت كردۆتـەوە، دەشـڵـێ: وەرن صـوڵحـێ بكـەین! كـە لەڕاسـتییدا ئـەوە صــوڵحی نێـــوان زاڵـــمو مەزڵوومــە، لەبەرئــەوە ئــەو صــوڵحە ناگونجــێ بڵـێین: باشــە، صــوڵحێـك باشـە كە لەسـەر بنـاغـەی دادگـەریـی بـێ.

<u>مەسـەلەی حەوتـەم</u>: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ ﴾، نەفـسەكان ڕژدییــان تێــدا ئامادەكــراوە، ڕژدیـــیو چــرووكیان تێدایــە، واتــە: نەفــسی ئینـسانەكان بەگـشتی وایـە، كـە پێـی خۆشـە ئـەوەی بـە مـافی خـۆی دەزانـێ دەسـت بـە هــەمووی بگـرێ، وە دەسـتبەرداریی هیـچی نـەبێ، ئەمـە وەك ئـەو ئایەتـە وایـە، كـە لـە سـوورەتی (الـشمس)دایـە، خـوای پەنهـانزان دەفـەرموێ:

﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ۝١ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ۝٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ۝٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا ۝٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ۝٨ ﴾الشمس، لێـرەدا خـوای باڵادەسـت سـوێند دەخـوا بە كۆمەڵـێك شـت، بـە ڕۆژگـار، بـە شـەوگار، بـە خـۆرو بـە مـانگ، بـە ئاسـمانو زەوی، وە بە نـەفس بەوەی كە ڕێكی خستوەو هێنـاویەتە دی، پاشـان دەفـەرموێ: ﴿ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ﴾، ئـــەو نەفـــسەی كـــە - نەفـــسی ئینـــسانە –

خراپەکاریی‌و پارێزکاریی فێرکردوە، واتە: خوای بەدیهێنەر نەفسی ئینسانی وا هەڵخستوە کە بتوانێ خراپە بکات‌و چاکە بکات، بتوانێ تاوان بکات‌و تەقوا پەیدا بکات، ئنجا ئایا بۆچی خوای کاربەجێ وای دروست کردوە؟ بۆئەوەی بگونجێ تاقی بکرێتەوە، ئێستا مەلائیکە دەتوانن گوناهان بکەن؟ نەخێر، شەیتانەکان دەتوانن چاکە بکەن؟ نەخێر، دارو بەردو ڕووەك‌و ... هتد، دەتوانن چاکەو خراپە بکەن؟ نەخێر، بۆیە بەکەڵکی تاقیکرانەوە نایەن، کێ بەکەڵکی تاقیکرانەوە دێ؟ کەسێك کە چاکەی لەدەستبێ‌و خراپەشی لەدەستبێ، ئەویش تەنیا بەشەرە، بۆیەش مرۆڤ بەکەڵکی ئەوە هاتوە جێنشینی خوابێ لەسەر زەوی‌و، هەڵگری ئەمانەتی خوابێ، وە خوای بەرزو مەزن تاقی بکاتەوە، چونکە دەتوانێ چاکەو خراپە ئەنجام بدات‌و تەقواداریی بکاتە پیشە[1]، وە حیکمەتی ئەوە کە خوای کاربەجێ ئینسانی وا دروست کردوە چاکەو خراپەی لەدەستبێ، ئەوەیە کە خوا ویستوویەتی تاقی بکاتەوە، ئەگەر ئینسان نەتوانێ بەرزبێتەوە بەرەو لای خوا بە پەیژەی تەقوادا، وە نەتوانێ سەرەوژێر بێتەوە بە قاڵدرمەی گوناهو تاواندا، تاقی ناکرێتەوە، ئەوە حیکمەتەکەیە، چونکە هەندێ کەس دەپرسێ: باشە بۆچی خوا ئینسانی وا دروست نەدەکرد هەر چاکەی لەدەستبێ، بۆئەوەی کە تووشی دۆزەخ نەبووبایە؟ دەڵێین: ئەوکاتە ئەو ئینسانە نەدەبوو کە بەکەڵکی تاقیکرانەوەبێ‌و، بەکەڵکی جێنشینایەتیی خوابێ لەسەر زەوی‌و، بەکەڵکی ئەوەبێ کە ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، خوای پەروەردگار دروستکراوی دیکەی زۆرن، مەلائیکەی زۆرن، بۆیە بەندایەتیی‌و طاعەتی ڕەها، وەك دەفەرموێ: ﴿...لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۝٦﴾ التحريم، واتە: سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن‌و هەرچی پێیان

---

١) دیارە جند (جنّ)یش لەو ڕووەوە وەك مرۆڤ وان، بەلام تەنیا باسی مرۆڤ کراوە بۆ خەلیفایەتیی خوا لەسەر زەوی.

بگوترێ جێبەجێی دەكەن، خوای بەرز ئەو جۆرە دروستكراوەی زۆرن، وە جۆرە دروستكراوی دیكەشی زۆرن، كە نە گوناهیان لەدەست دێ، نە چاكە، ئەویش ماددەی بێ ژیانو ڕووەكو ئاژەڵو ئەوانەن، وە جۆرە دروستكراوی دیكەشی هەن، كە هەر خراپەیان لەدەست دێ، ئەوانیش شەیتانەكانن، بەڵام خوای كاربەجێ لەو نێوانەدا ویستوویەتی جۆرە كائینێك بخوڵقێنێ، چاكەشی لە دەستبێو خراپەشی لە دەستبێ، بتوانێ بەرزیش بێتەوە، نزمیش بێتەوە، ئەویش بەهۆی چییەوە؟ بەهۆی ئەو توانایییەی كە خوای بەخشەر پێیداوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾، جا لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ﴾، ئەوە خوای بە بەزەیی هۆشداریی دەداتە ئێمە، كە ئینسانەكان دەبێ ئاگایان لێبێ، چرووكیی و ڕژدیی وەك سیفەتێكی خراپ لە سروشتی ئینساندا هەیە، دەبێ ئینسان ئاگای لەخۆی بێ، ئەو سیفەتە خراپە زاڵ نەبێ بەسەر سیفەتە چاكەكەی بەرانبەریدا، چونكە خوای پەروەردگار وەك چۆن سیفەتی چرووكیی و ڕژدیی داناوە، سیفەتی سەخاوەتیشی داناوە، وە وەك چۆن ترسنۆكیی هەیە، ئازایەتییش هەیە، وەك چۆن سیفەتە خراپەكان هەن، سیفەتە باشەكانیش هەن.

ئنجا ئازایەتیی ئینسان لەوەدایە سیفەتە خراپەكانی كەم بكاتەوەو خۆیان لێ بێزار بكات، وە خۆی بە سیفەتە چاكەكان بڕازێنێتەوە، وەك ئەهلی تەصەووف دەڵێن: (التَخْلـيَةُ مِنَ الرَّذَائِلِ والتَحْلـيَةُ بالفَضَائِلِ)، واتە: خۆ بێزاركردن لە سیفەتە پەستەكانو، خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە پەسندەكان.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُحْسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾، وە ئەگەر چاكەكاریی بكەنو پارێزكاریی بكەن، بێگومان خوا بەوەی دەیكەن شارەزایە، لێرەدا خوای پەنهانزان باسی كێشەو

مشتومڕی نێوان ژنو مێردان دەکاتو، سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ دوو سیفەت: چاکەکارییو، پارێزکاریی، ئەم دوو سیفەتە لە قورئاندا زۆر پێکەوە هاتوون، بۆ وێنە لە کۆتایی سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانە دایە کە تەقوا دەکەن، وە لەگەڵ ئەوانە دایە کە چاکەکارن، لێرەدا خوای کاربەجێ (إِحْسَان)ی پێشخستوە، چونکە ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ژنو مێرد پێکەوە چاکەکاربن، نەك هەر کامێکیان بڵێ: من هەقی خۆم بە تەواویی دەوێ، با بە داد (عدل) بەیەکەوە مامەڵە نەکەن، بەڵکو بە چاکە (فضل) لەگەڵ یەکدیدا مامەڵە بکەن، با پێکەوە ئەهلی (فضل)یش بن، بەس ئەهلی (عدل) نەبن، (عدل) ئەوەیە هەر کەسە هەقی خۆی وەربگرێ، بەلاَم (فضل) ئەوەیە هەقی خۆشت بدەی بە بەرانبەرەکەت.

ئنجا ئایا بۆچی ئەو دوو سیفەتە لێرەدا هاتوون؟ چونکە لەڕاستییدا ئینسان ئەگەر لەنێوان خۆیو خوادا ﷻ ئەهلی تەقوا بوو، ئەوە لەگەڵ خەڵکیدا ئەهلی ئیحسان دەبێ، هەر کەسێك پارێزکار بێ لە مابەینی خۆیو خوادا، چاکەکاریش دەبێ لەنێوان خۆیو ئینسانەکاندا، جا چ ژنو مێردایەتیی بێ، چ بابو دایك لەگەڵ منداڵان، چ منداڵ لەگەڵ بابو دایك، چ دراوسێیەتی بێ، چ برادەرییو هاوەڵایەتیی بێ، لەگەڵ هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگادا، بۆیە (عەبدولقادری گەیلانیی)یش قسەیەکی زۆر جوانی هەیە لەوبارەوە دەڵێ: دین لە دوو وشەدا کورت دەبێتەوە، ئیسلام لە دوو وشە کورت دەبێتەوە: (صِدقٌ مَعَ الحَقَ، وخُلُقٌ مَعَ الخَلْقِ) واتە: ڕاستیی لەگەڵ خوا، چاکیی لەگەڵ خەڵك، ئەوەی لەگەڵ خوا ڕاست بێ، لەگەڵ خەڵکیش چاك دەبێ، هیچ گومانتان لەوەدا نەبێ، بۆیە کوردەواریی خۆشمان دەڵێ: (لەو کەسە بترسێ کە لە خوا ناترسێ) ئەوەی لە خوا ترساو هەقی خوای جێبەجێ کرد، هەقی خەڵکی خواش جێبەجێ دەکات.

**مەســـەلەی نۆیـــەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ﴾، ئــــەم مەســـەلەیە پێویـــستە هەڵوەســـتەیەكی باشـــی لەبەردەمـــدا بكـەین، چـونكە هەندێك لەوانەی كە ئیـشیان بریتیـە لـە چەواشـەكاریی‌و سەفسەتە ئـەم ڕستە قوڕئانییـەیان كردۆتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی كـە چـەند ژنیـی لـە ئیـسلامدا ڕەوانیە! واتە: ڕەوانیە ئینسان زیاتر لـە هاوسـەرێكی هەبـێ!! لـە حاڵێكـدا كە ڕەوابـوونی زیـاتر لـە هاوسـەرێك هـەتا چـوار، یەكێكـە لـە شـتە بـە ئاشـكرا زانراوەكـانی ئیـسلام، بـەڵام هـەندێك كـەس ئـەم ڕسـتە قوڕئـانییەیان كـە بەشێكـە لـە ئایـەتێك، كـردوە بـە بەڵـگە لەسـەر ئـەوەی كـە چـەند ژنیـی لـە ئیـسلامدا دروسـت نیـە، هـەڵـبەتە مـن زۆرجـار گوتوومـە: ئێمـە دەبـێ یـان چـەنـد ژنیـی حـەڵاڵی ئیـسلامەتیی هەڵبـژێرین، یـان دەبێ فرەژنیـی حـەڕامی غـەیری ئیـسلام هـەڵبژێـرین، ئیـسلام ڕێگـای داوە پیـاو زیـاتر لـە هاوسـەرێكی هـەبـێ، بـە مەرجێـك بتوانـێ دادگـەریی یـان لەنێوانـدا بكـات، وە لەخـۆی ڕاببینـێ لـە ڕووی دابینـكردنی مافەكانیـانەوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴿٣﴾ ﴾النـــــــساء، لــــە ئافرەتـــــانی دڵپەسـندتان دوو دوو، سـێ سـێ، چـوار چـوار، بێـنن، بەڵـێ ئەگـەر ئـەم یاسا ئیسـلامییە وەرنـەگرین، دەبێ پەنابـەرینە بـەر فرەژنیـی، واتـە: پیـاوێك بـۆی هـەبـێ لەگـەڵ زیـاتر لـە ئافرەتێكـدا جـووت بـێ، بەبـێ ڕەچـاوكردنی یاسـاو ڕێـسای شـەرعیی، وە لەڕاسـتییدا بـە دیلـی چـەند ژنیـی بریتیـە لـە فرەژنیـی، فرەژنیی لە ئیسلامدا نیـە، بۆیە وا دەڵێم، چونكە هەندێـك لـە عەلمانییەكـان بە چەند ژنیـی دەڵێـن: فرەژنیـی، نـا، فرەژنیـی واتـە: زۆر، بـەڵام (چـەند) بـۆ شـتێكە كە بژمێردرێ، لە ئیسلامدا ڕێی پیـاو دراوە ئەگەر لە توانـایدا هـەبووو دەیتـوانی دادگەربـێ، یـەك، دوو، سـێ، چـوار، لـە زمـانی كوردییـدا (چـەند) بـۆ شتێكە كە بژمێـردرێ، بەڵام (فـرە) بۆ شـتێكە كـە زۆربـێ، یەكـێك بـە یـەكێك

دەڵێ: زۆرت کتێب هێناون؟ دەڵێ: بەڵێ زۆرم هێناون، یان فرەم هێناون، واتە: ناژمێردرێن، بەڵام ئەگەر بژمێردرێ، دەڵێ: چەندن؟ یەك، دوو، سێ، چوار، جا ئایا ئەم ڕستە قورئانییە، ئەوە دەگەیەنێ کە لە ئیسلامدا چەند ژنیی قەدەغەیە؟ ئەوان دەڵێن: لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سورەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەگەر ترسان کە دادگەر نەبن لەگەڵ ئافرەتانی هەتیو (کچانی بێباب)دا، کە ئەگەر هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، لەگەڵیاندا دادگەر نەبن (لەبەرئەوەی بابیان نەماوە) لەوان گەڕێن و هاوسەرگیرییان لەگەڵ مەکەن، ئنجا ئایا (یتیم) بە کێ دەگوترێ؟ بە منداڵی نە باڵغ دەگوترێ کچ بێ، یان کوڕ کە بابی مردبێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَا يُتْمَ بَعْدَ احْتِلَامٍ﴾ أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٨٧٣) عَن عَلِيّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣١٨٠)، واتە: لە دوای باڵغبوون هەتیویی نامێنێ، کوڕ بێ یان کچ، ئەگەر باڵغ بوو بە هەتیو لەقەڵەم نادرێ، بەڵام پێش ئەوە بە هەتیو لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام خوای پەروەردگار بە ئیعتیباری پێش باڵغبوونیان، وشەی یەتیمیان بۆ بەکاردێنێ، جا دەفەرموێ: ئەگەر مەترسییتان هەبوو لەگەڵ کچانی کە بابیان نەماوەو کاتی خۆی هەتیو بوون، دادگەرنەبن، کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، لەوان گەڕێن ﴿ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ﴾، ئەو ئافرەتانەی کە پێتان پاك و چاکن و بە دڵتانن دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار، هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ

﴿ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ ﴾، ئنجا ئەگەر ترستان هەبوو دادگەر نەبن، لە كاتێكدا كە زیاتر لە هاوسەرێكتان هەبێ، ئەوە با بەس یەكێك بێ.

جا ئەو كەسانە دەڵێن: لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ: ئەگەر ترستان هەبوو كە دادگەر نەبن، با یەكێك بێ، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾، ئێوە بە مسۆگەریی ناتوانن لەنێوان ژنانتان دادگەریی بكەن، واتە: ئەگەر چەند ژنێكتان هەبێ دادگەریان لە نێواندا بكەن، هەرچەندە بشتانەوێ‌و سووریش بن هەر ناتوانن دادگەربن، لە ئایەتی ژمارە (٣)شدا هەر لە سوورەتی (النساء) دەفەرموێ: ئەگەر زانیتان دادگەرییتان بۆ ناكرێ با یەكێكتان هەبێ، كەواتە: ئەم دوو ئایەتە ئەوەیان لێ وەردەگیرێ كە چەند ژنیی لە ئیسلامدا ڕەوانیە، بەڵام ئێمە چەند بەڵگەیەك دێنینەوە، كە لەڕاستییدا ئەم جۆرە تێگەیشتنە لەم ئایەتە قورئانییەو، لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (النساء) هەڵەیە:

**یەكەم**: لێرەدا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِ ﴾، ئێوە ناتوانن دادگەربن لەنێوان ژناندا، هەرچەندە سووریش بن، بۆیە زۆر مەیل مەكەن‌و لارمەبنەوە بەلای یەكێكیاندا، كە ئەوەی دیكەیان وەك هەڵواسراو بەجێ بهێڵن، ئەم ڕستە قورئانییە كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ، ئەگەر ناتوانن دادگەریی بە تەواویی بكەن، ئەوە مەچن هیچ لە دادگەرییش ڕەچاو نەكەن، كەواتە: ئەوەی كە خوا دەفەرموێ: لە تواناتان دا نیە، جیایە لەوەی كە دەفەرموێ: لە تواناتان هەیەو دەبێ بیكەن، ئەوەی كە دەكرێ ئەو

دادگەرییەیە كە ئینسان لە بەرگو پۆشاكو لە جێگاو ڕێگاو، لە شەو لەلا مانەوەدا، مرۆڤ دەتوانێ لەوەدا، بەڵام ئەوەی كە ناتوانێ جێبەجێی بكات، مەسەلەی خۆشویستنە، كامیانت زیاتر بە دڵە، ئەوەیە كە خوای پەروەردگار لێرەدا دەفەرمویٰ: ناتوانن بە تەواویی دادگەربن، واتە: لە مەیلی دڵو خۆشویستن دا ناتوانن بە تەواویی دادگەرییان لەنێواندا بكەن، ئەوەی دیكە كە لە ئایەتەكەی دیكەدا دەفەرمویٰ: ﴿ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ ﴾، واتە: دادگەرییەك كە بۆتان دەگونجیٰ، كە بریتیە لە چی؟ بریتیە لەوەی جێگاو ڕێگایان بۆ دابین بكەی وەك یەك، نانو نەفەقەیان بكێشی وەك یەك، وە شەو لەلامانەوەیان وەك یەكبیٰ، كە ئەوانەش دیسان لە حاڵەتی ئاساییدا دەكرێنو، لە حاڵەتی نائاساییدا سەنگو سووكییان تێدا دەكریٰ، وەك پێشتر باسمان كرد.

**دووەم:** هەموو توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە دادگەریی بە مەرج گیراو، بریتیە لە دادگەریی لە شەو لەلامانەوەو بەرگو پۆشاك بۆ دابینكردنو نانو نەفەقەو جێگاو ڕێگا بۆ دابینكردن، بەڵام ئەوەی كە لە تواناندا نیە، بریتیە لە (مَيلُ القَلْبِ والجِماع)[1]، واتە: دڵ بەلا داچوونو سەرجێیكردنو جووت بوون، بۆ وێنە (الطَّبري) لە تەفسیری ئەم ڕستە قورئانییەدا كە دەفەرمویٰ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾، دەڵیٰ: (لَنْ تُطِيقوا، أَيُّها الرِّجَالُ، أَنْ تسوُّوا بَيْنَ نِسَائِكُمْ وَأزواجِكُمْ في حُبِّهِنَّ بِقلُوبِكُم حَتَّى تَعْدِلُوا بَيْنَهُنَّ في ذَلِكَ، لأنَّ ذَلِكَ مِمَّا لا تَمْلِكُونهُ، وَلَيْسَ إلَيْكُمْ)، واتە: ئەی پیاوەكان ! ناتوانن لە نێوان

---

١) بڕوانە: (التفسير الصحيح: موسوعة التفسير المسبور من التفسير بالمأثور)، إعداد: أ. د. حكمت بن بشير بن ياسين، ج: (٢)، ص: (٢٤٦)، كە گوتوویەتی: (أخرج الطبري وابن أبي حاتم بسنديهما الحسن، عن علي بن أبي طلحة عن ابن عباس، قال: يعني: في الحب والجماع).

ژنەکانتــانو هاوســەرەکانتاندا، لــە خۆشەویــستنیان بەدڵتانــدا دادگــەر بــن، ئەوەتان بۆ ناگونجێ، وە ئەوە لە توانـای ئێوەدا نیـە، کەواتـە: کـە دەفـەرموێ نـاتوانن دادگــەریی لــە نێـوان ژنــانتاندا بکــەن، واتــە لــە خۆشــویــستنتاندا بۆیــان، هەروەهــا هــەر (الطَّبري) لـە چـەند ڕێیــەکەوە لـە تەفـسیرەکەی خۆیـدا هێناویەتی کە مەبەست لە: ﴿ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، دەڵێ: (فـي الحُبِّ وَالجِمَاعِ)، واتـە: لـە خۆشـویـستنیانو لەگەڵ جووتـبوونیاندا، بۆیـە لە تەفسیـرەکەی خۆیـدا بـە ژمـارە: (١٠٥٥٣، ١٠٥٥٦، ١٠٥٥٧، ١٠٥٥٨) ئـەو دەقـەی هێناوە کە مەبەست لە دادگەریی لـە نێوانیـاندا بـوون، واتـە: دادگـەرییکـردن لــە خۆشویــستنیانو لەگــەڵ جووتـبوونیــاندا، هەروەهــا (القُـرطُبي) لــە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ ﴾، بــە تــەواویی بــەلای یەکــیاندا دایمەشــکێنن، ئایەتەکــە وا دەفـەرموێ، لــە تەفسیری ئـەوەدا گوتوویـەتی: (قَالَ مُجَاهِد: لا تَتَعَمَّدُوا الإِسَاءَةَ بَلْ الزَمُوا التَّسْوِيةَ فِي القَسْمِ وَالنَّفَقَـةِ؛ لأَنَّ هَـذَا مِمـا يُسْتَطَاع)[1]، واتــە: بــە ئەنقەســت خراپــەو ســتەم مەکــەن لــە یــەکێك لــە هاوســەرەکانتان، بــەڵکو یەکـسانییان لەنێوانــدا بکـەن، لـە شــەو لــەلا مانــەوە (قَسْمِ) وە لـە نــانو نەفەقـەدا، چـونکە ئـەوە لـەو جـۆرە دادگەرییەیـە کـە لـە توانــای ئینـساندا هەیەو ئینسان دەتوانـێ ئەنجامی بدا، کەواتە: ئەوەی کە بـە ئینـسـان دەکـرێ، ئــەو چــوار شـــتەیە: جێگـــاو ڕێگـــایان وەك یــەك بــۆ دابــین بکــات، نــانو نەفەقەیــان وەك یـــەك بـــێ، بـەرگـو پۆشــاکیان وەك یـــەك بـێ، شـەو لـەلا مانەوەیـان وەك یەك بـێ، وە ئەوەی کە بۆ ئینـسـان ناکـرێ، ئەوەیـە کـە وەك یــەك خۆشـیـبوێن، وەك یەك مەیلی جینسـیی بەلایـاندا بچـێ.

**سێــیەم:** لـەوبارەوە ئــەو فەرموودەیـــەی پێغـەمبــەر ﷺ هەیـە، کـە دایکمـان عائیشــە دەیگـێڕێتــەوە: ﴿عَنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَـتْ: كَـانَ رَسُولُ

---

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٥٧).

اَللَّـهِ ﷺ يَقْـسِمُ، فَيَعْـدِلُ، وَيَقُـولُ: اَللَّهُـمَّ هَـذَا قَـسْمِي فِيمَـا أَمْلِـكُ، فَلا تَلُـمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلا أَمْلِكُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٢٥١٥٤)، أَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢١٣٦)، وَابْـنُ مَاجَـهْ (١٩٧١)، قَـالَ الـشَيخ الألبـاني: ضَـعيف، لَكِـن الطَّرَفُ الأَوَّل مِنْـهُ حَـسَنٌ، وَقَـالَ شـعيب الأرنـؤوط: هَـذَا إِسـنَاد رجالُـهُ ثِقـات رجـالُ الـشَيْخين غَـير حمـاد بـن سـلمة، وعبـد الله بـن يزيـد وهـو رضـيع عائـشة، واتـه: دایکمـان عائیـشە هاوسـەری بـەڕێزی پێغەمبـەر ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە شـێوەیەکی دادگەرانـە کاتـەکانی خـۆی بەسـەر خێزانەکانیـدا دابـەش دەکـرد، (دیـارە نـانو نەفەقـەو جێگـاو ڕێگـای هـەموویان وەك یـەك بـووە) دوایـی دەیفـەرموو: خوایـە! ئـەوە دابەشـکردنی منە، وە ئەوەی تـۆ پێـت دەکـرێ، مـن پێـم نـاکرێ، جا لۆمـەم مەکە لەسـەر ئـەوە کـە تـۆ دەیتوانـیو مـن نایتـوانم واتـە: کـە یەکێکیـانی لـە یەکێکیـان خۆشـتر بوێ، ئەوە بەدەست خۆی نیـە، ئـەوەی بەدەسـت ئینـسانە لـەم چـوار شـتەدایە: جێگـاو ڕێگـا، نـانو نەفەقـە، بـەرگو پۆشـاك، شـەو لەلامانـەوە، ئەمـەش بەڵـگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە گوتمـان: مەبەسـت لـەو ئایەتـە کـە دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾، ناتوانن دادگـەریی بکـەن لـە نێـوان ژنانـدا، واتـە: دادگـەریی تـەواو، ئـەو دادگەرییـە تـەواوەش، مەبەسـت پێی مەیلی دڵـە، کە ئەوەش لەسـەر ئینـسـان فـەڕز نیـە، چونکـە لـە توانـای ئینـسـاندا نیـە، وە ئـەوەی کـە لـە ئایـەتی ژمـارە (٣)ی سـوورەتی (النساء)دا بە مەرج گـیراوە، ئەو دادگەرییەیە کە لە توانـای ئینـساندا هەیـە، لەو چوار بوارەدا کە باسـمکردن، واتە: ئەوەی کـە لـە توانـای ئینـساندا هەیـە، بە مەرج گیراوە، وە ئـەوەی کە لە توانـایدا نیـە، خـوا بـە مـەرجی نەگـرتووەو فـەڕزی نەکـردوە.

**چـوارەم:** دەڵـێین: لـە سـەردەمی ڕۆژگـاری پێغەمبـەرەوە ﷺ، هـەم هاوەڵـە بەڕێزەکـانو خەلیفـە ڕاشـیدەکان، وە پێـشەواو پیـاوچـاکان دوو دوو، سـێ سێ، چوار چـوار، هاوسـەریان بـووەو، ئنجـا ئەگـەر وابـێ ئـەم دوو ئایەتـە

ئـەوە بگەیـەنن كـە چـەند ژنیـی دروسـت نیـە، دەبـێ بڵـێین: ئـەو هـاوەڵو خەلیفـەو ئـەو زانـایانە هیـچیان لـەم ئایەتـە حـاڵی نـەبوون !! كـە ئەمـە شــتێكی بــێ مانایـە، چـونكە حاڵــەتی چـەند ژنیــی هــەر بـووە، لـەنێو ئۆممەتـی ئیسـلامدا.

دیــارە بــە تەئكــید هــەموو كەسێكــیش لــە توانایــدا نیــە نــە لــە ڕووی جەستەیی، نە لـە ڕووی نـانو نەفەقــە، نـە لە ڕووی توانــای ماددیی، نـە لە ڕووی حەوســەڵەی مەعنــەویی، كــە چــەند ژنێكــی هــەبن، هەیــە ژنێكــی بــۆ بەڕێوەناچێو تەحەممولـی ئـافرەتێكیش ناكـات، لـە ڕووی مەعنەوییـەوە: كـەم حەوسـەڵەیە، تەنگـە پرێـسكەیە، زوو تـووڕە دەبـێ، هەیـە یـەك ژنیـشی هەیـە تەڵاقــی دەدات، یـاخود لـێك جیــادەبنەوە، هـەروەك ژنـیش هەیـە هـەڵ ناكـات، بــەڵام هەشــە كـە باخــەڵ فەڕاحــەو بـار قووڵــەو دڵـی گــەورەیەو، دەتوانــێ لەگـەڵ سـێ چوار ئافرەتیش ئیدارە بكاتو، دادگەرییشـیان لەنێواندا بكـات، ئـەو دادگــەرییەی كــە لــە توانــای ئینــساندا هەیــە، كەواتــە: ئــەو فەرمودەیەیــەی پێغەمبەر ﷺ كـە دەفـەرموێ: ﴿ مَـنْ كَـانَـتْ لَـهُ اِمْرَأَتَـانِ، فَمَـالَ إِلَـى إِحْـدَاهُمَا، جَــاءَ يَــوْمَ اَلْقِيَامَــةِ وَشِــقُّهُ مَائِـلٌ﴾ أَخْرَجَــهُ أَحْمَـد برقــم: (١٠٠٩٢)، أَبُـو دَاوُدَ بــرقم: (٢١٣٣)، وَالتِّرمِــذِيُّ بــرقم: (١١٤١)، وَالنَّــسَائِيُّ (٣٩٤٢)، وَابْــنُ مَـاجَــهْ (١٩٦٩)، عَنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه، وَصَـحَّحَهُ الألبـاني فـي (صـحيح الجـامع) بـرقم: (٦٥١٥)، واتە: هەر كەسێك دوو ژنی هـەبن، وە بـە لای یەكێكـیاندا دابـشكێنـێ، ڕۆژی قیـامەت دێ لایـەكی خـوارە.

ئەم فەرموودەیـە مەبەسـت پێـی مـەیلی ڕواڵـەتییەو لادانــە لـە دادگــەریەك كــە فــەڕزە، واتــە: كـە وەك یـەك جێگــاو ڕێگــایان بـۆ دابـین نەكــات، هـەروەها نــانو نەفەقەو بـەرگو پۆشــاكو شـەو لەلامانـەوە، ئـەوە لـە لایـەك، لە لایـەكی دیكەشـــەوە حاڵــەتی صــوڵحو پێكهــاتنی ژنو مێــرد، ئــەوەش حاڵەتێكــی هەڵاوێردراوە، واتە: پیاوێـك دوو خێزانـی هـەن، سـێ خێزانـی هـەن، یەكێكـیان كەوتۆتــە تەمەنــەوە یـان نەخۆشــە، یـان لەبـەر هـەر هۆیــەك بـە مێردەكــەی

دەڵێ: تۆ زیاتر موراعاتی ئەو هەوێیەی دیکەم بکە قەیناکات، من لە بەشێك لە هەقی خۆم عەفووت دەکەم، بۆ وێنە: لە چەند شەوان شەوێك وەرە بۆ لای من، یان زیاتر نانو نەفەقەی ئەو بکێشە، یان زیاتر ڕووبدە بەو، مادام بە تەبایی بەینی ژنو مێردە بێ، ئەوەش دیسان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ نایگرێتەوە، وە کابرا گوناهبار نابێ، چونکە ئەو ئافرەتە بۆخۆی لە هەندێك لە مافەکانی خۆی چاوپۆشیی دەکاتو دەستبەرداریان دەبێ، بەبێ ئەوەی پیاوەکە زوڵمی لێ بکات، جا یان ئافرەتەکە بۆخۆی تەقدیری وەزعەکە دەکات، یان ڕەنگە پیاوەکە لە سەرەتاوە لەسەری بە مەرج گرتبێ گوتویەتی: ئافرەت من تۆ دێنم بەڵام ئاگادار بە! من ناتوانم وەك ئەوی دیکە مامەڵەت لەگەڵدا بکەم، تۆ دەبێ قەناعەت بکەی بەوەندەی کە من بۆم دەکرێ بۆ وێنە: لە مانگێك چەند شەوێك دەتوانم بێمە لات، لەبەر ئەوە من ئەهلی کەسابەتم، زیاتر لە لای خێزانەکەی دیکەم دەبم، یان منداڵم لێی هەیە، یان ماڵو مێوانەکەم لەوێیە، یاخود لە ڕووی نانو نەفەقەوە بۆ وێنە: من ناتوانم، تۆ دەبێ بۆخۆت لە ڕووی مادديیەوە دەستبارێکم لەگەڵدا بگری، مادام ئافرەتەکە لە هەندێك لە مافەکانی خۆی دەستبەرداربێو بێتە خوار، وە بە لێکتێگەیشتن بێ، دیسان ئەو کابرایە گوناهبار نیە، وەك پێشتر باسمان کردو لە هەردووك زانای ناودار: (الطَّبري) و (القُرطُبي)یەوە هێنامانو قسەی زانایانیان هێنابوو، ئنجا ئەمەش بەڕاستیی حیکمەتی شەریعەتی تێدا دەردەکەوێ، وە بەزەیی خوای پەروەردگار، کە نایەوێ خەڵك سەغڵەت بکات، چونکە جاری وایە هەندێك حاڵەتی تایبەت دێنە پێشێ وەك پێشتر باسمان کردن، بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە هاوسەرەکانی: سەودەی کچی زەمعە، کە تەمەنێکی زۆری هەبوو بە زاراوی ئێمە پیرە ژنێك بووەو تەمەنی لە سەرووی حەفتاساڵ بووە، ئەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من نۆرە شەوی خۆم دەدەمە عائیشە، وەك پێشتر دەقی فەرموودەکەمان هێنا، لەو حاڵەتەدا گوناهی تێدا نیە، لەبەرئەوەی بۆخۆی بە ئازادیی خۆیو بە ئیرادەی خۆی بێئەوەی

کە زەختو فشاری لەسەر بکرێ دەستبەرداری ئەو مافەی خۆی دەبێ، کەواتە: لێرەدا شەریعەت ڕێی فراوان کردوە، بۆ هەندێك حاڵەتی تایبەت کە کەسانێك پێویستییان پێی دەبێ.

**مەسەلەی دەیەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾، دوای ئەوە باسی ئەوە دەکات کە پیاوان ناتوانن دادگەریی پێویست دادگەریی تەواو لەنێوان ژنەکانیاندا ڕەچاو بکەن، واتە: دادگەرییەك کە خۆشویستنی نێو دڵیش بگرێتەوە، ئەوەیان بۆ ناکرێ، دوایی دەفەرموێ: وە ئەگەر چاکسازیی بکەن، وە پارێزکاریی بکەن، بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، هی پێشی باسی چاکەکاریی‌و پارێزکاریی کرد، ﴿وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ﴾، بەڵام ئەمەیان باسی چاکسازیی (پێکهاتن)و پارێزکاریی دەکات، ئنجا ئایا حیکمەتی ئەوە چییە؟! حیکمەت ئەوەیە کە چونکە ئەگەر ژن‌و مێرد مشتومڕیان بوو و تێکگیران، دیارە پێویستییان زیاتر بە تەقواو، پاشان چاکەکاریی (إحسان) هەیە، نەك هەر کامێکیان بۆلای خۆی ڕایکێشێ، بەڵکو پێکەوە چاکەکاریی بکەن‌و ئەهلی فەزڵ بن، بەڵام لێرەدا باسی دادگەریی پیاوێك کە چەند هاوسەرێکی هەن، دەکات، بۆیە لێرەدا چاکسازیی‌و ئیصلاح زیاتر پێویستە، وێڕای پارێزکاریی، پاشان لەبەرئەوەی ئەو حاڵەتانە ئینسان تێیاندا تووشی هەڵەو کەموکوڕیی دێ، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار بەزەیی‌و لێبووردنی خۆی خستۆتە ڕوو دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٢٩﴾، ئەگەر بە پێی توانا چاکسازیی بکەن، وە پارێزکاریی بکەن لەنێوانی خۆتان‌و خوادا پارێزکاریی بکەن، وە لەگەڵ خۆتاندا ئیصلاح‌و چاکساز بن، ئەوە بێگومان خوا لێبووردەیە بۆ هەڵەو کەموکوڕییەکانتان، وە بە بەزەیی یە لە بەرانبەر گوناهەکانتاندا، دیارە ئەو لێبوردنەی خوای لێبوردەو، ئەو

بەزەییەی خوای دادگەر، جاری وایە ڕوو لە پیاوەکە دەکات، ئەگەر خەتای بێ، وە جاری وایە ڕوو لە ژنەکە دەکات، وە جاری وایە ڕوو لە هەردووکیان دەکات، یاخود هەموویان بۆ وێنە: پیاوێك دوو سێ خێزانی هەن، ڕوو لە هەموویان دەکات، لە حاڵێکدا هەموویان دەستیان دەچێتە کەموکوڕیی و هەڵەو پەڵەو کرچو کاڵییەوە.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾، دوای ئەوەی کە ژنو مێرد پێکەوە تێکدەگیرێن، جا چ لە حاڵەتی هەوێدارییدا بێ، چ لە حاڵەتی ژنو مێردێك دا بێ، کاتێك کە تێکدەگیرێنو پێکەوە ناسازێنو ناگونجێن، دوای ئەوەی هەموو ڕێیەکان تەجرەبە دەکەن، هەر پێکەوە ناگونجێن، چارەسەر چییە؟ چارەسەر ئەوەیە لێك جیاببنەوە، نەك هەتا دەمرن هەر پێکەوە خەریکی شەڕە دەنووکەو گوریس پچڕکێنە بن، کە منداڵەکانیشیان زایە دەبنو خزمو خەڵکیشیان پێیانەوە خەفەتخان دەبن، چارە هەر ئەوەیە لێك بترازێن، مادام هەر پێکەوە نەگونجێن، وەك شاعیرێك دەڵێ:

پای پەتیم خاسەن جە پێڵاوی تەنگ
تەنیایم خاسەن جە یانەی وەجەنگ

دەڵێ: پێخواس بم باشترە لەوەی پێڵاوی تەنگم لەپێدا بێ، وە بە تەنێ بم باشترەو سەڵت بم، لەوەی ماڵێکم هەبێ پڕلە شەڕو هەرابێ، جا لێرەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ، ئەگەر لێکیش جیاببنەوە ﴿ يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ﴾، خوا لە بەخششو دەوڵەمەندیی فراوانی خۆی هەموو لایەك بێنیاز دەکات، پیاوەکە ئافرەتێکی دیکەی لەوی چاکتری دەست

دەکەوێ، هەروەها ژنەکەش پیاوێکی باشتر ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾، وە خوا فراوانی کاربەجێ یە، فراوانە واتە: زانیاری فراوانی هەیە، وە حیکمەتی فراوانی هەیە، ڕەحمەتی فراوانی هەیە، بەخششی فراوانی هەیە ... هتد، لێرەدا واقیع بینیی ئیسلام دەردەکەوێ، بۆ زانیارییتان لە نەصرانییەتدا دوای ئەوەی کە ژنو مێرد دەبنە قسمەتی یەکدی، دروست نیە لێك بترازێن، ئەگەر جەرگی یەکدیش ڕەش بکەن، تازە لێك جیابوونەوە نیە! بەڵام ئیسلام دینێکی واقیع بینە، هەرچەندە ئەوەش کە بە ناوی دینی نەصرانییەوەیە، قەناعەتم وایە کە ئەوە وەحی خوای پەروەردگار نەبووە، کە نابێ ژنو مێرد لێك جیاببنەوە، بەڵکو ئەوە دوای ئەوەی کە نەصرانییەکان دەستکارییان کردوە، ئەوە لە بەشە گۆڕاوەکەیەتی، ئەگەرنا ناگونجێت خوا کە کاربەجێ یە، بڵێ نەخێر ژنو مێرد، پێکەوە نەگونجێنو یەکدیش خەفەتخان بکەنو جەرگی یەکدیش ڕەش بکەن، دەبێ هەر پێکەوە بن، شتی وانیە!! چونکە ژنو مێردایەتیی بۆ ئەوەیە کە ئیستیفادە لە یەکدی بکەن، منداڵیان هەبێو پێکەوە ڕێك بنو هاوکاری یەکدی بن، بەڵام ئەگەر پێکەوە بوونە دوژمنو، هەمیشە شەڕوو دەعوایان بوو، جا ئەوە چ ژنو مێردایەتییەکە؟ لەبەرئەوە ئیسلام دەڵێ: با ئەو گرێبەستە هەڵبوەشێتەوە.

ئنجا بۆ زانیارییتان هەندێك لە نەصرانییەکانو ڕۆژئاواییەکان ڕەخنە لە ئیسلام دەگرنو دەڵێن: تەڵاقی تێدایە، بەڵێ ئیسلام تەڵاقی داناوە، بەڵام نەك بە یەك قۆناغ، بەڵکو لێك جیابوونەوەی بە سێ قۆناغ داناوەو پێش لێك جیابوونەوەش ئیسلام دایناوە، مێرد بە چەند قۆناغ هەوڵبدا کەموکوڕیی خێزانەکەی خۆی چارە بکات: ﴿ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ ﴿٣٤﴾ ﴾النساء، ئەو ژنانەی کە دەترسێن لێتان یاخیی بن، ئامۆژگارییان بکەن، دوایی سەرجێییان مەکەن، دوایی لێیان بدەن، دوای ئەوەش دەفەرموێ: با دوو حەکەم لە

تـەڕەفی ژنو پیـاو بـچن صـولْحو پێکـهاتنیان بـۆ بکـەن، - وە لـە ئایەتـەکانی پێـشوودا بـە درێـژیی قـسەمان لێـوەکرد - ئنجـا ئەگـەر ئـەو هـەوڵانە هـەموو بێئەنجام بوون، ئەوجار پیاو بۆی هەیە وەك قۆناغی یەکەم تەڵاقی بدا، ئنجـا دوایی بۆی هەیـە بیهێنێتـەوە، پـێش ئـەوەی عیـددەی بەسـەر بچـێ، وە بـۆی هەیە نەیهێنێتـەوە، وە کە عیددەی بەسەرچوو و نەیهێنایەوە مانای وایـە لێـك جیابوونەتـەوە، بەڵام دەتوانێ بە نیکاحێکی تـازە بیهێـنێتـەوە، هەروەهـا بـۆ تـەڵاقی دووەمیش، بـەڵام لـە تـەڵاقی سێیەمدا ئـەوە ئـەو کاتـە یەکجـاریی لێك دەترازێـن[1]، تەماشـا دەکەین ئیسـلام کۆمەڵێك قۆناغی دانـاون تاکـو ئـەو ژنو مێــردە لێـك دەتــرازێن، وە تەڵاقـیش لـە ئیـسـلامدا وەك گوتــراوە: (أَبْغَـضُ الْحَلَاَلِ إِلَـى اللَّهِ تَعَالَـى الطَّـلاَقُ) واتە: ناخۆشـتـرین حـەڵاڵ لە لای خـوا، یـان بوغـزێنراوترین حــەڵاڵ لـە لای خــوا، بریتیـە لـە تـەڵاق، واتـە: خـوا تەڵاقـی خۆشـناوێو پێی خۆش نیە، بەڵام ڕێگاشـی داوە، چ کاتێك؟ کاتێك بەدیلی تـەڵاق خراپـتربێ لە تـەڵاق، بەدیلـی جیـابوونەوە، بریتــی بــێ لــەوە کە هەمیـشە شـەڕو دەعوایـان بێو سەری یەکدی بکوڵنو جەرگی یەکدی ڕەش بکـەن، کە ئەوە بێگومان، بۆخۆشیانو منداڵەکانیشـیانو بۆ خزمانیشـیان، خراپـترە.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** خوای پەروەردگار دوای ئەوەی ئەو مەسـەلە شـەرعییانەی خسـتنەڕوو، ئنجا سێ جار لەسـەر یەك دەفەرمویّ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەو ڕستەیە سـێ جار دووبارە بۆتـەوە، کە واتاکەی ئاوایـە: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە موڵکی خوایە، ئـەوە ماناکـەیـەتی، ئنجـا ئایـا بۆچـی سـێ جـار دووبـارە بۆتــەوە؟ چونکــە جـاری یەکـەم دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾، ئنجا

---

١) بۆ درێـژەی ئەم بابەتو سـەرجەم بابەتەکانی دیکـەی پەیوەسـت بە ئافرەتو خێـزانەوە، سـەرنجی: (ئافرەتو خێـزان لە سـایەی شـەریعەت دا) بدە، بەرگی یەکەمو دووەم، چاپـی: (٢٠١٢).

دوای ئـەوە دەفـەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، ئـەو ژن‌و پیاوە کە لێـك جیـادەبنەوە، بـابزانن کـە خـوا هـەر کامێـکیان بێـنیـاز دەکـات لەوی دیکە لە بەخششی خۆی، بۆچی؟ چونکە ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هـەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویـدا هەیـە موڵـکی خوایـە، کەواتــە: خوایـەك خـاوەنی هەموو ئاسمانـەکان‌و زەوی بــێ، دەتوانــێ ژن‌و مێردێـك کـە لێــك جیابوونەتـەوە، لـێکدییان بێمنــەت بکــات‌و لێکدییــان بێـنیــاز بکــات‌و دەوڵەمەندیـان بکـات، ئەوە جاری یەکەم.

دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، واتـە: ئێمـە ئێـوەو ئـەوانی کـە پێـش ئێوە کـتێبیـان پێـدراوە، ئامۆژگـارییمان کــردوون، کـە پارێــز لـە خـوا بکـەن، هـەمووتان خـوا فـەرمانی پێـکـردوون کـە ئەهلـی تەقوابـن، دوایـی دەفـەرموێ: ﴿ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ ﴾، بــــەڵام ئەگـــــەر بێبـڕوابن، بێگومان هەرچی لـە ئاســمانەکان‌و لـە زەویـدا هەیـە هـی خوایـە، وە خــوا دەوڵەمەنــدی ستایــشکراوە، لێــرەدا بــۆ جــاری دووەم بۆچـی خــوا وا دەفەرمـوێ؟ بۆئـەوەی هــەموو کـەس بزانــێ کە وەختــێ بێــبڕوا دەبــێ، خـوا پەکـی نەکـەوتوە لەسـەر کـەس، کـە بێــبڕوا دەبــێ‌و ســپڵە دەبــێ بەرانبـەر بـە خـوا، بـۆ خـۆی زەرەر دەکـات، چونکـە هـیچ لـە موڵـکی خوا کــەم ناکاتـەوە، وە هیچ لە خاوەنداریێتـی خوا کەم ناکاتەوە.

ئنجا بۆ جاری سـێیەم لەبەرئەوەی لە کۆتاییەکەیدا کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، واتــە: وە بەســە کــە خــوا وەکیـل بــێ، (وەکــیل) واتــە: کـــار پێســـپێردراو دەڵــێ: فـلان کـەس فـلان کەســی کــردە وەکیلـی خـۆی، وەکیــل

کێیە؟ کەسێکە کە ئیشەکەی خۆت پێ سپاردوە، دەڵێی: تۆ وەکیلی منبە، ئەو ئیشەم لە جیاتی بکە، جا خوا دەفەرموێ: خوا بەسە کار پێ سپێردراو بێ، بۆچی؟ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، چونکە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە موڵکی خوایە، خوایەکی وا ئەگەر بیکەیە وەکیلی خۆت، مانای هەموو شتێك هی ویەو دەتوانێ زۆر چاك وەکالەتی تۆ بکات، وە سەرپەرشتیی کاروباری تۆ بکات.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾، دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی لەپێش ئێوەدا کتێبیان پێدرابوو، وە ئێوەشمان ڕاسپاردوەو ئامۆژگارییمان کردوون، کە پارێز لە خوا بکەن، ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ خوشكو برایانی خۆشەویست؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە تەقوا شتێکی ئەوەندە گەورەیە خوا ﷻ وەك چۆن ئۆممەتی ئیسلامی پێ ئامۆژگاریی کردوە، هەموو ئۆممەتانی دیکەی پێغەمبەرانی پێشێش (علیهم الصلاة والسلام) ئامۆژگاریی کراون لە لایەن خواوە کە ئەهلی تەقوا بن، تەقوا یانی: چی؟ زۆر جار پێناسەی تەقوامان کردوە، کورتترین پێناسە بۆ تەقوا ئەوەیە کە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (وَصَارَ التَّقوَى في اصطلاح الشَّرعِ: حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤثِم) واتە: تەقوا لە زاراوەی شەرعیی دا بریتیە لە خۆپاراستن لە هەر شتێك کە گوناهبارکەر بێ، لە هەر شتێك کە ئینسان گوناهبار بکات، خۆی لێ بپارێزێ ئەوە پارێزکارییە، پارێزکار کێیە؟ کەسێکە کە خۆی دەپارێزێ لە هەر شتێك کە سەربکێشێ بۆئەوە کە ئینسان گوناهبار بێ، ئینسان بەچی گوناهبار دەبێ؟ بە دوو جۆرە شت:

١- واجبەکانی خوا بچوێنێ.

٢- قەدەغەکانی خوا بشکێنێ.

کەواتــە: ئەگــەر ئــەو شــتانەی کــە خــوا فــەرزی کــردوون، بــەپێی توانــا جێبەجێیــان بکــەی‌و ئـەو شـتانەش کـە خـوا قەدەغـەی کـردوون، بـەپێی توانـا خۆیان لـێ بە دوور بگری، مانــای وایــە تـۆ پارێزکــاری‌و ئەهلـی تەقــوای، وە بە پێچەوانەوە: بە ئەندازەی ئەوەی کە تۆ قەدەغەکان دەشکێنی، وە بە ئەنـدازەی ئەوە کە واجبەکان دەچوێنی، مانای وایە تۆ تەقوات کزەو کەمبۆتـەوە.

**مەسـەلەی چواردەیـەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴾، ئــەوە بــۆ جــاری دووەمــە لــە سـوورەتی (النسـاء) خـوا بانگـی خەڵـك دەكـات، بانگـی مرۆڤـایەتیی دەكـات دەفەرموێ: ئەی خەڵکینـە! ئەگـەر خوا بیەوێ ئێـوە لادەبات‌و کەسانێکی دیکە دێنێ، وە خوا لەسەر ئەوە بەتوانـایە، خوا ﷻ یـەکی لەسـەر خەڵـك نەکـەوتوە، ئەگەر گەلی کورد ڕوو لە خـوا نەبـێ، خوا ئـەوان لادەبا گەلێکـی دیکە دێنـێ، ئەگەر گەلـی عـەرەب بـە چاکـیی دەسـت بـە دینــی خـواوە نەگـرن، ئـەوە خـوا لایــان دەبــات‌و گەلـێکــی دیکــە دێنــێ، وە هەروەهــا یــان ئــەم جیلــە لــە میللـەتێکی دیاریکـراو لە کـورد لە عـەرەب لـە تـورك لـە فارس لـە ئەفغـان لـە ئینگـلیز ... هتـد، ڕاسـت نەبــێ لەگــەڵ خــواداو ســاغ نــەبن لەگــەڵ دینـی خــواداو پێـوەی بەنـد نەبـن، لایانـدەبــات‌و جیلـێکی دیکە دێنـێ، خـوا یـەکی لەسەر کەس نەکەوتوە وەك دەڵێ: (بَيْنَ المغرب والعِشاء يَفْعَلُ اللَّه مَا يَشَآء) لەنێوانی شـێوان‌و خەوتنـاندا خوا ئـەوەی بیـەوێ دەیکـات، کــێ دەیگــوت ئـەو شـۆڕشــانەی کـە ئێـستا لـە وڵاتـانی عەرەبیـدا بـەرپابوون هـەر طـاغووتـەو دیکتاتۆرەو تـاوڵ ڕەشی خۆی دەپێچێتـەوەو بەرەو زبڵـدانی مێـژوو ! پێـموایـە ئەوە لە خەون‌و خەیاڵی کەسـدا نـەبوو؟ بـەڵام خــوا ئەگـەر فـەرمووی: ببــە، دەبــێ، کەواتــە: لــێرەدا ئــەوە هەڕەشــەیە کـە خــوا دەفـەرموێ: ﴿ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴾، ئەگـەر

خوا بیەوێ لاتاندەبات ئەی خەڵکینە! وە کەسانی دیکە دێنێ، وە خوا لەسەر ئەوە بەتوانایە، ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە لە سوورەتی (محمد) ئایەتی (٣٨)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن لە بەرنامەی خوا ئێوە دەگۆڕێ بە کەسانێکی دیکە (واتە: ئێوە لادەباو کەسانێکی دیکە دێنێ)، وە ئەوان وەکو ئێوە نابن، ئەو هەڕەشەیە وەختێ خۆی لە گەلی عەرەب کراوە، یاخود لە مسوڵمانانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، هەروەها وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (فاطر) وایە کە دەفەرموێ: ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خوا بیەوێ ئێوە لادەباو دروستکراوانێکی تازە دێنێ، واتە: خەڵکێکی دیکە دێنێ، وە ئەوەش لەسەر خوا قورس نیەو ئاسانە، کەواتە: ئەم ئایەتە چی لێ وەردەگیرێ؟ واتە: ئەی خەڵکینە! ئەی مسوڵمانینە! خۆتان باش بکەن، وە وامەکەن کە شایستەی ئەوەبن خوا گەسکێکتان لێبداو ڕاتانبماڵێ، (القرطبي) لە تەفسیری ئەم ئایەتە لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وفي الآية تَخويفٌ وتنبيهُ لِجَميعِ مَنْ كَانَتْ لَهُ ولايةٌ وإمارةٌ ورياسَةٌ فَلاَ يَعْدِلُ في رَعيَّتِهِ، أو كَانَ عَالِماً فَلاَ يَعْمَلُ بِعِلْمِهِ وَلا يَنْصَحُ النَّاسَ، أَنْ يُذهِبهُ وَيَأتِي بِغَيْرِهِ)[١]، واتە: لەم ئایەتەدا ترساندن هەیە، وە ئاگادارکردنەوە هەیە بۆ هەر کەسێك کە سەرپەرشتیارییەکی بەدەستەوە بێ و بەرپرسیارییەتێکی هەبێ، وە سەرۆکایەتییەکی بەدەستەوە هەبێ، بەڵام دادگەر نەبێ، یاخود زانایەك بێ، بەڵام ئیش بە زانستەکەی خۆی نەکاتو بۆ خەڵك دڵسۆز نەبێ، ئەوە خوا دەیترسێنێ، وە ئاگاداری دەکاتەوە کە لە نێوی بەرێ، وە کەسانێکی دیکە بێنێتە شوێنی.

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (٥)، ص: (٣٥٩).

**مەسەلەی پازدەیەم:** خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾، هەر کەسێك بەرهەمی دنیای دەوێ‌و پاداشتی دنیای دەوێ، ئەوە خوا ﷻ دەنگی هەموو کەس دەبیستێ، وە بینەری هەموو کەس‌و شتێکە کێ ئامانجی دنیایە؟ کێ ئامانجی قیامەتە؟ کێ ئامانجی دنیاو قیامەتە؟ ئامانجی دنیا بە ڕێیەکی شەرعییدا بۆئەوەی قیامەتی پێ وەدەست بێنێ، وە کێ تەنیا دنیا دەبینێ؟ وە کێش تەنیا قیامەت دەبینێ‌و وا دەزانێ کە دەگونجێ سەرفرازیی دوارۆژ بەدەست بێنێ، بێئەوەی کە لە دنیایەدا هیچ بکات !! خوای پەروەردگار دەنگی هەمووان دەبیستێ، وە هەموانیش دەبینێ، ئەم ئایەتەش وەك ئایەتی ژمارە (٢٠)ی سوورەتی (الشورى) وایە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْأَخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك بەرهەمی دوارۆژی دەوێ، لە بەرهەمەکە بۆی زیاد دەکەین، وە هەر کەسێك بەرهەمی دنیای دەوێ، لە بەرهەمی دنیا شتێکی دەدەینێ، بەڵام لە دوارۆژدا هیچ پشك‌و بەشی نیە، هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)دا خوای دادگەر ئەم ڕاستییە گەورەو گرنگە دەخاتەڕوو، کە خوا هەر کەسە بەپێی توانای خۆی، بەپێی هەوڵدانی خۆی شتی بۆ دەکات، چ عەودالی دنیا بێ، چ عەودالی قیامەت بێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْأَخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ﴾، خوای پەروەردگار لەم سێ ئایەتەدا ئەو حەقیقەتە مەزنە دەخاتەڕوو،

کە زۆرجار ئێمەی مسوڵمانان لێی بێئاگاین، وا دەزانین چونکە مسوڵمانین هەرچی بمانەوێ خوا بۆمان دەکات، وە کابرای کافر چونکە کافرە، خوا هیچ شتێکی بۆ ناکات! بەڵام خوا لێرەدا دەفەرموێ: نەخێر وانیە ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾، هەر کەسێك ژیانی بە پەلەی دنیای بوێ، ئەوە بۆ هەر کەسێك بمانەوێ، ئەو ئەندازەیەی دەمانەوێ، بۆی دەستەبەر دەکەین، کافر کە بۆ دنیا هەوڵدەدات، خوای گەورە بەپێی هەوڵدانەکەی خۆی ئەو ئامانجەی بۆ دێنێتە دی ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا﴾، دوایی لە دوارۆژدا چونکە مەبەستی قیامەت نەبووەو، بۆ خوا کاری نەکردوە، دۆزەخمان بۆ داناوەو دەخرێتە نێوی بە زەمکراویی‌و بە تێکشکاویی، ئەوە لەلایەك، ﴿وَمَنْ أَرَادَ ٱلْأَخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾، وە هەر کەسێکیش دوا ڕۆژی بوێ، وە هەوڵیشی بۆ بدا، ئەوە نیە هەر بە قسە بڵێ: بەهەشتم پێ خۆشەو حەزدەکەم بچم بۆ بەهەشتێ، ئاخر دەبێ کاری بەهەشتییانە بکەی‌و، دەبێ هەوڵی بۆ بدەی، یان پێمخۆشە لەو دنیایەدا دەوڵەمەند بم، باشە بەڵام دەبێ کارو کەسابەت بکەی‌و خۆت ماندوو بکەی، ئارەقەی نێوچەوان بڕێژی‌و شەونخوونیی بکەی، جا دەفەرموێ: کەسێك دوارۆژی بوێ‌و خۆشی بۆ ماندوو بکات‌و هەوڵیشی بۆ بدات، وە ئیمانداریش بێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا﴾، ئا ئەوانە هەوڵدانەکەیان سوپاس کراوە، خوا سوپاسیان دەکات لەسەری پاشان بۆ هەردووکیان دەفەرموێ: ﴿كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا﴾، هەموویان هاوکاریی دەکەین، ئەهلی دنیاو ئەهلی قیامەتیش، هەڵبەتە ئەهلی قیامەت بەو واتایە نا کە دنیا واز لێبێنن، بەڵکو ئەوانەی دنیا دەکەنە وەسیلە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی

خوا لە قیامەتدا، ئەگەرنا کەسێك دنیا وێڵ بکات، قیامەتیشی نابێ، بۆیە خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (البقرة)دا مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە دەڵێن: ﴿...رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ٢٠١﴾، واتە: پەروەردگارمان! لە دنیادا چاکەمان بە نسیب بکەو لە قیامەتیشدا چاکەمان بە نسیب بکە، کە ئەوەی لە دنیایدا کردەوەی باشی نەبێ، لە قیامەتیش هیچی نابێ، جا خوا دەفەرموێ: هەر کامێکیان هاوکاریی دەکەین، ئەهلی دنیاو ئەهلی دوارۆژ ﴿مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا﴾، لە بەخششی پەروەردگارت، وە بەخششی پەروەردگارت لە کەس قەدەغە نیە، بەڵکو هەر کەس بەپێی هەوڵی خۆیو بەپێی توانای خۆی خوای بەخشەر لە بەخششی خۆی بەهرەمەندی دەکات.

ئەمە وەك گوتم: ڕاستییەکی زۆر گەورەو گرنگەو ئەوە دەگەیەنێ، کە خوای کاربەجێ ئەم ژیانە دنیایەی لەسەر بنەمای کۆمەڵێك یاسا داناوە، هەر کەسێك بەپێی ئەو یاسایانە بجووڵێتەوە، بەرهەمێکی دەستگیر دەبێ، جا ئەگەر ڕوو لە خوا بێو بۆ خوا صوڵحاو بێ، ئەوە بەرهەمی دنیاو دوارۆژیشی دەبێ، ئەگەر تەنیا دنیاش ببینێ، تەنیا بەرهەمی دنیای دەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوە هەمووی بەپێی یاساکانی خوای دادگەرە، وە خوا زوڵم لە کەس ناکات، بۆ وێنە: کافرێك کە مەلە دەزانێو دەکەوێتە نێو ئاو، چونکە مەلە دەزانێ دەربازی دەبێ، بەڵام مسوڵمانێك کە مەلە نازانێ، ئایا دەبێ بڵێ: چونکە من مسوڵمانمو بۆ خوا صوڵحام، مەلەش نەزانم قەیناکات؟ نا، دەخنکێ، بۆچی؟ چونکە خوای کاربەجێ یاسای داناوە: کە چوویە نێو ئاو دەبێ مەلە بزانی، یان کافرێك خۆ ماندوو دەکاتو ئیش دەکاتو ڕەنج دەدا، بەرهەمی دێتە دەست، بەڵام مسوڵمانێك تەنبەڵ تەنبەڵ دادەنیشێتو هیچ ناکات، هیچی نایەتە دەست، چونکە خۆی ماندوو نەکردووە،

بەپێی یاسای خوا دەبێ خۆت ماندوو بکەی، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾النجم، واتە: ئینسان هیچی دەستگیر نابێ، مەگەر هەوڵبدات، بۆیە دەبێ تێکۆشێو ئینسان بە ئەندازەی ئەوە تێدەکۆشێو بەرهەمیشی دەستدەکەوێ، ئەوەش یاساو سوننەتی خوای پەروەردگارە، چونکە ئەگەر وانەبووایە کافرەکان بۆیان هەبوو لە دوارۆژدا بڵێن: خوایە! هەرچەندە خۆمان ماندوو کرد لە دنیایە، بەڵام هیچمان دەستگیر نەبووە، نەخێر، لە دنیایە خۆت ماندوو بکە، چ بە مەبەستی ڕازیکردنی خواو بەدەستهێنانی ژیانی بەهەشت، چ بە مەبەستی بە دەستهێنانی دنیا، خوای دادگەر کەس ڕەنج بە خەسار ناکات.

لە کۆتایی ئەم دەرسەدا نوکتەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە کە دیارە (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی (لطیفة)یەکی خۆشە دەربارەی ژنو مێردێك دەڵێ: (أن عِمْرَان بْنُ حَطَّان الخَارِجيِّ كان من أدمِّ بني آدَم ، وامرأتهُ مِنْ أجْمَلِهم، فَنَظَرَتْ إليهِ يَوْماً، ثُمَّ قَالَتْ: الْحَمْدُ للَّهِ، فَقَالَ: مَا لَكِ ؟ فَقَالَتْ: حَمَدْتُ اللَّهَ عَلَى أنِّي وإيَّاك مِنْ أهْلِ الجنَّة؛ لأنَّكَ رُزِقْتَ مِثْلِي، فَشَكَرْتَ، ورُزِقْتُ مِثْلَك؛ فَصَبَرْتُ، وقد وَعَد اللَّه بالجَنَّة الشَّاكرين والصَّابرين)[1]، واتە: عیمرانی کوڕی حەططانی خاریجیی (واتە: پیاوێك بووە لە خەواریج) پیاوێك بووە زۆر ڕەش پێست بووە، (یانی ڕەش پێستێکی زۆر تۆخ بووە)، وە خێزانێکیشی هەبووە زۆر جوان بووە، ڕۆژێ خێزانەکەی تەماشای مێردەکەی خۆی دەکات دوایی دەڵێ: (الحمد لله) ستایش بۆ خوا، کابرا لێی دەپرسێ: دەڵێ چییە، بۆچی سوپاسو ستایشی خوات کرد؟ دەڵێ: سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەوە منو تۆ هەردووکمان بەهەشتیین، دەڵێ: چۆن؟ دەڵێ: تۆ منت بەنسیب بووەو تۆ سوپاسی خوات کردوە، کە بۆخۆت هێندە ڕەشی ئافرەتێکی هێندە جوانت بە نسیب بووە، تۆ سوپاسی خوات کردووەو

١) الجامع لأحكام القُرآن، ج: (١)، ص: (٤٢٨).

شـوكرانەت كـردوە، منیـش كـە تـۆم بـە نـسـیب بـووە صـەبرم گرتـوە، خـواش موژدەی بەهەشتی بە سوپاسگوزاران‌و خۆڕاگـران داوە.

بەڕێـزان !

دیـارە ئێمـە لـەم دەرسـانـەمانـدا هـەوڵـدەدەین ئـەوەی كـە زیـاتر پەیوەنـدیی هەیە بە تەفسیرو لێكدانەوەی ئایەتـەكانەوە بهـێنین، وە منـیش هەوڵــدەدەم بــە شــێوەیەك ئایەتەكــان لێكـــدەمەوە، كـــە زۆربـــەی ئاســـتەكان لێیـــان بەهرەمەنـــدبن، ئەگـــەرنا بێگـــومان دەریـــای قـــووڵ‌و بـــێ بنـــی قورئـــان زۆر گەوهـەرو مـرواری تێـدا هـەن، كـە دیـارە بـە هـەزارانی وەك ئێمـەش هـەموویان دەرنایـەن، وە بەڕاسـتیی قورئـان زۆر نهـێنیی‌و شـتی سەرسوڕهێنەری تێدایـە، كـە هەتــا ڕۆژگــار بـەرەو پـێش بـچـێ، قورئـان نهێنییەكـانی خـۆی ئاشــكرا دەكــات، وەك خـوای پەروەردگــار دەفـەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾ فصلت، واتە: نیشانەكانی خۆمانیان لە ئاسۆیەكان‌و لـە خۆشیاندا بـۆ دەردەخـەین، تـاكو ڕاسـتیی قورئانیـان زیـاتر بـۆ دەربكـەوێ، بـەڵام وەك گوتـم: ئێمـە ئایەتـەكان لەقـەدەر ئـەوە كـە لـە ئاسـتی گـشتی دابـن تەفسیر دەكـەین، خـوای پەروەردگـار یارمـەتیمان بـدات كـە ڕاستییەكانی قورئـان هـەزم بكـەین، بـە عـەقڵ‌و بـە دڵ، وە كـاریان پـێ بكـەین، وە سەرەنجـام بـەو قورئانـە ئیـصلاح‌و چاكـسازیی بكـەین لـە كۆمەڵـگای خۆمانـدا، تـاكو خۆمـان‌و كۆمەڵگاكەمان بەختەوەری دنیاو سـەرفرازی قیـامەت بكـەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و یەکەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لەم دەرسـەدا (١٣) ئایەت دەتوێژینـەوەو تەفسیر دەکـەین، لـە ئایـەتی ژمـارە (١٣٥ تاکو ١٤٧)، سەرەتا بۆ جاری حەوتەم لەم سوورەتی (النساء)دا خوا ﷻ بـە نازنـاوی ئیمـان بـانگی مـسولمانان دەکـاتو دەفـەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، وە فەرمانیـان پـێ دەکـات کـە دادگـەربنو بـە تـەواویی دادگـەریی ڕەچاو بکـەن، وە لەبـەر خوا شایەدیی بدەن واتـە: شـایەدیی بۆ خەڵك یان لەسـەر خەڵـك، پاشـان بـۆ جـاری هەشـتـەم خـوا ﷻ لـەم سـوورەتەدا بـە ناوونیـشـانی ئیمـان مـسولمانانی دەدوێنـێ، وە فەرمانیـان پـێ دەکـات کـە ئیمـان بـە خـواو بـە پێغـەمبەری خـوا ﷺ، وە بـە قورئـان، وە بـە کتێبەکـانی پـێش قورئـان بێنـنو، بەوبۆنەیەشـەوە باسـی کـوفرو سـەرەنجامی شـوومی کـافران دەکـات، ئنجـا دێتـە سـەر باسـی مونافیقـەکانو خـستنەڕووی کۆمەڵـێك لـە سیفەتەکانیانو هەڵوێـستەکانیان، وە ئامۆژگـاریـی مـسولمانان دەکـات، کـە نەکـەونە ژێـر کـاریگەریی مونـافیقو دەغەڵەکان، وە پێیان هەڵنەخەڵەتێـن، وە سەرەنجـام بـۆ جاری نۆیـەمو کۆتـایی لەم سـوورەتەدا، بـە نازنـاوی ئیمان مـسولمانان دەدوێنـێو، ئاگاداریـان دەکاتـەوە لـە دۆسـتایەتیکردنی کـافران، وە لـە کۆتاییـدا ئـەو ڕاسـتییە ڕادەگـەیەنـێ کـە مونافیقـەکان لـە ژێـری ژێـرەوەی ئـاگری دۆزەخـدان، بێجگـە لەوانـەیان کـە دەگەڕێنـەوەو دینداریـیـەکی چاكو سـاغو ڕاست دەکەن، کە ئـەوان لـە بەهەشـت لەگەڵ بڕواداران دان، وە خوا پاداشـتی ئیمـانـداران دەداتـەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ
ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ
أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٣٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ
ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ
ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ
كُفۡرٗا لَّمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ سَبِيلَۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ
عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ
عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ﴿١٣٩﴾ وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ
ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓۚ
إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ٱلَّذِينَ
يَتَرَبَّصُونَ بِكُمۡ فَإِن كَانَ لَكُمۡ فَتۡحٞ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ وَإِن كَانَ لِلۡكَٰفِرِينَ
نَصِيبٞ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ وَنَمۡنَعۡكُم مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ
ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ
ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ
فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ

ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى
ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟
وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ
ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە تـەواویی دادگـەریی بـچەسپێنن، وە لەبـەر خوا شـایەدیی بـدەن، ئەگـەر لەسـەر خۆتـان یـان بـابو دایکـتان یـان نـزیکانیـشتان بـێ، ئەگـەر بابـای شـایەدیی لەبـارەوە دراو، دەوڵەمەنـد یـان هـەژاربێ، ئـەوە خـوا لێیـان لە پێشـترە (و بەلای هیچ کامیان دا دایمەشکێنن لەبەر هـەژاریی یـان لەبــەر دەوڵەمەندیی) ئنجا تاکو دادگـەربنو لانەدەن، شـوێنی ئارەزوو مەکـەون، وە ئەگـەر شـایەدیی یەکە بگۆڕنو لابدەن یان پشـتگوێی بخـەن، ئـەوە بێگومـان خـوا شـایەدی ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿١٣٥﴾ ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بـڕوا بێـنن بـە خـواو پێغەمبەرەکەیو ئەو کتێبـەی دایبەزاندۆتـە سەر پێغەمبەرەکەیو ئـەو کتێبانـەی کـە پێـشتر دایبەزانـدوون، وە هەرکەسـێك بێــبڕوابێ بــە خــواو فریــشتەکانیو پێغەمبــەرەکانیو ڕۆژی دوایــی، ئــەوە بــە گومڕاییــەکی دوور گــومڕا بــووە ﴿١٣٦﴾ بێگومـان ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو دوایـی بێــبڕوا بوونـەوە، پاشـان ئیمانیـان هێنـاوەو دوای بێـبڕوا بوونەوە، دوایی لە بێبڕوایـی یـان زیـاد کـردوە، ناگونجـێ، نـە خـوا لێیــان ببـووریو نـە هـیچ ڕێیەکیـشیان (بـۆ دەربـازبوون) پێـشـان بـدات ﴿١٣٧﴾ موژدە بدە بە مونافیقەکان کە ئازارێکـی بەئێـشیان بـۆ دانـراوە ﴿١٣٨﴾ ئەوانـەی کـە لە جیاتی ئیمانـداران کـافران دەکــەنە دۆستو پـشـتیوانیان، ئایا بالأدەستیی یـان

لـەلا دەخـوازن! بێگـومان بالادەسـتیی تێكـڕا هـی خوایـە ﴿١٣٩﴾ وە پێشـتر لـە كتێبـدا بۆتـان دابـەزێنراوە، كـە هـەر كـات بیسـتتان ئایەتـەكانی خـوا كوفریـان پێدەكراو گاڵتەیان پێدەكرا، ئـەوە (لـەو كۆڕو شوێنە) لەگەڵیان (لەگەڵ بێبڕواو دەغەڵان)دا دامەنیشن، هەتا دەچنـە نێو باسێكی دیكـەوە، ئەگەرنا ئێوەش وەك وان دەبـن (لـە گونـاهو حـوكم دا)، بێگومـان خـوا كۆكـەرەوەی تێكـڕای مونـافیق‌و كافرەكانـە لـە دۆزەخـدا ﴿١٤٠﴾ ئەوانـەی هەمیـشە لێتـان دەخـەفتێن‌و لـە بۆسـەی چاوەڕوانیی دان، جا ئەگەر لەلایەن خـواوە سـەركەوتنێكتان هـەبوو، پێتـان دەڵێن: ئەدی ئێمـەش لەگەڵتان نـەبووین! (كوا پـشك‌و بەشـمان؟) وە ئەگـەر كافرەكانیش بەشـێكیان (لـە دەستكـەوت) هـەبوو، پێیـان دەڵـێن: ئایـا ئێمـە دەسـتەڵاتمان بەسەرتاندا نەبوو، وە نەبووینـە پارێزەر لە بەرانبـەر بڕوادارانـدا (كوا بەشـمان؟) بێگومـان خـوا لـە ڕۆژی قیامەتـدا دادوەرییتـان لەنێوانـدا دەكـات، وە خـوا بـواری زاڵـبوونی كـافران بەسـەر بڕوادارانـدا نـادات ﴿١٤١﴾ بەڕاسـتیی مونافیقەكـان (بـە خەیاڵی خۆیـان) خوا فریـو دەدەن، بـەڵام هـەر ئـەو فریـودەری وانـە، وە كاتێـك بـۆ نوێژ هەڵدەستن بـە تەنبەڵـیی هەڵدەسـتن، ڕووپامـایی بـۆ خـەڵكی دەكـەن، وە بـە كەمییش نەبێ یادی خوا ناكەن ﴿١٤٢﴾ وە لـەو نێوانـەدا لەرەلـەریانە (بـە تـەواویی نە لەگەڵ ئەواندان‌و نە لەگـەڵ ئەوانیـش دان (واتـە: لەگـەڵ بـڕواداران‌و كـافران) هەركەسـێكیش خوا گومڕای بكات، هیچ چارەیەكـت بـۆی نـادۆزرێتـەوە ﴿١٤٣﴾ ئـەی ئەوانەی بڕواتان هێنـاوە! بێـبڕوایان لـە جیاتی بـڕواداران بـە دۆسـت مەگـرن، ئایا دەتانەوێ (بەو ڕەفتـارەتـان) بەڵگەیەكی ئاشكرای خوا لەسـەر خۆتـان پەیدابكـەن ﴿١٤٤﴾ بێگـومان مونافیقـەكان لـە پلـەی هـەرە ژێـرەوەی ئاگـردان، وە هـیچ یارمەتیـدەرێكـت بۆیـان چـنگ ناكـەوێ ﴿١٤٥﴾ جگـە لەوانـەی دەگـەڕێنەوەو چاكسـازیی دەكـەن‌و، توند دەسـت بە خواوە دەگـرن‌و، دینـداریی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ دەكەنـەوە، ئـا ئەوانـە (لـە دوارۆژدا) لەگـەڵ بڕوادارانـدان، وە بێگومـان خـوا

پاداشتێكی مەزن دەداتەوە بڕواداران ﴿١٤٦﴾ خوا چی لە ئازاردانتان دەكات، ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەنو بڕوابێنن؟! وە خوا سوپاسگوزاری زانایە﴿١٤٧﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(تَلْوُۥٓا۟ ): واتە: لابدەن، بگۆڕن، دەڵێ: (اللَّيُّ: الفَتْلُ، لَوَى الحَبْلَ، فَتَلَهُ وَلَوى برَأسِه: أمَالَهُ، وَلَوىَ لِسَانَهُ بِكَذَا كِنَايَةٌ عَنِ الكَذِب)، لە زمانی عەرەبی دا (لَيّ) بە مانای بادانو گرێدان دێ، ئەگەر شتێك بابدەی دەگوترێ: (لَوى الحَبْلَ) واتە پەتەكەی بادا، یان گرێیدا، (وَلَوى برَأسِه) واتە: سەری خواركردەوە (وَلَوىَ لِسَانَهُ بِكَذَا) مەبەستی پێ درۆكردنە.

(ٱلْعِزَّةَ ): واتە: باڵادەستییو زاڵبوون، ئەوە كە ئینسان حاڵەتێكی هەبێ خەڵك زەفەری پێ نەبا (العِزَّة: حَالَةٌ مَانِعَةٌ للإنسانِ مَنْ أنْ يُغْلَبَ ... أرضٌ عَزَاز: أي صَلْبَة) حاڵەتێكە كە هەر كەسێك هەیبێ رێ دەگرێ لەوەی كە خەڵك بەسەریدا زاڵ بێ، كەواتە (عِزَّة) واتە: باڵادەستییو هەیبەتو قوەت، وە لە زمانی عەرەبی دەگوترێ: (أرضٌ عَزَاز) واتە: زەوییەكی پتەو كە بە ئاسانیی هەڵنەكەنرێو پاچی تێنەچێ.

(وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا ): واتە: گاڵتەی پێ دەكرێ، (الهُزْءُ: مَزْحٌ في خِفْيَة، والإستِهْزاءُ: تَعاطِي الهُزُءِ)، (هُزْءُ) بریتیە لە گاڵتەكردنێكی پەنهان، وە (إستهزاء) بریتیە لە حاڵەتی گاڵتە پێكردن.

(يَتَرَبَّصُونَ ): واتە: لێتان لە بۆسەدان، لێتان لە چاوەڕوانیی دان، لێتان دەخەفتێن، (التَرَبّص: الإنتظارُ بالشَّيءِ، أمرٍ يَنتظر زَوَالَه أوْ حصُولَه) چاوەڕوانكردنی شتێك، كە ئەو شتە لابچێ یان بێتە دی دەگوترێ: (تَرَبَّصُ بالشَّيءِ).

(فَتۡحٌ ): (الفَـتْحُ: إِزَالَـة الإِغلاق والإِشكَال، والنـصرة والظفـر) بریتیـه لـەوە كـه گرێیـەك بكرێتـەوەو ئیـشكالێك لابـچێ، وە هـەروەها وشـەی (فَـتْح) بـۆ سـەركەوتنو زەفـەر پـێبردنیش بەكـاردێ.

(نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ ): واتـە: بەسـەرتاندا زاڵبـووین، (الحَـوذُ أن يَتبَـعَ الـسائِقُ حَـاذيَ البعيـر أي أدبـارَ فَخِـذَيهِ فَيُعَنِّـف في سَوْقِهِ)، (حَوذ) ئـەوەیـە كە كەسـێك ئاژەڵێك – لـێرەدا بـە مانـای حوشـتری بەكـارهێنـاوە، - حوشـتر لێدەخوڕێ، یـان گوێـدرێژێك، یـان وڵاخێـك لێدەخوڕێو بـە دوای بكـەوێو لـە پـشتییەوە نەقـیزەی لـێبدا، یاخـود دارێكـی لـێبدا بۆئـەوەی بـڕوا.

(يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ ): واتـە: ڕووپـامایی بـۆ خەڵـك دەكـەن، (راءاهُ مُـراءاةً ورِءاءً وَرِيـاءً: أراهُ أنـهُ مُتَّـصِفٌ بـالْخَيْرِ والـصَّلاحِ عَلَـى خِلاَفِ مَا هُوَ عَلَيْـهِ) كـه لـە زمـانی عەرەبیـدا دەڵـێ: (راءاهُ مُـراءاةً ورِءاءً وَرِيـاءً) هـەر سێ وشـەكە (مُراءاةً ورِءاءً وَرِيـاءً) واتـە: حاڵەتێكـی پێـشانی كەسـێكـدا لـە چاكەو لـە خێـر، كـە وای پێشـاندا وایـە، بـەڵام وانەبـێ، بـۆ وێنـە: كەسێكی درۆزن (حاشای مەجلـیس) پێـشانی بەرانبەرەكـەی بـدا كـە ڕاسـتگۆیە، كەسـێكی بـێ دیـن وا پێـشانی خەڵكەكـە بدا كـە بـە دینــە، كەسێكی ترسنۆك وا پێشـانی خەڵـكی بـدا كە ئــازایەو، وە هەروەهــا، ئـەوە پێــی دەگوتــرێ (ریــاءً) كەواتـە ڕیـاء بریتیـە لـەوەی كـە خێـرو چاكە پێـشانی خەڵـك بـدەی، بـەڵام وا نەبـێ بـۆ وێنـە: كەسـێك نوێـژێك بكـات زۆر بـە ملكـەچییەوە بیكـات، كـه لـە حەقیقەتیـشـدا ملكـەچ نەبــێ بـۆ خـوا، ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (ریـاء) یـان بڵــێ بەڕۆژوومـەو بـەڕۆژووش نەبــێ، ئـەوە پێـی دەگوتــرێ (ریــاء) یـان حەجــێ بكـات، بـەڵام مەبەسـتی پـێ ڕەزامەندیی خـوا نەبـێ، ئـەوە ڕیایە.

(مُّذَبۡذَبِينَ ): (الذَبْذَبَـةُ: التَحَرُّكُ والإضـطِرَاب وتَـردَّدَ الـشَّيءُ المُعَلَّـقُ فِي الـهَواءِ، تَحَـرَّكَ وَتَـردَّدَ) واتـە: دێـنو دەچـنو لەرەلـەر دەكـەن لـە (ذَبـذَبة)ەوە هـاتوە،

(ذَبـذَبة) واتـه: جـووڵاندو لەرەلــەر، یـان شـتێك كـه بـه هـەوا هەڵبواســرێو بێـتو بچێ، مونـافیقیش لـه نێوانی مـسوڵمانانو كافرانـدا دێـتو دەچێ، نـه ئەوەیـه بـه یەكجـاریی بـه لای مـسوڵمانانـدا بـچـێو ببێتـه ئیمانداڕێكـی ڕاسـت، نـه ئەوەیـه بـەلای كافرانـدا بـشكێتەوەو ئـەو ساختەیەی كـه لەگـەڵ مسوڵمانـان دەیكـات، وازی لـێ بێنـێ.

(فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ ): (الـدَّرْك أقـصى قَعْـر البَحـر) والـدَرَكُ: كالـدَّرج، للـهبُوط..)، (دَرْك) بریتیـه لـه بنـی بنـەوەی دەریـا، (والـدَرَكُ: كالـدَّرج، للهبُـوط)، (دَرَج) یـانی: پەیـژه بـۆ سـەركەوتنه، بـەڵام (دَرَك) قادرمەیـه بـۆ چوونه خـوار.

(وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ ): واتـه: تونـد دەسـتیان پێـوه بگـرن، (العَـصْمُ: الإمْـسَاكُ، والإعتصَام: الإستمساك)، (عَصم) واته: دەست پێگرتن، بـەڵام (الإعتصام) واته: توند دەسـت پێوەگـرتن.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەكـان

خـوای پـەروەردگار بـۆ جاری حەوتـەم لـەم سـوورەتی (النـساء)دا، ئیمانـداران دەدوێنـێ پێـشتر باسمـان كـرد، كـه لـەم سـوورەتەدا نۆجـار خـوا ﷻ بانگـی ئیمانـدارانی كردووەو فەرموویەتی: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، وە هــەر جارێكــیش خــوا فــەرموویێتی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دواندنەكەی فەرمانەو ڕێگرییە، دەفـەرموێ: ئـەوە بكـەن پێویـستەو، ئـەوە مەكـەن قەدەغەیـه، لـێرەدا دەفـەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دوای ئـەوەی كۆمەڵـێك یاسـا لە ئایەتەكانی پێشـێدا باسكران، دەربـارەی خێـزانو مـاڵو مـافی ئافرەتـانو مافـی هەتیـوانو، چۆنیەتـی هەڵـسوكەوتی ژنو مێـردو چارەسـەری كێـشەو

گرفتێك كە بۆیان دێتە پێشێ و ئەوانە، ئنجا بەگشتی خوا بانگی ئیمانداران دەكاتو دەفەرمویٚ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ﴾، بە دادگەریی هەڵسن، (قَامَ) واتە: پێی هەڵسا، (قَائِم) واتە: پێ هەڵساو، (قَوّامَ) یانی زۆر پێ هەڵساو ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ﴾ واتە: زۆر بە دادگەریی هەڵسن، زۆر دادگەریی بەڕێوەبەرن، نەچن بە نیوەچڵیی دادگەریی بكەن، بە تەواویی دادگەریی بكەن، جا دوایی ڕوونی دەكەینەوە لە مەسەلە گرنگەكاندا كە لێرەدا مەبەست لە هەڵسان بە دادگەریی بەڕێوەبردنی دادگەریی بە تەواویی یانی چی؟ ﴿كُونُواْ شُهَدَآءَ لِلَّهِ﴾، وە لەبەر خوا شایەدیی بدەن كاتێك بانگ دەكرێن، یاخود: كە ئاگاداری مەسەلەیەكن، شایەدیی بدەن، جا شایەدیی لەسەردراوەكە، چ زەرەری بێ، چ قازانجی بێ، چ خزم بێ، چ بێگانە، چ گەورە بێ چ، گچكە، چ هەژار بێ، چ دەوڵەمەند، وەك دەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾، با ئەو شایەدییدانە بە زەرەری خۆشتان بێ، ﴿أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾، یاخود با ئەو شایەدییدانە بە زەرەری باب و دایك و نزیكترین كەسیشتان بێ، ئەو نزیكە چ خزم بێ، چ دراوسێ بێ، چ ڕەفیق بێ، هەر كەسێك بێ، شایەدییەكت كە لە لایە، شایەدییەكی بە هەق بدە، ﴿إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا﴾، ئەو كەسە كە شایەدییەكەی بۆ دەدرێ، یان شایەدییەكەی لەسەر دەدرێ، واتە: شایەدیی لەبارەوە دراوەكە، بە زەرەری بێ، یان بە قازانجی بێ، دەوڵەمەند بێ، یان هەژار، ﴿فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا﴾، خوا لێیان لە پێشترە، نابێ بڵێی: فلان كەس لەبەرئەوەی هەژارە، با شایەدییەكی بۆ بدەم بە ناهەق، خوا بۆخۆی دەفەرمویٚ: شایەدیی بە هەق بدە، با زەرەری هەژارەكەش بێ، یان بڵێی لەبەرئەوەی دەوڵەمەندە، با موراعاتی بكەم، شایەدیی دەبێ بە هەق بدرێ ﴿فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ﴾، بە دوای ئارەزوو مەكەون، بۆئەوەی لانەدەن

﴿أَن تَعۡدِلُواْ﴾ یانی: (كَراهَةَ أَن تَعْدِلُوا) ئەگەر دەتانەوێ لانەدەن[1] لە ڕاستەڕێ، بە دوای ئارەزوو مەكەون (الـهوى)، واتە: ئارەزوو، سۆزو عاتیفە، كەسێك لەبەرئەوەی خزمایەتیی یان هاوەڵایەتییت لەگەڵی هەیە، بڵێی: با شایەدییەكی بە ناهەقی بۆ بدەم، نەخێر شایەدیی بە هەق بدەن، واتایەكی دیكەی: ﴿أَن تَعۡدِلُواْ﴾، واتە: (لأن تعدلوا) ئەگەر دەتانەوێ دادگەربن[2] بە دوای ئارەزوو مەكەون، بۆئەوەی شایەدیی بە هەق بدەن ﴿وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾، وە ئەگەر بیگۆڕن (شایەدییەكە) واتە: لای بدەن، یاخود پشتگوێی بخەن‌و هەر شایەدیی نەدەن، بێگومان خوا بەوەی كە دەیكەن شارەزایە كەواتە: ڕێك‌و ڕاست شایەدیی بدەن.

ئنجا بۆ جاری دووەم لەم دەرسەماندا‌و بۆ جاری هەشتەم لەم سووڕەتی (النساء)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُ﴾، ئیمان بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەكەی ﷺ كە (موحەممەدە) وە بەو كتێبەی كە ناردوویەتە سەر پێغەمبەرەكەی ﷺ كە ئەم قورئانەیە، وە بە هەرچی كتێبێك كە لەوەو پێش ناردوویەتە خوار، لە تەورات‌و ئینجیل‌و زەبوور‌و صوحوف‌و هەموو كتێبەكانی دیكە، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: جا ئیماندار ئەوە ئیمانی هێناوە، ئەدی چۆن خوا دەفەرموێ ئەی ئیماندارینە ئیمان بێنن؟! واتاكەی ئەوەیە كە ئیمانتان هێناوە، بەڵام لە ئیمانەكەتان زیاد بكەن، یاخود ئیمانتان هێناوە، لەسەری بەردەوام بن، یاخود

---

١) (تعدلوا) بەم لێكدانەوەیە لە (عدل: مال) لایدا، وەرگیراوە، نەك (عدل: أقسط) دادگەربوو، بڕوانە: مختار الصحاح، ص: (٣٦٨)، لفظ: ع د ل .

١) واتە: (تعدلوا) بەم لێكدانەوەیە بە مانای ( تقسطوا) هاتوە، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو.

ئیمانێکی بە کورتییتان هێناوە، بە درێژیی ئیمان بێنن، یاخود ئیمانێکی کەمتان هێناوە ئیمانی خۆتان کامڵ بکەن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾، وە هەر کەسێك بە خوا بێبڕوا بێو بە فریشتەکانیو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرەکانیو بە ڕۆژی دوایی ﴿ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾، بە هەرکام لەو پێنج پایانە بێبڕوا بێ، ئەوە بە گومڕاییەکی دوور گومڕا بووەو، زۆر لە ڕاستە ڕێ دوورکەوتۆتەوەو بە زەحمەت دێتەوە سەر ڕێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴾، بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، دوایی کافر بوونەتەوە، دوایی ئیمانیان هێناوەتەوە، دوایی کافر بوونەتەوە، دوایی لە کوفر زیادیان کردوە، ئا ئەوانە ناگونجێ خوا لێیان ببووری، وە ناگونجێ هیچ ڕێیەکیشیان پێشان بدا، لێرەدا ئەوە یانی چی؟ ئایا مانای وایە ئەگەر تۆبەش بکەن خوا لێیان نابووریٚ؟ نا، چونکە لێرەدا باسی تۆبەکردنی نەکردوە، دەفەرموێ: ئیمانیان هێناوە، دوایی کافر بوونەتەوە، دوایی ئیمانیان هێناوە، دوایی کافر بوونەتەوە، دوایی لە جیاتی ئیمانی بێننەوە، یان تۆبە بکەن، لە کوفر زیادیان کردووەو، بەردەوام هەر لە کوفر زیاد دەکەن، ئا ئەوانە ناگونجێ خوا لێیان ببورێ، چونکە ناگەڕێنەوە، واتە: لەبەر بەردەوامبوونیان لەسەر کوفر خوا لێیان نابووریٚ، نەك تۆبە بکەنو خوا تۆبەیان لێ وەرنەگرێ، خوا تۆبەی هەموو کەس وەردەگرێ.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی مونافیقەکانو دەفەرموێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، موژدە بدە بە مونافیقەکان کە سزاو ئازارێکی بەئێشیان بۆ دانراوە، دیارە پێشتر پێناسەی مونافیقمان کرد، (منافق) واتە: دوو ڕوو، دەغەڵ، ڕووێکی پێشانی کافران دەداتو دەڵێ لەگەڵ ئێوەم، ڕووێکی دیکەش

پێشانی مسوڵمانان دەداتو دەڵێ لەگەڵ ئێوەم، لەگەڵ هیچیشیان ڕاست ناكات، جا دەفەرموێ: ئەوانە موژدەیان پێ بدە كە ئازارێكی بەئێشیان بۆ دانراوە، دوایی پێناسەیان دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، لێرەدا تەنیا بە چەند هەڵوێستێكیان پێناسەیان دەكات، ئەگەرنا موونافیقەكان هەڵوێستو سیفەتی خراپیان زۆرن، زیاتر لە سەد (١٠٠) سیفەتیان لە قورئاندا باسكراوە، وەك من لە كتێبی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّهِ)دا ڕوونم كردۆتەوە[1]، بەڵام لێرەدا چەند هەڵوێستێكی زەقیان دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ئەوانەی كافرەكان لە جیاتی ئیمانداران بە دۆست دەگرنو، بە پشتیوانی خۆیانیان دەزاننو، كەینو بەینیان لەگەڵیاندا هەیەو پشتیان پێ دەبەستن ﴿ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ ﴾، ئایا عیززەتو باڵادەستیی لە لای كافرەكان دا وا دەكەنو، پێیانوایە بە هۆی ئەو دۆستایەتییەی كافرەكانەوە، عیززەتو باڵا دەستییان پێ دەبڕێ؟ ﴿ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾، بێگومان باڵا دەستییو عیززەتو هێز، هەمووی لە لای خوایە، ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴾، ئنجا خوای پەنهانزان دوای ئەوەی زەقترین سیفەتی موونافیقەكانی خستە ڕوو، كە بریتیە لەوەی لە جیاتی ئیمانداران، كەینو بەینیان لەگەڵ ئەهلی كوفردا هەیەو ئەهلی كوفریان خۆشدەوێو، ئەوان بە دۆست دەگرنو ئەوان بە پشتیوانی خۆیان دەزانن، ئنجا خوای پەروەردگار بۆمان ڕوون دەكاتەوە كە چۆن مامەڵە لەگەڵ موونافیقەكانداو لەگەڵ ئەهلی كوفرو نیفاقدا بكەین؟ دەفەرموێ:

---

١) لە بەرگی هەشتەمی ئەو كتێبەدا، سەدو حەوت (١٠٧) سیفەتی موونافیقانم لە قورئان هەڵهێنجاون .

بێگومان ئێوە لە کتێبدا بۆتان نێردراوەتە خوار (واتە: لە سوورەتی (الأنعام)دا کە دوایی ئایەتەکە دێنین) کە هەرکاتێك ئایەتەکانی خواتان بیست کوفریان پێ دەکرا، یان گاڵتەیان پێدەکرا، لەگەڵیان دامەنیشن، واتە: لەو کۆڕو مەجلیسەدا کە تێیدا گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا دەکرێ، وە کوفریان پێ دەکرێ، دامەنیشن، هەتاکو ئەو کۆڕو مەجلیسە دێنە نێو باس و خواسێکی دیکەوە، ئەگەرنا لەوێ دابنیشن و گوێ تەپ بکەن، یاخود پێبکەنن بەدەمیانەوە ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، ئەوە ئێوەش وەك وانن، واتە: لە گوناح و حوکمدا حوکمی ئەوانتان هەیە، ئەگەر بۆت پەرچ نادرێتەوە، دەتوانی هەڵسیو ئەو مەجلیسە بەجێبهێڵی، بەڵام لەوێ دابنیشیو بەدەمیانەوە پێبکەنی، یان بێدەنگ بی، ئەوە حوکمی وانت هەیە، بێگومان خوا کۆکەرەوەی مونافیقەکان و کافرەکانە بەتێکڕایی لە دۆزەخدا، هەموویان پێکەوە خڕدەکاتەوە کەواتە: ئێوە لە خۆتان وریابن، حوکمی ئەوانتان نەبێ، ئەگەرنا ئێوەش لەگەڵ وان لە دۆزەخدا کۆدەبنەوە، وەك چۆن لەو کۆڕو مەجلیسەدا کوفر بە ئایەتی خوا کراو، گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا کراو، ئێوەش بەشداربوون، لە کۆڕو مەجلیسی دۆزوخیش لەگەڵیاندا بەشدار دەبن، ئنجا خوای دادگەر زیاتر هەڵوێستی مونافیقەکان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾، مونافیقەکان ئەوانەن کە لێتان لە بۆسەی چاوەڕوانییدان، لێتان دەخەفتێن، ئەگەر لەلایەن خواوە سەرکەوتنێکتان هەبوو، پێتان دەڵێن: ئەدی ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ واتە: ئێمەش دەبێ پشك و بەشمان هەبێ، وە ئەگەر کافرەکان پشك و بەشێکیان پێبڕاو، دەستکەوتێکیان

هەبوو، واتە: ئەگەر بای مسوڵمانان بوو، منەت لەسەر مسوڵمانان دەكەن‌و دەڵێن: ئێمەش لەگەڵ ئێوە بووین، بەڵام ئەگەر بای كافران بووو كافران سەركەوتنێكیان بەدەست هێنابوو، منەت لەسەر وان دەكەن‌و دەڵێن: ئەدی كوا پشك‌و بەشی ئێمە؟! ﴿أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، ئایا ئێمە بەسەر ئێوەدا زاڵ نەبووین؟ وە نەبووینە رێگری ئیمانداران كە زەفەر بە ئێوە بەرن؟ واتە: ئێمە بووینە پەرچ‌و رێگر كە ئیمانداران نەتوانن بە ئێوە بوێرن، كەواتە: پشك‌و بەشی خۆمانمان دەوێ، ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾، بێگومان خوا لە رۆژی دواییدا دادوەرییتان لە نێوان دەكات، ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَـٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾، وە خوا هیچ رێگە نادات كافران دەسەڵاتیان بەسەر ئیمانداراندا هەبێ، یاخود بەڵگەیان لەسەریان هەبێ.

پاشان خوای بەرز كۆمەڵێك سیفەتی دیكەی مونافیقەكان دەخاتە روو بۆ ئەوەی مسوڵمانان باشیان بناسن، جا بۆ زانیارییتان: خوای زاناو كاربەجێ جگە لەوەی سوورەتێكی تایبەت لە قورئاندا بەناوی سوورەتی (المنافقون) هەیە، لە گەلێك شوێنانیش باسی مونافیقەكان دەكات‌و هەڵوێستەكانیان‌و كردەوەكانیان دەخاتە روو، تاكو مسوڵمانان بیانناسن، چونكە مونافیقەكان زۆر بە زەرەن‌و لە كافران خراپترن بۆ كۆمەڵگای ئیسلامیی، چونكە وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دار كرمی لە خۆی نەبێ تەمەنی هەزار ساڵە) یاخود دەڵێن: (تەور لەبەرئەوەی كلكی دارە، بۆیە داری پێ دەبڕێتەوە) لەراستیدا مونافیق‌و دەغەڵەكان خۆرگەی نێو كۆمەڵگەی ئیسلامیین، بۆیە خوا زۆر تیشكیان دەخاتە سەر، وە بە مسوڵمانانیان دەناسێنێ، لێرەدا هەر لە درێژەی خستنە رووی سیفەتەكانیاندا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، بێگومان مونافیقەكان دەیانەوێ خوا فریو بدەن؟ چۆن خوا فریو دەدەن بە خەیاڵی

خۆیان دەڵێن: خۆمان بە مسوڵمان پێشان دەدەینو واش نین، پێیانوایە بەوە خوا فریو دەدەن! بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ﴾، خوا هەڵخەڵەتێنەری ئەوانە، کە لێیان دەگەڕێ لە دنیایەدا وەك مسوڵمان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، بەڵام لە قیامەتێ بۆیان دەخاتە ڕوو، کە ئەو ئیمانە ڕووکەشو ڕواڵەتییەی کە هەیانبووە، هیچ نەبوو، وە ئەوە وەك بڵێی جۆرێکە لە کڵاو لەسەرنانو هەڵخەڵەتێنران، ئەوە سیفەتێکیان کە دەیانەوێ خوا فریو بدەن، لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾البقرة، واتە: دەیانەوێ خواو ئیمانداران فریو بدەن، بەڵام نە خوای زاناو ئاگاداریان بۆ فریو دەدرێ، نە ئیماندارانی بێدارو هۆشیار، وە سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾، کە بۆ نوێژی هەڵسان بە تەنبەڵیی هەڵدەستن، چونکە قەناعەتیان پێ نیە، کەسێك قەناعەتی بە شتێك نەبێ بە چالاکییو گورجو گۆڵیی ئەو شتەی بۆ ئەنجام نادرێ، جا نوێژە، قورئان خوێندنە، ڕۆژووگرتنە، جەنگو جیهادە، ماڵ بەخشینە، هەرچی هەیە، کەسێك ئیمانی بە شتێك نەبێ، ئەو شتەی بە قالب سووکییو بە گورجو گۆڵییو بە چالاکییو بە دڵ خۆشیی، بۆ ئەنجام نادرێ ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾، سیفەتێکی دیکەیان ئەوەیە کە ڕووپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، واتە: شتێك پێشانی خەڵك دەدەن کە نییانە، وا پێشانی خەڵك دەدەن کە زۆر مسوڵمانن، بەڵام وانین، وا پێشانی خەڵك دەدەن کە زۆر دڵسۆزن، بەڵام وانین ﴿وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾، بە کەمییش نەبێ، یادی خوا ناکەن، ئەو بە کەمیی یادی خوا کردنەش، بەشێکە لەو ڕیابازییو ڕووپامایییە کە دەیکەن، ئەگەر لەگەڵ مسوڵمانان بن، وەك چۆن ئەوان باسی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، ئەوانیش باسیان دەکەن، بۆئەوەی کەشف نەبن، ئەگەر نوێژیان کرد،

نوێـژێ دەکـەن، شـتێك هاتە پێشێ ئەوانیش بە ڕواڵـەت بەشداریی دەکەن، ئـەوە بریتیـە لەو کـەم یادی خوا کردنە، ئەگـەرنا نەك بڵـێی کەمێـك یادی خـوا دەکەن بە قەناعەتـەوە، ئـەو کەمـەش کە دەیکەن قەناعـەتیان پێی نیـە، بـەڵام ئـەو کـەم یـادی خـوا کردنـە، بـۆ هەڵخەڵەتانـدنو فریـودانی مـسوڵمانانە، دەڵـێن: ئێمـەش مـسوڵمانین، ئێمـەش بڕوامـان بـە خـوا هەیـەو، بڕوامـان بـە ئیـسلام هەیـە، نوێـژ دەکـەینو ڕۆژوو دەگریـن، ئێمـەش مـسوڵمانین بەڵـێ ئێمـە ئیـسلامیی نـینو ناڵـێین دەبـێ ئیـسلام دەسـتەڵاتی هـەبێو ئیـسلام حـاکم بـێو هـەموو شـتێك بگەڕێنینەوە بۆ ئیسلامو بۆ یاسـاکانی، بـەڵام ئێمـەش مـسوڵمانین، ئەوەیـە دەڵـێ: (شـەل نیـە بـەڵام پـای شـکاوە) بـڕوای بـەوە نیـە شـەریعەت حـاکم بـێ، بـەڵام مـسوڵمانە! بـڕوای بـەوە نیـە یاسـاکان هـەموویان لـە شـەریعەت هەڵبهێنجـرێن، یاخـود هـیچ یاسـایەك دەرنـەکرێ پێـچەوانەی شـەریعەت بـێ، بـەڵام هـەر مسوڵمانیـشە! بـڕوای بەوەنیـە کـە ئیـسلامییەکان خەڵـکی باشـن، بـەڵام مسوڵمانیشە! بڕوای بەوە نیـە کـە ئیـسلام تاکە بەرنامـەی ڕێگـای ڕاسـتی ژیانـە، بـەڵام مسوڵمانیـشە! جا ئەگـەر ئـەوە مونـافیق نـەبێ، چییـە؟!! ئەوەیـە دەڵـێ: (شـەل نیە بەڵام پـای شکاوە) کەسێك پای شکاوە مانای وایە لە شـەل خراپـترە، وە لەڕاسـتییدا کەسـێك بـڕوای بـەوە نـەبێ، کـە ئیـسلام بەرنامـەی ژیـان بـێو، شـەریعەتی خـوا سـایەو سـێبەر بـێو، یاسـاو دەسـتوورەکانی وڵات بـە شـێوەیەك دابنـرێن کـە لەگـەڵ نەگـۆڕەکانی شـەریعەتدا تێکـنەگیرێن، کەسـێك وانـەبێ مـسوڵمان نیـە، کەواتـە: کەسێك ئیددیعای مـسوڵمانەتیی کـرد، بـەو سـیفەتانەوە، ئەوە مونافیقـەو بۆ ڕیابازییو ڕووپامابییەتی، بەڵام لە دڵو دەروونـی خۆیـدا بـڕوای بـە ئیـسلام نیـە، کەواتـە: ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، لێمـان تێکـنەچێ، مەبەسـت ئـەوە نیـە کـە کـەمێك یـادی خـوای دەکـەن، بەڵـکو یـانی: بـە شـێوەیەکی ڕیـابازانە باسـی خـوا دەکەن، لە کاتێکدا کە ئەو باسـی خوا کردنـە پێویـست بـێ، بۆئەوەی کە خەڵك بە مرۆڤـی بـاشو مـسوڵمانیان لـێ حاڵـی بـێ.

ئنجا سیفەتێكی دیكەیان باس دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، لەو نێوانەدا لەرەلەریانە، شتێك هەڵبواسی بە هەواوە بێو بچێ، ئەو حاڵەتە پێی دەگوترێ: (تَـذَبـذُبْ) لەو نێوانەدا، واتە: لە نێوانی مسوڵمانانو كافراندا لەرەلەریانە، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، كە پێغەمبەر ﷺ وێنەی بۆ مونافیقەكان هێناوەتەوە، بە مەڕێكی سەرلێشێواو كە لە نێوانی دوو ڕانە مەڕ دایەو نازانێ بچێتە لای كامیان مونافیقەكانیش نە بەولادا دەچن نە بەولادا دەچن، واتە: نە بەلای مسوڵماناندا بەتەواویی دەشكێنەوە، كە خۆ بە مسوڵمان پێشان دەدەن، نە ئەوەیە بەلای مسوڵماناندا بە تەواویی خۆیان ساغ بكەنەوەو، نە ئەوەیە بەلای كافرانیشدا خۆیان ساغ بكەنەوە، وەك لە دڵەوە كافرن، ڕواڵەتەكەشیان كوفری تێدا ببینرێو، یەكجاریی ببنە كافرێكی زەقو كافرێكی بینراوو بەرهەست ﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴾، وە هەر كەسێك خوا ڕێی لێ تێكبدات، هیچ ڕێیەكت بۆی چنگ ناكەوێ، واتە: هیچ ڕێیەك كە لێی دەربازبێ، ئەوەی خوا ڕێی لێ تێكدا بە كێ هیدایەت دەدرێ؟ جا یەكێك ڕەنگە بڵێ: بۆچی خوا ڕێ لە خەڵكی تێكدەدات؟ چۆن خوا ڕێ لە خەڵكی تێكدەدات؟ چۆن خوا سەر لە خەڵكی دەشێوێنێ؟ بێگومان خوای دادگەر سەر لە كەس ناشێوێنێو لێرەدا مەبەست ئەوەیە، كە هەر كەسێك یاساو بڕیاری خوای لە هەقدا بێتەدی، گومڕا دەبێ، یاساو بڕیاری خواش ئەوەیە كە هەر كەسێك گومڕایی هەڵبژێرێ، خوا لێی دەگەڕێو، هەر كەسێكیش هیدایەت هەڵبژێرێ، خوا لێی گەڕاوە، خوا خەڵكی سەرپشك كردوە، بۆیە كاتێك كەسێك گومڕایی هەڵدەبژێرێ، مانای وایە یاساو بڕیاری خوای بەسەردا چەسپیوە، كە بواری پێبداتو، هەر كەسێكیش هیدایەتی هەڵبژارد، دیارە خوا پێی خۆشەو خۆشیدەوێ، ئەوەی كە بەرەو كوفر دەچێت، دیسان خوا لێی دەگەڕێ، هەڵبەتە خوا پێی ناخۆشە، بەڵام بێگومان بواری پێدەدات، دیارە ئەوەی گرنگە ئەوەیە خوای پەروەردگار

بــە زۆر کــەس هیدایــەت نــادات، وە بــە زۆر کــەس ســەرگەردان ناکــات، بۆیــە دەفــەرموێ: هــەر کەسـێك خـوا ڕێـی لـێ تێکـبدات، واتـە: بەپێـی بڕیـاری خـواو بەپێی ئیـرادەی خوا، ڕێ لە خـۆ تێکـبداو، یاسای خوا بیگرێتـەوەو بـە پێـی ئـەو یاسـایەی خـوا سـەرگەردان بـێ، ئـەوە تـۆ نـاتوانی هیـچی بـۆ بکـەی‌و، هـیچ ڕێیـەکـت بۆی چنگ ناکـەوێ.

پاشـان لـە جـاری سـێیەم لـەم دەرسـەداو، بـۆ جـاری نۆیـەم‌و کۆتـایی لـەم سووڕەتەدا، خوای بەرز بانگی ئیمانداران دەکاو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! کـافران لـە جیـاتی ئیمانـداران مەکـەن بەدۆسـت، مەیانکـەن بـە پـشتیوانی خۆتـان ﴿ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴾، ئایا حـەز دەکەن‌و دەتانـەوێ کـە بەڵـگەیەکی ڕوون‌و ئاشـکرای خـوا لەسـەر خۆتـان پەیدابکـەن؟ واتـە: هـەر کەسـێك ئەهلـی کـوفر بکـات بـە دۆسـت‌و پـشتیوانی خـۆی، ئـەوە بەڵـگەی خـوای هێناوەتەوە سەر خۆی، کە ئـەو ئینـسانە شایـستەی ئەوەیـە سـزا بـدرێ‌و ڕیـسوا بکـرێ.

ئنجا دێتـە سـەر باسـی سـەرەنجامی مونافیقەکـان‌و دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾، بێگومـان مونافیقـەکان لـە پلـەی خـوارەوەی ئاگـردان، لە ژێری ژێرەوەی ئاگری دۆزەخ دان، ﴿ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾، وە هـیچ یارمەتیـدەرێك‌و پشتیوانێکیـشت بـۆ ئـەوان چنـگ ناکـەوێ، لێـرەوە بۆمـان دەردەکەوێ کـە کـوفری نیفـاق خـراپترین جـۆری کوفرە، چونکـە خـوای دادگـەر مونافیقـەکان بـە شـێوەیەك سـزا دەدات کـە هـیچ کافرێـك وا سزا نـادات، لـە بنـی جەهەنەمـێ دایانـدەنـێ، مانـای وایـە کوفرەکەشـیان لـە هـەموو جـۆرە کوفرەکـان خراپـترەو، لە هەموو جـۆرە کوفرێك بـە زەڕتـرە، جا ئـەوە سزای مونافیقـەکانە،

بەڵام ئەدی ئەگەر یەكێك لە مونافیقەكان ویستی بگەڕێتەوە ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ ﴾، مەگەر ئەوانەی كە دەگەڕێنەوەو، چاكسازیی دەكەنو، توند دەست بە خوا دەگرن، وە دینداریی خۆیان بۆ خوا ساغ دەكەنەوە ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، ئا ئەوانە لەگەڵ ئیمانداران دان ﴿ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾، وە لەمەودوا خوا پاداشتی مەزن دەداتەوە بە ئیمانداران، تەماشا بكەن! خوای بە بەزەیی ڕێی گەڕانەوە بۆ مونافیقەكانیش دەكاتەوە، هەرچەندە هێندە خراپن بە خەیاڵی خۆیان فێڵ لە خوا دەكەن، كەچی خوای لێبوردەو بەخشندە بەزەیی بەوانیش دا دێتەوەو ڕێی بۆ ئەوانیش كردۆتەوە كە بگەڕێنەوە، بەڵام تۆبەی وان ئاسان نیەو چارەسەری دەردی وان ئاسان نیەو، دەردی سادە چارەسەری سادەی دەوێ، بەڵام دەردی ئاوێتە كە لە چەند جۆرە شتێك تێكەڵ بووبێ، چارەسەری ئاوێتەی دەوێ، بۆ وێنە: كابرا حوممەماڵتای بێو، گرانەتای بێو، مەلاریای بێو سێ چوار شتی لێ تێكەڵ بووبن، دەبێ دەرمانو چارەسەرەكەشی ئاوێتە بێو، لە یەك كاتدا دەرمانی گرانەتاو حوممەماڵتاو مەلاریاو ... هتدیش، بەكاربێنێ ئنجا چاك دەبێ، مونافیقەكانیش خوای پەروەردگار چوار مەرجی بۆ داناون بۆ گەڕانەوەیان:

١- بگەڕێنەوە.

٢- چاكسازیی بكەن، كە تا ئێستا خراپەیان كردوە.

٣- دەست بە خوا بگرن، كە تا ئێستا دەستیان بە كافران گرتوە.

٤- دینداریی خۆیان بۆ خوا ساغ بكەنەوە، كە تا ئێستا دیندارییەكی ڕووكەشییو ڕواڵەتییو بەخڵتەو خاڵیان كردوە، ئنجا ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، ئا ئەوانە كە وایانكرد دەچنە ڕیزی ئیماندارانەوەو

حیسابیان لەگەڵ ئیماندارانـدا دەبێ ﴿ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾، وە لەمەودواش خوا پاداشتی مەزن دەداتەوە بە ئیمانداران، ئەمە ئاماژەشە بەوەی مونافیقەكان لەگەڵ ئیماندارانـدا نین و بە ڕواڵەت لەگەڵیانن، بەڵام لە حەقیقەتداو لە حیسابی خوادا، مونافیق لەگەڵ ئیمانداران نیەو لە ئیمانداران جیایە، تەنیا وەختێك مونافیقان دەچنەوە نێو ئیمانداران، كە واز لە نیفاقەكەیان بێنن، وە ئەو چوار مەرجە لە خۆیاندا بێننە دی، ئەو چوار سیفەتە لە خۆیاندا بەرجەستە بكەن: گەڕانەوە، چاكسازیی، دەست بە خواوەگرتن، ساغ و یەكلابوونەوە.

لە كۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾، خوا ڕوو لە ئیمانداران دەكات، وە ڕوو لە مونافیقان دەكات، وە ڕوو لە خەڵكی دەكات بەگشتیی و دەفەرموێ: خوا چی داوە لە سزادانی ئێوەو چ ئامانجێك وەدی دێنێ، ئەگەر ئێوە ئازار بدات، لە كاتێكدا كە ئێوە سوپاسگوزارو ئیماندار بن، خوا چۆن سزاتان دەدات؟ چ ئیشی بە عەزابی ئێوەیە؟ تۆڵەتان لێ دەكاتەوە، ڕقی لێتان هەڵساوە؟ ڕقی لێ داگرتوون؟ بێگومان ئەو شتانە لە خوای پەروەردگار ناوەشێنەوە، ئەدی بۆچی خوا بەندەكانی سزا دەدات؟ دیارە لەبەر كردەوە خراپەكانی خۆیان، كردەوەكانی خۆیانن كە دەبنە مایەی سزادانیان، نەك خوای بەرزو مەزن ڕقی لێیان بێ، وە بیەوێ تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە، بەو واتایە كە وەك چۆن بەشەر بەرانبەر بە یەك بوغزو كینەیان هەیەو تۆڵە لە یەكدی وەردەگرنەوەو، داخی دڵی خۆیان بە یەكدی دەڕێژن، خواش وابێ! بەڵام نەخێر، خوای بێ وێنە زۆر لەوە بەرزترە كە ئاوابێ كەواتە: ئەوە كردەوەكانی خۆتانن واتان لێ دەكەن كە تووشی سزاو جەزرەبە ببن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ﴾، ئەگەر شوكرانە بژێربن و سوپاسگوزارو بە ئەمەك بن، وە ئەهلی

ئیمان بن، خوا چی لە سزادانی ئێوە داوە؟ كەواتە عەكسی شوكرو ئیمان لە خۆتاندا دێننە دی، بۆیە تووشی سزادان دەبن، عەكسی شوكریش كوفرانەو، عەكسی ئیمانیش كوفرە، ئێوە سپڵەن لە بەرانبەر خوادا، وە بێ ئیمانن، وە سپڵەیی‌و بێ ئیمانییە كە سەردەكێشێ بۆئەوەی تووشی سزاو جەزرەبەبن، بەلاّم ئەگەر ئەهلی ئیمان‌و شوكر بن، ئەوە خوا سزاتان نادات‌و هیچ ئیشی بە سزای ئێوە نییە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا﴾، وە بێگومان خوا سوپاسگوزاری زانایە واتە: هەر كەسێك چاكە بكات، خوا سوپاسی دەكات‌و پاداشتی دەداتەوە، وە زاناشە دەزانێ ئەو چاكەیە چۆنە وە ناخی بەندەكانیشی چۆنە، پێش ئەوەی ڕواڵەتیان ببینێ، ناخ‌و دڵ‌و دەروونیان دەبینێ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ»﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٨١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٨٩)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا تەماشای ڕەنگ‌و دیمەن‌و ماڵ‌و سامانتان ناكات، بەڵكو تەماشای دڵ‌و كردەوەكانتان دەكات، تەماشای دڵتان دەكات، كە جەوهەری ئینسان بریتیە لە دڵ‌و دەروون‌و ڕووحی، وە تەماشای كردەوەكانتان دەكات، كە لەڕاستییدا دڵ‌و دەروون‌و ڕووحی ئینسانەو ناخی ئینسانە، كە پاڵ بە ئینسانەوە دەنێ، كردەوەكانی ئەنجام بدات، چ چاك چ خراپ.

## چـەند مەسـەلەیـەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** کە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾، لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەوەی بانگی ئیمانـداران دەکات دەفەرموێ: زۆر بە دادگەریی هەڵسن، وەشایەدیی بـدەن بـۆ خـوا، ئەگـەر لەسەر خۆتان یان لەسەر بابو دایکتان، یاخود لەسـەر نـزیکانو خزمانیشی بێ، زۆر هەڵسان بە دادگەریی، واتە: وەك تاك تاکتـان دادگـەربن، کە قـسـە دەکـەن کـە حـوکم دەدەن، وە لـە مامەڵەکردنتانـدا دادگـەربن، هـەتا ئینـسان لەگـەڵ منداڵـەکانی خۆیـدا دەبـێ دادگەربـێ، دیارییـەك دەدەی بـە کوڕێکـت، بیـدە بـەوانی دیکـەش، دەیـدەیت بـە کـچێکت، بیـدە بـەوانی دیکـەش، هـەتا لەوەشـدا ئینسان دەبێ دادگەربێ، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی دیارییەکی دابوو بە یەکێك لە کوڕەکانی فەرمووی: ئایا داوتـە بە هەموو کوڕەکانت؟ واتە: دەبێ بیدەی بە هەموویان، ئنجا دادگەری، ئنجا کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ ﴾، واتــە: تــاك تاکتــان دادگــەربن، وەك کۆمەڵــگا دادگــەربن، وەك دەوڵــەتو دامودەزگایەکــانی دەبــێ دادگــەرانە لەگـەڵ هاوڵاتییــان دا ڕەفتــار بکەن، ئەمە ئەوەی لـێ وەردەگیرێ، کە ئێمەی مسـوڵمان دەسـتمان کراوەیـە بـۆ چەسـپاندنی دادگــەریی‌و هـەر میکانیزمێـك‌و هـەر شـێوازێك‌و هـەر ڕێبــازێك عەقڵی بەشەرو ئەزموونی بەشەر بەدەستی هێنابێ، بۆ چەسـپاندنی دادگەریی، ئێمـە بۆمـان هەیـە لـێی بەهرەمەنـد بـین‌و ڕەچـاوی بکـەین، بۆیـە زانایـانی ئیسـلام بنـچینەیەکی شـەرعییان دانـاوە دەڵێن: (أينَمَا وُجِـدَ العَدْلُ فَثَمَّ شَـرعُ

اللّه) واتە: دادگــەریی لـە هـەر جێیـەك بـێ شـەریعەتی خـوا لــەوێ یـە، یـانی: چۆن دادگــەریی بـچەسـپـێ، شـەرعی خـوا پێـی ڕازییـە، (إبـن القیـم الجوزیـة) هــەندێ قسەی زۆر جوان لەوبـارەوە دێنــێ، دەڵـێ: {فإذا ظهـرت أَمَـاراتُ العَـدْلِ وَأَسْـفَر وَجهـهُ بـأي طريـق كَـانَ فَـثم شَـرع اللّهِ ودينـهُ ... قَـدْ بَـيَّنَ سُـبْحَانَهُ وَتَعَالى بِمَا شَرَّعَهُ مِنْ الطُرُقِ أن مَقْصُودَهُ إقَامَةُ العَدْلِ بَيْنَ عِبَادِهِ وَقِيَامُ النَّاسِ بِالقِسْطِ، فَأَيّ طَرِيـقٍ اسـتُخْرِجَ بِهَـا العَـدْلُ وَالقِسْـطُ فَهِـيَ مِـنَ الـدّيـنِ لَيْـسَـتْ مُخَالَفَـةً لَهُ}[1]، واتـە: نیـشانەكانی دادگـەریی لـە هـەر شـوێنێك دەركـەوتن، وە لـە هەر شـوێنێك ڕووی دادگـەریی دەركەوتو ئاشــكرابوو بـە هـەر شـێوازێك لـە شێوازەكان بێ، ئەوە شەرعـی خواو دینـی خـوا لــەوێیە ... خـوای پـاكو بێگــەرد بەو ڕێبازانە كە داینـاون، لە شەریعەتی خۆیدا ڕوونـی كردۆتەوە كە مەبەســتو ئامـانجی لە نـاردنی شــەریعەت، بەرپاكــردنی دادگەرییــە لـەنێوان بەندەكـانیدا، وە ئەوەیە كە خەڵك بە دادگەریی بەرێوەبـچن، بۆیــە هــەر ڕێیــەك دادگــەریی پـێ بێتــە دی، ئەوە بەشـێكە لە دیـن، وە پێچەوانەی دیـن نیـە.

بـۆ وێنــــە: ئــەو هەڵبژاردنانــەی ئێــستا دەكــرێن، ڕێخــراوە مەدەنییــەكان، سەندیكای ڕۆژنامەنووسان، سەندیكای پزیشكان، سـەندیكای یاسـاناسـان ... هتـد، یەكــێتی مامۆســتایان، یەكــێتی قوتابیــان ... هــتد، هــەموو توێژەكـــان بـــا یەكێتیــان هەبـــێو، سـەندیكایان هـەبێ، بـۆ بەرگرییــكردنی ئـەو ڕێكخــراوو دەزگایــە لـەو توێــژە، ئایـا ئــەوە پێـچەوانەی شــەرعە؟ نـا، مـادام عــەدل ئــاوا بێتەدی، شەریعەتی خوا ئەو میكانیزمو شـێوازە بـە بەشــێك لـە خـۆی دەزانــێ، هــەر شــێوازو ڕێبــازێك خــەڵك لــێیەوە گەیــشتنە دادگــەرییو یەكــسانییو گەیشتنە ئەوەی كە مافو ئـازادیی بـۆ هــەموو لایـەك دابیــن بكرێ، ئـەوە هـیچ پێـچەوانەی شــەریعەتی خوانیــە، بەڵــكو زۆربــاش مـوافیقی شــەریعەتی خــوای دادگەرو كاربەجێیــە.

---

١) الطرق الحكمية في السِّياسَة الشَّرْعِيَّة، ص: (٢٣).

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا﴾، ئەگەر ئەو کەسەی شایەدییەکەی لەبارەوە دەدرێ، جا شایەدیی لەسەر بدرێ، یان بۆی بدرێ، چ ناهەقی بێو شایەدیی لەسەر بدرێ، وە چ هەقی بێو شایەدیی بۆ بدرێ، ئەو کەسەی شایەدیی لەبارەوە دەدرێ، دەوڵەمەند بێ، یان هەژار بێ ﴿فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا﴾، خوا لێیان نزیکترەو لێیان لەپێشترە، ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ، نابێ هیچ شتێك بکرێتە پاساوی جێبەجێنەکردنی دادگەریی و یەکسانیی، فلان کەس کە هەژارە، لە رێی دیکەوە هەژاریی و ئاتاجییەکەی بۆ چارەسەر بکرێ، نەك ناهەقی بۆ بکەی بە هەق، هەروەها دەوڵەمەند ئەگەر دەوڵەمەندییەکەی بە ناشەرعیی بەدەست هێناوە، لەرێی دیکەوە سزای بدە، نەك هەقەکەی لێبکەی بە ناهەق، لەبەرئەوەی دەوڵەمەندە، بەڵام ئەگەر هەقی خەڵکی کەوتۆتەلا، لێی وەربگرەوە لە رێی دیکەوە، جا لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ أَفَاءَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ خَيْبَرَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: فَأَقَرَّهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَمَا كَانُوا وَجَعَلَهَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ فَبَعَثَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ فَخَرَصَهَا عَلَيْهِمْ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ أَنْتُمْ أَبْغَضُ الْخَلْقِ إِلَيَّ قَتَلْتُمْ أَنْبِيَاءَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَكَذَبْتُمْ عَلَى اللَّهِ وَلَيْسَ يَحْمِلُنِي بُغْضِي إِيَّاكُمْ عَلَى أَنْ أَحِيفَ عَلَيْكُمْ قَدْ خَرَصْتُ عِشْرِينَ أَلْفَ وَسْقٍ مِنْ تَمْرٍ فَإِنْ شِئْتُمْ فَلَكُمْ وَإِنْ أَبَيْتُمْ فَلِي، فَقَالُوا: بِهَذَا قَامَتْ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ قَدْ أَخَذْنَا فَاخْرُجُوا عَنَّا﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٧) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده قَوي عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، واته: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: خوای پایە بەرزو مەزن خەیبەری کردە دەستکەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ (دوای ئەوە کە قەڵاکانی جوولەکەکان گیران لە خەیبەرو باغو بێستانەکانی کەوتنە دەستی مسوڵمانان)، پێغەمبەری خوا ﷺ جوولەکەکانی لەسەر موڵك‌و سامانەکانی

خۆیان هێشتەوە، وە ئەو زەوی‌و باغی دارخورماو ئەوانەی کردە موڵکێك لەمابەینی خۆی‌و ئەواندا (فەرمووی: لەسەریان بن سالآنە، ئەوەندەمان خەراج بدەنێ، بەلاّم با باغەکان بەدەست خۆتانەوەبن، خۆتان ڕەنێویان بێنن) وە عەبدوڵلاّی کوڕی ڕەواحەی نارد بۆی مەزەندە (خَرَص) کردن‌و قەبلآندی کە چەندیان دەکەوێ، دوایی پێی گوتن: ئەی کۆمەڵی جوولەکان! ئێوە بوغزێنراوترین خەڵکی خوان لەلای من (واتە: لە هەموو کەس زیاتر ڕقم لێتان هەڵدەستێ) چونکە پێغەمبەرانی خواتان کوشتوون‌و درۆتان بە ناوی خواوە کردوە، بەلاّم ڕق هەڵسانم لە ئێوە وام لێ ناکات کە زوڵمتان لێبکەم، ئەوە من سالآنە بیست هەزار (٢٠٠٠٠) ویسق خورمام لەسەر داناون {دیارە ویسق ئەندازەیەکە لە کتێبە فیقهەکاندا بە تەفصیل باسکراوە} ئەگەر پێتان خۆشە باباغەکان بەدەست ئێوە بن‌و، ئێوە بیست هەزار ویسق بدەن بە ئێمە، ئەگەر پێشتان ناخۆشە با باغەکان بەدەست ئێمەوە بن، ئێمە بیست هەزار ویسقتان دەدەینێ، ئەوانیش گوتیان: ئەرزو ئاسمان ڕاوەستاون بەو دادگەرییە، {تۆ هەرچەندە ڕقت لێمان هەڵدەستێ، بەلاّم ئامادە نی زوڵممان لێبکەی، وە ئێمە سەرپشك دەکەی باغەکان بەدەست ئێمەوە بن‌و ئێمە ئەوە بدەین، بە ئێوە یاخود بەدەست ئێوەوە بن‌و ئێوە ئەو ئەندازەیە بدەن بە ئێمە} ئەوە ڕازی بووین کە بە دەست ئێمەوەبن، وە سالآنە ئەوەندەتان دەدەینێ ئێوە بڕۆن، (واتە: ولآتەکەمان بەجێ بێڵن‌و ئەوە ڕێککەوتین)، کەواتە: نەك فەقیرو دەوڵەمەند، ئەگەر جوولەکەش بن، تۆ چۆن هەقە دەبێ وا ڕەفتار بکەی.

<u>مەسەلەی سێیەم</u>: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟﴾، بە دوای ئارەزوو مەکەون، بۆئەوەی لانەدەن، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی ئەگەر دەتانەوێ دادگەربن، بە دوای ئارەزوو مەکەون، دیارە مانای یەکەمیان کاتێك دەبێ کە بڵێی: وشەی (تَعدِلوا) بە مانای (تمیلوا: تنحرفوا) {لابدەن}ە، ئەوکاتەش ڕستەکە ئاوای لێدێ: (فَلا تَتَّبعوا الهوى - كَرَاهة -

أن تَعدلِوا) واتە: وشەی (كَرَاهَـةَ)ی تێدا تەقدیر دەكەی، واتە: ئەگەر دەتانەوێ تووشی لادان نەبن، ئەوە بە دوای ئارەزوو مەكەون، یاخود (تَعدلِوا) بە مانای (تَمِلیوا) {لابدەن} نیەو هەر بەمانای دادگەرییە، واتە: ئەگەر دەتانەوێ دادگەربن، بەدوای ئارەزوو مەكەون، واتە: ڕستەكە ئاوای لێدێ: (فَلاتَتَّبعوا الهوى - إن أردتُم - أن تَعدلِوا) وە ڕستەی (إن أردتُم)ی تێدا تەقدیر دەكرێ، چونكە (عَدل) هەم بە مانای دادگەریی دێ، هەم بە مانای لادانیش دێ (عَـدَلَ) واتە: لایدا، وە (عَدَلَ) بە مانای دادگەریی كرد، لێرەدا ئەمە وەردەگیرێ، كە لەڕاستییدا ئەوەی وا لە خەڵكی دەكات لابداو تووشی لادان ببێ لە جادەی دادگەریی، بریتییە لە شوێنكەوتنی ئارەزوو، شوێنكەوتنی هەستو سۆز، وە ئەگەر ئینسان بە حوكمی عەقڵ ڕەفتار بكات، لانادا، لەوبارەشەوە لە ئایەتی ژمارە (٢٦)ی سووڕەتی (ص)دا خوای پەروەردگار دەربارەی داوود پێغەمبەر ﷺ كە دەیدوێنێ، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان كردۆتە جێنشین لەسەر زەوی، جا لەنێوان خەڵكیدا بە هەق دادوەریی بكە، وە بە دوای ئارەزووو هەستو سۆز مەكەوە، ئەگەرنا لە ڕێی خوا لات دەدا، كەواتە: ئەم ئایەتە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ كە هەموو ئەوانەی لادەدەن لە هەقو دادگەریی بە هۆی ئەوەوەیە كە بە دوای سۆزو هەواو ئارەزوو دەكەون، كابرا خزمیەتی بەلایدا دادەشكێنێ، یان ڕقی لێ هەڵدەستێ، هەقەكەی لێ دەخوا، یان بەهۆی دەمارگیریی مەزهەبیی‌و دەمارگیریی دینیی‌و دەمارگیریی نەتەوەیی‌و، دەمارگیریی خزمایەتیی، هەموو ئەو شتانەن كەوا لە حوكمڕانەكان‌و لە دادوەرەكان دەكەن تووشی لادان‌و ترازان ببن، كەواتە: هەر كەسێك بیەوێ لانەدا، دەبێ ئاگاداری خۆی بێ بە دوای ئارەزوو

نەكــەوێ، بـەڵكو چــاودێریی خـوای پـەروەردگار بەسـەر خۆیــەوە ببینــێ، وە ڕاستــە شەقامی خوای دادگـەر بگــرێو بـەری نـەدا.

**مەســەلەی چــوارەم:** دوای ئـەوەی خـوا باســی ئـەوەی كـرد كـە ئیمانـداران دەبـێ زۆربــاش دادگــەریی بەڕێــوەبەرن، وە شــایەدییش بــە هــەق بـدەن، ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾، ئینسان لـە شـایەدیی دانـدا دوو حـاڵەتی هـەن: ئەگـەر شـایەدیی بـە هـەق بـدات، ئـەوە ئـەركێكی گرنگی سـەرشانی ئەنجامـداوە، بـەڵام ئەگـەر شـایەدیی بەهـەق نـەدا، دوو حاڵـەتی لادانـی هـەن: یـان ئـەوەتا شایەدییەكە بگۆڕێ وەك فەرموویـەتی: ﴿وَإِن تَلْوُۥٓا۟﴾، (لَـوى یَلـوي) واتــە: (حَـرَّفَ) (یُحَـرِّفُ) ئەگـەر شــایەدییەكە بەجۆرێـك بـێو، بـە جۆرێكـی دیكـە شــایەدیی بــدات، یەكێــك هـەقی لەسـەر ئـەوی دیكـەیە، تـۆ عەكـسی بكەیـەوە بڵـێی: ئـەویان هـەقی لەسـەر وی هەیـە، یاخـود دوو هـەزار دۆلاری لەسـەر تۆ بـوو، بڵـێی نەخێر هەزار بوو، شایەدییەكە بە هەر شێوەیەك لـە شێوەكان بگۆڕێ، ﴿أَوْ تُعْرِضُوا۟﴾، یـان شـایەدییەكە هـەر نـەدەی، ئاگـات لـێبێ، بەڵام شـایەدیی نــەدەی، تـاكو ئـەوەی كـە شـایەدییەكەی لەسەر دەدرێو زەرەریـەتی لۆمـەت نەكات، بێی شایەدییەكە بشاریەوە، جا خـوا دەفــەرموێ: لــە هــەردوو حاڵەتەكانــدا ﴿وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟﴾، واتــە: شــایەدییەكە بگــۆڕنو بایـدەن، یـاخود پـشتـگوێی بخــەنو وازی لــێ بێـننو شایەدیی نەدەن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾، ئەوە بێگومان خوا بـەوەی كـە دەیكــەن شـارەزایە، خــوای زانــاو شـارەزا بـە زۆریـی سـیفەتی شــارەزا بـۆ شــەخـصەكانو كردەوەكـان بەكاردێنــێ، بـەڵام سـیفەتی زانیـاری بـۆ شـتـەكان بەكاردێنـــێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾﴾ النـــساء، واتــە: بێگومـان خــوا بـە هــەموو شــتێك زانایـە، بـەڵام بـۆ شەخـصەكان دەفـەرموێ:

﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٢٣٤﴾ البقرة، (خُبْرة)، واتە: شـارەزاییەكی زۆر ورد بـە كـردەوەو سـیفەتو حـاڵو بـاڵی خـەڵك، كەواتـە: ئەگـەر شـایەدیی بـە هـەق بـدەن، ئـەوە ئەركـێكی شـەرعییتان جێبەجـێ كـردوە، وە ئەگـەر شـایەدیی بـە هـەق نـەدەن، چ شـایەدییەكە بگـۆڕن، چ بیـشارنەوەو وازی لـێـبێنن، ئـەوە بێگومان خوا بەوەی كە دەیكەن شارەزایە واتـە: بـەو شـایەدیی گۆڕینـە، یـاخود بەو شـایەدیی شـاردنەوە، وە سـزاتان دەدا لەسـەری.

بۆ زانیارییتـان مەسەلەی شـایەدیی دان لـە ئیـسلامدا زۆر گرنگیـی پـێدراوە، لـە سـوورەتی (البقـرة) لـە ئایـەتی (الـدین)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْ﴾، واتـە: شایەدەكان كاتێك بـانگ دەكـرێن، بـا سەرپێـچیی نەكـەن، شـایەدییەكت لـە لایـە، پێویـستـە بـچی شـایەدییەكە بـدەی، هەروەهـا هـەر لـە سـوورەتی (البقـرة)دا لـە ئایـەتی دوای ئـەودا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَۚ وَمَن يَكۡتُمۡهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥ﴾، واتـە: شـایەدیی مەشـارنەوە هـەر كەسـێك شـایەدیی بـشارێتەوە، دڵـی گوناهبـارە، وە لەڕاسـتییدا ئەگەر بێتو خەڵك پێكەوە ڕاسـتو ساف بێ، وە كێ زانیارییەكی لەلایە، شایەدییەكی لەلایە، شایەدیی بە هەق بدات، ئەوە خەڵك ماڵی یەكدییان بە ناهەق بۆ ناخورێ، بەڵام جاری وایـە لـە دێیەكدا بیـست (٢٠) كـەس دەزانـن فلان كەس زوڵمی لە فلان كەس كردوە، یان هـەقێكی فلان كەسـی لەلایـە، بـەڵام ناچـن شـایەدییەكەی بۆ بـدەن، كـابرا هەقەكـەی زایـە دەبـێ، بۆیـە شـایەدیی شـاردنەوە یاخـود گۆڕین، گوناهێكی گەورەیـە.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُ﴾، واتـە: ئەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنـاوە ! ئیمـان بێـنن بـە خـواو بـە پێغـەمبەرەكـەی، وە

بەو كتێبەی كە ناردوویەتە سەر پێغەمبەرەكەی، وە بەو كتێبانەی كە لەوەوپێش ناردوونی.

## وەڵامی پرسیارو ئیشكالێك

یەكێك بۆی هەیە پرسیار بكا بڵێ: باشە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئیماندارینە ئیمان بێنن! لە حاڵێكدا كە ئیمانیان هێناوە؟! جا هەندێك لەوانەی بە سەركێڵیی تەماشای قورئان دەكەنو، بە حیساب ڕەخنە لە قورئان دەگرن دەڵێن: قورئان شتی نامەنتیقیی تێدایە، چۆن؟ دەڵێن: ئەوەتا بە ئیمانداران دەڵێ: ئەی ئیماندارینە! ئیمان بێنن، ئنجا ئەگەر ئیمانی نەهێنابێ، بۆ پێی دەڵێ: ئیماندار، وە ئەگەر ئیمانیشی هێناوە، ئەدی چۆن ئیمان بێنێ؟! بەڵام دەڵێین: ئەوە ڕاست نیەو وەڵامەكەی ئەوەیە كە: قورئان زۆر وردەو هەروا بە سەركێڵیی تەماشای قورئان بكەی، تێیناگەی، وەختێ لێی ورد دەبیەوە ئەوجار چاك تێیدەگەی، ئەوە ڕستەیە سێ واتای هەن:

**یەكەم:** (داوموا على الإيمان)، واتە: بەردەوام بن لەسەر ئیمان، یانی: ئەی ئیماندارینە! لەسەر ئیمانەكەتان بەردەوام بن، دەنا كەسێك كە ئیمانی بە خواو بە پێغەمبەر ﷺ بە كتێب كە خوا ناردوویەتی نەهێنابێ، بە ئیماندار لەقەڵەم نادرێ، بەڵام كە خوا دەفەرموێ: ئیمان بێنن، واتە: بەردەوام بن لەسەری.

**دووەم:** (آمِنوا بالتفصيل بعد الإِجمال)، واتە: بە كورتیی ئیمانتان هێناوە، ئنجا بە تەفصیلێ ئیمان بێنن، خەڵكی عەوام بە زۆریی بە كورتیی ئیمانی هێناوەو، بە كورتیی دەزانێ ئیسلام ڕاستە، بەڵام فەرزە ئینسان هەولبدا بە تەفصیلیش ئیمان بێنێ، یەك بە یەك هەوڵبدە حوكمەكانی ئیسلام تێبگەیو قەناعەت بكەی كە هەقن، كە ئەوەش ئیمانی تەفصیلییە، بۆیە زانایان دەڵێن: خەڵكی عەوام ئیمانەكەیان (مُجمَل)ەو زانایان ئیمانەكەیان (مُفَصَّل)ە، خەڵكی عەوام بە كورتیی ئیمان دێنن

ئیسلام ڕاستە، بەڵام پێی بڵێ بۆم بسەلمێنە ئەو حوکمە شەرعییە چۆنە؟ دەڵێ: نایزانم، مانای وایە هەر بە کورتیی دەزانێ ئیسلام ڕاستە، بەڵام خوا لێرەدا دەفەرموێ: بە تەفصیلیش ئیمان بێنن، ئیماندار نابێ هەر بە کورتیی بزانێ ئیسلام ڕاستە، بە تەفصیلێ بچۆ نێو شەریعەتەوە.

**سێیەم:** (آمِنوا الدرجة العليا من الإيمان) واتە: ئیمانتان هێناوە ئیمانێکی بە ڕەهایی، ئیمانێکی سادە، ئیمانێکی پلە خوار، بەڵام هەوڵبدەن پلەی ئیمانەکەتان بەرزبکەنەوە، چونکە ئیمان بەلای کەمەوە سێ پلەی هەن:

١- لای کەمی ئیمان ئەوەیە کە ئینسان بەوە نەبێ ناچێتە بەهەشت، ئەوە پێی دەگوترێ (مُطلَق الإيمان).

٢- پلەیەکی دیکەی ئیمان هەیە، کە ئەگەر ئینسان ئەو ئیمانەی هەبوو، گوناهە گەورەکان ناکات، ئەویش بریتیە لە چی؟ بریتیە لە ئیمانی میانجیی (وَسَط)، یاخود ئیمانی پێویست (واجب)، وەك من لە کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) [1]دا بە تەفصیلێ باسی ئەوەم کردوە، ئیمانی (واجب) ئەوەیە کە ئەگەر ئینسان ئەو ئیمانەی هەبوو، گوناهە گەورەکان ناکات.

٣- پلەیەکی دیکەی ئیمان هەیە کە ئیمانی پەسند (مُستحب)ی پێ دەڵێن، ئیمانی هەڵبژاردە کە ئەوە ئیمانی بەرزترەو هەرکەس ئەو ئیمانەی هەبوو، گوناهە گچکەکانیش ناکات، وە بەپێی توانا سوننەتەکانیش جێبەجێ دەکات، کەواتە: لێرەدا بە هەرکام لەو مانایانە بیگری کە خوا دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە! ئیمان بێنن، واتە: بەردەوام بن لەسەر ئیمانەکەتان، یاخود ئیمانێکی کورتتان هێناوە، ئیمانەکە تەفصیلێ پێ بدەنو بچنە نێو وردەکارییەکانی شەریعەتەوە، یاخود ئیمانێکی نزمو کەمتان هێناوە، هەوڵبدەن پلەی ئیمانەکەتان بەرز بکەنەوەو تەواو بکەن.

---

١) بڕوانە بەرگی یەکەم، لاپەڕە: (١٤٥- ١٥٣)، (پلەکانی ئیمان – مراتب الإيمان) چاپی یەکەم: ٢٠٠٦ .

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾، هەر کەسێك بێبڕوابێ بە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرەکانیو بە ڕۆژی دوایی، ئەوە بە گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە، لێرەدا جێی سەرەنج ئەوەیە کە خوا ﷻ باسی ئیمان دەکات باسی سێ شتان دەکات: ئیمان بە خواو، بە پێغەمبەری خواو، بەو کتێبەی کە خوا ناردوویەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾، بەڵام لە باسی کوفردا باسی پێنج شتان دەکات: کوفر بە خوا بە فریشتەکانی خواو بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەرانی خواو، بە ڕۆژی دوایی، ئایا ئەوە حیکمەتەکەی چییە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە کە لێرەدا سیاقەکە باسی پێناسەی کوفرو کافرانە، لەبەرئەوە خوای کاربەجێ باسی کوفرکردنی بە تەفصیلێ کردوە، بەڵام باسی ئیمان هێنانی بە کورتیی کردوە.

**مەسەلەی حەوتەم**: کە دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ اللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە، دوایی کافر بوون، دوایی ئیمانیان هێناوەتەوە، دوایی کافر بوونەتەوە، دوایی لە کوفر زیادیان کردوە، ئا ئەوانە ناگونجێ خوا لێیان ببووریٚ، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچیو چۆن خوا لێیان نابووریٚ، ئەگەر دوایی ئیمان بێنن، دوای ئەو کوفرە هەرچەندە کوفریشیان زیاد کردبیٚ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: کەسێك کە تۆبە ناکات، خوا لێی نابووریٚ، با پێشێ ئیمانی هێنابیٚو دوایی کافر بووبێتەوەو، دوایی دووبارە ئیمانی هێنابێتەوە، هەرچەندە دووجار ئیمانی هێناوە، بەڵام مادام خەتمی بە کوفر کردووەو کۆتاییەکەی کوفرە، وە لە کوفرەکەشیدا زیادی

کـــردوه، وەك دەفــەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرًا ﴾، واتــە: هــەر بــەردەوام بــووە لەســەر کـوفر، نـەك دووبـارە بگــەڕێتەوە بـۆ ئیمـان، ئەگـەرنا لـە حەدیـسی پێغــەمبەر ﷺدا هــاتوە کــە ئەگــەر ئینــسان چــەندجار گونــاح بکـــاتو بگـــەڕێتەوە بـۆ لای خـــوا، خـوا لــێی دەبـوورێ، هەڵبەتـە ئـەوە دووریـشە کـە ئینـسان هێنـدە کــافر بێتــەوەو ئیمــان بێنێتــەوەو کــافر بێتــەوەو، ئیمـان بێنـێتــەوە، بــەڵام بــە هــەرحاڵ ئــەوەی کــە لێــرەدا دەبینــرێ، ئەوەیــە کــە دەفــەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرًا ﴾، واتــە: لەســەر کوفــر بــەردەوامن، چـونکە دوایی باسـی ئیمان هێنـانەوەیان ناکـات، ئەگـەرنا ئەگەر ئیمـان بێنن، با مرۆڤـ لە کوفریش زۆر زیادی کردبـێو زۆر ڕۆچووبــێ، بـەڵام دوایـی کـە ئیمانی هێنـا، خـوا لێـی دەبـوورێ، بەڵـگەمان چییە؟ بەڵـگەمان ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿أَنَّ الإِسْلامَ يَجُبُّ مَا كَانَ قَبْلَهُ مِنْ الذُّنوبِ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بـرقم: (١٧٨٦١)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، واتە: ئیسلام گوناهەکانی پێش خۆی دەسڕێتەوە.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** خوا دەفەرموێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ١٣٨ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ مـــوژدە بـــدە بـــە مونافیــقەکان کـە ئـازارێکی بەئێـشیان هەیــە، ئەوانـەی کـە کـافران بـە دۆسـت دەگـرن لە جیاتی ئیمـانداران‌و، پشـت بەوان دەبەسـتن‌و ئەوانیـان خۆشـدەوێ.

خۆشـەویسـتان !

لێـرەدا ئەگــەر تەماشــا بکـەین خـوای پـەروەردگار بـە زۆر سیفەتی خـراپ باسـی مونافیقـەکان دەکـات، مـن لـەو کتێبــەی کـە لـە (زینـدانی ئـەمریکا)دا نووسـیومە: (الإِسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه)، زیـاتر لـە سـەد (١٠٠) سیفەتی مونافیقـەکانم لە قورئـاندا هێنـاوە، مونافیقـەکان سیفەتی خراپیـان زۆر زۆرە، لـە کـافران زیـاتر سیفەتی خراپیـان هەیـە، بـەڵام زەقـترین سـیفەتی

موونافیقەکان چییە؟ دوای کوفری پەنهان، زەقترین سیفەتیان و دیارترین سیفەتیان ئەوەیە کە دۆستایەتیی لەگەڵ ئەهلی کوفردا دەکەن، پشت بە ئەهلی کوفر دەبەستن، ئەهلی کوفریان خۆشدەوێ، کەینوبەینیان لەگەڵ ئەهلی کوفردا هەیە، بەڵگەمان چییە؟ تەماشا بکەن لە سوورەتی (المجادلة) لە ئایەتی (١٤ هەتا ١٩)دا خوای زاناو شارەزا باسی موونافیقەکان دەکات و ئاوا دەست پێدەکات ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم ...﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَـٰنِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿١٩﴾﴾، تەماشای ئەوانە ناکەی دۆستایەتیی کۆمەڵێك دەکەن کە خوا لێیان توورەیە، ئەوانەی خوا لێیان توورەیە کێن؟ جوولەکەکانن، وەك لە حەدیسی پێغەمبەردا هاتوە: ﴿إِنَّ الْمَغْضُوبَ عَلَيْهِمْ: الْيَهُودُ وَالضَّالِّينَ: النَّصَارَي﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٤٠٠) وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٣٢٦٣)، واتە: غەزەب لێگیراون جوولەکەکان و گومڕاو سەرگەردانەکان نەصرانییەکانن، وە وشەی (غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم) لە قورئاندا بۆ جوولەکەکان زۆر بەکارهاتوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا لە جوولەکەکان توورەیە؟ چونکە هەقیان ناسیوەو شوێنی ناکەون، ئەدی بۆچی نەصرانییەکان بە گومڕا ناو دەبات؟ چونکە هەر لە ئەسڵدا هەقیان نەناسیوە، جا خوا دەفەرموێ: تەماشای ئەوانە ناکەی دۆستایەتیی کەسانێك دەکەن کە خوا لێیان توورەیە، کە ئەو کەسانەش موونافیقەکانن، بۆچی؟ چونکە دەفەرموێ: ﴿مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ ﴿١٤﴾﴾ المجادلة، واتە: نە لە ئێوەن کە مسوڵمانی بە هەق بن، نە لەوانیشن کە کافری زەق بن، بە ڕواڵەت مسوڵمانی بە لەقەلەقن، یانی: ئەوەنیە کە مسوڵمانەتییەکەیان ڕێکوپێك بێ، بەڵکو مسوڵمانی ڕووکەشن و، ئیمانیان نیە، هەروەها جوولەکەش نین، کافری بە ئاشکراش بن، جا ئەوە لەگەڵ موونافیقەکانیەتی، دەفەرموێ:

ئەوانــە دۆســتایەتیی ئەوانــە دەکــەن کــە خــوا غــەزەبی لـێــگرتوون، کــە جوولەکەکانن، هەروەهــا لە سوورەتی (الـمـائدة) لـە ئایــەتی (٥١، ٥٢)دا کە خوا دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ٥٢ ﴾، پێــشێ باســی جوولەکــەو نەصــڕانییەکان دەکــات، دوایــی دەفــەرموێ: ئــەی ئەوانــەی ئیمانتــان هێنــاوە! جوولەکــەو نەصــڕانییەکان بــە دۆســـت مــەگرن، هەندێکــیان دۆســتی هەنــدێکیان، هــەر کەســێك لــە ئێــوە دۆســتایەتییان بکــات، ئــەوە لەوانــە، بێگومــان خــوا ڕێنمــایی کەســانی ســتەمکار ناکــات، ئەوانــە دەبینــی کــە دڵیــان نەخۆشــیی تێدایــە (خــوای کاربــەجێ ئــەم تەعبــیرەی بــەکارهێناوە بــۆ مونافیقــەکان) خێرایــی دەکــەن لــە دۆســتایەتیی جوولەکەو نەصــڕانییەکاندا.

دەزانن بۆچـی وا بە جەخت لەسەر کردنــەوەو بە داکۆکـیی لەسـەرکردنەوە باسـی ئــەم مەســەلەیە دەکــەم؟ بیکــەن بــە نیـشـانە، بیکــەن بــە پێــوەر، هــەر کەسێکتان بینی دڵی بە جوولـەکـان خۆش بـوو، دڵی بە نەصــڕانییەکان خـۆش بوو، دڵی بە ئەهلی کوفر خۆش بوو، دۆستایەتیی لەگــەڵ کـردنو، کەینوبەینــی لەگەڵ کـردنو، پـەیمانی لەگەڵ بەسـتن، بـزانن ئـەوە پێناســەی ئەهــلی نیفــاق دەیگرێتــەوەو ئەوانــە دەغــەڵو دوو ڕوون، چونکــە بابــای مــسوڵمانو ئیمانــدار، بەس ئەهلی ئیمــانی خۆشــدەوێو، بــەس پــشــت بــە ئەهلــی ئیمـان دەبەســتێو، بــەس دۆســتایەتیی ئەهلــی ئیمــان دەکــات، بــەڵێ مــودارا لەگــەڵ ئــەهلی کـوفر دەکـات، بــەڵام دۆسـتایەتییان ناکـات، مــودارا ئەوەیــە لەگــەڵیان مــەدار دەکـات، ڕێزیــشیان دەگــرێو ڕووشــی لەگــەڵیان خۆشــەو، قــسەشی لەگەڵــیان خۆشـــەو،

هەڵسوکەوتیشیان لەگەڵدا دەکات، ئەوە مودارایە، بەڵام لە دڵەوە تەنیا ئەوانەی خۆش دەوێن کە لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا دان، تەنیا ئەوانەی خۆشدەوێن کە بە ئەهلی ئیمانیان دەزانێ، وە تەنیا بە سەرکەوتنی وان دڵخۆشە، وە بە شکستیان دڵناخۆشە، وە تەنیا پشتی وان دەگرێ، بەڵام ڕووی لەگەڵ هەموو کەس خۆشە، پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێك چووبێتە لای، موشریك بووبێ، جوولەکە بووبێ، نەصرانیی بووبێ، مسوڵمان بووبێ، کافر بووبێ، ڕووی لەگەڵ هەموو کەس خۆش بووە، لەگەڵ هەموو کەس بەڕێز بووە، لەگەڵ هەموو کەس بە حورمەت بووە، مودارای لەگەڵ هەموو کەس کردوە، بەڵام کێی خۆشویستوە؟ بە تەئکید تەنیا ئیمانداران، وە دوای خوا پشتی بە کێ بەستوە؟ تەنیا بە ئیمانداران، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾الأنفال، واتە: ئەی پێغەمبەر! خوات بەسە، وە ئەو ئیماندارانەی کە شوێنت کەوتوون، واتە: لە دوای خوا، پشت بە ئیمانداران ببەستەو پشتت بەوان قایم بێ، ئەو مانایەکی، مانایەی دیکەشی: خوا بۆ تۆش‌و بۆ ئەو ئیماندارانەی شوێنتکەوتوون بەسە.

ئنجا خوای بێ هاوەڵ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان دۆستی ئێوەو پشتیوانی ئێوە، تەنیا خوایەو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، ئەوانەی کە نوێژ بەرپا دەکەن‌و زەکات دەدەن، وە زۆر ڕکووع دەبەن، وە هەر کەسێك دۆستایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی‌و ئیمانداران بکات، ئەوانە کۆمەڵی خوان، وە کۆمەڵی خوا زاڵی سەرکەوتوە، کەواتە: زەقترین نیشانەی مونافیقان، بریتیە لە دۆستایەتیی کردن لەگەڵ ئەهلی کوفردا، هەروەك دیارترین نیشانەی ئیمانداران، ئەوەیە

كە تەنیا پشت بە ئەهلی ئیمان دەبەستن‌و، تەنیا ئەهلی ئیمانیان خۆشدەوێ، تەنیا لەگەڵ ئەواندا ڕازو نیازو نهێنیی دەگۆڕنەوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾، كە باسی مونافیقەكان دەكات، دەفەرموێ: دۆستایەتیی لەگەڵ ئەهلی كوفردا دەكەن، دوایی دەفەرموێ: ﴿أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾، جا سُبحان اللّه ئەوەی كە خوا دەفەرموێ هەزارو چوار سەدو ئەوەندەساڵ پێش ئێستا فەرموویەتی، بەڵام دەڵێی هەر ئێستا هاتۆتە خوارو هەڵمی لێ هەڵدەستێ، دەفەرموێ: ئایا ئەو مونافیق‌و دەغەڵ‌و دڵ نەخۆشانە، كە دۆستایەتیی لەگەڵ جوولەكەو نەصرانییەكان‌و ئەهلی كوفر دەكەن، دەیانەوێ بەهۆی ئەوانەوە عیززەت‌و هێزیان پەیدابێ؟ عیززەت واتە: دەسترۆیشتوویی‌و دەسەڵات‌و زاڵبوون، ﴿فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾، بێگومان عیززەت‌و دەسترۆیشتوویی‌و دەسەڵات‌و باڵادەستیی هەمووی هی خوایە، كەواتە: پاساوی مونافیقەكان بۆ ئەوە كە سەر بە كافران بن‌و دۆستایەتییان بكەن، چییە؟ دەڵێن: بۆئەوەی عیززەتمان پەیدابێ‌و دەسەڵاتمان پەیدابێ، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا هاتووە: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە دەیانبینی، خێرایی دەكەن لە دۆستایەتیی لەگەڵ ئەهلی كوفردا، دەڵێن: دەترسین بەڵایەكمان تووشبێ، بۆیە: با لەگەڵ ئەهلی كوفردا دۆستایەتییەكمان هەبێ‌و كەینوبەینێكمان هەبێ، نەوەك بەڵایەكمان بەسەربێ، تاكو ئەوانە بۆمان ببنە بەڵاگێڕەوە، ئەوە دەكەنە پاساو بیانوو، بەڵام لەڕاستییدا ئەوەی ئیماندار‌بێ، عیززەت تەنیا لە خوا دەخوازێ، وە تەنیا پشتی بە خوا قایمە، وەك كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ڕووبار بتبا،

نەك بە پردی نامەردا بپەڕیەوە) شۆڕشەكانی كورد چەند جار تووشی ئەوە بوون، هەر لە شێخ مەحموودی حەفیدەوە، هەتا قازی موحەممەدو مەلا مستەفا ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، چەند جار كڵاو لەسەری كورد نراوە! جارێك ئینگلیزو، جارێكی دیكە ڕووس و، جارێكی دیكە ئەمریكا، كڵاو لەسەری ئەو میللەتەی ئێمە نراوە، پردی نامەرد بووەو میللەتەكەش بە سەریدا پەڕیوەتەوە، كە گەیشتۆتە نێوەڕاستی ڕووبار، پردەكەی لە بن دەرهێنراوە سەرەو بن كەوتۆتە نێو ڕووبار!! بۆیە پێشینانی خۆمان زۆر جوان دەڵێن: (ڕووبار بتبا، نەك بە پردی نامەردا بپەڕیەوە) چونكە ئیحتیمالی هەیە ئەگەر بۆخۆت لە ڕووبارەكە بپەڕیەوە، بۆخۆت مەلە بكەی، هەوڵێك بدەی، بەڵام لەسەر پردێك بكەویە خواریێ، زۆر خەتەرە، تەماشا بكەن! شۆڕشەكانی ئێمە هەموویان وابوون، هۆكاری ئەوەش ئەوە بووە، كە بەداخەوە بەداخەوە دەڵێم: ئێمە تەماشای ئەو ئایەتانەمان نەكردوە، جارێك دڵمان بە ئینگلیز خۆش كردوە، جارێك دڵمان بە یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو خۆش كردوە، جارێك دڵمان بە ئەمریكا خۆش كردوە، جارێك دڵمان بە جوولەكە خۆش دەكەین، هیچیشیان سوودیان نەبووەو نیە، ئەم دوا دواییەش كە ئەمریكا هات عێراقی گرت، قیادەی عەلمانیی كورد، دڵیان زۆر خۆش بوو، كە من ئەو كاتە هەر زوو گوتم: هێلكەی خۆتان لە سەبەتەی ئەمریكا مەكەن، دوایی بەبێ هێلكە دەمێننەوە، دڵیان خۆش بوو گوتیان: ئەمریكا ڕێككەوتنی ستڕاتیژیی لەگەڵمان هەیە، ئەمریكا ئاوامان بۆ دەكات، كێشەی كەركووكمان بۆ چارەسەر دەكات، كێشەی ناوچە دابڕێنراوەكانمان بۆ چارەسەر دەكات، دواییش دەركەوت! نەخێر، ئەمریكا تەنیا دڵسۆزی بەرژەوەندییەكانی خۆی بوو، جا ئەگەر ئێمە ئەو ئایەتانە بكەینە بەرنامەی خۆمانو تەماشایان بكەین، قەت تووشی ئەو هەڵانە نابین، ئەو ئایەتانە پێمان دەفەرموون: جوولەكەو نەصرانیی یەكانو ئەهلی كوفر بەگشتی بە دۆست مەگرنو پشت بە خوای خۆتان ببەستنو، لەسەر پێی خۆتان بوەستن.

**مەسـەلەی دەیـەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴾، واتە: ئێوە پێشتر لە کتێبدا بۆتان دابەزێنرابوو، کە ئەگەر بیستتان ئایەتەکانی خوا کوفریان پێ دەکراو گاڵتەیان پێ دەکرا، لەگەڵیان دامەنیشن، (واتە: لەگەڵ ئەوانەی کوفر بە ئایەتەکانی خوا دەکەنو گاڵتەیان پێ دەکەن دامەنیشن)، هەتا دەچنە نێو باسو بابەتێکی دیکەوە، ئەگەرنا ئێوەش وەك وانن، واتە: کە لە مەجلیسێك دا دانیشتووی‌و کوفر بە ئایەت دەکرێ گاڵتە بە ئیسلام دەکرێو گاڵتە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرێ، گاڵتە بە قورئان دەکرێ، گاڵتە بە شتێکی ئیسلام دەکرێ، ئەوان پێدەکەنن، تۆش دانیشتووی‌و لەوێ خۆت مات کردوە، ئەوە تۆش هاوبەشی ئەو گوناهەی، تۆ دوو هەڵوێستت لەپێشن: یان قسەکان بەرپەرچ بدەیەوە، یان کۆڕەکە بەجێ بهێڵی، ئەگەر بەرهەڵستییت بۆ ناکرێ، ڕاکە، ئەمما لەوێ بی‌و خۆ کڕ بکەی، مانای وایە تەسلیم بووی، مسوڵمانیش بۆی نیە تەسلیمی ناهەق بێ، بەڵێ ئەگەر لەوێ بە بێدەنگی دانیشی، مانای وایە تەسلیمی ئەو ناهەقە بووی‌و دانت بەو ناهەقییەدا هێناوە، ئەوەش زۆر گوناهە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ﴾، ئنجا با تەماشا بکەین: مسوڵمانان دەبێ ئەو ئایەتانە جێبەجێ بکەن، بەڵام لە چەند کۆڕو مەجلیسدا کوفر دەکرێو، شتی ناهەقی‌و ناڕاست دەگوترێو، مسوڵمانانیش لەوێ گوێی خۆیان تەپ دەکەن، بەڵکو هەیە مەلایە لەوێ دانیشتوەو زەق زەق تەماشا دەکات، لەپێش چاوی وی ڕەشبەڵەك دەکەن، قسەی خراپ دەڵێن، شیعر دەڵێن کە بۆنی کوفری لێ دێ، ئەویش گوێی خۆی تەپ کردوە، کەچی خوا دەفەرموێ: ئێوەش وەك وانن، ئەگەر ئەوانەتان بینی کە کوفریان بە ئایەتەکانی خوا دەکردو، گاڵتەیان بە ئایەتەکانی خوا دەکرد، لەگەڵیان دامەنیشن، هەتا

دەچنە نێو باس‌و بابەتێكی دیكەوە، ئەگەرنا ئێوەش وەك ئەوانن.

ئنجا ئایا كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾، لە كوێدا نێردراوەتە خوار؟ لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی ژمارە (٦٨)دا، ئنجا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئایەتەكەی سوورەتی (الأنعام) لە مەككە هاتوەو ئەمەیان لە مەدینە هاتوە، كەچی خوای بەرز پێكیانەوە پەیوەست دەكاتەوە، كەواتە: ئەم قورئانە هەمووی یەكەو پێكەوە جۆشدراوو پەیوەستە، ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأنعام)یش ئەمەیە، دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر ئەوانەتان بینی كە دەڕژانە نێو باسوخواسی ئایەتەكانی ئێمەوە، وە باسی ئایەتەكانی ئێمەیان بە ناهەق دەكرد، پشتیان تێبكەو وازیان لێ بێنە، هەتا باسی شتێكی دیكە دەكەن، وە بەشداریی كۆڕو مەجلیسەكەیان مەكە، وە ئەگەر شەیتان لەبیری بردیەوەو بێئاگا بووی، ئەوان قسەی ناهەقیان دەكردو تۆش خافڵای (دوایی بەبیرت هاتەوە، یان كەسێك خافڵاندووی بە شتێكەوەو قسەیەكی ناهەقیش دەگوترێ) دوایی كە هۆشیار دەبیەوەو دەزانی شتی ناهەق دەگوترێ، لەگەڵ خەڵكی ستەمكاردا دامەنیشە.

شایانی باسیشە ئەو ڕستەیە كە دەفەرمویٚ: ﴿ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾، كە لە هەردووكیاندا هاتوە لە سوورەتی (الأنعام)یشدا هاتوە، وە لە سوورەتی (النساء)یش داهاتوە، هەتا دەرژێنە نێو باسێكی دیكە، ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە مسوڵمان بۆی هەیە لە كۆڕو مەجلیسێكدا دابنیشێ، كە

كافری تێدان مادام كوفر بە ئایەتەكانی خوا نەكرێ‌و، گاڵتەیان پێ نەكرێ، بۆی هەیە لەگەڵ خەڵكی نامسوڵماندا دابنیشێ.

**مەسەلەی یازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا واتە: بێگومان ئێوەش وەك وانن، ئەگەر لەو كۆڕو مەجلیسەدا دابنیشن‌و بێدەنگ بن‌و، هەڵوێستتان نەبێ‌و بەجێشی نەهێڵن، جا ئایا بەچی وەك وانیان لێدێ؟! بە چەند شتێك:

١- بە دەمیانەوە پێبكەنن، كە ئەوە زۆر تۆخە.

٢- بێدەنگ بن، بەڵام دیارە بەدەمەوە پێكەنینەكە دەكاتە تەئید كردن‌و پشتگیریی كردن، دەگونجێ مرۆڤ وەزعەكەی وابێ نەتوانێ هەڵسێ، بەڵام نابێ بەدەمیانەوە پێبكەنێ، بەلای كەمەوە دەبێ خۆی گرژ بكاو هەڵوێستێك پێشانبدا كە پێی ناخۆشە، ئەمما بەدەمەوە پێبكەنێ، یاخود هیچ بەسەر خۆی نەهێنێ، مانای وایە بە دڵیش پێی ناخۆش نیە، ئنجا كە بەدڵ پێی ناخۆش نەبێ، مانای وایە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، ئێوەش وەك وانن، كەواتە: یان دەبێ بەرپەرچ بداتەوە، یان دەبێ بڕوا، یان ئەگەر بۆشی بەرپەرچ نەدرایەوە، وە نەشیدەتوانی بڕوا، هەرچەندە زانایان باسی ئەو حاڵەتەیان نەكردوە، بەس دەزانم جاری وایە حاڵەتی واش دێتە پێشێ، ئەوە لەو حاڵەتەدا بەلای كەمەوە، دەبێ خۆی گرژو نارەحەت بكات‌و، پێوەی دیاربێ كە پێی ناخۆشەو ئەو شتەی لەلا ڕەفزە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، ئەوەش سیفەتێكی دیكەی مونافیقەكانە، دەفەرموێ: ئەوانەی كە هەمیشە لێتان لەبۆسەدان، ئەگەر لەلایەن خواوە

سەرکەوتنێك هەبوو دەڵێن: ئەدی ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین؟! دیارە مونافیقەکان بە ڕواڵەت لەگەڵ مسوڵمانانن، واتە: ئایا ئێمەش لەگەڵتان نین؟ کەواتە: ئێمەش شەریكو برابەشین، وە ئەگەر کافرەکان بەشێکیان هەبوو لە سەرکەوتنداو دەستکەوتێکیان هەبوو، دەڵێن: ئەدی ئێمە بەسەر ئێوەدا زاڵ نەبووین، ئەگەر ویستبامان دەمانتوانی زەبرتان لێ بدەین، وە ئایا ئێمە نەبووینە پەرچو ڕێگر لەبەردەم ئیمانداراندا کە زیان بە ئێوە بگەیەنن، واتە: خزمەتێکمان پێتان کردوە، کەواتە: بەشمان هەیە، سەرنج بدەن! دەیانەوێ لە هەردوولایان بخۆن، جا ئەوە سیفەتی مونافیقەکانە، دەیانەوێ لەوێشو لەوێش بخۆن، کە لەڕاستییدا لە هەردوولایان بێبەش دەبن، بەڵام ئەمە ئەوە دەردەخات، کە مونافیقەکان هەوڵدەدەن لەلای مسوڵمانان خۆیان بە مسوڵمان پێشان بدەن، لەلای کافرەکانیش خۆیان وەك وان پێشان دەدەن، بە مسوڵمانان دەڵێن: کوا بەشمان؟ بە کافرانیش دەڵێن کوا بەشمان؟

جا بەڕێزان !

هەر کەسێکتان بینی، ویستی هەموو کەسێك ڕازی بکات، مسوڵمانانیش ڕازی بکاتو ئەهلی کوفریش ڕازی بکات، چاوەڕوانیی لە مسوڵمانانیش هەبوو، کە ڕێزی بگرنو بەشی بدەن، وە چاوەڕوانیی لە ئەهلی کوفریش هەبوو، وە بە زمانی وتار یان کردار بە ئەهلی کوفریان دەگوت: ئێمەش وەك ئێوەین، ئێمەش لەسەر هەمان بەرنامەینو لەسەر هەمان ڕێبازین، ئەوە بزانن کە ئەوانە مونافیقن.

**مەسەلەی <u>سێزدەیەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەرییتان لە نێواندا دەکات، وە خوا ڕێگا نادات کافران ڕێیان هەبێ بەسەر ئیمانداراندا.

لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دەربارەی ئەم ڕستەیە: ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ

لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾، وە خـــوا ناهێڵـــێ كـــافران ڕێیـــان بەســـەر ئیمانداراندا هـەبێ، كەوتوونـە مشـتومڕەوە، كە ئایا مەبەسـتی چییـە؟

١/ هەندێكـــیان گوتوویـــانە: وشـــەی (سَبِيلًا ) لـــە ڕســـتەی: ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾دا، مەبەســـت پێـــی بەڵگـــەیە، كەواتـــە: كـــافر بەڵگەیـان نابێ بەسـەر ئیماندارانەوە، نـە لـە دنیـــاو نـە لـە ڕۆژی دوایـــی دا، بە مەرجێـك ئیمـاندار ئیمـانداری بە ڕاســـتیی بـێ، ئەهلـــی كوفر بەڵـگەیان پێ نیە لە بەرانبـەر ئیمانداران دا.

٢/ وە هەندێكـیان گوتوویـانە: وشـەی (سَبِيلًا ) لـە ڕسـتەی: ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾دا، مەبەست پێی بەڵگە نیـە، بەڵـكو مەبەست پێـی ئەوەیـە كە كـافر ڕێیان ناچێتـە ئیمانداران، كە ئیمانداران بنبـڕ بكـەنو لە بەینیـان ببـەنو قەڵاچۆیـان بكـەن.

٣/ هەندێكیشیان گوتوویـــانە: مەبەســـت پێـی ئەوەیـــە كـە كـــافر نابـــێ حـوكم بكـات بەسـەر ئیمانداراندا.

بەڵام ئێمـە دەڵێین: ئەوەیان لـەم ئایـەتە وەرناگـیرێ، واتە: ئەوە كـە نـابـێ كـافر حوكم بكـات بەسـەر ئیمانداراندا، بەڵـێ ئەسڵ وایە كافر نابێ حـوكم بكـات بەسـەر ئیمانـدارانـدا، بـەڵام ئـەوە لـەم ئایەتـە وەرنـاگیرێ، چـونكە خـوا دەفـــەرموێ: ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، كەواتـــە: ئـــەو ئایـــەتە مەبەست پێـی دواڕۆژە، واتە: لە دواڕۆژدا خوا دادوەرییـتان لەنێوانـدا دەكـات، وە كـــافر قـــسـەیان نیـــە بەســـــەر ئیماندارانـــەوە، لـــە دواڕۆژداو بەڵـــگەیان لەسـەریان نیە، وە دەشگونجـێ مەبەست پێـی دنیـاش بـێ، كە بەڵـگەیان نیـە لەسـەریان لـە دنیـادا، یـاخود مەبەســـت پێـی ئەوەیـــە كـە كـافران هەرگیـز ناتـوانن مسـوڵمانان یەكجـاریی بەربـاد بكـەنو قەڵاچۆیـان بكەنو هیـچیـان

لێ نەهێڵن، بەڵێ کافران دەتوانن زەبر لە مسوڵمانان بدەن، خاکیان داگیر دەکەن تووشی ئەزیەتیان دەکەن، بەڵام ناتوانن بنبڕیان بکەن، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە چ ئیماندارێك کافر بەڵگەی لەسەری نابێ‌و، قسەی بەسەریەوە نابێ؟ وە چ ئیماندارێك کافر زەفەری پێ نابات؟ دەڵێین: ئیمانداری تەواو، ئیمانداری شارەزاو تێگەیشتوو لە دینی خۆی، کافر ناتوانێ لە بەرانبەریدا بوەستێ، بەڵام مسوڵمانێك بۆخۆی لە دینەکەی شارەزا نەبێ، لە بەرانبەر کافرێکی زۆرزان‌و قسەزاندا، زاری دەبێتە تەڵەی تەقیو!! بۆیە نابێ لە حاڵێکی وادا لە ئایەتەکە بکەویە گومان، خوا فەرموویەتی: ئیماندار، یانی: ئیماندارێك لە دینی خوای تێگەیبێ‌و ئیمانێکی باشی هەبێ‌و شارەزابێ لە قورئان‌و سوننەت، بڕواداریکی ئاوا کافر بەڵگەی لەسەری نیەو، بە پێچەوانەوە ئەو بەڵگەی لەسەر کافرەکە هەیە، کەواتە: مەبەست پێی ئیمانداری تەواوە، نەك مسوڵمانێکی سادە.

**مەسەلەی چواردەیەم:** خوای پەروەردگار جارێکی دیکە باسی مونافیقەکان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾.

بەڕێزان !

ئەگەر تێبینیتان کردبێ، خوا زۆر باسی مونافیقەکان دەکات، زۆر سیفەتیان لێ هەڵدەدا، چونکە پەنهانن، کافر ئەوە کافرە؛ جوولەکە دەڵێ: جوولەکەم، نەصرانیی دەڵێ: نەصرانییم، بتپەرست دەڵێ: بتپەرستم، بەس مونافیق دەڵێ: مسوڵمانم، لەبەرئەوە خوای زاناو شارەزا، باش تیشکی خستۆتە سەریان سیفەت‌و هەڵسوکەوت‌و ڕەفتارەکانی باش خستوونە بەر چرایە، تاکو مسوڵمانان باش بیانناسن و لەدەست‌و زمانیان تووشی زەرەر نەبن، لێرەدا خوای کاربەجێ چەند سیفەتێکی مونافیقەکان بەیان دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ بێگومان مونافیقەکان (بە خەیاڵی خۆیان) خوا هەڵدەخەڵەتێنن ﴿وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ﴾، بەڵام لەڕاستییدا خوا فریودەری ئەوانە ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾، وە کاتێك بۆ نوێژ هەڵدەستن بە تەنبەڵیی هەڵدەستن ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾، ڕیابازیی دەکەن بۆ خەڵك ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، وە بە کەمیی نەبێ یادی خوا ناکەن، ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ لەو نێوانەدا لەرەلەریانە، کەواتە: پێنج سیفەتیان لێ هەڵدەدات.

١/ فریودان: مونافیق یەکێك لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئەوەیە کە دەیەوێ خەڵك فریو بدات، خواو خەڵك فریو بدات، بەڵام لەڕاستییدا خۆی فریو دەدا.

٢/ تەنبەڵیی لە کاتی هەڵساندا بۆ نوێژ: چونکە بڕوای بە نوێژەکە نیە، بۆیە کە دەیکات بە تەنبەڵیی دەیکات، لەبەرئەوە دەبێ وریابین، خۆشمان عیبادەتو طاعەت بە گورجوگۆڵیی بکەین، چونکە بە ئەندازەی ئەوە کە گورجوگۆڵی لە طاعەتدا، مانای وایە ئیمانت پێیەتی، وە بە پێچەوانەوە: بە ئەندازەی ئەوە کە لێی تەنبەڵییو قالب گرانو تەوەزەلی، مانای وایە ئیمانەکەت کرچوکاڵو لاوازە.

٣/ ڕیابازیی کردنو ڕووپامایی کردن بۆ خەڵك:

٤/ یادی خوا کردن بە کەمیی: ئەو کەمەش کە باسی دەکەن لەبەرئەوەیە کە سەرنجی مسوڵمانان ڕاکێشنو خۆ بە مسوڵمان پیشان بدەن، تەنیا لەو کاتەدا باسی خوا دەکەن، نەك لە دڵەوە خوایان خۆشبوێ، بۆیە باسی بکەن!

٥/ لەرەلەرو ڕاڕایی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾﴾، سیفەتی پێنجەمی

مونافیقەکان ڕاڕایی‌و لەرانەوەیە، نە ئەوەیە خۆیان بە لای ئەهلی ئیمان دا بشکێننەوە بەتەواویی، نە ئەوەیە خۆیان بە لای ئەهلی کوفردا بشکێننەوەو لەو نێوانەدان، وەك گوتم: دەیانەوێ لە هەردوولایان بخۆن، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مونافیق دەفەرموێ: ﴿مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً، لا تَدْرِي أَيَّهَا تَتْبَعُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠٣٧)، واتە: وێنەی مونافیق وەك مەڕێکی سەرگەردان وایە لە نێوانی دوو ڕانەمەڕاندا (مەڕێك، بزنێك) لەنێو دوو مێگەلدا سەری لێ‌دەشێوێ، جارێك دەچێ بۆ لای ئەم، جارێك دەچێ بۆ لای ئەم، نازانێ بەدوای کامیان بکەوێ، مونافیق وایە جارێك دەچێ بۆ لای مسولمانان‌و دەیەوێ خۆی بە مسولمان لەقەڵەم بدات، وە جارێك دەچێ بۆ لای کافرەکان، قوربان ! لەگەڵ ئێوەین.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴾،واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! کافران لە جیاتی ئیمانداران بە دۆست مەگرن، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرای خوا لەسەر خۆتان دابنێن، واتە: خوا بەڵگەی لەسەرتان هەبێ کە مسولمان نین، بە هۆی دۆستایەتیی گرتنتانەوە لەگەڵ ئەهلی کوفردا؟!

خوشك‌و برایانی خۆشەویست !

ئەوە مەسەلەیەکی زۆر زۆر گرنگە، بەڵێ بەڕاستیی دۆستایەتیی گرتن‌و خەڵك خۆشویستن لە ئیسلامدا زۆر گرنگی پێدراوە، لێرەدا خوای پەنهانزان بانگی ئیمانداران دەکات، لە هەموو سووڕەتی (النساء)دا نۆ جار خوا بانگی ئیمانداران دەکات بە وشەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، کە ئەمە یەکێکیانە ئەی

ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! کافران بەدۆست مەگرن لەجیاتی ئیمانداران، نەچن شتی وا بکەن، ئەگەر وا بکەن چییە؟ ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا﴾، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرای خوا لەسەر خۆتان پەیدابکەن، یانی: خوا بەڵگەی لەسەرتان هەبێ کە مسوڵمان نین، بە بەڵگەی ئەوە کە دوژمنانی خواتان بە دۆست گرتوەو دۆستەکانی خواتان ئیهمال کردوە ؟! چەند شتێکی گەورەیە !! ئایا ئەگەر بەم تەرازووە مسوڵمانان هەڵسەنگێنی، دەبێ چەندیان سەلامەت دەربچن؟ هەر مسوڵمانەو خۆی بە مسوڵمان دەزانێ، کەچی تەماشا دەکەی لەگەڵ ئەهلی کوفردایە، یەکێك دڵی بە ئەمریکا خۆشە، یەکێك دڵی بە ڕوسیا خۆشە، یەکێك دڵی بە فەڕەنسا خۆشە، یەکێك دڵی بە بەریتانیا خۆشە، یەکێك دڵی بە چین خۆشە، یەکێك دڵی بە جوولەکە خۆشە، یەکێك دڵی بە نەصرانییان خۆشە، کە سەری بخەنو ڕزگاری بکەن !! یاخود مسوڵمانەو دڵی بە حیزبێکی عەلمانیی خۆشە، کە بڕوای بە دینەکەی ئەو نیە، بڕوای بە پێغەمبەرەکەی ئەو نیە، کەسێك عەلمانییەکی تەواو عەیار بێ، نەك عەلمانییەکی تەقلیدیی کە بەدەردی کابرا دەڵێ: بە دوای هەڵلای مام کوێخا کەوتوە، ئەوەنا، کەسێك بەڕاستیی عەلمانیی بێ، بڕوای بە ئیسلام نیەو ئیسلام بە بەرنامەی ژیان نازانێ، وەك چۆن نەصرانییەت دەڵێ: دین پەیوەندییەکی شەخصیی نێوان ئینسانو خوایە، ئەویش هەر ئەوەندە بۆ ئیسلامو بۆ مسوڵمانان دادەنێ، بەڵام ئەو شەریعەتە فراوانەی کە باسی حەڵاڵو حەڕامو ئەمرو نەهیو، باسی دەوڵەتو باسی دادوەرییو باسی جەنگو جیهادو، باسی چیو چی دەکات، ئەو هەمووی لەلا مەڕفوزەو دەڵێ: دەبێ خەڵك بۆخۆی بەرنامەی ژیانی دابنێ، سیکۆلاریزم ئەوەیە، بەڵام بەپێی ئەم ئایەتە بێ، کەسێك دۆستایەتیی لەسەر بناغەی ئیسلام بۆ ئەهلی ئیسلامو ئیمان ساغ نەکردبێتەوەو، ئەهلی کوفر بە دۆست بگرێ، مانای وایە بەو هەڵوێستەی، خوا بەڵگەی لەسەری دەبێ کە مسوڵمان نیە! بەڵام لێرەدا دەبێ وریابین، دۆستایەتیی

گرتن لەگـەڵ ئەهلـی کوفردا جیـایە لـە مـوداراکردن لەگەڵیان، وە جیـایە لـە پەیوەندیـی کۆمەڵایەتیـیو پەیوەندیـی سـیاسییو دراوسێیەتیو هەڵسوکەوتی ڕۆژانە ... هتد، زانایان لەوبارەوە زۆر شتیان گوتوەو کاتی خۆیشی لـە تەفسیری سوورەتی (آل عمران)دا لە تەفسیری ئـەو ئایەتـەدا، کـە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ ﴾، بە تەفصیلڵ باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە لێرەشدا چەند قسەیەکی لەبارەوە دەکەین: سەرەتا قسەیەك لە (حاکم)ەوە، دێنینەوە کە یەکێکە لـە زانایانی فەرموودەناس (قالَ الحاكِمُ: وَهِيَ الموالاة في الدينِ وَالنُّصْرَةِ فيهِ، لا المخالَقة والإحسان)[1]، واتە: دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ ئەهلی کوفردا، بریتیە لەوە کە لەبەر دین ئەوانت خۆشبوێ، وە لەسەر دینو بەرنامەکەیان سەریانبخەی، نەك خۆشڕەفتاریی چاکەکاریی.

ئینسان دەبێ لەگەڵ هەموو کەس خۆش خولْق بێو خۆش ڕەفتارو زمان شیرین بێو ڕووی خۆشبێو بەڕێز بێو، لەگەڵ کافرو مسوڵماندا، ئەوە جیایە لەوەی کە لەسەر بەرنامەکەیان لەگەڵیان بێو سەریانبخاتو لەبەر بەرنامەکەیان خۆشیبوێن، جا دینەکەیان، چ بەرنامەیەکی شێوێندراوی لە ئەسڵدا ئاسمانیی بووبێ، وەك نەصرانییەتو یەهودییەت، وە چ لە ئەسڵ دا ئینسان داینابێ، وەك سیکۆلاریزمو لیبرالیزمو کۆمۆنیزمو سۆشیالیزمو هەموو ئەو شتە ئیزمدارانەی کە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە هاتوون، هەر کەسێك: کۆمەڵێك، حیزبێکی خۆشبوێ لەبەر بەرنامەکەیانو بەرنامەکەشیان پێچەوانەی ئیسلام بێ، ئا ئەوەیە کە خوای دادگەر قەدەغەی کردوەو، ئەوەشە کە ئینسان لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەباتە دەرێ.

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٥٣٣).

لێرەدا قسەیەکی دیکەی جوان لە (الزَّمَخْشَرِي)یەوە دەخوازینەوە: (وَقَالَ الزَّمَخْشَرِي: وَعَنْ صَعصَعَةِ بنِ صوحان أنهُ قَالَ لابْنِ أَخ لَهُ: خَالصِ المُؤمنَ، وَخالِقِ الكَافِر والفَاجِرَ، فَإِنَّ الفَاجِرَ يَرضَى مِنْكَ بِالخُلُقِ الحَسَنِ)[1]، واتە: زەمەخشەریی لە صەعصەعەی کوڕی صووحانەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ نەقڵ دەکات کە بە برازایەکی خۆی گوتوە: لەگەڵ ئیمانداراندا ساغو ڕاست بەو لەدڵەوە خۆشت بوێن، بەڵام لەگەڵ کافرو فاجیردا خۆش خولق بەو خۆش ڕەفتاربە، {مسوڵمانەکەت لەدڵەوە خۆشبوێ، بەڵام کافرەکە بە ڕواڵەت مامەڵەی لەگەڵ بکەو موداراى لەگەڵدا بکەو لەگەڵی خۆش خولقو خۆش ڕەفتار بە}، چونکە بابای گوناهبارو خراپەکار، بە ڕەوشتی جوان لە تۆ ڕازی دەبێو لەسەرت پێویست ناکات بڵێ: لە دڵەوە دەبی خۆشتبوێم، چونکە دەسەڵاتی بەسەر دڵتدا نیەو نابێ بە دڵ غەیری ئەهلی ئیمانو غەیری چاکەو چاکەکارانت خۆشبوێ.

بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئەوە کە ئینسان دەگونجێ سیفەتی چاکی لە ئینسانی کافریشدا خۆشبوێ، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ، کە پێغەمبەری خوا بە ئەشەججی عەبدی قەیسی فەرمووە: ﴿إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١١٧)، والتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠١١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٢٠٤) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، واتە: تۆ دوو سیفەتت تێدان خوا خۆشیدەوێن: هێدییو مەندیی، وە ئارامییو پەلە نەکردن، (الْحِلْمُ) واتە: زوو تووڕەنەبوون[2]، وە (الأَنَاةُ) واتە: پەلە نەکردن[3]، ئنجا ئایا ئەو کابرایە کەی پێغەمبەری خوا ﷺ وای پێ فەرمووە؟ کاتێك کە هاتبوو مسوڵمان بێ، جارێ مسوڵمان نەبوو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ دواکەوتی؟ سەرۆکی وەفدی قەومەکەی خۆی بوو، گوتی: بۆیە دواکەوتم، ئەی موحەممەد!

---

١) محاسن التأويل، ج: (٥)، ص: (٥٣٣).

٢) المعجم الوسيط، ص: (١٩٤)، حَلُم: تأَنَّى وَسَكَنَ عند غَضَبٍ أو مكروه مع قدرة و قوة.

٣) المعجم الوسيط، ص: (٣١)، تأَنَّى: أنِيَ ويأْني فلاناً: أمْهلَهُ و ترفَّق به.

پێم جوان نەبوو بە بەرگی سەفەرێوەو بە تۆزو خۆڵو ئارەقەوە بێمە مەجلیسی تۆ، لە ڕێیە لامدا، خۆم شۆردو بەرگەکەم گۆڕیو، خۆم بۆن خۆش کرد، ئنجا هاتمە مەجلیسی تۆوە، دیارە هێشتا مسوڵمان نەبووە، بەڵام نەجیب بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: تۆ دوو سیفەتت تێدان خوا ئەو دوو سیفەتەی خۆشدەوێن: یەکەم هێدیو مەندیو زوو توورە نابی، دووەم پەلە ناکەی، لە ڕیوایەتێکدا هاتوە دەڵێ: گوتی: ئایا ئەو دوو سیفەتە بۆخۆم پەیدامکردوون یان خوا تێیدا پەیداکردووم، کە خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێن؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوا لە تۆیدا پەیدا کردوون، کەواتە: دەگونجێ ئینسان سیفەتی باشی لە کافریشدا خۆشبوێ، وە دەبێ سیفەتی خراپت لە مسوڵمانیش دا ڕق لێ هەڵبستێ، بەڵام نابێ کافرەکەت خۆشبوێ، سیفەتە چاکەکەیم خۆشدەوێ، حاتەمی طائیی کابرایەکی نەصرانیی بووە، بەڵام سیفەتی سەخاوەتەکەیمان خۆشدەوێ، وە ئازایەتیی ڕۆستەممان خۆشدەوێ، وە عەدالەتی نۆشیروان - کە پادشایەکی فارس بووە – مان خۆشدەوێ، سیفەتی چاکمان لە هەرسێکدا خۆشدەوێو، سیفەتی خراپیشمان لە هەر کەسێکدا بێ ڕق لێ هەڵدەستێ.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾، بێگومان مونافیقەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگردان، وە هیچ یاریدەرێکت بۆ ئەوان چنگ ناکەوێ، (دَرْك) پێچەوانەی (دَرَج)ە، (دَرْك)، واتە: پلە بەڵام بەرەو خوار، (دَرَج)، واتە: پلە بەڵام بەرەو سەرەوە، (يَصعدُ الدرج) واتە: بەرەو سەرێ دەچێ (يَنزلُ مِنَ الدَرَك) واتە: بەرەو خوارێ دەچێ، جا خوا دەفەرموێ مونافیقەکان لە پلەی خوارەوەی ئاگردان، لە بنی بنەوەن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾، کەسیشت چنگ ناکەوێ یارمەتییان بدات، لەبەرچی سزای مونافیقەکان زۆر سەختە؟

**یەکەم:** لەبەرئەوەی کوفرەکەیان زۆر خەستە.

**دووەم:** لەبەرئەوەی دووڕوون، بێ شـەخصـییەتن.

**سێیەم:** پاشان زەرەرو زیانیان بۆ مسولْمانان زیاترە لە کافری ئاشکرا.

**مەسـەلەی حەڤدەیـەم:** **مەرجـەکـانی تۆبـەی مونـافـیقـان**

خـوا کـە باسـی مونافیقـەکان دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾، جگـە لـەو مونافیقانـەی دەگەڕێنـەوەو، چاکسـازیی دەکـەن‌و، دەسـت بـە خـواوە دەگـرن، وە دینـداریی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغ دەکەنـەوە، ئەوانـە لەگـەڵ ئیمانـداران دان، وە خـوا لەمـەوداو پاداشـتێکی مەزن دەداتـە ئیمانـداران، وەك دەبیـنین خوا سـبحانە و تعالـی چـوار مـەرج دادەنـێ، بـۆ وەرگرتنـی تۆبـەی مونافیقـەکان، مونافیقـەکان هـەموویان لـە پلـەی ژێـرەوەی ئـاگردان، جگـە لەوانـەی کـە ئـەم چـوار سـیفەتەیان تێـدان:

١/ دەگەڕێنـەوە.

٢/ چاکسـازیی دەکـەن.

٣/ توند دەسـت بە خـواوە دەگـرن.

٤/ وە دینـداریی خۆیـان بۆ خوا سـاغ دەکـەنەوە.

لەبەرچـی؟ لەبەرئـەوەی کـە ئەگـەر ئینـسـان نـەخۆش کـەوتو دەردەکـەی سـادەبێ، دەرمانەکەشـی سـادەیە، بـەڵام وەختێـك دەردەکـەی ئاوێتەیـە، دەرمانەکەشـی دەبـێ ئاوێتـە بـێ، کـوفری سـادە ئەوەیـە مرۆڤـ کـافرەو تـەواو، گەڕانەوەکەشـی ئەوەیـە کـە دێ ئیمـان دێنـێ، بـەڵام مونـافیق خـۆ نەیگـوتوە کافـرم، گوتوویـەتی مـسـولْمانم‌و درۆی کـردوە، لەگـەڵ کـافرانیش درۆی کـردوەو لەگـەڵ مـسـولْمانانیش درۆی کـردوە، وە لەگـەڵ خـۆی‌و لەگـەڵ خـواو لەگـەڵ هـەموان درۆ دەکـات، لەبەرئـەوە دەردەکـەی قورسـە، بۆیـە خـوای کاربەجـێ

چوار مەرجی بۆ داناون: یەكەم دەبێ بابای مونافیق دەست هەڵبگرێ لەو كوفرە خەستە، ئنجا كە هەتا ئێستا خراپەی كردوە، دەبێ لەمەودوا چاكسازیی بكات، پاشان كە هەتا ئێستا پشتی بە غەیری خوا بەستوە، لەمەودوا دەبێ پشت بە خوا ببەستێو توند دەست بە خواوە بگرێو دەست بە دینی خواوە بگرێ، ئنجا كە هەتا ئێستا دینداریيەكەی بە دەغەڵیی بووە، لەمەودوا دەبێ بە خالیصیی بێو دینداریيەكەی بۆ خوا ساغ بكاتەوەو خڵتەو خاڵی پێوە نەمێنێ.

**مەسەلەی هەژدەیەمو كۆتایی:** كە دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾، واتە: خوا چی داوە لە ئازاردانی ئێوە، ئەگەر شوكرانە بژێربنو ئیمان بێنن، واتە: خوا چ مەدارێك ساز دەكات، ئەگەر بێتو ئێوە سزابدا، بەڵام وەختێك تۆ سپڵەو بێ ئیمان بی، خوا لەسەر سپڵەییو بێ ئیمانییەكەت سزات دەدا، ئەگەرنا وە نەبێ مەدارێكی خۆی بە سزادانی ئێوە ساز بكات، هەروەك هیچ مەدارێكیشی بە طاعەتی ئێمە بۆ ساز نابێ، خۆمانین كە لە چاكەكانمان بەهرەمەندینو خۆشمانین كە لە خراپەكانمان زەرەرمەندین: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ...﴿٤٦﴾ ﴾فصلت، واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات بۆخۆیەتی، وە هەر كەسێكیش خراپەیەك بكات لەسەر خۆیەتی.

(مَكْحُول) كە یەكێكە لە زانایانی تابیعین قسەیەكی جوانی هەیە، دەڵێ: (أَربَعٌ مَنْ كُنَّ فيهِ كُنَّ لَهُ، وَثَلاث مَنْ كُنَّ فيهِ كُنَّ عَلَيْهِ؛ فَالأَربع اللاتي لَهُ: فَالشُّكْرُ وَالإِيمَانُ وَالدُّعَاءُ وَالإِستِغْفَارُ، قَالَ اللَّهُ تَعَالى: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ﴾، وَقَالَ اللَّهُ تَعَالى: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الأنفال،

وَقَـالَ تَعَالـى: ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴿٧٧﴾ ﴾الفرقـان، وَأَمَّـا الثَّلَاث اللاَّتي عَلَيْهِ: فَالْمَكْرُ وَالبَغيُ وَالنَّكْثُ؛ قَالَ اللّهُ تَعَالى: ﴿ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ﴿١٠﴾ ﴾الفتح، وَقَالَ تَعَالى: ﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ﴿٤٣﴾ ﴾فاطر، وَقَالَ تَعَالى: ﴿ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴿٢٣﴾ ﴾يونس)[1]،
واتـە: چـوار سـیفەت لـە هـەر کەسـێکدا هـەبن، لێیـان بەهرەمەنـدە، سـێ سیفەتیش لە هەر کەسێکدا هەبن، لێیان زەرەرمەنـدە، ئـەو چوارەی کە لێیان بەهـرەمەندە: سوپاسـکردنە، ئیمـانە، پـاڕانەوەیە، داوای لێبـوردن لـە خواکردنـە، خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ﴾، خـوا چـی لـە سزای ئێوە دەکات، ئەگەر سوپاسگوزار بن و ئیمان بێنن، کەواتە: شـوکرو ئیمـانو دەبنـە هـۆی ئـەوە کـە ئینسـان غـەزەبی خـوای لـێ دوور بخرێتـەوە، ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتـە: خـوا سـزایان نـادات تـا تۆیـان لەنێودابـی، وە خـوا سـزایان نـادات، ئەگـەر داوای لێبـوردن لـە خـوا بکـەن، ئەگـەر ئینسـان داوای لێبوردن لە خوا بکـات، خوا سـزای نـادات.

وە خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتـە: بڵـێ: پـەروەردگارم گرنگییتـان پـێ نـادات، ئەگـەر نەپاڕێنـەوە، کەواتـە: ئەگەر بپاڕێینـەوە لە خـوا، خـوا گرنگـییمان پێدەداو بایـەخمان پێدەدات، ئـەوە ئـەو چـوارەی کـە لێیـان بەهرەمەنـدین، ئـەو سـێیەش کـە لێیـان زەرەرمەنـدین بـریتین لـە: فێـڵو، دەسـتدرێژییو، پـەیمان شـکـێنیی، خـوای بـەرز دەفـەرموێ: ﴿ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ﴿١٠﴾ ﴾، هەر کەسێك پەیمان بشکێنێ بـە

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن، ج: (٥)، ص: (٣٧٣).

زەرەری خۆیەتی، وە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ﴿٤٣﴾﴾، واتە: فێڵی خراپ هەر سەری خاوەنی دەگرێتەوە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەر کەسێك چاڵ بۆ خەڵك هەڵکەنێ، بۆخۆی تێیدەکەوێ)، وە خوای بەرز دەفەرموێ ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴿٢٣﴾﴾، دەستدرێژیی و زوڵمتان بە زەرەری خۆتان تەواو دەبێ، هیچ زاڵمێك نابینی لە دنیادا مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا هەر بەو زوڵمەی خۆی فەوتاوە، ﴿إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُم ﴿٢٣﴾﴾، هەر کەسێك دەستدرێژیی بکات بە زەرەری خۆی تەواو دەبێ.

خوا بە کەرەمی خۆی لەو چوار سیفەتە بەرزە بەهرەمەندمان بکاتو، لەو سێ سیفەتە پیسو نەگریسەش بەدوورمان بکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە پێنج ئایەت پێكدێ كە ئایەتەكانی (١٤٨ تا ١٥٢)ن، لەم پێنج ئایەتەدا سەرەتا باسی ئەو ڕاستییە كراوە، كە خوا حەز ناكات قسەی خراپ ببیستێ، مەگەر كەسێك ستەمی لێكرابێ، ئەوە بۆی هەیە باسی ستەمدیدەیی خۆی بكات، پاشان باسی ئاشكراكردنو پەنهانكردنی چاكەو لێبوردن لە خراپە دەكات، وە دوایی باسی دوو هەڵوێستی پێچەوانە دەكات، لە بەرانبەر پێغەمبەرانی خوادا (علیهم الصلاة والسلام) كە یەكێكیان بریتیە لە جیاوازیی خستنە نێوان خواو پێغەمبەرانەوەو، ئیمان هێنان بە هەندێكیانو كوفركردن بە هەندێكیان، ئەوەی دیكەشیان بریتیە لە ئیمان هێنان بە خواو بە پێغەمبەرەكانی (علیهم الصلاة والسلام) بەبێ جیاوازیی، كە دیارە سزای هەڵوێستی یەكەمیان سزایەكی ڕیسواكەرەو، پاداشتی دووەمیشیان پاداشتێكی نەبڕاوەی خوایە.

﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلۡجَهۡرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾
إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ
وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ
سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکــان

((خـوا پێـی خـۆش نیـە قـسەی خـراپ دەنگـی پـێ بـەرز بکـرێتەوە، مەگـەر کەسێك سـتەمی لێکـرابـێ، (بـۆی هەیـە باسـی سـتەمدیدەیی خـۆی بکـات)، وە خـوا بیسـەری زانـایە ﴿١٤٨﴾ ئەگـەر چاکـەیەك ئاشـکرا بکـەن، یـان پـەنهانی بکـەن، یـان چاوپۆشـیی لـە خراپەیـەك بکـەن، ئـەوە بێگـومان خـوا چاوپۆشـییکەری بەتوانـایە ﴿١٤٩﴾ بێگومـان ئەوانـەی بـڕوا بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـانی نـاهێنن، وە دەیانـەوێ جیـاوازیی بخەنـە نێـوان خـواو پێغەمبەرەکانییـەوە، وە دەڵێن: بـڕوا بـە هەندێکـیان دێنیـنو بـڕوا بـە هەندێکـیان نـاهێنین، وە دەیانـەوێ لـەو نێوانـەدا ڕێیـەك پەیدابکـەن ﴿١٥٠﴾ ئـا ئەوانـە کـافری ڕاسـتەقینەن، وە ئـازارێکی ڕیـسواکەرمان بـۆ کـافران ئامـادە کـردوە ﴿١٥١﴾ وە ئەوانـەی بـڕوا بـە خـواو بـە پێغـەمبەرەکانی دێنـنو، جیاوازیی ناخەنـە نێـوان هـیچ کامێکیانـەوە، (و ئیمـان بـە هـەموویان دێـنن) ئـا ئەوانـە خـوا لەمـەودوا پاداشـتەکانیان دەداتـەوە، وە خـوا لێبـوردەی بە بەزەیـی یە ﴿١٥٢﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەكان

(ٱلْجَهْرَ) دەڵێ: (الجَهْرُ: يُقَالُ لِظهُورِ الشَّيءِ بِإفْرَاطِ حَاسَةِ البَصَرِ، أَو حَاسَةِ السَّمْعِ)، (جَهْر) لە زمانی عەرەبیدا هەر شتێكە كە زۆر ئاشكرابێ، چ بە هەستی دیتن ببینرێ، چ بە هەستی بیستن ببیسترێ، بە هەستی دیتن وەك بەنی ئیسرائیل بە پێغەمبەر مووسایان گوت: ﴿أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴿١٥٣﴾﴾ النساء، واتە: خوامان بە ئاشكرا پێشانبدە، وە بەنسبەت هەستی بیستن وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴿١٠﴾﴾ الرعد، واتە: یەكسانن ئەوەتان كە بە كپیی قسەی كردوە، وە ئەوەتان كە بە دەنگی بەرز قسەی كردوە، بە شێوەیەكی وا كە ببیسترێ، كەواتە: وشەی (جَهْر) هەم بۆ دەنگ، هەم بۆ ڕەنگ بەكاردەهێنرێ، شتێك كە ئاشكراو زەق بێ‌و، ببیسترێ یان ببینرێ.

(عَفُوًّا) دەڵێ (العَفْوُ: هُوَ التَّجَافِي عَنِ الذَّنْبِ، عَفَوتُ عَنْهُ: قَصَدْتُ إِزَالَةَ ذَنبِهِ صَارِفَاً عَنْهُ)، (عَفُوٌّ) واتە: لێبوردە، جا (عَفْو) بریتیە لەوە كە ئینسان خۆی لە گوناح بە دوور بگرێ، واتە: كەسێك كە گوناهی كردوە خۆت لە گوناهەكەی دووربگری، بەو مانایەی كە چاوپۆشیی لێ بكەی، دەگوترێ: (عَفَوتُ عَنْهُ: قَصَدْتُ إِزَالَةَ ذَنبِهِ صَارِفَاً عَنْهُ)، واتە: ویستم گوناهەكەی لابەرم‌و چاوپۆشیی لێبكەم، وەك بڵێی گوناهەكەی نەكردبێ وایە.

(حَقًّا) (أَصْلُ الحَقِّ: المُطَابَقَةُ والمُوافَقَة... والحقّ: الواجب واللازم والجدير، وَمِنَ الفِعْلِ وَالقَوْلِ والإعتِقَاد مَا هُوَ ثَابت وَلَهُ حَقِيقَة)، وشەی (حَق) واتە: شتێك لەگەڵ شتێك پێكبێت‌و لەگەڵی گونجاوبێ، وە لە زمانی عەرەبیدا شتێك پێویست بێ، وە شتێك بە شتێكە وەبنوسێ‌و بەری نەدا، وە

شــتێکی شـایـسـتە، بـە هـەموویان دەگـوترێ (حَق)، وە لـە کـردارو لـە قـسـە (حـق) بریتیـە لە بڕواهێنـانێك چەسپاوبێ‌و حەقیقەتێکـی هـەبـێ.

(مُّهِينًا ): (مُـذِلاً مُـستَخِفاً، وَهَـانَ: سَـهُلَ، وَأذَلَّ وأَهَـانَ فُلانـاً: اسـتَخَفَّ بـهِ) کـە دەفـەرموێ: ﴿ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾، ســزاو، ئـازارێکی ڕیـسـواکـەر (مُـذِلاً)، واتـە: سـەرشـۆڕکــەر، زەبوونکــەر، وشــەی (هَـانَ)، واتــە: ئاســان بــوو، زەلیــل‌و گەردنکـەچ بـوو، (أَهَـانَ فُلانـاً)، واتـە: گاڵـتەی پێکـردو سـووك تەماشـای کـرد، کەواتە کە دەفـەرموێ: ﴿ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾، واتـە: سـزاو ئـازارێکی ڕیـسـواکـەرو زەبوونکــەر.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا خوای بەرزو مەزن دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا تا ڕاددەیەك پێناسەی ئیمانو کوفرو ئیماندارانو کافرانو مونافیقانی کردو سەرەنجامی هەرکامیانی خستەڕوو، ئاشکراشە کە هەبوونی ئەهلی ئیمانو ئەهلی کوفرو ئەهلی نیفاق لە کۆمەڵگایەکدا، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی تێکگیرانو گرفتو کێشەو دەمەقاڵێ، بە هۆی جیاوازیی فیکریی‌و هەڵوێستی سیاسییەوە، بۆیە لەم ئایەتانەدا سەرەتا باسی دەنگ هەڵهێنان بە قسەی خراپ دەکرێ، چ کاتێك نارەواو چ کاتێك ڕەوایە؟ دەفەرموێ: ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا﴾، واتە: خوا حەزناکات قسەی خراپ دەنگی پێ بەرز بکرێتەوەو دەنگی پێ هەڵبهێنرێ، مەگەر کەسێك ستەمی لێکرابێ، وە خوا بیسەری زانایە، بێگومان خوای تاكو پاك حەز لە چارەی هیچ جۆرە خراپەیەك ناکات، چ پەنهان بێ، چ ئاشکرا، وەك لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ... ﴿١٢٠﴾﴾الأنعام، واتە: واز لە گوناهی ئاشکراو پەنهان بێنن...

بەڵام بێگومان قسەو کردەوەی خراپ کاتێك ئاشکرا دەکرێ‌و پەردەی خامۆشیی‌و پەنامەکییان پێ دەدڕێنرێ، زەرەو زیانیان زیاتر دەبێ‌و ئاشکراکردنی خراپەو گوناه، دەبێتە مایەی تەشەنەکردنو پەرەسەندنیان.

بەڵام خوای دادگەرو کاربەجێ یەك حاڵەت لەو حوکمە هەڵداوێرێ‌و جیای دەکاتەوە، کە بریتییە لە حاڵەتی ستەمدیدەیی وەك فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾.

ئنجا خوای بەرزو مەزن باسی هەر دووك سیفەتی بیستن‌و زانینی خۆی دەكات: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴾، وە خوا بیسەری زانایە، تاكو هۆشداریی بداتە هەموو لایەك كە هەردوو قسەو باس‌و دەنگ‌و سەدایەكیان دەبیستیٚ‌و بە هەموو شتێكیشیان زاناو ئاگادارە.

پاشان خوای كاربەجیٚ ڕایدەگەیەنیٚ كە ئاگاداری خێرو چاكەی ئاشكراو پەنهانەو، خاوەنی ئەوپەڕی لێبوردەیی‌و تواناشە: ﴿ إِن تُبْدُواْ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُواْ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴾، واتە: ئەگەر چاكەیەك ئاشكرا بكەن، یان پەنهان، یان ئەگەر لە خراپەیەك ببوورن، ئەوە بێگومان خوا لێبوردەی توانایە.

لەم ئایەتە موبارەكەشەوە زۆر جوان دیارە كە خوای میهرەبان‌و لێبوردە هەموو لایەك هاندەدا بۆ چاكەكاریی‌و ئاشكراو پەنهان‌و، چاوپۆشییكردن‌و لێبوردەیی، دیارە باسكردنی هەندێك لە سیفەتە بەرزو بیٚ وێنەكانی خوا لە كۆتایی زۆرێك لە ئایەتەكاندا، یەكێك لە حیكمەت‌و مەغزایەكانی بریتییە لە سەرنجڕاكێشانی مسوڵمانان بۆ خۆڕازاندنەوەیان بە سیفەتە بەرزەكانی خوا، ئەوانەیان كە لەگەڵ مرۆڤدا دەگونجێن، وەك: زانیاریی، لێبوردە، بەزەیی، حیكمەت ... هتد.

پاشان خوای بەرزو بیٚ هاوتا، باسی هەڵوێستی خاوەن كتێبەكان لە بەرانبەر پێغەمبەرانی خوادا (علیهم الصلاة والسلام)و هەوڵدانیان بۆ جیاوازیی خستنە نێوانیان دەكات‌و دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە

خواو پێغەمبەرەکانیو، دەیانەوێ جیاوازیی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیو دەڵێن: بڕوا بە هەندێکیان دێنینو بەرانبەر بە هەندێکیان بێبڕوا دەبین، وە دەیانەوێ ڕێیەك لەو بەینەدا بدۆزنەوە. ئا ئەوانە کافری ڕاستەقینەن، وە سزایەکی ڕیسواکەرمان بۆ کافران داناوە.

وەك دواتر لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، مەبەست لە: ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾، ئەوەیە کە ئیمان بە هەندێك لە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) دێننو، ئیمان بە هەندێکیان ناهێنن، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەم ڕستەیە بەراورد (مقارنة)ی پێکراوە لەگەڵ ڕستەی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾دا، ئاشکراشە "کە ئیمان هێنان بە هەموو پێغەمبەرانی خوا بەبێ جیاوازیی" پێچەوانەی: "ئیمان هێنان بە بەشێك لە پێغەمبەرانی خواو، ئیمان نەهێنان بە بەشێکیانو جیاوازیی خستنە نێوانیان"ەو ڕاست دژی یەکدین.

پێشەوایە دەگونجێ بگوترێ: مەبەست بەم ئایەتە موبارەکە کەسانێکە کە لافی خواناسییو بڕوا پێهێنانی لێدەدەن، بەڵام بڕوایان بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) نییە، کە ئەوکاتە دەبێ بڵێین: مەبەست لە: ﴿وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾، خوا سبحانه وتعالى و پێغەمبەرەکاننی، بەڵام مانای یەکەم ڕاستەڕێ ترو گونجاوتریشە.

هەڵبەتە ئیمان هەبوون بە بەرزو بەرزتر (تفاضل) لە نێوان پێغەمبەرانیش دا، کە بێگومان لە ڕووی پێگەو پایەو پلەوە جیاوازن، جیایە لە ئیمان هەبوون بەوە کە هەموویان پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوان بێ جیاوازیی، بۆیە ئیمان هەبوون بە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) بێ جیاوازیی، لەگەڵ دانپێداهێنان بە هەبوونی پێگەو پلەو پایەی جیاواز لە نێوانیاندا، ناکۆكو پێکەوە دژنین.

ئنجا لە كۆتاییدا خوای كاربەجێ باسی هەڵوێستی ئیمانداران دەكات لە بەرانبەر پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوادا (علیهم الصلاة والسلام)و دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾، واتە: وە ئەوانەی بڕوا بە خواو پێغەمبەرانی دێنن‌و جیاوازیی ناخەنە نێوان هیچ كامیانەوە، ئا ئەوانە لەمەودوا پاداشتی خۆیانیان دەداتەوە، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە.

شایانی باسیشە خوای كاربەجێ بۆیە كەسانێك كە جیاوازیی دەخەنە نێوان پێغەمبەرانی خواوە، بە ئیمان پێهێنانی هەندێكیان‌و، بێبڕوابوون بە هەندێكیان، بە كافرو بێبڕوا بە خواو سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) لە قەڵەمی داون، چونكە هەر كەسێك بڕوای بە یەكێك لە پێغەمبەران نەبێ، مانای وایە بڕوای بە هیچیان نیە، بەتایبەت پێغەمبەری كۆتایی (محمد) ﷺ كە هەموویان موژدەیان بە هاتنی داوە بە میللەتەكانیان، هەروەها هەر كەسێكیش بڕوا بە پێغەمبەران‌و ڕەوانەكراوانی خوا نەهێنێ، مانای وایە ئایین‌و بەرنامەو فەرمایشتی خوای ڕەفز كردووە، بە ڕاستی نەزانیوە، دیارە بابای واش بە بێبڕوا بە خوا دادەنرێ.

## چـەند مەسـەلەیـەکی گرنـگ

**مەســەلەی یەکــەم:** کــە خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾، خـوا حەزناکــات قــسـەی خــراپ ئاشـكرا بكـرێ، مەگـەر کەسێك سـتـەمی لـێکرابـێ، ئەو بۆی هەیـە قـسـەی خــراپ بـە ئاشـكرا بەرانبـەر بە کەسێك بكات کە زوڵمی لـێکـردوە، دیـارە ئـەم ڕسـتـە قورئانییـە ئـەوەی لــێ وەردەگـیرێ، کـە قەدەغەیـــەو حەرامـە ئینـسـان قـسـەی خـــراپ بـە ئاشـــكرا بەرانبـەر بە هیچ کەس بكات، جا ئەو قسەی خراپــەی بـە ئاشــكرا، دەگونجـێ بە شـێوەی تــووكو دووعابــێ، یـان زەمو غـەیبـەت بـێ، وە دەگونجـێ بـە شـێوەی بانگەشــەی خــراپ بــێ، وە دەگونجــێ بە شــێوەی بوختــان بـۆكردن بــێ ..هتـد، هـەر شـێوەیەك لـە قـسـەکردن ببێـتـە هـۆی زیـان گەیانـدن بـە لایـەنی بەرانبـەر قەدەغەیـــە، بـە ئاشـكرا، ئـەدی بـە پەنهــانیی؟! دیـارە بـە پـەنهانییش هــەر قەدەغـەیە، بـەڵام بـە زۆریـی وایـــە کـە کـاتێـك کەسـێك لـە بەرانبـەر کەسـێكدا هەست بە سـتـەمدیدەیی دەكـات، بـە ئاشـــكرا قـسـەی لـە بەرانبـــەردا دەكــات، جــا چ بــە شـــێوەی زەمو غەیبـــەت بــێ، چ دووعـای خراپـی لــێ بكـات، وە چ بوختــانی پــێ بكــات.... هتــد، وە ئــەم ڕسـتـە قورئانییـــە وەك ئــەو ئایەتانــەی سوورەتی (الحجرات) وایە، کـە خـوای دادگـەر دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ

أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾الحجرات، لەم دوو ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی شەش جۆرە گوناح دەكات، سێیان ئاشكراو سێیان پەنهان، سەرەتا باسی سێ گوناهە ئاشكرایە دەكاتو دەفەرمووێ: ئەی ئیمانداریینە! با هیچ كۆمەڵێكتان لە پیاوان گاڵتە بە كۆمەڵێكی دیكە لە پیاوان نەكەن، هەروەها بە هیچ كۆمەڵێك لە ئافرەتان گاڵتە بە كۆمەڵێك لە ئافرەتان نەكەن، وە عەیب لە خۆتان مەگرن، (عەیب لە یەكدی گرتن واتە: عەیب لەخۆگرتن، چونكە ئەو برا مسوڵمانە، ئەو خوشكە مسوڵمانە وەك خۆتە، كە عەیبت لەو گرت، لە خۆتت گرتوە) وە ناوونـاتۆرە لە یەكدی مەبیننەوە، لە دوای ئیمان هێنان خراپترین ناو ناوی فاسقێتییە، (ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە بە هەركام لەو سێ گوناهە: گاڵتە بە یەكێك بكەی، عەیبی لێ بگری، ناوونـاتۆرەی لێ بنێی مرۆڤی مسوڵمان فاسق دەبێ)، دوایی دێتە سەر باسی سێ گوناهی دیكەی پەنهانو دەفەرمووێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! گومانی خراپ بە یەكدی مەبەنو خۆتان لە زۆر گومانان بپارێزن، چونكە هەندێك لە گومانی خراپ گوناهە، وە سیخوڕیی لەسەر یەكدی مەكەن، وە پاشملە بە خراپە باسی یەكدی مەكەن، ئایا یەكێكتان حەز دەكات بە مردوویی گۆشتی برایەكەی بخوات؟ بێگومان پێتان ناخۆشە، وە پارێز لە خوا بكەن، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەیی یە.

كەواتە: هەموویان هەر قەدەغەن، ئەو ڕستە قورئانییە كە دەفەرمووێ: ﴿لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ﴾، خوا حەزناكات، پێی خۆش نیە قسەی خراپی ئاشكرا ببیستی، مەگەر كەسێك زوڵمی لێكرابێ، مانای وانیە كە خوای پەروەردگار حەز بكات قسەی خراپی پەنهان ببیستێ، نەخێر، چ ئاشكرا، چ پەنهان نابێ ئینسان قسەی خراپ بەرانبەر بە هیچ كەس بكات، بەڵام ئەو حوكمە یەك حاڵەتی لێ

هەڵاوێردراوە ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾، مەگەر کەسێك ستەمی لێکرابێ، ئینسان کە ستەمی لێکرا، بۆی هەیە باسی مەزڵوومیەتی خۆی بکات، کە ئەوە لە مەسەلەی دووەمدا دەخەینە ڕوو.

**مەسەلەی دووەم:**

## بابای ستەملێکراو بۆی هەیە بە خراپ باسی ستەمکارەکەی بکات

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾، مەگەر کەسێك ستەمی لێکرابێ، لێرەدا خوای کاربەجێ کەسێك زوڵمی لێکرابێ هەڵیداوێری و جیای دەکاتەوە لە حوکمی ئەوە کە خوا حەزنەکات قسەی خراپ ئاشکرا ببیستێ، بەرانبەر بە کەس، مەگەر کەسێك ستەمی لێکرابێ، ئەو بۆی هەیە قسەی خراپ بکات، قسەکردنی خراپیش چەند جۆرێکە:

**جۆری یەکەم:** دەگونجێ تووك و دووعای خراپ بێ، ئەگەر بێ دەستەڵات بێ.

**جۆری دووەم:** دەگونجێ سکاڵای خۆی لەلای دادوەرێك، لەلای دەستەڵاتدارێك بکات، بڵێ: فلان کەس ئاوا زوڵمی لێکردووم، باسی ستەمدیدەیی یەکەی خۆی بکات، با بەرانبەرەکەی پێشی ناخۆش بێ.

**جۆری سێیەم:** دەگونجێ باسی بکات بەگشتی، یانی لەنێو کۆڕو مەجلیسدا باسی مەزڵوومیەتی خۆی بکات، ئەگەر کەسێك نەبوو دادی بدات و سکاڵایەکەی ببیستێ.

وە لەوبارەوە ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەن، کە من بە نموونە هەندێکیانم هێناون:

**فەرمایشتی یەکەم:** ﴿عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلَا يَقْرُونَنَا فَمَا تَرَى؟ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ، فَاقْبَلُوا، فَإِنْ

لَـمْ يَفْعَلُـوا، فَخُـذُوا مِـنْهُمْ حَـقَّ الـضَّيْفِ الَّـذِي يَنْبَغِـي لَهُـمْ» ﴾ أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٧٣٨٣)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٤٦١)، وَمُـسْلِمٌ بـرقم: (٤٤٩١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٧٥٢)، وَابْنُ مَـاجَهْ بـرقم: (٣٦٧٦)، واتـە: عوقبـەی کوڕی عامـیر خـوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: گوتمـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! جاری وایـە تـۆ دەماننێـری بـۆ شـوێنێك (بـۆ سـەفەرێك، بـۆ جەنگـێك) دەبینـە میـوان لـە خەڵكـێك (لـە دێیـەك، لـە شـارێك لادەدەیـن) بـەڵام میوانداریمـان ناکـەن، (واتـە: ئامـادە نـابن ڕامـانبگـرنو خواردنمـان بدەنـێ، کە هـەقی میـوانە! ڕات چییـە؟ چی بکـەین؟) پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی فەرمووییـن: هـەر کاتێـك لـە لای کۆمـەڵێك دابـەزین (واتـە: لاتانـدایـە شـوێنێك) ئەگـەر ئـەوەی پێویـستە بـۆ میـوان، بۆیـان ئەنجامـدان، لێیـان وەربگـرن، (واتـە: زیـاتریان لـێ چاوەڕوان مەکـەن)، بـەڵام ئەگـەر وایانـنەکرد بایی ئەوەندەی کە مافی میوانـە، بۆتـان هەیـە لـێیان وەربگـرن، (واتە: ئەگەر بە زۆرییش بـێ).

کەواتـە: میـوان بـۆی هەیـە هەقەکـەی خـۆی لـە خانـە خـوێی وەربگـرێ، کـابرا ڕێبـوارە پەکـی کـەوتوە کەسـێك پاروونانێکـی نەداتـێ، ئایـا لـە برسـان بمرێ، یـان بایـی بژیوی خۆی وەربگـرێ؟ بۆی هەیە وەریبگـرێ.

**فەرمایشـتی دووەم:** ﴿عَن أبي هُرَيرةَ ﷺ؛ أَنَّ رَجُلاً أَتَـى النَّبِـيّ ﷺ فَقَـالَ: إِنَّ لِـي جَـاراً يُـؤْذِينِي؟ فَقَـالَ لَـهُ: أخـرج مَتَـاعكَ فَضعهُ عَلَـى الطَّريـقِ فَأخـذَ الرَّجُـل مَتَـاعَهُ فَطَرحـهُ عَلَـى الطَّريـق فَجَعَـلَ كُـل مَـنْ مَـرَّ بِـهِ قَـالَ: مَـا لَـكَ؟ قَـالَ: جَـارِي يُؤْذيـني فَيَقُـولُ: اللَّهُـمَّ العنـهُ اللَّهُـمَّ اخـزه، قَـالَ: فَقَـالَ الرَّجُـلُ ارجِـع إِلَـى مَنْزِلِـكَ وَاللَّـهِ لاَ أؤذيـكَ أَبـداً﴾ أَخْرَجَـهُ الحَـاكِمُ برقم: (٧٣٠٢)، وَالبُخَارِيُّ فـي (الأدب الـمفرد) بـرقم: (١٢٤)، وَقَـالَ الـشيخ الألباني: حَسَـنٌ صَحِيحٌ)، واتە: ئەبو هورەیـرە خوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: پیـاوێك هاتـە لای پێغـەمبەری خـوا ﷺ گوتـی: دراوسـێکەم ئەزیـەتم دەدات، (ئایا بـە زمـان ئەزیـەتی دەدات، بـە دەسـت ئەزیـەتی دەدات؟ ڕوونـی

نەكردۆتـەوە) پێغـەمبەریش ﷺ فـەرمووی: كەلوپەلـی ماڵەكـەت بخـە دەرێ، لەسـەر ڕێگـا دایبنـێ، (وەك سـكاڵاكردن لەدەسـت ئـەو دراوسـێیە خراپـە)، ئـەویش كەلـوپەلەكەی لـە دەرێ دانـا (ئـەو كەلوپەلانـەی كـە ناگونجێ لـە دەرێ دابنرێـن) ئنجا هەركەس بـەو ڕێگـایەدا دەهات (دیـارە ماڵەكەیـان لەسـەر ڕێ بـووە) دەیگـوت: دراوسـێكەم ئەزیەتـم دەدات (ڕەنگـە گوتبێتـی دەمـەوێ بـاربكەم، یـاخود قـسەیەكی ئـاوا)، ئـەوانیش دەیانگـوت: خوایـە لەعنـەتی لـێ بكـە، خوایـە شـەرمەزاریی بكـە، (ئـاوا دووعـایان لە دراوسێكەی دەكـرد كـە ئەزیـەتی دەدا)، دیـارە ئەمـە لـێرەدا بە كورتیی باسكراوە، ئەگـەرنا دەبـێ ئـەو كەسـەی ماڵەكـەی بردۆتـە دەرێ بەڵگەیەكی ئاشكراو ڕوونـی پـێ بووبـێ، وە سەلـماندبی كـە دراوسێیەكەی ئەزیـەتی دەدات، ئەگـەرنا هـەر كەسێك گـوتی: دراوسـێم ئەزیـەتم دەدات، مەرج نیـە ڕاسـت بكـات)، دوایـی كـابرای كـە دراوسـێكەی خۆی ئەزیـەت دەدا گـوتی: بگـەڕێوە ماڵـێ كەلوپەلەكـانت بـەرەوە، سـوێند بـە خـوا لەمـەو دوا ئەزیەتت نـادەم.

**فەرمایـشتی سـێیەم:** ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٩٧٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٢٨)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٨٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٤٢٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٠٨٩)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٢٩١٩)، واتە: عـەمری كـوڕی شـەرید لە بـابی دەگێـڕێتەوە خـوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: بابـای هـەبووی ملنـەدەر بـۆ دانـەوەی قـەرز، ملـنەدانەكەی دەبێتـە مایـەی ڕەوابـوونی باسـكرانی بـە خراپـەو سـزادرانیشی. (يُحِلُّ عِرْضَهُ) واتـە: ڕەوا دەكـات كـە باسـبكرێو لـە كەسـایەتیی بـدرێو لەكـەدار بكـرێ (وَعُقُوبَتَهُ) هـەروەها ڕەوا دەكات كـە سـزاش بـدرێ، واتـە: پـاش سـكاڵالێكـرانی لـە لای دادوەر بەنـدی بكـاتو سـزای بـدات، تـاكو خـاوەن قەرزەكـە هەقەكـەی

وەردەگرێ، مادام قەرزدارەکە هەیەتی، ئەدی ئەگەر نەیبێ؟ ئەوە دەبێ بابای خاوەن قەرز چاوەڕێی بکات، تاکو قەرزدار پارەی پەیدادەبێ‌و دەیداتەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ...﴿٢٨٠﴾ ﴾البقرة، واتە: وە ئەگەر (بابای قەرزدار) تەنگ دەست بوو، سەغڵەت بوو، دەبێ چاوەڕێ بکرێ، تاکو ئاسانیی‌و فەرحانیی بۆ دێ‌و دەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە، بەڵام ئەگەر هەیبێ‌و مل بابداو نەیداتەوە، ئەوە بۆ تەرەفی بەرانبەر حەلاڵە کە باسیشی بکات، وە هەوڵبدات سزای خۆیشی بەسەردا بسەپێنێ، نەك خۆی ڕاستەوخۆ بەڵکو لە ڕێی دادگاوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴾، ئەگەر چاکەیەك ئاشکرا بکەن، یان پەنهانی بکەن، وە ئەگەر لە خراپەیەك چاوپۆشیی بکەن، بێگومان خوا لێبوردەی بە توانایە، ئەم ئایەتە سێ شتی لێ وەردەگیرێن:

**یەکەم:** چاکە دەگونجێ بە ئاشکرا بکرێ‌و دەشگونجێ بە پەنهانیی ﴿ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ ﴾، (خَیْر) هەم بە طاعەت دەگوترێ، هەم بە چاکە (إحسان)، هەم بە هاوکارییکردن، واتە: وشەی: (خَیْر) بەو شتانە دەگوترێ کە بۆ خوا دەکرێن، وە بۆ خەڵك دەکرێن، واتە هەر شتێك کە بۆ خوا جێگای ڕەزامەندییەو بۆ خەڵکیش جێگای سوودە، جا خوا دەفەرموێ: هەر شتێکی چاك، ئاشکرای بکەن، یاخود پەنهان، دیارە خوای زانا پێی دەزانێ، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (البقرة) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾

واتە: ئەوانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن بە شەوو بە ڕۆژ، بە پەنهانییو بە ئاشکرا، بەڵام ئایا وا باشە بە شەوبێ، یان بە ڕۆژبێ، بە ئاشکرابێ، یان بە پەنهان؟ ئەوە دەکەوێتە سەر تەقدیرو عەقڵو سەلیقەی ئەو کەسەی کە چاکە دەکات، جاری وایە وا باشە بە پەنهانیی بیکات، وە جاری وایە وا باشە بە ئاشکرا بیکات، جاری وایە بە شەو، وە جاری وایە بە ڕۆژ، دیارە هەموو ئەو حاڵەتانەش، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا بە تەفصیل باسمان کردوون.

بەڵێ چاکە دەگونجێ پەنهان بێ، وە دەشگونجێ ئاشکرابێ، بەڵام دیاریکردنی چاکەکردنی پەنهان یان ئاشکرا، دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتو بارودۆخی بابای چاکە لەگەڵکراوو بابای چاکەکار.

**دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ﴾، واتە: ئەگەر لە خراپەیەك ببوورن، چاوپۆشیی بکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خوای لێبوردە لێبوردنی پێ خۆشە.

**سێیەم:** ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا﴾، واتە: بێگومان خوا لێبوردەی بەتوانایە، کەواتە: لێبوردن یەکێکە لە سیفەتەکانی خوای بێ وێنە، خوای پەروەردگار لێبوردەیە، وە پێی خۆشە بەندەکانیشی لێبوردەبن، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ لە کۆتایی زۆر ئایەتاندا سیفەتەکانی خۆی باس دەکات، بۆ نموونە: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٧٣﴾ البقرة، ﴿... وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٦﴾ النساء، ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٢٢٠﴾ البقرة، ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ٤٣﴾ النساء، ﴿... فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ١٤٩﴾ النساء، ئەوە هەمووی مەبەست پێی ئەوەیە کە ئێوەش ئەی بەندەکانم ! ئەی ئینسانەکان ! ئەو سیفەتانەی خوا لەخۆتاندا

بێننە دی: خوا زانایە، تۆش هەوڵبدە زانابی، خوا بەتوانایە تۆش هەوڵبدە بەتوانابی، خوا لێبوردەیە، تۆش هەوڵبدە لێبوردەبی، خوا بە بەزەیی یە، تۆش هەوڵبدە بە بەزەیی بی ... هتد، ئەو سیفەتانەی کە لەگەڵ ئینسان دەگونجێن، بەڵام دیارە هەندێ سیفەتی خوای بێ وێنە هەن کە لەگەڵ ئینسان ناگونجێن، بۆ وێنە: خوای تاكو پاك: بەدیهێنەرە، وە خوا: مل پێ کەچکەر (جبَّار)ە، وە خۆ بە گەورەزان (متکبِّر)ە، ... هتد، ئەو سیفەتانەی کە لەگەڵ ئینسان ناگونجێن، ئەوە جیایە ئەگەرنا ئەوانیدیکە کە لەگەڵ ئینسان دەگونجێن، پێویستە ئینسان هەوڵبدات لەخۆیدا بەرجەستەیان بکات، بۆیەش خوای پەروەردگار کۆتایی ئایەتەکان بەو سیفەتانەی خۆی دێنێ، واتە: ئێوەش ئەو سیفەتانەی خوای کاربەجێ لەخۆتان بێنەدی.

ئنجا ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە: ئێوەش هەوڵبدەن لە جیاتی سکاڵاو، تووكو، باسکردنی خراپە، ئەگەر تواناتان بەسەر خۆتاندا دەشکێ هەوڵبدەن لێبوردەیی بکەنە پیشەو، لە تەرەفی بەرانبەر ببوورن با خراپەشی کردبێ، بەڵام بە مەرجێك ئەو لێبوردنە وای لێنەکات کە لەسەر خراپە بەردەوام بێ، ئەگەر بزانن مەعدەنەکەی باشە، ئینسانێکی بەڕێزەو خراپەی زیاتر ناکات، لێی ببوورە، بەڵام ئەگەر بزانی بە هۆی لێبوردنەکەتەوە زیاتر پێی لێ هەڵدێنێو، زوڵمی لە تۆ کردوە، زوڵم لە یەکێکی دیکەش دەکات، یاخود زوڵمێکی لێکردووی، دەیکاتە دوو زوڵم! ئەوە دیارە نابێ ببەخشرێ، ئەویش وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کەنگرو ماست بە وەختی خۆی) هەر شتەو لە شوێنی خۆیدا، ئنجا لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، کە سێ یاسامان بۆ بەیان دەکات، کە زۆر جێی سەرنجو پەند لێ وەرگرتنن: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللَّهِ ﷺ: مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِالْعَفْوِ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٧٢٠٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٥٣٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٢٩) وَقَالَ: حَسَنٌ

صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٢٤٨)، وَالدَّارَمِـيُّ بـرقم: (١٦٢٨)، واتـە: ئـەبو هورەیـرە خوا لـێی ڕازی بێ دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی:

١- هـیچ کـاتێك خێـرکردن نابێتـە هـۆی کەمبوونـەوەی مـاڵ، (بـە ڕواڵـەت کەسـێك خێـر لـە مـاڵو سـامانەکەی دا بکـات، لـێی کـەم دەبێتـەوە، بـەڵام پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: بەخشین نابێتـە هۆی کەمبوونـەوەی مـاڵ).

٢- خـوا بـۆ هـیچ بەندەیـەك بـە هـۆی لـێبوردنو چاوپۆشـییەوە، جگـە لـە عیـززەت زیـاد ناکات، (بـە ڕواڵـەت وا دێتـە پـێش چاو کەسـێك لـە هـەقی خـۆی خۆشـبێ، یـان چاوپۆشـیی لـێ بکـات، وەك بڵـێی لـە عیززەتـی کەمبۆتـەوە، بـەڵام پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: خـوا هـەر عیـززەتی زیـاد دەکات، کە دوایی ڕوونـی دەکەینـەوە چۆنـە؟!).

٣- هـیچ کەسـێك لەبەر خـوا خـۆی بـە کـەم نەگـرتووەو خـۆی خاکیـی پێشـان نـەداوە، مەگـەر خوا بـەرزی کـردۆتـەوە.

ئنجا ئایـا ئـەمـە چۆنـە؟ بەم شێوەیـە:

١) کـە ئینـسان بەخـشندەو سـەخیی بـوو، ماڵەکـەی خـۆی بەخـشی، خـەڵك خۆشـی دەوێو دووعـای خێـری بـۆ دەکـەنو، بـە چـاکە باسـی دەکـەن، وە خەڵـك حـەز بـە تێکـەڵـیو لـێ نـزیکبوونـەوەی دەکـەنو متمانـەی پێدەکەن، لـە ئـەنجامی ئـەوەدا ڕەنگـە کـارو کاسـبی چاکـتری دەسـتکەوێو، خوای پەروەردگار بەرەکـەت بخـاتە ماڵەکـەی.

٢) بەنسبەت ئەوەوە کە مرۆڤ لە هەقی خۆی، خەڵك دەبەخشێو لە جیاتی تۆڵەسـتاندنەوەو لێیـان دەبـووریٚ، عیـززەتی پێـی زیـاد دەکـات، ئـەوەش ئاوایـە کـە کاتێـك ئینـسان لـە هـەقی خـۆی خـەڵك دەبەخـشێو، بـە دڵ گـەورەیـیو دڵ فراوانـیو لـێبوردەیی لەگـەڵ خـەڵك مامەڵـە دەکـات، لەڕاسـتییدا عیـززەتی لـەلای خەڵـك زیـاد دەکـاتو، شـەخصییەتی زیاتر دەکـات، حورمـەتو ڕێزی زیـاتر دەبـێ.

٣) ئنجا ئـەوەی دیکـەیان کە هـەر کەسـێك لەبـەر خـوادا خـۆی بـە کـەم بگـرێ، خـوا بـەرزی دەکـاتەوە، ئینـسـانی خـۆ بـە زلـگـر خەڵـك بـە کـەم تەماشـای دەکات، بەڵام ئینسانی خاکـیو خۆ بە کەمگـر، بـە ڕێـزو خۆشـەویـسـت دەبـێ لەلای خەڵك، وە خـوای پەروەردگـاریش سـوننەتو یاسای وایـە، کـە هـەر کەسـێك لـەلای خەڵـك بـەڕێزو پەسـندو خۆشـەویـسـت بـێ، خـوای دادگـەریش بـەرزی دەکـاتەوە.

**مەسـەلەی چـوارەم:** کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗا ﴾، بێگومـان ئەوانـەی بێـبڕوان بەرانبـەر بـە خـواو بـە پێغەمبـەرانی خـوا (علـیهم الـصَّلاة والـسلام)، وە دەیانـەوێ جیـاوازیی بخەنـە نێـوانی خـواو پێغەمبـەرانی یـەوە، وە دەڵـێن: ئیمـان بـە هەنـدێکیان دێـنین، وە ئیمان بە هەندێکیان ناهێـنین، ئـا ئەوانـە کـافری ڕاسـتەقینـەن.

ئایـا لێـرەدا مەبەسـت کـێیە؟ لەڕاستییـدا مەبەسـت خـاوەن کتێبەکـانن، بۆچـی؟ چونکە ئایا کـێ جیـاوازیی خـستۆتە نێـوان پێغـەمبەرانەوە (علـیهم الصَّلاة والـسلام)؟! خـاوەن کتێـبەکـان، سـەرەتاش جوولەکەکـان، کە ئیمانیـان بـە پێغەمبـەران هەیـە بـە مووساشـەوە ؑ، بـەڵام ئیمـان بـە عیـسا ؑو بـە موحەممـەد ﷺ ناهێنـن، بگـرە عیـسا ؑ بـە زۆڵ لـە قەڵـەم دەدەن، وەك دوایـی باسـی دەکـەین، وە بـۆ موحەممـەدیش ﷺ دەڵـێن: ڕاسـتی نـەکردووەو پێغەمبەری خـوا نـەبووە، ئـنجا نەصـڕانییەکـان ئیمـان بـە هـەموو پێغەمبـەران دێنن بە مووساشەوە ؑ، دیـارە کە مووسـاش ؑ، پێغـەمبەری خوایـە، بـەڵام ئیمـان بـە موحەممـەد ﷺ ناهێنـن، کەواتـە: ئـەم ئایـەتە لێـرەدا مەبەسـتی پـێ ئەوانـە، جـا لێـرەدا یـەکێك بـۆی هـەیـە بپرسـێ: باشـە بۆچـی خـوا

دەفــەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ﴾، ئـەوانـەی بێبـڕوان بەرانبــەر بـە خـواو بـە پێغەمبــەرانی خـوا ؟ دەڵـێین: لەڕاسـتییدا ئیمـانی ڕاستەقینە بە خوا لە ڕێی پێغەمبەرانەوە دەبێ، واتە: جوولەکەو نەصـڕانیی خوا دەناسـن، بەڵام بۆچـی خـوای بەرزو مەزن بە کـافر لـە قەڵەمیـان دەداتو دەفەرمـوێ: ئیمانیـان بـە خـوا نیـە؟ چـونکە ئیمـانی ڕاسـتەقینەو ڕاسـتو دروست لە ڕێی پێغـەمبەرانەوە دەبێ (علیهم الصَّلاة والسلام)، کاتێك ئـەوان ئیمان بە پێغـەمبەری خاتـەم ناهێنن، کە دوا کـتێبـی لە لای خـواوە بـۆ هـاتوە، مانـای وایە ئەوان ئیمانی ڕاسـتو دروستیان بـە خـوای پـەروەردگار نیـە، بۆیـە خـوا لەسـەر زاری جوولەکـەو نەصـڕانییەکان دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ...﴿١٨﴾ ﴾المائـــدة، واتـــە: جوولەکـــەو نەصـڕانییەکان گوتیـان: ئێمـە کـوڕانی خـواینو خۆشـەویـستانی خوایـن، کـە ئـەوە درۆیەکـە بـە نـاوی خـواوە دەیکـەن، چـونکە خـوا کـوڕی نـین، وە بـە موتڵەقییش بڕیـاری نەداوە، کەس خۆشـەویـستی بـێ، مەگـەر بەنـدەی چاك بـێ بـۆ خـوا، مەگـەر ئیمانـدارو بـە تەقوابـێو پابەندبـێ بـە بەرنامـەی خـواوە، کەواتـە: بۆیـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: کـوفر بـە خـوا دەکـەن، وە کوفـر بـە پێغەمبەرانی دەکـەن.

ئنجـا پرسـیارێکی دیکـە دێتـە پـێش: ئایـا بۆچـی ئیمـان نـەهێنان بـە هەندێکیان کوفرە؟ وە کوفرە بە هەموویان؟ وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ﴾، ئەوانـەی بێـبڕوان بەرانبـەر بـە خـواو بـە پێغەمبەرانی خـوا، لـە حاڵـێکدا کـە وەك گوتمان، جوولەکە تـەنیا ئیمانیـان بـە موحەممـەدو عیـسا (علیهما الصلاة والسلام) نیـەو نەصـڕانییەکانیش بـەس ئیمانیان بە موحەممـەد ﷺ نیـە؟! وەڵامەکەی ئەوەیـە: چونکە پێغەمبـەران هـەموویان لـە یـەك سـەرچاوەوە هـەڵیانهێنجـاوە، وە هەمووشـیان یەکـدی

بەڕاست دەزانن، ئیمان بە هەر کامێکیان نەهێنی، مانای وایە ئیمانت بە هیچیان نەهێناوە؟ چونکە مووسا ﷺ بڕوای بە هەموو پێغەمبەران هەبووە، وە بڕوای بە موحەممەدی خاتەمیش ﷺ هەبووە، وە موژدەشی داوە بەوەی کە پێغەمبەری کۆتایی دێو ناوی موحەممەدە، وە موژدەشی داوە بە هاتنی عیساش ﷺ، کەواتە: کەسێك کە ئیمان بە عیساو بە موحەممەد (علیهما الصلاة والسلام) ناهێنێ، مانای وایە ئیمانی بە مووساش ﷺ هەڵدەوەشێتەوە، هەروەها نەصرانییەکان کە ئیمان بە موحەممەد ﷺ ناهێنن، ئیمان هێنانیان بە عیساش ﷺ هەڵدەوەشێتەوەو، مانای وایە پابەندنەبوون بە قسەی عیساشەوە ﷺ کەواتە: ئیمانیان بەویش نیە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ ﴾، ئا ئەوانە کافری ڕاستەقینەن، ئەوانە بەڕاستیی کافرن، توێژەرەوانی قورئان ئاوایان لێکداوەتەوە: (أي الذين كَفَرُوا كُفْراً ثابتاً لاريبَ فِيهِ)، ئەوانەی کە بێبڕوا بوون بە شێوەیەکی چەسپاو، کە هیچ گومانی تێدانیە، ئنجا ئایا بۆچی خوای کاربەجێ ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە؟ حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ئێمە دڵنیابین هەر کەسێك ئیمان نەهێنێ بە یەکێك لە پێغەمبەران، ئەوە کافرێکی بەڕاستییە، نەك بڵێی: چونکە ئیمانی بە مووسا و عیسا (علیهم السلام) هەیە، ڕەنگە هەر تۆزێك کافربێ!! نەخێر، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ ﴾، ئەوانە بەڕاستی کافرن، هیچ گومانتان لە کافربوونیاندا نەبێ، جا بۆیەش ئەم مەسەلەیەم بە جەختکردنەوە ڕوونکردەوە، چونکە هەندێك لە زانایانی ئیسلام ئەوانەی کە زۆر شارەزانین، یاخود زانایانی ڕەسمیی، ئەوانەی کە زیاتر لە دەوڵەتو ڕژێمەکانەوە ڕێنمایی وەردەگرن، جارجار لە بۆنەو یادەکاندا گوتوویانە: بۆمان نیە بڵێین: ئەهلی کیتاب، یاخود جوولەکەو نەصرانیی، کافرن، ئەوانیش ئیمانیان بە خوا هەیەو ئیمانیان بە ڕۆژی دوایی هەیەو، ئیمانیان

بە پێغەمبەرانیش هەیە، بەڵێ ئیمانیان بە موحەممەد نەهێناوە، بەڵام ئیمانیان بە پێغەمبەرانی دیکە هەیە، کەواتە: دروست نیە بڵێی کافرن، جا ئایا ئەو قسەیە ڕاستە؟ نەخێر، ئەوە قسەیەکی بێ بنەمایە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەو جۆرە کەسانە ئیمانیان نیە، لەڕاستییدا ئەوانە بڕوای ڕاستەقینەیان نە بە خواو، نە بە دواڕۆژو، نە بە پێغەمبەرانی خۆشیان هەیە، بۆیە خوای زاناو شارەزا مۆری کوفرێکی بێگومانی بە نێوچەوانەوە ناون.

**مەسەلەی شەشەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ ﴾، هیچ جیاوازیی ناخەنە نێوان هیچ کامێکیانەوە، واتە: جیاوازیی ناخەنە نێو هیچ کامێك و ئەوانی دیکەیانەوە، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە خۆ خوای دادگەر بۆخۆی جیاوازیی خستۆتە نێوان پێغەمبەرانەوە، وەك: دەفەرموێ: ﴿تِلۡكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ... ﴿٢٥٣﴾﴾ البقرة، واتە: ئەو پێغەمبەرانە هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، پاشان لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿٥٥﴾﴾، واتە: وە پەروەردگارت زاناترە بەوانەی کە لە ئاسمانو زەوی دان، وە هەندێك لە پێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکدا هەڵبژاردوە، وە زەبووریشمان بە داوود دابوو، ئەدی ئەوەنیە خوای پەروەردگار باسی پێغەمبەران دەکاتو دەفەرموێ: هەندێکیان لە هەندێکیان بەرزترن و بەسەریاندا بەرزکراوەنەوەو هەڵبژێردراون، ئەدی بۆچی خوا فەرموویەتی: ئەوانەی کە ئیمان بە خواو بە پێغەمبەران دێنن و جیاوازییش ناخەنە نێوان هیچ کامیانەوە؟ هەروەها ئەوانەی کە دەیانەوێ بە حیساب ڕەخنە لە قورئان بگرن و بە سادەیی و سەکێڵیی تەماشای قورئان دەکەن دەڵێن: ئەوەتا خوا

لەوێ دەفەرموێ: جیاوازیی ناخەنە نێوانیان، کەچی هەر بۆخۆشی دەفەرموێ: هەندێکم بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە!! وەڵامەکەی ئەوەیە: کە دەفەرموێ: جیاوازییان ناخەینە نێوان، واتە: لە ئیمان پێ هێناندا، دەبێ ئیمانمان بە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) هەبێ، کە ئەوانە هەموو پێغەمبەری خوان‌و ڕەوانەکراوی خوان، پەیام‌و بەرنامەیان لە خواوە هێناوە، دەبێ وەك یەك تەماشایان بکەین‌و ڕێز لە هەمووان بگرین بە یەکسانیی، بەڵام لە چ ڕوویێکەوە جیاوازییان لەنێواندا پەیدادەبێ؟ لە پلەو پایەو پێگەیاندا، بۆیە کە دەفەرموێ: پێغەمبەرانمان هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا هەڵبژاردوە، واتە: هەندێکیان پلەیان لە هەندێکیان بەرزترە، هەموویان بەرزن، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکیان بەرزترن، وەك چەند لووتکەیەکی چیا، تەماشا دەکەی لووتکەکان هەموویان بەرزن، بەڵام هەندێك لووتکە لە هەندێکیان بەرزترن، پێغەمبەرانیش (علیهم الصَّلاة والسلام) هەموویان بەرزن، هەموویان هەڵبژاردەن، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکیان بەرزترن، کەواتە: لە ڕووی ئیمان پێ هێنانیانەوە، جیاوازییان ناخەینە نێوان، بەڵام لە ڕووی پێگەو پایە بەرزییانەوە، هەندێکیان لە هەندێکیان بەرزترن، مانای وایە ئایەتەکان پشتگیریی یەکدی دەکەن‌و، نەك هەر تێکناگیرێن، بەڵکو ماناو واتای یەکدی تەواو دەکەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دە (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکانی (١٥٣ - ١٦٢)ن، لەم دە ئایەتەدا خوای کاربەجێ جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ سەر باس و خواسی خاوەن کتێبەکان و، خستنەڕووی کۆمەڵێکی دیکە لە سیفەت و هەڵوێست و ئاکارە خراپ و ناپەسندەکانیان.

سەرەتا باسی ئەوە دەکات کە چۆن خاوەن کتێبەکان بەتایبەت جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ کردوە کە لە ئاسمانەوە کتێبێکیان دابەزێنێتە سەر! ئنجا دەیخاتە ڕوو کە پێشتر - پێشینانی ئەو جوولەکانە - شتی لەوە گەورەتریان لە مووسا خواستوە: کە خوایان بە ئاشکرا پێشان بدات! پاشان باسی گۆلك پەرستییان و طوور بە سەردا بەرزکردنەوەیان دەکات، کە خوا چۆن کێوی طووری بەسەردا بەرزکردنەوە، وە باسی سەرپێچییان دەکات لە ژمارەیەك لە فەرمانەکانی خوا، وە شەممە شکاندنیان، وە باسی ئەوە دەکات کە چۆن پێغەمبەرانیان کوشتوون، وە باسی مەریەم (دایکی عیسا) دەکات، کە چۆن بوختانیان بۆ هەڵبەستوە، کە گوایە عیسا ﷺ بە زۆڵی لەدایك بووە، وە بانگەشەیان بۆ ئەوە کردوە کە عیسای مەسیحیان کوشتوە، وە خوا ﷻ لە هەموو ئەوانەدا بە درۆیان دەخاتەوە، وە ڕاشیدەگەیەنێ هەموو ئەو شتانەی وەك هەواڵ گوتوویانن، درۆن، نەك کردەوەکانی خۆیان، ئەوە دیارە کردوویانە، وە خوا ڕایدەگەیەنێ کە عیسای کوڕی مەریەمیان نەکوشتوە، بەڵکو وێنەی عیسا براوەتە سەر کەسێکی دیکەو، ئەو کەسەیان کوشتوەو لە سێدارەیان داوە لە جیاتی عیسا ﷺ، بەلام عیسا ﷺ بە کلاوڕۆژنەدا بەرز کراوەتەوە بۆ ئاسمان، پاشان خوای دادگەر

ڕایدەگەیەنێ، کە بە هۆی ستەمو خراپەی جوولەکەکانەوە، کۆمەڵێك بژێوی چاكو پاکیی لێ قەدەغە کردوون، وە پاشان خوای دادگەر کۆمەڵێك لە خاوەن کتێبەکان بەگشتیو جوولەکەکان بەتایبەتی، هەڵداوێرێو جیایان دەکاتەوە لەو زەمو سەرزەنشتە، وە بە ڕۆچوویی لە زانیارییداو، ئیمانو، نوێژ بەرپاکردنو، زەکاتدانو، ئیمان هێنان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وەسفیان دەکات، وە دەشفەرموێ: ئەوانە پاداشتێکی مەزنیان هەیە.

﴿ يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ
أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ
ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا
﴿١٥٣﴾ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ
فِي ٱلسَّبۡتِ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿١٥٤﴾ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ وَكُفۡرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
وَقَتۡلِهِمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا
يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفۡرِهِمۡ وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا ﴿١٥٦﴾ وَقَوۡلِهِمۡ
إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ
لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا
قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ
إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ
هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾

وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

## مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەكـان

((خـاوەن كتێبەكـان داوات لێدەكـەن كـە لـە ئاسـمانەوە كتێبێكیـان دابەزێنیـە سـەر، بێگومـان لـەوە گـەورەتریان لـە مووسا خواست، گوتیان: خوامان بـە ئاشـكرا پێـشان بـدە، ئیـدی بـە هـۆی سـتەمیانەوە برووسـك گرتنـی، ئنجـا دوای ئـەوەی بەڵگە ئاشـكرایەكانیان بـۆ هـاتن، گوێلكـیان كـردە پەرسـتراو، بـەڵام چاوپۆشـییمان لـەوە كـردو بەڵـگەیەكی ئاشـكرامان دایـە مووسـا ﴿١٥٣﴾ وە بـەدەم پـەیمان لێوەرگرتنیـانەوە (چیـای) طـوورمـان لەسـەر سـەر ڕاگـرتنو پێمـان گـوتن: بـە كڕنـووش بردنـەوە (واتـە: بـە چـەمینەوەو ڕكووع بردنـەوە) لـە دەرگاكـەوە بـچنە ژوور، وە پێمـان گـوتن لـە (ڕۆژی) شـەممەدا دەسـتدرێژیی مەكـەن (و شـەممە مەشـكێنن) وە پەیمانێكی پتەومـان لێـوەرگـرتن ﴿١٥٤﴾ (بـەڵام پاشان سزامان دان) بـە هـۆی پەیمـان شـكاندنیانو، بێـبڕوایی یـان بـە ئایەتـەكانی خـواو، بـە ناهـەق كوشـتنی پێغـەمبەرانو گوتنـی: دڵمـان پەردەپـۆش كـراوە، بەڵـكو بـە هـۆی بێـبڕوایی یانـەوە خـوا مـۆری كـردوون، بۆیـە جگـە لـە كـەمێك بـڕوا نـاهێنن ﴿١٥٥﴾ (هـەروەها سـزامان دان) بـە هـۆی بێـبڕوایی یـانو هەڵبەسـتنی بوختـانێكی مەزنـەوە بـۆ مەریـەم ﴿١٥٦﴾ وە بـە هـۆی ئـەو قـسەیانەوە كـە: ئێمـە مەسـیحی عیـسای كـوڕی مەریـەم - ڕەوانەكـراوی خوامـان - كوشـتوە، هەرچـەندە نەشـیان

کوشتبوو، وە هەڵیشیان نەواسیبوو، بەڵکو وێنەی ئەویان بۆ خرابووە سەر یەکێکی دیکە، وە ئەوانەش کە لە بارەیەوە مشتومڕیان بوو، لێی لە گوماندا بوون (چونکە) جگە لە شوێنکەوتنی گومان هیچ زانیارییەکیان لە بارەوە نەبوو، وە بە دڵنیاییی یەوە نەیانکوشتوە ﴿١٥٧﴾ بەڵکو خوا بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە، وە خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿١٥٨﴾ وە هیچ کەس لە خاوەن کتێبەکان نابێ مەگەر پێش مەرگی بڕوای پێ دێنێ، وە لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا بەسەریانەوە شایەد دەبێ ﴿١٥٩﴾ وە بە هۆی ستەمی جوولەکەکانەوەو، بە هۆی ڕێگریی یەکی زۆریان لە ڕێی خواو ﴿١٦٠﴾ بە هۆی سوود (ڕیبا) وەرگرتنیانەوە، هەرچەند لێشی قەدەغە کرابوونو، بە هۆی ناهەق ماڵی خەڵکی خواردنیانەوە، شتانێکی بە تامو خۆشمان لێیان قەدەغە کرد، وە بۆ ئەوانەیان کە بێبڕوان، ئازارێکی بەئێشمان ئامادە کردوە ﴿١٦١﴾ بەڵام ڕۆچووانیان بە زانیارییداو بڕواداران، بڕوا بەوە دێنن کە بۆ لات نێردراوەتە خوار، وە بەوەش کە پێش تۆ نێرراوەتە خوار، وە نوێژ بەرپاکەرانو زەکاتدەرانو بڕواداران بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئا ئەوانە لەمەودوا پاداشتێکی مەزنیان دەدەینەوە ﴿١٦٢﴾)) .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(**جَهْرَةً**): (جَهَرَ: يُقَالُ لِظُهُورِ الشَّيءِ بِإفرَاطِ حَاسَةِ البَصَرِ أَو حَاسَةِ السَّمْعِ)
وشەی: (جَهَرَ) هەر شتێکە دەربکەوێ بە شێوەیەکی زۆر ڕوون، چ بە هەستەوەری چاو، یان بۆ هەستەوەری گوێ، کەواتە: وشەی: (جَهَرَ) هەم بە قسەیەکی ئاشکرا دەگوترێ، کە بە گوێ دەبیسترێ، وە هەم بە دیمەنێکی ڕوون دەگوترێ، کە بە چاو دەبینرێ.

(ٱلصَّٰعِقَةُ): (الصَّاعِقَةُ وَالصَّاقِعَةُ يَتَقَارَبَانِ: وَهُمَا الهَدَّةُ الكَبِيرَةُ: المَوْتُ، العَذَابُ، النَّارُ)، هەردوو وشەی: (صَاعِقَةٌ، صَاقِعَةٌ) مانایان لێك نزیكە، بە دەنگێكی گەورەو ڕمبەیەكی گەورە دەگوترێ، وە بە مردن دەگوترێ، وە بە سزاو بە ئاگریش دەگوترێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ... ٦٨﴾الزمر، لێرەدا بە مانای مردن دێ، واتە: هەرچی لە ئاسمانەكانو زەوی دایە مردن، جگە لەوەی خوا دەیەوێ، یان كە دەفەرموێ: ﴿...وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ... ١٣﴾ الرعد، (صَواعِق) كۆی (صَاعِقَة)یە، لێرەدا بە مانای برووسكە، یان ئاگر هاتوە.

(غُلۡفُۢ): (قِيلَ هُوَ جَمْعُ أَغْلَف، أَي: فِي غِلافٍ، وَقِيلَ قُلُوبُنَا مُغَطَاةٌ مِنْ غَلَّفْتُهُ: جَعَلْتُهُ فِي غِلافٍ)، وشەی: (غُلْف) دەگونجێ كۆی (أَغْلَف) بێ، (أَغْلَف) واتە: شتێك كە خراوەتە كیفەوە، جا جوولەكەكان دەیانگوت: ﴿قُلُوبُنَا غُلۡفُۢ﴾، واتە: دڵمان خراوەتە كیفەوە، داخراوە، هیچ نابیستێ، دیارە بە گاڵتە وایانگوتوە، وە هەندێكیش گوتوویانە: مەبەست لە ﴿قُلُوبُنَا غُلۡفُۢ﴾، واتە: دڵمان داپۆشراوە، ئەوەش ڕەنگە بە توانجەوە بە پێغەمبەریان ﷺ گوتبێ، چونكە لە هەندێك ئایەتاندا هەیە دەفەرموێ: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ... ٧﴾البقرة، واتە: خوا مۆری بەسەر دڵەوە ناون، ئیدی بە توانجەوە گوتوویانە: جا خوا دڵی مۆر كردووین! كەواتە: قسەمان بۆ مەكە.

(شُبِّهَ لَهُمۡ): (أَي مُثِّلَ لَهُمْ مَنْ حِسِبُوهُ إِيَّاهُ...) واتە: بۆیان وێنا كرا، یاخود شێوەی عیسا عليه السلاميان بۆ برایە سەر شێوەی كەسێكی دیكە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەكـان

هـۆی هاتنــە خــوارەوەی ئــەو چــوار ئایــەتە كـە سەرەتایەكــەیان دەفــەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ... ﴾، تاكو دەگاتە: ﴿ ... بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ ﴾: ﴿أَخْـرَجَ ابْنُ جَرِير عَن مُحَمَّد ابْن كَعْبِ القَرَظِي قَالَ: جَـاءَ نَاسٌ مِنَ اليَهُـودِ إلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فقَـالوا: إنَّ مُوسَى جَاءَنَا بـالألوَاحِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَأْتِنَا بـالأَلواحِ مِنْ عِنْدِ اللَّـهِ حَتَّـى نُـصَدِّقكَ فَـأَنْزَلَ اللَّـهُ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ... ﴾، إلـى قَوْلِـهِ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ ... ﴾، فَجَثَـا رَجُـلٌ مِـنَ اليَهُـودِ فقَـالَ: مَـا أَنـزَلَ اللَّـهُ عَلَيْـكَ وَلا عَلَـى مُوسَى وَلا عَلَى عِيسَى وَلا عَلَـى أَحَدٍ شَيْئَاً، فَـأَنزَلَ اللَّـهُ: ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ... ﴿٩١﴾ ﴾الأنعـــــام﴾ لُبـاب النقـول فـي أسـباب النـزول: (٣٧٦)، تفـسير الطـبري بـرقم: (١٠٧٧٤)، و (١٣٥٤٢)، واتە: ئیبنو جەریر لە موحەممەدی كوڕی كەعبی قەرەزیی دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: كۆمەڵێـك لـە جوولەكـەكـان هـاتن بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتیـان: مووسـا لـە لایـەن خـواوە لەوحـەكانی هێنـان (لـەوح تەختـە بەردێـك بـووە كـە تەوراتیان لەسەر نووسیوە، لەسـەر ڕای زۆربـەی توێژەرەوانـی قورئـان)، تـۆش ئـەو كتێبەی كە لەلای خواوە بۆت دێ، با لەسـەر لـەوح بنووسـرێتەوە، تاكـو بـڕوات پـێ بێنــین، خوای زانـاش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً ... ﴾، واتــە: خــاوەن كتێبەكــان داوات لــێدەكەن لــە ئاسمانـەوە كتێبێكیـان دابەزێنیـە سـەر، لـەوە گەورەتـریان لـە مووسـا داوا كـرد، گوتیـان: بە ئاشكرا خوامان پێشـان بدە، یانـی: پێـت سـەیر نـەبێ كـە ئـەم داوایــە

لـــە تـۆ دەکـــەن، هـــەتا ئـــەو شـــوێنەی کـــە دەفەرمـــوێ: ﴿... بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾﴾، لەوبـارەوە هاتۆتـە خـوارێ.

جـا دەڵـێ: پیــاوێك لـە جوولەکـەکان کـە لــەوێ دانیـشـتبوو، هەڵسـایە سـەر چـۆك، دانیشـتو گوتی: خوا هیچی دانەبەزاندۆتە سەر تـۆ، هیـچی دانەبەزاندۆتـە سەر مووسا، هیچی دانەبەزاندۆتە سەر عیسا، وە هیـچی دانەبەزاندۆتـە سـەر هیـچ مرۆڤێـك، ئنجـا خـوای پـەروەردگار لەوبارەشـەوە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار، کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ... ﴿٩١﴾﴾الأنعـام، واتـە: وەك پێویـست ڕێـزی خوایـان نـەگرت، کـە گوتیـان: خـوا هـیچ شتێکی دانەبـەزاندۆتە سـەر هیچ بەشـەرێك، هیچ پەیامێکی دانەبەزاندوە بـۆ هـیچ کەسـێك، وەك پێویـست ڕێـزی خوایـان نـەگرت، یـانی چـی؟ یـانی: خـوا زۆر لـەوە بەرزتـرە ئەو بەشـەرانە وێـڵ بکـاتو پـەیامو بەرنامەیـان بـۆ نـەنێرێ، دینێکیـان بـۆ نـەنێرێ، کـە تێیـان بگەیـەنێ چـۆن بـژین؟ چـۆن بـەرێوە بـچن؟ وە چـۆن بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن؟ وە چۆن مامەڵە لـەنێوان خۆیـاندا بکـەن؟ وە چـۆن دنیـای خۆیـان ڕێـك بخـەن؟ خـوا زۆر لـەوە بەرزتـرە، کـە بـەو شـێوەیە مامەڵـە لەگـەڵ بەندەکانیـدا بکات.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

لـە سـوورەتی (النـساء) لـە زۆر شـوێناندا باسـی خـاوەن کتێبەکـان بەگـشتیو جوولەکەکان بەتایبـەتی کراوە، دووبـارە خـوا ﷻ دەگەڕێتـەوە سەر باسـی ئـەوانو دەفـەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، خـاوەن کتێبەکان داوات لێدەکەن، لـە ئاسـمانەوە کتێبێکـیان بـۆ دابـەزێنی، یەکـێك بـۆی هـەیە بڵـێ: ئـەدی ئـەوە نیـە قورئـان دابـەزێنراوە؟! دەڵـێین: وەك لـە هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئـایەتەدا کـە پێـشتر باسـمان کـرد بۆمـان دەرکـەوت، مەبەسـتیان ئەوە بوو، کتێـبێك لە نێوان دوو بـەرگ دابـێ، یاخود لەسـەر لـەوحی بـەرد، یان لەسـەر شـتێك نووسـرابێتەوە، حـازرو ئامادەبـێ، چـونکە دیـارە ئـەم قورئانـە بـە زارەکیـی (شـفهي) هـاتوە بـۆ پێغەمبـەر ﷺو، بـە زارەکیـی خـوای بـێ وێنـە فێـری جبـریلی کردوە، وە جیبـریل هێناویـەتی بۆ موحەممـەد ﷺ، وەك خـوا بۆخـۆی دەفــەرموێ: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ ... ﴿١٩٤﴾ ﴾الـشعراء، واتـە: گیـانی ئەمینـدار ﴿ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾، (کـە جیبریلـە) دایبەزانـدوە بـۆ سـەر دڵـی تـۆ (ئـەی موحەممــەد ﷺ!) ئەویــش وەریگــرتوەو بــە هــاوەڵانی گوتــوە، هــاوەڵانیش لەبـەریـان کـردوەو نووسـیویانەتەوە، وەك مـن لـە کتێبـی: (ئـەرکی سەرشـانمان بەرانبەر قورئـان)، وە لە پێشەکی بەرگـی یەکـەمی ئـەم تەفسیرەدا بـە تەفصـیلْ باسـم کـردوە، کـە چـۆن قورئـان نووسـراوەتەوەو چـۆن کۆکراوەتـەوە؟ کەواتـە: کـە گوتوویانـە: کتێبێکمـان بـۆ دابەزێنـە، واتـە: کـە لـە دووتوێـی بەرگـێك دابـێ، ئەگـەرنا بڕوایـان بـە قورئـان نـەکردوەو هـەر بیانوویـان گرتـوە، ئنجا خـوای کاربـەجێ دەفـەرموێ: ﴿ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ ﴾، بەتەئکـید لـەوە گەورەتریان لە مووسا داوا کرد، واتە: هەر بیانووت پـێ دەگرن، چییان پـێ گوت؟ ﴿ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾، گوتیـان: خوامـان پێـشان بـدە بـە ئاشکرا، مووسا عليه السلام

گفتوگـۆی لەگـەڵ خـوا دەکـرد، تەوراتیـشی هێنـابوو لەسـەر لـەوح نووسـرابوو، فریـشتە نووسـیبوویانەوە، هـەتا دەڵـێ: لەوحـەکان لـەوحی دنیـایی نـەبوون، لـە بەردی زۆر بەقیمەت بوون لـە بەهەشـتەوە هـاتبوون، یـان لـە هـەر شـوێنێك کـە خـوا بۆخـۆی دەزانـێ، کەچـی دەشـیانگوت: دەبـێ خوامـان پێـشان بـدەی! واتـە: جوولەکە عـادەتی ئێستایان نیە کە بیانوو بـە تـۆ دەگرن، لـەوە خراپـتریان بـە مووسـا ﷺ دەکـرد، دەیانگـوت: خوامـان پێـشان بـدە، ئنجا مووسا ﷺ لەگـەڵ خـۆی بـردن، کـە إن شاء اللّه ئەگـەر تەمـەن بـاقی بـێ لـە تەفـسیری سوورەتی (الأعـراف)دا دەیگەینـێ، کە بردنـی، مووسا ﷺ چوو قـسە لەگـەڵ خـوای بـەرزدا بکـات، کـە مووسـا ﷺ یـان بیـنی قـسەی لەگـەڵ خـوادا کـرد، گوتیـان: دەبـێ خوامان پێشان بـدەی، ئیـدی هـەورە تریـشقەیەك لـێیدان، هەموویان مـردن، یان هەموویـان لـە هـۆش خۆیـان چـوون، دوایـی مووسـا ﷺ پاڕایـەوەو گـوتی: ئـەی خوایـە! ئەوانەی کە ئێـستا مـردوون هـەموو ئەشـرافی وەچـەی ئیـسرائیلن، مـن چـۆن بـچمەوە نێویـان؟ دیـارە خـوای باڵادەسـت زینـدووی کردنـەوە، ئـەوانیش گوتیـان: جارێکی دیکـە ناماقووڵـیی وا ناکـەین، بۆیـە دەفـەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ﴾، هـەورە تریـشقەیەك، برووسـکەیەك، گرتنـی بـە هـۆی ئـەو سـتەمەیانەوە، ئـەوە سـتەمە، تـۆ بڵێـی: دەبـێ خـوام پێـشان بـدەی! پاکـیی و بێگـەردیی بۆ خـوا، ئینـسان کوا دەتوانـێ تەحەممولـی بینینـی خـوای بـەرزو بـێ هـاوتا بکـات؟ خـوا ﷻ خـۆی پێـشانی کێوێکـدا، کێوەکـە هەڵپڕووکـا، وەك خـوا فەرموویـەتی: دوای ئـەوەی کـە مووسـا داوای کـرد: ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَـٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾ ﴾الأعـراف، (مووسـا) فـەرمووی: پەروەردگـارم خۆتـم پێشـانبدە؟ (خـوا) فـەرمووی: ناتوانـی بمبینـی، بـەڵام تەماشای ئـەم چیایە

بكە ئەگەر تەحەممولی كردو لە شوێنی خۆی مایەوە، لەمەودوا تۆش دەمبینی (دەتوانی بمبینی)، ئنجا كاتێك خوا خۆی پێشانی چیایەكەدا، چیایەكە هەڵپڕووكاو وردوخاش بوو، وە مووسا لە هۆش خۆی چوو، جا كاتێك بە هۆش خۆی هاتەوە فەرمووی: پاكیی بۆتۆ (ئەی خوایە !) بۆ لات گەڕامەوە (لەو داوایەی كە كردوومە) وە من یەكەمینی بڕوادارانم.

ئەوجار خوای زاناو توانا باسی هەندێك كەموكوڕیی دیكەیان دەكات: دوای ئەوەی داوایان لە مووسا كرد خوایان پێشان بدات، برووسكەیەك و هەورە تریشقەیەك لێی دان، تەمبێ نەبوون، دەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾، دوای ئەوەی بەڵگە ڕوونو ئاشكرایەكانیان بۆ هاتن، گۆلكیشیان پەرست، مووسا ﵇ تا چوو بۆ كێوی طوور تەوراتی وەرگرتو هاتەوە، تەماشای كرد دەستیان كردوە بە گۆلك پەرستیی، وەك دوایی باسی دەكەین، (سامیریی) گۆلكێكی بۆ دروستكردن لە زێڕ، گوتی: مووسا پەرستراوی خۆی لێ ونبووە، دەچێ لێی دەگەڕێ، ئەمە پەرستراوی ئێوەیە، دەستیان كرد بە گۆلك پەرستیی، زۆربەیان یاخود هەندێكیان ﴿فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ﴾، دوای ئەوەی خوای دادگەر سزای دانو تۆبەیان كرد، دەفەرمویٚ چاوپۆشییمان لەوە كردو لێمان بووردن، ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾، وە بەڵگەیەكی زۆر ڕوونو ئاشكرامان بە مووسادا، هەڵبەتە بەڵگە ڕوونو ئاشكرایەكانی مووسا، زۆر زۆر بوون، یەكێكیان گۆچانەكەی بوو، ئەویدیكە دەستی بووە، ئەویدیكە ئەوەبوو كە تووكی[1] لە ئالی فیرعەون كردوە، هەر جارەی بەڵایەكیان بەسەر داهاتوە، وەك لە سوورەتی (الأعراف)دا هاتوە، ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ﴾، واتە: وە چیامان بەسەردا بەرز كردنەوە

١) تووك: دووعای خراپە، واتە: داوای خراپەو زیان لە خواكردنە بۆ بابایەكی ناحەزو دوژمن.

لەکاتی پەیمان لێوەرگرتنیاندا، واتە: بۆئەوەی پەیمانیان لێوەربگرین، چیامان لەسەر سەر ڕاگرتن، بۆئەوەی ئەو پەیمانە بدەن کە لەمەودوا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ﴿وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾، وە پێمان گوتن بە کڕنووش بردنەوە، واتە: بە چەمینەوەوە، ئەگەرنا ئەگەر ئینسان سەری لەسەر زەوی بێ ناتوانێ بڕوا، بۆیە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: واتە: بە چەمینەوەو بە ڕێزگرتنەوە، بە سەردانەواندنەوە، بچنە دەروازەی ئەو شارەوە کە بۆیان دیاری کرابوو، ﴿وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُواْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾، وە پێمان گوتن لە شەممەدا دەستدرێژیی مەکەن، شارێك لە کەنار دەریا بوو، ئەوانە عادەتیان وابوو ڕاوی ماسییان دەکرد، بەس ڕۆژانی شەممە ماسی باش دەهاتن، کە دیارە کاتی خۆی بۆیان دیاری کرابوو، وەك چۆن مسوڵمانان ڕۆژانی جومعەیان هەیە، ئەوانیش ڕۆژی شەممەیان هەیە، نەصرانییش ڕۆژی یەك شەممەیان هەیە، خوای پەروەردگار بۆ تاقیکردنەوە وایکرد ماسیەکان لە ڕۆژی شەممەدا دەهاتن، ئیدی شەممەیان شکاندو لەبەر تەماع خۆیان ڕانەگرت، وە لە شەممەدا ڕاوی ماسییان کرد، بە فێڵکردنێك کە دوای تۆزێکی دی باس دەکەم، فێڵیان کرد، ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾، وە پەیمانێکی پتەومان لێیان وەرگرت، کە جارێکی دیکە ئەو هەڵانە نەکەنەوە، بەڵام کە تەماشای قورئان دەکەین، دەزانین چەند سەرسەخت بوون، لە جوولەکە کەللە ڕەقتر نەبووە لەم دنیایەدا، هیچ کەسێك بەقەدەر جوولەکە خوای پەروەردگار موعجیزەی نەداوە بە پێغەمبەرەکەیان، لەبەرئەوەی زۆر کەللەڕەق بوون، پێغەمبەرەکەیان کە مووسایە ﷺ زۆر موعجیزەی بۆ هاتوون، تاکو کەللەیان نەرم بێ‌و، بە چاکیی ئیمان بێنن، جا دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾، ئنجا بە هۆی ئەوەوە کە پەیمانی پتەویان شکاند، ﴿وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، وە کوفریان بە ئایەتەکانی خوا کردو بڕوایان پێ نەهێنان، جا ئایەتەکانی خوا، چ ڕستەکانی فەرمایشتی

خوابن، وە چ دیاردە سروشتییەکان بن، کە ئەوانیش هەر بەڵگەو نیشانەی خوان، وە چ موعجیزەکانی پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام)بن، چونکە وشەی: (آیات) لە قورئاندا، بە مانای ڕستەکانی فەرمایشتی خوا بەکارهاتوە، وە بە مانای دیاردە سروشتییەکان بەکارهاتوە، وە بە مانای موعجیزەکانی پێغەمبەرانیش (علیهم الصَّلاة والسلام) بەکارهاتوە، جوولەکەکان کوفریان بە هەموو جۆرە ئایەتەکانی خوا کرد، ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾، وە بە هۆی ئەوەوە کە پێغەمبەرانیان کوشت بە ناهەق، دیارە پێغەمبەر هەر بە ناهەق دەکوژرێ، چونکە هیچ پێغەمبەرێك خراپەو ستەم ناکات، ئەدی بۆچی وا دەفەرموێ؟ بۆئەوەی لێرەدا شتەکەیان زۆر لێ زەق بکاتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەران (علیهم السلام) بە هیچ شێوەیەك هیچ ناهەقییەك بەرانبەر کەس ناکەن، تاکو بابای پێغەمبەر کوژ بڵێ: ئەو پێغەمبەرەم کوشت، بەڵام بە هەق کوشتم! پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) دەستدرێژیی لە ناموس و ماڵ و نەفسی کەس ناکەن، کەواتە: هەر کەسێك هەر پێغەمبەرێك بکوژێ، ئەوە بە تەئکید بە ناهەق کوشتوویەتی، ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەوە کە گوتیان: ئێمە دڵمان پەردە پۆش کراوە، یاخود دڵمان لە کیف دایە، یاخود دڵمان توورەکەی عیلمە، هەموو ماناکانی هەن، ﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ﴾، بەڵکو خوا مۆری بەسەر دڵەوە ناون، بە هۆی کوفرەکەیانەوە، ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، بۆیە کەمێکیان نەبێ ئیمان ناهێنن، یاخود ئیمانێکی کەم نەبێ ناهێنن، هەروەها سزامان دان ﴿وَبِكُفْرِهِمْ﴾، بە هۆی بێبڕوایی یانەوە ﴿وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا﴾، وە بە هۆی ئەوە کە بوختان و تۆمەتێکی گەورەیان پاڵدایە لای مەریەم (دایکی عیسا) سەلامی خوایان لێ بێ، کە جوولەکەکان گوتیان: زینای کردوە، بۆیە عیسای بووە، لە حاڵێکدا

کە مەریەم شووی نەکردبوو، وە ئافرەتێکی زۆر پاکیزەو داوێن پاك بوو، وە خوای بەدیهێنەر جیبریلی ناردوە، وەك لە سووڕەتی (مریم)دا هاتوە، وە ڕووحی عیسای بە بەرۆکی داکردو چووە نێو منداڵدانی، عیسا ئاوا پەیدابوو بێ ئەوەی بابی هەبێ، ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ ﴾، وە بە هۆی ئەوەوە، کە گوتیان: ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خوامان کوشتوە، دیارە نەیانکوشتبوو، بەڵام لەبەرئەوەی خۆیان پێوە هەڵکێشا، خوای دادگەر وەك گوناهێك لەسەری تۆمار کردوون، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (نەخواردووی لە سمێڵان مەییو)! ، جا لەوە وریابن، کەسی وا هەیە گوناهێکی نەکردوە، بەڵام وا خۆ پێشان دەدات کە کردوویەتی، مەبەستم زیاتر خەڵکی عەوامو سادەیە، بۆ وێنە: کابرا شەڕابی نەخواردۆتەوە، بەڵام وا خۆی پێشان دەدات کە خواردوویەتیەوە، یان زینای نەکردوەو وا پێشان دەدات کە کردوویەتی، قەتڵی نەکردوە، وا پێشان دەدات کە کردوویەتی.

لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێڕمەوە: یەکێك بۆی گێڕامەوە گوتی: نەفەرێك کوژرابوو، خەڵکیش نەیاندەزانی کێ کوشتوویەتی! گوتی: کابرایەکی (وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: فشەکەرو خۆهەڵکێش لەوێ بوو) هەر دەیانگوت: دەبێ کێ کوشتبێتی؟! ئەویش دەیگوت: بە خوای ئەوەی کە کوشتوویەتی، دەزانێ کێ کوشتوویەتی!! گوتی: کەسوکاری کوژراوەکەش دەیگرن، زۆر ئەزیەتی دەدەن، کابراش دەڵێ: بڕوا بکەن من نەبووم و ... هتد، دەڵێن: ئاخر تۆ وات پێشانداوە کە تۆی؟ دەڵێ: بڕوا بکەن هەر خۆم پێوە هەڵکێشاوەو نازانم کێ کوشتوویەتی، وە من پیاوی نەفەر کوشتن نیم!! (دیارە پیاوێکی ترسنۆك بووە)، دوایی زۆر ئەزیەتی دەدەنو دارکارییەکی باشی دەکەنو، دەڵێن جارێکی دیکە خۆ بە شتێکەوە هەڵنەکێشی کە نەتکردوە! جا خوا دەفەرموێ: وە بە هۆی ئەوەوە کە گوتیان: مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خوامان کوشتوە، (سزامان دان)، ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ ﴾، لە حاڵێکدا نەکوشتبوویانو نە لە سێدارەشیان دابوو، (صَلْب) واتە: لە خاچدان، هەڵواسین، ئێستا کە

نەصرانیی شتێك بە ملی خۆیاندا دەكەن ئاوایە: (✝)، بە حیساب ئەوە عیسایەو هێمای لە سێدارە دراوە، ﴿وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡ﴾، بەڵكو وێنەی عیسایان بۆ برایە سەر یەكێكی دیكە، (مُثِّلَ لَهُمْ) واتە: یەكێكی دیكەیان بۆ برایە سەر شێوەی عیسا ﷺ، وە ئەویان لە جیاتی عیسا كوشت، وەك لە مەسەلە گرنگەكاندا بە تەفصیل باسی دەكەین، ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ﴾، وە ئەوانەی كە تێیدا كەوتوونەتە ڕاجیایی یەوە، بۆخۆشیان لێی لە گوماندان، واتە: جوولەكەكان و نەصرانییەكانیش بۆخۆیان یەقینیان نیە، پێیان سەیر بوو، چونكە لە ڕیوایەتێك دا دەڵێ: دوازدە كەس بوون، دوای دەیانژماردن یازدە كەس بوون، باشە ئەدی ئەوەی دیكە چی لێ‌هات؟ ئەوە یەكێكیان گرتوە بە حیساب عیسایە، ئەدی نەفەری دوازدەیەم چی لێ‌هات؟ بۆیە دەفەرموێ: ئەوانەش كە تێیدا كەوتوونە ڕاجیایی یەوە، لێی لە دوو دڵییدا بوون، ﴿مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ﴾، هیچ زانیارییەكیان نەبوو دەربارەی، مەگەر شوێنكەوتنی گومان، ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا﴾، وە لە لای خۆیانەوە دڵنیا نەبوون، كە كوشتوویانە، دەیانزانی نەفەرێكیان كوشتوە، بەڵام دڵنیا نەبوون كە ئەوە عیسایە ﷺ، چونكە نیشانەكانی بەسەر عیسادا ﷺ نەدەچەسپین، شێوەی شێوەی عیسا بوو، بەڵام قسەو هەڵوێستی وەك دوایی باسی دەكەین، هەتا ئەوەی لە ئینجیلەكانیشدا هاتوە، لە عیسا ﷺ ناوەشێتەوە، لە ئینجیلەكاندا هاتوە، دەڵێ: عیسا گلەیی لە خوا كردوەو گوتوویەتی: خوایە! بۆ وازت لێ هێنام؟! خوایە بۆ پشتت بەردام؟! مسوڵمانێكی عادەتی گلەیی لە خوا ناكات، پێغەمبەرێكی پایە بەرز چۆن گلەیی لە خوا دەكات؟! جا دەفەرموێ: ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ﴾، بەڵكو خوا بەرزی كردەوە بۆ لای خۆی، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾، وە خوا زاڵی كاربەجێیە، ئەگەر بیەوێ كەسێك بپارێزێ دەیپارێزێ و كاربەجێشە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾، وە هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نیە مەگەر پێش مەرگی خۆی ئیمانی پێ دێنێ، واتە: لە سەرەمەرگدا ئیمانی پێ دێنێو بۆی دەردەکەوێ، کە عیسا ﷺ پێغەمبەری خوایە، یاخود عیسا ﷺ لە کۆتایی زەمانو دنیادا دێتە خوارو ئەوانەی خاوەن کتێبن، هەموویان دەزانن کە عیسا ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئەو کاتە ئیمانی پێ دێنن، واتە: پێش مردنی عیسا ﷺ کەواتە: ئەم ڕستەیە دوو واتای هەن، دەگونجێ: ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾، ڕاناوەکەی بچێتەوە بۆ هەر کام لە ئەهلی کیتاب، وە دەگونجێ ڕاناوەکە بۆ عیسا ﷺ بچێتەوە، ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴾، وە لە ڕۆژی دواییدا عیسا ﷺ بەسەریانەوە دەبێتە شایەدو چاودێر.

دیسان باسی هەندێك هەڵەو پەڵەو کەموکوڕیی دیکەی جوولەکەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ ﴾، بە هۆی ستەمو دەستدرێژیی‌و خراپەی جوولەکەکانەوە، هەندێ ڕزق‌و ڕۆزیی حەڵاڵ‌و بە تامو خۆشمان لێ قەدەغە کردن، ﴿ أُحِلَّتْ لَهُمْ ﴾، کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ کرابوون، ﴿ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴾، وە بە هۆی ئەوەوە کە زۆر لە خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا، چەند ڕزق‌و ڕۆزییەکی بە تامو خۆشمان لێ قەدەغە کردن، ﴿ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە سوودیان وەرگرت، ﴿ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ ﴾، کە لێشی قەدەغە کرابوون، ﴿ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ﴾، بە هۆی بە ناهەق خواردنی ماڵی خەڵکییانەوە، بە هۆی ئەوانەوە چەند خواردنێکی بە تامو لەزەت‌و بە چێژمان لێ قەدەغە کردن، ﴿ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوان لەوان، ئازارێکی بەئێشمان بۆ ئامادە کردوون.

ئنجا خوا ﷻ لێرەدا باسی كۆمەڵێك دەكات لە خاوەن كتێبەكان، وە جیایان دەكاتەوە لەوانەی ئەو كەتن و خراپەو تاوانانەیان كردووە، ئەو سزایەشیان بەسەردا چەسپیوە، دەفەرمووێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ﴾، بەلاّم ئەوانەیان كە بە زانیارییدا ڕۆچوونو پێیدا قووڵبوونەتەوەو زۆر شارەزان، نەك ئەوانەی كە سادەو سەركێڵن شارەزان، بەڵێ زانیاریی قووڵ، ئینسان بە ئەنجام دەگەیەنێ، وە هەمیشە زانیاریی كەم ئینسان تووشی هەڵە دەكات، فارس دەڵێن:

**نیمە مُلاّ دین میبَرَدْ        نیمە حَكیم جان میبَرَدْ**

یانی: نیوەی مەلا دین لە خەڵكی دەستێنێو، نیوە پزیشك ڕووحیان لێ دەستێنێ.

بۆ ئێمەو مانانیش هەروایە ئەوەی كە زانیاریی كەمبێ، تووشی دەمارگیریی دەبێ، كەسێك تەنیا ڕایەكی فیقهیی دەزانێ لە ئیسلامدا، یان تەنیا بۆچوونێك، وادەزانێ دین هەر ئەوەندەیە! بەلاّم ئەگەر زانیت جگە لەو بۆچوونە چەندان بۆچوونی دیكەش هەن، بە دڵنیایی ئەوكاتە سینگت فراوان دەبێو ئەگەر كەسێك وەك تۆی نەكرد، یەكسەر نالێی: لە دین دەرچووی، بەڵكو دەڵێی: دیارە ئەو بۆچوونەش هەیەو بۆچوونی دیكەش هەیە، هەمیشە زانیاریی زۆر، دڵی ئینسان فراوان دەكات، سینەی ئینسان گوشاد دەكاتو ئینسان فێری سەماحەتو دڵ گەورەیی دەكات.

پاشان دەفەرمووێ: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، وە ئەوانەی كە ئیماندارن، پێشێ باسی زانایەكانیان دەكات، ئنجا باسی ئیماندارانیان دەكات، ئەگەر ئینسان زانیارییەكی قووڵی هەبێ، یان ئیمانێكی پتەوی هەبێ، ئەوانە چی دەكەن؟ ﴿يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾، ئەوانە ئیمان دێنن بەوەی كە بۆ تۆ نێردراوەتە

خوار، وە بەوەش کە پێش تۆ نێردراوەتە خوار، ئینسان ئەگەر بەڕاستیی ئیمانی بە خوا هەبێ، هەرچی خوا ڕێزی لێ بنێ، ئەویش ڕێزی لێ دەنێ، هەر کتێبێك خوا بینێرێ ئیمانی پێ دێنێ، هەروەها ئەگەر مرۆڤ زانیارییەکی قووڵ و فراوانیشی هەبێ، ئەوە زانیارییەکەی بە ئامانجی دەگەیەنێ، وە ئەگەر ئیمانێکی باشیشی هەبێ و، دڵی لەگەڵ خوا پاك و ساف بێ، ئەو ئیمانەش ڕێنمایی دەکات ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، وە نوێژ بەرپاکەران و زەکاتدەران، ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، وە بڕواداران بە خواو بە ڕۆژی دوایی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا﴾، ئا ئەوانە لە دوارۆژدا پاداشتێکی مەزنیان دەدەینەوە، واتە: حیسابی ئەوانە لەگەڵ ئەوانی پێشێ جیایە، خوای دادگەر لێرەدا خاوەن کتێبەکان پۆلێن دەکات و دەفەرموێ: هەموویان خراپ و زاڵم نین و، هەموویان لادەرو لارێ نین، بەڵکو چاکەکاریشیان تێدا هەن، بەڵام چاکەکارەکانیان کامانەن؟ ئەوانەن کە عیلمێکی قووڵیان هەیە، لەگەڵ ئیمانێکی باش، کە ئەو عیلمە قووڵەو ئەو ئیمانە باشە، وایان لێدەکات ئیمان بێنن، بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وە بە هەموو ئەو کتێبانەی خوا ناردوونیە خوار، چ قورئان، چ کتێبەکانی پێشێ، وە بڕوا بە ڕۆژی دوایی دێنن، ئەوانە حسابێکی دیکەیان هەیە، وە ئەوانە پاداشتێکی مەزنیان لەلای خوای پەروەردگار هەیە.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾، وەك پێشتر ئاماژەمان پێكرد، كە خوا دەفەرموێ: خاوەن كتێبەكان داوات لێدەكەن، كتێبێكیان لە سەرێوە، لە ئاسمانێوە دابەزێنیە سەر، بێگومان پێشتر لەوە گەورەتریان لە مووسا داوا كرد، واتە: پێشینانی ئەو خاوەن كتێبانەی كە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا بوون، نەك خۆیان، چونكە خۆیان لە سەردەمی مووسادا ﵇ نەژیاون، بەڵكو پێشینەكانیان بوون، كەواتە كە دەفەرموێ: ﴿ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ ﴾، واتە: پێشینەكانیان باب و باپیرانیان، لەوە گەورەتریان لە مووسا ﵇ داواكرد، ﴿ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً ﴾، كە گوتیان: خوامان بە ئاشكرا پێشان بدە، كەواتە: وەك چۆن جوولەكەكان كاتی خۆی بیانوویان بە مووسا ﵇ گرتووە و بڕوبیانووی زۆریان هێناوەتەوە، ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺیش، هەر بە هاندەری بیانووگرتن بووە، كە داوایان لێكردووە، كتێبێكیان بۆ دابەزێنێتە خوار، كە مەبەستیان ئەوەبوو كتێبێك بێ لەنێو دوو بەرگان دابێ، یاخود لەسەر بەردو پێست نووسرابێ، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەكەی دا باسمان كرد، واتە: لەلایەن فریشتەكانەوە نووسرابێتەوەو، پێشانیان بدات، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ كتێبێكی بۆ دابەزێنراوە كە قورئانە، بەڵام نەك لەسەر شتێك نووسرابێتەوە، بەڵكو لە عەقڵ و دڵی موبارەكی پێغەمبەردا ﷺ تۆمار دەكرا، پاشان بە هاوەڵانی بەڕێزی دەفەرموو، ئەوانیش دەیاننووسییەوە، لەسەر پێستی حەیوان و بەردی تەنك و لاسكی خورما، وەك لە كتێبەكانی سوننەت و سیرەدا هاتووە، كەواتە: هەر مەبەستیان بیانووگرتن و ئیمان نەهێنان بووە.

ئنجا ئەو بیانووە هەر جوولەکەکان نەیانگرتوە، بەڵکو کافرەکانیش، وەك لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی ژمارە (٣٢)دا هاتوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ...﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: وە ئەوانەی بێبڕوا بوون گوتیان: دەبووایە قورئانی بە یەکجار بۆ دابەزێنرا بایە، بەڵێ، کافرو هاوبەش پەرستەکانیش ئەو بیانووەیان دەگرت و دەیانگوت: بۆچی قورئان بە یەکجار دانەبەزێنراوە؟ بۆچی ئەمڕۆ سوورەتێك دێ و سبەینێ سوورەتێك، یان ئەمڕۆ چەند ئایەتێك دێ و، سبەینێ چەند ئایەتێکی دیکەو دوو سبەی چەند ئایەتێکی دیکە، بەش بەش دێ، با هەمووی بە یەکجار بێ، خوای زاناو شارەزاش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ... كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: بۆیە بەو شێوە دایدەبەزێنین تاکو لە عەقڵ و دڵت دا بیچەسپێنین، وە زۆر بە شێنەیی بەسەرتدا دەخوێنینەوە، واتە: ئەم قورئانە بۆ موبارەکیی نەهاتوە، وەك موتفەرك بێ، بۆیە نەهاتوە هەر لەبەر بکرێ، بەڵکو هاتوە کاری پێ بکرێ، بۆیە بەپێی پێداویستییەکان و قۆناغەکان دابەزێنراوە، کەواتە: حیکمەتی خوای کاربەجێ وادەخوازێ، بۆیە هەر لە سوورەتی (الفرقان)دا لەدوای ئەم ئایەتە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: ئەوان هیچ وێنەیەکت بۆ ناهێننەوەو هیچ داوایەکت لێناکەن، مەگەر ئێمە هەقت بۆ دادەبەزێنین لە بەرانبەری ئەو قسەیەی ئەواندا، وە تەفسیرو لێکدانەوەیەکی لەوەی ئەوانت باشتر بۆ دێنین، یانی: وەڵامێکت بۆ دەنێرین بۆ ئەوان کە چاکتربێ لە قسەی ئەوان، کەواتە: ئەوە حیکمەتی تێدایە کە خوای پەروەردگار قورئانی بەش بەش ناردۆتە خوار، سوورەت، سوورەت، کۆمەڵە ئایەت، کۆمەڵە ئایەت، بە پێی پێداویستی ژیانی مسوڵمانانی یەکەم: هاوەڵانی بەڕێز، وە بۆ ئێستای ئێمەش و بۆ دوای ئێمەش

دیسان هەروایە، چونکە بێگومان قورئان هەمووی لێکراو وێکرا جێبەجێ ناکرێ، بەڵکو هەر ئایەتە، هەر کۆمەڵە ئایەتە، هەر سوورەتە لە شوێنی خۆیداو لە کاتی خۆیدا جێبەجێ دەکرێ.

**مەسەلەی دووەم:**

## ئاماژەکردن بە چوار ڕووداوی مێژوویی جولەکەکان

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُواْ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾﴾، لێرەدا خوای زاڵی بە بەزەیی چوار مەسەلەی گرنگ دەخاتەوە بیر جوولەکەکان، لێرەدا هەرچەندە ناوی ئەهلی کیتاب هاتوە، کە نەصرانییەکانیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەو شتانەی کە باسکراون، هەموویان تایبەتن بە جوولەکەکانەوە، خوا ﷻ چەند هەڵوێستێکی ئەوان دەخاتەڕوو کە کاتی خۆی باب و باپیرانیشیان ئاوا بیانوویان بە مووسا عليه السلام دەگرت، بۆئەوەی ئیمان نەهێنن و لاملیی بکەن و سەرپێچیی بکەن، واتە: ئەوانەی ڕۆژگاری تۆش ئەی پێغەمبەر! ﷺ هەر لەسەر ڕێچکەی ئەو باب و باپیرانەی خۆیان دەڕۆن، هەر خەریکی بیانووگرتن و مل بادان و سەرپێچیی کردنن، ئەگەرنا لەڕاستییدا ئەوان کە داوادەکەن کتێبێکیان بۆ بنێریە خوار، ڕاست ناکەن، ئەوە کتێبەو هاتۆتە خوارو دەنووسرێتەوە، ئەم کتێبە کە موعجیزەیەو دەستەوسانکەرە، ئەوەتا سەرەتا تەحەددای کردوون کە قورئانێکی ئاوا بێنن، دوایی فەرموویەتی: دە سوورەتی ئاوا بێنن، دوایی فەرموویەتی: سوورەتێکی ئاوا بێنن، بەڵام نەیانتوانیوەو دەستەوسان بوون، کەواتە: بزانن کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، وە بەپێی پێداویستی قۆناغەکانی

ژیانی ئێوە دایدەبەزێنێ، ئنجا چوار بەسەرهاتیان بیر دەخاتەوە، كە دیارە كاتی خۆی لە باب و باپیرانیان ڕوویانداوە:

**بەسەرهاتی یەكەم:** دەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾، واتە: دوایی گۆلكیان كردە پەرستراو، دوای ئەوەی ئایەتە ڕۆشن و ئاشكرایەكانیان بۆ هاتن، یاخود دوای ئەوەی موعجیزەو بەڵگە ڕوونەكانیان بۆ هاتن، گۆلكیان پەرست.

بۆ زانیارییتان ئەو بەسەرهاتی گۆلك پەرستییە، لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئاماژەی پێكراوە، جگە لێرە كە دەفەرمووێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ﴾، (أي اتَّخَذوا العِجْلَ إلَـهًا) گۆلكیان كردە پەرستراو، ناڵێین: گۆلكیان كردە خوا !! چونكە هەندێك لە بانگخوازان و تاربێژان تا ئێستا وادەزانن، وشەی (خوا) لەگەڵ پەرستراو هەر یەكەو، لێكیان جیاناكەنەوە، هەندێك لەو بانگخوازو مامۆستایانە كە لەسەر تەلەفزیۆنیش قسە دەكەن، لە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا دەڵێن: دوایی گۆلكیان كردە خوا، نەخێر، ئەو زاتەی بە كوردیی (خوا) بە عەرەبی (اللـه)و، بە فارسیی (خُدا)، بە ئینگلیزی (God)ی پێ دەڵێن، ئەو زاتە یەكەو هەرگیز مشتومڕ لەسەر ئەوە نەبووە كە یەكە، بەڵكو هەمیشە مشتومڕ لەسەر پەرستراو (إلـه) هەبووە، پەرستراو جۆراو جۆرن، ئەگەرنا هەر یەك خوا بووە، خوای پەروەردگار واتە: ئەو پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەنەی كە بەسەر كەون و كائینات ڕادەگات، موشریك و كافرەكانیش مشتومڕو كێشەیان لەسەر یەكتایی خوا نەبووە، وەك تاكە بەدیهێنەرو خاوەن، بەڵكو كێشەو مشتومڕیان لەسەر تەنیا پەرستراوێتیی خوا هەبووە، بۆیە ئێمە لە وشەی تەوحیددا دەڵێین: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خوا (اللـه)، یانی خەڵك پەرستراوی دیكە پەیدا دەكات، دەفەرمووێ: ﴿...مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا...﴿١٤﴾﴾

الكهف، واتە: لەگەڵ خوا پەرستراو (إِلَه)ی دیکەیان پەرستوە، لە قورئاندا هاتوە، پەرستراو(إِلَه) بە دووان (تثنیة)، کراوە ﴿... إِلَـٰهَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴿٥١﴾﴾ النحل، وە کۆ (جَمْع)یش کراوە، ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴿٢٣﴾﴾یس، بەڵام (اللَّه) ناکرێ بە دووان، وە ناشکرێ بە کۆ، بەڵکو تەنیا یەکێکە لە لای کافرو مسوڵمانان، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ﴾، ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ﴾، نەك گوێلکیان کردبێتە خوا، بەڵکو گوێلکیان کردۆتە پەرستراو، ئەگەرنا زانیویانە خوا هەر تاکەو هەر یەکێکە، بەڵام گوتوویانە، ئەو گوێلکەش دەپەرستین، بۆئەوەی لە خوامان نزیك بخاتەوە، هەروەها موشریکەکانیش بتیان پەرستوەو گوتوویانە لە خوامان نزیك دەخاتەوە، وەك خوا لەسەر زاری وان فەرموویەتی: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴿٣﴾﴾الزمر، ئەگەرنا هەر زانیویانە تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو مشوورخۆری هەموویان بەس خوایە ﷻ.

ئێستاش با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان بدەین کە باسی بەسەرهاتی گوێلك پەرستیی جوولەکان دەکات:

١) لە سوورەتی (البقرة) لە ئایەتی (٥٤)دا باسی ئەو گوێلك پەرستییە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾﴾، واتە: وە یاد بکەوە کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! ئێوە ستەمتان لە خۆتان کردوە، کە گوێلکتان پەرستوە، بگەڕێنەوە بۆ لای بەدیهێنەرتان، خۆتان بکوژن، (واتە: ئەوانەتان کە گوێلکیان نەپەرستوە، ئەوانە بکوژن کە

گۆلکیان پەرستوە، یاخود ئەوانەی کە گۆلکیان پەرستوە با خۆیان بکوژن، توێژەرەوانی قورئان چەند بۆچوونێکیان لەوبارەوە هەن).

٢) هەروەها لە سوورەتی (طە)دا بە تەفصیلێ هاتوە، لە ئایەتی (٨٣ - ٩٨) هەمووی باسی چۆنیەتی ئەو مەسەلەیە دەکات، کە لە سەرەتاوە دەفەرموێ: ﴿قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾﴾، واتە: ئێمە لە دوای تۆ گەلەکەتمان گومرا کرد، وە سامیریی هەڵیخەڵەتاندن، جا دوای ئەوەی مووسا پێیان دەڵێ: بۆچی واتان کرد؟ ئاوا وەڵام دەدەنەوە: ﴿قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾﴾، گوتیان: ئێمە بە دەستی خۆمان نەبوو، ئەو خشڵ و زێڕەی پێمان بوو فڕێماندا، سامیرییش فڕێیدا کە هەندێك دەڵێن: لە فیرعەونییەکانیان وەرگرتبوو، سامیریی چاڵێکی هەڵکەند، وەك بۆتەیەك و قاڵبێك لە شێوەی گۆلك داو، ئەو زێڕەی تێهاوێشت و ئاگری تێبەرداو زێڕەکە قاڵ بوەوە، شێوەی گۆلك دەرچوو، کونێکی لەلای پشتەوە کردبوو، کونێکیشی لەلای زاری کردبوو، کە هەوا لەلای پشتیەوە لێی دەداو لەلای زاری دەردەچوو، وەك گۆلك دەیبۆڕاند، دیارە سامیریی دەبێ کابرایەکی وەستاو پیشەسازو شارەزا بووبێ، ئنجا سامیریی گوتی: ئەوە پەرستراوی ئێوەیەو، مووسا پەرستراوەکەی لێ ونبووە بۆیە چووەتە سەر کێوی طوور لێی دەگەڕێ، ﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾﴾طـە، دیارە هاڕوونیش ﷺ پێیان دەڵێ: کە ئەوە پەرستراوی ئێوە نیە، ئەوانیش دەڵێن: هەر دەیپەرستین، تاکو مووسا دێتەوە، ئنجا کە مووسا ﷺ دێتەوە دەڵێ: ﴿قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾﴾، واتە: ئەی هاڕوون! کە دەتبینی گۆلکیان پەرست، بۆ بە دوام

نەکەوتی، ئایا سەرپێچییت لە فەرمانی من کرد؟! ئەویش دەڵێ: ﴿قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي ﴿٩٤﴾﴾ طه، واتە: ئەی کوڕی دایکم (گوتوویەتی: کوڕی دایکم، کەچی کوڕی دایك و باببیشیەتی، بەڵام دەیەوێ سۆزی بجووڵێنێ) سەرو ڕیشم مەگرە، من ترسام لەوەی کە بڵێی بەنی ئیسرائیلت تێکبەرداوە، (واتە: شەڕی ئەهلییت دروست کردوە) بۆیە ئارامم گرت تا دێیتەوە، ئەویش عوزرەکەی قبووڵ دەکات.

٣) هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یشدا ئەو بەسەرهاتە هەر باسکراوە، کە بەسەرهاتێکی زۆر گەورە بووە لە مێژووی بەنی ئیسرائیلدا، بەڵام لە تەوراتی ئێستادا کە من لەبەردەستمەو کە پێی دەگوترێ: پەیمانی کۆن و تەوراتیشی لەنێو دایە، دەڵێ: هارون گۆلکەکەی بۆ دروستکردن[1]!!.

هارون ﷺ کە پێغەمبەری خوایە، گۆلك دروست بکات بۆ بەنی ئیسرائیل و بڵێ: بیپەرستن لە جیاتی خوا !! جوولەکەکان لە کتێبەکانی خۆیاندا ئاوا ڕێز لە پێغەمبەرەکانی خۆیان دەگرن، کە دیارە هەمووی دەستکاریی کراوەو گۆڕراوە، وە قورئان ئەوەی ڕاست کردۆتەوە: وەك لە سوورەتی (طه) دا هاتوە مووسا ﷺ کە دێتەوە لێپێچینەوە لەگەڵ هارون ﷺ دا دەکات و دەڵێ: هارون بۆ بەدوای من نەکەوتی؟ هارونیش

---

١) بڕوانە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: (٣٢- الآيات ١- ٦) (هارون يصنع عِجلَ الذَّهبي) کە ئەمە دەقەکەیەتی: {وَلَمَّا رَأَى الشَّعْبُ أَنَّ مُوسَى قَدْ طَالَتْ إقَامته عَلَى الجَبَلِ اجْتَمَعُوا حَوْلَ هَارُونَ وَقَالُوا لَهُ: "هَيَّا اصْنَعْ لَنَا إِلهاً يتقدّمنا في مسِيرنا لأَنَّنا لانَدْرِي مَاذَا أَصَابَهُ هَذَا الرَّجُلَ مُوسَى الَّذِي أَخْرجنَا مِنْ ديار مِصْرَ. فَأَجَابَهُم هَارُونُ: "إِنْزِعُوا أَقْرَاطَ الذَّهَبِ الَّتِي فِي آذَانِ نِسَائِكُمْ وَبَنِيكُمْ وَبَنَاتِكُمْ وَأعطوني إِيَّاهَا". فَنَزَعوها من آذَانِهِمْ وَجَاءوا بِهَا إِلَى هَارُونَ. فَأَخَذَهَا مِنهُم وَصَهرها وصَنَعَ عِجْلاً. عِندَئِذٍ قَالُوا: "هَذِهِ آلِهَتُكَ يَا إِسْرَائِيلُ الَّتِي أَخرجتك مِنْ ديارِ مِصْرَ!} ، ص: (١٩٤).

ئاوا وەڵامی دەداتـەوە: ﴿ ... إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي ﴿٩٤﴾ ﴾طـه، واتـە: مـن ترسـام لـەوەی کـە بڵـێی بۆچـی بـەنی ئیسـرائیلی تێکبـەرداوە، چـاوەڕێی مـن بـای تـا دەهاتمـەوە، وە لـە سـوورەتی (الأعراف)دا دەڵـێ: مـن دەسـتـەڵاتم نـەبوو ئـەوان زۆرتربـوونو خەریکـبوو بـــشـمکوژن! ﴿ ... قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِي وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِي ... ﴿١٥٠﴾ ﴾، وە هـەر لـە سـوورەتی (طـه)دا خـوای پەروەردگـار بـاس دەکـات کـە هـاڕوون ڕێگـریی گوێلك پەرستیی لێکـردوون، بـەڵام بەقسـەیان نەکـردوە، ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِي ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: وە هـاڕوون پێیگـوتن: ئـەی قەومەکـەم! ئێوە هەڵخـەڵەتـاونو پەروەردگارتان بەس خوایـە، جـا بـەدوای مـن بکـەون، سـەرپێچی فەرمانەکـەم، مەکـەن!

**بەسـەرهاتی دووەم:** کـە خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا ﴾، واتـە: وە پێمانـگوتن بـە کڕنـووشو بـە چـەمینەوەوە، بـچنە نێـو دەرگـاکەوە، شـارێك بـووە خـوای بـەرزو مـەزن فـەرمانی پێکـردوون، بـچنـە نێـوی، بـەڵام فەرموویەتی: بـە کڕنـووش بردنـەوە، نـەك سـەر لەسـەر عـەرزێ دابنـێن بەڵـکو بـە چـەمینەوەو بـە سـەردانەواندەوە بـچنە نێـو شـارەکەوە، چـونکە ئینـسـان ئەگـەر سـەری لەسـەر عـەرزی بـێ نـاتوانی بـڕوا، کەواتـە: ﴿ سُجَّدًا ﴾، واتە: خۆدابنوێنـن، یانی: کە ئەو شـارە دەگرن، لووتـتان نەچێتە ئاسـمانێو لـەخۆبایی مـەبن، بەڵـکو سـەردانەوێننو بـە تەوازوعـەوە، وەك پێغـەمبەر ﷺ لە کـاتی ئـازادکردنی مەککەدا دەڵـێ: نێوچـەوانی موبارەکی لـە قەرپـووزی زینیـی وڵاخـەکەی دەدا، بـە تەوازوعـەوە دەچووە نێـو شـاری مەککـە، هەرچـەندە لـەوپەڕی دەسـتـەڵاتو هێـزدا بـووە، بـەڵام تەوازوعـی

بــۆ خـــوای زاڵو باڵادەســـت پێـــشانداوە، وەك لـــە ســـــوورِەتی (البقــرة)دا لەوبارەوە دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، هـەروەها لـە سـوورِەتی (الأعـراف)یـشـدا شـێوەی ئەمـە هـاتوە، واتـە: کـاتێك پێمانـگوتـن بچنە ئەو شارەوە (قريـة: لـە قورِئانـدا، واتـە: شارێکی گـەورە) وە لە هەر شوێنێکی دەتانەویٚ بە فراوانی بخۆن، رِزقو رِۆزی باشی تێدایە، وە بـە چـــەمینەوەوە بـــچنە نێـــو دەرگـــای شـــارەکەو بڵـــێن: (حِطَّةٌ) واتـــە: خوایـــە! گوناهـەکانمان لــیٚ دابارێنـە، ئێمـەش لـە گوناهـەکانتان خـۆش دەبـین، وە بـۆ چاکەکـــارانیش زیـــاد دەکـــەین، بـــەڵام ئەوانـــەی کـــە ســـتەمیان لـــەخۆیان کـــرد، قـسـەیەکی دیکـــەیان کـــرد، غـــەیری ئـــەو قـــسـەیەی کـــە پێیـــان گوتـــرا بـــوو، بۆیـــە ئەوانـــەی کـــە ســـتەمکاربوون لـــە ئاســـمانێوە (لـــە ســـەرێوە) ســـزامان بـــۆ دابـەزاندن بـە هـۆی ئـەوەوە کە لایـانـدابوو.

**بەسـەرهـاتی سـێیەم:** کـە خـوای پەروەردگـار دەفەرمویٚ: ﴿ وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ ﴾، وە پێمانـــگوتن: لـــە رِۆژی شـــەممەدا، دەســـتدرێژیی مەکـــەن، لەنێـو کـوردەواریی خۆمانـدا قـسـەیەك هەیـە دەڵـیٚ: (جوولەکـە شـەممەی ناشـکێنن) جوولەکـە لـە دینـی خۆیـاندا لەسـەریان پێویـستە رِۆژی شـەممە ئاگـر نەکـەنەوە، هیچ ئیـشوکارێك نەکـەن، چونکـە ئەگـەر ئـیش بکـەن یـان ئاگـر بکـەنەوە، دەڵێن: ئەوە شـەممەیان شـکاندوە، گوناهبـار دەبـن، جا ئـەوە کـە شـەممەیان شـکاندوە، ئـەویش لـە سوورِەتی (الأعـراف) لـە ئایـەتی (١٦٣ - ١٦٦)دا بەسـەرهـاتەکە بـاس دەکـات، کـە ئـاوا دەسـت پێدەکـات، ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ

عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾﴾، واتە: پرسیاریان لێبکە دەربارەی ئەو شارەی کە لە نزیك دەریا بوو، کە لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژیی یان دەکرد، کە لە ڕۆژی شەممەدا ماسییەکان سەریان لە ئاو دەردێناو دەهاتنە بەردەستیان (ئەوانیش لێیان قەدەغەکرا بوو لە ڕۆژی شەممەاندا ڕاوە ماسیی بکەن خوای کاربەجێش بۆ تاقیکردنەوەی ئەوان وایکردبوو) کە بەس بە ڕۆژی شەممان ماسییەکان دەهاتنە بەردەستیان و غەیری ڕۆژی شەممەی نەدەهاتن، جا خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾، واتە: ئاوا تاقیمان دەکردنەوە، چونکە لادەربوون، ئەوانیش هەڵسان فێڵیان کرد، فێڵەکەیان چی بوو؟ ڕۆژی شەممە دەهاتن دەیانگوت: ئێمە ڕاوە ماسیی ناکەین، بەڵام شەممە کە ماسییەکان دەهاتن دەیانهێنانە تەنکاوێو لەو لای بەربەستێکیان دروست دەکرد، هەر ڕۆژی شەممە، بەڵام لە ڕۆژی یەك شەممەو دوو شەممەدا بە لە باریی دەچوون ماسییەکانیان دەگرت و دەیانگوت: خۆ ڕۆژی شەممە ڕاومان نەکردوون!! بەس ڕۆژی شەممە دیوارێك بەربەستێکیان دروست دەکرد تاکو ماسییەکان نەتوانن بچنەوە نێو قووڵایی، لەوێ لە تەنکاوێدا عاسێیان دەکردن، ڕۆژی یەك شەممەو دوو شەممەو ڕۆژەکانی دیکە، دەهاتن بە ئاسانی دەیانگرتن، جا فێڵی شەرعیی (الحيلة الشرعية)ی لەوەوە هاتوە، کە دیارە شەرع حیلەو فێڵو خیانەتیی تێدا نیە، بەڵکو جوولەکە بەو شێوەیە فێڵیان کردوە، بۆیە هەندێك لە شەرعزانان دەڵێن: (الحيلة الشرعية) لە جوولەکەکانەوە دەرکەوتوە، ئەگەرنا شەریعەتی خوای دادگەر ڕێك و ڕاستە حیلەو فرت و فێڵ قبووڵ ناکات.

هەروەها باسی شەممە شكاندن لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٦٥ - ٦٦)دا هاتوە، كە لە بەرگی یەكەمی ئەم تەفسیرەدا هاتوە، كە دیارە لەوێ بە كورتیی و لە دوو ئایەتدا باسی ئەم بەسەرهاتە دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: (ئەی جوولەكەكان !) ئێوە ئەوانە دەزانن كە دەستدرێژیی یان كرد لە ڕۆژی شەممەدا، كە پێمانگوتن: ببنە مەیموونی پەستو زەبوون، وە كردمانن بە جێی پەند بۆ ئەوانەی پێش خۆیانو بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، (یاخود بۆ ئەوانەی كە لە دەوروبەریانن)، وە كردمانن بە ئامۆژگاریی بۆ پارێزكاران.

هەروەها لە شوێنی دیكەش لە قورئاندا ئاماژەی پێكراوە، كە كۆمەڵێك لە جوولەكەكان خوا كردوونی بە مەیموونو بەراز، یان بە مەیموون، وەك لێرەدا باس دەكات، هەندێكیش دەڵێن: سیفەتی مەیموونیان تێدا پەیدابووە، ئەگەرنا بە شكڵو شێوە هەر ئینسان بوون، بەڵام ڕەوشتو ڕەفتاری مەیموونیان تێدا پەیدابووە.

**بەسەرهاتی چوارەم:** كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴾، وە پەیمانێكی پتەومان لێوەرگرتن، ئەوە كەنگێ بووە؟ ئەوەش بەسەرهاتێكی دیكەیە، كە لێرەدا خوای شارەزا هەموو ئەو شتانە دەخاتەوە بیر جوولەكەكانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی هەم بۆخۆیان وەك تەمبێكردنو سەرزەنشت بێ‌و، بزانن ئێستا كە بیانوو بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەگرن، بابو باپیرانیشیان بیانوویان بە مووسا ؛ گرتوە، وە هەم بۆ بەرچاوڕوونیی مسوڵمانان، كە ئەوانیش فێر نەبن بیانوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرن، هەرجارە بڕوبیانوویێك بێننەوە، بەڵكو چی خوا فەرمووی، جێبەجێی بكەن، ئنجا ئەو

مەسەلەیەی پەیمانی پتەو لێوەرگیرانە، لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٦٣ - ٦٤)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَكُنتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٤﴾﴾، واتە: وە یادبکەنەوە کاتێك پەیمانی پتەومان لێتان وەرگرتوەو طوورمان بەسەرتاندا بەرز کردەوە، (طوور[1]: واتە: چیا، کێو) وە پێمانگوتن بەتووندی وەریبگرن، وە بزانن چی تێدایە؟ بۆئەوەی کە پارێز بکەن، بەڵام دوای ئەوە پشتتان هەڵکرد، وە ئەگەر بەخششو بەزەیی خوا نەبوووایە، ئەوە ئێوە لە زەرەرمەنداندەبوون، بەڵام خوای بەرز چاوپۆشیی لێکردنو لێی بوردن.

وە لە سوورەتی (الأعراف)یش لە ئایەتی (١٧١)دا باسی ئەو بەسەرهاتە دەکات، کە پەیمانیان لێ وەرگیراوە، دوای ئەوەی کێویان بەسەردا بەرز کراوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾﴾، واتە: یاد بکەنەوە کاتێك چیایەکەمان بەسەریانەوە بەرز کردەوە، وەك سێبەرێك وابوو لەسەریان، وە پێیان وابوو ئێستا بەسەریاندا دەکەوێ، پێمانگوتن: ئەوەی کە پێماندراون (لە بەرنامەو ڕێنمایی) بە توندوتۆڵی وەریبگرن، وە بزانن چی تێدایە؟ بۆئەوەی پارێزتان پەیدابێ.

---

١) هەندێکیش گوتوویانە: (طور) ناوی چیایەکی تایبەتە کە مووسا ﷺ: گفتوگۆی لەسەر لەگەل خوادا کردوە، بەڵام من ئەم ڕایەم پێ بێهێزە، چونکە خوا عز وجل هەر کام لە (طور) و (جبل)ی کردوە بە ناوی ئەو شتەی کە وەك سێبەر (كأنه ظلّة) بە سەرسەری جوولەکەکانی دا بەرز کردۆتەوە، ئاشکراشە کە (جبل) چیایەو دیارە (طور)یش هەر هاوواتای (جبل)ە، وەك دواییش لە درێژەی ئەم دەرسەدا باسمان کردوە.

ئەوەش كاتێك بوو كە مووسا ﷺ تەوراتی بۆ هێناو فەرمووی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دەبێ بەو شێوەیە ژیانی خۆتان ڕێكبخەن، ژیانی كۆمەڵایەتیی، خێزانیی، تاكیی، ئابووریی، سیاسیی.. هتد، گوتیان: نایكەین، فەرمووی: ئاخر ئەوە فەرمانی خوایە، بۆئەوەی ژیانتان ڕێبخەن دەبێ بەو شێوەیەبێ، ئیدی ملیان نەدا، دیارە دوایی مووسا ﷺ گفتوگۆی لەگەڵ خوای بێ وێنەدا كردو، سكاڵای كردو فەرمووی: ئەی پەروەردگار! ئەو گەلە ملكەچ نابن، خوای باڵادەستیش كێوێكی هەڵقەند، بۆیە زانایان گوتوویانە: قورئان هەندێكی هەندێكی تەفسیر دەكات، بۆئەوەی بزانین (طور) یانی: چی؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ ﴾، (نَتَقْنَا) یانی: (نَزَعْنَا) واتە: چیاكەمان هەڵقەند، ئنجا بەسەر سەریانەوە ڕامانگرت، چیایەكی گەورە، وەك هەورو سێبەر بەسەر سەریانەوە ڕابگیرێ، شتێكی زۆر سەیرو سەر سووڕهێنەر بووە؟ چیایەكی بەسەر سەرەوە ڕاگرتن و خوای باڵادەست بە مووسای فەرموو: پێیان بڵێ: پابەند دەبن بە تەوراتەوە، یان نا؟ جا دەڵێ: لە ترسان سەجدەیان بردبوو، لەسەر لایەكی سەریان سەجدەیان بردبوو و بە لایەكی دیكە تەماشایان دەكرد، نەوەك بەسەریاندا بكەوێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾، وە پێیانوابوو ئێستا بە سەریاندا دەكەوێ، ئنجا دوایی گوتیان: پابەند دەبین، وە بەڵێنیانداو بەڵێنێكی پتەویان لێوەرگیرا.

ئەم چوار ڕووداوە خوای پەروەردگار بیر جوولەكەكانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺیان دەخاتەوە، كە ئێوە باب و باپیرانیشتان هەر ئاوا لاملیی و لاسارییان كردوە، ئەوە لەلایەكەوە، لەلایەكی دیكەشەوە ئەوە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ كە خوا ئاوا ئەو جوولەكانەی هێناوەتە ژێر بار، ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگانەی پێشانداون، ئنجا هەر كەللە ڕەق و لاسار بوون، بۆیە سەیر نیە ئەی موحەممەد! ﷺ ئەگەر جوولەكەكانی سەردەمی تۆش ئاوابن، ئەوانەش دیارە كوڕی ئەو بابانەن، بۆیە ئاوان.

**مەسەلەی سێیەم:** خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە جوولەکەکان نەفرینیان لێکراوەو لە ڕەحمەتی خوا دوور خراونەتەوە بە هۆی خراپەو تاوانەکانیانەوە، دیارە ئەوەش دیسان لێرەدا دەرسێکی تێدایە بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەتایبەت، وە بۆ مسوڵمانانو خەڵکی دیکەش بەگشتی، کە بزانن جوولەکەکان بە هۆی گوناهەکانیانەوە خوا لەعنەتی لێکردوون، کەواتە: ئێوەش ئاگاتان لە خۆتان بێ، تووشی ئەو تاوانو گوناهانە نەبن، کە بتانکەنە مایەی دابەزینی لەعنەتو نەفرینی خوا، وەك لە ئایەتەکانی (١٥٥ - ١٥٧)دا دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِآيَاتِ اللَّهِ وَقَتْلِهِمُ الْأَنبِيَاءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ۚ بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾﴾، لێرەدا خوای کاربەجێ حەوت گوناهان دەخاتەوە بیر جوولەکەکان کە بە هۆی ئەو حەوت گوناهانەوە خوا لەعنەتی لێکردوونو غەزەبی لێگرتوون، چونکە خوای بێ وێنە خزمایەتیی لەگەڵ کەسدا نیە، کێ بۆ خوا ملکەچو پابەندبێ، خۆشیدەوێ‌و، کێ لاسارو لامل بێ، خوا ڕقی لێدەبێتەوەو حەز لە چارەی ناکات، کەواتە: ئەوەی جوولەکەکان دەیانگوت ڕاست نیە، ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَىٰ نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ... ﴿١٨﴾﴾ المائدة، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواینو خۆشەویستانی خواین، (یانی: گوناهانیش بکەین دەبەخشرێین، چونکە کوڕی خواینو خۆشەویستی خواین!) خوای

پەروەردگاریش لە وەڵامیاندا دەفەرموێ: ﴿... قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ...﴿١٨﴾﴾ المائدة، واتە: بڵێ: (ئەگەر كوڕانی خواو خۆشەویستانی خوان) ئەدی بۆچی بە هۆی گوناهەكانتانەوە سزاتان دەدات، (ئەدی بۆچی چەندان بەڵای بەسەرهێناون لەسەر سەرپێچییكردنتان؟ كەواتە: ڕاست ناكەن كوڕی خواو خۆشەویستی خوا نین) بەڵكو ئێوەش بەشەرێكن وەك ئەو خەڵكەو، خوا ئەوەی بیەوێ لێی دەبووری، ئەوەی بیەوێ سزای دەدات، كەواتە: ئێوە هیچ ئیمتیازێكتان بەسەر باقی بەشەردا نیە، ئنجا بۆ زانیارییتان ئێستاش جوولەكە دەڵێن: (نَحْنُ شَعْبُ اللَّهِ الْمُخْتَار) واتە: ئێمە گەلی هەڵبژاردەی خواین و، قەناعەتیان وایە دەڵێن: ئێمە گەلێكین خوا هەڵیبژاردووین، بەڵام بێگومان ئەوە درۆو دەلەسەیە و هیچ ئەسڵ و ئەساسی نیە، خوا تەنیا ئەو كەسانە هەڵدەبژێرێ كە فەرمانبەریی بۆ دەكەن و بەندەی بە وەفاو چاكن و پاكن، بەڵام كەسێك هەموو گیانی سەرپێچیی و كەموكوڕیی و لاملیی بێ، هەڵبژێدراوی چییە؟

ئنجا لێرەدا خوای زانا بە ڕاشكاویی نەیفەرمووە: نەفرەتی لێكردوون، ئەدی ئێمە بەڵگەمان چییە كە خوا نەفرەتی لێكردوون بە هۆی ئەو كارە خراپانەیانەوە؟ بەڵگەمان ئەوەیە كە خوا ﷻ لە سووڕەتی (المائدة) لە ئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ...﴿١٣﴾﴾، واتە: بە هۆی پەیمان شكاندنیانەوە لەعنەتمان لێكردن، وە دڵیانمان ڕەق كرد... هتد، ئنجا بێینە سەر ئەو حەوت شتەی كە خوای زاناو شارەزا دەیانخاتە ڕوو:

١/ ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ﴾، بە هۆی ئەوەوە كە پەیمانیان شكاند.

٢/ ﴿وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، وە بێبڕوابوون بە ئایەتەکانی خوا، چ ئایەتە خوێنراوەکان، چ ئایەتە بینراوەکان کە مەبەست دیاردە سروشتییەکانن، وە چ نیشانە یاسا دڕو دەستاوسانکەرەکان، کە لەسەر دەستی پێغەمبەران (علیهم الصَّلاَة والسلام) وەك موعجیزەو بەڵگە دەرکەوتوون، چونکە وشەی: (آیات) جاری دیکەش باسمان کردوە لە قورئاندا بۆ سێ شت بەکاردێ: بۆ ئەو ڕستانەی کە خوا دەیاننێرێ دەخوێنرێنەوە (الآیات المَقروءة)، وە دیاردە سروشتییەکانی کەون و کائینات (الآیات المَنظُورة)، وە بۆ ئەو بەڵگەو موعجیزانەش خوای پەروەردگار دەیدات بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییان.

٣/ ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾، وە بە هۆی ئەوەوە کە بە ناهەق پێغەمبەرانی خوایان دەکوشت، جارێ زەکەریاو یەحیایان بە تەئکیدی کوشتوە، وە پێغەمبەرانی دیکەشیان کوشتوون، بەڵام لە قورئاندا تەنیا باسی ئەوانە کراوە، وەك ناوهێنان.

٤/ ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، وە بە هۆی ئەوەوە کە گوتیان: دڵمان توورەکەی زانیاریی یە، واتە: دڵمان پڕە لە زانست، ئەی موحەممەد! پێویستییمان بە زانیاریی تۆ نیە، یان واتە: دڵمان داپۆشراوەو لە کیس دایەو زانیاریی ناچێتە نێو[1].

جا خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، بەڵکو خوا بەهۆی کوفرەکەیانەوە مۆری بەسەر دڵەوە ناون، بۆیە بە کەمیی نەبێ ئیمان ناهێنن، واتە: ئیمانێکی کەم نەبێ ناهێنن، یاخود کەمێکیان نەبێ ئیمان ناهێنن، هەردوو واتاکەی هەیە، بەڵام هی دووەمیان ڕاستترو بەجێترە.

---

١) غُلُف: یان کۆی (غلاف)ە، واتە: کیفو توورەکەی زانست، یان کۆی (أَغلف)ە، واتە: لە کیفو بەرگدا داپۆشراوە.

٥/ ﴿وَبِكُفۡرِهِمۡ﴾، وە بە هۆی بێبڕوایی یانەوە بە خواو بەرانبەر پێغەمبەرانی خوا.

٦/ ﴿وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا﴾، وە بە هۆی ئەوەوە دەربارەی مەریەم (دایکی عیسا ﷺ) بوختانو تۆمەتێکی گەورەیان هەڵبەست، گوتیان: مەریەم ئەو کوڕەی کە بووە ڕاست ناکات خوا جیبریلی ناردبێ و چووبێتە شێوەی بەشەرێکەوە، وە عیسای بە یەخەی مەریەمدا کردبێ و، چووبێتە نێو منداڵدانی و بووبێتە منداڵ، بەڵکو مەریەم زینای کردوە لەگەڵ کابرایەکی دیکەدا، وە عیسایان کرد بە زۆڵ (بیژوو)، بۆیە خوا دەفەرموێ: وە بە هۆی ئەوەوە کە بوختانێکی گەورەیان بۆ مەریەم هەڵبەست.

٧/ ﴿وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا﴾، بە هۆی ئەوەوە کە گوتیان: ئێمە مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خوامان کوشتوە، جا جێی سەرنج ئەوەیە کە جوولەکەکان عیسایان نەکوشتوە، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام خوای پەروەردگار لەعنەتی لێکردوون بە هۆی ئەو قسەیانەوە، چونکە خۆیان بەوەوە هەڵکێشاوەکە عیسایان کوشتوە، هەرچەند نەشیانکوشتوە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە هەرکەسێك خۆی بە گوناهێکەوە هەڵکێشێ، با نەشی کردبێ، لەسەری دەنووسرێ و لەسەری سزا دەدرێ، بۆچی؟ چونکە دیارە کە بەو گوناهە ڕازییەو ئەو گوناهەی پێ چاکە، بۆیە شانازیی پێوە دەکاتو، پێی وایە شتێکی باشی تۆمار کردوە، کە ئەو گوناهەی کردوە، بۆیە لەسەر خۆهەڵکێشان بەو گوناهەوە، سزا دەدرێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

## ڕاستکردنەوەی هەڵەیەکی مێژوویی گرنگ

## بۆ جوولەکەو نەصرانییەکان

خوا ﷻ لە ئایەتەکانی (١٥٦ - ١٥٧)دا ڕاستییەکی مەزن ڕادەگەیەنێ، کە ئەوە ڕاستکردنەوەیەکی مێژووییە بۆ جوولەکەکانو نەصرانیی یەکان بەشێوەیەکی تایبەتیی‌و، بۆ بەشەر بەگشتی، ئەویش ئەوەیە کە خوا ئەو ڕاستییە ڕایدەگەیەنێ کە کوژرانو لە سێدارەدانی عیسا ﷺ لەلایەن جوولەکەکانو ڕۆمەکانەوە، شتێکی بێ بنەمایە، جوولەکەکان لافی ئەوەیان لێداوە کە بە هاوکاریی ڕۆمەکان عیسایان گرتووەو لە سێدارەیان داوە، جا ئێستا جوولەکە وا دەڵێن بەهەرحاڵ، بەلام نەصرانییەکانیش باوەڕیان کردوە کە عیسا لە سێدارە - خاچ - دراوەو هەڵواسراوە، وە دەڵێن نێژراوەو دوای سێ ڕۆژان زیندووبۆتەوە، ئەوانیش تووشی ئەو هەڵەیە بوون، ئنجا خوای زاناو شارەزا لەم دوو ئایەتەدا باسی ئەو مەسەلەیە دەکاتو، ئەو هەڵەیە ڕاستدەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ ﴾، وە نەیانکوشتوە، وە هەڵیشیان نەواسیوە، لە سێدارەیان نەداوە، ﴿ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ﴾، بەڵکو وێنەی ئەویان بۆ براوەتە سەر یەکێکی دیکە، وێنەی عیسایان بۆ براوەتە سەر یەکێکی دیکە، وە ئەوانەی کە تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی یەوە، بۆخۆیان لێی لە گوماندانو یەقینیان نیە کە کوژراوە، ﴿ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴾، وە زانیارییان دەربارەی نیە، جگە لە شوێنکەوتنی گومان، بەلام یەقینیان نیە کە کوشتوویانە یان: بە دڵنیاییەوە نەیانکوشتوە، ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ

﴿عَزِيزًا حَكِيمًا﴾، بەڵكو خوا بەرزی كردەوە بۆ لای خۆی، وە خوا زاڵی كاربەجێیە، ئەم دوو ئایەتە وەك ئەو دوو ئایەتەی سوورەتی (آل عمران) وان، كە پێشتر تەفسیرمان كردن، كە خوای تواناو زاڵ دەفەرموێ: ﴿وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ٥٤ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٥٥﴾، واتە: وە ئەوان فێڵیان كرد، خواش تەگبیری كرد، وشەی: (مَكر) دەڵێ: (التدبیر الخَفِيّ) واتە: تەگبیرێكی پەنهان، جا بۆ خوا ﷻ جوان نیە وشەی فێڵ بەكاربێنین، واتە: تەگبیری كرد، نەخشەی كێشا، بەڵام بۆ ئەوان كە مەبەستێكی گڵاوو خراپیان هەبووە، كە كوشتنی پێغەمبەرێكی خوایە، لێی دەوەشێتەوە بڵێین: فێڵیان كردوە، جا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوە لەسەر شێوەی موشاكەلەیە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمۡ يَكِيدُونَ كَيۡدٗا ١٥ وَأَكِيدُ كَيۡدٗا ١٦﴾الطارق، واتە: ئەوان فێڵ دەكەن، منیش فێڵ دەكەم، خوای بەرز لەبەرئەوەی بەو تەگبیرو نەخشەیەی كە دایدەنێ، فێڵی ئەوان هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە ناوی لێناوە فێڵ، ئەگەرنا ئەوەی خوای دادگەر پێی ناگوترێ فێڵ، (راغب الأصفهاني)دەڵێ: (المَكْرُ: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يقصِدُهُ بِحِيلةٍ، وَذَلِكَ ضَربَانِ: مَكْرُ مَحْمُودٍ وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِذَلِكَ فِعْلَ جَمِيلٍ، وَمَذْمُومٌ وَهُوَ أَنْ يَتَحَرَّى بِهِ فِعْلَ قَبِيحٍ)، واتە: لە زمانی عەرەبییدا وشەی: (مَكْر) بریتیە لە لادانی بەرانبەرەكەت لەو ئامانجەی دەیەوێت، وە بە فێڵێك لایبدەی بە شێوەیەك كە بۆخۆی هەستی پێنەكات، جا ئەویش دوو جۆرە:

فێڵی باش: کە مەبەست پێی هێنانەدی کردەوەیەکی باشبێ.

فێڵی خراپ: ئەویش ئەوەیە کە بەهۆی ئەو فێڵەوە بیەوێ کردەوەیەکی خراپ یان ئامانجێکی خراپ بێنێتە دی، ئنجا وشەی: (مَكْر) کە بۆ دوژمنانی عیسا بەکارهاتبێ، بە پیلان و فێڵ لێکدەدرێتەوە، بەڵام کە بۆ خوای دادگەر بەکارهاتبێ، مەبەست پێی تەگبیرو نەخشەکێشانە.

ئنجا خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾، واتە: خوا باشترین نەخشە کێش‌و پلان دانەرە.

ئنجا باسی دەکات دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ ﴾، کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾، ئەم ڕستەیە بە سێ واتایان هاتوە: (مُمِيتُكَ أَوْ مُنِيمُكَ أَوْ قَابِضُكَ) واتە: دەتمرێنم، یان دەتخەوێنم، یان وەرتدەگرم، وە دەگوترێ: (تَوَفَّى الْمُدَّة: بَلَغَهَا وَاسْتَكْمَلَهَا) واتە: ماوەکەی تەواو کردو گەیاندیە سەر، یاخود تەواویی کرد، ئنجا خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾، دەبێ سەرنج بدەین! داخۆ کام مانایان لەگەڵ سیاقەکەدا دەگونجێ، ئەگەرنا لە ئەسڵدا (مُتَوَفِّيكَ) ئەو سێ واتایەی هەیە: مراندن‌و خەواندن‌و وەرگرتن، بەڵام لێرەدا بە مانای (دەتمرێنم) نایەت، بەڵکو بەمانای وەرگرتنی شتێك بە تەواوی دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَا ...﴿٤٢﴾ ﴾الزمر، واتە: خوا لە کاتی مردندا گیانەکان وەردەگرێ، ئەوەی نەشمردبێ لە کاتی خەوتنی دا...، کەواتە: ڕووح وەرگیران لە کاتی خەوتنیشدا پێی دەگوترێ (وَفَاة)، بەڵام بۆچی لێرەدا ناگونجێ بڵێین: (وَفَاة) بە مانای مردن دێ؟ چونکە جوولەکەکان دەیانویست عیسا بمرێنن، بیکوژن، جا ئەگەر خوای باڵادەست بۆخۆی مراندبێتی، مانای وایە ئەوە

ئامـانجی جوولەكەكـانو ڕۆمەكـان هاتۆتـە دی ! نـا، لێـرەدا (وَفَاة) بەمانـای خەواندنە، یاخود بە مانای وەرگرتنە، كەواتە: ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾، لێرەدا یانی: دەتخـەوێنم، (مُنيمُـكَ)، یـان: بـە تـەواویی وەرتـدەگـرم، (آخِذُكَ بِكَامِلِكَ) واتـە: مـن بـە ڕووحو جەسـتەوە وەرتـدەگرم، ﴿وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾، وە بـۆ لای خـۆم بـەرزت دەكەمـەوە ﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾، وە پاكـت دەكەمـەوە لەوانـەی بێبـڕوان، وە ئەوانەی شوێن تۆ كەوتوون بەسەر ئەوانی دیكەیاندا زاڵ دەكەم تا ڕۆژیی دوایی ...هتد، دیارە لە تەفسیری سووڕەتی (آل عمران)دا كە بریتیە لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرە بە تەفصیلْ باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوە.

## ئینجیلی بەڕنابا قسەی نەصرانییەكان بە لەسێدارەدرانی عیسا بە دۆر دەخاتەوە

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا ئەو كەسەی شێوەی عیسای ﷷ براوەتە سەر، وە لە جیاتی عیسا ﷷ لە سێدارە درا، لە خاچ درا، بابایەكی خائین بووە، یاخود فیداكار بووە؟

دوو ڕا هەن:

<u>**ڕای یەكەم**</u>: لە (إنجيل بَرنابا)دا[1] هاتوە: كە ئەو كەسە یەكێك بووە لە دوازدە (١٢) حەوارییەكانی عیسا ﷷ، وە خیانەتی لە عیسا كردوە لە

١) ئینجیلی بەڕنابا ئەو ئینجیلەیە كە (بەڕنابا) نووسیویەتی، كە یەكێك بووە لە (حواریی)یەكانی عیسا ﷷ، وە (الدكتور خليل سعادة) لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی وەریگێڕاوەو لە ساڵی (١٣٢٦)ی كۆچی چاپ كراوە، بەڵام نەصرانییەكان دان بەم ئینجیلەدا ناهێنن، چونكە ئەو ئینجیلە دەڵێ: عیسا بەندەو پێغەمبەری خوایە، نەك كوڕی خوا!!

بەرانبەر تۆزێك پارەو تەماع دا، ئێستاش با لەوبارەوە سەرنجی بەشەکانی (٢١٣، ٢١٤، ٢١٥، ٢١٦) ئینجیلی (بەرنابا) بدەین، لە: (الفصل الثالث عشر بعد الْمِئَتَين)، واتە: لە فەصلی (٢١٣)دا، لە ئایەتی (٢٤ تاکو ٢٩) بەم شێوەیە هاتوە: {(٢٤) فَقَالَ يَسُوعُ أَيضًا: «الْحَقَّ أَقُولُ لَكُمْ: إِنَّ وَاحِدًا مِنْكُمْ سَيُسَلِّمُنِي فَأُبَاعُ كَخرُوف». (٢٥) وَلَكِنْ وَيْلٌ لَهُ لأَنَّهُ سَيَتِمُّ كُلُّ مَا قَالَ دَاوُدَ أَبُونا عَنْهُ أَنَّهُ: «سَيَسقُط فِي الهُوَّةِ الَّتي أَعَدَّهَا للآخرِين». (٢٦) فَنَظَر من ثَمَّ التَّلاَمِيذ بَعْضُهُم إِلى بَعْض قَائِلِينَ بحزن: «مَنْ سَيكُونُ الْخَائِن؟». (٢٧) فَقَالَ حينَئذٍ يَهُوذَا: «أَأَنَا هُوَ يَا مُعَلِّم؟». (٢٨) فَأَجَابَ يَسُوعُ: «لَقَدْ قُلْتَ لِي مَنْ هُوَ الَّذي سَيُسَلِّمُنِي». (٢٩) أَما الأَحَد عَشَرَ رَسُولاً فَلَمْ يَسْمَعُوهُ»}، واتە: هەروەها یەسووع گوتی: من هەقتان پێ دەڵێم: یەکێك لە ئێوە من تەسلیم دەکاتو وەك بەرخ دەفرۆشرێم، بەڵام سزای سەخت بۆ وی، لەبەرئەوەی ئەوە دێتەدی کە بابمان داوود لەبارەیەوە گوتوویەتی: "سەرەنجام دەکەوێتە ئەو چاڵەوە کە بۆ خەڵکی دیکەی هەڵکەندوە"، قوتابییەکان تەماشای یەکدییان کرد (واتە: حەواریی یەکان تەماشای یەکدییان کرد)، بە دڵ تەنگییەوە گوتیان: دەبێ ئەو خائینە کێ بێ؟ لەو کاتەدا یەهووذا گوتی: ئایا منم ئەی مامۆستا؟! یەسووع، (واتە: عیسا) وەڵامی دایەوە گوتی: ئەوە تۆ پێتگوتم کە کێیە تەسلیمم دەکات، (واتە: بۆخۆتی)، بەڵام یازدە قوتابییەکان گوێیان لەو قسەیەی عیسا نەبوو.

وە لە (الفصل الرابع عشر بعد الْمِئَتَين) واتە: لە فەصلی (٢١٤)دا لە ئایەتی (٢ تاکو ٧) بەم شێوەیە هاتوە:

{(٢) لَمَا كَانَ يَهُوذَا يعرف المَوضع الَّذِي كَانَ فِيهِ يَسُوعُ مَعَ تَلاَمِيذِهِ، ذَهَبَ إِلى رَئِيس الكَهنة (٣) وَقَالَ: «إِذَا أَعطيتني مَا وَعَدْتَ بِهِ أُسَلِّمُ هَذِهِ اللَّيلَةَ لِيَدِكَ يَسُوعَ الذَّي تَطلبونَهُ (٤) لأَنَّهُ مُنْفَرِدٌ مَعَ أَحَدَ

عَشَرَ رَفِيقَاً». (٥) أَجَابَ رَئِيس الكَهنة: «كَمْ تَطْلب؟». (٦) قَالَ يَهُوذَا: «ثَلاَثِينَ قِطْعَةً مِنَ الذَّهَب». (٧) فَحِينَئِذٍ عَدَّ لَهُ رَئِيس الكَهنة النقود فَوْرَاً...}، واتە: لەبەرئەوەی یەهووذا ئەو شوێنەی دەزانی کە یەسووع لەگەڵ قوتابییەکانی تێیدا بوو، چوو بۆ لای سەرۆکی کاهینەکان، گوتی: ئەگەر ئەوەی بەڵێنت پێداوم بمدەیە (واتە: ئەو ئەندازە پارەیە) ئەوە من ئەمشەو ئەو (یەسووع)ە، تەسلیمی دەستی تۆ دەکەم، کە ئێوە بەدوایدا دەگەڕێن، چونکە لەگەڵ یازدە لە هاوەڵەکانی لە شوێنێك تاك بۆتەوە خۆیان پەنهان کردوە، سەرۆکی کاهینەکان (واتە: سەرۆکی پەرستگای جوولەکەکان) گوتی: چەند داوا دەکەی بتدەمێ؟ یەهووذا گوتی: سی (٣٠) پارچە زێڕ، لەو کاتەدا سەرۆکی کاهینەکان ئەو ئەندازە پارەیەی دەستبەجێ بۆ ژمارد.

وە لە (الفصل الخامس عشر بعد المِئَتَين) واتە: لە فەصلی (٢١٥)دا، لە ئایەتی (١ تاکو ٦) بەم شێوەیە هاتوە:

{(١) وَلَما دَنَت الجنُود مَعَ يَهُوذَا مِن المحَل الَّذِي كَانَ فِيهِ يَسُوعُ، سمعَ يَسُوعُ دُنُوَّجَمٍّ غفير (٢) فَلِذَلِكَ انسَحَب إلى البَيْتِ خَائِفَاً (٣) وَكَانَ الأحَد عَشَرَ نياماً (٤) فَلَمَا رَأى اللَّهُ الخَطَر عَلَى عَبْدِهِ أمَرَ جبريل وميخائيل و رفائيل و أوريل سفراءه أَنْ يأخذوا يَسُوعَ من العالَم (٥) فَجَاءَ الملائكة الأطهار وأَخَذوا يَسُوع من النافذة المشرفَة عَلَى الجنُود (٦) فَحَمَلُوهُ وَوَضَعُوهُ في السَّماء الثَالثة في صحبة الملائكة الَّتي تُسَبِّحُ اللَّه إلى الأَبَد}، واتە: وە کاتێك سەربازەکان لەگەڵ یەهوذا لەو شوێنە نزیکبوونەوە کە یەسووعی تێدابوو، یەسووع گوێی لە غەڵبە غەڵبو دەنگێکی زۆر بوو، بۆیە لەو کاتەدا (عیسا) بەترسەوە چوو بەرەو پشتەوەی ژوورەکە، وە یازدە هاوەڵەکەی خەوتبوون، کاتێك خوا ﷻ مەترسیی لەسەر بەندەکەی خۆی بینی، فەرمانی کرد بە جیبریلو

میخائیلو ڕوفائیل و ئۆریـل کە ئەوانە نوێنــەری ئـەون، کە یەسووع لـە دنیـا بەرنـە دەرێو بـەرزی بکەنـەوە، ئـەو فریـشـتـە پاکانـە هـاتنو یەسووع (عیـسـا)یـان لـەو پەنجـەرەوە کـە بـە ڕووکـاری باشـووردا دەڕوانـێ، بـردەدەر هەڵیانـگرتو لە ئاسـمانی سێیەمیان دانا، لە لای ئەو فریشـتـانەی کە هەتـا ئەبـەد خوا بە پـاك دەگـرن.

وە لە (الفصل السادس عشر بعد المِئَتَين) واتـە: لـە فەصـلی (٢١٦)دا، لـە ئایەتی (١ تاكو ٩) بەم شێوەیە بـاس دەكات:

{(١) وَدَخَـلَ يَهُـوذَا بعُنـف إلـى الغُرفَـةِ الَّتـي أُصْـعَدَ مِنْهـا يَـسُـوعُ (٢) وَكَـانَ التَّلامِيـذُ كُلُّهُـمْ نيـاماً (٣) فـأتى اللَّـهُ العَجَـبُ بـأَمرٍ عَجِيـبٍ (٤) فَتَغَيَّـرَ يَهُـوذَا فـي النطـق وفـي الوَجْـهِ فَـصَارَ شـبِيها بيَـسُوع حتَّـى اننـا اعتَقَـدنا أَنَّـهُ يَـسُـوع (٥) أَمَّـا هُـوَ فَبَعْـدَ أَن أيقَظنـا أخـذ يفـتش لينظـر أَيْـنَ كَـانَ الْمُعَلِّـمْ؟ (٦) لِـذَلِكَ تعَجَّبْنـا وَأجَبْنـا: «أَنْـتَ يَـا سـيد هُـوَ مُعَلِّمنـا أَنَـسِيتَنا الآن؟». (٧) أَمَّـا هُـوَ فَقَـالَ متَبَـسِّـمَاً: «هَـلْ أَنْـتُمْ أَغْبيـاءٌ حَتَّـى لا تعرفونَ يَهُوذَا الأَسْخَريُوطي». (٩) وَبَيْنَمـا كَـانَ يَقولُ هَذَا دَخَلَتِ الجنُودُ وَألقوا أَيديَهُم عَلَى يَهُـوذَا لأَنَّهُ كَانَ شَبِيهاً ليَسـوع مِنْ كُلّ وَجْه}، واتـە: یەهووذا بە توندیی چوە ژووری، ئەو ژوورەی کە یەسـووع (عیـسـا)ی لـێ بەرزکرایــەوە، وە قوتابییــەکان هــەموویان خــەوتبوون، بــەڵام خــوای سەرسوڕهێنەر شتێکی سەرسامکەری کـرد، ئـەویش ئـەوەبوو کە یەهـووذا هەم قسـەو هـەم دیمەنو دەموچاوی گۆڕاو وەك یەسووع (عیـسـا)ی لێهـات، هـەتا ئێمـە پێمـانـوابوو کـە هـەر یەسـووعە، بـەڵام ئـەو دوای ئـەوەی کە ئێمەی هەڵسـاند چاوی دەگـێڕا کە داخۆ مامۆسـتا لـە کوێیـە؟ بۆیـە ئێمـە سەرمان سوڕماو گوتمان: ئەی گەورەمان! ئـەدی تـۆ مامۆسـتامان نـی، ئێـسـتا ئێمـەت لەبـیـر چۆتەوە؟! (واتــە: وامانــزانی کـە عیـسـایە) بـەڵام ئـەو بـە زەردەخەنەوە گوتی: ئایا ئێوە گێلـن! ئەدی ئێوە یەهووذای ئەسـخەریوطیی ناناسنەوە (واتە: نامناسن کە من یەهووذام؟!) بەڵام کاتێك ئەو ئەو قسانەی

دەکرد، سەربازەکان هاتنە ژوورەوەو گرتیان، چونکە لە هەموو ڕوویەکەوە بە عیسا دەچوو (وایانزانی عیسایان گرتوە).

جا دەڵێ: جێی سەرسوڕمان ئەوە بوو کە بە یەهوذاوە دەبوو دوازدە کەس بن، بەڵام دەیان ژماردن یازدە کەس بوون، یەکێ کەم بوو، چونکە عیسا بەرزکرابۆوە[1].

ئنجا جوولەکەش و نەصرانییش و ڕۆمەکانیش پێیان وایە کە عیسا ﷺ کوژراوە! وە ئەم حەقیقەتە قورئان بەیانی کردوەو ڕاستی کردۆتەوە، کە ئەوەی لە سێدارە دراوە، عیسا نەبووەو هاوشێوەی عیسا ﷺ بووەو خیانەتی کردوەو خوای دادگەر وەك سزادان شێوەی عیسا ﷺی بردۆتە سەر ئەو، وە ناویشی (یەهووذای ئەسخەریوطیی) بووە.

<u>ڕای دووەم</u>: ڕایەکی دیکەش دەڵێن: ئەو کەسەی کە لە جیاتی عیسا ﷺ لە سێدارە دراوە، یەکێك بووە لە حەوارییە فیداکارو دڵسۆزەکانی عیساو کاتێك کە عیسا ﷺ گوتوویەتی: کێتان ئامادەیە شێوەی منی بچێتە سەر، وە لە جیاتی من لە سێدارە بدرێ؟ گەنجێك گوتوویەتی: من، سێ جاران پێی گوتوون و هەر سێ جاران ئەو گەنجە گوتوویەتی: من، عیساش ﷺ گوتوویەتی: باشە ئەوە شێوەی منت هاتە سەر، وە شێوەی عیسا ﷺ ی چۆتە سەرێ، وە لە جیاتی عیسا ﷺ خۆی فیدا کردوەو لە سێدارە دراوە، وەك دوایی دەقێکی لەسەر دێنین، بەڵام لێرەدا دەڵێین: ئایا ئێمە وەك مسوڵمان بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە دەگوترێ: عیسا ﷺ کوژراوەو، لە سێدارە دراوە، ڕاست نییە؟! کە نەصرانییەکان ئێستا خاچێك (✝) لە ملی خۆیان دەکەن، کە گوایە ئەوە ڕەمزی لە سێدارەدرانی عیسایە، عیسا ﷺ ئاوا لە سێدارە دراوە، ئەوە (—) داری سێدارەکەیە، ئەوەش (✝) عیسایە پێیدا شۆڕبۆتەوە!

---

١) بڕوانە: (إنجيل برنابا)، ص: (٣٠٧ تا ٣٦٩)، ترجمة: الدكتور خليل سعادة.

ئێمە پێنج بەڵگەمان هەر لە ئینجیلەکانی خۆیاندا هەن، بێجگە لەم ئایەتەی ئێرە، کە خوای زاناو شارەزا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾، وە نەیانکوشتوە، وە هەڵیشیان نەواسیوەو، لە سێدارەیان نەداوە، ﴿وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ﴾، بەڵکو وێنەی ئەویان بۆ براوەتە سەر یەکێکی دیکە، وێنەی عیسایان بۆ براوەتە سەر یەکێکی دیکە، ئنجا وێڕای ئەم ئایەتە[1]، دەتوانین ئەم بەلگانەش بێنین:

## پێنج بەڵگە لەسەر بەهەڵەداچوونی نەصرانییەکان لەوەدا کە دەڵێن: عیسا لەخاچ دراوە

**بەڵگەی یەکەم:** چوار ئینجیلەکان[2] بریتین لە: (مَتَّى، لُوقا، مَرقُس، يُوحَنّا)، کە دیارە کاتی خۆی خوای کاربەجێ یەك ئینجیلی بۆ عیسا ﷵ ناردوە، کەچی ئێستا نەصرانییەکان چوار ئینجیلیان هەن، ئەو چوارە بە ڕەسمیی دانیان پێدادێنن، ئینجیلێکی دیکەش هەیە کە لە هەموویان ڕاسترە، بە ناوی (إنجيل بَرنابا) کە پێشتر هەندێ شتمان لێوە نەقڵ کرد، وە ئەو ئینجیلە کە هی پێش هاتنی ئیسلامیشە، سەرەتا بە یۆنانیی نووسراوەتەوەو، دوایی بە ئینگلیزیی تەرجەمە کراوەو، لە ئینگلیزییشەوە بە سەرپەرشتی (شيخ محمد رشيد رضا) تەرجەمەی عەرەبیی کراوە، هەرچەندە نەصرانییەکان زۆر دژایەتیی ئەو ئینجیلە دەکەن، چونکە (بَرنابا) کە یەکێك بووە لە حەواریی و قوتابییە

---

١) دیارە ئایەتەکە بۆ ئێمەی مسوڵمان بەڵگەیەکی تەواوەو پێویستیمان بە هیچ بەڵگەی دیکەی نیە، بەلام ئەو بەڵگانەمان بۆ دوورخستنەوەی قسەی نەصرانییەکانەو، بۆ ئیسپاتی ئەوەیە کە ئەوەی قورئان فەرموویەتی لە بارەی عیساوە ﷵ هەر ئەوە ڕاستە .

٢) وشەی: (إنجيل) یانی: موژدە، مزگێنی.

دڵسۆزەکانی، وە ئەو بەسەرهاتەکەی تا ڕاددەیەکی زۆر بە ڕاستو دروستی گێڕاوەتەوەو، ئەوانی دیکە هەموویان دەستکاریی کراونو گۆڕدراون، جا ئەو چوار ئینجیلە کە ئێستا لەبەردەستی نەصرانییەکان دانو بریتین لە: (مَتَّى، لُوقا، مَرقُس، يُوحَنّا) وە چەندان ساڵ پاش عیسا عليه السلام نووسراونەوە، لەلایەن قوتابیانو قوتابییانی قوتابییانی عیساوە عليه السلام، واتە: نووسەری ئینجیلەکان هەر چواریشیان حەواریی نەبوون، هەندێکیان قوتابی قوتابییەکانی عیسا بوون، جا بەپێی ئەو چوار ئینجیلانە، قوتابییەکانی عیسا عليه السلام لە کاتی هێرشی ڕۆمەکاندا بە هاوکاریی جوولەکەکان، هەموویان ڕایانکردوە! هەر چوار ئینجیلەکە باسی ڕاکردنی هاوەڵە دانستەکانی عیسا عليه السلام دەکەن، دیارە ئێمە لێرەدا وەك عەرەب دەڵێین: (أُدِينكَ مِن فَمِكَ) واتە: بە زاری خۆت دەتگرم، ئەگەرنا ئێمە پێمان وانیە ئەو هاوەڵە دانستانەی عیسا عليه السلام ڕایانکردبێ، بەڵام چوار ئینجیلەکان وا دەڵێن، ئێمەش بە نەصرانییەکان دەڵێین: بە چوار ئینجیلەکان دەتانگرین کە ئەو لە سێدارەدرانەی عیسا عليه السلام ئەسڵو ئەساسی نیە، بۆ نموونە: لە {إنجيل: متى، الإصحاح: (٢٦)، رقم: (٥٦)} لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، (العهد الجديد) ص: (١٩٦١)دا دەڵێ: (عِندَئِذٍ تَرَكَهُ التَّلاميذُ كُلُّهُم وَهَرَبُوا)، واتە: لەو کاتەدا قوتابییەکان وازیان لێهێناو هەموویان ڕایانکرد.

وە ئەوە لە ئینجیلەکانی دیکەشدا بە هەمان شێوە هاتوە، ئنجا باشە کە ئەوان ڕایانکردبێ، مانای وایە زەمینە خۆشدەبێ بۆ سەرلێشێوان کە داخۆ کێ بوو لەسێدارە درا؟ چونکە ئەوان ڕۆیشتوونو هەرکەسە بۆ شوێنێك ڕۆیشتوەو ڕایکردوەو خۆی شاردۆتەوە، کەواتە: بەپێی چوار ئینجیلەکانیش، چارەنووس (مصیر)ی عیسا بۆ نەصرانییەکان لێڵو نادیارە.

**بەڵگەی دووەم:** ئەوانەی کە چوون عیسا عليه السلام دەستگیر بکەن، دیارە لە سوپای ڕۆم بوون، وە مەرج نیە عیسا عليه السلامو هاوەڵانییان یەك یەك

ناسیبێ، ئێستا ئەگەر کۆمەڵە سەربازێك، پۆلیسێك بێن، ئایا مەرجە ئەو خەڵکەی ئێرە هەموویان یەك یەك بناسن؟ نەخێر مەرج نیە، بۆیە مەرج نیە هەموویان ناسیبن و لێکیان جیاکردبنەوە، کەواتە: لەسێدارەدرانی یەهووذا لە جیاتی عیسا، شتێکی زۆر نزیك و مەنتیقییە تەنانەت بە پێی ئینجیلەکانیش.

**بەڵگەی سێیەم:** لە ئینجیلەکانیشدا هاتوە کە هێرشەکە بە شەو بووە، دیارە تاریکیی شەویش هۆکاری سەرلێشێوان و لێگۆڕانە، وە ئەوە کە هێرشەکە بە شەو بووە، لە {إنجيل: متَّى، الإصحاح: (٢٦)، رقم: (٣١)}، لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، ص: (١٩٥٩)دا هاتوە.

**بەڵگەی چوارەم:** دەڵێین: شتێکی بێجێیە، عیسا ﷺ لە بەرانبەر حاکم (بيلاطُس) کە حاکمی ڕۆمەکان بووە لە قودس، بەرگریی لە خۆی نەکات! وەك لە: {إنجيل: متى، الإصحاح: (٢٧)، رقم: (١٤)}، لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)، ص: (١٩٦٤)دا هاتوە، دەڵێ: (لَكِنَّ يَسُوعَ لَمْ يُجِبِ الحَاكِمَ وَلَو بِكَلِمَةٍ حتَّى تَعَجَّبَ الحاكِم كَثيراً)، واتە: بەڵام عیسا ﷺ بە یەك وشەش وەڵامی حاکمی نەدایەوە، بۆیە حاکمەکە زۆر سەری سووڕما! وا عیسا ﷺ دەبەن لە سێدارەی بدەن، عیساش ﷺ پێغەمبەری خوابێ و کەلیمەیەکیش نەڵێ!! چونکە دەڵێ: یەك کەلیمەی نەگوت، کەواتە: وا پێدەچێ یان (يَهُوذَا الأَسْخَرِيُوطي) بووبێ کە جاسووس بووە، یان ئەو گەنجە بووە کە خۆی فیداکار بووە، دەگونجێ پیاوێکی باشیش بووبێ، بەڵام حەپەساوەو قسەی بۆ نەکراوە، بەڵام ماقووڵ نیە، پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوا نەتوانێ دیفاع لەخۆی بکات، نابێ ئەو کەسە عیسا ﷺ بووبێ.

**بەڵگەی پێنجەم:** لە: {إنجيل: متى، الإصحاح: ٢٧، رقم: (٤٦) لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس)}، ص: (١٩٦٤)دا هاتوە، دەڵێ:

(وَنَحو السَّاعَة الثالثة صَرَخَ يَسُوعُ بِصَوْتٍ عَظيم: إِيلي إِيلي! لِما شَبَقتَني! أي: إلَهي إلَهي لِمَاذَا تَرَكْتَني!)، واتە: لە دەوری سەعات سێی شەودا (ئەوە بە حیساب عیسا بە دارێ هەڵواسراوە) یەسووع (واتە: عیسا) بە دەنگێکی مەزن هاواری کرد، گوتی: ئەی پەرستراوم ! ئەی پەرستراوم ! بۆچی وازت لێ هێنام !

کەواتە: دەبێ عیسا عليه السلام گلەیی لە خوا کردبێ، کە بەڕاستیی مسوڵمانێکی عادەتییش گلەیی لە خوا ناکات، کەواتە: ئەوە عیسا عليه السلام نەبووە، چونکە گلەیی کردن لە خوا لەلایەن پێغەمبەرێکی خواوە، شتێکی مەحاڵە، ئەوە هەر بە قسەی ئینجیلەکان، بۆیە دەڵێین: کەواتە: قسەی ڕاست ئەوەیە کە ئەوەی کوژراوە، یان (يَهُوذَا الأَسْخَريُوطي) بووە، وەك لە (إنجيل برنابا)و ئینجیلەکانی دیکەشدا هاتوە، یاخود هاوەڵێکی فیداکاریی مەسیح بووە، کە ئامادە بووە لە جیاتی مەسیح هەڵبواسرێ، وەك لە تەفسیرەکاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبنُ كثير)دا ئەم دەقە هاتوە: (أَيكُمْ يُلْقَى عَلَيْهِ شَبَهي، وَهُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّة؟ فَانتَدَبَ لِذَلِكَ شَابٌّ مِنْهُمْ، فَكَأَنهُ استصغرهُ عَنْ ذَلِكَ، فَأَعَادَهَا ثَانِيةً وَثَالِثةً وَكُلُّ ذَلِكَ لا يَنْتَدِبُ إلاَّ ذَلِكَ الشَّابُ، فَقَالَ: أَنْتَ هُوَ، وَأَلقَى اللَّه عَلَيْهِ شَبَه عِيسى، حَتَّى كَأنهُ هُوَ، وَفُتِحَتْ رَوْزَنَة مِن سَقْف البَيْتِ، وَأَخَذتْ عِيسى عليه السلام سِنةٌ مِنَ النَّومِ، فَرُفِعَ إِلى السَّمَاءِ وَهُوَ كَذَلِكَ، كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالى: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ...﴿٥٥﴾﴾ آل عمران، فَلَمَّا رُفِعَ خَرَجَ أَولَئِكَ النَّفَرُ فَلَمَّا رَأى أولَئِكَ ذَلِكَ الشاب ظَنُّوا أنهُ عِيسى، فَأَخذُوهُ في اللَّيل وَصَلَبُوهُ، وَوَضَعُوا الشَّوكَ عَلَى رَأسِهِ، فَأظهَرَ اليَّهُودُ أَنَّهُمْ سَعَوا في صَلْبِهِ وَتَبَجَّحوا بِذَلِكَ، وَسَلَّمَ لَهُمْ طَوَائِفُ مِنَ النَّصَارَى ذَلِكَ لِجَهْلِهِم وَقِلَّة عَقْلِهِم، مَا عَدا مَنْ كَانَ في البَيْت مَعَ المَسِيح، فَإنهُم شَاهدوا رَفعَهُ، وَأما الباقون فَإنهُم ظَنُّوا كَمَا ظَنَّ اليَّهُود أن الْمَصْلُوب هُوَ

الْمَسِيح ابْنُ مَرِيَم...)[1]، واتە: عیسا ﷺ بە حەوارییەکانی خۆی فەرموو: کامەتان ئامادەیە وێنەی منی بچێتە سەرو وەك منی لێبێ، ئەوە دەبێتە هاوەڵی من لە بەهەشتیێ؟ (واتە: لەجیاتی من لە سێدارە بدرێ) گەنجێك گوتی: من ئامادەم، عیساش ئەوی بە بچووك زانی (گوتی: بەڵکو یەکێکی دی تۆزێك تەمەنی زیاتربێ) جاری دووەمو جاری سێیەمیش دووبارەی کردەوە، هەر ئەو گەنجە ئامادەیی دەربڕی، ئەوانی دیکە ئامادەییان دەرنەبڕی، عیسا گوتی: دە تۆ وات لێهات، وە خوا وێنەی عیسای خستە سەر ئەو گەنجەو وەك ئەوبێ وای لێهات، وە لەسەر بانی سەقفەکەش کلاّو ڕۆژنەیەك کرایەوە، عیسا سەلامی خوای لێ بێ خەوی لێکەوت، وە بەرەو ئاسمان بەرز کرایەوە، وەك خۆی (کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾، واتە: دەتخەوێنم) وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ ...﴿٥٥﴾﴾، واتە: کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا! من دەتخەوێنمو بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، کاتێك بەرز کرایەوە، ئەوانەی کە لەگەڵی لەو ژوورەدا بوون، چوونە دەرێ، ئنجا دوای ئەوەی ئەوانی دیکە ئەو گەنجەیان بینی، کە شێوەی عیسای وەرگرتوە، وایانزانی عیسایە ﷺ، وە بە شەو گرتیانو بردیان، وە دڕکیان لەسەر سەری دانا، لە جیاتی تاج، وە هەڵیانواسی، (جا ئەوە لە ئینجیلەکانیشدا هاتوە، دەڵێ: بۆیە دڕکیان لەسەر سەری دانا تا سووکایەتیی پێبکەن، دەیانگوت: تۆ پادشای جوولەکەی؟! چونکە عیسا ﷺ بۆخۆی جوولەکە بووە، یانی لە قەومی یەهوود بووە، دەیانگوت: تۆ پادشای ئێمەی؟! کە پادشا دەبێ تاجی لەسەربێ، ئەوان چوو بوون تاجێکی دڕکاوییان لەسەر سەر دانابوو، وەك ئیهانە پێکردن، وە هەڵیشیان واسیبوو و لە سێدارەیان دابوو)، وە جوولەکەکان وایان دەرخست کە ئەوان بوونە هۆکاری لە سێدارەدانی عیسا، وە خۆیان بەوەوە هەڵکێشا،

---

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير إبنُ كثير، ص: (٣٣٨).

کۆمەڵێکیش لە نەصرانییەکان ئەوەیان بەڕاست دانا، لەبەرئەوەی کە بێئاگابوون و عەقڵیان کەم بوو، عەقڵیان پێ نەشکا (کە ناگونجێ پێغەمبەری خوا بەو شێوەی لێبکرێ) جگە لەوانەی کە لەگەڵی لە ژوورەکە دابوون، ئەوان بینییان کە عیسا بەرزکرایەوە، دیارە ئەوانیش هەریەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتوون و خۆیان شاردۆتەوە، بەڵام ئەوانی دیکە هەموو پێیان وابوو وەك چۆن جوولەکەکان پێیان وابوو، پێیان وابوو کە ئەوەی لە سێدارە دراوە، عیسای کوڕی مەریەمە سەلامی خوایان لێ بێ.

بەڵێ، ئەوەی کە ئێستا نەصرانییەکان لەلایەن شتێکی یەقینییە، ئەوە ڕیشەکەیەتی و بەو شێوەیە هاتوە، وەك چۆن شیعە چاوەڕێی (المَهدي المُنْتَظَر) دەکەن، کە ئەسڵ و ئەساسی نییە[1]، نەصرانییەکانیش لەڕاستییدا بەم شێوەیە تووشی هەڵەبوون و بە سەهوو چوون.

## پووچی بیرۆکەی خۆفیداکردنی عیسا بۆ سڕینەوەی گوناهان

لێرەدا شتێك دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە مەسەلەی فیداکردنی عیسا ﷺ بۆ سڕینەوەی گوناهی خەڵکی نەصرانیی، شتێکی بێ بناغەیە، واتە: ئەو بیرۆکەیەی نەصرانییەکان کە دەڵێ: هەموو ئەوانەی کە ئیمانیان بە عیسا ﷺ هەیە کە لە خاچ دراوە، ئەوە لە خاچدرانەکەی ئەو بۆتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانیان، ئنجا ئێمە بە پێی ئەم بەڵگانەی خوارەوە پووچیی و بێ بناغەیی ئەو بیرۆکەیە دەسەلمێنین:

١- بێگومان عیسا ﷺ کوڕی خوا نەبووەو، بەندەی خوا بووە، ئنجا یەکێك لە بەندەکانی خوا، ئەگەر گریمان کە لە سێدارەش بدرێ، بۆ دەبێ ببێتە هۆی ئەوەی کە گوناهی خەڵکی پێ لابچێ؟! چونکە ئەو ئازاری لە سێدارەدان دەچێژێ، نەك خەڵکەکە!

---

١) واتە: ئەو (مهدي)یەی ئەوان دەڵێن، کە کوڕی (الحسن العسكري) بێ و خۆی پەنهان کردبێ و ...هتد.

٢- خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿...وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ...﴿١٦٤﴾﴾الأنعام واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی یەكێكی دیكە هەڵناگریٚ، كەواتە: بۆ دەبیٚ عیسا ﷺ لە جیاتی گوناهی كەسانی دیكە لە سێدارە بدریٚ؟ ئەوە شتێكی زۆر بێجێیە، با لەسەر هەڵەی خۆی سزا بدریٚ، بەڵام بۆ دەبیٚ لە جیاتی گوناحو هەڵەی خەڵكی دیكە، لە خاچ بدریٚو سزا بدریٚ.

٣- ئنجا لەڕاستییدا ئەو بیرۆكەیە دەبێتە هاندەری خەڵك بۆ گوناح كردن، بۆ زانیارییتان خەڵكی نەصرانیی زۆریان كە گوناهان دەكەن، دوایی دەڵێن: ئەدی ئەوە نیە عیسا ﷺ لە سێدارە دراوە؟! ئەوە لە جیاتی گوناهی ئێمەیە، دوایی گوناهەكانی ئێمە هەموویان دەسڕێتەوە، جا نەصرانیی ئێستا عەقیدەیان وایە، تا ئێواریٚ گوناهان دەكەن، یان عومرێك گوناهان دەكەن، دوایی دەچنە لای پاپا یاخود قەشە، ئیعتیراف دەكەن بە گوناهەكانیان، ئەوانیش پێی دەڵێن: مادام ئیعتیرافت كرد، بڕۆ ئەوە لە جیاتی خوا عەفووم كردیو، گوناهەكانت هەموو سڕانەوە!!

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: كە دەفەرمویٚ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾، هیچ كام لە خاوەن كتێبەكان نین، مەگەر پێش مردنی ئیمان بە عیسا ﷺ دێنیٚ، ئەوەش مەسەلەیەكی گرنگە، ئەم ئایەتە پێشتریش ئاماژەیەكمان پێدا، بە دوو واتایان لێكدراوەتەوە:

١) هەندێكیان گوتوویانە: هەر كام لە خاوەن كتێبەكان پێش ئەوەی بمریٚو ڕووحی دەربچیٚ، دەزانیٚ كە عیسا ﷺ پێغەمبەری خوایە، واتە: ئەو ئینسانە كە بۆخۆی دەمریٚ، لە سەرەمەرگدا بۆی دەردەكەویٚ كە عیسا پێغەمبەری خوا بووەو ئیمانی پیٚ دێنیٚ.

٢) هەندێكیان گوتوویانە: (كە من ئەو ڕایەم زیاتر دەچێتە دڵەوە) هیچ كام لە خاوەن كتێبەكان نیە، مەگەر ئیمان بە عیسا ﷺ دێنیٚ پێش

ئەوەی عیسا ﷺ بمرێ، کەنگێ؟ کاتێك کە بۆ جاری دووەم دێتەوە سەر زەوی، وەك لە فەرمایشتە صەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، کە دوای ئەوەی عیسا ﷺ دادەبەزێ، بەر لەوەی دنیا بەجێ بهێڵێ، بۆ جاری دووەمو کۆتایی، جاری پێشێ بە خەوتن، ئەمجارە بە مردن، ئەوە هەرچی ئەهلی کیتابە، ئیمان بە عیسا ﷺ دێنێ، کە پێغەمبەری خوایە، لەوبارەشەوە فەرمایشت زۆرن، کە ئێمە هەندێکیان بۆ وێنە دێنینەوە:

**فەرمایشتی یەکەم:** ﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمْ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلاً فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المَالُ حَتَّى لا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ، حَتَّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الوَاحِدَةُ خَيْرًا مِن الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴾﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٠٩٥٧)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٢٢٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٣٨٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٣٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە (واتە: خوا) نزیکە کوڕی مەریەم بێتە خوار، ببێتە دادوەرێکی دادگەر، خاچ دەشکێنێو بەراز دەکوژێ، (چونکە نەصرانییەکان بەراز دەخۆن) سەرانە لادەبات، وە ماڵ زۆر دەبێ (بۆیە سەرانە لادەبات، واتە: کەس نامێنێ سەرانە بدات بە دەوڵەتی ئیسلامیی، وە هەموو خەڵك مسوڵمان دەبن) وە ماڵ زۆر دەبێ، هەتا هیچ کەس نایەوێ، وە هەتا وایلێدێ، سەجدە بردنێك بۆیان بە قیمەتتر دەبێ لە دنیاو لەوەی تێیدایە، (واتە: لەلایان خۆشەویستتر دەبێ) دوایی ئەبو هورەیرە گوتی: ئەگەر حەز دەکەن، ئەوە بخوێننەوە: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ

ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴾، هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نیە، مەگەر پێش مردنی ئیمانی پێ دێنێ، (واتە: پێش ئەوەی عیسا ﷺ بمرێ کە بۆ جاری دووەم لە ئاسمان دێتە خوار، هەموو خاوەن کتێبەکان ئیمانی پێ دێنن‌و مسوڵمان دەبن).

**فەرمایشتی دووەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْتُم إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُم فَأَمَّكُمْ أَوْ قَالَ إِمَامُكُمْ مِنْكُمْ» ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٦٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٩٢)، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە چی دەکەن، کاتێك کە مەسیحی کوڕی مەریەم هاتە نێوتان، وە پێشەواتان لەخۆتانە (واتە: کەسێك کە پێشەوای نوێژە، یان پێشەوای سەرکردەیە، لە خۆتان بوو، وە عیسای کوڕی مەریەم هاتە نێوتان، بۆئەوەی کە ئەو ببێتە پێشەواو ڕابەرتان).

**فەرمایشتی سێیەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ لِعَلاَّتٍ أُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ، وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ وَإِنَّهُ نَازِلٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ رَجُلاً مَرْبُوعًا إِلَى الْحُمْرَةِ، وَالْبَيَاضِ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَصَّرَانِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعُ الجِزْيَةَ، وَيَدْعُو النَّاسَ إِلَى الإِسْلامِ فَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ المِلَلَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِسلامَ، وَيُهْلِكُ اللَّهُ فِي زَمَانِهِ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ...﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٦٣٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٨٢١)، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێغەمبەران بران (لە بابێکن)، بەڵام لە چەند دایکێکن، (دایکیان جیاجیایە) بەڵام دینیان یەکە، وە من نزیکترینی خەڵکم لە عیسای کوڕی مەریەم، چونکە لە نێوانی من‌و

ئـەودا هـیـچ پـێغەمـبـەری دیـکـە نـەبوون، (دوای عیـسـا یـەکـسـەر موحـەممـەد هـاتوە) وە ئـەو دێـتـە خـوار بـۆ نێوتـان، هـەر کاتێـك بینیتـان بیناسـنەوە، پیـاوێکی چـوار شـانەیە، دەسـتـە پیـاوە، سـوورو سـپییە، دوو بـەرگی بۆیەکـراوی جـوانی لەبـەردان، سـەری وەك بلـێی ئـاوی لـێ بێتـە خـوار هەرچەندە تەڕیش نەبێ، (واتە: سەری دەبریسکێ) صەلـیب دەشکێنـێ، بـەراز دەکـوژێ، سـەرانە لادەبات، وە خەڵك بۆ ئیسلام بانگ دەکات، وە لە زەمانی ئەودا خاوەن بەرنامەکـان هیچیان نامێنـن[١]، جگە لە ئەهلـی ئیسلام، وە خوا لە سەردەمی ئەودا مەسیحی دەججال لەبەین دەبات.

**فـەرمـایـشـتـی چـوارەم:** ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقَ فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أَهْلِ الأَرْضِ يَوْمَئِذٍ، فَإِذَا تَصَافُّوا قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ. فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ نُخَلِّي بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا. فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ أَبَداً، وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللَّهِ، وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لاَ يُفْتَنُونَ أَبَداً، فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطُنْطِينِيَّةَ فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ، إِذْ صَاحَ فِيهِمُ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِى أَهْلِيكُمْ. فَيَخْرُجُونَ وَذَلِكَ بَاطِلٌ فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ، فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ، إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ فَأَمَّهُمْ فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ اللَّهِ ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِى الْمَاءِ، فَلَوْ تَرَكَهُ لاَنْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ، وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللَّهُ بِيَدِهِ فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِى حَرْبَتِهِ»﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٢٠٧)، واتـە: ئـەبو هـورەیرە خوا لـێی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: قیـامەت نایەت هەتا ڕۆم (واتە: سـوپای ڕۆمەکـان) دێتە ئەعماق (کە ناوچەیەکە لە

١) واتە: خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکان، نەك ئەوانی دیکە کە بڕوایان بە پێغەمبەران نیە.

شام) یان فەرمووی: دابیق (کە ئەویش ناوچەیەکە لە شام) وە سوپایەك لە مەدینەوە دەردەچێ کە باشترینی خەڵکی سەر زەوی ئەوکاتەن، (کە دیارە سوپایەکی مسوڵمانانە) کاتێك بەرەو ڕووی یەکدی ڕادەوەستن، ڕۆمەکان بە سوپای مسوڵمانان دەڵێن: لێمانگەڕێن با بجەنگین لەگەڵ ئەوانەدا کە ماڵو منداڵی ئێمەیان بە دیل گرتوە، مسوڵمانانیش دەڵێن: نەخێر وەڵڵاهی مەیدانتان بۆ چۆڵ ناکەین لە بەرانبەر برایەکانی خۆماندا (واتە: ئێمەش بەرگریی لەوان دەکەین، واپێدەچێ ئەوکاتە سوپایەکی مسوڵمانان لەگەڵ سوپای ئەوروپییەکان دا شەڕی بووە).

ئیدی پێکەوە دەجەنگن، سێیەکی ئەو سوپایەی مسوڵمانان ڕادەکەن، ئەوە قەت خوا لێیان خۆش نابێ، وە سێیەکیان دەکوژرێن، ئەوانە باشترین شەهیدن لەلای خوا، وە سێیەکەکەی کۆتاییان سەردەکەون، کە هەرگیز ئەوانە هیچ گوناهێك زەفەریان پێ نابات و کاریان تێناکات، ئنجا ئەوانە (قُسْطُنْطِينِيَّة) فەتح دەکەن، (واتە: ئەستەنبوولی ئێستا) وە کاتێك کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوت دەبن، شمشێرەکانیان،[1] (مەبەست پێی چەکەکانیانە) بە درەختی زەیتوون هەڵواسیوە، شەیتان لەنێویاندا هاوار دەکات دەڵێ: ئەوە مەسیحە، (واتە: دەججاڵ، چونکە دەججاڵیش پێی دەگوترێ: مەسیح، چونکە سیاحەتی کردوە بەسەر زەویدا، هەروەك چۆن عیسا ﷺ پێی دەگوترێ: مەسیح، چونکە عیسا ﷺ گەڕاوە بەسەرە زەویدا، بەڵام عیسا ﷺ بۆ خوا گەڕاوەو بانگەوازی بۆ دینی خوا کردوە، دەججالیش بۆ ئەوە دەگەڕێ کە خەڵکی لە دینی خواو لە ڕێی خوا لابدا) هاتە نێو ماڵو منداڵتان، ئەوانیش دەگەڕێنەوە، بەڵام تەماشا دەکەن نەخێر ئەوە بانگەشەیەکی درۆیەو قسەی

---

١) زۆر نزیکە پێغەمبەر ﷺ وشەی (أسلحتهم)ی بەکارهێنابێ و ڕاوییەکە کردبێ بە (سیوفهم) چونکە ئەوکاتە باوترین چەك شمشێر بووە، بەڵام وشەی: (أسلحة) کە کۆی (سلاح)ە، شمشێرو تفەنگو ... هتدیش دەگرێتەوە.

شـەیتانە، بەڵام کاتێـك دەگەڕێنـەوە بۆ شـام مەسـیحی دەججال دێ، لـە کاتێکدا ئـەوان خۆیان بـۆ جـەنگ کـردن سـاز دەکەنو ڕیزی سـوپاکانیان ڕێکدەخەن، قامەت دەکرێ بۆ نوێژ، عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوار، پێشنوێژییان بۆ دەکات، کاتێك دوژمنی خوا عیسا ﷺ دەبینێ دەتوێتەوە، وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، وە ئەگەر لێی گەڕابا هەر بۆخۆی لەنێودەچوو و دەتوایەوە، (ئەوەندە لە عیسا ﷺ دەترسێ) بەڵام عیسا ﷺ بەدەستی خۆی دەیکوژێ، وە خوێنەکەی لە تیغی حەربەکەیدا پێشانی مسوڵمانان دەدات، (بۆئەوەی مسوڵمانان بزانن ئەو دەججالەی کە ئیددیعای خوایەتیی دەکرد، کە دەججاڵ یەکەم کەسو دوایین کەسە، کە ئیددیعای خوایەتیی دەکاتو دەڵێ: من خوای پەروەردگارم، ئەوە تەرمەکەی لەوێ کەوتوە !).

کەواتە: بەپێی هەموو ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ عیسا ﷺ لە کۆتایی ڕۆژگارو زەماندا، دێتە خوار.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴾، هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نیە مەگەر پێش مردنی ئیمانی پێ دێنێ، وە ڕۆژی قیامەتێ لەسەریان دەبێتە شایەد، پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾، یانی چی؟ بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴾، ڕۆژی قیامەت بەسەریانەوە دەبێتە شایەد، یانی چی؟ چونکە لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: مادام عیسا ﷺ شایەد نەبووبێ بەسەریانەوە، چۆن لە قیامەت شایەدیی لەسەر هەموویان دەدا؟! چونکە ئەوەتا عیسا ﷺ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ ... وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ

﴿ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١١٧ ﴾، واتـە: (ئـەی خوایـە)! مـن بەسـەریانەوە چـاودێر بـووم هەتـا لەنێویـان بـووم، بـەڵام دوای ئـەوەی منـت مرانـد[١]، (یاخود منت خەوانـدو[٢]بەرزت کـردمەوە)[٣] تـۆ بەسەریانەوە چاودێر بووی، وە تۆ بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێـریو ئـاگاداری.

ئیشکالەکە لێـرەدا ئەوەیـە: مـادام عیسـا عليه السلام لەنێویانـدا نـەبووە، چۆن لـە قیامــەت شــایەدیی دەدا لەســـەر هەموویـــان؟! وەڵامەکـــەی ئەوەیـــە: کـــە شـــایەدییدانی عیـــسا عليه السلام لـــە قیامەتـــدا بریتیـــە لـــەوە کـــە تەوحیـــدو پێغـەمبەرایەتیـیو دینـی بـەو خەڵـکە ڕاگەیانـدوە، نـەك بەسـەر یـەك یـەکی کردەوەکانیـانەوە چاودێـر بووبـێ، بـەڵام مەبەسـت لـە شـایەدیی دانانـی دنیـایان، ئەوەیە کە شـایەدە لەسـەر کردەوەکانیـان.

کەواتـە: شایەدییـدانی قیامـەتیان ئەوەیـە کـە دەڵـێ: خوایـە مـن پـێم ڕاگەیاندوون، کـە دەبـێ تەنیـا تـۆ بپەرسـتنو بەندایەتیـی بـۆ تـۆ بکـەن، وە بەپێـی دینـی تـۆ بەڕێوەبـچن، ئـەوەم پـێ ڕاگەیانـدوون، لـە قیامەتـێ ئـەو شایەدییـەیان لەسـەر دەدات، بـەڵام ئـەو شایەدییـەی دنیـایە، ئەوەیـە کـە شـایەدە بەسەر کردەوەکانیانـەوە، واتـە: تـا لەنێویـاندا بـووە، شـایەدیی لەسـەر کردەوەکانیـان دەداو، کـە لەنێویـشیاندا نـەماوە، ئـەوە شایەدییەکـەی شـایەدییەکی گشـتییەو دەڵـێ: خوایـە من دینـی تـۆم پـێ ڕاگەیـاندوون.

**مەسـەلەی حەوتـەم**: کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ١٦٠ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ

١) ئەگەر مەبەست پێی پاش دابەزینی بێ لە ئاسمانەوە.

٢) ئەگەر مەبەست پێی پێش بەرزکرانەوەی بێ بۆ ئاسمان، کە خەوێنراوە ئنجا بەرزکراوەتەوە.

٣) دەشـگونجێ مەبەسـت لـە (توفَّيْتَنـي) وەرگیـرانی عیسا بـێ بەتـەواویو بـە ڕووحو جەسـتەوەو بەرزکرانـەوەی بـۆ ئاسـمان، چونکـە ئـەوەش مانایەکـی دیکـەی سـێیەمی (توفَّيْتَنـي) وەك پێشـتر باسمان کرد.

نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ﴾، خـوا دەفـەرموێ: بـە هـۆی سـتەم لەلایـەنی جوولەکەکـانەوە، چـەند خواردنێکـی بەلـەززەت هـەبوو لێمـان قەدەغـە کـردن، کە پێشـتر بۆیـان حـەڵاڵ بوون، بە هۆی ئـەوەوە کە خەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لادا، وە بـە هـۆی ئـەوەوە کـە ڕیبایـان وەرگـرت هەرچـەند لێیـان قەدەغـە کـرابوو، وە بە هـۆی ئـەوەوە کـە ماڵی خەڵکیـان بـە ناهـەق خـوارد، ئـەم ئایـەتە وەك ئـەو ئایـەتـەی سـوورەتی (الأنعام) وایـە، کـە دەفـەرموێ:

﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ ۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾ ﴾، قورئـان هەندێکـی هەندێکـی تەفـسیر دەکـات، خـوا دەفـەرموێ: ئەوانـەی کـە جوولەکـەن لێمـان قەدەغەکردن، هەر ئاژەڵـێك کـە نینـۆکی هەبـێ (وەك: قـازو مراویـیو حوشـترو نەعامـە، بـەڵام ئەوانـەی کـە نینۆکیـان هەبـێ، بـەڵام پەنجەکـانی پێکـەوە پەیوەسـت نـەبن، واتـە: مریـشكو کـەوو کـۆترو قـەلو ... هتـد، ئەوانـە ناگرێتـەوە) وە لـە مانگـاو مـەڕو بـزن چـەورییو دوونگەکەیانمـان لـێ قەدەغـەکردن، مەگـەر ئـەوەی بـە پـشتیانەوە لکـاوە، یـاخود ئـەوەی لەگـەڵ ڕیخۆڵەکانیـان تێکـەڵ بووە، یان ئـەوەی لەگـەڵ ئێسقان تێکـەڵ بووە، ئەوەش بە هۆی دەستدرێـژیی یانەوە، وە ئێمـە ڕاستگۆیـن.

کەواتـە: ئـەم ئایەتـە لەگـەڵ ئـەوەی سـوورەتی (النـساء)دا کـە دەفـەرموێ:

﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ ... ﴾، بـاس لـە یـەك بابـەت دەکەن، کە جوولەکـەکـان بـە هـۆی سـتەمو خراپەیـانەوە، هەندێـك خـواردنی باشـمان لـێ قەدەغەکردن، بۆیەش ئەوە ڕوون دەکەمـەوە، چونکە جوولەکـەکانی سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ بـە مـسوڵمانانیان دەگـوت: چـۆن گۆشـتی حوشـترو نەعـامەو مانگـاو قـازو مراویـی دەخـۆن، لـە حاڵێکـدا کـە ئەوانـە قەدەغـەن؟

دوایی خوای پەروەردگار ئەوەی ڕوونکردەوە، کە ئەوە کاتی خۆی لەسەر باب و باپیرانی ئێوە قەدەغەکرابوون، بە هۆی خراپەکارییانەوە، بەڵام لەسەر مسوڵمانان قەدەغە نەکراون، ئێوە ئەی جوولەکەکان! گوناهو لادان و غەڵەتتان هەبوون، بۆیە ئەو شتانەتان لەسەر قەدەغەکراون، بەڵام لەسەر مسوڵمانان قەدەغە نین.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَۚ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾، خوای پەروەردگار عادەتی وایە هەمیشە نەیارەکانی مسوڵمانان پۆلێن دەکات و، هەمووان بە یەك چاو تەماشا ناکات، وەك عادەتی ئێستای هەندێ لە مسوڵمانان کە دەڵێن: ڕۆژئاوا هەمووی خراپە، ئەمریکا هەموی خراپە، نەصرانیی و جوولەکەکان هەموویان یەك حیسابن، نەخێر، وانیە، بەڵکو دەبێ پۆلێنیان بکەین، ئەوانیش خراپیان هەیەو خراپترینیان هەیە، هەڵوێست چاکیشیان هەیە کە یان مسوڵمان دەبێ، یان هەڵوێستی لە بەرانبەر مسوڵماناندا دادگەرانەو چاکەکارانەیە، ئنجا خوای پەروەردگار لێرەدا باسی ئەو سیفەتە خراپانەی ئەهلی کیتاب بەگشتیو جوولەکەکان بەتایبەتی دەکات، دوایی دەفەرموێ: بەڵام ئەوانەیان کە بە زانیارییدا قووڵبوونەتەوە، وە ئەوانەیان کە ئیمانیان هێناوە، واتە: زاناکانیان و ئیماندارەکانیان، ئا ئەوانە ئیمان دێنن بەوەی کە بۆ تۆش دابەزێنراوە، وە بەوەش کە بۆ پێش تۆش دابەزێنراوە، واتە: ئیمان بە قورئان و بە کتێبەی دیکەی خواش دابەزێنراون، دێنن، وە ئەوانەی کە نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن، وە ئەوانەی ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی دێنن، ئا ئەوانە پاداشتێکی مەزنیان هەیە، کەواتە: ئێمەش پێویستە لێرەوە لە کتێبی خواوە

فێری ئینصاف بین، وە فێری دادگەریی بین بەرانبەر بە نەیارەکانی خۆمان، هەموویان بە یەك چاو تەماشا نەکەین، وەك ئەوان زۆرجار وا دەکەن، مـن زۆر جار لەگەڵ ئەو بەرپرسە ئەمریکییو بەریتانییو فەڕەنسییانە قسەم کردوەو، پێمگوتوون: هەرچی ئیسلامییە ئێوە بە یەك چاو تەماشای دەکەن، ئەوەی کە پابەندە بە شەریعەتەوە لە شێوازی کاریداو، ئەوەش کە لادەدات، کە ئەوە هەڵەیە، وەك چۆن ئێمەش مسوڵمانی وامان هەن کە بە یەك چاو تەماشای ڕۆژئاوا دەکەن، یان بە یەك چاو تەماشای ئەو جوولەکانە دەکەن کە خۆپێشاندان دەکەن دژی سیاسەتی قەوارەی جوولەکەو، ئەو جوولەکانەش کە موڵكو ماڵی مسوڵمانانی فەلەستینیان داگیر کردوە، کە ئەوەش غەڵەتە، لەنێو قەوارەی ئیسرائیل دا جوولەکە هەن دژی سیاسەتی جوولەکەو ئەمریکاو باقی زلهێزەکانی دیکەن، وە بەرگری لە مافەکانی ئێمە دەکەن، بۆیە نابێ هەموویان وەك یەك تەماشا بکەین، ئەو ئینصافە قورئان فێری ئێمەی دەکات، کە هەر کەسە وەك خۆی تەماشا بکەین، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (مەڕ بە پێی خۆی هەڵدەواسرێو، بزن بە پێی خۆی هەڵدەواسرێ)، ئنجا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەربارەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، هەرچەند قیرائەتی دیکەش هاتوە، (والمقيمون الصَّلاة)، ئەوانەی کە شارەزای زمانی عەرەبین دەزانن، لێرە بۆچی ﴿وَٱلۡمُقِيمِينَ﴾، لە جیاتی بە حاڵەتی (رفع) بێ، بە حاڵەتی (نصب) هاتوە؟ دەڵێ (مَنصوبٌ عَلَى المَدحِ: وأخصُّ المُقيمينَ الصّلاةَ بالذكر)، واتە: بۆیە (منصوب)ە، چونکە ویستراوە مەدحکردن بگەیەنێ، کە ئەوکاتە ئاوای لێدێ: وە بەتایبەتی باسی ئەوانە دەکەم کە نوێژەکانیان بەرپا دەکەن، یان کە بەرپاکەری نوێژەکانن، دیارە ئەوە مەسەلەیەکی ڕێزمانی (نَحْوي)یەو بۆیەش باسمکرد، چونکە هەندێك لەوانەی کە بە حیساب تانە لە قورئان دەدەن دەڵێن: ئەوە هەڵەیەکی

(نَحْوي)یە لە قورئاندا، چونکە لە سیاقێکدا کە هەمووی بە حاڵەتی (رفع) هاتوە، ئەوە بە حاڵەتی (نصب) هاتوە، بەڵام نا، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەسەلەکە ئەوەیە کە جاری وا هەیە چەند وشەیەك کە هەموویان یەك حاڵەتی ئیعرابییان هەیە، یەکێکیان جیادەکرێتەوە، لەبەر نوکتەیەکی رەوانبێژیی (نكتة بلاغية)، کە لێرەدا وایەو لە جیاتی ﴿والمقيمون ٱلصَّلَوٰةَ﴾، گوتراوە: (المُقيمينَ الصَّلاة) تاکو مەدحو ستایش بگەیەنێ بۆ نوێژکەران.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە ئایەتەکانی (١٦٣ - ١٦٩)ن، لەم حەوت ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ ڕادەگەیەنێ، کە وەحی بۆ ئەو ناردوە، وەك چۆن وەحی بۆ نووح و پێغەمبەرانی دوای نووحیش سەلامی خوایان لەسەربێ، ناردوە، واتە: خوا ﷻ ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ، کە وەحی ناردنی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ هەروەك وەحی ناردنیەتی بۆ پێغەمبەرانی دیکەی وەك نووح و ئەوانی دیکەی دوای ویش، کە دیارە خوا ﷻ لەو سیاقەدا ناوی یازدە لەو پێغەمبەرانە دێنێ، وە پاشان ڕایدەگەیەنێ کە بەسەرهاتی هەندێك لە پێغەمبەرانی (علیهم الصَّلاة والسلام) بۆ خوێندۆتەوە، وە بەسەرهاتی ژمارەیەکیشیانی بۆ نەخوێندۆتەوە، پاشان باسی حیکمەتی ڕەوانەکرانی پێغەمبەران دەکات، کە پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردوە موژدەدەرو ترسێنەربن، یاخود دڵخۆشکەرو وریاکەرەوەبن، وە بیانوو بڕی خەڵك بن، واتە: دوای ڕەوانەکرانی پێغەمبەران خەڵك بیانووی نەبێ لەسەر خوا ﷻ کە بڵێن: ئەی خوایە! نەمانزانی چۆن بژین؟ چی بکەین؟ چۆن بکەین؟ ئنجا باسی شایەدییدانی خۆی و فریشتەکانی دەکات لەسەر ڕاستیی قورئان، واتە: لە وەڵامی ئەوەدا کە بێبڕوایەکان بڕوا بە قورئان ناهێنن، وە بڕوا بەوە ناهێنن کە قورئان لە خواوە بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە، خوای کاربەجێ دەفەرموێ: شایەدیی دەدەم، وە فریشتەکان شایەدیی دەدەن، لەسەر ئەوە کە تۆ پێغەمبەری خوای و قورئانیش فەرمایشتی خوایەو لەوەوە بۆ تۆ هاتوە، لە کۆتاییدا خوای پەنهانزان باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی خەڵك لە ڕێی خوا لادەرو ستەمکار دەکات، کە لە دنیاو دوارۆژدا سەرەنجامێکی شوومو خراپیان هەیە.

﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ
إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ
وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن
قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا
مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا
حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ
يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ
ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا
لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ
يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئێمـە وەحییمـان بـۆ لای تـۆ نـاردوە، وەك چـۆن وەحییمـان بـۆ لای نـووحو پێغەمبەرانی دوای وی نـارد، وە وەحییمـان بـۆ لای ئیبـراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو ئەسباطو عیسـاو ئەییوبو یونـوسو هارِوونو سولەیمان ناردو، زەبووریـشمان دایـە داوود﴿١٦٣﴾ وە پێغەمبەرانێك کـە پێشتر بەسەرهاتیانمـان بەسـەرتدا خوێندۆتـەوەو، پێغەمبـەرانێك کـە بەسـەرهاتیانمان بەسـەرتدا نەخوێندۆتـەوە، وە خـوا بـە قسـەکردن فەرمایشتی لەگەڵ مووسـادا کـرد ﴿١٦٤﴾ پێغـەمبەرانێکی مـوژدەدەرو ترسێنەرن، تـاکو دوای هـاتنی پێغەمبـەران، خەڵـك بەڵگەی لەسـەر خـوا نـەبێ، وە خـوا زاڵـی کـاربەجێیە ﴿١٦٥﴾ (هەرچـەندە بێبـڕوایان ئیمان بە قورئـان نـاهێنـن) بـەڵام خوا شایەدیـی لەسـەر ئـەوە دەدات کـە بـۆی ناردوویـە خـوار، کـە بـە زانیـاریی خـۆی ناردوویـەتە خـوار، وە فریـشـتەکانیش شـایەدیی دەدەن، وە خـوا بەسـە بـۆ شایەدییـدان ﴿١٦٦﴾ بێگومـان ئەوانـەی بێبـڕوانو (خەڵـك) لـە ڕێـی خـوا لادەدەن، بـە گومڕاییـەکی دوور گومڕابـوون ﴿١٦٧﴾ بێگـومان ئەوانـەی بێبـڕوانو ستەم دەکـەن، ناکـرێ خـوا لێیـان ببـوورێو هیـچ ڕێیەکـیان پێشـان بـدات ﴿١٦٨﴾ مەگـەر ڕێـی دۆزەخ کـە بـە هەمیشـەیی تێیدا دەمێننـەوە، وە ئـەوەش لەسـەر خوا ئاسـانە ﴿١٦٩﴾)).

## شـیکردنــەوەی هــەندێك لە وشــەكان

(﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾): كـۆی (سِـبط)ە، (السِّبْط: وَهُـوَ وَلَـدُ الإبـنِ والإبنـةِ والـسِّبطُ مِـنَ اليهـود كالقَبيلَـةِ مِـنَ العَـرَبِ)، (سِبْط) واتــە: ڕۆڵــەی كــوڕ (كــوڕە زا) یــان ڕۆڵەی كـچ (كچە زا)، وە لەنێو جوولەكەكاندا (سِبْط) لـە بەرانبـەر قەبیلەیـە لەنێو عەرەبدا، وەك چۆن گەلـی عـەرەب بـۆ چـەند قەبیـلـەیەك دابــەش بـوو ون، گەلــی بــەنی ئیـسرائیلیش بـۆ چەنــد (سِـبط)ێـك دابــەش بــوون، لــە كوردەواریـی خۆماندا دەڵێن: تـیـرە، هـۆز.

(﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾): واتــە: خەڵكــیان لــە ڕێــی خــوادا لادا، (صَـدَّ عَنْـهُ صَـدَاً وَصُـدوداً: أعـرضَ، وَصَـدَّ فُلانـاً مَنَعَـهُ وَصَـرفهُ)، دەگـوترێ: (صَـدَّ عَنْـهُ صَـدَاً وَصُدُوداً) واتە: (أَعرضَ) یانی: پشتی تێكردو ڕووی لـێ وەرگێڕا، وە دەگـوترێ: (وَصَدَّ فُلاناً) واتە: فلان كەس پێشـگیریی لە فلان كەس كردو لایـدا.

(﴿ضَلُّواْ﴾): (خَفِـيَ وَغَـابَ) واتــە: پەنهــان بــوو، نادیــار بــوو، (وضَـلَّ الـشـيءُ فـي الشَّيء: ضَاعَ وَتَلِفَ وَهَلَكَ وَذَهَبَ) دەگـوترێ: فـلان شــتە لـە فـلان شــتەدا (ضَـال) بـوو، واتــە: لەبەیــنـچوو و نەمــاو فەوتــا، (ضَـلَّ الـشـيءُ: وَضَـلَّ عَـن الشَّيء، وضَلَّ الشيءُ في الشَّيء، وَضَـلَّ الـشَّيءِ: نَسـيَهُ أو أُنسِيَهُ وفقَدهُ) كـە دەگوتــرێ: (ضَـلَّ الـشـيءَ) واتـــە: شــتەكەی ونكــرد، یــان ئەگـەر بگـوترێ: (ضَـلَّ عَـن الـشَّيء) واتـە: شـتەكەی لـێ ونبـوو، یـان بـە شـتەكەی نەزانیـەوە، (وضَـلَّ الـشيءُ فـي الـشَّيء) واتـە: ئـەو شــتەی لـەو شــتەدا ڕێــی لـێ ونبـوو، یـاخود ئـەو شـتە لـەو شـتەدا زایـە بـوو، واتـە: لەبـیـری چـوو، یـان لەبــیری چووێنـرایـەوە، یاخود بـزری كـرد، (وضَـلَّ الطريـق) واتـە: ڕێیەكـەی ون كـرد، بـە ڕێــی نەزانــی، (وضَـلَّ الـشيءُ فُـلاناً: ذَهَـبَ عَنْـهُ فَلَـمْ يَقـدِرْ عَلَيْـهِ وَعَجَـزَ عَنْهُ)، واتـە: ئـەو شـتە لـەو كەسـە ونبـوو، لـێی بـزر بـوو، وە توانـای بەسـەریدا نەشكاو لە بەرانبـەریدا دەسـتەوسـان بووە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئـایەتەکـان

١) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣﴾، ﴿رَوَى ابْنُ إِسحاقٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ عَديّ بْنُ زَيدٍ: مَا نَعْلَمُ أنَّ اللَّهَ أنزلَ عَلَى بَشَرٍ مِن شَيءٍ مِن بَعْدِ مُوسى فأنزلَ اللّهُ الآيةَ﴾ لُباب النقول في أسباب النزول برقم: (٣٧٧) للسيوطي، جامع البيان للطبري برقم: (١٠٨٤٥)[1]، واتـە: ئیبنـو ئیـسحاق لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بـێ دەگێڕێتـەوە، کە عەدیـی کـوڕی زەیـد (دیـارە یەکێك بووە لە زاناکانی جوولەکـە) بـە پێغـەمبەر ﷺی گوتـوە، نازانیـنو ئاگامـان لـێ نیـە کـە لە دوای مووسا خوا هیـچ کتێبێکی ناردبێتـە سـەر هیـچ کـەس، خـواش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خوار کە دەفەرموێ: ئێمـە وەحییمـان بـۆ تـۆ ناردوە، وەك چۆن بۆ نـووحو پێغـەمبەرانی دوای ویشـمان نـارد.

٢) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ١٦٦﴾ ﴿رَوَى ابْنُ إِسحاقٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: دَخَلَ جَمَاعَةٌ مِنَ اليهودِ عَلَى رسول الله ﷺ فَقَالَ لَهُم إنِّي وَاللَّهِ أعْلَمُ أنّكُم تَعْلَمُونَ أني رَسُول اللَّهِ، فَقَالُوا: مَا نَعْلَمُ فأنزلَ اللّهُ الآيةَ﴾ لُباب النقول في أسباب النزول برقم: (٣٧٨) للسيوطي،

---

١) هەروەها بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب، ج: (١)، ص: (٥١٩، ٥٢٠) بە بێهێز (ضعيف)ی داناوە.

جامع البيان للطبري برقم: (١٠٨٥٤)[١]، واتە: ئیبنو ئیسحاق لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، کە کۆمەڵێك لە جوولەکەکان چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش پێی فەرموون: سوێند بە خوا من دەزانم کە ئێوە دەزانن من پێغەمبەری خوام، ئەوانیش گوتیان: ئەوە نازانین (مەبەستی ئەوەبووە کە لە کتێبەکانتاندا ناوونیشانی من هەیە، ئەوانیش گوتوویانە: نەخێر، ئاگامان لە شتی وانیە) ئیدی خوای زانا ئەم ئایەتەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: بەڵام خوا شایەدیی دەدا بەوەی کە بۆ تۆی ناردوە، بە زانیاریی خۆی ناردوویەتی، وە فریشتەکانیش شایەدیی دەدەن، دیارە ئەوانیش (زانایانی خاوەن کتێبەکانیش) دەیانزانی، بەڵام لەبەر بەرژەوەندییو ئەو بەزمەو بازاڕەی کە بە ناوی جوولەکایەتییەوە سازیان کردبوو، بۆئەوەی ئەو بازاڕەیان لێ تێکنەچێ، چونکە خەڵك پارەی بۆ دەهێنانو بە قسەی دەکردن، ئامادەنەبوون دان بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا ﷺ بنێن، وە ببنە شوێنکەوتوویکی سادەی پێغەمبەری کۆتایی!



١) سەرچاوەی پێشوو، ج: (١)، ص: (٥٢٠) بە بێهێز (ضعيف)ی داناوە.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە چەند ئایەتی ڕابردوودا باسی کۆمەڵێك هەڵوێست و ڕەفتاری بێجێی خاوەن کتێبەکان بەگشتی و جوولەکەکان بەتایبەتی کرد، وە هەندێك لەوانەی کە بە ئینصافن لە خاوەن کتێبەکان، وە لە ئیمانداره‌کانیان، ئەوانەی ئیمان دێنن بە پێغەمبەری کۆتایی جیایکردنەوە، لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾، ئێمە سروشمان بۆ تۆ کردوە، وەحیی لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە قسەیەکی پەنهان دەگوترێ، بۆیە بە دەنگی خشڵ دەگوترێ وەحیی، وە وەسوەسە پێی دەگوترێ وەحیی، بەڵام وەحیی لە زاراوی شەرعدا واتە: ئەو قسەیەی کە خوا ﷻ دەینێرێ بۆ پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام)، جا خوا دەفەرموێ ئێمە سروشمان بۆ لای تۆ ناردوە، ﴿كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾، وەك چۆن وەحییمان بۆ لای نووح و بۆ پێغەمبەرانی دوای ویش ڕەوانەکردوە، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر نووح و لەسەر پێغەمبەرانی خوا بێ، ئنجا ناوی ژمارەیەك لەو پێغەمبەرانە دێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾، وە ئێمە وەحییمان ناردوە، بۆ لای ئیبراهیم، وە بۆ ئیسماعیل (کە کوڕی ئیبراهیمە)، وە بۆ ئیسحاق (ئەویش هەر کوڕی ئیبراهیمە برای ئیسماعیل، بەڵام ئیسماعیل لە هاجەرەو ئیسحاق لە سارایە)، وە یەعقووب (کە کوڕی ئیسحاقە)، (وَٱلۡأَسۡبَاطِ) (واتە: نەوەکانی یەعقووب

کە لەنێویاندا هەندێك لە پێغەمبەران بوو ون، (علیهم الصَّلاة والسلام) بەڵام کوڕەکانی یەعقووب جگە لە یوسوف وەك دوایی باسی دەکەین، هیچ کامیان پێغەمبەر نەبوون ئەو یازدە کوڕەکەی دیکە، چونکە شتی وایان لێ ڕوودا‌ون لە درۆکردن‌و هتد، کە لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە، ئەدی مەبەستی چییە؟ کە لە (أسباط)یش پێغەمبەر بوون؟ واتە: لەنێو نەوەکانی یەعقووبدا هەندێك پێغەمبەر بوون کە یەکێك لەوانە مووسایە)، وە زەکەرییا، وە یەحیا، وە عیسا، (ئەوانە هەموویان نەسەب‌و ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر یەعقووب، وە عیسا ﵇، عیسای کوڕی مەریەم کە کۆتا پێغەمبەری خوایە، پێش پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، کۆتا پێغەمبەری گەلی ئیسرائیلە) وە ئەیییوب‌و یونوس‌و هارون‌و سولەیمان، (کە کوڕی داوودە)، وە زەبووریشمان بە داوود دابوو، (کە ئەویش یەکێکە لەو چوار کتێبانەی کە ناویان لە قورئاندا هاتوە تەورات‌و ئینجیل‌و زەبوورو قورئان) ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴾، وە هەندێك لە پێغەمبەران کە پێشتر بەسەرهاتیانمان بەسەر تۆدا خوێندۆتەوە، وە هەندێك لە پێغەمبەرانیش کە بەسەرهاتیانمان بەسەر تۆدا نەخوێندۆتەوە، کەواتە: مەرج نییە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) نەك هەر بەسەرهاتیان خوێندرابێتەوە، بەڵکو هەر ناویشیان هێندرابێ لە قورئاندا، وەك دوایی باسی دەکەین، تەنیا ناوی (٢٥) لە پێغەمبەران لە قورئاندا هاتوە، لە حاڵێکدا کە ژمارەی پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) بە هەزاران بووە، ﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴾، وە خوا بە دواندن فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کردوە، واتە: بە قسەکردن قسەی لەگەڵدا کردوە.

ئنجا وەسفی ئەو پێغەمبەرانە دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾، ئەو پێغەمبەرانە هەموویان دڵخۆشکەرو ترسێنەر بوون، یاخود

موژدەدەرو ورياكەرەوە بوون، واتە: ئەركيان بريتى بووە لە دڵخۆشكردنى خەڵك ئەوانەى كە بەقسەى پێغەمبەران دەكەن، دڵخۆشيان بكەن، بەوەى كە پاداشتيان بەهەشتە، وە ئەوانەش كە سەرپێچيى دەكەن لە فەرمانى پێغەمبەران (عليهم الصَّلاة والسلام)، بيانترسێنن‌و وريايان بكەنەوە، كە سەرەنجاميان دۆزەخە، ئەوە ئەركيان بووە، ئەدى حيكمەتى ڕەوانەكرانى پێغەمبەران چى بووە؟ ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾، بۆيە ڕەوانە كراون، تاكو خەڵك لە دواى پێغەمبەران، بەڵگەى لەسەر خوا نەبێ، هيچ بەڵگەو بيانوويەكيان بەدەستەوە نەبێ لە بەرانبەر خوادا، كە خوا فەرمووى: بۆچى منتان نەپەرستوە؟ بۆ بە دواى ڕێبازى ڕاستى من نەكەوتوون؟ بەڵگەو بيانوويان نەبێ، بەلام ئەگەر پێغەمبەران نەهاتبانايە صەڵات‌و سەلامى خوايان لەسەربێ، خەڵك بەڵگەو بيانووى هەبوو، دەيانگوت: خوايە! بە ڕێمان نەزانى، كە ئايا تۆ دەتەوێ ئێمە چۆن بژين؟ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾، وە بێگومان خوا زاڵى كاربەجێيە.

ئنجا لە وەڵامى ئەوانەدا كە وەك لە هۆى هاتنە خوارەوەكەيدا باسمان كرد، دانيانەدەهێنا بەوەدا كە قورئان لە خواوە بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ﴾، بەلام خوا شايەديى دەدا بەوەى كە بۆ تۆى ناردۆتە خوار، خوا شايەديى دەدا كە ئەو كتێبە كتێبى خۆيەتى‌و بۆ لاى تۆى ناردوە، ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ﴾، بە زانياريى خۆى ناردوويەتە خوار، زانياريى خواش بێسنوورە، بۆيە نهێنييەكانى قورئان بێسنوورن، بەلام ديارە ئەوەى زاناو شارەزا نەبێ، لە نهێنييەكانى قورئان تێناگات، سادەو نەفامو سەركێڵى وا هەيە ڕەخنە لە قورئان دەگرێ، بێئەوەى هيچى لێ تێبگات! وەك كوردەواريى خۆمان دەڵێ: (تفەنگ بە تاريكييەوە دەنێ) ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ﴾، وێڕاى ئەوە كە خوا شايەديى دەدا، لەسەر ئەوەى كە بۆ تۆى ناردۆتە خوار، فريشتەكانيش شايەديى دەدەن، ديارە ئێمە شايەديدانى

فریشتەکان نازانین، بەڵام خوا پێمان ڕادەگەیەنێ کە فریشتەکانیش شایەدیی دەدەن ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾، خواش بەسە بۆ شایەدییدان، واتە: ئەگەر فریشتەکانیش شایەدییان نەدابایە شایەدییدانی خوا بەسە، بەڵام خوای پەروەردگار پێمان ڕادەگەیەنێ کە هەموو فریشتەکانیش شایەدیی دەدەن، کە قورئان لە خواوە بۆ موحەممەد ﷺ هاتوە، ئەوەش بۆ زیادە دڵنیایی ئێمە، ئنجا خوا دەفەرمویێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّواْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان و خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوە، بە گومڕاییەکی دوورو سەرگەردانییەکی دوور، گومڕابوون، واتە: زۆر لە ڕێی خوا دوور کەوتوونەتەوە، یانی: ئەوانە نەك هەر بۆخۆیان پابەند نەبوون بە ڕێی خواوە، بەڵکو خەڵکیشیان لێ لاداوە، ئەو هەقە لە خواوە هاتوە قبووڵیان نەکردوەو، خەڵکیشیان بێبەش کردوە لە ناسین و بڕواهێنان بەو هەقە، ئنجا دوایی دەفەرمویێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا﴾، بێگومان ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، وە ستەمیان کردوە، ناگونجێ خوا لێیان ببوورێ، وە ناشگونجێ هیچ ڕێیەکیان پێشان بدا، واتە: هیچ ڕێیەکی ڕاستیان پێشان بدات، کە لێیەوە بگەنە ئیمان، بگەنە ڕەزامەندیی خوا، ئەدی چ ڕێیەکیان پێشان دەدات؟ ﴿إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، تەنیا ڕێی دۆزەخیان پێشان دەدا، کە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾، ئەوەش لە لای خوا ئاسانە، واتە: ئاسانە خوا هەر کەسێك بیەوێ ڕێی لێ تێکبدات، وە ئاسانە هەر کەسێك بیەوێ، ڕێنمایی بکات، بەڵام ئایا خوای پەروەردگار لە گوترە هەندێکیان دەخاتە سەر ڕێ و هەندێکیان لە ڕێ لادەدات؟ وەك هەندێ خەڵك کە بە سادەیی و سەرکێڵیی تەماشای یەك ئایەت دەکەن لە بابەتێکەوە، سەرەنجام چەمك و واتایەکی هەڵەی لێ وەردەگرن، کە

شێوازی ڕاست ئەوەیە تۆ ئایەتێك دەربارەی بابەتێك هاتوە، دەبێ تەماشا بکەی چەند ئایەتی دیکە لەوبارەوە هاتوون، هەموویان بێنی، ئنجا هەموویان واتاو چەمکێکت بە دەستەوە دەدەن، کە ڕاست و دروست بێ، وەك چۆن ئەگەر یەکێك تەماشای بینایەك، بکات، ئەگەر تەنیا لە ڕووکارێکەوە تەماشای بکات، دیمەنێکی دەکەوێتە بەرچاو، ئەوی دیکە لەو دیوەوە تەماشا بکات، دیمەنێکی دیکەی دەکەوێتە بەرچاو، ئەویدیکە لەلای ڕاست، ئەویدیکە لەلای چەپ ... هتد، بەڵام ئەگەر لە هەموو گۆشەکانو لە هەموو لایەکانەوە تەماشا بکات، دوایی هەموو گۆشەو لایەکان بێنێتەوە بەرچاوی، ئنجا دیمەنێکی ڕاست و دروستی ئەو بینایەی دەکەوێتە بەرچاو، مەسەلەی قەدەریش هەروایە[1]، خوای دادگەر لێرەدا دەفەرموێ: خوا هەر کەسێك بیەوێ گومڕای دەکاو ئاسانە گومڕای بکات، وە هەر کەسێك بیەوێ ڕێنمایی دەکات، بەڵام لە شوێنی دیکە بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە کێ گومڕا دەکات و کێ ڕێنمایی دەکات، دەفەرموێ: ﴿... وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ... ٢٧﴾ إبراهيم، واتە: وە خوا ستەمکاران گومڕا دەکات، هەروەها پێشمان دەفەرموێ: کێ ڕێنمایی دەکات، ﴿... وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ٢٧﴾ الرعد، واتە: وە خوا ڕێنمایی ئەوانە دەکات کە بۆ لای دەگەڕێنەوە، کەواتە: دەبێ هەنگاوی یەکەم لە تۆوەبێ، چ بەرەو گومڕایی، چ بەرەو هیدایەت، ئنجا خوای کاربەجێش هاوکارییت دەکات و دەستت دەگرێ، لە حاڵەتی گرتنی ڕێی ڕاستداو، لە حاڵەتی گرتنی ڕێی چەوتیشدا، وێڵت دەکات و حەواڵەی خۆتت دەکات.

١) لە بەرگی چواری کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا) بە درێژی باسی چۆنیەتی ئیمان بە قەدەرو قەزامان کردوە

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾، ئێمە وەحییمان بۆ لای تۆ ناردوە، وەك چۆن وەحییمان بۆ لای نووحو بۆ پێغەمبەرانی دوای ویش ناردوە، واتە: موحەممەد ﷺ ڕیزپەڕ نیە، وە یەکێکە لە پێغەمبەرانو سەرچاوەی ئاڕاستەکرانی هەموویان یەکە، ئەویش خوای پەروەردگارە، کەواتە: وەك چۆن ئەوانی دیکە پێغەمبەر بوون، موحەممەد ﷺیش پێغەمبەری خوایەو ڕەوانەکراوی خوایە، کەواتە: ئەی جوولەکەکانو نەصرانییەکانو صابیئەو خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان، ئەوانەی خۆتان بە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی پێشوو دەزانن! بۆچی بڕوا بە پێغەمبەرانی دیکە دێنن، بەڵام بڕوا بە سەروەری پێغەمبەرانو کۆتایی پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) ناهێنن؟! خۆ ئەو خوایەی وەحیی بۆ پێغەمبەرانی دیکە ناردوەو کتێبی بۆ ناردوون، هەر ئەویش وەحییو کتێبی بۆ پێغەمبەری کۆتایی ناردوە، وە ئەو پێغەمبەری کۆتایی یە، دان بە هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی دادێنێو، دان بە هەموو کتێبەکانیشیان دادێنێ، وە هێڵە گشتییەکانی بەرنامەی هەموو پێغەمبەران یەکن، وەك: خوا بەیەکگرتن، بڕوا بە ڕۆژی دوایی، حەڵاڵو حەرامە سەرەکییەکان، چاكو خراپە سەرەکییەکان.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا﴾، لێرەدا خوا ناوی دوازدە لە پێغەمبەران دێنێ، ئەوانیش: نووح، ئیبڕاهیم، ئیسماعیل،

ئیسحاق، یەعقووب، عیسا، ئەییوب، یونوس، هارووون، سولەیمان، پاشان داوود، دوایش مووسا صەلاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، وە لە سوورەتی (الأنعام)دا ناوی ژمارەیەكی دیكەش لە پێغەمبەران دێنێ، وەك فەرموویەتی:

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَـٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾﴾،

(یوسوف، زەكەریا، یەحیا، ئیلیاس، ئەلیەسەع، لووط) ئەوە شەش، كەواتە: (٦ + ١٢) = ١٨ هەژدە، وە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرمووێ: ﴿وَإِسْمَـٰعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾، ناوی ئیدریس و ذەلكیفل دێنێ (٢ + ١٨) = ٢٠ بیست، وە لە سوورەتی (هود)دا دەفەرمووێ: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ...﴿٥٠﴾﴾، ناوی هود دێنێ، (١ + ٢٠) = ٢١، پاشان هەر لە سوورەتی (هود)دا دەفەرمووێ: ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ...﴿٦١﴾﴾، ناوی صالح دێنێ، (١ + ٢١) = ٢٢، وە هەر لە سوورەتی (هود) دیسان دەفەرمووێ: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ...﴿٨٤﴾﴾، ناوی شوعەیب دێنێ، (١ + ٢٢) = ٢٣، وە لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾﴾، ناوی ئادەم دێنێ، ئەوە (١ + ٢٣) = ٢٤، وە لە هەمان سوورەتدا واتە: (آل عمران) ناوی موحەممەد دێنێ، (١ + ٢٤) = ٢٥، وە سەرجەم ژمارەی ناو هاتووان، بیست و پێنجە (٢٥)ە،

کەواتـە: ئـەو پێغەمبەرانـەی (علـیهم الـصَّلاة والـسلام) ناویـان لـە قورئـاندا هـاتوە، کامانەن ئـەو بیـستو پێنجـەن، (ئـادەمو ئیـدریسو نـووحو ئیبـراهیمو ئیـسماعیلو ئیـسحاقو لـووطو یەعقـووبو یوسـوفو مووسـاو هـاروونو ئەییوبو هوودو صالحو شـوعەیبو داوودو سـولەیمانو ذەلکیفـلو یونـوسو ئیلـیاسو زەکەریياو یەحیـاو عیسـاو موحەممــەد) صــەلاتو سـەلامی خـوا لەسەر هەموویان بێ، ئەوە ئەو بیستو پێنجەی ناویان لە قورئاندا هاتوە، ئەدی پێغەمبـەران هـەموویان ژمارەیـان چـەندە؟ لـەم فەرموودەیـەدا دەردەکـەوێ کـە ژمـارەی پێغـەمبەران سـەدو بیـستو چـوار هـەزار (١٢٤٠٠٠) پێغـەمبەرن: ﴿عَـنْ أَبــي ذَرٍ رضي الله عنه قَـالَ: قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! كَـمِ الأنبيَـاء؟ قَـالَ: مِائَـةُ أَلْـفٍ وَأَربعَـةٌ وَعِشـرونَ ألفـاً، قُلْتُ: يَا رَسُـولَ اللَّهِ! كَمِ الرُّسُـل مِنْهُمْ؟ قَـالَ: ثَلاثَمِائَـــة وَثَلاثَـة عـشـر جَـمٌّ غَفِيـرٌ. قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! مَـنْ كَـانَ أَوَّلُـهُم؟ قَـالَ: آدَم، قُلْتُ: يَـا رَسُـول اللَّـهِ، نَبِـيّ مُرسل؟ قَـالَ: نَعَـمْ، خَلَقَـهُ اللَّـهُ بِيَـدِهِ، وَنَفَـخَ فِيـهِ مِـنْ رُوحِـهِ، ثُـمَّ سَـوَّاه قِـبَلا، ثُـمَّ قَـالَ: يَـا أبـا ذَرّ! أَرْبَعَـةُ سـرَيانيون: آدَم، وَشِـيث، وَنُـوح، وخَنُـوخ (وُهَـوَ إدريـس، وَهُـو أولُ مَـن خَـطَّ بـالقَلَم) وَأَرْبَعَـةُ مِـنَ العَـرَبِ: هُـود، وَصَـالح، وُشُـعيب، ونبيّـكَ يَـا أبـا ذَرّ، وَأول نَـبي مِـن أنبيـاء بَنِـي إسـرَائيل مُوسـى، وآخـرهُم عِيـسـى. وَأَوّل النَّبِيّـين آدَمُ، وآخــرِهُم نَبِيُّـكَ﴾ رَوَاهُ إبـنُ مردويـة فـي تفسيره، وَأبـو حـاتم البستي فـي كتابـه: (الأنـواع والتقاسـيم) وَصَـحَّحَهُ)[1]،

واتـــە: ئــەبو زەڕ خــوا لــێی ڕازی بــێ، دەڵــێ: ئــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ! پێغەمبـەران ژمارەیـان چـەند بـووە؟ فـەرمووی: سـەدو بیـستو چـوار هـەزار، گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! چەندیـان ڕەسـوول بـوون (خـاوەن بەرنـامەی سـەربەخـۆ بـوون)؟ فـەرمووی: سـێ سـەدو سـێزدە، ژمارەیـەکی زۆرن، گـوتم: ئـەی پێغـەمبەری خـوا! کـێ یەکەمی پێغـەمبــەران بـووە؟ فەرمووی: ئـادەم، گوتم: ئەی پێغـەمبەری خـوا! پێغەمبـەرێکی خـاوەن بەرنامـە بـووە؟ فـەرمووی:

١) تفسير ابن كثير، ج: (١)، ص: (٥٨٥).

بەڵێ، خوا بە دەستی خۆی دروستی کردوە (دەستێك کە سیفەتی خوایەو بۆ خوا شایستەیە) دوایی ڕووحی بە بەرداکردوە، وە ڕێکی خستوەو قسەی لەگەڵ کردوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! چوار لەو پێغەمبەرانە سووڕەیییانی بوون: ئادەمو شیثو نووحو ئەخنوخ (کە ئیدریسە، وە ئیدریس یەکەم کەس بووە کە بە قەڵەم نووسیویەتی) وە چوار لەو پێغەمبەرانە عەرەب بوون: هوودو صالحو شوعەیبو پێغەمبەری تۆ ئەی ئەبو زەڕ! (واتە: موحەممەد ﷺ) وە یەکەم پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل مووسا بووە، وە کۆتا پێغەمبەریان عیسا بووە، وە یەکەم پێغەمبەر ئادەم بووە، وە کۆتا پێغەمبەریش پێغەمبەری تۆیە (کە موحەممەدە ﷺ).

**مەسەلەی سێیەم:** حیکمەتی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران، وەك پێشتریش باسمان کرد، خوا ﷻ لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، پێغەمبەرانێکی موژدەدەرو ترسێنەرن، تاکو لە دوای ڕەوانەکرانی پێغەمبەران، خەڵك بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە پێش هاتنی پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) خەڵك بەڵگەو بیانووی هەیە، وەك خوا ﷻ بۆخۆی لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: ئێمە خەڵکی سزا نادەین، هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین، کەواتە: ئەوانەی بانگەوازی پێغەمبەرانیان پێنەگات، لە قیامەتیشدا خوا سزایان نادا، لەسەر ئەوەی کە بۆچی بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ ناکەن، مادام بانگەوازی پێغەمبەرانیان پێ نەگەیشتبێ، هەروەها لە سووڕەتی (فاطر) ئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا

نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵێك و هیچ ئۆممەتێك نەبووە، مەگەر ڕەوانەکراوێك و ترسێنەرێکی تێدا نێردراوە، (پێغەمبەرێکی تێدا نێردراوە)، کە ئاگاداریان بکاتەوەو بیانترسێنێ و وریایان بکاتەوە، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە عەقڵی ئینسان بەتەنیا کافی نیە بۆ ئەوەی ئینسان ژیانی خۆی پێ ڕێك بخات، بەڵکو پێویستیی بە وەحیی خوا دەکات، کە بە پێغەمبەراندا (علیهم الصَّلاة والسلام) دەینێرێ، بەڵێ عەقڵی ئینسان دەتوانێ لە وەحیی خوا ﷻ حاڵی بێ، وە لە هەندێ وردەکارییەکانی ژیان تێدەگات، بەڵام هێڵە گشتییەکانی ژیان، وە بەتایبەتی مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا ﷻ، وە مامەڵەکردن لەگەڵ ئینسانەکاندا، پێویستیی بەوە هەیە کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دیاری بکرێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾، مەبەست لەو شایەدییدانە، ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەو قورئانەی بۆ موحەممەد ناردوە (علیهم الصَّلاة والسلام) وە دەسەوسانکەرە بەڵگەو موعجیزەیەکە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدی پێ دەکرێ، ئەوە شایەدییدانەکەی خوایە، واتە: خوا چۆن شایەدیی دەدا کە موحەممەد پێغەمبەری خۆیەتی؟ موعجیزەیەکی داوەتێ ئیسپاتی دەکات، کە ئەو موحەممەدە ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، چونکە کتێبێکی پێیە هیچ کەس ناتوانێ نەك وێنەی ئەو کتێبە، بەڵکو وێنەی سوورەتێکی بچووکی ئەو کتێبە، کە لە سێ ئایەت پێکدێت، وەك سوورەتی (کوثر)، بێنێ، وە ئەو قورئانە هەر کاتێ میللەتان دەستی پێ بگرن، زیندوویان دەکاتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ

﴿إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾الأنفال، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەری خواوە بچن، هەر کاتێ بانگیان کردن، بۆئەوەی زیندووتان بکاتەوە، بەڵێ لەڕاستییدا گەورەترین موعجیزەی قورئان ئەوەیە، کە هەر میللەتێك دەستی پێبگرێ‌و بە شوێن ڕۆشناییەکەیدا بڕوا، زیندوو دەبێتەوە، ئەوە گەورەترین موعجیزەی قورئانە کە میللەتانی مردوو زیندوو دەکاتەوە، ئنجا ئەدی چۆن شایەدییدانی فریشتەکان دەزانین؟ خوا پێی ڕاگەیاندووین کە فریشتەکانیش شایەدن، ئەگەرنا ئێمە فریشتەکان نابینین، بەڵکو خوا ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، ئەو دوو ئایەتە موبارەکە ئەوە دەگەیەنن، کە کافرانی خەڵك لەڕێ لادەرو ستەمکار، نە دەبەخشرێن‌و نە ڕێنماییش دەکرێن، جاری وایە ئینسان بۆخۆی کافرە لە ماڵی خۆی، وە جاری وایە کافرەو خەڵکیش کافر دەکات، یانی بۆخۆی گومڕایە ئەوە گومڕایە، بەلاَم جاری وایە بەوەندە ئیکتیفا ناکات، دێ خەڵکیش گومڕا دەکات، ئنجا ئەوانەی کە خەڵك گومڕا دەکەن گوناهەکەیان زۆر گەورەیە، وەك لە باسکردنی خواوە بۆمان دەردەکەوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان‌و خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوە، بە گومڕاییەکی دوور گومڕابوون، واتە: زۆر لە ڕێی خوا دوور کەوتوونەتەوە، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا﴾، بێگومان ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، وە ستەمیان کردوە، (کە ستەم‌و زوڵمەکەیان ئەوەیە خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن)، ناگونجێ

خوا لێیان خۆشبێ، واتە: هەر بەكەڵك نایە خوا لێیان خۆشبێ، كە بۆ هیچ كەسی دیكە واینەفەرمووە، كەواتە: كەسێك كە گومڕایەو خەڵك گومڕا دەكات، واتە: كافرەو زوڵمیش دەكات، ئەوە هەر ناگونجێ وەبەر قەڵەمی عەفووی خوای بەرز بكەوێ، مەگەر تۆبەیەكی زۆر چاك بكات ئەوە جیایە، تۆبەكەشی ئەوەیە كە هەتا ئێستا خەڵكی گومڕا كردوە، ئەوجار دەبێ خەڵك ڕێنمایی بكاتو، خەڵك ئاشنای دینی خوا بكاتو بیانهێنێتەوە بۆ ڕێبازی ئیسلام.

خوای پەروەردگار ئێمە لەو كەسانە بگێڕێ، كە خۆشمان بە ڕێی خوادا بڕۆینو خەڵكیش بە ڕێی خوادا بەرین، وە بمانپارێزێ لەوەی ببینە هۆی سەرلێتێكدانی خەڵك.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دەرسی كۆتایی یە لە سوورەتی (النساء)و لە حەوت (٧) ئایەت پێكدێت، كە ئایەتەكانی ژمارە: (١٧٠ - ١٧٦)ن، سەرەتا خوای زاناو توانا بۆ جاری سێیەم لەم سوورەتەدا بە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ئەی خەڵكینە! بانگی مرۆڤایەتی دەكات، پێیان ڕادەگەیەنێ كە پێغەمبەرەكەی، واتە: پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ بە هەق هاتۆتە لایان، بۆیە با ئیمانی پێ بێنن، پاشان خوا ﷻ بانگی خاوەن كتێبەكان بەگشتی دەكات، كە لە ئایینەدا تێنەپەڕێنن، زێدەڕۆیی نەكەن، وە شتی ناهەق بە ناوی خواوە نەڵێن، واتە: خوا بە شێوەیەك وەسف نەكەن كە شایستەی خوا نەبێ، وە پێیان ڕادەگەیەنێ، كە عیسای كوڕی مەریەم پێغەمبەری خوایەو، وشەی موبارەكی خوایەو ڕووحێكی تایبەتە خستوویەتە نێو منداڵدانی مەریەمەوە خوا لێی ڕازی بێ، بۆیە پێویستە ئیمان بە خواو پێغەمبەرانی خوا بێنن، كە عیسا یەكێكیانە، وە خۆیان لە بە سێ كردن (تثلیث) بە دووربگرن، واتە: نەڵێن پەرستراوەكان سێن، بەڵكو پەرستراوی هەق یەكێكەو بەس خوا شایستەی پەرسترانە، تاكەو هاوەڵی نیەو، ڕۆڵەشی نیە، پاشان خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ كە نە عیسای مەسیحو نە فریشتە لە خوا نزیكەكان، خۆیان پێ لەوە بەرزتر نیە، وە پێیان نەنگیی نیە كە بەندەی خوابن، وە هەر كەسێك لە بەرانبەر خوادا خۆی بە زل بگرێ، وە بەندایەتییكردن بۆ خوا بە نەنگ بزانێ، خوا هەموو ئەوانە تێكڕا كۆدەكاتەوە، وە ئیمانداران پاداشتو، خۆ بە زلگرانیش، سزای بەئێشیان دەبێ.

ئنجا خوا ﷾ بۆ جاری چوارەمو کۆتایی لەم سوورەتەدا بانگی مرۆڤایەتیی دەکات بە وشەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە بەڵگەو ڕۆشناییەکی ڕوونکەرەوەیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ هاتوە، وە هەر کەس ئیمان بە خوا بێنێ، وە توند دەست بەو بەڵگەو ڕووناکییەوە بگرێ، سەرەنجام ڕەحمەتو بەخششی خوای پێ دەبڕێ، وە ڕێنمایی دەکرێ بۆ ڕاستە شەقام، وە لە کۆتاییدا خوای کاربەجێ جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی کەلالە، (كلالة) واتە: ئینسانی بێ وەجاخ، ئەو کەسەی نە ڕۆڵەی هەیە، نە دایكو باب، ئایا چۆن میراتی لێ دەگیرێ، وە چۆن میرات دەگرێ؟ باسی ئەوە دەکات، وە ئەوەی لەوبارەوە پێشتر لە ئایەتی (١٢)ی ئەم سوورەتی (النساء)دا هاتوە، لێرەدا خوای کاربەجێ تەواوی دەکات، واتە: چۆنیەتی میرات لێگیرانی کەلالەو چۆنیەتی میراتگرتنی.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن
تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧٠ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ
لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ
رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ
ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا
فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ١٧١ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن
يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ
فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ١٧٢ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ
وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا
أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ١٧٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ
مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ١٧٤ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ
فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ١٧٥ يَسۡتَفۡتُونَكَ
قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ
مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن
كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ
وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ١٧٦ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی خەڵکینە! پێغەمبەرتـان بـە هەقـەوە لـە پەروەردگارتانـەوە بۆ هـاتوە، جا بـڕوا بێنن، هەر ئەوە بۆ ئێوە باشە، وە ئەگەر بێبـڕواش بـن، ئـەوە هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو زەوی دایە هی خوایـە، وە خـوا زانـای کـاربەجێیـە ﴿١٧٠﴾ ئـەی خـاوەن کتێبینە! لە ئایینتاندا تێمـەپەڕێنن، وە جگە لە هـەق بۆ خوا مەڵێن: (واتە: تـەنیا بە هەق خوا وەسف بکەن) بێگومان مەسیحی کوڕی مەریەم تـەنیا ڕەوانـەکراوی خواو، بە وشە دروستکراوی خۆی بـووە، هاوێشتوویەتە نێو منداڵدانی مەریـەم، وە گیانێك بووە لەلایـەن خۆیـەوە، دەجا بـڕوا بـە خـواو پێغەمبـەرانی بێـنو مـەڵێن: پەرستراوەکان سێن، واز لەو قسانە بێنن بۆ ئێوە باشـترە، بێگومان خوا تەنیا یـەك پەرستراوە، پاکیی بۆ وی کە ڕۆڵەی هـەبێ، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دایـە هـی ویە، وە خوا بەسە بۆ سەرپەرشتیاریی ﴿١٧١﴾ نـە مەسـیحو نـە فریـشتە زۆر لـە خـوا نــزیك خراوەکــان، بەنــدە بـوون بـۆ خوایـان پـێ نـەنگیی نیـە، وە هـەر کەسـێك بەندایـەتیی بـۆ کردنـی خـوا بـە نـەنگیی بزانــێ، وە خـۆی بـە زل بگــرێ، ئـەوە هـەموویان بۆ لای خـۆی کۆدەکاتەوە ﴿١٧٢﴾ ئنجـا ئەوانەی بڕوایان هێنـاوەو کـردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، ئەوە پاداشـتەکانیان بە تەواویی دەداتـەوەو، لـە بەخششـی خۆی بۆیـان زیاد دەکات، بەڵام ئەوانەی بەندایەتیی بۆ خوایـان پـێ نەنگـیی بـوو، وە خۆیـان بـە زلگـرت، ئـەوە ئـازارێکی بەئێـشیان دەداو، لـە جیـاتی خـواش هـیچ سەرپەرشـــتیارو یاریـــدەدەریان چـــنگ ناکـــەون ﴿١٧٣﴾ ئـــەی خەڵـــکینە! لـــە پەروەردگارتانەوە بەڵگەیەکی ئاشکراتان بۆ هاتوەو، ڕووناکییـەکی درەوشاوەمان بـۆ ناردوونـە خـوار ﴿١٧٤﴾ ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان بـە خـوا هێنـاوەو، تونـد دەسـتیان پێوەگرتوە، بێگومان دەیانخاتە نێو بەزەیـیو بەخشـشێك لە خۆیەوەو، بـەرەو لای خـۆی ڕێیـەکی ڕاسـتیان پێـشـان دەدات ﴿١٧٥﴾ داوای فـەتوات لێدەکـەن لـە بـارەی

چۆنیەتی میرات لێگیرانی بێ وەجاخەوە، بڵێ: خوا لە بارەی بێ وەجاخەوە فەتواتان بۆ دەدات، هەرکات پیاوێك مرد، کە هیچ ڕۆڵەی نەبوو، وە تەنیا خوشكێكی هەبوو، ئەوە نیوەی ئەوەی بەجێیهێشتوە هی ویە، (واتە: هی خوشكەكەیەتی)، وە براش هەموو میراتی خوشكەكەی دەبات، مادام ڕۆڵەی نەبن، جا ئەگەر دوو خوشك بوون، ئەوە دوو سێیەكی ئەوەی برایەكەیان بە میرات بەجێهێشتوە، دەبەن، وە ئەگەر كۆمەڵە براو خوشكێك بوون، ئەوە نێرینە هێندەی بەشی دوو مێینانی هەیە، خوا یاساكانی بۆتان ڕوون دەكاتەوە، نەوەك گومڕاببن، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە ﴿١٧٦﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێك لە وشـەكان

(لَا تَغْلُوا ): (الغُلُوُّ: تَجَاوُزُ الْحَدِّ، فَإِذَا كَانَ فِي السِّعْرِ: غَلاَءٌ، وَإِذَا كَانَ فِي القَدْرِ وَالْمَنْزِلَةِ: غُلُوٌّ، وفي السَّهْمِ: غَلْوٌ، وَأَفْعَالُهَا جَمِيعاً: غَلاَ يَغْلُو والغَلِيُ والغَلَيَانُ في القِدْرِ) وشەی: (غُلو) لە زمانی عەرەبیدا، واتە: سنوور بەزاندن و تێپەڕاندن، جا ئەگەر لە نرخ دابێ، پێی دەگوترێ: (غَلاَء)، یانی گرانیی ڕووی داوە، (غَلاَء الأَسعَارُ) زیادبوونی نرخەکان، وە ئەگەر لە پلەو پایەو پێگە دابێ، پێی دەگوترێ: (غُلُوٌّ)، وە ئەگەر لە تیرو ڕم هاوێشتن دابێ، کە تیرێ بهاوێی تێبپەڕێنێ، پێی دەگوترێ: (غَلْو)، وە کردەوەی هەموویان پێی دەگوترێ: (غَلاَ يَغْلُو) وە (وغَلِي وغَلَيَان) مەنجەڵ کە دەکوڵێ سەرقاپەکەی بەرز دەکاتەوەو، جاری وایە لە مەنجەڵەکەش دێتە دەرێ، ئەوە (غَلَيَان)ی پێ دەگوترێ، چونکە ئەویش زیاد لە پێویست کوڵیوە.

( لَّن يَسْتَنكِفَ ): واتە: پێی نەنگیی نیە، چونکە دەڵێ: (نَكَفْتُ وَاسْتَنْكَفْتُ مِنْهُ: أَنِفْتُ) واتە: پێم نەنگیی بوو، یان پێم لە خۆم نەوەشایەوە، (نَكَفْتُ عَن كَذا) واتە: ئەو شتەم پێ لە خۆم نەوەشایەوە، خۆم پێ بەرزتر بوو، عەرەب دەڵێن: (نَكَفْتُ الشيء: نَحَيتَهُ، مِنَ النَكْفِ) واتە: شتەکەم لادا، ئەویش لە (نَكْف)ەوە هاتوە، (وَهُوَ تَنحيَةُ الدَّمْعِ عَنِ الخَدِّ بالأُصبُعِ) ئەگەر یەکێك فرمێسکی لەسەر ڕوومەتی لابدات، پێی دەگوترێ: (نَكَفَ)، (وَبَحْرٌ لاَ يُنْكَفُ: أي لاَ يُنْزَحُ) دەریایەك کە نەگونجێ ئاوەکەی لێ دەربدەی، دیارە کە ئاوەکەی لێ دەرنادرێ لەبەر زۆریی.

(بُرْهَٰنٌ ): واتە: بەڵگە، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، دەڵێ: (البُرهانُ: بيانُ للحُجَّة)، واتە: بەڵگەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا، (وَهُوَ مَصْدَرٌ بَرَه يَبَرَه إِذَا

ابْيَّضَ) واتە: سپی بوو جوان درەوشایەوە، (والبُرْهَان: أوكَدُ الأدِلَةِ، وَهُوَ الَّذِي يَقتَضِي الصِّدقَ أبداً)، (بُرهان) بەهێزترین بەڵگەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە ڕاست دەربچێ.

(يَسْتَفْتُونَكَ ): واتە: پرسیارت لێدەکەن، داوای فەتوات لێدەکەن، (وَالفَتْيا والفَتوَى: الجَوَابُ عَمَّا يُشْكَلُ مِنَ الأحْكَام)، (فَتْيا وفَتوَى) وەڵامی پرسیارێکە دەربارەی حوکمێك کراوە کە ئیشکالی تێدایەو خەڵك بۆی ڕوون نیە.

(ٱلْكَلَٰلَةِ ): واتە: بێ وەجاخ، (كَلَالَةَ) کەسێکە ڕۆڵە (فرع)ی نەبێ، واتە: کچو کوڕ، وە ئەسڵی نەبێ، واتە: باب و دایك، کەواتە: کەلالە ئەوەیە کە خوشك و برای هەبن، ئەوەش لە چییەوە هاتوە؟ (كَلَّ: ضَعُفَ، وَكَلَّ السَّيفُ: لَمْ يَقْطَع فَهُوَ كَلِيلٌ، وَكلَّ فُلانٌ: تَعِبَ فَهُوَ كالٌ، وَالكَلالَةَ: مَنْ لَمْ يُخْلِفْ وَالِداً وَلا وَلَداً يَرِثُهُ، ووَارثٌ لَمْ يَكُن والِداً ولا وَلَداً للمُوَرِّث) وشەی: (كَلَّ) واتە: بێهێز بوو، دەگوترێ: (كَلَّ السَّيفُ) شمشێرەکە نەیبڕی، (كَلَّ: تَعِبَ) ماندوو بوو، (فَهُوَ كَلِيلٌ) زۆر ماندوو و شەکەتە، (كَلَالَةَ) ئەگەر میرات لێگیراو بێ، کەسێکە کە نە باب و نە دایکی هەبێ میراتی لێبگرێ و نە ڕۆڵەی هەبێ، وە ئەگەر میراتگریش بێ، ئەوەیە کە نە باب و دایك بێ، نە ڕۆڵەبێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ ...﴿١٧١﴾﴾، ﴿نَزَلَ فِي نَصَارَى نَجرَان النَّسْطُوريَّة وَهُم الَّذِين يَقولُونَ عَيسى ابنُ اللَّه، والْمَار يَعْقُوبِيَّة وَهُم الَّذِينَ يَقُولُونَ: عِيسَى هُوَ اللَّـه، والمُرْقُسِيَّة وَهُم الَّذِينَ يَقُولُونَ: ثَالِثُ ثَلاثَةٍ وَيَقُولُوا لَهُم: المَلْكانِيَّة﴾ (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَاني في (تفسيره)[1]، واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی نەصرانییەکانی نەجران هاتە خوار: نەسطووریيەکان دەیانگوت: عیسا کوڕی خوایە، وە مارِ یەعقووبییەکان دەیانگوت: عیسا بۆخۆی خوایە، وە مەرقوسییەکان کە دەیانگوت: عیسا یەکێکە لە سێیەکان، (واتە: خوا سێیە: خوایەو عیسایەو ڕووحولقودوسە، وە مەلکانییەشیان پێدەڵێن).

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾﴾، ﴿إنَّ وَفد نَجرَان أَتوا رَسُول اللَّه ﷺ وَنَاظَرُوهُ فِي أَمْرِ عِيسَى عليه السلام، فَقَالَ لَهُم النَّبِيُّ ﷺ كَانَ عَبْد اللَّهِ وَرَسُوله، فَقَالوا: لاَ تَقُل هَكَذَا، فَإِنَّ عِيسَى يَأنَفُ عَنْ هَذَا القَوْل، فَنَزَلَ تَكْذِيباً لِقَوْلِهم﴾[2]، واتە: ئەم ئایەتەش دەربارەی وەفدی نەجرانییەکان هاتە خوار، کە هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتووێژیان لەگەڵ کرد دەربارەی عیسا سەلامی خوای لێ بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانیش گوتیان: وامەڵێ، چونکە عیسا خۆی پێ لەوە

١) ج: (٢)، ص: (٣٣٦).

٢) أسباب النزول للواحدي، ص: (١٢٥).

بەرزتـرە، (واتە: عیسا لەوە گەورەترە كە بەنـدەی خوابـێ، ئـەو كوڕی خوایـە! یـاخود بەشـێكە لـە خـوا) ئنجا وەك بەدرۆخـستنەوەی قـسـەكانیان، خـوا ئـەو ئایـەتـەی نـاردە خـوار.

٣) هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ...﴿١٧٦﴾ ﴾، ﴿عَن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَرِيضٌ لاَ أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ فَصَبُّوا عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَعَقَلْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّمَا يَرِثُنِي كَلاَلَةٌ؟ فَنَزَلَتْ: آيَةُ الْفَرَائِضِ﴾ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (١٩٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤١٤٢)، وغيرهُم، واتـە: جابیـری كوڕی عەبـدوڵڵا خوا لـێیان ڕازی بـێ دەڵـێ: من نـەخۆش بـووم، لـە هـۆش خـۆم چـوو بـووم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـات سـەردانی كـردم، لـێم بـە ژوور كـەوت، دەستنوێژی گرتو ئاوی دەستنوێژەكەییان لـێ پرژانـدم (دیارە هاتۆتـەوە هـۆش خـۆی) دوایی گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ من هیچ كەس میـراتم لـێناگـرێ جگە لە كەلالە؟ (وەك گوتمان دەگونجێ وشەی كەلالـە بـۆ میـراتگـرو بـۆ میـرات لـێگیـراو بەكاربـێ) (واتـە: ئایا میـراتەكەم چۆن دابـەش بكرێ، كـە هـەر بـراو خوشكم هەن میراتم لـێ بگرن، نـە بـابو دایكـم هـەن، نـە كوڕو كچم هـەن) ئنجا ئایـەتی فـەرائیض هـاتە خـوار.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خـوا ﷻ وەك گوتمـان بـۆ جـاری سـێیەم ڕوو لـە مرۆڤایـەتی دەکـات، ڕوو لـە هـەموو خەڵـکی دەکـات بـە تێکڕایـیو دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ ﴾، ئـەی خەڵـکینە! پێغەمبـەر {ئـەو ئەلیفو لامەی سەر (الرسول) ئەلیفو لامی عەهدە، واتە: ئەو پێغەمبەرەی کە خۆتـان دەیناسـن، پێغەمبـەری کۆتـایی، موحەممـەد ﷺ} بـە هـەق لـە پەروەردگارتانەوە بۆ لاتان هاتوە، واتە: ڕەوانەکرانەکەی بە هەقە، یاخود هەقی لەگـەڵ خـۆی هێنـاوە، لەلایـەن پەروەردگـارتانەوە، ئیمـانی پـێ بێـنو بەڕاسـتی بزانو شوێنی بکەون، ئەوە بۆ ئێوە چاکتـرە، بەڵکو هەر ئەوە چاکە لە دنیاو دواڕۆژدا، ﴿ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، وە ئەگـەر بێبـڕواش بـن (خـوا بێـباکەو بێنـیازە)، چـونکە بێگومـان هەرچـی لـە ئاسـمانەکانو زەویـدا هەیـە هـی خوایـە، وە خـوا زانـای کاربەجێیـە، واتـە: ئەگـەر ئیمـان بـە پێغەمبـەری کۆتـایی موحەممـەد ﷺ بێـنن، بۆخۆتـان خێـرو چاکە لـە دنیـاو دواڕۆژدا، ئەگـەر ئیمانیـشی پـێ نـەهێنن بۆخۆتـان خراپـە، ئەگـەرنا خـوا خـاوەنی ئاسـمانەکانو زەوییـە، ئێـوە نـەبوون، خـوا هـەر خـوا بـووە، خـوا هـەروەك خۆیەتیو ئـەوەی زەرەر دەکاو قـازانج دەکـات لـە کوفرو ئیمـان، بۆخۆتـانن، ئیـدی ئۆبـاڵی خۆتـان بەئەسـتۆی خۆتـان.

ئنجا دوای ئەوەی کە بانگی بەشـەرییەتی کـرد، بـانگی خـاوەن کتێبـەکان دەکـات بەگشتی، بەڵام دوایی زیاتر فەرمایشـتەکە نەصـرانییەکان دەگرێتـەوە، دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ ﴾، ئـەی خـاوەن کتێبـەکان! لـە دینداریيتانـدا تێمەپـەڕێنو پەڕگیـریی مەکـەن، ئێمـە دەبـێ هاوسـەنگ بـین، نـە تێپـەڕێنینو نـە بەجـێ بمێـنین، چـونکە (تفـريط) بەجێمـانو بەزایەدانـە،

(إفراط)یش ڕۆچوونو تێپەڕاندنە، دین چ لێی بەجێ بمێنی، چ لێی تێپەڕێنی، هەردووکیان هەڵەن، لێرەدا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: لێی تێ مەپەڕێنن، ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾، وە بەنسبەت خواوە هەق نەبێ مەڵێن، واتە: خوا بە هەق نەبێ وەسف مەکەن، شتێك مەڵێن کە بۆ خوا شایستە نەبێو لە خوا نەوەشێتەوە، هەڵبەتە ئەم ڕستە قورئانییە بۆ جوولەکەو بۆ نەصرانییو بۆ هەموو خاوەن کتێبو شەریعەتە ئاسمانییەکان بەکاردێ، وە ئێمەش وەك مسوڵمانان هەر دەگرێتەوەو، مانای ئەوەنیە کە خوا بەس بەوان دەفەرموێ: تێمەپەڕێننو زێدەڕۆیی مەکەن لە دینداریيتاندا، بەڵکو بۆ ئێمەش هەر دەگرێتەوە، وەك لەم فەرمایشتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ﴾ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٨٧١)، وَالنَّسائيُّ برقم: (٣٠٥٧)، عَن ابن عباسٍ رضي الله عنه، واتە: خۆتان لە تێپەڕاندن لە دینداریيدا بپارێزن، ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی تێپەڕاندنەوە لە دینداریيدا فەوتان.

ئەوجار خوا ﷻ دێتە سەر باسی نەصرانییەکانو تێپەڕاندنیان لە خۆشویستنیان بۆ عیسادا عليه السلام کە لەوەدا زێدەڕۆیی یان کردووەو تووشی تێپەڕاندن بوون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾، بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەکراوی خوا بووە، وە وشەی خوا بووە، هاویشتوویەتی بۆ مەریەم، وشەی خوا بووە لە ڕێی جیبریلەوە ئەو وشەیە هاوێشتراوە بۆ مەریەم، یانی چی؟ یانی خوا ﷻ لێرەدا ڕووحی عیسای بە وشە ناوهێناوە، لەبەرئەوەی کە عیسا عليه السلام بێ باب دروست بووەو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوای بەدیهێنەر دروست بووە، خوای کاربەجێ ئەو شێوە دروستکردنەی بە وشە ناو بردوە، وە لە ڕێی ئەو وشەوە ڕووحی عیسا لە ڕێی جیبریلەوە خراوەتە نێو منداڵدانی مەریەمەوە: جیبریل فووی بە یەخەی کراسەکەی مەریەمدا کرد، وە ڕووحەکەی چووە نێو

منداڵدانییەوە، عیسا ﷺ بەو شێوەیە خوا دروستی کرد، وە ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، وە ڕووحێك بووە لەلایەن خواوە، دیارە ڕووحی هەمووان هەر لە لایەن خواوەیە، بەڵام ئەو ڕووحێکی تایبەتەو لە ڕێی تێکەڵبوونی نوتفەی باب و دایکەوە، نەبۆتە کۆرپە (جنین) بەڵکو ئەو ڕووحە ڕاستەوخۆ چۆتە نێو منداڵدانی مەریەمەوە، واتە: بێئەوەی کە باب و دایك پێك بگەن، عیسا دروست بووە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، ئەگەرنا ڕووحی هەمووان لە خواوەیە، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین: هەندێك لە نەصرانییەکان ئا ئەوە دەکەنە بەڵگەی ئەوەی کە عیسا کوڕی خوایە، یاخود بەشێکە لە خوا، بەڵام لەڕاستییدا بەهەڵەداچوون، وەك دوایی باسی دەکەین چونکە خوای بەدیهێنەر باسی هەموو ئاسمانەکان و زەوی دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ ... ﴿١٣﴾﴾ الجاثية، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، خوا لە خۆیەوە بۆ ئێوەی مەیسەرو دەستەمۆ کردوە، کەواتە: ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بێ، دەبێ هەموو بوونەوەرو کائینات بەشێك بێ لە خوا، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ﴾، دەجا ئیمان بێنن بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا، کە یەکێك لەو پێغەمبەرانە عیسای کوڕی مەریەمە سەلامی خوایان لێ بێ، ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ﴾، یعني: (ولا تَقُولُوا: آلِهَـةٌ ثَلاَثَـةٌ) أو (ولا تَقُولُوا: الإلَـه ثَلاَثَـةٌ)، واتە: مەڵێن پەرستراوەکان سێن، یان مەڵێن پەرستراوی بە هەق (کە خوایە) سێ دانەیە: خوایەو، عیسایەو، ڕووحولقودوسە، کە ئەوان دەڵێن: (ثَلاثَة أقَانيم: الأَب، وَالإبن والرُّوح القُدس)، وامەڵێن، چونکە ئەو ئەسڵ و ئەساسی نیە، فیکرێکی ئەفسانەیی یە، ﴿ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ﴾، دەستبەرداری ئەو جۆرە قسانەبن، بۆ ئێوە باشترە، ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾، بێگومان خوا یەك

پەرستـــراوە، ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞ ﴾، پـاکیی بـۆ وی کـە ڕۆڵــەی هەبـێ، کێ ڕۆڵەی هەیە؟ کەسێك کە پێویستیی بەوە هەیە کە بوونی لە ئەسڵ و وەچەیدا بەردەوام بێ، بەڵام خوای باڵادەست خۆی هەر هەیـە، واتـە: ئێمـە بۆیـە پێویـستمانەو حەزدەکـەین ڕۆڵـەو وەچـەمان هـەبێ، چـونکە بۆخۆمـان نـامێنین و بوونەکەمان بەهۆی ڕۆڵەو وەچەمانەوە بـەردەوام دەبـێ، بـەڵام خـوای بـێ هـاوتـا هـەر هەیـە، وە پاشـان خـوای بـێ هـاوتـا لـەوە بـەرزترە کـە ڕۆڵـەو وەچـەی هەبـێ، چونکە: خۆی بێنـیازەو جێی نیازە، وە بێ وێنەو بێ هاوتایـە ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی خوایـە، وە خــواش بەسـە بـۆ سەرپەرشـتیاریی، ئنجـا بەرپەرچـی بڕوبیـانووی نەصـڕانییەکان دەداتـەوە، کـە عیـسا دەپەرسـتن و دەڵـێن: عیـسا کـوڕی خوایـەو، عیـسا یەکێکـە لـە سـێ پەرسـتـراوەکان، دەفـەرموێ ﴿ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ ﴾، مەسیح پێی نەنگیی نیـە بەندەی خوابێ، وە فریشتە زۆر لە خوا نـزیکخراوەکانیش، پێیان نەنگیی نیە کە بەندەی خـــوابن، بەڵـــکو شـــانازیی پێـــوە دەکـــەن، ﴿ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴾، هـــەر کەســـێك پێـــی نەنگـــیی بـــێ بەنـدایەتیی بۆ خوا بکات، وە خـۆی بـە زل بگـرێ، ئـەوە هـەموویان کۆدەکاتـەوە لـە دواڕۆژدا ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ ﴾، جا ئەوانـەی کـە ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون، ئەوە پاداشتەکانیان بە تەواویی دەداتەوە، وە لە بەخششـی خۆیان بۆیـان زیـاد دەکـات ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴾، بـەڵام ئەوانـەی کـە پێیـان نەنگـیی

بووە بەندایەتیی بۆ خوا بکەنو، خۆیان بە زل گرتوە، ئەوە ئازارێکی بەئێشیان دەدات، جگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرێکیان چنگ ناکەوێ، دەربازیان بکات لە سزای خوا.

ئنجا خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا بۆ جاری چوارەمو کۆتایی بانگی مرۆڤایەتیی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، ئەی خەڵکینە! لەلایەن پەروەردگارتانەوە، (پەروەردگار، واتە: کەسێك کە سەرپەرشتیارتانەو بەخێوتان دەکات، ڕۆزییتان دەدات، دەتانژیێنێ، دەتانمرێنێ هەمەکارەتانە، لەلایەن ئەو پەروەردگارەوە) بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکراتان بۆ هاتوە، ئنجا ئایا ئەو بەڵگە ڕوونو ئاشکرایە چییە؟ دەگونجێ مەبەست پێی قورئان بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەر ﷺ بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی ڕاستییەکانی شەریعەت بێ، کە لە قورئانو لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەن، بەڵام بە پێی سیاق ئەوە زیاتر پێدەچێ کە مەبەست لە ﴿ بُرۡهَٰنٞ ﴾، لێرەدا پێغەمبەری خوا (موحەممەد ﷺ) بێ کە بەڵگەی ڕوونو درەوشاوەی خوایە ﷻ ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴾، وە بۆمان ڕۆشناییەکی درەوشاوەمان بۆ ناردۆتەخوار، کە دەگونجێ لێرەدا مەبەست لەو ڕۆشناییە دروەشاوەیە، پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بێ، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی قورئان بێ، چونکە قورئان لە سەرێوە هاتۆتە خوار، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) هاتوون، بەس قورئانو فەرمایشتی خوا، هاتۆتە خوار، کەواتە: پێغەمبەرتان بۆ هاتوەو قورئانیشتان بۆ دابەزیوە کە بە نوور وەسفی دەکات، ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ ﴾، ئنجا ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو توند دەستیان بە خوا گرتوە، یان دەستیان بە ڕێسمانی خوا گرتوە، یان دەستیان بە پێغەمبەری خواوە ﷺ گرتوە، یان دەستیان بە نووری خواو کتێبی خواوە گرتوە، ئەوانە خوا چییان بۆ دەکاتو چییان لێ

دەکـات؟ دەفـەرموێ: ﴿ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ ﴾، بـە تەئکـید خـوا دەیانخاتـە نێـو بـەزەیی یـەك لـە خـۆیو بەخششێك لەلایـەن خۆیـەوە، لـە دنیـادا دەیانخـاتە نێـو ڕەحمـەتو بەزەیـی خۆیـەوە، وە لـە دوارۆژدا دەیانخاتـە نێـو بەخششو چاکەی خۆیەوە، کە بە هەشتە ﴿ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴾، وە بەرەو خـۆی بۆ ڕێیەکی ڕاست ڕێنمایی یان دەکات، کەواتە: بـە ئەنـدازەی ئـەوە کە ئینسان دەست بە قورئانەوە دەگرێ، وە بە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێ، هیدایـەتو بەرچـاوڕوونیی بـۆ پەیـدا دەبـێ، ئنجـا لـە ئایـەتی کۆتاییـدا - وەك باسمان کرد - خوای پەروەردگار جارێکی دیکە دەگەڕێتـەوە سەر باسی چۆنیەتی میـرات گرتنو میـرات لـێگیـرانی ئینـسانی بێ وەجاخ، ئینـسانێك کە نـە ئەسڵی هەیـە کـە بـابو دایکـنو، نـە لقـی هەیـە کـە ڕۆڵـەو منداڵـن، دەفـەرموێ: ﴿ يَسۡتَفۡتُونَكَ ﴾، داوای فەتوات لـێ دەکەن ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ﴾، بڵـێ: خـوا فەتواتـان بـۆ دەداتو بۆتـان ڕوون دەکـاتەوە، دەربـارەی کەسـێك کـە میـراتی لـێدەگیرێو بێ وەجـاخە، واتە: کەسێك نە بـابو دایکی هەیـە، نـە ڕۆڵەی هەیـە، ئەگـەر میـرات لێگیـراوبـێ، وە ئەگـەر میـراتگـر بـێ، کەسـێك نـە بـابو دایـكو نە ڕۆڵـەیە ﴿ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ ﴾، ئەگەر پیاوێك وەفاتی کـردو ڕۆڵـەی نـەبوو، وە بـە پێـی سـیاق دەردەکەوێ کـە بـابو دایکیـشی نـەبوو ﴿ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ ﴾، یـەك خوشکی هەبوو ﴿ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ ﴾، نیـوەی میـراتەکەی بـۆ خوشـکەکەیەتی ﴿ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞ ﴾، ئـەو برایـەش هـەموو میـراتەکەی خوشـکەکەی دەبـا، مادام ئەو خوشـکەی منداڵـی نەبن، هەروەهـا بـابو دایکیشی نەبن، واتە: ئەو خوشـکە نیـوەی مـیراتی برایەکـە دەبـات، بـەڵام برایەکـە هـەموو میراتـی خوشـکەکەی دەبـات ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ ﴾، ئنجا ئەگەر خوشکەکان دووان بوون ئـەوە دوو لەسـەر

سێی ئەو میراتە کە برایەکەیان بەجێیهێشتوە، دەگرن. ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ﴾، بەڵام ئەگەر ئەوانەی میرات دەگرن، خوشكو برا بوون، پیاوانو ژنان، ئایا میراتەکە چۆن دابەش دەکرێ؟ ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾، بۆ نێرینە هێندەی بەشی دوو مێینە هەیە، واتە: بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە هەیە، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْ﴾، خوا بۆتان ڕوون دەکاتەوە بۆئەوەی گومڕا نەبن، یاساکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆئەوەی بزانن میرات چۆن دابەش دەکرێ ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە، وە بە پێی زانیاری بێسنووری خۆی ئەو شتانە بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە.

## چـەند مەسـەلەیـەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، ئـەوە بـۆ جـاری سـێیەمە کـە خـوا ﷻ بـە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ئەی خەڵـکینە! لـە سوورەتی (النساء)دا بـانگی بەشـەرییەت دەکات، دەفـــــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴾، ئـــــەی خەڵکینـە! بێگومان پێغـەمبەر لـە پەروەردگارتانـەوە هـەقی بـۆ هێنـاون، یـاخود بـە شـێوەیەکی هـەق ڕەوانـە کـراوە، ﴿ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡ ﴾، دەجـا ئیمـانی پـێ بێنن، ئەوە بـۆ ئێـوە باشـترە، ﴿ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴾، وە ئەگەر بێـبـڕواش بـن، ئـەوە مـوڵکی ئاسمانـەکانو زەوی هـی خوایە، وە خوا زانـای کاربەجێیـە، واتـە: خـوا بێنیـــازە لـە ئیمـانی ئێـوە، ئەگـەر ئێوە ئیمان بێنن بۆخۆتان باشـترە، یاخود ئەو ئیمان هێنانە بۆ ئێوە باشە، واتـە: بـۆ خـوا ﷻ بـاش نیـە، لـەو ڕووەوە کـە سـوودێك بـە خـوا ناگـاتو، بـە ئیمـان هێنـانی ئیمانداران سوودێك بە خـوا ﷻ ناگـاتو، خوا ﷻ قازانجـێکی پـێ نـابڕێ، هەروەك بە کافربوونی کـافرانیش خـوا ﷻ هـیچ زەرەرێـك ناکـات، وە زیـانی لـێ نادرێ، بەڵکو ئەوەی کە قازانـج دەکات، لـە ئیمـان هێنـانو زیـان دەکـات بـە هـۆی بـڕوا نەهێنانـەوە، ئینـسان بۆخۆیـەتی، جـا ئـەوە دەربـارەی ئیمـان، دەربـارەی هەموو شتەکانی دیکـەش کـە پەیوەنـدییان بـە ئیمانـەوە هەیـە، واتـە: طاعـەتو بەندایـــەتیی و، خـــۆدوورگرتن لـــە قەدەغـــە کراوەکـــانو، جێبەجێـــکردنی فەرمانـەکان، هـەمووی هەروایـە، وەك خـوا ﷻ لـە شـوێنی دیکـەدا بەگـشتی فەرموویـــەتی: ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَا ...﴿٤٦﴾ ﴾ فـــصلت،

واتە: هەر کەسێك کردەوەیەکی چاك ئەنجام بدات (کە ئیمان هێنان یەکێکە لە کردەوە چاکەکان) قازانجی بۆخۆیەتی، وە هەر کەسێك خراپەیەك بکات، زیانەکەی بۆخۆیەتی، بەڵام خوا ﷻ لەوە بەرزترەو مەزنترە کە ئێمە بتوانین سوودی پێ بگەیەنین، یاخود زیانی لێ بدەین، جا لێرەدا کە خوا ﷻ بانگی بەشەر دەکات، بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەمە لێیوەردەگیرێ کە خوای بە بەزەیی زۆر بە تەنگ بەندەکانییەوەیەو، زۆر بەزەیی پێیان دێتەوەو مشووریان دەخوا، بۆیە پەیتا پەیتا لە قورئاندا لە چەندان شوێندا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ئەی خەڵکینە! ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، ئەی خەڵکینە! هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم! هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ ﴾، ئەی مرۆڤ ! ئنجا دوایی بەتایبەت بۆ ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! چونکە لە نێو ئێمەدا واباوە، ئەگەر کەسێك بانگی یەکێك، یان کۆمەڵێ بکات و شتێکیان پێ ڕابگەیەنێ، دیارە خەمیان لێدەخواو گرنگییان پێدەدات، جا ئێمە جاری وایە کە بانگی کەسێك دەکەین خۆمان ئیشمان پێیەتی، بەڵام خوای پەروەردگار تۆزقاڵێکیش ئیشی بە ئێمە نیە، بەڵکو ئیشی خۆمانی بە خۆمان هەیە، یەك تۆزقاڵیش ئیشی خۆی بە ئێمە نیە، وەك گوتم نە بە ئیمان هێنان و طاعەتمان قازانجێك بە خوا دەگەیەنین و، نە بە کوفرو سەرپێچییشمان زەرەرێك لە خوای بەرزو مەزن دەدەین، بە پێچەوانەی خراپ لێ حاڵیبوونی زۆر مسوڵمانی کرچ و کاڵەوە، کە کاتێك نوێژێك دەکات، یان ڕۆژوویێك دەگرێ، حەجێك دەکات، ماڵێك دەبەخشێ... هتد، پێی وایە ئەوە چاکەیەکی لەگەڵ خوادا کردوە، خوای دەوڵەمەندی منەتباری خۆی کردوە! نازانێ لەڕاستییدا کە چاکە دەکات، چاکەی لەگەڵ خۆی کردوە، وە کە گوناهو تاوانیش دەکات، ئەوە خراپەی لەگەڵ خۆی کردوە، بەڵێ خوای خاوەن و پەروەردگار زۆر لەوە بەرزترە کە

ئێمە بتوانین قازانجی پێ بگەیەنین، یاخود زیانی لێ بدەین، ئنجا لێرەدا ڕەنگە یەكێك بڵێ: ئەدی بۆچی خوا چاكەی ئێمەی پێخۆشەو خراپەی ئێمەی پێناخۆشە؟ وەك دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ...⁽٧⁾ ﴾ الزمر، واتە: بێگومان ئەگەر بێبڕوابن ئەوە خوا دەوڵەمەندو بێنیازە لێتان، بەڵام ڕازی نیە كە بەندەكانی بێبڕوابن، یان سپڵەبن، وە ئەگەر سوپاسگوزاربن (كە ئیمان چڵەپۆپەی سوپاسگوزارییە بۆ خوا)، یان ئیمانداربن، خوا ڕازییەو پێی خۆشە، وەڵامەكەی ئەوەیە كە: خوا ﷻ قازانجی ئێمەی پێخۆشەو زەرەری ئێمەی پێناخۆشە، ئەگەرنا لەبەرئەوە نیە، ئەگەر چاكە بكەین قازانجی پێبگات و، ئەگەر خراپە بكەین زەرەری پێبگات، بەڵكو بۆیە خوا كوفرو خراپەی پێناخۆشە، چونكە بۆخۆمان خراپە، ئەویش زەرەری ئێمەی پێناخۆشە.

**مەسەلەی دووەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُواْ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ﴾، دوو شت بە خاوەن كتێبەكان دەفەرموێ، كە بە پلەی یەكەم جوولەكەو نەصرانییەكانن، بەڵام چەمكی فراوانتری (خاوەن كتێبەكان) هەموو ئەوانەن كە خۆیان بە خاوەنی كتێبێكی ئاسمانیی دەزانن، جا چ لە قورئاندا ناویان هاتبێ وەك: تەورات و ئینجیل و زەبوورو صوحوفی ئیبراهیم، چ ناویان نەهاتبێ، وەك هەندێك كتێبی دیكە بۆ وێنە: زەردەشتییەكان و ئەوانی دیكە، كە خۆیان بە خاوەن كتێب دەزانن، دەڵێن: ئەوە كتێبی ئاسمانییە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی خاوەن كتێبینە! لە دینداریی‌تاندا تێمەپەڕێنن، پێشتر باسی وشەی: (الغُلُوُّ)مان كرد، (الغُلُوُّ: مُجاوَزَةُ الحدِّ)، واتە: سنوور بەزاندن و تێپەڕاندن.

ئنجا كە دەفەرموێ: لە دینداریی‌تاندا تێمەپەڕێنن، پاشان وەك وێنەیەك لەو تێپەڕاندنە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ﴾، واتە: وە خوا بە

شتێك وەسف مەكەن كە هەق نیە، دەڵێین: تێپەڕاندن لە دینداریی‌دا پیشەی جوولەكەو نەصرانییەكان بووە، كە لە ئایەتەكانی پێشەوەدا خوای كاربەجێ باسی زۆر شتی كرد كە جوولەكەكان تێیدا تووشی تێپەڕاندن بوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ بِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴾، وە بە هۆی بێبڕوایی یانەوە بە خواو بە پێغەمبەران، وە گوتن و هەڵبەستنی بوختان و تۆمەتێكی مەزن بۆ مەریەم دایكی عیسا عليه السلام (كە گوتیان: مەریەم ئەو كوڕەی كە بووە زۆڵە)، جوولەكە بەو لایدا تێیانپەڕاندو، نەصرانییەكانیش بە پێچەوانەوە، ئەوانیش بەوەندەوە نەوەستان بڵێن: عیسا عليه السلام بەندەی خوایەو پێغەمبەری خوایە، بەڵكو گوتیان: هەر خودی خوایەو، یەكێكە لەو سێیانەی كە بە هەرسێكیان خوا پێكدێنن، وەك خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ...﴿٧٣﴾ ﴾المائدة، واتە: بێگومان بێبڕوان ئەوانەی كە گوتیان: خوا سێیەمی سێیەكانە، سێیەكان كێن؟

١) خوا سبحانه وتعالى.

٢) عیسا (كە دەڵێن: كوڕی خوایە).

٣) ڕوحولقودوس، كە ڕەنگە مەبەستیان پێی جیبریل بێ، وە هەندێكیان گوتوویانە: سێیەمیان مەریەمە، دایكی عیسا عليه السلام .

هەروەها لە ئایەتی (٧٢)ی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ...﴿٧٢﴾ ﴾، بێگومان بێبڕوان ئەوانەی گوتیان: خوا بریتیە لە مەسیحی كوڕی مەریەم، كەواتە: نەصرانییەكان عیسا بە كوڕی خوا دەزانن، یاخود عیسا بە خودی خوا دەزانن، هەردوو لای هەیە، دوایی تۆزێكی لێ باس دەكەین.

ئنجا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زۆر بە تەنگ ئەوەوە بووە كە ئێمە لە دینداریی‌دا تێنەپەڕێنین، وەك جوولەكەو نەصرانییەكان، وەك لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿لا

تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ ؈ فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ فَقُولُوا: عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ﴾ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٤٥)، وَالتِّرمِذِيُّ في (الشمائل المحمدية) برقم: (٣٣١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٣٩)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٨٤) عَنْ ابْنُ عُمَرَ ﵁، واتە: لە ستایش و پێهەڵگوتنی مندا تێمەپەڕێنن، وەك نەصرانییەكان لە ستایشكردنی عیسای كوڕی مەریەم دا (سەلامی لەسەربێ)، تێیانپەڕاند، (واتە: زیاد لە حەددی خۆی بردیانە سەرێ) بێگومان من بەندەم، بڵێن: بەندەی خواو ڕەوانەكراوی خوا، واتە: مەمكەن بە كوڕی خوا، وەك نەصرانییەكان عیسایان كردە كوڕی خوا، چونكە خوا ﷻ نە هاوسەری هەیە، نە ڕۆڵەی هەیە.

هەروەها دەربارەی تێنەپەڕاندن لە دینداریيدا، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكی دیكەدا دەفەرمویٚ: ﴿إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ﴾ أَخْرَجَهُ أحمد برقم: (٣٢٤٨)، وَالنَّسائيُّ برقم: (٣٠٥٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢٩)، عَن ابن عباسٍ ﵄)، واتە: خۆتان لە تێپەڕاندن لە دینداریی دا بپارێزن، ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی تێپەڕاندنەوە لە دینداریی دا فەوتان. ئەو بەرنامەو دینەی خوا دەینێرێ، ئینسان هاوسەنگ دەكات، هەقی ڕووح، هەقی جەستە، هەقی عەقڵ، هەقی عاطیفە، هەقی تاك؛ هەقی خێزان، هەقی كۆمەڵ، هەقی دنیا، هەقی قیامەت، هەقی خوای پەروەردگار، هەموو هەقەكان دەدات، وەك لەم فەرمایشتەدا چەند مافێك باسكراون: ﴿عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﵁ يَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ النَّهَارَ وَتَقُومُ اللَّيْلَ؟». قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: «فَلاَ تَفْعَلْ، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنَاكَ، وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، إِنَّ لِعَيْنِكَ حَقّاً، وَلِنَفْسِكَ حَقّاً، وَلأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، صُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ»﴾ أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٧٧)، دین ئەگەر بە شێوەیەكی ڕێك و ڕاست بگیرێ، ئینسان هاوسەنگ دەكات، بەڵام كاتێك تێیدەپەڕێنێ، هاوسەنگییەكە

تێکدەچێ، وەختێك كە ئینسان لەلایەكدا تێدەپەڕێنێ، لەسەر حیسابی بەزایەدانی لایەکی دیکەیە، جا ئەگەر لە لایەنی عیبادەتدا تێپەڕێنێ، دیارە لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەیە، وە ئەگەر لەلایەنی دنیا بە کەمگرتن (زُهد)دا تێپەڕێنێ، دیارە لەسەر حیسابی لایەکی دیکەیە، لەلایەنی جەنگو جیهاددا تێپەڕێنێ، دیارە لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکەیە ... هتد، بەڵام ئەگەر هەمووی بە هاوسەنگی بگیرێ، دیارە بە هیچ لایاندا لاسەنگ نابێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾، وە لەبارەی خواوە جگە لە هەق مەڵێن، لە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا دەڵێ: (لاتَصِفُوهُ بِمَا يَسْتَحِيل اتِّصَافُهُ بِهِ مِنْ الحلُولِ والإتِّحَادِ واتِّخَاذ الصَّاحِبَةِ أو الوَلَدِ)[١]، واتە: خوا بە شتێك وەسف مەكەن كە بۆ ئەو مەحاڵ بێ، وەك ئەوە كە بگوترێ: خوای بێ وێنە چۆتە نێو بەدەنی ئینسانو یەكیان گرتوە، وەك نەصرانییەكان دەڵێن: (إتَّحَد اللاهُوت بالنَّاسُوت) خواو بەندە یەكیان گرتوە، خوا چۆتە نێو جەستەی بەندەوەو، بەندە پەیوەست بووە بە خواوە، وە مەڵێن خوا هاوسەری هەیە، یان ڕۆڵەی هەیە، چونكە خوا ﷻ بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ⑪﴾ الشورى، هیچ شتێك هاوشێوەی خوا نیە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ① ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ② لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ③ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ④﴾ الإخلاص، واتە: بڵێ: خوا تاكە، خوا بێنیازەو جێی نیازە، كەسی لێ نەبووەو لە كەسیش نەبووە، وە هیچ كەس هاوتای وی نیە، ئەوە پێناسەی خوای پەروەردگارە.

---

١) محاسن التأويل، للقاسمي، ج: (٥)، ص: (٦٧٥).

## جـۆرەكانی تێپـەڕاندن لە دینـــداریی دا

یەكـەم: تێپەڕانـدن لـە عەقیـدەدا: كـە لـەنێو مسوڵمانانیـشدا بـووە، هەنـدێ بـە بیانووی ئەوە كە خوا زۆر بە پاك دەگرن، سیفەتەكانیان لـێ دارنیـوەو لایان بردوون، بە حیساب بۆ ئـەوەی كە خوا بە هیچ شتێك وەسف نەكەن، كە ئـەوە پێی دەگوترێ: (تعطیـل)، واتە: پەك خستنی سیفەتەكانی خوای بێ وێنـە، لـە بەرانبەریـشـدا هەندێكـیان بـە حیـساب زۆر جـەختیان كردۆتـەوە، لەسـەر ئەوەی كە سیفەتەكان بۆ خوا ئیسپات بكەن، تووشـی وێچواندنو جەستاندن (تـشبیه و تجـسیم) واتــە: ئــەو ســیفەتانەی خوایـان وەك هــی بەشـــەر لێكـردوونو تەماشایان كـردوون، یـان حاڵـەتێكی جەستەییان بـۆ خـوا بڕیـار داوەو، گوتوویانە: سیفەتەكانی خـوا وەك سـیفەتی بەشـەرن، كەواتـە: ئەوانـەی سیفەتەكان لە خوا دادەڕنـنو لایاندەبـەن، بەزایـەدان (تـفریط)یـان كـردوە، وە ئەوانەش كە سیفەتێكیان بـۆ خـوا بڕیـار داوە، كـە وەك هـی دروستكراوەكانە، زێدەڕیی (إفـراط)یـان كردوە.

دووەم: تێپەڕانـدن لە عیبـادەتدا[1]: ئەویش ئەوەیـە كـە مرۆڤـ لەسـەر حیـسابی كاسـبیی حەڵاڵو ژیاندنی ماڵو منداڵی، یان لەسـەر حیسـابی جـەنگو جیهاد دژی دوژمنـــانی ئیـسلامو بەرگرییــكردن لـە دیـنو ژیــن، لـە گۆشـەیەكی مزگەوتـدا هـەر خـەریكی عیبـادەتی شـەخـصییو خـەریكی خەڵوەتكێـشان (الإعتكـاف)ە، كـە لەڕاسـتییدا ئـەوە تێپەڕاندنـە لـە عیبادەتـدا، یـاخود لـە عیبادەتی شـەخصیی دا.

سێیەم: تێپـەڕاندن لە دنیـا بـە كەمگـرتن (زُهـد)دا، بەڵـێ ئینـسان دەبـێ دنیا بەكەم بگرێ، بەڵام بەو شێوەیەش نا كە وازی لێــبێنیو، پـەكی ژیـانی خۆیو

١) واتە: عیبـادەت بە چـەمكو واتایـە تەسـكو تایبەتـییەكەی، كە جێبـەجێكـردنی دروشــمەكانی نوێـژو ڕۆژوو و زەكـاتو حـەجو عـومرەو زیكـرو دووعـا، بەشـی سـەرەكییەتی، نـەك بە چـەمكو واتا گشتییو ئەسڵییەكەی، كە سەرجەم چالاكییو جموجۆڵەكانی مرۆڤ دەگرێتـەوە.

ماڵو منداڵو ئەوانەی نەفەقەیان لەسەریەتی، بخات، بە بیانووی دنیا بە کەمگرتنەوە، بەڵکو دەبێ دنیا ئەوەندە بە کەمبگیرێ کە شەرع ڕێگەی داوە، نەك وازی لێبێنیو ئیهمالی بکەیو، سەرەنجام ئەرکە شەرعییەکانیشی پێوە بفەوتێنی.

چوارەم: تێپەڕاندن لە دنیا ویستیی دا: بەڵێ شەریعەت ڕێگای داوە کاسبیی حەڵاڵ بکەیو، ڕزقی حەڵاڵ پەیدا بکەی، جلو بەرگی جوان لەبەر بکەیو، خواردنی خۆش بخۆی لە سنووری شەرعدا، وە بەخشندەبی، نەك چاوت لەدەستی خەڵکی بێ، بۆیە زەکاتدانو حەجکردن هی کەسانێکن کە دەوڵەمەندبن، چونکە ئەوەی دەوڵەمەند نەبێ، زەکاتی لێناکەوێ، وە ئەوەی دەوڵەمەند نەبێ حەجی لەسەر پێویست نابێ، زەکاتو حەج دوو پایەی ئیسلامن، کەواتە: لە ئیسلامدا دەوڵەمەندیيو هەبوونی سەروەتو سامان نیعمەتە، وە هەژارییو نەداریی بەڵایە، هەرچەندە زۆر لە مسوڵمانان وادەزانن کە هەژارییو تەنگدەستییو نەداریی، شتێکی پەسندو باشە، دەوڵەمەندییو پارەدارییو سامانداریی شتێکی خراپە! نەخێر دەوڵەمەندییو سامانداریی شتێکی باشە، بە بەڵگەی ئەوە کە دوو لە پایەکانی مسوڵمانەتیی، کە زەکاتدانو حەجکردنن، بە دەوڵەمەندان نەبێ ناکرێن، ئینسانی هەژار زەکاتی لەسەر واجب نیەو، حەجی بۆ ناکرێ، بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە هەژاریی بەڵایە، ئەم فەرمایشتەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووعایەکانیدا دەیفەرموو: ﴿اللَّهُمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الفَقْرِ وَالكُفْرِ﴾ أَخْرَجَهُ إبْنُ حِبَّانَ برقم: (١٠٢٣)، عن أنس رضي الله عنه، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيحٌ)، واتە: خوایە! پەنا دەهێنمە بەر تۆ لەبەر هەژارییو کوفر، هەروەها گوتراوە: (كَادَ الفَقْرَ أنْ يَكُونَ كُفْرًا) واتە: هەژاریی خەریکە ببێتە کوفر، واتە: سەردەکێشێ بۆ کوفر، لە ئەنجامی هەژارییدا مرۆڤ جاری وایە دینی خۆی دەدۆڕێنێ، ئەگەر ئیمانەکەی تەواو نەبێ، کەواتە: تێپەڕاندن لە دینداریيدا چەند جۆرێکی هەیە، کە ئێمە بەس وەك نموونە ئاماژەمان بە چوار جۆریان کرد.

**مەسەلەی سێیەم:** كە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، خوای زاناو شارەزا لێرەدا پێناسەی عیسا ﷺ دەكاتو دەفەرمویٚ: مەسیح عیسای كوڕی مەریەم ڕەوانەكراوی خوایە، وە وشەی خوایە ناردوویەتی، هاویٚشتوویەتی بۆ مەریەم، وە ڕووحێك بووە لە خواوە، لێرەدا ئەگەر تەماشا بكەین، خوا بە چوار شتان عیسا ﷺ وەسف دەكات، ئەو عیسایەی كە جوولەكەكان دەڵێن: زۆڵە، وە نەصرانییەكان دەڵێن: خوایە، یان كوڕی خوایە، ئەدی مسوڵمانان دەڵێن چی؟ دەڵێن: بەندەی خوایەو پێغەمبەری خوایە، وەك باقی پێغەمبەرانی دیكەو تەنیا جیاوازیی ئەوەیە كە عیسا ﷺ خوای بەدیهێنەر وای دروستكردوە كە بابی نەبیٚ، ڕووحێك بووە یەكسەر خستوویەتە نێو منداڵدانی دایكییەوە، وە لە ڕێی جیبریلەوە، عیسا ﷺ پەیدابووە، بۆئەوەی خوای پەروەردگار بە هەموو دنیای پێشان بدات، كە بەڵێ ئینسان بە بابو دایك پەیدادەبیٚ، بەڵام ئەگەر خوا بیەویٚ، بەبیٚ بابیش پەیدادەبیٚ، هەروەك ئەگەر بشیەویٚ، بەبیٚ بابو دایكیش پەیدادەبیٚ، وەك ئادەم، كە خوای باڵادەست لەبارەیەوە دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩﴾ آل عمران، كە ئێمە لە سووڕەتی (آل عمران)دا كە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرەیە، بەدرێژیی قسەمان لەوبارەوە كرد، وە باسمان كرد كە (قُرْطُبي) ئەم بەسەرهاتەی لەوبارەوە هێناوە: ﴿نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة بِسَبَبِ وَفْدِ نَجْرَان حِينَ أَنْكَروا عَلَى النَّبِيّ ﷺ قَولَه: إنَّ عِيسَى عَبدَ اللهِ وَكَلِمَتُهُ، فَقَالُوا: أَرِنَا عَبْداً خُلِقَ مِنْ غَيْرِ أَبٍ، فَقَالَ لَهُم النَّبِيُّ ﷺ: «آدَمُ مَنْ كَانَ أَبُوهُ، أَعَجِبْتُم مِن عِيسَى لَيْسَ لَهُ أَبٌ؟ فَآدَمُ ﷺ لَيْسَ لَهُ أَبٌ وَلاَ أُمٌّ»﴾ أسباب النزول للسيوطي برقم: (١٩٨)، وَ أَيضَاً رَوَاهُ ابْنُ أَبي حَاتم مُرْسَلاً)[١]، واتە: ئەم ئایەتە بە هۆی شاندی نەجرانەوە

١) الجامع لأحكام القُرْآن للقُرْطُبي، ج: (٤)، ص: (٩٢).

هاتە خوار، کە نکوولّییان کردو ڕەخنەیان گرت، لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: عیسا بەندەی خوایەو وشەی خوایە، (واتە: بە وشەی خوا دروست بووە)، گوتیان: بەندەیەکمان پێشان بدە، کە بەبێ باب دروست بووبێ‌و لەدایکبووبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی بابی ئادەم کێیە؟ ئایا سەرسام دەبن، بەوە کە عیسا بابی نیە، بەڵام سەرسام نابن کە ئادەم نە بابی هەیە، نە دایك؟ بۆیە خوا ئەم ئایەتە موبارەکەی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، واتە: وێنەی عیسا لە لای خوا وەك ئادەمە، لە گڵ دروستی کرد، پاشان پێی فەرموو: ببە، یەکسەر بوو، واتە: دروستکرانی عیسا ﵇ لە لایەن خوای زاناو تواناوە، هەروەك دروستکرانی ئادەمە، عیسا بابی نیە، کەچی ئادەم ﵇ نە بابی هەیە، نە دایکی هەیەو، خوای کاربەجێ ڕاستەوخۆ لە گڵ دروستی کرد، ئنجا ئەگەر عیسا لایەنێکی هەیە، کە دایکە، ئەوە ئادەم ﵇ هیچ کام لەو دوو لایەنەی نەبووە، واتە: نە باب نە دایك!!

جا وەك گوتمان: خوا بە چوار شتان پێناسەی عیسا دەکات:

**یەکەم**: دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، بێگومان مەسیح عیسای کوڕی مەریەمە، کە لە قورئاندا لە زۆر شوێنان عیسا ﵇ پاڵدراوەتەوە لای دایکی، (عیسای کوڕی مەریەم) بۆچی؟ چونکە عیسا ﵇ دایکی هەیە، بەڵام بابی نیە.

وشەی (مَسیح)یش:

١) یان لەسەر کێشی (فعیل)ەو بە مانای (فاعل)ە، لەبەرئەوەی عیسا ﵇ هەر کەسێك نەخۆش بووبێ، دەستی لێدابێ‌و دەستی پێداهێنابێ، چاك بووەتەوە.

٢) یاخود لەبەرئەوەی سیاحەت‌و گەشتی کردووەو بانگەوازی کردووەو خەڵکی هێناوەتە سەر ڕێی خوا.

٣) یاخود لەسەر كێشی (فعیل)ەو بە مانای (مفعول)ە، لەبەرئەوەی كە فریشتە دەستیان لێداوەو موبارەكیان كردوە، واتە: (مَمسوح) دەست پێداهێنراو.

**دووەم**: دەفەرموێ: ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ﴾، ڕەوانەكراوی خوایە، چونكە خوا پەیامو بەرنامەی خۆی پێدا ناردوە..

**سێیەم**: دەفەرموێ: ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ﴾، وشەی خوایە هاویشتوویەتی بۆ مەریەم، وشەی خوا یانی چی؟ دیارە وشەی خوا بەشێك نیە لە خوا جیابووبێتەوە، واتە: عیسا ﷺ بە وشەی خوا دروست بووە، نەك بە بەیەكگەیشتنی باب‌و دایكی، واتە: خوا فەرمانی كردوە، دروستبێ‌و دروستبووە، دیارە ڕووحەكەی بە فووی جیبریل كە بە یەخەی مەریەمی دایكی دا كردوەو، چۆتە منداڵدانییەوە، بووەتە كۆرپەلەو دروست بووە، ئنجا لەبەرئەوەی بە وشەی خوا دروست بووە، بۆیە خوا ناوی لێناوە (كَلِمَة).

**چوارەم**: دەفەرموێ: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، وە عیسا ﷺ ڕووحێكە لە خواوە، ئاشكرایە هەموو ڕووحەكان لە خواوەن، وە هەر خوا دەیانخووڵقێنێ! بەڵام ڕووحی عیسا ڕووحێكی تایبەتە، چونكە وەك دروستبوونی خەڵكی دیكە بە پرۆسەی پێكەوە جووتبوونی باب‌و دایكدا تێنەپەڕیوەو، یەكسەر چۆتە نێو منداڵدانی مەریەم، ئنجا بۆ زانیاریتان نەصرانییەكان كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، ڕووحێكە لە خواوە بە درێژایی مێژوو موناقەشەیان بووە لەگەڵ مسوڵمانان، كە ئەوە عیسا ﷺ ڕووحێكە لە خواوە، كەواتە: بەشێكە لە خوا، بۆیە ئێمە دەڵێین: كوڕی خوایە!! جارێك من لەگەڵ یەكێك لە نەصرانییەكان، كە خۆی بە زانا دەزانی موناقەشەم بوو لەوبارەوە، گوتی: خۆ قورئانی ئێوەش دان بەوە دادێنێ

کە عیسا بەشێکە لە خوا جیابۆتەوە! گوتم: کوا؟ گوتی: ئەوەنیە دەڵێ: ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾، ڕووحێکە لە خواوە، جا بۆ زانیارییتان وشەی: (مِنْ) دەگونجێ بۆ (بیانية)بێ، وەك دەڵێ: (اشتريتُ كيلوياً عَسَلاً ثم اشتَرَيْتُ مِنْهُ كيلويينِ آخَرَين)، واتە: کیلۆیەك هەنگوینم کڕی، دوایی دوو کیلۆی دیکەشم کڕی، هەر لەو هەنگوینەم کڕی، یانی: هەر لەو جینسە، چونکە دوو کیلۆیەکەی دیکە بەشێك نین لەو هەنگوینەی پێشێ کڕراوە، وە دەشگونجێ (مِنْ)، (تبعیضیة) بێ‌و ئەو شتەی دەچێتە سەری بەشێك بێ لە شتەکەی دیکە، وەك دەڵێ: (الفرعُ من الشجرة)، واتە: درەختەکە لقێکی لێ جیابۆوە، جاری واش هەیە (مِنْ) بۆ دەستپێکردن (إبتداء) بەکاردێ، واتە: ئەو شتە لەوەوە هاتوە، بۆ وێنە دەڵێ: (نَبَعَ الْمَاءُ مِنَ العَيْنِ)، واتە: ئاوەکە لە سەرچاوەکەوە هەڵدەقوڵێ‌و لەوێوەش هاتوە، جا من کە موناقەشەم بوو، بەو زانا نەصرانییەم گوت: ئەگەر بە پێی قسەی تۆبێ، دەبێ ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەموو دروستکراوەکان، بەشێکبن لە خوا، گوتی: چۆن؟ گوتم: خوای تاك‌و بێ وێنە لە ئایەتی (١٣)ی سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرمویێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾، واتە: وە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوەو تێکڕا هەمووی لە خواوەیە، لەوەدا نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە بیر دەکەنەوە، کەواتە: ئەگەر ئەو ﴿مِّنْهُ﴾، بەڵگەبێ لەسەر ئەوەی کە عیسا بەشێکە لە خوا، دەبێ بڵێین: ئاسمانەکان‌و زەوی‌و هەموو ئەوەی کە لە نێوان ئاسمانەکان‌و زەوی دایە، بەشێکن لە خوا، کە دیارە ئەوەش شتێکی ناڕاستە، کەواتە: مەبەست ئەوەیە کە لە خواوە هاتوون‌و، خەڵقەندەو دروستکراوی خوان، هەروەها بە نسبەت عیساشەوە بە هەمان شێوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرًا لَّكُمۡ﴾، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار ڕایدەگەیەنیّ و پێناسەی عیسا سەلامی خوای لێ بێ، دەکەن بەو شێوەیەی کە لەگەڵ واقیعی عیسادا دەگونجیّ، وە عەقڵ و فیطرەتیش قبووڵی دەکات، دەفەرموێ: ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾، دەجا ئیمان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی بێنن، کە یەکێك لە پێغەمبەران عیسایە سەلامی خوای لێ بێ، ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾، وە مەڵێن سێن، ﴿ٱنتَهُواْ خَيۡرًا لَّكُمۡ﴾، دەست هەڵگرن لەو قسە بێجیّ و نامەنتیقییانە، ئەوە بۆ ئێوە چاکترە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾، ئەم ڕستەیە بە دوو جۆر تەفسیر کراوە:

١/ (ولا تَقُولُوا: الإِلَهُ ثَلاثَةٌ) واتە: مەڵێن: پەرستراو سێ دانەیە.

٢/ (ولا تَقُولُوا: الآلِهةُ ثَلاثَةٌ) واتە: مەڵێن: پەرستراوەکان سێن، بەڵکو یەك پەرستراو هەیە، کە ئەویش بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی کەون و کائیناتە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾، ئایا نەصرانییەکان گوتوویانە: خوا سێن؟ دەڵێین: بەڵێ، لە ئایەتی (٧٣)ی سوورەتی (المائدة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ...﴿٧٣﴾﴾، واتە: بێگومان بێبڕوان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە، کە دوایی ڕوونی دەکەمەوە، ئەو سێیانە کێن؟ هەروەها لە ئایەتی (٧٢)ی سوورەتی (النِّساء)دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ

مَرْيَمَ ...﴿٧٢﴾﴾، واتە: بەڕاستیی بێبڕوان ئەوانەی گوتیان: بێگومان خوا بریتیە لە مەسیحی کوڕی مەریەم.

بۆ زانیارییتان وەك پێشتریش گوتمان، نەصرانییەکان دەڵێن: خوا ﷻ لە سێ بەش پێکهاتوە، کە ئەوان پێی دەڵێن: (الأقانيم ثلاثة)، (أقنوم) واتە: توخم، یاخود پێکهێنەر، جا دەڵێن: ئەو سێ توخمە ئەمانەن: خوا ﷻ بۆ خۆی، عیسا (کە کوڕی خوایە)، (الروح القدس) کە گیانی پیرۆزە، ئەویش مەبەستیان پێی جیبریلە، وە هەندێکیش دەڵێن: خواو عیساو دایکی، ئەوان بۆخۆیان بە تەعبیری خۆیان دەڵێن: (الأب، الإبن، الرُّوح القُدس) باب، کوڕ، گیانی پیرۆز، بۆ وێنە: لە (كتاب المقدس)دا[1] هاتوە، دەڵێ: (وَلَمَّا تَعَمَّدَ الشَّعْبُ جَمِيعاً تَعَمَّدَ يَسُوعُ، وإذْ كَانَ يُصلِّي انْفَتَحَتِ السَّماءُ وَهَبَطَ عَلَيْهِ الرُّوحُ القُدسُ مُتَّخِذاً هَيْئَةَ جِسميَّةٌ مِثْلَ حَمَامَةٍ، وَانطَلَقَ صَوْتٌ مِنَ السَّماءِ، يَقولُ: أنْتَ إبني الحَبيب بِكَ سُرِرْتُ كُلَّ السُّرور) واتە: کاتێك هەموو گەل خۆیان لە ئاو هەڵکێشا (نەصرانییەکان خۆیان لە ئاو هەڵدەکێشن کە تەعمیدی پێ دەڵێن) عیساش خۆی لە ئاو هەڵکێشا (واتە: تەعمیدی کرد)، وە کاتێك کە نوێژی دەکرد، دەروازەی ئاسمان کرایەوە ڕووح لقودوس هاتە خوار لە شێوەی کۆترێکدا خۆی نمایان کرد، وە دەنگێك لە ئاسمانەوە هات، گوتی: تۆ کوڕی خۆشەویستی منی، بە تۆ زۆر دڵخۆشم.

کەواتە: بە حیساب ئەو دەنگە هی خوایەو، گیانی پیرۆزیش هاتۆتە خوارێ، عیساش کوڕی خۆشەویستی خوایە! هەرچەندە لەڕاستییدا ئەوە زۆر ڕۆشن نیە، مەبەستی پێ ئەوەبێ کە عیسا کوڕی خوایە، چونکە لە تەعبیری خاوەن کتێبەکاندا وشەی (کوڕ)یان بەکارهێناوە، بۆ بەندە، واتە: کە گوتوویەتی کوڕی خوایە، یانی: خۆشەویستی خوایە، بەندەی خوایە، لە

---

١) (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)، العهد الجديد، إنجيل لوقا، الإصحاح: (٣)، الأيتان: (٢١،٢٢)، ص: (٢٠٧٤).

خوا زۆر نزیکە، جا لە شەرحو ڕوونکردنەوەی ئەو دوو ئایەتەی ئیصحاحی (٢٣)ی ئینجیلی (لوقا)دا ئەوانەی شەرحیان کردوە، دەڵێن: (هَذَا أَحَدُ المواضِعُ العَدِيدَة في الأسفارِ المُقَدَّسة التي يُذْكَرُ فيهَا الثَّالوثُ الأقدس: الآب والإبن والرَّوح القدس مَعاً، وَحَسَب التعبير التقليدي للكَنيسة فإن اللَّه واحِد في ثلاثة أقَانيم لَكِنَّهُم جَوهَرهُم واحِدٌ مُتَساوونَ منذُ الأزَلْ، وإلى الأبَد، ولايُمكن لأي قَدَرٍ مِن التفسير والشرح أن يُصَوِّرَ بِدِقةٌ وَقُوة هَذِهِ العِلاقَةِ المُتميِّزةِ الفَريدة، وَلَيْسَ في الطبيعَة أيُّ شَبيهٍ كَامِلٍ لَهَا لأنهُ لَيْسَ هُنَاكَ أيُّ عِلاَقَةَ تُشْبِهُ الثَّالوث)، واتە: ئەوە یەکێکە لەو شوێنە زۆرانە کە لە کتێبە موقەددەسەکاندا هاتوە، کە باسی سێیە پیرۆزەکە دەکات: باب، کوڕ، گیانی پیرۆز پێکەوە، وە بەپێی تەعبیری کلاسیکیی کەنیسە: خوا یەکێکەو لەو سێیانەدا خۆی نواندوە، بەڵام نێوەڕۆکو ماهییەتیان یەکە، وە هەموویان یەکسانن لە ئەزەلەوەو هەتا هەتایەش، وە هەرچەندە ئەوە زۆر ڕوونبکرێتەوەو شیبکرێتەوە ناگونجێ چۆنیەتی ئەو پەیوەندییەی نێوان ئەو سێیانە ڕوون بکاتەوە، چونکە لە سروشتدا هیچ شتێکی دیکە نیە وێنەی ئەوەبێ، وە هیچ پەیوەندییەك نیە کە لە شێوەی ئەو سێیانە بێ کە پێی دەگوترێ: (الثَّالوث) واتە: سێیانە.

لێرەدا مەبەستیان ئەوەیە کە هیچ عەقڵێك لەوە حاڵی نابێ، ڕاستیشە عەقڵی ئینسان ئەوە ڕەفز دەکات، شتێك یەکێك بێو سێش بێ! جا هەندێك لە نەصرانییەکان وێنەیەك دێننەوەو سەفسەطە دەکەن، دەڵێن: ئەدی چۆن هەڵم (بخار) هەیە، دوایی دەبێتە ئاو، دوایی دەشی بەستێو دەبێ بە بەفرو سەهۆڵ، کەواتە: یەك شتەو سێ شتیشن! بەڵام لەڕاستییدا ئەوە سەفسەطەیە، چونکە ئەوە هەر شێوەی خۆنواندنەکەی دەگۆڕێ، بەڵام لێرەدا خوای بێ وێنە زاتێکی بێ وێنەیەو، عیسا سەلامی خوای لێ بێ دروستکراوێکەو، لەدایکبووە، دوایی ئێوە دەڵێن: مردوەو هەڵواسراوەو، پاشان جیبریل فریشتەیە پێکهاتەیەکی دیکەیە، کەواتە: مەسەلەی (ثالوث)

زۆر جیایە لە مەسەلەی هەڵەو ئاوو سەهۆڵ.. بۆیە دەڵێین: لەڕاستییدا ئەوەی کە نەصرانییەکان دەیڵێن: خوای پەروەردگار یەکێکەو سێشە، بە هیچ جۆرێك عەقڵی سەلیم قبووڵی ناکات.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار باسی کرد کە عیسا ؑ چییەو؟ کێیەو؟ چۆن بووە؟ کە ڕاستە بابی نیە، بەڵام کوڕی دایکی خۆیەتیو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوای بەدیهێنەر بە وشەی خوا دروست بووە، وە ڕەوانەکراوی خوایەو ڕووحێکی تایبەتە لەلایەن خوای کاربەجێیەوە دروست کراوە، پاشان بەرپەرچی عەقیدەو بیروبۆچوونی ئەفساناویی نەصرانییەکانی دەداتەوە، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، بێگومان خوا یەك پەرستراوە، ﴿سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾، پاکیی بۆ ئەو کە ڕۆڵەی هەبێ، ڕۆڵەی نیە، نە کوڕ، نە کچ، ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە موڵکی ئەوە، وە ئەو بەسە بۆ سەرپەرشتیاریی، کەواتە: خوای باڵادەست حەوجێی ڕۆڵەو وەچە نیە، پاشان خوای بێوێنە جیایە، لە دروستکراوەکانی، ئێمە دەبینین هەندێ لە دروستکراوەکانیش کە جۆریان لێك جیایە ناتوانن پێکەوە زاووزێ بکەن، ئینسانو ئاژەڵ پێکەوە زاووزێ ناکەن، ئینسانو جن پێکەوە زاووزێ ناکەن، پاشان هەر لە دروستکراوەکانی خوا هی وا هەیە، کە ڕەگەزیان نیە، وەك فریشتەکان، نەنێرن، نەمێن، ماددەی بێ ژیان، نە نێرە نە مێ، بەو ماناو چەمکەی کە ئێمە دەیزانین، ئەگەرنا دەزانم لە نێو گەردیلەدا ئەلیکترۆنو پرۆتۆن هەیە، یانی: بارگەی سالبو بارگەی موجەب، بەڵام بەو چەمکەی ئێمە نیە، کەواتە: خوا ﷻ تاکەو بێوێنەیە، بێهاوتاو هاوەڵە، چونکە

ئەگەر هاوسەری هەبێ، دەبێ لە دروستکراوەکانی بێ، وە هیچ کام لە دروستکراوەکانی وەك وی نین، وە خوا زۆر لەوە بەرزترە، ئەو جۆرە تەصەووڕەی دەربارەی بکرێ، بەڵام بەداخەوە بەشەر زۆرجار کە نەیتوانیوە خوای پەروەردگار وەك خۆی بناسێو تەماشا بکات، هەڵساوە خوای بەرزومەزنی قیاس کردۆتە سەر بەشەر، کە دیتوویەتی: بۆئەوەی بەشەر بمێنێ، دەبێ زاووزێ بکات، پێی وابووە دەبێ خوای بێوێنەش زاووزێ بکات، بۆ ئەوەی بوونەکەی بەردەوام بێ.

هەروەها کە خوای بەرزو مەزن لە قورئاندا باسی کورسی دەکات، هەندێك کەس وا تەصەووڕی کردوە، کە وەك چۆن ئینسان لەسەر کورسی دادەنیشێ، خوای بێ وێنەش بە هەمان شێوە لەسەر کورسی دانیشتوە!! بەڵام زۆربەی زانایان (كرسي) کە لە قورئاندا باسکراوە، بە زانستو دەستەڵاتی خوا لێکیان داوەتەوە.

یان کە خوای بێهاوتا باسی بارەگا (عرش) دەکات، خوا پێش ئەوەی کە عەرش دروست بکات، چۆن بوو، دوای دروستکرانی عەرشیش هەروایە، وە خوا پێویستی بە غەیری خۆی نیە، پێویستی بە عەرش نیە، تاکو هەڵیبگرێ، بەڵکو عەرشیش بە دەستەڵاتی خوا ڕاوەستاوە، کەواتە: لەسەر عەرش بوونی خوا، واتایەکی جیای هەیە، لەوەی کە دێتە زەینی ئێمەوە، وە هەموو سیفەتەکانی خوا جیان لە هی ئێمە، هەروەك زاتی خوا جیایە لە زاتی دروستکراوەکانی، لەبەرئەوە مەسەلەی هاوسەرگیریی‌و منداڵبوون‌و ئەوانە بۆ خوا شایستە نین، وە لێی ناوەشێنەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** خوا ﷻ ڕاستییەکی دیکە دەخاتەڕوو کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، کاتێك وەفدی نەجران کە نەصرانیی بوون، هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ کە باسی عیسای کرد سەلامی خوای لێ بێ، وە فەرمووی: بەندەی خوایە، گوتیان: عیسا لێی ناوەشێتەوە بڵێی بەندەی خوایە، واتە: بۆ عیسا نەنگییە، چونکە عیسا کوڕی خوایەو، بەشێکە

لە خوا !! خواش لەبەر پەرچدانەوەی ئەو نەفامییەی ئەوانـدا فـەرمووی: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، مەسیح پێی نەنگیی‌و عەیب نیە، وە پێی وانیـە لە شان‌و شەوکەتی دێتە خوار، کە بەندەی خوابێ، وە فریشتە زۆر لـە خوا نـزیکخـراوەکانیش، پێیان نـەنگیی نیـە کـە بەنـدەی خـوابن، ﴿ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾، وە هەر کەسێك پێی نەنگیی بێ، بەندایەتیی بۆ خـوا بکـات، وە خـۆی بـە زل بگـرێ، ئـەوە (خـوا) هـەموویان بـۆ لای خـۆی کۆدەکاتـــــەوە، ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾، جـا ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجامـداوە، ئـەوە بـە تـەواویی خـوا پاداشتیان دەداتەوە، وە لە چاکەی خۆی بۆشیان زیاد دەکات، بـەڵام ئەوانـەی کە پێیان نەنگیی بووە، کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، وە خۆیـان بـە زلگرتـوە، ئـەوە سزایەکی بە ئێش‌و ئازاریان دەدات، وە جگە لە خوا یارمەتیدەرو پشتیوانێکیان چنـگ ناکەوێ، کەواتە: ئـەوەی کـە نەصرانییەکان گوتوویانـە: عیسـا ﵇ پێـی نەنگییە، بەندایەتیی بۆ خوا بکات، لەڕاستییدا شتێکی بێجـێ‌و نامەنتیقییـان گوتـوە، ئـاخر پێغـەمبەران (علیهم الصَّلاة والسلام) بۆیـە هەڵبـژێردراوی نێـو بەشەرییەت بوون، چونکە لە هەموو کەس بۆ خوا (عەبد)تـر بـوون‌و لـە هەموو کەس ملکەچتر بوون، وە زۆر بە شانازییەوە بەندایەتییـان بـۆ خـوا کـردوە، وە لەڕاستیدا بەندایەتیی بۆ خوا، شەرەفێکە خوا بە هـەموو کەسێکی نـادات، ئـەو پێغەمبەرانە (علیهم الصَّلاة والسلام) بۆیە هێندە پایەیان بـەرز بـووە، چونکە بـۆ خـوای پـەروەردگار زۆر عابـد بـوون، وەك خـوای کاربەجـێ کـە مـەدحی پێغـەمبەری خـاتەم دەکـات، لـە کاتێکـدا لـە مەقامێکـدا باسـی دەکـات، کـە

بەرزترین مەقامە، کە بریتیە لە شەورۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج) دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾ الإسراء، واتە: پاکیی بۆ ئەو خوایەی کە شەورۆیی بە بەندەکەی خۆی کرد (نافەرموێ: بە پێغەمبەرەکەی، دەفەرموێ: بە بەندەکەی خۆی) لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا، کە دەوروبەریمان بەپێز کردبوو، بۆئەوەی لە نیشانەکانی خۆمانی پێشان بدەین، بێگومان خوا بیسەری بینەرە.

**مەسەلەی حەوتەم:** ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکەو دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، کە ئەوە بۆ جاری چوارەم و کۆتایی یە، لەم سوورەتی (النساء)دا خوا بانگی بەشەر دەکات، بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾، ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە (پەروەردگار واتە: بەخێوکەر، مشوورخۆر، سەرپەرشتیارو سەییدو گەورە) بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان بۆ هاتوە، وە نوورێکی ڕۆشنی تیشکدەرمان بۆتان دابەزاندوە، پێشتریش باسمان کرد، کە مەبەست لە ﴿بُرْهَٰنٌ﴾، موحەممەدە ﷺ، کە بەڕاستیی پێغەمبەری کۆتایی خوا بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە لەسەر ڕاستییێتی دینی خوا، وە لەسەر ئەوە کە خوای بە بەزەیی بەندەکانی خۆی پشتگوێ نەخستوەو ئیهمالی نەکردوون.

ئنجا هەر کەسێك لە ژیان و سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ وردبێتەوە: لە عەقیدەی، لە عیبادەتی، لە ئاکاری، لە هەڵسوکەوتی، لە ڕەوشتی، لە هەڵوێستەکانی ...، لە هەر ڕوویێکی وردبێتەوە، زیاتر ڕاستییێتی دینی خوای بۆ دەردەکەوێ، چونکە پێغەمبەری ئێمە ﷺ قورئانی لە خۆیدا بەرجەستە کردوە، وەك دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پرسیاری لێکراوە دەربارەی

ڕەوشـتی پێغەمبـەر ﷺ گوتوویـەتی: ﴿عن سعید بن هشام: سألت عائشة رضي الله عنها عن خلق رسول الله ﷺ، فقالت: كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ﴾ رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٦٤٥) وَقَالَ شعیب الأرنؤوط: إسناده صحیح علی شرط الشیخین)، واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ ئەویش گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ سوننەتەکەی بریتیە لە جێبەجێکردنی قورئان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرایە لەسەر پەروەردگارییێتیی خوا، لەسەر بەزەیی خوا، لەسەر ڕاستییێتی ئیسلام، هەر کەسێك لە سیرەو ژیانو ئاکاری موحەممەد ﷺ وردبێتەوەو تێوەی ڕابمێنێ، لە ئیسلام تێدەگات، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئاوێنەی ئیسلامە، ئاوێنەی بەرجەستەکەری ئیسلامە، وە هەر کەسێکیش چاك ئاشنای پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، لە ڕاستییێتی دینی خوای پەروەردگار زیاتر تێدەگات، وە ئەوەی قورئان بە تیۆریی فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کردەوە کردوویەتیو، لە خۆی دا بەرجەستە کردوە.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ نُورًا مُّبِينًا ﴾، دیارە مەبەست لەو ڕووناکییە ڕوونو ڕۆشنە، قورئانە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە، بەڵام قورئان دابەزێنراوە، ﴿ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴾، بورهانەکە موحەممەدە ﷺ هاتوە لە نێو خۆیاندا، بەڵام نوورەکە لەلایەن خواوە دابەزێنراوە، ئنجا ئەو ڕۆشناییە هەم لە خودی خۆیدا ڕوونو درەوشاوەیەو، هەم ڕوونکەرەوەو درەوشێنەرەوەشە[1].

١) چونکە وشەی (مُبِین) دەگونجێ لە : (بان یَبِینُ) بێ، واتە: (لازم) بێ، وە دەشگونجێ لە: (أبان یُبِینُ) بێ، واتە: (متعدِّي) بێ.

بەڵێ (بانَ) یانی: درەوشایەوە، وە (أَبان) یانی: درەوشاندیەوە.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا﴾، جا ئەوانەی كە ئیمانیان بە خوا هێناوە، وە دەستیان بە خواوە گرتوە، یاخود دەستیان بەو بورهانە گرتوە، كە موحەممەدە ﷺ یاخود دەستیان بەو نوورە ڕوونە گرتوە، كە قورئانە، هەرسێكی دەگرێتەوە، ئیمان بە خوا هێنانو دەست بە خوا گرتن، یان دەست بە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتن، یاخود دەست بە قورئان گرتن، وە یاخود دەست گرتن بە هەموویانەوە، دیارە هەر كەسێكیش دەست بە هەر كام لە خوا عزوجلو قورئانو پێغەمبەری خواوە ﷺ بگرێ، دەستی بە دووەكەی دیكەشەوە گرتوە، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە كە مەبەست لێرەدا دەست بە خواوە گرتنە، چونكە دەست بە خوا گرتن، بەرهەمی ڕاستەو خۆی ئیمان پێهێنانیەتیو، واش ڕاسترە ڕاناوی (ضمیر) بۆ نیزیكترین باسكراو (أقرب مذكور) بچێتەوە، ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ ...﴾، كە دیارە نزیكترین باسكراو لێرەدا خوا (اللّه)یە سبحانه وتعالى، هەر كەسێك وابكات، خوا دەیخاتە نێو بەزەییو بەخششی خۆیەوەو، بەرەو لای خۆی دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست، چونكە ڕۆیشتن بۆ لای خوا دەبێ بە ڕێیەكی ڕاستدا بێ، من كتێبێكم هەیە بە ناوی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)[1]، ئینسان بە ڕێی خوارو خێچو بە كوێرە ڕێیاندا ناگاتە خوا، دەبێ بە ڕاستە شەقامدا بەرەو خوا بچێ، ئەو ڕاستە شەقامە كامەیە؟ قورئانە، ئەو قورئانەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆیدا بەرجەستەی كردوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی قورئانەوە خوای پەروەردگاری ناسیوەو خوای بەرزو مەزنی پەرستوە، وە زانیویەتی كە حەڵاڵو حەرامو چاكەو، خراپەو، ڕاستو چەوت، چییە؟ جا لێرەدا هەر باسی ئەوانەی كردوە كە ئیمان بە خوا دێننو، دەست بە خوا

---

١) چاپی پێنجەمی كراوەتەوەو بۆ عەرەبیو فارسیش تەرجەمە كراوەو، تەرجەمە عەرەبییەكەی لە (دار الحكمة)ی لەندەن چاپكراوەتەوەو كەوتۆتە بەردەست.

دەگرن، یاخود دەست بە قورئان دەگرن، یاخود دەست بە پێغەمبەر ﷺ دەگرن، کە دەیانخاتە نێو بەزەیی و بەخششی خۆیەوە، وە بەرەو خۆی دەیانخاتە سەر ڕاستە شەقام، بەڵام باسی ئەوانەی دیکەی نەکردوە، کە ئیمان بە خوا ناهێنن، وە دەست بە خواو بە ڕێسمانی خواو بە قورئانو بە پێغەمبەرەوە ﷺ ناگرن، کە ئەوانە بە پێچەوانەوە تووشی کوێرە ڕێیان دەبن، وە لە جیاتی ئەوەی نسیبیان ڕەحمەتو بەخششی خوابێ، نسیبیان غەزەبو تووڕەیی و سزای خوایە، خوا پەنامان بدات.

**مەسەلەی نۆیەمو کۆتایی**: وەك پێشتر باسمان کرد، ئایەتی ژمارە (١٢)ی سوورەتی (النساء) باسی کەلالەی کرد، ئێستاش ئایەتی ژمارە (١٧٦) دیسان باسی دەکات، ئنجا هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئایەتی ژمارە (١٢) مەبەست پێی خوشكو برای دایکیین، واتە: باسی حاڵەتێکە کە خوشكو برای بابیی، وە بابو دایکیی لە ئارادانینو، تەنیا خوشكو برای دایکیی هەن، کۆمەڵێك خوشكو برا هەن، بەس لە دایکیاندا خوشكو بران، بەڵام لە بابیاندا خوشكو برانین، بەڵام ئەم ئایەتە باسی میرات لێگیرانی ئینسانی بێ وەجاخ دەکات، لەلایەن خوشكو برایانێکەوە کە هی بابو دایکیین، بابو دایکیان یەکن، یاخود تەنیا بابیان یەکە، دەفەرموێ: ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ﴾، داوای فەتوات لێدەکەن، داوای ڕوونکردنەوەت لێدەکەن، بەڵێ خوا بۆتان ڕووندەکاتەوە، فەتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە، شایانی باسیشە کە هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (كلالة) زۆر مشتومڕیان بووە، کە ئایا کێیەو؟ چۆنە؟ هەتا لە تەفسیرەکاندا هاتوە کە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: یەکێك لەو شتانەی کە زۆرم مەبەست بوو پێغەمبەر ﷺ بۆم ڕوونبکاتەوە، پێناسەی (كلالة) بوو، هەندێکیش دەڵێن: کاتێك ئەوەی گوتوە، کە جارێ ئەم ئایەتە دانەبەزیوە، بە هەرحاڵ زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن (كلالة) کە ئێمە بە کوردی دەڵێین:

بێ وەجاخ، کەسێکە نە بابو دایکی هەبن، نە کوڕو کچیشی هەبن میراتی لێ بگرن، ئەوە ئەگەر میرات لێگیراوبێ، وە ئەگەر میراتگریش بێ، ئەوەیە کە بە نسبەت ئەو کەسەوە کە میراتی لێ دەگرێ، نە بابو دایك بێ، نە کوڕو کچ بێ، بەڵکو یان خوشك، یان برای بێ.

ئنجا دێتە سەر چۆنیەتی میراتگرتنو میرات لێگیرانی بابای بێ وەجاخ (كلالـة)و ڕوونکردنەوەیو دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ﴾، ئەگەر پیاوێك مرد، ﴿لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾، منداڵی نەبوو، واتە: نە کوڕ، نە کچ جا لێرە نەیفەرموە: (ولا والِـد) یانی: بابو دایکیشی نەبوون، بەڵام هەموو توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەبێ بابو دایکیشی نەبن، ئەوجار خوشکی میراتی لێدەگرێ، یاخود ئەگەر ئافرەت بێ، ئەوجار برایەکەی میراتی لێدەگرێ، ئەگەرنا هەتا بابو دایك هەبن، ئەوان میرات ناگرن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾، خوشکێکیشی هەبوو، ئەوە نیوەی ئەوەی بەجێیهێشتوە، دەبێتە میراتی ئەو خوشکە، ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞ﴾، وە ئەو برایەش هەموو میراتەکەی ئەو خوشکە دەبا، ئەگەر ئەو خوشکەی بمرێو، هیچ کوڕو کچی نەبن، منداڵی نەبن، هەروەها دەبێ دایكو بابیشی نەبن، ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾، ئنجا ئەگەر خوشکەکان دووان بوون، ئەوە دوو سێیەکی ئەوەی کە برایەکەیان بە میرات بەجێیهێشتوە، بە میرات دەگرن، واتە: دوو لەسەر سێی بۆ ئەوانە، بۆ ئەو دوو خوشکەیە، توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەگەر ئەو خوشکانە لە دووانیش زیاتر بن، هەر هەمان حوکمیان هەیەو، دوو لەسەر سێی میراتەکە هی ئەو خوشکانەیە، ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ﴾، بەڵام ئەگەر ﴿إِخۡوَةٗ﴾، بوون، پیاوانو ئافرەتان، واتە: کۆمەڵێك نێرومێی خوشكو برا

بوون، ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾، ئەوە بۆ نێرینە دوو هێندەی بەشی دوو مێینان میرات هەیە، واتە: دابەش دەکرێ، دووبەش بۆ برا، بەشێك بۆ خوشك، ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ﴾، خوا بۆتان ڕووندەکاتەوە، بۆئەوەی گومڕا نەبن و ڕێتان لێ تێکنەچێ، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئنجا لێرەدا پێویست بەوە دەکات چەند خاڵێ دەربارەی ئەم ئایەتە بخەینەڕوو، بۆئەوەی کە چەمك و واتاکەی ڕوونتربێتەوە، هەڵبەتە مەسەلەی میراتیش یەکێکە لەو زانستە شەرعییانەی کە وردەکاریی زۆری تێدایە، بەڵام ئێمە ئەوەندەی کە پەیوەندیی بە ئایەتەکانەوە هەبێ، ڕوونی دەکەینەوەو ناچینە نێو تەفاصیلّو وردەکارییەکانی میراتگرتنەوە.

## ڕوونکـردنەوەی چەند مەسـەلەیەك لەبارەی میـراتگرتن و میـرات لێگـیرانی بێوەجاخ (کـلالـة)ەوە

یەکەم: لە ئایەتی (١٢)ی سوورەتی (النساء)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾﴾، ئێمە پێشتر ئەم ئایەتەمان تەفسیر کرد کە باسی میرات لێگیرانی (کلالة) دەکات، بەڵام وەك گوتمان لێرەدا مەبەست پیاوێکە یان ئافرەتێکە، یان چەند پیاوو ئافرەتێك، چەند براو خوشکێکن، کە هی دایکیین، (واتە: تەنیا لە دایکدا خوشك و بران)، دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێك میراتی لێگیرا بە شێوەی کەلالەیی، (واتە: بێ وەجاخیی کە باب و دایکی نەبن، وە منداڵیشی نەبن)، یاخود ئافرەتێك، (کەواتە: کەلالە دەگونجێ پیاوبێ، وە دەگونجێ ئافرەت بێ) ئنجا ئەو کەسە برایەکی هەیە، یان خوشکێکی هەیە، ئەوە بۆ هەرکامیان شەش یەك هەیە، ئنجا ئەگەر زیاتر بوون، (کۆمەڵێك خوشك و برا بوون) ئەوە لە یەك لەسەر سێی میراتەکەدا بەشدارن، دوای ئەوەی ئەگەر وەصیەتی کردبێ، وەصیەتەکەی جێبەجێ دەکرێ، وە دوای درانەوەی قەرزێك کە لەسەریەتی، بەڵام قەرزێك نا کە زیان بە میراتگرەکان بگەیەنێ.

کەواتە: ئایەتی (١٢)ی سوورەتی (النساء) باسی براو خوشکی دایکیی دەکات، واتە: (الأخ والأُختُ لأُم) کە تەنیا لە دایکدا خوشك و برای یەکدین، بەڵام ئایەتی (١٧٦)ی سوورەتی (النساء) کە ئێستا خەریکی توێژینەوەینی، باسی

میراتگرتنی براو خوشکی دایکیی‌و بابیی، کە لە باب‌و دایکیاندا پێکدەگەنەوە، یاخود لە بابیاندا پێکدەگەنەوە (الأخ والأُختُ لأبٍ وأُمٍ، أو لأبٍ)، دەکات.

دووەم: دەربارەی پێناسەی وشەی (کلالة)، باشترین پێناسە ئەوەیە: (مَنْ لا وَلَدَ لَهُ، ولا وَالِدَ یرثُهُ)، واتە: ئەو کەسەیە کە نە ڕۆڵەی هەبێ (کوڕو کچ)، وە نە باب‌و دایکیشی هەبێ میراتی لێبگرێ، ئەوە ئەگەر میرات لێگیراوبێ، چونکە وشەی (کلالة)، دەگونجێ میرات لێگیراوبێ، وە دەشگونجێ میراتگربێ، ئنجا ئەگەر میراتگر بێ دەڵێین: (هو الوارث الذي لیس والداً ولا ولداً للمورِّث) کەسێکە کە میرات لە کەسێك بگرێ‌و نە باب‌و دایکیی ئەو کەسە بێ، نە ڕۆڵەی بێ، واتە: برا یان خوشکی بێ.

سێیەم: کە دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ﴾، ئەگەر پیاوێك مرد ڕۆڵەی نەبوو، هەروەها باب‌و دایکیشی نەبوو، خوشکێکی هەبوو، نیوەی میراتەکەی بۆ خوشکەکەیەتی، ڕواڵەتی ئایەتەکە وادەگەیەنێ کە خوشك تەنیا لەکاتی نەبوونی ڕۆڵەدا نیوەی میراتی برایەکەی دەبات، بەڵام لە کاتی هەبوونیدا واتە: ئەگەر برایەکەی منداڵی لەپاش بێ، نیوەی میراتەکەی نابات، بەڵام وانیە، بەڵکو ئەوە تەنیا لەکاتێکدایە کە برایەکەی منداڵی کوڕی هەبێ، ئەدی ئەگەر منداڵی کچی هەبێ؟ ئەوە خوشکەکە نیوەی میراتەکە دەبات، بەڵام ئەگەر برایەکەی کوڕی هەبوو، ئەو خوشکە ئەو نیوەیە نابات.

چوارەم: کە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾، بە ڕواڵەت ئەوە دەگەیەنێ، کە مادام برا مردووەکە، ڕۆڵەی نەبێ، خوشکەکەی نیوەی میراتەکە دەبات، بەڵام لەڕاستییدا وێڕای نەبوونی ڕۆڵە، دەبێ دایك‌و بابیشی نەبن، واتە: دەبێ برایەکەی باب‌و دایکیشی نەبن، ئنجا خوشکەکەی نیوەی میراتەکەی دەبات، هەروەها بەنسبەت خوشکەکەوە، دەبێ دایك‌و بابیشی نەبن، ئەوجار

برایەکەی هەموو میراتەکەی دەگرێ، ئەوەش بە یەکدەنگیی زانایان دەڵێن: خوشك لەکاتی هەبوونی دایك و بابدا میرات ناگرێ.

پێنجەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَ ﴾، مەبەست پێی خوشکی باب و دایکیی، یاخود خوشکی بابییە، چونکە خوشکی دایکیی، لە ئایەتی (١٢)دا باسی میراتگرتنەکەی کرد، کە شەش یەك دەگرێ.

شەشەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞ ﴾، واتە: برا هەموو میراتی خوشکەکەی دەبات، ئەگەر خوشکەکە ڕۆڵەی لە پاش نەبن، واتە: منداڵی نەبن، ئەوە ئەو برایەی هی باب و دایکییە، یاخود هی بابییە، ئەگەرنا برای دایکی هەموو میراتەکە نابات، بەڵکو شەش یەك دەبات، وەك لە ئایەتی (١٢)ی سوورەتی (النساء)دا باسمان کرد.

حەوتەم: بەڵگە لەسەر ئەوە کە مەبەست لە ئایەتی (١٧٦)دا براو خوشکی باب و دایکییە، یاخود بابییە، ئەوەیە کە خوا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ ﴾، ئنجا ئەگەر خوشکەکان دووان بوون، (یان زیاتر) دوو لەسەر سێی ئەوە کە برایەکەیان بەجێیان هێشتوە میرات دەگرن، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك خوشك و برا بوون، بۆ نێرینە هێندەی بەشی دوو مێینان هەیە، بەڵام لە میراتی خوشك و برای دایکییدا، فەرموویەتی: ﴿ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ ﴾، واتە: هەر یەکەی شەش یەك دەگرن، هەروەها لەوێ دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ ﴾، ئنجا ئەگەر خوشك و برای دایکیی بن، لە سێیەکدا بەشدارن.

هەشتەم: میراتگرتنی هەر كام لە براو خوشكی باب‌و دایكیی، یان بابیی لە یەكدی، پاش دانەوەی قەرزو جێبەجێكردنی وەصیەتە، وەك لە ئایەتی (١٢)ی سوورەتی (النساء)دا هاتوە، ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، دوای وەصیەتێك كە كراوە، دەبێ وەصیەتەكە جێبەجێ بكرێ، یاخود قەرزێك كە مردووەكە لەسەریەتی، دەبێ قەرزەكەی بدرێتەوە، ئنجا دوایی میرات دابەش دەكرێ، ئنجا هەرچەندە ئایەتی ژمارە (١٢) باسی میراتگرتنی براو خوشكی دایكیی دەكات، بەڵام ئەوە بۆ هەموویان هەر وایەو هەموو میرات دابەشكردنێك، دەبێ قەرزی خاوەن مردووەكە بدرێتەوە، وە وەصیەتەكەش جێبەجێ بكرێ، پاشان ماڵەكە دابەش دەكرێ.

نۆیەم: كاتێك براو خوشك میرات لە یەك دەگرن‌و، بابای میرات لێگیراو بەبێ وەجاخ (كلالة) دادەنرێ، كە برا یان خوشكە میرات لێگیراوەكە، نە منداڵی ڕاستەوخۆ (صُلب)ی هەبێ، نە منداڵی كوڕی (ولد الإبن)، هەروەها نە باب‌و دایكی هەبن، نە باپیر، ئەگەرنا مادام كچ‌و كوڕی كوڕ، یان باپیری هەبێ، میرات ناگرێ، وەك (تیسیر الكریم الرحمن)[1] هێناویەتی.

دەیەم: دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە (إبن العربي) لە كتێبی (أحكامُ القرآن)[2]دا لە قەتادەوە هێناویەتی، هەروەها (فخرالدین الرازي) لە (التفسیر الكبیر)دا[3] هێناویەتی، لە (أبو بكر الصدیق)ەوە، خوا لێی ڕازی بێ، كە گوتوویەتی: (أَلاَ إنَّ الآيَةَ الَّتِي نَزَلَتْ فِي أَوَّلِ سُورَةِ النِّسَاءِ مِنْ شَأْنِ الْفَرَائِضِ نَزَلَتْ فِي الْوَلَدِ وَالْوَالِدِ، وَالآيَةُ الثَّانِيَةُ أَنْزَلَهَا اللَّهُ سُبْحَانَهُ فِي الزَّوْجِ وَالزَّوْجَةِ وَالإِخْوَةِ مِنْ الأُمِّ، وَالآيَةُ الَّتِي خَتَمَ بِهَا سُورَةَ النِّسَاءِ فِي الإِخْوَةِ

١) ص: (٢١٧).
٢) ج: (١)، ص: (٦٥٣).
٣) ج: (١١)، ص: (١٠١، ١٠٢).

وَالأَخَـوَاتِ مِـنْ الأَبِ وَالأُمِّ ، وَالآيَـةُ الَّتِـي خَـتَمَ بِهَـا سُـورَةَ الأَنْفَـالِ أَنْزَلَهَـا اللَّـهُ سُبْحَانَهُ فِي ذَوِي الأَرْحَامِ)، واته: گێـڕدراوەتەوە لە ئەبو بەكـری صـیددیقەوە خـوا لـێی ڕازی بـێ كـە لـە وتارێكـی خۆیـدا گوتوویـەتی: ئاگـاداربـن! ئـەو ئایەتـەی كـە خـوا لـە سـوورەتی (النـساء)دا دەربـارەی بەشـەكان (واتـە: میـرات دابەشـكردن) ناردوویەتــە خــوارەوە، ئایــەتی یەكــەمیان دەربــارەی چـۆنیەتی میــراتگرتنی ڕۆڵـەو بـابو دایكــە، وە ئایـەتی دووەمیـان دەربـارەی چـۆنیەتی میـراتگرتنی مێردو ژنە، وە هی چەند خوشـكو برایەكە كە هـی دایكــیی بـن، وە ئـەو ئایـــەتەی كـە كـراوە بـە كۆتـایی سـوورەتی (النـساء) خـوا دەربـارەی برایانو خوشكانێك كە هی بـابو دایكــیین، ناردوونیـە خـوار، وە ئـەو ئایەتـەش كـە سـوورەتی (الأنفـال)ی پـێ خــەتم كــراوەو كراوەتــە كۆتـایی، دەربــارەی میـراتگـرتنی خزمان بەگشتی هاتۆتەخوار.

ئنجـا بەڕێــزان !

وەك لە سەرەتاشـەوە باسمكرد، بەڕاستیی ئەگەر بمانـەوێ هـەقی تـەواو بدەینـە ئــەو وردەكارییانــەی میــراتو ئــەو مەســەلە شــەرعییانە، دەبــێ بگەڕێینــەوە بــۆ سـەرچاوە شــەرعییەكان، كـە زانایـان بـە تەفصـیلێ باسـیان كـردوە، بـەڵام ئێمـە بـە قەدەر ئەوەندەی پەیوەنـدیی بە ئایەتـەكەوە هەیـە، باسـمان كرد.

لێـرەدا پـاش سـوپاسو سـتایشو شـوكرانەی زۆر بـۆ خـوای پـەروەردگار دێینـە كۆتــایی هێنــان بــەم زنجــیرە دەرســەی: (تەفـسیری قورئــانی بــەرزو بــەپێز) لــە سوورەتی (النساء)، لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێمـەوە، یارمـەتی هـەموو لایـەكمان بـدات باشـتــر لـە كتێبــی خـوا تێبگـەین، وە باشـتــر لـە سـوننەتو ڕێو شـوێنی پێغـەمبەر ﷺ حاڵی بیـن، وە یارمەتیشـمان بدات كە ئـەوەی دەیـزانین بیتـوانینو حــاڵی بوونەكەمان لە خۆمان بكـەینە حاڵ، ئنجا بەوەندەش وازنەهێنین كە تـەنیا خۆمــان كــاری پێبكــەین، بەڵــكو هەوڵبــدەین بــەو زانــستە شــەرعیو شــارەزاییە، دەوروبەریــشـمان ڕوونــاك بكەینــەوەو بیگــۆڕینو چاكــسازییو پاكــسازیی تێــدا

بکەین، بەو شێوەیە کە جێگای ڕەزامەندیی خوایە، وە بە تەئکید خواش بەوە ڕازی دەبێ کە خەڵك بەختەوەرو سەرفرازبن، وە تەنیا بە هۆی جێبەجێکردنی شەریعەتەکەشیەوە، بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دواڕۆژ دەبن، خوای پەروەردگار ئێمەو میللەتەکەمان لەو کەسانە بگێڕێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

دوا پێداچوونەوەی :

٢٢ی ڕەجەبی ١٤٣٤ ك

١ی حوزەیرانی ٢٠١٣ ز

هەولێر

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقى، إعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَرَ بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي، حَقَّقَهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية.

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرْآن لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف: الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني، تحقيق: عبدالرزاق الْمَهدي، دار الكتاب العربي، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل، تأليف: علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

٨) تفسير المراغي تأليف أحمد مصطفى المراغي، دار الفكر، بيروت.

٩) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان، تأليف: العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، تحقيق: عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٠) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن، تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١١) صفوة التفاسير، تأليف: العلامة محمد بن علي الصابوني، مكتبة الهداية، أربيل/ العراق، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٢) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف: محمد رشيد رضا، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٣) الأساس في التفسير، تأليف: سعيد حوى، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٤) فـي ظِلال القُرْآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٥) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّرِيعَة والْمَنْهَج، تأليف: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٦) مُفرَدات ألفاظ القُرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، دار القلم، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

١٧) المعجم الوسيط، دار الدعوة، الطبعة الثانية.

١٨) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م)، (أسباب النزول) للنيسابوري.

١٩) الْموطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي.

٢٠) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل، الناشر مؤسسة قرطبة، القاهرة، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها.

٢١) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٢٢) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري، حقوق أصولُهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٣) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٤) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٥) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٢٦) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٢٧) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني، تحقيق: مجدي بن مَنصور بن سي الشورى، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٢٨) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري، تحقيق: صالح اللحَّام، دار ابن حزم، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٩) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق أصولُهُ وخَرَّجَ أَحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٠) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى ( ١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٣١) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظُهُ وَجُمَلَهُ وَعَلّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفي ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ – ٢٠٠٧ م).

٣٢) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٣٣) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، تأليف: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٣٤) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ: عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٣٥) السنن الكبرى تصنيف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٣٦) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# بەرهـەمـەکانی دانـەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چـاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلامو ڕێچکان. چـاپی ٣/ ٢٠٠٦

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چـاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خــوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مسوڵمانی موجاهید کـێـیەوچۆنە؟ چـاپی٣ /٢٠٠١

٦- دەردو دەرمانی بزووتنـەوەی ئیسلامی. چـاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێبـازی پێغـەمبەر ﷺ کـامەیە؟! چـاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مـسوڵمان) وە دواتـر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

٨- ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون. چاپی ٥ /٢٠١٢

تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبیو لەژێر چاپە .

٩- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩

١٠- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغووت. چاپی ٢ /٢٠٠٥

١١- سۆزی نەتەوایەتیو بیـری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥

١٢- مســوڵمانی کامڵ/بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان. چاپی ١ / ١٩٩٧

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسـەری کێشـەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی ١ / ١٩٩٢

١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی ١ / ١٩٩٣

١٥- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەکی گەشو ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٨- ئیسلامو کێشـە هەنووکەییەکان. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەڵگاکـەمان بەرەو هەڵدێر دەبـات. چـاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاكوخاوێنی .

٢١- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

٢٢- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشین‌و زەکات.

٢٣- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەج‌و عومرە، زیکری خوا.

٢٤- گەڕانەوە بۆ لای خـوا ﷻ . چاپی ٥ / ٢٠١٠

٢٥- زانایانی ئیسـلام کێن‌و چۆنن ؟! چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٦- بنچینە گرنگەکانی هەڵس‌وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییـەکاندا، چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسـلامیی)یە، بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوەو چاپیش کراوە.

٢٧- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن‌دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٨- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی‌یەو چۆنە؟ چاپی ٢ /٢٠١٢

٢٩- بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسـەن، چاپی ٤ / ٢٠١٢ .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

٣٠- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەکانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٣١- پاســاوو بەڵگــە شـەرعییەکانی بنیاتنـانی‌کۆمـەڵی‌ ئیـسـلامیی، ئاڵقـەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٢- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی‌و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣٣- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەت دا بەرگی یەکەم‌و دووەم. چاپی ٣ / ٢٠١٢

٣٤- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك‌و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٦- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٧- چۆن هەڵس‌وکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٨- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١/ ٢٠٠٢

٤٠- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٤١- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێو چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢.

٤٢- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٤٣- کارو پڕۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢/ ٢٠٠٦ .

٤٤- ئیسلامو مسوڵمانەتیوکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چییەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٧- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٨- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّ و جل)، کتێبەکانی خوا (عزّ و جل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٩- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥٠- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندییو دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠. چاپی ١ / ٢٠٠٨

٥١- تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧، چاپی ٢/ ٢٠١١.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٥٢- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتییو لاسایی کردنەوەدا.

٥٣- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟

